# تەفسیری ڕەوان

## (بۆتێگەیشتنی قورئان)

نوسینی:

**مەلا مەحموودی گەلاڵەیی**

بەرگی (چوارەم)

جزمی (١٠،١١،١٢)



.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★

📖 ناوی کتێب: تەفسیری ڕەوان

📖 نوسینی: مەلا مەحموودی گەڵاڵەیی

📖 تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

📖 ژمارەی سپاردن: ﴿٢١٤٠﴾ی ساڵی ٢٠١٣ز پێدراوە.

📖 چاپو دیزاین: ﴿سامان محمد أمين﴾.

## چۆنیەتی دابەش کردنی دەسکەوتی جەنگ

﴿ وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ



﴿٤١﴾

لەئایەتی پێشوودا پەروەردگار فەرمانی بەموسوڵمانان کرد کە دژی کافران بجەنگن فەرمووی: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ﴾ جەنگیش بەشێوەیەکی ئاساییو عادەتی بەشوێنی دا دەستکەوت دەبێ، ئەمجار پەروەردگار لێرەدا یاسای دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگ دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ بزانن: ئەوەی لەجەنگ دا دەبێتە دەستکەوتتان، دەکرێتە پێنج بەش؛ بەشێك لەپێنج بەشەکە دەدرێ بەوانەی ئایەتەکە باسی کردون، بەڵام شتێك هەیەو پرسیار دەکرێ بۆ ئایەتەکە شەش لایەنی باس کردوون کە پێنج یەکەکەیان بەسەردا دابەش دەکرێ؟ لەوەڵام دا دەگوترێ رای راستو صەحیح ئەوەیە: کە هێنانی ناوی خودا بۆ پیرۆزیو تەبەرروکەو پێنج یەکەکە هەر بەسەر پێنج لایەن دا دابەش دەکرێ.

ئەبو عالیە دەڵێ: ئەو بەشەی بۆ خودا دیاری کراوە لەپێویستی کەعبەدا خەرج دەکرێ. بەڵام رایەکەی رەت کراوەتەوە بەوە کە ئاوەدانکردنەوەی ئەو پێنج لایەنەی پێنج یەکەکەیان بەسەردا دابەش دەکرێ ئەمانەن.

١- بەشێك بۆ پێغەمبەرە، بەئارەزۆی خۆی دەیدا بەکێ دەیدا.

٢- بەشی خزمەکانی پێغەمبەر ﷺ کە بریتین: لەبەنوهاشمو بەنوموطەلیب ئەمە رای شافیعیو ئەحمەدو هی تریشە، بەلگەشیان ئەو فەرموودەیەیە کە بوخاریو نەسائی دەریان هێناوە دەڵێن: کاتێ پێغەمبەر ﷺ بەشی (ذوی القربی)ی دابەش کرد تەنیا لەنێوان بەنوهاشمو بەنوموطەلیب دا بەشی کردو فەرمووی: (انهم لم يفارقوني في جاهلية ولا اسلام، انما بنوهاشم وبنوالمطليب شيء واحد). کە ئەمەی فەرموو: پەنجەکانیشی تێکنان. بوخاری دەڵێ: لەیث گوتی: یونس بۆیگێڕامەوەو ئەمەیشی زیاد کرد وتی: پێغەمبەر ﷺ هیچی بۆ بەنی عەبدو شەمسو بەنی نەوفل دانەنا. ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: عەبدو شەمسو هاشمو موطەلیب برای دایکی بوون، دایکیان عاتیکەی کچی مورڕە، نەوفەل برای باوکییان بوو، نەسائی دەفەرموێ: پێغەمبەر بەشی خزمەکانی دانا کە بریتی بوون لەبەنوهاشمو بەنوموطەلیب هەیانبوو دەوڵەمەند بوو هەیان بوو هەژار بوو!

بەڵام دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بەلای ئیمامی شافعییەوە ظاهیری ئایەتەکەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ پێنج یەکی دەستکەوتەکە دەکرێ بەپێنج بەش، بەشێك بۆ پێغەمبەرە ﷺ لەبەرژەوەندی موسوڵمانان دا خەرج دەکرێ وەکوو کڕینی کاڵاو پێداویستی جیهاد. بەشێك بۆ خزمەکانیەتی بەدەوڵەمەندو هەژاریانەوە، بەسەریان دا دابەش دەکرێ بۆ هەر نێرینەیەکیان دوو هێندەی مێینەیەکیان. ئەو سێ بەشەکەی تریشی بۆ سێ لایەنەکەی تر: هەتیوو هەژارو ڕێبوارە. ئیمامی ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: بەشی پێغەمبەر ﷺ دوا وەفاتی نامێنێ. هەروەها بەشی خزمەکانیشی نامێنێ. ئەگەر بیاندرێتێ. بەڵکوو پێنج یەکەکە بەسەر هەتیوو هەژارو ڕێبواردا دابەش دەکرێ.

ئیمامی مالیك دەفەرموێ: دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ دابەشکردنەکە حەواڵەی رای ئیمام دەکرێ، بەئارەزۆی خۆی چۆنی بەباش زانی ئاوا دابەشی دەکا. حەزی لێ بوو هەمووی دەخاتە بەیتولمالەوە، ئەگەر بەلایەوە گونجاو بوو بەسەر ئەوانەی ئایەتەکە ناوی هێناون دابەشی دەکا، ئەگەر بەلایەوە پەسەند بوو: هەندێکیان دەیاندرێتیو هەندێکیان نایاندرێتێ.





مالیکییەکان، بەڵگەیان زۆرن، یەکێ لەو بەڵگانە: ئەو فەرموودەیەیە: کە لەعەبدوڵڵای مەسعودەوە ریوایەت کراوە: دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ رۆژی جەنگی حونەین دەستکەوتی جەنگی بەشێوەیەکی تایبەتی دا بەچەند کەسێکی تایبەتی، سەد حوشتری دا بەئەقرەعی کوڕی حابیس، سەد حوشتریشی دا عویەینەی کوڕی حیصن، هەوا هەندێکی تری لەو دەستکەوتە دا بەهەندێ پیاو ماقوڵی عەرەب، پیاوێك وتی: وەڵڵاهی ئەم دابەشکردنە دادپەروەری تێدا نیە، یان لایەنی خودای تێدا رەچاو نەکراوە. عەبدوڵڵا دەفەرموێ: وتم: سوێند بێ بەخودا ئەمە بۆ پێغەمبەر ﷺ دەگێڕمەوە. ئیتر هەواڵەکەم بۆ گێڕایەوە ئەویش فەرمووی: (یرحم الله أخي موسى لقد أوذي بأكثر من هذا فصبر) خوا رەحم بەموسای برام بکا، بێگومان ئەویش لەسەر دەستی گەلەکەی لەمە زیاتر ناڕەحەت کراو خۆی راگرت.

٣- بۆ هەتیوان: زارۆکو منداڵی موسوڵمانان کە باوکەکانیان نەمابن.

٤- بۆ هەژاران: ئەو موسوڵمانانەی هەژارنو پێویستییان هەیە.

٥- رێبوار: ئەو موسوڵمانانەی لەماڵو وڵاتی خۆی دوور کەوتۆتەوەو پارەی پێ نەماوە.

ئەمجار دەفەرموێ: ﴿إِنْ كُنتُمْ آمَنتُمْ بِاللَّهِ...﴾ واتە: پابەندی ئەو شەریعەتو یاسایەبن کە بۆمان داناون دەربارەی پێنج یەکی دەستکەوتو لێی دەرمەچن، ئەگەر ئێوە ئیمانتان بەخودا هەیەو خۆتان بەموسوڵمان دەزانن. ﴿وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ﴾ هەروەها ئەگەر راست دەکەن بڕواتان بەو پەیامە هەیە کە ناردوومانە بۆ سەر بەندەی خۆشەویستمان کە پێغەمبەرە یان: بزانن؛ ئەو ماڵو کاڵایەی دەستتان دەکەوێ لەجەنگ دا پێنج یەکی دەدرێ بەو پێنج لایەنانەی باسکران. ئێوە تەماعتان تێیدا نەبێ، بەچوار بەشەکەی تری قینیات بکەن، ئەگەر ئێوە ئیمانتان بەخودا هێناوەو بڕواتان بەو پەیامە هەیە کە لەرۆژی بەدردا خودا ناردویە بۆ پێغەمبەری خۆی، ئەو رۆژی بەدرەی کە حەقو بەتاڵی تێدا جیا کرایەوە، موسوڵمانانی بەسەر کافرەکان دا زاڵ کردن، ئەو رۆژەی سوپای موسوڵمانو سوپای کوفر بەیەك گەیشتنو لێکیان دا، ئەو جەنگە یەکەم جەنگ بوو کە

پێغەمبەر ﷺ تەشریفی بەشداری تێدا کرد، ﴿وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ پەروەردگار بەسەر هەموو شتێك دا خاوەن دەسەڵاتو توانایە، دەتوانێ ئێوەی موسوڵمانی کەمو بێ چەکو ئامێری جەنگ بەسەر لەشکری زۆری کارفران دا زاڵ بکاوو هیچ شتێك نیە ببێتە کۆسپو تەگەرە لەبەردەم ئەنجامدانی ویستو ئیرادەی دا!

جا هەرچەندە مەبەستی جیهاد بەم دەقە قورئانیە ئاشکرایە، سنووردار کرا، دەرکەوت جیهاد بۆ خودایە، لەپێناو ئامانجێك دایە پەیوەندی بەبانگەوازی خوداو ئایینی خوداو مەنهەجی ژیانەوە هەیە. بەڵێ هەرچەندە ملکیەتی دەستکەوتی جەنگ لەوە پێش، قورئان حەواڵەی خوداو پێغەمبەری کردو صلاحییەتی دابەشکردنی دایە دەست پێغەمبەر ﷺ کە بەگوێرەی یاسای خودا دابەشی بکا، موجاهیدەکانی لێ دوورە پەرێز کرد، بۆ ئەوەی مەبەستو هەڵسوکەوتیان خالیص بۆ خودا بێ! وەلێ لەگەڵ هەبوونی ئەم راستیانە دا پێویستە ئەوە بزانرێ کە مەنهەجی قورئان مەنهەجێکی خودایییە، روبەڕوی واقیع دەبێتەوە بەبڕیارو ئەحکامی لەبارو گونجاو، بۆ هەموو رووداوێك حوکمی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ هەموو کێشەیەك حەللی گونجاوی هەیە، چارەسەری خۆی بۆ دیاری دەکا.

ئاشکرایە: جەنگ بەرپابووە، موسوڵمانان سەرکەوتن، دەسکەوت هەیە، جەنگاوەر هەن. ئەو جەنگاوەرانە لەرێگەی خودادا تێکۆشاون، ماڵو گیانی خۆیان بەخت کردوە، خۆیان کردتۆتە پێشمەرگەو فیدائی بەویستی خۆیان هاتوونە گۆڕەپانی جەنگەوە، بەچەکو نانو تفاقی خۆیان بەماڵو گیانەوە ئامادەی غەزا بوون، تەنانەت هەندێکیان وێڕای دابینکردنی پێداویستی بۆ خۆیان، پێداویستی کەسانی دیکەشیان دابینکردوە. دەی ئەمانە بەگیانو ماڵ ئامادەی خۆبەخت کردن بوون، دەسکەوتیان دێتە دەست.. لەوە پێشیش دڵو دەروونیان پاڵفتە کراوە لەوەی کە تەماعی ئەو دەسکەوتانەیان هەبێ، هەر لەسەرەتاوە خاوەنیەتی ئەو غەنائیمە بۆ خوداو پێغەمبەر گێڕدراوەتەوە. کەوابێ زەمیینە خۆش کراوە بۆ ئەوەی هەریەکەیان لەم دەستکەوتە بەشی خۆی بدرێتێ، لەکاتێك دا ئەو جەنگاوەرانە وا هەست دەکەن -کە ئەو بەشەی دەیاندرێتێ خوداو پێغەمبەر دەیاندەنێ، ئیتر ئەم




بەش پێ دانە پێویستییەکانیان دابین دەکا، داخوازییە ئادەمیزادەکانیان تێر دەکا، بێ ئەوەی هەڵپە هەڵپو کێشەو دووبەرەکی لەدابەشکردنەکە دا پەیدا ببێ. ئەمەش دوای ئەوەی کە لەسەرەتای سورەتەکە دا بەبڕیارێکی یەکالاکەرەوە ﴿قُلِ الأَنفَالُ لِلّهِ وَالرَّسُولِ﴾ ملکیەتو دەسەڵاتەکە دیاری کرا. لەلایەکی ترەوە وەکوو لەوە پێش بەکورتی ئاماژەمان بۆ کرد، زانایانی ئیسلام لەسەر ئەم ئایەتە ریوایاتی جۆراو جۆریان گێڕاوەتەوە، زۆر راو بۆچوونی فیقهی جۆراو جۆریان لەسەر ئەم ئایەتە هەڵساندوە، یەکەم: ئایا مانای (الغنائم)و (الأنفال) یەك مانایە؟ یان هەر یەکەیان مانای تایبەتی خۆی هەیە؛ دووەم: ئەو پێنج یەکەی -جگە لەو چوار بەشەی کە دەدرێ بەجەنگاوەران- چۆن دابەش دەکرێ؟ سێیەم: دەربارەی پێنج یەکی پێنج یەکەکە (خمس الخمس)ی کە دەدرێ بەخودا، ئایا ئەو پێنج یەکەیە کە دەدرێ بەپێغەمبەر؟ یان ئەویش بۆخۆی بەشی سەربەخۆیە؟ چوارەم: ئەو پێنج یەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ دیاری کراوە، ئایا تایبەتە بەخۆیەوە، یان حوکمەکەی دەگوێزرێتەوە بۆ جێنیشینو فەرمانڕوایانی دوا خۆیشی؟ پێنجەم: دەربارەی پێنج یەکی خزمەکانی پێغەمبەر ﷺ ئایا دوا سەردەمی پێغەمبەر ﷺ هەر بەردەوامەو دەدرێ بەبەرەی هاشمو بەرەی موطەلیب؟ یان دوا پێغەمبەر ﷺ ئیشەکە حەواڵەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان دەکرێ بۆ ئەوەی بەئیجتیهادو بۆچوونی خۆی بڕیاری تێدا بدا؟ شەشەم: ئایا ئەو پێنج یەکەی کە بۆ خوداو پێغەمبەرو خزمەکانیو هەژارانو هەتیوانو رێبواران دیاری کراوە دەکرێتە پێنج بەشی چوون یەك: یان ئەویش حەواڵەی پێغەمبەر ﷺ کراوەو ئەویش فەرمانڕەوایان چۆنیان بوێ ئاوا دابەشی دەکەن؟ ئەمانە هەموویان راو بۆچوونی فیقهینو هەریەکەیان بەڵگەی خۆی بەدەستەوەیە، بەپێویستمان نەزانی هەموو ئەو راو بۆچونو بەڵگە هێنانەوەو رەتدانەوەیان راگوێزی ئێرە بکەینو بیانخزێنینە ئەم جێگایەوە. بەتایبەتی کە مەوزوعی دەسکەوت (غنائم) بەشێوەیەکی گشتیو تێکڕایی ئەمڕۆ واقعێکی ئیسلامی نیەو روبەڕوی موسوڵمانان نابێتەوە، ئەمڕۆ ئەم مەسەلە، واقیعێکی زیندووی نیە، چونکە دەوڵەتێکی ئیسلامی لەگۆڕێ نیە، فەرمانڕەوایەکی موسوڵمان نیە، نەتەوەیەکی موسوڵمان بەو مانایە نیە لەپێناو ئایینی خودادا

جیهاد بکاو دەستکەوتی لەجەنگا هەبیو هەوڵی ئەوە بدا بزانێ چۆن دابەشی بکا. ئـەمڕۆ چی لـەو بـارەوە بگوترێ: کـات بەفیڕۆدانـە لەباسـێکی بۆشـی نـەظـەری دا، لەواقیعی موسوڵمان دا چ ڕەنگدانەوەیەکی نیە!!

## زۆر کردنی موسوڵمانان لەپێش چاوی کافرەکانو بەکەم پیشاندانی کافرەکان لەبەرچاوی موسوڵمانان!

﴿إِذۡ أَنتُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلۡقُصۡوَىٰ
وَٱلرَّكۡبُ أَسۡفَلَ مِنكُمۡۚ وَلَوۡ تَوَاعَدتُّمۡ لَٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِي
ٱلۡمِيعَٰدِ وَلَٰكِن لِّيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗا
لِّيَهۡلِكَ مَنۡ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٖ وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٖۗ
وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ إِذۡ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِي
مَنَامِكَ قَلِيلٗاۖ وَلَوۡ أَرَىٰكَهُمۡ كَثِيرٗا لَّفَشِلۡتُمۡ وَلَتَنَٰزَعۡتُمۡ
فِي ٱلۡأَمۡرِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَۗ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ
﴿٤٣﴾ وَإِذۡ يُرِيكُمُوهُمۡ إِذِ ٱلۡتَقَيۡتُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِكُمۡ قَلِيلٗا
وَيُقَلِّلُكُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِهِمۡ لِيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗاۗ
وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴿٤٤﴾﴾

باسەکە بەردەوام لێرەش دا هەر دەربارەی روداوی جەنگی بەدرە، پەروەردگار دوای ئـەوە کـە حـوکمی دابەشـکردنی دەسـتکەوتی جـەنگی دیـاری کـرد، ئـەمجار دیمەنێکی ئـەو رۆژە دەکێـشیو شـوێنو لەشـکر بـەزێنی هەردوو لاو سـەربازخانەی هـەردوو سـوپاکان دەسـت نیـشان دەکـا، بـۆ ئـەوەی موسـوڵمانان یـادی نیعمەتـە گەورەکانی خودا بکەنـەوە، کـە بەسـەر دوژمنـی سەرسـەختیان دا زاڵـی کـردن، ئـەو دوژمنـەی کـە لەهـەموو رویـەکی مـادیو سـەربازییەوە لـەوان بـەهێزتر بـوون. دەفەرموێ: ﴿إِذْ أَنتُمْ بِالْعُدْوَةِ الدُّنْيَا وَهُمْ بِالْعُدْوَةِ الْقُصْوَى﴾ ئەی گرۆهـی موسـوڵمانان! یـادی ئـەو بەیـەك گەیـشتنو تێکـرژانو لێکدنـە یەکالاکـەرەوە بکـەن کـە روی دا لەنێوان ئێوەو کافرەکان دا، هەمیشە شوکری پـەروەردگار بکـەن کـە لـەو جەنگـە دا ئێوەی بەسەر ئەوان زاڵ کرد!

لەکاتێك دا ئێوە لەبەردەم جەنگێکی ترسناك دا بوون لەگـەڵ دوژمـن دا، ئـەو کاتەی ئێوە لەلایەکی دۆڵەکەوە بـوون، بـەلای مەدینـەوە، ئـەو شـوێنەش زەوییـەکی لمبـەلان بـوو، قاچـتان رۆدەچـوو، بەناخۆشـی جـمو جوڵتـان بـۆ دەکـرا، لەشـکری کافرەکانیش لەبەرێکی تری دۆڵەکەوە -دوور لەمەدینە- بـەلای مەککەوە هـەڵیان دا بوو، ئاویشیان لێ نزیك بوو، ﴿وَالرَّكْبُ أَسْفَلَ مِنْكُمْ﴾ کاروانی قورەیـشییەکان کـە بەسەرۆکایەتی ئەبو سوفیان بوو، بەهـەموو ماڵو کالای پێیـان بـوو، لەخوارتانـەوە بـوون، بـەلای دەریـاوە، یـان کـەناری دەریاکـەوە. لـەو کاتـە دا کاروانەکـە لەشامەوە دەگەڕایەوە بەچل کەسی قورەیشییەوە، ئەوان لەگەڵ مەککەییەکان دا دەیانەویـست بەهـەموو جۆرێـك بـەرگری لـەو کـاروانو کالایـە بکـەنو نـەهێڵن کـە دەس بێنێتـە رێگای. ﴿وَلَوْ تَوَاعَدتُّمْ لاخْتَلَفْتُمْ فِي الْمِيعَادِ﴾ خۆ ئەگەر لـەوە پـێش ئێـوەو کافرەکان وادەی شـەڕتان بەیـەکتر بدایـەو شـوێنی جەنگەکـەتان دیـاری بکردایـە، بتانزانیایـە ژمارەیان چەنـدە، وا دەکەتان نەدەبردە سەر، لەترسی جـەنگ لـەکاتی دیـاریکراو دا ئامـادە نـەدەبوون، لەبـەر کـەمیو کـەمتفاقی خۆتـانو زۆریو بـەهێزی دوژمـن. هەروەها لەلایەکی ترەوە کافرەکانیش دەترسان شەڕ لەگەڵ پێغەمبـەر بکـەن، کـەوا بوو: هیچ لایەکتان ئامادە نەدەبوون بۆ جەنـگ. بەڵام بەیەکگەیشتنتان بەبێ پێش وادەیـیو بـەبێ ئـەوەی هـیچ لایـەکتان پـێش وەخـت حـەزتان لەشـەڕ بـێ، ﴿وَلَكِـنْ





﴿لِيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْراً كَانَ مَفْعُولاً﴾ بۆ ئەنجامدانی کارێك بوو: کە پەروەردگار بڕیاری دابوو، بەقودرەتو دانایی‌و زانایی خۆی پێش وەخت نەخشەی بۆ کێشابوو، بۆ ئەوەی ئایینی ئیسلام بەهێز ببێ، موسوڵمانان سەکەونو شیرکو کوفر لاواز بنو کافرەکان ریسوا بکرێن، بۆ جێ بەجێ کردنو ئەنجامدانی کارێك کە پەروەردگار لەوە پێش بڕیاری دا بوو رەتبوونەوەی نەبوو، ئەویش پارمەتیدانی خۆشەویستانی خۆی‌و زەلیل کردنی کافرەکان بوو، کە لە ئاکامی ئەو بەیەکگەیشتنەوە بوو، تا موسوڵمانان ئیمانیان زیاد بکاو بەهێزتر بێ، وە بۆ ئەوەی موسوڵمانان پابەندی فەرمانی خودا بنو شوکرو سوپاسی بۆ دەربڕن.

بەیەکگەیشتنی ئەم دوو سوپایە بەو شێوەیە لەداهاتوودا کاریگەرییەکی تری هەیە؛ ئەویش ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿لِيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنْ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَا مَنْ حَيَّ عَنْ بَيِّنَةٍ﴾ تا بمرێ ئەوەی دەمرێ لەکافرەکان پاش بینینی بەڵگەیەکی ئاشکرا کە راستی ئایینی ئیسلام دەسەلمێنێ، بژیێ ئەوەی دەژێی لە موسوڵمانان پاش ئەوەی بەڵگەی بەهێزی بینی کە خودا ئایینی خۆی زاڵ دەکاو کۆمەگی بەموسوڵمانان دەکا. بۆ ئەوەی کەس بیانووی نەمێنێ! چونکە جەنگی (بەدر) بەڵگەیەکی بەهێز بوو: بۆ چەسپاندنی بیرو باوەڕ لەدڵی موسوڵمانان داو خەڵکی هەڵنا بۆ کرداری چاكو راستاڵی! وادەی پەروەردگاری تێدا هاتەدی کە دەفەرموێ: ﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ﴾ (القمر: ٤٥).

دەشگونجێ بەشێوەی خوازە (ئیستیعارە) وشەی ﴿يهلك﴾ بەمانا (يكفر) وشەی ﴿يحيا﴾ بەمانا (يؤمن) لێ بدەینەوە. واتە: بۆ ئەوەی کافر بێ ئەوەی دەیەوێ کافر بێ، پاش بینینی بەڵگەی بەهێزو نیشانەی بیانوو بڕ. وە ئیمان بێنێ ئەوەی دەیەوێ ئیمان بێنێ پاش بینینی بەڵگەو نیشانەی بەهێز.

بەڵێ لەراستی دا جەنگی بەدر جیاکەرەوەی حەقو بەتاڵ بوو، بەڵگەو نیشانە بوو بۆ موسوڵمانان کە خودا چۆنی موژدە دا بوو بەپێغەمبەر ئاوا هێنایە دی.

بەڵگەو نیشانە بوو بۆ کافرەکان بەتێشکانیان چونکە ئەوان سەربازی شەیتان بوونو لەپێناو بیرو بڕوای پووچ دا جەنگانو سەرەنجام ریسوا بوون. بەکورتی‌و

پوختی پەروەردگار بۆیە ئێوەی لەبەدر دا بەبێ وادەو زانینی پێش وەخت بەیەك گەیاند بۆ ئەوەی ئێوە بەسەر ئەوان دا زاڵ بکا، وشەی حەق (لا الـه الا الله، محمد رسول الله) بەسەر وشەی بەتاڵ دا بەرز بکاتەوە، ئیش ئاشکراو رون بێ بەڵگەی بەهێزو بیانوو بڕبێ، نیشانەی رونو ئاشکرا بێ، کەس شكو گومانی نەمێنێ، جا ئەو کاتە کێ لەسەر کوفر دەمێنێتەوە با بمێنێتەوە، بۆخۆی دەزانیو لای نومایانە کە ڕێبازەکەی بەتاڵەو بەهەڵە چووە؛ چونکە ئەوەی کە بینییان بەڵگەیەکی مەحسووسو بیندراو بوو، تاقیکردنەوە بوو، بەڵگەی بیندراوو هەست پێکراو زۆر کاریگەرترە لەبەڵگەی نەظەریو عەقڵی. ﴿وَإِنَّ اللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگار شنەواو زانایە بەهەموو شتێك، هیچی لێ گوم نابێ، هەموو بیرو باوەڕو کردارو گوفتارێکی کافرو موسوڵمان دەزانیو شنەوایە بەگوفتاری کافرەکانو زاناو ئاگادار بوو بەهەڵسوکەوتو رەفتاریان، شنەوایە بەدوعاو نزای موسوڵمانانو ئاگادارە بەوەی کە شیاوی ئەوەن بەسەر دوژمن دا زاڵیان بکاو سەریان بخا! هەر کەسەیان لەکافرو موسوڵمان بەگوێرەی کردەوەیان پاداشو سزایان دەداتەوە. ﴿إِذْ يُرِيكَهُمُ اللَّهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلاً﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بیری ئەو کاتە بکەرەوە، کە پەروەردگار لەخەودا کافرەکانی بەکەمو بێ هێز نیشان دای، ئەتۆش ئەمەت بەهاوەڵانت راگەیاندو بڕوایان پێ کردیو دڵیان دامەزراو ورەیان بەرز بووەوە، هیوایان بەسەرکەوتن بەهێز بوو ﴿وَلَوْ أَرَاكَهُمْ كَثِيراً لَفَشِلْتُمْ وَلَتَنَازَعْتُمْ فِي الأَمْرِ﴾ ئەگەر پەروەردگار کافرەکانی بەزۆرو خاوەن هێز، نیشان بدایە، هاوەڵانت لێیان دەترسانو لەناو خۆیان دا لێیان دەبوو بەمقۆ مقۆ، هەندێکیان ئامادەباشی خۆیان پیشان دەداو هەندێکیان خۆیان دەگرتەوەو ئامادە نەدەبوون، چونکە بڕێکیان بڕوای پتەویان هەیەو ورەبەرزو دڵ قایمو خۆبەخت کەرن، پابەندی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودان، هەیانە ترسنۆكو ورە روخاوە؛ تا هەنگاوێك دەهاوێ هەزار حیساب دەکاو جۆرەها بیانوویان دەهێنایەوە، بۆ ئەوەی ئامادەی شەڕ نەبنو بەشداری نەکەن. ﴿وَلَكِنَّ اللَّهَ سَلَّمَ﴾ بەلام خودا ئێوەی لەو دووبەرەکیو ترسانو راجیایی یە پاراستو، تووشی ئەو شکانو نوشوستییەی نەکردنو ریسوا نەبوون! ﴿إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ بێگومان پەروەردگار زاناو ئاگادارە بەو هەستو

ترسانو لاوازییەی کە لەناو دەروونتان دا شێردراوەتەوە، ئاگای لەو هەستە شێردراوەیە: کە جەنگاوەر لەچوون بۆ جەنگ پاش دەدا، هەروەها زاناو ئاگادارە بەو وزە ئیمانییەی کە پاڵ بەجەنگاوەری خوداناسەوە دەنێ بۆ چوونە پێشەوەو خۆبەختکردن ئاگای لەئەندازەی تەوەککولو دڵئارامیو خۆگری هەریەکێك لەئێوە هەیە، بۆ هەموو کەسێك هۆکاری پێویستی رەخساندوە بۆ گەیشتن بەو مەبەستەی هەوڵی بۆ دەدا. ﴿وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذْ الْتَقَيْتُمْ فِي أَعْيُنِكُمْ قَلِيلاً﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویستو ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! بیری ئەو کاتە بکەرەوە کە پێش بەرپابوونی جەنگ پەروەردگار کافرەکانی لەچاوی ئێوەدا بەکەمو لاواز نیشان دا، بۆ ئەوەی بەخۆتان رابپەڕموونو ورەتان بەرز بێتەوەو پەلاماریان بدەن،بڕواتان بەیارمەتیدانی خودا بەهێزبوو فریشتەش گورو تینێکی تایبەتی خستە ناو دڵتانەوەو بەبێ ئەهمیەت کافرەکانتان هاتنە بەرچاو، لەهەمان کات دا ﴿وَيُقَلِّلُكُمْ فِي أَعْيُنِهِمْ وَيُقَلِّلُكُمْ فِي أَعْيُنِهِمْ﴾ ئێوەشی بەکەمو لاواز خستە پێش چاوی کافرەکان، بۆ ئەوەی زیاتر لەخۆیان بایی ببنو پێداویستی زۆر بۆ جەنگ ئامادە نەکەنو بەبێ ئەهمیەت سەیرتان بکەن، تەنانەت کار گەیشتە ئەوە ئەبو جەهل بڵێ: جا هاوەڵانی موحەممەد ئەوەندە کەمن رۆژانە بێچوە وشترێکیان بەسەو، پێی تێر دەخۆن. پەروەردگار ئەم هۆکارانەی رەخساندن ﴿لِيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْراً كَانَ مَفْعُولاً﴾ بۆ ئەوەی هەردوولاتان سووربن لەسەر بەرپاکردنی جەنگ ئەوان بەهۆی لەخۆبایی بوونو خۆبەزۆر زانینو خاوەن هێزو دەسەڵات، ئەمانیش بەهۆی پشت بەستنیان بەخوداو بەراست زانینی بەڵێنو وادەکانی خودا!! تا لەسەرئنجام دا ئەو نەخشەی کە لەزانستی خۆی دا کێشاویەتی ئەنجامی بدا، کە بریتییە لەزاڵ کردنی ئێوەی موسوڵمان بەسەر ئەوانی کافردا، وشەی (لا إله الا الله) بەرز بێتەوەو وشەی لاتو عوزاو....... ژێر بکەوێ.

﴿وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الأُمُورُ﴾ هەر بۆ لای خودایە گەڕانەوەو یەکالا کردنەوەی هەموو کارێکو هەموو شتێك بەدەستی خۆیەتی.

## یادکردنی خوداو خۆڕاگری
## لەبەرامبەر دوژمنو گوێڕادێری بۆ فەرمان

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةٗ فَٱثۡبُتُواْ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٤٥﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بَطَرٗا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿٤٧﴾ ﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوو دا باسی جۆرەها نیعمەتی خۆی کرد کە بەسەر پێغەمبەرو موسوڵمانان دا رشتبوونی لەرۆژی بەدردا، ئەمجار موسوڵمانان فێری ئەوە دەکا؛ کە هەر کاتێ روبەڕوی دوژمن بوونەوە، دوو رەوشتیان تێدا بێ؛ خۆگری لەبەرامبەر دوژمن دا، یادکردنی خودا بەزۆری، ئەمجار فەرمانیان پێ دەکا کە پابەندی فەرمانی خودا بن، گوێڕایەڵی ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەر بن، هەروا نەهی لێ کردن لەدووبەرەکیو کێشە نانەوە، بۆ ئەوەی بای بەختیان نەڕوا، هێزو توانایان بەردەوام بێ.

١- دەربارەی رەوشتی یەکەم دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا﴾ ئەی خاوەن باوەڕان! هەرکاتێ روبەڕوی کۆمەڵێك جەنگاوەری دوژمن بوونەوە، خۆڕاگربن لەبەریان هەڵمەیەن؛ بێگومان خۆگری رەوشتێکی مەعنەوییە زۆر جار دەبێتە هۆی سەرکەوتنو زاڵبوون بەسەر دوژمن دا، بڕوانە دوو پاڵەوان زۆرانبازی دەکەن، هەردووکیان ماندو دەبن، بێ هێز دەبن، هەریەکەیان چاوەڕوانی

ئەوەیە ئێستا نا ئێستا بکەوێ، بەڵام لەهەمان کات دا ئەوەشی بەدڵ دا دێ کە بەرامبەرەکەیشی لەوانەیە لەو ماندوتر بێ، ئیتر ورە بەخۆی دەداو خۆڕا دەگرێ تا ئاخر هەناسەو سەرکەوتن بەدەست دێنیو بەرامبەرەکەی بۆڕ دەدا، جەنگیش هەروایە، گرنگترین هۆکاری سەرکەوتن تێیدا خۆڕاگرییەو گەشبینییە، بەڵکوو خۆڕگری لەهەموو کردارێکی ئادەمیزا دا سوودی هەیە، هۆکاری سەرەکییە بۆ بەمراد گەیشتنو سەرفرازی.

لەصەحیحەین دا هاتووە لە(عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئەوفی)وە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەبرێ لەو ڕۆژانەی کە روبەروی دوژمن دەبووەوە چاوەڕوانی دەکرد تا خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لای دەدا ئەمجار وتاری بۆ جەنگاوەرانی دەفەرموو: (یاأیها الناس: لا تتمنوا لقاء العدو، واسألوا الله العافیة، فاذا لقیتموهم فاصبروا واعلموا أن الجنة تحت ظلال السیوف) ئەی خەڵکینە! هیوا خوازی شەڕ مەبن لەخودا بپاڕێنەوە بێ وەی بن، بەڵام هەرکاتێ شەڕ یەخەی پێ گرتن خۆڕاگر بن، بزانن: بەهەشت بەسایەی شمشێرەوە دەست دەکەوێ. عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەمووی: هیوا خوزای ئەوە مەبن کە لەگەڵ دوژمن دا بەشەڕ بێن، هەمیشە لەخودا داوا بکەن کە بێ وەی بن، کە roوویان بوونەوە خۆڕاگربنو یادی خودا بکەن، ئەگەر ئەوان قولە قولو دەنگە دەنگو هاوار هاواریان کرد، ئێوە بێدەنگ بن.

حافیظی طەبەری لەزەیدی کوڕی ئەرقەم لەپێغەمبەر (ﷺ) ریوایەت دەکا کە فەرموویەتی: ﴿ان الله یحب الصمت عند ثلاث: عند تلاوة القران، وعند الزحف وعند الجنازة﴾ پەروەردگار لەسێ کات دا بێدەنگی پێ خۆشە، لەکاتی خوێندنی قورئان دا، لەکاتی هێرش بردن بۆ سەر دوژمن، لەریو رەسمی جەنازە دا.

٢- رەوشتی دووەم: ئەومیە کە دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيراً﴾ لەکاتی جەنگ دا دژی دوژمن، زۆر ذیکری خودا بکەن، بەدڵو بەزوبان یادی خودا بکەن، بیر لەتواناو دەسەڵاتی بکەنەوە، یارمەتیدانی بێ سنووری بۆ خودا پەرستان

بخەنەوە یادی خۆتان، بەزوبان (الله أکبر) بکەنو بەدڵ یادی بکەنو بڕواتان هەبێ کە هیچ شتێك لێی عاسێ نابێ.

﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ ئەم خۆڕاگریو یادکردنی خوداو بیر کردنەوە لەتواناو دەسەڵاتی پەروەردگار هۆکاری بەمراد گەیشتنو دەستکەوتنی پاداشو، سەرکەوتن بەسەر دوژمن دایە. کەوابێ پێویستە ئادەمیزاد لەهیچ کاتێك دا لەیادی خودا نەبڕێو خودای لەیاد نەچێتەوە. لەکاتی شەڕو ئاشتی، بەلەشساغیو بەنەخۆشی لەماڵ بێ یا لەسەفەر بێ دەبێ هەمیشە خودای لەبیر بێ.

٣- ﴿وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ ڕەوشتی سێیەم ئەوەیە: کە فەرمانبەرداری فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودابن لەهەرشتێك دا کە فەرمانی پێ دەکەن یا نەهی لێ دەکەن.. پەروەردگار هەر فەرمانێکمان پێ بکا دەبێ پابەندی بین. لەهەر شتێك نەهیمان لێ دەکا دەبێ لێی دوور بکەوینەوە. چونکە تاعەتی خوداو پێغەمبەری خودا بەشێکە لەهۆکاری بەمراز گەییشتنو سەرکەوتنو زاڵبوون لەجەنگ دا، هەروەها چونکە گوێڕایەڵیو تاعەت یاساو نیظام دەچەسپێنێ، فەوضاو دووبەرەکی ریشەکێش دەکا، بارو دۆخی جەنگیش زۆر پێویستی بەپابەند بوونو پەیڕەوکردنی یاساو نیظام هەیە.

٤- ڕەوشتی چوارەم: یەکیەتیو تەباییو یەکریزی نێوان موسوڵمانانە، دەبێ هەموو کات موسوڵمانان یەکریزو یەك مەبەست بن. پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾ واتە: کێشەو دووبەرەکی لەناو خۆتان دا پەیدا مەکەن، یەکیەتیو تەبایی خۆتان مەشێوێنن، چونکە ئەگەر وا بکەن ناگەنە ئاواتو بەمراز ناگەنو لەژیان دا فاشیل دەبن، بای بەختتان دەڕواو نگینتان دەفەوتێ، شانسو بەخت یارتان نابێ.

پەروەردگار موسوڵمانان لەدووبەرەکی دەترسێنێ، چونکە کێشەو دووبەرەکی هێزو توانای ئادەمیزاد پەك دەخا، شیرازەی کۆمەڵ تێك دەدا، حەماسو سوور بوون لەدەروونی موسوڵمانان دا ناهێڵێ، هێزو تواناکانیان پەرتەوازە دەکا، هەبوونی فەرمانڕەوایی دەوڵەتو یاسا را دەماڵیو گیانی خۆبەختکردن دەمرێنێ، مێژوو

شایەدە، چەند گەلو نەتەوە بەهۆی بەرپابوونی کێشەو دووبەرەکی ناوخۆیان لەناوچوون!

٥- رەوشتی پێنجەم خۆراگرییە لەئاستی تەنگو چەڵەمە دا، تەحەممولکردنی زەبرو زەنگی دوژمنە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَاصْبِرُوا إِنَّ اللَّـهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ خۆڕاگرنو ورە بەرزبن لەکاتی هێرشو هەڵمەتهێنانی دوژمن دا، چونکە صەبرو خۆگری چەکی کاریگەری جەماوەری موسوڵمانانە، بۆیە گوتراوە ئازایەتیو بەجەرگی خۆگری تاوێکە، تاوێك دان بەخۆدا گرتنی جەند پێشمەرگەیەك لەجەنگێك دا رەوڕەوەی ژیانی گەلەکەیان دەگۆڕێ، سەرفرازیو ئازادیو ناوو شۆرەت بۆ خۆیانو نەتەوەکەیان تۆمار دەکەن، هەمیشە پەروەردگار لەگەڵ خۆڕاگرانەو یارمەتیدەرو سەرپەریشتیاریانە.

بەکورتیو پوختی ئەو پێنج رەوشتانەی باسکران بنەمای دابو نەرێتی جەنگینو چەسپاون هەر گەلو نەتەوەیەك رەچاویان بکا سەرکەوتوو بەمراز گەیشتوو دەبن. ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: بێگومان هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەبواری ئازایەتیو خۆبەختکردن دا، لەگوێڕایەڵی بۆ فەرمانی خوداو پێغەمبەر دا، لەگەردنکەچیو پابەند بوونیان بۆ ئەو فەرمانو ئامۆژگاریەی ئاراستەیان کراوە نموونەیەکی وەها بوون پاش خۆیان تا ئێستا کەس نەیتوانیوە شوێن پێیان هەڵبگرن، چونکە ئەوان لەسایەی بەرەکەتی هەمئاهەنگییان لەخزمەت پێغەمبەر داو گوێڕایەڵییان بۆ فەرمانەکانی، لەماوەیەکی کورتو قیاسی دا سەرباری کەمیو کەم تفاقییان وڵاتانی خۆرئاواو خۆرهەڵاتیان کۆنترۆڵ کرد، رەوڕەوەی مێژوویان گۆڕی، لەناخەوە دڵو دەروونی دانیشتوانی هەرێمە رزگارکراوەکانیان گۆڕی، نەتەوەکانی رۆمو فارسو تورکو بەربەرو صەقالیبە حەبەشو قیبطیء گەلێ نەتەوەی تریشیان هێنایە ژێر سایەی ئیسلامی پیرۆزەوە ئالای (لا الـه إلا الله، محمد رسول الله) بەسەر زوربەی ناوچەکانی جیهان دا شەکایەوە، ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەسەر هەموو ئایینەکانی تردا سەرکەوت، لەماوەی کەمتر لەسی ساڵ فەرمانڕەوایی موسوڵمانان خۆرهەڵاتو خۆرئاوای گرتەوە.

ئوسلوبی قورئان وەهایە: کە لەتەك فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە بکا، کە باسی موسولمانانانی کرد، باسی کافرانیش بکا، کە دونیای بەسەر کردەوە قیامەتیش بێنێتە پێشەوە، لەگەڵ باسکردنی هەموو شتێك دا باسی پێچەوانەکەشی بکا.

جا کە لەوەپێش فەرمانی بەموسولمانان کرد کە پابەندی ئەو پێنج ڕەوشتە پەسندانە بن، کە یەکێکیان جڵەوگیری بوو لەدووبەرەکی نانەوە، ئیتر بەشوێن ئەوەدا جڵەوگیرییەکی تر لەموسولمانان دەکاو دەیانترسێنێ لەوەی کە هەڵوێستی کافرەکان ڕەچاو بکەن. واتە داوا دەکا لەموسولمانان کە پابەندی ئەو پێنج ڕەوشتە پەسندانەبن چاو لەموشریکەکانی مەککە نەکەن، دەفەرموێ: ﴿وَلا تَكُونُوا كَالَّذِينَ خَرَجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ بَطَراً وَرِئَاءَ النَّاسِ﴾ ئیبنو جەریری طەبەری دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە لەموحەممەدی کوڕی کەعبی قورەظییەوە ڕیوایەت دەکا، دەڵێ: کە قوریشییەکان بەرەو بەدر، کەوتنە ڕێ ئافرەتی گۆرانی بێژیان لەگەڵ خۆیان هێنا بوو گۆرانییان دەگوتن‌و تەپڵو دەفیان لێ دەدا. ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ئەوەبوو: کاتێ ئەبو سوفیان کاروانەکەی ڕزگار کرد، ناردی بۆ لای قورەیشییەکان پێی وتن: ئێوە بۆیە هاتوون کاروانەکە ڕزگار بکەن، ئەوە پەروەردگار ڕزگاری کرد، کەوابێ ئێوەش بگەڕێنەوە بۆ مەککە، ئەبو جەهل وتی: نەبەخودا ناگەڕێینەوە هەتا نەچینە بەدر سێ ڕۆژ لەوێ دەمێنینەوە، حوشتر سەر دەبڕین، خواردن دەدەین بەخەڵك، عەرەق دەخۆینەوە، ئافرەتان گۆرانیمان بۆ بڵێن، هەموو عەرەب ئەم ئاهەنگەمان ببیستن، ئیتر بۆ هەتا هەتایە لێمان بترسن. بەڵێ ئەوە بوو ئاواتەکەی هاتە دی: لەجیاتی پیاڵە شەراب پیاڵە شەرابی مەرگیان چەشت، لەباتی گۆرانی گوتنی ئافرەتان بۆیان، گریان‌و شین‌و شەپۆڕو وایەشێرەیان بۆ کردن!!؟

ئیتر پەروەردگار نەهی لەموسولمانان کرد کە وەکوو کافرەکان ڕەفتار بکەن، فەرمانی پێ کردن کە نیەتو مەبەستیان ڕاستاڵانە بێ، یارمەتی ئایین بدەن پشتگیری پێغەمبەر بکەن فەرمووی: ﴿وَلا تَكُونُوا كَالَّذِينَ خَرَجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ بَطَراً وَرِئَاءَ النَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ﴾ ئەی موسولمانینە! خۆتان مەشوبهێنن

بەکافرەکانی مەککەو ئەتواری ئەوان رەچاو مەکەن، وەکوو ئەوانە مەبن کە لەماڵی خۆیان دەرچوون بۆ پارێزگاری کاروانەکەیان بەلوتبەرزیو لەخۆبایی بوونو بەخۆنازین، بەشێوەی تەکەبورو خۆبەزلزانین خۆیان رادەنواندو منەتیان بەسەر زەوی دا دەکرد کە بەسەری دا دەڕۆیشتن بەلوتبەرزیو فیزەوە خۆیان نیشانی خەڵك دەدا، پێیان خۆش بوو خەڵك بیبیان بینن. تەنانەت ئەبوجەهل کە پێیان گوت: ئەوە کاروانە کە رزگاری بووەو ئێوەش بگەڕێنەوە، وتی: نەبەخوا ناگەڕێینەوە تا نەچینە سەر بیری بەدرو لەو سەرئاوە دەبێ بمێنینەوە، حوشتر سەر بڕین شەراب بخۆینەوە، ئافرەتی گۆرانی بێژ گۆرانیمان بۆ بڵێ، هەموو عەرەب بەسەیرانو مانەوەمان بزانن‌و بۆ هەتا هەتایە ئەم هەڵوێستەمان بەداستان بگێڕنەوە!

ئەی گرۆهی موسوڵمانان! ئێوە پابەندی ئەو فەرمانانەبن کە ئاراستەتان دەکرێ، واز لەو شتانە بێنن کە جڵەوگیریتان لێ دەکرێ، خۆتان بپارێزن لەلاسایی کردنەوەی موشریکە لوتبەرزەکان، نەچن وەکوو ئەوان لوتبەرزی بنوێنن، خۆتان بەسەر خەڵك دا رانوێنن، چونکە ئەوان ئەو لوتبەرزیو تەکەبورەیان لێ بوو بەزەلیلیو ژێر دەستەیی‌و ریسوایی، لەجیاتی پیاڵە شەرابو مەی پیاڵەی مەرگیان چەشتو کەوتنە نێو عەزابی دۆزەخەوە بۆ هەتا هەتایە..

ئەوانە بەو لەشکرکێشی‌و دەرچوونەیان بۆ بەدر مەبەستیان ئەوە بوو خەڵك لەئایینی خودا هەڵگێڕنەوە، نەهێڵن ئادەمیزادان موسوڵمان بن، کۆسپو تەگەرە بخەنە نێوان ئادەمیزادان‌و بانگەوازی بۆ رێبازی خودا. ﴿وَاللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ پەروەردگار زاناو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێك دا، دەزانێ ئەوانە بۆچی لەشکریان کۆکردۆتەوەو بۆچی هاتوون بۆ بەدر. بەخراپترین سزا تۆڵەیان لێ دەستێنێتەوە لەدونیاو قیامەت دا. لەدونیا دا بەدیلی‌و کوشتن‌و ریسوا بوون، لەقیامەتیش دا بەئاگری دۆزەخ.

## دەست بالاکردنی شەیتان لەکافرەکان لەکاتی تین بۆ هاتن دا

﴿ وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّى جَارٌ لَّكُمْ ۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّىٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ ۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤٨﴾ إِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَـٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمْ ۗ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٩﴾ ﴾

ئەم ئایەتەش بڕێ دیمەنی تری جەنگی بەدر رادەنوێنیو هەڵوێستی شەیتانو دووڕووەکان دەخاتە روو.

دەربارەی هۆکاری هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٤٨) ﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ﴾ ریوایەت کراوە کە شەیتان ئەو رۆژە لەشێوەو روخساری سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشوم دا کە لەخێڵی بەنی بەکری کوڕی کەنانە بوو، هاتووە بۆ جەنگی بەدر، قورەیشییەکان لەبەنی بەکر دەترسان کە لەپشتەوە پەلاماریان بدەن، چونکە دوژمنایەتییان لەگەڵیان دا هەبوو، لەوەپێش قورەیش پیاوێکیان لێ کوشتبوون، ئیتر لێرە دا پەروەردگار باسی ئەوە دەکا کە شەیتان چی بەکافرەکان گوتووە.

ئیمامی ضەحاك دەڵێ: شەیتان ڕۆژی بەدر بەسوپاو ئاڵاوە هاتە یارمەتی کافرەکانو ئەوەی خستە دڵیانەوە کە ئەوان ناشکێن، ئەوان لەپێناو پاراستنی ئایینی باوکو باپیری خۆیان دا دەجەنگن.

بەیهەقیو هی تریش لەئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە: فەرموویەتی: ڕۆژی بەدر پەروەردگار کۆمەگی بەپێغەمبەرو موسوڵمانان کرد بەهەزار فریشتە، حەزرەتی جوبرائیل بەپێنج سەد فریشتەوە لەلایەکی سوپاوە، حەزرەتی میکائیل بەپێنج سەد فریشتەوە لەلایەکی تری سوپاوە بوون. شەیتان بەخۆیو لەشکرێکی شەیاتینی یەوە هاتە پێشەوە ئاڵایەکی لەگەڵ دا بوو لەشکرەکەی لەشێوەی پیاوەکانی بەنی مودلیج دا بوون، شەیتانیش بۆ خۆی لەشێوەی سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشم دا بوو، بەکافرەکانی گوت: (لا غالب لكم اليوم من الناس، واني جارلكم) کە هەردو لەشکری موسوڵمانانو لەشکری بێدینان بەرامبەر یەکتر وەستان ئەبو جەهل وتی: خودایە! کام لایەمان لەسەر حەقین یارمەتی بدە، پێغەمبەریش ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە فەرمووی: پەروەردگارا! ئەگەر ئەم کۆمەڵە موسوڵمانە بفەوتێنی ئیتر لەسەر زەوی دا کەس عیبادەتت بۆ ناکا!! جوبرائیل عەرزی کرد، چنگێك خشتو خۆڵ هەڵبگرە تێیان بگرە، پێغەمبەر ﷺ چنگێکی خشتو خۆڵ هەڵگرتو تێی گرتن، موشریکێك نەبوو کە شتێکی لەو خشتو خۆڵە وێ نەکەوێ، هەریەکەیان شتێکی لەو خشتو خۆڵە چووە چاویان یان لوتیان یان دەمیانەوە. پاشەو پاش هەڵهاتن. حەزرەتی جوبرائیل ڕووی لەشەیتان کرد، کە شەیتان چاوی پێ کەوت لەو کاتە دا دەستی لەناو دەستی کابرایەکی موشریك دا بوو -دەڵێن: دەستی لەناو دەستی (حارث)ی کوڕی هیشام دا بوو- خێرا خۆی ڕاپسکاندو خۆیو لەشکری هەڵاتن، کابرای موشریك پێی گوت: ئەی سوراقە! ئەتۆ نەتگوت: من یارمەتدەرو هاوسێتانم؟ بۆ وا هەڵدێی؟! شەیتان وتی: (اني بريئ منكم، اني أرى مالا ترون)

ئیمامی مالیك لە(موطأ) دا لەطەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵای کوڕی کوڕمیزەوە، ڕیوایەت دەکا، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مارئي الشيطان نفسه يوماً هو فيه

أصغر ولا أحقر ولا أدحر ولا أغيظ منه في يوم عرفة، وما ذاك الا لـما راى يوم بـدر يـا رسول الله؟ قال: أما انه رأى جبريل يزع الملائكة).

قەتادە دەڵێ:شەیتان کە جوبرائیلی بینی لەگەڵ فریشتە دەهاتنە خوارێ، زانی کە دەرەقەتی فریشتە نایە وتی: ﴿إِنِّي أَرَى مَا لا تَرَوْنَ إِنِّي أَخَافُ.....﴾ سوێند بەخودا ئەو دوژمنە نەفرین لێکراوە درۆی کرد، ئەو لەخودا نەترسا، بەڵکو لێی روون بوو کە دەرەقەت نایەو بەرامبەریی پێ ناکرێ، ئەمە دابو نەرێتی شەیتانی نەفرین لێکراوە لەگەڵ هەر کەسێك دا پابەندی فەرمانەکانی بێ، هەتا کە حەقو بەتاڵ روو بەڕوو بوونەوەو بەیەکگەیشتن، شەڕو جەنگەکەی بەئەوان سپاردو بۆخۆی لێیان جیا بوەوەو یەخەی خۆی لێ داڕنین.

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: ئێمە لەم جۆرە شوێنانە دا بەبێ دەقێکی قورئانی یان فەرموودەیەکی صەحیحی موتەواتەری پێغەمبەر ﷺ ناچینە ناو تەفاصیلی ئەم جۆرە غەیبیاتانەوە، ئەمانە کاروباری تایبەت بەبیرو باوەڕن، بەدەقێکی ئا لەو جۆرە نەبێ وەرناگیرێ بەڵام لەهەمان کات دا هەڵوێستی ئینکار ئامێز وەرناگرینو رەتیان ناکەینەوە لەم روداوەدا دەقێکی قورئانی هەیە ئەوە دەچەسپێنێ کە شەیتان کردەوەی موشریکەکانی لەپێش چاویان جوان کردو هەڵی نان کە بچنە دەرێ بۆ جەنگی بەدرو یارمەتیدانی خۆی بۆیان راگەیاندو وتی: من پشتیوانو یارمەتدەرتانم؛ بەڵام کە لەشکری حەقو بەتاڵ بەرامبەر بەیەك بوونو رووبەڕوو بوونەوە، پاشەو پاش کشایەوەو لێیان پاشگەز بووەوە وتی: من شتێك دەبینم ئێوە نایبینن من لەخودا دەترسمو ناتوانم لەگەڵتان بمێنمەوە، خودا تۆڵەو سزای بەئێشو سامناکەو من دەرەقەتی نایەم. ئیتر موشریکەکانی ریسوا کردو وازی لێ هێنان ئەوانی تووشی ئەو سەرەنجامە سامناکە کردو پابەندی بەڵێنی خۆی نەبوو. وەلێ نازانین شەیتان چۆنو بەچ شێوەیەك کردەوەی کافرەکانی لەپێش چاویان جوان کردو هەڵی نان بۆ ئامادە بوون بۆ جەنگ، دەقە قورئانەیەکە، روداوەکە دەچەسپێنێ، بەڵام چۆنیەتەکەی دیاری ناکا. شەیتانو کردەوەکانی هەموو لەچوار چێوەی جیهانی غەیب دانو بەبێ دەقێکی چەسپاو پەیییان پێ نابرێ!!

دەی ئەوەتا دەقەکە ڕووداوەکە دەچەسپێنێ چۆنیەتەکەی دەست نیشان ناکا..

بۆیە ئێمە مەنهەج و تەفسیرو بیرو بۆچوونی قوتابخانەی شێخ موحەممەد عەبدە لەم جۆرە شوێنانە دا پەسند ناکەین؛ کە هەوڵ دەدەن هەموو کارێکی غەیبی لەم بابەتە بەشێوەیەك ئاراستە بکەن کە جمو جۆڵی هەست پێ کراو لەم جۆرە عالەمە نهێنی یانەدا نەبێ، ئەوەتا لەژێر ڕۆشنایی ئەم قوتابخانە دا کردەوەی فریشتەکان وا ئاراستە دەکەن کە بریتییە لەجۆرە پەیوەندییەك بەگیانی موسوڵمانانەوەو بەس، هەر وەکوو چۆن لەشوێنێکی تردا ئەوەیان گەیاند کە فریشتە ڕۆژی جەنگی بەدر شەڕیان نەکردوە، هەرچەندە ئایەتی ﴿فَاضْرِبُواْ فَوْقَ الأَعْنَاقِ وَاضْرِبُواْ مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ﴾ هەیە!!

هەروەها لەئایەتی ﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ...﴾ش دا کردەوەی شەیتان وا تەفسیر دەکەن کە بریتی بووە لەجۆرە پەیوەندییەکی شەیتان بەگیانی موشریکەکانەوە. هەوەکوو چۆن تەفسیری ﴿طيرا أبابيل﴾یشیان بەمیکرۆبی ئاوڵە لێك داوەتەوە ئەمانە هەموو موبالەغەو زێدە ڕەوییە لەئاستی ئەو دەقە قورئانییانەی پەیوەندییان بەکاروباری نهێنییەوە هەیە؛ لەکاتێك دا پێویست بەم جۆرە تەئویلو ئاراستە کردنە ناکا، چونکە هیچ مانیعێکی نیە کە دەقەکە لەسەر مانای خۆی تەفسیر بکرێتەوە، ئەوەی لەسەر ئێمە پێویستە ئەوەیە: بەبێ هەبوونی دەقێکی چەسپێنەرو صەریح نەچینە نێو تەفاصیلەوە. لەسنووری دەقەکە دەرنەچین.

﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ وَقَالَ لا غَالِبَ لَكُمُ الْيَوْمَ مِنَ النَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەوە وەبیر هاوەڵانت بێنەوەو یادی بکەرەوە کە شەیتان بەهۆی دنەدەنەو ختوکەوە هەڵوێستو کردەوەی موشریکەکانی لەپێش چاویان جوان کردو لەدڵیان دا شیرینی کردن. وای خستە زەینو دڵیانەوە کە ئەوان بەهۆی زۆری و ژمارەیانو هەبوونی پێداویستی جەنگیان، هیچ کاتێ تێ ناشکێنو ژێر ناکەون، کەس ناتوانێ بەسەریان دا زاڵ ببێ، شوێنکەوتوانی ڕێبازی شەیتانو شەیتانو فەرمانبەردارانی، داکۆکیان لێ دەکەنو یارمەتییان دەدەن، ئەو ترسەی

هەیانبوو لەدوژمنی سەرسەختی خۆیان: کە خێڵی بەنی بەکر بوو ڕەواندیەوەو وتی: من پەنادەرو یارمەتدەرتانم، ناهێڵم خێڵی بەنی بەکری بەنی کەنانە لەپاشەوەڕا خەنجەرتان لێ بوەشێنن‌و فرسەتتان لێ بێنن، ئەوەبوو، شەیتانی نەفرین لێکراو خۆی بردە سەر شێوەو ڕوخساری سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشوم کە سەرۆک‌و ریش سپی خێڵی بەرەبابی مودلیج بوو. کە دەڵێ: ﴿وَإِنِّي جَارٌ لَكُمْ﴾ واتە من داکۆکیکەرم لێتان، دەتانپارێزم، ناهێڵم تووشی زیان‌و دەردیسەری ببن ئابەو جۆرە زۆر وادەی قەشەنگ‌و ڕازاوەی پێدان‌و هەڵیخەڵەتاندن! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەربارەی شەیتان دەفەرموێ: ﴿يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلاَّ غُرُوراً﴾ (النساء: ١٢٠). هەموو کارێکی شەیتان هەڵخەڵەتاندن‌و لەخشتە بردن‌و بەتەماکردن‌و ڕیسوا کردنە. پیاو ئەو پیاوەیە خۆنەخاتە داوی ئەو نەفرین لێکراوە، نەچێ وەکوو موشریکەکانی مەککە شوێنی بکەون‌و دوایی تووشی هەڵدێرو ملشکاندن بن!

بەڵێ کافرەکانی هەڵخەڵەتان‌و بەرەو جەنگی بەدر کێشی کردن‌و هێنانیە گۆڕەپانی جەنگەوە ﴿فَلَمَّا تَرَاءَتِ الْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَى عَقِبَيْهِ﴾ کاتێك هەردوو سوپا لێك ئاشکرا بوون‌و بەرامبەر یەك ڕاوەستان شەیتان -کە لەشێوەی سوراقەی کوڕی مالیك دا بوو- پاشەو پاش کشایەوەو قوچاندی‌و هەڵاتو ﴿وَقَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكُمْ﴾ وتی: من لەئێوە بەریەو لەپێری ئێوە نیەو هاوکارو هاوپەیمان‌و یارمەتیدەرتان نیم. ئیتر وازی لەهەڵخەڵەتاندن‌و لەخشتە بردنیان هێناو خۆی کێشایە دواوە. واتە: فێڵ‌و تەڵەکەبازییەکەی پووچەڵ بووەوە، کاتێك بینی فریشتە دابەزین‌و بینی فریشتە یارمەتی موسوڵمانان دەدەن لەسەرکەوتنی سوپای کوفر نائومێد بوو، وتی: ﴿إِنِّي أَرَى مَا لا تَرَوْنَ﴾ من شتێك دەبینم ئێوە نایبینن ﴿إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ﴾ من لەخودا دەترسم. پەروەردگار سزاو تۆڵەی توندو بەئێشە بۆ تاوانباران لەدونیاو قیامەت دا...

ترسی شەیتان لەوە بوو کە فریشتە سەربازەکانی بسووتێنن، نەك ترسی لەوە بێ کە موشریکەکان تیا بچن، چونکە فریشتەو شەیاتینی دوو شتی دژ بەیەکن

پێکەوە کۆنابنەوە، ئەگەر بەیەك بگەیشتنایە لایەنی بەهێز کە فریشتەکانن لایەنی زەبوونو بەتاڵ کە شەیاتینییەکانن تێدا دەچوونو دەفەوتان!

ئا بەو شێوە سەربازەکانی شەیتان لەسەرەتاوە لەگەڵ موشریکەکان بوون، دەنەـ دەنەو ختوکەیان دەدانو هەڵیان دەخەڵەتاندن. فریشتەکان لەگەڵ موسوڵمانان بوون، دڵیان قایم دەکردنو پشتگیرییان پێ رادەگەیاندنو وادەی یارمەتیو کۆمەکی خودایان پێ دەدان.. رستەی ﴿وَاللَّهُ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ وێ دەچێ لەوتەی شەیتان بێ، وێ دەچێ ئاخاوتنەکەی بەرستەی ﴿إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ﴾ کۆتایی بێو رستەی دوایی وتەی خودا بێ.

هۆی ئەوەی کە شەیتان چووەتە شێوەو روخساری سوراقەوە، بۆ دەرخستنی موعجیزەیەکی گەورە بۆ پێغەمبەر ﷺ چونکە کافرە قورەیشییەکان کە گەڕانەوە بۆ مەککە وتیان: سوراقە سوپای ئێمەی شکاند، ئەم هەواڵە بەسوراقە گەییشتەوە، وتی: بەخودا من ئاگاداری چوونیشتان نەبووم، کاتێکم زانیوە ئێوە چوون بۆ شەڕ کە هەواڵی تێشکانتانم بیستووە، ئیتر ئەو کاتە خەڵکەکە بۆیان ئاشکرا بوو: کە ئەو کابرایە سوراقە نەبوەو، شەیتان بووە.

ئەمجار.. لەوکاتەدا شەیتان موشریکەکانی هەڵدەخەڵەتاندن؛ ئەوانەی بەلوتبەرزیو لەخۆبایی بوونەوە چووبوونە دەرەوە، ئەوانەی خەڵکیان لەئایینی خودا لا دەداو هەڵیان دەنان بۆ چون بۆ شەڕو پاشان کەوتنە چاڵی ریسواییەوە..

ئالەو کاتە دا دووڕووەکانو ئەوانەی دڵیان زەعیفو لاواز بوو وایان گومان دەبرد کە ئەو کۆمەڵە موسوڵمانە ناتوانن بەرەنگاری لەشکری تەیاری قورەیش ببنەوە، ئەوان لەچاوی خۆیانەوە سەیری موسوڵمانانیان دەکردو تەماشای دیاردە مادییە روکەشەکانیان دەکردو پێیان وا بوو: کەمیو بێ تفاقی موسوڵمانەکان هۆکاری سەد دەرسەدە بۆ لەناوچوونیانو بۆخۆیان بەدەستی خۆیان خۆیان هاویشتۆتە چاڵی نەمانەوە!! بۆیە پەروەردگار دوا بەدوای رونکردنەوەی هەڵوێستو کردەوەی شەیتان باسی هەڵوێستی دووڕووەکان دەکا دەفەرموێ: ﴿إِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ غَرَّ هَؤُلَاءِ دِينُهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەوە بێنەوە یادی خۆتو

بۆ موسوڵمانانی بگێڕەوە: کاتێك دووڕووەکانو دڵ نەخۆشەکانو ئیمان سستو بڕوا لەرزۆکەکان. کەکەمی موسوڵمانانو زۆری کافرەکانیان بینی، وتیان: وا دیارە ئەو موسوڵمانانە بەئایینەکەیان هەڵخەڵەتاونو بەئایینەکەیان لەخۆبایی بوون، وا دەزانن ئەوان لەبەر خاتری ئایینەکەیان یارمەتی دەدرێن. بۆیە ئەوانە بەسێ سەدو چەند کەسێکەوە هاتوونە بەرەنگاری نزیکەی هەزار کەسی پڕ چەکو تەیاری قورەیش!!

بەڵێ ئەمە راستە لەتەرازووی هێزو سەربازی دا، بەڵام لەتەرازووی پەروەردگار دا راست دەرناچێو پشتی پێ نابەسترێ، ئەوەی گرنگو حیساب بۆ کراوە ئیمانی قایمو یارمەتیدانی پەروەردگارە وەکوو دەفەرموێ: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ (البقرة:٢٤٩) بۆیە لەکۆتایی ئایەتەکە دا فەرمووی: ﴿وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ کەسێك پشت بەخودا ببەستێو کاری خۆی حەواڵەی دەسەڵاتو توانای بێ سنووری ئەو بکا، ئەوە خودای بەسەو پێویستی بەکەسی تر نیە، ئەو یارمەتدەرو کۆمەگیکاریەتیو سەری دەخا، پەروەردگارو باڵا دەستو خاوەن هێزو توانایەو کەس بەسەری دا زاڵ نابێ، داناو لێزانە لەکارو کردەوەی دا، زاناو ئاگادارە بەدروستکراوانی خۆی هەرکەسێکی بۆێ یارمەتی دەدا، بەتایبەتی کە پەروەردگار دابو سوننەتی وەهایە حەق بەسەر بەتاڵ دا سەربخاو کۆمەڵی کەمی خاوەن باوەڕ بەسەر کۆمەڵی زۆری بێ باوەڕدا زاڵ بکا.

**تێبینی:**

﴿الْمُنَافِقُونَ﴾: ئەوانەن بەدەم بڕوایان هێناوە بەڵام لەدڵ دا کافرن، ﴿وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ﴾: ئەوانەن کەشکو گومانیان هەبیو بەئەندازەی دووڕووەکان کافر نەبن، بەڵکو بەهۆی ئەوەی تازە موسوڵمان بوون ئیمانیان پتەو نەبووەو لاوازیو زەبوونیەك لەدڵیان دا ماوە، لەناوی قوڕاو دا راو دەکەنو چاوەڕوانی هەلو فرسەتن کێ سەربکەوێ ئەوان یاری ئەو دەبن، گومانیان لەهێزو دەسەڵاتی موسوڵمان دا هەبووە.

## بەهیلاکبردنی کافرەکان

## وەکوو بەهیلاکبردنی فیرعەون لەبەر خراپەکارییان

﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ
يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٥٠﴾
ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ
﴿٥١﴾ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ
ٱللَّهِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٥٢﴾
ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا
بِأَنفُسِهِمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٣﴾ كَدَأْبِ ءَالِ
فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ فَأَهْلَكْنَٰهُم
بِذُنُوبِهِمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَكُلٌّ كَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار حاڵو چۆنیەتی موشریکەکانی روون کردەوە، کە چوونە دەرەوە بۆ شەڕکردن دژی موسوڵمانان بەشێوەیەکی لەخۆبایی بوونو لوتبەرزی، شەیتان کردەوەکانی لەپێش چاوان جوان کردنو هەڵینان، ئەوەشی روون کردەوە کە موونافیقەکان هەوڵیان دەدا موسوڵمانەکان زێوان بکەنەوە لەتێکۆشانو جیهاد ساردیان بکەنەوە. ئەمجار لێرە دا حاڵو چۆنیەتی مردنو لەدونیا دەرچوونی کافرو دووڕووەکانو ئەو ئازارو سزایەی لەکاتی مردن دا تووشیان دێ

شی دەکاتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿وَلَـوْ تَـرَى إِذْ يَتَـوَفَّى الَّـذِينَ كَفَـرُوا الْمَلائِكَـةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست ئەگەر تۆ ئەو حـاڵو چـۆنیەتەی کافرەکـان ببینـی کـە فریـشتەی تایبـەت بەگیانکێشان دەکێـشێ، شـتێکی گـەورەو سامناکت دەبینیو لەوانە نیە بتوانرێ باس بکرێ، ئادەمیزاد لەئاستی باسکردنی دا زمانو قەڵەم کۆڵو کولن، ئەو فریـشتانە بەقامچیو مقاشـی ئاسـنین لـەدەمو چـاوو پـشتیان دەدەنو تێیـان دەسـرەوێننو بـەزەبرو زەنـگ گیانیـان لەجەسـتەکانیان دەردەهێننو پێیان دەڵێن: ﴿وَذُوقُوا عَـذَابَ الْحَرِيـقِ﴾ بـڕۆنو بـچێژن سـزاو ئـازاری ئـاگری دۆزەخ لەقیامـەت دا، ئەمـە هەڕەشـەو ترسـاندنی پـێش وەختیانـە بـەو سـزا سامناکە کە لەرۆژی قیامەت دا دەخرێنە ناویو بۆیان ئامادە کراوەو چاوەڕوانیانە.

﴿ذَلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْـدِيكُمْ﴾ ئـەو عـەزابو سـزایەی تووشـتان دێ، ئـەو لێـدانو سزادانەی کاتی گیانکێشانتان بەهۆی ئەو کردەوانەتانـە کـە کردوتـانن، سـەرەنجامی خراپەکاری خۆتانە، تۆڵەی کوفرو ستەمکاری ژیـانی دونیاتانـە، بەدەسـتی خۆتـان خۆتان خستۆتە ناو ئەو ئاگرە سوتمانەوە. ﴿وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ﴾ پەروەردگار ئـــەو ســـزایەتان دەداو تۆڵـــەتان لێ دەســـتێنێ لـــەرووی دادپەروەرییـــەوە نـــەك بەستەمکاری، چونکە پەروەردگار ستەم لەهیچ بەندەیەکی خۆی ناکـا، بـەڵکوو ئـەو حـاکمێکی دادوەری وەهایـە کـە هـەرگیز سـتەم ناکـا! رۆژی قیامـەت تـەرازووی عەداڵەتکاری دەدەنیو هـەموو خـاوەن مافێك مـافی خـۆی دەدرێتـێ هـیچ کەسـێك بەهیچ جۆرێ ستەمی لێ ناکرێ.

لەفـەرموودەی قودسـی دا کـە ئیمـامی موسـلیم لەئـەبو زەڕەوە ریوایـەت دەکا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویـەتی: (ان الله تعالى يقول: يا عبادى! انى حرمـت الظلـم على نفسي وجعلته بينكم محرماً فلا تظالموا، ياعيادي انما هي أعمالكم أحصيها لكم، فمن وجد خيراً فليحمـد الله، ومـن وجـد غـير ذالـك فـلا يلـومنّ الا نفـسه). پـەروەردگار دەفـەرموێ: ئـەی بەنـدەکانم! ئـەمن سـتەمم لەسـەر خـۆم قەدەغـە کـردوە، لـەناو ئێـوەش دا بەیاسـاغم دانـاوە، ئێـوە لـەناو خۆتـان دا سـتەم لەیـەکتر مەکـەن. ئـەی بەندەکانم! ئەوە کردەوەکانتانن بۆتان دەنووسین، جا کەسێك خێـری دەسـکەوت بـا

سوپاسی خودا بکا، کەسێك خێرو چاکەی لەدەست نەهات ئەوە با سەرزەنشتی خودی خۆی بکا.

ئەمجار پەروەردگار بەرامبەری‌و پێك گرتنێك ئەنجام دەداو نمونەو وێنەیەك بۆ عەزابی موشریکەکان دێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿كَدَأْبِ آلِ فِرْعَوْنَ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ﴾ واتە: پەروەردگار ئاوای بەو کافرە موشریکانە کرد کە پێغەمبەری ئیسلامیان بەدرۆ خستەوەو بڕوایان پێ نەکرد، وەکوو چۆن لەوە پێش ئاوا گەلە پێشینەکانی لەسەر هەمان هەڵوێستو کردار لەناو برد، کردارو رەفتاری ئەم قورەیشییە موشریکانە وەکوو کردارو رەفتاری گەلی فیرعەونو گەلە ستەمکارەکانی پێشوو وەهایە. لەبەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەری خوداو سەررەقی‌و دڵ رەقییان لەئاستی پەیامی پەروەردگار، بۆیە ئەم کافرە قورەیشییانە بەکوشتنو بەدیل گرتنو ریسوا بوون سزایان درایەوە، وەکوو چۆن فیرعەونو گەلەکەی بەخنکاندن لەناوبران. ئەم موشریکانە ئایاتی خودایان رەتکردەوەو بڕوایان پێ نەکرد، ئیتر خودا بەهۆی تاوانو ستەمکارییانەوە بەهیلاکی بردنو بەهێزو تواناو دەسەڵات گرتنی‌و لەناو بردنو بەرەو دۆزەخ رەوانەکران. دابو نەرێتی خودا ناگۆڕی‌و بۆ هەموو موشریکو بێ بڕوایەك یەکسانە سزاو تۆڵەش لەسەر کردەوەو رەفتارە.

﴿إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ بێگومان پەروەردگار بەهێزو تواناو دەسەڵاتە، کەس ناتوانێ بەسەری دا زاڵ ببێ، کەس لەدەستی دەرناچێ، سزاو تۆڵەی بەئێشە بۆ کەسانێك شیاوی سزابنو ئایەتەکانی بەدرۆ بخەنەوە، بۆ هەموو شتێك ماوەو ئەندازەی داناوە، لەگەڵ وەختی هات بەسەریەوە ناچێ!

بوخاری‌و موسلیمو ئیبنو ماجە لەئەبو موسای ئەشعەرییەوە ریوایەت دەکا: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان الله ليملى للظالم حتى اذا أخذه لم يفلته) پەروەردگار مۆڵەتی ستەمکارەکان دەدا تا ماوەیەك ستەمکاری خۆی دەکا، هەتا کە گرتی ئیتر رزگاری نابێ لەدەستی. پەروەردگار هەرچەندە بەصەبرە بەڵام سزاو تۆڵەی زۆر بەزەبرە.

ئەمجار پـەروەردگار خەبـەر لەعەدالـەتکاری خـۆی دەداو باسـی دادپـەروەری‌و بڕیار دروستی خۆی دەکا لـەوەدا کـە نـازو نیعمـەتو ڕێـزو شـکۆمەندی بـدا بەهـەر کەسێك لێی ناسێنێتەوە تا ئەو کەسە بۆخۆی تاوانێك نەکا کە شیاوی ئەو نیعمـەت لێ ستاندنەوە بێ. دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّراً نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَى قَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ ئـەو سزاو تۆڵەیـەی کـە لـەئاکامی خراپەکاری کافرەکان پەیـدا بـوو، فەوتانـدنی کـافرە قورەیـشییەکان بـەهۆی کـوفرانی نیعمـەتی خـوداو بـەدرۆ خـستنەوەی پێغەمبـەر ﷺ هـەموو ئەمانـە لەچـوار چـێوەی ئـەو دابـو نـەرێتو سوننەتە خوداییـە دان کـە حیکمـەتو دانـایی زاتـی خـۆی داخـوازی دەکـاو هـەرگیز گۆڕانی بەسەر دا نایە، ئەویش بریتییە لەو یاسا نەگۆڕەی خۆی کە نـازو نیعمـەتی خـۆی لەسـەر هـیچ گـەلو نەتەوەیـەك هەڵنـەگرێ هـەتا ئـەو گـەلو نەتـەوە حـاڵو وەزعی خۆیان نەگۆڕن، بەم جۆرە کوفرانی نیعمەتەکانی بکەنو لەخۆیان بایی بنو شیاوی ئەوەبن خـودا وەزعیـان لێ بـشێوێنی‌و نـازو نیعمـەتیان لێ بگرێتـەوە. وەکوو ئـەوە پـەروەردگار نیعمـەتی بەسـەر قورەیـشییەکان دا رشـت، لەنەتـەوەو رەگـەزی خۆیـان پێغەمبـەری بـۆ نـاردن، بـەزمانی خۆیـان ئایـاتی خـودای بـۆ دەخوێندنـەوە، کەچـی ئـەوان بـەدرۆیان خـستەوە، لەمەککـە دەریـان کـردو لـەدژی جـەنگان، پەروەردگاریش بەو دەردەی بـردن! ئـەوەی پـێ کـردن کە پێـی کـردن! وێنـەی ئـەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ وَإِذَا أَرَادَ اللّهُ بِقَوْمٍ سُوءاً فَلاَ مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَالٍ﴾ (الرعد: ١١).

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە نـازو نیعمـەتی خـودا بـۆ گـەلو بـۆ تـاك پابەندە بەهەبوونی ئەخلاقو رەوشتـو کردەوەیەك کە پەسـندی لای پـەروەردگارە، هەتا ئەو رەوشتـو کردەوانە بەردەوام بـنو ئـەنجامیان بـدەن، ئـەو نـازو نیعمەتانـە پایـەدار دەبـن! پـەروەردگار ئـەو نـاز نیعمەتانـەیان لێ ناگرێتـەوە بـەبێ ئـەوەی ستەمکاری بکەنو خراپەیان لێ روبدا. هەرکاتێ ئادەمیزادەکان حاڵو وەزعی خۆیان گۆڕی‌و بیرو باوەڕو رەوشتی خۆیان تێك دا، ئـەرکی سەرشـانی خۆیـان ئـەنجام نـەدا، خـوداش نـازو نیعمـەتیان لێ دەگرێتـەوە، دەوڵەمەنـدیان هـەژار دەبـێ، بـەرێزو شکومەندییان بێ قەدرو لاواز دەبێ.

ئاشکراشە خۆشبەختیو کامەرانی گەلان، هێزو تواناو دەسەڵاتیان پابەند نیە بەدەوڵەمەندیو زۆری خزمو کەسو کار، وەکوو کافرەکان لافیان لێ دەداو پێیان وا بوو: زۆری ماڵو منداڵ لەسزای خودا دەیانپارێزێ! وەکوو پەروەردگار لێیان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَالاً وَأَوْلَاداً وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾ هەروەها پەروەردگار مەرایی بۆ هیچ گەلو نەتەوەیەك ناکا بەهۆی نەژادو رەگەزو رێزداری باوکو باپیرەوە. کەس بەمەلەی باکی ناپەڕێتەوە، وەکوو بەنو ئیسرائیلییەکان پێی لەخۆبایی بوبوونو دەیانگوت ئێمە نەوەی پێغەمبەرانینو خۆشەویستی خوداینو فەضلو رێزی ئێمە بەسەر هەموو گەلو نەتەوەکانی دیکەوە هەیەو پێغەمبەرایەتیو فەرمانڕەوایی هەر بۆ ئێمەیەو بۆ ئێمە پاوان کراوە!

جا کە سوننەتو دابو نەریتی پەروەردگار دەربارەی فیرعەونو گەلەکەیو نەتەوە ستەمکارەکانی پێشوو بەو شێوە بوو کە بەتاوانەکانیان گرتنیو لەناوی بردن، هەمان سوننەتو دابو نەرێتیشی بۆ کافرە قورەیشییەکان بەکار هێنا، لەجەنگی بەدردا یارمەتی پێغەمبەرو موسوڵمانانی داو زاڵی کردن بەسەر کافرەکان دا، زوربەی زۆری جەنگاوەرو پیاو ماقوڵو سەرانی قورەیشی بەهیلاك بردن!

﴿وَأَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ واتە: پەروەردگار شنەوایە بۆ ئاخاوتنی ئەوانەی پێغەمبەران بەدرۆ دەخەونەوەو گوێی لێیە چی دەڵێن. زاناو ئاگادارە بەوەی دەیکەن، سزاو پاداشیان لەسەر کردەوەکانیان دەداتەوە، چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە.

ئەمجار پەروەردگار کەلامی پێشوو جەخت دەکاتەوەو زیاتر روونی دەکاتەوەو جارێکی تر دەفەرموێ: ﴿كَدَأْبِ آلِ فِرْعَوْنَ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ فَأَهْلَكْنَاهُمْ بِذُنُوبِهِمْ وَأَغْرَقْنَا آلَ فِرْعَوْنَ وَكُلٌّ كَانُوا ظَالِمِينَ﴾ واتە: وەکوو چۆن دابو نەرێتی ئەو موشریکانە لەبارەی ئینکاریکردنی ئایاتی خوداو نازو نیعمەتەکانی دەشوبهێتە دابو نەرێتی نەتەوەی فیرعەونو گەلە ستەمکارە پێشینەکان. هەر بەو جۆرە دابو نەرێتیان لەبارەی بەردەوام بوون لەسەر بەدرۆ خستنەوەی

پێغەمبەرانو رەتکردنەوەی نیشانەی پێغەمبەرایەتییان دەشوبهێتە دابو نەریتی گەلی فیرعەونو ئەو نەتەوانەی پێش ئەوان، لێکچوونەکە لەنێوانیان دا لەدوو بوار دایە، یەکەم لەبواری کافربوونیان بەنیشانەکانی پەروەردگارو ئینکاریکردنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەران. دووەم لەبواری بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەرانو بەردەوام بونیان لەسەر ئەو هەڵوێستە ناپەسندەیان. هەریەکێ لەم گەلو نەتەوانە بەسزای خۆی گەیشت، پەروەردگار بەگوێرەی دابو سوننەتی خۆی هەریەکەیانی لەسەر تاوانی خۆی گرتو لەناوی بردن؛ بڕێکیان بەگرمەی هەورو هەورەتریشقە، هەندێکیان بەرەشەباو زریان، نەتەوەی فیرعەون بەخنکان لەناو دەریا دا......هتد، هەموویان ستەمکار بوونو ستەمیان لەخودی خۆیان کرد، کەوا بوو هەریەکەیان شیاوی ئەو سزاو تۆڵە بەزەبرە بوون کە تووشیان هات.

بەکورتی ئەوەی مێژوو لەلاپەڕەکانی دا تۆماری کردەوەو ئاماژەی بۆ دەکا دەربارەی دابو نەریتی گەلو نەتەوەکان لەروی کافربوونو بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەرانو ستەمکارییان لەسەر زەوی، ئەمجار سزاو تۆڵەی بەزەبری پەروەردگار بۆیان هەمووی بەگوێرەی سوننەتو نەخشەی خودایە لەبوونەوەردا، پەروەردگار ستەم لەکەس ناکا؛ بەم جۆرە بەبێ هۆ نیعمەتەکانی کە پێی بەخشیون لێیان وەربگرێتەوە، یان بەبێ هۆ تووشی ئاستەنگو ناخۆشییان بکا، بەڵکوو سزاو تۆڵەی بۆ ئەوانە ئاکامو سەرەنجامێکی سروشتیە بۆ کافر بوونو بەردەوام بوونیان لەسەر کوفرو بەدرۆ خستنەوەی فروستادەکانی پەروەردگارو ستەم کردنیان لەخودی خۆیان!!

واتە: ئەو بەدبەختو سزادراوانە دوو تاوانی گەورەیان ئەنجام داوە: کافر بوون بەهەبوونی خوداو تاکو تەنهایی زاتی پاکی، ئینکاریکردنی نازو نیعمەتەکانی.

کە لەکۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿وَكُلٌّ كَانُوا ظَالِمِينَ﴾ ئاماژەیە بەوە کە موشریکەکانی قورەیشو نەتەوەی فیرعەونو گەلەپێشینەکان هەموویان ستەمیان لەخودی خۆیان کردوە بەکافر بوونو تاوانکردن، هەروەها ستەمیان لەکەسانی دیکەش کردوە، خودا کە بەهیلاکی بردوون لەبەرستەمکارییانو تاوانیان لەناوی

بردوونو ئەو نازو نیعمەتەی پێی دابوون لێی ستاندنەوە، پەروەردگار کە بەو مەرەدەی بردن ستەمی لێ نەکردن، بەڵکوو بۆخۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد، کەوایان کرد خودا ئاوایان لێ بکا.

سزاو تۆڵەی پەروەردگار لە موشریکەکانی قورەیش بریتی بوو لەکوشتنو لێ ستاندنەوەی نازو نیعمەت، بەڵام سزاو تۆڵەی نەتەوەی فیرعەونو گەلەستەمکارەکانی پێشین بریتی بوو لەسزای ریشەکێشکەرو فەوتاندن: وەکوو خنکاندنی فیرعەونو نەتەوەکەی لەدەریا دا، ناردنی رەشەباو زریان بۆ سەر گەلی عاد، هەورەتریشقەو گرمەو ناڵەی لەئەندازە بەدەر بۆ سەر نەتەوەی ئەموود.

بێگومان هەموو ئەو کافرە ستەمکارانە شیاوی ئەو سزایە بوون کە تووشیان بوو. پەروەردگار نازو نیعمەتی خۆی بەسەر دا رشتبوون، رزقو رۆژی زۆرو زەبەندەی پێدابوون، لەسەر زەوی، ئەمەی بۆیە دابوونێ تا بەتاقییان بکاتەوە، دەری بخا ئاخۆ ئەوانە سوپاسگوزار دەبن یان کوفرانی نیعمەت دەکەن؟ بەڵام کافربوونو سوپاسی خودایان نەکرد، لەخۆیان بایی بوونو ملهوڕییان نواند، نازو نیعمەت ئەوانی گۆڕیو لەجیاتی خوداپەرستیو سوپاسگوزاری بوونە دەرمەبەگو ملهوڕو کەڵەنتەرو لەخودا یاخی بوو کافرو تاوانکار.... پێغەمبەران هاتنە سەریان، پەیامی خودایان بۆ هێنان بەڵام ئەوان پەیامی خودایان رەتکردەوە، پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستەوەو یاخی بوونو پشتیان هەڵکرد... ئیتر دابو نەرێتی خودایان بەسەر دا تەنفیذ کرا، یاسای پەروەردگاریان بەسەر دا ئەنجام درا، گیرانو لەناوبرانو وڵاتو خانوو باڵەخانەو گوندو شاروو تاخیان خاپوور کراو بوونە پەندو عیبرەتو خرانە زبڵدانی مێژووەوە.

بەڵی خودا لەناوی بردن پاش ئەوەی ئایاتی خودایان بەدرۆخستەوەو پەیامی پەیامبەرانیان رەتکردەوە، هەرچەندە ئەوانە پێش پێراگەیاندنو هاتنی پێغەمبەران بۆ ناویان کافر بوون بەڵام تا ئەوان پەیامی پێغەمبەرانیان بەدرۆ نەخستەوە خودا لەناوی نەبردن، چونکە ئەمە دابو سونەتو رەحمەتی خودایە تا پێغەمبەران نەنێریو بانگەوازی نەکەنو ئەو نەتەوە بانگ کراوە پێغەمبەرەکە بەدرۆ نەخەنەوە خودا سزایان نادا ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾.

مامۆستا سەیید لێرە دا دەفەرموێ: بەراستی ئەم جۆرە ئایەتانە دادپەروەری پەروەردگار نیشان دەدەن لەبارەی مامەڵە کردنی ئادەمیزاددا، لەوەدا کە ئەو نازو نیعمەتەی پێی داون لێیان ناسێنێتەوە تا ئەوان هەڵوێستی خۆیان نەگۆڕنو سلووکو حاڵی خۆیان ئاوەژوو نەکەنەوە؛؛؛ نازو نیعمەتیان لێ ناگرێتەوە هەتا کارێك نەکەن کە شیاوی ئەو لێ وەرگرتنەوە بن. هەرکاتێ ئەوان سوپاسگوزاری ئەو نیعمەتانە نەبوون کە خودا پێی بەخشیونو لەتاقیکردنەوەو ئەزموونەکە دەرنەچوون ئیتر پەروەردگار بارەکەیان لێ دەگۆڕێو وەزعەکەیان لێ دەشێوێنێ.!

لەلایەکی ترەوە ئەمە نیشانەی ئەوەیە: خودا رێزی ئادەمیزاد دەگرێو نرخی بۆ دادەنێ بە فەضلو گەورەیی خۆی وای کردووەو وا دەکا کە قەزاو قەدەری خۆی ئەنجام بداو جێبەجێی بکا لەرێگەی جمو جوڵی ئادەمیزاد دا ئاکامی ئەو گۆڕانە واقعییە بووە کە لەناو دڵی ئەوان دا سەری هەڵداوە، سزای ئەو مەبەستو سلووکو کردەوانەیە کە خۆیان بۆ خۆیان هەڵبژاردوە؛؛؛

لەسەرێکی ترەوە ئادەمیزاد ئەرکی بەرپرسیاریەتیەکی فرە مەزنی بەسەرەوەیە لەم روەوە کە دەتوانێ ئەو نازو نیعمەتە بەسەر خۆیەوە بێڵێو لێی زیاد بکا ئەگەر شوکرو سوپاسی لەسەر بکا، هەروەکوو چۆن دەتوانێ لەقەی لێ داو نازو نیعمەتەکە لابەرێ ئەگەر کوفرانی نیعمەت بکاو لەخۆی بایی بێو مەبەستو نیەتی بگۆڕێو رێگەی ژیانی کامەرانی هەڵە بکا.

ئەمە حەقیقەتێکی فرە مەزنەو لایەنێکی تەصەوورو تێڕوانینی ئیسلامی بۆ حەقیقەتی ئادەمیزاد دەست نیشان دەکا، پەیوەندی نەخشەو قەدەری پەروەردگار بەرامبەر ئادەمیزاد لەم بوونەوەرە داو، پەیوەندی پەروەردگار خۆی بەم بوونەوەرەوە دیاری دەکا.

لەم روەوە دەزاندرێ کە ئەم ئادەمیزادە لەتەرازووی خودادا چەند سەنگینە، چەند خاوەن پلەو رێزە، هەروەکوو ئەوە دەردەکەوێ کە ئادەمیزاد چەند کاریگەری گرنگی لەسەرنجامی خۆیو سەرەنجامی رووداوەکانی دەوروبەری دا هەیە، بۆمان دەردەکەوێ کە ئادەمیزاد لەبیرو بۆچوونی ئیسلامی دا لایەنێکی ئیجابییە

لەدیاریکردنو دەست نیشانکردنی سەرنجامی خۆی، بەلاّم بەئیزنو رەزامەندی خوداو بەگوێرەی قەدەری خودا کە لەچوار چێوەی جەو جوڵو کردەوەو نییەتو رەوشتی ئادەمیزادەکە دا جەرەیان دەکا. ئیتر ئادەمیزاد ئەو حاڵەتە سەلبییە زەلیلییەی لێ دوور دەکەوێتەوە کە رێبازە ماددییەکان بەسەری دا دەسەپێنن، ئەو رێبازە ماددیيانەی کە ئادەمیزاد وا تەصەور دەکەن کە لایەنێکی سەلبییە لەبەرامبەر (حەتمیە) کاریگەرەکان دا حەتمیەتی ئابوری، حەتمیەتی مێژوو، حەتمیەتی گۆڕانکاریو گەشەکردن... هەتا کۆتایی ئەو حەتمیەتە جۆراو جۆرانەی کە ئادەمیزاد بەرامبەریان هیچ تواناو دەسەلاّتێکی نیەو جگە لەگەردنکەچی موطلەق بۆ ئاکامی ئەو حەتمیەتانە هیچی تری لەباردا نیە.

## مامەڵە کردنی موسوڵمانان لەگەڵ وادە شکێنانو ئەوانەی دیاردەی پەیمانشکێنییان لێ دەردەکەوێ

﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ
﴿٥٥﴾ ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِي كُلِّ
مَرَّةٍ وَهُمْ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾ فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِي ٱلْحَرْبِ فَشَرِّدْ
بِهِم مَّنْ خَلْفَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِمَّا تَخَافَنَّ
مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَٱنۢبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ
ٱلْخَآئِنِينَ ﴿٥٨﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُوٓاْ إِنَّهُمْ لَا
يُعْجِزُونَ ﴿٥٩﴾﴾

لێرە بەولاوە ئەم بەشەی سورەتی ئەنفال زۆر یاسای چۆنیەتی مامەڵە کردنی موسوڵمانانی لەگەڵ هێزە جۆراو جۆرەکان دا لەکاتی ئاشتیو شەڕدا لەخۆ گرتووە. شێوەی ریکخستنە ناوخۆیەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامیو پەیوەندییان بەرێکخراوە دەرەکییەکانەوەو تێڕوانینی ئیسلام بۆ پەیمانو پەیوەندی بەستنەکان لەهەموو بارو دۆخێك داو هەروا تێڕوانینی بۆ پەیوەندی خوێنو رەگەزو خاکو پەیوەندی بیرو باوەڕ دیاری دەکا.

کۆمەڵێك ئەحکامو یاسا دادەنێ کە بڕێکیان ئەحکامی هەتا هەتایینو بڕێکیشیان ئەحکامی کاتینو بۆ ماوەیەك چارەسەری روداوەکان دەکەنو بۆ قۆناغێکی تایبەتیو حاڵو وەزعێکی تایبەتی هاتوونو دوایی لەسورەتی (التوبة)دا تەعدیلاتی تایبەتیان تێدا دەکریو دەبنە قاعیدەو یاسای هەمیشەییو کۆتایی.

**بڕێ لەو حوکمو یاسایانەی ئەم سورەتە باسیان لێوە دەکاو دەیانچەسپێنێ بەگوێرەی سیاقی ئایەتەکان ئەمانەن:**

١- ئەوانەی پەیمان لەگەڵ حکوومەتی ئیسلامی دەبەستنو پاشان پەیمانەکەیان دەشکێنن ئەوانە خراپترین پێڕۆی سەرزەوین... بۆیە پێویستە دەوڵەتی ئیسلامی تەمبێیان بکا بەشێوەیەك کە زەبروزەنگیان بەرامبەر بنوێنیو لەزێدوماڵو حاڵی خۆیان رایانقەنێنیو ئاوارەیان بکاو تاڵو سوێری دەربەدەرییان پێ بچێژێ، نەك هەر ئەمە بەڵکوو تەمبێ کردنەکەیان ئەوانەش بگرێتەوە کە نیازیان وایە پەیمانەکەیان هەڵوەشێننەوە یان هێرش بکەنە سەر حکوومەتی ئیسلام...

٢- ئەو کافرە پەیمان لەگەڵ بەستراوانەی کە سەرکردایەتی ئیسلامی ترسی ئەوەیان لێ دەکا لەوادەو بەڵێنی خۆیان پەشیمان ببنەوەو پەیمانەکەیان بشکێنن، ئەوە سەرکردایەتی ئیسلامی دەتوانێ پەیمانەکەیان بۆ رەت بکاتەوەو یەکلایەنە هەڵوەشاندنەوەکەی رابگەیەنیو خۆلەپابەند بوون پێیەوە رزگار بکا. ئەمجار دەتوانێ شەڕیان لەگەڵ بکاو تەمبێیان بکاو ترس بخاتە دڵی ئەوانەشەوە کە کۆمەکییان پێ دەکەنو پشتیان دەگرن!

ئایـەتی ژمـارە (٥٥) ﴿إِنَّ شَـرَّ الـدَّوَابِّ﴾ ئیبنـو عـەبباس دەفـەرموێ: ئەوانـە بەنوقورەیظە بوون، پەیمانی خۆیان شکاندو بەچەكو پێداویستی جەنگ، یارمەتی دوژمنـەکانی پێغەمبـەریان دا، دوایـی وتیـان: لـەبیرمان چـوبوەوەو هەڵـەمان کـرد. جارێکی تـر پـەیمانیان لەگـەڵ بەستەوەو هـەڵیان وەشاندەوە؛ ڕۆژی خەنـدەق دژی پێغەمبەر ﷺ پاڵیان بەکافرەکانەوە دا، کـەعبی کـوڕی ئەشـرەف کـە سـەرۆکیان بـوو چوبوو بۆ مەککە لـەوێ لـەدژی پێغەمبـەرو بـۆ شـەڕ کـردن لەگـەڵی بوبـوە سـوێند خۆری قورەیشییەکان.

ئایەتی ژمـارە (٥٨) ﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ﴾ ئـەبو شـشەیخ؛ ئیبنـو حـەییانی ئەنـصاری لەئیبنو شیهابی زوهرییەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: حەزرەتی جوبرائیل هاتە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی:............ بـڕۆ سـەر بـەنو قـورەیظـە، خـودا ڕێگـەی داوی تەمبێیان بکەی. سەعیدی کوڕی جوبەیر دەفەرموێ: ئەم ئایەتانە دەربارەی شـەش تاقمی جولەکە هاتوونە خوارێ کە ئیبنو تابووت یەکێکە لەوان.

موجاهیـد دەفـەرموێ: دەربـارەی جولەکـەی مەدینـە هاتوونـە خـوارێ. سەرۆکەکەیان کەعبی کوڕی ئەشرەف ملهوڕێك وەکوو ئەبو جەهل.

ئـەمجار پـاش ئـەوەی لەئایەتـەکانی پێـشوودا پـەروەردگار وەصـفی هـەموو کافرەکانی بەستەمکار کـردو فـەرمووی: ﴿وَكُـلٌّ كَـانُوا ظَـالِمِينَ﴾ بڕێکیـانی بەزێـدە کـوفرو سـەررەق دەسـت نیـشانکرد. ئـەمجار پـاش ئـەوەی کـە پـەروەردگار حـاڵو چـۆنیەتی قورەیـشییە موشـریکەکانی ڕونکـردەوە لـەبارەی شـەڕکردنیان دژی پێغەمبەر ﷺ لەجەنگی بەدردا، باسی حاڵو چۆنیەتی کۆمـەڵێکی تـر دەکا کـە دژی پێغەمبەر ﷺ شەڕیان کرد ئەوانیش جولەکەکانی وڵاتی حیجازنو دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِنْدَ اللَّهِ الَّذِينَ كَفَرُوا فَهُمْ لا يُؤْمِنُونَ﴾ واتە: خـراپترین پێـڕۆی سـەرزەوی لەحوکمو یاسای خودادا ئەو کافرە خودانەناسانەن کە پـەیمانی خۆیـان شکاندوەو وادەو بەڵێنی خۆیان نەبردە سەر، ئەوانە خراپترین دروستکراوی خوداو پیسترین ئادەمیزادن، چونکە دوو ڕەوشتیان تێدان، یەکـەم بـەردەوام بوونیـان لەسـەر کـوفرو بێدینیو یاخی بوون، ئەوان بەهیچ کلۆجێك ئیمان ناهێنن.

رەوشتی دووەمیان پەیمان شکێنیو پابەند نەبوونیانە بەوادەو بەڵێنی خۆیانو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ عَاهَدْتَ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِي كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لا يَتَّقُونَ﴾ ئەو خودانەناسە کافرە جوولەکانە کە تۆ ئەی موحەممەد! پەیمانت لێ وەرگرتوونو پاشانو هەموو جارێك پەیمانەکەیان شکاندوەو بەڵێنی خۆیان هەڵوەشاندەوە، هەرچەندە بەجەختو سوێند خواردن بڕیاری پابەند بوونیان بەو پەیمانە دا بوو.

سەرباری ئەو دوو رەوشتە رەوشتێکی سێیەمیشیان هەیە: ئەویش ئەوەیە تەقوای خودا ناکەنو لێی ناترسن، کۆ لەهیچ تاوانێك ناکەنو بەبێ منەت چ تاوانێکیان بوێ ئەنجامی دەدەنو هیچ ترسی ئاگری دۆزەخیان نیە.

پەروەردگار وەصفی ئەو جوولەکانەی بە(شر الدواب) خراپترین پێڕۆو ئاژەڵ. کرد، بۆ ئەوەی ئاماژە بێ کە ئەوانە گەییشتوونە پلەی ئاژەڵ، بەڵکو لەئاژەڵیش خراپتر، چونکە هیچ سوودێکیان نیە نەبۆ خۆیان، نەبۆ غەیری خۆیان، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿... إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلاً﴾ (الفرقان/٤٤) پاش ئەوەی پەروەردگار سێ رەوشتی جولەکەو کافرەکانی دیاری کرد، ئەوەی روون کردەوە کە ئەوانە چەند جار پەیمان شکێنییان کردوەو پابەندی وادەو بەڵێنی خۆیان نەبوون، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا باسی ئەوە دەکا چۆن مامەڵەیان لەگەڵ دا بکریو فەرمووی: ﴿فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِي الْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِمْ مَنْ خَلْفَهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! هەرکاتێك لەجەنگ دا تۆ ظەفەرت بەو پەیمان شکێنانە بردو بەسەریان دا زاڵ بووی، زەبرو زەنگی وایان لەگەڵ دا بنوێنە ئەوانەی پشتگیریشیان لێ کردون لێك بترازێنو پەرتەوازەی ببن. وایان لێ بدە ئەوانو کۆمەکیکارانیشیانو لێت بترسن، وایان بپروێنە ئەوانو یارمەتیدەرانیانو غەیری ئەوانیش لەدوژمنان؛ عەرەبو نا عەرەب لێتان بترسنو پەندو عیبرەت وەربگرنو کەسێکی تر نەوێرێ هەڵوێستی ئاوا بنوێنێ!! پەیمانتان لەگەڵ ببەستیو دوایی بیشکێنی!

بۆیە پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبەر کرد کە زەبروزەنگی تەواو بنوێنێ لەگەڵ ئەو دوژمنانەدا کە زیاد لەجارێك پێغەمبەر پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستوون، ئەوان هەڵیان وەشاندۆتەوە، بۆ ئەوەی لەوە دوا بەدرۆو دەلەسەیان هەڵنەخەڵەتێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەسروشت میهرەبانو ئاشتیخواز بووە. پێی وا بووە کە جەنگ زەرورەتەو هەرکاتێ هۆکارەکانی نەمان ئاشتی پەسندە ﴿وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا﴾ بێگومان ئەو جوولەکە فێڵبازانە وایان دەبردە زەینی پێغەمبەرەوە کە ئەوان ئاشتیخوازنو حەزیان لەئارامییە، کە پەیمانەکەشیان دەشکاند عوزریان بۆ دەهێنایەوەو دەیانگوت نەمانزانی، هەڵەمان کرد لێمان ببورە، هەموو ئەمانەشیان فێڵو تەڵەکەبازی بوو!

بۆیە پەروەردگار فەرمانی پێ کرد کە زەبرو زەنگ بنوێنێو بیان پروێنێ بیانتۆقێنێ، ﴿لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ بەڵکوو ئەوانەی لەپشتیانەوەنو یارمەتیدەریانن، بەخۆیان دا بچنەوەو ترسیان لێ بنیشێو بیر لەپەیمان شکێنی نەکەنەوەو خەیاڵی شەڕ کردن لەدژی پێغەمبەر نەکەن!

بوخاریو موسلیم فەرموودەیەکیان ریوایەت کردوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەهەندێ رۆژی وادا کە تێیان دا تووشی بەرەنگاریکردنی دوژمن دەبووەوە وتاری دەداو دەیفەرموو: (یاأیها الناس! لاتمنوا لقاء العدوّ وسلوا الله العافیة فاذا لقیتموهم فاصبروا واعلموا ان الجنة تحت ظلال السیوف) ئەمجار دەیفەرموو: (اللهم! منزّل الکتاب ومجری السحاب، وهازم الأحزاب اهزمهم وانصرنا علیهم) ئەی خەڵکینە! ئاواتە خوازی بەرەنگاریکردنی دوژمن مەبن، هەمیشە داوا لەخودا بکەن بەسەلامەتی بژینو ئاشتی بەرقەرار بێ، بەڵام کە ناچار بوونو تووشتان بوو بەتووشی دوژمنەوە خۆگربنو ئارام بگرن، باش بزانن بەهەشت بەسایەی شمشێرەوە دەست دەکەوێ. ئەمجار دەیفەرموو: پەروەردگارا! ئەی ئەو کەسەی قورئانت نازڵ کردوە، ئەی رۆییندەی هەورەکانو شکێنەری ئەحزاب، دوژمنانمان تێك بشکێنەو ئێمە زاڵ بکە بەسەریان دا.

لێرەدا ئاماژە بۆ دووشت دەکا:

١- شەڕ لای خوداو پێغەمبەری خودا خۆشەویست نیەو شتێکی ناچارییە بۆ بەرەنگاری بەغیی‌و عودوان پەنای بۆ دەبرێ، بۆ بەرز کردنەوەی رستەی (لا اله الاّ الله، محمد رسول الله)و پوچاندنەوەی بەتاڵ ئەنجام دەدرێ.

٢- بەکارهێنانی زەبرو زەنگ لەگەڵ پەیمان شکێنانو شەڕ هەڵایسێنان، بۆ پەرتەوازە کردنی ئەوانەی کە پشتیوانیانن، کارێکەو دەبێ ئەنجام بدرێ بۆ ئەوەی پەیمان شکێنانو هەواخواهانیانو پشتیوانانیان پەندو عیبرەت وەربگرنو بیر لەکاری ئاوەها نەکەنەوە.

پاش باسکردنی حوکمی پەیمان شکێنانو وەرگرتنی هەڵوێست بەرامبەریان، ئەمجار حوکمی ئەوانە بەیان دەکا کە بتمانە بەوادەو بەڵێنیان ناکرێ‌و دەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِنْ قَوْمٍ خِيَانَةً فَانْبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ﴾ واتە: ئەگەر پەیمانت لەگەڵ تاقمو گرۆهێك بەستو پاشان گومانی ئەوەت لێ کردن کە پەیمانەکەیان نابەنەسەرو وادەو بەڵێنەکانیان هەڵدەوەشێننەوە، بەم رەنگە نیشانەو بەڵگەی وا هەبوون ئاماژەیان بەوە دەکردو ترسی ئەوەی لا دروست کردن، کە پەیمانەکەیان نابەنەسەر ئەوە تۆ ئەی پێغەمبەر! ئەو رێگەیان لێ ببەستەو پێش ئەوەی ئەو خیانەتەیان لێ رو بدا، پێیان بڵێ: کەتۆ پابەندی پەیمانە بەستراوەکەنیتو بەڵێنەکەت، هەڵوەشاندۆتەوە، بەشێوەیەکی ئاشکراو نومایان بەبێ فێڵو ژێر بەژێری ئەمەیان پێ رابگەیەنە. حیکمەتیش لەمەدا ئەوەیە: کە ئیسلام بەهیچ کلۆجێك خیانەت پەسند ناکاو موسوڵمان نابێ بەهیچ شێوەیەك خیانەت لەگەڵ کەس بکا. واتە: نابێ پێش پێ راگەیاندنو هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی دابەستراو، شەڕیان لەگەڵ بکرێ، بۆ ئەوەی تۆش‌و ئەوان بەیەکسانی ئاگاداری هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکە بن‌و بزانن کە پەیمان نەماوە ئەمجار شەڕ دەکرێ ئەویش ئەگەر پێویست بوو.

﴿إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْخَائِنِينَ﴾ بێگومان خودا هەرگیز خائینانی خۆش ناوێن، تەنانەت خییانەتکردن لەکافرانیش ناڕەوایە.

بەیهەقی ریوایەتی کردوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ثلاثة، المسلم والكافر فيهن سواء: من عاهدته فوفّ بعده مسلما كان أو كافراً، فانما العهد لله، ومن كانت بينك وبينه رحم فصلها، مسلماً كان أو كافراً) سێ شت موسوڵمانو کافر تێیان دا یەکسانن: کەسێك پەیمانت لەگەڵ دا بەست ئەو کەسە موسوڵمان بێ یان کافر بێ پەیمانەکەتی لەگەڵ دا بەسەربەرە، چونکە پەیمان هی خودایە، کەسێك لەنێوان تۆو ئەودا خزمایەتی هەبوو ئەو کەسە کافر بێ یان موسوڵمان بێ صیلەی رەحمی لەگەڵ دا بەجێ بێنە، کەسێك سپاردەیەکی لا دانابیو کردیتی بەئەمین بەسەریەوە ئەو کەسە موسوڵمان بێ یان کافر بێ سپاردەکەی بدەرەوە.

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشە لەو خائینانە دەکا بەسزایەك کە چاوەڕوانیانە دەفەرموێ: ﴿وَلا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَبَقُوا﴾ با ئەوانەی کافرو بێ بڕوان وا گومان نەبەن کە لەدەست ئێمە رزگاریان بووەو سەرەنجامی خیانەتەکەیان نایەتەوە رێگایانو ئیتر بۆی دەردەچنو سزاو تۆڵەیان لێ ناسێندرێ! بەڵکو ئەوانو هەموو بوونەوەر لەژێر دەسەڵاتی ئێمە دانو دەستی ئێمەیان دەگاتیو تۆڵەیان لێ دەستێنن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ أَن يَسْبِقُونَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ (العنكبوت:٤) وشەی (يَحْكُمُونَ) واتە: يظنون :گومان دەبەن.

﴿إِنَّهُمْ لا يُعْجِزُونَ﴾ بێگومان ئەوانە خودا دەستە بەستە ناکەن، لەچنگی قارو تۆڵەی قوتار نابن، سزاو تۆڵەی کافربوونیان لێ دەسێندرێ، پێغەمبەرو موسوڵمانانیان بەسەر دا زاڵ دەکرێنو تۆڵەی پەیمان شکێنیو فرتو فێڵو خراپەکارییان لێ دەستێنن وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ وَلَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ (النور:٥٧) یان دەفەرموێ: ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللّهِ وَأَنَّ اللّهَ مُخْزِي الْكَافِرِينَ﴾ (التوبة:٢)

ئایەتەکە موژدەو دڵنیا کردنی پێغەمبەرە ﷺ بەوە کە خودا زاڵی دەکا بەسەر ئەو کافرانە دا کە ئەزیەتیان داوە، لەهەمان کات دا کافرەکان هیوا بڕاو دەکا لەوەی کە بەسەر موسوڵماناندا سەرکەون..

## خۆ ئامادە کردن بۆ جەنگ دژی دوژمنانو دابینکردنی پێویستیاتی جەنگ بەگوێرەی توانا

﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَىْءٍ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٦٠﴾﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبەری خۆی کرد کە پەیمان شکێنان پەرتەوازە بکاو بەزەبرو زەنگ لەگەڵیان دا بجوڵێتەوەو ئەگەر ترسی هەبوو لەپەیمان شکێنی تاقمو گرۆهێك پێش ئەوەی پیلانی خۆیان ئەنجام بدەن ئەوە پەیمانەکەیان بەسەر دا بداتەوە. ئەمجار لەم ئایەتە دا فەرمانی پێ دەکا کە خۆیو موسوڵمانان هەمیشە خۆیان ئامادە بکەن بۆ بەرەنگاریکردنی ئەو کافرانەو پێداویستی جەنگ بەگوێرەی توانا رۆژگار دابین بکەن هەڵبەتە ئەمەش کارێکی سروشتییە، هەرکاتێ پەیمان شکێنی کراو وادەو بەڵێن هەڵوەشێندرانەوە حاڵەتی جەنگ بەرپا دەبیو هەموو کاتێ چاوەڕوانی بەرپابوونی شەڕ دەکرێ بۆیی پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبەر کرد فەرمووی ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ﴾. ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! خۆتان ئامادەو تەیار بکەن بۆ شەڕی دوژمنانو پێداویستی جەنگ بەگوێرەی تواناو بارودۆخی رۆژگار دابین بکەن، بۆ ئەوەی بەرەنگاری دوژمن ببنەوە نەفسو ماڵو نامووسی خۆتان بپارێزنو نەهێڵن دوژمن دەستدرێژیتان بکاتە سەر، ئەمەش لەدوو خاڵ دا رەنگ دەداتەوە.

١- ئامادەکردنی هێزو دەسەڵات بەگوێرەی رۆژگارو شوێنو پێداویستی، کەوا بێ ئەوەی ئەمڕۆ لەسەر موسوڵمانان پێویستە ئەوەیە: پیشەسازیو چەکسازی فێر ببن؛ تۆپو فرۆکەو بۆمباو زەمین بەزەمینو دەبابەو کەشتیو غەواصەو ئەم جۆرە

چەکانە دروست بکەنو فێری بەکارهێنانی ببن، هەر وەکوو چۆن پێویستە ئەو فنونو زانستانە فێر ببن کە پەیوەندییان بەدروستکردنو بەکار هێنانی ئەو جۆرە چەکانەو هی تریشەوە هەیە.

ئەوەتا پێغەمبەرو هاوەڵانی لەغەزای خەیبەرو هی تریش دا ئالەتی مەنجەنیقیان بەرکا هێناوە.

ئیمامی موسلیم لەعوقبەی کوڕی عامیرەوە ریوایەت دەکا کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوەو فەرمووی: ﴿الا ان القوة الرمی﴾ ئاگاداربن هێزو توانا بریتییە لەو چەکەی لەدوورەوە شەڕی پێ بکەی. سێ جار ئەم فەرموودەیەی فەرموو. چونکە تەقە کردن لەدوژمن لەدوورەوە بەچەکێك کە کوشندە بێ، کاریگەر ترە لەوەی لەگۆڕەپانی جەنگ دا بەشمشێرو رمبو خەنجەرو گۆپاڵو ئەو جۆرە شتانە شەڕ لەگەڵ دوژمن بکرێ.

٢- دامەزراندنو دانایی سوار چاکو تیر ئەندازە لەسەر سنووری وڵاتو قایم کردنی بەندەنو سەنگەر لێدانو دابینکردنی ئامێری چاودێریو بەرگری.

بەکورتی پێویستە موسوڵمانان سوپایەکی بەهێزی هەمیشەییان هەبێ هەمیشە ئامادەباشی بەرگریکردن بێ لەوڵات ماڵو دارایی پێویستی بۆ دابین بکریو بەگوێرەی رۆژگار بەچەکو ئامێری شەڕ دەوڵەمەند بکرێ. پەروەردگار لەئایەتەکە دا کە بەتایبەتی باسی ئەسپ دەکا هەرچەندە وشەی (من قوة) ئەویش دەگرێتەوە. بۆ زێدە رێزلێنانو گرنگییەتی، چونکە ئەو کاتە ئەسپ گرنگترین ئامێرو پێداویستی جەنگ بوو.

بەڵێ پێویستە موسوڵمانان هەمیشە لەئامادەباشی دابنو کەرەسەی جەنگ دابین بکەن، بەئەوپەڕی هێزو تواناوە خۆیان تەیار بکەن، بۆ ئەوەی هەمیشە هێزی خواپەرست هێزی باڵادەست بێ لەسەر زەوی، هەموو هێزەکانی تر لێی بترسنو نەوێرن هێرش بکەنە سەر وڵاتی ئیسلامو هەموو جیهان گەردنکەچی دەسەڵاتی خودابنو نەتوانن کۆسپو تەگەرە بخەنە بەردەم بانگەوازیگەرانو خەڵك لەموسوڵمان بوون ژێوان نەکەنەوە، هەروەها کەس نەتوانێ مافی خوداییو

حاکمیەت بەخۆی بداو لافی خودایەتی لێ بدا. بۆ ئەوەی هەموو ئایینو پەرستشێك هەر بۆ خودا بیو بەس.

ئەمجار ئایەتەکە هۆی خۆ ئامادە کردنو خۆتەیار کردنو خۆ فێر کردنو هێزو توانا دابین کردنەکە دەست نیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنْتُمْ لا تُظْلَمُونَ﴾ بۆ ئەوەی دوژمنانی خوداو دوژمنانی موسوڵمانان بترسێنن ئەو کافرانەی کە دوژمنایەتییان بۆ ئێوە ئاشکراو نمایانە وەکوو موشریکەکانی مەککە، هەروەها بۆ ترساندنی ئەو دوژمنە نهێنیانەی کە هاوپەیمانن لەگەڵ ئەو دوژمنە ئاشکرایانە دا، جا ئێمە ئەو دوژمنانە بناسین یان نەیانناسین. خودا بۆ خۆی دەیانناسێ، چونکە زاتی پاکی ئەو زاناو ئاگادارە بەسەر هەموو نهێنییەك دا

## هەڵبژاردنی ئاشتیو یەکخستنی نەتەوەو هەڵنانی موسوڵمانان بۆ جەنگ

﴿ ۞ وَإِن جَنَحُوا۟ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ
هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦١﴾ وَإِن يُرِيدُوٓا۟ أَن يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ
حَسْبَكَ ٱللَّهُ ۚ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾
وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ۚ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ
بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٌ
﴿٦٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ

﴿٦٤﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ ۚ إِن يَكُن
مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَـٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم
مِّا۟ئَةٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا
يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾ ٱلْـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ
ضَعْفًا ۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن
يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ مَعَ
ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿٦٦﴾

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەئایەتەکانی پێشەوە ئەوەیە: لەوە پێش پەروەردگار فەرمانی بەموسوڵمانان کرد بەخۆتەیار کردنو ئامادەباشیو چەکسازی بۆ ئەوەی دوژمن لێیان بترسێو زات نەکا هێرشیان بکاتە سەرێ، یان کۆسپو تەگەرە بخاتە بەردەم بڵاوبوونەوەی ئایین. ئەمجار لێرەدا فەرمان دەکا بەئاشتی بەڵام ئاشتییەك کە لەسەر بنەمای ڕێزو پیاوەتی چەسپابێ، عیززەتو کەرامەتی تێدا بێ، هەرکاتێ ترسو خۆفەکە هەبوو لەدڵی دوژمنان داو مەیلی ئاشتییان کرد، بڕیاری ئایین ئەوەیە: ئاشتی قبووڵ بکەنو پابەندبن پێیەوە، چونکە جەنگ خۆی لەخۆی دا بۆ بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژییەو بۆ چەسپاندنی ئازادییەو بۆ ڕێگە ئاچووغ کردنی بڵاوکردنەوەی ئایینە، بۆ مەنع کردنو بەرەنگاریکردنی ستەمو بوغرابوونە، زەرورەتیش بەئەندازەی پێویست لێی وەردەگیرێو بەگوێرەی ئاتاج پەنای بۆ دەبرێ، هەتا حاڵەتی ئاشتیو ئاشتەوایی بگونجێ حاڵەتی شەڕ ڕەچاو ناکرێ.

کەوابوو پاش خۆئامادەکردنو دابین کردنی ئامێرو پێداویستی جەنگو ئامادە باشی تەواو بۆ جەنگو جیهاد، ئەگەر دوژمن داوای ئاشتی کردو حاڵەتی ئاشتی بەسەر شەڕو جەنگ دا هەڵبژارد ئەوە حوکمو بڕیار ئەوەیە قبوڵی حاڵەتی ئاشتی بکرێو رابەرو پێشەوای موسوڵمانان چۆنی بەلاوە باش بوو بەرژەوەندی موسوڵمانانی تێدا بەدی کرد ئەوە رەچاو دەکا، ئاشکراشە کە رابەرو پێشەوا ئەو بڕیارە لەسەر ئاکامی راوێژ (شوری)ی موسوڵمانان وەردەگرێ.

﴿وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا﴾ ئەگەر دوژمن لەحاڵەتی جەنگەوە مەیلیان بۆ ئاشتی کردو داوای ئاشتیان کرد، ئەوە تۆش ئەی پێغەمبەر! مەیل بۆ لای ئاشتی بکەو ئاشتەوایی پەسند بکەو پابەندی حاڵەتی ئاشتی بە! چونکە جەنگ خۆی لەخۆی دا مەبەستی سەرەکی نیە، تۆ شایان تری بەپابەند بوون بەئاشتەوایی‌و ئاشتیخوازییەوە. تۆ کە پەنا بەشەڕ دەبەی بۆ بەرگریکردنە لەئایینو بۆ رێگە خۆشکردنی بڵاوبوونەوەی ئایینە، بۆ لابردنی کۆسپو تەگەرەیە لەسەر رێبازی ئایین. کەوابێ هەرکاتێ دوژمنان دەستی ئاشتییان درێژ کرد، ئەتۆش ئاشتییان لێ وەربگرەو لێیان قبوڵ بکەو پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ داببەستەو ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾ پشتت بەخودا ببەستەو کاری خۆت بەخودا بسپێرە، لەمەکرو پیلانەکانیان مەترسە، خودا پشتیوانتەو لەپیلانی ئەوان دەتپارێزێ ﴿إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ بێگومان خودا شنەوایە بەو راوێژو گفتو گۆیانەی لەناو خۆیان ئەنجامی دەدەن، زاناو ئاگادارە بەو پیلانو نەخشە جۆراو جۆرانە کە دژی ئێوە دایدەڕێژن. خودا هیچی لێ گوم نابێ.

﴿وَإِنْ يُرِيدُوا أَنْ يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ اللَّهُ هُوَ الَّذِي أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر بیانەوێ لەرێگەی بانگەوازی بۆ ئاشتییەوە فێڵتان لێ بکەنو خۆیان بەهێز بکەنو خۆیان ئامادەو تەیار بکەن بۆ لێدانتان ئەوە تۆ ئەی پێغەمبەر! خودات بەسەو چاودێریت دەکاو یارمەتیت دەداو زاڵت دەکا بەسەریان دا، هەر خودا بوو کە لەوەپێش یارمەتی دایو هۆکاری مادیو مەعنەوی بۆ خوڵقاندی بۆ ئەوەی دڵی موسوڵمانان بەکۆچکارو یاریدەدەرانەوە دڵیان قایم بیو یەك بگرنو لەژێر ئاڵای ئیسلام داو لەژێر فەرماندەیی تۆدا جیهاد بکەن!

ئەمە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوە کە پێویستە موسوڵمان ئاشتی بەسەر بەجەنگ دا هەڵبژێریو ناچار نەبێ پەنا بۆ شەڕ نەبا، چونکە ئایینی ئیسلام ئایینی رەهنومایی خۆشەوییستیو ئاشتەواییە، رێگە نادا شەڕ بەرپا بێ مەگەر بارو دۆخێك بێتە کایەوە موسوڵمانان ناچاری شەڕ بکا! هەر بۆیەش ساڵی حودیبییە کە موشریکەکان داوای موصالەحەو ئاشتییان کردو وتیان با بۆ ماوەی نۆ ساڵ پەیمانی ئاشتی ببەستین هەرچەندە زۆر مەرجی وا لەپەیمانەکە دا هەبوون کە لەبەرژەوەندی موسوڵمانەکان نەبوو، پێغەمبەر ﷺ رازی بوو ئاشتییەکەی قبووڵ کرد.

کە لەئایەتی پێشوو دا فەرمووی ﴿هُوَ الَّذِي أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە گوێ بەپیلانو فرتو فێڵیان مەدە چونکە یارمەتی تۆی دا بەوە کە هۆکاری ماددیو مەعنەوی بۆ رەخساندی بەدوو شێوە کۆمەکی پێ کردی، شێوەیەکیان بریتی بوو لەکۆمەکی خودایی راستەو خۆ بەبێ هۆکاری مادی، شێوەیەکیشیان بریتی بوو لەدەستەبەر کردنی هۆکاری مادی کە یەکگرتنی موهاجرینو ئەنصار بوو بۆ پشتگیری کردنی مەیامەکەت.

ئەمجار لەئایەتی دوایی دا چۆنیەتی ئەو پشتگیرییە دیاری دەکا: کە بریتی بوو لەیەکگرتنی موسوڵمانانو رێکخستنی ریزەکانیانو دەفەرموێ: ﴿وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ﴾ پەروەردگار موسوڵمانەکانی لەسەر خۆشەویستی کۆکردەوە هەموویانی کردنە کۆمەڵێکی یەك ریزو یەك هەڵوێستو یەك ئامانج، هەموویان تێکڕا هاریکاری یەکتر بوون بۆ یارمەتیدانی پەیامی تۆو بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی تۆ، لەکاتێك ئەوان پێش هاتنی پەیامی تۆ یەکتریان دەدزا، دژایەتییان لەنێو دا بوو، هەمیشە کێشەو دووبەرەکیو شەڕو هەرایان بوو، بەخوێنی سەری یەکتری تینوو بوون، شەڕی درێژخایەنیان لەناو خۆیان دا کردوە، بەنموونە شەڕی چەند ساڵەی نێوان هۆزی ئەوسو هۆزی خەزرەج. پاشان خودای میهرەبان بەهۆی نووری ئیمانو باوەڕەوە ئەو دووبەرەکیو دژایەتیەی لەنێو دا هەڵگرتنو کردنی بەبرای گیانی بەگیانی یەکتری وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرُواْ نِعْمَتَ اللّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ

كُنتُمْ أَعْدَاء فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَاناً وَكُنتُمْ عَلَىَ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا﴾ (آل عمران:١٠٣).

پەروەردگار بەفەضلو گەورەیی ئەو خەڵکەی وا لێ کرد لەدەورت کۆببنەوە، گیانو ماڵی خۆیان لەپێناو بانگەوازییەکەت دا بەخت بکەن، ببنە نموونەی فیداکاریو لێبوردوویی‌و گیانبازی! خۆ ﴿لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً مَا أَلَّفَتْ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ﴾ ئەگەر تۆ هەرچی ماڵو سامانی لەزەوی دا هەیە هەموویت ببەخشییایە نەتدەتوانی بەو شێوە دڵیان یەکخەیو ئاوێتەی یەکتری ببنو ئاوا یەکدەمو یەکهەڵوێستو یەکئامانج بن ﴿وَلَكِنَّ اللّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ﴾ بەڵکوو پەروەردگار بەهۆی نیعمەتی ئیمانەوە، بەهۆی کۆکردنەوەمیان لەسەر ڕێبازی ڕاستو هیدایەت بەقودرەتو تواناو دانایی خۆی کردنی بەیەکنەتەوەو یەکیەتیو برایەتیو تەباییو خۆشەویستی خستە نێوانیانەوە کردنی بەنموونەی هەرمبەرزی برایەتیو خۆشەویستیو کۆمەڵگایەکی لێ دروست کردن مێژوو بەخۆیەوە نەدیبوو، بۆ هەتا هەتایێ مێژوو شانازییان پێوە دەکا. ﴿إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ بێگومان خودای باڵا دەست بەهێزو تواناو دەسەڵاتە، دەتوانێ هەرچی بیەوێ ئەنجامی بدا، داناو لێزانە، هەرچی دەیکا پەسندەو ڕەخنەی لێ ناگیرێ..

ئەمجار دوای ئەوەی وادەی بەپێغەمبەری خۆی دا بەوەی کە لەکاتی فێڵ لێ کردنو پیلان گێڕانی کافرەکان یامەتی دەدا، وادەی یارمەتیدانی هەمیشەییو سەرخستنی دونیاو قیامەتی پێ داو فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللّهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! یارمەتیدانی پەروەردگار بەستە بۆ خۆتو ئەوانەی شوێنت کەوتوون، خودا یارمەتیدەرو پشتیوانتە بۆ هەموو کاتو شوێنێك، زاڵت دەکا بەسەر دوژمنانت دا، هەرچەندێك دوژمن زۆرو موسوڵمانان کەم بن، خودا ئێوە سەردەخاو دواڕۆژ هەر بۆ خوداپەرستانە، ئەگەر وشەی (من) عەطف بێ بۆ سەر وشەی (الله) ئەو کاتە مانای ئایەتەکە بەم جۆرە دەبێ:

ئەی پێغەمبەر! ئەتۆ خودات بەسە ئەو لەسەرەتاوە ڕاستەوخۆ یارمەتی دایو سەرکەوتووی کردی. هەروەها یارمەتی دای بەو کۆمەڵە موسوڵمانەی کە پەیمانی

خۆیان لەگەڵ پەروەردگار دا بەراستی بردەسەرو پابەندی بەڵێنی خۆیان بوون. ئەوەتا: پەروەردگار هێزێکی یەکگرتووی لێ پێك هێنان، پاش ئەوەی دڵیان لەوەپێش پەرتەوازە بوو دژایەتییان ئاشکراو نمایان بوو هەمیشە لەناوخۆیان شەڕو هەرایان بوو، کێشەو دووبەرەکیو هێرشو خوێن رشتن لەناویان دا پەرەی ساندبوو، جا مەبەست هۆزی ئەوسو خەزرەج بێ کە لەپێش ئیسلام دا دوژمنایەتیو خوێن رشتن لەناوین دا بوو، یان مەبەست کۆچکەران بن کە لەپێش ئیسلام ئەوانیش حاڵیان لەحاڵی ئەوسو خەزرەج باشتر نەبوو. یان مەبەست هەموویان بن. هەموویان گونجاوە.

جا هەرچەندە خودا وادەی پاڵپشتیو یارمەتیدانی داوە بەپێغەمبەرو موسوڵمانان، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە موسوڵمانان پشتی لێ بدەنەوەو ئامێرو پێداویستی جەنگو بەرگریو سوپای پێویست پاشگوێ بخەنو ببنە (کاکە حەمەی پەنا بەخوا!!) واز لەهەموو ئامێرو هۆکارێکی مادی پێویستی جەنگو بەرگری بهێنن، بۆیە پەروەردگار دوابەدوای سەرکەوتنو پشتگیری دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضْ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ﴾ ئەی پێغەمبەر موسوڵمانان هەڵنێ بۆ جەنگانو دابینکردنی ئامێری جەنگ بەهەموو شێوەکانیەوە، وایان لێ بکە هەمیشە سوور بن لەسەر خەباتو تێکۆشانو بەرخودانو بەرگری لەنیشتمانو ئایینوماڵو سامان، واتە: دەبێ موسوڵمانان بۆ خۆیان ئەوپەڕی تواناو هێزی خۆیان بخەنە کار بۆ رێکخستنی سوپاو چەکدارکردنیو ئامادەکردنی بۆ جەنگ ئەمجار پشت بەخودا ببەستنو داوای سەرکەوتنو سەرفرازی لەخودا بکەن. جا ئەو کاتە ﴿إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفاً مِنْ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەگەر بیست جەنگاوەری موسوڵمانی خاوەن صەبرو خۆگر تووشیان بوو بەتووشی دوو صەد شەڕکەری کافر دەبێ خۆیان رابگرنو جیهاد بکەن تا بەسەریان دا زاڵ دەبن.

واتە: ئەگەر بیست موسوڵمانی خاوەن صەبر هەبوون بەهۆی لێزانیو ئیمانو خۆڕاگریانەوە سەرکەوتوو دەبن بەسەر دوو صەد کافری وادا کە ئەو رەوشتانەیان تێدابن. ئەگەر لەئێوە سەد کەس هەبێ بەسەر هەزار کافردا زاڵ دەبن. بۆیە دوا بەدوای ئەوە فەمووی: ﴿بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لا يَفْقَهُونَ﴾ واتە: هۆی تێشکانی کافرەکان

نەوەیە: ئەوان نەتەوەیەکی نەفامن وەکوو ئێوە لەحیکمەتی جەنگ نازانن. ئەوان کە شەڕ دەکەن تەنیا مەبەستیان سەرکەوتنو داگیر کردنە، ئێوە دەجەنگن بۆ بەرز کردنەوەی ڕستەی (لا اله الا الله محمد رسول الله) بۆ ڕاستکردنەوەی بیرو باوەڕ، بۆ خۆپاککردنەوە لەبتپەرستیو خۆئارایش دان بەرەوشتی بەرزو ئیظهاری بەندایەتی کردن بۆ خوداو ئەنجامدانی نوێژو زەکات دانو فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ﴾ (النساء:٧٦) یان دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ﴾ (الحج:٤١).

ئەمجار ئەوان بڕوایان بەزیندوبوونەوە نیە بەتەمای پاداشو تۆڵە نین، بەڵام ئێوەی موسوڵمان کە دەجەنگێن بەتەمای یەکێك لەدوو دەستکەوتی باشن؛ یان سەرکەوتنو دەسکەوتی جەنگ، یان شەهید بوونو بەمراز گەیشتن بەچوونە ناو بەهەشتو ژیانی بەختەوەری هەتا هەتایی.

ئایەتەکە وادەو مژدەی پەروەردگاری تێدایە بۆ موسوڵمانان، بەوە ئەگەر موسوڵمانان خۆڕاگربن بەسەر دەهێندەی خۆیان دا لەکافرەکان زاڵ دەبن. ئەوەشی تێدایە کە موسوڵمانان دەزانن بۆچی دەجەنگنو لەپێناو چی دا خەبات دەکەن، بۆ ڕەزامەندی خودا کاروباری خۆیان ئەنجام دەدەن، هەمیشە لەکافران شارەزاترن بەهەموو ئەو شتانەی کە گونجاون بۆ ژیانی ئادەمیزادو پێشکەوتنی گەلو وڵاتیان تێدایە، بەڵام کافرو جولەکەو نەصارا گەلو نەتەوەیەکی ماددیو بەرچاو تەنگن، مەبەستیان لەشەڕو جەنگ چەوساندنەوەی گەلو نەتەوەکانی ترە.

فەرمان بەخۆڕاگریو جەنگانی موسوڵمانێك بەرامبەر دەکەسی کافر، لەسەرەتای ڕوبەڕووبوونەوەی موسوڵمانان بەرامبەر کافران بووە، کاتێك بووە موسوڵمانان کەم بوون، ئەو کاتە داوایان لێ کراوە کە پلەی هەرە بەرزی خۆڕاگریو حەزمو عەزیمەت بەدەست بێنن. بەڵام پاشان کە موسوڵمانان زۆر بونو دەسەڵاتیان پەیدا کرد ئەمەیان بۆ سەنگو سووك کراو ئەو ئەرکە گرانەیان لەسەر شان سووك بوو، دەفەرموێ: ﴿الآنَ خَفَّفَ اللّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفاً فَإِن يَكُن مِّنكُمْ مِّئَةٌ

صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوا أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾.

واتە: ئەی كۆمەڵی موسوڵمان! لەكاتێكا لەسەر ئێوە پێویست بوو كە لەحاڵی بەهێزیو قووەت دا بەرەنگاری چەند هێندەی خۆتان ببنەوەو خۆتان رابگرنو بجەنگن، ئەوەتان لەسەر شان گران بوو، ئەوە پەروەردگار ئەوەی بۆ كەم كردنەوەو روخصەتی پێدان كە لەحاڵەتی غەیری بەهێزی دا بەرامبەر دوو هێندەی خۆتان خۆڕاگربن. ئیمامی بوخاری لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەكا، دەفەرموێ: كاتێك ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُواْ مِئَتَيْنِ﴾ هاتە خوارێ ئەم ئەركە لەسەرشانی موسوڵمانەكان قورس بوو، كە لەسەریان پێویست بوو هەریەكەیان لەبەرامبەر دە كەس دا خۆڕابگریو هەڵنەیێ. ئیتر بۆیان كەم كرایەوەو لەسەریان پێویست كرا كە لەبەرامبەر دوو هێندەی خۆیان دا خۆبگرنو بەس، چونكە خودا دەزانێ كە موسوڵمانەكان لەئاكامی جیهادو تێكۆشانو كاركردن دا تووشی زەبوونیو لاوازی بوون، حاڵیان گەیشتۆتە ئەندازەیەك داخوازی سووك كردنی ئەو ئەركەیە، بەتایبەتی دوا ئەوەی هەیبەتی ئیسلام لەدڵو دەروونی كافرەكان دا چەسپاو جێگیر بوو. بۆیە پەروەردگار فەرمووی: ئەگەر لەئێوە سەد جەنگاوەری خۆڕاگر هەبوو، بەسەر دوو سەد شەڕكەری كافردا زاڵ دەبن. ئەگەر لەئێوە هەزار جەنگاوەری خۆڕاگر هەبوو بەسەر دوو هەزار كافری شەڕكەردا زاڵ دەبن، ئەمەش بەئیرادەو ئیزنو رەزامەندی خودا دێتە كایە، پەروەردگار هەمیشە یارمەتیدەری خۆڕاگرو خاوەن صەبرو ئارامەكانەو پاڵپشتیان دەكا.

لەهەردوو حاڵەكە دا پێویستە موسوڵمانان بەرەنگاری كۆمەڵی زیاتر لەخۆیان بكەن، دوژمنیان هەرچەندە لەخۆیان زیاتر بێ دەبێ لەگەڵی دا بجەنگنو رێگای هەڵاتن رەچاو نەكەن. چونكە لەشەڕو بەرەنگاری دا، گرنگ زۆری نیە، بەڵكو گرنگ هەبوونی هێزی گیانی خۆڕاگریو پتەوی بیرو باوەڕە، ئەمەش شتێكی ئاشكراو نومایانە لەهەموو رۆژگارو سەردەمێك داو لەهەموو شەڕو جەنگێك دا، چەند جار كۆمەڵی كەمو بڕوا پتەو، بەئیزنو یارمەتیدانی خودا بەسەر كۆمەڵی زۆری بڕوا لاواز دا زاڵ بوون لەشەڕو بەرەنگاری دا زۆری ژمارە گرنگ نیە، ئەوەی گرنگە بریتییە لەرێكخستنی ریزەكانی سوپاو ئەندازەی صەبرو خۆڕاگرییانو

ئازایـەتیو وره بەرزیوپتـەوی ئیمـانو شـوێنکەوتنی فـەرمانی پـەروەردگاریانو پابەند بوون بەپیلانو نەخشەی سەرکردەکەیان.

که لەکۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿وَاللَّـهُ مَـعَ الـصَّابِرِينَ﴾ هەڕەشـە کردنـە لەموسـوڵمانان کـە نـابێ بـۆ سـەرکەوتن بەسـەر دوژمـن دا بەتـەنها پـشت بـەئیمان ببەسـتنو بـەس، بـەڵکوو پێویـستە وێـڕای هـەبوونی ئیمـان لـەدڵیان دا ڕەوشـتی تریـشیان تێـدا بـن کـە هـەره گرنگـی ئـەو ڕەوشـتانە صـەبرو خۆڕاگرییـە، خۆئامـادەکردنی مـادیو مەعنەوییـە بـۆ بـەرەنگار بوونـەوە، هـەروەها بەدەسـت هێنـانی زانیـاری تـەواو بەچۆنیەتی شـەڕو بـەکارهێنانی چـەکو دارشـتنی پـیلانو ئـەنجام دانـی نەخـشە دارێژراوەکـەو رونـی ئاکـامو سـەرنجامی شـەڕو مەبەسـت لەئەنجامدانی جەنگ!!

بێگومان لەقورئان دا چەند جارێك فەرمان بەموسـوڵمانان (تـاكو کۆمـەڵیان) کراوە کە خۆڕاگربنو صەبرو ئارامیان هەبێ وەکوو دەفـەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُواْ﴾ (الأنفال:٤٥) یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَـاتِلُونَ فِـي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنيَانٌ مَّرْصُوصٌ﴾ (الصف:٤) یان دەفـەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـواْ اصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَاتَّقُواْ اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (آل عمران:٢٠٠) ﴿وَلاَ تَنَازَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُواْ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ (الأنفال:٤٦).

## مەرجی بەدیل کردنو فیدیە لێ وەرگرتنیانو سوود لێ وەرگرتنیان

﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ

عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾ فَكُلُوا۟ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَـٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ
إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٩﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّمَن فِىٓ أَيْدِيكُم
مِّنَ ٱلْأَسْرَىٰٓ إِن يَعْلَمِ ٱللَّهُ فِى قُلُوبِكُمْ خَيْرًا يُؤْتِكُمْ خَيْرًا
مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧٠﴾ وَإِن
يُرِيدُوا۟ خِيَانَتَكَ فَقَدْ خَانُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ فَأَمْكَنَ مِنْهُمْ ۗ وَٱللَّهُ
عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾

ئـەمجار لەبابـەتی فـەرمان بەهـەڵنانی موسـوڵمانان بـۆ جـەنگو فیـداکاریو خۆبەختکردن، سیاقەکە دەگوێزێتەوە بۆ رونکردنەوەی حوکمی ئەو قورەیشییانەی کە لەجەنگی بەدردا بەدیل گیرا بوونو کەوتبوونە ژێـر دەسـتی موسـوڵمانەکانەوەو چۆنیەتی رەفتار کردنی پێغەمبەرو هاوەڵانی لەگەڵیان دا. پاشـان دێتـە سەرباسـی ئـەو دیلانـەو هـەڵنایان بـۆ ئیمانهێنـانو قـەرەبوو کردنـەوەی ئـەو بەهرانـەی کـە لەوەپێش لەکیسیان چووەو ئەو زیانەی پێیان گەیشتوە.

ئیمـامی ئەحمـەدو هـی تـریش لەئەنەسـەوە ریوایـەتیان کـردوە؛ دەفـەرموێ: رۆژی بەدر پێغەمبەر ﷺ لەبارەی دیلەکانەوە راوێـژی بـەهاوەڵانی کـردو فـەرمووی: ئەوە پەروەردگار ئێوەی بەسـەر ئـەوان دا زاڵ کـردوەو ئـەم دیلانـەی خسـتۆتە ژێـر دەسـتی ئێـوەو، چییان لێ بکـەین؟ حـەزرەتی عومـەر فـەرمووی: ئـەی پێغەمبـەری خودا! لەگەردنیان دەدەەو دەیانکوژین، پێغەمبـەر ﷺ رووی لێ وەرگێـڕاو، حـەزرەتی ئەبوبـەکر هەسـتاو فـەرمووی: مـن وای بـەباش دەزانم فیدیـەیان لێ وەربگـرینو ئازادیـان بکـەین، ئـیتر پێغەمبـەر ﷺ فیدیـەی لێ وەرگـرتنو ئـازادی کـردن ئـیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿لَّوْلاَ كِتَابٌ مِّنَ اللَّهِ سَبَقَ.....﴾ ناردە خوارێ.

ئیمامی ئەحمەدو تیرمیذیو حاکیم لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەت دەکەن کە فەرموویەتی: رۆژی بەدر دیلەکانیان هێنان، پێغەمبەر ﷺ بەهاوەڵانی فەرموو: راتان چیە دەربارەی ئەم دیلانە؟ حەزرەتی عومەرو حەزرەتی ئەبوبەکر رای خۆیان دەربڕیو پێغەمبەر بەگوێرەی رای حەزرەتی ئەبوبەکر رەفتاری لەگەڵ کردن! قورئان نازڵ بوو پشتگیری رای عومەری کرد ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى...﴾.

ئیبنولونذیر لەنافیعەوە لەئیبنو عومەرەوە، دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: هاوەڵان دەربارەی دیلەکانی بەدر مقۆمقۆیان تێ کەوت. پێغەمبەر ﷺ راوێژی بەحەزرەتی ئەبوبەکرو حەزرەتی عومەر کرد، ئەبوبەکر فەرمووی فیدیەیان لێ وەربگرە، عومەر فەرمووی: بیانکوژە، یەکێکیش وتی: ئەوانە ویستوویانە پێغەمبەر بکوژنو ئیسلام لەناوبەرن، کەچی ئەبوبەکر دەڵێ فیدیەیان لێ وەربگرە یەکێکی تریش وتی: ئەگەر لەناو ئەو دیلانەدا باوکی عومەر یان برای عومەریان تێدا بوایە داوای کوشتنی دیلەکانی نەدەکرد؟!!

ئیتر پێغەمبەر ﷺ رای حەزرەتی ئەبوبەکری پەسند کردو فیدیەی لێ وەرگرتن. ئەوەبوو ئایەتی ﴿لَوْلا كِتَابٌ مِنَ اللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ هاتە خوار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خەریك بوو لەپەیڕەو نەکردنی رای کوڕی خەططاب عەزابێکی سامناك بمانگرێتەوە، خۆ ئەگەر ئەو سزایە بهاتایە جگە لەعومەر کەسی تر رزگاری نەدەبوو.

ئەم ریوایەتانە تێکڕا ئەوە دەگەیەنن کە پێغەمبەر ﷺ رای حەزرەتی ئەبوبەکری پەسند کردوەو فیدیەی لەدیلەکان وەرگرت، ئایەتەکە بەو هۆیەوە نازڵ بووە. ریوایەتیش هەیە تیرمیذی لەئەبوهورەیرەوە ریوایەت دەکا، ئەوە دەگەیەنێ کە ئایەتەکە بەهۆی ئەوەوە نازڵ بوو بێ کە موسوڵمانەکان دەسکەوتی غەزای بەدریان وەرگرت پێش ئەوەی بۆیان حەڵاڵ بکرێ.

مامۆستا سەیید لەم بارەوە ریوایەتی زۆری هێناون، یەکێ لەم ریوایەتانە ئەوەیە: دەڵێ: ئەعمەش لەعومەری کوڕی موڕەوە ئەویش لەئەبو عوبەیدەوە

ئـەویش لەعەبـدوڵلاوە دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: ڕۆژی بـەدر پێغەمبـەر ﷺ ڕوی کـردە هـاوەڵانیو فـەرمووی: لـەبارەی دیلەکانــەوە چـی دەڵـێنو ڕاتـان چـیە؟ ئەبوبـەکر فـەرمووی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئەوانـە نەتـەوەو خـزمو کـەسوکـاری خـۆتن، بیانهێڵـەوە مۆڵـەتیان بـدەو داوای تۆبـەیان لێ بکـە، بـەڵکو تۆبـە بکـەنو خـودا تۆبەکـەیان لێ وەربگـرێ.. عومـەر فـەرمووی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئەوانــە بەدرۆیان خستیەوە، دەریان کردی، بیانهێنـە پێشەوەو لـەملیان بـدە... عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە وتی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! شیوو دۆڵێکـی وا دیـاری بکـە کـە دارو لێڕەواری زۆر بێ، بیانخەرە دۆڵەکەوەو ئاگریان تێ بەردە.. پێغەمبەر ﷺ بێ دەنـگ بـوو هـیچ وەڵامـی نەدایـەوە، دوایـی هەسـتاو چـووە ژورەکـەی.. ئـەمجار خەڵکەکە کەوتنە مقۆمقۆو هەندێکیان وتیان: وا باشە بەگوێی حەزرەتی ئـەبو بـەکر بکـەین، هەندێکیان ویتان حـەق وایـە بەقسەی عومـەر بکـەین، هەنـدێکی تریـان وتیـان: وا باشە بەقسەی عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحـە بکـەین، ئـەمجار پێغەمبـەر ﷺ هاتـەوە بـۆ ناویانو فەرمووی: پەروەردگار دڵی هەندێ کـەس ئەوەنـدە نـەرم دەکـا تـاوای لێ دێ لەشـیرو ماسـت نـەرم تـر دەبـێ. هـەروەها خـودا دڵـی هـەدێ کەسـیش وا ڕەق دەکـا لەبەرد ڕەقتر دەبێ، وێنەی تۆ ئەی ئەبو بەکر وەکوو وێنەی ئیبراهیم وایە عليه السلام کە فەرموویەتی ﴿فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي وَمَنْ عَـصَانِي فَإِنَّـكَ غَفُـورٌ رَّحِـيمٌ﴾ (ابـراهیم:٣٦) هەروەها وێنەی تۆ ئەی ئەبو بەکر وەکوو حەزرەتی عیسا وایە کـە فـەرمووی: ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ (المائدة:١١٨).

وێنەی تۆش ئەی عومـەر وەکـوو وێنـەی موسـا وەهایـە کـە فـەرمووی: ﴿رَبَّنَـا اطْمِسْ عَلَى أَمْوَالِهِمْ وَاشْدُدْ عَلَى قُلُوبِهِمْ﴾ (یونس:٨٨) هەروەها وەکـوو وێنـەی نـووح وایە کە فـەرمووی: ﴿رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً﴾ (نـوح:٢٦) ئـەمجار پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ئـەمڕۆ ئێـوە ژێـر دەسـتەن، کـەس لـەئێوە ڕزگـاری نـابێ، مەگەر بەفیدیەو خۆکڕینەوە یان لەملتان دەدرێ، ئیبنو مەسعوود دەفەرموێ: ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ. کە دەفەرموێ: ﴿مَا كَـانَ لِنَبِـيٍّ أَنْ يَكُـونَ لَـهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ﴾

ریوایەتێکی تر هەیە موسلیمو ئەحمەد لەعیکریمەی کوڕی عەمماره، ئەویش لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتی کردەوە کە وەصفی پێغەمبەرو هاوەڵەکەی حەزرەتی ئەبو بەکر دەکا دوای هاتنە خوارەوەی ئایەتەکە ریوایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوانەی فیدیە وەرگرتنیان پەسند کردوە کۆمەڵێکی زۆرن.. ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: حەزرەتی عومەر بۆی گێڕامەوە فەرمووی: کە جەنگی بەدر پەرپا بوو موشریکەکان شکان، حەفتا پیاوی جەنگاوەریان لێ کوژرا، حەفتا شەرکەریشیان لێ بەدیل گیرا، پێغەمبەر ﷺ راوێژی بەئەبو بەکرو عومەرو عەلی کرد، ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەر! ئەوانە خزمو کەس‌وکارن، من پێم وایە فیدیەیان لێ وەربگیرێ باشترە، ئەوەی لێیان وەردەگیرێ دەبێتە هۆی هێزو توانا بۆ ئێمە دژی کافرەکان، وێڕای ئەوەش هیوای ئەوەیان لێ دەکرێ خودا هیدایەتیان بداو موسوڵمان ببن، ببنە یارمەتیدەری ئێمە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەی کوڕی خەتتاب! تۆ چی دەڵێی؟

حەزرەتی عومەر دەفەرموێ: وتم: سوێند بێ من رای ئەبو بەکرم نیەو پەسندی ناکەم، وەلێ ئەگەر رێگەم دەدەی فلان خزمی عومەرە خۆم لەگەردنی دەدەم، رێگە بدە با عەلی لەگەردنی عەقیل بدا، رێگە بدە حەمزە لەملی فلانکەسی خزمی بدا، تا خودا ئاشکرای بکا کە ئێمە هیچ خۆشەویستیەکی موشریکەکانمان لەدەروون دا نیە، ئەوانە گەورەو ملهوڕو سەرانی قورەیشن.. بەلام پێغەمبەر ﷺ رایەکەی ئەبو بەکری بەدڵ بوو، رای عومەری پەسند نەکردو فیدیەی لەدیلەکان وەرگرت.

حەزرەتی عومەر دەڵێ: بۆ سبەینێ کە چووم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ بینیم تەشریفی لەگەڵ ئەبو بەکردا دانیشتبوو هەردوکیان دەگریان، وتم ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو: چی ئێوە دەگرێنێ بابزانم منیش هاوبەشیتان دەکەم لەگریاندا.. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆ ئەوە دەگریم کە هاوەلانت رای ئەوەیان بۆ دام کە فیدیە لەدیلەکان وەربگرم، بێگومان عەزابێکی پیشان درا لەو دارە نزیکە لێم نزیکتر بوو پەروەردگار ئایەتی ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ﴾ تادەگاتە ﴿لَوْلا كِتَابٌ مِنَ اللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ

عَظِـيمٌ﴾. هەڵبەتـە ئـەم ڕیوایەتـە لەهـەموو ڕیوایەتـەكان گـشتی تـرەو ڕاسـت تـرەو لەپێش ترە بۆ بەڵگە پێ هێنانەوە.

بەكورتی: دەبوایە دیلەكان بكوژرانایـە، ئـەوە پەسـند بـوو، وەرگرتنـی فیدیـە لێیان بەئیجتهادی پێغەمبەر بوو ﷺ هەموو ئیجتیهادێكیش وێ دەچێ هەڵەبێ وێ دەچێ ڕاست بێ، بـەڵام ئیجتهادی پێغەمبـەر ﷺ كە هەڵەی تێكـەوت دەبـێ ڕاسـت بكرێتەوە.[1] ئیتر ئەم ئایەتانە نازڵ بوون كە دەفـەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُـونَ لَـهُ أَسْــرَى حَتَّــى يُــثْخِنَ فِــي الأَرْضِ﴾ دروسـت نیـەو نـاگونجیو ڕەوا نیـە بـۆ هـیچ پێغەمبـەرێك لەپێغەمبـەران: كـە دیلـی هـەبن گلیـان بداتـەوەو بەنـدیان بكـا، یـان فیدیەیان لێ وەربگرێ، یان بەمنەتو پیاوەتی مەرەخەسیان بكا. مەگەر پاش ئەوەی بەتەواوی باڵا دەست دەبیو دوژمنان دەشكێنێ، دوژمنانی لـەخوێن دا دەگـەوزێنیو زۆریان لێ دەكوژیو ئـیتر توانـای شـەڕكردیان نـامێنێ، بـاڵا دەسـتیو سـەركەوتن بـۆ موعەسـكەری ئیـسلامیو موسـوڵمانان بەرقـەرار دەبـێ، تـرسو خـۆف دەچێتە دڵـی كافرانەوەو كەسیان زات نەكا جارێكی تر هێرش بۆ سەر موسوڵمانان بكـا، هـەروەها بۆ ئەوەی هیچ كامێك لەو دیلانە هەوڵی زەعیف بـوونی موسـوڵمانان نـەداو نەچـێ جاسووسـییان بەسـەرەوە بكـا، كـە بـەرەڵا كـراو گەڕایـەوە بـۆ وڵاتـی خـۆی زانیـاری دەربارەی هێزو توانای موسوڵمانان بگەیەنێ بەهێزی كافران.

بەڵام ئێوە ئەی موسوڵمانان! لەجەنگی بەدر دا پەلەتان كـرد: كـە دیلـەكانتان گرتن خێرا فیدیەتان لێ وەرگـرتن ﴿تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللَّـهُ يُرِيـدُ الآخِـرَةَ﴾ ئێـوە بەم فیدیە وەرگرتنە دەتانەوێ كاڵای دونیای فانیتان چنگ بكەوێ، پـەروەردگاریش دەیـەوێ ئێـوە پاداشـی قیامـەتتان دەسـكەویو پلـەو پایـەی بەهەشـت بـۆ خۆتـان پەزمەنـدە بكـەن، خـودا دەیـەوێ وشـەی حـەق سـەربكەویو ئێـوە بەشـتی مـادی پووچەوە هەڵەوگیرنەبن، حوكمو یاسایەكتان بۆ دادەڕێـژێ كە ببێتـە هـۆی چـوونە نـاو بەهەشـتو سـەرفرازی دونیـاو قیامـەتتان، ئەمـەش لەرێگـەی خـوێن ڕشـتنی دوژمنـانو سەرخـستنی وشـەی حـەقو چەسـپاندنی عەداڵـەتو یاسـای گونجـاو بـۆ

[1] تەفسیری مونیر ج١٠/٧٠-٧١

ئادەمیزادو عیززەت پەیداکردن بۆ ئایینو قەلاچۆ کردنی دوژمنان دەستەبەر دەبێ.

﴿وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ پەروەردگار بەهێزو دەسەلاتەو خۆشەویستانی خۆی زاڵ دەکا بەسەر دوژمنان دا لێیان بکوژنو لێیان بەدیل بگرن، داناو حەکیمە لەفەرمانو کردارەکانی دا، بۆ هەموو شتێك یاسای موناسیبو حوکمی گونجاو دەردەکا، بۆیە لەکاتێك دا کە هێزو دەسەلات بۆ موشریکەکانەو ئەوان بالا دەستن جڵەو گیری لەموسوڵمانان دەکا کە نابێ فیدیە لەدیل وەربگرنو دەبێ خوێن بڕێژنو زەبری کاریگەرو جەرگبڕ لەدوژمن بدەن، بەمەش عیززەتو سەربەرزیو شانو شەوکەتو سامو هەیبەت بۆ موسوڵمانان دەستەبەر دەبیو دوژمن لێیان دەترسێ وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ (المنافقون:٨)

﴿لَوْلا كِتَابٌ مِنْ اللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ خۆ ئەگەر پەروەردگار لەوەپێش لەلەوحولمەحفوظ دا بڕیاری ئەوەی نەدایە کە لێبووردنی هەیە بۆ کەسێك ئیجتهاد بکاو بەهەڵە بچێ، ئەگەر حوکمی لێخۆشبوونی لەوانە دەرنەکردایە، ئەوە بەهۆی ئەو فیدیەی کە بەپەلە لەدیلەکانتان وەرگرت، سزایەکی گەورەو بەئێشتان تووش دەبوو، چونکە ئەوانەی ئیجتهادیان کردو تێفکرینو وایان بەپەسەند زانی کە بییان هێڵنەوەو نەیانکوژن، پێیان وا بوو: هێشتەنەوەمیان لەوانەیە ببێتە هۆی ئیسلام بوونیانو تۆبەکردنیان، فیدیە لێ وەرگرتنیشیان دەبێتە هۆکاری بەهێز بوونیان بۆ تێکۆشانو جیهاد لەرێگەی خودادا ئەوەیان لەبیر چوبوو کە کوشتنی دیلەکان شکۆمەندی بۆ موسوڵمانان دەستەبەر دەکاو سامو هەیبەتیان دەخاتە دڵی کافرەکانەوە. هەندێك لەراڤەکەرانی قورئان دەڵێن: ئەو بڕیارەی پەروەردگار لەلەوحولمەحفوظ دا نووسیویەتیو چەسپاوە بریتییە لەوە کە ئەهلی بەدر سزا نەدا، ئەوان خودا لێیان خۆش بووە، یان بڕیارو حوکمەکەی ئەوەیە: کە هیچ نەتەوەیەك سزا نەدا مەگەر پاش پێ راگەیاندنو جەخت لەسەر کردنەوە، دەی خۆ ئەصحابی بەدر لەوە پێش ئەوەیان پێ رانەگەیەندرا بوو کە فیدیە لەدیل وەرنەگرن کەوابێ ئەمان بەر ئەو حوکمە دەکەونو سزا نادرێن..

یان تەنها تاوانی ئەوان ئەوە بوو کە پەلەیان کرد بۆ وەرگرتنی دەسکەوتی جەنگو هێشتا بۆیان حەڵاڵ نەکرابوو. کە لەوەبەولاوە خودا بۆیان حەڵاڵ دەکا. واتە: ئەگەر ئەم حوکمە ئیلاهییە پێش وەختە نەبوایە کە خودا بڕیویەتیەوە دەربارەی ئێوەی موسوڵمان، لەسەر ئەو فیدیە وەرگرتنە سزایەکی سامناکتان تووش دەبوو، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە کارەکەیان زۆر سامناکو خەتەرناك بووە.

ئەمجار دوای ئەوەی کە خودا رەخنەی لەموسوڵمانان گرت لەسەر فیدیە وەرگرتن لەدیلەکان، بەفەضلو مینەتی خۆی، بڕیاری بۆ حەڵاڵبوونیان بۆ دەداو بۆیان دەخاتە چوارچێوەی دەسکەوتی شەڕو بەو غەنیمەتە حلێبی دەکا کە لەسەرەتای سورەتەکە دا بۆی حەڵاڵ کردبوون. ئەوەشمان لەیاد نەچێ دەسکەوتی جەنگ بۆ نەتەوەی هیچ پێغەمبەرێك حەڵاڵ نەبوە. غەنیمەتی جەنگ تەنها بۆ نەتەوەی ئیسلام حەڵاڵ بووەو شتێکە تایبەتی نەتەوەی پێغەمبەری ئیسلام بووە... دەفەرموێ: ﴿فَكُلُوا مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلالاً طَيِّباً﴾ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان دەستکەوتی جەنگتان بۆ حەڵاڵ کرا، وەرگرتنی فیدیەشتان بۆ رەوایەو وەکوو دەستکەوتی جەنگ وایە. کەوابێ لەو فیدیەی وەرتان گرتووە بخۆنو بەکاری بێنن لەحاڵێك دا کە بۆتان رەوایە، ماڵێکی پاکو خاوێنەو لەزاتی خۆی دا حەرام نیە، هاوکات لەگەڵ خواردنو بەکار هێنانی فیدیە، تەقوای خودا بکەنو لەئاگری دۆزەخ بترسێن، لەهەموو کاروبارێکتان دا لایەنی خودا پاشگوێ مەخەن، ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگار لێخۆشبوونو لێبوردنی زۆرو فراوانە بۆ ئەو کەسانەی دەیەوێ رەحمەتو لێخۆشبوونی بیانگرێتەوە، واتە: دەبێ تەوازونێك لەهەستی خۆیان دا بەرامبەر خودا بێننە کایەوە؛ بەجۆرێك بەرەحمەتی خودا بۆغرا نەبنو تەقوای خودایان لەیاد نەچێ.

لەخودا بترسن سەرپێچی فەرمانەکانی مەکەن، شتێك کە سەرپێچی نەهیو فەرمانی خودای تێدا بێ توخنی مەکەون، لەوەدواش تاوان ئەنجام مەدەن، خودا لەو تاوانەی کە فیدیە وەرگرتنتانە خۆش دەبێ، بەرەحمو بەبەزەییە پێتان بەوەی کە فیدیە وەرگرتنی بۆ حەڵاڵ کردن. بەشێکیش لەرەحمەتی خودا بۆ بەندەکانی ئەوەیە: کە تۆبەیان لێ وەردەگریو لەتاوانیان خۆش دەبێ.





ئەمجار پەروەردگار دەستێکی رەحمەت بەسەر دڵی دیلەکان دا دێنیو هیواو ئاواتیان تێدا دروست دەکا، دەرگای خێرو ئەمەلیان بۆ دەکاتەوە، روناکاییو نوور دەخاتە ناو دڵیانەوە، پابەندیان دەکا بەدوا رۆژێکی وا لەرابووردویان باشتر بێ، بەتەمای ژیانێکیان دەکا لەهی پێشوویان کامەرانی تر بێ، ماڵو سامانو کەسبو کارێکیان بۆ دەست نیشان دەکا زۆر باشترە لەو ماڵو سامانەی لەکیسیان چووەو لێیان وەرگیراوە دوای ئەوانە هەموو، ئەمجار بەتەمای لێخۆشبوونو رەحمەتی بێ پایانی خودایان دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِمَنْ فِي أَيْدِيكُمْ مِنَ الأَسْرَى إِنْ يَعْلَمْ اللَّهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْراً يُؤْتِكُمْ خَيْراً مِمَّا أُخِذَ مِنْكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو ئادەمیزادە موشریکانە بڵێ: کە بەدیلی کەوتوونە دەست ئێوەو فیدیەتان لێ وەرگرتوون پێیان بڵێ: ئەگەر لەدڵتان دا خێرێکی تێدا بیو زانیاری خودا پێیەوە پەیوەست بیو ئێوە ئێستایان لەداهاتوو دا ئیمانو ئیخلاصو مەبەستو نیازتان پاك بیو سووربن لەسەر تاعەتی خوداو شوێنکەوتنی پێغەمبەر لەهەموو کردەوەیەکتان دا، تۆبە بکەن لەکوفرو بێدینی رابووردووتانو واز لەهەموو تاوانێك بێنن، عەزمتان جەزم بێ لەسەریارمەتیدانی پێغەمبەرو پەیامەکەیو بەخەیاڵیش دژایەتی نەکەن، ئەوە دڵنیابن پەروەردگار زۆرترو باشترتان لەوەی لێتان وەرگیراوە دەداتەوە، زەرەرو زیانی پێشووتان بۆ قەرەبوو دەکاتەوە، سەرباری ئەوەش ﴿وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ لەتاوانی شیرکو بێدینیتان خۆش دەبێ، پەروەردگار خۆشبوو لێبوردووە بۆ ئەو کەسانەی تۆبە لەتاوان دەکەن، بەرەحمو بەبەزەییە بۆ خوداپەرستان بەچاودێری خۆیو توفیقو رەهنومایی کردنی کۆمەکیان پێ دەکا!

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەو دیلانەی ئەم ئایەتە باسیان لێوە دەکا عەبباسو هاوەڵانی بوون، بەپێغەمبەریان گوت: ئیمانمان بەپەیامەکەت هێنا، شایەتی دەدەین تۆ پێغەمبەری خودای، بانگەوازی نەتەوەکەش بۆ ئەم راستییە دەکەین، ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو!

بەڵێ ئایینی ئیسلام کە رێگا دەدا دیل لای موسوڵمانان بمێنێتەوە بۆ ئەوە رێگا دەدا تا لەدڵیان دا خێرو هیواو ئاواتی خۆشبەختی بڕسکێنیو مشتو ماڵی دڵو دەروونیان بکا، دەرگای خێرو ئەمەلو گەشبینیو راستاڵییان لێ بکاتەوە بۆ

ئەوە دیل لای خۆی گل دەداتەوە، کە ئامێری ئیستقبال‌و وەرگرتن‌و وەڵامدانەوەی هیدایەتیان تێدا بوروژێنێ، نەك بۆ ئەوە تۆڵەیان لێ بکاتەوە، یان بۆ ئەوەی بیانچەوسێنێتەوەو ئیستیغلالیان بکا، وەکوو لەجەنگو هێرشەکانی فارس‌و رۆمان‌و گەل‌و نەتەوەکانی تردا باوبوو.

ئیمامی زوهری لەکۆمەڵێکەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: قورەیش ناردیان بۆ کڕینەوەی دیلەکانیان، هەر هۆزەو فیدیەی دیلەکانی خۆی دا.

عەبباس وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من موسوڵمان بووم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی دەزانم‌و ئاگام لەموسوڵمان بوونەکەت هەیە، ئەگەر وا بێ وەکوو دەڵێی ئەوە خودا پاداشت دەداتەوە، بەڵام دیمەنی رواڵەتیت ئەوە دەگەیەنێ کە تۆ دژی ئێمە هاتووی بۆ جەنگ، دەبێ فیدیەی خۆتو دوو برازاکانت: (نەوفلی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولموطەلیب، عەقیلی کوڕی عەتەبەی کوڕی عەمر؛ برای بەنیلحاریثی کوڕی فیهریش بدەی.

عەبباس وتی: ناتوانم‌و نیمە ئەو حەمەکە ماڵە بدەم ئەی پێغەمبەری خودا. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەو ماڵە لەکوێیە کە ژێر خاکت کردو بەئومەلفەضلت گوت: ئەگەر لەم سەفەرە نەهاتمەوە، ئەوە ئەم ماڵەی ژێر خاکم کرد بۆخۆتو فەضڵ‌و عەبدوڵڵاو قوثەم بێ؟ عەبباس کە ئەمەی بیست وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەراستی تۆ رەوانەکراوی خودای‌و دەزانم تۆ پێغەمبەری، بەراستی ئەمە شتێك بوو جگە لەخۆم‌و ئومولفەضل کەسی تر ئاگای لێی نەبوە، دەی حیسابم بۆ بکەن لەو ماڵەی پێمەوە گیراوە بیست ئۆقیە زێڕی بۆ خۆتان بەرن! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی نا ئەو ماڵە دەسکەوتی جەنگەو بەغەنیمەت حسێبە ئەوە هی خۆمانە. ئیتر عەبباس بیست ئۆقیە زیوی بۆ برازاکەی‌و هاوپەیمانەکەی دا بەم هۆیەوە ئەم ئایەتە ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِمَنْ فِي أَيْدِيكُمْ مِنْ الأَسْرَى......﴾ هاتە خوارێ.

جا عەبباس دەیگوت: پاشان خودا کەلێنی بۆ پڕکردمەوە زۆر بەشی باشتری لەوەی لێم وەرگیرابوو پێ دام، بووم بەخاوەنی بیست کۆیلە هەموویان بازرگانییان بەماڵو سامانێکی زۆر بۆ دەکردم، هیوای لێخۆشبوونی پەروەردگاریشم هەیە.

ئەبو شەیخ واتە ئیبنو حەیان لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: عەبباسو هاوەڵەکانی بەپێغەمبەریان گوت: ئیمانمان هێنا بەو پەیامەی بۆت هێناوین، شایەتی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خودای ئیتر ئایەتی: ﴿إِنْ يَعْلَمْ اللَّهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْراً.....الآية﴾ هاتە خوارێ.

﴿وَإِنْ يُرِيدُوا خِيَانَتَكَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! ئەگەر ئەو دیلانە بەتەما ئەوە بن کە خیانەتت لێ بکەن لەم روەوە بەڕواڵەت موسوڵمان بنو لافی ئاشتیو ئاشتەوایی لێ بدەن، پاشان پەیمان شکێنی بکەنو وادە بەخیلاف دەربچن، ئەوە لێیان مەترسەو چ بایەخێکیان نیەو چییان پێ ناکریو بەمراد ناگەن وەکوو لەوەپێش ئاواتیان بەدی نەهاتووە. ئەوەتا ﴿فَقَدْ خَانُوا اللَّهَ مِنْ قَبْلُ﴾ بێگومان ئەوان لەپێش روداوی جەنگی بەدردا خیانەتیان لەخودا کردوە بەوە کە کافر بوونو پەیمانی رۆژی ﴿قَالُوا: بَلَى﴾یان شکاندوە؟! وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەئەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ؟ قَالُوا: بَلَى﴾ (الأعراف:١٧٢).

بەڵگەی جۆراو جۆری لەبوونەوەردا نیشان دان، عەقڵو هۆشی پێداون بۆ ئەوەی بەکاریان بێننو دان بەتاکو تەنهایی خودادا بنێن. بەڵام ئەوان پاشگەز بوونەوەو پەیمانیان شکاند؟ ﴿فَأَمْكَنَ مِنْهُمْ﴾ پەروەردگار لەشەڕی بەدردا ئێوەی بەسەریان زاڵ کردو بەو دەردەی بردن کە دیتان، خۆ ئەگەر سەرلەنوێ رو لەخیانەتکاری بکەنەوەو بەتەمابن فێڵت لێ بکەن ئەوە خودا تۆ بەسەر ئەوان دا زاڵ دەکاتەوەو تێکیان دەشکێنێ! ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ پەروەردگار ئاگاداری نیازو مەبەستی ئەوانەیەو داناو لێزانە لەدانانی پیلانو نەخشەی داو خاوەن دەسەڵاتە لەئەنجامدانی هەموو کارێکی دا، موسوڵمانان بەسەر کافران دا سەردەخا ئەمەش دڵدانەوەی پێغەمبەری تێدایەو موژدەی سەرکەوتنیان پێ دەداو هەڕەشەی تێشکان لەکافرەکان دەکا، ئاشکراشە پەروەردگار بەسەر هەموو شتێك لەبوونەوەردا

ئاگادارەو دەسەڵاتی رەهای هەیە بۆ ئەنجام دانی هەر کارێکی بیەوێ بیکا، مامۆستا سەیید لەقورطوبییەوە ئەویش لەئیبنولعەرەبییەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: کاتێك موشریکەکان ئەو هەموو دیلەیان لێ گیران، هەندێ لەدیلەکان بەدەم موسوڵمان بوون، لەناخەوە ئیمانیان نەهێنا بوو، بەتەواوی دانیان بەئایین دا نەنابوو، دەیانەویست لەموسوڵمانەکان نزیك ببنەوەو لەکافرەکانیش دوور نەکەونەوە، واتە زەمانەسازییان دەکرد.

لەم رووەوە زانایانی ئیسلام دەڵێن: ئەگەر کافر بەدڵو بەدەم دانی بەئیسلام دا ناو موسوڵمان بوو، بەڵام بەکردەوە نەیچەسپاندو عەزیمەتی بەردەوام نەبوو تێیدا بەموسوڵمان حسێب ناکرێ، ئەگەر ئەم هەڵوێستە لەموسوڵمانێکەوە سەری هەڵدا ئەوە دەبێتە کافر. مەگەر بەهۆی وەسوەسەو ختوکەوە بێ ناتوانێ بەرەنگاری بکاو ناتوانێ لەخۆی دووربخاتەوە، ئەو حاڵەتە خودا چاوپۆشی لێ کردوەو بەهەڵوێستی حلێب نەکردوە.

## پۆلێن کردنی موسوڵمانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ لەڕوانگەی ئیمانهێنانو کۆچکردنەوە

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيْكُمُ ٱلنَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمِۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ

بَصِيرٌ ﴿٧٢﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ إِلَّا تَفْعَلُوهُ
تَكُن فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴿٧٣﴾ وَالَّذِينَ
آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوا وَّنَصَرُوا
أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٧٤﴾ وَالَّذِينَ
آمَنُوا مِن بَعْدُ وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا مَعَكُمْ فَأُولَٰئِكَ مِنكُمْ وَأُولُوا
الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ
عَلِيمٌ ﴿٧٥﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار یاسای جەنگو ئاشتی لەگەڵ کافران دا بۆ موسوڵمانان روونکردەوە، حوکمی چۆنیەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ دیلەکانی جەنگ دا دیاری کرد، ئەمجار چۆنیەتی پەیوەندی کۆمەڵگای موسوڵمان دیاری دەکاو چۆنیەتی پەیوەندییەکانی نێوان موسوڵمانانو کۆمەڵگاکانی تر دەست نیشان دەکا، حوکمی رێکو پێک بۆ ئەم پەیوەندییانە دەردەکا، ئیتر لەروانگەی ئەم پەیوەندییانەوە چۆنیەتی کۆمەڵگای موسوڵمان تێدەگەین، بۆ مان دەردەکەوێ ئەو بنەمایانەی کە ئەو کۆمەڵگایە پەیرەوی دەکا چۆنن‌و چین!

دەزانین پەیوەندییەکە پەیوەندی خوێن‌و گۆشت نیە، پەیوەندی خاکو رەگەز نیە، پەیوەندی مێژوو زوبان‌و ئابوری نیە، بەڵکو پەیوەندی بیرو باوەڕە، پەیوەندی قاعیدەو قیادەیە لەسەر بنەمای ئایین‌و خۆبەخت کردنیان لەپێناوی داو ئەندازەی موسوڵمانان پۆلێن دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوا وَنَصَرُوا أُولَئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَالَّذِينَ

آمَنُوا وَلَمْ يُهَاجِرُوا مَا لَكُمْ مِنْ وَلايَتِهِمْ مِنْ شَيْءٍ حَتَّى يُهَاجِرُوا﴾ ئايەتەكە موسـوڵمانان دەكا بەچوار كۆمەڵو گرۆهو تاقم:

١- ئەو موسوڵمانانەى پێش جەنگى بەدر كۆچيان كردوە. واتە: كۆچكرنەكەيان پێش پەيمانى ئاشتى حودەيبييە بووە.

٢- ئەنصارەكان: دانيشتوانى شارى مەدينە كە موسوڵمان بوونو كۆچكارە موسوڵمانەكانيان لەخۆگرتنو حەوانديانەوە.

٣- ئەو موسوڵمانانەى كە كۆچيان نەكردوو لەوڵاتى كوفردا مانەوە.

٤- ئەو موسوڵمانانەى پاش پەيمانى حودەيبييە كۆچيان كردوە.

**تاقمى يەكەم:**

ئەو موسوڵمانانەن كە لەسەرتاى ئايەتەكەوە باس كراونو رەوشتەكانيان ديارى كراوە، بە ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَاهَدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ﴾ پێناسە كراون، ئەوانەى بڕوايان بەخوداو بەپێغەمبەرى خودا هێناوە، دەستەى يەكەى كۆچكارانن، لەپێش جەنگى بەدردا تا پەيمانى ئاشتى حودەيبييە ساڵى شەشەمى كۆچى كۆچيان كردوە، ئەو تاقمە موسوڵمانانەن زێدو نيشتمانى خۆيان بەجێ هيچشتو وازيان لەماڵو دارايى خۆيان هێناو هاتن بۆ يارمەتى ئايينى خوداو بڵاوكردنەوەى بيرو باوڕى ئيسلامى. خۆيانو ماڵو سامانيان لەپێناو ئايينى خودادا بەخت كرد، ئەم تاقمە بەتەواوى لێبڕانو ئەوپەڕى فيداكارىو تێكۆشانيان ئەنجام دا، ئەمانە لاى خوداو لەتەرازووى خودادا دەستەيەكى كاملو رێزدارن، خاوەنى فەضلو فيداكارين لەرێگاى ئيسلام دا، پەروەردگار بەخاوەن ئيمانو بڕوا بتەو ئامازەى بۆ كردوون، بەوە وەصفى كردوون كە بڕوايان بەهەموو پەيامى پێغەمبەر ﷺ هەيە. هەروا وەصفى بەوە كردوون كە لەپێناو ئايينى خودادا نيشتمانى خۆيان بەجێ هێشتووەو وازيان لەماڵو سامانى خۆيان هێناوە، لەبەر خاترى ئايينى ئيسلام كۆچيان كردوە بۆ رەزامەندى خوداو يارمەتيدانى پێغەمبەر ﷺ بوونە ئاوارەو وڵاتيان جێ هێشتووە، هەروەها وەصفى بەوە كردوون كە لەرێگاى خودادا گيانو ماڵى خۆيان بەخت كردوەو جيهاديان كردووە.

جیهاد بەماڵ: بریتییە لەماڵبەخشین لەبواری هاریکاریکردنی موسوڵمانان دا ماڵ پێدانیان بۆ کۆچکردنو بەرگری کردن لەئایینی خودا، وەکوو ئەوە کە ماڵو سامانی خۆیان خەرج کردوە بۆ پێداویستی جەنگو پێداویستی موسوڵمانان، ئەمە جگە لەو گیانفیداییو دڵ فراوانییەی نواندیان کە ماڵو سامانی خۆیان لەمەککە جێ هێشتو وازیان لەهەموو بەرژەوەندییەکی دونیایی خۆیان هێنا!

جیهاد بەنەفس: بریتییە لەجەنگان دژی دوژمنانو خۆبەزلزانین بەسەریان داو بایەخ پێ نەدانیان، هەروا ئەو نارەحەتیەی کە پێش ئیزن بەجەنگان لەگەڵ کافران دا تووشیان هاتووە، هەروەها خۆڕاگرییان لەسەر ئەزیەتو نارەحەتیو گیرو گرفتی کە بەردەوام تووشی موسوڵمانان دەبێ لەپێناو ئایینەکەیان دا.

پێش خستنی جیهاد بەماڵ لەسەر جیهاد بەنەفس لەم رووەوەیە کە جیهاد بەماڵو سامان بەخشین پتر پێداویستی موسوڵمانان دابین دەکا، جیهاد بەنەفس بەبێ جیهاد بەماڵ دەستەبەر نابێو نایەتە ئەنجام، چونکە جەنگ پێویستی بەئامێری جۆراو جۆر هەیە ئەویش بەماڵو سامان دابین دەکرێ کەسێك بەبێ دابینکردنی ئامێری جەنگ بچێتە بەرەنگاری دوژمن خۆبەفیڕۆ دانەو خۆخستنە ناو تالووکەوەیە.

بەکورتی پەروەردگار دەستەی یەکەمی کۆچکارانی بەچوار ڕەوشت پێناسە کردوە: یەکەم ئیمان بەخوداو بەفریشتەو بەنامە ئاسمانییەکانو پێغەمبەرانو ڕۆژی دوایی. دووەم: کۆچکردن لەپێناو ئایین دا. سێیەم: جیهادو تێکۆشان بەماڵو بەگیان دژی دوژمنان. چوارەم: دەست پێشخەریو ڕەچەشکاندن بۆ ئەم کردارو هەڵوێستانە.

**تاقمی دووەم:**

ئەوانەن کە بە ﴿وَالَّذِينَ آوَواْ وَّنَصَرُواْ﴾ پێناسە کراون. واتە: ئەو یارمەتیدەرانەی کە داڵدەی پێغەمبەریان داو کۆچکەرانیان حەواندەوەو لە خۆیان گرتنو لە ماڵی خۆیاندا کردیانن بە بەشە برا، مەدینە بوو بە پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامو بڵاوبونەوەی بانگەوازی ئایینی ئیسلام بە هەموو کونو قوژبنی سەر

زەویدا، بوو بە پەناو پەناگای کۆچکەرانو قەڵای مەحکەمی موسوڵمانان. ئەو یاریدەدەرانە لە پێناو ئایینی خودادا کۆچکارانیان کردن بە بەشە براو هاوپشتی ماڵو سامانیان کام شتی چاکو بە نرخە ئەوەیان دا بە برا کۆچکەرەکانیانو نموونەی هەرە بەرزی دڵ فراوانیو خۆنەویستی بوون. ئەمانەش لەرێزو فەضلو شکۆمەندی دا بەپلەی دووەم دێنو دەستەی دووەمن.

﴿أُوْلَـئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ﴾ ئەوانە: هەندێکیان یارمەتیدەرو هەم ئاهەنگی هەندێکی تریانن، دۆستو پشتو پەنای یەکترین بۆ پشتگیری کردنی حەقو بڵاوکردنەوەی ئایین، هەریەکەیان لەباتی ئەویتریان کاری یەکتری ئەنجام دەدەن، بەجۆرێك هەریەکەیان دەڵێی کار بۆ خودی خۆی دەکا. هەریەکەیان بۆ ئەویتریان لەهەموو کەسی تر شیاوترە. چونکە مافو بەرژەوەندییان هاوبەشە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ برایەتی لەنێوان کۆچکارانو یارمەتیدەران دا چەسپاند، لەنێوان هەر کۆچکەرێکو یارمەتیدەرێك دا برایەتی دامەزراند، بەجۆرێك کە لەپێش خزمایەتی دا میراتیان لەیەکتری دەگرت، ئەم دابو نەریتە بەردەوام بوو، هەتا کۆچکاران بەهۆی بازرگانیو شتی ترەوە دەوڵەمەند بوونو بوژانەوە، ئەمجار پەروەردگار ئەم یاسایەی هەڵوەشاندەوە، لەصەحیحی بوخاری دا فەرموودەیەك هەیە ئیبنو عەبباس ریوایەتی کردوە، ئەم راستییە دەسەلمێنێ.

ئیمامی ئەحمەد لەجەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلییەوە فەرموودەیەکی ریوایەت کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (کۆچکارو یاریدەدەران هەندێکیان دۆستو یارمەتیدەری یەکترین. ئازادانی قورەیشو ئازادانی ثەقیف برێکیان وەلیو دۆستو سەرپەرپشتیاری یەکترینو تا ڕۆژی قیامەت ئەم هاریکاریو هەم ئاهەنگییە بەرقەرارو بەردەوامە.) وەڵێ ئەم فەرموودەیە: تەنها ئەحمەد ریوایەتی کردوە...

لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلام لەمەدینە دا هۆی میراتگرتن لەنێوان موهاجرینو ئەنصار دا موسوڵمانیەتیو کۆچکردن بوو، نەك خزمایەتیو شتی. موسوڵمان کە لەدەرەوەی مەدینە بوایە میراتی لەموسوڵمانی ناو مەدینە

نەدەگرت، مەگەر ئەو موسوڵمانە کۆچی بکردایە بۆ مەدینەو پەیوەندی لەیەکتر دەگرت.

ئابەو جۆرە پەیوەندی نێوان موهاجرینو ئەنصارو برایەتییان هەموو بوارێکی گشتی گرتەوەو لەهەموو پەیوەندیو بەرژەوەندییەك دا براو خوێنگرو میراتگری یەکتری بوون.

قورئانی پیرۆز زۆر وەصفو پێداهەڵدانی کۆچکارانو یاریدەرانی ئەنجام داوە، لەزۆر ئایەت دا ئەو هاریکاریو هەم ئاهەنگییەی نێوانیانی بەشێوەی مەدح ئامێز هێناوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الأَنْهَارُ﴾ (التوبة: ١٠٠) ﴿لَقَد تَّابَ الله عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ﴾ (التوبة: ١١٧) ﴿لِلْفُقَرَاء الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَاناً وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ، وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ (الحشر: ٨-٩) .

وەکوو دیارە ئایەتەکان، کۆچکارانیان پێش یارمەتیدەران خستووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە کۆچکاران ڕێزدارترن، زانایانیش وەکوو ئیبنو کەثیر دەڵێ: کۆڕایان لەسەر ئەم زێدە ڕێزەی کۆچکاران هەیەو، چ خیلافێکیان لەم بارەوە لێوە نەبیستراوە؛؛

**تاقمی سێیەم:**

ئەو موسوڵمانانە بوون کە ئیمانیان هێنابوو، بەڵام کۆچیان نەکردبوو، بەبیرو باوەڕ چووبوونە ڕیزی موسوڵمانانەوە، بەڵام هێشتا پەیوەندییان بەکۆمەڵگای موسوڵمانانەوە نەکردبوو، کۆچیان نەکردبوو بۆ وڵاتی ئیسلامو نەهاتبوونە ژێر سایەی ئەو حکوومەتە ئیسلامییەی کە شەریعەتی خودا تێیدا بەرقەرارەو سەرکردایەتی ئیسلامی کاروباری هەڵدەسوڕێنێ، هێشتا پەیوەندییان نەکردووە بەو کۆمەڵە موسوڵمانەی کەبوونە خاوەن وڵاتێکی وا شەریعەتی خودای

تێدا حاکمو کارپێکراوە، ئەم تاقمە پەروەردگار بەم شێوە باسیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يُهَاجِرُوا مَا لَكُمْ مِنْ وَلَايَتِهِمْ مِنْ شَيْءٍ حَتَّى يُهَاجِرُوا﴾ ئەوانەی بڕوایان بەپەیامی پێغەمبەر ﷺ کردووە، بەڵام لەمەککەوە بۆ مەدینە کۆچیان نەکردووە، لەخاکی کوفردا مانەوەو لەژێر دەسەڵاتی موشریکەکان دان، واتە: لە (دار الحرب) ماون، ئەوانە هیچ وەلایەتێکی یارمەتیدانو هاریکاری موسوڵمانانی (دار الإسلام)یان بۆ ناچەسپێ، ئەوانە بەئەندامی کۆمەڵگای ئیسلامی حسێب ناکرێن، چونکە ئەوانە بەفیعلی بەشێك نین لەکۆمەڵگای ئیسلامیو بەتەواوی گەردن کەچی سەرکردایەتی ئیسلامی نین. بەڵام ئەگەر موسوڵمانێك لەلایەن هێزی کوفرەوە دەستگیر کرا لەوڵاتی ئیسلام دوور خرایەوە، ئەوە ئەو دیلە موسوڵمانە حوکمی موسوڵمانانی دانیشتووی (دار الإسلام) ی هەیە.

﴿وَإِنِ اسْتَنْصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ﴾ ئەگەر داوای یارمەتییان لەئێوە کرد دژی ئەوانەی دەیانچەوسێننەوە لەسەر ئایین، ئەوە پێویستە کۆمەکییان پێ بکەنو بەهانایانەوە بچن. ﴿إِلَّا عَلَى قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ﴾ مەگەر داواکردنی یارمەتیو کۆمەکییەکەیان لەدژی گەلو نەتەوەیەك بێ کە لەنێوان ئێوەو ئەو گەلو نەتەوەدا عەهدو پەیمان هەبێو ئەوان پابەندی پەیمانەکەیان بن، ئەوە ئێوە بەهانایانەوە مەچنو وەڵامیان مەدەنەوە، ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ پەروەردگار ئاگادارو بینایە بەو کردارانەی دەیانکەنو بەو هەڵوێستانەی دەیانوێنن، هیچی لێ گوم نابێ، وریابن سنوورەکانی مەشکێنن، بۆ ئەوەی نەکەونە بەرسزاو تۆڵەی سامناکی. هەر کردەوەیەکی دەیکەن خودا چاوی لێیە، سەرو بنی دەزانێ، سەرەتاو ئاکامی لانومایانە، هۆکارو سەرەنجامی هەموو کردەوەیەکی لا ئاشکرایە.

بەکورتی ئەگەر لەغەیری (دار الإسلام) دا موسوڵمانان لەسەر ئایین دەچەوسێنرانەوەو داوای کۆمەکییان لەموسوڵمانانی (دار الإسلام) کرد دەبێ موسوڵمانان بەهانایانەوە بچن بەمەرجێ بەهاناچوونەکەیان نەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی عەهدو پەیمان لەگەڵ لایەنێکی تر، ئەگەر یارمەتیدانەکە دەبوە هۆی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی نێوان ئێوەو موعەسکەری دوژمن ئەوە نابێ ئێوە یارمەتی موسوڵمانە چەوسێندراوەکان بدەن، تەنانەت ئەگەر ئەو موعەسکەرە

دەستدرێژیکاریش بێ‌و ستەم لەو تاکە تاکە موسوڵمانانە بکاو لەسەر ئایینو بیرو باوەڕ بیانچەوسێنێتەوە هەر نابێ ئێوە بەهانایانەوە بچنو پەیمانەکەی نێوان خۆتانو ئەو موعەسکەرە هەڵوەشێننەوە... چونکە ئیسلام ڕێگە نادا غەدرو خیانەت بکرێ‌و پەیمان هەڵوەشێندرێتەوە، بەڕاستی ئەمە نایابترین پابەندبوونی موسوڵمانانە بەوادەو پەیمانی خۆیانەوە، باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە موسوڵمانان چەند گرنگی بە عەهدو پەیمان دەدەنو چەند بەپەرۆشن بۆ پارێزگاری کردنی پەیمانو وادەو بەڵێنی خۆیان..

ئەم تاقمە پێك هاتبوو لەو تاکە تاکە موسوڵمانانەی لە مەککەدا مابوونەوە، یان لەخێڵە عەرەبەکانی دەوروبەری مەدینەدا بوون، بەبیروباوەڕ موسوڵمان بووبوون بەڵام پەیوەندییان بەکۆمەڵگای موسوڵمانانەوە نەکردبوو، بەتەواوی گەردنکەچی ئەو سەرکردایەتیە ئیسلامییەی پێغەمبەر نەبووبوون.

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ﴾ ئەوانەی کافرو خوا نەناسن، بڕێکیان هاریکارو هەم ئاهەنگی یەکترین، لەسەر بیرو باوەڕی بەتاڵ کۆمەکی بەیەکتر دەکەن، لەدژی ئێوەی موسوڵمان پشتی یەکتری دەگرن، ئێوە دۆستایەتی‌و هەم ئاهەنگییان مەکەن، ﴿إِلاَّ تَفْعَلُوهُ﴾ ئەگەر ئێوە ئەم فەرمانانە جێبەجێ نەکەن، لەناو خۆتان دا هەم ئاهەنگ نەبن، یارمەتی یەکتر نەدەن، هەروەها پەیوەندی خۆتان لەگەڵ کافران دا نەپچڕێنن، پابەندی وادەو بەڵێنی خۆتان نەبن، ﴿تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ﴾ فیتنەو ئاشووب لەنێو خۆتان دا بەرپا دەبێ، دابو نەریتی جاهیلییەت بەسەر یاسای ئیسلام دا زاڵ دەبێ، سەرزەوی دەبێتە فیتنەو ئاشووب، جاهیلییەتو نەفامی بەسەر ئیسلام دا بوغرا دەبێ، بەندایەتی کردن بۆ ملهوڕان بەسەر بەندایەتی کردن بۆ خودا زاڵ دەبێ. بیرو باوەڕی ئایینی حەق لاواز دەبێ، کوفرو بێدینی پەرە دەستێنن، خوێنڕشتن پەیدا دەبێ‌و فیتنە هەموو شتێك دەگرێتەوە، حەقو ناحەق تێکەڵاو دەبن، موسوڵمانو کافر تێکەڵاو دەبنو لێك جیا ناکرێنەوە، بەمەش زێدە فەسادو ئاشووب لەئایینو دونیادا بەرقەرار دەبێ.

بەڕاستی ئەمە هەڕەشەیەکی گەلێ مەزنەو تا بڵێی سامناکە، ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئەو موسوڵمانانەی کەسایەتی‌و بوونی خۆیان لەسەر بنەمای هەم ئاهەنگی‌و وەلاو دەربڕین بۆ سەرکردایەتی ئیسلام ڕانەگەیەنن تاوانیارن‌و بەرپرسیارن لەبەرامبەر خوداو ئایین دا، جگە لەوەی کە لەژیانی خۆیان دا زەرەرمەند دەبن، تاوانی ئەو فیتنەو فەسادە گشتی‌یەشیان دەکەوێتە ئەستۆ!!

ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوە: کە ئایینی ئیسلام چەند بەتەنگەوەیە بۆ پارێزگاری کردنی کەسایەتی موسوڵمان‌و سەربەخۆیی‌و ئازادی لەنیشتمانی خۆی دا، چەندە مەبەستیەتی کە موسوڵمانان لە(دار الكفر) دا نەمێننەوە.

ئیبنو جەریر فەرموودەیەکی پێغەمبەری ﷺ ڕیوایەت کردوە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی: (أنا بريئ من كل مسلم بين ظهراني المشركين) ئەمن بەریم لەهەر موسوڵمانێك کە لەژێر سایەی موشریکان دا ژیان بەسەر دەبا، پاشان فەرمووی: (لا يتراءى ناراهما) باوەندە لێك دووربن چاویان لەئاگری یەکتر نەبێ.

ئەمجار سیاقی قورئان جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەوە بچەسپێنێ کە بیرو باوەڕی حەق‌و ڕاست لەو موسوڵمانانەدا ڕەنگ دەداتەوە کەئەم ئایەتە پێناسەیان دەکاو موهاجرین‌و ئەنصار دەگرێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ ئەو موسوڵمانانەی ئیمانیان بەپەیامی ئیسلام هێناوەو لەپێناو ئایینی حەق داکۆچیان کردوەو وازیان لەماڵ‌و سامان‌و زێدی خۆیان هێناوەو، تێکۆشاون‌و بەماڵ‌و گیانی خۆیان لەپێناو بیرو باوەڕیان جیهادیان کردوەو جەنگاون، هەروەها ﴿وَالَّذِينَ آوَوا وَنَصَرُوا﴾ ئەو موسوڵمانانەی کۆچکارانیان لەخۆگرتن‌و حەواندنیانەوەو یارمەتی ئایینی حەقیان داو وشەی (لا اله الا الله محمد رسول الله)یان بەرز گردوەو ﴿أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا﴾ ئەوانە بیرو باوەڕیان پتەوو تۆکمەو تەواوەو موسوڵمانی ساغ‌و ڕاستاڵن ﴿لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾ ئەوانە خودا پاداشتیان دەداتەوە بەلێخۆشبوون‌و چاوپۆشی لەتاوانەکانیان ئەگەر تاوانیان هەبێ، هەروەها پاداشیان دەداتەوە بەرزق‌و بژێوی پاك‌و خاوێنی

بەهەشت کە زۆرو پاکو بەردەوامو نەبڕاوەیە... ئەم سێ تاقمە پێشەنگو سەردەستەو نزیك بەڕەحمەتو بەخششی یەزدانو بەختەوەری دونیاو قیامەتن.

**تاقمی چوارەم:**

ئەو موسوڵمانانەن کە دوای پەیمانی ئاشتی حودەیبییە کۆچیان کردووەو قورئان بەم ئایەتە ئاماژەیان بۆ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا مِنْ بَعْدُ وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا مَعَكُمْ فَأُوْلَئِكَ مِنكُمْ﴾ ئەو موسوڵمانانەی ئیمانهێنانو کۆچکردنیان دواکەوت، دوای ئەوەی موسوڵمانان سەرکەوتنو شەوکەتیان پەیدا کرد ئەمجار ئەم تاقمە کۆچیان کرد بۆ مەدینەو لەگەڵ کۆچکارانو یاریدەدەران تێکۆشانو جیهادیان کرد، ئەوانە لەپێڕی ئێوەن، ئەی کۆمەڵی موهاجیرو ئەنصار! وەلایەتو مافو کۆمەکیو هەم ئاهەنگیتان بەسەر یەکترەوە هەیەو بەشێکن لەئێوە. ئەوان لەتەك ئێوە دا پاداشی باشو سەرەنجامی بەختەوەرییان هەیەو شوێنکەوتووی پێشینەکانیانن. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ....الآية﴾ (الحشر: ١٠)

پێغەمبەریش لەفەرموودەیەك دا کە موتتەفەقی موسیلمو بوخارییەو موتەواتەرە فەرموویەتی: (المرأ مع من أحب) ئادەمیزاد لەگەڵ ئەو کەسە دا حەشر دەکرێ کە خۆشی دەوێ.. لەفەرموودەیەکی تردا کە طەبەرانی ڕیوایەتی کردوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من أحب قوماً فهو منهم) کەسێك نەتەوەیەکی خۆش ویست ئەوە لەپێڕی ئەوانە، لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە: کە خودا حەشری ئەو کەسە لەگەڵ ئەو نەتەوەیە دەکا.

کە دەفەرموێ: ﴿فَأُوْلَئِكَ مِنكُمْ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوە کە پێشینەکان زێدە ڕێزو شکۆمەندییان هەیە...

ئەمجار پەروەردگار دوای باسکردنی وەلایەتی ئیمانو هیجرەت باسی وەلایەتی ڕەحمو خزمایەتی دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَأُوْلُوا الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ﴾ ئەوانەی پەیوەندی خزمایەتییان هەیەو خوێنو ڕەچەڵەکیان یەکە، بازێکیان نزیکترن لەبازێکیانەوە، ئەوانە وێڕای وەلایەتی ئیمانو کۆچکردن

وەلایـەتی خزمایـەتییان هەیـە، کـەوا بـوو: هەنـدێکیان لەپێـشترن بـۆ هەنـدێکیان لـەبارەی خۆشەویـستیو پـشتگیریو هـەم ئاهـەنگیو مـیرات لێـك گـرتن، بێگومـان پەروەردگار ئەم یاساو حوکمـەی لـەقورئان دا شی کردۆتـەوەو ئـەو دابـو نەرێتـەی کـردوە بـەحوکمو فـەرمانی کـردوە بەنـدەکانی پابەنـدی بـن. ئەنجامـدانی صیلەی رەحمی لەسەر پێویست کردوون.

پەیوەندی خزمایەتی لەپێوەندی ئایینو کۆچکردن بەهێز ترە، واتـە: خزمـی موسوڵمان لەپێشترە بـۆ خزمـی موسـوڵمانی لەموسـوڵمانێکی تـر کـە خزمـی نـەبێ، کەوابێ ئایەتەکە تەخصیـصی حـوکمی پێشەوە دەکا.. بـەڵام خزمـی کـافر وانیـە، چونکە کوفر پەیوەندییەکەی پچڕاندوەو لێرەدا خزمایەتیەکە چ دەورێکی نیە.

ئەمجار پەروەردگار ئایەتەکە بەوە کۆتایی دەهێنـێ کـە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّـهَ بِكُلِّ شَـيْءٍ عَلِـيمٌ﴾ خـودا ئاگاداری هەموو شتێکە، زانیـاری یـەزدان هـەموو شـتێك دەگرێتەوە، دەزانێ چ لەبەرژەوەندی دینو دونیاتان دایە. زانیارییەکەی هەموو ئەو شەریعەتو یاسایانە دەگرێتەوە کە لەم سورەتە دا بۆی داناون. وەکوو یاسـای شـەڕو ئاشتیو دەستکەوتی جەنگو مامەڵە کـردن لەگـەڵ دیـلو چۆنیەتی وادەو پـەیمانو پابەند بوون پێیانەوە، هەروا دۆستایەتیو وەلایەت لەنێوان موسوڵمانانو کاریگەری سیلەی رەحمو میرات لێك گرتن.

ئاماژەی ئەوەشی تێدایە کە هەموو حوکمو یاسای لەم سورەتەدان هـەموویان موحکەمو تۆکمەنو هەڵوەشاندنەوەیان نیە، هەموو حوکمەکان، داناییو کاراماییان تێدایە، هیچ حوکمێکی بێهودە نیـەو حـەقانیو راسـتو رەوانـن وەکوو لەشـوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جِئْنَاهُم بِكِتَابٍ فَصَّلْنَاهُ عَلَى عِلْمٍ﴾ (الأعراف:٥٢)

لێـرەدا کورتـە باسـێکی پێویـست هەیـە، ئـەویش ئەوەیـە: ئیبنـو عـەبباسو موجاهیدو عیکریمەو حەسەنو قـەتادەو هـی تـریش پێیـان وایـە: ئایـەتی ﴿وَأُوْلُـواْ الأَرْحَامِ.....الآية﴾ میراتگرتنێ بەهۆی سوێند بـۆ یـەکتری خواردنو برایـەتی گـرتن کــە لەســەرەتای ئیــسلام هــۆی مــیرات لێــك گــرتن بــوون، هەڵوەشــاندۆتەوە، فەرموودەیەکی صەحیحو موتەواتەریش پشتگیری ئەم رایەیان دەکا. کە پێغەمبـەر

ﷺ فەرموویەتی (ان الله قد اعطی کل ذي حق حقه، فلا وصیة لوارث) بێگومان پەروەردگار بۆ هەموو خاوەن مافێ مافی خۆی داوەتێ، ئیتر وەسیەتکردن بۆ میراتگر نیە. چونکە هەموو میراتگرێك خودا بەشی خۆی بۆ دیاری کردووە.. کەوابێ میراتگرتنی لەوەپێش کە بەهۆی یارمەتیو هەم ئاهەنگیو کۆچکردن دەچەسپا، هەڵوەشایەوە نەسخ بووەوە. میراتگرتن بەخزمایەتی نەبێ بەشتی تر نابێ، تەنها هۆکارێك بۆ میراتگرتن خزمایەتیە. کە دەفەرموێ: ﴿فِي كِتَابِ اللّهِ﴾ مەبەست ئەو بەشە میراتە باسکراوانەن کە لەسورەتی (النساء) دانو بەئایەتی میرات دەناسرێن. شافیعیەکان ئەم ڕایەیان بەلاوە پەسەندە ...ذەویلئەرحام کەلای زانایانی شەرع بریتین: لەخاڵو خوشکی دایكو خوشکی باوكو منداڵی کچو منداڵی خۆشكو ئەم جۆرە خزمانە بەشە میراتیان نیە. خزمی نزیك (عصبات) هەندێکیان شیاو ترن بەهەندێکیان بۆ میرات لێك گرتن، چونکە خاوەن بەشە میراتبەرەکان دیاری کراون... حەنەفییەکان دەڵێن: بەدەقی ئایەتەکە میراتەکە میرات بۆ ذەویلئەرحام هەیەو چەسپاوە، ئەمەش کاتێك دەبێ کە هیچ کامێك لەخزمی نزیك (عصبات) نەبن.

ئەوانەی کە دەڵێن: ئایەتی ﴿وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ...﴾ نەسخی حوکمی پێشوو ناکاتەوە ڕاڤەی وەلایەت وا ڕاڤە دەکەن کە بەمانا یارمەتیدانو خۆشەویستیو ڕێز لێ گرتن بێ. ئەو کاتە ئایەتی یەکەم بۆ رونکردنەوەی ئەومیە: کە پەیوەندی ئیسلام بەهێز ترە لەپەیوەندی خزمایەتی، ئایەتی دووەم بۆ رونکردنەوەی پلەو پایەی ئەو موسوڵمانە کۆچکەرو یارمەتیدەرانەیەو ئاماژەیە کە ئەوان بەراستی موسوڵمانو خواپەرستن. ئایەتی شێیەم بۆ رونکردنەوەی ئەومیە: کە ئەوانەی لەئیمانهێنانو کۆچکردن دا دواکەوتوون، حوکمی موسوڵمانە پێشینەکانیان هەیەو هەم ئاهەنگی بەهۆی خزمایەتییەوە پێویستە.

مەبەستیش بەئایەتی ﴿وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ...﴾ ئەومیە: کە وەلایەتی میراتگرتن تەنها بەخزمایەتی دەبێ، مەگەر بەلگەیەك دەست کەوێ تەخصیص بگەیەنێ ئەو کاتە مەبەست بەم کەلامە لابردنی بیرو بۆچوونێکە کە بگوترێ: وەلایەت وێ دەچێ وەلایەتی میرات بێ، ئیتر بەم ئایەتە ئەو بۆچوونەی رەواندەوە.

**ئایەتەکان ئەم حوکمو بەهرانەیان لێ وەردەگیرێ:**

١- پەیوەنـدی یارمـەتیو هاریکـاریو هـەم ئاهـەنگی نێـوان موسـوڵمانانی (دار الأسلام) چەسپاوە. کۆچکارە سەرەتاییەکان رێزدارتـرن لەکۆچکارانی دوایی. کۆچـکاران لەیارمەتیـدەران زیـاتر رێزدارتـرن، ئەوانـەی دواکـەوتوون لەئیمانهێنانو کۆچکردن حوکمی پێشینەکانیان هەیە.

٢- چەسپاندنی پەیوەندی یارمـەتیو هـەم ئاهـەنگی لـەنێوان موسـوڵمانانی (دار الإسـلام)و (دار الحـرب) دا، لـەکاتێك دا کـە ئـەو موسـوڵمانانەی (دار الحـرب) لەلایـەن کافرەکانـەوە ئەزیـەت بـدرێنو بـچەوسێندرێنەوە، مەگـەر لـەنێوان موسوڵمانانو ئەو لایەنـە کـافرە دا پـەیمانو بـەڵێنو ئاشـتەوایی هـەبێ؛ ئـەو کاتـە نـابێ موسـوڵمانان عەهـدو پـەیمانی خۆیـان پێـشێل بکـەنو یارمـەتی موسـوڵمانانی (دار الحـرب) بـدەن، مەگـەر کافرەکـان شـەڕی قەڵاچـۆ کـردنو بنبڕکرن دژی موسوڵمانەکانی ناوخۆیان ڕابگەیەنن!!

٣- پابەنـدبوون بەپـەیمانو بـەڵێنو ئاشـتەوایی پـیرۆزەو نابێ پاشگەز ببنـەوە تەنانەت ئەگەر زیانی بۆ بەرژەوەندی هەندێ موسوڵمانیش هەبێ.

٤- کافرەکان هەندێکیان یارمەتیدەرو هەم ئاهەنگی یەکترن.

٥- ئەگـەر ئێمـەی موسـوڵمان لـەناو خۆمـان دا یارمەتیـدەرو هاریکـاری یـەکتر نەبینو دۆستایەتی موعەسکەری کوفر بکـەین، تووشـی بـێ هێـزیو تێشکان دەبین.

٦- هـەر شـەریعەتو یاسـایەك خـودا داینـاوە بـۆ بەرژەوەنـدی دیـنو دونیـای موسوڵمانانە لەزانیارییەکی بەرفراوانەوە هەڵقوڵاوە.

٧- میراتـی ذەویلئـەرحام (ئـەو خزمانـەی لـەقورئان دا بەشـی دیاریکراویـان بـۆ دانـەنراوە) شـتێکی چەسـپاوەو قورئـان دەیگەیـەنێ، حەنەفییـەکانو حەنبەلییـەکان رایـان لەسـەرداوە، دەڵـێن: ذەویلئـەرحام دوو هۆکـاری

میراتگرتنیان تێدا کۆبونەوە: خزمایەتی، ئیسلام. کەوابێ ئەوان لەپێش ترن بۆ وەرگرتنی میرات لەو کەسانەی یەك هۆکاریان تێدایە کە ئیسلامەتییە.

مالیکیەکانو شافیعییەکان دەڵێن: ئەو ژەویلئەرحامانەی بەشە میراتیان بۆ دیاری نەکراوە میرات نابەن، ئەو کاتە میراتەکە دەگەڕێندرێتەوە بۆ (بیت المال)؛ خەزێنەی حکومەت. چونکە پەروەردگار لەئایەتی میرات دا بەشی میراتگرانی دیاری کردوە، چ خاوەن بەشی دیاریکراوبن، (اصحاب الفروض) یان عەصەبەبن، بەلام بۆ ذەویلئەرحام هیچی دیاری نەکردوە، ئەگەر بەشیان هەبوایە، خودا لەقورئان دا روونی دەکردەوە، ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾ (مريم: ٦٤) تیرمیذیو هی تریش ریوایەتیان کردوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان الله أعطى لكل ذي حق حقه) بێگومان پەروەردگار بۆ هەموو خاوەن مافێك مافی خۆی داوەتێ.

دەربارەی ئایەتی ﴿وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ﴾یش دەڵێن: ئایەتەکە موجمەلو جامیعە ئایاتی میرات شیکەرەوەن، هەموو کاتێکیش ئایەتی شیکەرەوە (مفسر) پێش دەخرێ!! ئەبو داود فەرموودەیەك لەمەراسیل دا ریوایەت دەکا دەڵێ: پرسیار لەپێغەمبەر ﷺ کرا دەربارەی میراتی خوشکی باوکو خوشکی دایك لەوەلام دا فەرمووی: (أخبرني جبريل ان لاشئ لهما) جوبرائیل خەبەری دامێ کە هیچیان ناکەوێ.

**بەیارمەتی خودا ئەمرۆ ١٩٩٨/٥/٢٧ لەپاکنووسی ئەم سورەتە بوومەوە بەمەش کۆتایی سورەتی ئەنفال هات.**

**خودا یارمەتیمان بدا بۆ تەواو کردنی سورەتەکانی تریش**

بسم الله الرحمن الرحیم

# سورەتی (التوبة) تەوبە

ئەم سورەتە چەند ناوێکی هەیە: بـراءة، التوبـة، المقشقشة، المبعثـرة، المـشردة، المخزیـة، الفاضـحة، المـثیرة، الحـافرة، المنکلـة، المدمدمـة، سـورة العـذاب... بـۆ هـەر ناوێکیش وەجهەتەسمیەو موناسەبەیێك هەیەو لەتەفسیرەکان دا باس کراوە.

ئەم سورەتە مەدەنییە، واتە: لەمەدینە هاتۆتە خـوارێ، لـەو سـورەتانەیە کـە لەدوا دوای قورئان دا هاتۆتە خوارێ، ئەگەر دوا سـورەت نـەبێ لـەدووا سـورەتەکانە، بۆیـە چـەند حـوکمو یاسـایەکی تۆکمـەو هەڵنەوەشـاوەی لـەخۆگرتوون دەربـارەی پەیوەنـدی نێـوان نەتـەوەی موسـوڵمانانو نەتـەوەکانی دیکـە، هـەر وەکـوو پـۆلێن کردنـی کۆمـەڵگای موسـوڵمانانی لـەخۆ گرتـووە، هـەموو چـین توێـژێکی کۆمـەڵگای ئیسلامی دەست نیشان کردوە، بەوردی وێنەی هەموو چینو توێژێکی کێشاوە.

ئەگەر بەووردیو مەوضوعیانە، بەدەقی ئایەتەکان دا بـچینەوە، بگەڕێینـەوە بۆ ئەو ریوایەتە جۆراو جۆرانەی دەربارەی ئەم سورەتە گێڕدراونـەوەو باسـی هـۆی هاتنە خواری ئایەتەکانیان لەخۆگرتووە، هەروەها بـەرووداوەکانی سـیرەی پێغەمبـەر دا بـچینەوە، بۆمـان دەردەکـەوێ کـە ئـەم سـورەتە بـەتێکڕا سـاڵی نۆیـەمی کۆچـی هاتۆتە خوارێ.. بەڵام بەیەکجار نەهاتۆتە خوارێ.. جا هەرچـەندە ئێمـە نـاتوانین بـەوردی ئـەو کاتەنـەی سـاڵی نۆیـەمی کۆچـی کـە بڕگـە بڕگـەی ئایەتـەکانی ئـەم سـورەتەی تێـدا هاتۆتـە خـوارێ دەسـت نـیشان بکـەین، بـەڵام دەتـوانین دان بـەوەدا بنێین کە ئەم سورەتە بەسێ قۆناغ هاتۆتە خوارێ... قۆنـاغی یەکـەم پـێش غـەزای تەبووك مانگی رەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچی بوو، قۆناغی دووەم لـەکاتی خۆئامـادە کردن بۆ ئەم جەنگەو پاشان لەناوەراسـتی شـەڕەکە دا بـووە، قۆنـاغی سـێیەم پـاش گەڕانەوە لەغەزاکە بووە..

پێشینەی سورەتەکەش لەئایەتی یەکەمەوە تا کۆتایی ئایەتی (٢٨)ی ئەوە لەئاخرو ئوخری ساڵی نۆیەم دا پێش وەرزی حەجکردن لەمانگی ذیلقەعیدە یان ذیلحیجە دا هاتوونە خوارێ[1]

سەرەتای ئەم سورەتە لەدوای رزگار کردنی مەککە هاتە خوارێ، پێغەمبەر ﷺ عەلی کوڕی ئەبو تالیبی نارد بۆ ئەوەی لەوەرزی حەج دا بەسەر موسوڵمانان دا بیخوێنێتەوە[2] رابەرو پێشەوای حەج لەو ساڵە دا حەزرەتی ئەبو بەکر بوو ﷺ.

ئایەتەکانی ئەم سورەتە (١٢٩) ئایەتن بەوشەی ﴿بَرَاءَةٌ مِنَ اللَّهِ﴾ دەستی پێ کراوە بۆیە ناونراوە (براءة) ئەمجار دوا بەدوای ئەوە باسی (اشهر الحرام)و پەیمانی موشریکەکانو پێویستی پابەند بوون بەو پەیمانەوە دەکا بەمەرجێ هەڵینەوەشێننەوە، کەسێك پەیمان بشکێنێ پێویستە شەڕی لەگەڵ بکرێ. ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە: کە کاکڵەی نزیکبوونەوە لەخودا بریتییە لەبڕوا بوون بەو زاتە، ئەوەشی تێدایە کە ئیمانی هیچ کەسێك تەواو نابێ تا خوداو پێغەمبەری خودای لەهەموو شتێك خۆشتر نەوێن، پەروەردگار ئەوەشی راگەیاند کە بەخۆنازینو پشت بەستن بەهێزو توانا سەرکەوتن دوا دەخاو ئاماژەشی بەحاڵی موسوڵمانان کرد لەغەزای حونەین دا، هەر لەم سورەتە دا چوونە ناو ماڵی (کابە) لەموشریکەکان قەدەغە کرا چونکە پیسن.

هەر لەم سورەتە دا پەروەردگار جەختی لەسەر جەنگان لەگەڵ یەهوودو نەصارا کردو لەسەر موسوڵمانانی بەپێویست دانا هەتا بەزەلیلی سەرانە دەدەنو ملیان بۆ یاسای ئیسلام شۆڕ دەکەن، هەر لەم سورەتە دا ئەو مانگانەی شەڕیان تێدا یاساغە دیاری کراون. فەرمانیشی تێدایە بۆ موسوڵمانان کە ئامادەباشی جەنگان بن دژی کافرانو بەبێ دواکەوتن بەپیر بانگەوازی چون بۆ غەزا بچن، ئەمجار ئاماژە بەئەوانە دەکا کە لەچون بۆ غەزا دواکەوتوونو خۆیان دوا خست، هەروا ئەوانەی

---

[1] في ظلال القران ج٨١/٣-٨٢

[2] التفسير المقتطف (ص٣١٦) . تەفسیری مەنار ج١٤٧/١٠ دەڵێ بۆ ئەوەی بەسەر موشریکەکانی دا بخوێنێتەوە.

کە لەبەر کەم ئەندامیو عەوەق نەیانتوانیوە ئامادەی جەنگ بن. هەروەها باسی چۆنیەتی ئەو دوو روانە دەکا کە هەرکاتێ بانگەوازی بکرایە بۆ غەزا، ئەوان دەبوونە کۆسپو تەگەرەو دەیانەویست موسوڵمانان سارد بکەنەوە. ئەمجار پەروەردگار باسی دووڕووەکانو هەڵوێستیان بەرامبەر موسوڵمانان لەشەڕو ئاشتی دا، دەکا.

هەر لەم سورەتەدا فەرمانی ئاشکراو روون دەربارەی سزای دووڕوویی دیاری کراوە: کە بریتییە لەوەی بەهیچ شێوەیەك پێغەمبەر ﷺ نوێژیان لەسەر نەکاو وەکوو موسوڵمانان مامەڵەیان لەگەڵ نەکا.

ئەمجار باسی ئەو بیانوانە دەکا کە دەبنە عوزری رەوا بۆ دواکەوتن لەغەزا، هەروەها حاڵو چۆنیەتی ئەو عەرەبانەی دەوروبەری مەدینە دەکا کە هاتوونە ژێر سایەی ئیسلامەوە، یان گەردنکەچی خۆیان بۆ حوکمی ئیسلام راگەیاند..

ئەمجار باسی مزگەوتی (الضرار) دەکا، ئەو مزگەوتەی کە دووڕووەکان بنیاتیان نابوو بۆ ئەوەی موسوڵمانان روونەکەنە ئەو مزگەوتەی پێغەمبەر ﷺ بنیاتی نابوو، ئەمجار باسی ئەو موسوڵمانانە دەکا کە لەئیمانو بیرو باوەڕیان دا راستگۆو موخلیصن، هەروا باسی تۆبە کردنی ئەوانە دەکا: کە لەچون بۆ غەزا دواکەوتبونو خودا تۆبەکەی لێ وەرگرتن، ئەمجار بەگشتی باسی موسوڵمانان دەکا کە چۆن پێشوازی هاتنە خوارەوەی قورئان دەکەن. کۆتایی سورەتەکەش بەوە دێنێ کە پەروەردگار حەزرەتی موحەممەدی بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵبژاردوەو پێغەمبەر ئادەمیزادێکی دڵسۆزو بەرەحمو بەزەییە، هەرگیز نایەوێ شوێنکەوتوانی ئەزیەت بدا، پێویستە موسوڵمانان بەدڵو گیان شوێنی بکەون. خۆ ئەگەر شوێنیشی نەکەون، ئەوە خودای بەسەو حەوێجەی بەکەسی تر نیە..

بەکورتی ئەم سورەتە سورەتێکی حاسیمو یەکلاکەرەوە بوو بۆ هەڵوێستی موسوڵمانان لەگەڵ ناموسوڵمانان دا، بەڵکوو خەتەرترین سوورەت بوو کە سوپای ئیمانی کۆکردەوەو ئامادەی کرد بۆ جەنگی یەکلاکەرەوەو کۆتایی لەنێوان موسوڵمانانو ناموسوڵمانان دا، ئەوەبوو: لەناوەوە ریشەکێشی دووڕوەکانی کردو

فـرتو فێڵـی جولەكـەكانی لـەناو بـرد، لـەدەرەوەی حكوومـەتی ئیـسلامیش دا بـەرەنگاری سـوپای مـلهوڕی رۆم بوونـەوەو لەجـەنگی تـەبووك دا زەنـدەقی بـردنو هەموو جەو جۆڵێكی گومان لێكراوی رۆمەكانی سەركوت كرد، تەماعی لـەناوبردنی ئیسلامو موسوڵمانانیان لەدڵ دەرهاویشتن!

ئـەم یەكالآكردنـەوەو ئەنجامـدانی ئـەو نەخـشە كێـشراوە خـوداكردە، كاریگەریـەكی گرنگـی هـەبوو لـەناوەوەو دەرەوەی حكوومـەتی ئیـسلامی دا ئـارامی بـەوڵات بەخـشیو دەزگـای دەوڵـەتی ئیـسلامی چەسـپاند، تەنانـەت دوای لـەدونیا دەرچـوونی پێغەمبـەریش ﷺ سـامو هەیبـەتو شـكۆمەندی ئـەو حكوومەتـە هـەر بەردەوام بوو!

## تیشكێك بۆ سەر پەیمانی ئاشتی حودەیبییە

پێغەمبـەر ﷺ سـاڵی شەشـەمی كۆچـی پـەیمانی ئاشـتینامەی حودەیبییـەی لەگەڵ موشریكەكان دا بەسـتو شەڕیان وەسـتاند، لەسـەر بەرقـەرار بـوونی ئاشـتیو ئارامی بۆ ماوەی (دە) ساڵ لەسەر چەند مەرجێك پەیمانو بەڵگەنامـەی مـۆر كـرد، پاشان قورەیشییە موشریكەكان بەكۆمەكی هۆزی بەنی بـەكری هاوپـەیمانو سـوێند خۆریان، پەیماننامەكـەیان هەڵوەشـاندەوە، هـاتن یارمـەتی هـۆزی بـەنی بـەكریان دا دژی هـۆزی خوزاعـە كـە هاوپـەیمانی پێغەمبـەر بـوون، ئـیتر عـەمری كـوڕی سـالی خـوزاعی بەسـەرۆكایەتی وەفـدێك هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ داوای یارمـەتیو كۆمەكی لێ كرد، پێغەمبەر ﷺ كۆمـەكی پـێ كـردو فـەرمووی: (نـصرت یـاعمرو بـن سـالم، لانـصرت ان لم أنـصر بـني كعـب) ئـەی عـەمری كـوڕی سالم كۆمـەگیتان پـێ دەكەم، یارمەتدراو نەبم كە یارمەتی هۆزی بـەنی كـەعب نـەدەم. ئـیتر سـەر لـەنوێ حاڵەتی شەڕ لەنێوان قورەیشو موسوڵمانان پەیدا بووەوە.

ئـیتر پێغەمبـەر ﷺ فـەرمانی بەموسـوڵمانان كـرد: كـە خـۆ ئامـادە بكـەن بـۆ جـەنگ، سـوپای موسـوڵمانانی بـەرەو مەككـە بـردو سـاڵی هەشـتەمی كۆچـی شـاری مەككە ئازاد كرد.

کاتێـك هـەواڵی ئـازاد کردنـی مەککـە گەیـشتە خەڵکەکـەی هـۆزی هـەوازین، مالیکی کوڕی عەوفی (النضری) سەرەك هۆزیان خەڵکەکەی کۆکردەوە بۆ شەڕکردن دژی موسوڵمانانو ئەوە بوو لەمانگی شەووالی ساڵی هشتەمی کۆچی غەزای حونەین بـەرپابوو، پاشـان پێغەمبـەر ﷺ بیـست ئەوەنـدە ڕۆژە دەوری شـاری طـائیفـی دا، شـەڕێکی دژواری لەگـەڵ کـردنو زۆری تـیرو مەنجـەنیق پێوەنـان. پاشـان لـەمانگی ڕەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچی پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ غەزای تەبووك کـە دوا غـەزای پێغەمبەر ﷺ بوو، لەوێ دا زوربەی سورەتی بەرائە هاتە خوارێ.

جا کە پێغەمبەر ﷺ لەغەزای تـەبووك گەڕایـەوە، خـەیاڵی حـەجکردنی بـوو، بەڵام چونکە ئەو موشریکەکان لەسەر دابـو نەرێتی خۆیان ئامادەی حەج دەبـوونو بەرووتی تەوافیان دەکـرد، پێغەمبـەر ﷺ پێـی نـاخۆش بـوو تێکـەڵاوییان بکـا، ئـیتر حەزرەتی ئەبو بـەکری کـردە فەرمانـدەی حـەجو ئـەو ساڵە ئـەوی نـارد بـۆ ئـەوەی شـێوەی ئەنجامـدانی کاروبـاری حـەج فێـری خەڵکەکـە بکـاو بەموشـریکەکانیش رابەگەیەنێ کە ئیتر ساڵێکی تر نابێ ئامادەی حەج ببنو بانگەوازی ﴿بَرَاءةٌ مِّنَ اللَّـهِ وَرَسُولِهِ﴾ بەناو خەڵك دا هەڵدەن...

هەر کە حەزرەتی ئەبو بەکر بەڕێ کەوت بەشوێن ئەودا حەزرەتی عەلی نارد بۆ ئەوەی ببێتە ڕاگەیەنەرو لەباتی پێغەمبەر ﷺ لـەکۆڕو کۆبوونـەکان دا پێـشەتای سورەتی (براءة) بۆ خەڵکەکە بخوێنێتەوە.

ئیتر حەزرەتی عەلی سواری وشتری (العضباء) بوو کە حوشـتری پێغەمبـەر ﷺ بوو. لەذیلحولەیفە دا گەییشتە حەزرەتی ئەبو بەکر. ئەبو بەکر لـەکاروباری حـەج دا پێـشەوایەتی کـرد، لـەڕۆژی جـەژنی قوربـانی سـاڵی نۆیـەم لـەمینا دا حـەزرەتی (عەلی)یش پێشەتای سورەتی بەرائەی بەسەر خەڵکەکە دا خوێندەوە..

ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سـاڵی نۆیـەمی کۆچـی عەلی نارد، ئیزنی دا کە ڕۆژی جەژنی قوربان لـەمینا دا سـەرەتای سورەتی (بـراءة) بەسەر خەڵك دا بخوێنێتەوە، هەروەها ساڵێکی تـر نـابێ موشـریکەکان حـەج بکـەن، نابێ ئیتر کەس بەرووتی بەدەوری کابە دا بسووڕێتەوە.

ئەحمەدو تیرمیذیو نەسائی لەزەیدی کوڕی یوثەیغ (پیاوێکی هەمەدانی بوو) دەڵێ پرسیاریان لەعەلی کرد، ئەو ساڵە بە چ کارێك رەوانەکرایو بۆچی پێغەمبەر بەدوا ئەبوبەکردا ناردیتیو رۆیشتی؟؟ مەبەستی ئەو رۆژە بوو کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبو بەکردا ناردی بۆ حەج. لەوەڵام دا حەزرەتی عەلی وتی: (بۆ راگەیاندنی چوار شت: کەسێك موسوڵمان نەبێ ناچێتە بەهەشتەوە، لەمە بەولاوە کەس بەروتو قووتی طەوافی کەعبە نەکا، هەرکەسێك لەگەڵ پێغەمبەر دا عەهدو پەیمانی هەبوو پەیمانەکەی تا کاتی دیاریکراوە، لەدوای ئەمساڵ ئیتر موشریکەکان حەجی کەعبە ناکەن...)

برێ لەشیعە ئەم مەسەلەیان گەورە کردوەو کردویانە بەزێدە رێزوفەضل بۆ عەلی بەسەر ئەبو بەکرداو زۆر یوایەتی بێ بناغەو پڕو پاگەندە ئامێزیان پێوە ناوە دەیکەنە بەڵگە کە حەزرەتی عەلی لەحەزرەتی ئەبو بەکر رێزدار ترەو ئەو لەئەبو بەکر شیاو ترە بۆ ئەوەی دوای کۆچی پێغەمبەر ﷺ ببێتە جێ نشین. پێیان وایە: پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی ئەبو بەکری کەنارگیر کردوە لەگەیاندنی سورەتی (براءة) بەخەڵکەکەو بەفەرمانی جوبرائیل گەیاندنی سورەتی (براءة) بەخەڵکەکەو بەفەرمانی جوبرائیل عەلی داناوە.

خاوەنی تەفسیری مەنار رەدی ئەم شوبهەو بۆچوونە هەڵانەی شیعەی بەشێوەیەکی زانستانە داوەتەوەو بوڕی داون، لەبەر دوورو درێژی بەپێویستم نەزانی راگوێزی ئێرەی بکەم. کەسێك مەبەستیەتی با بگەڕێتەوە بۆ تەفسیری ناوبراو ج١٠/١٦١-١٦٤ لەوێ بیخوێنێتەوە.

**سورەتی (براءة) بۆچی لەسەرەتاوە (بسم الله الرحمن الرحیم)ی بۆ نەنووسراوە؟؟**

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پرسیارم لەحەزرەتی عەلی کرد ﷺ وتم: بۆچی لەسەرەتای (براءة) دا ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾ نەنووسراوە؟

وتی: چونکە ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾ بۆ ئارامیو ئاسایشە، سورەتی (براءة) هاتۆتە خوارێ بۆ ئیعلانکردنی شەڕو کۆتایی هێنانی پەیمانی ئاگر بەستو ئارامیو ئاساییشی تێدا نیە.

سوفیانی کوڕی عویەینە دەڵێ بۆیە لەسەرەتای ئەم سورەتە دا ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾ نەنووسراوە، چونکە بیسمیلا رەحمەتو بەزەیی تێدایە، ئارامیو ئەمینی دەگەیەنێ، ئەم سورەتە بۆ لێدانی دووڕووەکان بەشمشێر هاتۆتە خوارێ ئاسایشو ئارامی بۆ دووڕووەکان نەهێشت.

ئیمامی قورطبی دەڵێ: قسەی راستو وێ چوو ئەوەیە: کە بۆیە بیسمیلا نەنووسراوە، چونکە جوبرائیل بۆ ئەم سورەتە بیسمیلای نەهێناوە، هاوەڵانی پێغەمبەریش لەناو موصحەفی ئیمام دا نەیان نووسییەوەو چاویان لەشێوە نووسینەوەی ئیمامی عوسمان کرد.

## موناسەبەو پەیوەندی سورەتی (براءة) بەسوورەتی (الأنفال) وە:

لێکچوونو پەیوەندییەکی تەواو هەیە لەنێوان سوورەتی (الأنفال)و سوورەتی (براءة). لەبارەی دانانی بنەما سەرەکییەکانی پەیوەندی نێو دەوڵەتییەوە، لەبارەی چۆنیەتی سیاسەتی دەرەوەو ناوخۆی عالەمی ئیسلامییەوە، سوورەتی (براءة) وەکوو تەواوکەرو شیکەرەوەی سورەتی ئەنفال وایە. ئەمیش وەکوو سوورەتی ئەنفال ئەحکامی کاتی شەڕو کاتی ئاشتیو چۆنیەتی هەڵسوکەوتی موسوڵمانانو کافرو دووڕووەکانی لەخۆگرتووە، یاسای پەیمان بەستنو پەیمان مۆرکردنی تێدایە.

بەڵام ئەوەندە هەیە لەسوورەتی ئەنفال دا باسی پابەند بوون بەپەیمانو بەڵێنو ئاشتینامەی نێوان موسوڵمانانو ناموسوڵمانان کراوەو بەپیرۆز دانراوە، بەڵام لەسوورەتی (براءة) دا کۆتایی هێنان بەو پەیمانو ئاشتینامانە هێنراوە. لەهەردوو سورەتەکان دا باسی قەدەغە کردنی موشریکەکان لەکابە کراوەو جەخت لەسەر ئەوە کراوەتەوە کە نەهێڵدرێ توخن ماڵی خودا بکەون.

لەهەردوکیان دا هەلْنانی موسولْمانان هەیە بۆ مالْبەخشین لەرێگەی خودادا، هەروا بەدورو درێژی باسی جەنگان لەگەلْ موشریكو خاوەن نامەکان کراوە حالْو چۆنیەتی دووروەکانیش رون کراوەتەوە!

وێرای ئەوەی کە لێکچوونی بنەڕەتی لەنێوان هەردوو سورەتەکە دا هەیەو پێیان دەگوترێ: هاوجووتو هەردووکیان دەربارەی جەنگ هاتوونە خوارێ! وەلێ قسەی راست ئەوەیە: کە هەریەکەیان بۆ خۆی سوورەتێکی سەربەخۆیەو (براءة) بەشێك نیە لەسوورەتی ئەنفال. چونکە سوورەتی (براءة) وەکوو ئاماژەمان پێ کرد ئەو حەمکە ناوەی هەنو لەسوورەتی ئەنفال جیا کراوەتەوەو بەم شێوە سوورەتو ئایەتەکان رێك خراون، موسولْمانان چین لەدوای چین ئەم لێك جیاکردنەوەو ناوان خستنە نێوان سوورەتی ئەنفالو (براءة)یان بەیەکتری سپاردوە، هەر لەسەردەمی حەزرەتی عوثمانەوە هەتاکو ئێستا ئاوا چەسپاوە.

ئیمامی عوسمان (ﷺ) فەرموویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) گیانی پاکی ئەسپارد، ئەوەی بۆ روون نەکردینەوە: کە سورەتی (براءة) بەشێك بێ لەسوورەتی ئەنفال. ئەم قسەیەی ئیمامی عوسمان بەلْگەیە لەسەر ئەوە کە هەموو سورەتەکانی قورئان بەرێنومایی پێغەمبەر (ﷺ) رێك خراون. (براءة) کە بەتەنیاوە پالْ سورەتی ئەنفال دراوە بەرێنمویی پێغەمبەر (ﷺ) نەبوە. بەلْکوو پێش ئەوەی ئەم مەسەلەیە روون بکاتەوە لەدونیا دەرچووە. لەسەردەمی پێغەمبەر دا بەم سوورەتە دەگوترا هاوجووت (قرینتان) لەبەر ئەمە دەبێ بخرێنە پالْ بەکتری، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) هێشتا لەژیان دا بووە کە ئەم نازناوەیان بۆ بەکار هاتووە.

ترمذی لەئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەلْێ: ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: بەحەزرەتی عوسمانی کوڕی عەففانم گوت: ئەرێ ئەوە چی پالْی بەئێوەوەنا، سوورەتی ئەنفال کە (میئبنە) نیە؛ ئایەتەکانی ناگەنە سەد ئایەتو سوورەتی (براءة) کە میئیەنە ئایەتەکانی لەسەر ئایەت زیاترن، خستووتاننە پالْ یەکترەوەو بیسملاتان لەناواندا نەنووسیونو لەپێری سوورەتە درێژەکان دا داتان ناون؟ چ هۆکارێك هەیە بۆ ئەم کارەتان؟ ئیمامی عوسمان فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) رۆژ

لەدوای رۆژ قورئانی بۆ دەهاتە خوارێ، جا کە شتێکی بۆ سەر نازڵ دەبوو بانگی هەندێ لەوانەی دەکرد کە قورئانیان دەنووسییەوە؛ دەیفەرموو: ئەم ئایەتە بخەنە فلانە سوورەتەوەو لەفلان جێگا دا داینێن. سوورەتی ئەنفال لەو سوورەتانە بوو کە لەسەرەتای سەردەمی مەدینە دا هاتۆتە خوارێ، سوورەت (براءة)ش لەو سوورەتانەیە کە دوا دوای هاتنە خوارەوەی قورئان دا هاتۆتە خوارێ، ناوەرۆکی هەردوو سوورەتەکە لەیەکتر دەچن، ترسام: کە (براءة) بەشێك بێ لەئەنفال، پێغەمبەر (ﷺ) لەدونیا دەرچووە، ئەوەی بۆ روون نەکردینەوە کە ئایا یەك سوورەتن یان دوو سوورەتن، لەبەر ئەوە خستمنە پەنا یەکتریەوەو لەنێوانیان دا (بسم الله الرحمن الرحیم)م نەنووسیو بەتاقمی سوورەتە درێژەکان حلێبم کردن.

## هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی موشریکەکانو راگەیاندنی شەڕ دژیان

﴿بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ
(١) فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ
مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۙ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِى ٱلْكَٰفِرِينَ (٢) وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ
وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِىٓءٌ مِّنَ
ٱلْمُشْرِكِينَ ۙ وَرَسُولُهُۥ ۚ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ
فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
بِعَذَابٍ أَلِيمٍ (٣) إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ

﴿لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَـٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾﴾

وەكوو ئاماژەی پێ كرا، پەیمانێكی گشتیو هەمەجۆر لەنێوان پێغەمبەر دا (ﷺ) لەلایەكەوەو موشریكەكانی مەككەو هی تریش مۆركرابوو؛ كە هیچ لایەكیان كەس لەمەككە نەگەڕێنێتەوە، كەس لەمانگەكانی (حەرام) دا گێچەڵ بەكەس نەكا، هەر ئەم جۆرە عەهدو پەیمانە لەنێوان پێغەمبەر (ﷺ)و هەندێ خێڵە عەرەبی تر بۆ ماوەیەكی دیاریكراو بەسترابوو، زوربەی زۆری موشریكەكان پابەندی پەیمانی خۆیان نەبوون، پەیمانەكەیان شكاند ئیتر سورەتی (براءة) نازڵ بوو.

وەكوو زانیشمان ئایەتە پێشینەكانی سوورەتی (براءة) ساڵی نۆیەمی كۆچی دەربارەی موشریكەكانی مەككە نازڵ بوون، ئەمەش پاش ئەوەی كە پێغەمبەر (ﷺ) ساڵی شەشەمی كۆچی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ دا بەستبوون. هەموویان پەیمانی خۆیان هەڵوەشاندەوە جگە لەخێڵی ضەمرەو خێڵی كەنانە..

ئیتر پەروەردگار فەرمانی بەموسوڵمانان كرد كە پابەندی پەیمانی بەستراو لەگەڵ موشریكەكان نەبنو مۆڵەتی چوار مانگیان بدەنێ، كە ئەو ماوە تێپەڕی كرد شەڕیان لەگەڵ بكەن.

مەبەست بەپەیمانەكان ئەو پەیمانەن كە كاتو سنووری دیاریكراویان نیە، جا كەسێك پەیمانێكی دیاریكراوی هەبوو ماوەكەی كەمتر لە (٤) مانگ بوو مۆڵەتی چوار مانگی دەدرێ، ئەوانەش كە پەیمانەكەیان زیاد لەچوار مانگەو ماوەكەی دیاری كراوە ئەوە ماوەكەی بۆ تەواو دەكرێ. چونكە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَأَتِمُّوا إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَى مُدَّتِهِمْ﴾ (براءة:٤) كولەبی دەفەرموێ: ماوەی چوار مانگ بۆ ئەو كەسانە بوو كە لەنێوان ئەوانو پێغەمبەردا (ﷺ) پەیمانی كەمتر لەچوار مانگ هەبوو بێ. ئەوانەش كە پەیمانیان زیاد لەچوار مانگ بوو بێ، ئەوە خودا فەرمانی پێ كردوون كە ماوەكە تەواو بكەن.

**ئێستاش دەست دەکەین بەراڤە کردنی ئایەتەکان:**

﴿بَرَاءَةٌ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى الَّذِينَ عَاهَدتُّمْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ واتە: خوداو پێغەمبەری خودا بەرین لەموشریکەکان، ئەوانەی پەیمانتان لەگەڵ دا بەستبوونو پابەندی نەبوونو هەڵیان وەشاندۆتەوە. دەستبەرداریو رزگاریو پابەند نەبوونی خوداو پێغەمبەری خودا بگەیەندرێ بەو موشریکانەی پەیمانتان لەگەڵ بەستوون.. دەستەبەردار بوونەکە پاڵ خوداو پێغەمبەر دراوە، چونکە دەستوورو شەریعەتێکی تازەیە لەخوداوە بۆ موسوڵمانانو فەرمانی بەپێغەمبەر کردوە کە جێبەجێی بکاو پێیەوە پابەند بیو پێیان رابگەیەنێ، ئاماژەی ئەوەشی تێدایە: کە دەستەبەردار بوونو بەرائەتەکە شتێکی گرنگەو دەبێ زۆر گرنگی پێ بدرێ. پەیمان بەستنەکە پاڵ موسوڵمانانەکان دراوە: دەفەرموێ: ﴿عَاهَدتُّمْ﴾ چونکە موسوڵمانانەکانن، کە چۆنیەتی پەیمانەکە جێبەجێ دەکەن، ئەوانن تەنفیذی خاڵەکانی پەیمانەکان دەکەن، ئەگینا پێغەمبەر (ﷺ) پەیمانەکەی بەستووە لەم رووەوە کە رابەرو سەرکردەی موسوڵمانەکانە!!

پچڕانی پەیوەندیو هەلگرتنی بارودۆخی ئاشتەواییو نەمانی حاڵەتی ئاسایش بگەیەندرێ بەموشریکە پەیمان لەگەڵ بەستراوەکان، کە دانیشتوانی مەککەو هۆزی خوزاعەو هۆزی مودلەجو هەموو ئەوانەی کە پەیمانیان لەگەڵ بەستراوە، واتە: خوداو پێغەمبەری خودا دەستبەرداری ئەو پەیمانانە بوون کە لەگەڵ موشریکەکان بەستراوە. پەیمانەکانیان بەسەردا دەدرێتەوە، چونکە جگە لەهۆزی بەنوضەمرەو هۆزی کەنانە ئەوانی دی پەیمانەکانیان هەڵوەشاندۆتەوە؛ ﴿فَسِيحُوا فِي الْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ﴾ ئەی موسوڵمانینە! بەموشریکەکان بڵێن: ئێوە لەیەکەم رۆژی ئیعلانی بەرائەتەوە بۆ ماوەی چوار مانگ دڵنیاو بێ خەم بن، بۆ کوێ دەچن بچنو چی دەکەن بیکەن، کەس چی بەسەرتانەوە نیەو لەهیچ مەترسن! دوای چوار مانگەکە ئیتر پەیمان هەڵوەشاتەوەو ئاشتی نەماوە.

ئەو ماوەیەی بۆیە بۆ دیاری کردن تا بیرێك لەداهاتووی خۆیان بکەنەوە، یان ئیمانهێنان هەڵبژێرن، یان خۆیان ئامادە بکەن بۆ شەڕو ماوەی خۆ ئامادەکردنیان

بۆ شەڕ هەبێ ئەگەر سوور بوون لەسەر مانەوەیان بەکافری. ئەمەش ئەوپەڕی بێ باکیو تەساموحی ئایینی ئیسلام دەگەیەنیو نیشانەی ئەوەیە: کە ئیسلام ئایینێکی زۆر گونجاوو لەخۆڕادیوە، هەروەها بۆ ئەوەی موسوڵمانان تۆمەتبار نەکرێن کە بەغافلگیریو لەنکاو شەڕ لەگەڵ دوژمنانیان بەرپا دەکەن.

ئیمامی سیوطی دەڵێ: چوار مانگەکان (شەووالو ذولقەعیدەو ذولحیجەو موحەررەم)ن چونکە ئیمامی زوهری گوتویەتی سوورەتی (براءة) لەمانگی شەووال دا نازڵ بووە.

زومەخشەریو ڕازیو قورطوبیو ئیبنو کەثیر دەڵێن: چوار مانگەکان مانگە یاساغکراوەکانن، کە بریتین: لەبیست ڕۆژی مانگی ذولحیجەو هەموو مانگی موحەررەمو مانگی صەفەرو مانگی رەبیعولئەوەڵو (دە) ڕۆژی مانگی رەبیعولئاخرە. جا بەو پێیەی کە ئیمامی عەلی پێشەتای سوورەتی (براءة)ی لەڕۆژی جەژنی قوربان دا لەمینا بەسەر خەڵکەکە دا خوێندەوە، ئەم ڕایەی دووەم ڕاسترو وێچوو ترە، لەو ڕۆژەوە کە ڕۆژی دەیەمی ذولحیجة بووە ماوەکە دەست پێ دەکا.

حیکمەتی ئەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) خوێندنەوەی سوورەتی (براءة)ی بەسەر موسوڵمانەکان دا بەئیمامی عەلی سپاردو ئەوی نارد ئەو بەراءتە ڕابگەیەنێ، چونکە بەراءتەکە هەڵوەشاندنەوەی ئەو پەیمانانەی لەخۆ گرتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ موشریکەکان دا بەستبوونی، دابو نەریتی عەرەبەکانیش وا بوو: کە هەڵوەشاندنەوەی پەیمان لەلایەن ئەو کەسەوە دەبێ کە پەیمانەکەی بەستووە، دەبێ ئەو کەسە هەڵیوەشێنێتەوە کە پەیمانەکەی مۆر کردوە، یان کەسێك بێ لەبنەماڵەو خزمی پەیمان بەستووەکە، جا پێغەمبەر (ﷺ) ویستی کە لەم بارەوە قسەی کافرەکان ببڕیو ئەم ڕێگەیەشیان لێ بگرێ، بۆیە عەلی کوڕی ئەبو طالیبی نارد -کە ئامۆزای بوو- ئەو پەیمانەکان هەڵوەشێنێتەوەو بەرائەتەکە ڕابگەیەنیو بۆ ئەوەی کەس قسەی نەمێنێ!

ئایەتەکە ئەوەی لەخۆگرتووە: کە دروستە موسولمانان پەیمانی نێوان خۆیانو موشریکەکان هەڵوەشێننەوە، ئەمەش لەدوو حاڵەت دا:

**یەکەم**: ماوەی پەیمانەکە تەواو بێ، ئەو کاتەی ماوەی پەیمان کۆتایی هات موسولمانان حاڵەتی جەنگ رادەگەیەنن.

**دووەم**: لەحاڵەتێك دا کە کافرەکان پەیمانەکە بشکێنن، یان ترسی ئەوە هەبێ خیانەت لەپەیمانەکە بکەن. ئەوە لەم دوو حاڵەتە دا پەیمانەکەیان بەسەردا دەدەینەوەو دەتوانین، حاڵەتی ئاشتیو ئارامی کۆتا پێ بهێنینو حاڵەتی شەڕ جار بدەین.

کە دەفەرموێ: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللَّهِ﴾ واتە: باش بزانن و دڵنیابن کە ئێوە لەهەرشوێنێك بن لەچنگی سزای خودا رزگارتان نابێ ناتوانن خودا داماو بکەن، ئەگەر لەسەر حاڵەتی موشریکی خۆتان بمێننەوە نەهەڵاتنو نەخۆ قایم کردن رزگارتان ناکەن، تەنانەت ئەگەر بۆ ماوەیەکیش مۆڵەتتان بدا ئەو پاشگوێتان ناخا.

﴿وَأَنَّ اللَّهَ مُخْزِي الْكَافِرِينَ﴾ هەروەها باش بزانن کە پەروەردگار موشریكو کافرەکان ریسوا دەکا، لەدونیادا بەتێشکانو کوشتنو لەقیامەت دا بەسزای دۆزەخ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەربارەی موشریکەکانی مەککەو هاووێنەکانیان دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ، فَأَذَاقَهُمُ اللَّهُ الْخِزْيَ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ (الزمر:٢٥-٢٦) بەڵێ ئەم بەرائەتە، جاڕدانێکی گرنگو کاریگەرو گشتی بوو، راگەیاندنێکی یەکالاکەرەو بوو بەو ئوسلووبە بەرزە راگەیەندرا، خاڵە سەرەکییەکانی نێوان موسولمانانو موشریکەکانی لەو رۆژگارە دا لەخۆ گرتووە، چونکە پەیمانی ئاماژە بۆ کراو لەنێوان پێغەمبەرو موشریکەکانی نێوە دورگەی عەرەب دا بەسترابوو، جاڕدانی بەرائەتی خوداو پێغەمبەری خودا لەو پەیمانە، هەڵوێستی هەموو موسولمانێك دیاری دەکاو کاریگەرییەکی تەواو لەدڵی موسولمانان دا پەیدا دەکاو هیچ دوو دڵیو ئەم لاو ئەولا ناهێڵێتەوە. ئەمجار دوای ئەم جاڕدانە گشتییە، شیکردنەوەو

رونكردنەوە دەهێنیو دەفەرموێ: ﴿فَسِيحُوا فِي الأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ.....الآيـة﴾ بـۆ ماوەی چوار مانگ مۆڵەتتان بێ، گەشتو گوزارو هاتۆچۆ بكەن، بازرگانی خۆتان ئەنجام بدەن، كاڵای خۆتان بێننو بەرن، دەفتەرو حیساباتی خۆتان تاوو توێ بكەن، كاروباری خۆتان رەدام بێنن، هیچ ترستان نەبێ، كەس چی بەسەرتانەوە نەبێ، بەئارامیو دڵنیایی ماوەی دیاریكراو بەسەر بەرن تەنانەت ئەوانەی كە پەیمانیشیان شكاندو پێیان وابوو: پێغەمبەرو موسوڵمانەكان لەغەزای تەبووك ناگەڕێنەوەو رۆمەكان بەدیل دەیانگرن، هەروەكوو ترسنووكو دووڕووەكانی ناو شاری مەدینەش وایان گومان بردوو

بەڵێ ئەم جاڕدانە لەكاتێك دا بوو ئادەمیزاد یاساو قانوونی نەدەزانی، كەس گوێی نەدەدایە وادەو بەڵێن، هەركەسێ هەلی بۆ هەڵبكەوتایەو فرسەتی بێنایە دەستی خۆی دەوەشاند، ئالەو كاتەداو لەو بارودۆخە دا ئیسلام ئەم جارە دەداو ئەم بەرائەتە ڕادەگەیەنێ، ئەم دابو نەریتە دێنێتە گۆڕێ، چونكە ئیسلام مەنهەجی پەروەردگارە، هەر لەسەرەتاوە بێ عەیبو كەمو كوڕییە، پێویست ناكا زەمانەو ڕۆژگار گەشەی پێ بكا بەڵكوو ئیسلام بۆ خۆی گەشە بەئادەمیزاد دەكاو پێشی دەخاو فێری شارستانی دەكا بەڵام لەچوار چێوەو سنووری شەریعەتو یاسای خۆی دا

جا لەگەڵ ئەو مۆڵەتەی دەیدا بەموشریكەكان، ڕاستییەكی تریان دەخاتە بەرچاو كە دڵیان وەلەرزە دێنیو لەناخەوە دەیانهەژێنێ، سەرەنجیان رادەكێشێ بۆ ڕاستیەكی تر بۆ ئەوەی چاوو دڵیان بكەنەوەو وەهۆش خۆ بێنەوەو بزانن كە ئەوان بەگەشتو گوزاری ماوەی مۆڵەت پێدراویان ناتوانن لەچنگی قاری خودا دەربچنو رزگاریان بێ، لەو ئاكامو سەرەنجامەی خودا بۆی داناونو بڕیاری داوە قوتاریان نابیو بۆی دەرناچن ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللَّهِ وَأَنَّ اللَّهَ مُخْزِي الْكَافِرِينَ﴾ قوڕ بەسەریان بۆ كوێ دەردەچنو بۆ لای كێ هەڵدێن؟ چۆن دەتوانن خودا دەستەپاچە بكەنو چنگی قارو غەزەبی نەیانگاتێ؟ ئەوان هەموویان لەژێر چنگی دەسەڵاتی یەزدان دان، بەڵكوو هەموو زەوی، هەموو بوونەوەر لەدەستی قودرەتی خودا دایە، ئەویش بڕیاری داوەو مەزندەی كردوە كە كافران ریسوا بكاو كەسیش ناتوانێ

لەبەردەم بڕیارو ویستی خودادا ببێتە لەمپەرو کۆسپو تەگەرە. کێ دەتوانێ قەزاو قەدەری خودا رەت بکاتەوە؟!

دوای ئەوە، ئەو وادەیە دەستنیشان دەکا: کە جاڕدانو راگەیاندنەکەی تێدا ئەنجام دەدریو بەموشریکەکان رادەگەیەنیو ماوەکە دیاری دەکرێ، دەترسێندرێنو ئاگادار دەکرێنەوە.

دوای ئەوەی پەروەردگار ئیعلانی بەرائەتی خۆی لەموشریکەکان کرد، ئەمجار فەرمانی کرد بەراگەیاندنی ئەم بەرائەتە بۆ هەموو ئادەمیزادەکان بەگشتیو دەفەرموێ: ﴿وَأَذَانٌ مِنْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى النَّاسِ يَوْمَ الْحَجِّ الأَكْبَرِ أَنَّ اللَّهَ بَرِيءٌ مِنْ الْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُ﴾ ئەمە جاڕدانو راگەیاندنە لەخوداو پێغەمبەری خوداوە بەبەرائەتو دەستبەردار بوونیان لەپەیمانو بەڵێنی موشریکەکان، بۆ ئەوەی بگاتە هەموو ئادەمیزادان بەگشتی لەرۆژی حەجی گەورەدا: کە رۆژی جەژنی قوربانە؛ ئەو رۆژەی کە ئەرکەکانی حەجی تێدا تەواو دەکرێ، گەورەترین رۆژی ئەنجامدانی کاروباری حەجە، ئەو رۆژەیە کە حاجیەکان لەمینا دا کۆدەبنەوە بۆ تەواو کردنی کارەکانی حەج.[٤] کەوابێ جار دانو بەرائەتەکە دووبارە کردنەوەیان تێدا نیە، چونکە بەرائەتی یەکەم تایبەتە بەپەیمان لەگەڵ بەستراوەکانو پەیمان شکێنەکان، راگەیاندنی بەرائەت لەجاری دووەم دا گشتییەو بۆ هەموو ئادەمیزادانە بەپەیمان

---

[٤] بەگوێرەی ریوایەتێکی ئیبنو عەبباسو بەمەزنەدەی ریوایەتی ئیبنو مەسعوودو ئیبنو ئەبی ئەوفاو موغیرەی کوڕی شوعبەو بەگوێرەی رێبازی ئیمامی مالیك رۆژی حەجی گەورە رۆژی جەژنی قوربانە، چونکە لەرۆژی جەژنی قوربان دا هەموو کاروباری حەج تەواو دەبن:- راوەستانی عەرەفە لەشەوەکەیدایە، رەمیو سەربڕین قوربانیو ئیحرام شکاندنو طەوافی کەعبە لەبەیانییەکەی دا ئەنجام دەدرێن.

بەرای عومەرو عوسمانو ریوایەتێکی ئیبنو عەبباسو رای طاووسو موجاهیدو بەگوێرەی مەزهەبی ئەبو حەنیفەو مەزهەبی شافعی رۆژی حەجی گەورە رۆژی عەرەفەیە، چونکە مەحرەمە فەرموودەیەك ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (يوم الحج الأكبر يوم عرفة) رۆژی حەجی مەزن رۆژی عارەفەیە.

لەگەڵ بەستراوو پەیمان لەگەڵ نەبەستراویانەوە، ئەوانەی پەیمانیان شکاندوەو ئەوانەی پابەندی بوون.

جا لەگەڵ ڕاگەیاندنی ئەو بەرائەتو جاڕدانو بانگ هەڵدانەدا، هەڵنان بۆ هیدایەتو ترساندن لەگومڕایی دەخاتە ڕوو دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ بەو کافرو موشریکانە بڵێن: ئەگەر تۆبە بکەنو واز لەهاوەڵدانان بۆ خودا بێنن، ئەوە بۆ ئێوە باشترو بەسوود ترە، لەدونیاو قیامەت دا سوودمەند دەبن، ﴿وَإِنْ تَوَلَّيْتُمْ﴾ ئەگەر تۆبە نەکەنو نەگەڕێنەوە بۆ لای خودا، پشت لەئیمانهێنان هەڵکەن، ڕو ئەئاینی ئیسلام وەرگێڕن، لەسەر کوفرو بێدینی خۆتان بەردەوام بن، ئەوە ﴿فَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللَّهِ﴾ باش بزانن ئێوە خودا دەستەوەسان ناکەن، سزاو عەزابی بۆ ئێوە دیو لەچنگی قارو غەزەبی ڕزگارتان نابێ، چونکە ئەو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێك دا باڵایە، هیچی لێ یاخی نابێ، عەزابو سزای سامناکی بەسەر ئێوە دا دەداو ناتوانن هیچی بەرامبەر بکەن، وادەو بەڵێنی خۆی بۆ پێغەمبەرانی بەوە کە بەسەر ناحەزانیان دا سەریان دەخا دێنێتە جیو کۆمەکیتان پێ دەکا.

﴿وَبَشِّرِ الَّذِينَ كَفَرُوا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئەی پێغەمبەر! موژدە بەو کەسانە بدە کە ئینکاری پێغەمبەرایەتیەکەت دەکەنو بڕوا بەخوداو بەفریشتەی خودا ناهێنن بەسزایەکی بەئێشو کوشندە لەقیامەت دا، هەڵبەتە بەکارهێنانی موژدە لەشوێنی هەڕەشەو ترساندن ئوسلوبێکی گاڵتە ئامێزو لاقرتێ پێکردنە بۆ زێدە سوکایەتی پێکردن بەو موشریکە ملهوڕانە. ئەم تەرغیبو تەرهیبە لەم شوێنە دا ئاماژەیان تێدایە بۆ چۆنیەتی سروشتی مەنهەجی ئیسلامی، ئەوە دەگەیەنێ کە ڕێبازی ئیسلام پێش هەموو شتێك ڕێبازی هیدایەتو ڕزگار کردنە، ئەوەتا مۆڵەتی موشریکەکان دەدا نەك لەبەر ئەوە نایەوێ غافلگیریان بکاو لەنکاو پەلاماریان بدا، بەڵکوو مۆڵەتیان دەدا بۆ تێفکرینو ورد بوونەوە لەداهاتووی خۆی، بۆ ئەوەی ڕێگای گونجاوو لەبار هەڵبژێرین؛ هەڵیان دەنێ بۆ تۆبە کردن لەشیرکو بێدینی، بۆ گەڕانەوە بۆ لای خودا، لەپشت هەڵکردنو ڕو وەرگێڕان لەئایین دەیانترسێنێ، هەڕەشەیان لێ دەکا بەسزای بەئێشو سامناك لەقیامەت دا، ئەمەش زیاد لەریسواکردنیان لەدونیا دا! بۆ ئەوەی دڵیان وەلەرز بێنیو هەستو هۆشیان

راتلەقێنێ، بەڵکو ئەو تەپو تۆزەی سروشتی داپۆشیون بتەکێنـدرێو نیگا ببیـسنو بەپیریەوە بێن..

ئەمجار پەروەردگار تاقمێك چەرت دەکاو لەوانەیان هەڵدەهاوێرێ کە مۆڵەتی چوار مانگەکە دەیانگرێتەوە، ئەو تاقمەش کەسانێکن کە پەیمانەکەیان سنووردارو دیاری کراوەو دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ عَاهَدتُّمْ مِنْ الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْئاً وَلَـمْ يُظَـاهِرُوا عَلَـيْكُمْ﴾ واتـە: هـەواڵی هەڵوەشـاندنەوەی پـەیمان هـەموو موشـریکەکان دەگرێتەوە جگە لەوانەی پەیمانتان لەگەڵ بەستوونو پابەنـدی پەیمانەکە بـوونو هـیچ خـاڵێکی پەیمانەکـەیان پێـشێل نـەکردوە، یارمـەتی هـیچ دوژمنێکیـان دژی موسوڵمانان نەداوە، وەکوو خێڵی بەنو ضەمـرەو خێڵی بـەنو کینانـە، کـە پابەنـدی پەیمانەکەی خۆیان بوون. ئەوانـە ﴿أَحَداً فَأَتِمُّوا إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَى مُـدَّتِهِمْ﴾ پابەنـدی پەیمانەکـەیان بـنو تاکـاتی دیـاریکراو تـەواو بـوونی پەیمانەکـەیان لەگـەڵیان دا هەڵکەن، بەمەرجێ ئەو پەیمان لەگەڵ بەسراوانە پەیمانەکەیان نەشکێنن، کۆمـەکی دوژمنـی موسـوڵمانان بکـەن، ئەوانـە وەفـا بەعەهـدو نیمـەیان دەکـرێ، ئـەمجار پەروەردگار جەختی لەسەر پێویستی وەفا بەپـەیمان کـردەوە، فـەرمووی: ﴿إِنَّ اللَّـهَ يُحِـبُّ الْمُـتَّقِينَ﴾ بێگومـان پـەروەردگار ئەوانـەی خـۆش دەوێـن کـە وەفـا بەعەهـدو پەیمانی خۆیان دەکەن.

ئیبنولقەییمی جەوزی دەڵێ: ئەوانەی خودا ئیـستثنای کـردنو فـەرمانی کـرد بەموسوڵمانان کە وەفا بەپەیمانەکەیان بکەن تا ماوەکەیان تـەواو دەبـێ، نـەك هـەر ئەوانەی پێش تەواو بوونی ماوەی پەیمانەکەیان موسـوڵمان بـوون، بـەڵکو ئەوانـەی پەویمانەکەشیان هەڵوەشاندبوەوەو خەڵکانی تریش لەوانەی کە مۆڵەتی چوار مانگ دران لەجیاتی ئەوەی ئەو ماوەیە گەشتو گوزار بکەن هاتنە ژێـر ئـاڵای یـسلامەوەو موسوڵمان بوون.

بێگومـــان پـــەروەردگار کـــە بەدەســـتی قـــودرەتی خـــۆی نەخـــشەی ئـــەم بانگەوازییەی کێشابوو- دەیزانی کە کاتی وشاندنی ئەم گورزە کاریگـەرە هـاتووە کـە ئاڕاسـتەی بـن چـنگی کۆمـەڵی موشـریکەکان بکـرێ، دەیزانـی کـە بـارودۆخ لـەبارەو

زەمینە خۆش‌و سازە بۆ جاڕدانی ئەم هەواڵە گرنگە، دەیزانی کە بەگوێرەی واقیعی کارو رواڵەتی رۆژگارو بەگوێرەی قەزاو قەدەری شێردراوەی خودا کاتی راگەیاندنی ئەم هەواڵە یەکالا کەرەوە بێ باکانە هاتووە، وەختی ئەوە هاتووە پیگایەکی ئەمین‌و خاوێن‌و تۆکمە بۆ دەوڵەتی ئیسلام دابمەزرێنی‌و نێوە دوورگەی عەرەب لەناموسوڵمانان خاوێن بکرێتەوەو بکرێتە ناوەندی پەلهاویشتن‌و جم‌و جۆڵی سوپای ئیسلام‌و لەوێوە مەفرەزەو لەشکرو سوپاکان بەم لاو بەو لادا بنێردرێن‌و ئاراستە بکرێن.

## پێویستبوونی شەڕکردن دژی موشریکەکانی عەرەب لەهەر کوێیەك بن

﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلۡأَشۡهُرُ ٱلۡحُرُمُ فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ وَخُذُوهُمۡ وَٱحۡصُرُوهُمۡ وَٱقۡعُدُواْ لَهُمۡ كُلَّ مَرۡصَدٖۚ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥﴾ ﴾

ئەم ئایەتە لق‌و پۆپی ئایەتی پێشووە، لەوەپێش پەروەردگار جاڕی بەرائەتی خۆی‌و پێغەمبەرەکەی لەپەیمانی موشریکەکان راگەیاند، مۆڵەتی چوار مانگی پێدان، ئەمجار لێرەدا باسی ئەوە دەکا: کە چ پێویستە موسوڵمانان بیکەن دوای تەواو بوونی ماوەی مۆڵەتەکە. دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا انسَلَخَ الأَشْهُرُ الْحُرُمُ﴾ ئەم ئایەتە بەئایەتی شمشێر بەناوبانگە، واتە: هەر کاتێ مانگە رێزدارەکان تەواو بوون، ئەو مانگانەی شەڕیان تێدا یاساغ کراوە بەڕێ بوون، کە بەلای زوربەی موفەسیرەکانەوە لەرۆژی جەژنی قوربانەوە دەست پێ دەکا تا دەگاتە رۆژی دەیەمی رەبیعولئاخیر، ئەوە چی بەرژەوەندی تێدایە لەم شتانەی دوایی ئەومیان لەگەڵ دا بکەن:

١- ﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾ موشریكو كافرەكان بكوژن لەهەر شوێنێك بەردەستتان كەوتن: لەناو بەستی كەعبە دابن یان لەدەرەوەی حەرەم بن، چۆنتان فرسەت لێ هێنان بەسەریانەوە مەچنو كۆیان لێ مەكەن.

٢- ﴿وَخُذُوهُمْ﴾ یان ئەگەر ویستان بەدیل بیانگرن بۆ ئەوەی دوایی یان بیانكوژن یان بەفیدیە بەرەڵایان بكەن، یان بەمنەتو پیاوەتی مەرەخەسیان بكەن.

٣- ﴿وَاحْصُرُوهُمْ﴾ یان لەناو قەڵاو باڵەخانەی خۆیان دا دەورەیان بگرن تا موسوڵمان بن، مەهێڵن دەرچن، هەتا گەردنكەچو سەر شۆڕ نەبنو چییان پێ دەڵێن ئەنجامی نەدەن گەمارۆ دانەكەیان لەسەر هەڵمەگرن، مەگەر ئیزنیان بدەن بەئامانو زامان بێنە ژێر سایەی ئێوەوە.

٤- ﴿وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ﴾ یان لەهەموو سەنگەرو بەندەنێك بۆیان دانیشنو چاودێرییان بكەنو بیانخەنە ژێر چاوەدێریو موراقەبەوە، هاتا ناچاریان دەكەن ئیمان بهێنن، هەتا دڵو دەروونیان پڕ بكەن لەترسو لەرزو زەندەقیان بچیو نەوێرن بەربەرەكانیتان بكەن.

ئایەتەكە بەرروونی فەرمان دەكا بەموسوڵمانان كە لەپاش تێپەڕبوونی چوار مانگ دەست لەموشریكەكان نەپارێزن لەهەر شوێنێك بەرپەلیان كەوتن بەقوتاریان نەدەن، یان بەدیلیان بگرن، یان دەوریان بگرنو نەهێڵن كەسیان دەرچێ، جگە لەوانەی كە فەرمان بەموسوڵمانەكان كراوە كە تا تەواو بوونی ماوەی پەیمانەكەیان هیچیان لەگەڵ نەكەن.

چونكە ئەو موشریكانە ئاگادار كراونەوە، ترسێندراون، هەڕەشەیان لێ كراوە، بۆ كارێكی دیاریكراویش مۆڵەتیان دراوە، كەوابێ ئەوان بەغەدرو خیانەت ناكوژرێن، بەغافڵگیری پەلامار نادرێن. پەیمانیان بەئاشكرا بۆ فڕێ دراوەتەوەو هەڵوەشێندراوەتەوەو پێش وەخت دەزانن چی چاوەڕوانیان دەكا! بەڵام ئەمە هەڵمەتی قەڵاچۆ كردنو لەناو بردن نەبوو بەڵكوو هەڵمەتی ترساندنو هەڵنان بوو بۆ موسوڵمان بوون. ﴿فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ﴾ ئەگەر تۆبەیان لەكوفرو هاوەڵدانان كردو هاتنە ژێر ئاڵای ئیسلامەوەو موسوڵمانبوونی

خۆیان راگەیاندو ئەرکەکانی ئیسلامیان جێبەجێ کردن؛ نوێژەکانیان بەرێکو پێکی ئەنجامدانو زەکاتی ماڵو سامانی خۆیان دەرکرد، ئەوە رێگەیان بۆ ئاچووغ بکەنو وازیان لێ بێنن با ئیتر کارو باری خۆیان ئەنجام بدەن ﴿إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ بزانن، کە خودا لێخۆشبوو لێبوردوە بۆ ئەو کەسانەی داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەن، بەرەحمو بەزەییە بەوانەی تۆبە دەکەنو دەگەڕێنەوە بۆ لای.

خوێنەری هێژا! سەیری مەنهەجی ئیسلام بکە، چەند مەنهەجێکی ئاشتیخوازو پیرۆزە، بیستو دوو ساڵ تێپەڕیوە، پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازییان دەکاو هەوڵیان لەگەڵ دەدا، بیستو دوو ساڵە ئەو موشریکو کافرە ملهوڕانە ئەزیەتی موسوڵمانان دەدەنو بەرەنگاریی خۆیانو ئاینیان دەکەن، بەهەمموو جۆرێك هەوڵی لەناوبردنو قەلاچۆ کردنیان دەدەن، کەچی سەیری سەماحەتی ئیسلامو هەڵگرانی بکە، پاش ئەو مێژووە دورو درێژە، لەگەڵ ئەو هەمموو ئەزیەتدانو تەنگ پێ هەڵچنینو دوژمنایەتیکردنەیان بۆ ئاینو رێرەوانی، پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەرو موسوڵمانان دەکا کە باوەشیان بۆ بکەنەوە، فەرمان دەکا بەو موسوڵمانانەی کە ئەزیەتدراون، دەربەدەر کراون شەڕیان لەگەڵ کراوە، ماڵو سامانیان داگیرکراوە؛ فەرمانیان پێ دەکا کە واز لەموشریکەکان بێنن بەمەرجێك بگەڕێنەوە بۆ لای خوداو تۆبە بکەن، موسوڵمان بنو پابەندی شەعائیرەکان بنو گەردنکەچی خۆیان بۆ ئاین رابگەیەنن‌و ئەرکەکانی ئەنجام بدەن! چونکە خودا تۆبەی تۆبەکار رەت ناکاتەوە، چەندێك تاوانی گەورەی کردبنو دوژمنێکی سەرسەخت بوو بێ کە تۆبەی کرد تۆبەی وەردەگیریو دەبێتە ئەندامێکی کۆمەڵی موسوڵمانان!

**تێبینی:**

ئایەتەکە ئەم حوکمانەی لێ وەردەگیرێن:

١- شەڕکردن لەدژی عەرەبە موشریکەکان هەتا ئیمان دێنن، چونکە ئەوان سەرانەیان لێ وەرناگیرێ: یان دەبێ بکوژرێن یان موسوڵمان بن.

٢- نوێژ کردنو زەکاتدان نیشانەی موسوڵمانبوونە، هەر کەسێ پابەندیان بوو خوێنو ماڵی پارێزراوەو مافی موسوڵمانانی دەدرێتێ مەگەر تاوانێکی تر بکا کە شیاوی تۆڵە لێ ستاندن بێ؛ بەم جۆرە بەنارەوا ئادەمیزادێکی بێ تاوان بکوژێ، یان ژنی هێنا بێو زینا بکا، یان دوای موسوڵمانبوون هەڵبگەڕێتەوە؛ بوخاریو موسلیمو هی تریش فەرموودەیەکیان گێڕاوەتەوە لەئیبنو مەسعوودو هی تریشەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لايحل دم امرئ مسلم الا باحدى ثلاث: كفر بعد ايمان، أوزنىً بعد احصان، أو قتل نفس بغير نفس.)

شەیخان؛ موسلیمو بوخاری فەرموودەیەکیان لەئیبنو عومەرەوە لەپێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی -فەرموودەکەش موتەواتەرە: (أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا ان لا اله الا الله، وان محمد رسول الله، ويقيموا الصلاة، ويؤتوا الزكاة، فاذا فعلوا ذلك، عصموا مني دماءهم وأموالهم الا بحق الاسلام، وحسابهم على الله.) مەبەستیش بەوشەی (الناس) لێرەدا بەکۆڕای زانایان عەرەبە موشریکەکانن.

بەمەرج گرتنی ئەم سێ شتە: (شایەتومان، نوێژ کردن، زەکاتدان) لەم ڕووەوەیە: کەوتنی شایەتومان بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەو کەسە وازی لەبەندایەتیکردنی غەیری خودا هێناوەو بەگوێرەی ئامۆژگاری پێغەمبەر (ﷺ) هەڵسو کەوت دەکا. ئەنجامدانی نوێژ ڕۆژی پێنج جار نیشانەی ئەوەیە کە چووەتە ریزی موسوڵمانانەوەو بۆتە ئەندامێکی ئەوان، زەکاتدانیشی نیشانەی ئەوەیە: کە ڕێزی یاسای ئیسلام دەگریو پابەندی قانوونی ئابووریو کۆمەڵایەتی ئیسلامە.

٣- ئیمامی شافیعی لەم ئایەتە ئەوەی وەرگرتووە: کە کەسێك نوێژ نەکا دەکوژرێ چونکە خودا لەهەموو حاڵێك دا خوێنی کافرەکانی بەحەڵاڵ داناوە، پاشان بەوەدی هاتنی سێ مەرج (تۆبە-نوێژ- زەکاتدان) خوێنەکەیانی حەرام کردوە، هەرکاتێ ئەم مەرجە نەهاتنە دی پێویستە بچینەوە سەر ئەو حاڵەتە کە خوێنەکەیان حەڵاڵە. جەصصاص کە خۆی حەنەفی مەزهەبە، دەڵێ: مەبەست بە ﴿وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ﴾ بڕوا بەپێویستبوونیانە نەك کردنیان!

٤- حەزرەتی ئەبو بەکر (ﷺ) دەربارەی ئەوانەی زەکاتیان نەداو هەڵگەڕانەوە، فەرمووی: (لا أفرق بين ما جمع الله) ئەمن جوداوازی ناخەمە نێوان ئەو دووشتەی خودا کۆی کردوونەوە، ئەمجار وتی: (لأقاتلن من فرق بين الصلاة والزكاة؛ فان الزكاة حق المال) سوێند بێ شەڕ لەگەڵ هەر کەسێك دەکەم جوداوازی بخاتە نێوان نوێژو زەکات، چونکە زەکات مافێکە لەسەر ماڵو دارایی.. جا دوایی ئیبنو عەبباس دەیفەرموو: خودا ڕەحم بەئەبو بەکر بکا چەند لەشەرع تێگەیشتووبو!

زانایان کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە کەسێك واز لەنوێژو ڕۆژوو زەکاتو فەرزەکانی تر بێنێو پێی وا بێ واجب نین پێی کافر دەبێ. کەسێك واز لەئەنجامدانی سوننەت بێنێو نەیکا بەبێ بایەخیان بزانێ پێی فاسق دەبێ.

٥- کەسێك لەبەر تەمبەڵی نوێژ نەکا، واتە بڕوای وا بێ کە فەرزە بەڵام تەمبەڵ بێ نەتوانێ بیانکا. مالیکو شافیعی پێیان وایە: کەسێك بڕوای بەخودا بێو پێغەمبەران بەراست بزانێ نوێژ نەکا دەبێ بکوژرێ.

ئەبو حەنیفە دەڵێ: بەند دەکرێ، لێی دەدرێ، ناکوژرێ، چونکە بەخودا ناسینەکەی لەپێڕی موشریکان دەرچووە، لەسەر نوێژ کردنو زەکات نەدانی بەند دەکرێو لێی دەدرێ. کەسێك نوێژ بکاو زەکات نەدا، دەبێ بەند بکرێ.

٦- کە دەفەرموێ: ﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ﴾ فەرمانەکە گشتییەو هەموو موشریكو کافرێك دەگرێتەوە. بەڵام فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم حوکمە گشتییەی تایبەت کردوە، ئافرەتو منداڵو ڕەبەن دێرنشینەکانی لەم حوکمە چەرت کردوە، کەوابوو مەبەست بەئایەتەکە: ئەو موشریکانە بکوژن کە شەڕتان لەدژ دەکەن، موشریکانی عەرەب یان دەبێ موسوڵمان بن یان دەکوژرێن. خاوەن نامەکان سەرپشك دەکرێن لەنێوان سێ شت دا، یان موسوڵمانبوون، یان سەرانە دان، یان کوشتن.

حەدیثەکەی بورەیدە: کە موسلیم ریوایەتی کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: کە تووشی موشریکەکان بوون، بانگەوازیان بکەن بۆ موسوڵمان بوون، ئەگەر موسوڵمان نەبوون داوای سەرانەیان لێ بکەن، ئەگەر دایان لێیان وەربگرنو وازیان لێ بێنن..) ئەم فەرمووده هەرچەندە گشتییەو هەموو موشریکان دەگێریتەوە بەڵام لەروانگەی ئەم ئایەتەی ئێرەوە عەرەبە موشریکەکان لەم حوکمەوە دەنراون.

## پەنادان رەوایە

﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ  ﴾

لەئایەتی پێشوو دا پەروەردگار پاش مۆڵەتی چوار مانگەکە، جەنگانو شەڕکردنی دژی موشریکەکان بەواجب دانا، وەکوو راڤەکراو شی کرایەوە. ئەمجار لێرەدا ئەوە روون دەکاتەوە کە تەنگ پێ هەڵچنینو زۆر لێکردن لێیان بۆ ئەوەی یان موسوڵمان بن یان بکوژرێن، ئەوە ناگەیەنێ کە زەمینە خۆش نەکرێ بۆ موشریکەکانو نەهێڵدرێ گوێیان لەقورئانو بەڵگەکانی ئیمان ببێ. بەڵکوو ئەگەر یەکێك لەموشریکەکان داوای بەڵگەو نیشانەی کرد، یان هات گوێی لەقورئان بێ، ئەوە پێویستە رێگای پێ بدریو هۆکاری بۆ بڕەخسێندرێ، نابێ بکوژرێ، پاش گوێگرتنو بەڵگە بیستن دەبێ بگەیەندرێتەوە شوێنی خۆیو لەکاتی هاتن بۆ وڵاتی موسوڵمانانو لەکاتی مانەوەیو لەکاتی گەڕانەوەی دا نابێ هیچ ترسو بیمێکی هەبێ.

جا هەرچەند ئایەتی پێشوو کە بەئایەتی شمشێر بەناوبانگە زۆر کاریگەری هەبوو لەسەر موشریکە عەرەبەکانو ئایەتێکی یەکالا کەرەوە بوو: بەڵام ئاشکراو

نمایانە کە ئیسلام ئایینی هیدایەتە، نەك ئایینی قەلاچۆ کردن، چونکە ئیسلام سوورە لەسەر بڵاوکردنەوەی بانگەوازی خۆی لەرێگەی هۆکاری ئاشتییەوەو بەهۆی بەڵگەو نیشانەو قەناعەتی دەروونییەوە. بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە مەبەستی لەجیهاد خوێنرشتن نیە، بەڵکوو ئەوەی لای ئیسلام گرنگە ئەوەیە ئیمان بچێتە ناو دڵانەوە، خەڵکی واز لەسەرپێچیو یاخی بوون بێنن، ئایین قبووڵ بکەنو دان بەتاکو تەنهایی خودادا بنێن. سەرباری ئەمانە هەموو بۆ رێزنان لەهۆکارەکانی دانانی جیهادو بۆ جەخت کردنەوەی سوور بوونی ئیسلام لەسەر ئاشتیو ئاشتەوایی، پەروەردگار رێنمویی موسوڵمانان دەکا: کە پێویستە هەر موشریکێك داوای حەوانەوەی کردو ویستی لەناو موسوڵمانان دا ماوەیەك بمێنێتەوە، دەبێ پەنای پێ بدریو بحەوێندرێتەوە، ئەوەتا قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ﴾ ئەگەر کابرایەك لەموشریکەکان پاش هەڵوەشاندنەوەی پەیمانو تێپەڕبوونی چوار مانگەکە هاتە لای ئێوەو پەنای بۆ هێنان ویستی گوێی لەئایەتەکانی قورئان بێ، لەپوختەی ئیسلام حاڵی ببێ، بەڵگەو دەلیل ببیستێ، ئەوە پەنای بدە، پارێزگاری بکە، هۆکاری بیستنی قورئانی بۆ ئاسان بکە، با بەدڵ گوێی لەقورئان بێ نەسیحەتو ئامۆژگاری ببیستێ. ﴿حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ﴾ هەرکاتێ ویستی بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، پێویستە پارێزگاری بۆ دابین بکرێ تا دەگاتەوە وڵاتی خۆی، پاشان ئەگەر ویستت شەڕیان لەگەڵ بکەی بەبێ غەدرو خیانەت دەتوانی شەڕیان لەگەڵ بکەی.

حوکمی ئەم ئایەتە بەردەوامو چەسپاوەو نەسڕاوەتەوە. حەسەن دەفەرموێ: ئەم ئایەتە موحکەمەو حوکمەکەی تا رۆژی قیامەت بەردەوامە..

سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: پیاوێکی موشریك هاتە خزمەت ئیمامی عەلی (ﷺ) وتی: ئەگەر یەکێك لەئێمە پاش تەوا بوونی ماوەی مۆڵەت کەراگەیەنراوە، بێتە لای موحەممەد بۆ ئەوەی گوێی لەقورئان بێ، یان کارێکی تری هەبێ، ئایا دەکوژرێ؟

عەلی فەرمووی: نا، چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ﴾ ئیمامی سوودیو ضەحاك دەفەرموون: ئەم ئایەتە حوكمەكەی سڕاوەتەوە بەئایەتی ﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ﴾ نەسخ بووەتەوە. ئیمامی قورطوبی ڕەدیان دەداتەوە دەفەرموێ: ڕای پەسند ئەوەیە ئایەتەكە موحكەمەو حوكمەكەی بەردەوامە، فەرمایشتەكەی ئیمامی عەلی لەریوایەتەكەی سەعیدی كوڕی جوبەیر باشترین بەڵگەیە.

ئەمجار فەرمووی: ﴿ذَلِكَ﴾ ئەو تەسامو‌حو لێبوردەییو ئاشتیخوازییەی ئیسلام كە لەپەنادانو حەوانەوەی ئەو موشریكانە دا خۆی دەنوێنیو لەپارێزگای گەڕاندنەوەیان بۆ وڵاتی خۆیان دا ڕەنگ دەداتەوە ﴿بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لا يَعْلَمُونَ﴾ بەهۆی ئەوەوەیە: كە ئەو موشریكانە تاقمو گرۆهێكی نەفامو تێنەگەیشتوون، ئاگایان لەحەقیقەتی ئیسلام نیەو، نازانن پوختەو كاكڵەی ئەو ئایینە چیەو چی نیە، ئادەمیزادیش دژایەتی ئەو شتە دەكا كە نایزانێ، كەوابوو پێویستە ئەمانیان بدرێ بۆ ئەوەی كەلامی خودا ببیسنو لەحەق حاڵی بن.

هەر لەم ڕوانگەوە بوو: كە پێغەمبەر (ﷺ) دڵنیایی دەدا بەهەر كافرێك بهاتایە بۆ فێربوونو تێگەیشتن یان ڕاسپاردەو نامەی بهێنایە، وەكوو ڕۆژی حودەیبییە كۆمەڵێك لەفروستادەكانی قورەیش هاتنە خزمەتی عوروەی كوڕی مەسعوودو میكرەزی كوڕی حەفصو سوهەیلی كوڕی عەمرو هی تریشیان تێدا بوون، ئەمانە یەكە یەكە لەنێوان پێغەمبەرو موشریكەكان دا هاتوچۆیان دەكرد بۆ صوڵحو ڕێك كەوتن، ئیتر ئەمانە ئەوەندە ڕەوشتی بەرزو جوانیان لەپێغەمبەر (ﷺ) بینی سەریان سوڕما، بەجۆرێك كە ئەو ڕەوشتو هەڵسو كەوتە جوانانەیان لەهیچ پاشاو مەلیكو سەركردەیەك نەبینیبوو، ئەمانە كە دەگەڕانەوە بۆ ناو هۆزەكانیان باسی ئەو ئەخلاقو ڕەوشتانەیان دەكرد كە لەپێغەمبەریان دەبینی! ئەمەش گەورەترین هۆكاربوون بۆ موسوڵمانبوونی زوربەیان.

تەنانەت كە دوو فروستادەی موسەیلیمەی درۆزن هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) لێ پرسین ئایا ئێوە شایەدی دەدەن كە موسەیلیمە پێغەمبەری خودایە؟

وتیان: بەڵێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (والله لولا أن الرسل لا تقتل، لضربت أعناقكما) سوێندم بەخودا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە فروستادە ناکوژرێن، لەملم دەدان. ئەم فەرموودەیە ئەحمەدو ئەبو داوود لەنەعیمی کوڕی مەسعوودەوە ریوایەتیان کردوە.

ئەم ئایەتەو وێنەکانی بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنن کە ئیسلام دەیەوێ هەموو ئادەمیزادێك رێگەی هیدایەت بگری‌و گەڕانەوەی بۆ لای خودا بێ، ئەو موشریکانەی داوای پەناو شوێنی حەوانەوە دەکەن‌و دەیانەوێ بۆ ماوەیەك لەوڵاتی موسوڵمانان دا بمێننەوە پیویستە پەنایان بدری‌و پارێزگاریشیان بکرێ، چونکە لەم حاڵەتە دا ترسی ئەوەیان لێ ناکرێ زیان بەموسوڵمانان بگەیەنن. کەوابوو چ خراپەیەکی تێدا نیە کە هەلێکیان بۆ بڕەخسێندرێ گوێیان لەقورئان بی‌و فێری ئایین ببن، بەڵکو دڵو دەروونیان نەرم بی‌و بەویستی خۆیان موسوڵمان ببن. بێگومان ئایینی ئیسلام مەنهەجی هیدایەتو بەختەوەرییە، مەنهەجی ریشەکێش کردن‌و لەناوبردن نیە.

ئەوانەی باسی جیهاد دەکەن لەئیسلام داو وای دەخەنەڕو کە بەزۆرە ملێ دەیەوێ خۆی بسەپێنی‌و خەڵکی بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە! ئەوانەش کە ئەم تاوانبار کردنەیان بەدڵ نیە، هەوڵ دەدەن داکۆکی لەئایین بکەن دەڵێن: ئیسلام کە پەنا بۆ جەنگ دەباو شەڕ رادەگەیەنێ تەنیا بۆ بەرگریکردن لەولاتو سنووری خۆی پەنا بۆ شەڕ دەبا! ئەمانە هەردوو لایان لەئایین حاڵی نەبوون‌و پێویستە وردترو رونتر بیر بکەنەوەو لەتەوجیهاتەکانی قورئان تێبفکرن‌و گوێچکەو دڵی خۆیانی بۆ بکەنەوە! بێگومان ئایینی ئیسلام جاردان‌و راگەیاندنە بۆ ئەوانەی لەئایین حاڵی نەبوون نازانن چیەو چۆنە، پەناو حەشارگەیە بۆ کەسانێك پەنای بۆ بەرن، تەنانەت بۆ ئەوانەش کە دوژمنی سەرسەختی ئەو ئایینە بوون‌و لێی چوونە سەنگەرەوەو لەدژی شمشێریان لەکالان کێشاوەو بەرامبەری وەستاون‌و هەوڵی لەناوچوون‌و ریشەکێش کردنیان داوە!

ئیسلام کە فەرمان بەموسوڵمانان دەکا بەشمێر جیهاد بکەن، بۆ ئەوەی ئەو کۆسپو تەگەرە مادی‌و مەعنەویانە وردو خاش بکا کە دەبنە لەمپەڕ لەنێوان

ئادەمیزادەکانو بیستنی کەلامی خودادا، دەبنە پەردەو بەربەست لەنێوان ئەوانو زانیاری بەو پەیامەی خودا ناردویەتیە خوارێ، لەنێوان ئەوان روناکی هیدایەت، لەنێوان ئەوانو رزگاربوونیان لەبەندایەتی کردن بۆ بەندەیەکی وەکوو خۆیان؛ جیهاد بەشمشێر بەرەوا دەزانێ بۆ رزگارکردنی ئادەمیزادەکان لەکۆیلایەتیو بەندایەتی کردنو رەها کردنیان بۆ ژێر سایەی خوداپەرستی. جا هەر کاتێ ئەم کۆسپو بەربەستانەی تێکشاندنو رایمالین، ئیتر ئادەمیزادەکان بەدڵنیاییو ئازادییەوە، با لەسەر بیرو باوەڕی خۆشیان بن لەسایەی دا دەحەسێنەوە، فێری ئایینیان دەکا نایانترسێنێ، پەنایان دەدا نایانکوژێ، پەنایان دەدا بۆ ئەوەی گوێیان لەکەلامی خودا بێ فێری تەعلیماتی ئایین بن، جا ئەوانە موسوڵمان بن یان بەکافری بمێننەوە، کە ماوەی پەنادانەکە تەواو بوو بەرێکو پێکی، لەژێر پارێزگاری پارێزەرانی موسوڵمانان دا دەگەڕێندرێنەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتوونو بەشوێنی دڵنیابوونی خۆیانی دەزانن.

ئەمڕۆ لەسەر زەوی دا چەندها نیظامو یاساو دابو نەریتی دانراوی ئادەمیزاد هەن بەسەدان پارتو گرۆهو رێکخراوو حکوومەتو فەرمانڕەوا هەن، کێ دەتوانێ لەژێر سایەی یەکێك لەم خۆسەپێنەرانە دا بحەوێتەوەو دژیشی بێ؟ تۆ کە دژی رژێمێك بیو لەبەردەستیشیا بی کوا لەژیانی خۆتوماڵو منداڵو خزمو کەسو کارت ئەمێنی؟ کوا ماڵو ناموسو موقەدەساتت پارێزراوە؟ دەی بۆ خۆت وردبەرەوە فێربەو ژیر بە، بڕوانە، ئەمجار بەراوردێکی بەویژدانانە بکە لەنێوان یاسای ئیسلامو هەریاسایەکی تری دانراوی ئادەمیزاد کە بەپێشکەوتوو مرۆڤ دۆست حلێب دەکرێ بۆ خۆت حوکم دەو بڕیار دەرکە بەلام بەویژدانانە!!!

## هۆکارەکانی دەستبەردار بوون لەپەیمانی موشریکەکانو شەڕ کردنیان لەژیان

﴿ كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ ٱللَّهِ
وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ
ٱلْحَرَامِ ۖ فَمَا ٱسْتَقَٰمُوا۟ لَكُمْ فَٱسْتَقِيمُوا۟ لَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ
ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٧﴾ كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُوا۟ عَلَيْكُمْ لَا يَرْقُبُوا۟
فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ يُرْضُونَكُم بِأَفْوَٰهِهِمْ وَتَأْبَىٰ قُلُوبُهُمْ
وَأَكْثَرُهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨﴾ ٱشْتَرَوْا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا
فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩﴾ لَا
يَرْقُبُونَ فِى مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُعْتَدُونَ
﴿١٠﴾ ﴾

پاش باسکردنی دەستبەردار بوونی خوداو پێغەمبەری خودا لەپەیمانی موشریکەکانو ئیعلانی شەڕی کرد دژیان، ئەمجار هۆی ئەو بەرائەتو دەستبەربوونە روون دەکاتەوە، هۆی مۆڵەتی چوار مانگ بۆ هەندێکیانو تەواو بوونی ماوەی پەیمان بۆ بڕێکیانو ئەمجار شەڕ کردن لەگەڵیان بەهەموو جۆرێك، دەست نیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ اللّٰهِ وَعِندَ رَسُولِهِ﴾؟ چۆن پەیمانی رێزلێ گیراو لای خوداو پێغەمبەری خودا دەبێ بۆ ئەو

موشریکانەی پەیمانیان پێشێل کردوە؟ ئەم رستە پرسیار ئامێزە مانای ئینکارو پێ رازی نەبوونی خودای لەخۆگرتووە، واتە: بەعەهدو پەیمانی ئەو کافرو موشریکانە بڕوا مەکەنو بایەخیان پێ مەدەن ئەوانە شیاوی ئەوە نین پەیمانیان لەگەڵ دا ببەستری‌و پەرەی پێ بدریٚ، ئەوانە لەراستی دا دوژمنن دڵرەشن، نیازی غەدرو خیانەتیان هەیە، هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن، بڕوایان بەخوداو پێغەمبەری خودا نیەو محاڵە ئەوانە خاوەنی وادەو بەڵێنی خۆیان بنو بەتەما پیاوەتی‌و پەیماندروستی ئەوان مەبن.

ئەمجار هەندێك هۆزو خێڵی عەرەبی لەو حوكمە وەلانانو فەرمووی: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ عَاهَدْتُمْ عِنْدَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ واتە: جگە لەو خێڵە عەرەبانەی كە لەلای كەعبە واتە: لەئاخی حەرەم دا پەیمانتان لەگەڵ بەستوونو پابەندی پەیمانی بەڵێنی خۆیان بوون ئەوانە حوكمەكەیان بەم جۆرەیە: ﴿فَمَا اسْتَقَامُوا لَكُمْ فَاسْتَقِيمُوا لَهُمْ﴾ هەتا ئەوان پابەندی وادەو پەیمانی خۆیان بن، ئێوەش پابەندی پەیمانەكە ببنو پەیمانشكێنی مەكەن، ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾ بێگومان پەروەردگار هەموو ئەو موسوڵمانانەی خۆش دەوێن كە وەفا بەپەیمانو بەڵێنی خۆیان دەكەنو گەردنكەچی فەرمانی خودان، خۆیان لەغەدرو خیانەتكاری دەپارێزن.

﴿كَيْفَ﴾ چۆن عەهدو پەیمان بۆ ئەو موشریكە پەیمانشكێنانە دەبێ؛ كەی ئەوان شیاوی ئەوەن كە پەیمانی رێزدارو وەفا پێكراویان لای خوداو پێغەمبەر هەبێ؟ وەلحال خودا بۆ خۆی دەزانی‌و ئاگادارە كە ئەوانە هەمیشە بۆ ئێوە لەكەمین دانو ﴿وَإِنْ يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ لا يَرْقُبُوا فِيكُمْ إِلاًّ وَلا ذِمَّةً﴾ ئەگەر فرسەتیان دەسكەوی‌و بەسەرتان دا زاڵ ببنو بزانن كە دەتوانن، ئەوە بێگومان هیچ موراعاتی سوێندو پەیمانو خزمایەتی‌و سوێند خۆری ناكەن، ئەمە هەڵنانی موسوڵمانانە بۆ ئەوەی سووربن لەسەر دوژمنایەتیكردنیانو دەستبەرداربوون لەپەیمانو بەڵێنیانو جەخت كردنەوەیە لەسەر ئەوە كە ئەوان شیاوی ئەوە نین ئێوە درێژە بەپەیمان بەستن لەگەڵیان بدەن، چونكە ئەوان هاوەڵ دادەنێن بۆ خوداو بڕوایان بەپەیامی پێغەمبەر نیە، ئەگەر دەسەڵاتیان بەسەر موسوڵمانان دا هەبێ، هەموانیان قەڵاچۆ دەكەنو هیچ شتێكیان لەبەر چاو نیە.

بڕێ لەدیاردەی دڵ پیسیو کینە لەدڵیان ئەومیە ﴿يُرْضُونَكُمْ بِأَفْوَاهِهِمْ﴾ فێڵبازو دووڕوون بەزوبان قسەی شیرین دەڵێن دڵیان پڕە لەکینەو دوژمنایەتیو حەسوودی. ئەوانە بەدەم قسەی خۆشو دۆستانەتان بۆ دەکەن ﴿وَتَأْبَى قُلُوبُهُمْ﴾ دڵیان بەو قسانەی خۆیان دەیانکەن رازی نیە!! ﴿وَأَكْثَرُهُمْ فَاسِقُونَ﴾ زوربەیان لەرێبازی حەق لایان داوەو پەیمانشکێنن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ﴾ (الفتح: ١١)

ئەمجار پەروەردگار دوو هۆکاری تر بۆ دەستبەردار بوونی خوداو پێغەمبەر لەپەیمانی موشریکەکان دەست نیشان دەکاو دەفەرموێ:

١- ﴿اشْتَرَوْا بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَناً قَلِيلاً فَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِهِ﴾ ئەوانە لەجیاتی پابەند بوون بەئایەتی خوداو پەیڕەو کردنی پەیامی ئیسلامو شوێنکەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەبنە هۆی شارەزابوون بۆ حەقو خێرو بەختەوەری هەردوو دونیا. ئەوانە لەجیاتی هەڵبژاردنی رێبازی ئیسلامو خوداپەرستی، شوێنکەوتنی هەواو هەوەسی خۆیان هەڵبژاردووە، خۆیان بەدونیا هەڵەوگیر کردوە، خەریکی دونیا خواردنن بەشێوەیەکی ناڕەوا، ئیتر سەرباری خۆیان خەڵکی تریش لەرێگا لادەدەنو ناهێڵن بچنە ژێر ئالای ئیسلامەوە، بۆ خۆیان موسوڵمان نابنو ناهێڵن خەڵکانی تریش موسوڵمان بن، ﴿إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ بێگومان ئەو کارەی ئەوان دەیکەن زۆر خراپە خراپکردارێکە کرداری ئەوان. ئەوەی ئەوان بۆ خۆیانیان هەڵبژاردووەو پێی رازی بوون تا بڵێی شتێکی ناشرینو قێزەونە.

٢- ﴿لا يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ إِلاًّ وَلا ذِمَّةً﴾ ئەوانە لە بەر ئەوەی کافرو خودا نەناسن دەربارەی هیچ موسوڵمانێك کە دەسەڵاتیان بە سەریدا بشکێ، موراعاتی هیچ سوێندو پەیمانو خزمایەتیەك ناکەن ﴿وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُعْتَدُونَ﴾ ئەوانە دەستدرێژی کەرنو ئەو پەڕی ستەمکاریو شەڕخوازییان پەیڕەو کردوە جگە لە شمشێر لە هیچی تر حاڵی نابن، ئەوانە بە زۆر نەبێ چارەیان ناکرێ، ئەوانە هەرگیز پابەندی پەیمانو بەڵێنیان نابن، زمانی حیوارو وتو وێژنازانن بەکوردی وەکوو ماری شێخ هۆمەر وان دەبێ بە دار شەرعیان بکرێ! ئەوەتا قورئان دوو

ڕەوشتی وە پاڵ داون، یەکەم فەرمووی: ﴿وَأَكْثَرُهُمْ فَاسِقُونَ﴾ دووەم فەرمووی: ﴿هُمْ الْمُعْتَدُونَ﴾. دەی باشە کەسانێك ئەو ڕەوشتانەیان هەبن چۆن ڕێزی پەیمانو بەڵێن دەگرن؟؟

**تێبینی:**

باوا نەزانـدرێ کەرەستەی ﴿لا يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ إِلاًّ وَلا ذِمَّةً﴾ لە ئایەتی دەیەمدا دوو بارە بوونەوەی رستەی ﴿لا يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ إِلاًّ وَلا ذِمَّةً﴾ ی ئایەتی هەشتەمە چونکە لە جاری یەکەم واتە لە ئایەتی هەشتەمدا مەبەست موشریکەکانە. لە ئایەتی دەیەمدا مەبەست جولەکەکانە، چونکە دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿اشْتَرَوْا بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَناً قَلِيلاً﴾ ئەمەش بۆ جولەکەکان گونجاوە، ئەگەر لە جاری دووەمیشدا هەر مەبەست موشریکەکان بێ ئەو کاتە دەبوو بە تیکرارو دووبارە بوونەوە.

## سەرەنجامی موشریکەکان
## یان تۆبەکردنو موسوڵمانبوونە یان شەڕو کوشتنە

﴿ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ
فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ۗ وَنُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١١﴾
وَإِن نَّكَثُوٓا۟ أَيْمَـٰنَهُم مِّنۢ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا۟ فِى
دِينِكُمْ فَقَـٰتِلُوٓا۟ أَئِمَّةَ ٱلْكُفْرِ ۙ إِنَّهُمْ لَآ أَيْمَـٰنَ لَهُمْ
لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ ﴿١٢﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار حاڵو چۆنیەتی موشریکەکانی دیاری کرد بەوەی کە دەربارەی موسوڵمانان هیچ سوێندو پەیمانیان لەبەر چاو نیە، پەیمانشکێنن،

دڵڕەشو خائینو سنوور شکێنن، ئەمجار پاش سەلماندنی دوژمنایەتییان بۆ ئیسلام ئەوە رادەگەیەنێ کە ئەوان دوو ڕێگایان لەپێشە یان تۆبە کردنو موسوڵمانبوون یان شەڕ کردن لەدژیانو کوشتنیان؛ واتە: لەم ئایەتانەدا ڕێنموویی موسوڵمانان دەکا کە چۆن هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ موشریکەکان دا پاش ئەوەی ئیعلانی دوژمنایەتی خۆیان دژی موسوڵمانان راگەیاند دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ﴾ ئەگەر تۆبەیەکی راستو دروستیان کردو وازیان لەکوفرو پەیمانشکێنیو هەڵخەڵەتاندنو گومڕاکردنی کەسانی دیکە هێنا، لەهاوەڵدانان بۆ خودا پەشێمان بوونەوە، بڕوایان بەتاکو تەنیایی خودا هێنا، نوێژەکانیان بەڕێکو پێکی ئەنجام دان، زەکاتی ماڵو سامانی خۆیان دەرکرد کە دەبێتە نیشانەی تەکافولی کۆمەڵایەتی لەناو موسوڵمانان دا، ئەگەر ئەمانەیان بەرێکو پێکی ئەنجام دان، ئەوە ئەو کاتە، ﴿فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ﴾ ئەوان برای ئایینیتانن، چی مافێك بۆ ئێوە هەبێ بۆ وانیش هەیە. چ ئەرکێك لەسەر ئێوە بێ لەسەر ئەوانیش دەبێ. کە دەفەرموێ: ﴿فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ﴾ بەڵگەیەکی بەهێزە کە برایەتی ئایینی زۆر لەبرایەتی رەگەز پیرۆزترو کاریگەرترە، دیارە ئەم هاوەڵناوەیان بەهۆی ئەو سێ شتەوە وەدەست هێناوە، کە لەپێشەوە باسکرانو بریتی بوون لەتۆبە کردن لەکوفرو پەیمانشکێنیو گەڕانەوە بۆ لای خودا؛ نوێژ کردنو زەکات دان.

﴿وَنُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ ئێمە بەڵگەو نیشانە دەخەینە رو، شییان دەکەینەوە بۆ سەلماندنی بوونی تاکو تەنیایی خۆمان بۆ گرۆهو تاقمو کەسانێك داناو زانابن، لەبەڵگەو نیشانە تێبگەنو وردبنەوە...

ئەم رستەیە تێهەڵکێشو تێخزێندراوە بەمەبەستی هەڵنانی موسوڵمانان کە جوان لەحوکمە شیکراوەکان ورد ببنەوە، پاش ئەحکامی پەیمانو پەیمان لەگەڵ بەسراوان بزانو پارێزگاری بکەن.

﴿وَإِنْ نَكَثُوا أَيْمَانَهُمْ مِنْ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا فِي دِينِكُمْ﴾ ئەگەر پەیمانی خۆیان هەڵوەشاندەوەو پابەندی وادەو بەڵێنی خۆیان نەبوون، تانەیان لەئایینەکەتان دا، رەخنەیان لەقورئانو پێغەمبەر گرت، گاڵتەو لاقرتێیان بەموسوڵمانان کرد، وەکوو

ئەوەی شاعیرەکانیان دەیانکردو بەشیعر هەجوی پێغەمبەرو موسوڵمانانیان دەکرد، سەرۆکەکانیان تانەو تەشەریان لەپێغەمبەرو قورئان دەدا، ئەوە مانای ئەوەیە: ئەوانە پێشەواو رابەری کوفرنو سەرۆکو فەرمانەدەی موشریکانن ﴿فَقَاتِلُوا أَئِمَّةَ الْكُفْرِ﴾ شەڕێکی دژوار دژی سەرانی کوفر ئەنجام بدەن، بەهەموو جۆرێك دژیان بجەنگن ﴿إِنَّهُمْ لا أَيْمَانَ لَهُمْ﴾ ئەوانە پەیمانو سوێندیان بێ بایەخە، وادەو بەڵێنیان نیە، واتە: چونکە ئەوانە وەفایان بەعەهدو پەیمانی خۆیان نەکردوە، وەکوو ئەوە وایە: کە هەر پەیمانیان نەبێ!! بۆیە ئاوا (نەفی) پەیمانی لێ کردن. شەڕیان لەگەڵ بکەن ﴿لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ﴾ بۆ ئەوەی واز لەکوفرو بێدینی خۆیان بێنن، چیدیکە ئەزیەتی موسوڵمانان نەدەن.

ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوە: کە هەر کاتێ (ذممي) پەناپێدراو تانەو تەشەری لەئیسلام دان، دەبێتە هۆکاری هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکەی. هەروەها ئەوەش دەگەیەنێ کە جەنگان دژی کوفر نابێ لەبەرژەوەندی دونیایی بێ، بۆ مەبەستی دەستکەوتو خۆ رانواندنو حەزی داگیر کردنو تۆڵەستاندنەوە بێ! بەڵکوو دەبێ بۆ رەخساندنی هەلو مەرجی جێگیر کردنی ئیسلام بێ، بۆ زەمینە خۆشکردنی بانگەوازی ئیسلامی بێ.

بێگومان ئەم دەقانە بۆ چارەسەری رەنگدانەوەی ئەو واقیعە بوو کە لەنیوە دوورگەی عەرەبی دا باوبوو، بۆ چارەسەری حاڵەتی نێوان موعەسکەری ئیسلامیو موعەسکەری موشریکەکان بوو، هیچ گومانی تێدا نیە کە حوکمی ئەم ئایەتانە دەربارەی ئەو واقیعانەیەو مەبەست بەموشریکەکان عەرەبە موشریکەکانی نیوە دورگەی عەرەبین. بەڵام لەراستی دا ئەمە هەڵوێستێکی هەمیشەییو گشتی موشریکەکانو خاوەن نامەکان بووە بەرامبەر ئیسلام، با جارێ هەڵوێستی خاوەن نامەکان واز لێ بێنین بۆ شوێنی خۆیو لەوێدا تیشك دەخەینە سەری. هەڵوێستی موشریکەکان بەدرێژایی رۆژگار هەڵوێستی دوژمنکاریو ملهوڕی بووە بەرامبەر خودا پەرستان.

جا کە ئێمە پێمان وابێ ئیسلام بەپێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد دەستی پێ نەکردوە بەڵکوو دوا قۆناغی ئیسلامەو بەو پێغەمبەرایەتییە کۆتایی بەو ئایینە هێنراوەو هەڵوێستی موشریکەکان بەرامبەر هەموو پێغەمبەرێکو هەموو پێغەمبەرایەتیەك لەمێژوو دا، رەنگدانەوەی هەڵوێستی شیرك بووە بەرامبەر ئایینی خودا، ئەوە گۆڕەپانی شەڕی نێوان ئیسلامو کوفر فراوانتر دەبێ، هەر لەبەرە بەیانی مێژووە دەبێتە شەڕی نێوان حەقو بەتاڵ، شەڕی نێوان کوفرو خوداپەرستی...!

سەیر بکەو بڕوانە موشریکەکانی مێژوو چ هەڵوێستێکیان نواند بەرامبەر حەزرەتی نووح، حەزرەتی هوود، حەزرەتی صالح، حەزرەتی ئیبراهیمو شوعەیبو موساو عیسا؟! (ﷺ)، بێگومان مێژوو شایەدە هیچ پیاوەتیو وادەو پەیمانێکیان بەرچاو نەگرتوون، هەر کە هەلیان بۆ هەڵکەوتووە زۆر بێ ڕەحمانە دەستیان لێ وەشاندوون!!

بڕوانە تەتەرە موشریکەکان چیان بەسەر عالەمی ئیسلامی هێنا لەکاتی هێرشی قەلاچۆکاری مەغۆلو تەتار، هەروا بەو جۆرەو لەهەموو سەردەمو رۆژگارو ناوچەو وڵاتێك دا، بزانە موشریکو خودانەناس چییان بەسەر موسوڵمانان هێناوە؛ چۆن لەهەموو لایەکەوە گەمارۆیان داونو پەلاماریان دەدەنو هەوڵی قەلاچۆ کردنو لەناوبردنیان دەدەن؟! سوبحانەڵلا هەر دەڵێی ئەم دەقە قورئانیە، ئەمڕۆ هاتۆتە خوارێ، بەڵکوو دەڵێی هەموو رۆژێك هاتنە خوارەوەکەی دووبارە بۆتەوە، چونکە ئاوێنەی باڵا نومایە بۆ هەموو کاتو سەردەمێك، بۆ هەموو کونو قوژبنێکی عالەمی ئیسلامیو هەڵوێستی کافران بەرامبەر موسوڵمانان.

ئەگەر لاپەڕەکانی مێژوو هەڵبدەینەوە، رووداوەکانی عالەمی ئیسلامی بخوێنینەوە، مرۆڤایەتیمان پێش چاو دەکەوێ، چونکە بەدەست خۆت نیە تفو لەعنەتی ئەو مێژووە تاریکو رەشە دەکەی! ئەوەتا کاتێك بتپەرستە تەتارەکان هێرشیان هێنایە سەر عالەمی ئیسلامیو بەرەو بەغدا راجمین، هەرچی هاتە سەر رێگەیان لەشارو گوندو کۆمەڵگا خاپوریان کرد، دانیشتوانیان قەلاچۆ کردن، کاتێکیش گەیشتنە بەغداو ساڵی ٦٥٦ﻫ دەستیان بەسەردا گرت، ئەو هەموو

کارەساتە خوێناوییەیان تێدا ئەنجام دا کە گێڕانەوەی هەندێکی مووی خوێنەرو بیسەر گرژ دەکاو موچورکە بەجەستەدا دەهێنێ! گێڕانەوەی هەموویشی لەتوانای ئادەمیزاددا نیە.

ئەوەبوو: ئەو خودا نەناسانە گەمارۆی بەغدایان دا هەرچی بەردەستیان کەوت لەژنو پیاوو منداڵو پیرو جوان کوشت بڕیان کردنو بێ رەحمانە شمشێریان لێ وەکار خستنو لەناویان بردن! خەڵکێکی زۆر لەترسان خۆیان خستە ناو بیرو زێرابو قامیشەڵانو پەنا پاسارەوە، چەند رۆژێك بەبرسیەتیو تینوەتیو ترسو لەرزەوە خۆیان حەشاردا، لەلایەکی ترەوە چەندان تاقمو گرۆهو کۆمەڵ خۆیان دەخزاندە باڵەخانەو تەویلەو ژێرخانو خانووی قایمو پتەوەوە دەرگایان لەسەر خۆیان گاڵ دەدا، تەتەرە خوانەناسەکان دەرگایان دەشکاندو ئاگریان بەردەدایە ئەو ماڵو خانانەی کە ئەو خەڵکە خۆیان تێدا حەشار دابوو، هەڵمەتیان بۆ دەبردنو ئەوانیش هەڵدەهاتنە سەربانو هەوڵی خۆدەربازکردنی گیانی خۆیان دەدا، بەڵام دەورەیان دەگیراو لەسەربانەکان دەیانکوشتنو خوێنیان بەچۆڕاوگە دەهاتە خوارێ بۆ کۆڵانەکانو لافاوی خوێن هەڵدەستا، هەروا خەڵکیان لەناو مزگەوتو خانەقاو خوێندنگاکان دا ئابلۆقە دەداو بەو پەڕی بێ رەحمیو دڕندانە دەیانکوشتنو جەستەی بێ گیانیان لەگۆڕی دەکەوت، کەس رزگاری نەدەبوو لەچنگیان، جگە لەجولەکەو مەسیحییەکانو ئەو کەسانەی پەنایان بەوان بردبوو، یان خۆیان خستبوە ماڵی ئیبنولعەلقەمی رافیضییەوە، کۆمەڵێکیش لەبازرگانەکان بەپارەیەکی زۆر ئەمانیان وەرگرتبوو خۆیانو ماڵو منداڵیان پارێزراو بوون. شاری بەغدا کە لەوە پێش پایتەختی عالەمی ئیسلامی بوو، نمونەی ژیارو شارستانی بوو، مەڵبەندی رۆشنبیریو زانستو زانیاری بوو، بووە کاولە ئاشو وێرانە شارو ئاداری بەسەر پاداریەوە نەماو تاکە تاکە نەبێ کەسی تێدا نەدەبینرا، ئەویش لەژێر باڵی رەشی ترسو تۆقاندنو برسیایەتیو نائارامی دا!

مێژوو نووسان دەربارەی کوژراوانی ئەو رووداوە رای جیا جیایان هەیە: هەندێك دەڵێن: هەشت صەد هەزار کەس کوژراوە، هەندێ دەڵێن: ژمارەی کوژراو گەیوەتە یەك ملیون، هەندێکیش دەڵێن: ژمارەی کوژراو دوو ملیون کەس بووە.

ئـەو خودانەناسـانە لـەكۆتایی مـانگی موحـەرەمی سـاڵی (٦٥٦ھ) چـوونە نـاو بەغداوە بۆ ماوەی چل رۆژ قەتڵو عامی ئەو خەڵكە موسوڵمانە بێ دەسـەڵاتانەیان كرد.. خەلیفە موستەعصیم رۆژی چوار شەممەی چواردەی مـانگی صـەفەر كوژرا، تەمەنی ئەو كاتـە (٤٦) سـاڵو (٤) مـانگ بـوو، مـاوەی خەلافـەتی (١٥) سـاڵو هەشـت مانگو چەند رۆژێك بـوو. هـەر لەگـەڵ كـوژرانی خۆی دا ئەبولعەباسـی كـوڕی كـە ناوی ئەحمەد بوو، تەمەنی گەیـشتبوە (٢٥) سـاڵ كـوژرا، پاشـان كـوڕی نـاوەنجی كـە ناوی ئەبولفەضل (عبد الرحمن) بوو تەمەنی (٢٣) ساڵ بوو كوژرا، كـوڕە پـچكۆلەی كە ناوی (موبارەك) بوو لەگەڵ سێ خوشكی دا فاطمـەو خەدیجـەو مەریـەم بـەدیلی گیران!!

مامۆسـتای (دار الخلافـة) شـێخ محی الـدین یوسـف كـوڕی شـێخ ئەبولفـەرەج ئیبنولجەوزی كە زۆر دژی ئیبنولعەلقەمیو وەزیربوو كـوژرا، هەرسێ كوڕەكانیـشی (عبـدالله، عبـدالرحمن، عبـدالكریم) لەگـەڵ پیـاو مـاقوڵو بەرپرسـانی داموو دەزگـای خەلافەت كوژران كۆمەڵێكی زۆر لەپێشەوایانی ئەهلی سوننە، یەك بـەدوای یـەك دا كـوژران، پیـاوی وا هـەبوو: لەبنەماڵـەی عەباسـیان بـانگ دەكرایـە دەرەوە بـەخۆیو ماڵو منداڵیەوە دەبرا بۆ گۆڕستانی (الخلال)و لەوێ وەكوو مەڕو بـزن سـەردەبڕانو هەندێ كچو كەنیزەكی جوانیشیان لێ هەڵدەبژاردن بۆخۆیان دەبردن!

هەر لەو رووداوانەدا مامۆسـتای پایـە بـەرز كـە مامۆسـتاو راوێـژكاری خەلیفـە بوو شێخ صدرالدین علی كە بەئیبنو (النیار) ناوبانگی دەركردبوو، كوژرا، زۆری تـر لەخـەتیبو پـێش نوێـژ خوێنـانو قورئـان خـوێنو قوتـابیو مامۆسـتا كـوژران، مزگەوتەكانو خوێندنگاكان لەخوێندن تیان دا وەسـتان، بـۆ مـاوەی چـەند مانگێك جومعەو جەماعـەت نـەكران. كتێبخانـەكان سـوتێندرانو تـەفروتونا كـران یـان دەمە ئاوی دیجلەدا دران. كە ماوەی دیاریكراو تەواو بوو، چـل شـەو بەسـەر ئـەو كوشـتنو بڕینەدا تێپەڕی، بەغداد بەتەواوی تێك روخابوو، تاق تاق نەبوایە كـەس نـەمابوو، كـوژراو لەسـەر جـادەو كـۆڵان سـواریەك كرابـوونو وەكـوو لێـرەوار بەسـەریەك دا كەڵەكـە بووبـون، بارانیـان لێ بـاری بـوو شـێوەو روخـساریان بەتـەواوی گۆڕابـوو، بۆگـەنیان كردبـوو، ئـاوو هـەوای بەغـدایان گـۆڕی بـوو، بـوو بـەهۆی كەوتنـەوەی

تاعوونێکی کوشندەو کاری لەئاوو هەوای وڵاتی شامیش کرد، خەڵکێکی زۆر بەهۆی ئەو تاعوونو کولێرەوە لەناو چوون، گرانی داهاتو بوو بەقاتو قڕی سەرباری ئەو کوشتنو بڕینە تاعوونو کولێرەو برسیایەتیو چەند نەخۆشی تری کوشندە پەیدا بوو!!

ئەمجار پاش تێپەڕ بوونی ئەو چل رۆژو شەوە بەدوشوومە، بانگی ئاشتیو عەفوو لێبوردن هەڵدرا، جاڕی ئەمنو ئاسایش بەگوێچکەی خەڵکی دا درا! ئەوانەی خۆیان شاردبووەو بەزیندو مابوونەوە لەکونو کەلەبەرو ژێر زەمینو زێراب هاتنە دەرێ، هەموویان دەتگوت: مردووی گۆڕستانو هاتوونەوە، زۆر کەس خزمو کەسو کاری یەکتریان نەدەناسیەوە، باوك منداڵی جگەرگۆشەی خۆی لێ نەبان بوو، برا برای خۆی لێ گۆڕابوو، ئەوانیش تاعون پێیان گەییشتوو تێکیەوە پێچانو چونە ریزی کوژراوانو مردوانی پێشوو!

خوێنەری هێژا! ئەمە وێنەیەکی واقیعی مێژووە، چۆنیەتی هەڵسو کەوتی موشریکەکانمان نیشان دەدا کاتێك بەسەر موسوڵمانەکان دا زاڵ بوون، ئەوە بوو: هیچ پەیمانو پیاوەتیو مرۆڤایەتیان لەبەرچاو نەگرتو بەو شێوە دڕوندەییو بێ رەحمییە لەگەڵ موسوڵمانان دا جولانەوە!! ئایا ئەم رووداوە مێژوویيو کۆنە، تاقانەی مێژوو بووەو تایبەتی تەتەرە بتپەرستەکان بووە؟ ئیتر دووبارە نەبۆتەوە؟!

نەخەیر! ئەو رووداوو قەتڵو عامەی دانیشتوانی بەغدا، تاقە رووداوی مێژوو نیە. نمونەی ئەو کۆکوژییە، زۆر جاری تر دووبارەو سێ بارە بۆتەوە، ئەوەی بتپەرستو گاپەرستە هیندییەکان لەکاتی جیابوونەوەی پاکستان لەهیندستان دژی موسوڵمانان ئەنجامیان دا چی کەمتر نەبوو لەکۆکوژییە سامناکەکەی تەتەرو مەغۆلەکان! بەڵێ هەشت ملیون موسوڵمان لەهیندستان لەترسی گیانی خۆیان لەوانەی بەچاوی خۆیان چەند پەلاماری بێ رەحمانەی گاپەرستەکانیان بینیبوو، ویستیان گیانی خۆیان رزگار بکەنو بڕیاری کۆچکردنیان دا، لەو هەشت ملیون موسوڵمانە تەنها سێ ملیونیان گەیشتنە پاکستان پێنج ملیونەکەی تریان لەرێگا دا لەناوبران، چەتەو عەصابە هیندییەکان کە هەموویان سەر بەکاربەدەستە گاورەکانی حکوومەتی هیندوستان بوون لەرێگەو باندا کەوکوژی بۆیان دادەنیشتنو

وەکوو کارو بەرخ سەریان دەبڕینو لاشەکانیان بەجێ دەهێشتنو دەبوونە خۆراکی درندەو جرو جانەوەر، ئەمەش پاش ئەوەی کە بەکوژراوی ئەتکیشیان دەکردن!

روداوی سامناکترو خوێناوی تر ئەوەبوو کە تووشی سەرنشینەکانی شەمەندەفەر بووا ئەوەبوو: رێککەوتننامە مۆرکرا لەسەر ئەوە هەر موچەخۆرێکی موسوڵمان دەیەوێ لەفەرمانگەکانی هیندستانەوە کۆچ بکا بۆ پاکستان ئازادە پەنجا هەزار موچەخۆر کۆبوونەوەو بەشەمەندەفەر ویستیان لەهیندستانەوە بێنە پاکستان، لەرێگا چەتەو رێگرە هیندییەکان ئەو شەمەندەفەرەیان لەتونێلێکدا کە ناوی (ممر خیبر) بوو حەوق کردو دەستیان کرد بەکوشتنو بڕینیان کاتێك شەمەندەفەر لەو سەرەوە دەرچوو سەرنشینەکانی بوبوونە گۆشتی هەنجنراوو هەرپەنجا هەزارەکە گیانیان سپاردبوو! فەرمودەی پەروەردگار زۆر راستو دروستە کە دەفەرموێ: ﴿كَيْفَ وَإِنْ يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ لا يَرْقُبُوا فِيكُمْ إِلاًّ وَلا ذِمَّةً﴾.

بەڵێ تا ئێستاش ئەم جۆرە کۆکوژیو مرۆڤ لەناو بردنە بەردەوامەو لێرەو لەوێ دووبارە دەبنەوە.

دەزانی بەچکە تەتەرە شیوعییەکانی چینو روسیا چییان بەسەر موسوڵمانانی ئەو وڵاتانە هێناوە؟ بەڵێ ئەو ئاشتیخوازە مرۆڤ دۆستانە لەماوەی چارەکە سەدەیەك دا بیستو شەش ملیون موسوڵمانیان لەناوبرد واتە لەهەر ساڵێك دا زیاد لەیەك ملیون زیاتریان کوشتو بڕکردوە؟! هەروا پەلاماردانو عەمەلیاتی قەڵاچۆکردنی موسوڵمانان درێژەی هەیەو پەرەی پێ دەدرێ!!

ئەمە جگە لەو هۆکارانەی دەیانگرنەبەر بۆ ئەزیەتدانی موسوڵمانانو سوکایەتی پێ کردنو ئەمجار لەناوبردنیان کە بەراستی پێست گرژ دەکاو موچەرکە دەخاتە ناو جەستەوە، ئەوەتا بۆ نمونە لەشەستەکانی ئەم چەرخەدا لەوڵاتی چین لەهەرێمی تورکستانی موسوڵمانی دا، کاری وا نامرۆڤانە ئەنجام دەراوە رووی تەتەرە موشریکەکان سپی دەکاتەوە. ئەوە بوو رابەرێکی موسوڵمانیان هێنا، لەسەر رێگەیەکی گشتی دا چاڵێکیان بۆ هەڵکەندو خستیانە ناوی، ئەمجار بەزۆرو بۆ زێدە ئازاردانی موسوڵمانان زەختیان لێ کردن کە هەر کەسە پیسایی خۆی بینی لەناو

چاڵەکە دا بەسەری ئەو رابەرە موسوڵمانەی دا بکا، سێ رۆژ ئەم عەمەلییەتە مرۆڤانەیە بەردەوام بوو!! تا کابرای رابەرو پێشەوای موسوڵمانان لەناو چاڵەکەدا گیانی ئەسپارد!!

هەمان هەڵسو کەوتی ئەو خودا نەناسانە لەیوغوسلافیای شیوعی دەرحەق بەموسوڵمانانی ئەو وڵاتە کردیان ئەمانیش لەوەتای شیوعی کەوتۆتە وەڵاتی یەغسلافیاوە لەدووای جەنگی دووەمی جیهانی، بەمەلایین لەموسوڵمانانیان قەڵاچۆ کردومو بەوپەڕی دڕندەیی‌و بێ بەزەییانە لەناویان بردوون، هەتا ئێستاش عەمەلیاتی قەڵاچۆکردن‌و سزادان‌و چەوساندنەوە بەردەوامە، کە هەرە نموونەی سامناکی ئەوەبوو کە هاتن موسوڵمانانیان گرتن بەپیاوو ژن‌و گەورەو پچکۆڵەوە خستیاننە ناو مەکینەی گۆشت هەنجنەوە (ئەو مەکینەی گۆشتی بەلوبیف دروست دەکا) لەماوەیەکی قیاسی دا دەبوونە هەویرێکی گۆشت‌و خوێن‌و ئێسقان.

ئەوەی لەیوغسلافیای شیوعی دا دژی موسوڵمانان ئەنجام دەدرێ ئێستا لەهەموو وڵاتانی شیوعی دا پەیڕەو دەکرێ! بەراستی قورئان راستە کە دەفەرموێ: ﴿كَيْفَ وَإِنْ يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ لا يَرْقُبُوا فِيكُمْ إِلاًّ وَلا ذِمَّةً﴾.[5]

ئەوەی بەسەر گەلی کوردی موسوڵمانیش هات لەم جۆرە قەتڵ‌و عامە دڕوندانەیە چی کەمتر نەبوو لەو روداوە خوێناویانەی باسمان کردن، خاوەنی توحفەی موظەفەرییە لەج١/١٤٧ دا لەباسی ئەو کوشتو کوشتارەی لەوڵاتی موکریان دا کراوە دەڵێ: یەکێك لەکارەساتە دڵتەزێنەکانی مێژووی کوردستان پاش موکری فڕانەکەی شاعەبباسی سەفەوی، کارەساتی قەتڵ‌و عام کردنی عەشیرەتی مەنگورە لەمەراغە، کە بەداخەوە مێژوو نووسانی خۆمان‌و بێگانە شتێکی ئەوتۆیان لەسەر نەنووسیوە.

کارەساتی کیمابارانی هەڵەبجەی شەهید کە لە ٣/١٦ ساڵی ١٩٨٨ دا ئەنجام دراو زیاد لەپانزە هەزار کوردی موسوڵمانی بریندارو کوژراو لێ کەوتەوە، هەروا عەمەلیاتی ئەنفالی گەرمیان‌و بادینان کە زیاد لە ١٨٢ هەزار کوردی موسوڵمانی تێدا

[5] بۆ ئەم نووسینە سەیری (في ظلال القران ج٤/١٥٠-١٥٤) بکە.

بێ سەرو شوێن كراو بەئەوپەڕی دڕوندەییو نامرۆڤانە ئەو حەمكە ژنو پیاوو مندالو گەنجو پیرە، لەناوبرانو كەسوكاریان نازانن گۆڕەكانیشیان لەكوێیە، لەپێش ئەو دوو كارەساتە دڵتەزێنانەش دا هەشت هەزار پیاوی بارزانی لەدەوروبەری هەولێر لەناو مالو خێزانی خۆیان دەرهێنرانو بەرەو تونی مەرگ راپێچ كرانو تا ئێستاش كەس نازانێ لەكوێو چۆن قەلاچۆكران!!؟ ئەوەی لەدوا سالەكانی (١٩٩١ز)وە لەبۆسنەو هەرزەگۆڤینەو ئەلبانیاو زوربەی ولاتی یەغسلافیای كۆن دژی موسولمانانی ئەو ناوچانە ئەنجام درا موچورکە بەپێستی مرۆڤ دا دێنیو مرۆڤایەتی تێیدا شەرمەزارەو پەڵەیەكی رەشە بەناوچاوانی مێژووەوە، ئەوەی سربەكانی سربوستان بەسەر موسولمانانی ئەو ولاتەیان هێنا نایەتە گوفتارو قەلەم تێیدا كۆلو زمان دەربارەی لالە. لەپێش چاوی هەموو جیهان ئاوا بەدڕندەیی ئەو هەموو موسولمانە قەلاچۆ كران!! بەراستی ئەو وشە زەرقو بەرەق نامێزانەو ئەو شیعارە زلو زەبەلاحانەی كە جیهانی كوفر وەكوو دەرزی مۆرفین لەجەستەی كۆمەلی ئادەمیزادی دەداو خەلكی ساویلكەی پێ دەخەلەتێنن هەر قسەیەو قسەش كورد وتەنی ناچێتە ناو گیرفانەوە. ئازادیو دیموكراتیو مافی مرۆڤو یەكسانی.....هتد وەكوو بالندەی عەنقا وەهانو ئیسمی بێ موسەمان.

## هەڵنانی موسوڵمانان بۆ جەنگان دژی موشریكە پەیمانشكێنەكان

﴿ أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوۡمٗا نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٍۚ أَتَخۡشَوۡنَهُمۡۚ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١٣ قَٰتِلُوهُمۡ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ وَيُخۡزِهِمۡ وَيَنصُرۡكُمۡ

عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ﴿١٤﴾ وَيُذْهِبْ
غَيْظَ قُلُوبِهِمْ وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ
﴿١٥﴾

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ژمارە (١٤) ئەبو شەیخ: ئیبنو حەییانی ئەلئەنصاری لەقەتادەوە ریوایەتی کردوە: دەڵێ: بۆیگێڕاینەوە کە ئەم ئایەتە دەربارەی هۆزی خوزاعە هاتۆتە خوارێ کاتێك کە لەمەککە چون بەگژ هۆزی بەنی بەکرداو شەڕیان لەگەڵ کردن. هەر ئەبو شەیخ لەعیکریمە ریوایەت دەکا دەڵێ: ئەم ئایەتە لەشانی خوزاعە دا هاتۆتە خوارێ. لەئیمامی (السدی)یشەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: (ویشف صدور قوم مؤمنین) ئەو قەومە موسوڵمانە مەبەست هۆزی خوزاعەیە کە هاوپەیمانی پێغەمبەر (ﷺ) بوون، تا دڵیان تەسکینی بێ لەهۆزی بەنی بەکر.

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە ئەوەیە: کە لەپێشەوە فەرمووی: ﴿فَقَاتِلُواْ أَئِمَّةَ الْكُفْرِ﴾. ئەمجار بەشوێن ئەو فەرمانە دا ئەو هۆیانە باس دەکا کە دەبنە هۆکاری شەڕەکە. کە بریتیە: لە پەیمانشکێنیو دەستدرێژیکردنیانە بۆ سەر موسوڵمانانو جاڕدانی شەڕ دژی خوداپەرستانو هەوڵدان بۆ دەرکردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوڵاتی خۆی. مەبەستی شەڕ کردن دژی موشریکەکان بۆ ئەوەیە: کە نیوە دوورگەی عەرەبی لەموشریكو بتپەرستەکان خاوێن بکرێتەوە... دەفەرموێ: ﴿أَلا تُقَاتِلُونَ قَوْماً نَّكَثُوا أَيْمَانَهُمْ﴾ ئەرێ موسوڵمانینە! ئەوە بۆچی بەپەلە خۆتان کۆناکەنەوەو دەست ناکەن بەشەڕ دژی ئەو نەتەوەو هۆزو خێڵانەی کە موشریكو خودانەناسن چەند جار پەیمانشکێنیان کردوە، ئەو وادەو بەڵێنانەی بەئێوەیان دابوو پابەندی نەبوون وەفایان پێ نەکردن، هەر هەلیان بۆ هەڵکەوتبێ دەستی خۆیان وەشاندوە. ئەمە هەڵنانی موسوڵمانانە بۆ جەنگان دژی موشریکە پەیمانشکێنەکان، ئەوەش لەبەر سێ هۆی سەرەکی.

١- ﴿نَكَثُوا أَيْمَانَهُمْ﴾ ئەو پەیمانانەی بەسوێند جەختیان لەسەر کردبوونەوە هەڵیان وەشاندونەوە، پێشێلیان کردون. ئیبنو عەبباس و سوودی و کولەبی فەرموویانە ئەم ئایەتە دەربارەی کافرەکانی مەککە هاتۆتە خوارێ کە پاش ئاشتینامەی (حودەیبییە) پەیمانی خۆیان شکاند، یارمەتی هۆزی بەنی بەکریان دا دژی هۆزی خوزاعە کە هاوپەیمانی پێغەمبەر بوون ئەمەش ئاماژەی ئەوەی تێدایە، کە جەنگان دژی پەیمانشکێنان زۆر لەپێشترە لەجەنگان دژی کافری دی، بۆ ئەوەی ببێتە پەندو عیبرەت کەس نەوێرێ پەیمانشکێنی بکا.

ئەم پەیمانشکێنییەی موشریکەکان، وەکوو ئاماژەی بۆ کرا شکاندنی پەیمانی حودەیبییە بوو، ئەوەبوو: قورەیشییەکان یارمەتی هاوپەیمانەکانی خۆیان کە هۆزی بەنی بەکر بوو دا لەدژی هۆزی خوزاعە کە هاوپەیمانی پێغەمبەر بوون (ﷺ)، کە بەگوێرەی پەیمانی حودەیبییە نەدەبوو ئەوەبکەن.

٢- ﴿وَهَمُّوا بِإِخْرَاجِ الرَّسُولِ﴾ لەوە پێشیش هەوڵی دەرکردنی پێغەمبەریان داوە، ویستوویانە لەمەککە دەری بکەن، یان بەندی بکەن و بیخەنە شوێنێکەوە کەس نەیبینێ، یان بەدەستی کۆمەڵێك پیاوکوژ لەناوی بەرن، بەم جۆرە پیلانیان دارشت کە لەهەر هۆزەو یەکێك تەرخان بکەن شەوێك لەنەغافڵ هەڵکوتنە سەری و بیکوژن بۆ ئەوە کەس نەزانێ بکوژی راستەقینە کێیەو خوێنەکەی بەفیڕۆ بڕوا وەکوو لەشوێنێکی تردا ئاماژەی پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللّهُ وَاللّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ (الأنفال: ٣٠) یان دەفەرموێ: ﴿يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ﴾ (الممتحنة: ١) یان دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَادُواْ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ الأَرْضِ لِيُخْرِجوكَ مِنْهَا﴾ (الأسراء: ٧٦).

٣- ﴿وَهُمْ بَدَءُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ ئەوانن کە یەکەمجار شەڕیان هەڵگیرساند، ئەوە بوو لەجەنگی بەدردا پاش ئەوەی دڵنیا بوون کە کاروانەکە رزگاری بووە، وتیان: نەخەیر ئێمە ناگەڕێینەوە هەتا موحەممەدو هاوەڵانی بنەبڕ نەکەین. هەروەها

لەجەنگی ئوحودو جەنگی خەندەقو شوێنی تریش دا چەند جار ئەم هەڵوێستەی خۆیان دووبارە کردۆتەوە.

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار سێ هۆکاری سەرەکی باسکردن کە داخوازی ئەوەن موسوڵمانان چاو نەترسانە بەرەو گۆڕەپانی جەنگ دژی موشریکەکان بڕۆنە پێشەوە. دەفەرموێ: ﴿أَتَخْشَوْنَهُمْ﴾ ئایا ئێوە لێیان دەترسنو ناوێرن لەگەڵیان دا بجەنگن؟ جا خۆ ئەگەر هۆی شەڕ نەکردنتان لەگەڵیان ترسانی ئێوە بێ لێیان، ئەوە ﴿فَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَوْهُ إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ خوا شیاوترە بۆ ئەوەی لێی بترسن، ئەگەر ئێوە بەراستی ئیمانتان هەبێ، چونکە موسوڵمانی راستو بڕوا پتەو، لەخودا نەبێ لەکەس ناترسێ. کەسێك ئیمانی ساغی هەبێ دەزانێ کە دەسەڵاتی هەموو شتێك بەویستی خودایە، جەمسەری هەموو بونەوەرو هەڵسوڕانی بەدەستی قودرەتی زاتی بێچوونە، تەنانەت ئەگەر بەگوێرەی دابو نەرێتی خودا لەبوونەوەردا لەغەیری خوداش بترسێ، ئەوە نابێ تەرجیحی ترسان لەغەیری خودا بەسەر ترسان لەخودا دا بدا! بەمجۆرە ترسان لەغەیری خودا وای لێ بکا لەخودا یاخی بیو سەرپێچی فەرمانەکانی بکا، بەڵکوو دەبێ هەموو کاتێ ترسانی لەخودا لەهەموو کەسێکی تر زیاتر بێ، بەڵکو نابێ جگە لەخودا لەکەسی تر بترسێ!!

ئەگەر کەسێك پرسیار بکا بڵێ: هێنانی ڕستەی ﴿أَتَخْشَوْنَهُمْ؟﴾ بەشێوەی ئیستیفهامی ئینکاری لەموسوڵمانەکان، شتێکی نەگونجاوە، مەگەر بڵێین: خودا بۆ خۆی زانیویەتی کە موسوڵمانەکان دەیانەوێ شەڕ لەگەڵ کافرەکان نەکەنو لێیان دەترسن!؟ ئەمەش عەقڵ نایگرێ، بەتایبەتی لەو سەرو بەندەدا کە ئەم ئایانەی تێدا هاتوونە خوارێ، کە ڕێکەوتی سەردەمی دوای رزگار کردنی مەککە دەکا، ئەو رۆژگارەی قەڵای شیرکو کوفر بەتەواوی تێك روخێنرا بوو، خۆ موسوڵمانەکان لەکاتێك دا خۆیان بێ هێزو دوژمنانیان بەهێز بوو بەو پەڕی فیداکاریو گیانبازییەوە دژی موشریکەکان دەجەنگان، هیچ ترسو خۆپاشدانو خۆشاردنەوەیەکیان لەچوون بۆ جەنگ نەبوە، ئەدی چۆن دوای ئەوەی بەهێز بوونو مەککەیان ئازاد کردو موشریکەکان بێ هێزو پەرتەوازە بوونو شکۆمەندییان نەما، لێیان دەترسن؟!

کەوابێ دەبێ بڵێین: پەروەردگار دوای هێنانی ئەو سێ هۆکارە گرنگە هەریەکێکیان بەتەنیا دەبێتە مایەی پێویستبوونی جەنگان لەدژی موشریکەکان، ڕوی خیطاب دەکاتە موسوڵمانەکانو پێیان دەفەرموێ: موسوڵمانینە! دوای دەستەبەر بوونی ئەم بەڵگە بەهێزانەو هاتنە دی ئەم سێ هۆ سەرەکییانە، هیچ شتێك نیە ئێوە لەشەڕ کردن لەگەڵیان بگێڕێتەوە جگە لەترسان لێیانو نەوێران بۆ جەنگان دژیان!! دەی ئەگەر هۆی شەڕ نەکردنتان دژیانو ترسانە لێیان، ئەوە خودا شیاو ترە بەئەو لێ ترسانەو حەق وایە لەو بترسن! ئەگەر ئێوە بڕواتان پتەوەو دڵنیان لەڕاستو دروستی ئایین دەبێ هەر لەخودا بترسنو بەس! هەر ئەو شیاوی لێ ترسانو تەقوا بۆ کردنە، خۆ ئێوە بەچاوی خۆتان بینیتان چۆن خودا یارمەتی دان، لەچەند شەڕو جەنگ دا کۆمەکی پێ کردن، لەکاتێك دا ئێوە بێ هێزو کەمدەست بوون دوژمنەکانتان زۆرو بەهێز بوون.

ئەم ئایەتە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە موسوڵمانی ڕاستو بڕوا پتەو دەبێ لەهەموو کەس ئازاترو دلێرتر بێ، نابێ جگە لەخودا لەکەسی تر بترسێ! ئەمجار پاش ئاراستەکردنو هێنانی ئەم بەڵگانە لەسەر پێویستبوونی شەڕکردن دژی موشریکەکانو پووچەڵکردنەوەی هەر کۆسپو تەگەرەیەك کە بۆنی ئەوەی لێ بێ لەگەڵیان نەجەنگێن، فەرمانێکی بێ پێچو پەنا ئاراستەی موسوڵمانان دەکاو دەفەرموێ: ﴿قَاتِلُوهُمْ﴾ ئەی موسوڵمانینە! دەست بکەن بەشەڕ دژی ئەو کافرانە، لەگەڵیان بجەنگێن، هەل لەکیس خۆتان مەدەن، ئێوە ئەگەر شەڕیان لەگەڵ بکەنو دژیان بجەنگێن ﴿يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ﴾ خودا بەدەستی ئێوە سزایان دەدا، ﴿وَيُخْزِهِمْ﴾ ریسوایان دەکا بەهۆی کوشتنو بەدیل گرتنیانو تێشکاندنیان، ﴿وَيَنْصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ﴾ ئێوەی خاوەن باوەڕ زاڵ بکا بەسەر ئەو موشریکانە دا ﴿وَيَنْصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ﴾ داخی دڵی خێڵو هۆزێکی موسوڵمان سارێژ بکا؛ کە بریتی بوون لەهۆزی خوزاعە؛ کە هاوپەیمانی پێغەمبەر بوون، زۆریان خەفەتو زوخاو لەموشریکەکانی مەککە خواردبوو، گەلێ ئازارو ئەشکەنجەیان لێ بینیبوون..

﴿وَيُـذْهِبْ غَـيْظَ قُلُـوبِهِمْ﴾ موجاهیـد دەفـەرموێ: خـەم‌و خەفـەتی دڵـی ئـەو موسوڵمانانە لابەرێ کە لەموشریکەکانەوە پێیان گەیشتبوو، غـەدریان لێ دەکـردن، خیانـەتیان دەرحـەق ئـەنجام دەدان، ئازاریـان دەدان، یـان کینـەو جـەخاری دڵتـان لابەرێ، ئەو داخ‌و کەسەرەی ناو دڵتان کـە بـەهۆی خراپـەکاری موشـریکەکان پەیـدا بوبـوو سـارێژ بکـا، خۆشـیـە گەشـە بکەوێتـە نـاو دەروونتانـەوە. ئیبنـو عـەبباس دەفەرموێ: ئەو قەومە چەند کەسانێکی یەمەنی بـوون، هاتنـە مەککەو موسـوڵمان بوون، لەلایەن دانیشتوانی مەککەوە ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر دران، خەبەریان بـۆ پێغەمبەر (ﷺ) نارد شکوای حاڵی خۆیان کرد، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: مزگێنـی بێ ئەوەندەتان نەماوە رزگاربن، ئەمجار دەفـەرموێ: ﴿وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَـى مَـن يَـشَاءُ﴾ ئەمە رستەیەکی سەربەخۆیەو عەطف نیە، واتە کەسـانێك کـە بیـەوێ هیدایـەتیان بداو رێنموییان بکا بۆ ئیمان هێنان، بـەم رەنگـە بـڕێ لەدانیـشتوانی مەککـە تۆبـە بکـەن‌و واز لـەکوفرو بێـدینی بێـنن، بێگومـان سـەرکەوتنی موسـوڵمانان وا لـەبڕێ موشریك‌و کافر دەکا کە ئیمان بهێنن، چاوی دڵیان بکرێتەوە بەتایبەتی کە دەبیـنن موسوڵمانان بەهۆی کۆمەکی خوداوە سەرکەوتن بەدەست دێـنن، هەسـت دەکـەن کـە هێزێك جیا لەهێزی ئادەمیزاد پشتگیریان دەکا. بەئاشـکرا دیـاردەی ئیمـان‌و بـاوەڕ لەهەڵوێـستیان دا بـەدەر دەکـەوێ، بێگومـان ئەمـە بـەفیعلی روی دا؛ ئـەوە بـوو: کۆمەڵێك لەموشریکەکانی مەککە موسوڵمان بـوون‌و دوایـی خزمـەتی ئیسلامیـشیان کرد، وەکوو ئـەبو سـوفیان، عیکریمـەی کـوڕی ئـەبو جـەهل، سـولەیمی کـوڕی ئـەبو عـەمر. بەمـەش موسـوڵمانە تێکۆشـەرەکان پاداشـتی جیهـادو مانـدوبوونی خۆیـان دەست کـەوت‌و ئـایینی ئیـسلامیش بەموسـوڵمانبوونی ئەمانـە هێـزو توانـای زیـادی کردو جەماوەری زۆر بـوو. ﴿وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَـنْ يَـشَاءُ وَاللَّـهُ عَلِـيمٌ حَكِـيمٌ﴾ خـودا زانایـەو دەزانـێ چـی بـۆ بەرژەوەنـدی بەنـدەکانی بەسـوودە، دەزانـێ سـەرەنجامی کارەکـان بەچـی دەگـاو سـەرەتا شـاردراوەکان چـیـیان لێ وەدی دێ. لێـزان‌و دانایـە، نەخشە بۆ ئاکامی کردارو جەم‌و جوڵەکانی دەکێشی‌و لەهەموو کـرداو گوفتـارێکی دا حـەکیم‌و لێزانـە هـیچ کـارو کردارێکی بێهودە نیـە، چـی بـوێ دەیکـاو چ بڕیـارێکی مەبەست بێ دەیدا، دادپەروەرەو هەرگیز ستەم ناکا، هەر شتێك حیکمەت داخـوازی

نەبێ نایکا، پاداشو سزای هەموو ئادەمیزادێك لەسەر كردوەكانی دەداتـەوە، چـاكە بەچاكەو خراپە بەخراپە.

## بەتاقیکردنەوەو لەبۆتەدانی موسوڵمانانو پاككردنەوەیان لەبێگانەو چڵكاوخۆر

﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تُتْرَكُوا۟ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَلَمْ يَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلْمُؤْمِنِينَ وَلِيجَةً ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾

ئایەتەكانی پێشوو هەڵنانی موسوڵمانانیانی تێدا بوو بۆ جیهادو جەنگان دژی ئەو موشریكانەی پەیمانی خۆیان شكاند، ئەم ئایەتـەی ئێـرەش هـەڵنانێكی تـرە بـۆ ئـەوەی موسـوڵمانان خۆیـان لەبۆتـە بـدەنو موجاهیـدی دڵـسۆزو خـائین لێـك جیابكەنەوە.

بـەڵێ دەبـوو موسـوڵمانان بەگـشتی دژی هـەموو موشـریكەكان جیهـاد بكـەن، دەبوو هەموو پەیمانەكانیان بەسەردا بدەنەوە، موسوڵمانان هەموو دەبێ هـەموویان لەبەرامبـەر موشـریكو خودانەناسـان دا یـەكڕیز بوەسـتن، دەبـوو پـاكو پـیس لێـك هەڵهاوێژن، رازو نیاز دەربكەون، پەردەلەسەر خائینان لابدرێ، ئەوانە دەربكـەن كـە موسـوڵمانی راسـتاڵ نـین، پـەردە لەسـەر بڕوبیانوویـان هەڵبدرێتـەوە؛ ئـەو بڕوبیانوانـەی برێـك بـەناو موسـوڵمان دەیانخستنەرو بـۆ پەیوەنـدی كـردن لەگـەڵ موشـریكەكان، ئەوانـە دەربكـەون كـە دۆسـتایەتی موشـریكەكان دەكـەن بـەبیانووی خزمایەتی یان بەرژەوەندی تر. ئیتر باوی ئەوە نەما چیدی چاوپۆشی لەو جاشـانە بكرێ كە دەسكیسی دوژمن بوونو ئەڵقە لەگوێی موشریكەكان بـوون، دەبـوو جارێ لێك جیابوونەوەو لێك دابڕان لەنێوان كوفرو ئیسلام دا هەڵبدرێ، بۆ ئەوەی نیـازی شـێردراوەی نـاو دڵـی دڵ كرمێیـان دەربكـەوێ. ئەوانـە دەربكـەون كـە

مەصلەحەتپەرستن‌و پەیوەندی خۆیان لەگەڵ کافرەکان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی دونیایی‌و مشەخۆری پەرە پێ دەدەن. جا بۆ رێگەگرتن لەم جۆرە کەسانە دەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَنْ تُتْرَكُوا؟﴾ واتە: ئەرێ موسوڵمانینە! ئەوە بۆچی شەڕ لەگەڵ ئەو موشریکانە ناکەن کە پەیمانیان شکاندو دەستدرێژییان کردە سەرتان‌و پابەندی وادەو بەڵێنی خۆیان نەبوون، بۆچی پێتان وایە ئەی موسوڵمانینە! کە ئێوە هەر ئاوا وازتان لێ بێنەری‌و پاشگوێ بخرێن‌و هیچ تاقیکردنەوەو بۆتەدان‌و ئەزمونێکتان لەگەڵ دا ئەنجام نەدرێ؟ دڵنیای بەتەمانین کە لەرێگەی جیهادو تێکۆشانەوە بەتاقی بکرێنەوە، کە لەراستی دا جیهادو جەنگان دژی موشریکەکان باشترین تاقیگەو بۆتەیە بۆ لێك جیاکردنەوەی راستو درۆ، بۆ دەرخستنی موسوڵمانی راستاڵو دوڕووی بەناو موسوڵمان، بەجیهاد دەردەکەوێ کێ موجاهیدو ماڵبەخش‌و گیان لەسەر مستە. ئایا بەخەیاڵی خۆتان ئاوا پاشگوێ دەخرێن‌و فەرمانتان پێ ناکرێ بەجیهاد کردن ﴿وَلَمَّا يَعْلَمَ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا مِنْكُمْ﴾ واتە: وەلحال لەئێوە شتێکی وای نەخستۆتە ڕو کە موجاهیدی راستو دڵسۆز لەچەکداری دووڕوو دەروون نەخۆش جیا بکاتەوە، کە هێشتا خودا لەئێوە کۆمەڵێکی نەهێناوەتە سەرمەسرەحی ژیان کە جیهاد دەکەن‌و بەخەڵکی نەناساندون؟! هێشتا جیهادکەرو تێکۆشەری دڵسۆز لەئێوە پەیدا نەبوە،[1] ﴿وَلَمْ يَتَّخِذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلَا رَسُولِهِ وَلَا الْمُؤْمِنِينَ وَلِيجَةً﴾ هەروەها جگە لەخوداو پێغەمبەری خوداو موسوڵمانان کەسی تریان نەگرتووە بەدۆست، نەبوونە چڵکاوخۆری موشریکەکان‌و ناچن

---

[1] مامۆستا مەلا عەبدولکەریم لەتەفسیری ئەم ئایەتە دا دەفەرموێ: واتە: ئایا ئێوە گومانتان وایە هەروا بەرەڵا بکرێن، وە داوای جیهادو زەحمەت کێشانتان لێ نەکرێ؟ وە هێشتا ئێوە لەرێگەی خودادا کارێکی واتان نەکردبێ خودا پێی خۆش بیو جیهادێکتان نەکردبێ لەبەر بەرزکردنەوەی کەلیمەی حەق داو عیلمی خودا تەعەللوقی نەبەستبێ بەکردەومیەکی وەهاوە شیاوی تەقدیر بێ؟ بەو کەسانەوە کە ئەوەندە موخلیصن‌و ساغن لەخزمەتی دونیا کە غەیری خوداو پێغەمبەری خوداو موسوڵمانەکان کەسی نەکردبێ بەمەحرەمی ئەسراری خۆی بۆ ئەوە کە باسی حاڵی موسوڵمانەکانی بگەیەنێ پێیان، وە لەئەسراری ناو ئیسلام ئاگادار بن، وە بزانن کە خودا ئاگادارە لەسەر ئەوەی ئەیکەن. تەفسیر نامی ج٤/٨١.

هەواڵو نهێنی موسوڵمانان بگەیەنن بەکافرەکان، بەڵکو ئەوان بەئاشکراو بەنهێنی بۆ خوداو پێغەمبەری خودا دەچارێن، خۆیان جیا دەکەنەوە لەو دووڕووە بەناو موسوڵمانانە: کە هەمیشە هەوڵی ئەوەیانە سیاسەتو نهێنی موسوڵمانان بزانن‌و بیگەیەننە کافرەکان ﴿وَاللّٰهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ خودا هەموو کاتێ ئاگادارو زانایە بەکردارو گوفتارتان‌و سزاو پاداشتان دەداتەوە. پێویستە ئەوە بزانین کە مەبەست بە ﴿وَلَمَّا يَعْلَمِ اللّٰهُ﴾ ئەوە نیە نەفیی زانیاری خودا بکەین، نەچین وەکوو هیشامی کوڕی عەبدولحەکەم بڵێین: خودا تاشتەکە نەیەتە بازنەی بوونەوە نایزانی‌و وەکوو ئەو ظاهیری ئایەتەکە وەربگرین..

بەڵکوو مەبەست لەئایەتەکە نەفیی کردنی زانیارییە کە لەواقیع دا وجوودی هەیە بەڵام هێشتا نەهێنراوەتە سەر گۆڕەپانی ژیانی ئادەمیزادو خودا بۆی ڕانەنواندون بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە لەسەریان لەڕۆژی قیامەت دا، نموونەی ئەم ئایەتە دەربارەی لەبۆتەدانی موسوڵمانان ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ. وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللّٰهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ﴾ العنكبوت: ٢-٣ هەر لەم بارەوە ئایەتێکی تر هەیە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لاَ يَأْلُونَكُمْ خَبَالاً وَدُّواْ مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاء مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ﴾ (آل‌عمران:١١٨).

بەکورتی‌و پوختی پەروەردگار کە لەوەپێش جیهادی بۆ موسوڵمانان دانا، لێرەدا دێ حیکمەتەکەی ڕون دەکاتەوە: کە بریتییە لەتاقیکردنەوەی بەندەکانی، بۆ ئەوەی دەری بخا کێ بەگوێرەی فەرمانەکانی هەڵس‌و کەوت دەکاو کێ سەرپێچی فەرمانەکانی دەکا پەروەردگار لەوەپێش‌و ئێستاو لەمەودواش زاناو ئاگادارە بەوەی بووە دەبێ...

## ئاوەدانکردنەوەو تازەکردنەوەی مزگەوتەکان

﴿مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا مَسَاجِدَ اللَّهِ شَاهِدِينَ عَلَىٰ أَنفُسِهِم بِالْكُفْرِ ۚ أُولَٰئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ وَفِي النَّارِ هُمْ خَالِدُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا اللَّهَ ۖ فَعَسَىٰ أُولَٰئِكَ أَن يَكُونُوا مِنَ الْمُهْتَدِينَ ﴿١٨﴾﴾

ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنو عەبباسەوە دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە وای تەخریج کردوە، دەڵێ: کە رۆژی بەدر عەبباس بەدیلی گیرا، خۆی هەڵنایەوەو گوتی: جا ئەگەر ئێوە دەست پێشخەریتان کردوەو پێش ئێمە موسوڵمان بوونو کۆچتان کردوەو جیهادتان کردوە، ئەوە بێگومان ئێمەیش کەعبەمان ئاوەدان کردۆتەوە، ئاومان داوە بەحاجیان، بەماڵی خۆمان دیلمان کڕیوەتەوەو ئازادمان کردوە، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خواریو فەرمووی: ﴿مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَنْ يَعْمُرُوا مَسَاجِدَ اللَّهِ....الآية﴾.

لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە: دەڵێ: رۆژی بەدر کۆچکارانو یارمەتیدەران روویان کردە دیلی قورەیشو تانەو تەشەریان لێدان کە موشریکو بێ باوەڕن، عەلی کوڕی ئەبو تالیب بەتوندی لۆمەی عەبباسی کرد کە دژی پێغەمبەر جەنگاوە، صیلەی رەحمی پچڕاندوە. ئەویش وتی: ئێوە خراپەکانمان بەرودا دەدەنەوە، باسی کارە باشەکانمان ناکەن، ئیمامی عەلی فەرمووی: جا بۆ ئێوە کاری باشتان هەیە؟ ئیتر دیلەکان دەمیان کرایەوەو ووتیان بەڵێ: ئێمە لەئێوە پاداشمان گەورەترە، ئێمە

کەعبـە کـە مـاڵی خودایـە ئاوەدانمـان کردۆتـەوە، پاسـەوانیمان کـردوە، دەرکـەوانو مجـەوری بـووین، ئاومـان داوە بـەحاجیان، دیلـی هـەژارمان بـەپارەی خۆمـان ئـازاد کردوە ئیتر ئەم ئایەتـە هاتـە خوارێ کـە ڕەتدانـەوەی قسەکانی عـەبباسو ئـەوانی تری تێدایە.

پەیوەنـدی ئـەم ئایەتانـەش بەئایەتـەکانی پێـشوەوە ئەوەیـە: دوای ئـەوەی یـەزدان لەســەرەتای ســورەتەکە دا بەرائــەتی خــۆیو پێغەمبەرەکـەی ڕاگەیانـدو جۆرەها فـەضیحەتو خراپەکارییـەکانیانی باسـکردن، کافرەکـان نـارەزایی خۆیـان دەربـڕیو وتیـان: ئـەم بەرائـەتو دەسـبەردار بوونـە ڕەوا نیـە، ئێمـە شـیاوی ئـەم سوکایەتی پێکردنە نین، چونکە ئێمـە ڕەوشـتی جوانمـان تێـدانو پیاوەتیمـان زۆرە، نمونەیــەك لەڕەوشــتی جوانمێرانــەمان ئەوەیــە: کەعبــەمان ئاوەدانکردۆتــەوەو چـاودێری دەکـەین. ئـیتر بـەم ئایەتانـە پـەروەردگار ڕەدی دانـەوە لەلایـەکی تـرەوە گونجاوبوو کە پاش بەسەردا دانەوەی پەیمانەکە بۆ کافرەکـانو جـاڕی لێـك دابـڕانو دەستبەردار بوونیان، ئیعلانـی ئـەوە بکرێ کـە نـابێ لەکەعبـەدا بتپەرسـتی بکـرێ، مافی ئەومیان نەدرێتێ: چیدی موشریکەکان چاودێری مـاڵی خـودا بکـەنو خۆیـانی پێوە هەڵبکێشن!!

دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَنْ يَعْمُرُوا مَسَاجِدَ اللَّهِ﴾ نابێو نـاگونجێو ڕەوا نیە بۆ ئەوانەی بتپەرستنو هاوەڵ بۆ خودا بەڕەوا دەزانن، مزگەوتەکانی خودا -کـە کەعبـە یەکێکیانـە- ئـاوەدان بکەنـەوە، نـابێ ڕێگـەیان پـێ بـدرێ عیبـادەتی پوچـی خۆیانی تیدا ئەنجام بـدەن، مـافی ئـەومیان نیـە سـەروکاری کەعبـە بکـەنو مجێـورو دەرکـەوانو ئـاودەری بـن، نـابێ بـۆ حـەجو عـەمرەش بـچنە نـاویو تـەوافی بکـەن، چونکە ئـەوان ﴿شَاهِدِينَ عَلَى أَنفُسِهِمْ بِالْكُفْرِ﴾ بـۆ خۆیـان شـایەدی کـافرێتی خۆیـان دەدەن: بەم جۆرە بت دەپەرسـتن، بـەروتو قـوتی تـەوافی کەعبـە دەکـەن، هـەر کـە سوڕێك بەدەوری کەعبەدا دەدەن سوژدە بۆ بتەکانیان دەبەن.

ئـەوان بـەگوفتارو کـردار موشـریکو کـافرن، ئـەومبوو: بـەگوفتار دەیـانگوت (لبیك لاشـریك لـك، الا شـریك هـو لـك تملکە ومامـلك) ئەمـە بـەگوفتار شـایەتدانە لەسەر خۆیان بەکوفر، بەکردەوەش ئـەوەبوو: بتیـان دەپەرسـت. لەڕاسـتی دا ئـەوان

بەم گوفتارو کردارانەیان دوو شتی دژ بەیەکیان لەخۆدا کۆکردبوەوە، دوو شتی لەگەڵ یەك نەگونجاویان خستبوە تەك یەکترەوە: کە عەقڵ نەیدەگرت، ئاوەدانکردنەوەی کەعبەو بڕوا نەبوون پێی!

﴿أُوْلَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ وَفِي النَّارِ هُمْ خَالِدُونَ﴾ ئەو خودانەناسە هاوبەشپەیداکەرانە، بەهۆی شیرکو کوفرەکەیانەوە، کردەوەکانیان پووچ کراوەتەوە، ڕۆژی قیامەت چ سوودو قازانجی لێ نابینن، ئەوان لەناو دۆزەخ دا بۆ هەتا هەتایە دەمێننەوە، کردارو هەڵوێستیان هێندە ناجوامێرانەیە، تاوانەکەیان هێندە گەورەو بەسامە سزای دادوەرانە بۆیان ئەوەیە لەناو ئاگری دۆزەخ دا بمێننەوەو لێی دەرنەچن. نموونەی ئەم ئایەتە لەبارەی سوود وەرگرتن لەکردەوە ئەم ئایەتانەن ﴿وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ (الأنعام:٨٨) یان ﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاء مَّنثُوراً﴾ (الفرقان:٢٣) یان ﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاء مَّنثُوراً﴾ (الزمر:٦٥) جا کە نەفیی ئەهلییەتی ئاوەدانکردنەوەو سەرپەرشتیکردنی مزگەوتەکانی خودای لەموشریکەکان کردو ئەو مافەی پێ ڕەوا نەبینن لەم ئایەتەی دوایی دا ئەو مافە بۆ بەندە خوداپەرستەکان دەست نیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللّهِ مَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ نەوەکوو شیاوی ئاوەدانکردنەوەو سەرپەرشتیکردنی مزگەوتەکانن ئیللا کەسانێك کە بڕوایان بەتاکو تەنهایی خودا بێ، بڕوایان بەزیندو بوونەوەو هاتنی ڕۆژی قیامەت هەبێ، کەسێك چاودێریکردنی کابەو ماڵی خودایە کە بڕوای تەواوی بەتاکو تەنهایی خودا بێ، ئیمانی بەڕۆژی قیامەت هەبێ، ﴿وَأَقَامَ الصَّلاَةَ﴾ نوێژەکانی بەڕێکو پێکی ئەنجام بدا، ﴿وَآتَى الزَّكَاةَ﴾ زەکاتی ماڵو سامانی بەگوێرەی شەرعی خودا دەربکاو بیدا بەو کەسانەی کە شیاوی زەکات پێدانن.

﴿وَلَمْ يَخْشَ إِلاَّ اللّهَ﴾ جگە لەخودا لەکەسی تر نەترسێ، هیچ مەخلوقاتێك گیانلەبەر بێ، یان بێ گیان بێ بە خودا نەزانێو بەندایەتی بۆ نەکاو لێی نەترسێ چونکە لە ڕاستی دا جگە لە خودا کەس زیانو قازانجی بە دەست نیە، هەر سوودو قازانجێك خودا مەیلی لێ نەبێ ناگا..

دەقەکە باسی بڕوا بە پێغەمبەری نەکرد چونکە بڕوا بە پێغەمبەرو پێغەمبەرایەتی دەکەوێتە چوار چێوەی ئەنجامدانی نوێژو زەکاتدانەوە نوێژ کردنو زەکاتدان لە کەسێك وەردەگیرێ کە بڕوای بە پێغەمبەر هەبێ. ﴿فَعَسَىٰ أُولَٰئِكَ أَنْ يَكُونُوا مِنَ الْمُهْتَدِينَ﴾ ئەمجار ئەوانەی کە ئەو ڕەوشتانەیان تێدانو خاوەنی ئەو کارە پەسەندانەن ئەوانە لەپێڕی هیدایەتدراوەکانن، ڕێنموونییان وەرگرتووە، ڕێبازی خودایان گرتۆتە بەرو، شیاوی پاداشتی باشو بەهەشتن، کردەوەکانیان بەفیڕۆ ناڕوا، هەر ئەوانە لەپێڕی هیدایەتدراوانن؛ نەك ئەوانەی موشریكو گومڕان، هاوەڵ بۆ خودا دادەنێنو بڕوایان بەپەیامی پێغەمبەر (ﷺ) نیە،، سوجدە بۆ طاغووتو پتو صەنەم دەبەنو ئەمجار بڕێ خزمەت پێشکەشی مەسجیدولحەرام دەکەنو خۆیان بەخاوەنو سەرپەرشتیاری دەزانن!

وشەی (لعل)و (عسى)و ئەم جۆرە وشانە کە لەخوداوە صادر بوون نابێ لەسەر مانای خۆیان مانا بکرێن، چونکە (عسى) بریتیە لەگومان بردن بەپەیدابوونی شتێك کە هۆکارەکانی هاتبنە دی. دەی بۆ خودا ناگونجێ گومان بەکار بهێنرێ، چونکە هەموو شتێك لای خودا نومایانە، هیچ شتێکی لێ نادیار نیەو حەقیقەتی هەموو شتێك بەئەوپەڕی زانینەوە دەزانێ! کەوابوو: ئەم جۆرە وشانە لەلایەن خوداوە بۆ شتی قەتعی بەکار دەهێندرێن گومانو دوودڵیو هیوایان تێدا نیە!

دەی بۆ پەروەردگار وشەی (عسى)ی بەکار هێنا؟ لەوەلام دا دەڵێین: بۆ ئەوەی ئاماژەی ئەوەی تێدا بێ کە کافرەکان هیوا بڕاو بن لەسوود بینین لەکردەوەکانیان، بەهیوای ئەوە بن ڕۆژی قیامەت سوود لەکردەوەکانیان ببینن، چونکە لەکاتێك دا پاداشی موسوڵمانان لەسەر کردەوەکانیان لەبابی خۆفو ڕەجادا بێ، دەبێ کافرەکان بەچ عەقڵو هۆشێکەوە بەتەما ئەوەبن: کە سوود لەکردەوەکانیان ببینن، چۆن خۆیان بەهیدایەتدراو دەزانن و دڵنیان لەوەی کە ڕۆژی قیامەت بەمراد دەگەن!

پێغەمبەر (ﷺ) لەچەند فەرموودەیەك دا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەبێ سەرپەرشتیکارانی مزگەوتو ئاوەندانکەرەوانی ماڵی خودا ئەو کەسانەبن کە

ئەو پێنج ڕەوشتانەیان تێدابن کە ئایەتەکە باسی کردن. ئەوەتا: شەیخانو ئیرمیذی فەرموودیەك لەئیمامی عوسمانەوە ڕیوایەت دەکەن دەفەرموێ: لەپێغەمبەرم (ﷺ) ژنەوت دەیفەرموو: (من بنى لله مسجداً يبتغي به وجه الله بنى الله له بيتاً في الجنة) کەسێك لەبەر خاتری خودا مزگەوتێك دروست بکا، بەم کارەی مەبەستی ڕەزامەندی خودا بێ، پەروەردگار لەبەهەشت دا خانوێکی بۆ بنیات دەنێ.

هەروەها ئیمامی ئەحمەد لەئبنو عەبباسەوە فەرموودەیەك بەمەرفووعی ڕیوایەت دەکاو دەفەرموێ: (من بنى لله مسجداً ولو كمفحص قطاة لبيضها، بنى الله له بيتاً في الجنة) کەسێك لەبەر ڕەزامەندی خودا مزگەوتێك بنیات بنێ، دەستی لەبنیات نانی ماڵی خودادا هەبێ بابە ئەندازەی شوێنی هێلکەی مراوییەکیش بێ، خودا لەبەهەشت دا خانوێکی بۆ بنیات دەنێ. فەرموودەیەکی تر هەیە، حاریثی کوڕی ئەبو ئوسامەو ئەبو شەیخ بەسەنەدێکی لاواز لەئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردوە. دەفەرموێ: (من أسرج في مسجد سراجاً، لم تزل الملائكة وحملة العرش تستغفرون له، مادام في المسجد ضوء من ذلك السراج) کەسێك چرایەك لەمزگەوتێك هەڵبکا، ڕوناکاییەك بخاتە مزگەوتێکەوە تا ڕوناکایی ئەو چرایە لەو مزگەوتە دا هەبێ فریشتەو هەڵگرانی عەرش داوای لێخۆشبوون بۆ ئەو کابرایە دەکەن..!! ئەمە لەبارەی ئاوەدانکردنەوەی ماددییەوە. لەبارەی ئاوەدانکردنەوەی مەعنەویشەوە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) زۆرو زەبەندەن: ئەوەتا: شەیخانو هی تریش لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتیان کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (انما عمار المساجد هم أهل الله) هەر خوداپەرستانو خۆشەویستانی خودا مزگەوتەکان بەخوداناسی تێیان دا ئاوەدان دەکەنەوە. ئیمامی ئەحمەدو ئیرمیذیو ئیبنوماجەو حاکمو ئیبنو مەردەویهی لەئەبو سەعیدی خودرییەوە ڕیوایەت دەکەن کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (اذا رأيتم الرجل يعتاد المساجد، فاشهدوا له بالأيمان) هەرکاتێ دیتان پیاو خوی بەمزگەوتەوە گرتوومو هاموو شۆی مزگەوت دەکا، ئەوە شایەتی بۆ بدەن کە خاوەنی بڕوایەو ئیماندارە. ئەمجار ئایەتی ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ی خوێندەوە...

طەبەرانی لەموعجەمولکەبیردا لەئیبنو مەسعوودەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: پەروەردگار دەفەرموێ: (ان بیوتي في الأرض المساجد، وان زواري فيها عمارها، فطوبى لعبد تطهر في بيته، ثم زارني في بيتي، فحق على المزور ان يكرم زائره) ئەم حەدیثە هەرچەند زەعیفە، بەڵام وەکوو گوتراوە: حەدیثی زەعیف لەفەضائیلی ئەعمال دا کاری پێ دەکرێ.

هەر طەبەرانی لەموعجەمولکەبیر دا فەرموودەیەکی تری زەعیف لەئیبنو مەسعوودەوە ڕیوایەت دەکا، دەڵێ: (لەئاخرزەمان دا کۆمەڵێك لەئوممەتی من دێنە ناو مزگەوتەکانو بەدەورە تێیان دا دادەنیشن، باسو گوفتوگۆیان هەرباسی دونیایە، باسی خۆشەویستی دونیایە، لەتەکیان دامەنیشن، خودا ئیشی بەوان نیەو کردەوەکانی ئەوانی ناوێ). لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە: ئاخاوتن لەمزگەوت دا چاکە دەخواو لەناوی دەبا وەکوو چۆن ئاژەڵ پوشو پەڵاش دەخوا.

پێویستە ئاماژە بەئەوەش بکەین کە دروستە کافرو خوانەناس بەکار بهێندرێن بۆ دروستکردنی مزگەوت، دروستەکاری بیناکردنو نەققاڕیو سپیکاریو دامەزراندنی ئامێری کارەباییو ئەم جۆرە شتانە بەوان ئەنجام بدرێ.

ئەوەی کە دروست نیە بەکافر بسپێردرێ ئەو شتانەن کە پەیوەندییان بەسەرپەرشتی کردنو هەڵسوڕانی کاروباری ئیداریو ئایینی مزگەوتە. ڕایەکی زەعیفیش هەیە دەڵێ: کافر بەهیچ جۆرێو بەهەرمەبەستێك بێ نابێ توخنی مزگەوت بکەوێ!؟.

## گەورەیی ئیمان بەخوداو بەرۆژی قیامەتو گەورەیی جیهاد لەپێناو ئایینی خودادا

﴿ ۞ أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَجَٰهَدَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ لَا

يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَـٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ
أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ يُبَشِّرُهُمْ
رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٍ وَجَنَّـٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ
مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ
﴿٢٢﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٩) وەکوو موسلیمو ئیبنو حیبانو ئەبو داود لەنعمانی کوڕی بەشیرەوە ڕیوایەتیان کردوە ئەومیە نوعمان دەڵێ: من لەگەڵ چەند هاوەڵێك لای مینبەری پێغەمبەر (ﷺ) وەستابووین، پیاوێکیان وتی: ئیتر من پاش ئەوەی ئیمانم هێناوە جگە لەئاودان بەحاجییان هیچ کارێکی تر ناکەم، یەکێکی تریان وتی: بەڵکوو ئاوەدانکردنەوە کەعبە خێر ترە، یەکێکی تریان وتی: نەخەیر، بەڵکوو جیهاد لەپێناو ئایینی خودادا لەو کارانە خێرترە کە ئێوە ناوتان هێنان، حەزرەتی عومەر لێیان تووڕە بوو، فەرمووی: لای مینبەری پێغەمبەر (ﷺ) دەنگتان بەرز مەکەنەوە، ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەینی بوو. جا وتی: کە نوێژی جومعەم کرد دەچمە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ئەم کێشەیەی ئێوە پرسیاری لێ دەکەم. ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ﴾ تا دەگاتە ﴿وَاللّـهُ لا يَهْـدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ی نارده خوارێ.

فەریابی لەئیبنو سیرینەوە ڕیوایەت دەکا، دەڵێ: عەلی کوڕی ئەبو طالیب هاتە مەککە بەعەبباسی گوت: ئەی مامی خۆم؟ ئەرێ بۆچی کۆچ ناکەی؟ بۆ پەیوەندی بەپێغەمبەرەوە ناکەی؟ عەبباس وتی: من کەعبە ئاوەدان دەکەمەوە، پارێزگاری

ماڵی خودا دەکەم مجێوری کەعبە دەکەم. ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ﴾ی نارده خوارێ.

عەبدولڕەزاق لە(شعبی)یەوە، ئیبنو جەریری طەبەری لەکەعبی قورەظییەوە ڕیوایەتیان کردوە: دەڵێن: طەلحەی کوڕی شەیبەو عەبباسو عەلی کوڕی ئەبو طالیب هەریەکەیان خۆی هەڵدەنایەوەو باسی شکۆمەندی خۆی دەکرد، طەلحە وتی: من خاوەنی کەعبەمو کلیل بەدەستی ئەم خانوە ڕێزدارەم، عەبباس وتی: من ئاودێری حاجیانمو ئەو ئەرکە پیرۆزەم لەئەستۆدایە. عەلی وتی: من لەپێش هەموو کەس دا نوێژم بەرەو قیبلە کردوەو من جیهادم کردوە. ئیتر پەروەردگار ئایەتی: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ﴾ نارده خوارێ. ئەم ئایەتە پەیوەندی بەئایەتەکانی پێشوەوە هەیە، لەم ڕووەوە تەواوکەرو شیکەرەوەیە بۆ ئایەتی پێشوو: ئەوەتا لەئایەتی پێشوودا ئەوەی روون کردەوە: کە ئاوەدانکردنەوەی کەعبە پەسندە ئەگەر خاوەن باوەڕ بیکا، ئەو ئەرکە ئەرکی موسوڵمانانە، نەك هی موشریکان. ئەمجار لەم ئایەتە دا ئەوە روون دەکاتەوە: کە ئیمانو جیهاد زۆر باشترن لەو کردەوانەی کە موشریکەکان خۆیان پێوە هەڵدەناو شانازییان پێوە دەکرد، کە بریتی بوون لەئاوەدان کردنەوەی کەعبەو ئاودان بەحاجییان.

دەفەرموێ: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ ئایەتەکە، یان خیطابە لەگەڵ موسوڵمانان، یان خیطابە لەگەڵ موشریکەکان؛ بەگوێرەی ڕیوایەتی نوعمانی کوڕی بەشیر خیطابەکە رو لەموسوڵمانەکان دەکا. بەگوێرەی سیاقی ئایەتەکەش خیطابەکە بۆ موشریکەکانە... ئەوەی کە مەبەستە ئەوەیە: ئایەتەکە رەنگدانەوی خۆهەڵنانەوەی دوو لایەنە لایەنی موسوڵمانانو لایەنی کافرەکان. چونکە وەکوو لەوەپێش لەهۆکاری هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان دا باسمان کرد؛ عەبباس کە ئەوسا کافربوو خۆی هەڵدەنایەوەو شکۆمەندییەکانی خۆی باس دەکردن کە ئاوەدانکردنەوەی کەعبەو ئاو دابەشکردن بوو بەسەر حاجیان دا.. وەکوو زانایانی نەحو دەڵێن: (کەلام لەحەذفی موضافە) (السقاية) موضافو ئیلەیهییە، موضافەکەی حەذف کراوە

کە وشەی (أهل)ە. واتە: ئایا ئێوە ئەوانەی ئاو دابەش دەکەن بەسەر حاجیان داو کەعبە ئاوەدان دەکەنەوە وەکوو ئەوانەیان حلێب دەکەن کە بڕوایان بەخودا هێناوە، بڕوایان بەهاتنی رۆژی قیامەت هەیەو لەپێناو ئایینی خودادا جیهادو تێکۆشان دەکەن؟ ئایا ئەم دوو تاقمە لەفەضلو رێزدا چون یەکن؟ بێگومان ئاودان بەحاجیانو ئاوەدانکردنەوەی کەعبە هەرچەندە کاری پەسەندن بەڵام خاوەنی ئەم ئیشانە لەپلەو پایەو بەرزی دا لای خودا ناچنە ریزی ئەهلی ئیمانەوە.

بەکورتی نابێ ئەو موشریکانەی ئاو بەسەر حاجیان دا دابەش دەکەن بیانبەنە ریزی موسوڵمانانی یەکتاپەرستو خاوەن بڕوا بەهاتنی رۆژی قیامەتو موجاهیدو تێکۆشەر لەپێناو ئایین دا، ئەو دوو تاقمە یەکسان نین. چونکە ﴿لا يَسْتَوُونَ عِنْدَ اللّٰهِ﴾ ئەوانە لای خودا وەکوو یەك نینو لەیەك ئاست دا نین. نە لەرەوشتو نە لەکردەوەدا نە لەدونیاو نە لەقیامەت دا هاوتا نین. ﴿وَاللّٰهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظّٰالِمِينَ﴾ پەروەردگار گەلو نەتەوەیەك هیدایەت نادا: کە بەردەوام بن لەسەر ستەم کردن لەخۆیان بەم جۆرە درێژە بەکوفری خۆیان بدەنو ستەم لەغەیری خۆشیان دەکەن.

ئایەتەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکا کە نابێ بەهیچ جۆرێك موشریكو کردەوە پووچەڵەکانیان بخرێنە تای تەرازوی موسوڵمانانو کردارە پەسندەکانیان. تەنانەت بەیەکسانی تەماشا کردنیان ستەمەو بەستەم حلێب دەکرێ.

ئیمان بەخوداو بەرۆژی قیامەتو جیهادو تێکۆشان بەگیانو ماڵ لەپێناو ئایین دا زۆر باشترو گەورەترە لەئاودان بەحاجیانو مجێوری کردنی کابە! بەڵکو جوداوازی ئەم دوو جۆرە کردارە هەر نایەتە ژمارو بەرامبەری ناکرێن!! ئەمجار پەروەردگار پلەو پایەی نێوان موسوڵمانانیش دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەوانەی بڕوای تەواویان بەتاکو تەنهایی خودا هەیە ﴿وَهَاجَرُوا﴾ لەبەر خاتری رەزامەندی خودا لەوڵاتی کوفرەوە کۆچیان کردوە بۆ وڵاتی ئیمانو ئیسلام ﴿وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللّٰهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ﴾ لەپێناو ئایینی خودادا جیهادیان کردوەو تێکۆشاون، گیانو ماڵی خۆیان بەخت کردوە، تاڵو سوێرییان چەشتووە،

جۆرەها تەنگو چەڵەمەو دەردی سەرییان تــوش هـاتووە، بێگومـان ئەوانــە ﴿أَعْظَـمُ دَرَجَــةً عِنْــدَ اللّــهِ﴾ پلــەو پایــەیان زۆر گــەورەترە لــەو موشــریکانەی ئــەرکی ئـاو دابەشکردنیان لەئەستۆ گرتووە، مجیوّری کەعبە دەکەنو روخـاوی چـاك دەکەنـەوە جوداوازی نێوانیان عاسمانو رێسمانە. ﴿وَأُوْلَئِكَ هُمْ الْفَائِزُونَ﴾ ئەوانـە، هـەر ئەوانـە بــەمراز دەکــەنو بەبەختــەوەر حلێــب دەکــرێن. هــەر ئــەو موســوڵمانە کۆچــکارە تێکۆشەرانە بەفەضلو کـەرەمی خـودا بەختـەوەر دەبـنو بـەمراز دەگـەنو پاداشـی کردەوەی باشیان وەردەگرنەوە. ئـەم بەختـەوەریو بـەمراز گەیـشتنە ئەومیـە: کـە ﴿يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُمْ بِرَحْمَةٍ مِنْهُ وَرِضْـوَانٍ وَجَنَّـاتٍ لَهُـمْ فِيهَـا نَعِيمٌ مُقِـيمٌ﴾ پـەروەردگاریان مزگێنی بەختەوەرییان دەداتێ بەوەی کە لەرەحمەتی خۆی دەبارێنێ بەسەریان دا، هەموانیان دەخاتە ژێر ئەو رەحمەتە بێ پایانەوە، سـەرباری ئـەوە رەزامەنـدی خـۆ دەکاتە سێبەری کامـەرانیو دایاندەپۆشـێ، ئەمـەش گـەورەترینو نایـابترین خەڵاتـە بۆیان، لەرۆژی قیامەت دا دەیانخاتە نێو باغو باغاتی بەهەشـتی جوانو رازاوەی کـە بــۆ ئــەوانی تــەرخان کــردوە، لــەو بەهەشــتە دا نــازو نیعمــەتی بــەردەوامو نــەبڕاوە هەیەو پەکیان لەهیچ ناکەویو چییان بوێ بۆیان دابین کـراوەو ئامادەیـە، بـۆ هـەتا هەتایەو بێ بڕانەوەو کۆتایی هاتن لەم نازو نیعمەتەدا دەگوزەرێنن!

﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً إِنَّ اللّهَ عِنـدَهُ أَجْـرٌ عَظِـيمٌ﴾ بـە هـەتا هـەتایش لـەوێ دەبـن، بێگومـان خـودا پاداشـی زۆر گـەورەی لایـە بـۆ بـڕواداران. وەکـوو لەئایـەتێکی تـردا دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ اللّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِـي جَنَّـاتِ عَـدْنٍ وَرِضْـوَانٌ مِّـنَ اللّـهِ أَكْبَـرُ ذَلِـكَ هُـوَ الْفَـوْزُ الْعَظِـيمُ﴾ (التوبة: ٧٢).

هـەردوو پێـڕی فـەرموودە موسـلیمو بوخـاری، هـەروەها تـیرمیـذیو نەسـائی لەئەبو سەعیدی خودرییەوە فەرموودەیـەك دەگێڕنـەوە کـە دەڵێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: پـەروەردگار روی رەحمـەتی دەکاتـە بەهەشـتییەکانو پێیـان دەفـەرموێ: ئـەی دانیــشتوانی بەهەشــت! هــەموویان بەبــەڵێ بــەڵێ وەڵام دەدەنــەوە، ئــەمجار دەفەرموێ: ئایا رازین بەپاداشتی خۆتان؟ هەموویان بەیەکدەم دەڵێن: خودایـە! بـۆ رازی نــین؟ لەچـیمان کەمـە؟ شـتێکت پـێ بەخـشیوین نـەدراوە بەکـەس! ئـەمجار

پەروەردگار دەفەرموێ: ئەمن شتێکتان پێ دەبەخشم زۆر لەو نازو نیعمەتەی پێتان دراوە گەورەتر بێ، هەموویان دەڵێن: پەروەردگارا! دەبێ چ شتێك لەم نازو نیعمەتە گەورەتر بێ؟ دەفەرموێ: رەزامەندی خۆمتان بەسەردا دەدەمو ئیتر لەمئێستا بەولاوە قەت لێتان نارازی نابم.

ئایەتەکە بەئاشکرا ئەوە دەسەلمێنێ کە جیهادو تێکۆشان وێڕای ئیمانی پتەو لەلای خودا لەهەموو کردەوەیەك گەورەترەو هیچ کردارو گوفتارێك نایگاتێ، چونکە جیهاد بریتییە لەگیانوماڵبەخت کردن لەپێناو بەرز کردنەوەی وشەی (لا اله الا الله)و بلاّوکردنەوەی ئایینی ئیسلام!

پێویستە ئەوەش بزانین کە وشەی (أعظم) لەئایەتەکە دا کە لەسەر شێوەی (اسم التفضيل) هاتووە مانای زێدەیی ناگەیەنێ، چونکە ئایەتەکە مانای ئەوە نیە کە کافرەکان پلەو پایەکیان هەیە لەخوار پلەو پایەی موسوڵمانە موجاهیدەکانەوەیە. بەڵکو پلەو پایەی موسوڵمانەکان رەهاو موطلەقە، کافرەکان کردەوەکانیان پووچو بێ سوودە، ئەوان لەدۆزەخ داو ئەوان لەبەهەشت دان، کەوابێ هیچ موفاضەلەو زێدەیەك لەنێوان کافرەکانو موسوڵمانەکان دا نیە ئەوان لەو پەڕی بەدبەختیو چارە رەشی دان ئەمان لەوپەڕی خۆشیو کامەرانی دان.

## وازهێنان لەدۆستایەتیکردنی باوكو براو خاوو خێزانی کافرو هەڵبژاردنی ئیمانو جیهاد بەسەر هەشت شتدا

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَابَآءَكُمۡ
وَإِخۡوَٰنَكُمۡ أَوۡلِيَآءَ إِنِ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡكُفۡرَ عَلَى ٱلۡإِيمَٰنِۚ
وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ قُلۡ إِن

كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ژمارە (٢٣). لەم بارەوە كولەبی دەڵێ: كاتێك پێغەمبەر فەرمانی پێ كرا بەكۆچ كردن لەمەككەوە بۆ مەدینە، پیاوی وا هەبوو: بەباوكو براو خێزانی خۆی رادەگەیاند: كە فەرمانی كۆچكردنیان پێ كراوەو دەبێ مەككە بەجێ بێڵن، جا هی وایان تێدا بوو بەبێ چەندو چوون ملی رێگای دەگرتە بەرو كۆچی دەكرد، هی واشیان هەبوو: بەماڵو منداڵو خزمو كەسوكاری رادەگەیاند، ئیتر خێزانی، كوڕی، كچی، خزمو كەسوكاری داوێنیان دەگرتو پێیان دەگوت: بۆخاتری خودا! چۆن ئێمە بەجێ دێڵی؟ دڵت دێ واز لەماڵو منداڵت بێنی؟ بۆ كێیان جێ دێڵیو بەكێیان دەسپێری؟ ئیتر ئەویش دڵی نەرم دەبوو، وازی لەكۆچ دەهێناو لەگەڵیان دەمایەوە. ئەم ئایەتە هاتە خوارێ سەركۆنەی ئەو جۆرە كەسانە دەكاو دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ...الآية﴾

دەربارەی ئەوانەش كە لەمەككە مابوونەوەو كۆچیان نەكردبوو ئایەتی ﴿قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ﴾ تا دەگاتە ﴿فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ﴾ كە مەبەست رزگار كردنی مەككەیە. هاتە خوارێ.

فەریابی لەئیبنو سیرینەوە ئەویش لەعەلی كوڕی ئەبو تالیبەوە ریوایەت دەكا: دەفەرموێ: بەچەند كەسێكم وت: ئەرێ بۆ كۆچ ناكەن؟ بۆچی پەیوەندی بەپێغەمبەرەوە (ﷺ) ناكەن؟؟ لەوەڵام دا وتیان: لەگەڵ كەسوكارمان دەمێنینەوە/

لەناو هۆزو ماڵی خۆمان دا دادەنیشین، ئیتر ئایەتی ﴿قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ...الآيَة﴾ هاتە خوارێ.

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە ئەوەیە: کە سیاقی ئایەتەکە بەردەوامە لەروتکردنەوەی هەستی موسوڵمانەکان لەهەموو جۆرە پەیوەندییەك جگە لەپەیوەندی لەگەڵ خودا، هەموو پەیوەندییەك لەدڵی کۆمەڵی موسوڵمانان دادەڕنێو مشتو ماڵی دەکا بۆ پەیوەندی کردن بەخوداو بەدینی خوداوە. بانگەوازی ئادەمیزاد دەکا کە واز لەهەرچی پەیوەندیو پەرژەوەندی خزمایەتیو لەززەتو خۆشی هەیە بهێنن، هەموو ئەمانە وەلا بنرێو لەشوێنی دا پەیوەندی لەگەڵ خوداو ئایینی خودا دا ببەسترێ. هەموو خۆشیو بەرژەوەندیو پەیوەندیو خزمایەتی بخاتە لایەکی ترازووەوە، خۆشەویستی خوداو پێغەمبەری خوداو جیهاد لەپێناو ئایین دا بخاتە لایەکی ترەوە، ئەمجار موسوڵمانان سەرپشك بکا، لایەکیان هەڵبژێرن!

بەکورتی ئایینی ئیسلام هاتووە مەفهوومەکان بگۆڕێ، هاتووە ئەو ڕاستییە بچەسپێنێ کە پەیوەندی ئایین بەهێزترو لەپێشترو بەرزترە لەپەیوەندی رەگەزو زمانو خزمایەتی، هاتوە جەخت لەسەر ئەو ڕاستییە بکاتەوە: کە بەرووبوومی جیهاد کاتێك دەستەبەر دەبێ، کە واز لەخۆشەویستیو دۆستایەتی موشریکەکان بێنێ، بەندایەتیکردن بۆ خوداو شوێنکەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) بەسەر هەموو شتێکی ژیان دا هەڵبژێریو لەناخەوە ئاوێتەیان بێ!! بۆیە بەو جۆرەو بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزە رووی خیطاب دەکاتە موسوڵمانانو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا آبَاءَكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بەتاکو تەنهایی خودا هەیەو ئیمانتان بەپێغەمبەر هێناوە، نەچن باوكو براو خزمی موشریکتان بکەنە لێپرسراوی خۆتانو پابەندی فەرمانو ئامۆژگارییان بنو لەشەڕدا یارمەتییان بدەن، بۆ خاتری ئەوان کۆمەگی بەکافرەکان بکەن، بەسەر نهێنی موسوڵمانان دا ئاگاداریان بکەن، نابێ لەخزمو کەسوکارو بنەماڵەو خاوو خێزانتان کەسانێك کە کافرو خودا نەناسن بیانکەنە دۆستو سەرپەرپشتیاری خۆتانو بەرژەوەندی ئەوان پێش بەرژەوەندی موسوڵمانان بخەن. ﴿إِنْ اسْتَحَبُّوا

﴿الْكُفْرَ عَلَى الإِيمَانِ﴾ ئەگەر ئەوان کوفریان هەڵبژاردو شیرکیان بە باشتر زانی لە ئیسلامو لە سەر کوفرو بێدینی خۆیان بەردەوام بوون. ﴿وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ کەسێك لە ئێوە کۆمەگی لە کافران داوا بکاو پشتیان بێ ببەستێ، ئەوە ئەوانە لەو گرۆهانەن کە لە رێبازی راست لایان داوە. ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەوانە موشریکن وەکوو ئەوان، چونکە بە موشریکەکان رازی بوون، رازی بوون بە کوفر کوفرە وەکو چۆن بە فیسق فیسقە...!

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ الممتحنة ـ ٩.

ئەمجار پەروەردگار روی خیطابی دەکاتە پێغەمبەرو دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: ﴿إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ﴾ ئەگەر باوکو باپیرانتان ﴿وَأَبْنَاؤُكُمْ﴾ کوڕو کچو نەتەوەتان ﴿وَإِخْوَانُكُمْ﴾ براو ئامۆزاو مامو خاڵتان ﴿وَأَزْوَاجُكُمْ﴾ خێزانو هاوسەرتان ﴿وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا﴾ ماڵو سامانێك كە كۆتان كردۆتەوە ﴿وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا﴾ بازرگانیو مامەڵەکردنتان کە ترسی بازاڕ وەستانو نرخ شکانی کاڵاکانتان هەیە، ﴿وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا﴾ خانوو باڵەخانەکانتان کە تێیان دا دەحەوێنەوەو ئیستراحەتیان تێدا دەکەن. پێیان بڵێ ئەگەر ئەم هەشت شتانەتان ﴿أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ﴾ لەخوداو پێغەمبەری خوداو جیهاد لەپێناو ئایین دا خۆشتر دەوێ، بەجۆرێك ئەو خۆشەویستییە ببێتە کۆسپو تەگەرە لەبەردەم یارمەتیدانی پێغەمبەر ئەوە ﴿فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ﴾ چاوەڕوان بن تا ئەوکاتەی خودا بڕیاری خۆی دەربارەی ئێوە دەردەکاو سزای بێ ئامانی خۆی دەنێرێ بۆتانو ئەوکاتە رزگارتان نابێ، ﴿وَاللَّهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ خودا هەرگیز هیدایەتی گەلو گرۆی سنوور بەزێن ناداو، هەر کە کاتی سزادانتان هات بەفوتارتان نادا.

ئەم دەستبەردار بوونو دابڕانە لەکوفرو گرۆهی موشریکان، هەر ئەرکی تاکە تاکەی کۆمەڵ نیەو بەس! بەڵکوو ئەرکی هەرە لەپێشی کۆمەڵی موسوڵمانانیشە،

ئەرکی دەوڵەتی ئیسلامیشە، دروست نیەو نابێ هیچ ئیعتیبارێك بۆ هیچ جۆرە پەیوەندیو بەرژەوەندییەك بکرێ لەسەر حیسابی بنەماکانی عەقیدەو داخوازییەکانی بیروباوەڕو پێویستیاتی جیهاد!! دەبێ هەموو پەیوەندیو بەرژەوەندییەك لەچوار چێوەی ئیسلام دا حیسابی بۆ بکریو بەپێوەری ئەو بپێورێ! هەموو شتێك دەبێ لەروانگەی ئیسلامەوە سەیری بکریو بەتەرازووی ئەو بکێشرێ!

**تێبینی:**

ئایەتەکە کە دەفەرموێ: ﴿لا تَتَّخِذُوا آبَاءَكُمْ.....﴾ وا پێ دەچێ خیطاب بێ بۆ هەموو موسوڵمانان، حوکمەکەشی بەردەوامە تا رۆژی قیامەتو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەبێ موسوڵمانو کافر لێك جیابنو نابێ موسوڵمانان گوێ بیسی فەرمانی کافران بن.

کە لەئایەتەکەی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ....﴾ جەخت لەسەر ئەوە دەکا کە خۆشویستنی خوداو پێغەمبەر (ﷺ) شتێکی پێویستەو کۆڕای موسوڵمانانی لەسەر چەسپاوە، خۆشەویستی خوداو پێغەمبەر بریتییە لەفەرمانبەرداری فەرمانەکانیانو شوێنکەوتنی پەیامی ئیسلام. چونکە لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾ (آل‌عمران:۳۱).

پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرموودەیەك دا فەرموویەتی: (لایطعم أحدکم طعم الإیمان حتى یحب في الله، ویبغض في الله، حتى یحب في الله ابعد الناس، ویبغض في الله أقرب الناس الیه) واتە: هیچ کەس لەئێوە تامی ئیمان ناکا هەتا وای لێ نەیە تەنها لەبەرخاتری خودا خەڵکی خۆش بوێ، لەبەر خاتری خودا خەڵکی ناخۆش بوێ. دوورترین ئادەمیزادی لەبەر خودا خۆش بوێ، نزیکترین خزمی خۆی لەبەر خاتری خودا بدزێ..

## پەروەردگار لەچەند هەڵو مەرجێکداو لەچەندان شوێندا کۆمەکی بەموسوڵمانان کردوە

﴿ لَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٖ وَيَوۡمَ
حُنَيۡنٍ إِذۡ أَعۡجَبَتۡكُمۡ كَثۡرَتُكُمۡ فَلَمۡ تُغۡنِ عَنكُمۡ
شَيۡـٔٗا وَضَاقَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ ثُمَّ
وَلَّيۡتُم مُّدۡبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى
ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ
بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٧﴾ ﴾

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ﴿ويوم حنين....﴾ بەیهەقی لە(الدلائل) دا ریوایەتی کردوە دەڵێ: رۆژی حونەین پیاوێك وتی: ئەمڕۆ لەبەر کەمی تێناشکێین، ژمارەی جەنگاوەرانی موسوڵمان (١٢) دوازدە هەزار بوو. پێغەمبەر (ﷺ) ئەم بەخۆنازینەی پێ ناخۆشبوو، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ. ﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ....الآية﴾.

لەڕووی پەیوەندیی نێوان ئەم ئایەتەو ئایەتی پێشوو دەگوترێ: لەئایەتی پێشوو دا پەروەردگار باسی ئەوەی فەرموو: کە پێویستە موسوڵمانان لەپێناو بەرژەوەندی ئایین دا دەستبەرداری باوکو براو خزمو کەسوکاری موشریکیان بن، لەهەمان کات دا خودا بۆخۆی دەیزانێ کە ئەم کارە لەسەر شانی موسوڵمانان گرانە، ئەمجار لێرەدا ئەوەیان بۆ ڕوون دەکاتەوە: کە هەرشتێك لەپێناو ئایین دا واز

لەبەرژەوەنـدی دونیـایی بێنـێ، خـودا وێـڕای بەهرەمەنـدی قیامـەت مەبەسـتی دونیاشـی بـۆ فەراهـەم دێنـێ، بـۆ ئەمـەش نموونەیـەکیان بـۆ دێنێتـەوە: کـە ڕۆژی حونـەین جـەنگاوەرانی موسـوڵمانان زۆر بـوون، بـەهێزو تـەیار بـوون، کەچـی کەبەزۆری‌و تەیاری خۆیان نازین تێشکان، پاشان لـەکاتی تێشکان‌و هـەڵهاتن دا کـە لەخودا پاڕانەوەو هانایان بۆ پەروەردگار برد خودا بەهێزی کردن‌و گڕوتینی پێدان بەجۆرێك توانییان سوپای کوفر بشکێنن. ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێ کـە ئادەمیزاد هـەرکاتێ پـشتی لـەئایین کـردو ڕوی کـردە دونیـا، دیـن‌و دونیـای لەدەسـت دەچـن هەرکاتێ بەندایەتی تەواوی بۆ خودا ئەنجام دا، لایـەنی ئایینییـان هەڵبـژارد؛ خـودا شکۆمەندی هەردوو جیهانی پێ دەبەخشی‌و بەجوانترین شێوە بەختـەوەری دونیـاو قیامـەتی دەکـا. ئەمـەش وەکـوو دڵدانەوەیـەك وا بـوو بـۆ ئەوانـەی لـەپێناو ئـایین دەستبەرداری خزم‌و کـەس‌وکـاری موشـریکیان بـوون، لەهـەمان کـات دا تێگەیانـدنی موسوڵمانانە بۆ ئەوەی هەمیشە ئەوەیان لەیادبێ کە کۆمەگی پـەروەردگار بـەهێزی مەعنەوی دەبێ، نەك بەزۆری ژمارە.

موجاهیـد لـەم بـارەوە دەفـەرموێ: ئـەم ئایەتـە یەکـەم ئایەتێکـە لەسـوورەتی (براءة) هاتۆتە خوارێ، پەروەردگار لەم ئایەتە دا فـەضل‌و ڕەحمـەتی خـۆی بەسـەر موسوڵمانان دا یاددەخاتەوە، چاکەو یارمەتیدانی هەمە جۆرو هەمیشەیی خـۆی بـۆ موسوڵمانان باس دەکا، چەند جـار کۆمـەگی پـێ کـردون‌و لەجـەنگ دا زاڵـی کـردون بەسـەر دوژمنـان دا، ئـەوەیان یـاد دەخاتـەوە کـە ئـەو شـکۆمەندی‌و سـەروەرییانەی بەدەستیان هێنـاون هـەموویان یارمـەتی خـودایی بـووە نـەك بـەهۆی زۆری ژمـارەو پڕچـەکی خۆیـان بـووە. سـەرنجی موسـوڵمانان بـۆ ئـەوە ڕادەکێـشێ کـە یارمـەتی لەخوداوەیـە، ژمـارەی زۆرو کـەم چ ڕۆڵێکـی نیـە، ئـەوەتا ڕۆژی جـەنگی حونـەین موسـوڵمانان ئەوەنـدە ژمـارەو ئەسـبابی شـەڕیان کـۆك بـوو بـۆ خۆیـان بـەخۆیان دەنازین خۆیان لەخۆ گۆڕا بوو، کەچی زۆری ژمـارەو چەکسازی‌و تـەیارییان دادی نەدان‌و تێشکان‌و هەڵاتن، کەمێکیان نەبێ هەموویان هەڵهاتن‌و دەوری پێغەمبـەریان چۆڵ کـرد، ئـەمجار پـەروەردگار سـەرلەنوێ یارمـەتی خـۆی بـۆ نـاردن‌و پێغەمبـەرو موسوڵمانانی سەرخستن، بۆ ئەوە تێیان بگەیەنێ کە یارمەتی هەر لەلایەن خـوداوە

دێ، بەکۆمەگی زاتی بێچوونی دەبێ، کەمو زۆری سوپا چ رۆڵێکی نیە ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾.

**پێداچوونەوەیەك بەجەنگی حونەین دا:**

مامۆستا سەیید لێرده دەفەرموێ: پەروەردگار لەچەند شوێنێك دا کۆمەگی بەموسوڵمانان کردبوو؛ هێشتا سێبەرو تارمایی ئەو یارمەتیدانە لەبیرەوەرییان دا مابوو، بۆیە هەرپێویستی بەئاماژە پێکردنێکی سەرپێیی هەبوو، بەڵام جەنگی حونەین ئەوەبوو دوای رزگار کردنی مەککە لەمانگی شەووالی ساڵی هەشتەمی کۆچی دا روی دا. ئەوە بوو دوای تەواو بوونی ئازاد کردنی مەککە، کاروباری شار ئاسایی بووەوە، زوربەی دانیشتوانی ئیمانیان هێنا، پێغەمبەر (ﷺ) هەموویانی عەفوو کرد، ئا لەم سەروبەندەدا هەواڵ بەپێغەمبەر گەییشت: کە هۆزی هەوازین خۆیان کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی شەڕ لەگەڵ موسوڵمانان بکەن، سەرۆکەکەیان مالیکی کوڕی عەوفی (النضری)و هۆزی تەقیف تێکرا لەتەکیا، خێڵی بەنو جەشەمو بەنو سەعدی بەنی بەکرو خێڵی ئەوزاع لەبونو هیلال، چەند کەسێك لەبەرەی عەمری کوڕی عامرو عەوفی کوڕی عامر- ئەمانە هەموویان کۆبوونەوەو پەیمانیان بەستووەو مندالو ژنیشیان لەگەڵ خۆیان هێناوە، مەڕو بزنو رەشەوڵاخو حوشترەکانیشیان هێناوە. پێغەمبەر (ﷺ) هەر بەو سوپایەی کە بۆ رزگار کردنی مەککە هێنابووی کە لەدەهەزار کەس پێك هاتبوو لەموهاجیرو ئەنصارو خێڵە عەرەبەکانی تر، ئەوانەی دانیشتووی مەککە بونو موسوڵمان بوون پێغەمبەر عەفووی کردن ئەوانیشی رەگەڵ کەوتن کە دووهەزار کەس بوون. پێغەمبەر (ﷺ) ئەم سوپا دوانزە هەزار جەنگاوەرەی بەرەو دوژمن برد، لەدۆڵێکی نێوان مەککەو طائیف کە ناوی حونەین بوو روبەڕوی یەکتر بوونەوەو لەو دۆڵەدا جەنگەکە بەرپابوو، لەبەرەبەیان دا شەڕ دامەزرا، موسوڵمانەکان دابەزینە ناو شیوەکەوە، جەنگاوەرانی هەوازین بۆسەیان بۆ موسوڵمانەکان دانابوو، کە موسوڵمانەکان روویان لەشیوەکە کرد کاتێکیان زانی شەرکەرە هەوازینیەکان لێیان راسانو شمشێریان لێ راستو چەپ کردنو بەر رێژنەی گوللەو تیرە بارانیان کردنو بەفەرمانی مەلیکەکەیان بەیەك گوڕ هەڵمەتیان بۆ بردنو هێرشیان کردە سەریان،

هەر زوولەشکری موسوڵمانەکان شکاو هەڵهاتن، پێغەمبەر (ﷺ) خۆی گرتو مایەوە، تەشریفی ئەو رۆژە سواری هێسترە بەڵەکەی بوو، هەڵمەتی دەبردە سەر دوژمن عەبباس ئاوزەنگی لای راستی گرتبوو ئەبو سوفیانی کوڕی ئەلحاریثی کوڕی عبدولوطەلیب ئاوزەنگی لای چەپی گرتبوو خۆیان پێوە هەڵواسیبوو بۆ ئەوەی زۆر بەگورجی نەڕوا، پێغەمبەر (ﷺ) ئاوزەنگی لێ دەداو موسوڵمانانی بانگ دەکردو دەیفەرموو (الي عباد الله، اليَ انا رسول الله) ئەی بەندەکانی خودا ومرن بۆ لای من دوم کەون، ومرن بۆ لای من من پێغەمبەرم. هەر لەو حاڵە دا دەیفەرموو:(أنا النبي لا کذب، انا ابن عبد المطلب) ئەمن پێغەمبەرم دروی تێدا نیە، من لەنەوەی عەبدوموطەلیبم. نزیکەی (١٠٠) کەس لەهاوەڵانی لەخزمەتیدا مابوونەوەو هەڵنەهاتبوون. هەندێك دەڵێن: هەشتا کەس بوون، لەمانە حەزرەتی ئەبو بەکرو عومەر، ئیمامی عەبباسو عەلیو ئەلفەضل ئیبنو عەبباس، ئەبوسوفیانی کوڕی ئەلحاریثو ئەیمەنی کوڕی ئوسامەی کوڕی زەیدو هی تریش بوون. خودا لەهەموویان رازی بێ، ئەمجار پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بەعەبباسی مامی کرد کە دەنگی بەرزو گەورە بوو بەهەموو هێزی خۆی بانگی هاوەڵانی دەکردو دەیفەرموو (یا أصحاب الشجرة) مەبەستی ئەوانە بوو: کە لەژێر درەختەکە دا بەیعەتیان بەپێغەمبەر کردو پەیمانیان دایە کە لەشەڕدا خۆگر بنو هەڵنەیەن، جاری وا بوو بانگی دەکردن (یا أصحاب الشجرة) جاری واش دەبوو دەیگوت: (یاأصحاب السمرة) ئیتر هاوەڵان لەم لاو لەولا وەڵامیان داوە (یالبیك، یالبیك) بەڵێ بەڵێ لەخزمەتداینو وا هاتین، خەڵکەکە بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) گەڕانەوە، تەنانەت پیاوی وایان هەبوو ئەگەر وشترەکەی بەدەستەوە نەهاتایە ملی رێگای نەگرتایە، زرییەکەی لەبەر دەکردو دادەبەزیو بەپێیانو بەهەڵەداوانو راکردن دەهات بۆ لای پێغەمبەر وشتری بەرەڵا دەکرد. کە کۆمەڵێك لەم هاوەڵانە ئاوا لەدەوری پێغەمبەر (ﷺ) کۆبوونەوە فەرمانی پێکردن کە هێرشێکی لەنکاوو کتوپڕ بەرنەسەر دوژمنو بەیەك گوڕ پەلاماریان بدەن... کە هاوەڵان بەفەرمانی پێغەمبەر هێرشیان بردو هەڵیان کوتایە سەریان موشریکەکان دەسبەجێ شکانو قوچاندیان، موسوڵمانان بەدوویانەوە لێیان دەکوشتن، بەدیلیان دەگرتن، هەی بگرەو بەردە بوو، هێشتا

هەموو هاوەڵانی هەڵهاتوو نەگەڕابوونەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەم تاقمە موسوڵمانە هێرشبەرانە کۆمەڵێکی زۆریان لەموشریکەکان بەدیل گرتبوو هێنابویاننە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ).

ئەمە یەکەم جەنگ بوو کە موسوڵمانان دوزادەهەزار جەنگاوەریان بۆ کۆببێتەوە، بەجۆرێك کە سەریان لەزۆری خۆیان سوور بمێنیو بەخەیاڵی خۆیان تێشکان نابینن، بێ ئاگابوون لەهۆکاری سەرکەوتنی لەوەپێشیان. ئەوە بوو لەسەرەتادا خودا تاڵاوی تێشکانو هەڵهاتنی پێ چەشتن، پاشان بەو برە کەمەی هاوەڵان کە لەخزمەت پێغەمبەر (ﷺ) مابوونەوەو خۆیان راگرتبوو سەرکەوتنی پێ بەخشین.

جا بۆ رانواندنی ئەم روداوەو چەسپاندنی لەمێژوو دا بۆ پەندو عیبرەت لێ وەرگرتن پەروەردگار ڕوی خیطاب دەکاتە موسوڵمانانو دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ﴾ ئەی موسوڵمانینە! بێگومان پەروەردگار لەزۆر شەڕو جەنگ دا ئێوەی سەرخستووە بەسەر دوژمنەکانتان دا، لەزۆر شوێنو شەڕگەی وەکوو بەدرو حودەیبییەو مەککەو شەڕی بەنوقوریظەو بەنو نەضیردا خودا یارمەتی ئێوەی داوە، بەهۆی بەهێزی بیروباوەڕتانو صەبرو خۆڕاگریتان وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ﴾ (آل‌عمران:١٢٣). چونکە پشتتان بەخودا بەستبوو بڕواتان وابوو یارمەتی هەر لەخوداوەیە. کە دەفەرموێ: ﴿في مواطن كثيرة﴾ مەبەستی ئەو غەزایانەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەنجامی دان دەڵێن: ژمارەیان گەیشتۆتە هەشتا شەڕگە، جا یان سەرکەوتنی تەواو لەهەموو روێیکەوە کە زوربەیان وا بوون، یان سەرکەوتن لەبارەی پەروەردەو راهێنان وەکوو لەجەنگی ئوحوود دا کە هەرچەند لەروی سەربازییەوە تێشکان بەڵام لەروی پەروەردەییەوە دەرسێکی بەسوود فێر بوون.

هەندێکی تر پێیان وایە شوێنو شەرگەکان کەمتر لەهەشتا شوێن بوون ئەبو یەعلا لەجابیرەوە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: ژمارەی غەزاکانی پێغەمبەر (ﷺ) بیستو یەك غەزا بووە، تەشریفی خۆی لەهەشتیان دا ئامادە بووەو شەڕی کردوە

کە ئەمانەن ((بەدر، ئوحوود، ئەحزاب، موصطەلەق، خەیبەر، مەککە، حونەین، طائیف)) مەفرەزەو دەستە جیهاد کەرەکانی کە ناردوونی سی مەفرەزە بوون.

﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ﴾ لەرۆژی حونەینیش دا هەر کۆمەگی پێ کردنو یارمەتیدان. لەکاتێك دا زۆریو تەیاریتان سەرسوڕمانی بەسەر هێنانو هەڵیخەڵەتاندنو لەخۆتان بایی بوون وتتان ئەمڕۆ تێ ناشکێین، ئیتر پەروەردگار لەسەرەتاوە خۆتانی بەخۆتان سپارد، ﴿فَلَمْ تُغْنِ عَنْكُمْ شَيْئاً﴾ زۆریتان چ سوودێکی پێ نەگەیاندن، دوژمن بەسەرتان دا زاڵ بوو، ﴿وَضَاقَتْ عَلَيْكُمْ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ﴾ لەترسانو لەپەشۆکاویتان (کونە مشکتان لێ بوونە قەیصەری) سەر زەوی پانو پۆڕتان لێ وەتەنگ هاتبوو، رێگای دەستکردنەوەو شەڕکردن یان خۆقوتار کردنی شەرفمەندانەتان نەدۆزییەوە، رێگا چارەتان نەما جگە لەهەڵاتن ﴿ثُمَّ وَلَّيْتُمْ مُدْبِرِينَ﴾ ئیتر بەتێشکاوی هەڵاتنو قوچاندتانو پێغەمبەرتان لەگۆڕەپانی شەڕدا لەگەڵ کۆمەڵێکی کەم لەهاوەڵان دا بەجێ هێشت. ﴿ثُمَّ أَنزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەمجار عینایەو کۆمەگی خودا فریاتان کەوت، دڵ ئارامیو خۆگری بەسەر پێغەمبەرو ئەو هاوەڵانەی لەخزمەتیا مابوونەوە باراند، دڵی پڕکردن لەهیواو ئاواتی سەرکەوتن، ئەو غەمو پەژارەی کە تووشی پێغەمبەر بوو بەهۆی تێشکانو هەڵاتنی زوربەی موسوڵمانەکانەوە لاچوو نەما، هەڵاتنی ئەوان زێدە ورەبەرزیو ئازایەتی بەپێغەمبەر بەخشیو زیاتر سوور بوو لەسەر هێرش بردنو پەلاماردانی دوژمن، ئەو موسوڵمانە کەمانەی لەخزمەتیدا مابوونەوە ئاپورەیان دابوو، تەشریفی بەسواری هێسترە بەڵەکەکەیەوە هەڵمەتی دەبردو ئاوزەنگی لێ دەدا بەرەو ناوجەرگەی دوژمن، بەمەش ترسو بیمی لەدڵی هاوەڵانی دەرهاویشتو ورە بەرزیو ئازایەتی بۆ گێڕانەوە بەتایبەتی کە هاواری لەموسوڵمانان دەکردو بۆلای خۆی بانگ دەکردنەوە، عەبباسی مامیشی بەدەنگی بەرز بەفەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) بانگی دەکردنو ورەی بەرز دەکردنەوە. وێڕای ئەم دڵ ئارامیو خۆگرییەی بەسەری دا باراندن. ﴿وَأَنزَلَ جُنُوداً لَمْ تَرَوْهَا﴾ بۆ بەهێز کردنی دڵی موسوڵمانەکان فریشتەی ناردنە خوارێ بۆ کۆمەگی پێکردنیان کە ئێوە بەچاو نەتان بینین، بەڵکوو ئاسەوارەکەیان لەدڵی خۆتان دا بینیو هەستتان پێ کرد، کە

بریتی بوو لەورە بەرزی‌و بەخۆدا چوونەوەو سەرلەنوێ هەڵمەت بردن‌و پەلامار دانی دوژمن‌و شکاندنی لێ کوشتن‌و بەدیل گرتنی زۆر لێیان.

﴿وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ سزای ئەوانەی دا کە کافر بوون بەکوشتن‌و بەدیل گرتن‌و تێشکان‌و راونان‌و ریسوا بوونیان ﴿وَذَلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ﴾ ئائەوەیە: سزای ئەوانەی کافرن لەدونیا دا، هەتا ئەوان کوفر بەسەر ئیسلام دا هەڵبژێرن‌و دژایەتی موسوڵمانان بکەن‌و شەڕیان لەدژ بکەن ئەوە حاڵیان دەبێ.

﴿ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ئەمجار خودا پاش ئەو سزادانەی موشریکەکان لەدونیادا، ئەگەر مەیلی لێ بێ تۆبەی ئەوانە قبووڵ دەکا کە تۆبە دەکەن‌و واز لەکوفرو بێدینی دەهێنن، هیدایەتیان دەدا بۆ موسوڵمان بوون‌و لەتاوانی لەوە پێشیان خۆش دەبێ ئەگەر بەراستی‌و لەناخەوە تۆبەیان کردبێ، خودا لێخۆشبوو لێبوردەیە بۆ ئەو کەسانەی تۆبە دەکەن‌و کردەوەی باش ئەنجام دەدەن.

لێخۆشبوونی زۆرەو ڕەحمەتی بەرفراوانە بەشی هەموو شتێك دەکا، ئەوە بوو لەباقی ماندەی هۆزی هەوازین خۆش بوو، موسوڵمان بوون‌و بەئیمانداری شوێن پێغەمبەر (ﷺ) کەوتن، دوای بیست رۆژێك لەرودانی شەڕەکە لەنزیك مەککە لەشوێنێك کە پێی دەڵێن: (الجعرانة) بەخزمەت پێغەمبەر گەیشتن‌و عەرزیان کرد کە ماڵ‌و منداڵیان بەدیل گیراوەو بیاندەنەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: یان ژن‌و منداڵەکانتان دەدرێتەوە یان ماڵ‌و سامانەکەتان، لایەکیان هەڵبژێرن، ئەوانیش ژن‌و منداڵەکانیان هەڵبژارد کە نزیکەی شەش هەزار دیل بوون لەئافرەت‌و منداڵ هەمووی پێ دانەوەو عەفووی کردن ماڵ‌و سامانەکەشی بەسەر جەنگاوەران دا دابەش کرد. هەندێك لەدانیشتوانی مەککە کە عەفوو کرابون‌و موسوڵمان بوبوون بۆ ئەوەی دڵیان دابمەزرێ یەکەی (١٠٠) سەد وشتری بەزێدە بەش دانێ، یەکێ لەوانەی وشتری درایە مالیکی کوڕی عەوفی (النضري) بوو وەکوو پێشوو کردیەوە بەسەرۆکی هۆزی (هەوازین).

ئیمامی بووخاری لەمیسوەری کوڕی مەخرەمەوە ڕیوایەت دەکا، کە چەند کەسێك لەهۆزی هەوازین هاتنە خزمەت پێغەمبەرو ئیمانیان پێ هێناو بەیعەتیان پێ کرد، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا! ئەتۆ باشترین ئادەمیزادی چاکترین کەسی، ژنو منداڵمان هەموویان گیراون، ماڵو ماڵاتمان هەمووی دەستی بەسەرا گیراوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ان عندي من ترون، ان خير القول أصدقه، اختاروا اما ذراريكم ونساءكم، واما أموالكم) ئەوەی لای منە ئەومیە: بێگومان باشترین قسە ئەومیە راست بێ (خودا راستەو راستی لێ خۆش دێ) ئێوە سەرپشك بن، یان ژنو منداڵەکانتان دەدەمینەوە، یان ماڵو سامانەکەتان. وتیان: ئێمە هیچ شتێك بەخێزانو منداڵەکانمان ناگۆڕینەوە، کەوابێ ژنو منداڵەکانمان پێ بدەنەوە. ئەمجار پێغەمبەر (ﷺ) هەستاو بەموسوڵمانەکانی فەرموو: (هؤلاء جاؤونا مسلمين، وانا خيرناهم بين الذراري والأموال فلم يعدلوا بالاحساب شيئاً، فمن كان بيده شيئ، وطابت به نفسه ان يرده فشأنه، ومن لا فليعطنا، وليكن قرضاً علينا حتى نصيب شيئاً فنعطيه مكانه) ئەوانە هاتوونە لامانو موسوڵمان بوون داوای ماڵو منداڵو خێزانەکانیان دەکەنەوە، ئێمەش سەرپشکمان کردوون لەنێوان ژنو منداڵو ماڵو سامانەکەیان، ئەوانیش ژنو منداڵەکانیان هەڵبژاردوە، ژنو منداڵەکانیان بۆ دەگەڕێنینەوە، دەربارەی ماڵەکەیان کەسێ شتێکی لایەو بەدڵ پێی خۆشە بابیانداتەوە، کەسێکیش پێی ناخۆشە بابەقەرز بمانداتێ تا دەسکەوتی ترمان دەبێ ئەو کاتە لەشوێنی ماڵی ئەمان ماڵی تریان دەدەینێ. هەموویان وتیان: رازین. ئەمجار پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (لا ندري لعل فيكم من لايرضى، فمروا عرفاءكم، فليرفعوا ذلك الينا) نازانین لەوانەیە تێتان دا هەبێ بەدڵ رازی نەبێ، کەوابێ بچن بۆ لای سەرپەلو سەردەستەکانتان با ئەوان ئەوەمان بۆ باس بکەن. ئیتر سەرپەلو ئامیر مەفرەزەکانیان هاتنو رەزامەندی خۆیان نیشان دا. ئیتر هەندێکیان بەدڵ ماڵەکەیان بۆ گێڕانەوە، هەندێکیشیان بەقەرز دایاننەوە بەم نیازە دوایی پێغەمبەر (ﷺ) لەباتی ئەوە ماڵی تریان بداتێ.

یەکێ لەئافرەتە گیراوەکان (شەیماء) کچی حەلیمەی سعدییە بوو: کە خوشکی شیری پێغەمبەر (ﷺ) بوو کچی ئەلحاریثی کوڕی عەبدولعوزا لەهۆزی بەنو سەعدی

بەنو بەکر بوو، پێغەمبەر (ﷺ) زۆر ڕێزی لێ گرتو خەڵاتی کردو چاکەی زۆری لەگەڵ کرد. بەدڵخۆشیو بەموسوڵمانی گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی.

ئیمامی موسلیم لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت دەکا، دەفەرموێ: ڕۆژی ئەوطاس پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەتێکی بینی دەهاتو دەچوو هاواری دەکردو عەرز لەخۆی نەدەگرت، پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لێ کرد، عەرزی کرا کوڕێکی دیارنیە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەتەکەی بینییەوە کوڕەکەی دۆزی بوەوە، خێرا ماچی دەکردو بەخۆیەوە دەگوشی. پێغەمبەر بانگی ئافرەتەکەی کردو بەهاوەڵانی فەرموو: پێتان وایە ئەم ئافرەتە ئەم جگەر گۆشەیەی خۆی بخاتە ناو ئاگرەوە؟ هاوەڵان عەرزیان کرد نەخەیر. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: بۆ؟ وتیان: لەبەر ڕەحمو شەفەقەتی بۆی. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (الله أرحم منها) خودا زۆر بەرەحم ترە بۆ ئێوە لەم ئافرەتە بۆ کوڕەکەی.

## پاساغکردنی مەسجیدولحەرام لەموشریکەکان

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا ۚ وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦٓ إِن شَآءَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٨﴾ ﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ڕستەی ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً﴾ لەم ئایەتەدا وەکوو ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنو عەبباسەوە گێڕاویەتەوە ئەوەیە: دەڵێ: موشریکەکان کە دەهاتن بۆ طەوافی ماڵی خوا خواردەمەنییان لەگەڵ خۆیان دەهێنا بازرگانییان پێوە دەکرد، کە نزیکبوونەوە لەکەعبەیان لێ قەدەغە کرا، موسوڵمانەکان وتیان:

ئەدی ئێمە لەکوێوەو چۆن خواردەمەنیمان بۆ بێ؟ ئیتر پەروەردگار ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ﴾ ناردە خوارێ.

ئیبنو جەریری طەبەریو ئەبو شەیخ؛ ئیبنو حەییانی ئەلئەنصاری لەسەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: کە ڕستەی ﴿إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ﴾ نازڵ بوو، موسوڵمانەکان تینیان بۆ هات وتیان ئیتر کێ خواردەمەنیو کالاّمان بۆ بێنێ؟ ئەمجار خودا ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً....﴾ ناردە خوارێ.

جا وەکوو لەسەرەتای ئەم سورەتەدا ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد، کە پێغەمبەر (ﷺ) ساڵی نۆیەمی کۆچی حەزرەتی عەلی نارد پێشەتای سورەتی (براءة) بەسەر موشریکەکانی مەککە دا بخوێنێتەوە، پەیماننامەکەیان بەسەردا بداتەوە.. پێیان رابگەیەنێ کە خوداو پێغەمبەری خودا دەستبەرداری موشریکەکان بوونو لێیان بەرین. کەسانێك وتیان: ئەی دانیشتوانی مەککە! لەوە بەولاوە دەزانن چیتان بەسەردێ! چۆن تووشی قاتو قڕیو گرانی دەبن چونکە ئیتر هیچتان بۆ نایەو کاروانو بازرگانیتان لێ قەدەغە دەکرێ ئیتر ئەم ئایەتە بۆ لابردنی ئەو شوبهەو بۆچوونە هەڵەیە هاتە خوارێ.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بەخوداو بەپێغەمبەری خودا هێناوە: بزانن کە موشریکەکان -بەهۆی هاوەڵدانانیانە بۆ خودا- دڵو دەرونیان پیس بووە، ئەوان لەبارەی بیرو باوەڕەوە گومڕان، عەقیدەیان فاسیدە، لەدەروون پیسی دا رۆچون، ئەوانە پیسن جا یان لەبەر پیسی دڵو دەروونیانو عیبادەتکردنیان بۆ بتو صەنەم، یان لەبەر ئەوە هاوەڵ بۆ خودا دەدانێنو هاوەڵدانانیش وەکوو پیسی وایەو پێویستە خۆی لێ بپارێزرێ. یان لەبەر ئەوە چونکە خۆیان پاك ناکەنەوە غوسڵ ناکەن، خۆ لەپیسو پۆخەڵی حیسسی ناپارێزن، جا کە ئەوانە بەو شێوەیە پیس بن ﴿فَلَا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا﴾ مەهێڵن نزیك بەمەسجیدولحەرام بکەونەوە، لەدوای ئەم ساڵەوە (ساڵی نۆیەمی کۆچی) ڕێگایان مەدەن بچنە ناو ماڵی خوداوە، ئیتر ئەو شوێنە پیرۆزە لەو کافرو خودا نەناسانە یاساغەو لێیان قەدەغەیە.

مەبەست بەموشریك: بتپەرستە، بڕێکیش پێیان وایە موشریك بەهەموو کافرێك دەوترێ چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاءُ﴾ (النساء:٤٨).

مەبەست بەپیسی ئێرە کە دەفەرموێ: (نَجس) پیسی مەعنەوییە واتە: بیرو باوەڕیان پیسە. زومەخشەری لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتی کردوە کە پیسی موشریك پیسی ماددییە وەکوو سەگو بەراز پیسن؟! بەڵگەش ظاهیری ئایەتەکەیە، ئیمامی هادی کە یەکێکە لەپێشەوایانی زەیدیو بڕێ عولەمای ظاهیریش پێیان وایە پیسیی موشریك پیسی ماددییە. ئیبنو جەریر لەحەسەنەوە ڕیوایەتی کردوە دەڵێ: کەسێك تۆقەی لەگەڵ موشریك کرد دەبێ دەستنوێژ بگرێتەوە.

مەبەست بەمەسجیدولحەرام: بەلای شافیعیو عەطاوە هەموو خاکی حەرەم دەگرێتەوە. بەلای مالیکییەکانەوە تەنها خودی کەعبە دەگرێتەوە.

حەنەفییەکان دەڵێن: مەبەست لەنەهی ئایەتەکە یاساغکردنی موشریکەکان نیە لەچوونە ناو ماڵی خودا، بەڵکوو مەبەست یاساغکردنیانە لەئەنجامدانی حەجو عومرە وەکوو لەسەردەمی نەفامی دا ئەنجامیان دەدان، کە دەفەرموێ: ﴿بَعْدَ عَامِهِمْ هَـذَا﴾ مەبەستی ئەوەیە: کە لەم ساڵ بەو لاوە نابێ حەجو عومرە بکەن، چونکە عەلی کاتێ سورەتی (براءة)ی بەسەر خەڵکەکەدا خوێندەوە ئەمجار وتی: ئیتر لەم ساڵە بەولاوە نابێ هیچ موشریکێك حەجو عومرە بکا هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً﴾ بەلگەیە لەسەر ئەوە کە ترسان لەفاتو فڕی، نەهاتنی موشریکەکانە لەکاتی حەجو عومرە دا چونکە لەحەجو عومرە مەنع دەکرێن. هەروەها چونکە کۆڕای زانایانی موسوڵمان هەیە لەسەر ڕێگەگرتن لەموشریکەکانو نابێ بهێڵن هیچ کاروبارێکی حەج ئەنجام بدەن. ئەمجار پەروەردگار ئارامی دەخاتە نێو دڵی موسوڵمانانەوەو دڵنیایان دەکا لەوە کە قەدەغەکردنی موشریکەکان لەمەسجیدولحەرام نابێتە هۆی فاتو فڕیو کەم بوونەوەی کاڵاو دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ إِن شَاء﴾ ئەگەر ترسی هەژاریتان هەیە، ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! بەهۆی نەهێنانی بژێوو کاڵای بازرگانی کە لەوەپێش

موشـریکەکان دەیانهێنـاو لـەم سـاڵەوە مـەنع کـرانو ناهێڵدرێ نزیـك ئـەو بەسـتە بکەونەوە، ئەوە دڵنیابن خودا بەفەضلو گەورەیی لەلایەکی تـرەوە ئـەو کەلێنـەتان بۆ پڕ دەکاتەوە، هۆکاری ژیانتان باشتر بۆ دابـین دەکـاو کـارو کاسـبیتان زۆر دەبـیو پەکتان ناکەوێ.

﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگار زاناو ئاگادارە بـەحاڵو چۆنیەتی ئێوە؛ هی ئێستاو هی داهاتووشتان، دەزانێ چۆن هەژار دەکەونو بەچی دەوڵەمەنـد دەبـن! حـەکیمو دانایـە لـەو شـەریعەتو یاسایەی بۆتـان دادەنـێ، لـەو فـەرمانو نەهییانەی ئاراستەتان دەکا، کە فـەرمانتان پـێ دەکـا بەجـەنگان دژی موشـریکەکان پاش تەواو بوونی پەیمانو ئاگربەست، یان کە جڵەگیریتان لێ دەکا لەنزیکبوونەوەی موشـریکەکان لەمەسـجیدولحەرام دوای سـاڵی نۆیـەمی کۆچـی، بـێ حیکمـەت نیـەو بەرژەوەندی دونیـاو ئـایینی ئێـوەی تێدایـە. هـەروەها پـەروەردگار حـەکیمو دانایـە لەهەرچی کە دەیداو هەرچی دەیگرێتەوە وە هیچ کارێکی بـێ هـوودە نیـە، چـونکە پەروەردگار کەماڵی رەهای هەیـە لـەکردارو گوفتاریـدا، دادپـەروەرو بـێ وێنـەو بـێ هاوتایە لەدروست کردنو بەدیهێنانو بەڕێوەبردن دا.

ئەمە هەواڵدانە لەنهێنی داهاتوو، هەواڵی غـەیبی بـوو هاتـە دی، خـودا وادەی خـۆی هێنایـە دی، دانیـشتوانی یەمـەنو ئـەهلی جیـدەو جـەرەشو شـوێنی تـر موسوڵمان بوون، خواردەمەنیو بژێوییان دەهێنا بۆ مەککە، موشـریکەکان خۆشـیان موسوڵمان بوون، کەس نەمایەوە موشریك بیو رێگای مەسجیدولحەرامی لێ بگـیرێ. لەهەرچوار لاوە خێـرو خێراتیـان بـۆ دەهـات، دەسـتکەوتی جـەنگیان بـۆ دەهاتـەوە، سـەرانەیان لەئـەهلی ذیمـمـە وەردەگـرتو بەتـەواوی هـەرزانیو فـەرەحی کەوتـە وڵاتەوە!!

**تێبینی:**

دانیشتنی موشریكو کافر لەوڵاتی ئیسلام دا سێ جۆرە:

١- بەسـتی مەککـە (الحـرم المکـي) بـەپێی رایـەکی شـافیعیو رێبـازی حەنبەلییـەکان نـابێ کـافر بـچێتە بەسـتی مەککـەوە، تەنانـەت ئەگـەر تەتـەرو

راسپاردەش بێ، ناهێڵدرێ پێی تێخا، بەڵکوو دەبێ ئیمام یان جێگری ئیمام بچێتە دەری حەرەمو نامەکەی لێ وەربگرێ یان پەیامو راسپاردەکەی ببیسێ. مالیکییەکان دەڵێن: دروستە ناموسوڵمان بچێتە بەستی مەککەوە بەوادەو پەیمانو بۆ ماوەی سێ رۆژ بەڵام نابێ بچێتە ناو مەسیجدولحەرامەوە، ئیمام بۆی هەیە ماوەی مانەوەکە زیادو کەم بکا. ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: ناموسوڵمانان دەتوانن بچنە ناو حەرەمەوە بۆ ماوەی سێ شەوو سێ رۆژ بەڵام بەمەرجێك ئیمام یان جێگری ئیزنی بدەن.

٢- ناخی حیجاز کە لەباری درێژییەوە نێوان عەدەنو سنووری عێراقە، لەباری پانیشەوە نێوان جیدەو کەنار دەریا تا سنووری شام. ناموسوڵمان بەئیزنو رەزای ئیمام دەتوانێ بۆ ماوەی سێ رۆژ بچێتە ناو ناخی حیجازەوە. ئیمامی موسلیم لەئیبنو عومەرەوە ریوایەت دەکا: دەفەرموێ: لەپێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: (لأخرجن اليهود والنصارى من جزيرة العرب، لا أترك فيها الا مسلماً) لەریوایەتێکی تری موسلیم دا: (أخرجوا المشركين من جزيرة العرب) بەرای شافیعیو حەنبەلییەکان دوورگەی عەرەب مەبەست خاکی حیجازە بەتایبەتی.چونکە فەرموودەیەك هەیە ئەحمەد ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: دەفەرموێ: (أخرجوا اليهود من الحجاز) حەزرەتی عومەر بۆ جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانە جولەکەو گاورەکانی تەنها لەحیجاز وەدەرنا نەك لەدورگەی عەرەب، لەوڵاتی یەمەن نیشتەجێی کردن هەرچەندە یەمەن بەشێکە لەدورگەی عەرەب.

بەلای مالیکییەکانەوە دروستە بهێڵدرێ ناموسوڵمان لەدورگەی عەرەب دا نیشتەجێ ببێ، کە بریتییە لەخاکی حیجازو یەمەن. چونکە فەرموودەی کە ئیبنو عومەر ریوایەتی کردو لەمەو پێش نووسیمان بەگشتی پاڵپشتی ئەم رایە دەکا، هەروەها ئەو حەدیثەی عائیشە کە ئەحمەد ریوایەتی کردوە ئەوە دەگەیەنێ. کە دەفەرموێ: (لا يترك بجزيرة العرب دينان) هەروەها ئەو حەدیثەی کە ئیمام مالیك لەمووەطەئدا لەزوهرییەوە بەمورسەلی ریوایەتی کردوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لايجتمع دينان في جزيرة العرب).

٣- ولاتــی موســوڵمانان بەگــشتی، ناموســوڵمان دەتــوانێ تێیــدا بمێنێتــەوە بەئەمانو زەمان. بەڵام نابێ بچێتە ناو مزگەوتەوە بەبێ ڕێگە پێدانی موسوڵمان، دروسته بۆ ناموسوڵمان بچێته نـاو مزگەوتەکانـەوە تێیـان دا بمێنێتـەوە بـا لـەش پیـسیش بـێ چـونکه لەسـەردەمی پێغەمبــەر (ﷺ) ناموســوڵمان دەهاتنــە نــاو مزگەوتەکەیەوە، ئاشکراشە لەو کافرانە دا هەبوە لەشی پیس بووە.

## جەنگان دژی خاوەن نامەکان

﴿ قَـٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَـٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ٢٩ ﴾

ئیبنولمونذر لەزوهرییەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: دەربارەی کافرەکانی قـورەیش ئایـەتی ﴿وَقَـاتِلُوهُمْ حَتَّـى لاَ تَكُـونَ فِتْنَـةٌ وَيَكُـونَ الـدِّينُ كُلُّـهُ لِلَّـه﴾ هاتۆتـه خـوارێ. دەربـارەی خـاوەن نامـەکانیش ئایـەتی ﴿قَـاتِلُوا الَّـذِينَ لا يُؤْمِنُـونَ بِاللَّـهِ وَلا بِـالْيَوْمِ الآخِرِ....﴾ هاتۆته خوارێ یەکەم کەس کە سەرانەیان دا دانیشتوانی نەجران بوون، پـێش لـەدونیا دەرچوونی پێغەمبـەر سـەرانەی خۆیـان تەسـلیم کـرد. ئیبنـو ئـەبی شــەیبەو ئــەبو شــشەیخ؛ ئــەبو حــەییانی ئەلئەنــصاری لەحەســەنی بەصــرییەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) لەپێناو ئـایین دا شـەڕی دژی دانیـشتوانی نیـوە دورگـەی عـەرەب کـردو جگـە لەموسـوڵمان بـوون هیـچی کـەی لێ قبـووڵ نـەکردن، بەراستی جەنگان دژی موشریکەکانی نیوە دورگەی عەرەب گەورەترین جیهاد بـوو، دوا ئەوە ئەو جیهادە بوو کە بەپێی ئایـەتی ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ....الآيـة﴾ دژی خاوەن نامەکان ئەنجام درا.

**موناسەبەی ئەم ئایەتە بەئایەتەکانی پێشوەوە ئەوەیە:**

ئەوەی پەروەردگار حوکمو بڕیاری خۆی دەربارەی موشریکەکان راگەیاندو بەرائەتی خۆیو پێغەمبەری خۆی جاڕدا، فەرمانی کرد بەجەنگان دژیانو قەدەغە کردنی مەسجیدولحەرام لێیان، ئەمجار بڕیارو حوکمی خۆی دەربارەی خاوەن نامەکان رادەگەیەنیو فەرمان دەکا بەموسوڵمانان کە دژیان بجەنگێن تا ناچار دەبن سەرانە بدەن، ئەمەش وەکوو رێخۆشکەرە وایە بۆ غەزای تەبووك کە دژی رۆمەکان (نەصرانییەکان) ئەنجام درا.

کە حەزرەتی موحەممەد کرا بەپێغەمبەرو رەوانەکرا جولەکەو مەسیحییەکان ئیمانیان پێ نەهێنا، بیرو باوەڕی خۆشیان نەسخ کرابۆوەوە بەکەڵکی هیچ نەدەهات. نەشەریعەتیان پەسندبوو نەئایین، بەڵکوو شوێن هەواو هەوەسی خۆیان کەوتبوون، چونکە ئەوان ئەگەر بڕوایان بەناوەرۆکی ئایینی خۆیان هەبوایە ئەو بڕوایەیان پاڵی پێوە دەنان بۆ ئەوەی ئیمان بەپێغەمبەر (ﷺ) بێننو پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد بەراست بزانن. لەم روەوە کە هەموو پێغەمبەرەکانی پێشوو مژدەیان بەهاتنی دا بوو فەرمانیان کردبوو: کە هەرکاتێ ئەو پێغەمبەرە پەیدا بوو پێوستە بڕوای پێ بکەن، چونکە بەهاتنی پێغەمبەری ئیسلام ئایینەکانی تر پووچ دەبنەوەو، ئیتر باویان نامێنێ. لەم روەوە کە ئیسلام لەخوداوە هاتووەو بوەتە سەرخەتمی هەموو دیانەتەکان، ئیتر بڕوابوون بە هەندێ پێغەمبەرو بڕوانە بوون بەهەندێکی تریان، بێ سوودو بایەخە چ حیسابێکی بۆ ناکرێ، ئەوان هەتا ئیمان بەحەزرەتی موحەممەد نەهێنن کە سەرخەتمی پێغەمبەرانە بەکافر حلێب دەکرێنو خوداپەرستیو ئەرکەکانی ئایینیان لێ وەرناگیرێ! بۆیە پەروەردگار خیطاب ئاراستەی موسوڵمانان دەکاو فەرمانیان پێ دەکا کە شەڕ دژی خاوەن نامەکان رابگەیەننو دژیان بجەنگێن بەمەرجێ ئەو چوار رەوشتە ناشیرینەیان تێدابن کە ئایەتەکە دەست نیشانی کردون کە دەفەرموێ:

١- ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾ ئەی موسوڵمانینە! شەڕ بکەن دژی ئەو جولەکەو نەصرانییانەی ئیمانیان بەخودا نیە، بێگومان ئەوان بەراستی بڕوایان بەخودا نیە، چونکە زوربەی جولەکە پێیان وایە: خودا جەستەی هەیەو لەشتی

مـادی تـر دەچـێ، ئـەوان بڕوایـان بەهـەبوونی خـوداو تـاكو تـەنهایی نیـە، نەصرانییەكان بڕوایان وایە: سێ خـودا هەن، لەسـەرەتاوە سێ خـودا بڕیـار دەدەن، ئەمجار دەیانكەنەوە بەیەك، بەمجۆرە دەڵێن: باوك هەیە، كوڕ هەیـە، ڕوحولقـودس هەیە. ئەم سێیانە بەخودا حلێب دەكەن، پاشان دەڵێن: بـاوك لەعیـسا دا تواوەتـەوە ئیتر عیسا بوەتـە خـودای تـاكو تـەنیا، دەی خۆ خـودا پـاكو پـیرۆزو بـەرزە لـەوەی لەناو جەستەی تردا بتوێتەوە یان لەگەڵ جەسـتەی تـر ببێتـە یـەك. هـەروا خـودا بەرزە لەوەی كوڕی هەبێ یان هاوەڵی هەبێ. جا كە ئەوان بڕوایان ئاوا بەخودا بیءو ئاوا خودا بناسن مانای وایە بەحەقیقەتو ڕاستی خوداناس نین.

وێـڕای ئـەوەش جولەكە دەڵێن: عـوزەیر كـوڕی خودایـە، هـەردولا جولەكـەو نەصـرانی مـالەو قەشـەكانیان كـردوە بەئـەربابو یاسـادانەر، شـەریعەتی خودایـان فەرامۆش كردوە، مالەو قەشەكانیان جۆری عیبـادەتو حـەلاڵو حـەرامیان بـۆ دیـار دەكـەن، ئـەوانیش پابەنـدی فەرمانـەكانیان دەبـنو وەكـوو فـەرمانی خـودا سـەیری فەرمانی مالەو كەشیشەكانیان دەكەن، كەوابوو بەخودایان دەزانن.

٢- ﴿بِـالْيَوْمِ الآخِـرِ﴾ بەڕاسـتی بڕوایـان بـەڕۆژی قیامـەتو زینـدوبوونـەوەی ئـادەمیزادو زینـدەوەرانی تـر نیـە. ئـەوان پێیـان وایـە كـە تـەنها گیانـەكان زینـدو دەكرێنەوە نەك جەستەكان، وەكوو فریشتەیان لێ دێ جەستەیان نابێ، پێیان وایـە: ئـەهلی بەهەشـت خـواردنـەوەیان نـابێ، هـیچ لـەززەتو خۆشـی مـادی لەقیامەت دا نیە، پێیان وایە نازو نیعمەتی بەهەشتو سزای ئاگر بـریتین لەچـەند مانایەكی گیانی وەكوو كەیف خۆشیءو دڵتـەنگیءو بـەس! ئـەوان بڕوایـان بـەژیانێكی پێك هـاتوو لـەماددەو گیـان لەقیامـەت دا نیـە، ئەمـەش تـەواو پێـچەوانەی هـەواڵی قورانی پیرۆزە، كەسێك بڕوای بەزیندوبونەوەی جەستەییءو گیانی بەیەكەوە نەبێ، مانای وایە بڕوای بەقورئان نیەو ئینكاری قورئان دەكا.

٣- ﴿وَلا يُحَرِّمُونَ مَا حَـرَّمَ اللَّـهُ وَرَسُـولُهُ﴾ ئـەو شـتانەی قورئـانو فـەرموودەی پێغەمبـەر حـەرامیان كـردوون ئـەوان بەحـەرامی نـازانن، تەنانـەت ئـەو شـتانەی تەوراتو ئینجیلی دەستكاری نەكراو حـەرامیان كـردون ئـەوان بـە حـەرامی نـازانن، بۆخۆیـان شـەریعەتو یاسـایەكیان بـۆ خۆیـان داهێنـاوە پێـچەوانەی ئاینـە

ئەصڵییەکەی خۆیانــە کــە نەسـخ بۆتــەوە بــەئایینی ئیـسلام. ئــەوەتا: جوولەکـە خواردنی ماڵی خەڵك بەناڕەوا لەڕێگەی ڕیباوو بـەرتیلو دەسبڕینی خـەڵك....هتـد بـەڕەوا دەزانـن، نەصرانییەکانیش ئـەو شـتانەی لەتـەورات دا لێیـان یاساغ کـراوە: وەکوو پیوو عەرەق.......هتد بەحەلاڵی دەزانن.

٤- ﴿وَلَا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُـوا الْكِتَـابَ﴾ ئـەوان بڕوایـان بـەئایینی حەق کە ئایینی ئیـسلامە نیـەو پابەنـدی فـەرمانو جڵـەو گیریو ئامۆژگارییـەکانی نـابن. بـەڵکوو بـەگوێرەی ئـەو پـەیڕەوو پرۆگرامـەی پیـاوە ئایینـەکانیان بەهـەواو هەوەسی خۆیان بۆیان داناون هەڵسو کەوت دەکەن.

تەوراتو ئینجیلیان دەسـتکاری کـردووە، بنـەما سـەرەکییەکانی ئایینـەکانیان کە لەگەڵ ئایینی ئیسلام دا یەك دەگرنەوەو بەنیگا بۆ حەزرەتی موساو حـەزرەتی عیـسا نێـردراون گۆڕانیـان بەسـەردا هێنـاونو وەکـوو خۆیـان نـەماونو لـەکاریان خستوون جا کەوا بیو ئەمە ڕەوشتو هەڵسو کەوتی ئەو خـاوەن نامانـە بـێ، ئێـوە ئەی موسوڵمانینە! شـەڕ بکـەنو بجـەنگن دژی ئەوانـەی کـە ئـەو چوار ڕەوشـتەیان تێـدان لـەخاوەن نامـەکان، ئەوانــە لەموشـریکەکان جـوداوازنو حوکمیـان جیایـە، موشریکەکان دوو ڕێگەیان لەبەردەم دایە: یان دەبێ موسـوڵمان بـن یـان دەکـوژرێن، بەڵام خاوەن نامەکان سێ ڕێگەیان لەبەردەم دایە، موسوڵمانبوون، سەرانە دان، شەڕ لەگەڵ کردن تا دەکوژرێن.

ئەی موسوڵمانینە! بجەنگێنو شەڕ لەگەڵ خاوەن نامەکان بکەن ﴿حَتَّى يُعْطُـوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾ تا ناچار دەبن: یان موسوڵمان بن، یـان سـەرانە دەدەن بەشـێوەیەکی وا: کـە بەتـەواوی گەردنکەچیو پابەنـدبوونیان بەئـەحکامی ئیـسلام پێـوە دیـار بـێ بـەبێ سەرپێـچیو منجـە مـنج کـردن سـەرانەی خۆیـان لـەکاتی دیاریکراودا تەسلیم بکـەن. سـەرانە سەرچاوەیەکی گرنگە لەبودجـەی حکوومـەتی ئیـسلامی دا، ئەنـدازەی ئـەم سـەرانە بـۆ نێرینەیـەکی بـاڵغی جەسـتە ساغو عـەقڵ تەواوی جولەکەو مەسیحیو ئەوانـەی لـەحوکمی ئـەوان دان لـە(٤٨) دیرهەمـەوە تـا (١٢) دوازدە دیرهەم بووە، بەمەرجێ ئەو کابرایە ماڵی هـەبیو دارایـی ئـەو سـەرانە دانەی هەبێ، ژنو منـداڵو پیرەمێـرد سـەرانەیان لەسـەر نیـە، کوێرو کـەم ئەنـدامو

پەککەوتە سەرانە نادەن مەگەر دەوڵەمەند بن. فەقیرو هەژارو کۆیلە سەرانەیان لێ ناسێندرێ، دێرنشینو رەبەنەکانیان ئەگەر لەخەڵك دابڕا بوون، بۆ خۆیان گۆشەگیر بوون سەرانەیان لەسەر نیە.

بناغەی سەرانە دانان لەسەر ئەو خاوەن نامانە ئەوەیە: کە ئەوان بەپێی پەیمانو موعاهەدە دەبنە خاوەن ذمەو پێویستە حکوومەتی ئیسلامی پارێزگارییان لێ بکا. خاوەن نامەکانو ئەوانەی لەحوکمی ئەوان دان نابرێن بۆ جەنگو سەربازی ناکەنو تەنانەت داکۆکی لەخۆشیان ناکەن دەبێ موسوڵمانان پارێزگارییان بکەن، دەی کەوابێ جێی خۆیەتی کە باجی ئەو پارێزگارییە بدەنو لەباتی ئەوەی کە سوود لەدەوڵەتی ئیسلامی دەبینن مەرافیقی گشتی بۆیان ئاوەڵایەو ئیستیفادە لەرێگەو بانو پردو خەستەخانەو پرۆژەی ئاوو ئاوەڕۆو ئەو جۆرە شتانە دەکەن ئەندازەیەك ماڵی تایبەتی خۆیان بدەن بەحکوومەتی موسوڵمانان. ئەوەتا موسوڵمان پێنجیەکی دەستکەوتی لێ وەردەگیرێ، زەکاتو سەرفیترەو قەرەبووی تاوان (کفارات)ی لێ وەردەگیرێ، دەی حەق وایە لەناموسوڵمانیش ئەندازەیەك ماڵ وەربگیرێو بخرێتە سەر بودجەی حکوومەت، لەدواییش دا ئەم پارەیە لەبواری پرۆژەی گشتیو بەرژەوەندی گشتی دا خەرج دەکرێتەوە، بەسەر فەقیرو هەژاری ئەهلی نیمە دا دابەش دەبێتەوە، ئەم جیزیە لێ وەرگرتنە نابێ بەمەبەستی چەوساندنەوەو زەلیل کردنی ئەو خاوەن نامانە بسێنرێ، چونکە ئەوە لەگەڵ دادپەروەری ئیسلام دا رێك ناکەوێ بەڵکوو ئەو سەرانە کە وەردەگیرێ بارتەقای ئەو پارێزگاریو دابینکردنی ئارامیو دابینکردنی بودجەی پرۆژە گشتییەکانە کە خۆشیان سوودی لێ دەبینن‌و بەشێکی بۆ ئەوان بەکار دەهێنرێ. وشەی (صاغرون) وەکوو برێ لەزانایانی شافیعیو ئیبنو قەییمی جەوزی فەرموویان بەمانا پابەندبوونە بەناوەرۆکی پەیماننامەکەو زەلیلیو سوکایەتی پێکردنی تێدا نیە. ئەمانە پێیان دەگوترێ ئەهلی کیتاب (خاوەن نامە) چونکە لەراستی دا نامەی ئاسمانیان هەبوە نیمچە بڕوایەکیان بەخوداو بەزیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەی رۆژی قیامەت هەیە، جۆرە بڕوایەکیان بەپێغەمبەرانو شەریعەتو ئایین هەیە.

پێیان دەگوترێ ئەهلی ذیممە، واتە: خاوەن وادەو بەڵێنو بەپێی ئەو عەهدو پەیمانــە پێویــستە موســوڵمانان مامەڵــەیان لەگــەڵ دا بکــەنو بەشــێوەیەکی دادپەروەرانـەو بـەگوێرەی پـەیمانی خـوداو پێغەمبـەر هـەڵسو کـەوتیان لەگـەڵ دا بکەن.

پێیان دەگوترێ (معاهدون) پـەیمان لەگـەڵ بەسـراو، چونکە ئـەوان لـەوڵاتی ئیسلام بەگوێرەی پەیمانێك کە بەستراوە لەنێوان ئەوانو موسوڵمانان دا نیـشتەجێ بوون ئەرکی سەرشانی موسوڵمانانو ئەوانیـشە کـە پابەنـدی خاڵـەکانی پەیمانەکـە بنو بەهەردو لایان رێزی پەیماننامەکە بگرنو سنوور شکێنی نەکەن. نـابێ بـەهیچ جۆرێك موسوڵمانان ستەمیان لێ بکەن، نابێ داوای ئەنجامدانی ئـەرکێکیان لێ بکـەن کە لەتوانایان دا نەبێ!

ئەوەشمان لەبیر نەچێ سەرانە (جیزیە) شتێك نیە ئیسلام دایهێنابێ، بەڵکوو پێش ئیسلام لەناو فارسەکان دا باو بووە، یەکەم کـەس کـە سـەرانەی داهێنـا کیـسرا نەوشـیروان بـووە، کاتێـك وڵاتـی فـارس کەوتـە ژێـر دەسـتی موسـوڵمانان حـەزرەتی عومەر کاری پێ کردو بەو شێوە جیزیـەی لێ وەرگـرتن. قورئـانی پـیرۆز ئەنـدازەی سەرانەی دیاری نەکردوە، لەمەوە فوقەهای موسوڵمانان کەوتوونە ڕاجیاییەوە!

شـافیعی دەفـەرموێ: سـاڵی یـەك دینـار لەدەوڵەمەنـدو هـەژاریان وەردەگـیرێ بەمەرجێ ئازادو باڵغ بن. بەڵگەشی ئەو فەرموودەیەیە کە ئەبو داوود و هی تـریش لەمەعاذیان ڕیوایەت کـردوە: کـە پێغەمبـەر (ﷺ) کاتێـك مـەعاذی نـارد بـۆ یەمـەن فـەرمانی پـێ کـرد کـە لەهـەموو نێرینەیـەکی باڵغیـان دینارێـك سـەرانە وەربگـرێ! شـافیعی بـۆ سـەلماندنی ئـەم رایـەی خـۆی دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (ﷺ) رونکـەرەوەو شـیکەرەوەی قورئانــەو ئــەو دەزانــێ مەبەسـتی پـەروەردگار لەئەنـدازەی جیزیـە چەندە، دەی ئەوەتا کە مەعاذی نارد ئەندازەکەی بۆ دیاری کرد...

ئەگەر لەپەیمانەکە دا صوڵحیان لەگەڵ بکرێ لەسەر زیاد لەدینارێك دروستە، کاتی وەرگرتنی سەرانە کۆتایی ساڵە.

مالیکییەکان دەفەرموون: ئەندازەی سەرانە لە سەر دەوڵەمەندو هەژاریان چوار دیناری زێڕە لە سەر ئەوانەی زێڕیان هەیە، چل دیر هەمە لە سەر ئەوانەی ژیویان هەیە. لە سەرەتای ساڵیشدا لێیان وەردەگیرێ.

مەجوس(ئاگر پەرست ) لە بارەی جیزمیەوە وەکو خاوەن نامەکان مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ. ئیبنو المونذیر دەڵێ: ئەمە رای زانایانی ئیسلامەو ج خیلافێك لەم بارەوە نازانم.

ئیمام مالیك لە مووەطەئدا ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: عومەری کوڕی خەتتاب (ﷺ) باسی قەومی مەجوسی کرد، دوایی فەرموی نازانم چۆن مامەڵەیان لەگەڵ دا بکەم؟ عەبدوررەحمانی کوڕی عەوف هەستا، وتی: شایەتی دەدەم من لەپێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (سنوابهم سنة أهل الكتاب) وەکوو خاوەن نامەکان مامەڵەیان لەگەڵ بکەن. ئیبنو عەبولبەر دەڵێ: مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی جیزیەوە بووە بەس! ئەم رایە بەڵگەیەکی بەهێزە کە مەجووس خاوەن نامە نین.

شافیعی‌و جەماوەری زانایان دەفەرموون: سەرانە تەنها لەخاوەن نامەکان وەردەگیرێ بەتایبەتی‌و بەس جا عەرەب بن یا عەجەم بن چونکە ئایەتەکە هەر باسی خاوەن نامەکانی کردوە، ئیتر حوکمەکە هەر رو لەئەوان دەکاو هی تر ناگرێتەوە. چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَاقْتُلُواْ الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ﴾ (التوبة/٥) نەیفەرموو: ﴿حَتَّى يُعْطُواْ الْجِزْيَةَ﴾ وەکوو دەرحەق بەخاوەن نامەکان فەرمووی. کەوابوو سەرانە لەبتپەرستی عەرەب وەرناگیرێ.

ئیمامی ئەوزاعی‌و مالیکییەکان دەفەرموون: سەرانە لەبتپەرستو ئاگرپەرستو کافرو بەدرۆخەرەوەی پێغەمبەر وەردەگیرێ؛ جا عەرەب بن یان

عەجەم بن، هۆزی تەغلەبی بن یان هۆزی قورەیشی هەر کەسێك بن جگە لەهەڵگەڕاوە لەئایین (مرتد عن الدين).

سەرانە وەردەگیرێ لەپیاوانی شەڕکەریان، چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿فاقتلوا الذين﴾ تا دەگاتە ﴿حَتَّى يُعْطُواْ الْجِزْيَةَ﴾ ئەم ئایەتە ئەوە دەخوازێ کە سەرانە لەسەر کەسێك بێ کە شەڕی پێ بکرێ، زانایانی ئیسلام کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە کە سەرانە لەپیاوانی شەڕکەری باڵغو ئازاد وەردەگیرێ.

جا ئەگەر سەرانەیان دا ئیتر هیچ شتێکی تر لەبەروبوومو بازرگانیو داهاتیان لێ وەرناگیرێ، مەگەر بازرگانی لەوڵاتێك دا بکەن کە جودا بێ لەو وڵاتەی صوڵحیان لەسەر کردوەو لەپەیمانەکەیان دا دەست نیشان کراوە. ئەو کاتە پاش فرۆشتنی کاڵاکانیانو وەرگرتنی پارەو پوڵەکەیان ئەوە دەیەکیان لێ وەردەگیرێ، ئەگەر خۆراکو گەنمو رۆنو ئەم جۆرە شتانەیان دەگواستەوە بۆ مەککەو مەدینە بەتایبەتی ئەوە نیوەی دەیەکیان لێ وەردەگیرێ!

هەرکەسێك لەوانە موسوڵمان ببێ بەکۆڕای زانایانی شەرع سەرانەی لەسەر لادەچێ، چونکە ئەحمەدو ئەبو داودو بەیهەقیو دارەقوطنی لەئیبنو عەبباس ریوایەتیان کردوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ليس على مسلم جزية) لەریوایەتێکی طەبەرانی لەئیبنو عومەرەوە هاتووە (من أسلم فلا جزية عليه) جا وەکوو سەرانە بەموسوڵمان بوون لادەچێ بەمردنیش لادەچێ، چونکە وەکوو ئاماژەمان پێ کرد سەرانە لەجیاتی پارێزگاریو نیشتەجێ بوونیان لەوڵاتی ئیسلام دا وەردەگیرێ...

## بیرو باوەڕی خاوەن نامەکان

﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ۖ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ ۖ

يُضَٰهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبْلُۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۚ
أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٣٠﴾ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ
وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ
مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓاْ إِلَٰهًا وَٰحِدًاۖ لَّآ
إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبْحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣١﴾
يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ
أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٣٢﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ
أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ
كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾

دەربارەی هۆکاری نازڵبوونی ئایەتی ژمارە (٣٠) ئیبنو ئەبو حاتەم لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکاو دەفەرموێ: سەلامی کوڕی میشکەمو نوعمانی کوڕی ئەوفاو شاسی کوڕی قەیسو مالیکی کوڕی صەیف، بەپێغەمبەریان گوت: ئێمە چۆن شوێنت بکەوین لەکاتێك دا تۆ وازت لەقیبلەی ئێمە هیناوە؟! هەروەها تۆ پێت وانیە عوزەیر کوڕی خودا بێ، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَقَالَتْ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ........الآية﴾ نارده خوارێ!

ئیبنو ئیسحاقو ئیبنو جەریرو ئیبنو مەردەویهی لەئیبنو عەبباسەوە هەمان ریوایەتیان کردوە.

جاوەکوو زاندرا پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوودا باسی ئەوەی فەرموو: کە جولەکەو نەصرانی بڕوایان بەخودا نیە، ئەمجار لەم ئایەتەی ئێرە دا ئەوە روون دەکاتەوە: کە ئەوان کوڕ بۆ خودا دادەنێن، ئەمەش هاوەڵدانانە بۆ خودا کەسێك بەلایەوە دروست بێ خودا منداڵی هەبێ، ئەوە مانای ئەوەیە: کە ئینکاری خودا دەکا. هەروەها ئەوە رون دەکاتەوە: کە ئەو خاوەن نامانە، زاناو مالەو قەشەکانیان بەیاسا دانەر دەزانن، جگە لەخودا حەرامو حەلاڵیان بۆ دەست نیشان دەکەنو هەمیشە هەوڵ دەدەن ئایینی ئیسلام قەلاچۆ بکەن.

﴿وَقَالَتْ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ﴾ برێ لەجوولەکەکان دەیانگوت عوزەیر کوڕی خودایە، عوزەیر کاهینێکی یەهوودی بوو دەورو بەری ساڵی (٤٥٧ پێش زایین) لەولاتی بابل نیشتەجێ بووبو، لەنەوەی حەزرەتی هاروون بوو، نووسەرێکی بەناوبانگ بوو، هەموو پارچەکانی تەوراتی کۆکردەوە، لەجیاتی عیبرانی کۆن پیتی کلدانی بەکار هێنا، (ئەسفاری، الأيام، عزرا، نحميا)ی دانا سەردەمی ئەو بەبەهاری ئایینی جولەکە حلێب دەکرێ، شیاوی ئەوەیە: بەبلاوکەرەوەو دامەزرێنەری شەریعەتی یەهودی بناسرێ، پاش ئەوەی شەریعەتی تەورات خەریك بوو لەناو بچێ ئەو زیندوی کردەوە، بۆیە جولەکە رێزی لێ دەنێنو تەقدیسی دەکەن، تەنانەت برێ یەهوود نازناوی (کوڕی خودا)یان داوەتێ

لەپاش مردنی حەزرەتی موسا (عليه السلام) بەنزیکەی هەزار ساڵ.

کەجولەکەکان جاری دووەم لەبابل دەرچوونو گەڕانەوە بۆ ئورشەلیم، عوزەیریش ساڵی (٤٥٦) پێش زایین بابلی بەجێ هێشتو گەڕایەوە بۆ ئورشەلیم.

ئەوەی لای مێژوو نووسان چەسپاوە، تەنانەت لای جوولەکەکان خۆشیان ئەوەیە: ئەو تەوراتەی حەزرەتی موسا نووسیویەتیەوە خستویەتیە ناو تابوتەوە، لەکاتی زاڵبوونی عەمالیقەکان بەسەر نەتەوەی ئیسرائیل دا، یان زاڵبوونی بەختونەصر پێش سەردەمی حەزرەتی سولەیمان (عليه السلام) ئەو نوسخەیەی تەورات فەوتاوە، چونکە حەزرەتی سولەیمان کە تابووتەکەی کردەوە جگە لەو دوو

لەوحانەی کە (٥) ئامۆژگارییەکەیان تێدا نووسرابوونەوە، هیچی تری تێدا نەبینی، وەکوو لەسفرەی (الملوك الاول) دا هاتووە.

ئیتر عوزەیر نووسینەوەی تەوراتی بەپیتی کلدانیو هەندێ پیتی عیبری ئەنجام دا. هەندێ رەخنەگر پێیان وایە چیرۆکی عوزەیر دەربارەی نووسینەوەی تەورات دەسهەڵبەستەو بێ بناغەیە.

﴿وَقَالَتْ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللَّهِ﴾ نەصرانیش وازیان لەیەکتاپەرستی هێناوەو دەڵێن: مەسیح کوڕی خودایە، بێگومان پێشینەکانی نەصرانی مەبەستیان بەکوڕییەتی عیسا بۆ خودا حەقیقەت نەبوو بەڵکوو بەمەجازبوو مەبەستیان خۆشەویستیو رێزداری لای خودا بوو، دوایی بەهۆی تێپەڕبوونی رۆژگارێکی زۆرو بەهۆی فەوتانی ئینجیلە ئەصلەکەو کاریگەری هیندییە بتپەرستەکان لەسەریان وایان لێ هات عیسا بەکوڕی حەقیقی خودا بزانن و پێیان وابوو عیسا بۆ خۆی خودایەو روحولقودسە، واتە: (عیسا)= کوڕ (الله)-باوك، روحولقودس ئەم سێیە ئاوێتەی یەکتر بونو بوون بەیەك تاکە فەردی حەقیقی. ئەمە تەعلیماتی کەنیسەبوو بەسێ سەدە دوای مەسیحو قوتابیەکانی دایانهێناو بلاویان کردەوە، بێگومان کۆمەڵێکی زۆر لەمەسیحییەکان کە خۆیان بە (موحدین) یان عەقلکار حلێب دەکرد دژی ئەم بیرو باوەڕە بوونو رەدیان کردەوەو ئێستاش هەیانە بڕوای بەو ئالووئە پیرۆز نیە، بەڵام کەنیشتەکانی کاثولیكو ئەرثوذکسو پرۆتستانتەکان بەمەسیحییان نازانن و بڕوایان پێ ناکەنو بەدەرچوو هەڵگەڕاوە لەئایین حلێبیان دەکەن.

جا چونکە هەردوو لا لەجوولەکەو لەنەصرانییەکان پشتیان بەسەرچاوەی راستو دروست نەبەستووە، لەو بارەوە بنەمایەکی راستیان لەئایینەکەیان دا نیە، ئەوەی لەتەوراتو ئینجیل دا نووسراوە تەزویرو دەستهەڵبەستەو پیاوە ئایینەکانیان نووسیویانە، بۆیە پەروەردگار بەدرۆیان دەخاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ قَوْلُهُمْ بِأَفْوَاهِهِمْ﴾ ئەوەی دەیڵێن: لەبارەی عوزەیرو عیساوە، قسەیەکی دەمهەڵبەستی خۆیانەو ج بەڵگەیەکی زانستیو سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراویان بەدەستەوە نیە،

جگە لەفڕو فیشاڵی خۆیانو درۆو دەلەسەو هەڵبەستراوی ماڵمو قەشەکانیان، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَيُنذِرَ الَّذِينَ قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَداً، مَّا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِآبَائِهِمْ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِباً﴾ (الكهف/٤ – ٥)

جوولەکەو مەسیحییەکان لەم قسە بێ بناغانەیان داو بەم کوفرە ئاشکراو بیرو باوەڕیان ﴿يُضَاهِئُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَبْلُ﴾ دەشوبهێنە قسەو کوفرو بیرو باوەڕی موشریكو کافرەکانی پێش خۆیان کە بتپەرستو بەرهەمیەکانو بوذیەکانی هیندو چینو یابانو نەتەوە کۆنەکانی میصرو ئێرانو یۆنانو ڕۆمان بوون، کەوابێ جولەکەو مەسیحی بیرو باوەڕی ئەو موشریكو کافرە کۆنینانەیە کاوێژی دەکەنەوەو بەناوی تەوراتو ئینجیلەوە بلاوی دەکەنەوە. هەروەکوو موشریکەکانی عەرەب هەندێکیان بڕوایان وابوو کە فریشتە کچی خودان. ﴿قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾ دەك نەفرینی خودایان لێ بێ، خودا ئەم کافرو موشریکانە بخاتە بەر نەفرینی خۆیو لەناویان بەرێ، سەیرو سەمەرەیە ئەوانە چۆن لەڕێبازی حەق لایان داوە، چۆنو بەچ عەقڵێك لەو حەقە ئاشکراو نومایانە لایان داوەو کەوتوونە ناو لکاوی گومڕایىو کوفرەوە؟؟

مەسیحو عوزیر دو بەندەی خودانو خودا دروستی کردون، قەتیش دروستکراو ناکرێ بەدروستکەرو بەدیهێنەر، نابێ مەخلووق بەخالق حلێب بکرێ! عیساو عوزەیر وەکوو هەموو ئادەمیزادێکی تر خواردنو خواردنەوەیان هەیە، ماندوبوونو حەسانەوەیان هەیە، پەروەردگار لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَّا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلَانِ الطَّعَامَ﴾ (المائدة:٧٥) هەر لەبارەی عیساوە دەفەرموێ: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَاهُ مَثَلاً لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ (الزخرف:٥٩) یان دەفەرموێ: ﴿لَّن يَسْتَنكِفَ الْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْداً لِّلَّهِ﴾ (النساء:١٧٢).

ئەمجار وەجهەشەبەهی نێوان جولەکەو مەسیحی لەگەڵ کافرو موشریکەکانی پێشوو دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ﴾ جولەکەو مەسیحییەکان ماڵمو قەشەکانیان کردبوون بەخودای

خۆیـان، لـەجیاتی پـەروەردگاری بـەرزو پـیرۆز، پیـاوە ئایینیـەکانیان شـەریعەتو یاسایان بۆ دادەنانو حەڵاڵو حەرامیان بۆ دەست نیشان دەکردن ئەوانیش پابەنـدی فەرمانو جڵەوگیرییەکانیان دەبوون، هەروەها عیسای کوڕی مەریەمیـشیان بـەخودا دەزانی.

جولەکەکان یاساو شەریعەتی دەسهەڵبەستی پیـاوە ئایینییـەکانی خۆیـان پـاڵ تـەورات دا بـوو، مەسـیحییەکانیش ئـەحکامی تـەوراتیان گـۆڕیو شـەریعەتی دەستهەڵبەستی خۆیان لەبواری عیبادەتو مامەڵەکردن دا خستە کارو گۆڕانکاریـیان لەحوکمـەکانی تـەورات دا کـردو بـەئارەزۆی خۆیـان حـەرامو حـەڵاڵیان بـۆ دەسـت نیشانکردن، رەشە خەڵکەکەش شوێنیان کەوتن. ئـەوەی زیـاتر ئەمـە رون دەکاتـەوە چـیرۆکی موسـوڵمانبوونی عـەدی کـوڕی حاتـەمی طـائییـە. ئیمـامی ئەحمـەدو ئیرمیذیو ئیبنو جەریری طەبەری لەعەدی کوڕی حاتەمەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: کـە عەدی بانگەوازی ئیسلامی پێ گەیی هەڵهات بۆ وڵاتی شام -لەسـەردەمی جاهیلی دا بوبوە مەسیحی- خوشکەکەیو کۆمەڵێك لەخزمو کەسوکاری بەدیلی کەوتنە دەست موسـوڵمانەکان. پێغەمبـەر (ﷺ) لـەروی ئینـسانیو پیاوەتییـەوە خوشـکەکەی ئـازاد کردو گەڕایەوە بۆ لای عەدی برای، هەڵینا بـۆ موسـوڵمانبوونو چوون بـۆ خزمـەت پێغەمبەر (ﷺ) پـاش ماوەیـەك عـەدی هـات بـۆ مەدینـە، هاتنەکـەی بـوو بـەجێگای قسەو باسـی خـەڵك چونکە عـەدی سـەرۆکی هـۆزی (طي) بـوو کـوڕی حاتـەم بـوو، ناوبانگی باوکی بەدونیا دا بڵاوبوبوەوە، کە چووە خزمـەت پێغەمبـەر (ﷺ) عـەدی صـەلیبێکی لـەمل دابـوو، پێغەمبـەریش (ﷺ) ئـەم ئایەتـەی دەخوێنـدەوە ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ عەدی دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! کوا خاوەن نامەکان پیاوە ئایینیەکانی خۆیان بەخودا دەزاننو دەیانپەرستن؟ پێغەمبەر (ﷺ) فـەرمووی: بـەڵێ: ئـەوان حـەڵاڵیان لێ حـەرام دەکـەنو حـەرامیان بـۆ حـەڵاڵ دەکەنو رەشەخەڵکەکەش شوێنیان کەوتوونو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییـەکانیان بوون، ئەوە عیبادەت بۆ کردنو بەخودا زانینیانە.

ئەمجار پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی عەدی! چی دەڵێی؟ ئایا ئەگـەر بڵـێی (الله أكبر) هیچ زیانت پێ دەگـا؟ ئایـا هـیچ شتێك هەیـە لـەخودا گـەورە تـر بـێ؟ چ

شتێك زیانت پێ دەگەیەنێ؟ ئایا ئەگەر بگوترێ (لا اله الا الله) زیانت پێ دەگا؟ ئایا جگە لەخودا خودای تر هەن؟

ئەمجار پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازی عەدی کرد بۆ موسوڵمان بوون، ئەویش ئیمانی هێنا. جا عەدی دەڵێ: کە ئیمانم هێنا، دیتم پێغەمبەر (ﷺ) لەخۆشیا دەمو چاوی دەگەشایەوە. ئەمجار فەرمووی: جوولەکە غەزەبی خودایان لەسەرە (مغضوب علیهم) ئەوانن. مەسیحی گومڕابوونو ڕێگایان لێ تێك چووە، ئەوان (ضالون)ن. خۆ ئەو جوولەکەو نەصرانییانە کەوا غەزەب لێ گیراوو گومڕانو وازیان لەئایینی حەقو ڕاست هێناوە بۆ خۆیان وایان لەخۆیان کردوە. ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا إِلَهاً وَاحِداً﴾ ئەوان لەسەر زەمانی موساو عیسا فەرمانیان پێ نەکراوە کە جگە لەخودا خودایەکی تر بپەرستن، ئەوەی فەرمانیان پێ کراوە بریتی بووە لەوە کە تەنها خودا بپەرستنو هاوەڵی بۆ دانەنێن. ئەو خودایە بپەرستن کە ئەحکامی ئایینی بۆ داناون، ئەو خودایە خودای ئەوانو خودای هەموو شتێکی تریشە، زاناو دانایە، بێ هاوەڵو بێ منداڵو تاکو تەنهایە، هەر شتێکی حەرام کرد حەرامەو بەکەس حەڵاڵ ناکرێ، هەرشتێك ئەو حەڵاڵی بکا، حەڵاڵەو بەکەس حەرام ناکرێ. هەر شەریعەتو یاسایەك دابنێ شوێنکەوتنی واجبو فەرضە، هەر فەرمانێکی فەرموو دەبێ جێبەجێ بکرێ، زاتی پاکی بەگوێرەی شەرعو عەقڵ شیاوی پەرستشە ﴿لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ﴾ بەپێی شەریعەتو عەقڵی سەلیم جگە لەپەروەردگار خودای ترنین، هیچ خودانین جگە لەزاتی پاکی ﴿سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ پەروەردگار پاكو بەرزو پیرۆزە لەهاوەڵو ژنو منداڵ یارمەتدەرو شەریك، هەر خۆی شیاوی پەرستنە، بێ وێنەو بێ نەظیرە لەزاتو لەصیفات دا. لەئولوهییەتو لەربووبییەت دا تاكو تەنهاو فەردی موطلەقە.

﴿يُرِيدُونَ أَنْ يُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ﴾ ئەو کافرو موشریکانە دەیانەوێ بەو بیرو بۆچوونە شێواوو پوچەی خۆیان نوری ئیسلام بکوژێننەوە، هەوڵ دەدەن ئەو ئایینەی پێغەمبەری ئێمە موحەممەد هێناویەتی لەناوی بەرن، بڵێسەی حەقو چرای هیدایەت بکوژێننەوە، بۆ ئەوەی هەموو ئادەمیزاد گومڕابن. ﴿وَيَأْبَى اللَّهُ إِلاَّ

أَنْ يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ پەروەردگاریش هەرگیز نـاهێڵێ مرادیـان بێتـەجێ‌و هەر دەیەوێ روناکایی ئـایینی خـۆی تـەواو درەخـشان بکـاو بـەدونیادا بڵاوبێتـەوە. هەرچـەندە کافرەکـان پێـشیان نـاخۆش بـی‌و بـەزیاد بـوون‌و بڵاوبوونـەوەی ئـایینی ئیـسلام تەنگـەتاو بـبن، خـودا هـەر ئـایینی خـۆی سـەردەخاو یارمـەتی پێغەمبـەری خۆی دەدا.

جولەکەکان لەسەرەتای ئیـسلام دا لەهـەموو کـەس زیـاتر دژی ئیـسلام بـوون، ئەوان لەدژایەتیکردنی پێغەمبەرو موسـوڵمانان دا وەکـوو موشـریکەکانی عـەرەب وا بوون..

جـا کـە نـەیانتوانی بەپاڵپـشتی موشـریکەکان نـووری ئیـسلام بکوژێننـەوە، ئەمجار هەوڵیان دا لەرێگەی دووبەرەکی دروستکردن‌و، فیتنە نانەوە نووری ئیسلام خەفە بکەن، وەکوو ئەو فیتنەو ئاشووبەی عەبـدوڵڵای کـوڕی سـەبەء بـەرپای کـرد، بناغەی لایەنگری شیعەگەری بۆ ئیمام عەلی داهێنا، زێدە رەوی‌و غولوی تێدا بەکار هێنا، دووبەرەکی خستە ناو موسوڵمانانەوە، ئەمجار ئاگری فیتنـەیی نێـوان ئیمـامی عەلی‌و معاوییەی خۆش کرد، بەو ئاگرە شوومە دەیانهەزار شۆڕە سواری موسوڵمانان لەناوچوون، کارگەیشتە ئەوەی لەسەرتاپای عالـەمی ئیـسلامی دا دووبـەرەکی پەیـدا ببی‌و ئەو هەموو روداوە سامناکانەی مێژوو کـە لـەناو شیعەو سـوننەدا رویـان داوە بێنە کایەوە.

رومای مەسیحیش لەلایەن خۆیانەوە چییان بۆ کـرا دژی ئیـسلام تەقـصیریان نەکرد، هەر کە نووری ئیسلام روناکایی بەخش کـرد، ئـەوان هەڵمـەتی نامەردانـەی خۆیان دژی موسوڵمانان دەست پێ کـرد، پاشـان ئـەوروپای مەسـیحی بـەردەوام بـوو لەدەستدرێژیکردن بۆ سەر وڵاتی ئیسلام‌و پەلاماردانی موسـوڵمانان، ئـەمجار نـۆرەی شـەڕی خاچپەرسـتەکان هاتـە پێـشەوە کـە ئـەو پـەڕی درنـدەیی‌و هێرشـی قەلاچۆکەریان هێنایە سەر موسوڵمانان، لەوساوەو ئێستاشی لەگەڵ دا بـێ لەرێگـەی سیاسـەتی ئیـستیعماری‌و رۆژهەڵاتناسـی‌و چـەند بروبیـانووی ژەهـراوی تـرەوە جۆرەهـا پیلانـی دووبـەرکی نانـەوەو دروسـتکردنی شـەڕو جـەنگی خوێنـاوی لـەناو موسوڵمانان دا بەرپادەبن‌و پەرەدەسێنن، هەمیـشە لـە هـەوڵی کوژانـدنـەوەی چـرای

درەخشانی ئیسلامن‌و بەبێ ماندو بوون لەو بوارەدا پیلان‌و نەخشەی خۆیان ئەنجام دەدەن، هەرچی هێزو توانای هەیانە خستویانەتە گەڕ بۆ ئەم مەبەستەو ساتە وەختێك فەرامۆشی ناکەن‌و بەگیان‌و بەماڵ لەپێناوی دا تێدەکۆشن!!

با جارێکی تریش بەمێژوو دا بگەڕێینەوە دواوە بزانین جولەکەو مەسیحی چییان بەسەر موسوڵمانان هێناوە. لەم بارەوە مامۆستا سەیید قوطب دەفەرموێ: لەپێش هاتنی ئیسلام دا شەڕو دوژمنایەتی نێوان رۆم‌و فارس چەند سەدەیەك بوو بەردەوام بوو هەمیشە نێوانی ئەم دوو ئیمپڕاتۆریەتە جەنگ‌و کوشتار بوو، جۆگەی خوێنی لێ دەڕۆیشت‌و ئاگری شەڕو فیتنەیی نێوانیان نەدەکوژایەوە. کە ئایینی ئیسلام لەنیوە دوورگەی عەرەب دا سەری هەڵدا کەنیشتە هەستی بەخەتەری ئەم ئایینە حەقە کرد، زانی زەرەری بۆ پەزەکانی دەبێ، دیارە فارسەکانیش هەمان ترسیان لێ نیشت، ئەوەبوو: فارس‌و رۆم دوژمنایەتی‌و کێشەو شەڕو هەرای خوێناوی کۆن‌و تازەی خۆیان لەبیر خۆبردەوە بۆ ئەوەی بتوانن بەرەنگاری ئایینی تازە بکەن‌و نەهێڵن ئیسلام پەل بهاوێ.

ئەوەبوو: رۆمەکان لەگەڵ غەساسینە ئالقە لەگوێکانیان لەشیمالەوە خۆیان کۆکردەوە بۆ ئەوەی پەلاماری موسوڵمانەکان بدەن، ئەمەش دوای ئەوەی کە رۆمەکان پیاوی راسپاردەو نێردراوی پێغەمبەریان بەنامەردانە شەهید کرد کە ناوی (الحارث)ی کوڕی عومەیری ئوزدی بوو. موسوڵمانان ئەمان‌و پارێزگارییان بۆ راسپاردەی ڕۆمەکان دابین دەکرد ئەگەر پیاوێکیان بەراسپاردەیی بهاتایە، نامەی بهێنایە یان کارێکی لەم جۆرەی ببوایە بەئەمان‌و زامان دەگەڕایەوە. بەڵام رۆمەکان غەدریان کردو بەناحەق راسپاردەی پێغەمبەریان شەهید کرد، ئەمە وای لەپێغەمبەر (ﷺ) کرد کەسوپایەکی سێ هەزار کەسی بەسەر کردایەتی سێ فەرماندە شەهیدەکان (زەیدی کوڕی حاریثە، جەعفەری کوڕی ئەبو طالب، عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە) ئاراستە کردن‌و لەمانگی جیمادی یەکەمی ساڵی هەشتەمی کۆچی غەزای مۆتەی لێ پەیدابوو. ئەوە بوو ئەو جەنگە نابەرامبەریە سامناکە بەرپابوو. ریوایەتی مێژوویی هەیە دەڵێ ژمارەی سوپای رۆمەکان (١٠٠) سەد هەزار کەس بوو سەد هەزار کەسی تریشیان لەئالقە لەگوێ‌و نۆکەرانیان لەشام

کە لەهۆزە عەرەبە مەسیحییەکان بوون رەگەڵ کەوت، سوپای موسوڵمانانیش لەسێ هەزار کەس تێپەڕی نەدەکرد. ئەمجار غەزای تەبووك روی دا کە زوربەی ئەم سورەتە لەو تەوەرەدا دەسورێتەوە، لەشوێنی خۆی دا بەدرێژی باسی لێوە دەکەین.

ئەمجار ئامادە کردنی سوپای ئوسامەی کوڕی زەید کە پێغەمبەر (ﷺ) ئامادەی کردو هێشتا سوپا بەڕێ نەکەوت پێغەمبەر وەفاتی فەرموو، پاشان حەزرەتی ئەبو بەکر (ﷺ) رەوانەی کردو بەرەو شام ناردی بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەو لەشکر کێشییەی رۆمەکان کە لەو هەرێمە ئەنجامیان دابوو دەیانەویست قەلاچووی موسوڵمانانو ئایینەکەیان بکەن.

ئیتر مەنجەڵی رقو کینەی خاچپەرستان وەکوڵ هات، هەر لەغەزای یەرمووکەوە کە موسوڵمانان تێیدا سەرکەوتنیان بەدەست هێناو بەشوێن ئەوەدا سوپای ئیسلام پەلو پۆی هاویشتو گەلێ موستەعمەرەی ئیمپراتۆری رۆمیان لەوڵاتی شامو میصرو شیمالی ئەفریقاو دورگەکانی دەریای سپی ناوەراست رزگار کردو ئیسلامیان تێدا بلاوکردەوە. ئەمجار بنکەی هەرەگرنگی ئیسلامیان لەوڵاتی ئەندەلووس دامەزران.

بێگومان شەڕی خاچپەرستەکان کە لەمێژوو دا بەم ناوە بەناوبانگە، یەکەم جەنگو دوا جەنگ نیە کە کەنیشتە دژی ئیسلام ئەنجامی دابێ، بەڵکوو ئەم شەڕانە زۆر پێش ئەم مێژووە بەناوی جیا جیاوە ئەنجام دراون، لەراستی دا شەڕی خاچپەرستان لەو رۆژەوە دەستی پێکرد کە رۆمانو فورس دوژمنایەتی خۆیان وەلاناو دەستیان کرد بەیارمەتیدانی یەکتری دژی موسوڵمانان لەخواروی نیوە دورگەی عەرەبەدا، ئەمجار لەغەزای موتەو دوایی لەغەزای یەرمووك، پاشان بەتەواوی قینو خەشمی خاچپەرستان دژی موسوڵمانان لەهێرشی خوێناوییان دا بۆ سەر ئەندەلووس دەرکەوت، ئەو دڕندەییو کۆکوژییەی دژی موسوڵمانانی ئەو ناوچەیە ئەنجام درا بۆوەتە لاپەڕەیەکی رەشی ئەفرین لێکراو لەمێژووی مرۆڤایەتی دا، خاچپەرستان لەو هێرشە وەحشیو خوێناوییەیان دا بۆ سەر ئەو بنکە ئیسلامییە گرنگەی ئەوروپا هێند بەدڕندەییو نامرۆڤانە جولانەوە مێژوویان شەرمەزار کردو لەوە پێش رووداوی وا نامرۆڤانەی بەخۆوە نەبینیوە.

بەملیۆن موسوڵمان کوژرانو تەعذیب درانو لەناو بران کە قەڵەم لەنووسینو شیکردنەوەی ئەو روداوە سامناکانە کولەو کۆڵەوارەو (بەکوردی باسی ئایەتە گوفتار) ئەوەی لەرۆژهەڵاتیش دا روی دا، ئەو تاوانو قەتڵو عامەی خاچپەرشتان دژی موسوڵمانان لەو هەرێمە ئەنجامیان دا لەهی ئەندەلووس کەمتر نەبوون.

جۆستاف لۆبون کە بۆخۆی نووسەرێکی فەرەنسیو مەسیحییە دەڵێ: یەکەم شت کە ریکاردۆسی ئینگلیزی ئەنجامی دا ئەوە بوو: کە لەبەردەم مەعەسکەرێکی موسوڵمانان دا سێ هەزار موسوڵمانی کوشتن کە خۆیان بەدەستەوە دابوو، ئامانو زەمانو پەیمانو وەعدیان پێ درابوو کە خوێنیان پارێزراوە ئەمجار دوای کوشتنی ئەم سێ هەزار کەسە، دەستی کرد بەکوشتنو برینو تالانکردنی موسوڵمانان بەجۆرێك کە هەر لەدەست خۆیان دیو لەخۆیان دەومشێتەوە.

نووسەرێکی تری مەسیحی کە ناوی (یۆرجا)یە دەڵێ خاچپەرستەکان بەدرندەترین شێوە دەستیان بەهێرش بردن بۆ سەر بەیتولمقدیس کرد، ئەمجار دەڵێ: ئەم هێرشبەرانە ئەوپەری درندەییان بەکار هێنا، دەهاتن ورگو ریخۆڵەی خەڵکیان هەڵدەدرین بۆ ئەوەی لەناو ریخۆڵەکانیان دا دینارو دیرهەم بدۆزنەوە!!!! کەچی صەلاحەددین کە قودسی لێ ستاندنەوە، خاچپەرستەکانی بەرەڵلا کردو ئەمانی پێدان، هەموو وادەو بەڵێنێکی کە پێی دا بوون جێ بەجێی کرد، تەنانەت مەلیك عادل کە برای صەلاحەددین بوو هەزار کۆیلەی بەدیل گیراوی بەرەڵلا کرد، هەموو ئەرمەنەکانی عەفوو کردن، رێگەی دا بطریك صەلیبو نیشانی کەنیسە هەڵبگرێ، رێگەی دا بەشا ژنو شابانوەکانیان دیدەنی مێردەکانیان بکەن!

باسی دەستدرێژی خاچپەرستەکان بۆ سەر موسوڵمانان بەکۆتا نایەو چەندی لەسەر بنووسرێ پۆشکە بژاردنە لەکایە، ئیتر لێرەدا ماوەی ئەوەمان نیە زیاتر لەسەری برۆینو باسی لێوە بکەین، کەسێك لەمە زیاتری گەرەکە با بگەرێتەوە بۆ ئەو سەرچاوانەی لەم بارەوە درێژەیان پێ داوە!

ئەوەی کە لەم رۆژگارە تازەی چەرخی بیستەم لە(زنجبار) روی دا پێچێکی لەبەرروداوەکانی پێشوودا نەبوو، ئەوە بوو: هەرچی موسوڵمان هەبوو لەو ناوچەیە

دا بنـەبڕ کـران، دوازده هـەزار کەسـیان بەیەکـەوه لێ کـوژرا، چـوار هـەزار کەسـیان مابوو لە دورگە وەدەرنـرانو فڕێدرانە ناو دەریاوە.

لەدوورگەی قوبروصیش ئاو وخۆراك لەو شوێنانە مـەنع کـرا کـە موسـوڵمانی لێ نیشتەجێ بوون بۆ ئەوەی لەبرسانو لەتینوان گیانیان دەرچێ، ئەمـە جگـە لـەو کوشتـو بڕیەی بەسەریان هێنـان، ئـەو دەرکـردنو مـاڵوێرانیو تـاڵانو بڕۆیـەی دژی موسوڵمانەکان ئەنجام درا لەنووسین نایەو ناخرێتە ناو روپەڕی کتێبەوە.

بەکوردیو بەپوختی ئەم هەویرە ئـاو زۆر دەبـاو لەهـەر ئاقارێـك پـێ داگـرێ هەمان تاسـو حەمامـە!! کوردسـتانی خۆشمـان لـەم بـارەوە کـەمی نـەدیوەو کـەمتری بەسەر نەهاتووە، سەرباری دابەشکردنی وڵاتەکەی بەسەر دراوسێکانی داو دابڕینـی ئـەم بەشـەی لەبەشـەکەی تـری جۆرەهـا شـاڵاوی کۆکـوژیو قەڵاچـۆکردنو خـاپور کردنــی بەســەر هێنــراوە، جۆرەهــا چــەکی کیمیــاوی بایــەلۆجیو دەمــارگرژیو تەنگەنەفەسـی تێـدا تـاقی کرایـەوە، سـەدو هەشـتاو دوهـەزار کـوردی موسـوڵمانی گونـدنشینی بێ دەسەڵاتـو پـرو پیرەژنو زارۆکـو منداڵی بێ تاوان بەناوی ئەنفالـەوە بێ سەرو شوێن کرانو کەس نازانێ چییان بەسـەر هـات، (لەسـاڵی ١٩٧٥ەوە بـۆ سـاڵی ١٩٨٨) کوردستانی رازاوەو بەهەشت ئاسا، سەرلەبەری خـاپوور کـرا، کانیـاوو جۆگـەو جۆباری تەقێنـدرانەوەو کوێر کرانەوە، باخو باخاتی سوتێندراو هەڵپاچو داپاچ کـرا، چوار هـەزارو پێنجسەد گونـدو شـارو شارۆچـکەی ژێـرو زەبـەرکرا، ئـەوەی بەسـەر کوردستانو موسوڵمانانی کورد هات لـەم ماوەیـەدا هـەر بەسـەر کوردسـتانو کـوردی موسوڵمان هاتووەو کەسی تر بەو دەردە نەبراوە.

بـەڵام وەکـوو دەڵێن تەنگانـە بـەریان کورتـەو دوای شـەوە زەنـگ ڕۆژهەڵاتـە سوپاس بۆ خودا لەدوای ساڵی(١٩٩١ز)وە وا وردە وردە کوردسـتان ئـاهی تێکەرایـەوەو گوندو شارو شارۆچکەی ئاوەدانییان بەخۆیانەوە بینییـەوە. ئەگـەر شـەڕی نـەفرین لێکـراوی براکـوژی نێـوان حیزبـە سیاسـیەکانی نەبوایـە، لەماوەیـەکی زۆر کـەم دا زوربـەی برینـەکانی گوشـتەوەزونیان دەهێنایـەوەو سارێژ دەبوونـەوە، بـەڵام شـەڕە کورسیو شەڕە گیرفان بوون بەکۆسپێکی تـرو وا زیـاد لەچوار سـاڵە (١٩٩٤ بـۆ ١٩٩٨) کـورد کـورد دەکـوژێ، مـاڵی یـەکتر تـاڵان دەکـەن بۆخۆیـان دژی خۆیـان لاسـای

داگیرکەران دەکەنەوەو لەوانیشیان تێپەڕاندوە، زۆر جۆری تەعذیبو داپڵووسین هەیە، دوژمن ڕوی نەدەهات ئەنجامی بدا ئەمان بەڕاشکاویو بەناوی کوردایەتیەوە شانیان بەرداوە (ئەڵلا بەرەکەت!!)

ئەمەی من دەیڵێم ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرەو دونیا شاهیدە، هەموو کوردێکی ڕۆشنبیرو بەشەرەفو خاوەن ویژدان لەداخان خەریکە شەق بەرێ، بۆ خۆشیان هەستیان بەخیانەتی خۆیان کردوەو دەزانن چ کارەساتێکیان بەسەر میللەت هێناوە بەڵام کێشەکە هێندە قوڵو نالەبارە نازانن چۆنی لێ رزگار بن. کورسی خۆشەویستیو پولو پارەی کوردستانیش زۆر زەبەندەو ئەوەیان بەخۆیانەوە نەدیوە، دڵیان نایە دەستی لێ بەردەن..

ئاخ براکوژی ئاخ شەڕە گیرفان، لەعنەت لەوانەی کە هەڵیان گیرسان!!

ئەمجار پەروەردگار شێوەی تەواو کردنی نووری ئیسلام ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە پێغەمبەری خۆی کە موحەممەدە، ناردویە بۆ سەر هەموو ئادەمیزاد بە هیدایەتو بەڵگەو نیشانەوە. ئاینێکی حەقی پیادا رەوانە کردوە، کە هەتا دەونیا دونیایە نەسخ نابێتەوە، گۆڕانی بەسەردا نایە، هیچ ئاینێکی تر هەڵی ناوەشێنێتەوە، هەر هەواڵێکی تێدایە ڕاستو دروستە، بیرو باوەڕی صەحیحو زانیاری بەسودی لە خۆ گرتووە، ئاینێکە هەموو کردەوەکانی کە تێیدا ئەنجام دەدرێن کردەوەی باشو بە سوودن بۆ دونیاو قیامەت..

ئەمجار پەروەردگار مەبەستی ناردنی پێغەمبەر ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ﴾ بۆ ئەوەی ئەم ئایینە بێ خەوشە: کە ئایینی ئیسلامە، بەرزی بکاتەوەو سەری بخا بەسەر هەموو ئایینەکانی تردا بەهۆی بەڵگەو بورهانی جۆراو جۆرەوە، بەهۆی ئەو زانیاریو زانستەی لەخۆی گرتووە، بیکاتە ئایینێکی باڵادەستی خاوەن دەسەڵاتی ماددی مەعنەوی. ئاشکراشە هیچ ئایینێك وەکوو ئیسلام کاریگەری گیانیو عەقڵیو ماددیو کۆمەڵایەتیو رامیاری لەسەر ئادەمیزاد نەبوەو نابێ. تاکە ئایینێکە کە بەکەڵکی هەموو سەردەمو کاتو شوێنێك دێ.. بۆ

هەموو کۆمەڵگاو نەتەوەیەك لەبارو گونجاوە.. لەموسنەدی ئەحمەددا لەعەدی کوڕی حاتەمەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ لەپێغەمبەرم ژنەوت: دەیفەرموو: (فوالذي نفسي بيده ليُتمنَّ الله هذا الدين حتى تخرج الظعينة من الحيرة، حتى تطوف بالبيت من غير جوار أحد، ولتفتحَنّ كنوز كسرى بن هرمز قلت: كسرى بن هرمز؟ قال: نعم كسرى بن هرمز، وليُبذلن المال حتى لا يقبله أحد).

## شێوەو چۆنیەتی مامەڵە کردنی مالمو قەشەکان لەگەڵ خەڵكدا

﴿ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلۡأَحۡبَارِ وَٱلرُّهۡبَانِ لَيَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۗ وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٣٤﴾ يَوۡمَ يُحۡمَىٰ عَلَيۡهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكۡوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمۡ وَجُنُوبُهُمۡ وَظُهُورُهُمۡۖ هَٰذَا مَا كَنَزۡتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡنِزُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ كَثِيراً...﴾ وەکوو ئیمامی واحیدی دەڵێ: لەشانی زانایانو خوێندەوارنی خاوەن نامەکان هاتۆتە خوارێ کە بەرتیلو باجیان لەرەشە خەڵکەکە وەردەگرتو دەیانچەوسانجنەوە.

دەربارەی ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ....﴾ ئیمامی بوخاری لەزەیدی کوڕی وەهەب، دەگێڕێتەوە: کە دەڵێ بەلای (رەبذە)دا تێپەڕیم (شوێنێکە لەنزیك

مەدینە) لەنکاو چاوم بەئەبو زەڕ کەوت، وتم: چی تۆی هێناوەتە ئێرە؟ وتی: لەشام بووم، لەگەڵ معاوییە دا دەربارەی ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ...﴾ بوو بەکێشەمان معاوییە وتی: لەشانی خاوەن نامەکان دا هاتۆتە خوارێ، منیش وتم دەربارەی ئێمەو ئەوان هاتۆتە خوارێ، قسەمان لێک هەڵبەزینەوەو نامەی لێ نووسیوم بۆ لای خەلیفەی موسوڵمانان؛ عوسمانی کوڕی عەففانو شکاتی لێ کردوم، خەلیفەش لەدوی ناردم بێمە مەدینە بۆ خزمەتی، هاتم، خەڵکم لێ کۆبووەوە، وەکوو ئەوە لەوەپێش نەیان بینیبێتم، کە هاتم روداوەکەم بۆ عوسمان گێڕاوە، ئەویش فەرمووی: ئارەزۆت لێیە واز لەشام بێنەو وەرە نزیک مەدینە، ئەوە ئەو فەرمانی پێ کردوم لێرە دەوام بکەم، ئەمن پابەندی فەرمانم، تەنانەت ئەگەر کۆیلەیەکی قولەرەشیش فەرمانڕەوام بیو فەرمانم پێ بکا، من گەردنکەچی دەبمو لەقسەی دەرناچم!!

جا کە لەوەپێش پەروەردگار وەصفی سەرۆکو مالەو قەشەکانی کرد بەوە: کە لوتبەرزو خۆبەزلزانن و لافی خودایەتی لێ دەدەن، مافی یاسادانان (کە بەس هی خودایە) دەیدەن بەخۆیانو شت حەڵاڵو حەرام دەکەن. ئەمجار لەم ئایەتانە دا بەوە وەصفیان دەکا کە چاو چنووکو بەهەڵپەن بۆ کردنەوەی ماڵو سامان لەرەشە خەڵکەکە، ئەوان بەتەماعو سوورن لەسەر وەرگرتنی ماڵی خەڵک بەناڕەواو بەشێوەی دەسبڕینو هەڵخەڵەتاندنیان، کە بەرەنگاری ئایینی ئیسلامیش دەکەن، ترسی لەدەستدانی بەرژەوەندییە ماددیەکانیا هەیەو دەترسن دونیا خۆرییان بۆ نەکرێ، ئەوان ئایین دەکەنە پرد بۆ گەیشتن بەدونیا. تا بڵێی بەخیلو چاو چنۆکن، حەزیان لەکۆکۆدنەوەی ماڵو نەقدینەیە لەقاسەکانیان دا هەڵی بگرنو زەکاتی لێ دەرنەکەن.

ئەم ئایەتە ڕونکردنەوەو شیکردنەوەی هەڵسوکەوتی مالەکانی جولەکەو رەبەنەکانی مەسیحییە، پەردە لەسەر تاوانو کردارە خراپەکانیان هەڵدەداتەوە بۆ ئەوەی خاوەن نامەکان خۆیان هەڵەو تاوانی ئەحبارو روهبانەکانیان بۆ دەربکەوێ، هەروەها بۆ ئەوەی موسوڵمانان هۆی سوور بوونی ئەم مالەو قەشانە لەسەر کوفرو بێدینی بزانن، لەهەمان کات دا ئایەتەکان هەڕەشەو ترس بەرنانی موسوڵمانانە کە

نەچن لەکردارو گوفتاردا چاو لەئەو مالەو قەشەقەشانە بکەنو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ كَثِيراً مِنْ الأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بەتاکو تەنهایی خوداو بەپێغەمبەرایەتی موحەممەد هەیە، دڵنیابنو باش بزانن: کە زۆر لەمالەو قەشەکانی خاوەن نامەکان بەناحەقو ناڕەوا ماڵو سامانی خەڵك دەخۆن، هیچ ڕێبازێکی شەرعیو ئایینیان بەدەستەوە نیە، بەڵکوو بەهەوانتەو بەئارەزۆبازی خۆیان ئەو خەڵکە دەسخەڕۆ دەکەنو هەڵیان دەخەڵەتێننو دەستیان دەبڕن. ئایەتەکە ئەو دەسخەڕۆ کردنو ماڵ خواردنەی پاڵ زوربەیانی دا بۆ هەموانی نەچەسپاند، چونکە کەمینەیەکیان خۆیان لەو کارە ناشرینە دەپاراست.

نمونەی ماڵ خواردنیان بەناڕەواو بەهەوانتە زۆرو هەمە جۆر بوو، وەکوو: بەرتیل وەرگرتن لەبواری ئەنجامدانی بڕیاری یاساییو شەرعی. سوود خواردن کە لێیان حەرام کرابوو، وەرگرتنی دیاریو فۆتوۆ ماڵو سامانی ئەو مەوقوفانەی تایبەت کرابوون بەئارامگای پێغەمبەرانو پیاوچاکانی پێشوویان، هەروەها لەسەدەکانی ناوەڕاست دا ئەرثوذکسەکانو کاثۆلیکەکانیان چەکی غوفرانیان دەدا بەخەڵکو بەپارە پێیان دەفرۆشتن، یان لەباتی دوعاو پاڕانەوە لەپەروەردگار بۆ تاوانباران پارەو پوولیان وەردەگرت. یان بەپارە فتوای جۆراو جۆریان دەردەکرد، حەرامیان حەلاڵ دەکردو، حەلاڵیان حەرام دەکرد، ئەمەش بۆ ڕازیکردنی ساماندارو پاشاو سەرۆکو حاکمەکانیان، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەرحەق بەجولەکەکان دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَى نُوراً وَهُدًى لِّلنَّاسِ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيراً وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُواْ أَنتُمْ وَلاَ آبَاؤُكُمْ قُلِ اللّهُ﴾ (الأنعام: ٩١).

نموونەیەکی تر لەبەڕەوا زانینی ماڵخواردنی خەڵك بەناڕەوا، ئەوەیە: جوولەکە بەلایانەوە ڕەوایە، ماڵ لەغەیری خۆیان وەدەست بێنن تەنانەت ئەگەر بەڕێگای خیانەتو دزیش بێ، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لاَّ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ إِلاَّ مَا

دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِماً ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ لَيْسَ عَلَيْنَا فِي الأُمِّيِّينَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى اللّهِ الْكَـذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ آل‌عمران:٧٥)

ئەمجار پـەروەردگار جۆرێکی تـر لەخراپـەکاری سـەرانی جولەکـەو مەسـیحی دیاری دەکا ئەویش بریتییە لەوەی کە ﴿وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللّهِ﴾ خـەڵکی لـەڕێبازی خودا لادەدەنو ناهێڵن کەسانی دیکە موسوڵمان ببن، واتـە: ئەوانـە وێـڕای خـواردنی ماڵو سامانی بۆرە پیاوو مسکێنەکان، ناشیان هێڵن موسوڵمان بنو مـەنعیان دەکـەن لەرێبازی حەقو راست، جا یان پەیامی ئیسلام رەتدەکەنەوەو بەدرۆی دەزانـن، یـان شكو گومان دەخەنە ناو بنەماو حوکمەکانی ئایینەوە لەبواری عەقیدەو عیبـادەتو مامەڵەو ئەحکامـەکانی تـری شـەرعو بیـرو بـاوەڕ دا ئـاڵو گـۆڕ دەکـەن، یـان تانـەو تەشەر لەخودی پێغەمبەر دەدەنو قورئان بەدرۆ دەزانن.

بەکورتی ئەوەی خەڵك هەوڵی بۆ دەدەن لەدونیا دا ماڵو سامانو پلەو پایـەی دونیاییە، ماڵو قەشەکان لەهەموو کەس زیاتر هەڵپەی بۆ دەکەنو سـوورن لەسـەر وەدەسـت هێنـانی. ئـەوەتا بـەناڕەوا مـاڵی خـەڵك دەخـۆن، مـەنعی خـەڵك دەکـەن لەناسـینی خـودا، نـاهێڵن ئادەمیزادەکـان بەراسـتی خـودا ناسـی بکـەن، عیبـادەتو بەندایـەتی بـۆ ئـەنجام بـدەن، بەتـەواوی لێ بـڕاون کـە خـەڵکی لەشـوێنکەوتنی پێغەمبـەر بگێڕنـەوە. بـۆ ئـەوەی شـوێنو پلـەو پایـەی خۆیـان لەدەسـت نـەدەن، مەکسەبە ماددییەکانیان لەکیس نەچن.

ناشیرین تـرین هەڵوێـستیانو گـەورەترین تاوانیـان ئەوەیـە کـە تانـەو تەشـەر ئاڕاستەی خودی پێغەمبەر خۆیو قورئانی پیرۆز دەکەن، هـەروا لەقوتابخانـەکان دا بـیرو بـاوەڕی گـەنجو لاوەکانمـان تێـك دەدەن.! سـەرباری ئـەو هـەموو رەوشـتە ناشـیرینانەیان بـەخیلو چاوچـنووکو پیـسکەو رەزیلیـشن، حـەقی خـودا لـەماڵو سامانی خۆیان دەرناکەن، دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِـزُونَ الـذَّهَبَ وَالْفِـضَّةَ﴾ ئەوانـەی ماڵو سامان کۆدەکەنەوە، پارەو پولو زێـڕو زیـو سـەفتە دەکـەنو دەیخەنـە قاسـەو گەنجینەوە ﴿وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ زەکاتی شەرعی دەرناکەن، لەپێناو ئایین دا ماڵ نابەخشن بۆ بەرژەوەندی گشتیو تایبـەتی موسـوڵمانان، یارمـەتی لێقـەوماوان

نادەن، جا ئەوانی کە ئەمە هەڵوێستو رەوشتیانە خاوەن نامەو مالەو فەشە بن، یان مەلاو حاجیو موسوڵمان بن، ئەوە ﴿فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ مژدەیان بدەرێ بەسزای کوشندەو بەئێش لەناو ئاگری دۆزەخ دا. ئەم هەڕەشەیە وەکوو رو دەکاتە خاوەن نامەکانو ئاراستەی مالەو فەشەکان کراوە، لەهەمان کات دا موسوڵمانانیش دەگرێتەوە. واتە: هەر کەسێك زێڕو زیو کۆبکاتەوەو سەریەکی بنیو زەکاتی شەرعیو مافی هەژارانی لێ نەدا بەئاگری دۆزەخ سزا دەدریو تۆڵەی لێ دەستێندرێ. هەر ماڵو سامانێك زەکاتی شەرعی لێ دەربکرێ، خاوەنەکەی بەماڵ خەزنکەر حلێب ناگرێ، مالیكو شافیعی لەئیبنو عومەرەوە ریوایەت دەکەن کە فەرموویەتی هەرماڵێك زەکاتی لێ بدرێ بەخەزنکردن حسێب ناکرێ بالەژێر حەوت تەبەقەی زەویشەوە بێ، هەر ماڵێکیش زەکاتی لێ نەدرێ ئەوە خزنکردنە با ماڵەکە ئاشکراوە بەدەرەوەش بێ، هەروەها ئیبنو عەدیو خەطیب لەجابیرەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (أي مال أديت زكاته فليس بكنز).

ئیبنو ئەبی شەیبەو ئەبو داودو حاکم لەئیبنو عەباسەوە ریوایەت دەکەن، دەڵێ: کە ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ﴾ هاتە خوارێ، لەسەرشانیان گران بوو، وتیان: کێ لەئێمە دەتوانێ کە ماڵو سامان بۆ منداڵەکانی پاشەکەوت نەکا؟ حەزرەتی عومەر (ﷺ) فەرمووی: پەلەمەکەن ئێستا بۆتان شی دەکەمەوە. ئیتر بەرەو ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) کەوتە رێ، ثەوبان شوێنی کەوت، عومەر هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! مانای ئەم ئایەتە زۆر قورسە لەسەرشانی هاوەڵان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خودا بۆیە زەکاتی داناوە بۆ ئەوەی ئەو ماڵەی دەمێنێتەوە پاکی بکاتەوە، میراتیشی لەو ماڵە دا داناوە کە لەدواتان بەجێ دەمێنێ، ئیتر حەزرەتی عومەر لەخۆشیان (ئەڵلاهو ئەکبەری کرد) ئەمجار پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەرێ پێتان نەڵێم چ شتێك باشترین پەزمەندیە؟ باشترین شت کە پیاو بیخاتە گەنجینەی خۆیەوە ئافرەتی صالیحەیە، کە پیاو سەیری بکا دڵی خۆش بکا، کە فەرمانی پێ بکا بەقسەی بکا، ئەگەر لەماڵ نەبوو ناموسی بپارێزێ.

ئەمجار پەروەردگار جۆری سزای سامناکی ئەو سامان خەرنکەرو زەکات نەدەرانە شی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ﴾ ئەی موحەممەد! هەواڵیان بدەرێ بەسزایەکی بەئێشی سامناك کە تووشیان دەبێ لەو رۆژە دا کە ئەو زەکات نەدەرە سوور دەکرێتەوە لەناو ئاگری دۆزەخ دا لەسەر ئەو ماڵو سامانەی کۆی کردۆتەوەو زەکاتی لێ نەداوە، واتە: ماڵو سامانەکەی دادەنرێو ئاگری گەرمی لەسەر دەکرێتەوە ئەویش وەکوو ئاگرەکەی لێ دێ.

چۆنییەتی ئەم سوور کردنەوەو، گێڕانی ماڵو سامانەکە بەئاگر، کاروبارێکی قیامەتیەو نهێنیو غەیبە، ئێمە چۆنیەتیو دیاردەکانی نازانین، وا باشە حەواڵەی عیلمی خودای بکەین.

موسلیم لەئەبو هورەیرەوە فەرموودەیەکی بەمەرفووعی ریوایەت کردوە دەفەرموێ: (هەر پیاوێك زەکاتی ماڵو سامانی نەدا، رۆژی قیامەت ئەو ماڵو سامانەی بۆ دەکرێ بەپلێتی ئاگرینو لاتەنیشتو چاوو پشتی پێ داخ دەکرێ). هەر لەئەبو هورەیرەوە فەرموودەیەکی تر گێردراوەتەوە دەفەرموێ: (کەسێك خودا ماڵو سامانێکی بداتیو زەکاتی لێ نەدا ماڵو سامانەکەی بۆ دەکرێتە نێرە مارێکی کەچەڵ دوو خاڵی رەشی بەپشت دوو چاویەوەیە، رۆژی قیامەت خۆی تێ باهەڵدەدا، هەردوو بناگوێی دەگریو دەڵێ من ماڵو سامانەکەی تۆم، من گەنجو خەزینەکەتم، ئەمجار ئایەتی ﴿سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ (آل‌عمران: ١٨٠)ی خوێندەوە ماڵو سامانەکەیان بۆ دەکرێتە پلێتی ئاگرو ﴿فَتُكْوَى بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ﴾ روخسارو لاتەنیشتو پشتیان بەو پلێتە ئاگرینانە داخ دەکرێ. کە بەتایبەتی باسی ئەو ئەندامانەی جەستە دەکا: چونکە ئەوان لەدونیادا بەروخسار پێشوازی لەخەڵك دەکەنو نیشانەی کەیف خۆشییەکەیان بەدەمو چاوەوە دیارە، بەروخسار خۆیان گرژ دەکەن کە داوای هەژاران رەتدەکەنەوەو نائومێدیان دەکەن، کە لەناو نازو نیعمەت دا دەتلێنەوە بەسەر تەنیشتو پشتیان دا تەپاتل دەدەن، لەلایەکی ترەوە داخکردنی دەمو چاو باشتر دیارەو ئەنگی ترە، لە پشتو لاتەنیشت قەبرغەیان بەئازارترە، ئەمجار لەلایەن فریشتانەوە کە بەرپرسن لەداخکردنیان پێیان دەگوترێ: ﴿هَذَا مَا كَنَزْتُمْ لأَنفُسِكُمْ

﴿فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ﴾ ئەمە ئەو ماڵو سامانەتانە كە بەخەیاڵی خۆتان بۆ سودو قازانجی خۆتان كۆتان كردبووە، ئەوا بوو بەهۆی زیانو سزادانتان. یان دەتوانین بڵێین: ئەو ئامێری داخكردنەتان كە پێی داخ دەكرێن ئەو ماڵو سامانەیە كۆتان كردبوەوە بۆ خۆشیو رابواردن!!

بێگومان ئاگری دۆزەخ زۆر لەئاگری دونیا گەرمترە داخكردنەكەش لەداخكردنی دونیا بەئێش ترە، ئەو داخانە بەهەر شوێنێك دابنرێن لەو دیوەوە دەرچێ!! بەراستی قورئان وێنەی داخكردنەكەی سەرنج راكێش كێشاوە، ئەوپەڕی ترسو سامناكی تێدا كۆكردۆتەوە، دەبوایە بەبیر لێ كردنەوەمو لێ وردبوونەوە چاو بەملۆق بوەستایەو مووی لەش گرژ بوونایەو پێست هەڵقرچایەو خەو لەچاوان بزڕایە! (دەی خودایە بۆ خاتری رەحمەتی بەرفراوانت دڵمان وا لێ بكەی زەكاتی ماڵو سامانمان دەربكەین، خودایە! لەو سزا سامناكە بمانپارێزەو لەهەموو سزایەكی ئەو رۆژەو ئاگری دۆزەخ پەنامان بدە... ئامین)

پێویستە سەرنجێكی ورد لەو خاوەن نامانە بدەین بزانین چییان بەسەر هات، بۆچیو چۆن لەئایینی حەق لایان داو گۆڕانارییان تێدا كرد، بەڵێ پێویستە باشباش ئەو خاوەن نامانە بناسینو رەوشتو ئاكاریان بەتەرازووی ئایین كێشانە بكەین، ناسینی ئەمان زۆر لەناسینی بتپەرستو موشریكەكان لەپێش ترە، چونكە خاوەن نامەكان لافی ئیمانداری لێ دەدەنو بەناوی ئایینەوە قسە دەكەن. ئەگەر بەباشی دەرنەخرێنو بەجەماوەر نەناسرێن، زۆر كەسیان پێ هەڵدەخەڵەتێ، بەخاوەن بڕواو ئایین حلێب بكرێن، هەرچەندە لەراستی دا ئەمانیش هاوبەش پەیداكەرنو هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن، هەیانە دەڵێ عیسا كوڕی خودایە، هەیانە دەڵێ عوزەیر كوڕی خودایە!

هەروەكوو چۆن زۆر كەسی بەتەسكەرە موسوڵمان لافی موسوڵمانێتی لێ دەدەن، بەناوی ئیسلامەوە قسە دەكەن، بەڵام لەراستی دا ئەم جۆرە موسوڵمانانەش وەكوو جولەكەو مەسیحییەكان لایانداوە، ئەمانیش فریان بەسەر ئیسلامەوە نەماوە، زۆر كەس هەیە خۆی بەموسوڵمانی خالص دادەنێ، بەرواڵەت ئەركەكانی ئیسلامەتی وەكوو نوێژو رۆژوو حەج جێ بەجێ دەكا، بەڵام وەعیی ئیسلامی نیە،

ئایینو سیاسەت لێك جیا دەكاتەوە، موسوڵمانیەتی بەشێكی شەخصی دەزانیو بەس! خۆ بەموسوڵمان دەزانیو لەحیزبێكی دژ بەئیسلام دا كادرو تێكۆشەرە، بیرو باوەڕێكی تری گرتۆتە ئەستۆی خۆیو بەیاساو قانوونێك رازییە كە دوژمنانی خودا دایاننــاوە! رازییە واز لەشەریعەت بێنیو حوكم بەقانوونی فەرەنسی بكا، بێدینان دەیانەوێ بزوتنەوەو رابوونی ئیسلامی لەناوبەرنو بەهەموو جۆرێك سوكایەتی بەموسوڵمانانو قورئان بكەن، گاڵتە بەبیرو باوەڕی خوداپەرستان بكەن، ئەم خۆ بەموسوڵمان زانانە چەپڵەیان بۆ لێ دەدەنو بگرە پارمەتییان دەدەن، كە هیچكە نەبێ بێ دەنگ دەبن!!

بەڵێ: ئەگەر موسوڵمانان ئاوا بێ دەنگ نەبوونایە بەرامبەر ئەوانەی قەلاچۆی موسوڵمانان دەكەن، ئەگەر وەعیی ئیسلامی لەدەرونیان دا بجۆشایەو چاویان لەپێغەمبەرو هاوەڵانی بكردایە كاریان بەم حاڵە نەدەگەیو ئاوا بەراشكاوی نۆكەرانی ماسوونیو صەهیونەتی جیهانی بەهەموو جۆرێكو لەهەموو ئاقارێك پەلاماری موسوڵمانانیان نەدەداو هەوڵی ریشەكێش كردنیان نەدەدان.

خەلافەتی عوسمانی كە بەناوی ئیسلامەوە حوكمی دەكرد لەئاخرو ئۆخریدا بەهۆی بێ وەعیی موسوڵمانانەوە وا گەندەڵ بوو، هێندە ناموسوڵمان بەناوی موسوڵمانەوە تێیدا بوونە كاربەدەست، ئەو ئیمپڕاتۆریەتە گەورەیە، هێندەی كە لەوەپێش دونیای هێنابوە عامێلكە، كۆمەڵێكی بەناو موسوڵمانی ناموسوڵمان روخاندیان! ئەتاتوركی كافر لەسەر تەلاری بێ گیانی خەلافەتی عوسمانیو ئیسلامی رژێمی كوفر ئاسای خۆی دامەزراند، كەچی لەبەر بێ ئاگاییو نەبوونی وەعیی ئیسلامی خەڵكەكە هەستیان بەخەتەری ئەم رژێمە عیلمانیە نەكرد، بەڵكوو دڵیان پێی خۆش بوو، تەنانەت پیاوی ئایینی وا هەبوو زۆر بەراشكاویو شانازییەوە چوونە نێو حیزبی (ئیتحادو تورەقییەوە)! لەریزی ئەو حیزبە شوومە دا كادرو تێكۆشەر بوون.

**تێبینی:**

ئایەتەکە گەلێ حوکمی لێ وەردەگیرێن: یەکێ لەو حوکمانە زەکاتی ماڵی نەقدینەیە (زێڕو زیو) بەمەرجێ چوار شت دەستەبەر بن تێیدا.

**یەکەم**: خاوەنەکە کۆیلە نەبێ، دەبێ ئازاد بێ، چونکە کۆیلە ئەهلیەتی ملکایەتی ناقیصە.

**دووەم**: دەبێ موسوڵمان بێ، چونکە زەکات بۆ پاکبوونەوەی ماڵو سامانە کافر ئەهلیەتی ئەوەی نیە.

**سێیەم**: دەبێ ساڵی بەسەردا هاتبێتەوە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرموودەیەك دا کە درەقوطنی لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەتی دەکا فەرموویەتی: (لیس في المال زكاة حتى يحول عليه الحول) تا ساڵ بەسەر ماڵو سامان دا وەرنەسوڕێتەوە زەکاتی تێناکەوێ.

**چوارەم**: دەبێ ماڵەکە بگاتە ئەندازەی (نیصاب) ئەو ئەندازەیەی شەرع دایناوە، ئەگەر زێڕ بوو دەبێ بگاتە بیست دیناری ئاڵتون واتە: بیست میثقاڵ ئاڵتون بێ.

ئەگەر زیوبوو دەبێ دووسەد دیرهەم بێ، یان بەهەردوکیان نیصابیان تەواو دەکرد، بەڵگە لەسەر ئەوە کە دەبێ ماڵەکە بگاتە حەد (نیصاب) ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە: کە ئەبو داوود لەئیمامی عەلیەوە ریوایەتی کردوە کە فەرموویەتی لەکەمتر لەدووسەد دیرهەم زیو زەکات ناکەوێ، لەکەمتر لەبیست دینار زێڕ زەکات ناکەوێ.

**پێکهاتەی ساڵ لەبڕیارو ئەندازەکێشی خودادا، شەڕ کردن لەگەڵ هەموو موشریکەکانو حەرامکردنی زیاد کردنی مانگ**

﴿إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِى
كِتَـٰبِ ٱللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ مِنْهَآ
أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ فَلَا تَظْلِمُوا۟ فِيهِنَّ
أَنفُسَكُمْ وَقَـٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا
يُقَـٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣٦﴾
إِنَّمَا ٱلنَّسِىٓءُ زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
يُحِلُّونَهُۥ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا لِّيُوَاطِـُٔوا۟ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ
فَيُحِلُّوا۟ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ زُيِّنَ لَهُمْ سُوٓءُ أَعْمَـٰلِهِمْ وَٱللَّهُ لَا
يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ژمارە (٣٧) وەکوو ئیبنو جەریری طەبەری لەئەبو مالیکەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کافرەکان وا دەبوو سێزدە مانگیان بەساڵێك حسێب دەکرد، مانگی موحەڕڕەمیان دەکردە مانگی صەفەرو شتی قەدەغەکراویان تێدا حەڵاڵ دەکرد، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿إِنَّمَا النَّسِيءُ زِيَادَةٌ فِي الْكُفْرِ﴾ ناردە خوارێ.

ئـەم ئایەتانـەی ئێـرە وەرگەڕانەوەیـە بـۆ سـەر موشـریکەکانو سـەرلەنوێ ژماردنی کارە خـراپو تاوانەکانیانـە. وەکـوو ئـەوەی کـە جولەکـەو مەسـیحییەکان دەهاتن حوکمو شەریعەتی خودایان دەگۆڕی، ئـیتر شـوێنەکە گونجاو بـوو کـە باسـی حوکمی شەڕکردن لەگەڵیانو چۆنیەتی مامەڵە کـردن لەگـەڵیان دا بکـرێ. ئـەمجار بگەڕێتـەوە سـەر ئـەحکامی موشـریکەکان، ئـیتر لێکچوونو هـەم ئاهـەنگی نێـوان موشـریکەکانو جولەکـەو مەسـیحییەکان ئاراسـتە دەکا دەربـارەی هۆکـاری جـەنگان دژیان، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِنْدَ اللَّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْراً فِي كِتَابِ اللَّهِ يَـوْمَ خَلَـقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ بێگومان هەر لەو ڕۆژەوە کە خـودا ئاسمانـەکانو زەوی دروسـت کـردون پێکهاتـەی سـاڵو ژمـارەی مانگـەکانی چـوار وەرزی سـاڵ لـەبڕیارو ئەندازەکێشیو زانیـاری پـەروەردگار دا کـە فـەرمانی کـردوە بـەکار پێکـردن پێیـان لەیاسـای هاتوچۆی مـانگ دا چەسپاندویەتی دوازدە مـانگی بـێ زیـادو کـەمن، بـەو جۆرەی کە ئەمڕۆ ئولفەتمان پێوە گرتووە. مەبەست بەمانگەکان ئەو ماوەیـە کـە لەڕوانگەی بینینی یەکەم ڕۆژی مانگەوە هەموو کۆتایی بیسـتو نۆ ڕۆژ یان سی ڕۆژ دەستەبەر دەبێ. ﴿مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ﴾ چوار مـانگ لـەم دوازدە مانگـە مـانگی ڕێـزدارو تایبـەتینو شـەڕو ئاژاوەیـان تێـدا قەدەغـە کـراوە، سـێ مانگیـان بـەڕیز بەشـوێن یەکـەوەن (ذولقعـدة، ذولحجـة، المحـرم)ن مانگێکیـان بەتاکەوەیـە ئـەویش مـانگی ڕەجەبە. ﴿ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾ ئەوەی باسکرا، هەر ئەوەیـە ئـاینی ڕاسـتو دروسـتو ئـاینی ئیـبراهیمو ئـیسماعیلیش بـەو شـێوە هـاتووە. کـەوابێ ﴿فَـلا تَظْلِمُـوا فِـيهِنَّ أَنْفُـسَكُمْ﴾ لـەو چـوار مانگـە دا ستەم لـەخۆتان مەکـەن، نەچـن ڕێـزی ئـەم مانگـە ڕێزدارانە بشکێنن، شتی قەدەغە کراویان تێدا ئەنجام مەدەن. خودا بۆ خۆی کەونی بەدیهێناوەو خۆیشی یاسای هەڵسوڕانو بەردەوامبوونی لەسەر ئەو شێوە هەڵسوڕانە دارشتوە.

بەڕاسـتی ئـەم دەقـە قورئانییـە ئەنـدازەی ڕۆژگـار پێوانـە دەکا، ئەنـدازەی هەڵسوڕانو سروشتی بونەوەر دەست نیشان دەکا. کـە خـودا لەسـەر ئـەو سروشـتە بوونـەوەری پێـك هێنـاوەو دەیگەڕێنێتـەوە بـۆ سـەرەتای پەیـدابوونی ئاسمانـەکانو زەوی. ئاماژە بەوە دەکا کـە هەڵسوڕانی بوونـەوەر هەڵسوڕانێکی نـەگۆڕاوەو پـاشو

پێش ناكا، هەموو ساڵێك ئەم دەورە زەمەنییە دووبارە دەبێتەوە، ئەم دەورە زەمەنییە كە پێی دەگوترێ: ساڵ دابەش بووە بەسەر دوازدە مانگ دا، هیچ ساڵێك لەساڵێكی تر زیادو كەمتر نیە، ئەمە لەیاسای خودادا چەسپاوەو پەروەردگار نیظامی بوونەوەری ئاوا داناوەو هیچ زیادو كەمی بەسەر دانایە چونكە بەگوێرەی یاسایەكی نەگۆڕ هاتۆتە كایەوە، ئەو یاسا كەونییەی كە خودا لەو ڕۆژەوە بونەوەری بەدیهێناوەو ڕێگی خستووە ئەم شێوەی بۆ دیاری كردوە.

ئەمجار پەروەردگار حوكمی شەڕ كردن لەدژی موشریكەكان بەشێوەیەكی گشتی دەست نیشان دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً﴾ بەكۆمەڵو بەتێكڕا شەڕ بكەن دژی موشریكەكان، وەكوو چۆن ئەوان بەكۆمەڵو هەمئاهەنگی شەڕتان لەگەڵ دەكەن، ئێوە دژی هەموانیان بجەنگنو كەسیان لێ مەبوێرن، دەس لەهیچ خێڵو تاقمێكیان مەپارێزن، وەكوو چۆن ئەوان دژی هەموانتان شەڕ دەكەنو كەستان لێ نابورێرن، لەراستی دا جەنگەكە لەنێوان موشریكانو خوداپەرستانە، لەنێوان كوفرو ئیمان دایە، شەڕی هیدایەتە دژی گومڕایی، شەڕی دوو موعەسكەری لێك جیاوازن، ناگونجێ بەئاشتی هەڵكەنو ئاشتی بكەوێتە نێوانیان، چونكە كێشەكەیان كێشەی سەرسەرەكیو جوزئی نیە، نیزاعیان لەسەر بەرژەوەندییەكی دونیایی یان سنوورێكی خاكو ئاو نیە، شەڕی رامیاریو رەگەزایەتیو نیشتمانی نیە، بەڵكوو شەڕی بیروباوەڕە، شەڕی پەیڕەوو پرۆگرامێكە كە لەو بیرو باوەڕە ئاسمانییەوە سەرچاوە دەگرێ، شەڕی ئایینە دژ بەئایینان، ڕێككەوتننامەو وتووێژو دانوسان چاری ناكا، هیچ چارێك نیە جگە لەجیهادو تێۆشان جیهادی تەواوو سەرتاسەری، شەڕی مانو نەمان، ئەمە دابو نەریتی خودایە، كە گۆڕانی بەسەردانایە، قانوونێكی ئەوتۆیە ئاسمانو زەوی لەسەر دامەزراون، بیرو باوەڕو ئایین لەو قانوونە خوداییە سەرچاوەیان گرتووە. ئەمجار موسوڵمانان دڵنیا دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ بزانن یارمەتی خودا بۆ ئەوانەیە: كە خۆ لەسنوور بەزێنێ دەپارێزن، خۆیان دەپارێزن لەوەی كە حەرام حەڵاڵ بكەن یان حەڵاڵ حەرام بكەن، یان قانوونی خودا تەحریف بكەن، هەرگیز لەجیهاد كردن پاڵ نادەنەوە، ترسان لەجەنگان دژی موشریكەكان نیە،

سەرکەوتن بۆ ئەوانە، چونکە خودایان لەگەڵە، کەسێکیش خودای لەگەڵ بێ هەر ئەو سەرکەوتووە!!

ئەمجار پەروەردگار هۆکاری ئەم شەڕکردنە دژی موشریکان رون دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا النَّسِيءُ زِيَادَةٌ فِي الْكُفْرِ﴾ بێگومان دواخستنی رێزو حورمەتی مانگێکی رێزدار بۆ مانگێکی تر کە ئەو رێزەی نەبێ، هەڵگێرانەوەی حەرامو حەڵاڵ زیاد کردنی کوفرو بێدینی ترەو دەیخەنە پاڵ کوفرو شیرکی پێشوویان کە بتپەرستیە، گۆڕانکارییە لەئایینی ئیبراهیمو بیرو بۆچونێکی خراپە چونکە کافرو بێدین هەرکاتێ تاوانێك زیاد بکا مانای وایە کوفر زیاد دەکا. رونکردنەوەی ئەم مەوزوعە بەم جۆرەیە؛ عەرەبەکان قەدەغەبوونی شەڕ لەمانگەکانی (أشهر الحرم) دا بەمیرات لەحەزرەتی ئیبراهیمو ئیسماعیل بۆ مابوەوە، پارێزگاری ئەم یاساو دابو نەریتەیان تێك نەدابوو بۆ ئەوەی هەموو ساڵێ بتوانن حەج بکەن، جا کە رۆژگارێکی زۆر بەسەر ئەم دابو نەریتەدا تێپەڕی، گۆڕانکارییان لەمەناسیكو مانگە قەدەغە کراوو رێزدارەکان دا کرد، بەتایبەتی لەمانگی موحەڕڕەم دا، چونکە بەلایانەوە ناخۆش بوو لەسەر شانیان گران بوو سێ مانگ لەسەریەك واز لەشەڕ کردنو پەلاماردان بێنن، لەبەر ئەوە هاتن مانگی موحەڕڕەمیان کرد بەمانگێکی ئاسایىو رێزدارییان لێ ساندەوە، رێزو قەدرەکەیان دا بەمانگی صەفەر بۆ ئەوەی (أشهر الحرام) لەچوار مانگەکە کەم نەکەن. ئەم کارەشیان پێچەوانەی دەقی قورئانو حیکمەتی دانانی یاسای (أشهر الحرام) بوو.

ئەم موشریکانە کە ئەم گۆڕانکارییانە لەمانگە رێزدارەکان دا دەکەن ﴿يُضَلُّ بِهِ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەوانەی کافرن زیاد لەکوفرەکەیان پێی گومڕا دەبن. واتە: زیاد لەکوفری پێشوویان گومڕاش دەبن. ئەمە ئەگەر وشەی (يضل) بەشێوەی (مبني للمجهول) بخوێندرێتەوە. ئەگەر بەشێوەی (مبني للمعلوم) بخوێندرێتەوە ماناکەی بەم جۆرە دەبێ، خودا ئەو کافرانە گومڕا دەکا، بەم جۆرە ﴿يُحِلُّونَهُ عَاماً يُحِلُّونَهُ عَاماً وَيُحَرِّمُونَهُ عَاماً﴾ مانگێکی تایبەتی ساڵێك دەیکەنە مانگی رێزدارو ساڵێکی تر نایکەنە رێزدار.

﴿لِيُوَاطِئُوا عِدَّةَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ﴾ بۆ ئەوەی ژمارەی مانگە شەڕتێدا قەدەغە کراوەکان لەژمارە دا کەم نەکەن واتە: لەساڵێك دا چوار مانگ شەڕیان تێدا قەدەغەبێ.

﴿فَيُحِلُّوا مَا حَرَّمَ اللَّهُ﴾ ئەم شێوە گۆڕانکاریو گواستنەوەی ڕێزە لەم مانگ بۆ ئەو مانگ لەگەڵ هێشتنەوەی ژمارەی مانگە ڕێزدارەکان، بۆ ئەوە وا دەکەن ئەو شتانەی خودا حەرامی کردوە ئەوان حەلاڵی بکەن.

﴿زُيِّنَ لَهُمْ سُوءُ أَعْمَالِهِمْ﴾ کردەوە خراپەکانیان لەپێش چاو جوان کراوە، شەیتان لەخشتەی بردونو کردەوەی خراپیان لەلا جوان بووە، پێیان وایە: بیرو باوەڕی پووچو بەتاڵیان ئایینی ڕاستو دروستە.

﴿وَاللَّهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ پەروەردگار گەلو نەتەوەی کافرو گومڕا هیدایەت ناداو شارەزایان ناکا بۆ ڕێبازی ڕاست. ئەوانەی بۆخۆیان ڕێبازی گومڕایی هەڵدەبژێرن، خودا هیدایەتیان نادا بۆ ڕێگای حیکمەت ئامێزو خێرو چاکەو پابەند بوون بەئەحکامی شەرعی خوداوە، بەڵکوو ڕیسوایان دەکاو ڕەحمیان پێ ناکا، چونکە بەگوێرەی دەقی قورئان شارەزایی کردن بۆ ڕێبازی خۆشبەختی دونیاو قیامەت ڕەنگدانەوەی بیرو باوەڕی ڕاستو کردەوەی چاکو پەسندە ئەوەتا لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُمْ بِإِيمَانِهِمْ﴾ (يونس: ٩).

ئەو کافرانە بەئارەزۆی خۆیان ئەحکامی خودایان دەگۆڕی، ئەو شتەی خودا لێی حەرام کردبوون حەلاڵیان دەکرد، شتێك کە خودا حەلاڵی کردبوو ئەوان حەرامیان دەکرد، بەم جۆرە دەهاتن تەلاعوبیان لەمانگەکانی ساڵ دا دەکرد، هەوڵیان دەدا ساڵی مانگیّ وا لێ بکەن یەکسان بێ لەگەڵ ساڵی خۆری دا دەهات ئاڵو گۆڕیان لەمانگەکان دا دەکرد ڕێزو حورمەتی مانگەکانی مەشهوور بە (أشهر الحرام) دەگواستەوە، بەم جۆرە مانگی (ذولقعدة) یان دەبرد شوێنی (ذولحجة)و (ذولحجة)یان دەبردە شوێنی (محرم)و (محرم)یان دەبردە جێگەی (صفر)و مانگی (رجب)یان دەخستە شوێنی (شعبان) بۆ نموونە مانگی (محرم) کە شەڕی تێدا

قەدەغەبوو ئەوان ئەم قەدەغە بوونەیان دەدا بەمانگی (صفر)و لەخودی مانگی (محمرم)دا شەڕیان تێدا حەڵاڵ دەکرد، بەگوێرەی قازانجو بەرژەوەندی خۆیان، بەرواڵەت پابەندی چوار مانگە قەدەغەکراوەکان دەبوون، بەناو پێیان دەگوتن: حەرامو لەراستی دا لەو چوار مانگە خاوەن ڕێزو حورمەتە نەبوون کە خودا دایناببوون!! دەی بابزانین ساڵی خۆری چیەو ساڵی مانگی چیە؟!

هەر لەو کاتەوە خودا ئاسمانەکان و زەوی و خۆرو مانگو ئەستێرەو شەوو ڕۆژی داناوە، بەهۆی هاتوچۆی مانگو خۆرەوە. ساڵی مانگی و ساڵی خۆری داناوە، بەم جۆرە ساڵی مانگی وا داناوە دوازدە جار مانگ تازە ببێتەوەو خولی خۆی تەواو بکا، ساڵی خۆریشی وا داناوە کە لەهەر خاڵێکەوە خۆر هەڵبێ بڕواو بێتەوە بۆ ئەو خاڵەی کە سەرەتا لێی هەڵهاتووە، ئیتر بەگوێرەی ئەم یاسایە ساڵی مانگی بریتییە لەسێ سەدو پەنجاو پێنج ڕۆژ، ساڵی خۆری بریتییە لەسێ سەدو شەصتو پێنج ڕۆژو چواریەکی ڕۆژێك.

جا لەبەر ئەوەی کە مانگ زوزو تازە دەبێتەوەو شێوە گۆڕانەکەی لەبەرچاوە هەموو کەس خوێندەوارو نەخوێندەوار دەتوانێ حیسابی خۆی پێ بکا. بۆیە حیسابی مامەڵەو ڕێ و ڕەسمی ئایین بەگوێرەی ساڵی مانگی ڕێك خراوە، بەتایبەتی کە لەئایینی حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی ئیسماعیل دا زۆر بایەخ بەمانگەکانی (أشهر الحرام) دراوە لەهەر دوازدە مانگ دا چوار مانگیان بەمانگی ڕێزو قەدر داناوە شەڕو ئاشوبیان تێدا حەرام کردوون. ئەو چوار مانگە سێیانیان بەسەریەکەوەن (ذوالقعدة، ذوالحجة، محرم) مانگێکیشیان بەتەنیایە، کە مانگی (رجب)ە.

جا چونکە مانگی (ذوالحجة)و ڕەفیقەکانی بەگوێرەی حیسابی ساڵی مانگی دەگۆڕێن، جاری وا دەبێ دەکەونە بەهارو جاری وا دەبێ دەکەونە زستان یان هاوین یان پایزەوە، بەم جۆرە کاتەکانی حەجکردن دەگۆڕان بەرژەوەندی عەرەبەکان لەبازرگانی و عیبادەتکردن دا بەئارەزۆی ئەوان نەدەبوو، ساڵی وا دەبوو حەج دەکەوتە وەرزێکەوە بۆ بازرگانی ئەوان زیانی دەبوو نەگونجاو بوو.. بۆیە هاتن

دەستدرێژییان کردە سەر ئەم یاسا خوداییەی کە لەئایینی ئیبراهیم دا دامەزرابوو گۆڕییان، ڕێو ڕەسمی مانگە شەڕ تێدا قەدەغە کراوەکانیان خستە سەر حیسابی ساڵی خۆری. جا لەبەر ئەوە کە ساڵی خۆری وەکوو ئاماژەمان پێ کرد دە ڕۆژو چواریەکی ڕۆژێکی لەساڵی مانگی زیاترە، هەر بەسێ ساڵی جارێك مانگێکیان زیاد دەکردو ساڵی مانگییان دەکردە سێزدە مانگ. بۆ ئەوەی کاتی حەج لەوەرزێك دا لەگەڵ بەرژەوەندی بازرگانییان دا بگونجێ. پەروەردگار ئەم جۆرە گۆڕانکاریو دەست لێدانەی ساڵو مانگەکانی ساڵی بە (نسيء) ناو بردوە.

موجاهید (ﷺ) دەڵێ: عەرەبەکان باویان وابوو: پیاوێکی هۆزی کەنانە هەموو ساڵێ لەمەوسیمی حەج دا بەسواری گوێدرێژێ دەهات دەیگوت: خەڵکینە! من ڕەخنە ناگرمو نائومێدیش نیم، هەرچی دەیڵێم: ڕەتبوونەوەی نیە، ئێمە ئەمساڵ بڕیارمان دا مانگی موحەرەم مانگی قەدەغە کراو بێ. مانگی صەفەرمان دواخست، ساڵی داهاتوو دەهات دەیگوت: ئەمساڵ مانگی صەفەرمان قەدەغە کردو مانگی (محرم)مان دواخست. ئەمەیان بۆیە دەکرد ﴿لِّيُوَاطِئُوا عِدَّةَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ﴾ بۆ ئەوەی لەگەڵ ژمارەی ئەو مانگانەی خودا قەدەغەی کردبوون یەك بگرنەوە.

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: ئەو پیاوەی هەموو ساڵێ دەهات ناوی (القلمس) بوو لەرۆژگاری پێش ئیسلام دەژیا. دابو نەریتی کافرەکان وابوو: لەمانگەکانی (أشهر الحرام) دا پەلاماری یەکتریان نەدەدا، پیاو هەبوو باوە کوشتەی خۆی بەردەست دەکەوت دەستی بۆ نەدەبرد گوێی نەدەدایە.

## هەڵنانی موسوڵمانان بۆ جیهادو هەڕەشەکردن لەوازهێنان لێی

### موعجیزەی ئەشکەوتی حیرا:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم

بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا تَنفِرُواْ
يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ وَلَا
تَضُرُّوهُ شَيۡـٔٗاۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ إِلَّا
تَنصُرُوهُ فَقَدۡ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذۡ أَخۡرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ
لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ
عَلَيۡهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٖ لَّمۡ تَرَوۡهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفۡلَىٰۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ
ٱلۡعُلۡيَاۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٣٨) ئیبنوجەریر لەموجاهیدەوە دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێ: کاتێك فەرمان بەموسوڵمانان کرا کە بچن بۆ غەزای تەبووك وەرزەکە هاوین بوو، میوەجات پێگەیشتبوو، سیبەر خۆش بوون، موسوڵمانان ئەم چوون بۆ غەزایەیان لەسەرشان گران بوو، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ.

دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٣٩) ئیبنو ئەبی حاتەم لەنەجدی کوڕی نوفەیع دەگێڕێتەوە دەڵێ: دەربارەی ئەم ئایەتە پرسیارم لەئیبنو عەبباس کرد،

ئەویش فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) هەندێ لەخێڵە عەرەبەکانی هەڵدان بۆ غەزا، ئەوانیش لەسەرشانیان قورس بوو تۆزێك قنگ گرانییان کرد، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ ﴿إِلاَّ تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَاباً أَلِيماً﴾ ماوەیەك بارانی لێ گرتنەوە، ئەوە سزای ئەو قنگ گرانیەیان بوو.

بەکورتیو پوختی خیلاف لەناو زانایەن دا نیە لەوە دا کە ئەم ئایەتانە بۆ سەر کۆنەکردنی ئەوانە هاتونە خوارێ کە لەچون بۆ غەزای تەبووك ساڵی نۆیەمی کۆچی لەخزمەت پێغەمبەر دا (ﷺ) دواکەوتنو ئامادەی ئەم غەزایە نەبوون.

**راڤەکەرانی قورئان دەڵێن: هۆی ئەم خۆپاشدانو قنگ گرانییەی خەڵکەکە لەچون بۆ غەزای تەبووکو شەڕکردن لەگەڵ رۆمەکان چەند شتێك بوو:**

١- کاتەکە هاوین بوو، قاتو قڕی بوو.

٢- دووری ئەو شوێنەی بۆی دەچوون لەمەدینە، هەروەها دابین نەکردنی زوربەی پێویستییەکانی کە بەخەیاڵی خۆیان پێویست بوون.

٣- میوە پێگەییشتبوو لەمەدینەو دەوروبەری.

٤- گەرمای بەتین لەو کاتەدا.

٥- ترسان لەسوپای رۆم.

لەوەپێش پەروەردگار هۆکاری شەڕکردنی موسوڵمانان دژی موشریکی جولەکەو مەسیحی باس فەرموو: سوودو قازانجی شەڕ لەگەڵ کردنیانی دیاری کردو فەرمووی: ﴿قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ﴾.... ئەمجار لێرەدا باسی ئەو هۆکارانە دەکا کە شەڕکردن لەگەڵ رۆمەکان لەغەزای تەبووك دا بەپێویست دادەنێن!.

تەبووك شوێنێکە کەوتۆتە نێوە رێگای نێوان مەدینەو دیمەشق، تەبووك (٦٩٠) کیلومەتر لەمەدینە دوورەو (٦٩٢) کیلومەتریش لەدیمەشق دوورە.

ئەم غەزایە لەمانگی رەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچی پاش گەڕانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لەغەزای حونەینو طائیف روی دا.

ئەم ئایەتانەش ئەو کاتە هاتنە خوارێ کە پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازی خەڵکی کرد بۆ خۆئامادەکردن بۆ غەزای تەبووك، وەکوو ئاماژەمان پێ کرد ئەو کاتەش موسوڵمانان لەقاتو قڕیو تەنگو چەڵەمەو گەرمای بەتین دا بوون، ئازوخەو تفاقو دانەوێڵە نەبوو، کاتی ئەوە بوو خەڵك دابنیشیو چاوەڕوانی پێگەیشتنی میوە بکا، خورما گەنان بوو، نزیکی ئەوە هاتبوو خورما بچنو میوە بڕنن، بۆیە موسوڵمانان ئەم چوون بۆ غەزایەیان لەسەر شان گران بوو، ئیتر پەروەردگار ئەوە رون دەکاتەوە کە نابێ خۆشبەختی دونیاو قیامەتو خێرو بێری نەبڕاوە، بۆ خۆشی دونیا فەرامۆش بکەین، کەسێك ئەوە بکا نەفامو نەزانە.

سورەتی تەوبە لێرە بەولاوە تا ئاخری سورەتەکە جگە لەدوو ئایەتی کۆتایی دەربارەی غەزای تەبووك دەدوێ، باسی ئەو روداوانە دەکا کە هاوکات لەگەڵ رۆژانی بەرپابوونی غەزاکە هاتنە کایەوە، پەردە لەسەر دووروەکانو بڕوا لاوازەکان لادەدەن، دڵو دەروونی موسوڵمانان پاڵفتە دەکەن لەهۆکاری دووبەرەکیو دژایەتی.. دووریان دەخەنەوە. ناو بەناویش بڕێ ئەحکامو پەندو ئامۆژگاری تێهەڵکێش دەکا، ئەمەش شێوازێکی تایبەتی قورئانە!!

جاوەکوو مێژوو نووسانو شارەزایانی سیرە نووسیویانە هۆی بەرپابوونی ئەم جەنگە دژوارە ئەوەبوو رۆمەکانو هۆزە عەرەبە مەسیحییەکانو هی تریش خۆیان کۆکردبووەوەو سوپایەکی گەورەیان بەفەرماندەی (قوباز) پێکەوەنابوو بۆ ئەوەی هێرش بێننە سەر مەدینە، ژمارەی سەربازە ئامادە کراوەکان چل هەزار نەفەربوون.

پێغەمبەر (ﷺ) خەڵکی هەڵنا بۆ ئامادەباشی بەماڵو بەگیانو چوونە دەرەوە بۆ شەڕ کردن لەگەڵیان. لەو سەروبەندەدا حەزرەتی عوسمان کاروانێکی ئامادە کردبوو بینێرێ بۆ شام بۆ بازرگانیکردن، لەو کاتەدا هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە دووسەد وشترە بەهەموو بارو بارگەنەوە ئەوەش دووسەد ئۆقیە زیو سەرفیان بکە بۆ رێکخستنی ئەم سوپایە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ماضر عثمان مافعل بعد اليوم) لەم ڕۆ بەولاوە هیچ شتێك زیان بەعوسمان ناگەیەنێ.

جاکە پێغەمبەر (ﷺ) بەلەشکرێکی سێ هەزار کەسییەوە گەییشتە تەبووك، پێش گەیشتنی رۆمەکان پێیان زانینو زانیان کە سوپای ئیسلام زۆرو بەدەسەڵاتە، لەوەپێشیش لەغەزای مۆتەدا بەچە ترسێنن کرابوون. لەبەر ئەوە وایان بەباش زانیبوو کە بڵاوەی لێ بکەنو لەناو وڵاتەکەی خۆیان دا خۆ بشارنەوە نەوەك بەدەست سوپای ئیسلام لەناو بچن. پێغەمبەریش کەوای زانی نەیویست بچێتە ناو وڵاتەکەیانەوەو بۆیان بگەڕێ، بەڵکوو بیست رۆژ لەتەبوك دا بەو لەشکرە زۆرەوە مایەوە نوێژی کورت کراوەیان تێدا کرد، پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە. جا هەرچەندە سوپای ئیسلام لەم غەزایەدا توشی جەنگ نەبوو بەڵام کاریگەرییەکی مەعنەوی گەورەی لەسەر عەرەبو رۆمەکان هەبوو، چی لەکاریگەری فەتحی مەککە کەمتر نەبوو، لەلایەکەوە روبەرو بوونەوە بوو لەگەڵ گەورەترین هێزی ئەو رۆژگارە، ترسێکی گەورەشی خستە دڵی دوژمنانی ئیسلامەوە، پاش ئەوەی کە عەرەبەکان دەترسان رۆمەکان لەماڵی خۆیان دا قەڵاچۆیان بکەن. بەچاوی خۆیان دیتییان سوپای ئیسلام چۆن رۆمەکانی جوجك ترسێن کردن.

بێگومان هەر ئەم غەزایەش بوو کە رێی بۆ موسوڵمانان خۆش کرد کە لەوەدوا لەسەردەمی خەلیفەی یەکەم ئەبو بەکرو خەلیفەی دووەم عومەردا (ﷺ) وڵاتی شام رزگار بکەن.

دەی با ئەمجار بچینە سەر مەبەستو دەست بکەین بەتەفسیری ئایەتەکانو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمْ انفِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الأَرْضِ؟﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بەخوداو پێغەمبەری خودا هێناوە، ئەوە چیتانە، بۆ کە پێتان دەگوترێ بەگشتی خۆتان ئامادە بکەنو بڕۆن بۆ شەڕ دژی رۆمەکان کە خۆیان ئامادە کردوە بۆ پەلاماردانی شاری مەدینەو وڵاتی موسوڵمانانو لەناوبردنتان کەچی ئێوە بەزەوییەوە نووساونو جوڵەتان نیەو هیچ دیاردەیەکی بەپیرەوە چوونی بانگەوازییەکەی پێغەمبەرتان پێوە دیار نیە تەمبەڵو تەوەزەل پاڵتان لێ داوەتەوە، چاوتان لەرابواردنو میوە خواردنو لەسێبەر دانیشتنە؟؟ چ شتێك بوەتە کۆسپو تەگەرە لەبەردەمتان دا بەو جۆرە قەلبتان داهێزاوە سەری خۆتان کز کردوە (شانتان کردوە کۆمەو لەخۆتان گرتووە لۆمە) وا

وەگری پاڵدانەوە بوون تەنانەت بەنوێڵیش ڕاست نابنەوە؟! چیە؟ بۆ ئەوەندە جەستەی خۆتان خۆش دەوێ، بۆ ئەوەندە خۆپەرستو بێ هەستو دونیا خۆشەویستن؟

بێگومان ڕاپەرینو ڕاسان بۆ جیهاد لەرێگەی خودادا خۆرزگار کردنە لەکۆتو زنجیری زەوی‌و خۆپارێزییە لەتەمبەڵی‌و گۆشتو خوێن پەستی، ئەنجامدانی مانای بەرزییە لەمەیدانی ئادەمیزاددا، چاوەڕوانکردنی هەمیشە زیندویی‌و خۆرزگارکردنە لەفەوتان!! ﴿أَرَضِيتُمْ بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنَ الآخِرَةِ﴾ ئایا ئێوە ڕازی دەبن بەرابواردنی ژیانی دونیا لەجیاتی خۆشبەختی ژیانی قیامەتو لەززەتو خۆشیەکانی. ئەگەر ئەوە بکەنو بەوە ڕازی بن ئەوە مانای وایە وازتان لەخێرو خۆشی نەبڕاوە هێناوە لەپێناو وەدەست هێنانی شتێکی کەمو پڕوپووچ ﴿فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ﴾ ئەو ژیانەی دونیاتان کە زوربەی غەمو خەفەتە، ئەگەر بەرامبەری بەخۆشی‌و لەززەتی ژیانی نەبڕاوەی قیامەت بکرێ جگە لەشتێکی کەمو بێ نرخ هیچی ترنیەو ناشێ بکرێ بەباربەهای ئەو ژیانە خۆشەی قیامەت.

هەرخاوەن بڕوایەك خۆپارێزێ لەچون بۆ جیهادو تێکۆشان لەپێناو ئایینی خودادا نیشانەی ئەوەیە: بیرو باوەڕی ساغ نیە، ئیمانی سستەو داینەمۆی باوەڕی لەکار کەوتووە، یان خەلەلی تێدایە. بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (من مات ولم يغزو ولم يحدث نفسه بغزو، مات علی شعبة من شعب النفاق) نیفاق واتە: دووڕوویی. دووڕوو پێش ڕەنگدانەوەی خەلەلێکی بیرو باوەڕەو نیشانەی ناکامڵی‌و ناساغی ئیمانە، وا لەخاوەنەکەی دەکا: لەترسی مردن، یان هەژاری خۆ لەجیهاد بدزێتەوە، بیر لەوە ناکاتەوە کە ئەجەل بەدەست خودایەو رزق‌و ڕۆزی لای خودایە، ژیانی دونیا لەچاو ژیانی قیامەتو خۆشی‌و لەززەتی نەبڕاوەی دا شتێکی زۆر کەمو بێ نرخە، نابێ ئەو بەهرەو خۆشییە نەبڕاوە بەهۆی ئەو ژیانە کەمەی دونیاوە لەکیس خۆی بدا. ئەمجار هەڕەشە لەوانە دەکا: کە خۆ لەجیهاد دەدزنەوەو خیطابیان ئاڕاستە دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَاباً أَلِيماً وَيَسْتَبْدِلْ قَوْماً غَيْرَكُمْ﴾ ئەگەر لەگەڵ پێغەمبەر دەرنەچن بۆ جیهادو بەپیر بانگەوازییەکەیەوە نەچن ئەوە خودا لەدونیا دا سزای بەئێشتان پێ دەگەیەنێ وەکوو ئەوە گرانی‌و

قاتو قڕی بخاتە ناوتانەوە، دوژمن بەسەرتان دا زاڵ ببێ، بەهیلاکتان بەرێ، لەپاش فەوتاندنی ئێوە، لەباتی ئێوە کۆمەڵێکی راستاڵ دێنێتە پێشەوە گەلو نەتەومیەکی تر بێنێتە شوێنی ئێوە بۆ ئەوەی یارمەتی پێغەمبەری خودا بدەنو پابەندی فەرمانو جڵەوگیری ئایینەکەی بن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْماً غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُمْ﴾ (محمد/٣٨). خیطابی ئایەتەکە هەرچەندە بۆ کۆمەڵێکی تایبەتییەو لەمەوقیفێکی تایبەتی دایە، بەڵام لەراستی دا مەعناکەی گشتیو بەرفراوانە هەموو خاوەن بیرو باوەڕێکی خودا پەرست دەگرێتەوە. ئەو سزایەی لەئایەتەکەدا هەڕەشەی پێ دەکرێ تەنها سزای قیامەتی نیە بەس! بەڵکو سزای دونیاییشە، سزای زەلیلیو ژێر دەستەییە کە تووشی ئەوانە دەبێ خۆ لەجیهاد دەشارنەوە، سزای زاڵبوونی دوژمنە بەسەریان دا، بێبەشبوونیانە لەخێرو بێری وڵاتو داگیرکردنیەتی لەلایەن دوژمنانەوە، سەرەڕای ئەوەش ماڵو گیانیان زۆر زیاتر لەکیس دەچێ لەوەی کە لەجیهادو تێکۆشان لەپێناو ئایین دا لەکیسیان دەچو، کەرامەتو پیاوەتییان زۆر زیاتر دەفەوتێ لەوەی کە لەجیهاد دا دەفەوتا! هەر گەلو نەتەوەیەك واز لەجیهاد بێنێ خودا مۆری زەلیلیو ژێر دەستەیی لەناوچاوانیان دەداو زەلیلو دەسەپاچەی دوژمن دەبن. ئەگەر جیهاد بکەن زۆر لەوەیان کەمتر لەکیس دەچێ.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا داوای لەهۆزێکی عەرەب کرد بچن بۆ غەزا ئەوانیش قونگ گرانییان نیشان دا، ئیتر خودا بارانی لێ گرتنەوە ئەوە سزاکەیان بوو.

﴿وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْئاً﴾ ئێوە ئەگەر لەجیهاد کردن خۆبدزنەوەو تەمبەڵو تەوەزەلی بنوێنن ئەوە زیان بەخودا ناگەیەنن، چونکە خودا باڵادەستە بەسەر هەموو بەندەکانی دا.

هەندێك دەڵێن: راناو لە(تضروە) دا بۆ پێغەمبەر دەگەڕێتەوە. واتە: ئێوە ناتوانن زیان بەپێغەمبەر بگەیەنن، چونکە خودا وادەی داوە کە بیپارێزێ لەدەستی چەپەڵ، وە کۆمەگی پێ بکاو بەسەر دوژمنانی دا سەری بخا، وادەو بەڵێنی خودا

دێتە جێ‌و شك‌و گومانی تێدا نیە، وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لاَ تُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ (آل‌عمران: ١٩٤) یان دەفەرموێ: ﴿وَلَنْ يُخْلِفَ اللَّهُ وَعْدَهُ﴾ (الحج:٤٧). هەرگیز خودا وادە بەخیلاف نیە. ﴿وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ پەروەردگار بەبێ ئەوەی ئێوە كۆمەگی پێ بكەن دەتوانێ بەسەر دوژمنانی دا زاڵ ببێ!!

ئەمجار پەروەردگار نموونەیەك لەئەمری واقیع‌و رووداوێكی مێژوویی دێنێتەوە كە بۆخۆیان دەیزانن‌و لەیادیان ماوە چۆن یارمەتی پێغەمبەری خۆی دا، بەبێ هۆكاری ئەوان پێغەمبەری لەتەنگو چەڵەمە رزگار كرد، یارمەتی‌و سەركەوتن بەدەست خودایەو كێ بوێ دەیدا بەو كەسەو دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللَّهُ﴾ ئەگەر ئێوە یارمەتی پێغەمبەری خودا نەدەن، لەگەڵی دا نەچن بۆ جیهاد، ئەوە خودا كۆمەگی پێ دەكاو یارمەتدەری دەبێ، كەسێكیش خودا یارمەتدەری بێ بەسیەتی‌و حەوێجەی بەكەسی ترنیە. خودا یارمەتی دەداو وەكوو چۆن ساڵی كۆچ یارمەتی دا ﴿إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ كاتێك كافرەكان تەنگیان پێ هەڵچنی‌و پیلانیان بۆ دادەرشتن بەكوشتن، بەبەندكردن، بەدەركردن. وەكوو لەشوێنێكی تردا فەرموویەتی: ﴿وإذ يمكر بك الذين كفروا ليثبتوك أو يقتلوك أو يخرجوك﴾ (الأنفال: ٣٠).

پێغەمبەر (ﷺ) بەفەرمانی خودا كۆچی كرد لەگەڵ هاوەڵی خۆشەویستی دا ئەبو بەكری صدیق ﴿ثَانِيَ اثْنَيْنِ﴾ حاڵی پێغەمبەر بەم جۆرە بوو یەكێ بوو لەدوو كەس، نەسوپای كۆچكەران‌و نەسوپای یارمەتیدەرانی لەگەڵ دا بوو، بەڵكوو تەنیا دوو كەس بوون؛ خۆی‌و ئەبو بەكری هەواڵی ﴿إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ﴾ لەو كاتەدا كە لەناو غاری حیرا دا بوون، كە ئەشكەوتێكە لەكێوی (ئەور) سەعاتە رێیی لەمەككە دوورە. ﴿إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا﴾ لەو كاتەدا كە ئەبو بەكری هاورێی چاوی بەكافرەكان كەوت كە هاتبوونە دەرگای ئەشكەوتەكە ترسی لێ نیشت لەوە كە بیان بینن‌و بیانگرن‌و بیانكوژن، بەپێغەمبەری وت: ئەگەر تەماشای بەرقاچی خۆیان بكەن ئێمە دەبینن. پێغەمبەر (ﷺ) بۆ دڵدانەوەی ئەبو بەكر فەرمووی:

مەترسە خودا لەگەڵمانە، یارمەتیمان دەداو دەمان پارێزێ ئیمامی ئەحمەدو هەردوو پیری فەرمووده (بوخاریو موسلیم) لەئەنەسەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: حەزرەتی ئەبو بەکر بۆی گێرامەوە: فەرمووی: لەئەشکەوتەکەدا لەگەڵ پێغەمبەر دا بووم (ﷺ) شوێنەواری موشریکەکانم بینی، عەرزم کرد ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر یەکێیان قاچ بەرز بکاتەوەو تەماشای ژێر پێی خۆی بکا دەمانبینێ، فەرمووی: (ئەی ئەبو بەکر تۆ گومانت چۆنە بەدوو کەس کە خودا سێهەمیان بێ)

لەریوایەتێك دا هاتووە دەفەرموێ: ئەگەر یەکێکیان بڕوانێتە قاچی خۆی ئێمە لەژێر قاچیەوە دەبینێ. ﴿فَأَنزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَيْهِ﴾ ئەمجار پەروەردگار ئارامی خۆی ناردە خوارێ بۆ سەر دڵی پێغەمبەر (ﷺ) یان بۆ سەر دڵی ئەبو بەکر، ئیبنو عەبباسو هی تریش دەفەرمون: مەبەست ئەبو بەکر بێ باشترە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) هەموو کاتێ دڵئارام بووەو ترسی نەبوە.

ئیبنولعەرەبی دەڵێ: گەڕانەوەی راناو لە(علیه) دا بۆ ئەبو بەکر وێچووترە، چونکە ترسی لێ نیشتو دەترسا پێغەمبەر بکوژن، ئیتر خودا ئارامی خۆی ناردە سەرِ دڵی ئەبو بەکر بەهۆی دوعای پێغەمبەر (ﷺ) ئیتر دڵی دامەزراو ترسی لێ رەویەوەو ئارامی بۆ پەیدابوو. ئیمامی رازی دەفەرموێ: گەڕانەوەی راناوەکە بۆ ئەبو بەکر پەسندترە چونکە قاعیدەی نەحوییان وەهایە دەڵێن: کە بۆ ضەمیر دوو مەرجیع هەبوو دورو نزیك بۆ نزیکەکە بگەڕێتەوە باشترە. دەی مەرجیعە نزیکەکە ئەبو بەکرە، هەروەها چونکە ترسو دڵە راوکێکە بۆ ئەبو ئەکر پەیدا بوبوو نەك بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر پێغەمبەر خۆی بترسایە نەیدەتوانی دڵی ئەبو بەکر ئارام بکا.

﴿وَأَيَّدَهُ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا﴾ کۆمەکی پێغەمبەری خۆی کرد بەسەربازو لەشکرێك کە ئێوە نەتان بینی، کە بریتی بوو لەفریشتە رۆژی جەنگی بەدرو رۆژی جەنگی ئەحزابو رۆژی جەنگی ئوحود یارمەتیان دا.

هەندێك پێیان وایە مەبەست بەیارمەتیدانی فریشتە کە لێرە دا ئاماژەی پێ کراوە یارمەتیدانی ڕۆژگاری کۆچ کردن بووە کە فریشتە پارێزگاری خۆیو ئەبو بەکری هاوەڵیان کردو چاوی کافرەکانیان لەئاستیان دا کوێر کرد. ﴿وَجَعَلَ كَلِمَةَ الَّذِينَ كَفَرُوا السُّفْلَى﴾ پەروەردگار وای کرد دروشمی کافرانی ژێر خستو ئاواتو هومێدیان نەهاتە دیو تێشکانو زەلیلو ڕیسوا بوون. ﴿وَكَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا﴾ ڕستەی (لا اله الا الله، محمد رسول الله)ی سەرخست بانگەوازی بۆ ئیسلامی پێش خستو وەگەڕخست. ئەمە ئەگەر ﴿كَلِمَةُ اللَّهِ﴾ بە (مەنصوبی) بخوێندرێتەوە. ئەگەر ﴿كَلِمَةُ اللَّهِ﴾ بەمەرفووعی بخوێندرێتەوە ئەو کاتە ماناکەی بەهێزتر دەبێ واتە: هەر دروشمی خودا، ڕستەی (لا اله الا الله) لەسەرەوەیەو پایەدارەو هەر ئەو سەرکەوتووە.

﴿وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ خودا عەزیزو بالآ دەستە، هەر کەسێك پەنا بەئەو بەرێ پارێزراوو سەرکەوتووە، حەکیمو دانایە لەکردارو گوفتاری دا، هەموو گوفتارو کارێکی لەجێی خۆی دایەوەو هیچ شتێکی بێ حیکمەت نیە، هەرکەسێ شیاوی کۆمەگی پێکردن بێ کۆمەگی پێداکاو لەکاتی گونجاو دا یارمەتی دەدا، بێگومان کۆمەگی بەپێغەمبەر (ﷺ) کرد، کۆچی سەرکەوتووی ئەنجام دا دەوڵەتی دامەزراند، کافرانی شکاندن، ئیمپڕاتۆرەکانی فارسو ڕۆمی ڕوخاندن، ئایینی ئیسلامی بەسەر هەموو ئایینەکانی تردا بالآ دەست کرد وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾ (الصف: ٩).

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مانای ﴿كَلِمَةَ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ وشەی شیرکە ﴿كَلِمَةُ اللَّهِ﴾ ڕستەی (لا اله الا الله، محمد رسول الله)یە لەصەحیحەین دا فەرموودەیەك لەئەبو موسای ئەشعەرییەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پرسیار لەپێغەمبەر کرا (ﷺ) لەبارەی پیاوێك لەبەر خاتری پێی بگوترێ ئازایە شەڕ دەکا، یان لەبەر خاتری خزمایەتی، یان بۆ خۆ هەڵنانەوەو ڕانواندن شەڕ دەکا، کامیان لەڕێگەی خودادا

حلێب دەكرێ. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: كەسێك بۆیە شەڕ بكا تا كەلیمەی خودا سەربكەوێ ئەوە لەرێگەی خودا حسێب دەكرێ.

## نەفیری عام بۆ جیهاد لەپێناو ئایینی خودادا

﴿ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾﴾

جاكە لەئایەتی پێشوودا نمونەی كۆمەگی كردنو سەرخستنی پێغەمبەری (ﷺ) هێنایەوە، لەروانگەی ئەم نموونە واقیعە كاریگەرەوە بانگی موسوڵمانان دەكا: كە تێكڕا بەبێ جیاوازی بێ ئیشو خاوەن كار پیرو نەوجەوان بچن بۆ جیهاد، هیچ كۆسپو تەگەرەیەك لەچوون بۆ غەزایان دوانەخاو دەفەرموێ: ﴿انفِرُوا خِفَافاً وَثِقَالاً﴾ ئەی موسوڵمانینە! هەركاتێ بانگی جیهاد درا، بانگ كران بۆ چوون بۆ جیهاد وەڵامی بدەنەوەو بەپیر بانگەوازی جیهادەوە بڕۆن تاكتاكو كۆمەڵ كۆمەڵ، هەركەسە بەگوێرەی حاڵو توانای خۆی. دەوڵەمەند بن یان هەژار، نەخۆش بن یاساغ، پیر بن یان جوان، ئێشتان هەبوو یان بێكار بوون ﴿وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ جیهاد بكەن، تێبكۆشنو بەماڵو گیان لەپێناو ئایینی خودادا، بۆ بەرز كردنەوەی ئاڵای (لا اله الا الله، محمد رسول الله) ﴿ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەوە بۆ ئێوە سەر بەرزیو خێرو شكۆمەندییە، هۆی پارێزگاری ماڵو وڵاتو نامووسو سەروەریتانە.

ئەگەر ئێوە لەئەهلی زانیاری ڕاستو مەعریفەتی حەقن، جاكە ئێوە ئەوە دەزانن و هەست بەباشی ئەوە دەكەن ئەوە راپەڕن بۆ جیهادو تەمبەڵی مەكەن.

ئەگەر ئێستا ئەم ئایەتە مانابکەین دەبێ بڵێین: ئەی موسوڵمانینە! راپەڕن بۆ جیهاد بۆ شەڕ بەسواری بەپیادەیی بەچەکی سوکو بەچەکی قورس بەزرێپۆشو بەفرۆکەو ئەرزئەرزو تۆپو بەقەڵەمو بەزوبان بەشیعرو بەوتارو هەموو جۆرە چالاکییەك هەر کەسە بەگوێرەی دەسەلاتو توانای خۆی.

## خۆپاشدانی دووڕووەکان لەچوون بۆ غەزای تەبووكو شێوە ئیزن وەرگرتنیان

﴿لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّاتَّبَعُوكَ وَلَٰكِن
بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ الشُّقَّةُ ۚ وَسَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَوِ اسْتَطَعْنَا
لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ يُهْلِكُونَ أَنفُسَهُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ
(٤٢) عَفَا اللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ
الَّذِينَ صَدَقُوا وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ (٤٣) لَا يَسْتَأْذِنُكَ
الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَن يُجَاهِدُوا
بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ (٤٤) إِنَّمَا
يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَارْتَابَتْ
قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ (٤٥)﴾

کە پەروەردگار فەرمانی کرد بەموسوڵمانان بۆ چون بۆ غەزا بەشێوەیەکی گشتیو نەفیری عام، برێك لەدووڕووەکان بەبیانووی پڕوپووچەوە خۆیان پاش دا هەندێ موسوڵمانی تریش بەبیانووی جیا جیاوە خۆیان دواخست. ئیتر لەناوەندی سەفەری پێغەمبەرو جەنگاوەرانی ئیسلام بۆ شەڕ ئەم ئایەتانە هاتنە خوارێ.

بەکورتی کە لەئایەتی پێشوودا موسوڵمانانی هەڵنان بۆ جەنگان لەپێناو ئایینی خوداداو سەرزەنشتی تەمبەڵو تەوەزەلەکانی کرد، لێرەدا گەڕایەوە سەریانو پەردەی لەروی کۆمەڵێك هەڵماڵیو ئەوەی راگەیاند: کە لەگەڵ ئەو هەڵنانو تەماع بەرنانە بۆچوون بۆ جیهاد کەچی کۆمەڵێك خۆیان لەچوون بۆ غەزای تەبووك پاش دا هەرچەندە زوربەی هەرەزۆری موسوڵمانان چوستو چالاکانە بەپیر بانگەوازی چوون بۆ جیهاد چوونو خۆیان ئامادە کردو لەخزمەت پێغەمبەر دا کەوتنە رێ چونکە ئەوان چاوەڕوانی یەکێ لەدوو شتە باشەکانیان دەکرد یا سەرکەوتن یان شەهید بوونو مەردانە مردن.

ئیتر ئەم ئایەتانە دەربارەی هەڵوێستی دووڕووەکان هاتوونە خوارێ ئەو دووڕووانەی کە خۆیان لەچوون بۆ غەزای تەبووك دواخست. ئەمە یەکەمجار بوو: کە ئایەتی قورئان نازڵ ببێو موسوڵمانی راستاڵو دووڕوەکان لێك جیا بکاتەوە. بۆیە یەکێك لەناوەکانی ئەم سورەتە، (الفاضحة)یە چونکە پەردەی لەسەر دووڕووەکان لاداو هەڵسو کەوتی دەست نیشان کردن.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: تائەم سورەتی (براءة)ە نەهاتبوە خوارێ پێغەمبەر (ﷺ) مونافیقەکانی باش نەدەناسینو بەوردی شارەزای هەڵسو کەوتیان نەبووا!

بەڵێ قورئان وێنەی خۆپیشاندانی دووڕووەکانو ئەوانەی خۆیان پاش دا بوو بەم شێوە سەرنج راکێشە دەکێشیو دەفەرموێ: ﴿لَوْ كَانَ عَرَضاً قَرِيباً وَسَفَراً قَاصِداً لاَتَّبَعُوكَ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەگەر ئەوەی تۆ بانگەوازی خەڵکەکەت بۆ کرد سوودو قازانجێکی بەیدەست بوایە بەئاسانی بەدەستەوە بهاتایە، پێگەییشتنو وەدەستهێنانی ماندووبوونی زۆرو چەرمەسەری گەرەك نەبوایە، سەفەرێکی کورتو

بـێ تـرس‌و بـێ نارەحـەتی بوایـە هـەموویان شـوێنت دەکـەوتن‌و بـەپیر بانگەوازییەکەتـەوە دەهـاتن، چـونکە خۆشویـستنی مـاددەو هەوڵـدان بـۆ وەدەستهێنانی، شتێکی سروشتییە لەئادەمیزاددا، بەتایبەتی ئەگەر ئەو شتە خۆش‌و ئاسان بەدەستەوە بی‌و ئاکام‌و سەرەنجامی بێ ترس بێ، کورد وتـەنی (خـوڕەی لێوە نەیە) هەروەها ئەوانەی هەولی بۆ دەدەن بڕوایان بەڕۆژی دوایی نەبی‌و چاوەڕوانی پاداشی قیامەت نەبن وەکوو نموونەی ئەو دووڕووانە.

﴿وَلَكِنْ بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ الشُّقَّةُ﴾ بـەلام تـۆ ئـەی پێغەمبـەر! داوای نـەفیری عامـت لەوانەکرد بۆ شوێنێکی دوورو سەفەرێکی سامناک‌و پڕ دەردی‌سەری‌و ئاکام تـرس‌و خۆف گیانبازی‌و خۆفیداکرن، ئەتۆ داوات لێ کردن کە ڕاپەڕن بۆ جیهاد لـەوەرزێکی گـەرم‌و پـڕئێش‌و کـارو کـاتی کۆدکردنـەوەی بـەروبووم‌و میوەجـات، لـەکاتێك دا تـۆ داوای چـوونە دەرەوەت لێ کـردن بـۆ غـەزا کـە سـێبەر خۆشـن‌و چوونە دەرەوە بـۆ سەفەری دوور مایەی ماندووبوون‌و دەردی سەرییە، بۆیە کۆمەڵێك لەو مەنافیقانـە لەترسـان‌و لەتەمبـەڵییان دواکـەوتن‌و لەگـەڵت نـەهاتن بـۆ غـەزا، ئـەوە نیـشانەی ئەوەبوو کە ئەوانە کۆمەڵێکی هەلپەرستـو مادە پەرستـو دونیا ویستن.

جـا وەنـەبێ شـەرم بیـانگرێ‌و سـەری خۆیـان کـز بکـەن‌و دەم درێـژی نەکـەن بەلکوو ﴿وَسَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَوِ اسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ﴾ کە لەغەزای تـەبووك گەڕایـەوە سوێندت بۆ دەخۆن، سوێندی بەدرۆ وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يعتـذرون اليكم اذا رجعتم اليهم﴾ (التوبة:٩٤) یـان ﴿يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا عَـنْهُمْ﴾ (التوبـة:٩٦) سوێند دەخۆن دەڵێن: ئەگـەر بمانتوانیایـە لەگـەڵ ئێـوەدا دەردەچووین بـۆ غـەزا، ئەگەر بیانووی وەرگیراومان نـەبوایە، کۆسـپ‌و تەگـەرەمان نەهاتایـە پـێش، ئێمـەش لەگەڵ ئێوە دەهاتین بۆ غەزا، دواکەوتنمان لەبەر ناچاری بـوو، ئەوانـە بـەم سـوێند خواردنـە بەدرۆیـەیان ﴿يُهْلِكُـونَ أَنفُـسَهُمْ﴾ خۆیـان بـەفتارە دەدەن، خۆیـان شـیاوی سزای سـەختی خـودا دەکـەن، چـونکە سـوێندی بـەدرۆ دەخـۆن، نـاوی خـودا بەکـەم تەماشـا دەکـەن، بۆیـە بـەدرۆ سـوێندی پـێ دەخـۆن‌و دەیکەنـە پـەردەی درۆو دووڕوویيان، ئەوان دەیانەوێ پشتگیری مەبەستە ناڕەواکانیان بەسوێندی درۆ بکەن،

تاوان بەتاوان بەهێز بکەن. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (الیمین الفاجرة تدع الدیار بلاقع) سوێندی بەدرۆ وڵات وێران دەکا.

﴿وَاللَّـهُ يَعْلَـمُ إِنَّهُـمْ لَكَـاذِبُونَ﴾ پـەروەردگار دەزانـێ کـە ئەمانـە لەسـوێند خواردنیان بەخودا درۆ دەکەن، کە دەڵێن: ئەگەر بمانتوانیایەو کۆسپو تەگەرەمان لەپێش نەبوایە لەگەڵتان دەردەچووین، راست ناکەن، توانایان هەبوو: جەستەیان ساغو ماڵو سامانیان هەبوو، هیچ بیانوویان نەبوون. جگە لەتەمبەڵیو خۆویستی.

ئـەمجار پـەروەردگار سەرزەنـشتی پێغەمبـەر (ﷺ) دەکـا کـە ئیزنـی بـڕی دووڕووی دا کە خۆ لەچوون بۆ غەزای تەبووك پاش بدەن. بەڵام سەرزەنـشتەکە تـا بڵێی نەرمو نیانە، پێش سەرزەنشتەکە عەفووی ئاراستە کـردوە ﴿عَفَا اللَّـهُ عَنْـكَ﴾ خودا لێت نەگرێ، خودا عەفووت بکا لەسەر ئەوەی کە بـەئیجتیهادی خـۆت کاتێـك داوای روخصەتیان لێ کردی ئیزنت دان ئەوان بیانووەکەیان درۆو دەلەسە بوو ﴿لِـمَ أَذِنتَ لَهُمْ﴾ بۆچی ئیزنـت دان، بـۆ ماوەیـەك چاوەڕوان نـەبووی‌و خـۆت نـەگرت تـا حەقیقـەتت بـۆ دەربکـەوێ، تـاقمی راسـتاڵو تـاقمی درۆزنـت بـۆ دەربکەوتنایـە! بـۆ خێرا ئیزنت دانو ماوەیەك سەبرت نەگرت؟ ﴿حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَـكَ الَّـذِينَ صَـدَقُوا وَتَعْلَـمَ الْكَاذِبِينَ﴾ هەتا بەتەواوی هەڵوێسستت بۆ روون دەبێتەوە ئەوانەی راستگۆن ئاشکرا ببنو بزانی کێ درۆ دەکا، ئەو کاتە کە هەر دوولات بۆ دەرکەوتن ئەمجار لەروانگەی ئـەوەوە هەڵوێـستت بنوانـدایـە، چـونکە ئەگـەر تـۆ خـۆت بگرتایـەو خێـرا ئیزنـت نەدانایـە، ئـەوان بـەبێ ئـەوەی ئیزنیـشیان بـدەی هـەرخۆیان پـاش دەدا، ئـەو کاتـە حەقیقەتیان دەردەکەوت، پەردەی دووروویان لەسەر لادەدرا، سروشتیان چۆنە ئـاوا دەکەوتنـە بەرچـاوانو نەیانـدەتوانی لـەژێر پـەردەی ئیزنـی پێغەمبـەردا خۆیـان حەشاربدەن.

مەجاهید دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی کەسانێك نازڵ بووە کە لەناو خۆیـان دا بەیەکتریان گوت: داوای روخصەت لەپێغەمبـەر بکـەن ئەگـەر ئیزنـی دان ئـەوە بـۆ خۆتان لێی دانیشن، ئەگەر ئیزنیشی نەدان هەر دانیشنو مەچن. بۆیـە پـەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ کە خاوەن بـڕوا ئیزنـی نەچـوون بـۆ غـەزا داوا ناکـاو دەفـەرموێ:

﴿لا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ﴾ ئەوانەی بڕوایان بەخوداو بەرۆژی دوایی هەیە داوای ئیزنی نەچوون بۆ غەزات لێ ناکەن، هەرگیز خۆیان چوون بۆ غەزا بەماڵو گیان پاش نادەن. بەڵکوو بەبێ منجە منجو داوای روخصەت کردن بەرەو جیهاد رادەچەنو ئامادەو تەیارن، چونکە بڕوایان وایە جیهاد لەخودایان نزیك دەکاتەوەو رێبازی بەرەو بەهەشتە، چونکە جیهاد نیشانەی بیرو باوەڕی تەواوە وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُوْلَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾ (الحجرات:١٥). هەرگیز موسوڵمان دابو نەریتی ئەوەی نیە دەربارەی چوون بۆ جیهاد ئیزن وەرگرێ، ج جایی خۆپاشدانو نەچوون، بەڵکو گەورە گەورەی هاوەڵان لەموهاجیرینو ئەنصار هەمیشە دەیانگوت: ئێمە دەربارەی چوون بۆ غەزا ئیزن لەپێغەمبەر وەرناگرین، چونکە پەروەردگار چەند جار لەقورئان دا ئێمەی هەڵناوە بۆ جیهاد ئیتر سوود لەروخصەت وەرگرتن دا چیە. موسوڵمان ئەوەیە: لەکاتی ئاشتیو فەرەحی دا خۆی ئامادە بکاو چەکو پێویستیاتی غەزا دابین بکا، هەر کە بانگ کرا بۆ غەزا بێ سیو دوو رەگەڵ موجاهیداندا بەرێ بکەوێ.

موسلیمو ئیبنو ماجە فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) لەئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (من خير معاش الناس لهم رجل ممسك بعنان فرسه في سبيل الله يطير على متنة كلما سمع هيعة أو فزعاً طار على متنه يبتغى القتل والموت في مظانه). باشترین ئیشی پیاو ئەوەیە: کە ئەسپێك ئامادە بکا بەزینکراوی لەرێگەی خودادا، حازرو ئامادە باش، هەر کە هاوارێکی گوێ لێ بوو بۆ جیهاد، سواری ئەسپی خۆی ببێ بەرەو مەیدانی شەڕ بەگورجی بەرێ بکەوێو بۆ مەیدانی مردنو کوشتن غار بدا.

﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ﴾ خودا زانایە بەو کەسانەی کە لێی دەترسنو خۆدەپارێزن لەو شتانەی کە دەبنە هۆی نارەزایی خودا، هەوڵ دەدەن ئەو کردەوانەی خودا پێی خۆشە ئەنجامیان بدەن، بۆ رەزامەندی خودا هەمیشە ئامادەن بەماڵو بەگیان خۆیان بەخت بکەنو دژی دوژمنانی خودا بجەنگن.

ئەمە قاعیدەیەکی تۆکمەیە، ئەوانەی ئیمانیان پتەوە بەخوداو بڕوایان بەرۆژی قیامەت هەیە، چاوەڕوانی ئەوە ناکەن ئیزن بدرێن بۆ ئەنجامدانی جیهاد، هیچ خۆیان مەحتەل ناکەن لەبەپیرەوە چوونی بانگەوازی جیهاد بەماڵو بەگیان ﴿إِنَّمَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَارْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ﴾ بەڵکو ئەوانە، داوای ئیزنت لێ دەکەنو روخصەتی نەچوون بۆ غەزات لێ دەخوازن کە ئیمانیان بەخوداو بەرۆژی دوایی نیە، ئەوانە ئیزنت لێ دەخوازن کە دڵیان یەقینی تێدا نیە، خۆیان دەخافڵێنن، هەوڵی دوزینەوەی بڕوبیانوو دەدەن بۆ ئەوەی کۆسپێك دروست بکەن ببێتە پەرژین لەنێوان ئەوانو ئەنجامدانی ئەرکی ئەو عەقیدەیەی کە خۆیان بەپەیڕەوی نیشان دەدەنو بەرواڵەت خۆیان بەهەڵگری ئەو بیرو باوەڕە دەزانن. ئەو لەشكو گومانی خۆیان دا دێنو دەچن، ئەوان شكو گومانیان دەربارەی ئایین هەیە، دڵیان دانەمزراوە، راڕاو دوو دڵن لەکارو گوفتاریان دا، لەکردەوە ئاسانەکانی خوداپەرستی وەکوو نوێژو رۆژو دا، هاوکاری موسوڵمانەکان دەکەن، هەوڵ دەدەن خۆیان لەئەرکە قورسەکان بشارنەوە، بڕو بیانووی جۆراو جۆر دەدۆزنەوە بۆ خۆرزگار کردن لەئەنجام دانیان.

**تێبینی:**

دەربارەی جیهاد لەئایەتی ﴿أَن يُجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ﴾ دەگوترێ جیهاد دوو جۆرە، جیهاد بەماڵ، جیهاد بەگیان. جیهاد بەماڵیش دەبێتە دوو جۆر، ماڵبەخشین لەبواری چەکسازیو دابین کردنی پێویستیاتی مادی جەنگ. ماڵبەخشین بەسەر خودی جەنگاوەرانو ماڵو خێزانیان.

جیهاد بەگیان، چەند جۆرێکە: وەکوو ئەوە بەکردەوە کابرا بچێتە کۆڕی جەنگەوە، ئەمە گەورەترین جۆری جیهادە. یان هەڵنانی موسوڵمانان بۆ جەنگان فەرمان بەجەنگ. یان هەوڵدان لەشوێنی حەساسو کونو کەلەبەری دوژمن، یان فێر کردنی فرتو فێڵی شەڕو ئاگادار کردنەوەی موسوڵمانان بۆ گرتنە بەری رێبازی لەبارو گونجاو بۆ سەرکەوتن. وەکوو ئەوەی لەجەنگی بەدردا حوبابی کوڕی مونذیر عەرزی پێغەمبەری کردو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئەم شوێنەی لەشکربەزیت تێدا کردوە بەڕای خۆتە یان بەنیگا فەرمانت پێ کراوە؟؟ پێغەمبەر

(ﷺ) فەرمووی: بەڵکوو رای خۆمەو وام بەباش زانیوە. حوباب وتی: دەی کەوابێ من پێم وایەو وای بەباش دەزانم کە لەنزیك ئاوەکەوە لەشکربەزی بکەینو ئاوەکە بخەینە پاش خۆمانەوەو ئەو بیرو گۆلاوانەی لەلای دوژمنەوەیە وێرانیان بکەبنو پڕیان بکەینەوە. پێغەمبەر (ﷺ) ئەم رایەی پەسند کردو حوباب چۆنی نەخشە کێشا وا لەشکربەزی کرد...

ئەمجار ئەوە ماوە بزانین ئایا جیهاد بەگیانو بەماڵ گەورەترە یان جیهاد بەعیلم؟! لەراستی دا جیهادی عیلمو زانست جیهادی سەرەکییەو جیهاد بەگیان لقو پۆپە، هەموو کاتێکیش ئەصل لەفەرع لەپێش ترە.

جا ئەگەر نەفیری عام کرا، ئەوە جیهاد بەگیانو ماڵ لەسەر هەموو کەسێك فەرزە. ئەو کاتە خەریکبوون بەجیهاد گەورەترە لەخەریکبوون بەعیلم، چونکە ئەگەر دوژمن دەستی بەسەر موسوڵمانان دا رۆیشت زیانی دەبیو زەحمەتە ئەو زیانە پڕبکرێتەوە، بەڵام فێربوونی زانیاری هەموو کاتێ دەستەبەر دەبێ، هەروەها فێربوونی عیلم فەرزی کیفایەو لەسەر هەموو کەس پێویست نیە.. بەڵام ئەگەر نەفیرەکە گشتی نەبوو، ئەو کاتە جیهاد فەرزی کیفاییە، وەکوو خوێندنو فێربوون وەلێ ئالەم کاتەدا خۆخەریك کردن بەخوێندنو فێربوونی عیلمەوە باشترو گەورەترە، چونکە پلەو پایەی عیلمو زانیاری لەپلەو پایەی جیهاد بەرزترە.

ئەگەر وا رێ کەوت ئەمیری سوپا فاسق بوو لەشکرەکەشی فاسق بوون ئەو کاتەش جیهاد کردن دروستە، چونکە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دوای لەدونیا دەرچوونی چوار جێنشینەکان لەژێر فەرماندەی سەر لەشکری فاسق دا جیهادیان کردوە، ئەوەتا ئەبو ئەییوبی ئەلئەنصاری لەژێر فەرماندەی یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان جیهادی کردوە.

**بەڵگە لەسەر خۆپاشدانی دووڕووەکان بەبێ عوزری ڕەوا، زیانی چوونیان بۆ جەنگ**

﴿ ۞ وَلَوْ أَرَادُوا۟ ٱلْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا۟ لَهُۥ عُدَّةً وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ ٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٤٦﴾ لَوْ خَرَجُوا۟ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُوا۟ خِلَٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾ لَقَدِ ٱبْتَغَوُا۟ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ حَتَّىٰ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَظَهَرَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە کە روخصەت وەرگرتنی دووڕووەکان لەپێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی نەچوونیان بۆ جەنگی تەبووک بەبێ عوزری رەوا بوو، بیانووەکەیان بێ بناغەبوو، ئەمجار بەڵگە لەسەر دووڕووییان دێنێتەوە دەفەرموێ: ئەوان ئەگەر خەیاڵی هاوبەشیکردنی غەزاکەیان هەبوایە خۆیان ئامادە دەکرد، پاشان ئەوە روون دەکاتەوە: کە نەچوونەکەیان بەرژەوەندی موسوڵمانانی تێدابوو، ئەگەر هاوبەشییان بکردایە دەبوونە خۆرکەی نێو سوپای موسوڵمانانو دووبەرەکییان دەخستە ناوڕیزەکانی سوپای ئیسلامەوەو کاریان دەکردە سەر برێ موسوڵمانی بڕوا لاوازو پڕو پاگەندەکانیان دەبیسرانو قسەکانیان وەردەگرتن.

کەوابوو ئایەتەکانی پێشوو پەردە لەسەر بڕو بیانوو دووڕوییەکان لادەدا. ئەم ئایەتانەی ئێرەش بۆ دڵنەوایی کردنی پێغەمبەرو موسوڵمانانەو ڕونکردنەوەی ئەو هۆکارانەیە کە پەروەردگار کردی بەکۆسپو تەگەرەی دەرچوونیان، نەیهێشت ئەوان هاوبەشی بکەن، هەروەها بۆ لادانی پەردەیە لەسەر دووڕویی‌و نهێنییەکانیانو بێ بناغەیی بڕوبیانوویان.

بەکورتی ئایەتەکان خراپەکارییەکانی دووڕووەکان دەردەخەنو خەتەریان لەسەر موسوڵمانان دەست نیشان دەکاو موسوڵمانان لەفرتو فێڵو پیلانەکانیان دەترسێنێ.

لەبڕێ ڕیوایەت دا هاتووە کە ژمارەی ئەو خۆپاشدەرانە (٣٩) کەس بوون. بێگومان ئەو دووڕووانەی خۆیان پاش دا توانای دەرچوونیان هەبوو دەیانتوانی کە رستەی پێویست بۆ هاوبەشیکردنەکەیان دابین بکەن، عەبدوڵلای کوڕی ئەبی کوڕی سەلوولو (الجد)ی کوڕی قەیسیان تێدا بوون، ئەوانیش دەوڵەمەندو پیاو ماقوڵی ناو بنەماڵەی خۆیان بوون. ﴿وَلَوْ أَرَادُوا الْخُرُوجَ لأَعَدُّوا لَهُ عُدَّةً﴾ ئەگەر مەبەستیان بوایە لەگەڵ پێغەمبەرو موسوڵمانان هاوبەشی غەزاکەیان بکردایە، خۆیان بۆ ئامادە دەکرد؛؛ چەکو تفاقو ولاغی سواری‌و شتی تری پێویستیان دابین دەکردو، هەشیان بوو، دەیانتوانی، ﴿وَلَكِن كَرِهَ اللَّهُ انبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ﴾ بەلام پەروەردگار دەرچوونەکەیانی بۆ هاوبەشیکردن پێ ناخۆش بوو، چونکە زیانی بۆ موسوڵمانان تێدابوو، خودا دەیزانی مەبەستیان چیەو سروشتیان چۆنە، دووڕوویییان چەندەو چەند حەزیان لەتێشکانی موسوڵمانە، بۆیە پەروەردگار ترسو لەرزی خستە ناو دەروونیانەوەو کەوتنە بڕو بیانوو دۆزینەوە بۆ خۆدزینەوە، بەهیچ جۆرێ زاتی ئەوەیان نەکرد ڕەگەڵ بکەونو هاوبەشی غەزاکە بکەن ﴿وَقِيلَ اقْعُدُوا مَعَ الْقَاعِدِينَ﴾ پێیان گوترا: دەلەگەڵ پیرەژنو پەککەوتەو منداڵو بێ دەسەڵاتەکان بۆخۆتان بمێننەوە، ئەوە شوێنی شیاوی ئێوەیەو رایەتان ناکەوێ لەریزی پیاوانی جەنگاوەردا بڕۆن بۆ غەزا، ئەوە شوێنی ترسنۆکو بێ هیمەتو دڵ ڕاڕاو دەروون نزمو خوێڕی‌و حیزە پیاوانە، دە بۆخۆتان لەگەڵ ئەو

پڕو پیرێژنانە بمێننەوە!! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ الْخَوَالِفِ﴾ (التوبة:٨٧)

ئەمەش خێرو قازانجی موسوڵمانانی تێدا بوو، بەشداری نەکردنەکەیان بەرژەوەندی عەسکەری زۆری بۆ موسوڵمانان تێدا هەبوو، چونکە هاوبەشی کردنی پیاوانی ترسنۆکو ورەنزم نەك سوودی هەیە، بەڵکو زیانی زۆریشی هەیە، هەبوونی کەسانی خائینو ئەژنۆ شکاوو لەرزۆك لەناو سوپادا مایەی تێشکانو ژێر کەوتنە. دڵنیا بن ئەی موسوڵمانینە! ﴿لَوْ خَرَجُوا فِيكُمْ مَا زَادُوكُمْ إِلاَّ خَبَالاً﴾ ئەگەر ئەوانە لەناو ئێوەدا هاوبەشییان بکردایە هیچ هێزو توانایەکیان بۆ ئێوە زیاد نەدەکرد، بەڵکو سەرباری ئەوەی کە هیچ سوودیان نەدەبوو، ئەم سێ زیانە سەرەکییەشیان بەئێوە دەگەیاند.

یەکەمیان: چەواشەیی لەراو بۆچون دا کە بەعەرەبی پێی دەگوترێ: (خبال) لەبنەمادا (خبال) نەخۆشییەکی عەقڵییە وەکوو شێتی وایە: چەواشەیی لەبیرو بۆچون داو کاردروستی لەکردەوەدا دەخوڵقێنێ.

دووەمیان: ﴿وَلأَوْضَعُوا خِلالَكُمْ يَبْغُونَكُمُ الْفِتْنَةَ﴾ دووبەرەکیو ناشووبیان دەخستە نا ریزەکانتانەوە، دەیانەویست فیتنەییو ترسو دڵەراوکێ لەناوتان دا بڵاو بێتەوە.

سێیەمیان: ﴿وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ﴾ تاقمو گرۆهی واتان تێدایە عەقڵ سووكو سافیلکە، بڕوا لاوازو ترسنۆکو ورە نزمو عەزیمەت روخاو لەبەرامبەر جیهاد، جا ئەگەر ئێوە حاڵو، چۆنیەتی ئەوانە ئاگادار نەبن، ئەو ئاگادارنەبوونەتان شەڕ دەکێشێ بۆ بەرپابوونی شەڕو فەساد لەنێو موسوڵمانان دا!

کەوابوو بەشدار نەبوونەکەیان هەزار جار باشتربوو لەبەشداربونیان. ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾ خودا ئاگادارو زانایە بەحاڵو چۆنیەتی ستەمکاران دەزانێ چ بووەو چ دەبیو چ نابێ، لەسەر هەموو کردارو هەڵوێستێکیان سزاو پاداشی شیاوی خۆیان دەداتەوە.

ئـــەمجار پـــەروەردگار هەڵوێـــستێکی ریـــسوا ئـــامێزی رابووردوویـــان وەبـــیر پێغەمبەر دەهێنێتـەوە، جۆرێکی تـر لەمـەکرو حیلـەی دووڕووەکانو دڵ پیـسییان دەردەخاو دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ ابْتَغَوْا الْفِتْنَةَ مِنْ قَبْلُ﴾ بێگومان ئەو دووڕووانە لـەوەپێش لەرێگەی چوون بۆ غەزای ئوحوودا ویستیان دووبەرەکیو فیتنەیی بخەنە نـاو ریـزی موسـوڵمانانەوە، ئـەو کاتـەی کـە عەبـدوڵڵای کـوڕی ئوبـەی سـەرۆکی دووڕووەکـان لـەنێوان مەدینــەو ئوحــوودا گەڕایــەوەو سـێیەکی سـوپاکەی لەگـەڵ دا گەڕایـەوە، بەخەڵکەکەی دەگوت: پێغەمبەر شوێن قسەی منداڵو پاڵ کەوتووەو هیـچی بـەڕای ئێمە نەکرد، دەی کەوابێ لەپێناو چی دا ئێمە خۆمان بەکوشت بـدەین. نزیـك بـوو بـەنو سـەلەمەو بـەنو حـاریثـەش شـوێنی بکـەون بـەڵام خـودا پاراسـتنیو ئـەو ریسوابییەی بەسەرشان دا نەهێنان وەکوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلاَ وَاللّهُ وَلِيُّهُمَا﴾ (آل‌عمران:١٢٢).

ئەو کاتەش دەرچوونی ئەو مونافیقانە لەناو ڕیزی موسوڵمانان دا خەتەرێکی کاریگەر بوون.

﴿وَقَلَّبُوا لَـكَ الأُمُـورَ حَتَّـى جَـاءَ الْحَـقُّ وَظَهَـرَ أَمْـرُ اللّـهِ وَهُـمْ كَـارِهُونَ﴾ ئـەو دووڕووانـە جۆرەهـا فـرتو فێڵیـان ئـەنجام دا دژی پێغەمبـەرو پەیامەکـەی، بیریـان لـەوە دەکـردەوە: چـۆن بـەرگری پـەیامی ئیـسلام بکـەن، لەلایەکـەوە پەیوەنـدییان بەجوولەکەکانەوە هەبوو لەلایەکی ترەوە پەیوەنـدییان بەموشـریکەکانەوە هـەبوو، هەرچـی دژایەتیـەکی ئــەو دوو لایەنــە دژی موســوڵمانان ئــەنجامیان دەدا ئــەو دووڕووانە دەستیان تێیدا هـەبوو، هاوکـارو هـەم ئاهـەنگیان بـوون، هـەتا یارمـەتی خودا گەییشتو ئایینی ئیسلام سەرکەوتو شەرعو یاسای باڵا دەست بـوو قەڵاچـۆی جولەکـەکان کـراو بـەنو نـەضیرو بـەنو قـورەیظە بـەو دەردە چـون کـە پێـی چـون سەرچاوەی بتپەرستیو شیرك بەگرتنی مەککە لـەناو چـوو، ئـەو دووڕووانـە پێیـان ناخۆش بوو.

**بڕو بیانووی مونافیقەکان بۆ دواکەوتن لەغەزای تەبووك و ناپاکییان بەرامبەر موسوڵمانان**

﴿وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ ٱئۡذَن لِّي وَلَا تَفۡتِنِّيٓۚ أَلَا فِي
ٱلۡفِتۡنَةِ سَقَطُواْۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ
بِٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾ إِن تُصِبۡكَ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡۖ
وَإِن تُصِبۡكَ مُصِيبَةٞ يَقُولُواْ قَدۡ أَخَذۡنَآ أَمۡرَنَا مِن
قَبۡلُ وَيَتَوَلَّواْ وَّهُمۡ فَرِحُونَ ﴿٥٠﴾ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا
مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوۡلَىٰنَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ
ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلۡ هَلۡ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحۡدَى
ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ وَنَحۡنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمۡ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٖ
مِّنۡ عِندِهِۦٓ أَوۡ بِأَيۡدِينَاۖ فَتَرَبَّصُوٓاْ إِنَّا مَعَكُم
مُّتَرَبِّصُونَ ﴿٥٢﴾﴾

دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ژمارە (٤٩) طەبەرانیو ئەبو نەعیمو ئیبنو مەردەویهی لەئیبنو عەبباسەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: کە پێغەمبەر (ﷺ) ویستی بچێ بۆ غەزای تەبوك بەجەددی کوڕی قەیسی فەرموو: ئەی جەددی کوڕی قیس! رات چۆنە دەربارەی جیهاد کردن لەگەڵ رۆمەکان دا؟ لەوەڵام دا وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من بابایەکی خاوەن خێزانم، هەرکاتێ ئەو ئافرەتە لاملـ

زەردانەی رۆم ببینم خۆم پێ راناگیرێو دەکەومە هەڵەوە، ئیزنم بدەو تووشی فیتنەییم مەکە ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ ائْذَنْ لِي﴾ نارده خوارێ.

لەڕیوایەتێکی تردا کە ئەبو حاتەمو ئیبنو مەردەویهی لەجابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ریوایەتیان کردوە: دەڵێ: (جەد) کە لەپیاو ماقوڵانی دووڕووەکان بوو عەرزی پێغەمبەری کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خودا رێگەم دەدەی نەیەم بۆ غەزا؟ چونکە من پیاوێکم زۆرم ئارەزۆ لەئافرەتە دەترسم ئەگەر ئافرەتی بەنولئەصفەر ببینم تووشی فیتنەیی ببم! پێغەمبەر (ﷺ) کە لەو کاتەدا روی لێ وەرگێڕابوو فەرمووی وا ئیزنم دای!

دەربارەی ئایەتی ﴿إِن تُصِبْكَ حَسَنَةٌ.....﴾ ئیبنو ئەبی حاتەم لەجابیری کوڕی عەبدوڵلاوە، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ئەو کۆمەڵە دووڕووەی لەمەدینەدا مابوونەوە پڕوپاگەندەی ناخۆشو جۆراو جۆریان بڵاو دەکردەوە، دەیانگوت: موحەممەدو هاوەڵانی لەم سەفەرەیان دا تووشی دەردی سەری بوونو بەهیلاکچوون پاش ماوەیەك هەواڵی بەدرۆ کەوتنەوەیان پێ گەیی، هەواڵ هات کە پێغەمبەرو هاوەڵانی ساغو سەلامەتن، ئیتر دووڕووەکان بەم هەواڵە زۆر نارەحەت بوون ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿إِن تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ﴾ ناردەخوارێ. پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەئایەتەکانی پێشووەوە ئەوەیە: ئەمانیش وەکوو ئایەتەکانی رابوردو خراپەکارییەکانی دووڕووەکان دەردەخەنو جۆرێکی تر لەفرتو فێڵەکانیان ئاشکرا دەکەن، ئەوەش دەردەخەن کە مونافیقەکان پێیان ناخۆشە موسوڵمانان توشی خۆشی ببن، زۆر دڵخۆشو تەڕدەماخن کە دەبیسن موسوڵمانان تووشی زیان بوون، دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ ائْذَنْ لِي وَلَا تَفْتِنِّي﴾ لەو کۆمەڵە مونافیقانە هی وا هەیە پێت دەڵێ: ئەی موحەممەد! روخصەتم بدە بۆ خۆم دانیشمو نەیەم بۆ غەزای تەبووك، بەهۆی چوونە دەرم لەگەڵ خۆت دا مەمخەرە گۆمی تاوانەوە، لێم گەڕێ با نەیەمو تووشی داوی ژنە رۆمییان نەبم، ئەگەر چاوم پێیان بکەوێ زۆر زەحمەتە خۆم پێ رابگیرێ. بەڵێ بەو جۆرە بڕو بیانووی پڕوپووچ دەدۆزنەوە، خۆیان بەخاوەن شەرمو ناموس نیشان دەدەن. ئیتر پەروەردگار رەدیان دەداتەوەو بەدرۆیان دەخاتەوە، چۆنیەتیو حەقیقەتیان دەردەخاو دەفەرموێ: ﴿أَلَا

﴿فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا﴾ واتە: ئەوان بەم بڕوبیانووەوە بێ سەرو بەرەیان، بەم خۆهەڵکێشان، خۆ بەخاوەن شەرەف نیشاندانەیان، کەوتوونە نێو دەریای تاوانی جۆراو جۆرەوە، ئەوان کاتێ ئەم بڕو بیانوە درۆیانە دەدۆزنەوە، خۆیان لەجیهاد دوادەخەنو لەچوون بۆ غەزا خۆیان دەشارنەوە بەبیانووی ئەوەی گوایە چاویان بەئافرەتی رۆمی نەکەوێو بەخەیاڵی خۆیان تەماشای ئافرەتی نامەحرەم نەکەن!

﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ﴾ بێگومان دۆزەخ چواردەوری کافرانی داوە لەچنگی رزگاریان نابێ، تەعبیرە قورئانییەکە وێنەی دیمەنەکە وا دەکێشێ، وەکوو ئەوە بڵێی فیتنە چاڵێك بێ وەکوو بیر فیتنە خوازان تێی دەکەون؛ لەولاشەوە دۆزەخ دەورەی داون، هەموو کونو کەلەبەرێکی لێ گرتوونو چی بکەن رزگاریان نابێ، رێگای هەڵاتنیان نیە. لەهەمان کات دا هەڕەشەیەکی توندو تیژو ترسناکەو نیشانەی ئەوەیە: کە ئەوان ئەهلی دۆزەخن لەبەر تاوانی زۆرو بێ شوماریان، دۆزەخ دەبێتە خانووی هەتا هەتاییان لەسزای درۆزنیو خۆپاشدانیان لەچوون بۆ غەزاو دەروون نزمییان بۆ ئەو پلەیە کە بڕو بیانووی ئاوا بهێننەوە......

ئایەتەکە بەکینایە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوانە تاوانیان ئەنجام داوەو دەبێ چاوەڕوانی سزای تاوانەکانیان بن، هەروەها کوفرو بێدینیان دەچەسپێنێ، هەرچەندە ئەوان بەرواڵەت خۆیان بەموسوڵمان خۆپیشان دەدەن.

ئەمجار پەروەردگار لەجۆرێکی تر لەفرتو فێڵی دووڕووەکانو دەروون پیسیان، پێغەمبەر ئاگادار دەکاتەوە پەردە لەسەر دژایەتیو دوژمنایەتییان هەڵدەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِن تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ﴾ ئەگەر ئێوەی موسوڵمانو خوداپەرست تووشی خۆشیو خێرو بێرێك ببن؛ لەغەزایەك دا سەرکەوتن بەدەست بێنن وەکوو جەنگی بەدر ئەوان دڵتەنگ دەبنو پێیان ناخۆشە، چونکە ئەوان خێرو خۆشییان بۆ پێغەمبەرو بۆ موسوڵمانان ناوێ.

لەلایەکی ترەوە ﴿وَإِنْ تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُوا قَدْ أَخَذْنَا أَمْرَنَا مِنْ قَبْلُ﴾ ئەگەر بەڵاو ناخۆشییەکتان تووش بێ، تێشکانو هەڵاتنو پاشەکشە کردنو کوشتنو بریندار بوونیان تووش ببێ وەکوو ئەوەی رۆژی جەنگی ئوحود بەسەرتان هات؛

ئەوە دەڵێن: ئێمە زوو بۆخۆمان ئەوەمان دەزانیو هەرزو حیسابی ئەوەمان کردبوو خۆمان لێ پاراستو خۆمان نەخستە ناو ئەو گێژاوەوە خۆمان لەشەڕەکە پاش داو کەنارگیریمان کردو خۆمان بەفتارە نەدا، ئێمە بۆخۆمان پێش بینی ئەوەمان کردبوو ئەم تێشکانەمان لەپێش چاوبوو ﴿وَيَتَوَلَّوا وَهُمْ فَرِحُونَ﴾ ئەمجار لەشوێنی ئەم ئاخاوتنەیان هەڵدەستنو بەرەو ماڵو منداڵی خۆیان دەگەڕێنەوە، کەیف خۆشو تەڕدەماخن بەئاکامی لەبەرچاوی هەنووکەیی رووداوەکەو، دڵخۆشن بەوەی کە موسوڵمانان تووشی ئەو ناڕەحەتیو تەنگو چەڵەمەیە بوونو بۆخۆشیان رزگاریان بووە.

ئەوانە بەشێوەیەکی کوێرانەو نەفامانە سەیری رووداوەکان دەکەن، پێیان وایە: هەموو بەڵاو موصیبەتێك لەهەموو حاڵێك دا شەڕو بەدبەختییە، وا گومان دەبەن کە خۆپاشدان لەچوون بۆ غەزاو دانیشتن لەماڵەوە خێرو خۆشی بۆخۆیان دەستەبەر دەکەن، دڵیان بڕوای ئەوەی تێدا نیە خۆیان بەخودا بسپێرنو رازی بن بەقەزاو قەدەری پەروەردگارو دڵنیابن کە خێر لەوەدایە خودا دەیرەخسێنێ.

موسوڵمانی راستو خوداپەرست کۆشش دەکاو هەڵمەت دەباو لەخودا نەبێ لەهیچ ناترسێ، چونکە بڕوای قایمو پتەوەو دڵنیایە کە هەرچی تووشی دەبێ لەخێرو شەڕ پابەندە بەویستو ئیرادەی خوداوە. هەمیشە خودا یارمەتیدەرو پاڵپشتی ئەوانەیە کە خۆیان بەخودا دەسپێرن!

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەری خۆی دەکا: کە وەڵامی ئەم هەڵوێستە نامرۆڤانەی مونافیقەکان بداتەوە، کە بەخێرو خۆشی موسوڵمانان دڵتەنگ دەبنو بەهاتنی بەڵاو موصیبەت بەسەریان دا دڵخۆشو تەڕدەماخن. دەفەرموێ: ﴿قُلْ لَنْ يُصِيبَنَا إِلاَّ مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! پێیان بڵێ: ئەوەی کە خودا لە لەوحولمەحفوظ دا بۆی نەنووسیبین نایەتە رێمان تووشمان نابێ. ئێمە لەژێر چاودێری مەشیئەتو قەزاو قەدەری خودا داین. ئەو سەرپەرشتیارو یارمەتیدەرو رەنگرێژی کارو بارمانە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ مَوْلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَأَنَّ الْكَافِرِينَ لَا مَوْلَى لَهُمْ﴾ (محمد: ١١)

هەرچی بۆمان بڕیار دەداو داویەتی هەمووی بەرژەوەندی ئێمەی تێدایەو خێرە، خودا بۆخۆی سەرکەوتنی سەرەنجامی بۆ موسوڵمانان نووسیوە، لەئاکام دا بەڵێنی سەرکەوتنی پێ داون، هەر بەڵاو نارەحەتیەکی تووشیان دەبێ، ئەوە ئەزمونو تاقیکردنەوەو پەروەردەکردنیانە بۆ گەیشتن بەسەرکەوتنی کۆتایی، بۆ ئەوەی موسوڵمانان بەبەڵگەو چاورونیو هۆشیارییەوە بەو سەرکەوتنە بگەن، بەگوێرەی دابو نەرێتی خوداو لەرێگەی هۆکارەکانی سەرکەوتن، بەگوێرەی هەوڵو تێکۆشان سەرکەوتنێکی گرنگ بەدەست بێنن نەك سەرکەوتنی هەرزانو هیچو پووچ. عیزەتو شکۆمەندییەك بەدەست بێنن: کە جەنگاوەرانی خاوەن ورەو دەروونی بەرز کە ئامادەباشییان تێدایە بۆ بەرەنگاریکردنی هەموو بەڵایەك پارێزگاری بکەن، ﴿هُوَ مَوْلاَنَا وَعَلَى اللّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ با موسوڵمانان تەوەکولیان هەر بەخودا بێ، پشتیان هەر بەو ببەستن، واتە: بڵێ: ئێمە هەر بەخودا پشت دەبەستینو ئەومان بەسە، نابێ موسوڵمانان جگە لەخودا پشت بەهیچ کەسی تر ببەستن، ئەمجار بڕوا بەقەزاو قەدەری خوداو پشت بەستن بەخودا نابێ ببنە لەمپەڕ بۆ دابینکردنی پێویستیاتی ژیان لەشەڕو ئاشتی دا بەگوێرەی توانا، چونکە ئەوە فەرمانی خودایە بەرونو ئاشکرا فەرمان بەموسوڵمانان دەکا: کە هەرچی لەتوانایان دا هەیە لەچەکو تفاق بۆ بەرامبەری کافران دابینی بکەن ئەی ئەوە نیە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ.....الآية﴾

ئاشکراشە جۆری دابینکردنی پێویستیاتی جەنگ زۆرو هەمە جۆرن، خۆپاراستن لەکێشەو دووبەرەکی لەناو ریزی موسوڵمانان دا بەشێکە لەخۆسازدانو بەرامبەری کردنی دوژمن. هەوڵدان بۆ یەکیەتیو تەبایی بەشێکە لەو خۆسازدانە. هەر کەسێك فەرمانی خودا بەتەواوی جێبەجێ نەکا پشتی بەتەواوی بەخودا نەبەستووە، کەسێك پێویستیاتی ژیان لەکاتی جەنگو لەکاتی ئاشتی دا دابین نەکاو هەوڵ نەدا بۆ وەدەستهێنانیان مانای وایە وەکوو پێویست پشتی بەخودا نەبەستووە.

لەلایەکی ترەوە موسولمان کاروباری هەموو خێرو چاکەیە، سەرکەوتن بەدەست بێنی یان شەهید ببێ. کافر هەموو ئیشێکی بەدبەختیو چارەرەشییە، راستەوخۆ سزای خودایان تووش ببێ، یان بەدەستی موسولمانان بکوژرێن.

ئەمجار پەروەردگار رێنموویی پێغەمبەر دەکا: کە وەلامێکی تری ئەو مونافیقانە بداتەوە کە بەوە دلخۆش دەبن موسولمانان تووشی بەلاو نارەحەتی ببن دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَا إِلاَّ إِحْدَى الْحُسْنَيَيْنِ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بەو دووڕووانە بلێ: ئایا ئێوە جگە لەیەکێ لەدوو ئاکامی باش چی تر بۆ ئێمە چاوەڕوان دەکەن؟ ئایا جگە لەسەرکەوتنو ظەفەر، یان شەهید بوونو پاداشی باشی قیامەت چی تر بۆ ئێمە چاوەڕوانن؟ ئێمە ئەگەر بژیین بەسەر بەرزیو ژیانی شکۆمەندیو خوداپەرستی ژیان بەسەردەبەین، ئەگەر بمرین بەشەهیدی دەمرین، سەر بەرزو پیاوانە دەچینە دەشتی مەحشەر (هەزار وتەنی: مەردانە مردن نەك ژنانە ژین).

﴿وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَنْ يُصِيبَكُمُ اللَّهُ بِعَذَابٍ مِنْ عِنْدِهِ أَوْ بِأَيْدِينَا﴾ وەلحال ئێمە چاوەڕوانی یەکێ لەدوو ئاکامی خراپین کە تووشی ئێوە ببێ؛ یەکەمیان ئەوەیە: خودا لەلایەن خۆیەوە سزایەکتان بۆ دێنێ، لەئاسمانەوە گرمەو هەورەبروسکەو زریانێکتان بۆ بنێرێ، یان بوومەلەرزەو بورکانێکتان لەژێرەوە لێ هەڵسێنێو غافلگیرتان بکاو لەناوتان بەرێ، دووەمیان ئەوەیە: کە بەدەستی ئێمە تووشی سزای کوشتنو لێدانو بریندار کردنو رفاندنو جۆرەها نارەحەتی تر ببن، ﴿فَتَرَبَّصُوا إِنَّا مَعَكُمْ مُتَرَبِّصُونَ﴾ ئێوە چاوەڕوانی ئاکامی ئێمەبنو ئێمەش چاوەڕوانی سەرەنجامو ئاکامی ئێوەین، هیچ گومانیش لەوەدا نیە هەردوك لامان دەگەینە سەرنجامو ئاکامی خۆمانو ناتوانین خۆمانی لێ لادەین. ئێمە دلنیاین لەوادەی خودای خۆمانو بەلگەی بەهێزمان بەدەستەوەیە، ئێوە هیچ رێنمویەکی چاکتان نیە، شوێن رێبازی شەیتان کەوتوونو گومڕابوون ئێمە شوێن رێبازی خودا کەوتووینو هیدایەتدراوین. دلنیا بن ئێوە لەئێمە شتێك نابینن کە دلتانخۆش بکا، ئێمەش لەئێوە شتێك نابینین کە دلتان ناخۆش نەکا. ئێوە چاوەڕوانی وادەو بەلێنی شەیتان بن، ئێمە چاوەڕوانی وادەو بەلێنی خوداین.

**پووچەڵبوونەوەی خێرو خێراتی موونافیقەکانو**
**بەفیڕۆ چوونی نوێژو خوداپەرستیان**

﴿ قُلْ أَنفِقُواْ طَوْعًا أَوْ كَرْهًا لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمْ إِنَّكُمْ كُنتُمْ قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَا مَنَعَهُمْ أَن تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَاتُهُمْ إِلَّآ أَنَّهُمْ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأْتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمْ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٥٤﴾ فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾

دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ژمارە (٥٣) ئیبنو جەریری طەبەری لەئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: جەدی کوڕی قەیس بەپێغەمبەری گوت: من کە ئافرەتی ڕۆمی ببینم ناتوانم خۆڕابگرمو تووشی فیتنە دەبمو دەکەومە داویانەوە، بۆیە نایەم بۆ غەزا بەڵام بەماڵو سامان کۆمەگی دەکەم ئیتر ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو نازڵ بووە.....

**پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتانە بەئایەتەکانی پێشەوە لەم ڕووەیە:**

لەوەپێش پەروەردگار سەرەنجامی موونافیقەکانی دیاری کرد؛ کە سزادانیا بوو لەدنیاو لەقیامەت دا. ئەمجار بەشوێن ئەوەدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە: کە ئەو دووڕووانە چەندێك کاری باش ئەنجام بدەن وەکوو ماڵبەخشین لەپێناو جیهاددا

لەقیامەت سوودی لێ نابینن، چونکە ئیشەکەیان بۆ ڕیابازیو خۆهەڵنانەوەیەو بۆ داپۆشینی کردەوە ڕیسوا بەرەکانیانە.

مەبەست ئەوەیە: کە هۆکاری سزای دونیاو قیامەت بۆ ئەوان کۆبۆتەوەو هۆکاری راحەتو کامەرانییان لێ تەرەبووە، لەدونیاو قیامەت خۆشی نابینن! ماڵو سامانی زۆریان هۆی ماندوییو شەکەتی دونیایانەو لەقیامەتیش دا بارگرانیو ئاگری دۆزەخە بۆیان.....

ئەوەبوو: برێ لەو دووڕووە خوێڕییانە خۆیان لەغەزای تەبووك دەدزییەوە پێشنیاری ئەوەیان کرد برێ لەماڵو سامانی خۆیان پێشکەش بەپێغەمبەر (ﷺ) بکەن بۆ ئەوەی ناوەراستی عەصاکە بگرن نەك ئەمسەر یان ئەوسەری. ئەمەش دابو نەریتی ئادەمیزادی دووڕووە لەهەموو رۆژگارێك دا خەتی گەرانەوە بۆ خۆیان دەهێڵنەوە. ئیتر پەروەردگار چاوو راوەکەی رەتکردنەوەو بەپێغەمبەری خۆی فەرموو: کە جاری ئەوە بدا کە ماڵبەخشینەکەیان لای خودا مەقبووڵ نیەو بەفیڕۆ دەچێ! چونکە ئەوان ماڵبەخشینەکەیان بۆ ڕیابازیو لەترسانە، لەبیرو باوەڕەوە نیەو بۆ خودا نیە. جا ئەو ماڵو سامانەی دەیبەخشن بەخۆشی خۆیان بێ یان لەترسان بیو بۆ داپۆشینی تاوانەکانیان بیو چاو بەستەکێ بێ لەهەردوو حاڵەکە دا ماڵبەخشینەکەیان بەفیڕۆ دەچیو لای خودا خێرو ثەوابیان ناگاتێ.

﴿قُلْ أَنفِقُوا طَوْعاً أَوْ كَرْهاً لَنْ يُتَقَبَّلَ مِنكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو دووڕووانە بڵێ: چەندێك ماڵو سامان ببەخشن لەرێگەی خوداداو بۆ جیهادو لەبواری کاری خێردا بەخۆشیو بەناخۆشی لێتان وەرناگیریو هیچ پاداشتان بۆ حیساب ناکرێ؛ چونکە ئێوە تاقمو پێرێکی کافرو بێ بڕوان، بڕواتان بەخوداو بەپێغەمبەری خودا نیە، شكو گومانتان هەیە دەربارەی پەیامی پێغەمبەرو ناوەرۆکی ئایینو پێتان وا نیە رۆژی قیامەت پاداش لەسەر کردەوەی چاكو سزا لەسەر خراپەکاری هەبێ.. ﴿إِنَّكُمْ كُنتُمْ قَوْماً فَاسِقِينَ﴾ چونکە ئێوە تاقمگەلێکی فاسقو لەرێ دەرچوون، لەخودا یاخی بوون بێ بڕواو ئیمانن، کردەوەش کاتێك پەسندە کە ئیمانی لەگەڵ بێ؛ وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾ (المائدة:٢٧).

کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّكُمْ كُنتُمْ قَوْماً فَاسِقِينَ﴾ عیللەتو بایيسە بۆ رەتکردنـەوەی ماڵبەخشینەکەیانو وەرنەگیرانیو قبووڵ نەبوونی لەدونیاو قیامەت دا. واتە: هۆی وەرنەگیرانی ماڵبەخشین لێیان ئەوەیە: کە ئـەوان فاسـقو بێ بـڕوان، کـافرو خـودا نەناسن.

﴿وَمَا مَنَعَهُمْ أَنْ تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَاتُهُمْ إِلاَّ أَنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَبِرَسُولِهِ﴾ هیچ شتێ نیە مەنعی ئەوەی لێ کردبن کە ماڵبەخشینیان لێ وەربگیریو خێرو خێراتیان لای خودا پەسند بێ بێجگە لەوەی: کە ئەوانە ئەم سێ رەوشتەیان تێدا کۆبووەتەوە.

یەکەمیان: ئەوەیە: بڕوایان: بەخوداو بەپێغەمبەری خودا نیە.

دووەم: ﴿وَلاَ يَأْتُونَ الصَّلاَةَ إِلاَّ وَهُمْ كُسَالَى﴾ نوێژەکانیان ئەنجام نادەن مەگـەر لەحاڵی تەمبەڵیو تەوەزەلی دا، کە نوێژەکانیان دەکەن بـۆ ڕیبابـازیو خۆپارێزییـە، نەك لەبەر ئەوە دەیکەن کە بڕوایـان بـەواجبی نوێـژ هەیـە. بۆیـەی ناکـەن خـودا پاداشـیان بداتـەوە، لەبەرئـەوە نوێـژەکانیان ئـەنجام نـادەن کـە فـەرمانی خودایـەو بەجێ هێنانی ئەرکی سەرشانیانە. بۆیە لەکاتی ئەنجامدانی نوێژەکانیان لەشـگرانو جەستە قورسن دەڵێی بێگاریان پێ دەکرێ، هیچ دڵو دەروونیان بەنوێژەکە رونـاك نابێتەوەو جەستەیان چوستـو چالاك نابێ.

سـێیەم: ﴿وَلاَ يُنفِقُـونَ إِلاَّ وَهُـمْ كَـارِهُونَ﴾ مـاڵو سـامانیان نابەخـشن لەبەرژەوەنـدی جیهـادو بـواری خێـرو چـاکەی تـردا مەگـەر بەشـێوەیەکی پیناخۆشبوونو نابەدڵو دەڵێی بەزۆر لێیان دەسێندرێ، چونکە ئـەوان ئـەم جـۆرە ماڵبەخشینەیان بەلاوە سەرانەو جەریمەیەو موسوڵمانان سوودی لێ وەردەگرن، نەك خۆیـان، چـونکە خۆیـان بەموسـوڵمان حلێـب ناکـەن، کـەوابێ هـیچ سوودو قـازانجی قیامـەتی لێ ناکـەن، چونکە بـڕواو ئیمـانی لەگـەڵ دا نیـە، لـەدونیاش دا سـوودی لێ نابینن.

بێگومـان ئەمـە نموونـەی دووڕووە لەهـەموو کـاتو سـەردەمێك دا هەمیـشە تـرس سـواری شـانیان بـووەو لەدڵـەڕاوکێ دان دەیانـەوێ خۆیـان بـسازێنن، دڵو

دەروونێکی پیس‌و پۆخەڵ، ڕواڵەتێکی ڕوت‌وقوت لەهێزی گیانی، شتێك دەڵێ کە بەدڵ بڕوای پێی نیە.

نوێژ دەکەن بەتەمبەڵی‌و جەستەگرانی‌و ڕوت‌و خاڵی لەهەموو لایەنێکی گیانی، نوێژەکەیان وا ئەنجام نادەن کە نیشانەی ئیمانی پێوە دیار بێ، چونکە لەناخەوە هەڵنەریان تێدا نیە، بەڵکوو وا هەست دەکەن کە بەزۆر پێیان دەکری‌و ناچارن، هەروەها کە ماڵ‌و سامانی خۆیان دەبەخشن نیشانەی نارەزامەندییان پێوە دیارەو دەڵێی پێستیان دەگروی‌و بەڕو ڕایان دەکێشی. پەروەردگار هەرگیز کردەوەیەك وەرناگرێ کە لەعەقیدەو باوەڕەوە هەڵنەقوڵابێ، ئاوێتەی هەست‌و شعوور نەبووبێ، واقیع‌و هەڵنەر ڕوکنی هەرە گرنگی کردەوەن. نیەتیش پێوەری ڕاست‌و دروستی کردەوەیە. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (انما الأعمال بالنیات وانما لکل امرئ مانوی).

**لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە :**

لەئایەتی پێشوودا وای ڕاگەیاند کە دووڕووەکان دوو تاقم بن: بەشێکیان ماڵیان بەخشیبێ بەئارەزۆی خۆیان‌و بەشێکیان بەزۆرە ملێ ماڵیان دابێ! کەچی لەم ئایەتەدا دەق ئەوەی ڕاگەیاند کە هەر بەزۆرە ملێ ماڵیان دەبەخشن!!!

لەوەڵام دا دەڵێین: ئەوان بەتێکڕایی لەناخەوە پێیان ناخۆشە ماڵ‌و سامانی خۆیان لەجیهادو بەرژەوەندی تری موسوڵمانان دا ببەخشن. وەلێ هەندێ لەوانە کە بێ داوالێکردن بەئارەزۆی ڕواڵەتکاری خۆیان، شتێکیان بەخشیبێ بۆ خۆ هەڵنانەوەو کەشخە کردن، یان شێوەی (تقیە)و خۆنیشان دان بەموسوڵمانی باش، ماڵیان بەخشیوە، کەوابوو ئەگەر شتێکیان دابێ ئەوە لەبەر ئەوە بووە ماڵبەخشینەکەیان بەلاوە ئاسان تر بووە لەوەی بەشداری غەزای تەبووك بکەن، واتە بۆ خۆشاردنەوە لەو سەفەرە سەختە هاتوون پێشنیاری ئەوەیان کردوە: کە بڕێ ماڵ‌و سامان بدەن‌و لەماڵەوە لێی دانیشن. کەوابوو لەڕاستی دا ئەم ماڵبەخشینەیان هەرچەندە بەڕواڵەت بەویستی خۆیانە، بەلام لەڕاستی دا لەترسانەو بەزۆرە. ئەمانیش وەکوو تاقمەکەی تریان لەترسان‌و بەناچاری داویانە.

لەلایەکی ترەوە دەتوانین بڵێین: مەبەست بەوشەی (طوعـاً) ئارەزۆو پێخۆشحاڵی نیە، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە: بێ ئەوەی پێغەمبەرو موسوڵمانان یان سەرۆکەکانی خۆیان زۆریان بۆ بێنن‌و لێیان بسێنن، ئەوان هەرچەندە پێشیان ناخۆشە ماڵی خۆیان داوە. مەبەست بەوشەی (کرها) زۆر لێکردن‌و ناچار کردنیانە بەماڵبەخشین.

بێگومان ئەو دووڕووانە کە بەنابەدڵی‌و بۆخۆ دزینەوەو خۆشاردنەوە ماڵ‌و سامانیان دەبەخشن، دەوڵەمەندو خاوەن کوڕو خزم‌و کەس‌و کاربوون، پیاو ماقووڵ‌و ریش سپی بنەماڵەو خێڵی خۆیان بوون، بەڵام ئەم شتانە لای خودا بەهیچ ناچن، دەبێ لای پێغەمبەرو موسوڵمانیش بێ بایەخ بن‌و بەهیچ نەچن، ئەوانە نیعمەتیان نەدراوەتێ تا پێی دڵخۆش بن، بەڵکوو فیتنەو نیقمەتە خودا بۆی هێناون‌و، مایەی سزاو نارەحەتییانە. کەوابێ ﴿فَلا تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ وَلا أَوْلادُهُمْ﴾ ئەی فروستادە! یان ئەی بیسەر! با ماڵ‌و سامانی ئەو دووڕووانە سەرنجی ئێوە رانەکێشێ، منداڵ‌و کەس‌و کاریان ئێوە نەخاتە حاڵەتی سەرسوڕمانەوە با نازو نیعمەتی کە پێمان داون ئێوە سەرسام نەکا، هەموو ئەو شتانە کە بەڕاڵەت بەنیعمەت دێنە بەرچاو لەراستی دا هۆکاری بەدبەختی‌و چارەرەشییە بۆ ئەوان، ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ بِهَا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ پەروەردگار دەیەوێ بەو ماڵ‌و سامانە لەژیانی دونیایان دا سزایان بدا، ئەوەتا بەماندوبونێکی زۆرو چەرمەسەری کۆی دەکەنەوە، لەپێناو وەدەستهێنانی دا چەند تووشی گێروگرفت‌و دڵەراوکێ دەبن، پاشانیش بەخۆشی‌و ناخۆشی بەنابەدڵی‌و پێناخۆشبوونەوە دەبێ لەجیهاددا خەرجی بکەن، بەزەکات‌و کۆمەگی کردنی موسوڵمانان‌و بەهێزکردنی دەوڵەتی ئیسلام بەشێکی لێ ببەخشن، هەروەها منداڵ‌و کەس‌و کاریان وا دەبێ لەجەنگ‌و روبەڕوبوونەوە دا گیان لەدەست دەدەن‌و ئەمانیش بۆیان بەپەرۆشن‌و چ پاداشیشیان نادرێتێ (واتە: فاسق‌و مەحروومن) ﴿وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَافِرُونَ﴾ بۆ ئەوەی گیانیان دەرچێ بەکافری! لەقیامەت دا سزا بدرێن بەسزای دۆزەخ، چونکە بەکافری دەمرن‌و کردەوەی باشیان هەمووی پووچ کراوەتەوە. واتە: ئەم ماڵ پێدان‌و منداڵ پێدان‌و لەشساغ‌و نیعمەتە جۆراو جۆرانەی پێیان دراوە، هەمووی

لەخشتە بردنو ئیستیدراجە، بۆ زێدە گومڕا بوونیانە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُواْ إِثْماً﴾ (آل‌عمران:١٧٨) یان ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِّنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَى﴾ (طه:١٣١) یان ﴿أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ، نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ بَل لَّا يَشْعُرُونَ﴾ (المؤمنون/٥٥/٥٦).

بەکورتی کردەوەی چاکی کافر وەکوو بەجێهێنانی صیلەی رەحەمو یارمەتیدانی لێقەوماوو ئەم جۆرە شتانە، وێ دەچێ لەژیانی دونیادا سوودی لێ ببینێ، بەڵام لەقیامەت دا چ پاداشتی نادرێتەوە، ئاماژە بەو فەرموودەیەی کە موسلیم لەعائیشەوە ریوایەتی دەکا دەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەرم کرد وتم: ئەی رەوانەکراوی خودا! ئیبنو جووعان لەسەردەمی نەزانی دا صیلەی رەحمی بەجێ دەهێنا، فەقیرو هەژاری نان دەدا، ئایا ئەو کردەوانەی سوودی پێ دەگەیەنن؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نەخەیر سوودی پێ ناگەیەنن؛ چونکە ئەو رۆژێک لەرۆژان لەژیانی دا نەیگوتووە: (رب اغفر لي خطيئتي يوم الدين) واتە: چونکە بڕوای بەخودا نەبوە، لەئەنەسەنەوە گێردراوەتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: پەروەردگار ستەم لەموسوڵمان ناکا بۆ بچووکترین چاکە، لەدونیادا پاداشتی دەداتەوەو لەقیامەتیش دا پاداشی دەداتەوە بەڵام کافر کە لەدونیادا خواردەمەنی دەست دەکەوێ ئەوە بەسونگەی ئەو کردەوانەی کە لەدونیادا بۆ خودا کردوونی، کە چووە ژیانی قیامەتەوە ئیتر هیچ چاکەیەکی نیە پاداشی پێ وەربگرێ.

قسەی پوختو ڕاست ئەوەیە: سوود بینینی کافر لەچاکەی خۆی لەدونیادا بەگوێرەی ویستو ئیرادەی خودایە، هەرکاتێ ویستی لەدونیادا پاداشی بداتەوە دەیداتەوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاء لِمَن نُّرِيدُ﴾ (الأسراء/١٨).

## سوێند خواردنی دووڕووەکانو هەوڵدانی هەل وەدەستهێنانیان بۆ تانەو تەشەردان لەپێغەمبەر (ﷺ)

﴿ وَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ وَلَٰكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ ﴿٥٦﴾ لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَـًٔا أَوْ مَغَٰرَٰتٍ أَوْ مُدَّخَلًا لَّوَلَّوْا۟ إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ ﴿٥٧﴾ وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِى ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنْ أُعْطُوا۟ مِنْهَا رَضُوا۟ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْا۟ مِنْهَآ إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوا۟ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ژمارە (٥٨) بوخاریو نەسائی لەئەبو سەعیدی خودرییەوە دەگێڕنەوە، دەڵێ: لەکاتێك دا کە پێغەمبەر (ﷺ) ماڵو سامانێکی دابەش دەکرد/ ذولخویصیرەی تەمیمی کە (حەقوصی کوڕی زوهەیرەو ماکی خەواریجەکانە) هاتە خزمەتیو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دادپەروەربە، عەدالەتکاری بکاربێنە! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ماڵوێران؛ ئەگەر من عەدالەتکاری نەکەم ئەدی کێ عەدالەتکاری ئەنجام دەدا؟ عومەری کوڕی خەتتاب وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئیزنم بدە با لەملی بدەم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نا وازی لێ بێنە! بێگومان ئەمە هاوەڵو تاقمو دەستەو دائیرەیەکی هەیە یەکێ لەئێوە پێی ناخۆشە نوێژیان لەگەڵ بکا، ڕۆژوویان لەگەڵ بگرێ. ئەمانە لەئایین دەردەچن وەکوو چوون تیر لەکەوان دەردەچێ. ئایەتی ﴿وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ﴾ دربارەی ئەوان هاتۆتە خوارێ.

ئیبنو ئەبی حاتەم لەجابیرەوە ریوایەتێکی لەم سێوە گێراوەتەوە. ئیبنو جەریر لەداودی کوڕی ئەبو عاصیمەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: ماڵو سامانێکی زەکاتیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بەسەر ئەمو ئەودا دابەشی کرد، تا هیچی نەمایەوە، پیاوێکی ئەنصاری چاوی لەم دابەشکردنە بوو، وتی: ئەمە دادی تێدا بەکار نەهاتووە، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ.

ریوایەتی تریش لەم بارەوە هەن بەپێویستم نەزانی راگوێزی ئێرەیان بکەم. سەرجەم ریوایەتەکان ئەوە دەگەیەنن کە ئەوانەی تانەو تەشەریان دەدا لە پێغەمبەر (ﷺ) دووڕووەکان بوون.

پەیوەندی ئەم ئایەتە بەئایەتەکانی پێشوەوە ئەوەیە: دوای ئەوەی کە پەروەردگار ئەوەی راگەیاند کە دووڕووەکان هەموو زیانی دونیاو قیامەتیان لەخۆ گرد کردۆتەوە، ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە کە ئەوان لەهیچ خراپەکارییەك ناپرینگێنەوە، کە پەلاماری سوێندی بەدرۆ دەدەن، لەهەلو فرصەت دەگەڕێن بۆ تانەو تەشەردان لەپێغەمبەر (ﷺ) ئەوەبوو: لەسەر زەکات وەرگرتن لەدەوڵەمەندان تانەیان لێ دەداو دەیانگوت: خزمەکانی پێش دەخاو بەزۆری زەکات بەوان دەدا دادپەروەری لەدابەشکرنەکە دا بەکار ناهێنێ.

بێگومان مونافیقەکان خۆیان خزاندۆتە ریزی موسوڵمانانەوە، نەك لەرووی ئیمانو باوەڕەوە، بەڵکوو لەترسانو بۆ خۆپاراستن، بۆ تەماعو دەسکەوت، ئەمجار سوێندیان دەخوارد دەیانگوت: ئێمە موسوڵمانینو بەباوەڕەوە ئیسلاممان قبووڵ کردوە، ئیتر ئەم ئایەتانە فەصحیان دەکەنو پەردەیان لەسەر لادەبەن، کراسی دووڕوویيان لەبەردەکەن دەفەرموێ: ﴿وَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنْكُمْ﴾ سوێند بەخودا دەخۆنو جەخت دەکەن کە ئەوانە بەراستی لەپێڕی ئێوەنو موسوڵمانن‌و بەدڵ ئایینی ئیسلامیان وەرگرتووە، لەکاتێك دا ﴿وَمَا هُمْ مِنْكُمْ﴾ ئەوان لەتاقمی ئێوە نین، ﴿وَلَكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ﴾ بەڵکوو ئەوانە دەستەو تاقمێکن ترسنۆكو چاوچنووك. لەترس‌و ناچاری دا خۆیان تێکەڵ بەئێوە دەکەن، خۆ بەپێڕی ئێوە حلێب دەکەن. ئەوانە کە ئەو هەموو سوێندانە دەخۆنو خۆیان لەکۆمەڵی ئێوە حسێب دەکەن

﴿لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَأً أَوْ مَغَارَاتٍ أَوْ مُدَّخَلاً﴾ ئەگەر قەلاو پەناگایەکیان چنگ بکەوێ، یان ئەشکەوتو کونە شاخێکیان بدۆزیایەوە، یان کونو نەفەقێکیان لەزەوی دەست بکەوتایەو بیانزانیایە تێیدا ئارام دەگرنو پارێزراو دەبن ﴿لَوَلَّوْا إِلَيْهِ﴾ خۆیان بۆ دەکوتاو پەنایان بۆ دەبردو خۆیان تێ دەخزاندو لەئێوە جیا دەبوونەوە. هەرچەندە ئەم جۆرە شوێنانە خراپترین شوێنو مەسکەنن ﴿وَهُمْ يَجْمَحُونَ﴾ ئەوانە بەراکردنو هەڵپە کردن بۆ یەکێ لەم کونو کەلەبەرانە رایان دەکردو رادەجمین، بەشێوەیەك هیچ شتێ نەدەبوو بیانگرێتەوە، وەکوو ولاخی چەمووشو سەرکەش غاریان بۆ لادەداو واتە: ئەو ناپاکانە هێندە لەتێکەڵی ئێوە بێزارن، هەر روناکایەکیان شك ببردایە خۆیان لەئێوە جیا دەکردەوە..... یان لەبەر ئەوەی زۆر دەترسن پەردە لەسەر ناپاکییەکەیان هەڵبدرێتەوە ئاواتە خوازن شوێنێکیان دەست بکەوێو بۆ لای بەغارو هەڵەداوان بچن، جا با ئەو شوێنە تەنگو تاریكو هەڵدێرو ناخۆشیش بێ.

ئەوان کە لەگەڵ ئێوە دەژین ناچارییەو پێیان ناخۆشە، لەخۆشەویستییان نیە. بەڵام ناچارنو ناچاریش حوکمی تایبەتی خۆی هەیە.

هەر بۆیەشە ئەو ناپاکانە هەمیشە غەمبارو دڵتەنگن کە دەبینن ئیسلامو موسوڵمانان لەپێشکەوتنو سەرکەوتن دان.

ئەمجار سیاقی سوورەتەکە بەردەوام دەبێ لەسەر دەرخستنی نیازو مەبەستو کردارو گوفتاری بەدو نالەباری مونافیقەکان، پەردە لەسەر دووڕوویی بەدرەوشتیان لادەدا، هەرچەندە ئەوان هەوڵ بدەن خۆیان بەپیاو چاك بخەنە بەرچاوو خۆیان دابپۆشن بەڵام نەیانتوانیو ناتوانن، چونکە خودا هەواڵی لێ دان، هەیانبوو تانەو تەشەری لەپێغەمبەر (ﷺ) دەدا، رەخنەی لێ دەگرت دەربارەی دابەشکردنی زەکات بەسەر خەڵك دا بەوە تاوانباریان دەکرد گوایە: دادپەروەری بەکار ناهێنێ. لەکاتێك دا پێغەمبەر (ﷺ) لەهەموو تاوانێك دا مەعصووم بووە، دادپەروەریو رەوشتی پاکو بەرز هەرلای ئەو بەتەواوی هەبوە.

هەیانبوو دەیگوت: پێغەمبەر خۆش باوەڕی گوێ لەمشتەو گوێ لەهەموو قسەیەك دەگرێ، چی پێ بگوترێ باوەڕی پێ دەکا، لەکاتێك دا ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) یەکەم ئادەمیزادی ژیرو بەرچاورونو لێزانو لێهاتوو کار دروست بووە، تەنانەت لای دوژمنانیش چ جایی لای دۆست!

هەیانبوو قسەی ناشیرینو بەدی دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ) بەدەم دا دەهاتو هەڵەوەڕی دەکرد، جا کە لێی ئاشکرا دەبوو، بەسوێندو پاکانە کردنی بەدرۆ خۆی لێ بەری دەکرد. هەیانبوو دەمی خۆی دەپاراست نەیدەوێرا ئەوەی لەدڵی دایە بیڵێ، دەترسا قورئان بێتە خوارێ ناپاکییەکەی ئاشکرا بکا. ئیتر ئەم ئایەتەی دوایی ئەو هەڵوێستو نیازانەی مونافیقەکانمان بۆ روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ﴾ هەندێ کەس لەناو ناپاکان هەیە: کە رەخنەت لێ دەگرێ دەربارەی دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگو زەکاتی ماڵو سامانی دەوڵەمەندان کە لێیان وەردەگرێ، تانەو تەشەرت لێ دەدەن، پڕوپاگەندەی ناشیرینت دەربارە بڵاو دەکەنەوە، گوایە: تۆ فەرقو جیاوازیو لایەنگیری دەکەی لەدابەشکردنی ئەو ماڵو سامانە دا کە دەکەوێتە ژێر دەستت!! ئەوانە کە ئەو پڕوپاگەندانە بڵاو دەکەنەوە لەبەر دڵسۆزییان نیە بۆ عەداڵەتکاری، نیازیان پاك نیەو بۆ دادو ئایین هاوار ناکەن، بەڵکوو ئەوانە بۆ بەرژەوەندی خۆیان هاواریان لێ هەڵساوە، بۆ تەماعو چاوچنۆکی خۆیان شاتە شاتیانە. (بەکوردی شینەکەیان بۆ حسێن نیە بۆ هەریسەیە!)

﴿فَإِنْ أُعْطُوا مِنْهَا رَضُوا﴾ ئەوانە ئەگەر لەو ماڵو سامانە بەشیان بدرێ، زۆر رازینو گوێیان لەهیچ کەسێکی تر نیەو گرنگی بەحەقو عەداڵەتو ئایین نادەن چ نیازو مەبەستێکیان بەو زاراوانە نیەو باسیان ناکەن. ﴿وَإِنْ لَمْ يُعْطَوْا مِنْهَا﴾ ئەگەر لەو ماڵو سامانە بەشیان نەدرێ ﴿إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ﴾ ئیتر دەسبەجێ شێتگیر دەبنو بێ سێوودوو نارەزامەندی خۆیان نیشان دەدەن. چەند ریوایەتێك هەن دەربارەی ئەوانەی پێغەمبەر (ﷺ) بەشی دانو ئەوانەی رەخنەیان لێ گرت:

هەنـدێك دەڵـێن: ئەوانـەی پێغەمبـەر (ﷺ) لەدەسـتكەوتی جـەنگو لـەزەكات بەشی دەدان ئەو تاقمە بوو: كە تازە موسوڵمان بوبوون واتە: (مؤلفة القلوب) بوون، بۆ ئەوە دڵیان لەسەر ئیسلام دابمەزرێ.

هەنـدێ دەڵـێن: ئەوانـەی رەخنـەیان گـرت (ئیبنـو ذیلخوومیـصیرە) سـەرۆكی خەواریجەكان بوو؛ كە لـەكاتێك دا پێغەمبـەر (ﷺ) دەسـتكەوتی جـەنگی حونـەینی دابـەش دەكـرد وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! دادوەرانـە دابەشـی بكـە. وەكـوو لەپێشەوە ئاماژەمان پێ كرد.

هەنـدێكیش دەڵێن: رەخنەگرەكـە (ابـو الجـواط)ی دووڕووبـوو: كـە رەخنـەی لەدابەشكردنی پێغەمبەر گرتو وتی: سەیری ئەم برادەرەی خۆمان ناكەن؟ زەكاتو دەستكەوت، بەسەر شوانو گاوانەكان دا دابەش دەكاو پێـشی وایـە: عەداڵـەت بـەكار دەهێنێ!!

پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: مـاڵوێران! بۆچـی شـوانی دەبێتـە لەكـەو عەیبـە؟ ئەدی موسا شوان نەبوو؟ داوود شوان نەبوو؟ جا كە كابرا رۆیـشت، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ترستان لەئەم كابرایەو هاوەڵانی ببێ ئەمانە دووڕوون.

بەهەرحاڵ دەقە قورئانییەكە ئەوە دەچەسپێنێ كە رەخنەو تانەو تەشەرەكە كۆمەڵێك دووڕوو ئاراسـتەی پێغەمبـەریان كـردوە، كـە گوتووشـیانە، لەبـەر خـاتری دین نەیانگوتووە، بەڵكوو بۆ بەشی خۆیان هاواریان لێ هەڵساوە، بەوە شێتگیر بـوون كە بەشـیان نـەدراوە، ئەمـەش نیـشانەی دووڕوویـیو ناكـەس بەچەییانە، چونكە كەسـێك بـڕوای بەئیـسلام هـەبێ، گومـانی لەرەوشـت بـەرزی پێغەمبـەر دا نـابێ، تەنانەت پێغەمبەر (ﷺ) پێش پێغەمبەرایەتیشی بەراسـتگۆو ئـەمین ناسـراو بـووە، عەداڵـەتكاری لایـەنێكی ئەمانـەتی خودایـەو خراوەتـە سەرشـانی موسـوڵمانانو ئەوانیش پابەندی بوون چی جایی پێغەمبەرەكەیان.

ئاشكراشــە ئــەم دەقــە قورئانییانــە چـیرۆكی روداوو دیـاردەی رابـووردو دەگێڕێتەوە: كە پـێش ئـەم غەزایـە روویـان داوە، كـە لێـرەدا لەناوەنـدی باسـی ئـەم

غەزایە (واتە: غەزای تەبووك) دا دەیخاتەڕوو بۆ وێنە کێشانی حاڵو چۆنیەتی هەمیشەیی دووڕووەکانە.

هەر بەم بۆنەیەوە سیاقی قورئان ڕێگای گونجاوو شیاو بە موسوڵمانانمان پیشان دەدا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوا مَا آتَاهُمْ اللَّهُ وَرَسُولُهُ﴾ ئەگەر ئەوانە بەوە ڕازی بوونایە کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی دیاری دەکردنو دەیدانێ لەدەستکەوتو زەکات نەفسیان پێی دابمرکایەو هەرچەندە بەشەکەیان کەمیش بوایە قنیاتیان پێ بکردایە، ﴿وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ﴾ بیانگوتایە: فەضلو نیعمەتی خودامان بەسەو ڕازین بەو بەشەی پێمان دراوە، ﴿سَيُؤْتِينَا اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَرَسُولُهُ﴾ لەوە بەدوا خودا رزقو رۆژییمان دەدانیو لەدەسکەوتێکی تردا بەشمان زیاد دەکا، پێغەمبەر (ﷺ) بەشی زیاترمان دەداتێ ﴿إِنَّا إِلَى اللَّهِ رَاغِبُونَ﴾ ئێمە ئومێدمان وایە: کە خودا لەفەضلو نیعمەتی خۆی بێ بەشمان نەکا، ئێمە حەزمان لێیە خودا بەشمان بداو، جگە لەخودا لەکەسی تر داوای هیچ ناکەین. ئێمە هەر بۆ لای خودا مەیلو سۆزمان هەیەو حەزمان هەر لەنیعمەتی ئەوە. ئەمەیە ئەدەبو ئەخلاقو ڕەوشتی بەرزو شیاو بەموسوڵمان، ئەمەیە: ئەدەبی نەفسو ئەدەبی ئیمانن، ڕەزامەندی بەدابەشکردنی خوداو پێغەمبەر، ڕەزامەندی گەردنکەچیو قەناعەت، نەك ڕەزامەندی ترسو زۆری!

ئەگەر ئەوانە بەدابەشکرنی خوداو پێغەمبەر ڕازی بوونایە قسەو گفتوگۆو ئاخاوتنو هەڵسو کەوتیان بەو جۆرە بوایە کە گوترا، ئەوە بۆ ئەوان دەبوە مایەی بەختەوەری هەردوو جیهانو ڕەزامەندی خودایان بەدەست دەهێنا، مەبەستی قورئان لێرەدا فێرکردنو ئەدەب دادانی موسوڵمانانە کە هەمیشە بەنیعمەتی خودا ڕازی بن، بەدابەشکردنی دەستکەوتو زەکات کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەنجامی دەدا ڕازی بن، چونکە هەرچی دەیکاو فەرمانی پێ دەکا دادپەروەریو عەداڵەتکارییە، بەرژەوەندی موسوڵمانانی تێدایە، کەوابێ ئەرکی سەرشانی موسوڵمانانە کە ڕازی بن بەبەشی خوداو تەماعی زیاتریان نەبێ...

## ئەو هەشت لایەنەی زەکاتیان بەسەر دابەش دەکرێ

﴿ ۞ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦٠ ﴾

ئەمجار دوای روون کردنەوەی ئەم شێوە ئەدەبە بەرزە شیاوە لەئاستی خوداو پێغەمبەری خودادا، بەدڵو بەگیانو لەناخەوە، نەك بەسەر زارەکی، ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ کە ئیش بەدەست پێغەمبەر نیە، ئەو دابەشکردنە پێغەمبەر لەخۆیەوە ئەنجامی نادا، بەڵکوو فەرمانی خودایەو فەرزی خودایەو دابەشکردنی خودایە، پێغەمبەر تەنها ئەنجامی دەداو هیچی تر. ئەم زەکاتە فەرزێکی خودایيەو بەفەرمانی خودا، پێغەمبەر (ﷺ) لەدەوڵەمەندەکانی دەستێنیو بەسەر هەژارەکان دا دابەشی دەکاتەوە، ئەو کەسانەی کە زەکاتەکەیان بەسەردا دابەش دەکرێ دیاریکراونو قورئان دەستنیشانی کردونو کەس دەسەڵاتی گۆڕانکاریو زیادو کەم تێدا کردنی نیە، تەنانەت پێغەمبەریش مافی ئەوەی نەدراوەتێ، ئەوەتا: قورئان بەئەداتی حەصر ئەو تاقمو گرۆهانە دەست نیشان دەکا کە زەکاتیان بەسەردا دابەش دەکریو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ....الآيـة﴾ موناسەبەو پەیوەندی ئەم ئایەتەش بەئایەتەکانی پێشوەوە ئەوەیە: کاتێك دووڕووەکان رەخنەیان لەشێوەی دابەشکرنی زەکات گرت. پەروەردگار ئەوەیان بۆ روون دەکاتەوە کە زەکاتو صەدەقە بەسەر ئەو هەشت تاقمو گرۆهەدا بەش دەکریو بەس! کەسی تر مافی رەخنەگرتنی نیەو کەس رایەی ناکەوێ تانەو تەشەر لەدابەشکرنی پێغەمبەر بدا، ئەوان کە رەخنە بگرن هەڵەنو پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر حەقەو تەنفیذی فەرمانی خودای کردوە، هێنانی ئەم ئایەتە لەم شوێنەدا زۆر گونجاوو جێی خۆیەتی بۆ

ئەوەی ڕێبازی حەقو عەدالەتکاری لەشێوەی دابەشکردنی زەکات دا ڕوون بکاتەوە، دەوڵەمەندەکان ستەم نەکەن، نەچن جگە لەم صنفانە بیدەن بەکەسانی تر: کە شیاوی زەکات پێدان نین. لەلایەکی ترەوە ئایەتەکە یادخەرەوەیەکی هەمیشەییە: کە ئەو هەشت صنفە شیاوی زەکات پێدانن، هەڵئانی دەوڵەمەندەکانیشە کە مافی هەژاران لەماڵی خۆیان دا دەربکەن، بەبێ منەتکردنو خۆ بەسەردا بادان، حەقی خودا لەماڵو سامانی خۆیان دا بدەن بەئاتاجان.

هێنانی ئەم ئایەتە لەنێوان ئەو ئایەتانە دا کە باسی مونافیقو فرتو فێڵەکانیان دەکەن، بۆ ئاگادارکردنەوەیانە کە ئەوان شیاوی زەکات پێدان نینو نابێ بەتەمابن زەکاتیان بدرێتیو (دەستی خۆیان بن سەریان بدەن).

دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ﴾ نەوەکوو زەکات دەدریو حەقە بیاندرێتێ ئیللا کە دەدرێ: ﴿لِلْفُقَرَاءِ﴾ بۆ فەقیرانە؛ ئەوانەی نەکاسبیان هەیە، نەماڵو سامان. ﴿وَالْمَسَاكِينِ﴾ بۆ هەژاران؛ ئەوانەی کەمێك ماڵو سامانیان هەیە بەلام پێی بەڕێوە ناچن. ﴿وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا﴾ ئەوانەی ئیشو کاری زەکات کۆکردنەوە ئەنجام دەدان. ﴿وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ﴾ ئەوانەی تازە موسوڵمانبوونو هێشتا دڵیان لەسەر ئیسلام دانەمەزراوە، ﴿وَفِي الرِّقَابِ﴾ بۆ کۆیلە ئازاد کردن ئەوانەی کۆیلەن، پارەیان دەدرێتێ بۆ ئەوەی خۆیان ئازاد بکەن! ﴿وَالْغَارِمِينَ﴾ ئەوانەی قەرزدارن، بەمەرجێك پارە قەرزکردنەکەیان بۆ پرۆژەی بێدینی نەبووبیو لەقەرز کردنیش دا زێدەڕەویان نەکردبێ. ﴿وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ هەروا دەدرێ بەوانەی لەرێگەی خودادا تێدەکۆشن، جا تێکۆشانەکەیان جەنگان دژی کافران بێ، یان قوتابی ئایینی بن، یان بانگەوازی ئیسلامی بلاو بکەنەوە.

﴿وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً﴾ ئەم زەکاتە فەرزێکە خودا پێویستی کردوە، ئەرکێکی سەرشانی دەوڵەمەندانە خودا واجبی کردوە. ﴿مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ خودا زاناو دانایە لەحوکمو بڕیاری دا، هیچ ئیشێکی بێ حیکمەت نیە.

بەڵگە لەسەر ئەوەی کە وشەی (الصدقات) مەبەست پێی زەکاتی واجبە. ئەوەیە: یەکەم (ال) لەوشەی (الصدقات) دا ئەلفو لامی عەهدو ذوکرییە، ئەوەی

لەوەپێشیش باس کراوە زەکاتی فەرزەو زاجبە، کە لەئایەتەکەدا ئاماژەی پێ کراوەو دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ﴾ دووەم: پەروەردگار بە(لامی تەملیك) مافی ئەو هەشت صنفانەی لەزەکات دا چەسپاندوەو کردویەتی بەملکی ئەوان، ئەوەی کە دەکرێ بەملکیان زەکاتی واجبە، چونکە لەئایەتەکەدا بەشێك بۆ ئەو کارمەندانە دیاری کراوە کە بەسەر کۆکردنەوەو حیسابکردنی دا رادەگەن، دەی کارمەند بۆ زەکاتی زاجب دادەنرێ نەك بۆ زەکاتی مەندوب. هەروەها چونکە زەکاتی مەندوب دەتوانرێ بدرێ بەغەیری ئەو صنفانەش...

**ئەو شتانەی زەکاتیان تێدایە چوار شتن:**

پارەو پوولو ئاژەڵ، بەروبومی کشتوکاڵو کاڵای بازرگانی.

**لێرەدا لێکۆڵینەوەیەك هەیە:**

١- ئیمامی شافیعی بەلایەوە پێویستە هەموو زەکاتێکی واجب وەکوو زەکاتی چوار جۆرەکە (پارە، ئاژەڵ، بەروبوم، بازرگانی)و زەکاتی سەرفیترە، بدرێ بەو هەشت صنفانەی ئایەتەکە ئاماژەی پێ کردون، دەڵێ: چونکە ئایەتەکە بە (لامی تەملیك) ئەو زەکاتەی کردوە بەمافی ئەو کۆمەڵانەو بە(واوی تەشریك) بەشدارییانی چەسپاندوە، بەشکردنەکەی بەوشەی (انما) کورت هەڵێنانەوە لەو هەشت صنفانە دا. کەوابێ ئایەتەکە دەڤە لەوەدا کە زەکاتە واجبەکان ملکی ئەو هەشت پۆلانەیەو خۆیان لەناو خۆیان تێیدا هاوبەشن. هەر بەلای شافیعییەوە کەسێك زەکات یان سەرفیترەی دا دەبێ لەهەر صنفەی لەسێ کەس کەمتری نەدا، چونکە کەمترین کۆ سێ کەسە. (أقل الجمع ثلاثة).

٢- سێ پێشەوایانی تر پێیان وایە: دروستە زەکاتەکان بدرێن بەیەك صنف. هەروەها بەلای ئەبو حەنیفەو مالیکەوە دروستە بدرێ لەهەر صنفەی بەیەك کەس. چونکە ئایەتەکە تەخییری تێدایە لەنێوان صنفەکان دا. ئاماژە بەوە کە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاء فَهُوَ خَيْرٌ لُّكُمْ﴾ (البقرة: ٢٧١) هەروەها لەپێغەمبەرەوە فەرموودەیەك هەیە: کە کۆمەڵێك لەمەعاذەوە ریوایەت دەکەن: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (أمرت أن آخذ الصدقة من اغنيائكم، وأردها

علی فقرائکم) دەی ئەوەتا لەفەرمووده‌یەکەدا تەنیا یەك صنف باس کراوە کە صنفی فەقیرانە. بەڵگەیان لەسەر ئەوە: کە دروستە لەهەر صنفەی بدرێ بەیەك کەس، ئەوەیە: دەڵێن: (أل) لەجەمعی موعەرەف دا بەمەجاز جینس دەگەیەنێ، واتە: جینسی صەدەقە بۆ جینسی فەقیر، دەی خۆ جینسی فەقیر بەیەك کەس دێتە جێ کەوابوو (أل) بەمەجاز بۆ جینس بەکاردێ چونکە محاڵە بۆ حەقیقەت بەکاری بێ، کوا دەتوانرێ زەکات بدرێ بەهەموو هەژارێك، واتە: ناگونجێ کابرا هەزار دیناری زەکات هەیە بیدا بەهەموو فەقیران!!؟

**رونکردنەوەی هەشت صنفەکان کەمێ بەدرێژی بەم جۆرەیە:**

**یەکەم:** تاقمی فەقیران، ئەوانەی پێویستیان بەیارمەتیدانی ماڵی هەیەو دەوڵەمەندنین، بەڵکوو هیچیان نیە.

**دووەم:** مسکێنو هەژار ئەوانەن کە هەندێ دەرامەتیان هەیە بەڵام بەشیان ناکاو پێی ناژین.

زاناکانی شەرع راجیاییان هەیە دەربارەی فەقیرو مسکێن لەوەدا ئایا کامەیان حاڵی خراپترە؟

شافیعییەکانو حەنبەلییەکان، پێیان وایە: فەقیر حاڵی لەمسکێن خراپترە، ئەمان دەڵێن: فەقیر کەسێکە هیچی نەبێ، نەماڵو سامانی هەبێ، نەکارو کاسبیشی هەبێ بتوانێ ژیانی خۆی دابین بکا. بەڵام مسکێن ئەو کەسەیە. مڵکو ماڵی هەبێ، کارو کاسبی هەبێ بەڵام بژێوی دابین نەکا.

حەنەفییەکانو مالکییەکان بەپێچەوانەی شافیعیەکان حەنبەلییەکانەوەنو دەڵێن: مسکێن حاڵی خراپترە. ئەم راجیاییە چ بەرومێکی ئەوتۆی لێ شین نابێ، چونکە هەر دوتاقمەکە زەکاتیان پێ دەدریو خێرو صەدەقەیان پێ دەشێ، ئەم راجیاییە کاتێك بەروبوومی دەبێ کە کابرایەك وەصیەت بکا فلانە شتی بۆ فەقیران بێ بەشی مسکێنانی لێ نەدرێ، یان بەپێچەوانەوە، یان کابرا شتێك دابنێ بۆ فەقیرانو شتێکی تر بکاتە وەصیەت بۆ مسکێنان ئەو کاتە پێویستە شوێن رێبازی تاقمێك لەم زانایانە بکەوین.

بەلگـەی شـافیعیەکانو حەنبەلییـەکان ئەوەیـە: دەڵـێن: پـەروەردگار لەئایەتەکەدا فەقیرەکانی پێش خستووە، چونکە ئاتاجیان زیاترە، هەروەها قورئان دەفـەرموێ: ﴿أَمَّـا الـسَّفِينَةُ فَكَانَـتْ لِمَـسَاكِينَ....﴾ (الكهـف:٧٩) ئـەوەتا ئەمانـە کەشتییان هەبووەو مسکێنیش بوون؛ هەروەها پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: (اللهم انـي أعوذبـك مـن الفقـر.....) وەکـوو لەریوایـەتێکی حـاکم دا هـاتووە کـە لەئـەبو سەعیدی دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کە دەپاڕایەوە دەیفەرموو: (اللهم أحـيني مـسكينا، وأمـتني مـسكينا، واحـشرني في زمـرة المـساكين) دەی نـاگونجێ پێغەمبـەر پەنابگرێ لەشتێکی خراپو دوایی داوای شتێکی خراپتر بکا.

کەوابوو مسکێن ئەو کەسەیە کە شتێکی هـەبی‌و بەشی ژیـانی نـەکا. ئـەوەتا: زانایانی زمانی عەرەبی: وەکوو ئیبنولئەنباری دەڵێن: مسکێن: بەکەسێك دەگـوترێ شـتێکی هـەبێ بیخـوا، فـەقیر: کەسـێکە هیـچی نـەبێ. دەڵـێن: لـەزمانی عـەرەبی دا فەقیر کەسێکە برِێ فەقەراتی پشتی لەبـەر نـەبوونی بـژێوی دەرهـاتبن واتـە: هـیچ حاڵێك لەوە ناخۆشتر نەبێ.

هـەروەها شـەیخان (موسـلیمو بوخـاری) ریوایـەتێك لەئـەبو هـورەیرەوە دەگێڕنەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویـەتی: (ليس المسكين بهذا الطواف الذي يطوف على الناس فترده اللقمة واللقمتان، والتمرة والتمرتان، قالوا: فما المـسكين يارسـول الله؟ قال: الذى لايجد غنىً يغنيه، ولا يُفطَنُ له فيَصدق عليه، ولا يسأل الناس شيئاً).

بەلگەی حەنەفییەکانو مالکییەکان لەسەر بۆچونەکەیان کـە دەڵێن: مـسکێن لەفەقیر حـاڵی خـراپترە. ئەوەیـە: پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿أَوْ مِـسْكِيناً ذَا مَتْرَبَـةٍ﴾ (البلد:١٦) واتە: پێستی جەستەیان بەگڵو خۆڵەوە نووسابێ. کـە نیـشانەی ئاتـاجو نەبوونیەتی...

برِێ لەزنایانی زمانیش وەکوو ئەصمەعی‌و ئیبنو سیکیت گوتوویانە: مـسکێن کەسـێکە هیـچی نـەبێ، فـەقیر کەسـێکە شـتێکی هـەبێ بـەلاّم بەشـی بـژێوی نـەکا. هەروەها مسکێن ئـەو کەسـەیە کـە لەهـەر شـوێنێك بـوو نیـشتەجێ دەبی‌و شـوێنی تایبەتی نەبێ ئەمەش ئەوپەڕی هەژاری‌و نەبوونییە.

ئەوەی ئاشكراو نومایانە زانایانی زمانیش راجیاییيان هەیە. كەوابوو زانایانی شەرعیش كە لەم بارەوە راجیاییيان لەناو دا پەیدا بووە، لەسەر بنەمای راجیایی زانایانی زمان سەری هەڵداوە.

بەهەر حاڵ هەموو لایەك لەسەر ئەوە كۆكن كە (فقراو مساكین) دوو صنفن‌و زەكاتیان پێ دەشێ.

ئەبو یوسفو موحەممەد؛ هاوەڵانی ئەبو حەنیفە، دەڵێن: (فقراء)و (مساكين) یەك صنفن.

ئەم خیلافە كاتێ سوودی هەیە، كە كابرایەك سێیەكی ماڵ‌و سامانی خۆی بكاتە وەصیەت بۆ فلان‌و بۆ فەقیرو مسكێنان. جا ئەوانەی كە دەڵێن: یەك صنفن، فلانەكە نیوەی سێیەكەكەی دەكەوی‌و فەقیرو مسكێنەكانیش نیوەكەی تری دەبەن.

لەسەر رای ئەوانەی كە دەڵێن؛ دوو صنفن سێیەكە ماڵی كابرا دەكرێتە سێ بەش، بۆ فلانەكەس بەشێكو بۆ فەقیرەكان بەشێكو بۆ مسكێنەكانیش بەشێك.

**ئەندازەی فەقیری چەندەو كەی ئادەمیزاد بەهەژار دادەنرێ...؟**

زانایانی شەرع لەسەر ئەوە كۆكن؛ كەسێك خادیم‌و خزمەتكاری هەبی‌و بەڵام نەتوانێ بێ ئەو خادیمە هەڵبكا بۆی هەیە زەكات وەربگرێ، زەكاتدەر دەتوانێ زەكاتی بداتێ، جگە لەوە راجیایی هەیە:

١- ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: كەسێك بیست دیناری زێڕ یان دووسەد دیرهەمی هەبێ نابێ زەكات وەربگرێ ئەبو حەنیفە نیصابی زەكاتی داناوە بەرێژەی فەقیری‌و دەوڵەمەندی، چونكە وەكوو كۆمەڵێك لەمەعازەوە فەرموودەیەك ریوایەت دەكەن دەڵێ پێغەمبەر فەرمووی: (أمرت ان آخذ الصدقة من أغنيائكم، واردها في فقرائكم) ئەوەتا كەسێك ئەو ئەندازە ئاڵتونەی هەبێ یان ئەو مەبلەغە دیرهەمەی هەبێ بەدەوڵەمەند حلێبەو لەتاقمی فەقیران نیە، واتە دەبێ زەكات بدا نەك زەكات وەربگرێ.

٢- ئیمامی ئەحمەدو ثەوریو ئیسحاقو زانایانی تریش فەرموویانە کەسێك (٥٠) پەنجا دیرهەمی زیوی هەبێ یان بایەی ئەوەندەی زێڕ هەبێ، نابێ زەکات وەربگرێ! هەروەها زەکات پێ شیاویش -جگە لەقەرزدار- نابێ لەپەنجا دیرهەم زیو یان قیمەتەکەی بدرێتێ، بەڵام قەرزدار دەتواندرێ زیاد لەو ئەندازەیەی بدرێتێ.

بەڵگە لەسەر ئەوە: کە کەسێك پەنجا دیرهەمی هەبێ بەدەوڵەمەند حلێبە، ئەو فەرموودەیەیە: کە دارەقوطنی لەعەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە ریوایەتی کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لاتحل الصدقة لرجل له خمسون درهماً) بەڵام ئەم فەرموودەیە لاوازی لەئیسنادەکەی دا هەیە.

٣- ئەوەی کە لەمالیکەوە مەشهورو باوە ئەوەیە: کە پرسیار لەئیمامی مالیك کراوە ئایا کەسێك چل دیرهەمی هەبێ زەکاتی دەدرێتێ؟ وتی: بەڵێ دەیدرێتێ.

فەقیر بەلای مالیکییەکانەوە کەسێکە بەشی ساڵێکی تەواوی بژێوو پۆشاكو پێویستیاتی تری هەبێ.

٤- شافیعیو ئەبو ثەور فەرموویانە: کەسێك بتوانێ کاسبی بکاو وەستایەتیو دەست رەنگینییەکی هەبێ، جەستەو عەقڵو هۆشی تەواو بێ، بەجۆرێك بتوانێ لەرێگەی ئیشو کاری خۆیەوە خۆی بەخێو بکا، زەکاتی لێ حەرامە.. لەبەر ئەو فەرموودەیەی ئەبو داوودو تیرمیذیو دارەقوطنی لەعەبدوڵای کوڕی عومەرەوە لەپێغەمبەرەوە ریوایەتیان کردوە کە فەرموویەتی: (لاتحل الصدقة لغني، ولا لذي مِرّة سوي).

### ئایا زەکاتو سەرفیترە دەدرێ بەکافرو ئالو بەیتی پێغەمبەر؟

ظاهیری ئایەتەکەو هێنانی وشەکە بەو شێوە گشتییە داخوازی ئەوەیە: کە زەکات بدرێ بەهەر ئادەمیزادێکی فەقیرو هەژار جا لەئالو بەیت بن، یان خزمو کەسو کاری زەکاتدەرەکە بن. موسوڵمان بن یان کافر!!

بەڵام زانایانی شەرع پێیان وایە: زەکات تەنها دەدرێ بەموسوڵمانان، نابێ هیچی لێ بدرێ بەکافر. چونکە لەصەحیحەین دا فەرموودەیەك هەیە ئیبنو

عەبباس ریوایەتی کردوە: کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ معاذی دەنارد بۆ یەمەن پێی فەرموو: (أعلمهم أن عليهم صدقة تؤخذ من أغنيائهم، فترد على فقرائهم) فێریان کە زەکات لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێو بەسەر هەژارەکانیان دا دابەش دەکرێتەوە. هەر لەروانگەی ئەم فەرموودەوە ئەبو حەنیفە پێی وایە دروستە سەرفیترە بدرێ بەکافر، چونکە حەدیثەکە هەر باسی زەکاتی کردوە.

هەروەها زانایانی شەرع پێیان وایە دروست نیە زەکات بدرێ بەو کەسانەی کە بژێویان لەسەر زەکاتدەر هەیە وەکوو دایکو باوکو منداڵو خێزان.... چونکە زەکات پێدان بۆ لابردنی ئاتاجییە، دەی کەسێك بژێوی دابین بکرێ، ئاتاجی نامێنێ، لەهەمان کات دا کەسێك زەکات بدا بەوانەی نەفەقەیان لەسەریەتی مانای وایە زەکاتەکە بەخودی خۆی دەبەخشیو سوودگەیاندنە بەخودی خۆی!

هەروەها زانایانی شەرع کۆکن لەسەر ئەوە: کە دروست نیە زەکات بەبەرەی هاشم بدرێ، چونکە فەرموودەیەك هەیە، موسلیم لەموطەلیبی کوڕی رەبیعە ریوایەتی کردوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (ان هذه الصدقة انما هي أوساخ الناس، وانها لاتحل لمحمد ولا لآل محمد) ئەم زەکاتە چڵکی خەڵکە بۆ موحەممەدو خزمو کەسو کاری موحەممەد حەڵاڵ نیە.

ئیمامی شافیعی دەفەرموێ: بۆ موطەلیبیەکانیش حەڵاڵ نیە. لەبەر ئەو فەرموودەیەی بوخاری لەجوبەیری کوڕی موطعیم ریوایەتی کردوە؛ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان بني هاشم وبني المطلب شيئ واحد، وشبك بين أصابعه...!)

### ئەو ئەندازەیەی لەزەکات دەدرێ بەفەقیرو هەژار!!

زانایانی شەرع رای جیاجیایان لەم بارەوە هەیە:

ئەبو حەنیفە، دەڵێ: نابێ لەنیصابی زەکات تێپەڕ بکا، واتە: باش نیە دووسەد دیرهەمی زیو یان قیمەتی ئەوە بدرێ بەیەك کەس!

ئیمامی شافیعی دەڵێ: فەقیرو هەژار ئەوەندەیان دەدرێتێ کە ئاتاجیان نەمێنێ، چونکە مەبەست لەزەکات نەهێشتنی ئاتاجییە.

ئیمامی مالیك پێی وایە: ئەوە پابەندە بەئیجتیهادی ئیمامەوە، ئیمامی مالیك لەتەك ئیمامی ئەحمەد دا پێیان وایە: دروستە بەشی ساڵێکیان بدرێتێ.

### ئایا دروستە زەکات لەوڵاتێکەوە بگوێزرێتەوە بۆ هەژارانی وڵاتێکی تر؟

لەم بارەوە زانایانی شەرع دوو رایان هەیە:

جەماوەری زانایان پێیان وایە: دروست نیە، زەکات لەو شارەی ماڵو سامانەکەی لێیە بگوێزرێتەوە بۆ شارێکی تر، بەڵکوو هەر دەبێ بدرێ بەئاتاجانی ئەو شارە.

بەڵام مالیکییەکانو شافیعییەکانو حەنبەلییەکان بەلایانەوە دروستە زەکات بگوێزرێتەوە بۆ وڵاتێك؛ دوورییەکەی کەمتر بێ لەمەسافەی قەصر؛ کە دروستە نوێژی تێدا کورت بکرێتەوە. واتە دەبێ لە(٨٩) کیلومەتر کەمتر بێ. چونکە کەمتر لەو ئەندازە دوورییە بەوڵاتی خۆی حلێب ناکرێ.

شافیعی پێی وایە: ئەگەر لەئەو وڵاتەی ماڵو سامانەکەی لێیە ئاتاج دەست نەدەکەوتن پێویستە زەکاتەکە بگوێزرێتەوە بۆ نزیکترین وڵات کە ئاتاجی تێدابێ. ئەگەر برێ ئاتاج لەوڵات دا هەبوونو زەکاتیان پێ درا، پاشان هەندێك لەماڵی زەکات مایەوە دەگوێزرێتەوە بۆ وڵاتێکی تری نزیك.

ئیبنولقاسمو سوحنون بەلایانەوە دروستە لەبەر پێویستی زۆر زەکات لەم شار بۆ ئەو شارو لەم وڵات بۆ ئەو وڵات بگوێزرێتەوە چونکە دەبێ هەموو کاتێك ئاتاج پێش نائاتاجان بخرێن ئەگەر لەشارێك هی وا نەبوون زەکاتیان پێ بشێ، زەکاتەکە دەگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی تر کە هی وای لێ بێ زەکاتی پێ بشێ. بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیەیە: کە ئەبو داوود لەسوومیدی کوڕی حەنظەلەوە ریوایەتی کردوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (المسلم أخو المسلم لایُسلمه، ولا یَظلمه) موسوڵمان برای موسوڵمانە ناهێڵێ شتێك هەبێ زیانی پێ بگەیەنیو ستەمیشی لێ ناکا.

واتە: ئەگەر لەولاتێك دا موسوڵمانان تووشی برسیایەتی بوون، موسوڵمانانی دەوڵەمەنـدی ولاتێکـی تـر پاشـگوێیان ناخـەن بـەڵکوو بـەماڵی زەکـاتو خێـرو صەدەقەی تر باروبوویان دەکەن!

حەنەفییـەکان، دەڵـێن: گواسـتنەوەی زەکـات لەولاتێکـەوە بـۆ ولاتێکـی تـر کەراهەتی تەنزیهی هەیە. مەگەر بۆیە بیگوێزێتەوە بیدا بەخزمی هەژارو فـەقیری (واتە: ئەوانەی بژێویان لەسەری نیە) یان بۆ ئەوەی دابەشی بکا بەسـەر کۆمـەڵێك دا کە زیـاتر پێویـستیان پـێ بـێ، یـان صـاڵحترو بەتـەقواتر بـن، یـان سـوودیان بـۆ موسوڵمانان زیاتر بێ، یان لە(دار الحرب)ەوە بیگوزێتەوە بۆ (دار الأسلام) یـان بیـدا بـەقوتابیانی خوێنـدگاو زانکۆکـان، یـان بیـدا بەوانـەی خـەریکی خـودا پەرسـتیو طـاعـەتکردنن، یـان پـێش تـەواو بـوونی تێوەرسـووڕانەوە سـاڵ بەسـەر مـاڵو سامانەکەدا، ئالەم حاڵانەدا گواستنەوەی زەکات کەراهەتی نیە، ئەگەر لەبەر غەیری ئـەم حاڵانـەش گواسـتیەوە هەردروسـتە. چـونکە (معـاذ) کـە چـوو بـۆ یەمـەن بەدانیشتوانی یەمەنی فەرموو: قوماشـم بـدەنێ لێتـان وەردەگـرم لـەجیاتی زەکـاتی گەنمەشامیو گەنمو جۆ، چونکە ئەوە بۆ ئێوە ئاسانترەو بـۆ کۆچکارانی مەدینـەش بەسوودترە.

**ئەم فەرموودەیەی ( معاذ ) دوو شت دەگەیەنێ:**

١- گواستنەوەی زەکات لەیەمەنەوە بۆ مەدینەو لەوێ پێغەمبەر (ﷺ) دابەشـی بکا بەسەر هەژاران دا، ئەوەی پشتگیری ئەم رایە دەکا ئایەتەکەیـە: کـە دەفـەرموێ: ﴿انما الصدقات للفقراء﴾ جیاوازی نەخستۆتە نێوان فەقیری ئەم شار تا ئەو شار.

٢- وەرگرتنـی بـەهاو نـرخ لـەجیاتی زەکـات. چـونکە مەبەسـت بـەزەکات نەهێشتنی ئاتاجی هەژارانە، هەرشتێك ئاتاجییەکە نـەهێڵێ دروستە. ئایەتەکـەش دەفەرموێ: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً﴾ شتێکی لەشتێکی تر جیا نەکردۆتەوە.

جـەماوەری زانایـانی شـەرع بەلایانـەوە دروسـت نیـە لـەهیچ شـتێك دا بـەها بـەزەکات بـدرێ لـەباتی شـتەکە. چـونکە ئـەوە مـافی خودایـە، بـەدەق بەسـەر ئـەو شتانەی دا بڕیوە: کە زەکاتیـان تێدایـە، نـابێ ئـەو بەسـەر دابڕینـە بگوێزییـەوە بـۆ

شتێکی تر، وەکوو قوربانی، کە بڕدراوە بەسەر ئاژەڵ دا شتێکی تر ناخرێتە شوێنی ئاژەڵو بکرێتە قوربانی بەڵکوو دەبێ کار بەوە بکرێ کە دەقەکە دیاری کردوە.

ئەوەی بەلای حەنەفییەکانو شافیعییەکانو حەنبەلییەکانەوە موعتەبەرە دەربارەی زەکاتیماڵو سامان ئەو شوێنەیە کە ماڵو سامانەکەی لێیە. بەنیسبەت سەرفیترەشەوە شوێنی ڕۆژووەوانەکە حلێیە.

**مالیکییەکان دوو رایان هەیە:**

١- دەڵێن: ئیعتیبار بەشوێنی ماڵو سامانەکە دەکرێ پاش تێوەر سووڕانەوەی ساڵ بەسەر ماڵەکەدا لەکوێ بوو لەوێ دابەش دەکرێ.

٢- هەندێکیان دەڵێن: ئیعتبار بەشوێنی خاوەن ماڵەکەیە لەکوێ بێ لەوێ زەکاتەکە دابەش دەکا، چونکە ئەو بەرپرسیارە لەدەرکردنی زەکاتەکە، ماڵو سامانەکە تابیعی خاوەنەکەیەتی.

کەسێك لەماڵو سامانی خۆی زەکاتی دەرکردو دای بەفەقیرێکی موسوڵمان، دوایی دەرکەوت ئەو زەکات پێدراوە کۆیلەیە، یان کافرە، یان دەوڵەمەندەو زەکاتی پێ ناشێ، بەرای ئیمامی مالیك زەکاتەکەی لەکۆڵ دەکەوێ، چونکە ئەو زەکاتدەرە ئیجتیهادی کردوە، بەبڕوای خۆی گەیشتۆتە ئەو قەناعەتە کە ئەو کابرایە زەکاتی پێ دەشێ، واتە: ئەو ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ هێناوە.

**سێیەم صنف کە زەکاتیان دەردرێتێ:**

کارمەندەکانی زەکاتن ئەوانەی ئیمام دەیاننێرێ بۆ کۆکردنەوەی زەکاتو نووسینو ئیشو کارێك کە پەیوەندی بەزەکاتەوە هەبێ، کە قورئان بە رستەی ﴿وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا﴾ ئاماژەی پێ کردون.

ئەمجار زانایان کەوتوونە راجیاییەوە دەربارەی ئەو ئەندازەیەی کە دەیاندرێتێ. سێ را هەیە..

١- موجاهیدو شافیعی دەڵێن: هەشت یەکیان دەدرێتێ. ئەگەر کرێکەیان لەبەشەکەیان زیاتربوو لەبەیتولمال بۆیان تەواو دەکرێ. رایەکی تریش هەیە دەڵێ

لەبەشەکانی تر بۆیان تەواو دەکرێ. ئەم رایە لەگەڵ ظاهیری ئایەتەکە دا یەك دەگرێتەوە.

٢- حەنەفییەکانو مالیکییەکان دەڵێن: بەئەندازەی ئیشەکەیان بەشیان دەدرێ، چونکە ئەوان خۆیان بۆ ئەو کارە تەرخان کردوەو بەو ئیشەوە هەڵەوگیر بوون، کەوابوو کیفایەتی خۆیانو کیفایەتی ماڵو منداڵیان لەماڵی فەقیران دابین دەکرێ.

ئەگەر پێویستی ئەمان هەموو زەکاتەکەی گەرەك بوو، حەنەفییەکان هەرنیوەیان دەدەنێ، لەنیوە زیاتریان نادەنێ. دەبێ ئەوەی دەیاندرێتێ کیفایەتی مام ناوەندی بێ.

پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین: کە ئەوەی دەدرێ بەکارمەندانی زەکات کۆکردنەوە، کرێی ئیشەکانیانە، کەوابێ ئەگەر دەوڵەمەندیش بن دەیاندرێتێ، تەنانەت ئەگەر لەبەرەی (هاشم)یش بنو ئەولادی پێغەمبەریش بن بەلای مالیكو شافیعییەوە هەربەشیان دەدرێ. چونکە پێغەمبەر ﷺ عەلی کوڕی ئەبوطالیبی نارد بۆ زەکات دابەشکردنو ناردی بۆ یەمەن بۆ سەرپەرشتیکردنی کۆکردنەوەی زەکات. کۆمەڵێکیشی لەبەنو هاشم کردوە بەکارمەندی زەکات کۆکردنەوە، دوای وەفاتی پێغەمبەریش ﷺ جێنشینەکانی لەبەرەی هاشم کارمەندی زەکات کۆکردنەوەیان داناون. چونکە کارمەندی زەکات کرێکارە لەسەر کارێکی موباح، پێویستە یەکسانی بخرێتە نێوان هاشمیو غەیری هاشمییەوە وەکوو باقی بوارەکانی ئیشو کار.

ئیمامی ئەبو حەنیفە: دەفەرموێ: کارمەندی هاشمی بەشی نادرێ، چونکە بەشەکەی بەشێکە لەزەکاتو صەدەقە، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (ان الصدقة لاتحل لآل محمد، انما هي أوساخ الناس) رواه مسلم عن المطلب بن ربيعة. کە ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوە، هەر شتێك فەرزی کیفایە بێ وەکوو (ساعی زەکات، نووسەری کاروباری زەکات، دابەشکەر، ژمێریار، پاسەوان) دروستە بۆ ئەو کەسانەی کە پێیەوە هەڵەوگیر دەبن، کرێی کارەکەیان وەربگرن، هەر لەم بابەتە پێشنوێژی کردن، ئەوەتا هەر چەند نوێژ فەرزی عەینە

لەسەر هەموو کەسێك، خۆتەرخان کردن بۆ ئیمامەت فەرزی کیفایەیە وەکوو قورطوبی فەرموویەتی: هەر لە رستەی ﴿وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا﴾ برێ لە فوقەها پێیان وایەو وای بۆ چون کە پێویستە ئیمام کارمەندی تایبەتی بنێرێ بۆ زەکات کۆکردنەوە، چونکە برێ لەو ساماندارانەی کە زەکاتیان لەسەرە لەوانەیە نەزانێ چی و چەندی لە سەر پێویستە بیدا، هی وا هەیە رەزیلو چرووکە دڵی نایە زەکات بدا.

لە صەحیحەیندا هەیە کە پێغەمبەر ﷺ عومەری کوری خەتتابی نارد بۆ زەکات وەرگرتن.

ئەبو داوود لە باوکی رافیع؛ کە (مەولای) پێغەمبەر ﷺ بوو دەگێرێتەوە: دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بەنوو مەخزومی کردە بەرپرسیاری زەکات وەرگرتن.

ئایەتەکە کە بەدەق وشەی (عاملین)ی هێناوە، ئەوە دەگەیەنێ: کە زەکات وەرگرتن تایبەت بێ بەئیمامەوە، واتە: پیویستە بدرێ بەئەو، ئەگەر خاوەن ماڵ بۆخۆی بیدا بەموحتاجان زەکاتەکەی لەکۆڵ ناکەوێ ئەوەی پشتگیری ئەم رایە دەکا ئایەتی ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً...﴾التوبة/١٠٣یە، کە بەشێوەی فەرمان فەرمان بەکار بەدەستی موسوڵمانان دەکا: کە زەکات لەماڵی موسوڵمانان وەربگرێ.

بەڵام ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ، لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾المعارج/٢٤-٢٥، دژی ئەم رایەیەو حوکمێکی پێچەوانە دەبەخشێ..

لەراستی دا قسەی حەقو رای راست ئەوەیە: کە دروستە بۆ ئەو کەسانەی زەکاتیان لەسەرە راستەوخۆ بۆخۆیان بیدەن بەخاوەن ئاتاجان. بۆیە زانایانی ئیسلام لەم بارەوە تەفصیلاتیان داوەو فەرموویانە:

١- ئەگەر ماڵی زەکاتەکە ماڵێکی شاردراوە بوو: وەکوو پارەو پوول. ئەوە دروستە خاوەنەکەی راستەوخۆ دابەشی بکا، یان بیدا بەئیمام.

٢- ئەگەر ماڵەکە ماڵێکی بەدەرەوە بوو: وەکوو ئاژەڵو بەروبوومی کشتو کاڵو باغو داری بەردار، ئەوە بەلای جەماوەری زانایانەوە پێویستە بیدا بەئیمام، چونکە مافی داواکردن لەو ماڵەدا تایبەتە بەئەوەوە وەکوو خەراجو سەرانە.

شافیعی لەرای تازەی دا فتوای ئەوەی داوە: کە دەشێ خاوەن ماڵ بۆخۆی دابەشی بکا، چونکە ئەویش زەکاتێکە وەکوو زەکاتی پارەو پوول.

**چوارەم صنف زەکاتیان پێ دەشیو دەیاندرێتێ مونەلەفەتولقولوبن:**

ئەم تاقمە کەسانێك بوون لەسەرەتای بلاوبوونەوەی ئیسلام دا بەرواڵەت موسوڵمان بوونو تازە ئیمانیان هێنابوو بڕوایان پتەو نەبوبوو، بەشێکیان لەزەکات دەدرایە، بۆ ئەوەی دڵیان بەئیسلام خۆش ببێو بیرو باوەڕیان پتەوبێ.

جۆرێکی تریش هەن بە(مؤلفة القلوب) حلێب دەکرێن کافرنو نیازی موسوڵمانبوونیان هەیە، ئەمانەش بەگوێرەی رێبازی ئیمامی ئەحمەد بەشیان دەدرێ بۆ ئەوەی هەڵبندرێن بۆ زوو موسوڵمان بوون چونکە ئەوە چەسپاوە: کە پێغەمبەر ﷺ بەشی (مؤلفة القلوب)ی موسوڵمانو موشریکی داوە.[٧]

بەگوێرەی رێبازی حەنەفییەکانو شافیعییەکان ناموسوڵمان بەهیچ کلۆجێ بەشی نادرێ. کە لەسەرەتای ئیسلامیش دا بەشیان دەدرا، ئەوە بارودۆخێکی تایبەت بووە، ئەو کاتە موسوڵمانەکان کەم بوونو بێ هێز بوون، دوژمنیان بەهێز بووە، دوایی کە پەروەردگار ئایینی ئیسلامی بەهێز کردو پەرەی پێدا، پێویستی بەوە نەما بەشێك لەزەکات بدرێ بە(مؤلفة القلوب)ی ناموسوڵمان.

دوایی لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ جێنشینەکان ئەم لایەنەیان پاشگوێ خستو بەشی ئەم تاقمەیان نەدا تەنانەت ئیمامی عومەر ﷺ فەرمووی (انا لانعطي على الأسلام شيئاً، فمن شاء فليؤمن، ومن شاء فليكفر) ئێمە بەرتیل نادەین بۆ موسوڵمان بوون، هەرکەسێ حەزی لێیە با موسوڵمان بێ، ئەوی ئارەزۆی لێیە با لەسەر حاڵەتی کوفرو بێدینی خۆی بمێنێتەوە.

---

[٧] سەیری (نيل الأوطار) ج٤/١٦٦ بکە.

بەڵام (مؤلفة القلوب)ی موسوڵمان ئەمانە چەند جۆرێکن بەشیان دەدرێ بۆ چەسپاندنی ئیسلام لەدڵیان دا.

١- ئەوانەی بڕوایان لاوازەو هێشتا دڵو دەروونیان بەنووری ئیمان رووناك نەبوە، ئەمانە بەشیان دەدرێ بۆ بەهێز بوونی ئیمانیان.

٢- پیاوماقوڵو ڕێزداری بنەماڵەو هۆز کە چاوەڕوان دەکرێ سەرەك خێڵو پیاوماقوڵی تریش چاوی لێ بکەن. ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ بەشی ئەبو سوفیانی کوڕی حەربو کەسانی دیکەشی دا. بەشی زیبەرقانی کوڕی بەدرو عەدی کوڕی حاتەمی دا لەبەر ئەوە پیاوماقوڵو ڕێزداری هۆزەکەیان بوون.

٣- دانیشتوانی سەر سنووری نێوان وڵاتی ئیسلامو وڵاتی کوفر، ئەمانە بەشیان دەدرێ بۆ ئەوەی باشتر پارێزگاری وڵاتی ئیسلام بکەن.

٤- ئەو کەسانەی زەکاتی ماڵو سامانی گەلو هۆزێك دەهێنن کە زۆر زەحمەتە کارمەندی زەکات بتوانێ بیانگاتیو زەکاتەکەیان لێ وەرگرێ. چونکە ئەوە چەسپاوە کە ئەبو بەکر ﷺ ساڵی پاشگەزبوونەوە (عام الردة) کە عەدی کوڕی حاتەم زەکاتی ماڵو سامانی خۆیو هۆزەکەی هێنا بەشە زەکاتی (مؤلفة القلوب)ی دا بەعەدی.

**ماوەتەوە ئەوە بزاندرێ: (ئایا ئێستا بەشی (مؤلفة القلوب) ماوە یان حوکمەکەی تەواو بووە؟)**

زانایانی ئیسلام دوو ڕایان هەیە:

١- حەنەفییەکانو ئیمامی مالیك پێیان وایە: بەشی (مؤلفة القلوب) ئێستا بەهۆی بڵاو بوونەوەی ئیسلامو بەهێزبوونی نادرێ. کەوابێ ئەو صنفانەی ئێستا زەکاتیان پێ دەدرێ حەوت تاقمن، نەك هەشت. واتە: بەشی (مؤلفة القلوب) لابراوەو حوکمەکەی هەڵگیراوە، چونکە عیللەتی حوکمەکە کۆتایی هاتووە.

وەکوو چۆن ڕۆژو کە خۆر ئاوا بوو کۆتایی بەکاتی بەڕۆژوو بوون دەهێندرێ.

جەماوەری زانایان -کە هەندێ فوقەهای مالیکیشیان لەگەڵدان- دەڵێن: بەشی (مؤلفة القلوب) ماوەو نەسڕاوەتەوە، هەر کاتێ پێویست بوو دەیاندرێتێ.

ئەوەی کە حەزرەتی عومەرو حەزرەتی عوسمان ئەم بەشەیان ڕاگرتووە دەگەڕێندرێتەوە بۆ ئەوە کە لەسەردەمی ئەوان دا پێویست نەبوە. نەك لەبەر ئەوە بووبێ کە بەشەکەیان (سقووطی) کردبێ. چونکە ئایەتی زەکات لەدوا دوا ئەو ئایەتانەیە کە نازڵ بوون، هەروەها چونکە مەبەست بەبەش پێدانیان هەڵنانیانە بۆ موسوڵمان بوون، نەك بۆ ئەوەی کۆمەکی بەموسوڵمانان بکەن کەوابوو بەبڵاوبوونەوەی ئیسلام ئەم حوکمە سقووط ناکا هەرکاتێ پێویست بوو: دەدرێ.

بەکورتیو پوختی ئەم بەشە دەکەوێتە بەر ئیجتیهادی ئیمام هەرشتێك بزانێ بەرژەوەندی موسوڵمانانی تێدایە دەیکا.

**پێنجەم صنف کە زەکاتیان دەدرێتێ:**

ئەو کۆیلانەن کە لەگەڵ خاوەنەکانیان قەباڵەی ئازاد بوونیان نووسیوە واتە: (مکاتب)ن.

مکاتب: ئەو کۆیلەیەیە کە لەگەڵ خاوەنەکەی قەباڵەی نوسیوە کە بەندازەیەکی دیاریکراو لەماڵو سامان چەند قیسطیك بدا بەخاوەنەکەیو ئازادی بکا. جا هەرکاتێ ئەو بڕە ماڵانەی دان ئازاد دەبێ. جا ئەمانە بەشەزەکاتیان دەدرێتێ بۆ ئەوەی ئەو بڕە پارانەی کە لەسەریانە بیدەن بەخاوەنەکانیان.

مەرجە دەبێ ئەو موکاتەبەی بەشەزەکاتی دەدرێتێ موسوڵمانو موحتاج بێ.

بڕێ لەزانایانی ئیسلام وەکوو: ئیبنو حەبیبی مالیکی فەرموویانە لەو بەشەزەکاتە بەشی دیل دەدرێ. جا چونکە ئەمڕۆ کۆیلایەتی لەجیهان دا نەماوە، زۆر جێگای خۆیەتی: کە کار بەم ڕایەی ئیبنو حەبیبو هاوەڵانی بکرێ.

**شەشەم صنف کە زەکاتیان پێ دەدرێ:**

قەرزدارانن.. واتە: ئەوانەی کە قەرزداریی سواری شانیان بووە، ناتوانن قەرزەکانیان بدەنەوە. بەلای شافیعییەکانو حەنبەلییەکانەوە کابرای قەرزدار بۆخۆی قەرز کردبێ یان بۆ غەیری خۆی، بۆ ئیشی خێر بووبێ یان نا، هەر بەشی دەدرێ.

ئەگەر بۆخۆی قەرز کردبوو، کاتێك دەیدرێتێ کە هەژار بێ. ئەگەر بۆ بەرژەوەندی خەڵکی تری وەرگرتبوو، دەوڵەمەندیش بێ هەر دەیدرێتێ. چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاتحل الصدقة لغني الا خمسة: لغاز في سبيل الله، أو لعامل عليها، أو لغارم، أو لرجل اشتراها بماله، أو لرجل له جار مسكين، فتصدق على المسكين، فأهدى المسكين اليه)[^]

حەنەفییەکان دەڵێن: قەرزدار کەسێکە قەرز سواری شانی بووبێ، ئەگەر قەرزەکانی بداتەوە، هیچی بۆ نەمێنێتەوە، یان ئەوەی دەمێنێتەوە نەگاتە نیصابی زەکات.

مالیکییەکان دەڵێن: (غارم) کەسێکە قەرز باری گران کردبێ لەپێناو خەڵکی ترداو قەرزدار بوونەکەی لەبەر بێ عەقڵیو خراپەکاری نەبووبێ، واتە: نەدارایەك بێ نەتوانێ قەرزەکەی بداتەوە. بەکورتی هەژار بێو قەرزداربوونەکەی لەکاری خراپی وەکوو قومارو عەرەقخواردنەوە دا نەبووبێ، بەئەنقەستیش خۆی قەرز دار نەکردبێ بۆ ئەوەی زەکات وەربگرێ؛ بەم جۆرە کابرا ئەوەندەی هەبێ بەشی بکا، بەڵام زێدەرەوی زیادە مەسرەف بکا بەقەرزو قۆڵە بۆ ئەوەی زەکات وەربگرێ. ئەگەر وا بکا نایدرێتێ بەشی بەرناکەوێ چونکە مەبەستەکەی ناشەرعییە، بەپێچەوانەوە هەژار ئەگەر لەبەر ناعیلاجی قەرز بکاو مەبەستیش زەکات وەرگرتن بێ، ئەوە لەماڵی زەکات بەگوێرەی قەرزەکە بەشی دەدرێ چونکە مەبەستەکەی پیرۆزە.

ئەگەر یەکێك قەرزی کردبوو: بۆ کاری نامەشرووع، یان مەبەستێکی ناشیرین قەرزی کردبوو، پاشان تۆبەی کرد، ئەمانە چاك وایە بەشەزەکاتیان بدرێتێ.

جەماوەری زانایان دەفەرموون: ئەگەر کەسێك مردو قەرزدار بوو: لەماڵی زەکات قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە، چونکە ئەمەش لەپێڕی قەرزدارانە (غارمین)ە.

[^] ئەبوداوودو ئیبنو ماجە لەسەعیدی خودرییەوە ئەم فەرمودەیەیان گێڕاوەتەوە.

پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەیەك دا دەفەرموێ: (انا أولى بكل مؤمن من نفسه: من ترك مالاً فلأهله، ومن ترك ديناً أو عيالاً فاليَ وعلىَ).[٩]

**حەوتەم صنف کە زەکاتیان دەدرێتێ:**

ئەو موسوڵمانانەن کە لەپێناو ئایینی خودا تێدەکۆشن، ئەو جەنگاوەرانەن کە موچەیان لەلایەن حکوومەتی ئیسلامەوە بۆ دیاری نەکراوە، ئەوانە هەژار بن یان دەوڵەمەند بن لەماڵی زەکات دەیاندرێتێ، پێداویستی جەنگەکەیان بۆ دابین دەکرێ.

جەماوەری زانایان پێیان وایە: ﴿في سبيل الله﴾ واتە: غەزا کردن لەپێناو ئایین دا، چونکە وشەی (السبيل) کاتێك بەموطلەقی گوترا: مەبەست غەزایە.

وەڵێ ئەگەر کەسێك ئەندازەیەك موچەی دیاریکراوی لەدیوانی سوپاوە بۆ دیاری کرابوو، ئەوە بەشی نادرێ، چونکە کەسێك موچەو بژێوی لەلایەن حکوومەتەوە بۆ دابین بکرێ، لەپێڕی موحتاجان دەردەچێ‌و پێویستی بەزەکات نیە.

دروست نیە کابرا بەزەکاتی ماڵی خۆی حەج بکا، یان غەزا بکا، یان بەزەکاتی ماڵ، سامانی خۆی حەجی بۆ بکرێ، یان غەزای بۆ بکرێ... بەم پێیە ئەمڕۆ سوپای ئەم دەوڵەتە ئیسلامییانە زەکاتیان پێ ناشێ چونکە سەربازو ئەفسەرن‌و موچەی ڕێك‌و پێکی هەمیشەییان هەیە، وەڵێ دەتواندرێ لەکاتی پێویستی دا بەماڵی زەکات بەشداری دابینکردنی پێویستیاتی سوپا بکرێ، یان بڕێ لەماڵی زەکات بدرێ بەئەوانەی خۆبەخشن‌و (تطوع)یان کردوە.

ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: جەنگاوەر هەژار بێ لەماڵی زەکات بەشی نادرێ.

ئیمامی ئەحمەد لەراسترین ریوایەت دا کە لێیەوە گێردراوەتەوە: فەرموویەتی: حەج دەچێتە چوار چێوەی ﴿في سبيل الله﴾وە، کەوابێ کەسێك هەژار

---

[٩] ئیمامی ئەحمەدو موسلیم‌و بوخاری‌و نەسائی‌و تیرمیزی‌و ئیبنو ماجە ئەم فەرموودەیەیان لەئەبو هورەیرەوە، ریوایەت کردوە..

بێو بیەوێ حەج بکا لەماڵی زەکات بەشی دەدرێ بۆ ئەوەی حەجەکەی ئەنجام بدا، بەڵگەی ئیمام ئەحمەد ئەو فەرموودەیەیە کە ئەبو داوود لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتی کردوە: کە پیاوێك وشترەکەی تەرخان کردبوو لەرێگەی خودادا، ژنی ئەو پیاوە ویستی بچێتە حەج. پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (إركبيها فأن الحج من سبيل الله)

جەماوەری زانایان وەڵامی ئەم بەڵگەیەی ئیمام ئەحمەدیان داوەتەوە دەڵێن: بەڵێ ڕاستە حەج دەچێتە چوار چێوەی (سبيل الله)وە وەلێ لێرەدا ئایەتەکە بەسەر جیهاددا دەبڕێو بەمانا غەزایە. ئیبنولعەرەبی دەڵێ: من هیچ گومانم لەوەدا نیە کە مەبەست بە(سبيل الله) لێرەدا غەزا کردنەو جیهاد بەشێکە لە(سبيل الله) بڕێ لەزانایانی حەنەفی پێیان وایە: (سبيل الله) هەوڵدان بۆ فێربونی زانیاری دەگرێتەوە.

ئیمامی کاشانی دەفەرموێ: (سبيل الله) هەموو کارێکی خێر دەگرێتەوە کەوابێ کفنو دفنی مردوو، پرد رابەستنو جادە راکێشانو قەڵا دروستکردنو مزگەوت دروستکردن دەگرێتەوە.

بەکوردیو پوختەی مەبەست بە(سبيل الله) ئەوەیە: بەشێك لەزەکات بدرێ بەجەنگاوەرانی ئیسلام، بەلای شافیعییەکانەوە ئەگەر دەوڵەمەندیش بن هەربەشیان دەدرێ. بەلای حەنەفییەکانەوە ئەگەر هەژار نەبن نایاندرێتێ. بەلای ئیمامی ئەحمەدو حەسەنو ئیسحاقەوە (حەج)یش دەچێتە چوار چێوەی (سبيل الله)وە.

زانایانی ئیسلام کۆکن لەسەر ئەوەی: کە دروست نیە ماڵی زەکات بۆ دروستکردنی مزگەوتو سەربازخانەو رابەستنی پردو جادە راکێشانو ئاو راکێشانو ئەو جۆرە شتانە خەرج بکرێ. وەلێ لەبڕێکیانەوە ریوایەت کراوە: کە دروستە ماڵی زەکات بۆ ئەو جۆرە شتانە خەرج بکرێ.

**هەشتەم صنف کە زەکاتیان پێ دەدرێ:**

ڕێبواری گەڕیدەو موسافیرن، ئەوانەی لەزێدو نیشتمانی خۆیان دوورکەوتوونەوە، یان ئەوانەی دەیانەوێ سەفەربکەن، سەفەرەکەشیان بۆ کاری خێر بێ؛ وەکوو سەفەری حەجو جیهادو سەردانی سوننەتو ناواجب. وەلێ بۆ سەفەری (موباح) وەکوو گەشتو گوزار کردنو سیاحەت، ئەوە بەلای شافیعییەکانەوە نایاندرێتێ، چونکە پێویستی پێ نیە، بەلای برێ لەزانایانەوە دەیاندرێتێ ئاماژە بەوە کە ئەو کەسانەی بۆ سەفەری ئاوا دەچن بۆیان هەیە نوێژ کورت بکەنەوەو رۆژوو بشکێنن کەوابێ دەشێ زەکاتیشیان پێ بدرێ.

ڕێبوار ئەگەر پێویستی بەماڵو پارەو پوول بوو ئەوەندەی دەدرێتێ کە بگاتەوە زێدو نیشتمانی خۆی. تەنانەت ئەگەر لەوڵاتی خۆی دەوڵەمەندیش بێ هەردەیدرێتێ. کەسێك داوای زەکاتی کردو ئیدیعای ئەوەی کرد کە موستەحەقی زەکاتە، داوای لێ دەکرێ کە داواکارییەکەی بەبەڵگەوە بچەسپێنێ بۆ نموونە کە ئیدیعای ئەوەی دەکرد کە قەرزدارە دەبێ داواکارییەکەی بسەلمێنێ، ئیبنولعەرەبیو قورطوبی لەفوقەهای مالیکییەکان دەڵێن: جگە لەقەرزداری، حاڵەتەکانی تر پێویستسان بەبەڵگە هێنانەوە نیە، بەڵکوو ظاهیری دیمەنو حاڵیان شایەتە لەسەر داواکارییەکەیان.

ئیمامی رافیعی لەشافیعییەکان دەفەرموێ: وەصفی پەنامەکی وەکوو هەژاریو نەدارایی پێویست بەبەڵگەو شایەد ناکا. بەڵام وەصفی ئاشکرا؛ وەکوو ئەوە بڵێ: کارمەندی زەکات کۆکەرەوەدەم یان موکاتەبم یان قەرزدارم پێویستە بەڵگەی هەبێ. (مؤلفة القلوب) داوای بەڵگەی لێ ناکرێ. دروست نیەو نابێ کابرا زەکات بدا بەکەسێك کە نەفەقەو بژێوی لەسەریەتی وەکوو باوکو دایکو منداڵ، واتە: نابێ زەکاتدەر زەکاتەکەی بدا بەباوکی یان دایکی یان منداڵەکانی، وەلێ ئەگەر ئیمام زەکاتەکەی دا بەباوکو دایکی زەکاتدەر یان بەمنداڵەکانی ئەوە چ قەیدی نیە.

وا چاکە زەکاتدەر زەکاتی ماڵی خۆی بدا بەخزمی موحتاجی، ئیمام مالیك فەرموویەتی: باشترین شوێن کە تۆ زەکاتی ماڵو سامانی خۆی بدەیتێ ئەو خزمو کەسو کارانەتن کە بژێویان لەسەر تۆ نیە. بەڵگەش لەسەر ئەمە، فەرموودەکەی پێغەمبەرە کە بەخێزانی عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودی فەرموو: (لك أجران" أجر الصدقة وأجر الصلة) ئەم فەرموودەیە بوخاریو موسلیم گێڕاویانەتەوە.

ئەمجار ماوەتەوە ئەوە بزانین: ئەمانەی زەکاتیان دەدرێتێ چەندیان بدرێتێ باشە؟!

بەلای ئیمام مالیکو ئیمامی ئەحمەدەوە قەرزدار بەئەندازەی قەرزەکەی دەیدرێتێ، فەقیرو مسکین کیفایەتی خۆیانو هی ماڵو منداڵیان دەدرێتێ بۆ ماوەی ساڵێك.

شافیعیەکان دەڵێن: بەگوێرەی پێویستی دەیاندرێتێ. حەنبەلییەکان دەڵێن: نابێ لەئەندازەی نیصابی زەکات تێپەڕ بکات.

ئەمجار پاش دەست نیشانکردنو دیاریکردنی ئەو صنفانەی زەکاتیان پێ دەشێ، دەفەرموێ: ﴿فَرِيضَةً مِّنَ اللَّهِ﴾ واتە: پەروەردگار ئەم بەشە زەکاتانەی داناوەو فەرزی کردون، بەهیچ جۆرێك ئێوە پێچەوانەی ئەم حوکمە یەزدانییە هەڵسوکەوت مەکەنو پابەندی حوکمەکە بن.

﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ خودا ئاگادارو زانایە: بەدیوی دەرەوەو ناوەوەی هەموو شتێکو، دەزانێ بەرژەوەندی ئادەمیزاد چۆنەو لەچی دایە، بەو پێیە حوکمی بۆ دیاری دەکا. شتێك ناکا بەرژەوەندی ئاژەمیزادی تێدا نەبێ.

ئەوەتا: پەروەردگار زەکاتی واجب کردوە بۆ پاککردنەوەی دڵو دەروون، بۆ پارێزگاری ماڵو سامان، بۆ سوپاسکردنی پەروەردگار لەسەر نیعمەتەکانی. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم﴾التوبة/١٠٣.

## ئەزیەتدانی پێغەمبەر ﷺ لەلایەن دووڕووەکانەوەو ڕاستکردنەوەی بۆچوونەکانیان

﴿ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِيَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌۚ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَّكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦١﴾ ﴾

پەیوەنـدی ئـەم ئایەتـە بەئایەتـەکانی پێـشەوە لـەم ڕووەوەیـە: کـە ئـەمیش لایـەنێکی تـری نـەفامی دووڕووەکان ڕوون دەکاتـەوە، کە بەشێوەی تانـە لێدانـەوە دەیانگوت: ئەو - مەبەستیان پێغەمبـەر بـوو - گوێ بیـسە، هەرچی بـۆی بگـوترێ‌و سوێندی بۆ بخورێ یەکسەر بڕوا دەکا!!

لەئایەتـەکانی پێـشووش دا ئـەوەی ڕوون کـردوە: کـە تانـەو تەشـەریان لەپێغەمبـەر دەدا دەربـارەی دابەشـکردنی زەکـاتو صـەدەقە. ئیبنـو ئـەبی حاتـەم لـەئیبنو عەبباسـەوە دەگێڕێتـەوە: دەڵێ: نەبتـەل کوڕی حاریـث دەهاتـە خزمـەت پێغەمبــەر ﷺو دادەنیــشت گــوێی دەگــرتو فــەرموودەکانی بــۆ دووڕووەکــان دەگێڕایـەوە: ئـیتر پـەروەردگار ئایـەتی ﴿وَمِـنْهُمْ الَّـذِينَ يُـؤْذُونَ النَّبِـيَّ...﴾ی نـاردە خوارێ. قورطوبی دەڵێ: ئـەم ئایەتـە، دەربـارەی عـەتتابی کـوڕی قوشـەیر هاتۆتـە خوارێ: کە دەیگوت: موحەممەد گوێ ڕادێرە چی پێ بگوترێ دەیکا.

ئیبنو عەبباس ﷺ دەفەرموێ: کۆمەڵێك دووڕوو بەشێوەیەکی ناشیرین باسی پێغەمبەریان کرد: هەندێکیان وتیان فلان کار مەکەن وازبێنن؛ نەوەکوو پێغەمبـەر پێی بگاتەوە! جوللاسی کوڕی سوومیدی کوڕی صامیت وتی: ناناچی دەڵێن: بیڵێن، دوایی دەچینە لای‌و سوێند دەخۆین: کە ئێمە ئـەوەمان نـەگوتووە، ئـەویش پێمـان

باوەڕ دەکا، چونکە موحەممەد گوێ رادێرەو چی پێ بڵێین بڕوا دەکا!! ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو.

مەبەستی دووڕووەکان ئەوە بوو: کە پێغەمبەر زیرەك نیەو زۆر لە شت وردنابێتەوەو تێفکرینی نیە، بۆیە ناویان نابوو گوێچکە، وەکو چۆن بە جاسووس دەڵێن: چاو.

دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُمُ الَّذِينَ يُؤْذُونَ النَّبِيَّ﴾ لەو تاقمو گرۆ دووڕوانە کە سانێك هەن بە قسەو گاڵتە پێکردن ئەزیەتی پێغەمبەر دەدەن، رەخنەی لێ دەگرن، ﴿وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ﴾ دەڵێن: موحەممەد گوێڕادێرە، چی بێ بگوترێ: بڕوا دەکا، چی بۆ باس بکرێ بڕوای پێ دەکا، هەر کاتێ بێینە لایو سوێندی بۆ بخۆین یەکسەر بڕوامان پێ دەکا، مەبەستیان ئەوەیە: دڵسافو خۆشباوەڕە، زوو بڕوا دەکاو تێفکرینی نیەو لە شت ورد نابێتەوە. ئەم بیرو بۆچوونە یان لەوەوە سەری هەڵدابوو، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەزاهیری حاڵ مامەڵەی لەگەڵ دەکردنو نهێنییەکانی ئاشکرا نەدەکردن. ئیتر پەروەردگار رەددی دانەوەو فەرمووی: ﴿قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَكُمْ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئەو کەسەی ئێوە پاشملە ئەو تۆمەتانەی ئاراستە دەکەن، وەکوو دەڵێنو بۆی چوون: وانیەو ئێوە بەهەڵە چوون، چونکە ئەو کەسەی ئێوە ئەم جۆرە تۆمەتانەی پاڵ دەدەن گوێچکەی خێرە، هەرراستی دەبیسیو بەبەتاڵ هەڵناخەڵەتێ ئەو گوێ بیسی خێرە ﴿يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ بڕوا بەخوداو سروشتی خودا دەکا، بڕوا بەموسوڵمانان دەکا، چونکە موسوڵمانانی راستاڵ ئیمانەکەیان ناهێڵێ درۆ بکەن ئەو گوێچکەی بیستنی درۆو فیتنەییو دەمەدەمێ نیە، ئەو دەزانێ راستگۆو درۆزن کێنو کێ نین، بەباشی لێکیان جیا دەکاتەوە، وەلێ ئەو لەگەڵ دووڕووەکان دا بەگوێرەی ئەحکامی شەریعەتو ئادابی ئیسلام مامەڵە دەکاو سوڕیان هەڵناماڵێ؛ ئەو پێغەمبەرە خاوەن رەوشتی بەرزو مرۆڤایەتییەو ئادەمیزادێکی نموونەییە. لەراستی دا ئەو بڕوا بەدووڕووەکان ناکاو هەواڵو بیرو بۆچوونیان بەراست نازانێ!

﴿وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ﴾ ئەو پێغەمبەرە رەحمەتو سۆزە بۆ ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لەئێوە، رەحمەتە بۆ ئێوەی دوورووو کە بڕوا رواڵەتیەکەی لێ وەرگرتوونو نهێنییەکانتان بڵاو ناکاتەوەو فەزحتان ناکا، ئەو هەڵسو کەوتەی بەرامبەر موشریکەکان دەینوێنێ بەرامبەر ئێوە نایونێنێ. موراعاتی بەرژەوەندی ئیسلامو موسوڵمانان دەکا کە ئەو کارە خراپانە لەئێوە قبووڵ دەکا!

رەحمەتو بەزمییە بۆ ئەو کەسانەی بەدڵ بڕوایان کردوەو ئیمانیان هێناوە، چونکە بووەتە هۆی هیدایەتیان بۆ خۆشبەختی دونیاو قیامەتیان. کەوابوو پێغەمبەر ﷺ گوێچەکەی خێرو رەحمەتە، هەر خێرو رەحمەت دەبیسێ، جگە لەخێرو رەحمەت هیچ شتێکی تر نابیسیو بەلایەوە پەسەند نیە.

﴿وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەوانەی بەکردارو گوفتار ئەزیەتی پێغەمبەری خودا دەدەن سزایان ئاگری دۆزەخە، خودا بەعەزابی بەردەوامو بەئێش تۆڵەیان لێ دەستێنێ!

ئەم ئایەتە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە ئەزیەتدانی پێغەمبەر ئەگەر پەیوەندی بەپێغەمبەرایەتیەکەیەوە بێ کوفرەو تاوانی تێنەگەیشتووە، ئەم جۆرە عەیبو عارانەی پاڵ بدا پێی کافر دەبێ. چونکە ئەوە پێچەوانەی بڕوا پێکردنو ئیمان پێ هێنانیەتی. بەڵام کەسێك ئەزیەتی پێغەمبەر ﷺ بدا لەبارەی دابو نەریتی دونیاییەوە وەکوو ئەوانەی کە زۆر لای دەمانەوەو لەماڵەوە لای دەدانیشتن، یان دەنگیان لەخزمەتیا بەرز دەکردەوە، یان ئەوانەی کە بەناوی خۆیەوە بانگیان لێ دەکرد، ئەوە حەرامو نەشیاوەو کوفر نیە. ئەم هەڵوێستو کردارو گوفتارانە هەرچەندە دەبوونە هۆی نارەحەتبوونی پێغەمبەر بەڵام ناچنە خانەی کوفرەوە. قورئان لەئایەتێك ئامازە بەوە دەکا کە هەندێ کەس پاش نانخواردن لەماڵی پێغەمبەر دەمانەوەو درێژەیان بەمانەوەکەیان دەداو پێغەمبەریش پێی ناخۆش بوو، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ﴾الأحزاب/٥٣، ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾الحجرات/٢.

**ڕەوشتی ئەو دووڕوانە خۆیان لەغەزای تەبووك پاش دا بوو**

﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ
أَحَقُّ أَن يُرْضُوهُ إِن كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟
أَنَّهُۥ مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدًا
فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْخِزْىُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٣﴾ يَحْذَرُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ
أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِى قُلُوبِهِمْ ۚ قُلِ ٱسْتَهْزِءُوٓا۟
إِنَّ ٱللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ
لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ
وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم
بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةًۢ
بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾

دەربارەی هۆی ناردنە خوارەوەی ئایەتی ژمارە (٦٢) ئیبنولمونذیر لەقەتادەوە دەگێڕێتەوە: دەڵێ: پیاوێك لەدووڕووەكان دەربارەی خۆدواخەرەكانی غەزای تەبووك كە ئەو ئایەتانەیان دەرحەق هاتۆتە خوارێ وتی: سوێندم بەخودا ئەوانە پیاوماقوڵی ئێمەنو ڕێزدارن، جا ئەگەر ئەوەی موحەممەد دەیڵێ حەقو ڕاست بێ، ئەوە بێگومان ئەوانە لەگوێدرێژ خراپترن، پیاوێكی موسوڵمان گوێی لەوتەی دووڕووەكە بوو، وتی: وەڵڵاهی ئەوەی موحەممەد ﷺ دەیفەرموێ: حەقو ڕاستە،

ئـەتۆش لەگوێدرێـژ خـراپتری، کـابرای موسـوڵمان بەهەڵـەداوان چـوو بـۆ لای پێغەمبەرو شکاتی کردو ئەم روداوەی بۆ گێرایەوە، پێغەمبەر ﷺ ناردی بەدوای کابرای دووڕووداو پێی فەرموو: چی وای لەتۆ کرد ئەو قسە ناشیرینانە بکەی؟ کابرای دووڕوو دەستی کرد بەتف لەخۆکردنو نەفرین لەخۆکردنو سوێندی خوارد کە ئەو قسانەی نەکردونو شتی وا روی نەداوە. کـابرای موسـوڵمانیش هـەر دەپاڕایەوەو دەیگوت: خودایە راستی راستگۆیانو درۆی درۆزنـان ئاشکرا بکە، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ...﴾ ناردە خوارێ.. بەهەمان شێوە لە(السدي)یەوە ئەم ریوایەتە گێڕدراوەتەوە.

دەربارەی ئایەتی ژمارە (٦٥) ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنو عومەرەوە ریوایـەتی کردوە دەڵێ: پیاوێکی دووڕوو لەوانەی خۆیان لەچوون بۆ غەزای تەبووك دا پاش دابوو رۆژێك لەمەجلیسێك دا وتی: من هیچ شتێکم نەبینیوە وەکوو ئەم قورئـان خوێنانە وا بێ، کەسم نەبینیوە ئەوەندە چڵێسو زمادرۆزنو ترسنۆك بن لەکاتی روبەڕو بوونەوەی دوژمن دا! پیاوێك گوێی لێ بوو، وتی: وەڵڵاهی درۆ دەکەنو ئەتۆ دووڕوویو دەبێ پێغەمبەرت لێ تێبگەیەنم، ئیتر ئەم هەواڵە بەپێغەمبەر ﷺ گەیشتو ئەم ئایەتە هاتە خوارێ.

ئیبنو جەریری طەبەریو ئیبنولمونذیرو ئەبو شەیخ؛ ئیبنو حەیانی ئەلئەنصاری لەقەتادەوە دەڵێ: چەند کەسێك لەدووڕووەکان لەکاتی غەزای تەبووك دا وتیان: سەیرە! ئەم پیاوە (مەبەستیان پێغەمبەر بوو) بەتەمایە قەڵاو باڵەخانەی شام بخاتە ژێر دەستی خۆیەوە، ئەوە خەیاڵپلاوێکی کەم وێنەیە، زۆر زەحمەتە بتوانێ ئەم ئاواتەی بێنێتە دی پەروەردگار پێغەمبەری خۆی بەسەر ئەم وتانە دا ئاگادار کرد، پێغەمبەر ﷺ هاتە ناویانەوەو فەرمووی واو واتان گوتووە، وتیان: نەوەڵڵا ئێمە سوحبەتو شۆخیمان کردوە بەجیدیمان نەبووە ئیتر ئەم ئایەتانە هاتنە خوارێ. ئیبنو ئەبی حاتەم دووبارە لەکەعبی کوڕی مالیکەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: میخششی کوڕی حەمیر وتی: سوێند بەخودا من پێم خۆشە هەریەکێك لەئێوە سەد جەڵدەی لێ بدرێ بەمەرجێك ئایەتی قورئان نەیێتە خوارێ پەردە لەسەر دووڕوویەکەمان هەڵبداتەوە. ئەم قسانە بەپێغەمبەر ﷺ

گەیـشتنەوە، پاشـان هـاتن بـۆلای پێغەمبـەر عـوزرو بەهانـەیان دەهێنایـەوە. ئـیتر ئایەتی ﴿لاتعتذروا﴾ هاتە خوارێ.

پەیوەنـدی ئـەم ئایەتانـەش بـەهی پێشەوە لـەم رووەوەیـە: کـە لایـەنێکی تـر لـەکارە خراپـەکانی دووڕووەکـان ئاشـکرا دەکـەن. کـە بریتییـە لەسـوێند خـواردنی بـەدرۆیانو دوژمنایـەتیکردنی خـوداو پێغەمبـەری خـودا، گاڵتـەکردنیان بـەقورئان، بەتایبـەتی ئـەو ئایەتانـەی حاڵو چـۆنیەتی ئـەوانی روون دەکـردەوە، خۆپاشـدانو نەچوونیانی بۆ غەزای تەبووك رەخنەدەگرت.

ئـەوەتا: لـەم ئایەتانـە دا پـەروەردگار خیطـاب ئاراسـتەی موسـوڵمانان دەکـاو ئەوەیان بۆ روون دەکاتەوە: کە دووڕووەکان بۆ ئەوەی ئێوە لێیان رازی بن، پەنا بـۆ سوێند خواردنی بەدرۆ دەبەنو خوداش دەزانێ ئەوانە درۆزننو روپامـایی دەکـەنو دەفەرموێ: ﴿يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ﴾ هەر کە دووڕوویی‌و نیفاقیان دەرکەوتـو هەستیان بەهەڵوێستی حـەرەجو حەیابـەرەی خۆیـان کـرد، خێـرا پـەلاماری سـوێند خواردن دەدەن، دەست دەکەن بەعوزر هێنانەوە بـۆ ئـەو کـردارو گوفتارانـەی لێیـان رودراوە، بۆ ئەوەی ئێوە رازی بکەنو دڵتان لێیان نەرەنجێ، وەلحاڵ ﴿وَاللَّـهُ وَرَسُـولُهُ أَحَقُّ أَنْ يُرْضُوهُ﴾ خوداو پێغەمبـەری خـودا شیاوترن بـەوەی ئـەو دووڕووانـە هـەوڵ بدەن رازیان بکەن، پابەندی فەرمانو نەهیەکانیان بن، ئیمـانی راستەقینە بهێـننو کردەوەی چاك بکەن. واز لەدووڕوویی‌و روپامایی بێننو ببنە موسوڵمانی راستاڵ!

تێبینی ئەوە دەکرێ: کە راناو لەوشەی (یرضوە) دا بـەموفرەد هێنـدراوە کـە بەرواڵەت دەبوایە (مـوثـەننا) دووانـی بوایـە، واتـە: بیگوتایـە (یرضوهما) وەلێ کـە بـەموفرەد هێناویـەتی، بـۆ ئەوەیـە پێمـان بزانێنـێ کـە رازیکردنـی پێغەمبـەر رازیکردنی خودایە، چونکە سەرچاوەی پێغەمبەرایەتی یەك سەرچاوەیەو فـەرمانو جڵەوگیریەکان لەیەك سەرچاوەوە هەڵدەقوڵێن. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿مَّنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ﴾النساء/٨٠، ئەم پێزانانندنەش مەبەستێکی گرنگەو پێویسـتە ئـادمیزادان بیـزانن، ئەگـەر راناوەکـەی بەشـێوەی مـوفرەد نەهێنایـە ئـەو مەبەستە گرنگەی نەدەگەیاند!!

ئـەمجار لـەکۆتایی ئایەتەکـەدا دەفـەرموێ: ﴿إِنْ كَـانُوا مُـؤْمِنِينَ﴾ واتـە: ئەگـەر ئەوان لافی بڕواداری لێ دەدەنو بەسوێند جەخت لەسەر ئیمانـداری خۆیـان دەکـەن دەبوایـە خـوداو پێغەمبـەری خـودا رازی بکـەن، کەسـێك خۆبەموسـوڵمانو خـاوەن بـاوەڕ دەزانـێ بـاخوداو پێغەمبەرەکـەی رازی بکـەن، چـونکە بەدەسـت هێنـانی رەزامەندی ئەوان نرخو سوودی هەیە، رازیکردنـی خـەڵکی تـر بەتـەنیا هـیچ سـودو نرخێکی نیە.

ئـەمجار پـەروەردگار سەرزەنـشتی دووڕووەکـان دەکـاو خەتـەرو زیـانی کـاری ناپەسـندیان روون دەکاتـەوە، دەیانترسـێنێ لـەئاکامی کـاری نابـەراویانو بەشـێوەی پرسیار ئەو ناپاکانە سەرزەنشت دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّـهُ مَـنْ يُحَـادِدِ اللَّـهَ وَرَسُولَهُ﴾ ئایا ئەو دووڕووە ناپاکانە نـازاننو دڵنیـانین لـەوەی کەسـێك دوژمنایـەتی خوداو پێغەمبەر بکاو سنوور بەزێنی بکا، یـان گاڵتـەو قەشمـەری بەپێغەمبـەر بکـا، رەخنە لەکردارو گوفتارو رەوشتی بگرێ، وەکوو ئـەوە: کە دەربـارەی دابەشـکردنی (صـدقات) رەخنـەیان لێ گـرت، دەربـارەی رەوشـتو هـەڵسو کـەوتی پێغەمبـەر ﷺ لەگـەڵیان دا گاڵتـەیان پـێ دەکـردو دەیـانگوت گوێڕادێرو خۆشباوەڕە.....هتـد. ئایا نازانن کەسێك بەم جۆرە دژایەتی خوداو پێغەمبەر بکـا ﴿فَأَنَّ لَـهُ نَـارَ جَهَـنَّمَ خَالِـداً فِيهَـا﴾ ئـەوە سـزاو تۆڵـە لێ سـتاندنیان ئـاگری دۆزەخـەو بـۆ هـەتا هەتایـە تێیـدا دەمێنێتـەوەو رزگـاربوونی نـابێ. ﴿ذَلِـكَ الْخِـزْيُ الْعَظِـيمُ﴾ ئـەو سـزا بـەئێشو هەمیشەییە ریسوا کردنێکی گەورەو سامناکە، هـیچ ئـازارو ریـسواکردنێکی دونیـایی نایگاتێ!

لەراستی دا دووڕووەکان بۆخۆیان حەقیقەتی خۆیـان دەزانـن، ئـەوان بڕوایـان بـەخوداو بەپێغەمبەرایـەتی موحەممـەد نیـە، ئـەوان لـەخۆیان بەشـکن، گومانیـان دەربـارەی نیگـا هەیـە، راڕاو نائـارامن، هەمیـشە لەحاڵـەتی دڵـەڕاوکێ دان، بۆیـە پەروەردگار بەم شێوە وەصفیان دەکاو دەفـەرموێ: ﴿يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَنْ تُنَزَّلَ عَلَـيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُمْ بِمَا فِـي قُلُـوبِهِمْ﴾ دووڕووەکـان ترسـی ئـەوەیان هەیـە: کـە سـوورەتێکی قورئان دابەزێتە سەر موسوڵمانەکانو نهێنی دووڕووەکان دەربخاو پـەردەیان لەسـەر لابداو دووڕووییەکەیان ئاشکرا بکا، هـەواڵ بەموسـوڵمانەکان بـدا بـەوەی کـە لـەدڵی

دووڕووەکـــان دا حەشـــار دراوە، راســـتی حـــاڵو چـــۆنیەتییان بەموســـوڵمانەکان ڕاگەیەنیو بۆیان لەبنی کولەکەکە بدا، بەتەواوی فەضح بنو نهێنییەکانیان ئاشکرا بنو ریسوا بن!!

وێرای ئەم ترسو دڵە راوکێو راڕایی یەیان، هەمیشە گاڵتەیان بەقورئانو بەپێغەمبەرو موسوڵمانان دەکرد، بەبێ شەرمانە دەیانگوت: ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ﴾البقرة/١٤، بۆیە پەروەردگار هەڕەشەی لێ کردنو فەرمووی: ﴿قُلْ اسْتَهْزِئُوا﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: بەکەیفی خۆتان گاڵتەو قەشمەری بەئایەتەکانی خودا بکەن، دڵنیا بن: کە ﴿إِنَّ اللّهَ مُخْرِجٌ مَا تَحْذَرُونَ﴾ بێگومان خودا نیگا بۆ پێغەمبەرەکەی دەنێریو سورەتی قورئانی بۆ سەر نازڵ دەکا، نهێنیو شتە پەنامەکییەکانتان دەردەخا، حەقیقەتو چۆنیەتی ئێوە بەپێغەمبەر رادەگەیەنیو فەضح دەبن، وەکوو لەئایەتێکە تردا دەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ اللَّهُ أَضْغَانَهُمْ...﴾محمد/٢٩.

ئاشکرایە: ئەمە هەڕەشەو ترساندنی دووڕووەکانە لەسەر رەفتارو کردارو گوفتارە ناشرینەکانیان.

ئەمجار پەروەردگار سوێند دەخوا لەسەر ئەوە: کە ئەگەر پێیان بگوترێ: ئەرێ بۆچی ئێوە گاڵتە بەقورئانو پەیامی ئیسلام دەکەن؟ دوایی دەست دەکەن بەسوێند خواردن: کە ئێمە ئەو قسانەمان بەراست نیە، ئەوەتا: دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ﴾ ئەی فروستادە؛ ئەی پێغەمبەر! سوێند بێ ئەگەر تۆ لێیان بپرسی؛ ئەرێ ئێوە بۆچی گاڵتە بەقورئان دەکەن؟ بۆچی رەخنە لەپێغەمبەر دەگرن؟ بۆچی بەنهێنیو پەنامەکی دژی پێغەمبەرو پەیامەکەی دەدوێن؟ خێرا دەست دەکەن بەعوزر هێنانەوەو ﴿لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ﴾ سوێند دەخۆن لەسەر ئەوە: کە ئەوان لەو قسانەیان دا جیددی نین، بۆ سوحبەتو گاڵتە کردنو کات بەسەر بردنو بۆ پێکەنین ئەو قسانە دەکەن، پێیان وا بوو: ئەم عوزرەیان لێ وەردەگیریو ئەم درۆیەیان بۆ بەسەر دەچێ، چونکە ئەوان نەیاندەزانی کە قشمەریو لاقرتێ کردن بەئایین کوفرێکی ئاشکرایەو تاوانێکی گەورەو بەفتارەبەرە! ئەمجار

پەروەردگار سەرزەنشتیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ﴾ ئایا ئێوە گاڵتەو قەشمەری بەخوداو بەقورئانو بەپێغەمبەر دەکەن؟ هیچتان دەست نەکەوتووە گاڵتەی پێ بکەن خوداو پێغەمبەر نەبێ؟! بەراستی کارێکی خراپ دەکەنو تاوانێکی گەورە ئەنجام دەدەن. چونکە گاڵتە کردن بەخوداو بەقورئانو پێغەمبەر کوفرێکی ئاشکراو تاوانێکی بەهیلاك بەرمیە.

مەبەست بەگاڵتە کردن بەخودا، گاڵتەکردن بەیادی خوداو بەزاتو صیفاتی خودایە، بەشەریعەتو یاسای خودایە، مەبەست بە(آيات الله) قورئانی پیرۆزو باقی حوکمو یاساکانی ئایینە. مەبەست لەگاڵتەکردن بەپێغەمبەر ئەومیە: قەشمەری بەپێغەمبەرایەتی بکرێ یان بەرەوشتو بەکردارو گوفتارەکانی.

دەی ئێوە بێ شەرمانە ئاوا گاڵتە بەو شتە موقەدەسو پیرۆزانە دەکەنو ئەمجار کە پێتان زانرا، دەست دەکەن بەعوزر هێنانەوەو پێیان وایە: عوزرەکەتان لێ وەردەگیرێو ئاوا بەراشکاویو بێ ترسو خەجاڵەتبوون بیانووی نامەقبووڵتان دەهێننەوە ﴿لا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾ ئەم جۆرە عوزرانە مەهێننەوە، بەو جۆرە بیانوانە پاساوی ئەو تاوانانەتان مەدەنەوە، چونکە ئەنجامدانی کاری کوفرو ناپەسند بەمەبەستی سوحبەت، پێکەنینو رابواردن شتێکی زۆر بێ جێیەو ناماقوڵییەو نابێ بکرێ، عوزر هاوردنەوەتان دانانە بەتاوانو، عوزر لەقەباحەت خراپتر!!

﴿إِنْ نَعْفُ عَنْ طَائِفَةٍ مِنْكُمْ﴾ خۆ ئەگەر ئێمە خۆش ببین لەتاقمێکتان بەهۆی تۆبە کردنو گەڕانەوەتان لەتاوانو وازهێنانتان لەو کارە کوفر ئامێزانە وەکوو میخەشی کوڕی حەمیر کە تۆبەی کردو ناوی عەبدوررەحمانی لێ نراو لەخودا پاڕایەوە پلەی شەهادەتی پێ ببڕێ کەس لاشەکەی نەدۆزێتەوە، نزاکەی گیرابوو رۆژی شەڕی (یەمامە) شەهید بوو کەس نەیزانی کێ کوشتیو لاشەکەی کەوتە کوێوە.

ئەوە ﴿نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ﴾ کۆمەڵێکی تر سزا دەدەین بەهۆی تاوانبارییانو سووربوونیان لەسەر هەڵوێستی کوفر ئامێزیان.

واتە: ئەگەر ئێمە خۆش ببین لەو دووڕووانەی کە تۆبە دەکەن‌و واز لەقسەی بەدو بەدرفتاری دێنن، نابێ بەوە کەسانی دیکە هەڵخەڵەتێن، چونکە بێگومان ئێمە سزای ئەوانە دەدەین: کە تۆبەناکەن‌و لەهەڵوێستی تاوانبارییان پەشیمان نابنەوە، سوور دەبن لەسەر تاوانی کوفر ئامێزیان!

## ڕەوشتی دووڕووەکان‌و سزای قیامەتیان

﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ
بِٱلْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ۚ
نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ۗ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ
﴿٦٧﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْكُفَّارَ نَارَ
جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ هِىَ حَسْبُهُمْ ۚ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ
مُّقِيمٌ ﴿٦٨﴾ كَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنكُمْ قُوَّةً
وَأَكْثَرَ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا فَٱسْتَمْتَعُوا۟ بِخَلَٰقِهِمْ فَٱسْتَمْتَعْتُم
بِخَلَٰقِكُمْ كَمَا ٱسْتَمْتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُم بِخَلَٰقِهِمْ
وَخُضْتُمْ كَٱلَّذِى خَاضُوٓا۟ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى
ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٦٩﴾ أَلَمْ
يَأْتِهِمْ نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ

وَقَوْمِ إِبْرَاهِيمَ وَأَصْحَابِ مَدْيَنَ وَالْمُؤْتَفِكَاتِ أَتَتْهُمْ
رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِن
كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٧٠﴾

ئەم ئایەتانەش لەهەمان تەوەرەی ئایەتەکانی پێشوودا دەسووڕێنەوەو خراپەو هەڵوێستی ناپەسندی دووڕووەکان روون دەکەنەوە، فەضحیان دەکەن!

لەم ئایەتانەدا جۆرێکی تر لەخراپەکاری مونافیقەکان دیاری دەکا جوداوازی نێوان موسوڵمانانو ئەوان دەستنیشان دەکاو، دەیانشوبهێنێ بەدووڕوو کافرەکانی پێش خۆیان، حاڵو چۆنیەتییان دەشوبهێنێ بەحاڵو چۆنیەتی مونافیقەکانی پێش ئەوان، بەرامبەری‌و قیاس لەنێوان ئەوانو کەسانی رابردوو ئەنجام دەدا.

ئەوەش دەچەسپێنێ کە ئەو مونافیقانە بەنێرو مێیانەوە لەو خراپەکاریانەدا هاوبەشن، لەهەمان کاتیش دا هەڕەشەی توندیان ئاراستە دەکا: بەوە کە لەرۆژی قیامەت دا لەپێڕی برادەرو هاوبیرەکافرەکانیان دا سزاو تۆڵەیان لێ دەستێنێ‌و وەکوو ئەوانەیان حلێب دەکا کە ئاژاوەو ئاشووبو ستەمکاری کوفریان لەسەر زەوی بڵاو کردۆتەوەو دەفەرموێ: ﴿الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ﴾ واتە: دووڕووەکان پیاوو ئافرەتیان، لەئەخلاقو رەوشتو کردارو گوفتاریان دا دەشوبهێنە یەکتری‌و لەخراپەکاری دا چون یەکن.

ئەمجار ئەو لێکچوونە شی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿يَأْمُرُونَ بِالْمُنْكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنْ الْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ﴾ واتە: هەندێ لەو دووڕووانە فەرمان بەهەندێکی تریان دەکەن بەخراپەکاری‌و فیتنەو ئاشووب، وەکوو درۆو خیانەتو پەیمانشکێنی‌و پابەند نەبوون بەوادەو بەڵێن، هەر شتێك خودا پێی ناخۆش بێ ئەوان ئەوە پەیڕەو دەکەن، وەکوو لەفەرموودەیەکی صەحیح دا هاتووە کە شەیخانو تیرمیذی‌و نەسائی لەئەبو هورەیرە ریوایەتیان کردوە: دەفەرموێ: (آية المنافق ثلاث: اذا حدث كذب، واذا وعد أخلف، واذا ائتمن خان) نیشانەی دووڕوو سێ شتە، کە قسەی کرد

درۆ بکا، کە وادەی دا نەیباتە سەر، کە سپاردەی لادانرا خییانەتی تێدا بکا. وێڕای فەرمانکردیان بەخراپەکاریو کرداری ناپەسند، جڵەو گیری دەکەن لەچاکەو هەر شتێك باش بێ شەرع فەرمان بەکردنی بکاو عەقڵ بەپەسندی بزانێ، ئەوان نەهی لێ دەکەنو کۆسپو تەگەرە دێننە رێی. ئەوەتا هەوڵ دەدەن خەڵك لەجیهاد کردن سارد بکەنەوە، تێدەکۆشن موسوڵمانان لەرێگەی خودا ماڵو سامانی خۆیان خەرج نەکەن، ئەوەتا قورئان لەشوێنێکی تردا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا عَلَى مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنفَضُّوا﴾المنافقون/٧، بۆ خۆشیان هیچ کامێ لەو کارە باشانە ئەنجام نادەن. بەتایبەتی لەبارەی ماڵبەخشینەوە تا بڵێی دەست قووچاوو رژدن، بەهیچ جۆرێ روناکەنە ماڵبەخشین، شتێکی ئاشکراشە ئەم ماڵ نەبەخشینەیان بەهێزترین بەڵگەی نیفاقو دووڕوویییانە، هەر وەکوو چۆن ماڵبەخشین لەپێناو ئایینی خودادا نیشانەی بڕوا پتەوی‌و موسوڵمانیەتی راستەقینەیە.

﴿نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ﴾ ئەو مونافیقانە ئەوەیان لەبیر چووەتەوە کە بەطاعەتو پابەندبوون بەفەرمانی خوداو وازهێنان لەو شتانەی جڵەوگیری لێ کردون، خۆیان لەخودا نزیك بکەنەوە، رۆژێك لەرۆژان بەدڵیان دا نەهاتووە: کە ئەرکی سەرشانیانە طاعەتی خودا بکەنو سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی بن، شوێن هەواو هەوەسی شەیتانی خۆیان کەوتونو خودایان لەبیر چۆتەوە، بۆیە خوداش جەزای دانەوە، واتە: سزای دان، بەوە: لەدونیادا لەرەحمەتو لوطفی خۆی بێ بەشی کردنو تۆفیقی نەدان، لەقیامەتیش دا پاداشی باشیان نادادتێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ نَنسَاكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا﴾الجاثية/٣٤.

نەك هەرپاداشیان ناداتێ بەڵکوو دەیانخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوەو بەو ئاگرە سوتمانە سزایان دەدا.

﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ واتە: بێگومان ئەو مونافیقە بەدبەختانەی لەرێبازی راست لایان داوەو رێبازی شەیتانیان گرتۆتە بەر ئەوان لەهەموو کەس زیاتر گومڕاو فاسقو سەر لێ شێواون، لەهەموو ئەخلاقو فەضیلەتێك رووت بوونو،

هیچ خێرو چاکەیەکیان لێ چاوەڕوان ناکرێ، تەنانەت ئەوان لەکافرو مولحیدەکانیش زیاتر لەڕێبازی خودا دوورکەوتوونەوە، ئەو کافرو گومڕایانەی کە پێیان وایە عەقیدە بەتاڵەکەی خۆیان راستەو پەیڕەوی دەکەن لەبواری فیسقو دەرچوون لەڕێبازی خودا ناگەنە ئەو مونافیقانە هێندەی ئەوان لەفەضیلەو ئەخلاقی بەرز رووت نەبوونو لەگومڕایی دا نایانگەنێ!!

ئەمجار پەروەردگار ئەو عەزابو تۆڵەیە دیاری دەکا کە بۆ مونافیقەکانو وێنەی ئەوانی داناوە لەسزای کردارو گوفتارەکانیانو دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ پەروەردگار وادەی داوە بەدووڕووەکان بەپیاوو ئافرەتیانەوە، وێڕای کافرەکانی تریش بەئاگری دۆزەخ، بڕیاری داوە: کە ئەوانە هەموویان بخاتە نێو دۆزەخەوەو بۆ هەتاهەتایە تێیدا دەمێننەوە.

تێبینی ئەوە دەکرێ: ئایەتەکە مونافیقی پێش کافری تر خست، بۆ ئەوەی ئاماژە بێ: کە ئەو مونافیقانە هەرچەند بەرواڵەت لەپێزی موسوڵمانانو خۆیان بەخاوەن بڕوا نیشان دەدەنو بڕێ ئەرکی ئیسلامی رواڵەتی ئەنجام دەدەن، وەلێ لەکافرەکانی تر خراپترن، بەتایبەتی لەو کافرانەی کە پابەندی ئایینی هەڵوەشاوەو گۆڕدراوی خۆیانن وەکوو خاوەن نامەکان. واتە: جولەکەیەکی پابەند بەئایینی خۆی هەرچەندە ئایینەکەی هەڵوەشانەوەو گۆڕانکاری تێدا کراوە زۆر لەکابرای دووڕووی بەرواڵەت نوێژکەرو رۆژووگر...هتد باشترەو هێندەی مونافیق زیانی بۆ ئایینی ئیسلام نیە. ﴿هِيَ حَسْبُهُمْ وَلَعَنَهُمُ اللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُقِيمٌ﴾ ئاگری دۆزەخ ئەوەندەی ئازاد تێدایە کە بەسیان بیو سزای کردەوەکانیان پڕ بکاتەوە، خودا نەفرینی لێ کردوونو لەرەحمەتی خۆی دووری خستوونەوە، ئەو بەدبەختانە سزای هەمیشەییان هەیە، جگە لەسزای سوتان بەئاگری دۆزەخ، سزای هەمیشەیی وەکوو هەڵپڕوزانی دەمو چاویان بەبای سەمومو داپلۆخانی هەناویان بەئاوی کوڵاتوو، قەدەغەبوونی بینینی خودا لێیانو مەحرووم‌بوونیان لەو بەهرەو نیعمەتە گەورەیە. لەژیانی دونیاشیان دا هەمیشە لەسزای دڵەڕاوکێ دان، بەئازاری نەخۆشی

دووڕوویی گرفتارن، ترسی ئەوەیان هەیە: پێغەمبەرو موسوڵمانان بەنهێنییەکانیان بزانن‌و فەضح ببن.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە: کە ئەوەی تووشی ئەو دووڕووانە دەبێ لەسزاو تۆڵەی دونیاو رۆژی دووایی دەشوبهێتە ئەو سزاو تۆڵەیەی تووشی موونافیق‌و کافرانی پێشوو بووە، ئەو عەزابەی بۆ دووڕووەکانی سەردەمی ئیسلام تەرخان کراوە، وەکوو سزای ئەو دووڕوو کافرە پێشینانەی سەردەمی پێغەمبەرەکانی رابوردو وایەو دەفەرموێ: ﴿كَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ كَانُوا أَشَدَّ مِنْكُمْ قُوَّةً وَأَكْثَرَ أَمْوَالاً وَأَوْلاداً فَاسْتَمْتَعُوا بِخَلاقِهِمْ﴾ واتە: ئێوە ئەی ئەو دووڕووانەی ئەزیەتی خوداو پێغەمبەری خوداو موسوڵمانان دەدەن! دەشوبهێنە ئەو دووڕووانەی گەلەپێشینەکانی پێغەمبەرانی رابوردوو، کە لەپێش ئێوەوە هاتوونە گۆڕەپانی ژیانەوەو لەناوچوون. ئێوەش وەکوو ئەوان بەماڵ‌و سامان‌و منداڵ‌و کەس‌و کار لەخۆتان بایی بوون بەژیانی دونیا هەڵخەڵەتاون‌و بوغرا بوون. وەڵێ ئەوان لەئێوە بەهێزتر بوون، ماڵ‌و منداڵ‌و کەس‌و کاریان لەئێوە زۆرتر بوو، هەموو هەوڵ‌و تەقەللایەکیان لەژیان دا بۆ لەزەت وەرگرتن‌و خۆش رابواردن‌و ماڵ‌و منداڵ زۆر کردن بوو، بەژیانی کەمخایەنی دونیا لەخۆیان بایی بوون، خۆشییەکانی جیهان لەخشتەی بردن، هیچ مەبەستێکی پیرۆزو بەهرەمەندییان نەبوو لەو ژیانەیان دا جگە لەرابواردنی کاتی‌و مادی کورتی دونیایی بەشی خۆیان رایانبواردو بەو ژیانە کورتە شادمان بوون. وەکوو خاوەن باوەڕانی خودا پەرستو پەیڕەوانی رێبازی حەق هەوڵیان نەدا بۆ چەسپاندنی وشەی حەق‌و تەرازووی عەداڵەتو دابینکردنی ئەمن‌و ئاسایش‌و فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە. ﴿فَاسْتَمْتَعْتُمْ بِخَلاقِكُمْ كَمَا اسْتَمْتَعَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ بِخَلاقِهِمْ﴾ ئێوەی موونافیق‌و گومڕا رێبازی دووڕووەکانی رابوردووتان گرتۆتە بەرو هەمان هەڵس‌وکەوتی ئەوان دووبارە دەکەنەوە، ئەو هەڵوێست خراپەکاریانەی دووڕووەکانی پێشینان بەرامبەر ئایینی حەق‌و راست نواندیان‌و کردیان، ئێوەش ئەوە ئەنجام دەدەن، هەوڵ نادەن هیدایەت لەقورئان وەربگرن‌و شوێن پەیامی پێغەمبەر بکەون‌و دڵ‌و دەروونی خۆتان پاڵفەتە بکەن‌و بچنە پێڕی بەختەوەرانەوە. ئێوە دووڕووی سەردەمی ئایینی ئیسلام شیاوی سزاو

تۆڵەی زیاترو بەئێش ترن! چونکە ئەوان لەئێوە بەهێزترو ماڵو سامان زۆرتر بوون، ئەو ئایاتو موعجیزانەی خودا نیشانی ئێوەی داوە، ئەوان نەیان بینیوە.

بەکورتی ئێوە شوێن پێی موناڤیقەکانی رابووردوو کەوتوون هەرچەندە زۆر شت هەیە داخوازی ئەوەن کە ئێوە پێچەوانەی ئەوە رێگایەتان بگرتایە بەر.

لەهێنانی وشەی (استمتاع) جارێك بۆ موناڤیقە کۆنەکانو ئەمجار بۆ موناڤیقەکانی سەردەمی ئیسلامو جارێکی تر بۆ موناڤیقە پێشینەکان، مەبەستێکی سەرەکی هەیە کە بریتییە لەسەرزەنشتو لۆمە کردنی موناڤیقەکانی سەردەمی پێغەمبەرەکانی پێشوو کە لەززەتیان وەرگرت لەو ژیانە کورتەی جیهانو هەڵەوگیری ئەو بەشە کەمەی ژیان بوونو مەحروومی خۆشبەختیو کامەرانی قیامەت بوون بەهۆی هەڵەو گیرییان بەبەشی ژیانی کورتو کەمخایەنی جیهان. ئەمجار موناڤیقەکانی سەردەمی ئیسلامی پێ شوبهاندنو تا تەشبیهەکە بەلیغ بێو وەجهە شەبەهو لێکچواندنە کە زۆر کاریگەر بێ. وەکوو ئەوە یەکێك بیەوێ ستەمکارێك ئامۆژگاری بکا، ناشیرینیو دزێوی ستەمکارییەکەی بخاتە رو پێی دەڵێ: تۆ وەکوو فیرعەون وای کە لەختوخۆڕایی خەڵکی دەکوشتو بەبێ تاوان ئەشکەنجەی ئادەمیزادانی دەدا، ئەتۆش وەکوو ئەو دەکەیو وەکوو ئەو هەڵسو کەوت دەکەی!

بەکورتی دووبارەکردنەوەی (استمتاع) بۆ تەئکیدو جەخت کردنەوەیە.

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار ئەو دووڕووانەی شوبهاندن بەکافرو موناڤیقەکانی گەلەپێشینەکان لەهەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی کاڵای دونیاییو رووەرگێڕان لەهەوڵدان بۆ قیامەت. لێکچواندنێکی تر لەنێوان هەردوو تاقم دا دەخاتە روو ئەویش بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەرانو وەصف دار کردنیان بەفێڵو تەڵەکەبازیو غەدر کردنو دەفەرموێ: ﴿وَخُضْتُمْ كَالَّذِي خَاضُوا﴾ واتە: ئێوەی دووڕووی سەردەمی هاتنی ئیسلام وێڕای ئەوەی کە دەبوایە وازتان لەخراپەکاریو درۆو فێڵبازی بهێنایە، کەچی ئێوەش وەکوو دووڕووە پێشینەکان لەدرۆو فرتو فێڵبازی دا رۆچوونو ملتان لەخراپەکاری نا!!

ئەمجار پەروەردگار سەرەنجامی کردەوەی هەموو دووڕووەکان بەکۆنو تازەوە، ئەوانـەی لەسـەردەمی پێغەمبـەرانی پێـشوودا بـونو ئەوانـەی لەسـەردەمی هـاتنی ئیسلام دا بوون دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ واتە: ئەو مونافیقو کافرانە هەموویان هـەوڵو تێکۆشـانیان بەفیڕۆ چوو، ئەو کردارانەیان کە پێیان وا بوو: کرداری چاكو باشن پووچەڵ بـوون بەکەڵکی هیچیان نەهاتن، چونکە هەرچی کردویانە بۆ ریابازیو ناودەرکردن بوون، مەبەسـتیان خزمـەت گەیانـدنو سـوود بەخـشین نـەبوو، لەقیامـەتیش دا پاداشـو ئەوابیان نادرێتێ، چونکە بۆخودایان نەکردونو هـیچ نیـازو مەبەسـتی رەزامەنـدی خودایان نەبووە. لەسەرێکی ترەوە هـەبوونی بـڕوا مەرجـە بـۆ پـاداش وەرگرتنـەوە ئەوانیش ئەو مەرجەیان تێدا نەهاتۆتەدیو بـڕوای راستەقینەیان نـەبوە، بـەڵکوو ئـەوان هـەر بەروکـەشو رواڵـەتبازی خۆیـان بـەخاوەن بـاوەڕ خـستۆتە ڕوو، ئـەگینا لەراستی دا ئەوان کافربونو روناکایی ئیمانیـان تێـدا نـەبوو، ئـەوان دووڕوو بـوونو بەروکـەش خوداپەرسـتو لـەناوەرۆك دا کـافرو بـێ بـڕوا ئەوانـە خەسـارەتمەندو مایەپووچ بوون، لـەکاتێك دا پێیـان وابـوو قـازانج دەکـەن زیانیـان پـێ گـەیی، هـیچ پاداشیان دەست نەکەوتو هیچیان پێ نەبڕا، خۆیان ماندو کرد بۆ بەرپەرچدانەوەی پێغەمبـەران، جگـە لـەوەی خێـرو چاکەی دونیـاو قیامـەتیان لـەکیس چـوو، جگـە لەسزاو تۆڵـەی دونیـاییو رۆژی قیامـەت هـیچی تریـان دەسـتگیر نـەبوو، مـاڵوێرانو خانە خراپو بەدبەختـو چارەڕەشو ریسوای دونیاو قیامـەت بـوون. نموونـەی ئـەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً، الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعاً﴾الكهف/١٠٣/١٠٤.

بەپێچەوانەوە موسوڵمانو خوداپەرست بەختەوەری دونیاو قیامەتە، هەرچی دەیکا لـەخێرو چاکە بـۆی دەبێتـە مایـەی خۆشـبەختی هـەردوو دونیـای، وەکـوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَآتَيْنَاهُ أَجْرَهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ﴾العنكبوت/٢٧.

بەکورتیو پوختی مەبەست لەشوبهاندنی ئـەو مونافیقانـە هـیچ سوودێکیان لـەکارو کردەوەکانیـان نـەبینی، جگـە لەمایـە پوچـیو خەسـارەتمەندیو ریـسوایی

هیچیان دەستگیر نەبوو، هەرچەندە ئەوان لەئەمان بەدەسەلاّت تر بوونو ماڵو منداڵو کەسو کاریان فرەتر بوو، کەوابوو: ئەم مونافیقانەی سەردەمی ئیسلام شیاوترن بەوەی بکەونە نێو عەزابی دونیاو قیامەتەوەو لەبەختەوەری هەردوودونیا بێ بەش بکرێنو لەمونافیقەکانی پێشوو زیاتر سزا بدرێن!!

ئەمجار پەروەردگار ئامۆژگاری ئەو دووڕووانە دەکا: کە پێغەمبەریان بەدرۆخستەوەو هەڕەشەیان لێ دەکاو دەیانترسێنێ بەو سزاو کارەساتانەی بەسەر گەلە ستەمکارەکانی پێشوو هاتووەو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَأْتِهِمْ نَبَأُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَقَوْمِ إِبْرَاهِيمَ وَأَصْحَابِ مَدْيَنَ وَالْمُؤْتَفِكَاتِ﴾ ئەوە هەواڵی بەسەرهاتی گەلەپێشینەکان بەو مونافیقانە نەگەیشتووە؟ ئەو سزاو کارەساتەی بەسەر شەش گەلە بەدرۆخەرەوەکان هات بەئەو دووڕوو کافرانەی سەردەمی ئیسلام نەگەییشتووە؛ بێ ئاگان لەهەواڵی ئەو گەلانەی پێش ئەوان: کە لەپێغەمبەرەکانیان یاخی بوونو سەرپێچی فەرمانی خودایان کردو خوداش بەسزای سەختو بێ ئامانی خۆی گرتنیو لەناوی بردن؟ بێ ئاگان لەسەرەنجامی گەلی نووح کە بەتۆفان خنکانو جگە لەوانەی ئیمانیان بەحەزرەتی نووح هێنابوو کەسی تریان لێ دەرنەچوو، یان ئەو رەشەباو زریانەی کە عادی گەلی حەزرەتی هودی لەناوبرد، یان ئەو گرمەو ناڵەو شریخەی گەلی ثەموودی دوا بڕوا کرد، یان ئەو عەزابەی ملهوڕی وەکوو نەمروودی لەناوبرد، ئەو ملهوڕەی هەوڵی دا حەزرەتی ئیبراهیم بسوتێنێ، یان ئەو بوومەلەرزەو زەوی راتلەقاندنەو عەزابی (يوم الظله)ی توشی گەلی شوعەیب پێغەمبەر هات، یان ئەو رۆچونو بەقوڕا بردنی توشی گوندەکانی هۆزی لووط هات، کە بە دانیشتوانەکانیانەوە ژێرو زەبەر کرانو خاکەکەیان هەڵگێڕدرایەوەو ئەمجار بەردەباران کران، ئایا ئەو کافرو دووڕوانەی سەردەمی ئیسلام ئەم بەسەر هاتو رووداوانەیان پێ نەگەیشتوەو نەیان بیستوە؟ واتە: بیستویانەو پێیان گەیشتووە.

ئەو گەلو نەتەوانە ﴿أَتَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ پێغەمبەرەکانیان بە بەڵگەو نیشانەی ئاشکراوە هاتونە ناویانو ئەوانیش لە جیاتی ئەوەی بڕوایان پێ بکەن بە درۆیان خستوونەوە،

پەروەردگاریش پەلەی لە ناوبردنیان کردو لە بێخی دەرهێنان، خودا کە لەناوی بردن ستەمی لێ نەکردوون بەڵکوو ئەوان بۆخۆیان ستەمیان لەخودی خۆیان کردوە. هۆی لەناوچوونیان کردەوەناپەسندەکانی خۆیان بوو، بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرەکانیان بوو، دژایەتیکردنی حەقو حەقخوازان بوو.

هەڵبەتە لەدابو نەریتی خودا نیەو دادپەروەری ئەو داخوازی ئەوە نیە لەخۆوە ئەو خەڵکە سزا بدا، بەڵکوو لەپێش دا پێغەمبەر دەنێری‌و بیانوویان دەبڕی‌و دەیانترسێنێ لەسزاو تۆڵەی بێ ئامانی، بۆ ئەوەی ئادەمیزاد خۆیان لەسەر پێچیکردن بپارێزنو پەیڕەوی بەرنامەی پەروەردگاریان بکەن، جا ئەگەر پابەند نەبوونو ستەمیان لەخودی خۆیان کردو، سەر رەقییان نواندو موبالاتیان بەئامۆژگاری‌و ترساندنو هەڕەشەی پێغەمبەرەکانیان نەکرد، ئەمجار خودا عەزابی سەختی خۆی بۆ ناردونو لەناوی بردوون!

قورئان بۆیە بەتایبەتی ئەو شەش گەلانەی باس کردن، چونکە کافرو دووڕووەکان هەواڵی بەسەرهاتی ئەو گەلانەیان بیستبوو، هەندێکیان دەماودەم پێ گەییشتبوو، لەلایەکی ترەوە شوێنەوارو پاشماوەی ئەو گەلە لەناوچووانە لەوڵاتی شامو دەورو بەری دایەو نزیکی وڵاتی حیجازەو زۆر جار بەچاوی خۆیان ئاسەوارو کەلاوەو شوێنەواری ئەو غەزەب لێ گیراوانەیان بینیوە.

مەبەستیش لەیاد خستنەوەی کافرو دووڕووەکانی سەردەمی ئیسلام بەئاکامو سەرەنجامی ئەو گەلە لەناوچووانە ئەوەیە: پێیان بزانێنێ: کە دابو نەریتی خودا گۆڕانی بەسەردا نایە، ئەمانیش ئەگەر سووربن لەسەر هەڵوێستو کوفرو بێدینی خۆیان ئەوە عەزابی خودایان بۆ دێو لەناویان دەباو رزگاریان نابێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُوْلَـئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَاءةٌ فِي الزُّبُرِ﴾القمر/٤٣.

بێگومان پەروەردگار سەرانی کوفرو نیفاقی سەردەمی پێغەمبەری ئیسلامی لەیەکەم غەزادا کە غەزای بەدر بوو لەناوبردن، پاشانیش لەغەزاکانی تردا جار دوای جار ریسوای کردنو لەناوی بردن، بەڵام مونافیقەکان بەنهێنی هەر خەریکی پیلان دارشتنو فێڵو تەڵەکەبازی بوون، هەتا خودای زاناو دانا بەم سورەتە پەردەی لەسەر هەڵماڵینو نهێنییەکانی ئاشکرا کردن ئیتر زوربەیان وازیان هێنا، سەرۆکەکەیان کە عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی بوو بەداخو خەفەتی خۆیەوە سەری نایەوە..

سەیرە ئادەمیزاد کە لەسروشتی خۆی لای دا هێزو توانای روالەتی بوغرای دەکاو بیر ناکاتەوە، نازو نیعمەت بەرچاوی دەگرن ناروانێ، پەندو عیبرەتی رابوردوان کاری تێ ناکەن، مەگەر کەسێك خودا هیدایەتی بداو هەست بەدابو نەریتی خودا بکا لەبوونەوەرداو رفتاری خۆی باش بکاو بەگوێرەی شەریعەتی خودا هەڵسو کەوت بکا.

زۆر کەس هەن خودا بەتاقییان دەکاتەوە هێزو توانایان پێ دەبەخشێ ماڵو سامانو منداڵیان دەداتێ، ئیتر خۆیان لەخۆ دەگۆڕیو لەناوچوونی ساماندارانی پێش خۆیان کاریان تێ ناکەنو بیر لەسەرەنجامی ملهورو ستەمکاران ناکەنەوە، هەتا خودا بەدەستی قودرەت دەیانگریو سەرەونگوونیان دەکا، ئەو کاتە وەهۆش خۆ دێنەوە بەڵام بێ سوودە.

## رەوشتی موسوڵمانانو پاداشی قیامەتیان

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ

﴿سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٧٢﴾﴾

لەوەپێش رەوشتی دوورووە ناپاکەکانی دەست نیشانکردن، رەوشتی ناشیرینو هەڵسو کەوتی ناپەسندیانی رانواندن، سزاو تۆڵەی پڕاوپڕی کردەوەکانیانی رون کردەوە. ئیتر بەشوێن ئەوەدا باسی رەوشتی جوانو پەسندی موسوڵمانان دەکا، پاداشو جەزای کردەوەکانیان دیاری دەکا..

ئەمە ئوسلووبی قورئانە، بەمەبەستی پەندو ئامۆژگاری شتە دژبەیەکەکان ریز دەکا، کە باسی شەوی کرد، باسی رۆژیش دەکا، کە باسی دونیای کرد، باسی قیامەتیش دەهێنێتە پێشەوە، باسی موناڤیقو کافران بکا، باسی خوداپەرستان دەخاتە پاڵی..هتد جوداوازی نێوان شتە دژ بەیەکەکان دەستنیشان دەکاو دەیانخاتەڕوو بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بەئارەزۆو ویستی خۆی چی باشە بۆ ژیانی دونیاو قیامەتی ئەوە هەڵبژێرێ، بۆخۆی بەرژەوەندی خۆی دیاری بکا... ئالێرەدا جیاوازی ئاشکرا لەنێوان کردارو گوفتاری کافرو موناڤیقەکانو ئەو سزایە کە شیاوی ئەوانە لەگەڵ کردارو گوفتاری موسوڵمانانی راستاڵو پاداشو ئەوابی لەپاساوی کردارەکانیان دا وەری دەگرنەوە نومایان دەبیو دەردەکەوێ.

بۆ ئەوەی موناڤیقەکان بزانن کە ئەوان موسوڵمان نینو ئەوەی بەڕوکەش دەری دەخەن کە گوایە موسوڵمانن پوچو بێ سوودەو هیچیان لێ دەست ناکەوێ، ماندوبوونیان بێ هودەیەو کاریان بێ بەرو سوودە. ماندوبوونیان خۆڕاییەو رەنج بەخەسارن. ئەوەتا: لەوەصفی موسوڵمانان دا دەفەرموێ: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ﴾ پیاوانی موسوڵمانو ئافرەتانی موسوڵمان هەندێکیان

یارمەتیدەرو کۆمەکیکاری یەکترن، لەیەکیەتی بیرو باوەڕدا، لەیارمەتیدانی یەکتری لەسەر چاکەو دژی دوژمنان پشتی یەکتری دەگرنو یەکتری تەواو دەکەن، وەکوو لەفەرموودەی صەصیح دا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (المؤمن للمؤمن کالبنیان یشد بعضه بعضاً) موسوڵمان بۆ موسوڵمان وەکوو ریزی دیوار وان هەندێکی هەندێکی تر پتەو دەکا. جاکە پێغەمبەر ﷺ ئەم فەرموودەیەی فەرموو: پەنجەکانی خۆی تێك پەڕاندنو چەمبەرەی پێ بەستن! هەروەها لەفەرموودەیەکی تردا فەرموویەتی: (مثل المؤمنین في توادهم وتراحمهم كمثل الجسد الواحد، اذا اشتكى منه عضو، تداعى له سائر الجسد بالحمى والسهر) نموونەی موسوڵمانان لەیەکتر خۆشەویستی داو لەرەحم بەیەکتری کردن دا وەکوو جەستەیەك وان کە شوێنێکی ئەو جەستەیە ئازاری هەبوو، باقی ئەندامەکانی تری ئارام ناگرنو شەو بەخەبەرن!

بێگومان هاریکاری نێوان موسوڵمانان بەپیاوو ئافرەتەوە بەوپەڕی لێبوردویی‌و خۆنەویستییەوە لەکاتی مەترسی‌و هەڵوێستو شوێنی زۆر ناسك دا خۆی نواندوە، لەکاتی کۆچکردنیانو جیهادو تێکۆشان دا پیاوو ئافرەتی موسوڵمانان شان بەشانی یەکتری نموونەترین هاریکاری‌و پشتگیری یەکتریان ئەنجام دەوا، پیاوان بەداوێنپاکی‌و چاو پارێزی‌و دڵخاوێنی، ئافرەتان بەحەیاو حیشمەتو پۆشاکی موسوڵمانانەو پابەندبوون بەشەریعەتی ئیسلام لەکردارو گوفتارو هەڵسو کەوت دا کاری خۆیان ئەنجام دەداو هاریگاری یەکتریان دەکردو نموونەی کۆمەڵگای ئیسلامییان پێك هێنا!!

بێگومان ئافرەت لەمێژووی ئیسلام دا ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لەبەئاکام گەییشتنی کۆچکردنو بلاوبوونەوەی ئیسلام، لەجەنگەکانی موسوڵمانان دژی کوفرو بێدینان بەشداری جەنگاوەرانی ئیسلامیان کردوە، ئاویان بەسەردا گێڕاون خواردەمەنییان بۆ ئامادە کردون، جەنگاوەرانیان هەڵناوە بۆ هەڵمەتبردنو خۆفیدا کردن، بەئامۆژگاری‌و تانەلێدان جەنگاوەرانی هەڵاتوویان گێڕاونەوە بۆ گۆڕەپانی جەنگ، بریندارو نەخۆشیان تیمار کردون!

تێبینی ئەوە دەكرێ: دەرحەق بەئەهلی ئیمان فەرمووی: ﴿بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ﴾ دەربارەی مونافیقەكانیش فەرمووی: ﴿بَعْضُهُم مِّن بَعْضٍ﴾ چونكە موسوڵمانان برای یەكترینو خۆشەویستیو هاریكاریو سۆزو بەزەیییان بۆ یەكتری بەدڵو بەگیانە؛ بەپێچەوانەی دووڕووەكان هیچ هێزێكی مەعنەوی نیە كۆیان بكاتەوە بیرو باوەڕێك نیە یەكیان بخاو بەیەكیانەوە ببەستێتەوە. بەڵكوو هەندێكیان شوێنكەوتووی هەندێكیانن، لەگومانداریو ترسو رژدیو ڕاڕاییو ترسو لەرزدا، چونكە دڵیان جیا جیانو یەك دڵ نین. ئەمجار پەروەردگار جگە لەصیفەتی (ویلایەت) پشتگیریو هاریكاری نێوان موسوڵمانان، پێنج صیفەتی تریان بۆ دیاری دەكا كە دەبنە خاڵی سەرەكی جیاكردنەوەی موسوڵمان لەدووڕوو ئەم پێنج رەوشتە پەسندانەش ئەمانەن:

١- ﴿يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ﴾ فەرمان بەیەكتری دەكەن بەچاكە كردن بەڵام مونافیق جڵەوگیری دەكەن لەفەرمان بەچاكە.

٢- ﴿وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ موسوڵمانان جڵەوگیری دەكەن لەخراپە بەپێچەوانەی دووڕووەكان فەرمان دەكەن بەخراپەكاری.

٣- ﴿وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ﴾ موسوڵمانان بەرێكوپێكی نوێژەكانیان بەخوشوعو خوضوعەوە ئەنجام دەدەنو لەبەر خاتری خودا دەیكەن، بەڵام دووڕووەكان كە هەڵدەستن بۆ نوێژ بەتەمبەڵیو لەشگرانییەوە نوێژەكانیان دەكەنو بۆ ناوو شۆرەتو بۆ ئەوەی جاوبەستەكێ لەخەڵكی بكەن.

٤- ﴿وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ﴾ موسوڵمانان زەكاتیماڵو سامانی خۆیان بەرێكو پێكی دەدەنو خێرو صەدەقەی تریش دەبەخشن بەئاتاجان. بەپێچەوانەوە دووڕووەكان بەخیلی دەكەنو دەستی خۆیان دەقوچێنن.

٥- ﴿وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ موسوڵمانان فەرمانبەرداری فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودان، چییان فەرمان پێ بكرێ ئەنجامی دەدەن، جڵەوگیری چییان لێ بكرێ لێی دوور دەكەونەوە، بەڵام مونافیقەكان هەمیشە یاخیو سنوور بەزێننو پابەندی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا نین!! ﴿أُولَٰئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ

عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ بەهۆی ئەو ڕەوشتە جوانو پەسەندانەوە، ئەو موسولمانانە شیاوی ڕەحمەتو بەزەیی پەروەردگارن، خودا بەلێنی ڕەحمەتی خۆیان پێ دەدا لەدونیاو قیامەت دا. بێگومان پەروەردگار عەزیزو بالادەستە هەرشتێکی بوێ دەیکا، هەر وادەو بەلێنێك بدا، هەرهەڕەشەیەك بکا دەیهێنێتە جێ، حەکیمو دانایە، کاروباری بوونەوەر بەگوێرەی عەدالەتکاریو دانایی خۆی ڕێكو پێك هەلدەسوڕێنێ کەوابێ بەهەشتو ڕەزامەندیی خۆی بەموسولمانان دەبەخشێو بۆ مونافیقەکانیش ئاگری دۆزەخو قارو غەزەبی!!

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە پیتی (س) لەوشەی (سیرحمهم)دا بۆ تەئکیدو موبالەغەیە، مانای تایبەتکردنی کردار ناکا بەزەمانی داهاتووی نزیك، چونکە ڕەحمەتو بەزەیی خودا بۆ موسولمانان هەمیشەییو بەردەوامە.

ئەمجار ئەو وادەو بەلێنەی داویەتی بەموسولمانان شی دەکاتەوەو ئەوە ڕادەگەیەنێ کە ڕەحمەتی خودا زۆر شت دەگرێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ پەروەردگار بەلێنی بەپیاوانی موسولمانو ئافرەتانی موسولمان داوە، کە شادیان بکا بەباغو باغاتی بەهەشت کە بەژێر دارو درەختەکانی دا جۆگەو جۆبار دەکشێن، ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ بۆ هەتا هەتایە لەناو ئەو بەهەشتە ڕازەوەدا دەمێننەوە، لەززەتو خۆشی لێ وەردەگرن، ﴿وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ﴾ خانووبەرەی دلگرو ڕازاوەی بۆ ئامادەکردون، لەناو بەهەشتی ئەبەدی دا، وێڕای ئەو خانوو بالەخانە دلگیرانە، سەرباری ئەو هەموو ئامێرو هۆکاری خۆشگوزەرانیو بەختەوەرییە: کە نەچاو بینیویەتیو نەبەسەر دلی کەس دا بەخەیال ڕابوردوە، ئەو خودا پێداوانە نازو نیعمەتێکی تریان هەیە: کە لەهەموو نیعمەتەکانی تری بەهەشت خۆشترو بەلەززەت ترە ئەویش ڕەزامەندیی خودایە بۆیان، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ أَكْبَرُ﴾ هەیە بۆ موسولمانان ڕەزامەندی خودا کە زۆر لەبەهەشت گەورەترو، زۆر لەبەهەشت مایەی شادمانی ترە. شتێکی بەلگە نەویستیشە کە کامەرانی گیانی خۆشترو پیرۆزترە لەلەززەتی جەستەیی. ئەوەی پشتگیری ئەمە دەکا: ئەو فەرموودەیە: کە ئیمام مالیكو موسلیمو بوخاری لەئەبو سەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتیان کردوە کە پێغەمبەر

فەرموویەتی: (ان الله عزوجل يقول لأهل الجنة، فيقولون: لبيك ربنا وسعديك، والخير في يديك. فيقول: هل رضيتم؟ فيقولون: ومالنا لانرضي يارب، وقد اعطيتنا مالم يعط أحداً من خلقك، فيقول: الا أعطيكم أفضل من ذلك؟ فيقولون يارب وأي شيئ أفضل من ذلك؟ فيقول: احلّ عليكم رضواني فلا أسخط عليكم بعده أبداً).

هەندێ لەراڤەكەران پێیان وایە: (رضوان) بریتییە لەبینینی زاتی خودا لەرۆژی قیامەت دا. وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ﴾یونس/٢٦.

بێگومان ساتێك پەیوەندی بەزاتی كردگار ساتێك بینینی ئەو زاتە بێچوونە، لەهەموو خۆشیو بەختەوەرییەك گرنگترە، بەڵكوو هیچ خۆشییەك لەئاستی دا بەخۆشی داناندرێ. بەڵێ ساتەوەختێك كە لەقوڵایی دڵی ئادەمیزاددا شوعلەیەك لەو نووورە ئەزەڵیو ئەبەدییەی كە چاو دەركی ناكا روناكاییەك دەنوێنێ، ساتی هاڵهاتنی ئەو نووورە لەناو گیانی ئادەمیزاددا، تاقە شاتێك لەو ساتانەی كە رێ دەكەوێ بۆ كەمێك لەئادەمیزادان بریسكەیەك لەنووری خودا دەكەوێتە ناو دڵو گیانیانەوە، هەموو خۆشیو لەززەتێك لەئاستی دا بەهیچ دەژمێردرێن، دەی دەبێ چ بگوترێ بەرەزامەندییەكی خودایی كە هەموو گیان داپۆشێو هەمیشە بەبێ برانەوە هەستی پێ بكرێ!! جا كە پەروەردگار لەئایەتەكە دا سێ شتی باس كردن (الجنات، المساكين الطيبة، رضوان من الله) ئەمجار فەرمووی: ﴿ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ واتە: ئەو وادەو بەڵێنەی خودا، یان ئەو رەزامەندییە، یان ئەو خۆشیو لەززەتە مادیو مەعنەوییانە بەیەكەوە بەمراز گەیشتنێكی فرە گەورەیەو هیچ خۆشییەكی تری ناگاتێ، بەم لەززەتو نیعمەتانە پاداشی موسوڵمانە راستاڵەكان دەدەمینەوەو ئەوە پاداشو نیعمەتن نەك ئەو خۆشیو لەززەتانەی دونیا كە مونافیقو كافرەكان هەوڵی بەدەست هێنانی دەدەنو هەمیشە هەڵپەیانە بۆیان!!

## جیهادو تێکۆشان دژی کافرو مونافیقەکان

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَـٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ
عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٣﴾ يَحْلِفُونَ
بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ
إِسْلَـٰمِهِمْ وَهَمُّوا۟ بِمَا لَمْ يَنَالُوا۟ ۚ وَمَا نَقَمُوٓا۟ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ
ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦ ۚ فَإِن يَتُوبُوا۟ يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ ۖ وَإِن يَتَوَلَّوْا۟
يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ وَمَا لَهُمْ فِى
ٱلْأَرْضِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٧٤﴾ ﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار وەصفی موسوڵمانانی کردو ئەو رەوشتە جوانانەی وەپاڵ دانو وادەو بەڵێنی پاداشی هەرە باشی پێدان، بەرزترین پلەو پایەی بەهەشتی بۆ تەرخان کردن، جارێکی تر گەڕایەوە بۆ سەر مونافیقەکانو هەڕەشەی توندی لێ کردنو ترساندنی بەوە کە وەك کافرەکان جیهادیان لەدژ بکرێ، خستنیە پێڕی ئەو کافرانەی کە بەئاشکرا ئیعلانی کوفرو بێدینی خۆیان کردوە.

فەرمان دەکا بەپێغەمبەرەکەی کە جیهاد بکا لەدژی کافرانو مونافیقان موسوڵمانان هەڵبنێ بۆ جەنگان دژی ئەوانەی بەئاشکرا جاڕی کافریەتی خۆیان داوەو دژی ئەوانەش کە بەرواڵەت خۆیان بەموسوڵمان حلێب دەکەنو لەدڵ دا کوفریان پەنهان کردوە.

قورئان ئەوە دەچەسپێنێ کە مونافیقەکان قسەی کوفر ئامێزیان کردوەو دوای ئەوەی جاڕی موسوڵمانبوونی خۆیان دا کافربوونەوە، ویستیان کارێك ئەنجام

بدەن: کە تێرۆر کردنی پێغەمبەر بوو بەڵام بۆیان ئەنجام نەدرا، دەبێ ئەوان بۆچی رقیان لەپێغەمبەر بێ؛ خۆ رەوانە کردنی پێغەمبەر بێجگە لەخێرو بەرەکەت بۆ ئەوانو بۆ هەموو ئادەمیزاد هیچی تر نیە. ئەمجار پەروەردگار مونافیقەکان هەڵدەنێ کە بگەڕێنەوەو تۆبە بکەنو چی تر درێژە بەکوفرو دووڕوویی خۆیان نەدەن.

دەقەکەی قورئان بەگشتی حاڵو چۆنیەتی مونافیقەکان رادەنوێنیو زۆر لەهەڵوێستەکانیان ئاشکرا دەکا، ئاماژە بەوە دەکا کە زۆر جار هەوڵیان داوە شەڕو ناڕەحەتی بەپێغەمبەرو موسوڵمانان بگەیەنن. چەند سەرگوزشتەیەك هەن هۆکاری تایبەتی بۆ هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان دیاری دەکەن.

قەتادە دەڵێ: دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی نازڵ بووە، ئەوەبوو: دوو پیاو شەڕیان بوو یەکێکیان جوهەنیو ئەویتریان ئەنصاری. کابرای جوهەنی بەسەر ئەنصارییەکەدا زاڵ بوو، عەبدوڵڵا بەکابرای ئەنصاری وت: ئەوە بۆ نایەن یارمەتی براکەتان بدەن؟ سوێندم بەخودا وێنەی ئێمەو وێنەی موحەممەد وەکوو وتەی مەشهوری کابرا وایە کە وتی: (سەگەکەت قەڵەو بکە بتخوا) ئەمجار وتی: ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ مەدینە دەبێ عەزیزو پیاو ماقووڵەکانمان ئەو ناکەسبەچانە وەدەرنێین. پیاوێك لەموسوڵمانان بەپەلە چووە خزمەت پێغەمبەرو ئەو قسانەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ لەدوای ناردو پرسیاری لێ کرد: بۆچی ئەو قسانەت وتووە: ئەویش سوێندی خوارد کە شتی وا نەبوە ئەو قسەی ئاوای نەگوتووە. ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ!

ئیمام ئەبو جەعفەری کوڕی جەریر لەئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: رۆژێك پێغەمبەر ﷺ لەژێر سێبەری درەختێك دانیشتبوو، فەرمووی: رۆژێك پیاوێك دێ بۆ لاتان بەچاوێکی شەیتانانە دەڕوانێ بۆتان، کە هات قسەی لەگەڵ دا مەکەن. وەندەی پێ نەچوو پیاوێکی چاوشین بەدەرکەوت، پێغەمبەر ﷺ بانگی کردو پێی فەرموو: لەسەر چی تۆو هاوەڵانت جوێنم پێ دەدەن؟؟

پیاوەکە هەستاو رۆیی‌و هاوەڵەکانی هێنان، هەموویان سوێندیان خوارد: کە ئەوەیان نەگوتووە، ئەوەندەیان سوێند خوارد پێغەمبەریان رازی کردو لێیان خۆشبوو، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا...﴾ی نارده خوارێ.

عورووەی کوڕی زوبەیرو هی تریش دەڵێن: ئەم ئایەتانە دەربارەی جوللاسی کوڕی سوومەیدی کوڕی صامیت هاتوونە خوارێ. ئەم کابرایە کۆڵە بەسەیەکی لەخێزانەکەی هەبوو، ناوی عومەیری کوڕی سەعد بوو، جوللاس وتی: ئەگەر ئەوەی موحەممەد هێناویەتی راستبێ، ئەوە ئێمە حاڵمان لەم گوێدرێژانەی خۆمان خراپترە، عومەیر وتی: سوێند بەخودا ئەی جوللاس! ئەتۆ خۆشەویسترین کەسی بۆ من، پێم ناخۆشە زیانت پێ بگا، ئەتۆ قسەیەکت کرد ئەگەر باسی بکەم حەیام دەچێ، ئەگەر بیشارمەوە دەمکوژێ. یەکیان لەوی تریان لام سووکترە، هەواڵەکەی بەپێغەمبەر ﷺ گەیاندو پێغەمبەر ﷺ بەروی دادایەوە، ئەویش ئینکاری کردو وتی: من شتی وام نەگوتووە. سوێندی خوارد کە شتی وای نەگوتووە، ئەمجار پەروەردگار ئەم ئایەتانەی نارده خوارێ. پیاوەکە وتی: بەڵێ گوتوومە، وەڵێ خودا تۆبەی داناوە من تۆبە دەکەم ئیتر ئەمەی لێ قبوڵ کرا.

بەڵام ئەم ڕیوایەتانە تێکرا لەگەڵ رستەی ﴿وَهَمُّوا بِمَا لَمْ يَنَالُوا﴾ کە لەئایەتەکەدا هەیە ناگونجێ، چەند ریوایەتێکی تر هەن: ئەوە دەچەسپێنن کە مەبەست بەو شتەی کە موونافیقەکان ویستیان ئەنجامی بدەن‌و بۆیان نەکرا ئەوەبوو: کە لەکاتی گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لەغەزای تەبووک کۆمەڵێك دووڕوو ویستیان بەغافڵگیری پێغەمبەر ﷺ تیرۆر بکەن.

یەکێك لەو ڕیوایەتانە ئەوەیە: کە ئیمام ئەحمەد ﷺ دەڵێ: یەزید بۆیگێڕاینەوە دەڵێ: وەلیدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جەمیع لەباوکی طوفەیلەوە بۆیگێڕاینەوە، کاتێ پێغەمبەر ﷺ ویستی لەغەزای تەبووك بگەڕێتەوە، فەرمانی دا جاڕ بدرێ: کە پێغەمبەر ﷺ لەکەلو بەرزاییەکەوە دەگەڕێتەوە، با هیچ کەس لەوێوە نەگەڕێتەوە، ئیتر دەستەیەك لەو دووڕووانە دەم‌و چاوی خۆیان داپۆشیو لەو ڕێگەوە هاتن بەنیازی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەو ڕێگا سەختەیە هەڵدێرن بەسەر وڵاغەکەیەوە، لەو کاتەدا عەممار وڵاغەکەی لێ دەخوڕی‌و حوزەیفەش

لەپێشەوە هەوسارەکەی رادەکێشا. عەممار بەگژیان دا چووەوە، پێغەمبەر ﷺ لەولاغەکە دابەزیو دووروووەکان نەیانتوانی کارەکەیان ئەنجام بدەن، ئایەتی ﴿وَهَمُّوا بِمَا لَمْ يَنَالُوا﴾ دەربارەی ئەم روداوە نازڵ بووە[١] ئەمجار پێش ئەوەی بچینە سەر راڤەکردنی ئایەتەکان بابزانین جیهاد چەند جۆری هەیە؟!

جیهاد: سێ جۆری هەیە: جیهاد کردن لەدژی دوژمنێکی ئاشکراو دیار، جیهاد دژی شەیتان، جیهاد کردن دژی نەفسو ئارەزۆ. ئایەتی ﴿وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ﴾الحج/٧٨ هەرسێ جۆرەکانی جیهاد دگرێتەوە. هەروەها ئایەتی ﴿وَجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾التوبة/٤١، ئەمیش هەرسێ جۆرەکە دەگرێتەوە. پێغەمبەریش ﷺ لەم بارەوە فەرموویەتی: (جاهدوا المشركين بأموالكم وأنفسكم وألسنتكم) ئەم فەرموودەیە ئیمام ئەحمەدو ئەبو داودو نەسائیو ئیبنو حەببانو حاکم لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەتیان کردوە.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبەر کردوە کە جیهاد بکا دژی کافرو مونافیقەکانو توندو تیژ بێ لەگەڵیان، وەکوو چۆن فەرمانی پێ کردوە: کە ئاوەشی عەطفو بەزەیی بۆ موسوڵمانان بکاتەوەو لەگەڵیان دا هێدیو هێمن بێ.

هەواڵی ئەوەشی پێداوە: کە سەرەنجامی کافرو مونافیقان لەرۆژی قیامەت دا ئاگری دۆزەخە.

هەرئیبنو کەثیر ریوایەتێك لەئیمام عەلییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەچوار شمێشرەوە نێردراوە. شمشێرێك بۆ هاوبەشپەیداکەران ﴿فَإِذَا انسَلَخَ الأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُواْ الْمُشْرِكِينَ﴾التوبة/٥، شمشێرێك بۆ کافرو خاوەن نامەکان ﴿قَاتِلُواْ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلاَ يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَلاَ يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُواْ الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ

---

[١] بۆ زێدە تەفصیلو ئاگادار بوون بڕوانە (الأساس في التفسير) دانراوی مامۆستا سعید حوی ج٤/٢٣٢٩-٢٣٣٢.

صَـــاغِرُونَ﴾التوبـــة/٢٩. شمـــشێرێك بـــۆ دووڕووەكـــان ﴿جَاهِـــدِ الْكُفَّـــارَ وَالْمُنَافِقِينَ﴾التوبة/٧٣، شمشێرێك بۆ یاخی بووەكان ﴿فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ﴾الحجرات/٩.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبەر ﷺ كردوە كە بەشمشێر جیهاد لەگەڵ دووڕووەكان دا بكا بەڵام بەشێوەیەكی توندو تیژ!!

بـەكورتی مونافیقـەكان ئەگـەر دووڕوویـی خۆیـان ئاشـكرا كـرد بەشمـشێر جیهادیـان لەگـەڵ دەكـرێ، ئەگـەر نیفاقەكـەیان دەرنەخـست وەكـوو موسـوڵمانان مامەڵەیان لەگەڵ دەكرێ مەگەر لەئایین هەڵگەڕێنـەوە یـان لەكۆمـەڵی موسـوڵمانان یاخی ببن‌و تاودەنە چەك‌و سەنگەر بگرن، یان شەعائیری ئیسلام جێبەجێ نەكەن!

بێگومان لە ڕۆژگاری ئێمـە دووڕوو زۆرو زەبەنـدەن، خـاوەن دەسـەڵات‌و قـسە ڕۆیـشتوو كـار بەدەســتن، ڕۆژ بـە ڕۆژیـش پەرەدەسـێنن‌و لـەزیاد بوونـدان، موسوڵمانانیش پاڵیان لێ داوەتەوەو چاوی خۆیان نوقاندوە، لایەنی خودا بـەردەدەن لەترسی زمـانی كافرو دووڕوو!! سـەیرە دەڵێـی ئایـەتی ﴿یجاهـدون في سـبیل الـله ولایخافون لومة لائم﴾یان نەبیستووە؟!

ئەمجار دێینە سەر ڕاڤەكردنی ئایەتەكان: كە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِـدْ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَـيْهِمْ﴾ ئـەی پێغەمبـەر! تێبكۆشـەو بـەردەوام بـە لەسـەر تێكۆشـان لەسـەر بەرەنگاربوونـەوەی تـاقمی كـافرو دووڕوو، هـەوڵ بـدە بـۆ ئـەوەی لەهەڵوێـستی خۆیـان پەشـیمانیان بكەیـەوە، تونـدو تیژبـە لـەدژیان‌و نـەرم‌و نیـانی لەبەرامبەریان دا مەنوێنە، وەكوو چۆن ئەوان ئەوپـەڕی هێـزو توانـای خۆیـان دژی تـۆ بـەكار دەهێـنن. توانـای خـۆت بخـەكارو بـەرەنگاریان ببـەوە؛ بەبەڵگـەو دەلیـل بۆریـان بـدە، بەشمـشێرو گـورزو تـیر شـەڕیان لەگـەڵ بكـە. هەڵبەتـە ئـەم چـەك‌و ئامێرانـە بـەگوێرەی ڕۆژگـار دەگـۆڕێن‌و دەبـێ موسـوڵمانان هـەوڵ بـدەن لەگـەڵ بارودۆخ دا چەكی پێویستیان هەبێ.

بێگومـان زانایـانی ئیسـلام كـۆكن لەسـەر ئـەوە كـە دووڕوو بـەگوێرەی شەریعەت مامەڵەی موسوڵمانانیان لەگەڵ دەكرێ‌و شـەڕیان لەگـەڵ نـاكرێ مەگـەر

بەئاشکرا لەئایین هەڵگەڕێنەوە، یان لەکۆمەڵی موسوڵمانان یاخی بن‌و سەنگەریان لێ بگرن، یان بەئەنقەستو ئینکەبەری شەعائیری ئیسلام جێ بەجێ نەگەن، لەوەپێشیش فەرموودەکەی ئیبنو عوسمانمان باس کرد کە فەرموویەتی: (جهاد الکفار بالسیف وجهاد المنافقین باللسان) جیهادی کافران بەشمشێرەو جیهادی دووڕووەکان بەئامۆژگاری‌و بەڵگەو دەلیل.

بێگومان جولەکە کافرەکانی مەدینە زۆر ئەزیەتی پێغەمبەریان دەدا، تەنانەت وشەی (السلام علیکم)یشیان گۆڕیبوو کە تووشی پێغەمبەر دەبوون، دەیانگوت (السام علیکم) واتە: مردنت لەسەر بێ. پێغەمبەریش لەوەلامیان دا دەیفەرموو: (وعلیکم) پاشان چەندەها وادەو بەڵێنی خۆیان هەڵوەشاندەوە ئەو رووداوانەی لێ کەوتنەوە کە لەوەپێش باسمان کردن.

بەلام پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی لەگەڵ دووڕووەکان دا بەشێوەیەکی نەرمو نیان بوو، ئەم هەڵوێستە نەرمو نیانەی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەریان وای لێ کردن جورئەت بکەن ئەوانیش ئەزیەتی پێغەمبەر ﷺ بدەن‌و پاشملە تانەو تەشەری لێ بدەن‌و پێی بڵێن: (هو أذن)....هتد. ئیتر لەم ئایەتەدا پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبەر کرد کەچی دی نەرمو نیانیان لەگەڵ نەنوێنێ، بەلام بەرامبەر ئەوان‌و کافرەکان توندو تیژ بێ، چونکە وێنەی ئەوانە بەنەرمو نیانی ناچارێن‌و پەندو عیبرەت وەرناگرن‌و تەمبێ خواردو نابن. وەکوو شاعیرێکی عەرەب دەڵێ:

ووضع النّدی في موضع السیف بالعلا مضر کوضع السیف في موضع الندی

بەڕاستی ئەمە جیهادێکی زۆر سەختو دژوارە، چونکە دەبێ هەڵوێستێك بنوێنێ بەرامبەر دووڕووەکان مام ناوەندی بێ نەوەکوو موسوڵمانان بەنەرمو نیانی‌و عەطفو بەزەیی لەگەڵیان دا بجووڵێتەوە، نەوەکوو کافرەکان تەندو تیژ بێ لەدژیان، واتە: دەبێ زۆر دادپەروەرانە لەگەڵ ئەم تاقمەدا بجوڵێتەوە. بۆیە ئیمامی عومەر لەم بارەوە دەفەرموێ: (أذلوهم ولاتظلموهم) بیانخەنە ژێر رکێفی خۆتانەوەو ستەمیان لێ مەکەن!!

بێگومـان سیاسـەتی ئیـسلامی دانـاو پابەنـد بەفـەرمانی خـوداو لێهـاتویی پێغەمبەر ﷺ دەربـارەی مامەڵـە کردنـی موسوڵمانان لەگـەڵ دووڕووەکـان وای کـرد زوربـەی زۆری ئـەو مونافیقانـە تۆبـە بکـەنو پەشـیمان ببنـەوە بەراسـتی بـەدڵو بەگیان موسوڵمان ببن.

﴿وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ دڵنیابە سـەرەنجامیانو شوێنی حەوانـەوەیان دۆزەخە، شوێنی تریان نیە جگە لەو شوێنە ناخۆشە، بەراستی خراپ ئاکامێکە ئەو ئاکامەی ئەوان، خراپ مـەنزڵو نیـشتەمەنییەکە، هەرکەسـێ بـچێتە نـاوی نـامرێو لەو سزایە رزگاری ببێ، ژیانەکەشـی چ ژیانێـك نیـە. پێـی بگـوترێ ژیـان! بـەکورتی ئەو دووڕووانە دوو عەزابیان دەدرێ؛ سزای دونیایان لەسەر دەستی موسوڵمانان کـە جیهادیان لەگەڵ دەکرێ، سزای قیامەتیشیان بەئاگری دۆزەخە...

ئەمجار پەروەردگار تاوانی مونافیقەکان دیاری دەکا، ئەو تاوانانەی کـە دەبنـە هۆی ئـەوەی وەکوو کافرەکـان جیهادیـان لەگـەڵ بکـرێ: ئـەو تاوانانـەی کـە بـریتین لەبانگەشەی کوفرو هەوڵدان بۆ تیرۆرکردنی پێغەمبەرو گاڵتە کردن بەنیـشانەکانی خوداو بەپێغەمبەرو بەموسوڵمانانو فـەرمووی: ﴿يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا﴾ سـوێند بەخودا دەخۆن، کە ئەو وشە کوفرانـەی پاڵیـان دراوە نـەیانگوتووە، قورئـانی پـیرۆز ئەو وشـە کوفرانـەی کـە ئـەوان وتوویانـە باسیان ناکا، ئەوەنـدە شـتێکی ناشـیرینو نـەگونجاویان گوتـووە قورئـان خۆدەپـارێزێ لەباسـکردنیان هـەروەها بـۆ ئـەوەی موسوڵمانان ئەو وشـە ناشـیرینانە نەخوێننـەوە، چـونکە ئەگـەر قورئـان ئـەو وشـەو رسـتانەی ئـەوان گوتوویانـە بیـچەسپاندنایە موسـوڵمانان دەیانخوێندنـەوە.. ﴿وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلامِهِمْ﴾ بێگومان ئـەوان وشـەی کوفریـان وتـووە، کـە دەڵێن: ئەمان وتووە درۆ دەکەن، شتی وایان گوتووە کوفری ئاشکرایە، ئـەوان پـاش ئـەوەی بەموسـوڵمان خۆیـان پیـشان دابـوو ئیعلانـی ئیـسلامەتی خۆیـان کردبـوو، ئیظهـاری کـوفرو بێـدینی خۆیـان ئـەنجام دا. دوای ئـەوەی کوفرەکـەیان شـاراوەبوو ئاشکرایان کـرد! ﴿وَهَمُّوا بِمَا لَمْ يَنَالُوا﴾ بـڕێ لـەو مونافیقانـە هـەوڵی تـیرۆر کردنـی پێغەمبەریان داو بۆیان نەکرا، ویستیان لەبەندەنو بەرزایی (العقبـة) کـە لەغـەزای تەبووك دەگەڕایەوە هەڵێدێرن. ژمارەی ئەم تیرۆرکەرانە بەگوێرەی فەرموودەیـەك

کە ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردوە دوانزە کەس بوون، لەڕیوایەتێکی ئیمام ئەحمەدیش دا عەممار جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دوانزە کەس بوون![1]

﴿وَمَا نَقَمُوا إِلاَّ أَنْ أَغْنَاهُمْ اللَّهُ وَرَسُولُهُ مِنْ فَضْلِهِ﴾ ئەو مونافیقانە لەئیسلامو ناردنی پێغەمبەر ﷺ شتێکیان نەبینیوە شیاوی ڕق لێ بوونەوەو هەوڵدانی تۆڵەکردنەوە بێ بێجگە لەوەی: کە خودا بەفەضلو گەورەیی خۆی بەهۆی دەستکەوتی جەنگەوە ئەوانو پێغەمبەریشی بێ ناتاج کردوە، کە ئەو ماڵو سامانە دەسکەوتەیە بەلایانەوە خۆشەویسترین شتە، ئەوانیش وەکوو ئەنصارەکانی مەدینە هەژارو موحتاج بوون، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك لەوتەیەکیدا ڕووبەڕووی ئەنصارەکان فەرمووی: (كنتم عالة، فأغناكم الله بي) واتە: زوربەی زۆری دانیشتوانی مەدینە دەستکورتو هەژار بوون، بەهۆی کۆچکرنی پێغەمبەر ﷺ بۆناویان دەوڵەمەند بوون.

بەکورتی شتێك نیە ببێتە هۆکاری ئەوەی ئەو مونافیقانە ڕقیان لەپێغەمبەرو ئیسلام بێ جگە لەوەی کە خودا بەفەضلو گەورەیی خۆی ئیسلامی کردوە بەهۆکاری ئەوەی ئەوان دەوڵەمەند بن! ئەمە پێی دەگوترێ مەدحی شێوە زەم.

ئەمجار سەرباری ئەم هەموو خراپەکاریو تاوانکردنە دەرگای تۆبەو پەشیمان بوونەوە کراوەو لەسەرپشتە ﴿فَإِنْ يَتُوبُوا يَكُنْ خَيْراً لَهُمْ﴾ ئەگەر ئەو دووڕووە تاوانکارانە تۆبە بکەنو واز لەدووڕوویی خۆیان بێنن، چیدی کرداری ناپەسند نەکەنو گوفتاری ناشیرین نەڵێن، ئەوە ئەو تۆبەو گەڕانەوە دەبێتە خێرو بەهرەمەندی دونیاو قیامەت دەبن: خودا تۆبەیان لێ وەردەگریو بەمراز دەگەن، لەدونیادا دەچنە پێڕی موسوڵمانانەوەو ڕەوشتی ئەوان هەڵدەگرن، پشت بەخودا دەبەستنو ڕازی دەبن بەقەزاو قەدەری خودا، خۆڕاگر دەبن لەبەرامبەر تەنگو چەڵەمەدا، تێدەکۆشن بۆ وەدەستهێنانی بەختەوەری قیامەتو بەڕاستی دەبنە هەواڵی پێغەمبەرو سوود لەڕەوشتەکانی وەردەگرن، فێری برایەتیو هەم ئاهەنگیو

[1] تەفسیری مەراغی ج١٦٦/٤ ، في ظلال القران ج٢٥٧/٤.

هاریکاری موسوڵمانان دەبن. لەقیامەتیش دا بەبەهەشتیان شاد دەکاو لەناو نازو نیعمەتی بەهەشت دا رادەبوێرن. ﴿وَإِنْ يَتَوَلَّوْا يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ عَذَاباً أَلِيماً فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ﴾ ئەگەر پشت هەڵکەنو روو وەرگێرن لەم بانگەوازییەو تۆبە نەکەنو سوور بن لەسەر دووڕوویی‌و خراپەکاری ئەوە پەروەردگار لەدونیاو قیامەت سزای بەئازاریان دەدا، لەدونیادا بەجۆرەها سزا تۆڵەیان لێ دەستێنێ: بەکوشتنو برین، بەرفاندنی ژنو منداڵیان، بەدەست بەسەراگرتنی ماڵو سامانیان، بەژیانی راڕایی‌و دڵە راوکی‌و ترسو خەمو خەفەتاوی. بەجۆرێك کە (کوونە مشکیان لێ ببنە قەیصەری)و عەرز لەخۆیان نەگرێ وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَأً أَوْ مَغَارَاتٍ أَوْ مُدَّخَلاً لَوَلَّوْا إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ﴾التوبة/٥٧.

یان دەفەرموێ: ﴿يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ﴾المنافقون/٤، هەمیشە ژیانی دونیایان خەمو خەفەتوترسو دڵەراوکێیە.

لەقیامەتیش دا ئەوە سزاو تۆڵەیان ئاگری دۆزەخەو دەخرێنە ناو قوڵایی دۆزەخو دەرەکی ئەسفەلەوە

﴿وَمَا لَهُمْ فِي الأَرْضِ مِنْ وَلِيٍّ وَلا نَصِيرٍ﴾ لەهەموو سەر زەوی دا کەسێکیان نیە سەرپەرشتیاریان بی‌و یارمەتییان بداو داکۆکییان لێ بکا، چونکە کەسێك خودا ریسوای بکا، کێ دەتوانێ پەنای بدا؟ لەدونیادا هەموو دەرگایەکیان بەرودا دادەخرێ، وەلایەتو خۆشەویستی‌و هاریکاری موسوڵمانانیان نیە، کەس خاسیان بۆ نابێژێ. لەقیامەتیش دا ئایەتە قورئانییەکان ئەوە دەچەسپێنن: کە کەس پشتگیری کافرو مونافیق ناکا.

## درۆزنی مونافیقەکانو بێ وادەو بەڵێنیانو چیرۆکی ثەعلەبە

﴿ ۞ وَمِنْهُم مَّنْ عَـٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٧٦﴾ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿٧٧﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٧٨﴾ ﴾

دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە چیرۆکێکی سەرنج راکێش هەیە، زوربەی راڤەکەرانی قورئان لێرەدا ئەو چیرۆکەیان هێناوە چەسپاندویانە هەرچەندە لای زانایانی فەرمووده نەچەسپاوە!!

چیرۆکەکەش ئەوەیە: طەبەرانیو ئیبنو مەردەومیهیو ئیبنو ئەبی حاتەمو بەیهەقی لەئەبی ئومامەوە دەگێڕنەوە کە هاوەڵێکی پێغەمبەر ﷺ کە ناوی ثەعلەبەی کوڕی حاطیب بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دوعام بۆ بکە کە خودا دەوڵەمەندم بکا! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ماڵوێران! ماڵو سامانێکی کەم بتوانی سوپاسی خودای لەسەر بکەی زۆر باشترە لەسامانێکی زۆر کە نەتوانی سوپاسی خودای لەسەر بکەی. ثەعلەبە وتی: بەخودا! ئەگەر خودا ماڵو سامانم بداتێ، زەکاتو صەدەقەی پێویستی لێ دەدەم! پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کرد، ئاژەڵی پەیدا کردن، پەرەیان ساندو زۆر بوون، تا وای لێهات کۆڵانەکانی مەدینە نەیدەکێشان! ناچار چووە دەری شارو لەوێ خەریکی بەخێوکردنی ئاژەڵەکانی بوو، دەهات بۆ مزگەوتی مەدینە بەپەلە پرۆزە نوێژەکەی دەکردو دەرۆیشتەوە بۆ لای

حەیوانــەکانی، وای لێ هــات شــوێن لــەوەڕو پــاوانی دەوروبــەری مەدینــە جیگــای بــەخێوکردنی مــەڕو مــاڵاتی ثــەعلەبــەیان لێ نــەدەبووەوە، ناچــار هەنــدێك لەشــار دوورکەوتــەوە، ئــیتر نەیــدەتوانی ئامــادەی نوێــژی جەماعــەت بــێ، تــەنها بــۆ نوێــژی جومعــە حــازر دەبــوو، نوێــژی هــەینی ئــەنجام دەداو یەکــسەر دەگەڕایــەوە بــۆ لای ئاژەڵەکانی، پاش ماوەیەك ئەوەنــدە پــەرەیان ساندو پێیانــەوە هەڵــەوگیر بــوو وازی لەئامادەبوونی جومعەو جەماعەت هێنا، ئەمجار کە ئایەتی ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا﴾ هاتە خوارێ، دو پیاو دانــران بــۆ کۆکردنــەوەی زەکــاتی مــاڵو سامانی ئــەو دەڤــەرەی ثــەعلەبــەی لێ بــوو، پێغەمبــەر ﷺ نامەیــەکی بــۆ نووســینو نــاردی بــۆ لای ثــەعلەبــە، پیاوەکــان هاتنــە لایو نامــەی پێغەمبــەریان پێــداو بۆیــان خوێندەوە، وتی: جارێ بچن بۆلای خەڵکی ترو کە لێبوونەوە بەلای من دا وەرنەوە، جاکە دوایی هاتنەوە لای ثەعلەبە بۆ ئەوەی زەکاتەکەی لێ وەرگرن! وتــی: وەڵلاهــی ئەمە سەرانەیە، وەکوو سەرانە دەچێ! بڕۆن من ئەم سەرانەیە نــادەم! ئــیتر ئایــەتی ﴿وَمِنْهُم مَّنْ عَاهَدَ اللَّهَ...﴾ تا دەگاتە ﴿يَكْذِبُونَ﴾ نازڵ بوو.

ئیبنو جەریرو ئیبنــو مــەردەوەیهی لــەئیبنو عەبباســەوە دەگێڕنــەوە: دەڵێن: دوایــی ثــەعلەبــە زەکاتەکــەی هێنــا بــۆ مەدینــە، پێغەمبــەر ﷺ فــەرمووی: خــودا جڵەوگیری لێ کردووم کە زەکاتەکەت لێ وەربگرم ئــیتر ثــەعلەبــە هــاواری لێ هەڵساو گڵو خۆڵی بەسەر خۆیدا کرد، بەڵام بێ سوود بوو، پێغەمبەر فەرمووی: مــن کــاتی خــۆی پــێم گــوتیو بەقــسەت نــەکردم، ئــەوە ســزای کــرداری خۆتــە. پێغەمبــەر ﷺ لەدونیا دەرچوو ثەعلەبە زەکاتەکەی هێنا بۆلای ئەبو بەکر ئەویش لێی وەرنەگرت پاشان لەســەردەمی جێنــشینی عومــەردا زەکاتەکــەی هێنــا بــۆلای ئــەو، ئــەویش لێــی وەرنــەگرت، لەسەردەمی جێنشینی ئیمام عوسمان دا مرد!!

مامۆستا (د. وهبــة الزحیلی) دوای گێڕانــەوەی ئــەم چیرۆکە دەڵێ: لەڕاســتی ئــەم چــیرۆکە لای فــەرموودە زانــان نەچەســپاوەو صــەحیح نیــە چــونکە ثــەعلەبــە یەکێکە لەهاوەڵانی غەزای بەدرو خوداو پێغەمبەری خودا شایەتی ئیمانداریيان بــۆ داوە. ئیبنــو عەبدولبــەڕ وتوویــەتی: قــسەی ئەوانــەی کــە دەڵێن: ثــەعلەبــە زەکــات

نەدەر بووەو ئەو ئایەتە دەرحەق بەئەو هاتۆتە خوارێ هیوا وایە ئەو رایە راست نەبێ.

ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە (الأصابة في تمييز الصحابه) دا دوای لێکۆلینەوەیەکی ئەبی حاطیبە، دەلێ ثەعلەبەی کوڕی حاطیب هاوەلی بەدرەو لەجەنگی حونەین دا شەهید بووە.

بەهەر حاڵ دەقە قورئانییەکە بەو ئوسلووبە ئامازەی بۆ کردوە بەو شێوە موبهەمە رای نواندوە، ئەوە دەگەیەنێ کە کەسانێکی دووڕوو هەبوون: لەکاتی هەژاری دا لەو جۆرە وادانەیان دوون دایی کە دەوڵەمەند بوون پابەندی وادەی خۆیان نەبوون! ئایەتەکان بەردەوامن لەسەر پەردەلادان لەسەر هەڵوێستو کرداری دووڕووەکانو نهێنییەکانیان بۆ موسوڵمانان ئاشکرا دەکەن. جا چونکە ئەو مونافیقانە گرۆ گرۆو جۆراو جۆرن بۆیە قورئان بەشێوەی جۆراو جۆر باسیان دەکا: جارێک دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُمُ الَّذِينَ يُؤْذُونَ النَّبِيَّ﴾التوبة/٦١، دەمێک دەفەرمووێ: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ﴾التوبة/٥٨، چەلێك دەبێژێ: ﴿وَمِنْهُمُ الَّذِينَ يُؤْذُونَ النَّبِيَّ﴾التوبة/٦١، لێرەش دا دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ عَاهَدَ اللَّهَ لَئِنْ آتَانَا مِنْ فَضْلِهِ﴾ واتە: هەندێك لەو مونافیقانە هەیە پەیمانیان بەخودا پێغەمبەری خودا داوەو دەدەن، دەڵێن: ئەگەر خودا بەفەضلو گەورەیی خۆی دەوڵەمەندمان بکاو ماڵو سامانمان بداتێ ﴿لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ بەتەئکیدەوە دەڵێن: ئێمە زەکاتی ماڵو سامانمان بەرێکو پێکی دەدەین، خێرو خێرات دەکەین، ماڵ دەبەخشین لەپێناو رەزامەندی خودادا، بەندەی راستاڵو گوێڕایەڵی فەرمانی خوداو پێغەمبەر دەبین.

﴿فَلَمَّا آتَاهُمْ مِنْ فَضْلِهِ بَخِلُوا بِهِ وَتَوَلَّوا وَهُمْ مُعْرِضُونَ﴾ کەچی کاتێ رِزقو رۆزی زۆری پێدانو ماڵو سامانیان زۆر بوو، رژدیو چروکییان نواندو زەکاتی واجبیان لەماڵو سامانی خۆیان دەرنەکرد، لەپێناو ئەنجامدانی کاری چاکەو خێرو خۆشیو باربووی جەنگاوەرانو بەهاناوە چوونی لێقەوماوان هیچیان نەبەخشی، پشتیان هەڵکردو خۆیان لەکۆمەگی کردنی هەژاران گرتەوە، جا وەنەبێ ئەم پشت

هەڵکردنـەیان شـتێکی لاوەکـی بـێو بەدەگمـەن رووی دا بـێ، بـەڵکوو لـەقوڵایی دڵیانەوەو بەهـەموو سووربونو لێبڕانـەوە پـشتیان هـەڵکردو بەئەنقەسـتو بـەهۆی رژدیو چروکییانەوە دەستی خۆیان قوچاندو بەهیچ کلۆجێ رێبازی ماڵبەخشینیان رەچاو نەکردو بەلای دا نەچوون، لەبیر خۆیـان بـردەوە، تەنانـەت ئەگـەر بیریـشیان بێتەوە، بیری خۆیانی ناهێننەوەو گوێی خۆیانی لێ کەڕ دەکەن ئەگەر بـانگ بکـرێن بۆ ماڵبەخشین وەڵام نادەنەوە!!

﴿فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقاً فِي قُلُوبِهِمْ إِلَى يَـوْمِ يَلْقَوْنَـهُ﴾ ئـەو رژدیو بەخیلییـە دوای ئـەو هـەموو سـوێندو وادەو بەڵێنانـەیان، بـوو بـەنیفاقو لـەدڵیان دا خـۆی دا کوتـا، ئـەو ناپـاکیو دووڕوویـیـەیان بـەردەوام دەبـێ تـا دەمـرنو دەچـنەوە بـەرقاپی پەروەردگاریان، چونکە دیارە چاوەڕوانی تۆبەیان لێ ناکریو سوورن لەسەر ناپاکی خۆیان.

ئـەمجار دوو هۆکـاری سـەرەکی بـۆ نیفاقەکـەیان بـاس دەکـا: کـە تایبـەتترین ڕەوشتی دووڕووەکانە، یەکەمیان پابەند نەبوونیانە بەوادەو بەڵێن، دووەم درۆزنی! دەفەرموێ: ﴿بِمَا أَخْلَفُوا اللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾ واتە: ئەو دووڕوویـیـەیان بەهۆی ئەوەوەیە: کە پابەندی وادەو بـەڵێنی خۆیـان نـین لەوتـەو سـوێندەکانیان دا درۆ دەکەن. چونکە دابـو نـەرێتی خـودا لـەئادەمیزاد دا وا هـاتووە هەرکردەوەیـەك کە نیفاق داخوازی بـێ زیـاتر نیفـاق لـەدڵ دا دەچەسپێنیو بـەهێزی دەکـا، وەکـوو چۆن کردەوەی چاكو پەسند ئیمان لەدڵ دا بەهێز دەکا زیـاتر دەیچەسپێنێ! هـەر بەو جۆرە هەموو رەوشـتو بیرو بـاوەڕێکی ئادەمیزاد زیـاد دەکـاو بـێ هێـزو بـەهێز دەبێ بەو کردەوانەی ئەنجامیان دەدا.

جـا چـونکە ئـەو دووڕووانـە خـیلاف وادەییو درۆزنـی لـەدڵو دەروونیـان دا جێگیر بوونو خۆیان دا کوتاوە بۆیە دووڕوویی لەدڵیان دا پتەوو چەسپاوە.

﴿أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ سِـرَّهُمْ وَنَجْـوَاهُمْ وَأَنَّ اللَّـهَ عَـلاَّمُ الْغُيُـوبِ﴾ ئایـا ئـەو دووڕووانە نازانن کە پەروەردگار هـەموو نهێنـیو پەنامـەکیان دەزانـێ؟! نـازانن کـە خـودا ئاگادارە بەسـەر ئـەو پەیمانـشکێنییەی لـەدڵی خۆیـان دا دەیـشێرنەوەو ئـەو

سـرتەو ئاخاوتنـە نهێنیانـەی کـە بەپەنامـەکی ئـەنجامی دەدەنو تانـەو تەشـەر ئاراستەی ئایینی خوداو پێغەمبەر دەکەنو پیلانو نەخشەی گلاو دژی موسوڵمانان دادەڕێژن نازانن کە پەروەردگار ﴿علام الغیـوب﴾ەو نهێنـی شـێردراوەی نـاو قـوڵایی دڵ دەزانیو هیچی لێ گوم نابێ!!!

**جوداوازی نێوان وشەی (السر)، (النجوی)، (الغیب) بەم جۆرەیە:**

(السر): بریتییە لەنهێنی نادڵ.

النجوی): بریتییـە لـەئاخاوتنی نهێنـی کـە خـەڵك لـەناو خۆیـان دا ئـەنجامی دەدەن. (الغیب): ئەوەیە: لەخەڵك نهێنی بێ.

## تانەو تەشەری مونافیقەکان لەموسوڵمانانو خوداش لێیان خۆش نابێ

﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ
فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ
فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱسۡتَغۡفِرۡ
لَهُمۡ أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ سَبۡعِينَ مَرَّةٗ فَلَن يَغۡفِرَ
ٱللَّهُ لَهُمۡۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا
يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٨٠﴾ ﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار باسی بـەخیلیو رژدی مونافیقـەکانی کـرد، تەنانـەت پاش ئەوەی سوێندیان خواردو پەیمانیان دا: کە ئەگەر خودا مـاڵو سـامانیان بـداتێ

زەکات دەدەن‌و خێرو صەدەقە دەکەن، هەر چروکی‌و رژدییان نواند. ئەمجار دێتە سەر باسی ئەوە: کە ئەو مونافیقانە لەتاوانکردن دا بەمەشەوە نەوەستاون، بەڵکوو تەجاوزیان کردوە: بۆ گاڵتە کردن بەو موسوڵمانانەی کە هەریەکەیان بەپێی خۆی خێرو خێرات دەکا، ئەگەر کابرای موسوڵمان دەوڵەمەند بێ‌و زۆر ببەخشێ دەڵێن: ئەوە بۆ ریبابازی دەبەخشێ، ئەگەر هەژار بێ‌و کەم ببەخشێ، بەگاڵتە پێکردنەوە دەڵێن: خودا پێویستی بەو تۆزە ماڵە نیە ئەو بیبەخشێ. بەم جۆرە ئەو مونافیقانە گەیشتوونە ئەندازەیەك هیچ بەش‌و بارێکیان لەئایینی ئیسلام دا بۆ خۆیان نەهێشتۆتەوە. تەنانەت ئەگەر پێغەمبەر دوعای لێخۆشبوونیشیان بۆ بکا خودا لێیان خۆش نابێ، چونکە ئەوەندە لەکوفرو بێدینی دا رۆچوون هیوای ئیمانیان لێ ناکرێ‌و لێخۆشبوونی خودایان بەنسیب نابێ!! هەردوو پیری فەرموودە: موسلیم‌و بوخاری‌و هی تریش لەئەبو مەسعودی بەدرییەوە دەگێڕنەوە دەڵێن: گوتویەتی: کاتێك فەرمانمان پێ کرا بەماڵبەخشین لەرێگەی خودادا هەمانبوو بەکرێ کۆڵکێشی دەکردو بەوە ماڵ‌و منداڵی خۆی دەژیاند، پیاوێك کە ناوی (الحبحاب) یان (الحبحاح) بوو نیو ربەی خورما هێنا کردی بەخێر، یەکێکی تر زیاتری هێنا! مونافیقەکان وتیان: بێگومان خودا پێویستی بەو تۆزە خێرەی ئەم هەژارە نیەو ئەوەشیان کە زۆری هێناوە بۆ ریبابازی هێناویەتی. ئیتر ئایەتی ﴿الَّذِينَ يَلْمِزُونَ...﴾ هاتە خوارێ.

ئیبنو جەریر لەعیکریمەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: لەغەزای تەبووك دا پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانانی هەڵنان کە خێرو صەدەقە بکەن‌و کۆمەکی کۆ بکەنەوە بۆ پێداوستی موسوڵمانان. عەبدوررەحمانی کوڕی عەون چوار هەزار دیرهەمی هێنا، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ماڵ‌و سامانەکەم هەشت هەزار دیرهەم بوو نیوەم هێناوەو نیوەشم هێشتۆتەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خودا خێرو بەرەکەت بخاتە ئەو ماڵەی بەخشیوەتەو ئەو ماڵەی هێشتووتەوە. عومەری کوڕی خەتابیش ئەندازەیەکی وای هێنا، عاصیمی کوڕی عەدی ئەنصاری حەفتا ویسقی خورمای هێنا، عوسمانی کوڕی عەففان ماڵێکی یەکجار زۆری هێنا، ئەبو عەقیل ربەیەکی خورما هێنا وتی: قوربان! شەوی رابردوو باغە دارخورمام بۆ کابرایەك ئاو داوە،

دوو ربـەم خورمـا لێ وەرگرتـووە ربەیـەکیانم بـۆ مـاڵو منـداڵم جـێ هێـشتووەو ربەیەکیشیانم بەقەرز داوە بەخودا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد کە ربە خورماکەی بخەنە سەر کۆمەڵی صەدەقە.

ئیتر مونافیقەکان لەروی تانـەو تەشـەرەوە وتیـان: ئەوانـە بـۆ ریابـازی ئـەو ماڵو سـامانەی خۆیـان هێنـاوە کردویانـە بـەخێر. (ابـو عقیـل)یـش بۆیـە ئـەو ربـە خورمایـەی هێنـاوە تـا لـەریزی ئـەو ساماندارەنەدا نـاوی بهێنـرێ، ئـەگینا خـودا چ پێویستیەکی بەو ربە خورمایەی ئەبو عەقیل نیە، ئیـتر پـەروەردگار ئـەم ئایەتـەی نارده خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لا يَجِدُونَ إِلاَّ جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ﴾ ئـەو کەسـانەی تانـەو تەشـەر لـەو موسـوڵمانانە دەدەن کـە بـەئارەزۆی خۆیـان زیـاد لـەزەکاتی واجبـو پێویـست مـاڵو سـامانی خۆیـان دەبەخـشن، گاڵتـە بەسـامانداره موسـوڵمانەکان دەکـەن دەڵـێن: بـۆ ریابـازی بەلێـشاو مـاڵ دەبەخـشن، لاقرتـێ بەهـەژارەکان دەکـەن کـە شـتی کـەم دەبەخشن، دەڵێن: هەر بۆیـە ئـەو شـتە کەمـە دەبەخـشن بـۆ ئـەوەی ناویـان لەگـەڵ ماڵبەخشەکانی تر تۆمار بکرێ، ئەگینا خـودا چ پێویـستیەکی بـەو تـۆزە ماڵـە نیـە. ئەو مونافیقانەی کە بەو جۆرە گاڵتـە بەموسـوڵمانان دەکـەن، ﴿سَخِرَ اللَّهُ مِنْهُمْ﴾ خودا تۆڵەی ئەم گاڵتە کردنەو هەموو کردارو گوفتارو هەڵوێستێکیان لێ دەستێنێو دەیانکاتە جێگای گاڵتەی موسوڵمانانو ریسوایان دەکـا، بـەم جـۆرە نیـازو مەبەسـتی گڵاویان دەردەخاتو وتارو کرداری بەدیان ئاشکرا دەکاو دەیانکاتـە پەنـدی زەمانـەو ئابروویان دەبا. سەرباری ئەوەش ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ لەقیامەتیش دا سزای تونـدو بەئێشیان بۆ ئامادە کراوە..

ئـەمجار پـەروەردگار سـزاو تۆڵـەی خـۆی بـۆ دووڕووەکـان دیـاری دەکـاتو دەیانخاتە پێڕی کافرەکانەوەو دەفەرموێ: ﴿اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ﴾ ئـەی موحەممـەد! ئەگـەر تـۆ بپاڕێیـەوەو داوای لێخۆشـبوون بکـەی بـۆ مونافیقـەکانو داوا بکـەی تاوانـەکانیان پـەردەپۆش بکـرێنو لێیان خۆش بینو فەضحیان نەکەین، یان بۆیـان نەپاڕێیـەوەو داوای لێخۆشـبوونیان بۆ نەکەی یەکسانە، ئەگەر هـەزار جـار داوای لێخۆشـبوونیان بـۆ بکـەی ئـەوە بزانـە

خـودا تاوانـەکانیان پـەردەپۆش ناکـاو لێیـان خـۆش نـابێ، بـەڵکوو رۆژی قیامـەت لەپێش چاوی خەڵك ریسوایان دەکا.

مەبەست بە(سـبعین) لێـرەدا ژمـارەی تایبـەت نیـە، بـەڵکوو مەبەسـت زۆریو زۆر داوا کردنــە، واتــە: ئــەتۆ هەرچــەندێك داوای لێخۆشــبوونیان بــۆ بکــەی، پاڕانەوەکەت وەرناگیریو لێیـان خـۆش نـابین. وەکـوو لەئایەتێکـە تـردا دەفـەرموێ: ﴿سَوَاء عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ﴾المنافقون/٦.

بێگومان پێغەمبەر ﷺ لەخودا دەپاڕایەوە: کە هیدایەتیان بداو تۆبـە بکـەنو لێیـان خـۆش بـێ، هـەروەکوو چـۆن دوعـای دەکـرد کـە لەموشـریکەکان خـۆش بـێ، چەندێك ئەزیەتیان بدایە، ئەو لەخودا دەپاڕایەوە دەیفـەرموو: (اللهم اغفـر لقـومي فانهم لايعلمون) رواه ابن ماجه.

بێگومـان پێغەمبــەر ﷺ لـەم داوای لێخۆشـبوونەی بـۆ کـافرو دووڕووەکـان عـوزری هـەبوە، عوزرەکەشـی ئـەوە بـووە: کـە نائومێـد نـەبوە لـەوەی ئیمـان بێـنن، بەمەرجێ نەیزانیبێ کە ئەوانە بەسروشت گومڕان، چونکە داواکردنی لێخۆشـبوون بـۆ موشـریكو دووڕوو کاتێـك یاسـاغە کـە زانیبیـەتی ئەوانـە بەسروشـت گـومڕانو ئیمان ناهێنن. وەکوو لەشوێنێکی تردا ئاماژە بۆ ئەمە دەکاو دەفـەرموێ: ﴿مَـا كَـانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى مِن بَعْـدِ مَـا تَبَـيَّنَ لَهُـمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴾التوبة/١١٣.

ئـەمجار لێـرەدا پـەروەردگار هـۆی قبـووڵ نـەکردنی داواکاریەکـەی پێغەمبـەر دیـاری دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿ذَلِــكَ بِــأَنَّهُمْ كَفَــرُوا بِاللَّــهِ وَرَسُــولِهِ﴾ بۆیـە داوای لێخۆشبوونەکەت وەرنـاگیرێ چـونکە ئـەوان ئینکـاری تـاكو تـەنهایی خـودا دەکـەن، بڕوایـان بـەوە نیـە کـە خـودا ئاگـادارو زانایـە بەسـەر هـەموو نهێنـیو سـرتەو پەنامـەکیو شـتە نادیارەکـان دا. ئینکـاری پێغەمبەرایـەتی پێغەمبـەری ئیـسلام دەکـەنو بڕوایـان بەزینـدو بوونـەوە نیـەو سـوورن لەسـەر ئینکارییەکـەیان! دڵو دەروونیـان ئامادەباشـی ئـەوەی تێـدا نیـە هیدایـەتو نـووری ئـایین وەربگـرنو

موسوڵمان ببن. ﴿وَاللَّهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ دابو نەریتی خودا وا جاری بووە: کە هیدایەتی گرۆو تاقمی یاخی بوو کافر نەداو نەیانخاتە سەر ڕێبازی حەق.

کەسانێك بۆخۆیان ئامادەباشی ئیمان هێنانو تۆبە کردنیان تێدا نەبێ، لەرێبازی حەق لایاندابێ، خوداش هیدایەتیان نادا، ناهومێد کردنیان لەلێخۆشبوون لەبەر ئەوە نیە خودا بەخیل بێ، یان پێغەمبەر ﷺ کەمتەرخەمی کردبێ، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە: کە ئەوان ئامادەباشی ئەوەیان تێدا نیە بگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێگای حەقو ڕاست. کوفرو بێدینییەکەی خۆیانە کە بووەتە لەمپەڕو کۆسپ لەبەردەم لێخۆشبوونی خودا بۆیان!

## موونافیقە خۆپاشدەرەکان لەچوون بۆ غەزای تەبووك دڵخۆش بوون بەنەچوونەکەیان

﴿ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓا۟ أَن يُجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُوا۟ لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُوا۟ قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا۟ كَثِيرًا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ



﴾

دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە، ئیبنو جەریر لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەخەڵکی کرد کە لەخزمەتیا بچن بۆ غەزای تەبووك، کاتەکەش وەرزی هاوین بوو، چەند کەسێك وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! زۆر گەرمایەو ناتوانین دەربچین بۆ غەزا ئێمە لەکاتی گەرمادا ناچین بۆ غەزا ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا﴾ی ناردە خوارێ.

هەرئیبنو جەریر لەموحەممەدی کوڕی کەعبی ئەلقورەظییەوە ریوایەتێکی تری لەم جۆرە ریوایەت کردوە.

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار لەئایەتی پێشوودا بڕێ کردەوەی ناپەسندی دووڕووەکانی روون کردەوە کە بریتی بوو لەعوزر هێنانەوە بۆ نەچوون بۆ غەزای تەبووکو تانەو تەشەر دان لەدابەشکردنی صەدەقە.... جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ سەر بەیانکردنی جۆرێکی تر لەخراپەکاریەکانیان کە دڵخۆشبوونیانە بەپاڵدانەوەو دەرنەچوونیان بۆ غەزا، دەفەرموێ: ﴿فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلافَ رَسُولِ اللَّهِ﴾ واتە: ئەو دووڕووانە کەیفخۆشن بەوەی کە لەمەدینە دا پاش دراونو نەبراون بۆ غەزاو ئەو بەهرەمەندییەیان بەنسیب نەبووە. کەیفخۆشن بەوە کە لەماڵەوە دانیشتوونو پێغەمبەر ﷺ لەکاتی بەرێکەوتنی بۆ غەزای تەبووك لەگەڵ خۆی نەیبردون...

هۆی دڵخۆشییان بەو دەرنەچوونەیان بڕوا نەبوونیانە بەگرنگی جیهادو بەخێرو بێری تێکۆشان لەپێناو ئاینی خودادا، پێیان ناخۆشە لەتەك پێغەمبەر دا بەماڵو بەگیان جیهاد بکەن! هەڵبەتە ئاشکرایە پێخۆشبوونیان بەمانەوە لەماڵ مانای ئەوە دەگەیەنێ: کە چوونیان پێ ناخۆشە. بەڵام پەروەردگار مانای رستەکەی جەخت کردوەو فەرمووی: ﴿وَكَرِهُوا أَنْ يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ واتە: پێیان ناخۆش بوو کە جیهاد بکەن بەماڵو گیانیان لەپێناو ئاینی خودادا. هاوبەشی غەزا بکەن!

جا وەنەبێ هەر بەپێخۆشبوونی مانەوەیان لەماڵەوە واز بێنن بەڵکوو خەڵکی تریش دەترسێنن لەهاوبەشی کردنو هەڵیان دەفریوێنن بۆ خۆپاشدانو پاڵدانەوە! بەجۆرێك هەندێکیان ئامۆژگاری هەندێکیان دەکرد: ﴿وَقَالُوا لا تَنفِرُوا فِي الْحَرِّ﴾ پێیان گوتن: مەچن بۆ جیهاد، لەم وەرزە گەرمایەدا هاوبەشی ئەو غەزایە مەکەن، کاتەکەی ناسکەو سێبەر خۆشنو میوەگەنانەو بەروبووم پێگەیشتووە! ماڵو حاڵو باغو باغاتی خۆتان بەجێ مەهێڵن، ئەم گەرمایە تەحەممول ناکرێ!

پەروەردگار ڕەددیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئاگری دۆزەخ کە ئامادەکراوە بۆ سەرپێچیکاران، ئێوەش سەرەنجامتان بەهۆی پابەند نەبوونتان بەفەرمانی خوداو پێغەمبەری خوداوە بۆ ئەو شوێنە ناخۆشەیە زۆر لەو گەرمایە گەرمترە: کە ئێوە خۆی لێ دەشێرنەوە؛ ﴿لَوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ﴾ ئەگەر عەقڵو تێفکرینیان ببوایە، سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەریان نەدەکردو لەماڵەوە پاڵیان نەدەدایەوە، بەهاوبەشی نەکردنەکەیان کەیفخۆش نەدەبوون بەڵکوو خەفەتبار دەبوون، خۆیان نەدەکردە سوتەمەنی ئەو ئاگرە بێ ئامانە.

ئیمامی مالیکو هەردوو پیری فەرمووده ڕیوایەتێك لەئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (نار بني آدم التي توقدونها جزء من سبعين جزءً من نار جهنم.)

جا ئەگەر ئەوانە لەگەرمای ماوەکورتی سەر زەوی دەترسن، ڕەحەتیو رابواردن لەسای سێبەر دا ئیختیار دەکەن، ئەی دەبێ لەئاگری دۆزەخ دا چی بکەن؟ خۆ ئاگری دۆزەخ گەرمترەو درێژ خایەنترە! بەراستی ئەمە گاڵتە پێکردنێکی تاڵ، بەڵام لەهەمان کات دا حەقیقەتە.

بەکورتی ئەوانە دوو ڕێگایان لەپێشە، یان بۆ ماوەیەکی کورتو سنووردار لەگەرماو تەنگو چەڵەمەدا جیهاد بکەن، یان فڕێ دەدرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە بۆ ماوەیەك هەر خودا دەزانێ چەندە!

﴿فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلاً وَلْيَبْكُوا كَثِيراً﴾ با کەم پێ بکەنو زۆر بگرین! واتە: دەبوایە ئەوان پێکەنینیان کەمو گریانیان زۆر بوایە، بۆ حاڵی خۆیان بگریانایەو بەزەییان بەحاڵی خۆیان دا بێتەوە، لەپای ئەو بەهرەمەندییەی لەکیسیان چووەو ئەو سزاو تۆڵەیەی بۆیان ئامادەکراوە!

دەشتوانین ئاوا مانای ئەم ڕستەیە بکەین: با ماوەیەکی کەم کەیفخۆش بن بەپاڵدانەوەو نەچوون بۆ غەزا، با پێ بکەنن!! بێگومان ماوەی پێکەنینەکەیان کەمە، چونکە بەکۆتایی هاتنی ژیانیان کۆتایی کەیفخۆشیو پێکەنینیان دێ!

بەشوێن ئەو پێکەنینو شادییەیان دا گریانی درێژخایەنو نەبڕاوەی قیامەتیان بۆ پەیدا دەبێ، سزاو تۆڵە بێ ئامانی ناو ئاگری دۆزەخیان توش دێ ﴿جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ ئەو سزادانو عەزابەی قیامەتیان پاداش تۆڵەستاندنەوەی ئەو کردەوانەیانە، کە لەژیانی دونیادا ئەنجامیان داوە.

موسلیمو بوخاری لەصەحیحەینی خۆیان دا فەرموودەیەکیان لەنوعمانی کوڕی بەشیرەوە ریوایەت کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ان أهون أهل النار عذاباً يوم القيامة لَمَنْ له نعلان وشراكان من نار جهنم يغلي منهما دماغه، كما يغلي المرجل، لايرى أن أحداً من أهل النار أشد عذابا منه، وانه أهونهم عذاباً) هێواشترین سزادانی ئەهلی دۆزەخ رۆژی قیامەت کەسێکە دوو (نەعل) سۆڵی لەئاگر لەپێ دەکرێ، مێشکی بەهۆیانەوە دەکوڵێ وەکوو چۆن مەنجەڵی سەر ئاگر دەکوڵێ، وا گومان دەبرێ کەس بەئەندازەی ئەو سزای بەئێشو توند نیە، وەڵێ ئەو لەهەموو دۆزەخییەکان عەزابی سوکترە.

جا وەنەبێ ئەم هەڕەشەیەی ئایەتەکە تایبەت بێ بەمونافیقەکانو کەسی تر نەگرێتەوە، بەڵکوو موسوڵمانی راستاڵیش دەگرێتەوە. ئەوانیش خەق وایە، پێکەنینیان کەمو گریانیان لەترسی خودا زۆر بێ، ئەوەتا: تیرمیذی فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئاڕاستەی هاوەڵانی کردوە، فەرموویەتی: (والله لو تعلمون ما أعلم لضحكتم قليلاً، ولبكيتم كثيراً، ولخرجتم الى الصُعُداتِ تجأرون الى الله تعالى، والله لوددت أني كنت شجرة تعضد) سوێندم بەخودا ئەوەی من دەیزانم ئەگەر ئێوە بتانزانیایە کەم پێ دەکەنینو زۆر دەگریانو دەچوونە سەر رێگەوبانان لەخودا دەپاڕانەوەو دەنووزانەوە. وەڵڵاهی من بۆ خۆم پێم خۆش بوو درەختێك بومایە ببڕامایە؟!

## مەنع کردنی مونافیقان لەهاوبەشیکردنی جیهادو مەنع کردنی پێغەمبەر لەوەی نوێژ لەسەر مردوو بکا

﴿ فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ
لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا۟ مَعِىَ أَبَدًا وَلَن تُقَـٰتِلُوا۟ مَعِىَ عَدُوًّا ۖ
إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْخَـٰلِفِينَ ﴿٨٣﴾
وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ
كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ وَلَا تُعْجِبْكَ
أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَـٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ
أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾

دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئیمام ئەحمەدو بوخاری‌و تیرمیذی هی تریش فەرموودەیەکیان لەئیبنو عەبباسەوە گێڕاوەتەوە، دەڵێ: بیستم عومەر دەیگوت: کاتێ عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی مرد، بانگی پێغەمبەر ﷺ کرا بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکا، پێغەمبەر ﷺ تەشریفی لەسەری راوەستا بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکا، ئیمامی عومەر دەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەرم کرد وتم: قوربان چۆن جەنابت نوێژ لەسەر دوژمنی خودا؛ عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی دەکەی کەواو وای گوت، فلان رۆژ ئەوەی گوتو فلان کات ئەوەی گوت. خۆ خودا نەی لێ کردوی کە نوێژ لەسەر مونافیقان بکەی! پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنەی هاتی‌و منیش زۆرم گوت. ئەمجار فەرمووی: عومەر! وازم لێ بێنە! ئەمن بۆخۆم سەرپشك کراوم، پێم گوتراوە ﴿استغفر لهم أو لاتستغفر لهم ان تستغفر لهم سبعين مرة فلن يغفر الله لهم﴾

ئەگەر بزانم: لەحەفتا زیاد بکەم خودا لێیان خۆش دەبێ لەحەفتا کەڕەتم زیاتر داوای لێخۆشبوون بۆ دەکردن.

ئەمجار نوێژی لەسەر کردو لەگەڵ تەرمەکەدا رۆیشتو لەسەر گۆڕەکەی وەستا، تا شێردرایەوە عومەر دەڵێ: بەراستی من جەسارەتم کردو خۆم زۆر پێ نازابوو. سوێندم بەخودا زۆری پێ نەچوو ئەم دوو ئایەتە نازڵ بوون، ئیتر لەودوا تا لەدونیا دەرچوو نوێژی لەسەر دووڕوو نەدەکرد! زوربەی زۆری کتێبە تەفسیرەکان ئەم ریوایەتەو ریوایەتی تریان لەم بارەوە هێناوە، بەڵام بەراستی ئەمە جێگای هەڵوێستەیەو پێویستی بەلێ وردبوونەوە هەیە.

هەر بۆیە زۆر لەزانایانی ئیسلام وەکوو قاضی ئەبو بەکری باقلانیو ئیمام الحەرەمەینو ئیمام غەزالیو هی تریش پێیان وایە: ئەم حەدیثە صەحیح نیە، چونکە لەچەند رویەکەوە دژایەتی لەگەڵ مانای ئایەتەکە دەکا.

١- نوێژ کردنی پێغەمبەر ﷺ لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کراوە بەهۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکە، دەی سیباقی قورئانو ریز کردنی ئایەتەکان بەئاشکرا ئەوەیان لێ وەردەگیرێ: کە ئەم ئایەتە لەغەزای تەبووك دا هاتووتە خوارێ، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی ساڵی پاش غەزای تەبووك مردوە.

٢- عومەر کە دەڵێ: چۆن نوێژ لەسەر تەرمی دوژمنی خودا دەکەیو خودا نەی لێ کردووی: کە نوێژ لەسەر مونافیقان بکەی، ئەوە دەگەیەنێ کە نەهییەکە پێش مردنی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بووە، دەی هەرقسەکەی عومەر کە دوایی دەڵێ: نوێژی لەسەر کردوو لەگەڵ تەرمەکەی دا رۆیشت... ئەمجار پەروەردگار ئایەتی ﴿وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم...﴾ی ناردە خوارێ، ئەوە دەگەیەنێ کە ئایەتەکە پاش مردنی کوڕی ئوبەی هاتۆتە خوارێ، ئەمەش دژایەتیەکی ئاشکراو روونە لەنێوان دەقی ریوایەتەکەدا.

٣- فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: خودا سەرپشکی کردوم لەوەدا داوای لێخۆشبوون بۆ مونافیقان بکەم یان نا! ئیشکال پەیدا دەبێ، چونکە سەرپشکی کاتێك دەبوو کە ئایەتەکە بەصەراحەت ئەوەی تێدا نەبوایە: کە خودا

لێیان خۆش نابێ، بەڵام ئەوەتا: لەئایەتەکەدا بەئاشکرا دەفەرموێ: ﴿ان تستغفر لهم سبعين مرة فلن يغفر الله لهم﴾ کەوابوو (أو) بۆ تەخییر نیە بۆ تەسوییەیە، جوداوازی نێوان (تەخییر)و تەسوییە)ش ئاشکرایە.

لەبارەی نوێژ کردنی پێغەمبەر ﷺ لەسەر تەرمی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی ریوایەتی تریش هەن لەئیبنو عومەرەوە، لە جابیرەوە ریوایەت کراوە.

ئەبو یەعلاو هی تریش لەئەنەسەوە ریوایەتیان کردوە: کە پێغەمبەر ﷺ ویستی نوێژ لەسەر تەرمی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بکا، جوبریل نەیهێشتو فەرمووی: ﴿وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم﴾ ئەم ریوایەتە ئەوە دەگەیەنێ: کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر نەکردوە. بۆ چارەسەری دژایەتی نێوان ریوایەتەکان هەندێك لەزانایان ریوایەتی بوخارییان پەسند کردوە، هەندێکیان ویستوویانە تەوافوق بخەنە نێوانیان وتوویانە: مەبەست بە(الصلاة) لەریوایەتی عومەر دا، هەروا لەریوایەتێکی تردا کە لەعەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە دەگێڕدرێتەوە بەمانا دوعاو داوای لێخۆشبوونە، یان مەبەست ئەوەیە: ویستی نوێژی لەسەر بکاو جوبرائیل نەیهێشت! بەهەرحاڵ پێویستە ئەوە بزانین: کە ئایەتەکە مانایەکی گشتی تر دەگەیەنێ‌و فراوان ترە لەو مانا تایبەتیەی کە ریوایەتەکان دەیگەیەنن. مامۆستا (سید قطب) دەفەرموێ: ئایەتەکە بنەمایەك لەبنەماکانی رێزو تەقدیر لەیاسای کۆمەڵی موسوڵمانانی تێکۆشەر لەپێناو بیرو باوەڕدا دەچەسپێنێ، داوای ئەوە دەکا چاوپۆشی نەکرێ لەبەخشینی داوەرەی رێزو تەقدیر بۆ ئەوانە خۆ لەجیهادو تێکۆشان دەشێرنەوە، راحەتو نوستن لەسێبەردا بەسەر تێکۆشانو جیهاد لەپێناو ئایینی خودادا هەڵدەبژێرن، تەرازووی رێزو تەقدیر هەوڵو تێکۆشانو پابەند بوونە بەفەرمانی خوداو ئامۆژگاری پێغەمبەری خودایە، تەقواو خوداپەرستییە.

ئەمجار دوای ئەم بەرکووڵە دەربارەی هۆی نازڵبوونی ئایەتەکان دێینەوە سەر راڤەکردنی ئایەتەکان. دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ رَجَعَكَ اللَّهُ إِلَى طَائِفَةٍ مِنْهُمْ فَاسْتَأْذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! ئەگەر خودای تۆ لەغەزای تەبووك تۆی گەیاندەوە بۆ مەدینەو ئەو کۆمەڵە مونافیقەت چاوپێکەوتنەوە کە خۆیان پاش

داوەو ئامادەی غەزا نەبوون، -وەکوو قەتادە دەڵێ: دوانزە پیاو بوون داوایان لێ کردی بۆ غەزایەکی تر ڕەگەڵت کەون، ویستیان هاوبەشی بکەن ئەتۆ لەروانگەی تەمبێ کردنو سزادانیانەوە ﴿فَقُلْ لَنْ تَخْرُجُوا مَعِي أَبَداً﴾ پێیان بڵێ: ئێوە ئیتر بەهیچ شێوەیەك جارێکی تر هاوڕێیەتی من ناکەنو لەگەڵم نایەنو لەسەنگەری ئێمە دا ئێوە شەڕ لەدژی دوژمنان ناکەن، ئێوە ئەو پیاوە نین شەرەفو ڕێزی جیهادتان بەربکەوێ.

ئەمجار پەروەردگار بابیسی ئەوە دێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَلَنْ تُقَاتِلُوا مَعِي عَدُوّاً إِنَّكُمْ رَضِيتُمْ بِالْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ ئێوە یەکەمجار پاڵدانەوەو خۆشاردنەوە لەجیهادتان هەڵبژاردو بەبێ عوزرو بیانووی ڕەوا خۆتان پاش داو نەهاتن بۆ غەزا، سوێندی بەدرۆتان خواردو ڕاستگۆ نەبوون، دڵخۆشو تەڕدەماغ بوون بەخۆپاشدانو هاوبەشی نەکردن، بەڵکو بەوەشەوە نەدەوەستان خەڵکانی تریشتان هەڵدەنا بۆ خۆپاشدانو هاوبەشی نەکردن، کەوابێ ﴿فَاقْعُدُوا مَعَ الْخَالِفِينَ﴾ دانیشنو پاڵی لێ بدەنەوە لەگەڵ ئەو مونافیقانەی خۆیان پاش داوەو لەجیهاد خۆیان شاردۆتەوە، یان دانیشن لەگەڵ پیرەژنو ئافرەتو منداڵو پەککەوتەکان، ئێوە پیاوی جیهاد نینو ئەو شەرەفەتان پێ نادرێ! ئەرکی پارێزگاریکردن لەئایینی خودا شکۆمەندییەکە شانی ئێوە هەڵی ناگرێ!!

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەر ﷺ دەکا: کە دوورەپەرێزی تەواو لەکۆمەڵی مونافیقان ڕابگەیەنێ، نوێژ لەسەر مردوویان نەکاو ئامادەی بەخاکسپاردنیان نەبێو داوای لێخۆشبوونیان بۆ نەکا. دەفەرموێ: ﴿وَلا تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَداً وَلا تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ﴾ بەهیچ شێوەیەك نوێژ لەسەر مردوویان مەکەو ئامادەی بەخاکسپاردنیان مەبەو لەسەر گۆڕیان ڕامەوەستەو دوعای ئارامیو خۆراگرییان لەسەر وەڵامی فریشتە بۆ مەکە! ئەبو داوودو حاکمو بەزار لەئیمامی عوسمانەوە ڕیوایەتیان کردوە: دەفەرموێ: هەرکاتێ پێغەمبەر لەبەخاکسپاردنو داپۆشینی تەرمی مردوو دەبووەوە لەسەر گۆڕەکەی ڕادەوەستاو دیفەرموو: (استغفروا لأخيكم وسلواله التثبيت فانه الآن يسأل) داوای لێخۆشبوون بۆ ئەم

برایەتان بکەنو داوای خۆراگری‌و جوان وەڵامدانەوەی بۆ بکەن بێگومان ئێستا ئەو پرسیاری لێ دەکرێ.

ئایەتەکە بەروونی ئەوە دەگەیەنێ کەنابێ نوێژ لەسەر تەرمی کافر بکرێ، ئەمە حوکمێکی گشتییەو هەرکەسێ موناڤیق بێ نابێ موسوڵمان نوێژی لەسەر بکا. نابێ ئامادەی بەخاکسپاردنو داپۆشینی بێ، نابێ زیارەتی گۆڕی بکا، نابێ دوعای لێخۆشبوونی بۆ بکا.

ئەمجار پەروەردگار هۆکاری نەهی کردن لەنوێژ لەسەر کردنیانو راوەستان لەسەر گۆڕیانو دوعا بۆ کردنیان روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُوا وَهُمْ فَاسِقُونَ﴾ چونکە بێگومان ئەوانە بڕوایان بەهەبوونی خودای تاکو تەنیا نیەو، ئینکاری پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر دەکەنو سووربون لەسەر ئەو بێ بڕواییەیانو بەکافری مردوونو کە دونیایان بەجێ هێشتووە بێ ئیمان بوون، لەحاڵەتی یاخی بوونو سنوور شکێنی دا بوون کە مەرگ یەخەی پێ گرتوون.

هەروەها چونکە نوێژ کردن لەسەر مردو شەفاعەت بۆ کردنەو راوەستان لەسەر گۆڕی رێز لێگرتنە بۆی. دەی کافرو فاسق شایانی رێزو تەقدیر نین.

ئەمجار پەروەردگار نەهی لەپێغەمبەر کرد: کە بڕێ دیاردەی رابواردنو ژیانخۆشی موناڤیقەکان سەرنجی رانەکێشنو بەلایەوە پەسند نەبن، لەبەر چاوی جوان نەبنو دڵی بۆیان لێ نەدا، دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ وَأَوْلَادُهُمْ﴾ با ماڵو سامانی فرەیانو منداڵی زۆریان سەرمنجی تۆ رانەکێشیو تۆ سەرسام نەکا. ئەوە خێرو خۆشیو بەختەوەری نیە پێیاندراوە، ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُعَذِّبَهُمْ بِهَا فِي الدُّنْيَا﴾ بێگومان پەروەردگار دەیەوێ بەو ماڵو منداڵەی کە پێی داون لەدونیادا سزایان بدا، ماڵو سامانیان هۆی سزاو عەزابیانە لەدونیادا، ماندو دەبن بەکۆکردنەوەو پارێزگاریکردنی، هەمیشە لەدڵەڕاوکێ دانو غەمی بەدەستهێنانو لەکیس چوونیانە، دوایی موسوڵمانان لەشێوەی زەکات باربوو کردنی جەنگ دا لێیان دەستێنن، موسوڵمانان پێی بەهێز دەبن ئەوان پێیان ناخۆشە، منداڵو خزمو کەسیان لەشەڕو جەنگ دا دەکوژرێنو بەپەرۆشن. ﴿وَتَزْهَقَ أَنْفُسُهُمْ وَهُمْ كَافِرُونَ﴾

گیانیان دەربچێ ئەوان لەحاڵی کوفرو بێدینی دابن، خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت دەبن‌و ئەوەش گەورەترین خەسارەتمەندیو ماڵوێرانییە.

لەوەپێش‌و لەم سورەتەدا ئایەتێکی تر بەم مانایە رابوردو دەفەرموێ: ﴿فَلاَ تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ وَلاَ أَوْلاَدُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ اللّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَافِرُونَ﴾التوبة/٥٥.

تێبینی ئەوە دەکرێ ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە نابێ موسوڵمان نوێژ لەسەر تەرمی کافرو مونافیق بکا، نابێ ئامادەی بەخاکسپاردن‌و لەگۆڕنانیان بێ، بەلام نابێتە بەڵگەی صەریح لەسەر ئەوە کە پێویستە نوێژ لەسەر تەرمی موسوڵمان بکرێ‌و ئامادەی بەڕێکردن‌و بەخاکسپاردنی ببێ. بەڵکوو حوکمی ئەمە لەفەرموودەی پێغەمبەر وەردەگیرێ لەم بارەوە فەرموودەی صەحیح زۆرن، یەکێك لەو فەرموودانە ئەو فەرموودەیەیە کە ئیمامی موسلیم لەجابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: (ان أخا لكم قد مات فقوموا فصلوا عليه) برایەکتان -مەبەستی نەجاشی‌یە- مردووە خۆتان ئامادە بکەن نوێژی لەسەر بکەن. جابیر دەڵێ: هەستاین‌و خۆمان کرد بەدوو ریزو نوێژی مردوومان لەسەر کرد.

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ هەواڵی لەدونیا دەرچوونی نەجاشی راگەیاند لەو رۆژەی تێیدا مردبوو، موسوڵمانانی برد بۆ شوێنی نوێژ کردن‌و چوار جار ئەڵلاهو ئەکبەری فەرموو.

لەلایەکی ترەوە زانایانی ئیسلام کۆکن لەسەر ئەوە: کە دروست نیە نوێژ لەسەر تەرمی موسوڵمانان نەکرێ، هەندێك بەلایانەوە فەرزی کیفایەیە.

برێ لەزانایان فەرموویانە: لەگۆڕنان‌و شاردنەوەی تەرمی موسوڵمان وەکوو نوێژ لەسەر کردنی وایەو فەرزی کیفایەیە.

هەڵبەتە ئایەتەکە ئەوەی لێ وەردەگیرێ: کە راوەستان لەسەر گۆڕی مردوی موسوڵمان تا دەشێردرێتەوە، شتێکی باشە...! پێغەمبەر ﷺ لەسەر گۆڕی مردووی موسوڵمان دەوەستا تا دەشێردرایەوە! دوعای زمانڕاستی‌و وەلامدروستی بۆ دەکردو دەپاڕایەوە لەخودا کە لەوەلامدانەوەی فریشتەکانی دێن بۆ لای نەشڵەژێ!

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ئەگەر مردوێك دەمرد لەسەر گۆڕەکەی رادەوەستا تا دەشێردرایەوە.

لەصەحیحی موسلیم دا هاتووە: عەمری کوڕی عاص ﷺ لەکاتی سەرەمەرگ دا وەسیەتی کرد وتی: کە خستانمە گۆڕەوەو داتان پۆشیم، کەمێك گڵو خۆڵ لەسەر گۆڕەکەم بەرز بکەنەوە، ئەمجار بەئەندازەی ئەوەی وشترێك سەربڕنو گۆشتەکەی دابەش بکەن لای گۆڕەکەم بمێننەوە بۆ ئەوەی کەمێك بێمەوە سەرخۆو بزانم چۆن وەڵامی فریشەکان دەدەمەوە. جەماوەری زانان کۆکن لەسەر ئەوە: کە لەسەر جەنازە چوار جار ئەڵڵاهو ئەکبەڕ دەکرێ.

دارەقوطنی لەئوبەی کوڕی کەعبەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ان الملائكة صلت على آدم، فكبرت عليه أربعاً، وقالوا هذه سنتكم يابني آدم ....).

## نیزن وەرگرتنی سەرانی نیفاق بۆ خۆدزینەوە لەجیهادو ئامادەباشی موسوڵمان بۆ جیهاد

﴿ وَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٌ أَنۡ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَجَٰهِدُواْ مَعَ رَسُولِهِ
ٱسۡتَـٔۡذَنَكَ أُوْلُواْ ٱلطَّوۡلِ مِنۡهُمۡ وَقَالُواْ ذَرۡنَا نَكُن مَّعَ
ٱلۡقَٰعِدِينَ ﴿٨٦﴾ رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلۡخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَىٰ
قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَفۡقَهُونَ ﴿٨٧﴾ لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ مَعَهُۥ جَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ
ٱلۡخَيۡرَٰتُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٨٨﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ

تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ



پاش ئەوەی پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە: کە دووڕووەکان فرتو فێڵو بیانووی نارەوا دەدۆزنەوە بۆ خۆپاشدان لەچوون بۆ غەزا لەخزمەت پێغەمبەر دا، بەشوێن ئەوەدا هەڵوێستێکی تریان ئاشکرا دەکا، ئەویش ئەوەیە: هەرکاتێ ئایەتێك نازڵ ببێ باسی ئیمانو جیهادی تێدا بێ، خاوەن ماڵو سامانو بەتواناکان داوای ئیزنی نەچوون بۆ غەزا دەکەنو دەیانەوێ هاوبەشی جیهادو تێکۆشان نەکەن، داوا لەپێغەمبەر ﷺ دەکەن کە وازیان لێ بێنێ لەگەڵ پرو پیرێژنو کەم ئەندامو شەلو سەقەتەکاندا بمێننەوە. دەفەرموێ:

﴿وَإِذَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ آمِنُوا بِاللَّهِ وَجَاهِدُوا مَعَ رَسُولِهِ اسْتَأْذَنَكَ أُولُوا الطَّوْلِ مِنْهُمْ﴾ هەرکاتێ سورەتێکی قورئان یان هەندێکی نازڵ ببێ، فەرمانیان پێ بکا بەئیمانهێنان بەخوداو بەپێغەمبەرو بەزیندوبوونەوەو داوایان لێ بکا لەگەڵ پێغەمبەر دا بچن بۆ جیهادو تێکۆشان، خاوەن سامانو بەتواناکان داوای روخصەتت لێ دەکەن کە وازیان لێ بێنی هاوبەشی جیهادو تێکۆشان نەکەنو خۆپاش دەن ﴿وَقَالُوا ذَرْنَا نَكُنْ مَعَ الْقَاعِدِينَ﴾ دەڵێن: ئەی پێغەمبەر! وازمان لێ بێنە با ئێمە لەگەڵ ئافرەتو پەککەوتەو منداڵو بێ هێزەکان بمێنینەوە!!

ئادەمیزاد دوو پێڕن، دوو جۆرن، دوو سروشتن: پێڕی دووڕوویی‌و لەرزۆکی‌و خۆویستی‌و ریسوایی، پێڕی بڕوا پتەوانو بەهێزو تواناو خۆڕاگران، پێڕێك دەیانەوێ خۆ لەجیهاد بدزنەوە خۆپاش بدەن رازین بەکەودەنی‌و نزمی! پێڕێك راستاڵو خۆ بەخش‌و فیداکارو نەفس بەرزو خاوەن هەڵوێست، ئامادەن خۆیان فڕێ بدەنە ناو ئاگرەوە، چاو نەترس‌و ورەبەرزو بڕواپتەوو فەرمانبەردارو گوێ بیست!!

هەر کە سورەتێك دێتە خوارێ فەرمانی بەجیهادو تێکۆشان لەخۆگرتبێ دەوڵەمەندو لەشساغ‌و بەتواناکان دێنە پێشەوە نەك بۆ چوون بۆ غەزاو

خۆبەختکرنو بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانیان بەڵکو بۆ خۆپاشدانو خۆدزینەوە، رازین لەگەڵ ئافرەتو بێ نەواو شەلو سەقەتەکان دا حلێب بکرێن، ئەوانە (حیزبی حیزی‌و سەلامەتی)ن خۆویستو تەنپەرستن، هەستی پیاوەتی‌و سەربەستی‌و ئازادییان تێدا نیە، ترسنۆکو لەرزۆکو ورە روخاون!

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُوا لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ فَإِذَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا الْقِتَالُ رَأَيْتَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ الْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ فَأَوْلَى لَهُمْ﴾محمد/٢٠.

ئەم مونافیقە ترسنۆکانە نایانەوێ بەرگری لەئایینو ماڵو نیشتمانو ناموسو شەرەف بکەن هەستیان مردووەو بێ شعوورن ﴿رَضُوا بِأَنْ يَكُونُوا مَعَ الْخَوَالِفِ﴾ رازی بوون بەوە: کە لەگەڵ ژنو ژاڵ دا بمێننەوە، رازی بوون کە وەکوو پیرەژنو پەککەوتەکان کە ئەرکی جیهادیان لەئەستۆ دا نیە مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ، ئەمەش ئەوپەڕی ترسنۆکی‌و زەلیلییەو نەفسی بەرز قێزی لێ دەکاتەوە! هۆی ئەم ترسنۆکی‌و ناپیاوییەیان نەفامی‌و نەزانییە ﴿وَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ﴾ دڵیان مۆر کراوە، پەروەردگار دڵی مۆر کردوون بەهۆی نەچوونیان بۆ غەزاو خۆپاشدانیان لەجیهاد، دڵیان داخراوە هیچ نووری عیلمو زانیاری‌و هیدایەت وەرناگرێ، وایان لێ هاتووە لەهیچ حاڵی نابن، نازانن چ بەرژەوەندی‌و سوودی ئەوانی تێدایە. ئەنجامی بدەن، نازانن چ شتێك زیانی بۆ ئەوان هەیە خۆی لێ بپارێزن، حیکمەتو نهێنی ئەوە نازانن بۆچی خودا فەرمانی بەجیهاد کردن کردوە!

ئەمجار پەروەردگار بەرامبەری‌و پێکگرتنێکی لەنێوان وەزعی مونافیقانو موسوڵمانان دەکاو سەروەری‌و پیاوەتی خوداپەرستان دیاری دەکاو، ئاکامو سەرەنجامیان، پاداشی باشو بەمراز گەییشتیان روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿لَكِنِ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ جَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ﴾ بەڵام پێغەمبەرو موسوڵمانانی شوێنکەوتووی، جیهاد دەکەنو خۆناشێرنەوە، بەماڵو بەگیان ئامادەی جەنگو بەرگریکردنن لەئایینو وڵاتو ماڵو گیان، ئامادەن لەرێبازی ئایین دا خۆیان بەخت بکەن، ئەرکی سەرشانی خۆیان جێ بەجێ دەکەن. لەدونیادا بەمراز گەییشتوونو

سەرکەوتنی خۆیانو تێشکانی دوژمنانیان دەستکەوت بوو ﴿وَأُوْلَئِكَ لَهُمُ الْخَيْرَاتُ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ئەو موجاهیدە تێکۆشەرانە خێرو بێری دونیاو قیامەتیان دەستگیر بوو، خۆشیو کامەرانیو سەروەری هەردوجیهانیان دەسکەوت، سەرفرازو بەمراد گەیشتوو خۆیانن، بەپێچەوانەی دووڕووەکانەوە کە خەسارەتمەندی هەردوو جیهاد بوون!!

﴿أَعَدَّ اللّهُ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ پەروەردگار ئامادەی کردوە بۆ ئەو موسوڵمانە خودا پێداوانە باغو باخاتی وا کە بەژێر درەختەکانیان دا جۆگەو جۆبار دەکشێنو بۆ هەتا هەتایێ لەو خۆشیو لەززەتە دا دەگوزەرێنن! بەراستی ئەو رابواردنو لەززەتو نیعمەتە جۆراو جۆرانەی پێیان دەدرێ بەمرازگەیشتنێکی فرە مەزنەو پلەو پایەو شکۆمەندییەکی بێ وێنەیە!!

## دووڕوویی عەرەبە دەشتەکییەکانو ئیزن وەرگرتنیان بۆ نەچوون بۆ جیهاد

﴿ وَجَآءَ ٱلْمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٩٠﴾ ﴾

دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ضەححاك دەڵێ: ئەو کۆمەڵە پێڕی عامیری کوڕی (الطفیل) بوون، هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە لەگەڵ تۆ غەزامان کرد لەو کاتەدا عەرەبە دەشتەکییەکانی هۆزی طەی پەلاماری ماڵو منداڵی داوێن، ماڵاتو کەلو پەلیان بردوین دەترسین: ئەگەر لەگەڵتا بێین بۆ جیهاد دووبارە ئەوان یان هۆزی تر تاڵانمان بکەن!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (سيغنيني الله عنكم) خودا من بێ ئاتاج دەكاو پێویستم بەئێوە نیە.

موجاهید دەڵێ: ئەوانە چەند كەسێك بوون لەهۆزی غەطەفان عوزریان هێنایەوە خودا عوزری لێ قبوڵ نەكردن.

موناسەبەی ئەم ئایەتە بەهی پێشەوە ئەومیە: پەروەردگار لەوەپێش ئەحواڵی دووڕووە دانیشتوەكانی مەدینەی بەیان كرد، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا حاڵو چۆنیەتی عەرەبە دووڕووە دەشتەكییەكان شی دەكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَجَاءَ الْمُعَذِّرُونَ مِنَ الأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ﴾ ئەو عەرەبە دەشتەكییانە هاتنە لای پێغەمبەرو داوای ئیزنی لێ دەكەن رێگەیان بدا نەچن بۆ غەزای تەبووك، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خودا بەسەر هەواڵی ئێوەدا ئاگاداری كردووەو دەزانم مەبەستتان چیەو خودا بێ ئاتاجی كردوم لەیارمەتی ئێوەو پێویستیم پێتان نیە.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەم كۆمەڵە بیانوەكەیان راست بوو، پێغەمبەر ﷺ بڕوای پێكردن. ریوایەتی تریش هەن ئەوە دەچەسپێنن كە درۆیان كردوەو بیانوویان نەبوەو پێغەمبەر ﷺ بڕوای پێ نەكردون. ﴿وَقَعَدَ الَّذِينَ كَذَبُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ خۆیان لەجیهاد پاش دا ئەو تاقمەی خوداو پێغەمبەریان بەدرۆخستنەوە، بەروكەش خۆیان بەخاوەن باوەڕ دادەناو لەدڵ دا كافر بوون، ئەمانە وەكوو بۆ غەزا نەچوون نەهاتن عوزریش بێننەوە. ئەوانە ئەو مونافیقە عەرەبە دەشتەكییانەن كە عوزریان نەهێنایەوە، بەبێ عوزرو بەهانە خۆیان پاش داو نەچوون بۆ جیهاد.

﴿سَيُصِيبُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ لەوە بەولاوە ئەوانەی كافرو مونافیقن، ئەوانەی خوداو پێغەمبەریان بەدرۆ خستنەوە بەدرۆ عوزریان هێنایەوە، یان ئەوانەی عوزریان نەهێنایەوە، سزای بەئێشو توندیان توش دێ، لەدونیادا بەكوشتنو بڕین لەقیامەتیش دا بەئاگری دۆزەخ!!

## ئەو موسوڵمانانەی جیهادیان لەسەرنیە

﴿ لَيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾

دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە، ئیبنو ئەبی حاتەم لەزەیدی کوڕی ثابیتەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: خەریکی نووسینەوەی سورەتی (براءة) بووم، پێنووسم لەسەر گوێچکەم دانابوو فەرمانمان پێکرا بچین بۆ غەزا، پێغەمبەر ﷺ چاوەڕوانی سروش بوو بۆی بێ، لەو کاتەدا کوێرێك هاتە خزمەتیو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من چی بکەم چاوم نابینێ کوێرم؟ ئیتر ئایەتی ﴿لَيْسَ عَلَى الضُّعَفَاءِ....﴾ هاتە خوارێ.

بەلاَم بۆ ئایەتی ﴿وَلا عَلَى الَّذِينَ إِذَا مَا أَتَوْكَ...﴾ سێ هۆکاری هاتنە خوارەوە باس کراون:

١- ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکاو دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەخەڵك کرد: کە خۆئامادە بکەنو لەتەکیا بچن بۆ غەزا، کۆمەڵێك لەهاوەڵان هاتنە خزمەتی، عەبدوڵلای کوڕی موغەففەلی موزەنییان تێدا بوو، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! وڵاغی سواریمان بۆ پەیدا بکە دێین بۆ غەزا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچم دەست ناکەوێ ئێوە سوار بکەم بەدڵ شکاوی

گەڕانەوەو دەگریان، پێیان ناخۆش بوو نەچن بۆ غەزا، تێشوو ولاغی سوارییان دەست نەکەوێ. ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَلا عَلَى الَّذِينَ إِذَا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ..﴾ی نارده خواریو عوزری لێ قبووڵ کردن.

٢- موجاهید دەڵێ: ئەوانە سێ برابوون: مەعقەل، سوومید، (النعمان)ی کوڕی موقرین. داوایان لەپێغەمبەر کرد کە خوففو نەعلیان بۆ دابین بکا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لا أحد ماأحملكم عليه).

٣- حەسەنی بەصری دەڵێ ئەم ئایەتە دەربارەی ئەبو موسای ئەشعەریو هاوەڵانی هاتۆتە خوارێ، هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ داوای شتێکیان دەکرد هەڵیان گرێ، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ تووڕە بوبوو فەرمووی: (والله ماأحملكم ولا أجد ماأحملكم عليه).

هەڵبەتە پەیوەندی ئاشکراو روون هەیە لەنێوان ئەم ئایەتەو ئایەتەکانی پێشوودا، ئەوەتا: دوای ئەوەی پەروەردگار هەڕەشەی لەوانەکرد: کە بیانوو دەدۆزنەوەو بەدرۆو دەلەسە خۆیان لەچوون بۆ جیهاد دەدزنەوە، باسی ئەوانە دەکا کە عوزری شەرعییان هەیە ئەوە رادەگەیەنێ: کە ئەو خاوەن عوزرانە جیهادیان لەسەر فەرز نیە! چونکە ئیسلام ئایینی ئاسانکاریو ئاسانخوازییە، بەگوێرەی توانا ئەرك دەخاتە سەرشانی رێرەوانی، ئەوانەی توانای چوون بۆ جیهادیان نیە کەم ئەندامو کوێرو نەخۆشن، یان تێشوو پێداویستی جەنگیان بۆ دابین ناکرێ، عوزریان رەوایەو نەچوونیان قبووڵە. دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَى الضُّعَفَاءِ﴾ چوون بۆ غەزا واجب نیە لەسەر بێ هێزو پیرو کەفتەکار ﴿وَلا عَلَى الْمَرْضَى﴾ هەروەها لەسەر نەخۆشو کەم ئەندامو کوێریش جیهاد فەرز نیە، ﴿وَلا عَلَى الَّذِينَ لا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ﴾ هەروەها جیهاد لەسەر ئەوانە واجب نیە کە پێداویستی جیهادیان بۆ دابین ناکرێ. ﴿إِذَا نَصَحُوا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ بەمەرجێ ئیمانی تەواوو پتەویان بەخودا هەبێ، شوێن ئامۆژگاری پێغەمبەر بکەون، بەنهێنیو ئاشکرا پابەندی فەرمانی خودا بن، حەقناس بنو حەقخوازانیان خۆش بوێ، بەرژەوەندی گەلو

ولاَت بپارێزن، جاسووسیو خیانەت لەوڵات نەکەن، پڕو پاگەندەی دژ بەئیسلام بڵاو نەکەنەوە.

ئیمامی موسلیم فەرموودەیەکی لەتەمیمی (الداری)یەوە گێڕاوەتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الدين النصيحة، قالوا لمن يا رسول الله؟ قال: لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم) واتە: ئایین بریتییە لەئیخلاص، هاوەڵان عەرزیان کرد: ئیخلاص بۆ کێ؟ ئەی پێغەمبەری خودا. فەرمووی: ئیخلاص بۆ خوداو بەندایەتی بۆ کردنو خۆشویستنی، خوێندنەوەی قورئانو تێفکرین لەمانای ئایەتەکانو کارپێکردنی، خۆشویستنی پێغەمبەرو شوێنکەوتنی پەیامەکەی. ئیخلاص بۆ فەرمانڕەوایی موسوڵمانانو پشتگیری لێ کردنیانو ئیخلاص بۆ جەماوەری موسوڵمانان ئەوەیە: ڕێگای حەقیان نیشان بداو هەوڵی پتەوکردنی ریزەکانیان بدا.

﴿مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِنْ سَبِيلٍ﴾ هیچ ڕێبازو بیانوێک نیە چاکەکاران سزا بدرێن، لۆمەیان بکرێ، کە بیانوی شەرعییان هەبێ بۆ نەچوون بۆ غەزاو لەماڵەوە دانیشتن، تاوانبار نابنو گوناهیان ناگاتێ! بۆ کەس نیە تاوانیان پاڵ بدا بەکورتیو پوختی هەموو نەصیحەتکارو ڕاستاڵو موخلیصێک بۆ خوداو بۆ پێغەمبەری خودا موحسینو چاکەکارە، کەس ڕایەی ناکەوێ چاکەکار بەگیر بێنیو بیخاتە بەر لێپرسینەوەو سەرزەنشت کردن!

﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ﴾ پەروەردگار لێخۆشبوونی زۆرە بۆ ئەو خاوەن عوزرو چاکەکارانەو بۆ کەسانی تریش کە وەك ئەوان بن.

﴿رَحِيمٌ﴾ خاوەنو سۆزو بەزەیی زۆرە، هەرگیز زیاد لەتواناو دەسەڵات ئەرك ناخاتە سەر کەس. بەڵام یاخی بوو مونافیقەکان تا تۆبە نەکەنو واز لەتاوانو دووڕوویی نەهێنن خودا لێیان خۆش نابێ.

﴿وَلا عَلَى الَّذِينَ إِذَا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لا أَجِدُ مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ﴾ هەروەها تاوانو حەرەج لەسەر ئەو کەسانە نیە کە ئامادەباشی چوون بۆ جیهادیان تێدایەو بەڵام وڵاخی سواریو تێشوو چەکیان دەست ناکەوێ، بژێوی ماڵو منداڵیان دابین

نـەکردوە، بەتایبـەتی ئەوانـەی هاتنـە لای تـۆ ئـەی پێغەمبـەر! بـۆ ئـەوەی وڵاخـی سواری‌و تێشوویان بۆ دابین بکەی‌و لەگەڵتا بێن بۆ جیهادو پێت گوتن: تێشوو وڵاخی سواریم دەست ناکەوێ بتاندەمێ، بەمە دڵیان تەنگ بوو دەستیان کرد بەگریان‌و زۆریان پێ ناخۆش بوو: کە شەرەفی بەشداری کردنی جیهادیان لەکیس دەچێ‌و ناتوانن لەگەڵ سوپای ئیسلام وەرێ بکەون. ئامادەی جەنگ بن.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لەباسی غەزای تەبووك دا دەڵێ: چەند پیاوێکی موسوڵمان هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە بەگرینۆك بەناوبانگن. حەوت زەلامی ئەنصاری‌و هی تریش بوون: (سالم بن عمیر)و (علی بن زید)و (ابو لیلی عبدالرحمن بن کعب)و (عمرو بن الحمام بن الجموح)و (حرمی بن عبدالله)و (عیاض بن ساریة الفزاری) هەژارو نەدارا بوون کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: هیچم دەست ناکەوێ سوارتان بکەم‌و ناتوانم پێویستیتان دابین بکەم ﴿تَوَلَّوا وَأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنْ الدَّمْعِ حَزَناً أَلاَّ يَجِدُوا مَا يُنفِقُونَ﴾ کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەریان بەجێ هێشت، چاویان فرمێسکی دەڕشت‌و بەکوڵ دەگریان‌و دڵ تەنگ بوون‌و خەم‌و پەژارە دایگرتبوون، چونکە توێشوو پێداویستی جەنگیان دەست ناکەوێ.

ئیبنو ئەبو حاتەم لەحەسەنی بەصریەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لقد خلفتم بالمدينة أقواماً، ماأنفقتم من نفقة، ولاقطعتم وادياً، ولا نلتم من عدونيلاً الا وقد شركوكم في الآجر) ئەی هاوەڵان! ئێوە لەمەدینە کۆمەڵێکتان بەجێ هێشتووە، ئێوە هیچ بژێوو ماڵ‌و سامانێکتان نەبەخشیوە، هیچ دۆڵ‌و شیوو رێگایەکتان نەبڕیوە، هیچ پەلاماردانێکی دوژمنتان ئەنجام نەداوە‌و هیچ زەبرێکی کاریگەرتان لەدوژمن نەداوە، ئیللا ئەو کۆمەڵە بەجیماوە هاوبەشتانن‌و پاداشی وەکوو ئێوەیان هەیە. ئەمجار پێغەمبەر ﷺ ئایەتی ﴿وَلا عَلَى الَّذِينَ إِذَا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لا أَجِدُ مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ....﴾ خوێندەوە.

لەڕیوایەتێکی تردا کە موسلیم‌و بوخاری لەئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (انَ بالمدينة أقواماً ماقطعتم وادياً، ولاسرتم

سیراً الا وهم معکم، قالوا/: وهم بالمدینة؟ قال: نعم، حبسهم العذر) لەریوایەتی ئیمام ئەحمەد دا دەڵێ: (حبسهم المرض)

**بەیارمەتی خودا ١١/٨/١٩٩٨ لەپاکنووسی جزمی دەیەم بوومەوە**

## لێپرسینەوە لەو خاوەن سامانو بەتوانایانەی بەبێ عوزری ڕەوا خۆیان لەچوون بۆ غەزا پاش‌دا

﴿ ۞ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَسۡتَـٔۡذِنُونَكَ وَهُمۡ أَغۡنِيَآءُۚ رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلۡخَوَالِفِ وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾

لەئایەتی پێشوودا فەرمووی: ﴿مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِنْ سَبِيلٍ﴾ ئێستاش بۆ تەواوکردنی ئەو باسە پەروەردگار بڕیاری خۆی بەرامبەر ئەوانە دەردەکا کە خاوەن سامانو راحیلەو تێشوو چەکی پێویستو لەشساغو تەندروستن. دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَسْتَأْذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَاءُ﴾ واتە: دەرگای لۆمەو سەرزەنشت لەسەر چاکەکاران نیە، بەڵکوو ڕێگای لۆمەو لێپرسینەوەو سەرزەنشتکردن بەرووی ئەو کەسانەدا ئاچووغە کە دەوڵەمەندو خاوەن تواناو لەشساغن، دەتوانن وڵاغی سواری‌و تێشوو چەکی پێویست دابین بکەن، کەچی داوای ئیزن دەکەنو دەیانەوێ پێغەمبەرﷺ عوزری نارەوایان بەڕەوا بزانی‌و ئیزنیان بدا. ئەوانە عوزریان نیەو بیانوویان ناحەقەو جێگای سەرزەنشتو لێپرسنەوەنو تاوانبارن، چونکە ﴿رَضُوا بِأَنْ يَكُونُوا مَعَ الْخَوَالِفِ﴾ ڕێگایان بەخۆیان داوە لەگەڵ ئافرەتو منداڵو شەلو

سـەقەتو پەککەوتـەکاندا بمێننـەوە، رازیـن لـەپێری ئـەو بـێ دەسـەڵاتو کـەم ئەندامانە بژمێردرێن، قبووڵی زەلیلیو سەرشۆڕی دەکەنو پیاوەتیو مەردایەتییان تێدا نیە، حیـزیو سـەلامەتییان هەڵبـژاردوە، چاوشـۆڕو ورە روخـاوو دڵەتەپێیانـە، ئیـتر لەئاکامی ئەم هەڵوێستو نامەردییەیاندا خەسارەتمەندی هەردوو جیهان بوون ﴿وَطَبَعَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لا يَعْلَمُونَ﴾ خودا دڵی مۆر کردوون خێـری تـێ ناچـیو رووناکی رووی تێ ناکا، سەریان لێ شێواوەو نازانن بەرژەوەندییان لەچیدایە، نازانن جیهاد چـەند سـوودمەندە بـۆ دونیـاو قیامـەتیان، ئـەوان لـەتاواندا نقـووم بـوونو خۆیان لێ گوم بووە، هەست بەخراپی ئاکامی خۆیان ناکەن.

بەراستی خەسـارەتمەندن! هەسـتی جیاکردنـەوەی خێـرو شـەڕیان تێـدا کـزو لاوازە، فـەرقی سـوودو قـازانجی خۆیـان ناکـەن، خەسـارەتمەندی دونیـاو قیامـەتن: لـەدونیادا کۆمـەڵێکی قێـزەوەنو لاکەوتـەی کۆمـەڵن، لەقیامـەتیشدا سـزای دۆزەخ چاوەڕوانیانە.

## عوزر هێنانەوەی مونافیقانو خۆپاشدەرانی غەزای تەبووكو سوێند خواردنی بەدرۆیان

﴿يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ قُل لَّا تَعْتَذِرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ قَدْ نَبَّأَنَا ٱللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ وَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَـٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٤﴾ سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ

لَكُمْ إِذَا ٱنقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا۟ عَنْهُمْ ۖ فَأَعْرِضُوا۟ عَنْهُمْ ۖ
إِنَّهُمْ رِجْسٌ ۖ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟
يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا۟ عَنْهُمْ ۖ فَإِن
تَرْضَوْا۟ عَنْهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ
﴿٩٦﴾



دەربارەی سەبەبی نزوولی ئەم ئایەتە، لەئیبنو عەبباسیان گێڕاوەتەوە دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی (الجد)ی کوڕی قەیسو موعەتتەبی کوڕی قوشەیرو هاوەڵانی دووڕوویان هاتۆتە خوارێ، هەشتا پیاو بوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەموسوڵمانان کرد کە گەڕانەوە بۆ مەدینە هاونشینی ئەو کۆمەڵە مونافیقە نەکەنو دەنگیان لێ دابڕن.

قەتادە دەڵێ: دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی هاتووتە خوارێ، لەم ڕووەوە کە دوا گەڕانەوەی بۆ مەدینە سوێندی بۆ پێغەمبەر ﷺ خوارد، هەر گیز لێی دوانەکەویو سەرپێچی نەکا، داواشی لێ کرد کە ڕەزامەندی خۆی پێ ببەخشێ. بەڵام وادەی خۆی بەجێ نەهێناو وادە بەخیلاف دەرچوو.

پەیوەندی نێوان ئەم ئایەتانەو ئایەتەکانی پێشوو لەم ڕووەوەیە: کە لەئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار سەرزەنشتی ئەوانەی کرد: کە عوزرو بیانووی ناڕەوایان دادەتاشین، عوزری ئەوانەشی قبووڵ کرد کە لەڕاستیدا خاوەن عوزر بوون، ئەمجار هەواڵ بەموسوڵمانان دەدا: کە ئاگامی ئەو مونافیقانەی لەغەزای

تەبووك خۆیان دواخستووە چۆنەو چۆن دەبێ، ئەمەش هەواڵێكی غەیبییەو پێش وەخت پەروەردگار بەپێغەمبەری راگەیاندو پاشانیش هاتەدی. دەفەرموێ: ﴿يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ﴾ ئەی كۆمەڵی موسوڵمانان! بزانن: كە ئێوە لەغەزای تەبووك گەڕانەوە، ئەو مونافیقانە دێنە لاتانو پاكانەتان بۆ دەكەنو عوزرتان بۆ دێننەوە، چەندان بڕو بیانوو دەدۆزنەوە بۆ پاساودانەوەی نەچوونیان بۆ غەزای تەبووك! ﴿قُلْ لا تَعْتَذِرُوا لَنْ نُؤْمِنَ لَكُمْ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: عوزر مەهێننەوە، بیانوو مەدۆزنەوە، ئێمە هەرگیزاو هەرگیز بڕواتان پێ ناكەینو عوزرتان قبووڵ نیەو ئەوەی دەیڵێن: راست ناكەن! كە بڕواشتان پێ ناكەین هەر بەهەوانتە نیە بەڵكوو ﴿قَدْ نَبَّأَنَا اللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ﴾ پێش وەخت لەرێگەی سرۆشەوە پەوەردگار بڕێ نهێنیو حاڵو چۆنیەتی ئێوەی بەپێغەمبەری خۆی راگەیاندوە، نیازو مەبەستی گڵاوتان، سەرپێچیو نافەرمانیو دژایەتیكردنتان بۆ حەق لەلایەن خوداوە بەئێمە گەیشتووە. ﴿وَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ﴾ لەوە بەولاوە خوداو پێغەمبەری خودا كردەوەكانتان دەبینن؛ واتە: كردەوەكانتان لەدونیادا بۆ خەڵك دەردەكەوێ، دوارۆژتان: لەبەردەوامبوون لەسەر نیفاق، یان تۆبە كردنو وازهێنان لەدووڕوویی دەزاندرێو بۆ خەڵك دەردەكەوێ: واتە: كردەوە گرنگە، سوێند خواردنو قسەی بێ كردەوە هیچ بایەخێكی نیە، جا ئەگەر تۆبەتان كردو وازتان لەدووڕوویی هێنا، بەكردەوە چەسپاندتان: كە تۆبەكردنەكەتان بەراستە، ئەوە خودا تۆبەكەتان لێ قبووڵ دەكاو لەتاوانی لەوە پێشتان خۆش دەبێ، پێغەمبەریش وەكوو موسوڵمانانی راستگوو راستاڵ مامەڵەتان لەگەڵ دەكا!

خۆ ئەگەر هەر سوور بوون لەسەر نیفاقو دووڕوویی‌و بازاڕی دووڕوویيتان رەواج پێدا، ئەوە پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەی خودا فەرمانی پێ دەكا، مامەڵەتان لەگەڵ دەكا، جیهاد لەدژتان رادەگەیەنێو توندو تیژیتان لەگەڵ دەنوێنێو وەكوو برا كافرەكانی ترتان حیسابتان بۆ دەكا!

﴿ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ پاشان ڕۆژی قیامەت دەگەڕێندرێنەوە بۆ لای پەروەردگاری ئاگادارو زانا بەهەموو شتێکی نهێنیو ئاشکرا، دەگەڕێندرێنەوە بۆ لای خودایەکی وا دەزانێ چی لەدڵی خۆتاندا دەشارنەوەو چی ئاشکرا دەکەن، ئاشکراو پەنامەکی بۆ ئەو چوون یەکە، جا ئەو کاتە هەواڵتان دەداتێ: چیتان کردوەو چ هەڵوێستێکتان نواندوە، بەگوێرەی نیازو مەبەستو کردەوەکانتان تۆڵەتان لێ دەستێنیو پاداشتان دەداتەوە، دڵنیابن سزاو تۆڵەستاندنەوەی دووڕوو لەهی کافر سەختترەو لەدۆزەخدا شوێنیان لەهی کافران ناخۆشترە. ئەوەتا: پەروەردگار لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾النساء/١٤٥.

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە پێویستە مرۆڤ خۆ لەهەموو کردارو گوفتارێك بپارێزێ کە عوزری بۆ بهێنێتەوە، لەفەرموودەی پێغەمبەریشدا هاتووە فەرموویەتی: (اياك و كل أمر يعتذر منه) خۆت بپارێزە لەهەر کارو گوفتارێك دوای عوزر هێنانەوەی بوێ.

ئەمجار پەروەردگار هەواڵی ئەوە دەدا: کە ئەو مونافیقانە عوزرو بیانوە درۆکانیان بەسوێندی درۆ جەخت دەکەنەوەو دەفەرموێ: ﴿سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ﴾ کە گەڕانەوە بۆ مەدینە، ئەو مونافیقانەی خۆیان لەهاتن بۆ غەزا پاش داوە، دێنە لاتانو عوزو بیانووی نەهاتنیان بەسوێندی بەدرۆ جەخت دەکەنەوە بۆ ئەوەی چاوپۆشییان لێ بکەنو لۆمەو سەرزەنشتیان نەکەن لەسەر ئامادەنەبوونو خۆپاشدانیانو ڕژدی کردنیان لەماڵبەخشیندا.

﴿فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ﴾ ئێوە ڕویان لێ وەرگێڕن، سەرکۆنەیان مەکەن، بایەخیان پێ مەدەنو بەهیچیان بزانن، چونکە ئەوان دڵو دەروونیان پیسو ژەنگ گرتووە، بیرو باوەڕیان پووچو بەتاڵە، دڵو دەروونیان مشتو ماڵ ناکریو بیروباوەڕیان ڕاست ناکەنەوە، کەوابێ هیچ حیسابێکیان بۆ مەکەن ﴿إِنَّهُمْ رِجْسٌ﴾ ئەوان دڵ پیسو

نالـەبارن، پێویـستە خۆیـان لێ دوورەپـەرێز بگـرن، وەکـوو چـۆن خۆتـان لـەگول دەپـارێزن ئـاوا پارێزییـان لێ بکـەن، ﴿وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ لەکۆتاییدا جێگایان دۆزەخە، لەتۆڵەی ئەو کردەوانەی لەدونیادا کردویـانو بوونـە هۆی پیسیو زیاد بوونی پیسیو ژەنگ گرتنی دڵو دەروونیان!

بەکورتی، بـاییس (علة) بـۆ روو وەرگێـڕانو گرنگـی پێنەدانەکە دێنێتـەوەو دەفەرموێ: ئەوانە پیسنو دۆزەخین، سەرزەنـشتو لۆمـە کـردن سوودی نیـە بۆیـانو گومڕا بوونو نایەنەوە سەر ڕێبازی ڕاست!!

ئەمجار جـەخت لەسـەر دووڕووییەکـەیان دەکاتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا عَنْهُمْ﴾ بـەدرۆ سـوێندتان بـۆ دەخـون بـۆ ئـەوەی لێیـان ڕازیـی بـنو بەڕواڵەت مامەڵەی موسوڵمانیان لەگەڵ بکەن، واتە: بـۆ ئـەوەی مامەڵەکردنەکـەتان بـەو شـێوە بۆیـان بـەردەوام بـێ، بەموسـوڵمانیان حـسێب بکـەن. ئەمـە مەبەسـتی سەرەکیو هەرەگرنگی ئەوانـەو هیچی تریـان مەبەسـت نیـە. ئـەگینا ئەگـەر ئـەوان لەناخەوە موسوڵمان بوونایە مەبەستی سەرەکییان بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خـودا دەبوو.

﴿فَإِنْ تَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لا يَرْضَى عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ﴾ ئەگـەر ئێـوە لێیـان ڕازی بـن، ڕەزامەنـدی ئێـوە چ سـوودێکیان پـێ ناگەیـەنێ، چـونکە ئـەوان بـەهۆی فیسقەوە لەنێو ڕقو قاری خوداد‌انو خودا سزای دۆزەخی بۆ ئامـادەکردونو، ئـەوان لەچوارچـێوەی فـەرمانی خـوداو پێغەمبـەر دەرچـوونو فاسـقن، خـوداش هـەرگیز لەتاقمو گرۆی فاسق ڕازی نیە، کەسێکیش خودا لێی ڕازی نەبێ ڕەزامەندی خەڵکی تر سوودی پێ ناگەیەنێ!

ئایەتەکە ڕێنومایی موسوڵمانان دەکا: کە ڕەزامەنـدی خۆیـان بەمەنافیقـەکان نەبەخـشنو بەسـوێندی بـەدرۆو زمـانی لووسـیان هەڵنەخەڵـەتێن، بەسـە بـۆ دووڕوویـیو نیفـاقی ئـەوان کـە خـودا شـایەتیان لەسـەر دەداو بـەدرۆزنیان دادەنـێ،

بەسە: کە خودا موسوڵمانان بۆ ڕێگای ڕاست شارەزا دەکاو هەڵوێستی پیاوانەو مەردانەیان فێردەکا.

## کافریو دووڕوویيو ئیمانداری عەرەبە دەشتەکییەکان

﴿ ٱلۡأَعۡرَابُ أَشَدُّ كُفۡرٗا وَنِفَاقٗا وَأَجۡدَرُ أَلَّا يَعۡلَمُواْ
حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٩٧﴾ وَمِنَ
ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغۡرَمٗا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَۚ
عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٩٨﴾ وَمِنَ
ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا
يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِۚ أَلَآ إِنَّهَا قُرۡبَةٞ لَّهُمۡۚ
سَيُدۡخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٩٩﴾ ﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار حاڵو چۆنیەتی عەرەبەکانی ناوشاری مەدینەی باس کرد بەموسوڵمانو مونافیقیانەوە، ئەمجار دێتە سەر باسکردنی عەرەبە دەشتەکییەکانی دەرەوەی مەدینە بەکافرو مونافیقو موسوڵمانانیەوە، ئیمامی ڕازی پێی وایە: ئەم ئایەتەو ئایەتەکانی پێشووش خیطابە لەگەڵ عەرەبە لادێیو دەشتەکییەکان.

وەلێ ڕاڤەکەرانی تری قورئان پێیان وایە: ئایەتەکانی پێشوو هەموویان خیطابن لەگەڵ عەرەبە موناڤیقەکانی ناو شاری مەدینە، ئەم ئایەتانەی ئێرەش دەربارەی عەرەبە دەشتەکییە دووڕووەکانن..

واحیدی دەفەرموێ: ئایەتی ﴿الأَعْرَابُ أَشَدُّ...﴾ مەبەستی عەرەبە دەشتەکییەکانی هۆزی (أسد)و (غطفان)و عەرەبەکانی ناو شاری مەدینەیە.

ئیبنو جەریری طەبەری لەموجاهیدەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئایەتی ﴿وَمِنَ الأَعْرَابِ مَن يُؤْمِنُ...﴾ دەربارەی (بەنو موقرین) نازڵ بووە؛ ئەو کۆمەڵەی کە هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە تێشوو وڵاغی سوارییان بۆ دابین بکاو بچن بۆ غەزاو پێغەمبەر پێی فەرموون: من وڵاغی سواری ئێوەم دەست ناکەوێ‌و ناتوانم پێداویستی ئێوە دابین بکەمو ئەوانیش بەدڵگەرمی‌و گریانەوە گەڕانەوەو ئایەتی ﴿وَلا عَلَى الَّذِينَ إِذَا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ....﴾التوبة/٩٢. دەربارەیان نازڵ بوو.

لەعەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەعقەلی (المزني) گێڕدراوەتەوە دەڵێ: ئێمە دە کەس بووین لەبنەماڵەی (مقرن) ئەم ئایەتەمان دەربارە هاتۆتە خوارێ.

دەفەرموێ: ﴿الأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْراً وَنِفَاقاً وَأَجْدَرُ أَلاَّ يَعْلَمُوا حُدُودَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ﴾ واتە: عەرەبە دەشتەکییەکان کوفرو نیفاقیان لەعەرەبی تر بەهێزترە، شیاوترن بەوەی کە سنووری شەریعەت نەزانن‌و پابەندی پەیامی پێغەمبەری خودا نەبن. چونکە دەشتەکی سروشتیان توندترو دڵیان رەقترە، نەفامو نەزانترن!

ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داوودو تیرمیذی‌و نەسائی ریوایەتیان کردوە لەئیبنو عەبباسەوە لەپێغەمبەرەوە کە فەرموویەتی: (من سكن البادية جفا، ومن اتبع الصيد غفل، ومن أتى السلطان افتتن) کەسێك لەلادێ دانیشێ سروشتی وشك دەبێ،

کەسێك نێچرەوان بێ لەخودا غافڵ دەبێ، کەسێك بەردەستی پاشابێو لەدەرباری سوڵتاندا کار بکا، تووشی فیتنەیی دەبێ.

ئەبو داودو بەیهەقی لە ئەبو هورەیرەوە بە(مەرفووعی) زێدەیەکیان لەسەر ئەم فەرموودەیە ریوایەت کردووە دەفەرموێ: (وما ازداد أحد من سلطانه قرباً الا ازداد من الله بعداً) چونکە پادشاو مەلیك عادەتەن ماستاوکەر لێیان نزیك دەبنەوە، ریابازو خۆلەبەرکەر لەدەرباریاندا شوێنیان چنگ دەکەوێ.

﴿وَاللّٰهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ پەروەردگار زاناو ئاگادارە بە حاڵو وەزعی بەندەکانی بە سارنشینو شارنشینیانەوە، حەکیمو دانایە لەدانانی شەریعەتو یاسا بۆیانو لەپاداشدانەوەی چاکەکارانو تۆڵەستاندنەوە لەخراپەکاران.

﴿وَمِنَ الأَعْرَابِ مَنْ يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَماً﴾ هەندێك هەن لەو عەرەبە دەشتەکییانە بڕێ ماڵو سامانی خۆیان دەبەخشن بۆ جیهاد بەریابازیو بەمەبەستی خۆپاراستنو خۆنزیك کردنەوە لەموسوڵمانان، پێیان وایە: ئەوەی دەیبەخشن سەرانە لێ ستاندنو خەسارەتمەندییەو گێچەڵ لەخۆ دوورخستنەوەیەو ئەرکێکە لەسەر شانیان پێیان خۆش بێو پێیان ناخۆش بێو دەبێ ئەنجامی بدەن، پێیان وانیە لەدونیاو قیامەتدا سوودی لێ وەربگرن، لەدونیادا ئاشکرایە بەسەرانەو گێچەڵ لەخۆ دوورکەوتنەوەی دەزانن، بۆ قیامەتیش ئەوان بڕوایان بەزیندوبوونەوەو سزاو پاداشی قیامەت نیەو بەتەمای پاداش وەرگرتنەوەی ڕۆژی قیامەت نین لەسەر ئەو ماڵبەخشینە.

ئیمامی ضەحاك دەڵێ: ئەمانە هۆزی بەنو ئەسەدو هۆزی غەطەفان بوون!

﴿وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ الدَّوَائِرَ﴾ ئەم تاقمە عەرەبە دەشتەکییە مونافیقە چاوەڕوانی ئەوەن ئێوە تووشی بەڵاو موصیبەتێك بن، هێزو تواناتان نەمێنێ، لێ بکەونو دوژمن بەسەرتاندا زاڵ ببێ، ئیتر ئێوە ئەوانتان لەبیر بچێتەوەو نەتانپرژێتە

سەریان، داوای هاوبەشی کردنو ماڵبەخشینیان لێ نەکەن، ئیتر ئەوانیش ئەم ماڵبەخشینە ریبابازیەیان لەکۆڵ بکەوێ! لەم سەرانە دانە رزگاریان بێ، بێگومان ئەوان لەدڵی خۆیاندا چاوەڕوانی ئەوە بوون موشریکەکانو جولەکەکان بەسەر موسوڵمانەکاندا زاڵ ببن، دوایی کە لەوە نائومێد بوون، ئەمجار چاوەڕوانی لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەرﷺ بوون، وایاندەزانی ئیسلام بەلەدونیا دەرچوونی پێغەمبەرﷺ کۆتایی دێو موسوڵمانان نامێنن، ئیتر ئەوان بۆخۆیان دەکەونە ئیستراحەتەوە. بەڵام خەیاڵیان خاوەو ئەو ئاواتەیان نایەتە دێو دوا کڵاوی بابردو کەوتوون!

﴿عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ﴾ بەڵاو موصیبەتو تەنگو چەڵەمەو ناخۆشی بەسەر خۆیاندا بخولێتەوەو یەخەی خۆیان بگرێ! ئەوەی چاوەڕوانی دەکەن تووشی پێغەمبەرو موسوڵمانان بێ، تووشی خۆیان بێ.

رستەی ﴿عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ﴾ دەگونجێ هەواڵدانو خەبەر بێ، دەگونجێ دوعالێکردن بێ. واتە: (انشاء) بێ. ئێمە بەشێوەی دوعا راڤەمان کرد...

بێگومان ئەم هەواڵە هاتەدی، یان بڵێین: ئەم دوعایە گیرا بوو، بەڵاو موصیبەتو تەنگو چەڵەمە یەخەی خۆیانی گرتو تووشی تێشکانو ریسوایی بوون، ئاواتیان نەهاتە دێو بەمراز نەگەیشتن!

﴿وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ پەروەردگار شنەوایە بۆ ئەو قسانەی لەناو خۆیاندا دەیڵێن: کە رەنگدانەوەو دەربڕینی هەستو شعوورو بیرو باوەڕیانە دەربارەی ماڵبەخشینیان، زاناو ئاگادارە بەو نیازو مەبەستانەی: کە لەناو دڵی خۆیاندا دەیشێرنەوە، بابزانن: لەوەبەولاوە خودا حیسابیان لەگەڵ دەکاو لەسەر ئەو کردارو گوفتارو نیازو مەبەستانەیان تۆڵەیان لێ دەستێنێ، یان (خودا شنەوایە بۆ ئەو گوفتارانەی لەکاتی ماڵبەخشینەکەدا دەیڵێن، شنەوایە بۆ دوعای بەندەکانی لێیان، زاناو ئاگادارە بەو نیازو مەبەستانەی لەدڵی خۆیاندا حەشاریان داوە، دەزانێ کێ

شیاوی یارمەتیو سەرکەوتنە، کێ شیاوی ریسوا کردنو تێشکانە). نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَا إِلاَّ إِحْدَى الْحُسْنَيَيْنِ وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَنْ يُصِيبَكُمْ اللَّهُ بِعَذَابٍ مِنْ عِنْدِهِ أَوْ بِأَيْدِينَا﴾التوبة/٥٢.

ئەمجار پاش ئەوەی حاڵو وەزعی عەرەبە دەشتەکییە مونافیقەکانی روون کردەوە، باسی عەرەبە دەشتەکییە خوداناسەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ الأَعْرَابِ مَنْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ هەروەها لەو عەرەبە لادیو دەشتەکییانە کەسانێك هەن، بڕوایان بەخودا هەیە، پێیان وایە: هەر ئەو خاوەنی بوونەوەرەو دەسەڵاتی تەواوو رەهای هەیەو بەویستی خۆی بوونەوەر هەڵدەسوڕێنێ، بڕوایان بەهاتنی رۆژی قیامەت هەیە: کە پاداشو سزای تێدا دەدرێتەوە، بڕوایان بەخوداو بەپێغەمبەرو بەرۆژی دوایی رێكو پێکەو راستو دروستە.

هەندێك پێیان وایە: مەبەست بە(الأعراب) لێرەدا خێڵی جوهەینەو موزەینە و بەنو ئەسلەمو خێڵی غەففارە.

موجاهید دەڵێ: ئەوانە: پیاوانی بەنو موقرینن لەهۆزی موزەینە. ئەو کۆمەڵەی هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ داوای توێشوو ولاغی سوارییان کرد بۆ چوون بۆ غەزای تەبووك. ئەوانەن: کە خودا دەربارەیان فەرموویەوتی: ﴿وَلا عَلَى الَّذِينَ إِذَا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ﴾التوبة/٩٢.

﴿وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَاتٍ عِنْدَ اللَّهِ وَصَلَوَاتِ الرَّسُولِ﴾ ئەوانە ماڵو سامانی خۆیان دەبەخشن لەپێناو رەزامەندی خوداداو دوو مەبەستیان هەن:

١- نزیکبوونەوە لەخوداو بەدەستهێنانی رەزامەندی زاتی بێچونی.

٢- دوعا کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆیان، چونکە پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ ئەوانە دەکرد کە زەکاتی ماڵی خۆیان دەداو ماڵو سامانی خۆیان دەبەخشی داوای

لێخۆشبوونی خودای بۆ دەکردن، داوای خێرو بەرەکەتی بۆ دەکردن، ئەوانیش بەم دوعایانە دڵیان دادەمرکاو ئارامی دەگرت.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە: کە ئەو موسوڵمانانە پاداشیان مسۆگەرە، شایەدی ئەوەیان بۆ دەدا: کە زەمینیان بەهەڵە نەچووەو ماڵبەخشینەکەیان سوودبەخشە بۆیانو جێی خۆی دەگری‌و دەفەرموێ: ﴿أَلا إِنَّهَا قُرْبَةٌ لَهُمْ﴾ ئاگادار ببنەوەو بزانن: ماڵبەخشینەکەیان لەرەحمەتو بەخششی خودایان نزیك دەکاتەوەو دەکەونە ژێر رێژنەی بارانی رەحمەتی تایبەتی خۆیەوەو رەزامەندی خۆی دەبەخشێ پێیانو هیدایەتیان دەدا بۆ بەردەوام بوون لەسەر رێبازی راستو دروست: کە دەیانگەیەنێ بەبەهەشتی بەرینو نەبڕاوەو رازاوە. ﴿سَيُدْخِلُهُمُ اللَّهُ فِي رَحْمَتِهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگار لێخۆشبوونو رەحمەتو بەزەیی بەرفراوانو بێ سنوورو بێ سەرو بنە، رەحمەتو لێخۆشبوونی خۆی دەبەخشێ بەو بەندانەی لەکردارو گوفتاریاندا موخلیص‌و دڵسۆزن، لەگوناهو کەمتەرخەمییان خۆش دەبێ، هیدایەتیان دەدا بۆ بەردەوام بوون لەسەر کارو کردەوەی باش‌و پەسەند! ئەمەش دەبێتە هۆی ئاکامباشی‌و بەختەوەری دوارۆژ.

## پۆلێن کردنی دانیشتوانی مەدینەو دەوروبەری

﴿وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا

أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ
مُنَٰفِقُونَ وَمِنْ أَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ مَرَدُوا۟ عَلَى ٱلنِّفَاقِ لَا تَعْلَمُهُمْ
نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ
عَظِيمٍ ﴿١٠١﴾ وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا۟ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا۟ عَمَلًا صَٰلِحًا
وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾

**دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ﴿وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ....﴾ ئیمامی ڕازی دەفەرموێ: ئەوەی ڕاستو صەحیحە ئەوەیە: کە ئەم ئایەتە مەبەستی ئەو هاوەڵانەیە کە دەست پێشخەرو پێشەنگ بوون بۆ کۆچکردنو یارمەتیدانی ئیسلام.**

**ئایەتی (١٠١) بەگوێرەی قسەی بەغەوی و واحیدی: کە لە(کولەبی)یەوە دەگێڕنەوە دەربارەی خێڵی جوهەینەو خێڵی موزەینەو ئەشجەعو ئەسلەمو غەففار هاتۆتە خوارێ: کە دانیشتووی دەوروبەری مەدینە بوون.**

**دەربارەی ئایەتی ﴿وَآخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ﴾ ئیبنو مەردەوەیهیو ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە: فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ غەزا، ئەبو لوبابەو پێنج کەسی تر خۆیان پاشدا، دوایی ئەبو لوبابەو دوو پیاو لەپێنج کەسەکە بیریان کردەوەو بەخۆیاندا هاتنەوەو پەشیمان بوونەوە، وتیان خۆمان بەکوڵەکەکانی مزگەوتەوە شەتەك دەدەین، خۆمان ناکەینەوە تا پێغەمبەر ﷺ خۆی نەیە بەدەستی خۆی نەمان کاتەوە خۆمان بەرەڵڵا ناکەین!**

ئەمانە وادەی خۆیان بەجێ هێناو خۆیان شەتەلکدا، سێ کەسەکەی تریان خۆیان شەتەك نەدا. پێغەمبەر ﷺ لەغەزا گەڕایەوە، فەرمووی: ئەوانە کێن خۆیان بەو کۆڵەکانەوە شەتەك داوە؟ پیاوێك عەرزی کرد وتی: قوربان! ئەوانە ئەبو لوبابەو هاوڕێکانین، لەهاتن بۆ غەزا خۆیان پاش داوە، دوایی پەشیمان بوونەوەو وەعدیان داوە خۆیان ببەستنەوە تا تەشریفت نەیان کەیەوە خۆیان ئاوا بەشەتەك دراوی بهێڵنەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تا فەرمانم لەخوداوە پێ نەکرێ نایانکەمەوە، ئیتر ئایەتی ﴿وَآخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ....﴾ هاتە خوارێ، ئەمجار پێغەمبەر ﷺ بەرەڵلای کردن‌و عوزرییانی لێ وەرگرتن. سێ کەسەکەی تر مانەوە کە خۆیان نەبەستبووەوەو باسیان نەکرابوو، ئەوانە بوون: کە خودا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿وَآخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ اللَّهِ﴾ ئیتر خەڵك دەیانگوت: ئەو سێ کەسە ئەگەر سروش دەربارەیان نەیەتە خوارێ‌و عوزریان لێ وەرناگیرێ. هەشبوون دەیانگوت: بەڵکوو خودا لێیان خۆشبێ، تا لەدواییدا ئایەتی ﴿وَعَلَى الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا...﴾ هاتە خوارێ جا پێش ئەوەی بچینە سەر ڕاڤە کردنی ئایەتەکان پێویستە پەیوەندی ئەم ئایەتانە بەهی پێشەوە ڕوون بکەینەوە. پەیوەندییەکەش ئەوەیە: پەروەردگار لەوەپێش ڕێزی کۆمەڵە عەرەبێکی ڕوون کردەوە: کە بەمەبەستی خۆ نزیك کردنەوە لەخوداو دوعاکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆیان ماڵ‌و سامانی خۆیان دەبەخشن، ئەمجار فەضل‌و ڕێزی کۆمەڵێکی تری عەرەبی بەیان کرد: کە لەکۆمەڵی پێشوو ڕێزدار ترن، پلەو پایەیان بەرزو شکۆدارترە ئەوانیش کۆمەڵ‌و تاقمی موسوڵمانە پێشینەکانن کە دەستەو تاقمی یەکەمی کۆچکارو یارمەتیدەرانن، ئەمجار بەشوێن ئەواندا باسی حاڵ‌و چۆنیەتی کۆمەڵێك لەمونافیقەکانی مەدینەو دەوروبەری دەکا. هەرچەندە یەکەیەکە دەسنیشانیان ناکا، ئەمجار حاڵ‌و چۆنیەتی کۆمەڵێکی تر باس دەکا: کە کرداری چاك‌و خراپیان تێکەڵ کردووەو چاکەو خراپەیان هەیە، ئەوانە ئومێد وایە تۆبەیان لێ وەربگیرێ لێخۆشبوونی پەروەردگار بیانگرێتەوە.

ده‌فه‌رمویَ: ﴿وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ﴾ په‌روه‌ردگار له‌م ئایه‌ته‌دا ره‌زامه‌ندی خۆی؛ ئه‌وپه‌ڕی ره‌زامه‌ندی خۆی راده‌گه‌یه‌نیَ بۆ كۆمه‌ڵێك له‌موسوڵمانانو پاساوی ڕێزو پله‌و پایه‌یان به‌سه‌ر موسوڵمانی دیكه‌دا ده‌داته‌وه‌، كه‌ نمونه‌و پێشه‌نگو ده‌ست پێشخه‌ر بوون بۆ موسوڵمانبوونو جیهادو تێكۆشان، ئه‌وانه‌ش سیَ چینو توێژن:

**یه‌كه‌م**: موسوڵمانه‌ دێرینه‌كان ئه‌وانه‌ی یه‌كه‌مجار كۆچیان كرد: كه‌ بریتین: له‌و كۆمه‌ڵه‌ موسوڵمانانه‌ی پێش په‌یمانی ئاشتی (حوده‌یبییه‌) ده‌ست پێشخه‌ربوون له‌هیجره‌تكردنو یارمه‌تیداندا. رێزدارترین ئه‌م كۆمه‌ڵه‌ په‌سه‌نده‌ چوار خه‌لیفه‌كانی پێغه‌مبه‌رن (أبو بكر، عمر، عثمان، علي) ئه‌مجار ئه‌و ده‌ هاوه‌ڵه‌ رێزدارەن كه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌دونیادا مـوژده‌ی به‌هه‌شتی پێداونو به‌(العشرة المبشرة) به‌ناوبانگن.

رێزدارترینی ئه‌م كۆمه‌ڵه‌ جنێشینی یه‌كه‌م حه‌زره‌تی ئه‌بوبه‌كره‌ ﷺ هاوار بۆ ئه‌و كۆمه‌ڵه‌ی كه‌ خۆیان به‌موسوڵمان ده‌زاننو دژایه‌تی ئه‌م خه‌لیفه‌ ڕێزداره‌ ده‌كه‌نو جوێنی پیَ ده‌ده‌ن، په‌نا به‌خوا! به‌ڕاستی ئه‌وانه‌ كۆمه‌ڵێكی گومڕاو سه‌رلێشێواون. عه‌قڵو هۆشیان تێكچووه‌، دڵیان ره‌ش بووه‌، چۆن زات ده‌كه‌ن له‌گه‌ڵ هه‌بوونی ئه‌و هه‌موو ئایاتی قورئانو فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ردا: كه‌ ده‌رباره‌ی فه‌ضڵو رێزی ئه‌و چینه‌ به‌رێزه‌ی صه‌حابه‌ هاتوون، چۆن زات ده‌كه‌ن ناماقوڵی به‌رامبه‌ر پیاوی وه‌كو حه‌زره‌تی ئه‌بوبه‌كر بكه‌ن؟ دژایه‌تی كه‌سانێك ده‌كه‌ن كه‌ خودا ره‌زامه‌ندی خۆی لێیان راگه‌یانده‌وه‌. به‌چ عه‌قڵو بیرو هۆشێك دژی زاتی وه‌كوو حه‌زره‌تی ئه‌بوبه‌كرو حه‌زره‌تی عومه‌رو حه‌زره‌تی عوسمان، ده‌دوێنو جنێویان ئاراسته‌ ده‌كه‌نو بوختانو قسه‌و باسیان بۆ هه‌ڵده‌به‌ستن؟ خودا له‌شه‌ڕی ئه‌و كۆمه‌ڵه‌ گومڕایه‌ی ئه‌مه‌ هه‌ڵوێستیانه‌ به‌رامبه‌ر صه‌حابه‌ی خودا لیَ ڕازی بوو، بمانپارێزیَ!!!

**دووەم**: دەستەی یەکەمی یارمەتیدەرانن؛ ئەو کۆمەڵە هاوەڵە یارمەتیدەرەی ئامادەی پەیمانی (عەقەبەی یەکەم بوون) کە ژمارەیان حەوت کەس بوو لەمینا ساڵی یازدەهەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر واتە: دوو ساڵ پێش هیجرەتی پێغەمبەر ﷺ پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەردا بەست. ئەمجار هاوەڵانی (پەیمانی عەقەبەی دوەمن) کە ژمارەیان حەفتا پیاوو دوو ئافرەت بوون.

**سێیەم**: ئەو موسوڵمانانەی کە شوێن ئەو موسوڵمانە دێرینانە کەوتوون بەچاکەکاریو ئیمانو گەردنکەچیەوە شوێن ئەو صەحابە خوا لێ رازیبووانە کەوتوون، کردارو گوفتاریان چاکەو چاکەکارییە، ئەم سێ تاقمو دەستەیە ﴿رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ﴾ خودا لەبیرو باوەڕو کردارو گوفتاریان رازییەو طاعەتو خودا پەرستییان قبووڵەو لەتاوانو زەللەو خراپەیان خۆش بووە، بەئەوان ئیسلام گەشەی کردوەو بڵاوبۆتەوە، ئەوان بوون بەگیانو بەماڵ خۆیان فیدایی کرد؛ ئەوانییش لەخودا رازین سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی دەکەن، رازین بەو نیعمەتانەی خودا لەدونیاو قیامەتدا بەسەریدا رشتوون، لەشیرکو گومڕایی رزگاری کردوون، توفیقی داون بەرەو رێبازی خێرو چاکە هەنگاو بنێن، هیدایەتی داون بۆ حەقو رێبازی راست، سەربڵندی دونیاو قیامەتی کردون، ﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ باغی بەهەشتی بۆ داناون کە بەژێردارو درەختەکانیدا جۆگای ئاو دەکشێنو ئەوەندەی تر جوانیو رازاوەیی بەباغەکانی بەهەشت دەبەخشن، بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە.

تێبینی دەکرێ: کە شوێنکەوتنی هاوەڵان وەکوو پێویست، دەبێ شوێنکەوتنێکی چاکەکاریو ئیحسان ئامێزبێ، واتە: کردەوە چاکو نیازپاکو موخلیص بێ بۆ ئایین، ئەگەر هەروا بەڕواڵەت پەیڕەوی ئیسلام بکاو مەرجی ئیحسانی تێدا نەبێ، بەشوێنکەوتووی هاوەڵانی پێغەمبەر ناژمێردرێو ناچیتە

چوارچێوەی مەفهوومی ئایەتی ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ آل‌عمران/ ١١٠ لەو پێرە حسێب ناکرێ!!

ئەمجار پەروەردگار حاڵو چۆنیەتی کۆمەڵێکی تری دانیشتووی مەدینەو دەوروبەری روون دەکاتەوە، هەواڵی کۆمەڵێك دووڕووی مەدینەو دەورو پشتی بەپێغەمبەر دەدا، وەصفو چۆنیەتییان رادەگەیەنیو دەفەرموێ: ﴿وَمِمَّنْ حَوْلَكُمْ مِنَ الأَعْرَابِ مُنَافِقُونَ وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ مَرَدُوا عَلَى النِّفَاقِ﴾ لەو عەرەبانەی لەدەوروبەری مەدینەن، کە خێڵی جوهەینەو ئەسلەمو غەففارو ئەشجەعن مونافیقو دووڕوون، هەروەها هەندێکی تریان دانیشتووی ناو شاری مەدینەن دووڕوون؛ نەك هەر دووڕوو بەس! بەڵکو ﴿مَرَدُوا عَلَى النِّفَاقِ﴾ لەسەر دووڕوویی راهاتوونو تێیدا ماهیرو کارامەن ﴿لا تَعْلَمُهُمْ﴾ ئەتۆ ئەی موحەممەد! وێڕای زیرەکیو لێزانیت نایانناسیو ناتوانی دەست نیشانیان بکەی. ئەوەندە وریاو پیسو فێڵبازو خۆپارێزن ناهێڵن هەستیان پێ بکەی. ﴿نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ﴾ ئێمە دەیانناسینو بەسەر نهێنیو پەنامەکییەکانیاندا ئاگادارینو پێیان دەزانین، ئەوان کوفرو دژایەتی لەنێو دڵیان حەشار دەدەنو بەرواڵەتو روکەش خۆیان وەکوو موسوڵمانی موخلیصو راستاڵ پیشان دەدەن ﴿سَنُعَذِّبُهُمْ مَرَّتَيْنِ﴾ بەسەریانەوە ناچیو بۆیان سەرناچێ لەوە بەولاوە دوو جار سزایان دەدەین بەریسوابوونو ماڵفەوتاندنیانو منداڵ مردنیان، ئەمجار بەئازاری کاتی گیانکێشانو عەزابی ناوگۆڕ، یان بەماڵ لێ ستاندنو ماندوکردنی جەستەیان.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: بەنەخۆش کەوتنیان لەدونیاداو بەسزای قیامەتیان.

﴿ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَى عَذَابٍ عَظِيمٍ﴾ پاشان دەگەڕێندرێنەوە بۆ ناو سزای دۆزەخ کە بەئێشو ئازارترین سزایە. مەبەست ئەوەیە: سزایان دوو چەندانەو چەند چەندانە دەبێ!

ئـەمجار باسـی كۆمـەڵێكی تـری دانـشتوانی مەدینـەو دەوروبـەری دەكـا: كـە مەنافیقی خالیص نین بەڵكوو كۆمەڵێكن كرداری چاكەو كرداری خراپـەیان تێكـەڵ بەیەك كردوە، ئیمانیان هەیەو تاوانبارن! دەفەرموێ: ﴿وَآخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ﴾ كۆمەڵێكی تر هـەن كـە خۆیـان پاشـداوە، نـەهاتن بـەدرۆو بیـانوو بهێنـنـەوەو عـوزر خواهی بكەن، بەڵكوو دان بەتاوانی خۆیاندا دەنێن‌و دەڵێن كارێكی خراپمان ئـەنجام داو پەشیمانین، ئەوانـە ﴿خَلَطُوا عَمَلاً صَالِحاً وَآخَرَ سَيِّئاً﴾ كـرداری چاكیان تێكـەڵ بەكردەوەیەكی تری خـراپ كـردووە، جارێـك چـوون بـۆ جیهـادو جارێـك خۆیـان لێ پاشداوە، تۆبەو تاوانیان تێكەڵ بەیەك كردوە، ئەوانە ﴿عَسَى اللّهُ أَنْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ﴾ هومێد وایە؛ خودا تۆبەیان لێ وەربگرێ‌و لێیان خۆش بێ ﴿إِنَّ اللّـهَ غَفُـورٌ رَحِيمٌ﴾ بێگومان خـودا لێبـوردوو لێخۆشـبووە، بـەرەحم‌و بەزەییـە بـۆ ئـەو كەسانەی تۆبـە دەكـەن‌و لـەكرداری خۆیـان پەشـیمانن‌و سـورن لەسـەر ئـەوە: كـە جـارێكی تـر نەگەڕێنەوە بۆ سەر ئەو خراپەكارییەیان.

## وەرگرتنی زەكات‌و قبوولكردنی تۆبەو فەرمان بەكاری چاكە

﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ
عَلَيْهِمْۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ أَلَمْ
يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَأْخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ
وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ وَقُلِ ٱعْمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ

عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ...﴾ ئیبنو جەریر لەئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کە پێغەمبەر ﷺ ئەبو لوبابەو هاوڕێیەکانی لەکۆڵەکەکان کردنەوەو دانیان نا بەتاوانی خۆیانداو خودا تۆبەی لێ قبوڵ کردن، ئیتر ماڵو سامانی خۆیان هێنایە خزمەت پێغەمبەرو وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە ئەو ماڵو سامانەمان بوو: کە بوو بەهۆی دواکەوتنمان لەبەشداریکردنی غەزا، بۆمان ببەخشەو داوای لێخۆشبوونمان بۆ بکە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فەرمانم پێ نەکراوە: کە هیچتان لێ وەربگرم، ئەمجار پەروەردگار ئایەتی ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً...﴾ی ناردە خوارێ، ئیتر پێغەمبەر ﷺ سێیەکی ماڵەکەی لێ وەرگرتن.

حەسەنی بەصری دەڵێ: ئەو ماڵ لێ وەرگرتنە قەرەبووی ئەو تاوانەبوو: کە ئەنجامیان دابوو...

کۆمەڵێك لەزانایانی ئیسلام پێیان وایە: کە مەبەست بەم ئایەتە زەکاتی واجبە. بەم پێیە فەرمانی ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ﴾ هەموو ماڵو سامانی ئادەمیزادان دەگرێتەوە. وشەکە گشتییەو مەبەست پێی ماڵو سامانێکی تایبەتییە، چونکە بڕە ماڵو سامانێك هەیە زەکاتی تێدا نیە، وەکوو خانووی سوکناو حەوانەوەو پۆشاكو وڵاغی سواریو ئەم جۆرە شتانە، ئەمانە ماڵو ساماننو زەکاتیشیان تێدا نیە.

جا ئەم فەرمانە هەرچەندە ئاراستەی پێغەمبەر کراوەو تایبەتە بەئەوەوەو هۆکاری نازڵبوونەکەشی تایبەتە، بەڵام جێنشینەکانی پێغەمبەرو فەرمانڕەوایانی موسوڵمانی دوا ئەوانیش دەگرێتەوە. بۆیە حەزرەتی ئەبو بەکری صەدیقو باقی

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ شەڕیان دژی ئەو خێڵە عەرەبانە ڕاگەیاند: کە لەزەکاتدان پاشگەزبوبوونەوە، شەڕیان لەگەڵ کردن تا ملیان کەچ کرد بۆ زەکاتدانو زەکاتی ماڵو سامانیان تەسلیم بەخەلیفەی پێغەمبەر کرد، وەکوو چۆن لەوەپێش دەیاندا بەپێغەمبەر. تەنانەت حەزرەتی ئەبوبەکر فەرمووی: (و الله لو منعوني عقالا -أو عنقا- كانوا يؤدونها الى رسول الله ﷺ لأقاتلنهم على منعه)

ئەمجار پێش ئەوەی بچینە سەر ڕاڤەکردنی ئایەتەکان بەپێویستی دەزانم موناسەبەی ئەم ئایەتانە بەهی پێشەوە دەست نیشان بکەم.

١- جا ئەگەر مەبەست بەوشەی (صدقة) لەئایەتەکەدا قەرەبوو کردنەوەی ئەو تاوانە بێ کە لەخۆپاشدەرەکانی غەزای تەبووك ڕویدا، ئەوە پەیوەندی ئەم ئایەتانە بەئایەتەکانی پێشەوە ئاشکراو نومایانە، چونکە ئەگەر وابێ مەبەست بەئایەتەکان چارەسەرکردنی هەڵەی کۆمەڵێك ئادەمیزادەو حوکمەکە تایبەتە بەوانەوە!

دەشبێ مەبەستەکە گشتی بێ، بەم جۆرە بگوترێ: ئێوە کاتێك ڕازی بن زەکاتی غەیرە واجب بدەن، دەبێ بۆ دەرکردنی زەکاتی واجب ئامادەباشی زیاترتان تێدابێ!

٢- ئەگەر مەبەست بەوشەی (صدقة) لەئایەتەکەدا زەکاتی واجب بێ، یان واجب بوونی زەکات وەرگرتن بێ لەدەوڵەمەندەکان، کە ئەمە بۆچوونی زوربەی فوقەهای ئیسلامەو بۆچونێکی ڕاستیشە، ئەوە موناسەبەکە بەم جۆرە دەبێ: واتە: دەتوانرێ بگوترێ: کاتێك ئەبو لوبابەو هاوەڵانی تۆبەیان کردو پەشیمانییان لەکارەکەیان دەربڕیو خۆپاشدانی خۆیان لەغەزای تەبووك بەتاوان زانی، دانیان بەوەدا نا کە هۆکاری خۆپاشدانەکەیان خۆشویستنی ماڵو سامان بوو ڕژدیو چروکییان بوو، هەوڵدانیان بوو بۆ پاراستنیو خەرج نەکردنی، کەوابێ پێیان گوتراوە: ئەگەر ڕاست دەکەن تۆبەتان کردووەو پەشیمانن، دە زەکاتی ماڵو سامانتان

(كه واجبه له‌سه‌رتان) ده‌ربكه‌ن، چونكه ئیدیعای تۆبه‌كردن‌و په‌شیمانبوونه‌وه‌تان هه‌ر به‌قسه نابێ، ده‌بێ به‌ركرده‌وه بیسه‌لمێنن، جا ئه‌گه‌ر زه‌كاتی پێویستی ماڵ‌و سامانی خۆتان دا، ئه‌وه روون ده‌بێته‌وه كه ئێوه راستگۆن له‌تۆبه‌كردنه‌كه‌تاندا. ئه‌گینا درۆ ده‌كه‌ن!

جه‌صصاص ده‌ڵێ: راست ئه‌وه‌یه؛ مه‌به‌ست به‌(صدقة) له‌ئایه‌ته‌كه‌دا زه‌كاتی واجبه، چونكه تا ئێستا نه‌چه‌سپاوه: كه ئه‌وانه به‌تایبه‌تی صه‌ده‌قه‌یه‌كیان له‌سه‌ر واجب بوو بێ له‌سه‌ر كه‌سانی دیكه واجب نه‌بووبێ، جا ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌مان بۆ نه‌چه‌سپێ، ده‌بێ بڵێین: ئه‌بو لوبابه‌و هاوه‌ڵانی‌و خه‌ڵكانی تر هه‌موویان له‌ئاست ئه‌حكامی ئیسلام‌و عیباده‌تدا یه‌كسانن‌و ئایه‌ته‌كه تایبه‌ت نیه به‌ئه‌بو لوبابه‌و هاوه‌ڵانیه‌وه به‌ڵكوو هه‌موو سامانداریك ده‌گرێته‌وه.[١٢]

﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً﴾ ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر! هه‌روه‌ها هه‌موو حاكم‌و فه‌رمانڕه‌وایه‌كی دوای پێغه‌مبه‌ر، وه‌ربگره له‌ماڵ‌و سامانی ئه‌و تۆبه‌كارانه‌و له‌كه‌سانی تریش به‌شێك له‌ماڵ‌و سامانیان كه زه‌كاتی دیاریكراوه‌و واجبه له‌سه‌ریان ده‌ری بكه‌ن ﴿تُطَهِّرُهُمْ﴾ به‌و زه‌كات لێ وه‌رگرتنه له‌ده‌ردی به‌خیلی‌و ته‌ماع پاكیان ده‌كه‌یته‌وه ﴿وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا﴾ دڵ‌و ده‌روونیان پاڵفته ده‌كه‌ی، له‌نه‌خۆشی رژدی‌و چروكی پاكیان ده‌كه‌یته‌وه، گه‌شه‌و نه‌ش‌و نما به‌چاكه‌و حه‌سه‌نه‌یان ده‌ده‌ی، به‌رزیان ده‌كه‌یته‌وه بۆ پله‌و پایه‌ی راستالان، به‌و زه‌كات لێ وه‌رگرتنه ماڵ‌و سامانیان گه‌شه ده‌كاو زۆر ده‌بی‌و خاوێن ده‌بێته‌وه. ئیمامی ئه‌حمه‌دو موسلیم‌و تیرمیذی له‌ئه‌بو هوره‌یره‌وه فه‌رمووده‌یه‌كیان ریوایه‌ت كردوه ده‌فه‌رموێ: (ما نقصت صدقة من مال) واته: زه‌كاتدان ماڵ‌و سامان كه‌م ناكاته‌وه.

---

(١٢) أحكام القرآن ج٣/١٤٨

﴿وَصَلِّ عَلَيْهِمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! دوعا بۆ ئەوانە بکە زەکات دەردەکەنو داوای ڕەحمو بەزەیی خودایان بۆ بکە. بۆیە سوننەت وایە: کە جابی زەکات زەکاتەکە وەردەگرێ دوعا بۆ زەکاتدەر بکا، ﴿إِنَّ صَلاَتَكَ سَكَنٌ لَهُمْ﴾ بێگومان دوعاکردنی تۆ ئەی پێغەمبەر بۆ زەکاتدەرەکان ئارامی دەبەخشێ بەدڵو دەروونیانو هیچ پەرۆشی ئەوماڵەیان نابێ کە دەیبەخشن. ﴿وَاللّٰهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ پەروەردگار شنەوایە بۆ دوعاو پاڕانەوەی تۆ بۆیانو شنەوایە بەدانناني ئەو خۆپاشدەرانە بەتاوانی خۆیانداو تۆبەکردنیانو پاڕانەوەیان. ﴿عَلِيمٌ﴾ زاناو ئاگادارە بەو هەستو شعوورەی لەناو دڵو دەروونیاندا شاردراوەتەوە بەو پەشیمانبوونەوەو ئەو غەمو پەژارەی تووشیان بووە لەناکامی تاوانی خۆپاشدانیان لەچوون بۆ غەزا! دەزانێ ئاخۆ تۆبەکەیان بەراستە یان نا؟ دەزانێ چ شتێك بەرژەوەندی ئەوانی تێدایە چ شتێك بۆ ئەوان زیان بەخشە.

**گوتراوە زەکاتدان سێ سوودی گەورەی بۆ زەکاتدەر هەیە:**

١- دڵو دەروونی پاك دەکاتەوە.

٢- ڕەزامەندی پەروەردگاری بۆ دەستەبەر دەبێ.

٣- ماڵو سامانی پارێزراو دەبێ.

بەڵێ خودا شنەوایە بۆ دوعاو پاڕانەوەی بەندەکانی، زانایە بەنهێنی ناو پەرەی دڵیانو ئاگاداری هەموو شتێکی نهێنیو ئاشکرایە، هەر ئەوە حوکم دەکا لەکارو باری بەندەکانیدا، تۆبەو پەشیمانییان لێ وەردەگرێ، صەدەقەو زەکاتیان لێ قبووڵ دەکا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی خودا ئەنجام دەدا، چی پێ بفەرموێ ئەو جێ بەجێ دەکا، هیچ شتێك لەخۆیەوە بڕیار نادا، جا بۆ چەسپاندنی ئەم حەقیقەتەو خستنەرووی ئەم ڕاستییە فەرمووی: ﴿أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللّٰهَ هُوَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَأْخُذُ الصَّدَقَاتِ وَأَنَّ اللّٰهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ ئایا نەزانن؟ واتە: با بزانن: کە هەر

خودا تۆبە لەبەندەکانی وەردەگریو زەکاتو صەدەقە قبوول دەکا، هەر خودایە تۆبەو پەشیمانی ئاراستە دەکریو هەر ئەویش مافی ئەوەی هەیە تۆبە وەرگریو رەحمو بەزەیی بەتۆبەکاران ببەخشێ، کەسی تر مافی ئەوەی نیە. تەنانەت پێغەمبەری خودا کاتێك هاوەڵە خۆپاشدەرەکانی لەکۆڵەکەکان کردنەوە، صەدەقەکەیانی لێ وەرگرتن بەفەرمانو بەئیزنی خودابوو، تا خودا ئیزنی نەداو نیگای بۆ نەنارد ئەو نەیتوانی هیچ بکا! لێخۆشبوون لەتاوانی بەندەکان عائید بەخوداو بەس! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ اللّهُ ؟﴾آل‌عمران/١٣٥ یان دەفەرموێ: ﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحاً ثُمَّ اهْتَدَى﴾ طه/٨٢.

﴿وَقُلْ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو تۆبەکارانەو بەخەڵکانی تریش بڵێ: تێبکۆشنو کار بکەن، بێگومان کردەوەی ئێوە چاك بێ یان خراپ، دەبینرێ؛ خودا ئاگای لێیەو پێغەمبەر دەیبینیو موسوڵمانان پێی دەزانن.

کردەوە گرنگییەکی تایبەتی هەیەو بناغەی خۆشبەختیو کامەرانییە، یان مایەی بەدبەختیو چارەڕەشییە، هەرچی ئێوە بیکەن: لەچاکەو لەخراپە خودا دەیبینیو ئاگاداریەتی، پێغەمبەرو موسوڵمانانیش بەسەر کردەوەکانتاندا ئاگادار دەکا، پاداشو سزاتان بەگوێرەی کردەوەکانتان دەدرێتەوە...

پێویستە هەموو ئادەمیزادێك بترسێ لەم هەڕەشەیەی پەروەردگارو بگەڕێتەوە بۆ لای خوداو تۆبەی پەشیمانی خۆی لەتاوانەکانی رابگەیەنیو چی تر سوور نەبێ لەسەر سەرپێچی کردنی فەرمانی پەروەردگاری! باش بزانن کە لەقیامەتدا کردەوەکانتان بەسەرخودادا رادەنوێرێنو دەخرێنە بەرچاوی پێغەمبەرو موسوڵمانان، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَى مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾ الحاقة/١٨.

ئیمام ئەحمەدو بەیهەقی لەئەبو سەعیدی خودرییەوە ڕیوایەت دەکەن: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لو أن أحدكم يعمل في صخرة صماء، ليس لها باب ولا كوة، لأخرج الله عمله للناس كائنا ماكان) ئەگەر - لەفەرضی مەحاڵدا - یەکێك لەئێوە لەناو کونە بەردو شاخێکدا کار بکا ئەو کونە بەردو کونە شاخە دەرگاو کونو کەلەبەری تێدا نەبێو وا بزانێ کەس پێی نازانێ، خودا کردەوەکانی بۆ خەڵك رادەنوێنێ.

ریوایەت کراوە: کە کردەوەی زیندوان بەسەر خزمو کەسو کاری مردوویاندا رادەنوێرێن. ئەبو داوودی طەیالیسی فەرموودەیەك لەجابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ان أعمالكم تعرض على أقربائكم و عشائركم في قبورهم، فان كان خيراً استبشروا به، و ان كان غير ذلك قالوا: اللهم ألهمهم ان يعملوا بطاعتك﴾. هەروەها فەرموودەی تریش هەن. ئەوە دەچەسپێنن: کە کردەوەی موسوڵمانان بەسەر پێغەمبەردا رادەنوێرێن.

﴿وَسَتُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ رۆژی قیامەت دەگەڕێندرێنەوە بۆ لای پەروەردگاری زاناو ئاگادار بەسەر هەموو نهێنیو ئاشکراییەکدا، دەبرێنەوە بەر دادگایی کردنی خودایەك دیارو نادیاری لەلا چوون یەکە، ئاشکراو نهێنی لەلا ئاشکراو نومایانە، کردەوەکانتان دەخاتەوە بەرچاوو ﴿فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ هەواڵتان دەداتێ بەو کردەوانەی لەدونیادا ئەنجامتان داوون، ئەمجار سزاو پاداشتان بەگوێرەی کردەوەکانتان دەداتەوە چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە!!

## ئەو سێ کەسەی تۆبە لێ وەرگرتنیان دواخرا

﴿ وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ ٱللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾



**ئەوانەی لە چوون بۆ غەزای تەبووك دوا کەوتبوون سێ تاقم بوون:**

١- ئەو مونافیقو دووڕووانە: کە لەدووڕوویی‌دا کارامەو شارەزابوونو زوربەی دواکەوتووەکان لەم تاقمەبوون.

٢- ئەو موسوڵمانانە بوون: کە دانیان نا بەتاوانی خۆیانداو تۆبەیان کردو پەشیمان بوونەوەو خودا تۆبەی لێ قبووڵ کردن، ئەمانە ئەوانە بوون: کە خۆیان بەکۆڵەکەوە شەتەك دابوو وەکوو لەمەوپێش باسکرا.

٣- ئەو کەسانە بوون: کە نەیانـدەزانی چ بکەن؛ عوزریان بۆ پێغەمبەر نەهێنایەوە لەئاکامی دواکەوتنیان بۆ غەزا. لەگەڵ ئەبو لوبابەو هاوەڵانی‌دا خۆیان شەتەك نەدا، پەروەردگار بڕیاری خۆی دەربارەیان دواخست، پەنجا شەو ئیشەکەیان بەموعەللەقی مایەوە، موسوڵمانان دەنگیان لێ دابڕین. هەتا ئایەتی قبولکردنی تۆبە لێیان هاتە خوارێ، ئەمانە ئەو سێ کەسە بوون کە دەربارەیان ئایەتی ﴿وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ﴾ التوبة/١١٨ نازڵ بوو.

ئیبنو عەبباسو موجاهیدو عیکریمەو ضەححاکو هی تریش دەڵێن: ئەوانەی ئایەتی ﴿وَآخَرُونَ مُرْجَوْنَ ...الآيـة﴾ یان دەربارە هاتۆتە خوارێ ئەو سێ کەسە بوون: کە لەتۆبە کردن پاش خران ئەوانە: مورارەی کوڕی رەبیعو کەعبی کوڕی مالیكو هیلالی کوڕی ئوممەیە بوون: کە لەهاوبەشی کردنی غەزای تەبووك خۆیان پاشدا لەبەر تەمبەڵیو خۆلستنەوەو ئیستراحەتو پاڵدانەوە، نەك لەبەر دووڕوویی‌و نیفاق.

﴿وَآخَرُونَ مُرْجَوْنَ لأَمْرِ اللّهِ﴾ تاقمێکی تر لەخۆپاشدەرانو هاوبەشی نەکەرانی غەزای تەبووك، مەوضوعەکەیان لەبەر ئەوە خودا بڕیاری یەکالاکەرەوەی دەربارەیان دەرنەبڕیوە دوا خراوە، موسوڵمانان نازانن چییان دەربارە نازڵ دەبێ ئایا خوا تۆبەیان لێ قبووڵ دەکا یان نا؟!

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەموسوڵمانان کرد کە دەنگیان لێ دابڕنو هاونشینیو هاوڕێیەتییان نەکەن، فەرمانی کرد خێزانەکانیان پێیانەوە دانەنیشنو بچنەوە ماڵە باوانیان تا ئاکام دیاری دەکرێ!

ئەو تاقمە کارەکەیان یەکالا نەبۆتەوە لەسەرەتای دووریان دان ﴿إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ﴾ یان خودا سزایان دەدا ﴿وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ﴾ یان تۆبەیان لێ قبووڵ دەکا.

بێگومان ئیشەکەیان بۆ ماوەیەك ئاوا بەموبهەمی مایەوەو بڕیاری یەکالاکەرەوەیان دەربارە نەهاتە خوارێ. هەڵبەتە هۆیەکەش شكو گومان نەبوو چونکە پەروەردگار لەوە دوورە، بەڵکوو بۆ ئەوە بوو: ماوەیەك لەنێوان خۆفو ڕەجادا بمێننەوە، غەمو نارەحەتی لەدڵیاندا پەرەبسێنێو لەناخی دڵەوە هەوڵی تۆبە کردن بدەن، خەڵکی چاوەڕوانی ئاکامیان بکەن، جا هی وا هەبوو: دەیگوت: ئەمانە ئەگەر خودا تۆبەیان لێ وەرنەگرێ بەدبەختو چارە ڕەش بوون، هەشبوو دەیگوت: ئومێد وایە خودا لێیان خۆش بێ.

بێگومان ئەم تاقمە پەشیمان بوون لەوەی کە نەچوون بۆ غەزا بەڵام پەروەردگار دەمو دەست تۆبەو پەشیمانی لێ وەرنەگرتن. چونکە پەشیمانی رووت سوودی نیە، ئەگەر لەناخەوە تۆبە لەتاوانو سەرپێچی نەکرێ. جا کە بەدڵ تۆبەیان لەتاوان کرد، تۆبەکەیان قبووڵ بوو.

﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ﴾ پەروەردگار زاناو ئاگادارە دەزانێ کێ شیاوی سزادانەو کێ شیاوی لێخۆشبوونە، چ شتێك لەبەرژەوەندی بەندەکانیدایە. ﴿حَكِيمٌ﴾ داناو حەکیمە لەکردارو گوفتاریدا، لەدانانی شەریعەتو یاسایەك کە بەختەوەری هەردوو دونیا بۆ بەندەکانی دەستەبەر بکا. هەر لەرووی ئەو زانایی‌و داناییيەوە بوو: یەکالاکردنەوەی کاری ئەم تاقمەی دواخست!!

## مزگەوتی (الضرار) و مزگەوتی (قوبا)

﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا وَكُفۡرٗا وَتَفۡرِيقَۢا
بَيۡنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن
قَبۡلُۚ وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ
لَكَٰذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى
ٱلتَّقۡوَىٰ مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٞ يُحِبُّونَ
أَن يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ أَفَمَنۡ أَسَّسَ
بُنۡيَٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقۡوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٍ خَيۡرٌ أَم مَّنۡ أَسَّسَ
بُنۡيَٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٖ فَٱنۡهَارَ بِهِۦ فِي نَارِ جَهَنَّمَۗ وَٱللَّهُ لَا
يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٩﴾ لَا يَزَالُ بُنۡيَٰنُهُمُ ٱلَّذِي بَنَوۡاْ
رِيبَةٗ فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ



دەربارەی هۆی نازڵ بوونی ئەم ئایەتە پیرۆزانە مامۆستا سید قطب لەئیبنو کەثیرەوە ریوایەت دەکاو دەفەرموێ: لەپێش کۆچ کردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە لەو شارەدا کابرایەکی خەزرەجی هەبوو ناوی (أبو عامر الراهب) بوو، ئەم کابرایە لەسەردەمی نەزانی‌دا بوبوو بەمەسیحی‌و زانیاری ئەهلی کیتاب فێر بوبوو، رێزێکی تایبەتیشی لای خاوەن نامەکان‌و خەزرەجییەکان هەبوو، کە پێغەمبەر ﷺ تەشریفی کۆچی بۆ مەدینە کردو موسوڵمانان لێی کۆ بوونەوەو ئایینی ئیسلام بڵاوبووەوەو گەشەی کرد، لەجەنگی بەدریش‌دا موسوڵمانەکان ئەو سەرکەوتنە مەزنەیان بەدەست هێنا، ئەم ئەبو عامیرە نەفرین لێکراوە ئۆقرەی لێ براو دژایەتی خۆی بۆ پێغەمبەرو موسوڵمانان راگەیاندو هەڵهات بۆ مەککەو چووە پاڵ قورەیشییەکان‌و هەمیشە دنەدنەی دەدان بۆ ئەوەی شەڕ دژی پێغەمبەرو هاوەڵانی بکەن. شەڕی ئوحود بەرپا بوو ئەوەی رویدا رویدا، ئەم نەفرین لێکراوە پێش بەرپابوونی جەنگی ئوحود چەند چاڵێکی لەنێوان لەشکری کوفرو لەشکری موسوڵمانان‌دا هەڵکەند، کە شەڕ دامەزرا ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ کەوتە چاڵێکیانەوە سەری شکاو دەمو چاوی بریندار‌بوو ددانی شکا.

لەسەرەتای بەرپا بوونی جەنگەکەش‌دا ئەبو عامیر هاتە پێشەوەو هەوڵی‌دا خەزرەجییەکان هەڵخەڵەتێنی‌و بۆ لای خۆی رایانکێشێ، بەڵام کەس هەڵنەخەڵەتاو تفو نەفرینیان لێ کرد...

لەپێش هەڵاتنیش‌دا پێغەمبەر ﷺ بانگی کردبوو، هەندێ قورئانی بۆ خوێندبوەوە داوای لێ کردبوو ئیمان بهێنێ، بەڵام ئەو بانگەوازییەکەی پێغەمبەری رەت کردبوەوە، ئیتر پێغەمبەر ﷺ دوعای لێ کردبوو: کە بەدەرکراوی‌و غەریبی سەربنێتەوەو دوعاکەشی گیرابوو... ئەوە بوو کاتێك جەنگی ئوحود تەواوبوو ئەبو عامیر بۆی مەعلوم بوو: کە سەرکەوتن‌و باڵادەستی هەر بۆ پێغەمبەرو هاوەڵانیەتی. هەڵهاتو چوو بۆ لای هیرقەل پاشای رۆمو داوای لێ کرد کە هێرش

بێنێ بۆ سەر پێغەمبەرو هاوەڵانی، ئەویش وادەو بەڵێنی دایەو پەنای دایە. ئەمجار ئەبو عامیر نامەی نووسی بۆ هەندێ لەخزمو کەس‌و کارەکانی لەمەدینە کە بەمونافیقی مابوونەوە، وادەو بەڵێنی پێدان کە بەم زوانە بەسوپایەکی زۆرەوە هێرش دێنێتە سەر پێغەمبەرو شەڕی لەگەڵ دەکاو دەیشکێنێ‌و بەسەریدا زاڵ دەبێ، فەرمانیشی بەخزمو کەس‌و کارە دووڕووەکانیشی کرد کە بنکەیەکی بۆ بکەنەوە، هەر کاتێ هاتە ناو مەدینە بیکاتە بارەگاو سەنگەری خۆی‌و پەیڕەوکارانی. ئەوانیش بەمەبەستی ئەنجامدانی فەرمانەکەی لەتەنیشت مزگەوتی (قوبا)وە مزگەوتێکیان دروست کرد؛ مزگەوتێکی گەورەو قایمو قوڵ. پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ تەشریفی بڕوا بۆ غەزای تەبووك ئەوان لەدروستکردنی مزگەوتەکە بوونەوە، هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەرو داوایان لێ کرد کە دیدەنی مزگەوتەکەیان بکاو نوێژی تێدا بکا، بەمە شەرعیەت بدرێ بەمزگەوتەکەیان‌و ئیجازەی نوێژ تێداکردنی بۆ وەربگرن، ئەمەشیان عەرزکرد: کە ئەوان ئەو مزگەوتەیان بۆ نەخۆش‌و پیرو پەککەوتە بنیات ناوە کە لەشەوی زستان‌و باوو بۆراندا ناتوانن بگەنە مزگەوتی قوبا.

پەروەردگار پێغەمبەری لەوە پاراست کە بەگوێیان بکاو خێرا بچێ نوێژی تێدا ئەنجام بدا، فەرمووی: ئێستا ئێمە لەسەر سەفەرین وەغر دەکەین، خودا یاربێ کە گەڕاینەوە دێم. کە لەغەزای تەبووك گەڕیەوە نزیك بەشاری مەدینە بووەوە حەزرەتی جوبرائیل هاتە خواری‌و هەواڵی مزگەوتی (الضرار)ی پێ ڕاگەیاند، مەبەست لەدروستکردنی ئەم مزگەوتە چیەو بۆچی نیازێك بنیات نراوەو بەفەرمانی کێ ئەنجام دراوە، هەموو ئەم شتانەی بەپێغەمبەر گەیاند! ئیتر پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردو ناردی پێش ئەوەی تەشریفی بگاتەوە مەدینە مزگەوتەکەیان روخاندو تێکیاندا. ئەم روداوە بەهەمان شێوە لەئیبنو عەبباس‌و لەسەعیدی کوڕی جوبەیرو موجاهیدو عوروەی کوڕی زوبەیرو قەتادەوە گێڕدراوەتەوە...!

ئەوانـەی مزگـەوتی (الـضرار)یـان دروسـتکرد دوانـزە پیـاوی دووڕووبـوون بەفەرمانو مەشۆرەتی ئەبو عامیری راهیب بنیاتیان نا،.

ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ ناردنی بۆ روخانـدنو سوتاندنی مزگەوتەکە مـالیکی کوڕی دوخـشومو مـەعنی کـوڕی عـەدیو عـامیری کـوڕی سـەکەنو وەحـشی (بکـوژی حەمزە) بوون.

چیرۆکی مزگەوتی (الـضرار) چیرۆکێکی مەشـهورو زەقـەو یەکێکـە لـەروداوە گرنگەکانی غەزای تەبووك.

بۆیە پەروەردگار دوای رانواندنی حاڵو چۆنیەتی چینو توێـژە جیاجیاکـانی کۆمەڵگای ئیسلامی ئەو سەردەمە، باسێکی سەربەخۆی بۆ ئەو مونافیقانە تـەرخان کرد کە ئەو مزگەوتەیان بنیات ناوەو فـەرمووی: ﴿وَالَّـذِينَ اتَّخَـذُوا مَـسْجِداً ضِـرَاراً وَكُفْـراً﴾ ئەوانـەی مزگـەوتی (الـضرار)یـان بنیـات نـا، کۆمـەڵێك دووڕوو بـوون لـەو دووڕووانـەی باسـکران، دوانـزە پیـاو بـوون لـەدووڕووەکانی هـۆزی ئـەوسو هـۆزی خەزرەج. ئەم مزگەوتەیان بنیات نا بۆ چوار مەبەستی سەرەکی.

١- بۆ زیانگەیانـدن بەموسـوڵمانو نوێژکـەرانی مزگـەوتی قوبـا کـە پێغەمبـەر ﷺ بەگەییشتنی بۆ شاری مەدینە دروستی کردبوو.

٢- بـــۆ رەتکردنـــەوەی پـــەیامی پێغەمبـــەرو کـــافر بـــوون بـــەخۆیو پێغەمبەرایەتیو تانەو تەشەردان لەخۆیو پەیامەکەی تەرخانکردنی ئەو مزگەوتە بـۆ شـوێنی پیلانگێـرانو ئاشـوب نانـەوە دژی پێغەمبـەرو هـاوەڵانیو هـەروەها بـۆ خۆدزینەوەی مونافیقەکان لەبەجی هێنانی نوێژەکانیان.

٣- ﴿وَتَفْرِيقاً بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ بۆ لێـك دابڕانـی موسوڵمانانو پەرتـەوازەبوونیان، چـونکە لـەوەپێش موسـوڵمانان هـەموویان لـەدوا پێغەمبـەرەوە لەمزگـەوتی قوبـادا

نوێژیان دەکرد، ئەگەر بڕێکیان نوێژ لەمزگەوتی (الضرار)دا بکەن، لێك دابڕانو جوداوازی لەنێوان موسوڵمانانـدا دروست دەبێ.

٤- ﴿وَإِرْصَاداً لِمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ مِنْ قَبْلُ﴾ بۆ چاوەڕوانیو بەتەماهاتنی کەسانێك کە بێن دژی ئایینی خوداو پێغەمبەر ﷺ شەڕ بکەنو ئەو بەناو مزگەوتە بکەنە بنکەی خۆیانو تێیدا کۆببنەوەو ئامادەباش بن بۆ جەنگ کە سوپای خەیاڵپڵاوی ئەبو عامیری راهیب هات رەگەڵی بکەون!!

هەڵاتنی ئەبو عامیر هەندێك پێیان وایە: دوای غەزای ئوحود بووە وەکوو لەوە پێش ئاماژەمان پێ کرد. هەندێك پێیان وایە: دوای غەزای حونەین بووە، ریوایەتی تریش هەیە ئەوە دەگەیەنێ: کە پاش غەزای ئەحزاب بووە.

﴿وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلاَّ الْحُسْنَى﴾ ئەو مونافیقانەی مزگەوتی (الضرار)یان بنیات ناوە سوێند دەخۆنو دەڵێن: ئێمە ئەم مزگەوتەمان بەنیازی چاکەکاریو پاك بنیات ناوە، بۆ ئەوە دروستمان کردوە کە نەخۆشو پیرو پەککەوتە شەوی ساردو سەرما نوێژی تێدا بکەن، تووشی نارەحەتی نەبن، ئەم سوێند خواردنو ماستاو کردنەیان بۆیە بوو، بۆ خاتری پێغەمبەر بڕوایان پێ بکاو بچێ نوێژ لەمزگەوتەکەدا بکاو بەوە شەرعییەت بدەن بەمزگەوتەکەو ئیتر موسوڵمانانی پێ هەڵخەڵەتێنن، ﴿وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ خودا دەزانیو شایەدی دەدا، کە ئەوانە درۆ دەکەن. نەبڕوایان بەئیسلام هێناوە، نە نیازو مەبەستیان ئەوەیە: کە ئیدیعای دەکەن، ئەوانە دووڕوون لەکردەوەکانیاندا، خودا بەدڵ پیسیو درۆزنیو نیازی چەپەڵیان دەزانێ.

جا چونکە ئەوان ئەو مزگەوتەیان بۆیە بنیات نابوو زیان بەموسوڵمانان بگەیەننو خراپەکاری ئەنجام بدەن، پەروەردگار نیگای بۆ پێغەمبەر ناردو فەرمانی پێکردو پێی فەرموو: ﴿لا تقم فيه أبداً﴾ ئەی پێغەمبەر! بەهیچ جۆرێك ئەتۆ نوێژ لەو مزگەوتەدا مەکە.

وشەی (قیام) زۆر جار بەمانا نوێژ دێ، دەگوترێ: (فلان یقوم اللیل) واتە: شەو نوێژ دەکا. لەحەدیثی بوخاریدا هاتووە: (من قام رمضان إیماناً و احتساباً غفر له ما تقدم من ذنبه) کەسێك شەوانی رەمەزان نوێژەکانی بەرێكو پێکی بکاو بڕوای تەواوی هەبیو بەهیوای پاداش بێ، خودا لەتاوانی لەوە پێشی خۆش دەبێ.

ئەمجار پەروەردگار پێغەمبەر هەڵدەنێ بۆ نوێژ کردن لەمزگەوتی قوباداو دەفەرموێ: ﴿لا تَقُمْ فِيهِ أَبَداً لَمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَنْ تَقُومَ فِيهِ﴾ بێگومان مزگەوتێك کە لەسەر تەقواو خوداپەرستی بنیات نرابیو لەیەکەم ڕۆژی دروستکردنیەوە بۆ نیازی پاکو مەبەستی پیرۆز دروستکرابیو موسوڵمانان تێیدا کۆببنەوەو خودا پەرستی تێدا بکەنو یەکتر بناسنو یەکیەتیو تەباییو برایەتی تێدا پەرە پێ بدەن، ئەوە شیاوی ئەوەیە: کە تۆ ئەی پێغەمبەر نوێژی تێدا بکەیو پێشنوێژی بۆ موسوڵمانان تێدا ئەنجام بدەی!

﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا﴾ لەو مزگەوتەدا چەند پیاوێکی موسوڵمانی تێدان، بەنوێژ تێداکردنو ذیکرو سوبحانەڵلا کردن ئاوەدانی دەکەنەوە، بەیانیو ئێواران خەریکی خوداپەرستی کردنن تێیدا! حەزیان لەپاکو خاوێنی جەستەو دڵو دەروونیانە، دەیانەوێ نەفسیان مشتو ماڵ بکەن، پیسی تاوانو خراپەکاری لێ بکەنەوە، پۆشاکو بەرماڵیان پاکو خاوێن بێ، تاراتو دەستنوێژو غوسڵیان ڕێكو پێکە. ﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ﴾ پەروەردگار ئەوانەی خۆش دەوێن کە زێدەڕەوی دەکەن لەپاککردنەوەو بەپاك ڕاگرتنی گیانو جەستەیان، چونکە پێیان وایە: پاکو خاوێنی جەستەو گیان کە ماڵی مرۆڤایەتی دەستەبەر دەکەن بۆیان. هەر لەم ڕوانگەوە پێیان ناخۆشە پۆشاکو جەستەیان پیسو چڵکن بن، هەڵبەتە زیاتر پێیان ناخۆشە کە دڵو دەروونیان بەتاوانو خراپەکاریو ڕەوشتی ناشیرین چڵکن بێ. خۆیان لەریاباز‌ییو بەخیلی دەپارێزن چونکە ئەوە ڕەوشتی دووڕووەکانە. سیاقی ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ: کە مەبەست بەو مزگەوتەی کە لەسەر بناغەی تەقواو

خوداپەرستی بنیات نراوە، مزگەوتی قوبایە، وەڵێ ئیمام ئەحمەدو موسلیم‌و نەسائی فەموودەیەکیان ریوایەت کردوە، دەفەرموون: پێغەمبەر ﷺ کە لەم بارەوە پرسیاری لێ کرا وەڵامی دایەوە کە مەبەست بەو مزگەوتە مزگەوتی خۆیەتی کە لەناو مەدینەدایە بەمزگەوتی پێغەمبەر بەناوبانگە. هەرچەندە ئایەتەکە مەنعی ئەوە ناکا: کە هەردو مزگەوتەکە (مزگەوتی قوباو مزگەوتی مەدینە) مەبەست بن، چونکە هەردوکیان لەسەر تەقواو خوداپەرستی بنیات نراون.

زومەخشەری دەڵێ: مانای ئەوە کە خۆپاککردنەوەیان پێخۆشە، واتە: پاکو خاوێنی هەڵدەبژێرن‌و سوورن لەسەر خاوێنی بەئەندازەی خۆشەویستی‌و حەزو نارەزو بۆ ئەو خاوێنییە. خۆشەویستی خوداش بۆ ئەوان ئەوەیە: لێیان رازییەو چاکەیان لەگەڵ دەکا.

دەڵێن: وەصفدارکردنیان بەرەوشتی پاکو خاوێنی لەم روەوە بووە: کە ئەوان بۆ دەست بەئاو گەیاندن لەپێشدا بەبەرد خۆیان پاک کردۆتەوە ئەمجار بەئاو خۆیان پاک کردۆتەوە.

خۆشەویستی خودا بۆ بەندەکانی بریتییە لەهەبوونی رەزامەندی لەکردارو هەڵوێستیان‌و قبووڵکردنی کردەوەکانیان‌و نزیک خستنەوەیان لەخۆی. چونکە پەروەردگار پاکو مونەززەهە لەوەی کە رەوشتی لەرەوشتی بەندەکانی بچێ، خۆشەویستی خودا جودایە لەخۆشەویستی بەندەکانی، خۆشەویستی خودا شتێکی وایە لایەق بەزاتی پاکی بێ. وەکوو لەحەدیثی قودسی دا هاتووەو بوخاری ریوایەتی دەکاو دەفەرموێ: (ولا یزال عبدي یتقرب الي بالنوافل حتى أحبه، فاذا أحببته کنت سمعه الذي یسمع به، و بصره الذي یبصر به).

ئەمجار بەرامبەری‌و هاوتەرازویەکی لەنێوان نیازی بنیاتنانی مزگەوتی قوباو مزگەوتی ضیراردا ئەنجامداو فەرمووی: ﴿أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَى تَقْوَى مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٍ خَيْرٌ أَمْ مَنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَى شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَانْهَارَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ﴾ ئایا

کەسێك بناغەی مزگەوتەکەی لەسەر تەقواو هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی ڕەزامەنـدی خودا دانابێ، چاکترە، یان کەسێك بناغەی مزگەوتەکەی لەسەر لێواری شیوێکی بـن هەڵۆڵی وا دانابێ کە نزیکە داڕوخێ؟ واتە: یەکسان نیە کەسێك بناغەی مزگەوتی داڕشتبێ لەسەر تەقواو خوداپەرستیو وەدەستهێنانی ڕەزامەنـدی خـودا، بناغەی مزگەوتی دانابێ لەسەر بناغەیەکی قایمو قوڵی سوود بەخش بۆ دونیاو قیامەت. لەگەڵ کەسێکدا: کە مزگەوتی ضیراری دروستکردبێ بەنیازی زیـان گەیانـدنو کوفرو بێدینیو لێك ترازانـدنی کۆمەڵی موسوڵمانانو چاوەڕوانی هاتنی سوپای دوژمن؟!!

ئەوانە دیواری باڵەخانەکەیان لەسەر لێواری شیوێکی بن هەڵۆڵی وا داناوە کە خەریکە داڕوخێ، هەر کە ڕوخا بەرەوو دۆزەخ تریێڵ بێ!

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار لەسەر شێوەی تەمثیل تەشبیهی شێوەی ئەهلی ئیخلاصو ئیمانی کردوە بەشێوەی کەسێك باڵەخانەیێك کە لەزەوی ساغو سەختدا لەسەر بناغەی قایمو قوڵو بەمەودای باشو بەپێی یاسای میعماریو بیناسازی دروست کرابێ، تەشبیهی هەیئەتی ئادەمیزادی دووڕوو بێ ئیمانو وەرەوخاوو خۆنەگری کردوە بەشێوەی پیاوێ خانوێك لەسەر قەراخی شیوێکی بـن هەڵۆڵی ڕوخەکی وا بنیات نێ کە خەریك بێ لەخۆیەوە هەرەس بێنیو داڕوخێ. ئیستعارەکە مەکنییەیە، بەم جۆرە تەقواو ڕیضوان شوبهێندراون بەخاکێکی قایمو سەختی وا کە بگونجێ بینای لەسەر رابیەسترێ، ئەمجار موشەبەهوبیهی حەزف کراوە ئاماژە بۆیەکێ لەقەرینەکانی کراوە کە (أسس)ەیە...

﴿وَاللَّهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ پەروەردگار هیدایەتی گرۆی ستەمکاران ناداو شارەزای ڕێبازی حەقو عەداڵەتیان ناکاو پشتگیریان لێ ناکاو سەرفرازو بەمرازگەییشتوو سەرکەوتوویان ناکا.

ئـەمجار پـەروەردگار رۆڵـی ناشـیرینی ئـەو مزگەوتـە درۆینەیـە دیـاری دەكـاو نیازو مەبەستە گلاوەكانی دووڕووەكان دەخاتـە روو، دەفـەرموێ: ﴿لا يَـزَالُ بُنْيَـانُهُمْ الَّذِي بَنَوْا رِيبَةً فِي قُلُـوبِهِمْ إِلاَّ أَنْ تَقَطَّـعَ قُلُـوبُهُمْ﴾ بـەردەوامو هەمیـشە دروسـتكردنو بنیاتنانی ئەو مزگەوتە درۆینەی بنیاتیان ناو دوایی روخێنـدرا، بوەتـە هـۆی شـكو گومـانی ئـەو مونافیقانـە دەربـارەی ئـایینو زیـادبوونی نیفاقیـانو ئـاخو كەسـەرە لەدڵیانداو ناسڕێتەوە، بەردەوامو هەمیشە گڕیو ژانە لـەدڵیانداو ناسـۆری جـەرگـو هەناویانـە، مەگـەر دڵـەكانیان پارچـە پارچـە بكـرێنو بمـرنو هەسـتو خۆسـتیان نـەمێنێ، ﴿وَاللَّـهُ عَلِـيمٌ﴾ پـەروەردگار ئاگـاداری كـرداری بەندەكانیـەتی ﴿حَكِـيمٌ﴾ خـاوەن حیكمـەتو داناییيـە لـەپاداشو سـزادانەوەیان بەچـاكە یـان بەخراپـە، بەشـێكیش لەحیكمـەتو دانـایی پـەروەردگار رونكردنـەوەی حـاڵو چـۆنیەتی مونافیقەكانەو دەرخستنی شتە پەنامەكیو نهێنییەكانیانە.

مەبەست بەئایەتەكە ئەوەیە: ئـەو بینایـەی كـە مونافیقـەكان بنیاتیـان نـاو دڵیان پێی خۆش بوو، سەرچاوەی گومان پەیدا كردن بوو بۆیان، نیشانەی ئەوەبوو: كە كوفرو نیفاق لەدڵیاندا رەگی داكوتابوو.

جا كاتێك پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد بەروخاندنو سوتاندنی ئـەو مزگەوتـە درۆینەو روخێندرا، زۆر لەسەر شانیان گران بوو، زیاتر رقیان لەپێغەمبـەر هەڵساو پتر گومانیان پەیدا كرد لەپێغەمبەرایەتیەكەیدا، تـرسو خۆفیـان لێ پەیـدا كـردو، كەوتنە گومانەوە دەربارەی هەڵوێستی داهاتووی پێغەمبەر دەربارەیان؛ ئایـا وازیـان لێ دێنێ یان شەڕیان لەگەڵ دەكاو قەلاچۆیان دەكا.

ئیتر خودی ئەو بینایە شكو گومان بوو چونكە هۆكـاری پەیـداكردنی گومـان بوو، كاتێكیش مزگەوتەكە روخێندرا زیاتر گومانیان لا پەیدا بوو.

**تێبینی :**

**ئایەتەکان زۆر حوکمیان لێ وەردەگیرێ هەرە گرنگەکانیان ئەمانەن:**

١- هەر مزگەوتێك دروستکردنی زیانبەخش بێ بۆ موسولمانان، یان بۆ ریبابازیی دروست کرابێ، دەچێتە خانەی مزگەوتی ضیرارەوە نوێژ کردن تێیدا دروست نیە. دروست نیە مزگەوت لەتەنیش مزگەوتی ترەوە بنیات بنرێ، ئەگەر بنیات نرا پێویستە بروخێندرێ، مەگەر شارۆچکەکە قەرەبالغ بی‌و مزگەوتێکیان بەس نەکا.

٢- زانایان دەفەرموون: کەسێك پێشنوێژی ستەمکارێك بێ دروست نیە نوێژی لەپشتەوە بکرێ مەگەر عوزری هەبێ یان تۆبە بکا، چونکە حەزرەتی عومەر لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا رێگەی نەدا موجەممەعی کوڕی جارییە بێتە پێنوێژی مزگەوتی قوبا، لەبەر ئەوە لەوەپێش ئیمامی مزگەوتی ضیرار بوو، پاشان کە عوزری هێنایەوەو عوزرەکەشی وێچوو بوو رێگەی دا ببێتە پێشنوێژی (قوبا).

٣- کە دەفەرموێ: ﴿وَتَفْرِيقاً بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە مەبەستی سەرەکی لەکۆبوونەوە بۆ جەماعەت لەمزگەوتدا یەکیەتی‌و تەبایی‌و برایەتی‌و وەگری بوونی یەکترییە، تا بەهۆی ئەم پێکەوە گونجانە دڵو دەروونیان صافو بێ گەردبێ.

تەنانەت ئیمام مالیك لەم ئایەتە ئەوەشی دەرهێناوە: کە دروست نیە لەیەك مزگەوتدا دوو جەماعەتی تێدا بکرێ، واتە: دوو پێشنوێژ بەجیا پێشنوێژی تێدا بکەن!!

٤- هەڵنانی موسولمانان بۆ پاکو خاوێنی مەعنەوی؛ واتە: پاك بوونەوەی دڵو دەروون لەحیقدو حەسەدو مشتو ماڵکردنی دڵو دەروونو بەهێزکردنی بیرو

باوەڕ. هەروەها پاكو خاوێنی جەستەو پۆشاك. چونكە پەروەردگار مەدحی ئەوانەی كردوە كە پاكو خاوێنیان پێ خۆشە.

**زانایانی شەرعزان دەربارەی لابردنی پیسو پۆخەڵی لەجەستەو پۆشاك سێ ڕایان هەیە:**

١- شافیعیو ئەحمەدو مالیك لەرایەكی دا دەفەرموون: لابردنی پیسی لەجەستەو پۆشاك پێویستەو بەپۆشاكی پیسەوە نوێژكردن دروست نیە.

٢- ئەبو حەنیفەو ئەبو یوسف دەفەرموون: ئەگەر پیسییەكە بەئەندازەی دیرهەمێك بوو دەبێ نوێژەكەی بگێڕێتەوە.

٣- ئیمامی مالیك لەرایەكی تریدا هاوەڵانی پێیان وایە لابردنی پیسی لەجەستەو لەپۆشاك سوننەتەو واجب نیە!

قورطوبی ڕای یەكەم پەسەند دەكاو دەڵێ ئەوە ڕاستو وێچووە، چونكە پێغەمبەر ﷺ بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕیو فەرمووی ئەم دوو كەسەی لەم دوو گۆڕەدا نێژراون سزا دەدرێن نەك لەسەر تاوانی گەورە، یەكەمیان فیتنە گێڕبوو، ئەویتریان لەمیز خۆی پاك نەدەكردەوە، كە میزی دەكرد باش خۆی پاك نەكردۆتەوە[١٣] هەڵبەتە ئادەمیزاد لەسەر پشت گوێ خستنی واجب سزا دەدرێ.

ئەبو بەكری كوڕی ئەبو شەیبەو ئەحمەدو ئیبنو ماجەو حاكم لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەكەن دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أكثر عذاب القبر من البول) زوربەی زۆری سزای ناوگۆڕ بەهۆی میزەوەیە.

ئەوانەی كە دەڵێن: پاككردنەوەی جەستەو پۆشاك لەپیسی سوننەتەو واجب نیە، بەڵگەیان ئەوەیە: كە پێغەمبەر ﷺ كاتێك لەنوێژدا بوو جوبرائیل پێی فەرموو: نەعلەكانت پیسیان پێوەیە، ئەویش تەشریفی نەعلەكانی داكەندو

---

([١٣]) ئەم فەرموودەیە بوخاریو موسلیم ریوایەتیان كردوە.

درێژەی بەنوێژەکەی دا، دوایی ئەو نوێژەی نەگێڕایەوە، کەوابێ ئەمە نیشانەی ئەوەیە: کە لابردنی پیسی لەجەستەو پۆشاك لەکاتی نوێژدا سوننەتەو واجب نیە، ئەگەر کاتیش بەبەریەوە مابوو وا باشە نوێژەکە بکاتەوە.

## ڕەوشتە بەرزەکانی موسوڵمانانی ڕاستگۆو ڕاستاڵ

﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ
وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ ۚ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ
فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ ۖ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ
وَٱلْإِنجِيلِ وَٱلْقُرْءَانِ ۚ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ ۚ
فَٱسْتَبْشِرُوا۟ بِبَيْعِكُمُ ٱلَّذِى بَايَعْتُم بِهِۦ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ
ٱلْعَظِيمُ ﴿١١١﴾ ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلْعَٰبِدُونَ ٱلْحَٰمِدُونَ
ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلْءَامِرُونَ
بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱلْحَٰفِظُونَ
لِحُدُودِ ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار ڕەوشتی دووڕووەکانی دەست نیشان کردن، کۆمەڵو

چینە کەمتەرخەمە موسوڵمانەکانی دیاری کردن دێتە سەر باسی حاڵو چۆنیەتی موسوڵمانانی راستاڵو راستگۆو خاوەن بیرو باوەڕی تۆکمەو تەواو کە سەردەستەی ئەو رەوشتە پەسندانە جیهادو تێکۆشانە.

راڤەکەرانی قورئان دەفەرموون: ئەم ئایەتە ئەو کاتە نازڵ بوو: کە حەفتا نەفەر لەیارمەتیدەران لەپەیمانی دووەمدا پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەر بەستو پەیمانەکە بە (بیعة العقبة الکبری) مەشهورە.

ئیبنو جەریری طەبەری هەروەها موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەظی لەعەبدوڵڵای کوڕی رەواحەوە دەگێڕنەوە: دەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەرم کرد (واتە: شەوی پەیمانی عەقەبە) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! مەرجی پەروەردگارو خۆت دەربارەی ئەم پەیمانە بفەرموو: بزانین چیتان لەئێمە دەوێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (اشترط لربي أن تعبدوه ولا تشركوا به شيئا، اشترط لنفسي أن تمنعوني مما تمنعون منه أنفسكم وأموالكم) وتیان: قوربان! جا کە ئەوەمان جێ بەجێ کرد چیمان دەدرێتێ؟ فەرمووی: (بەهەشت)، هەموو تێکرا وتیان: سەودایەکی باشەو قازانجە، هەرگیز لەم پەیمانە پاشگەز نابینەوە، پێیەوە پابەند دەبین، ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو[٤]: ﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ﴾ واتە: پەروەردگار گیانو ماڵو سامانی لەموسوڵمانان کڕیوە بەوە کە بەهەشتیان دەداتێ، لەپای گیانو سامانبەخشین بەهەشتیان پێشکەش دەکا.

---

([٤]) مامۆستا سەیید لێرەدا پەراوێزێکی نووسیوە، دەفەرموێ: ئێمە بەدووری دەزانین: کە ئەم ئایەتە لەو رۆژەدا (واتە: رۆژی ((بیعة العقبة الکبری)) نازڵ بووبێ، چونکە ئەو کاتە جەنگان لەدژی کافرو موشریکەکان پێویست نەکرابوو، ئایەتەکە بۆ خۆی مەدینەییە، روداوی پەیمانی عەقەبە پێش کۆچ کردن بووە. بەڵام مەفهومی ئایەتەکە لەگەڵ مەفهوومی پەیمانەکە یەك دەگرنەوە. (في ظلال ج٤/٣١٥).

ئایەتەکە ئیستیعارەو تەمثیلە موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ جیهادو تێکۆشان. بەم شێوازو چەمکەیە پەروەردگار تەعبیر لەهەڵوێستی موسوڵمانان دەداتەوە: کە گیانو ماڵیان لەپێناو ئایینی ئیسلامدا دەبەخشنو ئەویش لەڕووی کەرەمو ئیحسانەوە بەهەشتیان دەداتێ، ئەگینا لەراستیدا گیانەکانو سامانو هەموو شتێك هی خودایە، خۆی خاوەنی بەهەشتو گیانی موسوڵمانانو سامانیو هەموو شتێکە... پەروەردگار بەسەماحەتو بەخشندەیی خۆی گیانو ماڵێك کە خۆی بەخشیویەتی دەیکڕێتەوەو تایبەتی دەکا بەخۆیەوە، کەوابێ موسوڵمانان گیانو سامانی خۆیان بەخودا فرۆشتووە، هیچیان نەماتەوەتەوە بیبەخشن، سەوداو مامەڵەیەکە پەروەردگار لەنێوان خۆیو بەندە موسوڵمانانەکانیدا ئەنجامی داوە، کڕیارە کە خودایە، بەویستی خۆی چۆنی بوێ ئاوا تەصەرووفی تێدا دەکا، فرۆشیار هیچی بەدەست نیە جگە لەوەی ڕێبازی بۆ دیاریکراوی خۆی بگرێو ئەملاو ئەولا نەکا، موناقەشەو رەخنەگر نەبێ، جگە لەفەرمانبەرداری و تەسلیم بوون هیچی تر نەکا، بەهاو نرخی وەری دەگرێ بەهەشتە، ڕێگا جیهادو تێکۆشانو شەڕو جەنگە، ئاکامیش یان سەرکەوتنو دوژمن شکاندنە، یان شەهید بوونە، هەردووکیشیان پیرۆزو سەروەریین.

ئەمجار هۆی مامەڵەکەو چۆنیەتی گیان فرۆشتنی موسوڵمانان کە گیانو ماڵی خۆیان بەبەهەشت دەفرۆشن روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّـهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ﴾ لەرێگەی خودادا شەڕ دەکەن، لەپێناو بەرز کردنەوەی ئاییندا دەجەنگن، دوژمنان دەکوژن، یان بۆ خۆیان شەهید دەبن، جا چ بکوژن یان شەهید بکرێن یان بکوژنو شەهیدیش بن، ئەوە بەهەشتیان بۆ ئامادە کراوە. ﴿وَعْداً عَلَيْهِ حَقّاً فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ﴾ پەروەردگار وادەی بەهەشتی پێداون، لەسەر خۆی پێویست کردووەو کردویەتی بە مافێکی چەسپاو بۆیانو لەتەوراتو ئینجیلو قورئاندا ئەم وادەیەی داوەو ئەم حەقیقەتەی چەسپاندوە، جا ئەگەر تەوراتو

ئینجیل لێیان فەوتابێو گۆڕانکارییان تێدا کرابێ ئەوە چ زیانێکی نیە، چونکە لەقورئاندا چەسپاوە!!

﴿وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللَّهِ ؟﴾ کێ لەخودا باشتر وەفا بەبەڵێنی خۆی دەکاو زیاتر پابەندی بەڵێنەکانیەتی، واتە: کەس بەئەندازەی خودا لەوادەدا راستگۆ نیە، کەس ئەوەندەی خودا پابەندی بەڵێنەکانی نیە، هەرگیزاو هەرگیز پەروەردگار خیلاف وادە نابێ. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ حَدِيثاً﴾النساء/٨٧ یان دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلاً﴾النساء/١٢٢، ئەم جۆرە ئوسلووبە کاتێك بەکار دەهێندرێ کە زێدە دڵنیایی هەبێ لەراستی قسەکەو زێدە رۆیی بکرێ لەحەقو راستی مەسەلەکەدا.

جا کە وەفا بەعەهدو پەیمان بەم شێوەیە جەختی لەسەر کرایەوەو پابەندبوون بەوادە کە ئاوا مسۆگەر بێ ﴿فَاسْتَبْشِرُوا بِبَيْعِكُمْ الَّذِي بَايَعْتُمْ بِهِ﴾ مزگێنی بدەن، کەیفخۆشی دەربڕن: بەوەی کە نەفسو ماڵی خۆتان بەخودا بەخشیوەو لەشوێنیدا بەهەشتتان وەرگرتووە، ئێوە سوودمەندن، چیتان لەکیس چووە؟ موسوڵمان ئەگەر گیانو ماڵ لەپێناو ئاینی خودادا ببەخشیو بەهەشت وەربگرێ، چی لەکیس چووە؟ هیچی لەدەست نەچووە، گیان هەر دەمریو ماڵ دەفەوتێ، خاوەنەکەیان لەپێناو ئایینی خودادا بیانبەخشێ، یان لەپێناو شتێکی دیدا بیانبەخشێ هەر دەفەوتێن. کەوابێ: لەراستیدا خودا بەهەشت بەخۆڕایی دەبەخشیو بەبێ موقابیل دەیدا بەبەندەکانیو بەمەحضی فەضلو ئیحسانی خۆی لەئاکامی بەخشینی گیانو ماڵدا: کە دوو شتی پایەدار نین بەهەشتی بەردەوامو پایەداریان پێ دەبەخشێ ﴿وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ ئەو بەمراز گەیشتنە بەمراز گەیشتنێکی گەورەو مەزنەو نازو نیعمەتێکی هەتا هەتاییو نەبڕاوەیەو هیچ بەمراز گەیشتنێکی تری ناگاتێ!!

جیهادو تێکۆشان لەپێناو ئایینی خودادا بەیعەتو ئەرکێکە لەگەردنی هەموو موسوڵمانێکدایە، هەر لەو رۆژەوەی خودا پێغەمبەرانی ناردوونو ئایینی خودا لەئارادایە تاکۆتایی دونیا ئەم ئەرکە بەردەوامە...

بەڵام پێویستە ئەوەندە بزاندرێ کە جیهاد لەپێناو ئایینی خودادا بریتی نیە لەوە: کە کابرا بچێ بۆ شەڕو جەنگ، بەڵکوو جیهاد لوتکەیەکە لەسەر بنەمای بیرو باوەڕی تۆکمەی وا دادەمەزرێ کە لەهەستو شعوورو شیعارو ئەخلاقو کردارو گوفتاردا رەنگ بداتەوە. ئەو موسوڵمانانەی: کە خودا پەیمانی لەگەڵ بەستوونو بیرو باوەڕی تۆکمەو پتەویان هەیە کەسانێکن رەوشتی ئیمانییان تێدا بەرجەستەبووە...!!

ئەو موسوڵمانانەی گیانوماڵیان لەپێناو ئایینی خودادا دەبەخشن ﴿التَّائِبُونَ﴾ ئەو کەسانەن: کە تۆبەیان لەتاوانی رابوردویان کردوە، بەراستی بۆ لای خودا گەڕاونەوە، وازیان لەتاوان هێناوەو پەشیمانن لەهەڵوێستی رابردوویان، کردەومیان باشەو پابەندی فەرمانو جڵەوگیریەکانی ئایینن، خۆیان لەتاوان پاك کردۆتەوە، رویان لەپەروەردگارەو راستاڵو صاڵحن!

﴿الْعَابِدُونَ﴾ بەندایەتیو روتێکردنو گەردنکەچییان هەر بۆ پەروەردگارە، دان بەخودایەتیو پەروەردگاریەتی زاتی حەقدا دەنێن، هەموو کردارو گوفتارێکیان بۆ خودایەو مەبەستیان رەزامەندی ئەوە.

﴿الْحَامِدُونَ﴾ بەدڵو زوبان سوپاسگوزاری پەروەردگارن، لەخۆشیو ناخۆشیدا شوکرانەژمێرنو سوپاسگوزارن؛ لەخۆشیو نازو نیعمەتدا سوپاسی نیعمەتەکانی دەکەن، لەسەر ناخۆشیو بەڵاو موصیبەت سوپاسی ئەوەی دەکەن کە خودا بەتاقییان دەکاتەوە، هەست دەکەن کە خودای بەزەییو دادپەروەر کە بەندەی خۆی بەتاقی دەکاتەوە بۆ خێرو بەرژەوەندی بەندەکانە: کە خودا بۆ خۆی دەزانیو ئەوان نایزانن.

﴿السَّائِحُونَ﴾ دەربارەی مانای ئەم وشەیە راڤەکەرانی قوران تەفسیری جیاجیایان هەیە:

ریوایەتی وا هەیە، دەڵێ: ئەوانە کۆچکارانن، هەیە دەڵێ: مانای تێکۆشەرو موجاهید دەگەیەنێ، ریوایەتی واش هەیە دەڵێ: مەبەست ئەو قوتابیو فەقێیانەن کە بەشوێن عیلمو زانیاریدا وێڵی هەندەران دەبن. هەشە دەڵێ: مەبەست رۆژوانەکانە.

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: مەبەست ئەوانەن کە بیر لەبوونەوەر دەکەنەوە، خەیاڵو هەستو شعووری خۆیان دەخەنە کار بۆ تێفکرین لەردوستکراوانی پەروەردگار! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەربارەی وێنەی ئەو خوداپەرستە بیرکەرەوانە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ، الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ...الآية﴾

پاش تۆبەو پەشیمانیو بەندایەتیکردنو سوپاسگوزاری جەوەکە وا دەخوازێ کە مانای ﴿السَّائِحُونَ﴾ بەو شێوەیە بکەین:

هەڵبەتە وێڕای تۆبەو بەندایەتیکردنو سوپاسگوزاری، بیرکردنەوە لەمەلەکووتی پەروەردگار وا لەئادەمیزاد دەکا کە بەتەواوی خۆبخاتە پەنا پەروەردگارەوەو خۆی پێ بسپێریو تێ بگا خودا بۆچی ئەم دونیایەی هێناوەتە کایەوەو ئەو حەقیقەتو راستییە بزانن: کە خودا بوونەوەری پێ هێناوەتە وجود! بەوەش رازی نەبن کە تەمەنی خۆیان خەرج بکەن لەتێفکرینو بیرکردنەوەداو بەس! بەڵکوو بۆ ئەوەی لەسەر بنەمای ئەو هەستو شعوورە ژیان بنیات بنێنو وڵات ئاوەدان بکەنەوە!

﴿الرَّاكِعُونَ السَّاجِدُونَ﴾ ئەو موسوڵمانانەی کە نوێژەکانیان ئەنجام دەدەنو نوێژکردن بووتە رەوشتێکی سروشتیو رکوعو سوژدە بردن لێیان بووتە دیاردەیەکی تایبەتیو جیاکەرەومیان لەخەڵکی تر.

﴿الآمِرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّاهُونَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ فەرمان دەکەن بەچاکەو نەهی دەکەن لەخراپە..!

ئەمە لەکاتێکدا کە کۆمەڵگایەکی موسوڵمان دروست دەبیو بەندایەتی تەنها بۆ خودا دەکریو کاروبار بەگوێرەی قانوونو شەریعەتی خودا ئەنجام دەدرێ، ئەو کاتە فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە ئاراستە دەکرێ بۆ راستکردنەوەی هەندێ هەڵەو خوارو خێچی کە لەناو کۆمەڵگاکەدا پەیدا دەبن.

بەڵام کاتێك لەسەر زەویدا کۆمەڵگایەکی موسوڵمان نەبێ، حکومەتێك نەبێ کار بەشەریعەتی خودا بکاو حاکمییەتو ربووبییەت بۆ خودا بەرجەستە نەبێ، ئەوە لەو کاتەدا فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە دەبێ بۆ چەسپاندنی ئولوهیەتو دامەزراندنی حکومەتی ئیسلامی ئاراستە بکرێ.

دەبێ فەرمان بەچاکە بۆ دامەزراندنو چەسپاندنی شەریعەت خودا بیو نەهی لەخراپە بۆ قەڵاچۆکردنی حوکمی طاغوتو ملهوڕەکان بێ، واتە: دەبێ ئامانجو مەبەستە سەرەکییەکە لەو کاتەدا بەفەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە بۆ ئەو کارە گرنگە ئاراستە بکریو هێزو تواناکان بۆ ئەو دەستکەوتە گەورەیە بخرێنە کار.

دەبێ فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە لەئومووری فروعیاتدا چ سودێکی هەبێ ئەگەر کۆمەڵگاکە کۆمەڵگایەکی موسوڵمان نەبوو، کار بەشەریعەتی خودا نەدەکرا.

بۆ نموونە ئەگەر وڵاتی ئیسلام کەوتە ژێر دەستی کوفرەوە یان ئابڵوقە دراو ترسی داگیرکردنی هەبوو، ئالەم کاتەدا ئەگەر کۆلکە شێخێك یان مەلایەك لەجیاتی ئەوەی بانگی جیهاد هەڵداو گیانی بەرگریو خۆفیداکردن لەناو موسوڵماناندا بوروژێنیو هەڵیان نێ بۆ جیهادو تێکۆشانو دامەزراندنی حکوومەتی ئیسلامیو کارکردن بەشەریعەتی خودا...هتد ئەگەر لەجیاتی ئەوە چەند موسوڵمانێکی سافیلکە بباتە کونجی مزگەوتێکەوە، تەکیەو خانە قایکەوەو فێری فروعاتی ئایینیان بکا دەبێ ئەو کابرا لەئایین تێنەگەیشتووە چ سوودێکی هەبیو تا چ ئەندازەیەك پەیڕەوی پێغەمبەرو هاوەڵانی کردبێ؟!!

پێغەمبەرو هاوەڵانی جیهادیان کردو تێکۆشان بۆ دەمەزراندنی فەرمانڕەوایی خوداو کارکردن بەیاسای یەزدان، جا کە ئەمەیان بۆ دەستەبەر بوو، ئەمەیان چەسپاند، ئەمجار گرنگییان بەفەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە لەفروعییاتدا دەست پێ کرد.

﴿وَالْحَافِظُونَ لِحُدُودِ اللَّـهِ﴾ ئەوانەی پارێزگاری سنوورەکانی خودا دەکەن، هەوڵ دەدەن یاسای خودا لەخۆیانداو لەخەڵکی تردا تەنفیذ بکەن، بەرگری بکەنو نەهێڵن یاساکانی یەزدان بەفیڕۆ بچن یان دەستدرێژییان بکرێتە سەر.

ئەم بەندەش وەکوو بەندی (فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە) پێویستە لەکۆمەڵگایەکی موسوڵماندا ئەنجام بدرێ، کۆمەڵگای موسوڵمانیش کۆمەڵگایەکە شەریعەتو یاسای خودا تێیدا بەرقەرار بێ، ئولوهییەتو ربوبییەت تەنها بۆ خودا پەیڕەو بکرێ، هەموو حوکمو قانوونێکی ملهوڕو ستەمکاران ڕەت بکرێتەوە، کەوابوو پێویستەو ئەرکی سەرشانی هەموو موسوڵمانانە: کە هەموو هێزو توانای خۆیان بۆ وەدی هێنانی کۆمەڵگای موسوڵمان بخەنە کارو هەوڵی دروستکردنی حکومەتی ئیسلامی بدەن، ئیتر ئەو کاتە ڕێگا خۆش دەبێ بۆ پارێزگاری سنوورەکانی پەروەردگارو تەنفیذ کردنی هەموو فەرمانو چڵەو گیریەکانی!

ئائەمەیـە: کۆمـەڵی موسـوڵمانو گـرۆی خوداپەرسـت، ئـەو کۆمەڵـەی خـودا سـەوداو مامەڵـەی لەگـەڵ کـردونو گیـانو مـاڵی لێ کڕیـون بەبەهەشـت!! ئەمەیـە ڕەوشـتو نیشانەی ئەو کۆمەڵە موسوڵمانەی: کە خودا گیانو ماڵی لێ کڕیون: تۆبـەو پەشیمانیو گەڕانەوە بۆ لای خودا، خوداپەرستیو پەیوەنـدی هەمیـشەیی بـەخودا، سـوپاسو شـوکرانە ژمێـری لەخۆشـیو نـاخۆشیدا، تێفکـرینو وردبوونـەوە لەبوونـەوەرو گەشـتو گـوزارکردن بـەناو زەویداو، فـەرمانکردن بەچـاکەو نـەهی لەخراپە، پارێزگاریکردنی سنوورەکانی خودا!!

لەڕوانگەی ئیسلامەوە.. ژیان گاڵتـەو گـەپ نیـە، خـواردنو لـەززەت وەرگـرتن نیـە، حیـزیو سـەلامەتی نیـە، بـەڵکوو ژیـان لەڕوانگـەی ئیـسلامەوە بریتییـە لەتێکۆشـان لـەپێناو چەسـپاندنی حـەقو ڕاسـتیدا، بـۆ دەسـتەبەر کردنـی خێـرو خۆشیو سەرخستنی وشەی (لا اله الا الله)و خۆ بەخت کردن لەپێناو ئایینی خودادا ئەمجار بەمرازگەییشتنو بەبەهەشت شادبوون! ئائەمەیە: ئـەو ژیانـەی پـەروەردگار فەرمان بەبەندەکانی دەکا: کە بەپیریەوە بچن ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَجِيبُواْ لِلّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُم لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾ دەی کەوابێ ﴿وَبَشِّرْ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئـەی پێغەمبـەر! مزگێنـی بـدە بـەو موسـوڵمانانەی ئـەوە ڕەوشـتو هەڵوێـستو کـردارو گوفتاریانـە، موژدەیان بدەرێ بەخێرو خۆشی دونیاو قیامەت!

## حوکمی داواکردنی لێخۆشبوون بۆ موشریکەکانو مەرجی سزادان لەسەر تاوان

﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ

أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ
إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ
لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ ۚ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾ وَمَا
كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًۢا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم
مَّا يَتَّقُونَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۚ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ
ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١١٦﴾

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایاتانە ئیمام ئەحمەدو موسلیمو بوخاریو ئیبنو شەیبەو ئیبنو جەریرو هی تریش لەرێگەی سەعیدی کوڕی موسەییەب ئەویش لەباوکییەوە دەڵێ: کاتێك مەرگ لەئەبو طالیب نزیك بووەوە پێغەمبەر ﷺ دیدەنی کرد، لەو کاتەدا ئەبو جەهلو عەبدوڵلای کوڕی ئەبی ئوبەی لای بوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مامە! بڵێ: (لا الـه الا الله) تا رێگەم بێ لای خوای گەورە شەفاعەتت بۆ بکەم، ئەبو جەهلو عەبدوڵلا وتیان: ئەی ئەبو طالیب! تۆ چۆن دڵت بڕوا دەدا واز لەئایینی عەبدولموطەلیب بێنی؟؟ ئیتر ئەم مەلعوونانە وازیان لێ نەهێناو هەر قسەیان بۆ کرد تا گیانی دەرچوو بەموشریکی مرد. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم بەمەرجێ جڵەوگیریم لێ

نەکرێ: ئیتر ئایەتی ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ...الآية﴾ نازڵ بوو.

بەڵام لێرەدا شتێك هەیە پێویستە ئاماژەی پێ بکرێ، ئەویش ئەوەیە: ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، ئایەتەکە مەککەیی بێ چونکە ئەبو طالیب بەسێ ساڵێك پێش کۆچ مردوە، جا چونکە ئەم سورەتە هەمووی مەدینەییە برێ لەزانایان بەدووریان زانیوە: کە ئەم ئایەتە لەبارەی ئەبو طالیبەوە نازڵ بووبێ!!

تیرمیذی ریوایەتێکی لەئیمام عەلییەوە هێناوەو حاکم پەسەندی کردوە، ئیمام عەلی دەفەرموێ: ژنەوتم پیاوێك داوای لێخۆشبوونی بۆ باوکو دایکی دەکردو هەردوکیشیان کافر بوون، جا ئیمام دەفەرموێ: بەکابرام وت: ئەوە تۆ چۆن داوای لێخۆشبوون بۆ باوکو دایکت دەکەی لەکاتێکدا ئەوان موشریکن؟؟

لەوەڵامدا کابرا وتی: ئەی ئەوە نیە حەرزەتی ئیبراهیم دوعای لێخۆشبوونی بۆ باوکی کرد لەکاتێکدا باوکی موشریك بوو!! جا ئەمەم بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە ئیتر ئایەتی ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ...﴾ هاتە خوارێ..!

حاکمو بەیهەقی لەدەلائیلداو هی تریش لەئیبنو مەسعودەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: رۆژێك پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ گۆڕستانو لای گۆڕێك دانیشتو زۆر پاڕایەوە، پاشان گریاو منیش دەستم کرد بەگریان. فەرمووی: ئەم گۆڕەی لای دانیشتوم گۆڕی دایکم بوو، داوای روخصەتم کرد لەخوا بۆی بپاڕێمەوەو داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەم، بەڵام خودا رێگەی نەدام، ئیتر ئایەتی ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ...﴾ نازڵ بوو.

ئەحمەدو مەردەویهی دەگێڕنەوە: لەبورەیدەوە کە دەفەرموێ: لەخزمەت پێغەمبەردا بووم، کاتێك لەسەر (عوسمان) راوەستاو گۆڕی دایکی چاو پێکەوت،

دەستنوێژی گرتو نوێژی کردو گریا، پاشان فەرمووی: داوام لەپەروەردگار کرد کە رێگەم بدا داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەم، کەچی جڵەوگیریم لێ کرا!! ئەمجار ئایەتی ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ...﴾ نازڵ بوو.

ئەحمەدو موسلیمو ئەبوداوود لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ هاتە سەرگۆڕی دایکیو گریاو ئەوانی لەدەوروپشتی بوون هەموویان گریان، پاشان فەرمووی: داوام کرد خودا رێگەم بدا داوای لێخۆشبوون بکەم بۆ دایکمو ئیزنی نەدام، داوام کرد رێگەم بدا دیدەنی گۆڕەکەی بکەم، ئیزنی دام، ئێوەش ئەی موسوڵمانینە! دیدەنی گۆڕستان بکەن چونکە دیدەنی گۆڕستان مردنتان یاد دەخاتەوە!

ریوایەتەکان ئەوە دەگەیەنن کە هۆی نازڵبوونی ئایەتەکە ئەبو طالیب یان دایکی پێغەمبەر ﷺ یان پیاوێکی موسوڵمان بووبێ: کە داوای لێخۆشبوونی بۆ باوکو دایکی کردوە کە کافر بوون.

ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دەفەرموێ: وێ دەچێ هۆکاری نازڵبوونی ئایەتەکە پێشکەوتبێ، وەکوو چیرۆکی ئەبو طالیب یا دواکەوتبێ وەکوو چیرۆکی ئامینەو چیرۆکی عەلی.

هەندێکیش پێیان وایە: کەوێ دەچێ هۆکاری نازڵبوون زیاد لەهۆکارێك بێ.

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە ئەوەیە: دەڵێن: سورەتی (براءة) لەسەرەتاوە تا ئێرە لەتەوەرەی راگەیاندنی دەستبەردانو دابڕان لەکافرو مونافیقدا دەسووڕێتەوە، ئەمجار لێرەدا ئەوە روون دەکاتەوە، کە پێویستە بەرائەت لەمردووەکانیشیان رابگەیەندرێ، تەنانەت ئەگەر ئەو مردووە کافر، یان ئەو مونافیقە مردوە نزیکترین کەس بێ وەکوو باوکو دایکو مام. مەبەستەکە ئەوەیە کە لەهەموو حاڵێکدا پێویستە موسوڵمان خۆیان لێ دووربخاتەوەو بەرائەتیان لێ

رابگەیەنیٚ!! دەفەرمویٚ: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ﴾ شیاو نیە بۆ پێغەمبەرو موسوڵمانان کە داوای لێخۆشبوون بۆ موشریكو کافر بکەن.. واتە: ئەوە ئیشی ئەوان نیە کە داوای لێبوردن بۆ موشریکەکان بکەن واتە: شتی وا ناکەن. ئەمە ئەگەر رستەی (ماکان) مانای نەفی لیٚ بدەینەوە. ئەگەر رستەی (ماکان)بۆ نەهی بیٚ، ئەو کاتە ماناکەی بەم جۆرە دەبیٚ، رەوا نیەو نابیٚ پێغەمبەرو موسوڵمانان داوای لێخۆشبوون بۆ موشریك بکەن، چونکە پێغەمبەریٚتیو ئیمان رێگە نادەن داوای لێخۆشبوون بۆ موشریك بکریٚ، ﴿وَلَوْ كَانُوا أُوْلِي قُرْبَى﴾ با ئەو کافرو مونافیقانە خزمو کەسو کاری نزیکیش بن بۆ دوعا گۆیەکان؛؛!

ئەمجار هۆی نەهی لەداوای لێخۆشبوونەکە روون دەکاتەوەو دەفەرمویٚ: ﴿مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴾ واتە: داوای لێخۆشبوون بۆ کافرو موشریکەکان ناکەن، یا با داوای لێخۆشبوونیان بۆ نەکەن پاش ئەوەی بۆیان دەرکەوت، کە ئەو موشریکانە پێرو تاقمی دۆزەخنو بەموشریکی دونیایان جیٚ هێشتووەو بەکافریی سەریان ناوەتەوە، چونکە خودا بۆ خۆی بریاری داوە: کە لەموشریكو کافر خۆش نەبیٚ، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاءُ﴾النساء/١١٦

خاوەنی تەفسیری بەیضاوی دەفەرمویٚ: ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەرئەوە: کە دروستە داوای تۆفیقو هیدایەت بۆ کافری زیندو بکریٚ، بەمەش دژایەتی رواڵەتی نێوان ئەم ئایەتەو ئایەتی داوای لێخۆشبوونی حەزرەتی ئیبراهیم بۆ باوکی دەرەوێتەوە: کە لەخودا پاڕایەوەو وتی: ﴿واغفر لأبي إنه كان من الضالين﴾الشعراء/٨٦ واتە: خودایە! هیدایەتی بدەو دڵی نەرم بکە ئیمان بێنیٚ، ئەم دوعا کردنەشی بەهۆی ئەوەبوو: لەوەپێش وادەی پێدا بوو، هێشتا خودا جڵەوگیری لیٚ نەکردبوو ئەم بەڵێنی پیٚ دابوو کە دوعای بۆ بکا: وەکو دەفەرمویٚ: ﴿سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّي إِنَّهُ كَانَ بِي حَفِيّاً﴾ مریم/٤٧، واتە: من هەر ئەوەندەم لەدەست دیٚ دوعات

بۆ بکەمو داوای لێخۆشبوونت بۆ لەپەروەردگار بکەم، ڕەوشتی ئیبراهیمیش بریتی بوو: لەوەفا بەوەعدو بەڵێنی خۆی، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّى﴾النجم/٣٧، بۆیە لێرەدا وەکوو وەڵام بۆ پرسیارێکی مەزندەکراو دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لأَبِيهِ إِلاَّ عَنْ مَوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ﴾ داوای لێخۆشبوونی ئیبراهیم بۆ باوکی لەبەر وادەو بەڵێنێك بوو: کە پێیدا بوو، وتبووی: داوای لێخۆشبوونو هیدایەتت بۆ دەکەم، لەپەروەردگارم دەپاڕێمەوە هیدایەتت بدا!!

بەڵام ﴿فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ﴾ کە بۆ ئیبراهیم دەرکەوت کە باوکی دوژمنی خودایە، بەم جۆرە بەکافری مردبێ، یان خودا نیگای بۆ کردبێو پێی ڕاگەیاندبێ کە باوکی ئیمان ناهێنێو بەکافری دەمرێ، خۆی لێ بێ بەری کردو بەخەی خۆی لێ هەڵتەکاند، داوای لێخۆشبوونی بۆ نەکردو وازی لێ هێنا، ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لأَوَّاهٌ حَلِيمٌ﴾ بێگومان ئیبراهیم زۆر دڵ نەرمو بەبەزەییو دوعا گۆو لەخودا ترسو خۆڕاگرو بەصەبر بوو. ویڕای ئەوەی باوکی ئەزیەتیداو دوژمنایەتی کردو هەڕەشەی لێ کردو پێی گوت: ﴿قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ آلِهَتِي يَا إِبْرَاهِيمُ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَاهْجُرْنِي مَلِيّاً﴾مريم/٤٦، کەچی ئیبراهیم وادەی پێدا دوعای لێخۆشبوونو هیدایەتدانی بۆ بکات!

ئەمجار پەروەردگار ئەوەی ڕاگەیاند: کە ئەوانەی لەوەپێش داوای لێخشبوونیان بۆ موشریکەکان کردووە بەتاوانباریان حلێب ناکاو لێیپێچینەوەیان لەگەڵدا ناکا لەسەر ئەو کارەو فەرمووی: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْماً بَعْدَ إِذْ هَدَاهُمْ﴾ دابو نەرێتی خودا وا جاری نەبووە لەبوونەوەردا، حیکمەتو دانایی خودا وا نیە: کە گەلو هۆزێك بەگومڕا دابنێو حوکمی تاوانبارو خراپەکاریان بەسەردا بدا، سزاو عیقابی گومڕاییان بەسەردا بدا پاش ئەوەی خودا بەرەحمەتی خۆی هیدایەتی دان بۆ ئیسلامو خوداناسین، هەتا پێیان ڕانەگەیەنێ کە فلان کار حەرامو

یاساغەو پێویستە خۆی لێ بپارێزنو جڵەوگیریان لێ نەکا، لەسەر کردنەکەی سزایان نادا، دابو نەرێتی خودا وا باوە کەس سزا نەدا ﴿حَتَّى يُبَيِّنَ لَهُمْ مَا يَتَّقُونَ﴾ هەتا ئەوەی پێویستە خۆی لێ بپارێزن بۆیان روون نەکاتەوەو پێیان رانەگەیەنێ کە فلان گوفتار یاساغەو فلان هەڵوێستو فلان کردار مەمنوعە سزاو تۆڵە تاستێنێ، عوزرو بیانووی بەندەکانی دەبڕێ ئەمجار سزاو تۆڵە دەخاتە کار!!

﴿إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ دڵنیابن پەروەردگار زانایە بەهەموو شتێکو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا، حاڵو چۆنیەتی بەندەکانی دەزانێ، دەزانێ پێویستیان بەچ روون کردنەوەیەك هەیەو، هەر شتێك پێویستی بەروون کردنەوەو شیکردنەوە بێ بەدەقیکی ئاشکراو بێ پێچو پەنا روونی دەکاتەوەو تێیان دەگەیەنێ بۆ ئەوەی هەرکەسەو بەئارەزووی خۆی حوکم دەرنەکاو هەڵوێست نەنوێنێ! هەر لەم روانگەوە بوو: حەزرەتی ئیبراهیم بەتاوانبار حسێب نەکرا: کە داوای لێخۆشبوونی بۆ باوکی کرد پێش روون بوونەوەی ئاکامو سەرەنجامی، هەروەها پێغەمبەرو موسوڵمانانیشی سەرکۆنە نەکردو بەسەرپێچیکاری لەقەڵەم نەدان چونکە داوا کردنەکەیان پێش روون کردنەوەکە بووە پێش یاساغ کردنو جڵەوگیرییە ئاسمانیەکە بوو!! دەی ئەمە بەئاشکرا ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە بێ ئاگاو ئەهلی فیترەت؛ ئەوانەی پەیامی پێغەمبەریان پێ نەگەییشتبێ موکەللەفو بەرپرس نین. ئیتر لەم روانگەوە بەدوور دەزاندرێ کە هۆکاری نازڵبوونی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکە داواکردنی پێغەمبەر بووبێ بۆ لێخۆشبوون لەدایکی، چونکە خاتوو ئامینە (دایکی پێغەمبەر ﷺ) لەسەردەمی نەزانیدا سەری ناوەتەوەو پێش هاتنی ئایینی ئیسلامو بەپێغەمبەر بوونی حەزرەتی موحەممەد لەدونیا دەچووە. دەی خۆ پەروەردگار بەروونی لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾ الأسراء/١٥.

دوای ئـەوەی پـەروەردگار فـەرمانی کـرد لەدەسـتبەردان لـەکافرو موشـریك، ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە: کە کۆمـەکیو یارمـەتی هـەمووی لەلایـەن خوداوەیـە، هەردەبێ لەخودا داوای سەرکەوتنو پیرۆزیی بکرێ، چونکە سەڵتەنەتو دەسـەڵاتو فـەرمانڕەوایی ئاسمانـەکانو زەوی هـەمووی بەدەسـت خودایـە، جـا کـە خـودا یارمەتیـدەرو کۆمـەکیکار بـێ بـۆ موسـوڵمانان، ئـیتر کـافرو موشـریکەکان نـاتوانن زیانیان پێ بگەیەنن! دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾ بێگومـان پـەروەردگار خـاوەنی هـەموو بوونـەوەرە، هەرچـی مڵـكو سـەڵتەنەتی ئاسمانـەکانو زەوی هەیـە، هـەر هـی خودایـە، هـەر ئـەو هەڵـسوڕێنەرو راگـری بوونەوەرە، هەموو شتێك بەدەست خۆیـەتی؛ دەژێنـێو دەمرێنـێ، هەرچی بیـەوێ دەیکا، هەر ویستی ئەو دێتەجێو کەس ناتوانێ حوکمی ئەو هەڵبوەشێنێتەوە ﴿وَمَا لَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلا نَصِيرٍ﴾ پشتگیریو کۆمـەکیتان هـەر لـەخوداوە بـۆ دێ، کەوابێ یەخەی خۆتان لەو کافرو خوانەناسانە هەڵتـەکێننو دەسـتبەرداریان بـبن، هـیچ هێـواو هومێـدێکتان بـەوان نـەبێ، خزمایـەتیو پەیوەنـدی ئـەوان وەلابنـێنو ئیهمالیان بکەن، ئێوە جگە لەخودا کەسی تر یارمەتیدەرو فریادڕەستان نیە!!

**تێبینی:**

**ئایەتەکان ئەم حوکمانەیان لێ وەردەگیرێن:**

١- هەرکەسـێ بـەکافری بمـرێ، نابـێ دوعـای لێخۆشـبوونی بـۆ بکـرێ، نابـێ بەنازناوی خوالێخۆشبوو مەرحووم فلانو شەهید فلان ناوی ببرێ.

٢- پێویستە موسوڵمان یەخەی خۆی لەکافرو موشریك هەڵتەکێنێ بەزینـدوو مردوویانــەوە، چـونکە خـودا رێگـەی نــەداوە موسـوڵمانان داوای لێخۆشـبوون بـۆ موشریکەکان بکەن.!

پێغەمبەر ﷺ رۆژی جەنگی ئوحود کە ددانی پیرۆزی شکاو دەمو چاوی بریندار بوو فەرمووی: (اللهم اغفر لقومي فإنهم لايعلمون) ئەومیان پێش نازڵبوونی سورەتی (توبة) بووە، یان حیکایەتو گێڕانەوەی دوعای پێغەمبەرانی پێش خۆی بووە؟ چونکە موسلیم فەرموودەیەکی لەئیبنو مەسعوودەوە ریوایەت کردوە: فەرموویەتی: (كأني أنظر الى النبي يحكي نبيا من الأنبياء ضربه قومه، وهو يمسح الدم عن وجهه ويقول رب اغفر لقومي فإنهم لايعلمون).

٣- داوای لێخۆشبوونی ئیبراهیم بۆ باوکی نابێتە بەڵگە. کە دروستە موسوڵمان دوعا بۆ موشریك بکا، چونکە دوعاکردنەکەی ئیراهیم ﷺ لەئاکامی وادەو بەڵێنێك بووە، جا بەڵێندەرەکە یان ئیبراهیم بووە، وادەی بەباوکی دا کە داوای لێخۆشبوونی بۆ بکا بەهومێدی ئەوە موسوڵمان بێ، کە بەموشریکی مرد، بەخەی خۆی لێ هەڵتەکاند. یان بەڵێندەرەکە باوکی بووە وادەی بەئیبراهیم دا: کە ئیمانی پێ بێنێ، کە بەموشریکی مرد، زانی کە دوژمنی خودایەو یەخەی خۆی لێ هەڵتەکاند.

٤- هەرکەسێ پەیامی پێغەمبەری پێ نەگەیشتبێ عوزری هەیەو بەئەهلی فیترەت حیساب دەکرێو سزا نادرێ.

## تۆبە وەرگرتن لەجەنگاوەرانی غەزای تەبووكو هەروا لەو سێ کەسەش کەخۆیان پاش دابوو

﴿ لَقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ

مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ
بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُوا۟ حَتَّىٰٓ
إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ
أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓا۟ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ
عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾

پەیوەندی ئەم ئایەتانە بەهی پێشەوە لەم رووەوەیە: کە پەروەردگار دوای ئەوەی چۆنیەتی غەزای تەبووکی روون کردەوە، حاڵو وەزعی ئەوانەی بەیان کرد کە خۆیان لەچوون بۆ غەزا دواخست، جارێکی تر گەڕایەوە بۆ سەر باسی ئەو غەزایەو یاردەکانی. شێوەو شێوازی قورئانە، ئایەتەکانی پیوەندار بەباسێکەوە لێك جیا دەکاتەوە، بەئوسلووبی جیاجیا ئاڕاستەیان دەکا بۆ ئەوەی لەسەر دڵو دەروون کاریگەریی خۆیان بنوێننو هەمیشە تازەگەرییان تێدابێ، لەخوێندنەوەو تەماشا کردنو گوێ گرتن لەئایەتەکان نائومێدیو وەڕز بوون پەیدا نەبێ؛ ئایەتەکانی ئێرە موناسیبو گونجاون لەگەڵ ئایەتەکانی پێشوو کە دەربارەی جڵەوگیری کردن لەداوای لێخۆشبوون بۆ موشریکەکان هاتوون!

دەربارەی هۆکاری نازڵبوونی ئەم ئایەتانە ئیمامی بوخاریو هی تریش لەکەعبی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە: کە دەڵێ لەهیچ غەزایەك لەپێغەمبەر ﷺ هەڵنەبڕاوەو لەهەموویاندا جگە لەغەزای بەدر لەخزمەتیدا بووم، تا غەزای

تەبووك پەیدابوو، بانگ هەڵدرا بۆ راجمینو نەفیری عام... ئیتر پەروەردگار تۆبەی لێ قبوولٚ کردینو ئەم ئایەتانە هاتنە خوارێ: ﴿لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ﴾ تادەگاتە ﴿وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ کەعب وتی: ئایەتی ﴿اتَّقُواْ اللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ الصَّادِقِينَ﴾ دەربارەی ئێمە هاتۆتە خوارێ.

﴿لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ﴾ بێگومان پەروەردگار رەحمەتو فەضلو ئیحسانی خۆی بەسەر پێغەمبەرو کۆچکارانو یارمەتیدەراندا پەخش کرد، تۆبەی لەو هاوەڵە موسوڵمانانە وەرگرت؛ کە لەگەڵیا ئامادەی جەنگی تەبووك بوون، لەهەڵەو کەمتەرخەمییان چاوپۆشی کرد، چونکە لەم غەزایەدا هاوەڵان تووشی تەنگو چەڵەمەو دەردی سەریی بوون، زۆریان نارەحەتیو برسیایەتیو تینوایەتی چەشتو خۆڕاگرو بەصەبرو ئارام بوون.

بێگومان هەڵەو کەمتەرخەمی ئەو موسوڵمانانە هەڵقوڵاوی سروشتی ئادەمیزادانەیان بووە، ئەوانیش ئادەمیزاد بوونو ئادەمیزادیش بێ هەڵە نابێ، یان دەرەنجامی راو ئیجتیهادێك بووە لەو کارانەدا کە هێشتا پەروەردگار رونکردنەوەی یەکلاکەرەوەی دەربارەیان نەفەرمووە، تا سەرپێچیکاریان بەتاوانبارو یاخی بوو حیساب بکرێ. بۆیە ئیبنو عەبباس دەربارەی تۆبە وەرگرتن لەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ شتێکی (خوار باشتری) ئەنجام داوە، کە دەبوایە شتە باشترەکەی بکردایە، واتە: (خلاف الأولی)ی ئەنجام داوە: کە رێگەیدا موونافیقەکان هاوبەشی غەزاکە نەکەن. وەکوو قورئان ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿عَفَا اللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ﴾ التوبة/٤٣. واتە: تۆبەکەی پێغەمبەر لەئاکامی ئیجتهادێك بوو کردیو خودا ئاگاداری کردەوە، کەمتەرخەمی کۆچکارانو یارمەتیدەران لەم روەوە بووە: کە تۆزێك بەقەنگ گرانیو تەمبەڵی بۆ غەزاکە خۆیان ئامادە کرد؛ بەوپەڕی لەشسووکیو چوستو چالاکییەوە نەهاتنە پێشو نەکەوتنە رێ، هەندێکیان

تاوانەکەیان ئەوە بوو کە گوێیان بۆ دووڕووەکان دەگرت چۆن دەیانەوێ موسوڵمانان تووشی فیتنەیی‌و گێرەو کێشە بکەن!

**لێرەدا تۆبە دوو مانای هەیە:**

١- تۆفیقیان بدا بۆ تۆبە کردن.

٢- تۆبەیان لێ وەربگری‌و رەزامەندی خۆی برژێنێ بەسەریاندا.

﴿الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ﴾ واتە: خودا رەزامەندی خۆی بەخشی بەو هاوەڵانەی پێغەمبەر ﷺ کە لەکاتی تەنگانەو سەغڵەتیدا شوێن پێغەمبەر کەوتن‌و سڵیان لەماندوبوون‌و برسیایەتی‌و تینوایەتی نەکردەوە، لەو بارو دۆخە سەغڵەتییەدا، لەو بارو دۆخەدا کە کۆتایی وەرزی هاوین بوو، بژێوو بەروبوومیان لەخورمای ساڵی پێشوو کەم بوبووەوە، سەرەتای وەرزی پاییز بوو، خورمای تازەو تەڕیان بۆ هەڵنەدەگیرا، هەبوو چەند دەنکە خورمایەکی کۆنی لەگەڵ خۆی دەبرد، هەبوو هەندێ جۆی پل‌و پوشاوی دەکردە تێشوو، هەبوو کەمێك پیوی لەگەڵ خۆی برد. لەبارەی ئاوی خواردنەوەشدا لەوپەڕی بێ ئاویدا بوون. تەنانەت لەگەڵ ئەو هەموو پێویستساتەی بەوشتریان هەبوو لەو سەفەرەدا هی وایان هەبوو وشترەکەی سەر دەبڕی بۆ ئەوەی بەئاوی ناو گەدەی وشترەکە دەمیان تەڕ بکەن، وێڕای ئەم برسیایەتی‌و تینوایەتییە گەرماو گڕەی هاوینیش سەرباربوو!

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا دەفەرموێ: ﴿فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ﴾ لەسێ لاوە بوو، تەنگانەی بێ وڵاخی واتە: کەمو کوڕی وڵاخی سواری، نەبوونی تێشوو، نەبوونی ئاوی خواردنەوە.

ئەم تۆبە قبولکردنە لەموسوڵمانان ﴿مِنْ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِنْهُمْ﴾ کاتێك بوو: کە نزیك بوو دڵی هەندێکیان لەحەق لابدا، لەرێبازی موسوڵمانان دەربچن، ئەوەبوو: بڕێك لەو موسوڵمانانە لەچوون بۆ غەزاکە دواکەوتن، بەڵام

دواکەوتنەکەیان لەبەر دووڕوویی نەبوو، بەڵکوو هۆکاری تری هەبوو، ئەمانە ئەوانە بوون: کە کرداری باشو خراپیان تێکەڵ بەیەك کردبوو، دانیان بەتاوانی خۆیاندا نا ﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ﴾ پاشان خودا تۆبەی لێ وەرگرتنو ڕەزامەندی خۆی پێ بەخشین، دڵیانی لەسەر ئایینی خۆی دامەزراند ﴿إِنَّهُ بِهِمْ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگار دڵسۆزو بەبەزەییە بۆ بەندە تۆبەکارەکانی، پاش ئەوەی خۆڕاگرییان نواندو لەپێناو ئاییندا جیهادیان کرد پاشگوێیان ناخا! غەمو ناخۆشییان لەسەر لادەباو سودو قازانجیان پێ دەگەیەنێ!

دووبارەکردنەوەی تۆبە وەرگرتن لێیان کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ﴾ بۆ ڕێز لێنانو گرنگی دانە بەو موسوڵمانانەو لابردنی شكو گومانە لەناو دڵو دەروونیانو دڵنیا کردنیانە لەقبووڵبوونی تۆبەکەیان.

﴿وَعَلَى الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا﴾ هەروەها پەروەردگار تۆبەی وەرگرت لەو سێ کەسەی لەغەزا دواکەوتبوون.. نەك بەهۆی دووڕوویی و نیفاق بەڵکوو بەهۆی تەمبەڵیو ڕاحەت ویستیو دانیشتنخوازی. ئەمانە ئەو سێ کەسەن کە لەچوون بۆ غەزای تەبووك دواکەوتبوون مەوزوعی تۆبە لێ وەرگرتنیان دواخرابوو، هیچ بڕیارێك دەربارەیان دەرنەچووبوو، یەکێکیان کەعبی کوڕی مالیك (شاعیری بەناو بانگ)و هیلالی کوڕی ئومەییەی واقیفیو سێیەمیان مورارەی کوڕی ڕەبیعی عامیرییە، هەمووشیان لەیارمەتیدەرانن.

**لێرەدا پەروەردگار ئەو موسوڵمانانەی بەسێ صیفەت وەصفدار کرد:**

**صیفەتی یەکەم:** ئەوەیە دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ﴾ واتە: ئەوانە تۆبە لێ وەرگرتنیان دواخراو وەغرا هەتا وایان لێ هات دونیایان لێ تەنگ بوو (کونە مشکیان لێ بوو بەقەیسەری)و تەنگەتاو بوون، ترسی سەرەنجامی حاڵی خۆیان هەبوو، زۆر بەوە ناڕەحەت بوون: کە پێغەمبەرو موسوڵمانان دەنگیان لێ دابڕیبوونو قسەیان لەگەڵ نەدەکردن، کۆڕو کۆمەڵیان

له‌گه‌ڵ دانه‌ده‌به‌ستن، خێزانه‌كانیان جێگایان لێ جیاكردبوونه‌وه، ئه‌نجا رۆژ به‌م شێوه‌و له‌م حاڵه‌دا مانه‌وه.

**صیفه‌تی دووه‌م:** ئه‌وه‌یه: كه ده‌فه‌رموێ: ﴿وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ﴾ به‌هۆی خه‌م‌و ناڕه‌حه‌تی زۆرو نائومێدی دڵیان ته‌نگ بوو، كه ده‌یاندی خۆشه‌ویستانیان ده‌نگیان لێ دابڕیون‌و خه‌ڵكی به‌چاوی سووك سه‌یریان ده‌كه‌ن..

**صیفه‌تی سێیه‌م:** ئه‌وه بوو ﴿وَظَنُّوا أَنْ لا مَلْجَأَ مِنْ اللَّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ﴾ دڵنیا بوون له‌وه‌ی: كه هیچ په‌نانین له‌قاری خودا بیانپارێزێ جگه له‌تۆبه‌و گه‌ڕانه‌وه بۆ لای خوداو داوای لێخۆشبون‌و هیوای ره‌حمه‌تو به‌زه‌یی په‌روه‌ردگار، كه‌وتبوونه حاڵه‌تێكی زۆر دژواره‌وه: پێغه‌مبه‌ر روی لێ وه‌رگێڕاون، موسوڵمانان ده‌نگیان لێ دابڕیون، نه‌یانده‌زانی هانا بۆ كێ به‌رن‌و داوای دوعاو شه‌فاعه‌تی له‌كێ بكه‌ن!

﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ﴾ پاشان په‌روه‌ردگار به‌زه‌یی پێدا هاتنه‌وه بڕیاری تۆبه لێ وه‌رگرتنی ناردەخوارێ. ﴿لِيَتُوبُوا﴾ بۆ ئه‌وه‌ی تۆبه بكه‌ن‌و بۆ لای خودا بگه‌ڕێنه‌وه، شوێن په‌یامی پێغه‌مبه‌ر ﷺ بكه‌ون!

﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ بێگومان په‌روه‌ردگار به‌زۆری‌و به‌لێشاو تۆبه‌ی تۆبه‌كاران قبووڵ ده‌كا، ره‌حمه‌تو به‌زه‌یی به‌رفراوانه بۆ چاكه‌كاران، به‌فه‌ضڵ‌و به‌خششی خۆی (هه‌رچه‌نده شیاوی سزادانن) جۆره‌ها نیعمه‌تی خۆی پێ به‌خشیون! چیرۆكی ئه‌م سێ كه‌سه وه‌كوو راڤه‌كه‌رانی قورئان ده‌گێڕنه‌وه: به‌م جۆره‌یه: ئه‌م سێ هاوه‌ڵه له‌خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ردا نه‌چوون بۆ غه‌زای ته‌بووك‌و خۆیان پاشدا.

كه‌عب: كه یه‌كێكه له‌و سێ كه‌سانه ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر ﷺ زۆری حه‌ز له‌قسه‌و گفتوگۆی من بوو، كه له‌م غه‌زایه دواكه‌وتم‌و نه‌چووم. پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی: ده‌بێ چ شتێك وای له‌كه‌عب كردبێ نه‌هاتبێ بۆ غه‌زا؟ كه ته‌شریفی گه‌ڕایه‌وه بۆ

مەدینـە، دووڕووەكان عوزریـان هێنایـەوەو عـوزری لێ وەرگـرتن، ئـەمنیش چـوومە خزمەتیو عەرزم كرد قوربان! من ولاغـی سـواریو ئێـشووم ئامـادەبوو، كـە نـەهاتم تـاوان بـوو، تـاوانم كـرد، داوای لێخۆشـبوونم بـۆ بكـە. پێغەمبـەر داواكـەی ڕەت كردەوە.

ئیتر پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەموسوڵمانان كرد: كە هاونیشینیو هاوەڵی ئـەو سـێ كەسـە نەكـەنو دەنگیـان لێ دابـڕن، ئـەوەبوو كـەس قـسەی لەگـەڵ نـەدەكردن، ئـەمجار فـەرمانی كـرد خێزانەكانیـشیان لێیـان جیـا ببنـەوەو دووره پـەرێزییان لێ بكەن؛؛ دونیایان لێ تەنگ بوو، (سەری كێوانیـان لێ بـەپووش گـیرا) خێزانـی هـیلالی كوڕی ئومییە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتـی: قوربـان! هـیلال ئەوەنـدە گریـاوەو دەگـری ترسـم هەیـە چاوی كـوێر بـن، ئـا بـەم شـێوە پـەنجا شـەو تێپـەڕی. ئـەمجار پەروەردگار ئایـەتی ﴿لَقَد تَّابَ اللهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَـاجِرِينَ﴾و ﴿وَعَلَـى الثَّلاثَـةِ الَّـذِينَ خُلِّفُوا﴾ی نـاردە خـوارێ، ئـەو كاتـە پێغەمبـەر ﷺ لـەماڵی ئوموسـەلەمە بـوو، هاتـە دەرو تەشـریفی هـات بـۆ ژوورەكـەی خـۆیو فـەرمووی: (ئـەڵڵاهو ئەكبـەر ئـەوا پـەروەردگار عـوزری هاوەڵانمـانی وەرگـرت) كـە نوێـژی بـەیانی كـرد، ئـەم تۆبـە قبوولكردنەی بۆ هاوەڵانی گێڕایەوە، مزگێنی دا كە خودا تۆبـەی لێ وەرگـرتن، ئـیتر هـاوەڵانی تۆبـە لێ وەرگـیراو بەهەڵـەداوان هـاتن بـۆ خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ و پێغەمبـەریش ئایەتـەكانی بەسـەردا خوێندنـەوە. كـەعبی كـوڕی مالیـك وتـی: مـن لەخۆشی قبووڵبوونی تۆبە لێمان، بڕیارمدا هەموو ماڵو دارایی خـۆم بكەمـە خێـرو صەدەقە، پێغەمبەر ﷺ رازی نەبوو، وتم: نیوەی دەكـەم بـەخێر، هـەر رازی نـەبوو، وتم: سێیەكی دەكەم بەخێر، فەرمووی: باشە.

لەریوایـەتێكی تـردا هـاتووە: كـەعب دەڵـێ: كـە مـژدەی تۆبـە لێ وەرگرتنمـان پێدرا، خێرا خـۆم گـۆڕیو بەهەڵـەداوان هـاتم بـۆ خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ كـە هـاتم راونــیم تەشـریفی لەمزگـەوتدا دانیـشتبوو موسـوڵمانان لـەدەوری دانیـشتبوون،

طەلحەی کوڕی عەبدوڵلا بەراکردن بەرەو پیرم هاتو دەستی خستە ناو دەستمەوەو وتی: تۆبە لێوەرگرتن پیرۆز بێ، هەرگیزاو هەرگیز ئەم هەڵوێستەی طەلحەم لەبیر ناچێتەوە. ئەمجار پێغەمبەر ﷺ کە دەمو چاوی دەتگوت: مانگی شەوی چواردەیە دەدرەوشایەوە، فەرمووی: ئەی کەعب! مژدەت لێ بێ بەپیرۆزترین رۆژگاری ژیانت، لەوکاتەوە هاتوویە سەردونیا رۆژی وا خۆشت تووش نەبوە، ئەمجار ئایەتەکانی بەسەردا خوێندەوە...

بێگومان ئەم چیرۆکو روداوە پەندو ئامۆژگارییە بۆ موسوڵمانانو پێویستە خوداپەرستان دڵیان پێی بکەوێتە لەرزەو بەجۆش بێنو فرمێسک برێژن! دەگێڕنەوە ئیمام ئەحمەد ئەوەندەی بەم ئایەتانە دەهاتە گریانو کوڵی هەڵدەستا بەهیچ شتێکی تر ئەوەندە کوڵی گریانی هەڵنەدەستا!

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار بڕیاری قبوڵبوونی تۆبەی لەو سێ کەسە ناردە خوارێ، چڵەوگیری ئەومیان لێ دەکا: کە ئیتر جارێکی دیکە نەگەڕێنەوە بۆ سەر کردەوە خراپەکانی پێشوویانو چەلێکی دی لەچوون بۆ غەزا دوانەکەونو لەجیهادو تێکۆشان تەمبەڵی نەکەنو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ﴾ ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوەو بڕوادارن، لەخوا بترسنو خۆبپارێزن لەو شتانەی دەبنە هۆی نارازی بوونی خودا لێتان، بەهیچ شێوەیەك سەرپێچی پەیامی پێغەمبەر مەکەن، ئەرکی سەرشانی خۆتان ئەنجام بدەن، لەهەموو غەزاو گۆڕەپانی جیهادو تێکۆشاندا لەگەڵ پێغەمبەرو موسوڵماناندا بن، نەچن لەپێغەمبەرو موسوڵمانان هەڵبڕێنو خۆتان پاش بدەن لەگەڵ موناфیقو گومڕایاندا لەماڵ دانیشن!

لەدونیادا لەگەڵ راستگۆیان بن لەبیرو باوەڕو وادەو بەڵێندا، بەگوفتارو کردارو هەڵوێست لەپێڕی راستگۆیان بن، نەچن خۆتان بخەنە پێڕی ئەو موناфیقو گومڕایانەی تاوان دەکەنو دەیانەوێ بەدرۆو سوێندی درۆ خۆیان رزگار بکەن.

حاکم لەئیبنو مەسعوودەوە لەپێغەمبەرەوە ریوایەت دەکا: دەفەرموێ: (ان الکذب لایصلح منه جد ولا هزل، ولا یعد الرجل ابنه ثم لاینجز له، اقرءوا ان شئتم: یاأیها الذین آمنوا اتقوا الله وکونوا مع الصادقین).

بەیهەقی بە(مەرفووعی) ریوایەتێکی هێناوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان الصدق یهدي الی البر، وان البر یهدي الی الجنة، وان الکذب یهدي الی الفجور، وان الفجور یهدي الی النار، انه یقال للصادق: صدق وبرَ، ویقال للکاذب: کذب وفجر، وان الرجل لیصدق حتی یکتب عند الله صدیقاً، ویکذب حتی یکتب عند الله کذاباً).

وازهێنان لەدرۆ رێخۆشکەرەیە بۆ وازهێنان لەهەموو تاوانێك.. لەئایینی ئیسلامدا، درۆ کردن، رەوانیە مەگەر لەسێ شوێندا نەبێ: لەشەڕدا، لەرێکخستنەوەو موصالەحەکردنی نێوان خەڵکدا، هەروا پیاو قسە بۆ خێزانی خۆی بکا بۆ ئەوەی رازی بکا، بەمجۆرە پێی بڵێ: تۆ لەلای من لەهەموو کەس جوانتری خۆشەویسترین کەسی لەلام! واتە: تەنها لەم بوارەدا پیاو بۆی رەوایە بەدرۆ قسە بۆ ژنی خۆی بکا، بەڵام لەبواری بەرژەوندی خێزانو بژیوو ئەم جۆرە شتانەدا درۆ کردن دروست نیە.

ئیبنو ئەبی شەیبە لەئەسمای کچی یەزیدەوە لەپێغەمبەرەوە فەرموودەیەك ریوایەت دەکا: فەرموویەتی: (کل الکذب یکتب علی ابن آدم الا رجل یکذب في خدیعة حرب، أو صلاح بین اثنین، أو رجل یحدث إمرأته لیرضیها) واتە: هەموو درۆیەك بەتاوان بۆ ئادەمیزاد دەنووسرێ، مەگەر کابرایەك درۆ بکا بۆ ئەنجامدانی فرِوفێڵی شەڕو جەنگ، یان بۆ ناوبژیکردنی نێوان دوو کەس کەلێك عاجزنو ناخۆشییان هەیە. یان پیاوێك بیەوێ رەزامەندی خێزانەکەی بەدەست بێنێ ئالەم سێ بوارەدا درۆ کردن رەوایە!.

## واجب بوونی چوون بۆ غەزاو جیهاد لەسەر دانیشتوانی مەدینەو خێڵە عەرەبەکانی دەوروبەری

﴿ مَا كَانَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ الْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا عَن رَّسُولِ اللَّهِ وَلَا يَرْغَبُوا بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَطَئُونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ (١٢٠) وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١٢١) ﴾

لەئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار فەرمانی بەموسوڵمانان کرد: کە هەمیشە لەگەڵ راستگۆیاندا هەڵسوکەوت بکەنو کردارو گوفتاریان وەکوو هی ئەوان بێ، شوێن پێغەمبەر بکەونو لێی دانەبڕێن. لێرەش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوەو جڵەوگیری لەوە دەکا: کە لەپێغەمبەر ﷺ دوا نەکەونو هەمیشە پابەندی فەرمانو ئامۆژگاریەکانی بنو دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لأَهْلِ الْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُمْ مِنَ الأَعْرَابِ أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ وَلا يَرْغَبُوا بِأَنفُسِهِمْ عَنْ نَفْسِهِ﴾ ناشێو نابێو ناگونجێ بۆ

دانیشتوانی شاری مەدینە کە پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامەو بارەگای پێغەمبەری لییە، هەروەها دانیشتوانی دەوروبەری مەدینە، کە بریتین لەهۆزی موزەینەو جوهەینەو ئەشجەعو غیفارو ئەسلەم، نابیو ناگونجێ لەپێغەمبەر دوابکەونو لەتەکیا نەچن بۆ غەزا. وەکوو ئەوەی هەندێ کەس لەغەزای تەبووك خۆیان پاش داو لەخزمەت پێغەمبەر ﷺدا نەچوون؟ هەروەها نابێ لەهیچ کارو بارێکی تری دەوڵەتدا لەپێغەمبەر دابڕێنو خۆیان کلا بکەن، هەروەها نابێ بەهیچ جۆرێك گیانو جەستەی خۆیان لەهی پێغەمبەر خۆشتر بوێ، نابێ ئەوان لەسای سێبەر دانیشنو لەنازو نیعمەتدا بتلێنەوەو پێغەمبەریش لەتەنگو چەڵەمەدا بێ، بەڵکوو ئەرکی سەرشانی موسوڵمانانە: کە لەخۆشیو ناخۆشیدا، لەتەنگانەو شەڕو جەنگدا بەئەوپەڕی نیشاتەوە هاوکاری پێغەمبەر بکەنو جیهادو تێکۆشان ئەنجام بدەن، چونکە ئاشکراو نمایانە ڕێزدارترین گیانو جەستە لای خودا گیانو جەستەی پێغەمبەرە، جا لەکاتێکدا گیانو جەستەی پێغەمبەر ﷺ بکەوێتە نارەحەتیو تەنگو چەڵەمەوە، ئەوە پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانان هاوکاری پێغەمبەر بکەنو بەموو لێی دانەبڕێنو خۆیان فرێبدەنە ناو ئەو تەنگ چەڵەمانەوە!

بەکورتیو پوختی ئەو کەسەی خۆ لەچوون بۆ غەزا لەتەك پێغەمبەردا بشارێتەوەو تەمبەڵی بکا، مانای وایە: گیانو جەستەی خۆی لەپێغەمبەر خۆشتر دەوێ، کەسێکیش خۆی لەپێغەمبەر خۆشتر بوێ نیشانەی ناتەواوی ئیمانو باوەڕیەتی.

کەوابێ ئەو موسوڵمانانە مافی ئەوەیان نیە پێغەمبەر بچێ بۆ غەزاو تووشی نارەحەتی ببێو ئەوان پاڵی لێ بدەنەوەو لەماڵەوە دانیشنو خۆ بلێسنەوە! نابێ ڕێگای ئەوە بدەن بەخۆیانو بەوە ڕازی بن پێغەمبەر لەناخۆشیدا بێو ئەوان لەئیسراحەتدا بن! بەڵکوو پێویستەو ئەرکی سەرشانیانە کە شوێن پێغەمبەر بکەونو لەتەکیا جیهاد بکەن، ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ لا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلا نَصَبٌ وَلا مَخْمَصَةٌ فِي

سَبِيلِ اللَّهِ وَلا يَطَئُونَ مَوْطِئاً يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَيْلاً إِلاَّ كُتِبَ لَهُمْ بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ﴾ چونکە ئەوانە کە دەچن بۆ جیهاد، هەر ناخۆشیو نارەحەتیەکیان تووش دێ لەتینوایەتیو ماندوبونو برسییایەتی لەرێگەی خودادا، هەروەها کە برێك خاکی کوفر داگیر دەکەنو پێیان دەخەنەسەریو کافرەکان نارەحەت دەکەن، هەروەها کە فرسەت لەکافرەکان دەبینن‌و دەست لەدوژمن دەوەشێنن، بەدیل دەیانگرن، یان لێیان دەکوژن، یان تالانیان لێ دەگرن، شکستیان بەسەر دێنن، ئیللا بەهەر یەکێ لەم شتانە چاکەیان بۆ دەنووسرێ، یا پاداشتی باشیان دەدرێتەوە. بەهەر جمو جوولۆ هەلۆیستو خۆڕاگریو بەرگریو پەلاماردانو هێرش بردنێك کە ئەوانە لەکاتی جیهاد دا ئەنجامی دەدەن خێرو چاکەیان بۆ دەنوسرێ، هەموو شتێکیان طاعەتو خوداپەرستییەو خودا پاداشیان لەسەری دەداتەوە، چونکە ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ بێگومان پەروەردگار پاداشی چاکەکارن بەفیڕۆ نادا، هەرکەسێك کردەوەی چاك بێ پابەندی فەرمانو جلەوگیریەکانی پەروەردگار بێ پاداشی شیاوی خۆی دەدرێتەوە، هەر لەم روانگەیەوە پەروەردگار بۆ دانیشتوانی شاری مەدینەو دەوروبەری پاداشی باشی داناوە، هەرکردەوەیەکی باشیان کردبێ بەفیڕۆ ناچیو پاداشی خۆیان وەردەگرنەوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلاً﴾الكهف/٣٠.

هەروەها ﴿وَلا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلا كَبِيرَةً وَلا يَقْطَعُونَ وَادِياً إِلاَّ كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمْ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ئەو موجاهیدو تێکۆشەرانە شتێك نابەخشن؛ کەم بێ یان زۆر بێ، پچووك بێ یان گەورە بێ، شیوو دۆڵێك نابڕن‌و هاتووچۆی پێدا ناکەن ئیلا خودا پاداشیان بۆ دەنووسیو لەسەری چاکەیان دەداتەوە، هیچی پاشقول ناداو هیچی لەبیر ناچیو هیچ کارێکیان بەفیڕۆ ناچێ، چونکە جیهاد لەرێگەی خودادا بۆ بەرز کردنەوەی وشەی (لا الە الا الله)یە، بۆ پاراستنی بیرو باوەڕە، بۆ پارێزگاری وڵاتو ناموسو فەرهەنگو کەلەپوورە. هەرگەلو

نەتەوەیەك واز لەجیهاد بێنن دەبنە ژێر دەستەو كۆیلە، پیاوەتیو وڵاتو مێژوو موقەداستیان پێخوست دەكرێ، هیچ ڕێزو نرخێكیان نامێنێ!

## تێبینی :

### ئایەتەكان ئەم حوكمانەیان لێ وەردەگیرێ:

١- جیهاد فەرضو ئەركێكی پێویستە لەسەر دانشتوانی مەدینەو خێڵو هۆزەكانی دەورو بەری مەدینە، چونكە مەدینە پایتەختی حكوومەتی ئیسلامییەو ئەوانیش دانیشتووی ئەو پایتەختەن، هاوسێی پێغەمبەرن ﷺ هەرچی تووشی پێغەمبەر بێ لەبەهرەو سەروەریو خێرو خۆشیو ناخۆشی، راستەوخۆ ئەوانیش دەگرێتەوە.

٢- رەوا نیە موسوڵمان خودی خۆیان لەپێغەمبەر خۆشتربوێ، چونكە ئیمان كاتێك تەواو دەبێو موسوڵمان بەموسوڵمانی كامڵ حیساب دەكرێ: كە پێغەمبەری لەخۆی خۆشتربوێ.

٣- هەر ناخۆشیو نارەحەتییەكی تووشی موجاهید دەبێ بەخێرو چاكە بۆی دەنووسرێو پاداشی دەدرێتەوە.

٤- جیهاد بۆ موسوڵمانو بۆ كافر خێرو خۆشیو بەختەوەرییە؛ چونكە بەنیسبەت كافرەوە دەبێتە هۆی ئەوەی لەچوارچێوەی كوفردا نەمێنێو بچێتە چوارچێوەی ئیسلامەوە، دەرحەق بەموسوڵمانانیش خێرو خۆشبەختییە، چونكە دەبێتە هۆی پارێزگاری ناموسو خاكو ئایینو موقەدەساتیانو عیززەتو كەرامەتیان بۆ دەستەبەر دەكا.

٥- پێویستە ئەوەش بزانین ئەم ئایەتانە بەئایەتی دوایی نەسخ بوونەوە. كە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً...﴾ واتە: حوكمی ئایەتەكان هەر ئەوەندە بەردەوام بووە: كە موسوڵمانان كەم بوون. وەكوو لەمەودوا شیدەكەینەوە.

## جیهاد فەرضی کیفایەیەو هەوڵدان بۆ فێربوونی زانستو زانیاری فەرضە

﴿ ۞ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً ۚ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾

ئەم ئایەتە باقی ماندەی حوکمەکانی جیهادە، ئەم ئایەتە جیهاد کردن لەسەر هەموو موسوڵمانان بەپێویست دانانێ، بەڵکوو ئەوە دەگەیەنێ کە جیهاد فەرزی کیفایەیە، واتە: ئەگەر کۆمەڵێك ئەنجامیان دا لەسەر هەموویان لادەچێ، خۆ ئەگەر بڕێکیان بەم ئەرکە پیرۆزە پێویستە هەڵنەستان ئەوە هەموویان تاوانبارن!

ئیبنو ئەبی حاتەم لەعیکریمەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: کە ئایەتی ﴿إِلاَّ تَنفِرُوا۟ يُعَذِّبْكُمْ عَذَاباً﴾ هاتە خوارێ. هەندێ لەموسوڵمانان لەلادێکاندا خەریکی بانگەوازیو فێرکردنی کەسو کاریان بوون، دووڕووەکان دەیانگوت: ئەوە نەفیری عام کراوەو کەچی هەندێ کەس لەگوندو ناو دەوارنشینەکاندا ماونەوەو نەچوون بۆ غەزا، ئەوانە لێیان قەوماو سەرپێچی فەرمانی خودایان کرد، بەهیلاك چوون، ئیتر ئایەتی ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً...﴾ هاتە خوارێ.

هەر ئیبنو ئەبی حاتەم لەعەبدوڵڵای کوڕی عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەیرەوە ریوایەت دەکات، دەڵێ: موسوڵمانان چونکە زۆر سوور بوون لەسەر چوون بۆ جیهاد، ئەگەر پێغەمبەر مەفرەزەیەکی بناردایە بۆ سەر شوێنێك هەموویان رادەجمینو پێغەمبەریان بەتەنیا لەمەدینەدا دەهێشتەوە، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ. ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: کە پەروەردگار سەرزەنشتی دواکەوتووەکانی غەزای تەبووکی

کرد، هاوەڵان بڕیاریان دا: کە لەوەدووا بەهیچ شێوەیەك لەسوپاو مەفرەزەکان دوانەکەون، هەر کە مەفرەزەیەك ڕەوانە دەکرا، هەموویان دەچوون، پێغەمبەر ﷺ بەتەنیا دەمایەوە، ئیتر ئایەتی ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ...﴾ هاتە خوارێ.

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: وا پێدەچێ هاتنە خوارەوەی قورئان لەم سوورەتەدا کە نارەزامەندی بەرامبەر خۆپاشدەرەکان دەردەبڕێو هەرەشە لەخۆشاردنەوەو خۆپاشدان لەجیهاد دەکا بەتایبەتی لەدانیشتوانی مەدینەو دەوروبەری، وای لەموسوڵمانان کرد: کە پاڵە پەستۆی یەکتری بکەن بۆ چون بۆ جیهادو لەمەدینەدا قەرەباڵغی دروست بکەنو ئامادەباشی خۆیان بنوێنن‌و چاوەڕوانی فەرمانی پێغەمبەربن ﷺ چییان فەرمان پێ دەکاو بۆ کوێیان دەنێرێ، بەتایبەتی هۆزو خێڵەکانی دەوروبەری مەدینە کە بەتەواوی قەرەباڵغییان خستبوە ناو مەدینەوە بەجۆرێك کە پێویست بوو نەفیر عامەکەی کە لەوەپێش نیگای پێ هاتبوو سنور داربکرێ، ئەوەتا: پانتایی وڵاتی ئیسلام فراوان بووە، نزیکە نیوەدورگەی عەرەبی هەمووی گەردنکەچی ئیسلام ببێ. ژمارەی ئەو پیاوانەی ئامادەباشی چوون بۆ جیهادیان هەیە زۆر بووە ژمارەیان (پاش روداوی غەزای تەبووك) نزیکەی سی هەزار جەنگاوەرە؛ کە لەوەپێش ئەو ژمارەیە لەهیچ غەزایەکدا کۆنەدەبووەوە، کەوابوو: ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە هێزو تواناکان دابەش بکرێن بۆ هەموو بوارەکانی ژیان کۆمەڵێك تەرخان بکرێن، بۆ ئاوەدانکردنەوە، بۆ بازرگانی کردن، بۆ فێربون‌و خوێندن‌و بوارەکانی تری ژیان بۆ کۆمەڵگاو نەتەوەیەك کە خەریکە بناغەی دەوڵەتو ژیار دادەنێ، بێگومان پێداویستی‌و هەڵس‌و کەوتی ئەم گەل‌و نەتەوەیە پاش هاتنی ئیسلام زۆر جیاوازە لەپێداویستی‌و هەڵس‌و کەوتی ژیانی پێش هاتنی ئیسلام: کە لەچوارچێوەی یاسای خێڵایەتیدا رەنگی دەدایەوەو بریتی بوو: لە پێداویستییەکانی سەرتایی کۆمەڵگای خێڵەکی!!

ئەم ئایەتەی دوایی هاتە خوارێ بەئاشکرا دابەشکردنی هێزو تواناکان بۆ بوارە جیاجیاکانی ژیان دەست نیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً﴾ ناگونجیو شیاو نیە بۆ موسوڵمانان کە هەموویان تێکڕا ڕاجەن بۆ غەزاو شاری مەدینە چۆڵ بکەنو پێغەمبەر ﷺ بەتەنیا بمێنێتەوە، چونکە وەکوو وتمان: جیهادو چوون بۆ غەزا فەرضی کیفایەیە، هەرکاتێ کۆمەڵێك لەموسوڵمانان پێی هەڵسان بری هەموانیان دەکەویو تاوان لەسەر گشتیان لادەچێ، فەرضی عەین نیە، واتە: ئەرکی سەرشانی یەکەیەکەی هەموو موسوڵمانان نیە، وەکوو نوێژ نیە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی عاقڵی ڕەسیدە واجب بێ. کاتێك جیهاد دەبێتە فەرضی عەین: کە پێغەمبەر ﷺ تەشریفی بۆ خۆی بچێ بۆ غەزاو نەفیری گشتی ڕابگەیەنێ.

﴿فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَائِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ﴾ ئەوە بۆچی لەهەموو تاقمو کۆمەڵێك لەموسوڵمانان بڕێکیان ناچن بۆ خوێندنو فێربوون؟ بۆچی لەهەموو کۆمەڵێکی زۆر بەشێکیان خۆیان تەرخان ناکەن بۆ تێگەیشتن لەئایین؟ بۆ تێکۆشانو ماندووبوون لەپێناو بەدەستهێنانی عیلمو زانستدا. بۆ زانینی ئەحکامی شەریعەتو نهێنییەکانی ﴿وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾ بۆ ئەوەی کە موجاهیدەکان لەبەرەکانی جەنگو ڕووبەڕووبوونەوەدا گەڕانەوە بۆ ناو شارو گوندەکان، ئەوانەی فێری ئەحکامی ئایین بوون جەنگاوەرەکان لەفرتو فێڵی دوژمنان بترسێنن، ترسی قارو غەزەبی خودایان بخەنە دڵو دەروونەوە، ئەحکامی ئایینیان فێر بکەن، بۆ ئەوەی لەخودا بترسنو خۆیان لەسەرنجامی سەرپێچی کردن بپارێزنو بێ ئەمری نەکەن!

ڕاناو لە (ليتفقهوا، ولينذروا)دا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو موسوڵمانانەی لەخزمەت پێغەمبەردا ماونەوە. ڕاناو لە(اذا رجعوا) دەگەڕێتەوە بۆ موجاهیدەکانی کە لەجیهاد بوون.

مامۆستا سەید پێی وایە: راناو لەهەرسێك لەشوێنەكەدا هەر بۆ موجاهیدەكان دەگەڕێتەوەو دەفەرموێ: ئەم ئایینە بەرنامەیەكی حەرەكییە، كەسێك لەجمو جۆڵو تێكۆشاندا نەبێ تێی ناگا؛ ئەوانەی كە دەردەچن بۆ جیهاد ئەوانە شیاوترن بەتێگەیشتنو لێ حاڵی بوون لەئایین، ئەوان بەباشی ماناو نهێنییەكانی ئایینیان بۆ دەردەكەوێ، ئەوان لەكاتی تێكۆشانو تەطبیقی عەمەلیدا حەقیقەتو ناوەرۆكی ئایینیان بۆ دەردەكەوێ! ئەوانەی لەماڵەوە دانیشتوون ئەوان پێویستیان بەوە هەیە لەموجاهیدەكانەوە فێری ئایین بن، چونكە ئەوان ئەو شتانەیان نەدیوە كە مەجاهیدەكان بینیویانە، تێگەیشتنی ئەوانیان بەدەست نەهێناوە، وەكوو موجاهیدەكان نهێنیو حەقیقەتی شتەكانیان بۆ روون نەبۆتەوە، بەتایبەتی ئەگەر دەرچوونو جمو جۆڵو بەشێوەیەكی گشتی گونجاو ترە بۆ تێگەیشتنو فێر بوون!!

**تێبینی:**

**ئایەتەكە ئەم حوكمانە روون دەكاتەوە:**

١- جیهاد فەرزی كیفایەیەو فەرزی عەین نیە، چونكە ئەگەر فەرزی عەین بێ دەبێ هەموو موسوڵمانان بچن بۆ غەزا، ئەو كاتە بەرژەوەندی گەلو وڵات بەرێوە ناچێ، خێزانو منداڵ تووشی زەرەرو زیان دەبن، كەوابێ با كۆمەڵێك لەموسوڵمانان ئامادەی جیهادو غەزابن، تاقمێكیشیان خەریكی فێربوونی ئایینو ئەحكامی شەریعەت بن، ئاگاداری ماڵو منداڵی موجاهیدان بكەن، بەرژەوەندی وڵاتو گەل بەرێوەبەرن، كە موجاهیدەكان گەڕانەوە ئەوەی فێری بوون لەئەحكامی شەریعەتو كاروباری ئایینی بۆیان شی بكەنەوە.

٢- هەوڵدان بۆ خوێندنو فێربوونی زانستو تێگەیشتن لەقورئانو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ئەویش وەكوو جیهاد وایەو فەرزی كیفایەیە پێویستە كۆمەڵێك لەموسوڵمانان پێی هەڵسنو ئەنجامی بدەن.

ئاشکراشە کە هەوڵدان بۆ فێربوونی عیلمو زانست کارێکی گەلێك پیرۆزەو پلەو پایەیەکی فرە مەزنەو هیچ کردارو گوفتارێکی ناگاتێ. ئیمامی موسلیم فەرموودەیەکی پێغەمبەری ریوایەت کردوە: کە دەفەرموێ: (من یرد الله به خیراً یفقهه في الدین).

تیرمیذی لەئەبو داودەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: لەپێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: (من سلك طریقاً یلتمس فیه علما سهل الله به طریقا الی الجنة، وان الملائكة لتضع أجنحتها رضا لطالب العلم، وان العالم لیستغفر له من في السموات ومن في الأرض والحیتان في جوف الماء، وان فضل العالم علی العابد كفضل القمر لیلة البدر علی سائر الكواكب، وان العلماء ورثة الأنبیاء، وان الأنبیاء لم یورثوا دینارا ولا درهماً، ورثوا العلم فمن أخذ به أخذ بحظ وافر).

## سیاسەتمەداریی جەنگی لەشەڕی کافراندا

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار فەرمانی بەموسوڵمانان کرد: کە دژی هەموو موشریكو کافرێك بجەنگێن، وەکوو چۆن ئەوان دژیان دەجەنگێن! ئەمجار لێرەداو لەم ئایەتەدا رێگای لەبارو گونجاوتر نیشان موسوڵمانان دەدا، فەرمانیان پێ دەکا، کە لەنزیکەکانەوە دەست پێ بکەن، تا خزمو کەسو کارو هۆزو خێڵەکەیان راوەستابێ، جیهاد لەگەڵ نەتەوەو هۆزو خێلی دوورە دەست نەکەن.

پێغەمبەرو هاوەڵانی بەم نەخشەیە هەڵسو کەوتیان کرد، سەرەتا دژی گەلو هۆزەکەی خۆیان کە لەمەککە بوون جەنگانو جیهادیان کرد، ئەمجار دژی عەرەبەکانی تر جەنگانو خستیاننە ژێر رکێفی خۆیان، ئەمجار جیهادیان گواستەوە بۆ وڵاتی شامو پاشان بەرەو عێراق کشانو لەسەردەمی خەلیفەی دووەم عومەری خەتتابدا هەموو وڵاتی عێراقو شامو جەزیرەو وڵاتی ئێرانو بەشێکی ئەفریقا کەوتە ژێر رکێفی سوپای ئیسلامەوەو خەڵکەکەیان موسوڵمان بوون، هەر بەم جۆرە نەخشەو پلانی بانگەوازی ئیسلامی ئەنجام دراو بڵاوکرایەوە، ئەوەتا لەسەرەتاوە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ﴾الشعراء/٢١٤، پاشان کە گۆرەپانی بانگەوازی بەرفراوان دەبێ دەفەرموێ: ﴿وَلِتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا﴾الأنعام/٩٢.

ئەمجار وەکوو مژدەیەکی پێش وەخت قورئان ئەم هەواڵەی بەموسوڵمانانی سەردەمی پێغەمبەر رادەگەیەنیو دەفەرموێ: ﴿سَتُدْعَوْنَ إِلَى قَوْمٍ أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ﴾الفتح/١٦.

شایانی باسە زۆر لەراڤەکەرانی قورئانو مێژوو نووسان پێیان وایە: ئەم نەتەوە ئازاو جەربەزەیە گەلی کوردەو ئاماژەیە بەئەوان، کە سوپای ئیسلامیش لێیان نزیک بووەوە بەبێ شەڕو پێکادان موسوڵمان بوونو باوەشیان بۆ ئایینی ئیسلام گرتەوەو تێیدا توانەوە، هەرچی گوتراوە دەربارەی شەڕو پێکادانی نێوان سوپای ئیسلامو نەتەوەی کورد درۆو هەڵبەستراوەو لەراستییەوە دوورە، خودا یاربێ لەکاتی راڤەکردنی ئەم ئایەتەدا بەدوورو درێژی ئەم باسە روون دەکەینەوە.

دەربارەی قوناغێکی تری جیهاد دەفەرموێ: ﴿قَاتِلُواْ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ﴾التوبة/٢٩، یان دەفەرموێ: ﴿وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ﴾الأنعام/١٩.

بەڵێ سیاسەتی بانگەوازی ئیسلامی بەم جۆرە بوو، بەشێوەیەکی سروشتی بڵاوبوەوە، قۆناغ قۆناغو پلە بەپلە بوو، تا ناوخۆو دەوروبەری نزیکی مەدینەی کۆنترۆڵ نەکرد پەلی بەملاو بەولادا نەهاویشت، پێغەمبەر ﷺ بانگەوازییەکەی سەرەتا لەخزمو کەسو کارو هۆزەکەی خۆیەوە دەست پێ کرد، کە شەڕو جەنگانیش پێویست بوو سەرەتا لەگەڵ خزمو کەسو کاری خۆیدا جەنگا، ئەمجار دژی گەلو نەتەوەی تر جیهادی ئەنجام دا!

سەید دەفەرموێ: فوتوحاتی ئیسلامی بەم شێوە ئەنجام درا، سەرەتا بەرەنگاریی ئەوانەی کردوە کە نزیکی (دار الإسلام) بوون جیرانو هاوسێو موسوڵمانان بوون، هەروا قوناغ بەقۆناغو پلە بەپلە موسوڵمانان پەرەیان بەبانگەوازیو جیهاد کردنی خۆیان دا، کاتێك کە نیوەدوورگەی عەرەبی زوربەی یان هەمووی هاتە ژێر رکێفی ئیسلامەوەو پاش رزگار کردنی مەککە ئیتر هێزێك لەو هەرێمە نەمایەوە جێگای مەترسی بێ، ئەمجار غەزای تەبووك ئەنجام درا کە لەقەراغو بیجاغی وڵاتی رۆمدا روی دا، پاشان سوپاکانی ئیسلام بەرەو وڵاتی رۆمو وڵاتی فارس کشانو لەکوفرو بێدینی پاکیان کردنەوەو بوون بەوڵاتی ئیسلامیو پانتایی سەرزەمینی ئیسلامیان فراوان کردو سنوورەکانیان تێکەڵاو کردو وڵاتێکی ئیسلامی پانو پۆڕو دامەزراوو هێدیو هێمنو خوداپەرستیان دروست کرد...

دەی با ئەمجار بێینە خزمەت ئایەتەکەو دەست بەراڤەکردنی بکەین!

دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قَاتِلُوا الَّذِينَ يَلُونَكُمْ مِنَ الْكُفَّارِ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بەتاکو تەنیایی خوداو بەپێغەمبەرایەتی (محمد)و بەرۆژی قیامەت هەیە، بجەنگن لەگەڵ کافران، کامەیان لێتان نزیکترەو هاوسێی (دار الإسلام)ە لەوەوە دەس پێ بکەن، تا هاوسێو نزیکەکانتان نەخەنە ژێر رکێفی ئیسلامەوە پەل بۆ دوور مەهاوێژن! چونکە ئیسلام رەحمەتە، هاوسێو خزمو کەسوکارو نزیك شیاوترە، ئێوە هەوڵ بدەن سەرەتا ئەوان ئەو رەحمەتەیان

بەربکەوێ، هەروەها چونکە هەوڵدان بۆ موسوڵمانبوونی خەڵك ئەگەر لەهاوسێو نزیکەوە دەست پێ بکرێ سوود بەخش ترو بەرەکەت ئامێزترە، پاریزگاری وڵاتو خانوو ماڵی تێدا زیاتر بەدی دەکرێ، نەفەقەو پێداویستی جەنگی کەمتر تێدەچێ، موجاهیدانو بانگەوازیخوازان بەئەمینیو دڵنیاییەوە هاموشۆی بەرەکانی جەنگ دەکەن، ترسی ئەوەیان نیە بۆسەیان بۆ بنرێتەوەو لەدوواوە لێیان بدرێ!

بێگومان بەم نەخشەو پلانە خوداییە بۆ جیهادو جەنگان موسوڵمانان هەڵسو کەوتیان کرد، بۆیە سەرەتا جیهادیان لەدژی جولەکەکانی دەوروبەری مەدینە ئەنجامدا جولەکەکانی هۆزی قورەیظەو بەنو نەضیرو خەیبەریان تەفرو تونا کرد، ئەمجار پەلاماری موشریکەکانی نیوەدورگەی عەرەبیان دا، پاشان سوپای ئیسلام بەرەو شیمالی مەدینە بەرێخرا بۆ ئەوەی جیهاد لەگەڵ رۆمەکان بکەن.. لەهەمان کاتیشدا سوپایان بەرەو عێراقو وڵاتی فارس رەوانەکرد!

﴿وَلْيَجِدُوا فِيكُمْ غِلْظَةً﴾ باکافرانو رێگرانی بڵاوبوونەوەی ئیسلام توندو تیژی لەئێوە ببینن، ئازایەتیو مەردایەتیو خۆراگریو چاونەترسی ئێوەیان بۆ دەربکەوێ، بزانن ئێوە چەند سوورن لەسەر گەیاندنی روناکی نووری ئیسلام بەهەموو جیهان، چەند فیداکارو ئازاو خۆنەویستو جەنگاوەرن!

هەڵبەتە ئەمە سیاسەتی شەڕو جەنگەو سروشتی شەڕ وایە بەرژەوەندی شەڕو جەنگ وا دەخوازێ جەنگاوەران توندو تیژی بنوێننو بەهەڵمەت بن وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ﴾التوبة / ٧٣، بەلام پێش ئەوەی شەڕ پێویست بێ دەبێ موسوڵمانان بەهێدیو هێمنیو بەنەرمو نیانی بانگەوازی خۆیان ئەنجام بدەن، بەحیکمەتو (موعیظە)ی جوانو دلگیر بانگەوازی خۆیان ئاراستە بکەن! جا ئیتر ئەگەر بانگەوازیی بەو نەرمو نیانیە بێ سوود بوو، دوژمنان لوتبەرزی بنوێنن ئەو کاتە شەڕ پێویست دەبێو پێویستە موسوڵمانان توندو تێژی بنوێنن! ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ

﴿مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ باش بزانن: کە پەروەردگار لەگەڵ خوداپەرستانو خۆپارێزەرانو لەخودا ترساوانە، یارمەتیان دەدا پارێزگارییان دەکاو پشتو پەنایانە!

﴿متقین﴾ ئەو کەسانەن کە شوێن فەرمانی خودا کەوتوون، خۆیان لەجڵەوگیرییەکانی دەپارێزن، لەسزاو تۆڵەی دەترسن.

کەوابێ مانای رستەکەی کۆتایی ئایەتەکە بەم جۆرەیە: خودا لەگەڵتانە ئەگەر ئێوە پابەندی حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلام بن، فەرزو سوننەتەکانی ئەنجام بدەن، خاوەن صەبرو خۆگرو پابەندی یاساو نیظام بن، خۆتان لەیاساشکێنیو سنوور بەزێنیو کەمتەرخەمی لەدابینکردنی پێویستیاتی بەرەنگار بوونەوەی دوژمن بپارێزن، بەگوێرەی رۆژگارو شوێن چەکی روبەرو بوونەوە دابین بکەن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ﴾الأنفال/٦٠.

## هەڵوێستی دووڕووەکان بەرامبەر بەسورەتەکانی قورئان

﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ
هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ
يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ
رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾ أَوَلَا
يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِى كُلِّ عَامٍ مَّرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ

ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ
سُورَةٌ نَّظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ هَلْ يَرَىٰكُم مِّنْ أَحَدٍ
ثُمَّ ٱنصَرَفُوا۟ ۚ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ
﴿١٢٧﴾

لەوەپێش پەروەردگار جۆرەها کردەوەی ریسوا ئامێزی دووڕووەکانی بەیان کرد، هەڵوێستی ناشیرینو ناپیاوانەیانی خستنە روو، وەکوو خۆپاشدانیان لەغەزای تەبووك، عوزر هێنانەوەیان بەدرۆو سوێند خواردنیان بەدرۆو دەلەسە بۆ داپۆشینی نەچوونەکەیان، ئەمجار لێرەدا هەڵوێستی ناشیرینی تریان دەست نیشان دەکا کە لەهی پێشوویان خەتەرترە، ئەویش گاڵتەکردنیانە بەقورئانو گوێ پێ نەدان بەئایەتەکانیو خۆگێل کردنیانە لەبیستنی، چونکە هەرکاتێك سورەتێك بهاتایە خوارێ عەیبو نەنگی ئەوانی تێدا بوایە، بەبیستنەکەی نارِحەتو تەنگەتاو دەبوون! هەروەها ئەگەر سورەتێکیان ببیستایە باسی ئەوانی تێدا نەبوایە گاڵتەیان پێ دەکردو تانەیان لێ دەداو پێکەنینیان پێ دەهات.

ئەوەتا پێش ئەوەی کۆتایی بەئەم سورەتە بهێنێ کە زۆر باسی مونافیقانی تێدایە. چەند ئایەتێك دەهێنێ. کە وێنەیەکی زیندووی هەڵسو کەوتی مونافیقەکان دەخاتە سەر شاشەی تەلەفیزیوونی تایبەتیو چۆنیەتی پێشوازیکردنیان لەئایەتو سورەتەکانی قورئان دەخاتە روو، لەهەمان کاتدا وێنەیەکی پێشوازیکردنی موسوڵمانانیش لەقورئان رادەنوێنیو پێکەوە دەیانکاتە تابلۆیەکی رەنگینو سەرنج راکێشو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَـٰذِهِ إِيمَانًا؟﴾ هەر کە سورەتێك لەسوورەتەکانی قورئان دێتە

خـواریءو بـەدووڕووەکان دەگـاو دەیبیـسن، هەیانــە بــەبرادەرەکانی دەڵــێ: واتــە هەندێکیان بەهەندێکیان دەڵێن: ئەرێ کوڕینە! کێ بەئەم سورەتە بڕوای کردو پێی وایە: لەخوداوە هاتۆتە خواریءو موحەممەد راستگۆیە لەوەدا دەڵێ: من پێغەمبەرم! پرسیارێکی سەیرو سەمەرەیە ناراستەی یـەکتری دەکـەن، پرسـیارێکە هـەر کەسـێك تۆزقاڵێك سورەتەکە کاری تێ بکا پرسـیاری وا ناکـا، ئاشـکرایە: کـە ئیمـانی راسـتو دروست: کە بریتییە لەبڕوای تەواوو تۆکمە بەهۆی هاتنـە خـوارەوەی قورئـان زیـاد دەکاو بـەهێز دەبـێ، هـەرکاتێ خـاوەن بـڕوا بـەدڵءو بەتێفکرینـەوە گوێ لـەقورئان بگرێ ئیمانی دوو چەندانە پتەو دەبێ بـەجۆرێك وای لێ دێ کـار بـەناوەرۆکی ئـەو ئایەتانـە بکـاو قورئـان بکاتـە بەرنامـەی ژیـانی خـۆی، ئەمـەش بەڵگەیـەکی روونءو ئاشکرایە کە ئیمان زیادو کەم دەکا، بەهێزیءو بێ هێزی بەسەردا دێ!

بەڵێ پرسیارێکی سـەیرو سـەمەرەیە، لەهـەمان کـاتدا بـۆنی گاڵتـە کردنیـشی بەسوورەتءو ئایەتەکان لێ دێ، دەیانەوێ شكءو گومـان بخەنـە نـاو دڵـی یەکتریـیـەوەو بەراستیان نـەزانن، ئـەمجار ئـەو شـكءو گومانـە بەرامبـەر قورئـان تەشـەنە بکـاتءو بچێتە ناو دڵی موسوڵمانانەوە! قورئان کاریگەری نەمێنێ!

ئــیتر پــەروەردگار دەربــارەی حەقیقــەتی قورئــانءو کاریگــەری لــەدڵی موسوڵماناندا رەددی دانەوەو فەرمووی: ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَزَادَتْهُمْ إِيمَاناً﴾ بـەڵام موسـوڵمانان وەکـوو دووڕووەکـان نـین، دەربـارەی قورئـان پرسـیاری گاڵتـەئامێز ناراسـتەی یـەکتری بکـەن، بـەڵکوو ئەمانـە بەهاتنـە خـوارەوەی سـوورەتی قورئـان بڕوایان زیاد دەکاو دڵیان زیاتر دامەزراو دەبێ لەسەر ئـایینءو ئیمـانی بـەهێزبوویان پاڵیان پێوە دەنێ بۆ ئەوەی رەفتـار بـەناوەرۆکی قورئـان بکـەنءو پابەنـدی فـەرمانءو جڵەوگیرییەکانی بـن ﴿وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ حاڵـیشیان وایـە: کـە کەیفخۆشـن بەهاتنـە خوارەوەی سوورەتی تر، چونکە بەڵگەیەکی تریان لەسەر بیروبـاوەڕ بـۆ زیـاد بـووە، دڵیان بەیادی خودا کەوتۆتـە جـەو جۆڵءو وەلەرزەکـەوتووە، هەسـتیان بەچـاودێری

پەروەردگار کردوە بۆیان، کە دەبینن خودا چاودێریانەو سوورەتو ئایاتی تریان بۆ دەنێرێ، ئەوانیش زیاتر دڵیان دادەمەزرێو ئیمانیان بەهێز دەبێ.

بەڵێ موسوڵمانان کەیفخۆشن بەسوورەتی تازە نازڵبوو چونکە دڵو دەروونیان پاك دەکاتەوە، شارەزایان دەکا بۆ رێبازی بەختەوەری هەردوو جیهان.

زومەخشەری لەمانای رستەی ﴿فَزَادَتْهُمْ إِيْمَاناً﴾دا دەڵێ: چونکە سوورەتی تازە هاتوو بڕوا زیاد دەکا، دڵنیایی لەراستی بیرو باوەڕ تۆکمە تر دەکا، فێنکایی بەدڵ دەگەیەنێ، یان سوورەتە تازە هاتوەکە کردەوەیان پێ زیاد دەکا، زیاد کردنی کردەوەی باشیش دەبێتە هۆی زیادبوونی ئیمان، چونکە ئیمان بریتییە لەبڕواو کردەوە، وەکوو گوتراوە: ئیمان ئەوەیە لەدڵدا جێگیرەو کردەوە شایەتییەتی؛؛

﴿وَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْساً إِلَى رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا وَهُمْ كَافِرُونَ﴾ بەڵام ئەوانەی دڵو دەروونیان پیسیو پۆخەڵی دووڕوویی تێدایە، سەرباری کوفری پێشوویان کوفرو نیفاقو شكو گومانی تریش دەخەنە پاڵی، ئەوە پیسی دەخەنە پاڵ پیسیو کوفرو دووڕوویان زیاد دەکاو تۆکمەو دامەزراو دەبێ، بەو کوفرو نیفاقەوە دەمرنو سەر دەنێنەوە، بەم حاڵە ناسروشتییە سلار دەبنەوە، دونیا بەجێ دێڵن بڕوایان بەخوداو بەقورئانو بەپێغەمبەر نیە!

ئەمەش پێچەوانەی مەبەستی هاتنە خوارەوەی قورئانە، چونکە لەراستیدا قورئان هێدایەتو نوورو روناکییە، دەرمانی دەردی دڵو دەروونە، مشتوماڵی دڵ دەکا، رەحمەتو بەخششە لەخوداوە بۆ بەندەکانی وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلاَ يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إَلاَّ خَسَاراً﴾الأسراء/٨٢، یان دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاء وَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِي آذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى أُوْلَئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ﴾ فصلت/٤٤.

بەراستی ئەمە بەشێکە لەبەدبەختییەکانیان، ئەوەی هۆکاری هێدایەتە

دەبێتە هۆکاری گومڕایی‌و فەوتان بۆ ئەوان، هەروەکوو چۆن کەسێك میزاجی تێك بچێ خواردن‌و خواردنەوەی پێ ناکەوێ.

ئـەمجار پـاش ئـەوەی پـەروەردگار ئـەوەی روون کـردەوە: کـە مونافیقـەکان بەکافری دەمرن، ئەوەش روون دەکاتەوە: کە هەموو ساڵێك جارو دووجـار تووشـی سزای دونیاییش دەبن دەفـەرموێ: ﴿أَوَلا يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٍ مَرَّةً أَوْ مَـرَّتَيْنِ ثُمَّ لا يَتُوبُونَ وَلا هُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ ئایا ئەو دووڕووانە نازانن: کە هەموو ساڵێك جارێك یان دوو جار بەتاقی دەکرێنـەوە، تووشـی جۆرەها تـەنگو چـەڵەمە دەبـن، گرانـی‌و نەخۆشـی‌و زەرڕو زیانیـان تـووش دێ، ئـەم جـۆرە شـتانەش بەرەواڵـەت خـودا دەخەنەوە یادی ئادەمیزادو وای لێ دەکا مـەیلی ئیمـان هێنـانی ببـی‌و واز لـەکوفرو بێدینی بێنێ، جوداوازی نێوان حەق‌و بەتاڵ بکا، کەچی ئەوانە وێـڕای ئـەم هـەموو تاقیکردنەوانـەی کـە تووشـیان دێـن، تۆبـە ناکـەن‌و لـەتاوانی پێـشوویان پەشـیمان نابنـەوە، پەنـد وەرنـاگرن‌و رام نـابن، بەسـەررەقی دەمێننـەوەو بـەهیچ جـۆری ئامادەباشی ئەوەیان تێدا نیـە قبـووڵی ئیمـان بکـەن؛ پەنـدو ئامۆژگـاری کاریـان تـێ ناکا!

﴿وَإِذَا مَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ نَظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ﴾ ئەگـەر سـورەتێکی قورئـان نـازڵ ببێ بۆ سەر پێغەمبەر ﷺو ئەم مونافیقانە لای دانیشتبن سـەیری یـەکتری دەکـەن، بەچـاو ئامـاژە بـۆ یەکـدی دەکـەن، لـیچ دادەگـرن‌و گاڵتـەیان پـێ دێ، لەبـەر دڵ نەخۆشی‌و بێ بڕوایی یان چ گرنگی بەنیگای تازە هـاتوو نـادەن، خۆسـاز دەکـەن بـۆ هەڵاتن‌و خۆدزینەوە دەیانـەوێ هـەلیان بـۆ هەڵبکـەوی‌و دەرچـن، بەیەکـدی دەڵـێن: ﴿هَلْ يَرَاكُمْ مِنْ أَحَدٍ﴾ ئەرێ کە دەرچوون پێغەمبـەرو موسـوڵمانان ئێوەیـان بینـی؟ ئاگایان لێ بوو کە خۆتان دزییەوە؟

﴿ثُمَّ انصَرَفُوا﴾ ئەمجار هەموویان کۆڕو یانەی پێغەمبەر ﷺ جێ دێڵن‌و پـشت لەحـەق‌و راسـتی هەڵدەکـەن، ئەمـە حـاڵو چـۆنیەتی ژیـانی رۆژانەیانـە، هـەڵس‌و

کەوتو کردارو رەفتاریانە، لەسەر حەق بەردەوام نابن، حەق وەرناگرنو لێی تێناگەن، نایانەوێ لەحەقو راستی حاڵی ببن وەکوو لەشوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿فَمَا لَهُمْ عَنِ التَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ، كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ، فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾المدثر ٤٩-٥١، ﴿للذين كفروا قبلك مهطعين، عن اليمين وعن الشمال عزين﴾المعارج/٣٦-٣٧.
ئەوەتا لێرەدا وەکوو کامێرای تەلەفیزیۆنی وێنەی ئەو کافرانە دەکێشێ، کە لەکۆڕو مەجلیسی پێغەمبەر ﷺ بەهەڵەداوان دەردەچنو لەبیستنی حەقو راستی هەڵدێنو بەرەو گومڕاییو بەتاڵ هەڵدەتێزێنن.

﴿صَرَفَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لا يَفْقَهُونَ﴾ خودا دڵو دەروونی لاداون لەحەقو ئیمانو خێرو نوورو روناکی، هیچ نابیستنو حەق نابینن. یان دوعایە لێیان، واتە: خودا دڵو دەروونیان لەحەقو راستیو نووری ئیمان لابدا، حەقو راستی نەبیسنو توخنی نەکەونو هەرگیز شتێك نەکەن قازانجو بەرژەوەندی خۆیانی تێدا بێ!

﴿بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لا يَفْقَهُونَ﴾ چونکە ئەو بەدبەختانە گەلو نەتەوەیەکن لەو ئایاتانە حاڵی نابن کە دەیانبیستن، نایانەوێ لێیان حاڵی ببن، دڵیان نادەنێ تا لێیان تێ بگەن، بەڵکوو ئەوان خەریکی خۆ لێ گێل کردنو گوێ پێ نەدانن، پەروەردگاریش دڵیانی لاداو وەندەی تر گومڕای کردن! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ﴾الصف/٥.

**تێبینی:**

**ئایەتەکان ئەم حوکمانەیان لێ وەردەگیرێ :**

١. ئیمان زیادو کەم دەکا، ئەمەش رای زوربەی زانایانی سەلەفو خەلەفی موسوڵمانانە!

٢. کوفرو نیفاق دەکەونە سەریەکو پاڵ لێك دەدەنو زیاد دەبن.

٣. بەڵاو موصیبەتو تەنگو چەڵەمە هۆکاری خودا ناسینن.

## ڕەوشتەکانی پێغەمبەر ﷺ کە پەیوەندییان بەئوممەتەکەیەوە هەیە

﴿ لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ
عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ
رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ
إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبەر کرد: کە ئەرکی قورسو ناخۆش بخاتە سەرشانی موسوڵمانان: کە ئەنجامدانیان کارێکی ئەستەمەو کەسێك خودا تۆفیقی نەدا بۆی هەڵناسوڕێن. ئەمجار دێ کۆتایی سوورەتەکە بەشێوەیەك دێنێ کە ئەو ئەرکەیان لەسەر شان سووك بکا، ئەویش ئەوەیە: کە ئەو پێغەمبەرەی ئەو ئەرکانە دەخاتە سەرشانی ئێوە لەخۆتانەو هەر بەهەرەو سەروەرییەکی دەست بکەوێ سەروەری ئێوەیەو ئێوەی پێ بەهرەمەند بن، لەهەمان کاتدا ئەوەش رادەگەیەنێ کە ئەو پێغەمبەرە بەهیچ جۆرێك زەرەرو زیانی ئێوەی ناوێو هەمیشە هەوڵی ئەوەیەتی بەختەوەری دونیاو قیامەتتان دەست بکەوێ. ئەو وەکوو پزیشکی کاراماو لێزان دەیەوێ برینی ئێوە تیمار بکا، دەردی سامناکتان دەرمان دەکا، کەوابێ چیتان پێ رادەگەیەنێ لێی وەربگرنو پابەندی فەرمانو جڵەوگیریەکانی بن!

هەروەها کە لەسەرەتای سوورەتەکەدا ئەوەی راگەیاند: کە خوداو پێغەمبەری خودا بەرین لەموشریکەکان، ئەمجار حاڵو چۆنیەتی مونافیقەکانی قۆناغ بەقۆناغ شی کردەوە، لەرووی ژماردنی نیعمەتەکانییەوە خیطابی ئاڕاستەی نەتەوەی

عەرەب کردو منەتی بەسەردا کردن بەوە: کە لەرەگەزی خۆیان پێغەمبەری بۆ ناردوون، پێغەمبەرێکی رەگەز عەرەبو قورەیشی نەسەب، لەخوداوە نیگای بۆ هێناونو پەیامی پەروەردگاریان پێ رادەگەیەنێ، هەرچی رەوشتی جوانو بەرز هەیە تێیدا هەن، دڵسۆزو بەبەزەییە بۆیانو پێی ناخۆشە تووشی سزاو نارەحەتی ببن.

حاکم لەموستەدرەکدا لەئوبەی کوڕی کەعبەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: دوا ئایەتی قورئان کە هاتۆتە خوارێ ئایەتی ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنفُسِكُمْ...﴾ە

موسلیمو بوخاری لەبەرڕای کوڕی عازیبەوە ریوایەت دەکەن، دەڵێ: دوا ئایەت کە هاتۆتە خوارێ ئایەتی ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ﴾یە دوا سوورەتیش کە هاتۆتە خوارێ سوورەتی (بەرائەیە).

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: دوا ئایەت کە هاتۆتە خوارێ: ئایەتی ﴿وَاتَّقُواْ يَوْماً تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ﴾یە. ماوەی نێوانی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەو کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ هەشتا رۆژ بووە!

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کە لەسەردەمی خەلیفەی یەکەمدا قورئانیان کۆکردەوە بەبڕیاری هەموویان ئەم دوو ئایەتەیان خستۆتە دوا سوورەتی (براءة)وە.

ئیمام ئەحمەدو موسلیمو بوخاریو تیرمیذیو هی تریش ریوایەت دەکەن لەزەیدی کوڕی ثابیتەوە: کە باسی کۆکردنەوەی قورئان دەکا لەسەردەمی حەرزەتی ئەبو بەکرداو رۆڵی خۆی لەو کارە گرنگەدا دەگێڕێتەوە: دەفەرموێ: (....هەتا لەسورەتی (تەوبە)دا دوو ئایەتم لای خوزەیمەی ئەلئەنصاری دەست کەوتن لای کەسی تر نەمدیبوون، ئەویش ئایەتی ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنفُسِكُمْ...﴾هەتا کۆتایی سورەتەکە) کە دەڵێ لای کەسی تر نەمدیبوون واتە: بەنووسراوەیی ئەگینا

لەسینەی خۆی‌و هاوەڵانی تریش‌دا هەڵگیرابوون واتە لەبەریان بوو.

﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنفُسِكُمْ﴾ ئەی موسوڵمانینە! بزانن‌و دڵنیا بن هاتووە بۆ سەر ئێوە پێغەمبەرێك لەخودی خۆتانە، لەرەگەزو نەتەوەی خۆتانەو بەزمانی خۆتان ئاخاوتن دەکا، لاتان ناسراوو رابوردوو زانراوە، هۆزو بنەماڵەی دەناسن‌و لەزمانی حاڵی دەبن، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِّنْهُمْ﴾الجمعة/٢، یان دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ مَنَّ اللّهُ عَلَى الْمُؤمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾آل‌عمران/١٦٤.

**قورئان لێرەدا پێنج رەوشتی بەرزی پێغەمبەری ﷺ دیاری کردوە:**

١- دەفەرموێ: ﴿مِنْ أَنفُسِكُمْ﴾ واتە: ئەی نەتەوەی عەرەب! ئەو پێغەمبەرە لەخودی خۆتانە. مەبەستی هەڵنانی عەرەبەکانە بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن‌و ئیمانی پێ بێنن‌و لەبانگەوازی‌و پەیامەکەی هەڵنەسڵەمنەوە.

٢- دەفەرموێ: ﴿عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ﴾ زۆر لەسەر شانی قورسەو بەلایەوە ناخۆشە ئێوە تووشی تەنگو چەڵەمە بێن، زۆر بەتەنگەوەیە: کە لەدونیاو قیامەتدا تووشی ناخۆشی نەبن. چونکە لەرەگەزی خۆتانەو خۆشی ئێوە خۆشی ئەوە، ناخۆشیتان ناخۆشی ئەوە.

٣- ﴿حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ﴾ زۆر سووره لەسەر ئەوەی شارەزای رێگای خەق‌و هیدایەتتان بکا، بەدڵ دەیەوێ لەدونیاو قیامەتدا لەخۆشی‌و بەختەوەری‌دا بن.

٤- ﴿بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ زۆر بەبەزەیی‌و دڵسۆزە بۆ موسوڵمانان‌و مەبەستیەتی رێگای هیدایەت بگرن‌و لەئاگری دۆزەخ رزگارتان بێ.

کە فەرمانتان پێ دەکا بەجیهاد کردن‌و تەحەممولکردنی نارەحەتی لەم رووەوە نیە: کە سووکایەتیتان پێ بکا، یان لەبەر دڵرەقی‌و توند سروشتی نیە. بەڵکوو ئەوە جۆرێکە لەرەحمەت‌و دڵسۆزی ئەو بۆ ئێوە، دەیەوێ لەکۆیلەیی‌و

ژێردەستەیی رزگارتـان بکـا، گونـاهو تاوانتـان لێ هـەڵوەری، بەتەنگەوەیـە: کـە ئێـوە شەرەفـو سەروەریی هەڵگرتنی پەیامی ئیسلامیتان پێ ببڕێ، ڕەزامەنـدیی خوداتـان دەست کەوێ بەهەشت مسۆگەر بکەن!

جا ئەی پێغەمبەر! ﴿فَإِنْ تَوَلَّـوْا﴾ ئەگـەر ئـەو موشـریکانە پشتیان هـەڵکردو ڕوویـان وەرگێـڕا، گوێیـان بـۆ پەیامەکـەت نـەگرتو ئیمانیـان نـەهێناو بڕوایـان بەپێغەمبەریـەتی تـۆ نـەکردو نەیانویـست بـەگوێرەی شـەریعەتی خـودایی هـەڵسوکەوت بکەن، ئـەوە ﴿فَقُـلْ حَـسْبِيَ اللَّـهُ﴾ تـۆ بڵـێ: مـن خـودام بەسـە، ئـەو پشتیوانم بێ، بەسەر دوژمنانمدا سەر دەکەوەو پێویستیم بەکەسی تـر نیـە. هـەموو هێـزو توانـاو دەسـەڵاتێك هـی ئـەوەو کەسێك پـشت بەئـەو ببەسـتێ حەوێجـەی بەکەسی تر نیـە. ﴿لا إِلَهَ إِلاَّ هُـوَ﴾ هـیچ خودایـەکی حـەقو شـیاو بـۆ پەرسـتن نیـە جگـە لـەزاتی پـەروەردگار، هـیچ خودایـەك نیـە شـیاوی ئـەوە بـێ هانـای بـۆ بـبرێو بەندایەتی بۆ بکرێ جگە لـەخودا، مـن پـشتم بەئـەو بەسـتوەو کـاری خـۆم بەئـەو سپاردوەو پشت بەکەسی تر جگە لەئەو نابەستم!

﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ ئەو خوداو خـاوەنی عەرشـی بەرینـە، گەورەترین دروستکراو: کە عەرشە، لەژێر دەسـەڵاتی ئەودایـە. ئـەبو داوود لەئـەبو دەرداوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: کەسێك بەیانیو ئێوارە بڵێ: ﴿حَسْبِيَ اللَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُـوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُـوَ رَبُّ الْعَـرْشِ الْعَظِـيمِ﴾ حـەوت جـار ئـەم دوعایـە بخوێنـێ، ئـەوەی گرنگە لای خودا بۆی جێ بەجێ دەکا.

کۆتایی سورەتی تەوبە

بسم الله الرحمن الرحیم

# سورەتی یونس

ئەم سوورەتە ناونراوە: سوورەتی یونس؛ چونکە چیرۆکی یونس پێغەمبەری تێدایە ﷺ، چیرۆکی ئەم پێغەمبەرە، تا بڵێی سەرنج ڕاکێشە، چ لەڕووی ئەوەوە: کە بۆ خۆی ماسی قووتی داو ماوەیەك لەسکی ماسیدا مایەوە، یان لەڕووی ئەوەوە: کە گەلەکەی زێدە لە هەموو گەلان کاتێك پەشیمان بوونەوەو ئیمانیان هێنا خودا سزای لەسەر لابردن..

ئەم سوورەتە، گەلێ باسی سەرەکی لەخۆ گرتوونو زوربەی مەبەستە گرینگەکانی قورئانی تێدا کۆکراونەوە؛ وەکوو چەسپاندنی یەکتاپەرستیو ڕوخاندنی شیرکو پوچەڵکردنەوەی بنەماکانی، چەسپاندنی پێغەمبەرایەتیو زیندوبوونەوەو هاتنی ڕۆژی قیامەت، بانگەوازیی بۆ ئیمانهێنان بەنامە ئاسمانییەکانو کۆتایی هێنانی ئەو نامە ئاسمانیو پەیامانە بەقورئانی پیرۆز، کە بەڕواڵەت ئەم سەرە باسانە سەرە باسی ئایەتو سوورەتی مەککەیین. سوورەتە مەککییەکان لەم باسانەدا دەسوڕێنەوە!

مەبەستە سەرەکییەکانی ئەم سوورەتە لەچوارچێوەی حەقیقەتی ئولوهیەتو حەقیقەتی بەندایەتیو چۆنیەتی پەیوەندی نێوان پەروەردگارو بەندەکانیو ناساندنی خودا بەئادەمیزاددا دەسووڕێنەوە، ئادەمیزادەکان فێر دەکەن: چۆن بەندایەتی بکەنو چۆن بی پەرستنو چۆن پابەندی فەرمانو جڵەوگیریەکانی بن، هەوڵ دەدا هەموو ئەو شتە لاوەکیانەی خراونە پاڵ بیرو باوەڕی سروشتیو ڕاستەوەو لەئایینی خودا نینو خەڵکی بەئایین لەقەڵەمیان داون؛ وەدەریان بهاویو بیرو باوەڕی موسوڵمانانی لێ پاك بکاتەوەو خەڵکی بگێڕێتەوە بۆ بەندایەتیکردنو

پەرستنی پەروەردگارێك كە شیاوی پەرستنو بەندایەتی بۆ كردنەو هەر ئەو خودایەو كەسی تر شیاوی پەروەردگاریەتی نیە!

**پەیوەندی سوورەتی (یونس) بە سوورەتی پێش خۆیەوە:**

وەكوو زانیمان سوورەتی (تەوبە) بەباسكردنی رەوشتەكانی پێغەمبەر ﷺ كۆتایی هات، ئەم سوورەتە بەپووچەڵكردنەوەی شكو گومان بەرامبەر هاتنە خوارەوەی نیگا بۆ پێغەمبەر ﷺ دەست پێ دەكا، ئەو شكو گومانانە رەت دەكاتەوە: كە ئاڕاستەی هاتنی نیگا بۆ پێغەمبەر كراوەو موژدەو ترساندنی لەخۆ گرتووە.

هەروەها زانیمان زوربەی ئایەتەكانی سوورەتی پێشوو دەربارەی حاڵو چۆنیەتی موونافیقەكانو هەڵوێستیان بەرامبەر بەقورئان بوو، ئەم سوورەتەش دەربارەی حاڵو چۆنیەتی كافرو موشریكەكانو بیرو رایان بەرامبەر قورئان دەدوێ. كەوابوو: پەیوەندی نێوان ئەم سوورەتەو سورەتی پێشوو ئاشكراو نمایانە، لەوەپێش رەوشتەكانی پێغەمبەری باسكردن كە هەموویان داخوازی ئەوەن ئیمانی پێ بهێنرێ، ئەمجار لێرەشدا باسی ئەو نامەیە دەكا كە بۆی نێردراوە، باسی ئەو پێغەمبەرە دەكا كە رەوانە كراوە، هەموو كاتێكیش ئیشو كاری گومڕایان ئەوەیە: كتێبە ئاسمانییەكان بەدرۆ بزانن‌و بڕوایان پێ نەكەن!

ئەوەشمان لەیاد نەچێ كە مەرج نیە موناسەبەو پەیوەندییەكی ئاشكراو زەق لەنێوان سوورەتەكاندا، یان لەنێوان ئایەتەكانی سوورەتەكاندا هەبن، چونكە زۆر جار مەبەستەكان جۆراو جۆر دەبن، ئوسلووبی قورئانیش ئوسلووبێكی تایبەتیو سەرناسایە، جێگۆڕكەو گواستنەوەی تێدایە؛ لەم مەبەستە دەگوێزێتەوە بۆ مەبەستێكی ترو لەوەوە بۆ یەكێكی تر لەعەقیدەو بیرو باوەڕەوە دەگوێزێتەوە بۆ عیبادەت، بۆ باسی رەوشتو ئەخلاق بۆ پەند هێنانەوە، بۆ چیرۆكو سەرگوزشتە، بۆ ئەحكامی سەوداو مامەڵە، بۆ ئەحكامی ئەحواڵ شەخصیو ...هتد. ئەمەش شێوەو شێوازێكی تایبەتی قورئانەو بۆ كێشكردنی سەرنجو بەئاگا هێنانەوەی دڵو مێشكە

لـەکاتی خوێندنــەوەیدا، بـۆ رەواندنــەوەی وەڕزبــوونو باوێـشكو خەوەنوچـكەیە لەهەستو دەروونی خوێنەرو بیسەردا... بێگومان ئـەم شـێوازو ئوسلووبە داخـوازی زۆرەو كاریگەری گرنگی هەیـە لەسـەر دڵو دەروونـی ئـادەمیزاد، وەكـوو دەبینـدرێ لەبواری فەنو ئـەدەبـدا خـەڵكی زۆر بەپەرۆشـن بـۆ خوێندنـەوەی رۆمـان شـێوازی رانواندنی چیرۆكو تەمثیل، چونكە سەرنجی بینەرانو خوێنـەرانو بیـسەرانی تێـدا رادەكێــشرێ ئەمــەش بــەهۆی هێنــانی روداوی كتــوپڕیو شــتە لاوەكییــەكانو شیكردنەوەی بڕێ لەو شتە لاوەكیانە!

**ئەو باسە سەرەكییانەی ئەم سوورەتە لەخۆی گرتوون ئەمانەن:**

١- هەڵوێــستی موشــریكەكانی مەككــە رادەنــوێنیو دابـو نــەریتی خــودا دەچەسپێنێ

دەربـارەی مـەخلوقاتی خۆی، كـە بـۆ هـەموو گـەلو نەتەوەیـەك پێغەمبـەری ناردوە، حەرزەتی (محمد)یشی كردوە بەسـەرخەتمی پێغەمبـەرانو بەئـەو زنجیرەی پێغەمبەرانی كۆتایی پێ هێناوە، ئەمەش شتێكی ئاساییەو دابو نـەڕێتی خودایـە لەبوونەوەرداو نەدەبوو موشریكەكان سەریان لەوە سوور بمێنـێ كـە خـودا نیگا بـۆ ئادەمزادێكی هەڵبژێراوی خۆی بنێریو دەفـەرموێ: ﴿أَكَانَ لِلنَّـاسِ عَجَبـاً أَنْ أَوْحَيْنَـا إِلَى رَجُلٍ مِنْهُمْ أَنْ أَنْذِرْ النَّاسَ وَبَشِّرْ الَّذِينَ آمَنُـوا أَنَّ لَهُـمْ قَـدَمَ صِـدْقٍ عِنْـدَ رَبِّهِـمْ قَـالَ الْكَافِرُونَ إِنَّ هَذَا لَسَاحِرٌ مُبِينٌ﴾.

٢- حەقیقــەتی ئولوهییــەتو چــۆنیەتی بەندایــەتی بــۆ ئــادەمیزاد روون دەكاتــەوە، ئــەمیش لەرێگــەی نیـشانەكانی بوونــەوەرەوە: كـە گـەواهی هـەبوونی خودایــەكی خــاوەن دەســەڵاتو بــەتوانان. صـیفاتی خـودای كردگـار رادەنــوێنیو نیشانەی دەسەڵاتی ئەو خودایەیان لەبوونـەوەردا لەدەوروبـەردا، لـەخودی خۆیـاندا لەگۆڕانكاری لـەدیاردەكانی سروشـتدا پیـشان دەداو سـەرەنجیانی بـۆ لا رادەكێـشیو لـەدەروازەی دڵو دەروونیـان دەداو هەسـتی نوسـتوویان وەئاگـا دێنـێ! دەفـەرموێ:

﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ...الآية﴾ پاشان سەرەنجامی مەخلووقات بەزیندوبوونەوەو پاداشو سزا دیاری دەکا...

٣- ئەمجار بیرو باوەڕی موشریکەکان روون دەکاتەوە، پێنج جۆر شوبهەو گومانی کافرەکان دیاری دەکاو رەددی ئەوانە دەکاتەوە کە بڕوایان بە پێغەمبەرایەتیو نیگا نیە، بەشێوەیەکی مەنطیقی دڵنیاکەرەوە موناقەشەیان دەکا، ئەوە دەچەسپێنێ: کە قورئان نامەی ئاسمانییەو لەخوداوە بۆ پێغەمبەر رەوانە کراوەو بەدرێژایی رۆژگار بەسەر ئاسایی دەمێنێتەوە، دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ هَـذَا الْقُرْآنُ أَن يُفْتَرَى مِن دُونِ اللّهِ﴾ بەڵگە لەسەر ئەوە دێنێتەوە: کە ئەو قورئانە لەخوداوە هاتووە، تەحەددای موشریکەکانی مەککە دەکاو داوایان لێ دەکا: کە بتوانن بەئەندازەی کورترین سوورەتی ئەم قوئانە بخەنە روو، هەرچەندە ئەو قورەیشییانە لەبارەی رەوانبێژیو زمانپاراویو گوزارەکاریو وێژەوانییەوە سوارچاك بوونو دەستی باڵایان هەبوو، کەچی لەبەرامبەر ئەم تەحەددایەی قورئان بۆڕیان خواردو دەستەوەسانو جۆش دەماوبوون، نەیانتوانی بەربەرەکانی بکەن، ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِ﴾ ئەمجار هەڵوێستی موشریکەکان بەرامبەر قورئان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمِنهُم مَّن يُؤْمِنُ بِهِ وَمِنْهُم مَّن لاَّ يُؤْمِنُ بِهِ﴾.

٤- ئەمجار هەندێ دیاردەی بەتوانایی خودا دەست نیشان دەکا، کە هەموویان بەڵگەن لەسەر تاكو تەنیاییو گەورەیی پەروەردگارو هاندەرن بۆ بڕواپێکردنو ئیمان هێنان، چونکە پەروەردگار کانو سەرچاوەی ژیانو رزقو رۆژیو نازو نیعمەتە. ﴿قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ والأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيَّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللّهُ فَقُلْ أَفَلاَ تَتَّقُونَ ؟!﴾

٥- ئاگاداریو حازریی زاتی پەروەردگار بەسەر هەموو شتێکدا بۆ هەموو شتێك کە پەیوەندی بەژیانی ئادەمیزادەوە هەبێ دەچەسپێنێ، وایان نەخشەکێش

دەكا كە دڵو دەروونی ئادەمیزادەكان پڕ دەكا لەترسو لەرزو هۆشیاریو بەئاگایی، هەروەها دڵو دەروونیان پڕ دەكا لەحاڵەتی چاوەڕوانیو بەتەمای هاتنی سزای خودایی لەهەموو ئانو ساتێكدا، بۆ ئەوەی ئادەمیزادەكان لەخەوی غەفڵەت راست بكاتەوەو بێ ئاگاییو خودا لەبیرچوونەوەیان لەدڵو دەروونیان لێ بڕەوێنێتەوە، بەنازو نیعمەتەكانی ژیان هەڵنەخەڵەتێن!

٦- ئەمجار بۆ پەندو ئامۆژگاری، بۆ چەسپاندنی راستی قورئان بڕێ چیرۆكو بەسەرهاتی پێغەمبەران دەگێڕێتەوە، وەكوو چیرۆكی حەزرەتی نووحو بەسەرهاتی حەزرەتی موساو چیرۆكی حەزرەتی یونس ﷺ.

٧- ئەمجار كۆتایی سوورەتەكە بەوە دێنێ: كە ئادەمیزادان شوێن قورئان بكەونو شەریعەتی خودا بكەن بەپەیڕەوو پرۆگرامی خۆیان، چونكە خێرو خۆشی دونیاو قیامەتی تێدایە بۆ ئادەمیزادو دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَكُمُ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنِ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَا أَنَاْ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ، وَاتَّبِعْ مَا يُوحَى إِلَيْكَ وَاصْبِرْ حَتَّىَ يَحْكُمَ اللّهُ وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ﴾.

ئەمە بەركۆڵێك بوو بۆ راڤەكردنی ئەم سوورەتەو ئەمجار دێینە سەر راڤەكردنی سوورەتەكە بەدرێژی:

## بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

## باسی ناردنی نیگا بۆ پێغەمبەر ﷺ و هەڵوێستی خەڵكی بەرامبەر نیگا

﴿ الٓر تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ

ءَامَنُوٓاْ أَنَّ لَهُمۡ قَدَمَ صِدۡقٍ عِندَ رَبِّهِمۡۗ قَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ إِنَّ
هَٰذَا لَسَٰحِرٞ مُّبِينٌ ﴿٢﴾

دەربارەی هۆکاری نازڵبوونی ئەم ئایەتانە، ئیبنو جەریر لەئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: کە پەروەردگار حەرزەتی موحەممەدی کردە پێغەمبەرو ناردی، ئەویش پەیامی خۆی راگەیاند، عەرەبەکان بانگەوازییەکەیان رەت کردەوەو وتیان: خودا لەوە گەورەترە پێغەمبەری ئادەمی بنێرێ،، ئەوان پێیان وابوو: دەبێ پێغەمبەر فریشتە بێ، ئیتر پەروەردگار بۆ رەواندنەوەی سەرسامیو تێنەگەیشتوویی عەرەبەکان ئایەتی ﴿أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَباً...﴾ی ناردە خوارێ، هەروا ئایەتی ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلاَّ رِجَالاً...﴾یوسف/١٠٩و هی تریشی ناردە خوارێ جا کە پەروەردگار بەڵگە لەدوا بەڵگەی ناردە خوارێ لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر هەر دەبێ ئادەمیزاد بێ، ئەمجار وتیان: جا ئەگەر پێغەمبەر هەر دەبێ ئادەمی بێ، ئەوە کەسانێك هەن لەموحەممەد شیاوترن ببنە پێغەمبەر. وەکوو قورئان لێیان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ هَذَا الْقُرْآنُ عَلَى رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ﴾زخرف/٣١، مەبەستیان وەلید کوڕی موغیرە بوو لەمەککەو مەسعوودی کوڕی عەمری ثەقەفی بوو لەشاری طائیف. ئیتر پەروەردگار بۆچوونەکەیانی رەتکردەوەو فەرمووی: ﴿أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَةَ رَبِّكَ...الآية﴾زخرف/٣٢.

﴿الر﴾ ئەم سێ وشەیە دەبێ بەم شێوەیە بخوێندرێنەوە: الف، لام، را. مەبەستیش لە هێنانی ئەم وشانە: ئاگادارکردنەوەو چاوەڕوانکردنە بۆ ئەو شتەی لەوەدوا دەخوێندرێنەوە بۆ ئەوەی گرنگی پێ بدرێو هەوڵ بدرێ بیسەرو خوێنەر لێی حاڵی ببن.

هەڵبەتـە راڤەكـەران بـۆ مانـای ئـەم جـۆرە وشـانە زۆر مانـای جیـا جیایـان خـستوونەروو، یـەكێ لـەو مانایانـە ئەوەیـە: پـەروەردگار تەحـەددای عەرەبـەكانو هەموو ئادەمیزاد دەكاو دەفەرموێ: ئەوەتا ئێمە قورئانمان لـەو جـۆرە پیتانـە پێـك هێناوە، دە ئێوەش ئازابن لەو پیتانە كتێبێكی ئـاوا بخەنـە روو، وەكوو لەسـەرەتای سوورەتی (بەقەرە)دا ئاماژەمان پێ كردن، یەكە یەكە ماناكانمان شی كردەوە...

﴿تِلْـكَ آيَـاتُ الْكِتَـابِ الْحَكِـيمِ﴾ ئـەو نیگایـەی بـۆت نێـردراوە، ئـەوە ئایـاتی قورئانی پڕ حیكمەتن، یـان ئایـاتی قورئـانی دامـەزراوو هەڵنەوەشاوەن، یـان ئایـاتی قورئـانی خـاوەن حیكمـەتن، یـان ئایـاتی سـوورەتی پـڕ حیكمـەتو دانـایین، ئایـاتی راستـو حـەقن پـەروەردگار بـۆ بەنـدەكانی روونیـان دەكاتـەوە، حـەڵاڵ و حـەرامیان تێدا ئاشكرا دەكا، ئەحكامو سنورەكانی شەریعەتی خودایان تێدا روون دەكرێتەوە.

﴿أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَباً أَنْ أَوْحَيْنَـا إِلَـى رَجُـلٍ مِنْهُمْ﴾ پـەروەردگار نـارەزایی خـۆی دەردەبـڕێ بەرامبـەر ئـەو كافرانـەی كـە پێیـان سـەیرەو دەڵێن: نابـێ پێغەمبـەر لەئادەمیزاد بێ، واتە: هەڵوێستی ئەو برە خەڵكە سـەیرە: كـە ئینكـاری نیگانـاردنی ئێمە دەكەن بۆ ئادەمیزادێك لەرەگەزی خۆیانەو دەڵێن: نابیو ناگونجێ پەروەردگار نیگا بۆ ئادەمیزاد بنێـرێ، پێیـان وایـە هاورەگـەزیی ئـەو پێغەمبـەرە لەگـەڵ ئـەوان دەبێتـە مـانیعو كۆسـپ لەبـەردەم پێغەمبەرایەتیەكـەیدا، واتـە: بـەبیرو بۆچـوونی ئەوان دەبێ پێغەمبەر لەرەگەزی ئادەمیزاد نەبێ!!

قورئان لەچەند شوێنێكدا ئەم بیرو بۆچوونەی كافرەكانی لـەم بـارەوە تۆمـار كـردوە، دەفـەرموێ: ﴿أَبَـشَرٌ يَهْـدُونَنَا﴾التغـابن/٦، یـان ﴿أَبَعَـثَ اللَّـهُ بَـشَراً رَّسُولاً﴾الأسراء/٩٤، یان ﴿لَوْ شَاء رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَائِكَةً﴾فصلت/١٤، (حـەزرەتی هـودو حەزرەتی صالح)یش كە بینیان گەلەكانیان پێیان سەیرە پێغەمبەر لەئادەمیزاد بێ. روویان كردە گەلەكەیانو فەرموویان: ﴿أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَاءكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَى رَجُلٍ مِّنكُمْ﴾الأعراف/٦٣.

ئیبنـو عـەبباس دەفـەرموێ: کـە پـەروەردگار حـەزرەتی موحەممـەدی بەپێغەمبەریی نارد، عەرەبەکان ئینکاریـان کـرد، یـان هەنـدێکیان ئینکاریـان کـرد، وتیان: خودا زۆر لەوە گەورەترە پێغەمبەرەکەی ئادەمیزاد بێ، خودا لەوە بـەرزترە پیاوێکی وەکوو موحەممەد بکاتە فرستادەی خۆی، ئیتر پەروەردگار ئایـەتی ﴿أَكَـانَ لِلنَّاسِ عَجَباً...﴾ی نارده خوارێ.

وێدەچێ سەرسووڕمانەکەیان لـەم ڕووەوە بـوو بـێ: کە حـەزرەتی موحەممـەد پیاوێکی ساماندار نەبوە، بەتەرازووی کۆمەڵایەتی ئەوان پێغەمبەر دەبێ ساماندارو سەرۆك هۆز بێ، چونکە قورەیشییەکان دەیانگوت: سـەیرەو جێگـای سەرسوڕمانە! بۆ خودا کەسی دەست نەکەوت بیکاتە پێغەمبەر جگە لەهەتیوەکەی ئەبو طالیب؟! ئەو کابرا هەژارە کەی بەکەڵکی پێغەمبەریی دێ؟ ئـەوان پێیـان وا بـوو: پێغەمبـەر دەبێ ساماندارو خاوەن نـازو نیعمـەتو سـەرەك هـۆزێکی نـاودار بـێ وەکوو قورئـان لەسەر زمانی ئەوان دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ هَذَا الْقُرْآنُ عَلَى رَجُلٍ مِّـنَ الْقَـرْيَتَيْنِ عَظِـيمٍ﴾الزخـرف/٣١، مەبەستیـشیان یـان وەلیـدی کـوڕی موغـەیرە لەمەککـە یـان مەسعوودی کوڕی عەمری ئەقەفی لـەطائیـف بـوو، لـەڕاستـیدا ئـەم سـەیر لێهاتنو سەرسووڕمانەیان لـەجێی خـۆیدا نـەبوو، هـەموو پێغەمبـەرانی پێـشوو ئـادەمیزاد بوون، وەکو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ جَعَلْنَاهُ مَلَكـاً لَّجَعَلْنَـاهُ رَجُـلاً وَلَلَبَـسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ﴾الأنعام/٩، یـان ﴿قُل لَّوْ كَـانَ فِـي الأَرْضِ مَلآئِكَـةٌ يَمْـشُونَ مُطْمَئِـنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ السَّمَاءِ مَلَكاً رَّسُولاً﴾الأسراء/٩٥.

نـاردنی پێغەمبـەری ئـادەمی بـۆ سـەر ئـادەمیزاد گونجاو تـرە بـۆ وەرگـرتنو قبـووڵکردنی بانگەوازییەکـەیو باشـتر لێـك حـاڵی دەبـنو ئاخـاوتن ئـەنجام دەدەن، ئـەمجار هەڵبـژاردنی ئادەمیزادێـك بـۆ پێغەمبەرایـەتیو ئەنجامـدانی ئـەرکی ئـەو پەیامـە، ئـەوە خـودا بـۆ خـۆی باشـتر دەزانـێ کـێ شـیاوی ئـەو پلـەو پایەیـەو دەستنیشانکردنی یەکێك بۆ ئەو کارە عائیـد بـەخودا خۆیـەتیو کـەس مـافی ئـەوەی

نیە ڕەخنە بگرێ ﴿اللَّـهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلَائِكَةِ رُسُلاً وَمِنَ النَّاسِ﴾الحج/٧٥، یان دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ﴾الأنعام/١٢٤.

ئەرکی سەرشانی ئەم پێغەمبەرە نیگا بۆ کراوە ئەوەیە: ﴿ أَنْ أَنْذِرْ النَّاسَ﴾ واتە: نیگامان بۆ کردوە کە خەڵکی بترسێنێ لەسزای دۆزەخ ئەگەر لەسەر کوفرو بێدینی بمێننەوە، فێری یەکتاپەرستیو خوداناسییان بکا، مەبەستەکانی ئایینیان بۆ روون بکاتەوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا ئەرکی سەرشانی پێغەمبەر دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿لِتُنذِرَ قَوْماً مَّا أُنذِرَ آبَاؤُهُمْ فَهُمْ غَافِلُونَ﴾یس/٦.

وێڕای ئەم ترساندنو هەڕەشەلێکردنە ﴿وَبَشِّرْ الَّذِينَ آمَنُوا أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِنْدَ رَبِّهِمْ﴾ مزگێنی بدە بەو کەسانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوەی باش ئەنجام دەدەن، کە لای پەروەردگاری خۆیان پلەو پایەی بەرزو شکۆداریان هەیە لەبەهەشتی رازاوەو بەریندا، پاداشی کردەوەکانیان وەردەگرنەوە، نوێژو رۆژوو خێرو خێراتیان پەسەندو وەرگیراوە...

هەڵبەتە موژە دانو ترساندن تایبەتمەندترین رەوشتی پێغەمبەرن ﷺ قورئانی پیرۆز چەند جارێك ئاماژە بۆ ئەم ئەرکانە دەکاو دەفەرموێ: ﴿قَيِّماً لِّيُنذِرَ بَأْساً شَدِيداً مِن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْراً حَسَناً﴾الكهف/٢، یان دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً﴾الأحزاب/٤٥، جا هەرچەندە ئێمە پێغەمبەرێکی ئادەمیو لەرەگەزی خۆیانو ناسراو لای خۆیانمان بۆ سەر ناردوونو موژدەدەرو ترسێنەرە، راستگۆییو ئەمانەتپارێزیو خاوەن ناوبانگی پیاوەتیو رابوردوی سەربەرزانەی لای هەموانیان ئاشکراو نمایانە، کەچی ﴿قَالَ الْكَافِرُونَ إِنَّ هَذَا لَسَاحِرٌ مُبِينٌ﴾ ئەو کافرانە، کە ئەو پێغەمبەرە رەوشت جوانو رابووردوو پاکە هاتە سەریان لەجیاتی ئەوەی ئیمانی پێ بهێنن، وتیان: ئەم موحەممەدە جادوبازێکی ئاشکراو نمایانە!

بەڵێ هەرچەندە نیگاو سروشتی خودا بۆ پێغەمبەران ئەوەندە ئاشکراو روونەو بەخششێکی خوداییە دەیدا بەهەندێ بەندەی هەڵبژاردەی خۆیو رەحمەتو بەهرەیە بۆ ئادەمیزادو دەبوایە زۆر زوو ئیمانیان بەفروستادەی خودا بهێنایەو یەکسەر بەرەو پیری بانگەوازییەکەی بچن، کەچی بەلایانەوە سەیرو سەمەرەیەو خودی فروستادەکە بەجادوباز دەزانن!!

قیرائەتێکی تر بۆ ئەم رستەیە هەیە، لەجیاتی (ساحر مبين) دەخوێندرێتەوە (سِحْرٌ مبين) بەگوێرەی ئەم قیرائەتە، ماناکەی بەم جۆرە دەبێ؛ کافرەکان دەیانگوت: بێگومان ئەم قورئانە کە موحەممەد هێناویەتی سیحرو چاوبەستەیەکی ئاشکرایەو حەوێجەی بەبەڵگە نیە!

بەهەرحاڵ. ئەو کافرانە قورئانیان بەسیحر لەقەڵەم داوەو پێغەمبەریان بەساحیر زانیوە، لەهەردوو بۆچوونەکەیاندا بەهەڵەچوونو درۆ دەکەن، دەبوایە ئەوان (ئەگەر هۆشیان بوایە) بیانگوتایە ئەمە پێغەمبەرەو نیگای بۆ کراوە، چونکە ئەوەی کە دەیخوێندەوە موعجیزەو سەرئاسایە، کەلامی خودایەو بەرنامەی ژیانە. سیحر هیچ جۆرە شتێکی لەحەقائیقی بوونەوەر لەخۆنەگرتووە، بەرنامەی ژیانو شەریعەتی تێدا نیە، بەلام قورئان ئەحکامی بەرزو یاسای پیرۆزو ئامۆژگاری بەپێزی تێدایە، لەبارەی زانیاری رامیاریو کۆمەلایەتیو ئەخلاقو رەوشت تابلێی دەوڵەمەندەو لەروی شێوازو نەظمەو ماناوە موعجیزەو سەرئاسایەو شاکاری پەروەردگارەو ئادەمیزاد ناتوانن وێنەی تەنانەت کورترین سوورەتی بخەنە رو!

بەلام ئەوەندەی پێ نەچوو هۆشمەندەکانی عەرەبو داناکانیان بۆیان روون بووە: کە قورئان سیحر نیەو پێغەمبەر جادوباز نیە، چونکە ئەوان سیحرو جادوویان بەتاقی کردبوەوە، کە تێفکرین نەپێغەمبەر ﷺ دیاردەی ساحیریی پێوە دیار بووە، نەقورئانیش لەسیحر دەچوو. بۆیە وردە وردە ملیان لەموسوڵمان بوون نا!

ئاشـکرایە سـیحر زانیارییەکـە پـشت بـەفێڵو چاوبەسـتەکیو شـەعوەزە دەبەستێ، یان بەکارتێکردنی تایبەتمەندی برێ شتی سروشـتی ئـەنجام دەدرێ، یـان پەیوەنـدی بەئەستێرەناسـیو دەروونزانـیو لێکۆڵینـەوە لـەم بوارانـەدا هەیـە، دەی بەهیچ جۆرێك قورئان لەم جۆرە شتانە ناچیو ئەم دیاردانەی تێدا بـەدی نـاکرێن، بـەڵکوو پێـچەوانەی ئـەو شـتانەیەو لـەزوور ئـەو شـتانەوەیە، چـونکە نیگـای پەروەردگارەو هاتۆتە سەر دڵو دەروونی پێغەمبەرو ئەحکامی بەرزو پیرۆزی لەخۆ گرتوون، کە تەلۆکی بوونـەوەرەو بەرنامـەی ژیانـە، لـەبواری تەشریعو قـەضاوەتو رامیـاریو کۆمەڵناسـیو زانیـاری هەمـەجۆرو ئـەخلاقو رەوشـت دا نامەیـەکی بـێ وێنەیە، لەرووی شێوازو وشەسازیو ماناوە سەرئاسایەو شاکارێکی تاقانەیە!

## خودا بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییەو پێویستە ئادەمیزادەکان بەندایەتی بکەن

﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۖ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ إِذْنِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ


٣ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئـەوەی راگەیانـد: کـە کافرەکـان سەرسـام بـوون لـەوەی خـودا نیگـا بـۆ ئـادەمیزاد بکـاو ئـادەمی بکاتـە فروسـتادەی خـۆی، لێـرەدا بۆچوونەکەیانی رەت کردەوەو ئەوەی چەسپاند: کە شتێکی ئاساییە خودا نیگا بـۆ بەندەیەکی هەڵبژاردەی خۆی بکاو بیکاتـە فروسـتادەی خۆیو ئـەرکی بانگـەوازیو

ترساندنو مژدەدانی بخاتە سەرشان! ئەمجار لێرەدا دوو شتی سەرەکی دەچەسپێنێ:

١- ئەوە دەچەسپێنێ: کە ئەم بوونەوەرە پەروەردگارێکی بەتواناو زاناو دانا بەدیهێناوەو هەڵیدەسوڕێنێو فەرمانڕەوای موطلەقە تێیدا.

٢- لەئایەتی دوایشدا حەشرو نەشرو زیندوبوونەوەو هاتنی قیامەت دەچەسپێنێ، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك پاداشو سزای کردەوەکانی وەربگرێتەوە.

هەڵبەتە ئەمە قەضییەیەکی بنەڕەتیو سەرەکیە لەبواری بیرو باوەڕدا، قەضییەی ربووبییەتو قەضییەی ئولوهییەت دوو باسی گرنگی عەقیدەن، موشریکەکان بەجیددی ئینکاریان دەکردن، ئەوان بڕوایان وا بوو: کە بوونەوەر خودای هەیەو ئەم کەونە بێ خاوەنو پەروەردگار نابێ، چونکە سروشتی ئادەمیزاد هەرگیز ناتوانێ قەناعەت بەخۆی بکا: کە ئەم بوونەوەرە بێ خودا بێ، بەدەگمەن نەبێ هەموو ئادەمییەك بڕوای وایە: کە بوونەوەر خودایەکی خاوەن دەسەڵاتی هەیە.

جا عەرەبەکان لەگەڵ ئەوەدا بڕوایان وا بوو: کە بوونەوەر خودای هەیەو ئەم کەونە بێ پەروەردگاری دروستکار نابیو لەخۆڕا نەهاتۆتە وجوود، بەڵام هاوەڵیان بۆ خودا دادەناو بەندایەتییان بۆ دەکردن بۆ ئەوەی لەخودای کردگاریان نزیکیان بکەنەوەو ببنە شەفاعەتکار بۆیان!

هەڵبەتە قورئانی پیرۆز ناچێتە ناو کێشەو جەدەلێکی ذیهنی وشكو برینگەوە دەربارەی قەضییەی ئولوهییەتو ربوبییەت، وەکوو ئەو کێشەو جیدالەی دوایی لەژێر کاریگەریی مەنطیقی یۆنانیو فەلسەفەی ئیغریقییەوە هاتە کایەوە، بەڵکوو بەشێوەیەکی ڕەوانو ئاسانو بەمەنطیقیکی سروشتی قەضییەکە رادەنوێنیو بەڵگەکان ئاراستەی دڵو مێشکی ئادەمیزادەکان دەکاو هەستو شعوور

دەبزوێنیو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمْ اللّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ بێگومان خودای ئێوە ئەڵلایە؛ ئەو خودایەی ئاسمانەکانو زەوی لەشەش ڕۆژ یان شەش کاتدا بەدیهێناون، ئەم بوونەوەرە بەرفراوانە کە خەیاڵیش پەی بەئەمپەڕەو ئەوپەڕی نابا، بەئاسمانو زەوییەوە، بەمانگو ڕۆژو ئەستێرەو مەجەڕەو شارە ئەستێرەکانەوە، بەشەوو ڕۆژو ئاوو هەوایەوە، بەهەموو ئەو شتانەی وان لەئاسمانەکاندا، بەهەموو چۆمو دەریاو کێوودەشتو دۆڵو زیندەوەری سەرزەویو ناو خاکو ناو دەریاکانەوە هەموویان دروستکراوو بەدیهێنراوی خودای کردگارن، پەروەردگار لەماوەو کاتێکدا دروستی کردونو بەدیهێناون: کە هەر خۆی دەزانێ چەند بووەو چەندی خایاندوە!

ئەی ئادەمیزاد! سەیر بکە: ئەم شەوە تاریکەی کە وەکوو: پەردەی ئەستوور ملەما لەبوونەوەر دەبڕیو عوالیمەکان دادەپۆشیو هێدیو هێمنییەك دەخاتەوە، هەستو خۆستەکان کپ دەکاو زیندوەکان لەناو لانەکانیاندا وەردەکەوێنێ، ئەمجار ئەم شەوە سامناکە ڕادەبڕیو شەبەقی بەیانی لەئاسۆوە دڕ بەتاریکی دەداو وەکوو پێکەنینی منداڵی ساوا دەم دەکاتەوە، ئەم جمو جۆڵەی بەیانی دەیخاتەوە ناو بوونەوەرو نەشو نما دەخاتە ناو ژیانو زیندەوەرانەوە، ئەم سێبەرە کشاوەی: کە بینەر وا دەزانێ ڕاوەستاوە، لەڕاستیدا بەهێدی دەکشیو ڕاوەستانی نیە، ئەم باڵندەیەی بەیانی بەبرسیایەتی دەڕواو ئێواران بەتێری دەگەڕێتەوە، ئەم زیندەوەرانەی باز دەهاونو دێنو دەچنو لەجمو جوڵ دان، ئەم گیاو گژو دارو درەختو ڕووەکانە کە لەگەشو نمادان، ئەم مەخلووقاتە هەمەجۆرەی تێکەوە دەهاویو دێو دەچێ، ئەم دەڕواو ئەو دێ، ئەو منداڵدانانەی وەچە دەخەنەوەو ئەو گۆڕانەی مردو قووت دەدەن، ئەم حەمکە وێنەو سایەو شێوەو شێوازو جمو جۆڵ و هاتو چۆو ڕزینو تازە بونەوەو سیس بوونو گەشبوونەوە، لەدایکبوونو مردنو هەڵسوڕانی بێ وچانی ئەم بوونەوەرە بەرفراوانەی کە ساتە وەختێك ڕاوەستانی نیەو شەوو ڕۆژ لەهاتو چۆدان... ئەمانە هەموویان هەستو نستی ئادەمیزاد

دەجولێنن‌و لەناخەوە هەڵیدەنێن بۆ ئەوەی بیر لەبوونەوەر بکاتەوەو بڕوانی‌و رامێنی‌و تێ بفکری‌و بزانێ: کە ئەم بوونەوەرە بەبێ هودە دروست نەکراوەو بێ پەروەردگار نیەو نابێ!

ئەڵێ ئەو خودایەی شیاوی خودایەتی‌و پەرستنە ئەو خودایەیە: کە ئەم بوونەوەرەی بەو جۆرە رێکی‌و پێکییە هێناوەتە کایەوە، بەدانایی‌و زانایی رێکی خستوە.

﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُدَبِّرُ الأَمْرَ﴾ ئەمجار کۆنترۆڵی عەرشی کرد، کۆنترۆڵکردن‌و بەسەردا راگەیشتنێك کە شیاوی زاتی پاکی بێ. لەگەڵ گەورەیی‌و شکۆمەندیی ئەودا بگونجێ، جگە لەخودا خۆی کەسی تر نازانێ ئەو کۆنترۆڵکردنە چۆنەو چۆن نیە..

عەرش: کورسی یان مەڵبەندی بەڕێوەبردنی بوونەوەرە، گەورەترین دروستکراوی بوونەوەرە، جگە لەخودا کەسی تر چۆنیەتی عەرش نازانێ..

پەروەردگار کە کۆنترۆڵی عەرشی کردوەو فەرمانڕەوایی بوونەوەر دەکاو کاروباری مەخلوقات‌و مەلەکووت بەحیکمەت‌و زانایی خۆی هەڵدەسووڕێنی‌و بەگوێرەی نەخشەو پلانی ئەزەلی خۆی‌و داخوازی حیکمەت‌و ئیرادەو مەشیئەت ئیش‌و کاری بوونەوەر تاوو توێ دەکا. سەرەتاو کۆتایی شتەکان مەزندە دەکا، چۆنیەتی‌و گونجانی شتەکان لەناو خۆیان‌داو داخوازییەکان رێك‌و پێك دەکا، سەرەتاو ئاکامەکانیان دیاری دەکا.

مامۆستا سەیید: دەفەرموێ: ئیستیوا لەسەر عەرش کینایەو درکەیە: لەپلەو پایەی دەست بەسەردا راگەییشتن‌و کۆنترۆڵ کردن‌و خستنە ژێر رکێفێکی بەردەوام‌و دامەزراوەوە بەزمان‌و زاراوەیەك کە ئادەمیزاد لێی حاڵی ببن‌و ماناکانی پێ بزانن...

وشـەی ﴿ثُمَّ﴾ لێـرەدا بـۆ دیـاریکردنی زەمـان نیـە، وەغرانـی مـاوە ناگەیـەنێ، بەڵکوو بوعدێکی مەعنـەوی دەگەیـەنێ، کـات لـەم مەقامـەدا هـیچ سایەو بـوونێکی نیە، چونکە کاتـو حاڵەتـو چۆنیەتییەك نیـە خـودا تێیـدا نـەبوو بـیو پاشـان تێـی هاتبێ، خودا پاکـو بـەرزو پـیرۆزە لەهـەر شـتێك کـە زارەوەی (حـدوث) بیگرێتـەوە، هـەر شـتێك پەیوەنـدی بـەکاتو شـوێنەوە هـەبێ پـەروەردگار لـەخۆناگرێ؛ خـودا ناخرێتـە نـاو جوغزیانـەوە، بۆیـە بەدڵنیاییـەوە دەڵێین: وشـەی ﴿ثُـمَّ﴾لێـرەدا بـۆ بوعـدی مەعنەوییـە، ئێمـەیش دڵنیـاین لـەوەی کـە ئێمـە سـنووری رێگـا پێـدراوو ئەمینمان نەبەزاندوە، ئەو ئەندازەیەی رەوایە بـۆ عـەقڵ و هۆشـی ئـادەمیزادان کـە تێیانـدا بڕیـار بـدەن نـەمان بەزانـدوە!! چـونکە ئێمـە پـشت بەقاعیدەیـەکی کـوللی دەبەستین، پەروەردگار بەدوور دەگـرین لەهـەموو شـتێك کـە بـوونی پـاش نـەبوون (حدوث) بگەیەنێ، هەر شتێك داخوازی کاتـو شوێنی تێدا بێ بەراوەی نازانین زاتی خودای تێدا دیاری بکەین.

بۆیـە زانایـانی سـەلەفی صـالح لێـرەدا دەفـەرموون: ئیـستیوای خـودا بەسـەر عەرەشدا بوەو هەیە، وەلێ چۆنیەتیەکەی بـۆ ئێمـە نەزانـدراوە، بڕوامـان بـەخوداو بەعـەرشو ئیـستیوای خـودا بەسـەر عـەرەشدا هەیـە، بـەلام لەچـۆنیەتیەکەی ناکۆڵینـەوەو نـاتوانین بگەینـە ئامـانج، چـونکە زانیـاری ئێمـە سـنووردارەو پـەی بەچۆنیەتی ئیستیوای سەر عەرش نابا.

﴿مَا مِنْ شَفِيعٍ إِلاَّ مِنْ بَعْدِ إِذْنِهِ﴾ هـیچ تکـا کـارو شـەفاعەتخوازێك نیـە، بتوانـێ شەفاعەت بۆ یەکێك بکا مەگەر خودا بۆ خۆی رێگە بەو تکاکارە بدا!!

هـەموو کـارو بارێـك بەدەسـت خـودا خۆیـەتی، هـەموو بڕیارێـك هـی ئـەوەو لەوەوەیە: هیچ شـەفاعەتکارێك نیـە بتوانـێ بـەبێ ئیزنـی خـودا بەنـدەکان لـەخودا نزیـك بکاتـەوەو شـەفاعەتیان بـۆ بکـا، ئەمـەش بـەگوێرەی نەخـشەو پـیلانو مەزندەکردنی پەروەردگار خۆیو شیاوی ئەو کەسانە بۆ شەفاعەتکارییو شەفاعەت

بۆ کردن بەهۆی ئیمانو کردەوەی چاکیانەوە، نەك بەتەنها پاڵدانەوە بەهیوای شەفاعەت! بەمەش بیرو بڕوای ئەو کافرانە پوچەڵ دەبێتەوە کە بتو صەنەمو فریشتەیان دەپەرستو پێیان وا بوو: شەفاعەتیان قبووڵەو هەرگیز ڕەت ناکرێتەوە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ﴾البقرة/٢٥٥، یان دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِندَهُ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُ﴾سبأ/٢٣، یان دەفەرموێ: ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئاً إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَى﴾النجم/٢٦، یان دەفەرموێ: ﴿يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَنُ وَرَضِيَ لَهُ قَوْلاً﴾طه/١٠٩.

لەهەمان کاتدا شەفاعەتی ئەو کەسانە دەچەسپێنێ کە خودای میهرەبان ئیزنی شەفاعەتکردنیان دەداو ڕازییە شەفاعەت بکەن!

﴿ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ﴾ ئەو خودایەی ئەوە صیفەتەکانی: کە لەڕاستیدا صیفەتەکانی کە صیفەتی خودایەتیو پەروەردگاریەتییە، هەموویان صیفاتی کەمالو جەمالن، صیفەتی خەڵقندەییو مەزندەکردنو دانایيو نەخشەکێشانو هەڵسوڕاندنی بوونەوەرو بڕیاردان لەشەفاعەت کردندان، هەر ئەو خودایە سەروکاری ئیشەکانتان دەکاو کەسی تر ڕایەی ناکەوێ هاوبەشی بێ لەخودایەتیدا، لەهەموو ئەو صیفەتانەی کە بۆ زاتی پاکی دەشێنو تایبەتن بەئەو!

﴿فَاعْبُدُوهُ﴾ یەکتاپەرستيو بەندایەتی هەر بۆ ئەو بکەن، عیبادەت بۆ ئەو ئەنجام بدەن ﴿أَفَلا تَذَكَّرُونَ﴾ ئەوە بۆ بیر لەئیشو سەرەنجامی خۆتان ناکەنەوە، ئەی گرۆهی موشریکەکان! بۆ ئەوەی لەڕوانگەی بیر کردنەوەتانەوە هۆش خۆتان بێنەوەو بزانن، کە هەر خودا شیاوی پەروەردگاریەتيو پەرستش بۆ کردنە، نەك ئەو خودا درۆزنانەی ئێوە بەخودایان دەزانو کڕنووشیان بۆ دەبەنو بەهیوان شەفاعەتتان بۆ بکەنو لەخوداتان نزیك بکەنەوە، لەکاتێکدا ئێوە دەزانن: هەر خودا بەدیهێنەرو دروستکارە. وەکوو قورئان لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم

مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾الزخرف/٨٧. یان دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ؟ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾المؤمنون/٨٦-٨٧، یان دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾الزمر/٣٨.

بێگومان عەرەبەکان بڕوایان بەتاکو تەنهایی خودا هەبوو لەربوبیەتدا دەیانزانی بەدیهێنەر هەر ئەوەو کەسی تر توانای بەدیهێنانی نیە، وەکوو لەو کۆمەڵە ئایەتانەی پێشەوە دەردەکەوێ، بەڵام ئەو عەرەبە نەفامانە لەئولوهییەتدا هاوەڵیان بۆ خودا دادەنا، عیبادەتو پەرستشیان بەتەنها بۆ خودا نەبوو، بۆیە لیرەدا فەرمووی: ﴿ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ﴾ ئەمجار بانگەوازی کردن بۆ بیرکردنەوەو بەخۆدا هاتنەوە، فەرمووی: ﴿أَفَلا تَذَكَّرُونَ ؟﴾ واتە: ئەوە بۆ ئەوەندە نەفامو نەزانن؟ بۆ بیر ناکەنەوەو تێنافکرن کە خودا بەدیهێنەرو دروستکاری ئاسمانەکانو زەوییە بەدیهێنانو دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی بکەنە بەڵگە لەسەر تاکو تەنهایی خودا لەبواری ئولوهییەتو ربوبییەتدا؟!

**تێبینی :**

ئایەتەکان بەئاشکرا ئەم حوکمانەیان لێ وەردەگیرێن :

١- چەسپاندنی تاکو تەنهایی خوداو کورت هەڵهێنانی عیبادەت هەر بۆ ئەو.

٢- دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی لەشەش کاتدا یان لەشەش رۆژدا، هەرچەندە دەیتوانی لەچاولێکنانێکدا بەدییان بهێنێ، بەڵام کەوایکردوە بۆ ئەوەیە بەندەکانی بەکارامایی‌و بێ هەڵەشەیی کارەکانیان ئەنجام بدەن.

٣- زانایانی ئیسلام (اجماع) کۆڕایان وایە: کەوا لەژوور ئاسمانەکانەوە قەبارەیەکی گەورەو شکۆمەند هەیە. پێی دەگوترێ عەرش، چۆنیەتی‌و چەندییەتی ئەو عەرشە هەر خودا دەزانێ‌و چۆنیەتی کۆنترۆڵکردنەکەشی هەر خۆی دەزانێ!

٤- رۆژی قیامەت بەبێ ئیزنی خودا (نەپێغەمبەرو نەغەیری پێغەمبەر) کەس

ناتوانێ شەفاعەت بکا.

٥- هەر خودا بۆ خۆی کاروباری بوونەوەر هەڵدەسوڕێنیو کەسی تر هاوەڵ و هاوبەشی نیە، کارەکانیشی بەمەحضی حیکمەتو دانایی خۆیەتیو کەس تەگبیرو نەخشەی بۆ ناکێشێ، لەسۆنگەی شەفاعەتو ڕێنومایی کەسەوە نیە.

## بڕوا بەڕۆژی قیامەتو زیندوو بوونەوەو پاداش

﴿ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا وَعْدَ اللَّهِ حَقًّا إِنَّهُ يَبْدَؤُا الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ بِالْقِسْطِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْفُرُونَ ﴿٤﴾ ﴾

لەئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار هەبوونو تاکو تەنهایی خۆی چەسپاند، ئەوەی ڕونکردەوە: کە هەر خۆی شیاوی پەرستشو عیبادەت بۆ کردنەو نابێ کەسی تری بۆ بکرێ بەهاوەڵ و هاوبەش؛؛ لێرەشدا بنەمایەکی تری گرنگ دەچەسپێنێ، ئەویش زیندووبوونەوەو سزاو پاداش وەرگرتنەوەیە لەسەر کردەوە، چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە، دەفەرموێ: ﴿إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً﴾ هەر بۆ لای خودایە گەڕانەوەتان، دوای مردن زیندو دەکرێنەوە، هەمووتان دچنەوە بەرقاپی خودا، یەك کەستان پاشگوێ ناخریو لەبیر ناچێتەوە، ﴿وَعْدَ اللَّهِ حَقّاً﴾ خودا بۆ خۆی ئەم وادەو بەڵێنەی داوەو وادەو بەڵێنێ خوداش پاشگەزبوونەوەی تێدا نیەو

هەر دێتە جێ، هەموو کەس ئاکامی کرەوەکانی خۆی دێتەوە رێو پاداشو سزای خۆی وەردەگرێتەوە.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە، کە چۆن سەرتا مەخلووقاتی بەدیهێناوە، ئاواش جارێکی تر پاش مردنو لەناوچوون دروستیان دەکاتەوە، ئاشکراشە دروستکردنەوە لەدروستکردن ئاسانترە. هەر چەندە بەنیسبەت خوداوە کاری ئاسانو گران چوون یەکن. دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ﴾ بێگومان خودا سەرەتا مەخلووقاتی بەدیهێناوەو پاشان جارێکی تر دروستیان دەکاتەوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾الروم/٢٧، دروستکردنی ئادەمیزادو زیندەوەر ئاشکرایەو رۆژانە دەبیندرێو دەزاندرێ کە چەند زارۆکو بێچوو لەدایك دەبنو دێنە کۆڕی ژیانەوەو پێش ماوەیەك ئەوانە نەبوون، وەلێ ئادەمیزاد تا ئێستا نازانێو رەنگە لەمە دواش هەر نەزانێ سەرەتای دروستبوون چۆنەو چۆن مادە گیانی تێ دەچێو وەگەڕ دەکەوێو دەکەوێتە جمو جووڵ.

دەربارەی دروستبوونەوەی پاش دونیا خراپ بوون، ئەوە زانا ماددییەکانیش بۆیان روون بۆتەوە: کە ئەم کەونە تێکدەچێو دونیا وێران دەبێ، زۆر بەڵگەی زانستییان لەسەر بەکۆتاهاتنی ئەم دونیایە هێناوەتەوە، بەڵام برێکیان ئینکاری زیندوبوونەوەو پاداش وەرگرتنەوەو سزادان لەسەر کردەوەی دونیا دەکەن. وەلێ قورئان بەم بەڵگە بەهێزە هاتنی قیامەتو زیندوبوونەوەی چەسپاند، بەم بەڵگە سادەو سروشتییە: کە دەفەرموێ: کەسێك بتوانێ لەنەبوەوە بوونەوەر دروست بکاو بیهێنێتە گۆڕێ؛ دەتوانێ سەرلەنوێ جارێکی تر گیانەکان بخاتەوە ناو لاشەوەو دوای مردن زیندوویان بکاتەوە. ئەمەش بەڵگەیەکە، لەوەتەری هەستی ئادەمیزاد دەداو دەیهەژێنێو کاریگەریی تەواوی هەیە!

مەبەستییش لەسەر لەنوێ دروستکردنەوە: هاتنی ڕۆژی قیامەتو زیندو کردنەوەو حیسابکردنو لێپرسینەوەیە لەئادەمیزادەکان ﴿لِيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ بۆ ئەوەی پاداش بداتەوە بەئەو موسوڵمانانەی ئیمانیان هێناوە بەخوداو بەپێغەمبەرانو بەو نامانەی بۆیان نێردراوەو کرداری باشیان ئەنجام داوە ﴿بِالْقِسْطِ﴾ بەعەدالەتکاریو پاداشی تەواو؛ بۆ ئەوەی هەموو کەسێك پاداشو سزای شیاوی خۆیان وەربگرنەوە وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئاً وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ﴾ الأنبياء/٤٧.

عەدالەتکاریی لەپاداشدانەوەدا دژایەتی نیە لەگەڵ ئەوەدا: کە خودا پاداشی چاکەکاران بەدوو چەندانە دەداتەوە، چونکە ئەوە فەضلو بەخششێکە خودا بەمەحضی ڕەحمەتی خۆی دەیدا، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِ إِنَّهُ غَفُورٌ شَكُورٌ﴾فاطر/٣٠. یان دەفەرموێ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ﴾یونس/٢٦، دیارە زێدەکە فەضلو بەخششی خودایە.

هەڵبەتە گەیشتن بەلەزەتو خێرو خۆشی بێ ئێشو ئازارو ترس، مەبەستێکی دروستکردنەوەو زیندوکردنەوەیە، ترۆپکی کەمالی ئادەمیزادییەو ئەو هیواو ئاواتەیە: کە دەگونجێ ئادەمیزاد بیگاتێ، ئاشکراشە ئەو هیواو ئاواتە لەم دونیا پڕ تەنگو چەڵەمەو پڕ دەردو بەڵاو ئازارو ئەندێشەیەدا دەستەبەر نابێ، خۆ ئەگەر لەم ژیانە کورتەی دونیادا ئادەمیزاد تەنها هەست بەبڕانەوەی لەزەتو خۆشی بکاو بڕوای وا بێ ئەو خۆشیو لەزەتانەی تێیدا دەژی دەبڕێتەوە، ئیتر جارێکی تر زیندو نابێتەوە، ئەوە بۆ خۆی کەمو کورتییەو نیشانەی نەگەیشتنی ئادەمیزادە بەپلەی کەمالو سەرفرازیی!

کەوابوو: ڕزگار بوون لەکەمو کورتیو دەردو بەڵاو تەنگو چەڵەمەو لەززەت وەرگرتن بەدڵنیایی لەژیانی هەتا هەتاییو بەبێ ترسو خەمو خەفەت ئەمە

لەژیانی ئەو دونیادا لەبەهەشتدا دەستەبەر دەبیو ئادەمیزاد پێی دەگاو دەگاتە ترۆپکی کەمالی ئادەمیزادییو خێرو خۆشی نەبڕاوەی دەست دەکەوێو بەختەوەر دەبێ!

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا لَهُمْ شَرَابٌ مِنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْفُرُونَ﴾ ئەوانەی کافرنو بڕوایان بەخوداو پێغەمبەرانی نیەو ئینکاری زیندو بوونەوە دەکەن، سەریان سووڕ دەمێنێ لەوەی: کە خودا نیگای بۆ بەندەیەکی هەڵبژاردەی خۆی کردوە، بۆ ئەوەی لەئاگری دۆزەخ بیانترسێنیو موژدەی بەهەشتیان بداتێ، ئەوانە سزاو تۆڵەی کوفرو تاوانیان لێ دەستێندریو دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە، لەباتی ئاوی ساردو گەواراو سازگار ئاوی کوڵاتوویان دەدرێتێ بۆ خواردنەوە، تینوویانەو ناتوانن ئەو ئاوە گەرمە ناسازە بخۆنەوە، کە دەیخۆنەوە قورگو گەدەو ریخۆڵەیان قاشقاش دەکاو دایدەپلۆخێنێو ناو سکیان دەبرژێنێ، لەباتی نەهێشتنی تینوایەتییان تووشی ئەو ئازارە دژوارە دەبن، بەراستی ئەو شەرابو خواردنەوەیان خراپ شەرابێکە کە دەرخواردیان دەدرێ، وێڕای ئەوەش سزای بەئێشیان هەیە، لەهەموو لایەکەوە لەعەزابو ئازاری بەئێشدا دەتلێنەوە، بەئاگر دەسوتێندرێن، ئاوی کوڵاتوو داپلۆخێنەریان دەدرێتێ، قوزەڵقورتیان دەرخوارد دەدرێ...

هەڵبەتە سزای کافرو خودا نەناسان لەسەر کوفرو بێدینیان مەبەستێك نیە لەو مەبەستانەی ئادەمیزادی بۆ دروستکراوەو بۆی زیندودەکرێتەوە، بەڵکوو شتێکە عەداڵەت داخوازییەتیو عەقڵ پەسەندی دەکا، بۆ ئەوەی چاکەکارو خراپەکار بەیەك چاو سەیر نەکرێن، موسوڵمانو کافر چوون یەك نەبن، ئێمە زۆر جاری وا دەبێ دەبینین کافرو خودا نەناس لەوپەڕی خۆشیو رابواردن دانو بەوپەڕی درندەییو ملهوڕییەوە ستەم لەئادەمیزادان دەکەن، لەهەمان کاتدا دەبینین زاناو پیاو چاکو خودا پەرستان لەژیانێکی پڕ تەنگو چەڵەمەدا بەکولەمەرگی ژیان بەسەر دەبەن، دەی بەچ عەقڵێك دەبێ ئەم دوو تاقمە وەکوو یەك پاداشیان

بدرێتـەوە، وەكـوو لەشـوێنێكی تـردا دەفـەرموێ: ﴿أَمْ نَجْعَـلُ الَّـذِينَ آمَنُـوا وَعَمِلُـوا الـصَّالِحَاتِ كَالْمُفْـسِدِينَ فِـي الْـأَرْضِ أَمْ نَجْعَـلُ الْمُـتَّقِينَ كَالْفُجَّـارِ﴾ص/٢٨، كـەوابوو پێویسته دووا ژیانی دونیا ژیـانێكی تـر هـەبێ، هـەموو كـەس سـزاو پاداشـی شـیاوی خۆی تێدا وەربگرێتەوە.

## چەسپاندنی بەتوانایی خودا لەبوونەوەردا، هێنان‌و بردنی مانگ‌و خۆرو شەوو رۆژ

﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥﴾ إِنَّ فِى ٱخْتِلَـٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَّقُونَ ﴿٦﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار چـەند بەڵگەیـەكی رانوانـدن، بـۆ چەسـپاندنی تـاك‌و تەنهایی خوداو كورت هەڵهێنانی ئولوهییەت لەزاتی پاكی‌داو زیندوبوونـەوەی رۆژی دوایـی، بەڵگەكانیـشی لەدروسـتكردنی ئاسمانـەكان‌و زەوییـەوە هێنایـەوە، ئـەمجار بەتایبەتی دێ باسی چۆنیەتی خۆرو مانگ‌و تایبەتمەندییـەكانیان دەكاو دەیانكاتـە بەڵگە لەسـەر تـاك‌و تـەنهایی خـودا لـەبواری دروسـتكردن‌و بـەدیهێناندا، هـەروەها دەیانكاتـە بەڵگـە لەسـەر چەسـپاندنی زیندوبوونـەوەو هـاتنی رۆژی قیامـەت، لـەم روەوە: كە خۆرو مانگ ئامێری زانینی چۆنیەتی تێوەر سووڕانەوەی ساڵ‌و حیـسابن!

بەهۆی ئەوانەوە چاودێری ڕۆژگار دەكریو دەزاندرێ چەندەو چۆنە، ئەمجار باسی ئەو سوودو قازانجانە دەكا: كە لەگۆڕانی شەوو ڕۆژ پەیدا دبن، وێڕای باسكردنی سوودو قازانجی هەموو ئەو شتانەی پەروەردگار لەئاسمانەكانو زەویدا دروستی كردون.

بەم جۆرە بۆمان دەردەكەوێ: كە بەڵگە لەسەر خودایەتیو پەروەردگاریەتی (ئولوهییەتو ربوبییەت) چوار شتن: دروستكردنی ئاسمانەكانو زەوی، چۆنیەتی هاتوچۆی خۆرو مانگ، سوودو قازانجی پەیدابوو لەم هەڵسوڕانە، ئەو شتانەی خودا لەبوونەوەردا بەدیهێناونو حاڵ و چۆنیەتییان، بۆ نموونە بارانو هەورو بروسكە، بومەلەرزەو گێژەڵوكەو بوركانو شۆقەزێڕینە، هاتووچۆی شەپۆلی دەریاو باوو بۆرانو زریانو ڕەشەبا، حاڵ و چۆنیەتی ڕسكانو پێگەیشتنو بەسەرچوونو فەوتانی درەختو ڕوەك، چۆنیەتی پەیدابوونو ژیانی ئاژەڵ و پەلەوەرو خشۆكو باڵندە، ئەمجار فەوتانو لەناوچوونیان، هەروا هەبوونی كانو كانزاو میوەو بەروبووم لەهەموو جۆرێك!!!

دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً﴾ واتە: (الله) كە خودای ئێمەیە، خوادایەكی وەهایە: ئاسمانو زەوی بەدیهێناون، خۆری وا دروست كردوە كە تیشكو ڕوناكی دەدا بەبوونەوەر، سەرچاوەیە بۆ ژیانی گیاندارانو گەشەكردنی ڕوەكو درەخت، ئەگەر تیشكی خۆر نەبوایە هۆكاری ژیانو گەشەو نما دەستەبەر نەدەبوو، سەر زەوی بەكەڵكی ژیان نەدەهات ﴿وَالْقَمَرَ نُوراً﴾ مانگی وا بەدیهێناوە كە بەروناكایی خۆی تاریكایی شەو درِ دەداو هۆكارێكە بۆ نەشو نماكردنی درەختو گژوگیاو ژیانی گیانداران!

قورئانی پیرۆز روناكی خۆری بە(ضیاء) هێناوەو هی مانگی بە(نور) باس كردووە، ئەمە ئاماژەیە كە جوداوازییەك لەنێوان ڕوناكی ئەم دوانەدا هەیە، زانستی تازە دەری خست كە تیشكی خۆر زاتییەو هی خۆیەتی، وەلێ ڕوناكی مانگ

ڕەنگدانەوەی تیشکی خۆرە تێیداو هی خۆی نیە! ئەمەش موعجیزەیەکی قورئانە پێش چواردە سەدە ئەم زانستییەی چەسپاندوە.

﴿وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ﴾ مانگی وا ڕەخساندوە: کە قۆناغ قۆناغ هاتوچۆ دەکا هەرشەوە لەمەنزڵێکدایە، بەبیستو هەشت ڕۆژ جارێك تازە دەبێتەوە، سەرەتا: کە دەردەکەوێ بچوكو بێ نمودە، وردە وردە گەورە دەبێ کە دەبێتە مانگی شەوی چاردە، ئەمجار وردە وردە دەپووکێتەوە کە تاوای لێ دێ وەکوو لاسکی هێشووی خورما چرچ دەبێتەوەو نموودی نامێنێ.

هەڵبەتە ئەو گۆڕانەی بەسەر مانگدا دێ، لەپێش چاوی ئێمە وایەو بەهۆی ئەوەیە: کە تیشکی خۆر هەر لەو بەشەی دەدا کە بەرامبەریەتی، ئەگینا قەبارەی مانگ خۆی گەورە بوونو بچووك بوونەوەی بەسەردا نایە!!

پەروەردگار خۆرو مانگی بەو شێوە بەدیهێناونو هەریەکەیان لەتەوەرەی خۆیدا هاتووچۆ دەکا ﴿لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ﴾ بۆ ئەوەی بەهۆی هاتووچۆی خۆرو مانگو گۆڕانکاری تێیاندا ئێوەی ئادەمیزاد فێری ژمارەی ساڵ و مانگو حەفتەو ڕۆژەکان ببن، ئەو ماوەو کاتانەی بەهۆی خۆرو مانگ دیاریی دەکرێن فێریان ببن، وەرزەکانی ساڵ بناسن، کاتی حەجو عومرەو مانگی ڕەمەزانو حیسابو کیتابی بازرگانیو کارکردنی جۆراو جۆرتان لێ تێك نەچێ! بەهۆی خۆرەوە ڕۆژەکان دیاریی دەکرێن، بەهۆی مانگەوە مانگو ساڵ دەزاندرێن، هەروەها بەهۆی خۆرەوە ساڵی خۆرییو بەهۆی مانگەوە ساڵی مانگی دیاری دەکرێن، لەهەردوو حیسابەکەشدا سوودو قازانجی ئادەمیزاد هەیە. حیسابی ساڵی خۆریی یەك شێوەیەو گۆڕانی بەسەردا نایە، حیسابی ساڵی مانگی بەئاسانی دەزاندرێ، خوێندەوارو نەخوێندەوار دەتوانن لێی حاڵی ببنو کاری پێ بکەن، بۆیە هەرچی ئەحکامی شەرعیو کاتی عیبادەتو خودا پەرستی هەیە بەگوێرەی ساڵی مانگی ئەنجام دەدرێن!

بێگومـان ئـەم مەشـهەدانە؛ دیمـەنی خـۆرو مـانگ، پەیـدابوونی شـەوو ڕۆژو هاتنی ئەمو ڕۆیشتنی ئەو، دیاردەو دیمەنی ئاشکراو نمایـانی بوونـەوەرن، نیـشانەی گەورەیی‌و بەدەسەڵاتی‌و بەتوانایی پـەروەردگارن، ئێمـە پێیـان ڕاهـاتووین‌و بـەهۆی دووبارەبوونەوەی بەردەوام بەشتێکی ئاساییان دەزانین! ئەگینا تۆ سەرنج بدە، دەبێ ئادەمیزاد چەند سەری سووڕ بمێنی‌و واقی وڕبێ کە بـۆ یەکـەمجار هـەڵهاتنی خـۆر یان مانگ ببینێ یان ئاوا بوونیان ببینێ!؟!

ئـەم دوو دیمەنانــە (هـەڵهاتنی خـۆرو مـانگو ئاوابوونیـان) دوو دیمــەنی بەڕووەوەن‌و بەردەوام دووبارە دەبنەوە، ئێمە پێنانـەوە ڕاهـاتووین. قورئـانی پـیرۆز سەرنجی ئادەمیزادیان بۆ لای ڕادەکێشێ بـۆ ئـەوەی هەسـتیان ببزوێنـێ، بـۆ ئـەوەی هەستی چاوەڕوانی‌و وردبوونەوە لەدڵاندا زیندووبکاتـەوە، هۆشیاری‌و وردەکاریی‌و تێڕوانین لەهەستیاندا بخوڵقێنی‌و بیانکەنە نیشانەی بـەتوانایی‌و دانـایی خـودا، بـۆ ئـەوەی دڵنیـابن. ﴿مَـا خَلَـقَ اللّـهُ ذَلِـكَ إِلاَّ بِـالْحَقِّ﴾ مـانگو خـۆری بێهـودە بـەدی نەهێناون، خۆر کە تیشك دەدا بەهەموو ئەو ئەستێرانەی کە لەتـەوەرەی ئـەودان‌و بەکۆمەڵەی ئـەو حـسێب دەکـرێن‌و گـەرمایی دەگاتـە هـەموو زینـدەوەران‌و بـەهۆی ئـەوەوە ئـادەمیزادو گیانلەبـەرانی تـریش شـت دەبیـنن کـارو بـاری ژیانیـان ڕێـك دەخەن. هەروا مانـگ کە ڕوناکایی خـۆی لـەخۆرەوە وەردەگـری‌و ڕیبـوارو کاروانـچی ڕێگـای پـێ دەردەکـەن‌و گـەلێ سـوودی تـری تێدایـە ئەمانـە بـەبێ هـودە دروسـت نـەکراون. بـەڵکوو حیکمـەتو مەبەسـتێکی هەرمبـەرز لەدروسـتکردنیاندا هەیـە، دروستکردنیان حەقـەو بەحـەق هێنراونـە دی‌و بـۆ مەبەسـتی حـەق دروسـتکراون! وەکـوو لەشـوێنێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَمَـا خَلَقْنَـا الـسَّمَاء وَالْـأَرْضَ وَمَـا بَيْنَهُمَـا بَـاطِلاً﴾ص/٢٧. یـان دەفـەرموێ: ﴿أَفَحَـسِبْتُمْ أَنَّمَـا خَلَقْنَـاكُمْ عَبَثـاً وَأَنَّكُـمْ إِلَيْنَـا لَـا تُرْجَعُـونَ﴾المؤمنـون/١١٥، بـەڵێ دروسـتکردنی ئـەم بوونـەوەرە، هاتووچـۆی خـۆرو مانگو ئەو ئەستێرەو کاکە شانە بێهودەنیە، بێ حیکمەت نیە، بێ مەبەست نیە!!

﴿يُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ پەروەردگار نیشانەکانی بوونەوەر دیاردەکانی خۆرو مانگو شتەکانی تر دەکاتە بەڵگە لەسەر دەسەڵاتی فراوانو دانایی‌و زانایی خۆی بۆ گەلو نەتەوەیەك کە بزانن سوود لەو دیاردانە وەربگرنو حەقو بەتاڵ لێك جیا بکەنەوە.

﴿إِنَّ فِي اخْتِلافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾ بێگومان لەبەدیهێنانی شەوو رۆژ، کە بەشوێن یەکتردا دێن، ئەویان دێ‌و ئەمیان دەڕوا، هەمیشە بەدوای یەکتریدا وێڵن، هەروا لەکورتی‌و درێژیی شەوو رۆژدا، کە بەگوێرەی گۆڕانی شوێنهەڵاتی خۆرەوە گۆڕانیان بەسەردا دێ، وێڕای ئەو یاساو نیظامە پڕ حیکمەتو وەردەکارییەی کە لەسووڕانەوەی خۆردا هەیە، هەروا ئەو تایبەتمەندییەی کە لەخودی شەوو رۆژدا هەیە؛ ئەویان بۆ نووستنو حەسانەوەو ئەمیان بۆ ئیشوکار!

﴿وَمَا خَلَقَ اللَّهُ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ هەروەها ئەو حەشاماتەی خودا لەئاسمانەکانو زەوی دا دروستی کردوونو حاڵ و چۆنیەتی‌و تایبەتمەندییان، بگرە هەر ئاژەڵ و پێڕۆو خشۆکو چۆنیەتی هەورە بروسکەو تریشقەو گرمەو ناڵەی سەرسووڕهێنەریان، بارانو سەرماو گەرماو لافاوو رەشەباو زریانو بومەلەرزەو بورکانو ئەم جۆرە شتانە، چۆنیەتی دەریاو شەپۆلو زیندەوەرانی ناوی، چۆنیەتی کانو کانزاو پێکهاتەی سەیرو سەمەرەیانو هەموو ئەمانەو گەلێ شتی تریش ﴿لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَّقُونَ﴾ ئەمانە هەموویان بەڵگەی بەهێزو گەورەن لەسەر هەبوونی بەدیهێنەرێکی تاکو تەنهاو خاوەن حیکمەتو دەست رەنگینو کارامە لەدروستکردنو هەڵسوڕانو بەڕێوەبردنو یاسادانانەدا بۆ گەلو نەتەوەیەك خۆیان لەسەرپێچی فەرمانی خودا بپارێزنو پێچەوانەی سوننەتی خودا لەبوونەوەردا هەڵسوکەوت نەکەن، چونکە پەروەردگار بۆ هەموو شتێك یاسای داناوە، هەر کەسێك پێچەوانەی ئەو یاسایە بێ تووشی زیان دەبێ، سزا دەدرێ، بۆ وێنە خودا یاسای تەندروستی داناوە هەر کەسێك پەیڕەوی نەکا نەخۆش دەکەوێ، لەناو

دەچێ، یاسای پاڵفتەکردنی دڵ و دەروونی داناوە، هەر کەسێك پەیڕەوی نەکا تووشی فەساد دەبێ. یاسای خودا بۆ ئادەمیزاد بەردەوامبوونیانە لەسەر خوداپەرستی هەر کەسێك پەیڕەوی نەکا تاوانبارەو شیاوی سزادانە.

## پاداش و سزای موسوڵمانان و کافران!

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا
وَٱطْمَأَنُّوا۟ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنْ ءَايَـٰتِنَا غَـٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ
مَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَـٰنِهِمْ
تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَـٰرُ فِى جَنَّـٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٩﴾ دَعْوَىٰهُمْ
فِيهَا سُبْحَـٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَـٰمٌ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ
ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار چەند بەڵگەیەکی هێنایەوە لەسەر چەسپاندنی هەبوونی و تاكو تەنیایی و چەسپاندنی هاتنی ڕۆژی قیامەتو زیندوو بوونەوەو پاداشدانەوە لەسەر کردەوە هەر کەسە بەگوێرەی خۆی؛ چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە، ئەمجار باسی حاڵ و چۆنیەتی ئەوانە دەکا: کە بڕوایان بەخودا نیەو پشت هەڵدەکەن لەنیشانەو بەڵگەی هەبوونی خوداو تاكو تەنهایی! هەروا حاڵ و

چۆنیەتی ئەو موسوڵمانانەش دیاریی دەکا: کە وێڕای هەبوونی باوەڕ، کرداری چاکو خودا پەسند ئەنجام دەدەن، ئەمجار سزاو پاداشی هەردوو تاقم دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ لا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا﴾ ئەوانەی بەتەمانین زیندو بکرێنەوەو بچنەوە بەرقاپی خودا بۆ لێکۆڵینەوەو حیسابو سزاو پاداشو پێیان وایە: ژیان هەر ژیانی دونیایەو بەس! ﴿وَرَضُوا بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاطْمَأَنُّوا بِهَا﴾ لەجیاتی ژیانی قیامەتو هەوڵدان بۆ بەختەوەری ژیانی نەبڕاوەی ئەو دونیایە، رازین بەژیانی کەمخایەنی دونیای بێ بەقاو غافڵنو بێ ئاگان لەژیانی حەقیقیو نەبڕاوەی قیامەت، بەژیانی جیهانی بێ بەقا رازینو پاڵیان لێ داوەتەوەو باوەشیان بەلەززەتو نیعمەتە رواڵەتیەکانیدا کردوەو خۆیان پێوە هەڵەو گیر کردوە. هەروەها ﴿وَالَّذِينَ هُمْ عَنْ آيَاتِنَا غَافِلُونَ﴾ ئەوانەی بێ ئاگان لەنیشانەکانی خودا لەبوونەوەردا، هەروا بێ ئاگان لەئایاتە شەرعییەکانی، بیر لەنیشانەکانی بوونەوەر ناکەنەوەو لێیان وردنابنەوە، پابەندی فەرمانەکانی نابن ﴿أُوْلَئِكَ مَأْوَاهُمْ النَّارُ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ ئەوانە سەرەنجامو شوێنی حەوانەوەیان ئاگری دۆزەخە، ئەمەش لەتۆڵەی ئەو تاوانو کارە خراپانەی کە لەدونیادا ئەنجامیان داوە، سزای بێ بڕواییان بەخوداو پێغەمبەرو رۆژی دواییو زیندوبوونەوەیە.

جا کە بەم جۆرە سەرەنجامو سزای پێڕی یەکەمی روونکردەوە، ئاشکراشە کە خوێنەرو بیسەر چاوەڕوانی ئەوەن بزانن: ئاخۆ پاداشو ئاکامی پێڕی دووەم چیەو چۆنە؟! بۆیە پەروەردگار بەم ئایەتەی دوایی پاداشی پێڕی دووەمیش دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ ئەوانەی بڕوایان بەخوداو بەپێغەمبەرایەتی هێناوە، لەنیشانەکانی بوونەوەر غافڵ نەبوونو بەتەما لیقای پەروەردگارنو ترسی لێکۆڵینەوەیان هەیەو بەتەما بەهەشتو بەخششی پەروەردگارن، لەنیشانەکانی ورد دەبنەوەو پابەندی ئایەتە شەرعییەکانینی، خوداپەرستو لەخودا ترسن، ئەوانە ﴿يَهْدِيهِمْ رَبُّهُمْ بِإِيمَانِهِمْ﴾ پەروەردگار بەهۆی

هەبوونی ئیمانەکەیانەوە شارەزایان دەکا بۆ ڕێگای راستو دروست: کە دەیانگەیەنێ بەبەهەشتی رازاوە: کە بەژێر درەختەکانیدا جۆگەو جۆبار دەکشێنو هەمیشە لەژیانی کامەرانیو خۆشی بەردەوامدا دەیگوزەرێنن. دەخرێنە بەهەشتێکەوە کە ﴿تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمْ الأَنْهَارُ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾ بەژێر خانوو باڵەخانەکانیاندا جۆگەو جۆبار دەکشێن، لەبەهەشتی پڕ لەرزەتو خۆشیدا، لەبەهەشتێکدا کە بەراستی شوێنی خۆشیو رابواردنە. جا موسوڵمان کە دەخرێنە بەهەشتەوە ﴿دَعْوَاهُمْ فِيهَا﴾ یەکەم وتەو هوتافیان لەبەهەشتدا ﴿سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ﴾ پاکو بێ عەیبی هەر بۆ تۆیە ئەی خودای ئێمە، بەپاکو پیرۆزیو کەماڵت ئیعتراف دەکەین، خودایەکی تاکو تەنهاو بێ شەریکی، ئێمە سوپاست دەکەین، بەذیکرو تەقدیسی تۆ لەزەت وەردەگرینو خۆشیمان پێ دەگا. ﴿وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَامٌ﴾ چاکو چۆنیو لێك پرسینیان لەناو یەکتریدا سەلام کردنە لەیەکتریو هەواڵی رزگاربوونیان بەیەکتری رادەگەیەنن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْواً وَلَا تَأْثِيماً، إِلَّا قِيلاً سَلَاماً سَلَاماً﴾الواقعة/٢٥-٢٦.

وشەی (سلام) وشەیەکی ناسکو پیرۆزە، لەدونیادا موسوڵمانان بەم وشەیە چاکو چۆنی لەگەڵ یەکتریدا دەکەن، هەروەها پەروەردگار لەبەهەشتدا بەم وشەیە سەرەتا دەست بەئاخاوتن دەکا لەگەڵ موسوڵمانان وەکوو دەفەرموێ: ﴿تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُ سَلَامٌ﴾الأحزاب/٤٤. هەروەها فریشتە بەم وشەیە بەخێرهاتنی بەهەشتییەکان دەکەن، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ﴾الزمر/٧٣.

بەڵێ ئادەمیزادان کە چوونە بەهەشتەوە ئیتر خەمو خەفەتیان نامێنێ، هیچ شتێك نیە پێیەوە هەڵەوگیر بن، هەڵپەی ماڵ پەیداکردنو سامان کۆکردنەوەیان نیە، هەوڵی بەدەست هێنانی پلەو پایە نادەن، خەریکی ئەوە نین زەرەرو زیان لەخۆیان دوور بخەنەوە، ئەمانە هەموو کۆتاییان هاتووە، خودا بێ ئاتاجی

کردوون، پێویستسان بەم هەوڵ و تەقەللایانە نەماوە، ئەوان لەغەمو ناڕەحەتیو مەینەتی رزگاریان بووە، گەییشتوونە پلەی کەماڵ و لەئەوپەڕی رەزامەندی دان، ئەوەی کە حەزیان لێیە پێوەی خەریك بنو زیاتر لەززەتی لێ دەبینن تەسبیحاتە سوپاسو ستایشی خودایە، ناوناوە سەلام کردن لەیەکتریو لەفریشتەکانی خودایە.

کە دەچنە بەهەشتەوە سوپاسی خودا دەکەن: کە وادەی راستی پێداونو بەهەشتی پێ خەڵات کردون وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُ وَأَوْرَثَنَا الْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَاء فَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ﴾الزمر/٧٤.

کە بەلەززەتو خۆشی نەبڕاوەی بەهەشت بەهرەمەند دەبن، دڵپاکیو خۆشەویستی نێوان خۆیان بەسەلام لێك کردن دەردەبڕن، ئەمجار سەرلەنوێ دەست دەکەنەوە بەسوپاسی خودا ﴿وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ کۆتایی هەموو حاڵ و چۆنیەتی رابواردنیان هەروەها داوایەك کە لەخودای بکەنو هەر مەبەستێك بیانەوێ بێتە دی، بەسوپاسو ستایشی خودای بوونەوەر بەدووبارە کردنەوەی رستەی ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ئەنجامی دەدەن. بەمە زیاتر خۆشیو لەززەتی بەهەشتیان پێدەکەویو گیانیان پێی شاد دەبێ.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەو راستییە: کە خودای پەروەردگار هەمیشە سوپاسکراوە، هەر لەسەرەتاوە کە بوونەوەری بەدیهێناوە هەتا هەتایە سوپاسی خودا بەردەوامە بۆیە: کە سەرتا بوونەوەری هێنایە دی فەرمووی: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾الأنعام/١، کە قورئانیشی ناردە خوارێ فەرمووی: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ﴾الكهف/١.

## هه‌میشه ئاده‌میزاد خێری ده‌وێ‌و كاتی رق هه‌ڵسانیشی داوای شه‌ڕ ده‌كا

﴿ ۞ وَلَوْ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ ٱسْتِعْجَالَهُم
بِٱلْخَيْرِ لَقُضِىَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ ۖ فَنَذَرُ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ
لِقَآءَنَا فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١﴾ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ
ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوْ قَاعِدًا أَوْ قَآئِمًا فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ
ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمْ يَدْعُنَآ إِلَىٰ ضُرٍّ مَّسَّهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ
لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾

دوای ئه‌وه‌ی په‌روه‌ردگار باسی سه‌رسووڕمانی كافره‌كانی كرد، له‌وه‌ی: كه موحه‌ممه‌د نیگای بۆ دێ، ئه‌مجار به‌ڵگه‌ی تاك‌و ته‌نهایی خوداو هاتنی رۆژی قیامه‌تی هێنانه‌وه. لێره‌دا وه‌ڵامی قسه‌و شوبهه‌یه‌كی كافره‌كان ده‌داته‌وه، كه ده‌یانگوت: خودایه! ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی موحه‌ممه‌د ئیدیعای ده‌كا راسته، ده به‌ردبارانمان بكه، یان سزایه‌كی ترمان به‌سه‌ردا بده. پوخته‌و ناوه‌رۆكی وه‌ڵامه‌كه‌ش ئه‌وه‌یه: كه هاتنی عه‌زاب بۆ سه‌ریان‌و به‌ردباران كردنیان چ به‌رژه‌وه‌ندییه‌كی ئه‌وانی تێدا نیه. ئه‌وه‌یان بۆ روون ده‌كاته‌وه: كه ئه‌و سزاو تۆڵه‌یه‌ی هه‌ڕه‌شه‌یان پێ لێ ده‌كرێ، وه‌غرانه‌كه‌ی تا كاتێك كه خودا دیاری كردووه‌و خێرا بۆیان نایه، حیكمه‌تێكی خوداییه‌و ره‌حم‌و به‌زه‌ییه‌تی بۆ ئه‌وان، ده‌فه‌رموێ: ﴿وَلَوْ يُعَجِّلُ اللَّهُ لِلنَّاسِ الشَّرَّ اسْتِعْجَالَهُمْ بِالْخَيْرِ﴾ په‌له كردن سروشتێكی

ئادەمیزادە، ئەو هەمیشە پەلەیەتی خێرو خۆشی دەست بکەوێ؛ چونکە حەزی لەقازانجی خۆیەتی، کاتێکیش رقی هەڵدەستیو عەقڵی دەشێوێ داوای شەڕ دەکەن، دوعای شەڕ بۆخۆیان دەکەن. واتە: ئەگەر پەروەردگار بەپەلە وەڵامی ئادەمیزاد بداتەوەو دوعای شەڕ لەخۆکردنیان قبووڵ بکا، وەکوو ئەو پەلەکردنەی کافرەکانی مەککە لەپێغەمبەریان دەکرد: کە خێرا ئەو سزایەی هەڕەشەی پێ لێ کردون بۆیان بێنێ، وەکوو چۆن پەلەی دەستکەوتنی خێرو سوودو قازانج دەکەن.. ئەگەر خودا بۆ هەموو پەلەپەلو داواکارییەکیان بەپەلە وەڵامیان بداتەوەو داواکاریەکەیان بێنێتە جێ، ئەوە ﴿لَقُضِيَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ﴾ لەناو دەبرانو دەفەوتانو لەناو دەچوون، بەڵام خودا بەرەحمو بەبەزەییە، خێرا سزاو تۆڵەیان لێ ناستێنێو، دوایان دەخا بۆ کاتێك کە خۆی دیاری کردوەو حیکمەتو بەرژەوەندی ئەوان لەم دواخستنەی سزاو تۆڵەیەدایە، لەوانەیە هەندێکیان موسوڵمان ببن، هەندێکیان وەچەو نەوەی وایان لێ بکەوێتەوە دوایی ببنە سەربازی ئیسلام.

بێگومان کافرەکانی مەککە بەپێغەمبەریان دەگوت: ئەگەر راست دەکەی تۆ پێغەمبەریو دەڵێی ئەگەر ئیمان نەهێنن سزای خوداتان بۆ دێ، دە منەتت نەبێ باسزاکەی بێ! قورئان ئاماژە بەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ وَقَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِمُ الْمَثُلاَتُ﴾الرعد/٦. یان ﴿وَإِذْ قَالُواْ اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَـذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾الأنفال/٣٢. جا هەرچەندە ئەوان بەم شێوە بێ نەزاکەتە بەرەنگاری بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ دەبوونەوە، بەو ئوسلووبە ناشیرینە تەحەددای پێغەمبەریان دەکرد، وەلێ پەروەردگار بەرەحمو بەبەزەییو حیلمو میهرەبانی خۆی داواکارییەکەیانی قبووڵ نەکرد، موڵەتیان دان بۆ ماوەیەکی تر چونکە ئەگەر وەڵامی بدانایەوەو عەزابی بۆ بناردنایە، یەکسەر تێدا دەچوون، وەکوو چۆن گەلو نەتەوەکانی تر: کە پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستنەوە سزایان بۆ هاتوو لەناوچونو ئاسەواریان نەما،

ئـەمان: کـە خـودا وەڵامـی نەدانـەوەو سـزای بـۆ نـەناردنو کۆکـوژی نـەکردن حیکمـەتێکی تێدایـە، لەوانەیـە هەنـدێکیان ئیمـان بێـنو بێنـە گـەڵ تـاقمو گـرۆی موسوڵمانان، کەسێکیش وێڕای ئەم موڵەتدانە هەر سەرپێچی بکاو موسـوڵمان نـەبێ ئەوە خودا بەکوشتن یەکیەکە لەناویان دەبا، وەکوو لەئایـەتێکی تـردا ئامـاژە بـەوە دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿قَـاتِلُوهُمْ يُعَـذِّبْهُمُ اللّـهُ بِأَيْـدِيكُمْ وَيُخْـزِهِمْ وَيَنـصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ﴾التوبة/١٤.

سزای باقی کافرەکانی تر: کە بەدەستی ئێوە بەر کوشتنو بڕین ناکەون، ئەوە خودا هەڵی دەگرێ بۆ رۆژی قیامەت. دەفەرموێ: ﴿فَنَذَرُ الَّذِينَ لا يَرْجُـونَ لِقَاءَنَـا فِـي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ واتە: ئەوانەی کە بەتـەما نـین زینـدوو ببنـەوە بـەرەوڕوی ئێمـە بکرێنەوە لێیان دەگەڕێین لـەگومڕاییو کوفرو بـێ بـاوەڕی خۆیـاندا بتلێنـەوە، بـۆ رێزنـان لەپێغەمبـەر عـەزابی کۆکوژیـان بـۆ نـانێرینو بەکۆمـەڵ لـەناویان نابـەین، بەڵکوو مۆڵەتیان دەدەین، نازو نیعمەتی خۆمانیان بەسەردا دەڕێژین، هـیچ بەڵگـەو بیانوێکیان بۆ ناهێڵینەوە..

هەروەها رەحمو بەزەیی خودا بۆ بەندەکانی داخوازی ئەوەیـە: کـە هـەرکاتێ بـەهۆی تۆڕەبوونـەوە دوعـای شـەڕو نەگبـەتییان لـەخۆیان، لـەماڵ و منـداڵیان کـرد دوعاکـەیان وەرنـەگرێ، چـونکە پـەروەردگار بـۆ خـۆی زانـاو ئاگـادارە: کـە ئـەو دوعایانەیان مەبەست نینو لەناخەوە هەڵناقووڵێ بەڵکوو لـەئاکامی توڕەبـوونو رق هەڵسانەوە ئەو نزایانەیان کردوە!!

ئەبو داودو ئەبو بەکری بەزار لەجابیرەوە فەرموودەیەك ریوایەت دەکەن: کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لاتدعوا على أنفسكم، لاتدعوا على أولادكم، لاتدعوا على أموالكم، لتوافقوا من الـله ساعة فيها اجابـة، فيـستجيب لكـم) دوعـا لـەخۆتان مەکەن، دوعا لەمنداڵتان مەکەن، دوعا لەماڵتان مەکەن، نەوەکوو دوعاکـەتان وا رێ بکەوێ تەصادوفی ئەو ساتە بکا کە دوعای تێدا گیرا دەبێ.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (من داوام لەخودا کرد: کە دوعای خۆشەویست دژی خۆشەویست گیرا نەبێ.)

هەر بەبۆنەی باسی پەلەکردنی ئادەمیزاد بۆ هاتنی شەڕو عەزاب، نموونەیەکی ئادەمیزادمان بۆ رادەنوێنێ لەو کاتەدا کە دەردو بەڵایەك یەخەی پێ دەگرێ، پەردە لەسەر سروشتی ئادەمیزاد لادەباو دەری دەخا چەند بێ حەوسەڵەو بەهاتو هاوارە، چەند بێ ورەو خۆڕانەگرە! پەلە دەکا شەڕو عەزابی بۆ بێ، کەچی کە بەڵایەك یەخەی دەگرێ دەست دەکا بەپاڕانەوە، کە بەڵاکەی لەسەر لاچوو، دەگەڕێتەوە سەر حاڵی جارانیو (وەکوو نەبای دیبێو نەباران)! دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَسَّ الإِنْسَانَ الضُّرُّ دَعَانَا لِجَنْبِهِ أَوْ قَاعِداً أَوْ قَائِماً﴾ هەر کاتێ ئادەمیزادی کافرو بێ بڕوا دەردو بەڵایەکی تووش هات؛ نەخۆش کەوت، هەژار بوو، بەند کرا... هاوارمان دەکاتێ، لێمان دەپاڕێتەوە، بەپاڵکەوتنەوە، بەدانیشتنەوە، بەراوەستانەوە، بەبەردەوامی لەهەموو کاتەکانو حاڵەکاندا، بەئیلحاحەوە لەخودا دەپاڕێتەوە بۆ ئەوەی لەو بەڵایە رزگاری بکا، درێژە بەپاڕانەوەکەی دەداو قسەی قەڵەو قەڵەو هەڵدەڕێژێو دەلاڵێتەوەو دەنووزێتەوە..! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ فَذُو دُعَاء عَرِيضٍ﴾فصلت/٥١. دەست بەرز دەکاتەوەو رو لەئاسمان دەکاو دەپاڕێتەوە

﴿فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُ﴾ کاتێك کە بەڵاو ناخۆشییەکەمان لەسەر هەڵگرتو کەوتەوە خۆشیو فەرەحییەوە ﴿مَرَّ كَأَنْ لَمْ يَدْعُنَا إِلَى ضُرٍّ مَسَّهُ﴾ پشت هەڵدەکاو رو لەخودناسی وەردەگێڕێو وا خۆی نیشان دەدا؛ کە هەر هیچ ناخۆشی نەدیوەو نەپاڕاوەتەوەو هاواری پڕ ئیلحاحی لەخودا نەکردوە! هەر دەڵێی: کوردی وتەنی (نەبای دیوەو نەباران). ﴿كَذَلِكَ زُيِّنَ لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ئاوا بەو جۆرە رێگای گومڕاییو هەڵدێر بۆ کافران جوان دەکریو پێیدا دەڕۆنو تووشی دەبن.

بەراستی ئەمە تابلۆ کێشانێکی رەنگینە بۆ نموونەی ئادەمیزاد؛ کە لەژیانیدا هەڵە دەکا، تاوان ئەنجام دەدا، سەرکەش‌و بوغرا دەبێ، زێدە رەوی دەکا، لەشی ساغ‌و بارودۆخی بۆ گونجاوە، دونیا بەکەیفی ئەوە، مەگەر کەسێك خودا رەحمی پێ بکاو پارێزراو بێ، ئەگینا کەس لەهەرەتی لەشساغی‌و هەبوونی ماڵ و سامان‌و هێزو توانادا بیر لەوە ناکاتەوە کە دەردەداری هەیە، هەژاری هەیە. بەهەرزانی‌و زۆر سامانی‌و تەندروستی‌و لەشساغی بوغرا دەبێ‌و خودای بیر ناکەوێتەوە. کاتێکیش دەردو بەلا یەخەی دەگرن، ئاخ‌و ئۆف کەرو بەهاتو هاوارە، زۆر دەپارێتەوە درێژە بەدوعاو پارانەوەو هەڵنوزان دەدا، تەنگەتاوو نەفەس کورتو بێ حەوسەڵەیە، کاتێکیش دوعای گیرا بوو بەلای لەسەر لاچوو پشت هەڵدەکا، خودای لەبیر دەچێتەوە تێفکرینی نیە. دەست دەکاتەوە بەسەرکەشی‌و سەرپێچی!!

مەبەست بە(انسان) لەئایەتی ﴿وَإِذَا مَسَّ الإِنْسَانَ الضُّرُّ﴾ ئادەمیزادی کافرە، چونکە ئەو هەڵوێستو کردارە هەڵوێستی موسوڵمانان نیەو شیاوی ئەوان نیە، قورطوبی دەفەرموێ: کافرو غەیری کافریش دەگرێتەوە. مەبەست، بەو کەسەی رێگای گومرایی بۆ کافرەکان جوان دەکا، شەیتانە یان نەفسە، یان خودایە. چونکە فیعلەکە لەرستەی ﴿زين للمسرفين﴾ (مبني للمجهول)ە بکەر باس نەکراوە.

کافر بەموسریف ناوبراوە، چونکە خۆی‌و ماڵ و سامانی خۆی بەفیرۆ دەدا؛ نەفسی خۆی کردوە بەبەندەی بتو خودا درۆزنەکان، ماڵ و سامانی خۆی لەشتی پڕوپووچدا خەرج دەکا.

## دابو نەریتی خودا بۆ لەناوبردنی گەلو نەتەوە ستەمكارەكانو جێنشینكردنی خەڵكی تر لەشوێنیان

﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ ۙ وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٣﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ مِنۢ بَعْدِهِمْ لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی روونكردەوە: كە كافرەكانی مەككە پەلەی هاتنی عەزابیان بوو، ئەوەشی راگەیاند كە گیرابوونی دوعاكانیان بێ سوودە، ئەمجار ئەوەشی روون كردەوە: كە ئەوان لەم داواكارییەیاندا درۆ دەكەن، چونكە ئەگەر بەڵایان بێتە سەر دەست دەكەن بەهاوارو فوغانو پاڕانەوەو داوا دەكەن لەسەریان لابچێ! ئەمجار لێرەدا هەڕەشەیان لێ دەكاو سەرنجیان رادەكێشێ بۆ سەرەنجامو ئاكامی نەتەوە پێشینە سەرڕەقەكانو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا﴾ ئەی موشریكەكانی عەرەب! بەخۆتاندا بچنەوە، واز لەسەرپێچیو ستەمكاری بێنن، بزانن: كە ئێمە لەپێش ئێوەدا زۆر گەلو نەتەوەمان لەناو بردوون بەهۆی ستەمكاریو بەدرۆخستنەوەی پەیامی پێغەمبەرانیان.. كاتێك بەبەڵگەی بەهێزو موعجیزەی ئاشكراوە هاتنە سەریانو ئەوانیش بەدرۆیان خستنەوەو ئێمەش لەتۆڵەی سەرپێچییاندا ریشەكێشمان كردنو لەناومان بردن، وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ الْقُرَى أَهْلَكْنَاهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِداً﴾الكهف/٥٩.

جا لەناوبردنەکەیان بەتێکڕایی بووە، وەکوو گەلو نەتەوەی نوحو عادو ئەموود، یان زەلیل کردنو بێ دەستو بێ دەسەڵات کردنیان بووەو زاڵبوونی گەلو نەتەوەی تربووە بەسەریاندا، وەکوو لەهەندێ چەرخو رۆژگاردا بەسەر بەنوئیسرائیل هاتووە. جا ئەم گەلو نەتەوانە ﴿وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ﴾ پێغەمبەرەکانیان هاتنە ناویان بەبەڵگەوە بەموعجیزەو نیشانەی راستەوە، کەچی ئەوان بەدرۆیان خستنەوە بڕوایان پێ نەکردن، ﴿وَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا﴾ ئەوان ئامادەباشی ئەوەیان تێدا نەبوو ئیمان بێنن، بۆ بڕوا کردنو موسوڵمان بوون نەدەگونجان، خودا بۆ خۆی دەیزانی ئیمان ناهێنن، چونکە بەکوفرو بێدینی راهاتبوون، هەموو هیواو ئاواتیان رابواردنو دونیا خۆریو ستەمکاریو فیسقو فجوور بوو، ئیمانهێنان لەوان دوور بوو، خودا بۆ خۆی دەیزانی: کە چ سوودو بەرژەوەندی لەمۆڵەتدانیاندا نیە، تا بمێننەوە زیاتر گومڕا دەبنو ستەمو ئاژاوە بڵاو دەکەنەوە، بۆیە ئێمەش لەناومان بردن ﴿كَذَلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ﴾ بەوێنەی ئەو لەناوبردنو بەفتارەبردنە تۆڵە لەهەموو تاوانبارێك دەستێنن، بەو شێوەیە گەلو نەتەوەی تاونکارو لەخودا یاخی سزا دەدەین!

ئەمە هەڕەشەیەکی توندو ترسناکە بۆ کافرەکانی قورەیش، کە ئەگەر بەردەوام بن لەسەر سەرپێچیکردنو هەڵوێستی نالەباریان بەرامبەر پەیامی پێغەمبەر ﷺ ئەوە ئەوانیش بەدەردی ئەوان دەچنو وەکوو گەلە پێشینە لەناو براوەکانیان بەسەر دێ، بەتایبەتی کە ئەو کافرانە ئاسەوارو شوێنەواری بڕێ لەو گەلو نەتەوانە لەدوورگەی عەرەبیدا دەبینن، هەروا لەسەفەرو کاروانی زستانو هاوینیاندا بۆ یەمەنو وڵاتی شام ئاسەواری نیشتەمەنی هەندێ لەو نەتەوە بەدبەختە لەناوبراوانەیان بەرچاو دەکەوێ.

جا کە سەرەنجامی تاوانبارانی رانواندو، ئاکامو لەناوچوونی ئەو ستەمکارانەی دیاریی کرد کە پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستنەوەو سزایان بەسەردا

باری، ئەمجار ئەوە دەخاتە بیری قوڕەیشییەکانەوە: کە ئەوان جێنشینی ئەو گەلە لەناوبراوانەن و لەسەر کەلاوەی ئەوان نیشتەجێ بونو دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكُمْ خَلاَئِفَ فِي الأَرْضِ مِن بَعْدِهِمْ﴾ ئەی ئەوانەی پێغەمبەری ئیسلام نێردراوە بۆ سەرتان! بزانن کە لەپاش لەناوبردنی گەلو نەتەوە پێشینەکان ئێوەمان کردوە بەجێگیرو جێنشین لەزەویدا.

ئەمەش مزگێنییە بۆ ئوممەتی ئیسلام: کە ئەگەر ئیمان بێننو شوێن پەیامی پێغەمبەر بکەون، دەبنە خەلیفەو جێنشین لەسەر زەویو تواناو دەسەڵاتو فرمانڕەواییيان دەست دەکەوێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾النور/٥٥. هەڵبەتە پەروەردگار وادەی خۆی بەجێ هێناو موسوڵمانانی کردە خاوەنو فەرمانڕەوای مەملەکەتی فارسو ڕۆمو فیرعەونەکانو زۆر گەلو نەتەوەی تریش!

بەراستی ئەمە هەژاندنێکی بەهێزی هەستی ئادەمیزادە، پێی رادەگەیەنێ کە کراوە بەجێنشینی کەسانێك کە سەردەمێك خاوەن دەسەڵاتو ماڵو سامان بوونو لێیان سەندراوەتەوە، فەرمانڕەوا بوونو لێ خراونو لەناوبراون ئەمیش هەر دەبێ ڕۆژگارێك بێ دونیا بەجێ بێڵێو ماڵئاوایی بکا! ئەم ژیانەی کە تێیدایە چەند ڕۆژێکەو بەسەری دەباو دوایی دێ!!

﴿لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ﴾ ئێمە ئێوەمان کردوە بەجێنشینی ئەو نەتەوانە بۆ ئەوە ببینین ئێوە چۆن هەڵسو کەوت دەکەن! چۆن جێنشینییەکەتان ئەنجام دەدەن! بۆ ئەوەی بەگوێرەی کردەوەکانتان سزاو پاداشتان بدەینەوە.

ئیمامی موسلیم لەصەحیحەکەیدا فەرموودەیەکی هێناوە، ئەبو سەعیدی خودری ڕیوایەتی کردوە دەفەرموێ: (ان الدنیا حلوة خضرة، وان الله مستخلفكم

فیها، فناظر کیف تعملون، فاتقوا الدنیا، واتقوا النساء، فان أول فتنة بني اسرائیل کانت من النساء) واتە: دونیا شیرینو خۆشو جوانە، خودا ئێوەی کردوە بەجێنشین تێیدا دەڕوانێ چۆن هەڵسو کەوت دەکەن، خۆتان لەتەڵەکەبازی دونیا بپارێزن، خۆتان لەفیتنەو شەڕی ئافرەتان بپارێزن، چونکە بێگومان یەکەمجار کە فیتنەو شەڕو ئاشووب تووشی نەتەوەی ئیسرائیل بوو لەئافرەتەوە بوو بەهۆی ئافرەتەوە بوو.

قەتادە دەڵێ: خودا راستی فەرمووە: بۆیە ئێمەی کردوە بەجێنشین تا بڕوانێتە کارو پیشەمان، دەی بەقوربان هەوڵ بدە کاری چاكو باش نیشانی پەروەردگار بدەن بەشەوو بەرۆژ توخنی کاری خراپ مەکەون.

ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوە: کە ئەم جێنشینکردنە پەیوەستە بەئەنجامدانی کاری باش، بۆ ئەوەی ئێمە لەخۆمان بایی نەبینو وانەزانین: کە ئیتر هەتا هەتایە دەمێنینەوەو دەتوانین پێچەوانەی سوننەتی خودا لەبوونەوەردا هەڵسو کەوت بکەینو ئیتر لێپرسینەوە نیە!

بێگومان هەستکردنی ئادەمیزاد بەوە: کە لەژێر چاوەدێرییەوە بەو ژیانە کورتەی جیهان تاقی دەکرێتەوەو هەرچی هەیەتیو دەیبێ بۆ ئیمتیحانو تاقیکردنەوەیە مەتاعەیەکی بۆ پەیدا دەبێ بەربەستی بوغرابوونو گومڕابوونو بێ ئاگایی وای لێ دەکا هەڵەوگیری کاڵاو مەتاعی دونیایی نەبێ. هەڵپە نەکا بۆ وەدەستهێنانی بەرێگەی ناڕەواو نامەشروع.

## ئایەتەکان بەکورتی ئاماژە بۆ ئەم مەبدەئە سەرەکییانە دەکەن:

١- بنبڕ کردنی گەلو نەتەوە پێشینەکان بەهۆی زوڵمو زۆری خۆیان بووە، جا زوڵمەکە یان کوفرو شیرك بووە یان بوغرابوونو ملهوڕی فەرمانڕەواو لێپرسراونە.

٢- ئەم ئایەتانە هەڕەشەن لەکافرەکانی مەککەو هاووێنەکانیان لەهەموو

سەردەمو چاخێكدا. هەرگەلو نەتەوەیەك پەیامی حەزرەتی (محمد) بەدرۆ بخاتەوە خودا دەتوانێ ڕیشەكێشیان بكا.

٣- جێگیركردنو نیشتەجێكردنی هەر گەلو نەتەوەیەك پابەندە بەئەنجامدانی كردەوەی باشەوە. كە پەروەردگار گەلو نەتەوەیەك دەخاتە شوێنی نەتەوەیەكی تر بۆ ئەوەیە: دەربكەوێ تا چ ئەندازەیەك پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەكانی خودان، هەڵبەتە خودا بۆ خۆی زانیاری كاملی هەیە بەسەر رابوردوو داهاتوودا؛ دەزانێ چ بووەو چ هەیەو چ دەبێ. كەوابێ چ پێویستی بەتاقیكردنەوەی ئادەمیزاد نیە بزانێ چی دەكەنو چۆن دەبن! وەڵێ كە تاقیكردنەوەكە ئەنجام دەدا بۆ ئەوەیە لەڕوانگەی كردەوەكانیانەوە بەڵگەی حیسسیو مادیو بینراو لەسەر بەندەكانی راست بكاتەوە! واتە: پەروەردگار كە ئەم تاقیكردنەوانە ئەنجام دەدا بۆ ئەوەیە بۆ بەندەكانی دەربكەوێ خۆیان چییان كردووە!!

## موشریكەكان داوایان لەپێغەمبەر دەكرد كە قورئانێكی تریان بۆ بێنێ، یان هەندێ ئایەتی بگۆڕێ

﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآئِ نَفْسِىٓ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ

عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ
أَدْرَىٰكُم بِهِۦ ۖ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ ۚ أَفَلَا
تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا
أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٧﴾

لێرەدا سیاقەکە دەگۆڕێو لەخیطابی هەڕەشەو پەندو ئامۆژگاریی بۆ کافرەکان ڕو دەکاتەوە ڕانواندنی نموونەی کردەوەکانیان، ئەوە دەردەخا: کە پاش جێنشینکردنیان لەشوێنی نەتەوە ستەمکارەکانی پێشوو چییان کردوە، هەڵسو کەوتیان چۆن بووە!

لەوەپێش دوو شوبهەی کافرەکانی بەرامبەر ئایین دیاری کردن: یەکیان سەرسوڕمانیان لەهاتنی نیگا بۆ ئادەمیزادو هەڵبژاردنی حەزرەتی موحەممەد ﷺ بۆ پێغەمبەرێتیو دووەم داواکردنی هاتنی عەزاب بۆ سەریان!

لێرەشدا شوبهەیەکی تریان دەخاتە ڕوو، ئەویش تانەو تەشەردانیانە لەپێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ و گومان پەیدا کردنیان لەقورئاندا. بۆیە هەر کە پێغەمبەر قورئانی بەسەردا دەخوێندنەوە، دەیانگوت: ئەمانەمان بەلاوە پەسەند نیە. بیگۆڕە، قورئانێکمان بۆ بێنە ڕەخنە لەخوداکانمان نەگرێ.

ئیبنو عەبباس ﷺ دەفەرموێ: پێنج کەس لەکافرەکان گاڵتەیان بەپێغەمبەرو قورئان دەکرد، ئەو پێنج کەسە: وەلیدی کوڕی موغیرەی مەخزوومیو عاصی کوڕی وائیلی سەهمیو ئەسوەدی کوڕی مەطەلیبو ئەسوەدی کوڕی عەبدیەغووثو حاریثی کوڕی حەنظەلە بوو. پەروەردگار هەریەکەیانی

بەشێوەیەك لەناوبرد، پێش وەختیش موژدەی بەپێغەمبەردا بوو كە خودا خۆی لەعودەی ئەو گاڵتەكەرانە دێو تۆڵەیان لێ دەستێنێو فەرمووبووی: ﴿إِنَّا كَفَيْنَاكَ الْمُسْتَهْزِئِينَ﴾الحجر/٩٥.

بەم شێوە هەڵسو كەوتیان لەگەڵ پێغەمبەرو پەیامەكەی كرد، ئەمە كارو كردەوەیان بوو پاش جێنشین كردنیان لەشوێنی گەلو نەتەوەكانی پێشوو!!

لەجیاتی ئەوەی بەندو عیبرەت وەربگرنو بەخۆیادا بچنەوە كەچی ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا﴾ هەركاتێ ئایاتی قورئانیان بەسەردا بخوێندرایەوە، واتە: هەر كاتێ پێغەمبەر قورئانی بەسەر موشریكەكاندا بخوێندایەوە ﴿بَيِّنَاتٍ قَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا﴾ ئەوانەی موشریكو بێ بڕوانو بەتەما زیندوبوونەوە نین دەڵێن: ﴿ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَذَا أَوْ بَدِّلْهُ﴾ ئەم قورئانە بگێڕەوە بۆ شوێنی خۆیو قورئانێكی ترمان بۆ بێنە لەشێوەی ئەم قورئانە نەبێ، شتێكی وای تێدا نەبێ پێمان ناخۆش بێ، رەخنە لەخواكانمان نەگرێ، شتێكی وای تێدا نەبێ ئێمە بڕوامان پێی نەبێ، باسی زیندو بوونەوەو سزاو پاداشی تێدا نەبێ. یان كە هیچكەنەبێ هەندێكی لێ بگۆڕە؛ ئەو ئایەتانەی هەڕەشەو رەخنەیان تێدایە لایانبەرەو ئایەتی تر بخە جێگەیان.

مەبەستیشیان لەم چاوڕاوە ئەوە بوو: كە پێشنیازەكەیان جێبەجێ بكرێ ئیتر ئەو كاتە دەعواكەی پێغەمبەر: كە دەیگوت: قورئان نامەی پەروەردگارە پووچ دەبوەوە.

وا پێدەچێ ئەو موشریكانەی: كە لەرۆژی قیامەت نەدەترسانو بەتەما حیسابو لێكۆڵینەوە نەبوون، وایاندەزانی: وەكوو پێشبڕكێی بازاڕی عوكاظو موبارەیاتی ئەدەبی وایە: هەر بەبیستنی ئەم داخوازییەیان خێرا موحەممەد قورئانێكی تر دادەنێو دەیخاتە بەردەمیان: یان خێرا داخوازییەكانیان جێبەجێ

دەکاو هەندێ لەئایەتەکان دەگۆڕیو ئایەتی بەدڵی ئەوان دادەنێ!!

بۆیە پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەر ﷺ دەکا: کە داخوازییەکەیان ڕەت بکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِنْ تِلْقَاءِ نَفْسِي﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو موشریکانە بڵێ: من ڕایەم ناکەویو ناگونجێ بۆ من: کە بەخودی خۆم ئەم قورئانە بگۆڕم، چونکە من تەنیا شوێن ئەو نیگایە دەکەوم کە بۆم دێ بەسروش ناراستەم دەکرێ، ئەویش ئەوەیە: کە پێتان ڕادەگەیەنم، منیش هەر ڕاگەیاندنم لەسەرە، ئەم قورئانە نامەی خودایە من بەپێی ئەم نامە هەڵسو کەوت دەکەم، بەهیچ شێوەیەك بۆم نیە دەسکاری بکەمو گۆڕانکاری تێدا بکەم! باش بزانن ئەم قورئانە یاری یاریکەران نیە، لێهاتوویو بەتوانایی هەستیارو شاعیر نیە، بەڵکوو دەستوورو یاسای ژیانە بۆ ئادەمیزاد، کەتەلۆکی بوونەوەرە، یاسایەکی گونجاوو لەبارە بۆ هەموو بارودۆخێك بۆ گشت ناوچەو وڵاتو هەرێمێك، لەلایەن هەڵسوڕێنەری بوونەوەرەوە نێردراوە، یاسای خوڵقێنەری ئادەمیزادە بۆ ئەوەی ببێتە پەیڕەوو پرۆگرام بۆ ئادەمیزاد، هەڵبەتە خوداش لەهەموو کەس باشتر دەزانێ بەرژەوەندی ئادەمیزاد چیەو چی بۆ باشە! کەوابوو: ناگونجێو نابێ پێغەمبەر لەلایەن خۆیەوە ئەو قورئانە نێردراوە لەلایەن خوداوە بگۆڕێ.

ئەمجار جەختی لەسەر ڕستەی پێشوو کردەوەو فەرمووی: ﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ﴾ پێیان بڵێ: من تەنیا شوێن ئەو پەیامە دەکەوم کە بەسروش بۆم نێردراوە، هیچی لێ ناگۆڕم، هەر گۆڕانکارییەکی تێیدا بکەم تاوانەو سەرەنجامی سزای دۆزەخە.

هەر دەست لێدانێك تێیدا یاخی بوونە لەخوداو دژایەتی کردنی خودایە، ئەمن شتی وا ناکەم، چونکە ﴿إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ من دەترسم ئەگەر لەخودای خۆم یاخی بم، هەر تاوانێك ئەنجام بدەم دەترسم لەسزای ڕۆژێکی گەورەو سامناك کە ڕۆژی قیامەتە! دەی کەوابێ من چۆن زات دەکەم

کەلامی خودا بگۆڕمو ویستی ئێوە بێنمە دی! حاشا من شتی وا ناکەمو ناشێ بێکەمو رایەم ناکەوێ.

ئەم قورئانە نێگای خودایەو لەخوداوە بۆم هاتووە، راگەیاندنی قورئان خراوەتە ئەستۆمو فەرمانم پێ کراوە پێتانی رابگەیەنم. ﴿قُلْ لَوْ شَاءَ اللَّـهُ مَا تَلَوْتُـهُ عَلَيْكُمْ وَلَا أَدْرَاكُمْ بِهِ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئەگەر خودا مەیلی ببوایە ئەم قورئانە بەسەرتاندا نەخوێنمە ئەم دەخوێندەوە، ئەگەر خودا بیویستایە من ئەو قورئانە فێری ئێوە نەکەم فێرم نەدەکردن! کارەکە هەمووی بەدەست خودایە، ناردنە خوارەوەی قورئان، راگەیاندنی بەئادەمیزاد هەمووی بەفەرمانو ویستی خودا خۆیەتی. ئەگەر خودا بیویستایە من نەنێری‌و ئەم قورئانە فێری ئێوە نەکەم نەیدەناردمو منیش بەئێوەم نەدەگەیاند، بەڵام خودا ویستی وایە: کە میننەتو فەضلی خۆی بەسەر ئێوەدا بڕێژێ‌و ئەم زانیارییە بەسوودەتان فێر بکاو ئێوەش بەهۆی ئەم هیدایەتو شارەزایی کردنەوە ببنە میراتگرو جێنشین لەسەر زەوی. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جِئْنَاهُم بِكِتَابٍ فَصَّلْنَاهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾الأعراف/٥٢ قورئان خودا ناردویەتیە خواری‌و خۆشی دەزانێ، کە هەرچی پێویستیاتی ئادەمیزاد هەیە لەهیدایەتو هۆکاری خۆشبەختی‌و کامەرانی تێیدایە!! بەڵگە لەسەر ئەم راستیانە حاڵو وەزعی رابوردووی منە ﴿فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُراً مِنْ قَبْلِهِ﴾ ئەمن ماوەیەکی زۆر ژیانم لەناو ئێوەدا بەسەر بردوە، پێش ئەوەی ئەم قورئانەم بۆ بێ، چل ساڵ لەناو ئێوەدا ژیاوم، سورەتێکم لەم جۆرە سورەتانە بۆ ئێوە نەخوێندۆتەوە، تەنانەت ئایەتێکیشم لەم جۆرە ئایەتانە لەدەم دەرنەچووە، شتێکم بۆ ئێوە نەخوێندۆتەوە بشوبهێتە ئەم قورئانە لەشێوازو زانیاری‌و رەوانی‌و وێژەییدا، ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ؟﴾ ئەرێ ئێوە بۆچی بیر ناکەنەوەو تێنافکرن: کەسێك چل ساڵ ژیانی بەسەر بردبێ، لەو ماوە دورو درێژەدا پەڕاوێکی نەخوێندبێتەوە، لای کەس وشەیەکی نەخوێندبێ، دێڕێکی نەنووسیبێ،

نەخوێنـــدەوار بـــووبیو بەنەخوێنـــدەواری مابێتـــەوە. شـــوێن ئـــایینو ڕێبازێـــك نەکەوتبێ، خەریکی شیعرو ئەدەبو بەلاغەو بەیان نەبووبێ، چۆن توانی ئەم نامـە سەرئاسایە بێ وێنەیە بخاتەڕوا؟

ئەمە نیشانەی ئەوەیە: قورئان نامەیەکی سەرئاسـایەو کـەلامی پـەروەردگارە، دانراوو نووسراوو دەستکردی ئادەمیزاد نیە.

چونکە عەرەبەکان: کە ئەو کاتـە سوارچاکی ڕەوانبێـژیو پاڵـەوانی مەیـدانی فەصاحەتو بـەیان بـوون، هەرچـەندە قورئـان تەحـەددای کـردنو داوای لێ کـردن هەموویان کۆببنەوەو هەوڵ بدەن وێنەی قورئان، یان دە سووڕەت تەنانـەت وێنـەی کورترین سورەتیـشی بخەنـە ڕوو، بـەڵام ئـەوان نـەیانتوانیو جـۆش دامـانو دەسـەو وەسـان بـوونو تـا ئێـستاش نـەتوانراوە ئـەو تەحەدایـە بشکێننو ئـەو سەرشـۆڕییە لـەخۆیان لابـدەن، ئـەو هـەموو شـاعیرو بوێـژو ڕەوانبێـژو خۆشـخوانو هەسـتیارانە هاتوونـــە گۆڕەپـــانی ژیانـــەوەو دونیایـــان بـــەجێ هێـــشتووەو ئێـــستاو ئێـــستاش نەیانتوانیو لەمەودواش کەس ناتوانێ ئەو تەحەدایە ڕەت بکەنەوە!!

چـونکە فەصـاحەتو بەلاغـەتی قورئـان هـەموو فەصـاحەتو بەلاغـەتێکی بـۆڕداوە، لـەزوور هـەموو شـیعرو پەخـشانێکەوەیە، بنـەماو قاعیـدەی هـەموو زانیارییەکی پێویستی تێدایە، چیرۆکی رابـردوانو هـەواڵی نهێنـی داهاتووی لـەخۆ گرتـووە، لەگـەڵ هـەموو زانیارییـەکی ڕاسـتو تیـۆرێکی زانیـاری دامـەزراودا یـەك دەگرێتـەوە، کـەلامێکی بـێ عـەیبو بـێ وێنـەو نموونەیـە. جندۆکـەو ئـادەمیزاد هەموویان خەریك بن، ناتوانن نموونەی ئەو قورئانە بخەنە ڕو، وەکوو لەئایـەتێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَـذَا الْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيراً﴾الاسراء/٨٨.

کەواتـە: ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ افْتَرَى عَلَى اللّهِ كَذِباً أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ؟﴾ کـێ لـەو دوو کەســـــــــــە ســـــــــــتەمکارترو بێـــــــــــدین تـــــــــــرە؟؟

**یەکەمیان:** ئەو کەسەیە کە بەدرۆ شت بۆ خودا هەڵدەبەستێ، هاوەڵی بۆ دادەنێ خێزانو ماڵو منداڵی پاڵ دەدا، یان کەلامی خودا دەگۆڕێ، یان لەسەر خودا شت هەڵدەبەستێ ئیدیعای ئەوە دەکا کە نیگای بۆ دێو پێغەمبەرەو واش نیە.

**دووەمیان:** ئەو کەسەیە ئایاتی خودا بەدرۆ دەخاتەوە، بڕوا بەنیشانەو ئایەتی خودا ناکا.

﴿إِنَّهُ لا يُفْلِحُ الْمُجْرِمُونَ﴾ شەئنو حاڵ ئەوەیە: کە بێگومان پەروەردگار لەڕۆژی قیامەتدا کافرو تاوانباران رزگار ناکا، لەچنگ سزای خودا قوتاریان نابێ، سەرەنجامیان سزاو عەزابی بەئێشو سوتماکە.

بەکورتی مەبەستی ئەوەیە: پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: من بۆخۆم شت لەسەر خودا هەڵنابەستمو ئەو تاوانە ستەمکارییە ناکەم، جڵەوگیری لەئێوەش دەکەمو داواتان لێ دەکەم ئایاتی خودا بەدرۆ نەخەنەوە، بڕوا بەنامەو پەیامی بکەنو شوێنم بکەونو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی پەروەردگار بن.

واتە: خراپترین جۆری ستەمکاری دوو شتن: یەکەمیان: شت هەڵبەستن لەسەر خودا، دووەمیان: بەدرۆخستنەوەی ئایاتی خودا، جا من کە جڵەوگیری لەئێوە بکەم بۆ تاوانی دووەم، چۆن رێگە بەخۆم دەدەم، کە تاوانی یەکەمیان ئەنجام بدەم؟!

## عەرەبەکان بتیان دەپەرستو پێشیان وابوو شەفاعەتیان بۆ دەکەن

﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ

﴿أَتُنَبِّئُونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعۡلَمُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ١٨﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە: کە موشریکەکان داوایان لەپێغەمبەر کرد: قورئانێکی تریان بۆ بێنێ، یان هەندێك لەئایەتەکانی بگۆڕێ. دەیانگوت: ئەم قورئانەمان ناوێ چونکە رەخنە لەخوداکانمان دەگرێو بەخراپ باسیان دەکا. ئەمجار لێرەدا رەخنە لەوە دەگرێ کە ئەو نەفامانە ئەو بتانەیان کردوە بەخوداو دەیانپەرستن. هەرچەندە ئەو بتانە بێ گیانن‌و ناتوانن زەرەرو زیان بەکەس بگەیەنن‌و هیچ بەڵگەشیان بەدەستەوە نیە لەسەر داواکەیان! دەی چۆن عاقڵ‌و هۆشمەند لەجیاتی خودای تاك‌و تەنها ئەو بتانە دەپەرستن. هەروا بەم جۆرە سیاقی قورئان کردارو گوفتاری کافرەکان رادەنوێنی‌و دەفەرموێ:

﴿وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لا يَضُرُّهُمْ وَلا يَنْفَعُهُمْ﴾ ئەو نەفامانە عیبادەت بۆ چەند بتو صەنەمێك دەکەن، لەجیاتی ئەوە خودا بپەرستن‌و بەندایەتی پاکی بۆ بکەن، کەچی بەردو دار دەپەرستن‌و شتێك دەپەرستن کە ناتوانن زیان‌و قازانجیان پێ بگەیەنن: ﴿وَيَقُولُونَ هَؤُلاءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللَّهِ﴾ دەڵێن: ئەو بتو صەنەمانە لای خودا شەفاعەتکارمانن، لای خودا تکامان بۆ دەکەن.

بێگومان زۆربەی زۆری عەرەبەکان دانیان بەوەدا دەنا: کە خودا بەدیهێنەرە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ﴾الزخرف/٩. لەهەمان کاتدا ئینکاری زیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەی رۆژی قیامەتیان دەکرد، عیبادەتیان بۆ بتو صەنەم ئەنجام دەداو دەیانکردنە هاوبەشی خوداو لەگەڵ خودادا بەندایەتییان بۆ دەکردن.

پێیان وا بوو: ئەو دارو بەردە بێگیانانە توانای گەیاندنی زیانو سوودیان هەیە، دەتوانن ببنە ناوەندو تکاکارو لای خودا شەفاعەتیان بۆ دەکەن! وەکوو لەشوێنێکی تردا لەسەر زوبانی ئەوان دەفەرموێ: ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾ واتە: دەیانگوت: ئێمە بۆیە عیبادەت بۆ بتەکان دەکەین بۆ ئەوەی لەخودامان نزیك بکەنەوە... ئیتر خودا بیرو باوەڕەکەی ڕەتکردنەوەو فەرمووی: ﴿قُلْ أَتُنَبِّئُونَ اللَّهَ بِمَا لا يَعْلَمُ فِي السَّمَوَاتِ وَلا فِي الأَرْضِ؟﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: هیچ بەڵگەیەکتان لەسەر داواکەتان بەدەستەوە نیە، ئایا ئێوە هەواڵ دەدەن بەخودا بەشتێك کە لەئاسمانەکانو زەویدا هەبوونی نیەو نازانێ کێ ئەو شەفاعەتە دەکا؟!

واتە: پێیان وایە: خودا نازانێ کێ شەفاعەتی لا دەکا؟ ئایا ئێوە شتێك دەزانن کە خودا نایزانێ؟ هەواڵی دەدەنێ بەشتێك کە نازانێ لەئاسمانو زەویدا هەیە؟!

ئەمە شێوازێکی گاڵتە پێکردنە شیاوی ئەو نەفامانەیە: کە ئەوە بیرو بۆچوونیانە، ئەوە عەقڵو هۆشیانە، ئەمجار بەشوێن ئەم قەشمەری پێکردنەدا، پاکو بێ عەیبی خودا ڕادەگەیەنیو دەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ واتە: پاکو بێ عەیبە، بەرزو پیرۆزە، دوورە لەوەی: کە شەریکی بۆ دادەنێن، خودا پاکو پیرۆزە لەوەی کە شەریكو هاوەڵی هەبێ. هەروەها پاکو بێ عەیبەو دوورە لەو شتانەی بۆی هەڵدەبەستن کە گوایە هەندێ شت دەتوانن کار لەخودا بکەنو بەندەکانی لەخودا نزیك بکەنەوەو لای خودا تکاکاریان بن!

**لەوەپێش ئادەمیزادان هەموویان لەسەر ئایینی ئیسلام بوون**

﴿وَمَا كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَٱخْتَلَفُوا۟ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ فِيمَا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ١٩﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار چەند بەڵگەیەکی هێنایەوە لەسەر پووچیو بێ بناغەیی بتپەرستی، ئەمجار هۆکاری ئەم رێڕەوە خراپە روون دەکاتەوەو ئەوە رادەگەیەنێ: کە ئەم شیرکو بتپەرستییە بەهۆی شوێنکەوتنی هەواو هەوەسەوە لەناو خەڵکدا بڵاو بووەوە، لەوە پێش ئادەمیزادەکان هەموویان لەسەر ئایینێکی حەقو راست بوون، ئەویش ئایینی ئیسلام بوو!!

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: نێوان سەردەمی ئادەمو نووح هەزار ساڵ بووە، لەم ماوە دوورو درێژەدا ئادەمیزاد تێکڕا لەسەر ئایینی پاکو خاوێنی ئیسلام بوون، پاشان دووبەرەکیو ناکۆکی کەوتە ناو خەڵکەکەوە، بتپەرستیو هاوەڵ دانان بۆ خودا بڵاو بووەوە، ئەمجار پەروەردگار پەیتا پەیتا پێغەمبەرانی بەبەڵگەو موعجیزەوە ناردە ناویانەوە، بۆ ئەوەی هەر کەسە بەئارەزۆی خۆی رێبازی ژیانی هەڵبژێرێ، کەسێك بیەوێ بەختەوەری دونیاو قیامەت بێ، شوێن ئایینی پێغەمبەران بکەوێ، کەسێکیش بیەوێ گومڕا ببیو بەدبەختی دونیاو قیامەت بێ با بەبتپەرستیو بێدینی بمێنێتەوە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ﴾الأنفال/٤٢.

حیکمەتو ویستی خودا وا بوو: کە ئادەمیزاد دوای ئەو دووبەرەکیو بتپەرستییەی لەناویاندا بڵاو بووە، بۆ ماوەیەك مۆڵەتیان بداو یەکسەر بنبڕیان نەکاو خێرا سزایان نەدا!!

﴿وَمَا كَانَ النَّاسُ إِلاَّ أُمَّةً وَاحِدَةً﴾ ئادەمیزاد لەهەموو رۆژگارو سەردەمەکانی رابووردودا نەتەوەیەکی یەکپارچە بوونو پابەندی ئایینێکی پاکو خاوێن بوون ئەویش ئایینی خوداپەرستیو یەکتاپەرستیو ئایینی سروشتی ئادەمیزادە کە ئایینی ئیسلامە، ﴿فَاخْتَلَفُوا﴾ پاشان کێشەیان تێکەوتو بوون بەگرۆو تاقم تاقم بەهۆی هەوەسبازیو شوێنکەوتنی بیرو باوەڕی پڕوپووچەوە، دووبەرەکیو جوداوازیی کەوتە نێوانیانەوە. بیرو باوەڕی جیا جیایان تێدا پەیدابوو... یان کاتێك پێغەمبەران هاتنە سەریان دووبەرەکییەکە پەیدا بوو؛ بەم رەنگە هەندێ لەخەڵکەکە شوێن پێغەمبەرەکان کەوتنو هەندێکیشیان لەسەر گومڕاییو هەواپەرستیو بیرو باوەڕی پوچیان مانەوەو سوور بوون لەسەر بتپەرستیو رێبازی چەوتی خۆیان. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾البقرة/٢١٣.

بەڵێ ئایینی سروشتی بۆ ئادەمیزاد ئایینی ئیسلامە، ئایینی یەکتاپەرستیو خودا پەرستییە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (كل مولود يولد على الفطرة حتى يعرب عنه لسانه، فأبواه يهودانه أو ينصرانه، أو يمجسانه)(١٥) هەموو منداڵێك کە لەدایك دەبێ لەسەر ئایینی سروشتیو خوداپەرستی دێتە کۆڕی ژیانەوە، تەنانەت بەزوبانیش ئەم هەستی ئایینییە دەردەبڕێ، پاشان باوكو دایکی دەیکەن بەجوولەکە، یان بەفەلە، یان بەئاگر پەرست!

(١٥) ئەم فەرموودەیە ئەبو یەعلاو طەبەرانیو بەیهەقی لەئەسوەدی کوڕی سەریعەوە ریوایەتیان کردوە.

﴿وَلَوْلا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِنْ رَبِّكَ﴾ ئەگەر لەبەر ئەو کەلیمە حەقو راستە نەبوایە.. کە لەوەپێشو لەئەزەلدا خودا بڕیاری داوە: کە سزاو پاداش بخاتە رۆژی قیامەتو لەوێدا دادگای بەندەکانی بکاو حەقو بەتاڵ لێك جیابکاتەوە، ﴿لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ فِيمَا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ ئەوە لەدونیادا کافرو بڕوا پووچەکانی لەناو دەبرد، ئەو شتەی تێیدا کەوتوونە کێشەوە یەکالای دەکردەوەو حەقو بەتاڵی لێك جیا دەکردەوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾یونس/٩٣.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: مانای ئایەتەکە بەم شێوەیە: ئەگەر لەبەر ئەو بڕیارە یەزدانییە نەبوایە: کە لەوەپێش بڕیاری داوە: کە کەس سزا نەدا، تا بەڵگەیان لەسەر نەهێنێتەوەو بیانوویان نەبڕێ، هەروەها بڕیاری داوە کە مۆڵەت بدا بەبەندەکانی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، هەر کاتێ بیانووی بڕینو ماوەی مۆڵەت تەواو بوو، ئەو کاتە سزا دەدا.

ئایەتەکە هەڕەشە لەناکۆکیو کێشەی نێوان ئادەمیزادەکان دەکا، هەڕەشە لەوانە دەکا: کە کێشە پەیدا دەکەن لەبنەمای عەقیدەو لەو قورئانەی نێردراوە بۆ قەلاچۆکردنی دیاردەی دووبەرەکیو گێڕانەوەی ئادەمیزاد بۆ یەکیەتیو هەم ئاهەنگیو یەکتاپەرستی.

لەهەمان کاتدا دڵدانەوەی پێغەمبەرە ﷺ لەوەدا: کە سزادانی ئەوانەی بڕوای پێ ناکەن دوا خستووە.

**تێبینی** : ئایەتەکە سێ حوکمی سەرەکی لێ وەردەگیرێ:

أ- هەموو ئادەمیزادێك کە لەدایك دەبێ لەسەر ئاینی سروشتیو یەکتاپەرستی لەدایك دەبێ، دوایی باوكو دایكو دەوروبەر کاری تێدەکەنو بیرو بۆچوونی دەگۆڕن.

ب- پەیڕەو نەكردنی پەیامی پێغەمبەرانو كتێبە ئاسمانیەكانو شوێنكەوتنی هەواو هەوەس بوەتە هۆی پەرتەوازە بوونی كۆمەڵانی ئادەمیزادو جودا وازیی بیرو بۆچوونو عەقیدەو بیرو باوەڕیان!

ج- بڕیاری خودا چەسپاوەو قەضاو قەدەری وا داخواز بووە، كە تا ڕۆژی قیامەت دادگایی ئادەمیزاد نەكاو لێكۆڵینەوەو توێژینەوە لەسەر كردەوەكانیان هەڵبگرێ بۆ قیامەتو لەوێ سزاو پاداشیان بداتەوە.. ئەگەر لەبەر ئەو حوكمە پێش وەختە نەبوایەو ئەو بڕیارەی نەدایە: هەرزو دادگایی ئادەمیزادی دەكردو موسوڵمانانی دەخستنە بەهەشتەوەو كافرانیشی تووڕدەدانە ناو دۆزەخەوە، بەڵام لەبەر حیكمەتێك كە خۆی دەیزانیو بۆ ئەوەی فرسەت بداتە ئادەمیزاد بتوانێ بیرو باوەڕی خۆی ڕاست بكاتەوەو بەخۆیدا بچێتەوەو تۆبە لەتاوانو كوفرو گومڕایی خۆی بكا مۆڵەتی پێداوە تا ڕۆژی قیامەت دادگایی ناكا!!

## كافرەكان داوای ئایەتو نیشانەی جۆراو جۆر دەكەن لەپێغەمبەر

﴿ وَيَقُولُونَ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَقُلْ إِنَّمَا ٱلْغَيْبُ لِلَّهِ فَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾



پاش ئەوەی قورئان سێ شوبهەی موشریكەكانی دیاری كردن: كە ئاڕاستەی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدیان دەكرد، یەكیان سەرسوڕمانیان بوو لەوەی نیگا بۆ موحەممەد بێ، یەكێكیان پەلەكردنیان بوو لەهاتنی سزاو عەزاب، سێیەمیشیان گومان پەیدا كردنیان بوو لەقورئان.

لێرەشدا شوبهەی چوارەم باس دەکا: کە کافرەکان ئاڕاستەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەریان دەکرد، ئەویش ئەوە بوو: دەیانگوت: قورئان نابێتە نیشانەی پێغەمبەرایەتیو بەموعجیزە حیساب ناکرێ، دەیانگوت: ئەوە موساو عیسا، کیتابیشیان هەبوە بەڵام کیتابەکانیان نەبوەتە موعجیزە بۆیان، بەڵکوو موعجیزەی تریان هەبوە بۆ نیشانەی پێغەمبەرایەتییان.

شایانی باسە لەناو موشریکەکانی عەرەبدا، هی وایان هەبوو ئیدیعای ئەوەیان دەکرد: کە لەوانەیە بتوانن بەربەرەکانی قورئان بکەن، وەکوو لەشوێنێکی تردا قورئان ئاماژەی پێ دەکاو لەسەر زوبانی ئەوان دەفەرموێ: ﴿لَوْ نَشَاء لَقُلْنَا مِثْلَ هَـذَا﴾الأنفال/٣١. بۆیە دەیانگوت: پێویستە بۆ چەسپاندنی پێغەمبەرایەتی موحەممەد نیشانەی ماددیو موعجیزەی کەونی بێنە خوارێ.

﴿وَيَقُولُونَ لَوْلا أُنْزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِنْ رَبِّهِ﴾ موشریکەکانی عەرەب دەڵێن: ئەوە بۆچی موعجیزەیەکی کەونی نائاسایی نایێتە سەر موحەممەد، وەکوو ئەو موعجیزە نائاساییانەی بۆ نووحو شوعەیبو هوودو صالحو موساو عیسا دەستەبەر بوون. یان کێوی صەفا بکاتە ئاڵتون، یان کێوەکانی مەککە لا ببرێنو شوێنەکانیان ببێتە دەشتاییەکی فراوانو کشتو کاڵی تێدا بکرێ. هەروا گەلێ داخوزای تر: کە قورئان لەچەند شونێکدا ئاماژەیان پێ دەکا: داخوزاییەکانی موشریکەکان تۆمار دەکاو بەکورتی یان بەدرێژی وەڵامیان دەداتەوە.

ئەوەتا لەسوورەتی (الفرقان)دا دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا مَالِ هَـذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ لَوْلَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُ نَذِيراً، أَوْ يُلْقَى إِلَيْهِ كَنزٌ أَوْ تَكُونُ لَهُ جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَا﴾الفرقان/٧-٨.

یان لەسوورەتی (الأسراء)دا دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّى تَفْجُرَ لَنَا مِنَ الأَرْضِ يَنبُوعاً. أَوْ تُسْقِطَ السَّمَاء كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفاً أَوْ تَأْتِيَ بِاللّهِ وَالْمَلآئِكَةِ قَبِيلاً.

أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَى فِي السَّمَاء وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّى تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَاباً نَّقْرَؤُهُ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إَلاَّ بَشَراً رَّسُولاً﴾الأسراء/٩٠-٩٣.

پەروەردگار ڕەددێکی گورچکبڕی دانەوەو فەرمووی: ﴿وَمَا مَنَعَنَا أَن نُّرْسِلَ بِالآيَاتِ إِلاَّ أَن كَذَّبَ بِهَا الأَوَّلُونَ﴾الأسراء/٥٩.

سەیرە، ئەو هەموو نیشانە سەرئاساییانەی: کە ئەم نامە پیرۆزە، ئەم قورئانە سەرئاسایە لەخۆی گرتوون دادیان نادا، ئەم هەموو نیشانە جیا جیایانەی لەبوونەوەردا بڵاو کرانەوە بەسیان ناکا؟ داخوازی پەیدا بوونی موعجیزەی نائاسایی وەکوو هی پێغەمبەرانی پێشوو دەکەن؟؟

ئەوانە نەفامن لەسروشتی پێغەمبەرایەتی موحەممەد حاڵی نەبوون، نازانن سروشتی موعجیزەی پێغەمبەری ئیسلام لەهی پێغەمبەرانی تر جیاوازە، موعجیزەی موحەممەد موعجیزەیەکی کاتیو کورت خایەن نیە چینێك ببیننو بڕێتەوە؛ بەڵکوو موعجیزەی حەزرەتی موحەممەد ﷺ موعجیزەیەکی نەمرو گشتیو بەردەوامە، موعجیزەیەکە: چین لەدوای چین لەگەڵ دڵو عەقڵدا دەدویو لەوەتەری حەسساسو ناسکیان دەداو کۆن نابیو بەسەر ناچیو کاریگەری خۆی لەدەس نادا، هەتا عیلمو زانست پێش بکەوێ، ڕۆژگار بێنو بچنو ڕوداو ڕوو بدەنو تیۆرو فەلسەفە پەیدا ببن، قورئان زیاتر تازەگەریو واقیعیو گونجانی بۆ مامەڵە پێ کردنو کردنی بەیاسای ژیان دەسەلمێندرێ.

لەلایەکی ترەوە وەکوو چەسپاوە لەموعجیزەو کتێبە ئایینیو مێژووییو سیرەو بایوجرافییەکاندا پەروەردگار زۆر موعجیزەو نیشانەی زانستیو کەونی بەپێغەمبەر ﷺ بەخشیوە، بەڵام نەیکردونە بەڵگە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتیەکەیو داوای لێ نەکردون ئیمان بەکاریگەریو گرنگیان بێننو فەرمانی بەپێغەمبەر نەکردوە تەحەددای کافرەکانی پێ بکا، بەڵکوو ئەو موعجیزانەی پێ بەخشیون بۆ پێویستیاتی کاتی، بۆ نموونە گیرا بوونی بری نزاو

پاڕانــەوەی پێغەمبــەر ﷺ وەکـوو شـیفای نــەخۆش‌و تێـر کردنــی کۆمــەڵێکی زۆر بەخواردەمەنییەکی کەم لەغەزای بەدرو غـەزای تـەبووکدا، هـەروەها بـارانی بـاران بۆ دابینکردنی پێویستیاتی موسوڵمانان لەغـەزای بـەدردا، هـەروەها دوو لـەتبوونی مـانگو ناڵـەی قـەدە دارەکە، کـە پێغەمبـەر ﷺ پـشتی پێوەدا بـوو دوایـی بـەجێی هێـشتبوو، هـەروەها ئاخـاوتنی گیانلەبـەران لەگەڵیـداو گـەلێ شـتی تـر لـەدیاردەی نائاسـایی کـە بەپێغەمبـەرەوە بینـراون‌و لێـوەی دەگێڕنـەوە، ئەمانـە هەرچـەندە موعجیزە بوون وەلێ روداوێکی کاتی بوون‌و بەسەر چوون گرنگی بۆ ئەوانـە هـەبوە کە بینیویانە.

بەکورتی بەڵگەی بەهێز لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممـەد ﷺ قورئـانی پـیرۆزو نـەمرە، ئـەو کتێبـە سەرئاسـایەیە کـە تەحـەددای ئـادەمیزادو ئەجندەی پێ کردو بۆڕی دان، لەلایەکی ترەوە تازانیاری پێش بکەوێ‌و توێژینـەوە لەبوونەوەردا بکرێ، تیۆرو داهێنانی زانست ئامێز دەربکەوێ، زیاتر راسـتی قورئـان دەردەکەوێ‌و سەر ئاسایی‌و بێ وێنەیی دەچەسپێ.

موسلیم‌و بوخاری‌و تیرمیذی فەرموودەیەکیان بەمەرفووعی ریوایەت کـردوە، دەفەرموێ: (مامن نبي الا وقد أعطى من الآيات ما مثله آمن عليه البشر، وانما الـذي أوتيته وحياً أوحاه الله الي، فارجو أن أكون أكثرهم تابعا يوم القيامة).

پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبـەر ﷺ کـرد: کـە بەشـێوەیەکی کـورت وەڵامـی ئەوانە بداتەوە: کە پێشنیازی هێنانی ئایاتو نیشانەی جۆراو جۆریـان لەپێغەمبـەر دەکــرد، پێیــان وابــوو: ئــەو جــۆرە مــوعجیزە کــەونی‌و ماددیانــە نیــشانەی پێغەمبەرایـەتین. دەفـەرموێ: ﴿فَقُـلْ إِنَّمَـا الْغَيْـبُ لِلَّـهِ﴾ ئـەی موحەممـەد! بـەو موشـریکو بـێ بڕوایانـە بڵـێ: جێبـەجێ کردنـی پێـشنیازەکانی ئێـوە کـارو بـاری غـەیبن، تـەنها خـودا زانیـاری غـەیب دەزانـی‌و ئـەو ئیـشە نهێنـی‌و پەنامەکییانـە تایبەتن بەخۆیەوەو هەر خۆی ئاگاو سـەرەنجامی هەموو شـتێك دەزانـێ‌و هـەموو

کاروبارێك بەدەست خۆیەتیو بەویستی ئەو دێتە کایەوە، نەمنو نەهیکەش ئاگاداری عالەمی نهێنی نین، زانیاری غەیب تایبەتە بەزاتی پەروەردگارەوە، جا ئەگەر پەروەردگار بڕیاری دابێ موعجیزەیەك لەو موعجیزانەم بۆ بنێرێ ئەوە هەر خۆی کاتو چۆنیەتی هێنانی دەزانێ.

جا ئەگەر ئێوە بڕوام پێ ناکەن هەتا ئەو موعجیزە پێشنیاز کراوانەتان نەیەتە دی، ئەوە ﴿فَانْتَظِرُوا إِنِّي مَعَكُمْ مِنَ الْمُنْتَظِرِينَ﴾ چاوەڕوان بن با بزانین خودا چی بڕیار داوە بۆ منو بۆ ئێوە منیش لەگەڵتان چاوەڕوانم.

ئاشکراشە دەبێ چاوەڕوانی سزاو تۆڵەی خودابن، چونکە ئێوە سەررەقو ئینکارن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَهَلْ يَنتَظِرُونَ إِلاَّ مِثْلَ أَيَّامِ الَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِهِمْ قُلْ فَانتَظِرُواْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُنتَظِرِينَ﴾یونس/١٠٢.

**ئەوەی لەئایەتەکەوە وەردەگیرێ دوو شتی سەرەکییە :**

١- زانیاری غەیب (کە نیگا کردن بۆ پێغەمبەرانو ناردنە خوارەوەی موعجیزەو ئایاتی کەونی)یش دەگرێتەوە تایبەتمەندی خودانو هیچ کەس دەسەڵاتی زانینو دەستەبەرکردنیانی نیە.

٢- هەڕەشە کردن لەکافرەکانی مەککەو وێنەی ئەوان بەناردنی عەزاب بۆ سەریان ئەگەر ئیمان نەهێننو لەسەر سەررەقیو ئینکاری خۆیان بەردەوام بن.

## ڕەوشتی کافرەکان فرتو فێڵو سەرڕەقیو بێ ویژدانییە

﴿ وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً مِّنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُمْ إِذَا لَهُم مَّكْرٌ فِىٓ ءَايَاتِنَا ۚ قُلِ ٱللَّهُ أَسْرَعُ مَكْرًا ۚ إِنَّ رُسُلَنَا يَكْتُبُونَ مَا

تَمۡكُرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ
فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ
عَاصِفٞ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ
بِهِمۡ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ
لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمۡ إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ فِي
ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۗ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ
مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُكُمۡ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ
تَعۡمَلُونَ ﴿٢٣﴾

پاش ئەوەی لەئایەتی پێشوودا ڕەددی موشریکەکانی دایەوە بەوە: کە ناردنی ئایاتی کەونی شتێکە تایبەتە بەپەروەردگارەوە، بەشێکە لەکاروباری غەیب. ئەمجار لێرەدا وەڵامێکی تری موشریکەکان دەداتەوە، وەڵامەکەش ئەوەیە: کە ئەو موشریکانە تەنانەت ئەگەر ئەو ئایاتانە بنێردرێن و ئەوان بەچاوی خۆیان بیانبینن هەر بڕوا ناکەن، چونکە دابو نەریتو ڕەوشتیان فرتو فێڵو ئینکاریو بێ ویژدانییە، زۆر جار نیشانەی تاکو تەنهایی خودا دەبینن، کەچی پەند ئامێز نابن و فرتو فێڵی جۆراو جۆر ئەنجام دەدەن بۆ پشت هەڵکردنو ئیمان نەهێنان، کەچی وێڕای ئەوەش هەرکاتێ توشی تەنگو چەڵەمەیەك ببن دەست دەکەن بەهاتو

هاوارو دادو فیغان، ئەگەر کەوتنە خۆشییەوە لەخۆیان بایی دەبن.. دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا أَذَقْنَا النَّاسَ رَحْمَةً مِنْ بَعْدِ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُمْ إِذَا لَهُمْ مَكْرٌ فِي آيَاتِنَا﴾ هەرکاتێ بەخشیمان بەموشریکەکان خۆشیو هەرزانیو ئاسایش پاش تەنگو چەڵەمەیەك کە لەوەپێش یەخەی گرتبوون، لەجیاتی ئەوەی سوپاسی پەروەردگار بکەن، سەری بەندایەتی بۆ نەوی بکەن... گاڵتەی پێ دەکەن تانەو تەشەری ئاراستە دەکەن، دەیانەوێ کاریگەری دەسەڵاتی خودا لەو شتانەدا بشێرنەوە، واقیع هەڵبگێڕنەوە، گرنگی بەو روداوە نەدەن...

بۆ نموونە ئەگەر بارانی باراندو زەوی تێر ئاو کرد، دەڵێن: باران باری چونکە وەرزەکە وەرزی باران بارینە، یان بۆیە باران باری چونکە فلانە ئەستێرە دەرکەوتووە، ئەگەر یەکێك لەبەلایەك رزگاری بوو دەڵێ بەرێکەوت رزگارم بوو، ئەگەر لەئیشو کارەکانیدا سەرکەوتووبوو سەرکەوتنەکەی پاڵ کارامایيو زیرەکی خۆی دەداو هۆکارەکە ناگەڕێنێتەوە بۆ تۆفیقی خوداو ناڵێ خودا تۆفیقی دامو پشتگیری کردم!

تەنانەت قورەیشییەکان کە تووشی گرانیو بێ بارانی بوون هاتنە لای پێغەمبەرو لەروی خزمایەتیو صیلەی رەحمەوە داوایان لێ کرد لەخودا بپاڕێتەوە بارانیان بۆ بباری، خودا دوعای گیرا کردو باران باری، کەچی قورەیشییەکان بارینی بارانەکەیان پاڵ بتەکانیان دەداو، تانەو تەشەریان لەئایاتی خودا دەداو، دژایەتی پێغەمبەریان دەست پێ کردەوە، گەڕانەوە سەر حاڵی جارانیانو خودایان لەبیر چووەوە. وەکوو دەڵێن: هەر کاتێ ئادەمیزاد کەوتە ئەمنو ئاساییشو هەرزانییەوە خودای لەبیر دەچێتەوەو بوغرا دەبێو خۆی لەخۆ دەگۆڕێ!

بوخاریو موسلیم لەعەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە، ریوایەت دەکەن: کە قورەیشییەکان کاتێ بەپیر بانگەوازی پێغەمبەرەوە هاتنو بەدرۆیان خستەوە، نزای لێ کردن، کە خودا گرانییەکی وەکوو قاتو قڕی رۆژگاری حەزرەتی یوسفیان تووش

بێ، دوعای پێغەمبەر لەقورەیش گیرا بوو، گرانیو قاتو قڕی یەخەی گرتن وایان لێهات لەبرسان ئێسقانو مردارەوەبوویان دەخوارد، برسییایەتی تەنگی پێ هەڵچنین، بەجۆرێك کە یەکێکیان بیڕوانیایە بۆ ئاسمان، هەردوکەڵی دەهاتە پێش چاوانو تارمایی هەوری بەدی نەدەکرد، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُّبِينٍ، يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾الدخان/١٠-١١. ناردە خوارێ.

ئەبو سەفیان هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی موحەممەد! ئەتۆ فەرمانمان پێ دەکەی صیلەی رەحم بەجێ بێنین، وا خەریکە گەلەکەت قڕ ببیو لەبرسان بمرن، لەخودا بپاڕێوە باران بباری، پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کردنو خودا گرانی لەسەر لابردنو بارانیان بۆ باری، ئەوانیش هەمدیسان دەستیان کردەوە بەفرتو فێڵو گاڵتە کردن بەئایاتی خوداو دژایەتیکردنی پێغەمبەرو بەدرۆ خستنەوەی!!

ئەمجار پەروەردگار رەدیان دەداتەوەو فەرمان بەپێغەمبەر دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُلْ اللَّهُ أَسْرَعُ مَكْراً﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: خودا بەدەستو بردترە بۆ سزا دانو تۆڵە لێ ستاندنتان لەسەر کردەوەکانتان، ئەو سزایە یەخەتان دەگرێ پێش ئەوەی نەخشەی کوژاندنەوەی چرای ئیسلام جێ بەجێ بکەن. پەروەردگار زاناترو بەتواناترە بۆ (استدراج) راکێشکردنتانو مۆڵەتدانتان بەجۆرێك تاوانباران وا دەزانن: سزایان نادریو قوتاریان دەبێ، بەڵام باوا نەزانن: کە رزگاریان دەبێ، ئەوان مۆڵەتدراونو لەنکاوێکو لەپڕێکا عەزاب یەخەیان دەگریو تا تێکیانەوە نەپێچێ بەخۆیان نازانن!

باوا نەزانن ئێمە لێیان بێ ئاگاین ﴿إِنَّ رُسُلَنَا يَكْتُبُونَ مَا تَمْكُرُونَ﴾ بێگومان فریشتە چاودێرو کردەوەنووسەکان: کە بۆ تۆمارکردنی کردەوەی ئادەمیزاد تەرخان کراون، هەموو هەڵسو کەوتی ئەوان ئاگادارنو هەموو فرتو فێڵو نەخشەو پیلانو کارو کردەوەیان تۆمار دەکەنو سەرژمێری دەکەنو عەرزی دەکەن

بۆ پــه‌روه‌ردگاری ئاگـادار به‌ســه‌ر هــه‌موو نهێنـی‌و په‌نامه‌کییـه‌کدا، ئـه‌ویش سـزاو پاداشی پڕاو پڕتـان ده‌داتـه‌وه، هـیچ کردارێـك (بـچوك‌و گـه‌وره) نـابوێرێ، هیـچی لێ گوم نابێ، هه‌موو نهێنی‌و په‌نامه‌کی لای ئه‌و عه‌یان‌و نومایانه!!

ئـه‌مجار پـه‌روه‌ردگار تابلۆیـه‌کی سـه‌رنج راکێش راده‌نوێنـێ بـۆ ئـه‌وه‌ی حـاڵ‌و چۆنیه‌تی ئه‌و موشریکانه‌و هاووێنـه‌کانیان روون بکاتـه‌وه. ده‌فـه‌رموێ: ﴿هُـوَ الَّـذِي يُسَيِّرُكُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾ په‌روه‌ردگار خودایه‌کی وه‌هایه هێزو توانای پێ به‌خشیون: که بتوانن له‌وشکانی‌و له‌ناو ده‌ریادا هاتوچۆ بکـه‌ن، خۆتـان‌و مـاڵ‌و سامان‌و کالاَتـان لـه‌م وڵات بـۆ ئـه‌و وڵات بگوێزنــه‌وه، له‌وشـکانی‌دا بـه‌هۆی وڵاغ‌و قـه‌تارو ترومبێـل‌و گالیسکه‌وه، له‌ده‌ریادا به‌هۆی که‌شتی‌و گه‌مێوه له‌هه‌وادا به‌هۆی فرۆکه‌وه.

﴿حَتَّى إِذَا كُنتُمْ فِي الْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِمْ بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا بِهَا جَاءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَاءَهُمُ الْمَوْجُ مِنْ كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾ هـه‌تا کاتێك وا رێ ده‌که‌وێ ئێوه له‌که‌شتی‌دان‌و به‌هۆی بای گونجاو بۆ رۆییشتنی گه‌مێکه به‌ســه‌ر روی ده‌ریــادا به‌هێـدی‌و به‌نــه‌رمی بــه‌هێزی ئـه‌و بایـه خۆشـومزه درێـژه به‌رۆیشتن ده‌ده‌ن، که‌یفخۆش‌و شادمانن به‌و بایه موافیقه خۆشومزه گونجاوه، پاشان کوتـــوپڕ بایـــه‌کی نـــاموافیق‌و ره‌شـــه‌بایه‌کی ناهـــه‌موارو گێژه‌ڵوکـــه‌و زریـــان له‌که‌شتیه‌که‌یانی داو ده‌ریا شێواو شه‌پۆل هاتن‌و چوون‌و له‌هه‌موو لایێکه‌وه شـه‌پۆلی ترسـناك ده‌وره‌ی دان‌و گومانیـان وا بـرد: کـه ئـیتر رزگاربوونیـان نیـه‌و مـردن‌و له‌ناوچوون یه‌خه‌ی گرتـوون‌و کۆتاییانـه... ئـا لـه‌و کاتـه ترسـناکه‌دا هـیچ پـه‌نایان چنگ نه‌که‌وتن جگه له‌هانا بردن بۆ خودا، ئـیتر بـه‌دڵ لـه‌خودا پاڕانـه‌وه، ده‌سـتیان کرد به‌هاوارو سکالاَو لاڵـه‌و پاڵـه لـه‌بارگای خـوداو بـه‌نیازی راسـتاڵی‌و دڵسۆزییه‌وه عه‌رزی بارگای په‌روه‌ردگارتان کردو وتتان: ﴿لَئِنْ أَنْجَيْتَنَـا مِـنْ هَـذِهِ﴾ پـه‌روه‌ردگارا! ئه‌گه‌ر ئه‌مجاره له‌م مه‌رگـو مه‌ینه‌ته رزگارت کـردین ﴿لَنَكُونَنَّ مِنَ الـشَّاكِرِينَ﴾ ئـیتر

به‌گیانو به‌دڵو به‌زمان سوپاسگوزارینو سه‌ری به‌ندایه‌تی بۆ نیعمه‌ته‌کانت شۆڕ ده‌که‌ینو فه‌رمانبه‌ردارو یه‌کتاپه‌رست ده‌بین.

﴿فَلَمَّا أَنْجَاهُمْ﴾ که‌چی کاتێ خودا به‌میهره‌بانی خۆی رزگاری کردنو له‌و مه‌رگه‌ساتو مه‌ینه‌ته ره‌هابوونو له‌ده‌ریا ده‌رچوون، له‌جیاتی ئه‌وه‌ی به‌ڵێنی خۆیان ببه‌نه سه‌رو سوپاسگوزارو یه‌کتاپه‌رست بن ﴿إِذَا هُمْ يَبْغُونَ فِي الأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾ ده‌ستیان کردده‌وه به‌سته‌مکاری له‌سه‌ر زه‌وی‌و گه‌ڕانه‌وه بۆ سه‌ر بارو دۆخی پێشوویان! ده‌ستیان کردده‌وه به‌سته‌مکاری‌و یاخی بوونو سه‌رپێچی کردن.

ئه‌مجار په‌روه‌ردگار پاش ئه‌وه‌ی ئه‌و په‌ندو مه‌ثه‌لو تابلۆیه‌ی رانواند، خیطاب ئاراسته‌ی هه‌موو یاخی بووان ده‌کا له‌هه‌ر شوێنێکو له‌هه‌ر سه‌رده‌مو رۆژگارێکدا بنو فه‌رمووی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ مَتَاعَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ ئه‌ی ئاده‌میزادینه! بزانن: ئه‌م سته‌مکاری‌و یاخی بوونه‌تان تاوانه‌و سزاو تۆڵه‌که‌شی یه‌خه‌ی خۆتان ده‌گرێته‌وه، له‌دونیاو قیامه‌تدا بۆ خۆتان سزای ئه‌و تاوانانه ده‌چێژن، خۆتان پێی زه‌ره‌رمه‌ند ده‌بن، له‌دونیادا ئه‌و له‌ززه‌تو خۆشییه‌ی ده‌یچێژن کورت خایه‌نه‌و به‌رده‌وام نابێ، ویژدانتان لۆمه‌تان ده‌کاو هه‌میشه هه‌ست ده‌که‌ن به‌سزایه‌کی ویژدانی، زۆر جاریش وا ده‌بێ کابرای یاخی بوو هه‌ر له‌دونیادا سزای یاخی بوونی تووش دێو سه‌رباری سزای قیامه‌ت سزای دونیاش ده‌چێژێ! فه‌رمووده‌یه‌ك هه‌یه ئیمام ئه‌حمه‌دو بوخاری ریوایه‌تیان کردوه ده‌فه‌رموێ: (مامن ذنب أجدر أن يجعل الله لصاحبه العقوبة في الدنيا، مع ما يدخر له في الآخرة، من البغي و قطيعة الرحم) واته: هیچ تاوانێك هێنده‌ی تاوانی به‌غی‌و پچڕاندنی صیله‌ی ره‌حم شیاو نیه که سه‌رباری سزای قیامه‌ت له‌دونیاشدا خاوه‌نه‌کانیان تووشی سزا ببن.

له‌فه‌رمووده‌یه‌كی تردا: كه‌ تیرمیذی له‌خاتو عائیشه‌وه‌ ریوایه‌تی كردوه‌ ده‌فه‌رمویّ: (أسرع الخير ثواباً البر و صلة الرحم، و أسرع الشر عقاباً البغي و قطيعة الرحم) یان (ثنتان يعجلهما في الدنيا؛ البغي و عقوق الوالدين).

﴿ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُكُمْ فَنُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ پاشان سه‌رمه‌نجامو گه‌ڕانه‌وه‌تان رۆژی قیامه‌ت بۆ لای ئێمه‌یه‌، واته‌: دوای ژیانی كورت خایه‌نی دونیاتان زیندو ده‌كرێنه‌وه‌ بۆ دادگای‌و سزاو پاداش وه‌رگرتنه‌وه‌، ئه‌و كاته‌ هه‌واڵتان ده‌ده‌مێ به‌هه‌موو كردارو هه‌ڵوێستێكی دونیاتان، چی سته‌مكاری‌و یاخی بونتان ئه‌نجام داوه‌ هه‌مووی لای ئێمه‌ نووسراوه‌و سزای پڕاو پڕتان ده‌ده‌مینه‌وه‌. جا كه‌سێك نامه‌ی كرداری خێرو چاكه‌ی تێدا بوو، باسوپاسی خودا بكا، كه‌سێكیش ده‌فته‌ری كرده‌وه‌كانی خراپه‌ی تێدا بوو، ئه‌وه‌ با سه‌رزه‌نشتی خودی خۆی بكا..

## نموونه‌ی ژیانی دونیا له‌خێرا به‌سه‌رچوونی‌و بڕانه‌وه‌یدا..

﴿إِنَّمَا مَثَلُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلْأَنْعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَٰدِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِٱلْأَمْسِ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾﴾

پەروەردگار لەئایەتی پێشوودا فەرمووی: ﴿إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَى أَنفُسِكُم﴾ جا چونکە هۆی یاخی بوونی ئادەمیزاد سوور بوونیانە لەسەر ژیانی دونیاو زێدە ڕەوییانە لەهەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی نازو نیعمەتەکانی، نموونەو پەندێکی هێنایەوە بۆ ئەوەی هەر کەسێك عاقڵو هۆشمەند بێ بەژیانی دونیاو نیعمەتەکانی هەڵنەخەڵەتیو هەوڵ بدا بەشێوەیەکی میانەڕەوی پێویستییەکانی ژیانی دابین بکاو وازبێنێ لەبەکارهێنانی ڕێگای نامەشروعو نەگونجاو بۆ وەدەستهێنانی لەززەتەکانی، دووربکەوێتەوە لەستەمکاریو فەسادو ئاشووبگێڕی لەسەر زەویو بەژیانی کورت خایەنی جیهان لەخۆی بایی نەبێ.

بۆیە خودا تەشبیهو لێکچواندنێکی ئەنجامدا، تەشبیهی ژیانی دونیای کرد بەزەویو زارێك کە ئاودێر کرابیو گوڵو میوەو بەروبوومی باشی وەبەرهێنا بیو هەمیشە لەگەشەو نەشو نمادا بێ، تاوەختی دروێنەو چنینو ڕنینی هات، بەڵام لەنکاوێك وەیشوومەو ڕەشەباو زریان لێی داو لەبێخ دەری هێناو ئاداری بەسەر پاداریەوە نەهێشت. دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ وَالْأَنْعَامُ﴾ نموونەو شێوەی ژیانی دونیا لەرازاوەییو گەنجیو دەسەڵاتو هێزو تواناو داراییو هۆی پێکهاتنی کامەرانی ژیان لەهەموو ڕوویەکەوە، دەشوبهێتە ئاوی ئارامی بەهاران کە لەئاسمانی بەخشندەیی خۆمانەوە دەیبارێنین بەسەر زەوی تینووی نەرمانو بەپیتدا، جا بەهۆی ئەو بارانەوە زەوی زیندو دەبێتەوە، گژو گیای جۆراو جۆر دەڕویو سەر لەخاك دەردێنێ دارو درەخت چرۆ دەکەنو شین دەبنەوە، هەموو ئەمانە نەشو نما دەکەنو تێك دەچەرژێنو تێکەڵ بەیەکتر دەبن، بوونەوەر دەڕازێننەوە، سپیو سەوزو سورو شینو زەردو ئاڵو پەمەییو... باوەش لەیەکتری وەردێنن، گیاو گژی وا هەیە ئادەمی دەیخواو سوودی لێ وەردەگرێ، بەروبوومی وا هەیە، پێخۆرو بژێوی ئادەمیزادە هی واش هەیە خۆراکی ئاژەڵو گیانلەبەرانی ترە.

﴿حَتَّى إِذَا أَخَذَتْ الأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَازَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَا أَنَّهُمْ قَادِرُونَ عَلَيْهَا﴾ هەتا کاتێ زەوی بەهۆی ئەم ڕێژنە بارانە بەهارییانەوە بەشی خۆی لەجوانیو رازاوەییو زینەتو زیبا وەردەگرێ، برێ دار هەڵئەچێو بازێ دائەچێو لەبەر میوەی زۆر گران لقەکانی شۆڕ دەبنەوە، هەندێ بەسەر زەویدا بڵاو دەبێتەوە، گژو گیا کامڵ دەبیو دانەوێڵە پێدەگاو میوە دێتە بەر، هەموو بەروبومو دانەوێڵە کاتی ئەوەی دێ دروێنە بکرێنو بچێندرێنو بهێندرێنەوە بۆ ماڵو عەمبار بکرێن، خاوەنەکانیان دێنە سەر ئەو باوەڕە کە کاتی دروێنەو رنینو چنین هاتوەو هەموو شتێك کاتی سوود لێ وەرگرتنیان هاتووە، دەتوانن سوودیان لێ وەرگرن! ئا لەو سەرو بەندەدا ﴿أَتَاهَا أَمْرُنَا لَيْلاً أَوْ نَهَاراً فَجَعَلْنَاهَا حَصِيداً كَأَنْ لَمْ تَغْنَ بِالأَمْسِ﴾ کوتوپڕ قەزاو قەدەری ئێمە بۆ لەنابردنی ڕوی کردە ئەو باخو بێستانو کشتو کاڵە زۆرو هەمو جۆرە بەشەو یان بەڕۆژ بەفاری خۆمان لێمان داو هەموو ئەو گیاو گژو دارو دروختو دانەوێڵەو بەروبوومە حەڵاڵو پێگەیشتوەمان کردە سوتەمەڕۆو لەکەڵکی خواردنو سوود لێ وەرگرتن کەوت! هەروەکوو لەدوێنێدا نەبووبیو نەبیندرا بێ، کەسێك شارەزا نەبووبێ نازانێ ئەو شوێنە شوێنی کشتو کاڵ بووە یان نا، هەر دەڵێی لەوەپێش سەوزایی لێ نەبووەو شینایی لێ شین نەبووە!

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَفَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَى أَن يَأْتِيَهُمْ بَأْسُنَا بَيَاتاً وَهُمْ نَآئِمُونَ، أَوَ أَمِنَ أَهْلُ الْقُرَى أَن يَأْتِيَهُمْ بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ﴾الأعراف/٩٧-٩٨.

فەرموودەیەك هەیە ئەحمەدو موسلیمو نەسائیو ئیبنو ماجە لەئەنەسەوە ریوایەتیان کردوە، دەفەرموێ: (يؤتي بأنعم أهل الدنيا، فيغمس في النار غمسة، فيقال له هل رأيت خيراً قط؟ هل مرَ بك نعيم قط؟ فيقول: لا، و يؤتى بأشد الناس عذاباً في الدنيا فيغمس في النعيم غمسة، ثم يقال له: هل رأيت بؤسا قط؟ فيقول: لا) ڕۆژی قیامەت خۆشگوزارانترین ئادەمیزاد دێنن: کە لەدونیادا لەهەموو کەس خۆشتری رابواردبێ، جارێك لەئاگری رودەکەنو دەری دێننەوەو پێی دەگوترێ

ئەرێ لەدونیادا هەرگیز خۆشیت دیوە؟ ئەرێ لەدونیادا خۆشگوزەرانیت بەسەردا تێپەڕیوە؟ لەوەڵامدا دەڵێ: نەخەیر. ئەمجار یەکێکی تر دێنن: کە لەهەمووکەس لەدونیادا ژیانی ناخۆشتر بووبێ، تۆزێك دەخرێتە ناو لەززەتو خۆشی بەهەشتەوە، ئەمجار پێی دەگوترێ: ئەرێ قەت ناخۆشیت بینیوە؟ دەڵێ: نەخەیر.

﴿كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ وەکوو ئەم مەثەلە ئاشکرایەو بەو جۆرە ئاوا ئێمە نیشانەکانی دەسەڵاتی خۆمان شی دەکەینەوە بۆ گەلو نەتەوەیەك: کەبیر لەحاڵی دونیا بکەنەوە، کە لەگەڵ ئەوەدا زوو بەسەر دەچێ، کەچی ئادەمیزاد ئاوا خۆیانی پێوە هەڵەوگیر دەکەن!! بەڵێ بەو جۆرە ئێمە بەلگەو نیشانەی سەلمێنەری تاكو تەنهایی خۆمانو هەبوونی سزاو پاداش لەرۆژی قیامەتداو هەرچی بەرژەوەندی ئادەمیزادی تێدابێ شی دەکەینەوە بۆ کەسانێك کە بیر لەئایاتی خودا بکەنەوە، عەقڵو بیرو هۆشی خۆیان دەخەنە کار بۆ پەند وەرگرتن بەم پەندو مەثەلانە دەربارەی ژیانی دونیا: کە زوو لەکیس خەڵك دەچێو گۆڕانی بەسەردا دێ.

بێگومان لێکچواندنی دونیا بەگژوگیای زەوی لەقورئاندا زۆرو زەبەندەیە وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرّاً ثُمَّ يَكُونُ حُطَاماً وَفِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٌ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ﴾الحديد/٢٠.

یان ئایەتی ﴿وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاء أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيماً تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُّقْتَدِراً﴾الكهف/٤٥.

یان ئایەتی ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِ زَرْعاً مُّخْتَلِفاً أَلْوَانُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرّاً ثُمَّ يَجْعَلُهُ حُطَاماً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِأُوْلِي الْأَلْبَابِ﴾الزمر/٢١.

## هەڵنانی ئادەمیزادان بۆ بەهەشتو باسی حاڵو چۆنیەتی چاکەکارانو خراپەکاران لەقایەمەتدا

﴿ وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ
مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٢٥﴾ ۞ لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ وَلَا يَرۡهَقُ
وُجُوهَهُمۡ قَتَرٞ وَلَا ذِلَّةٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ
﴿٢٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةِۭ بِمِثۡلِهَا وَتَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ
مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۖ كَأَنَّمَآ أُغۡشِيَتۡ وُجُوهُهُمۡ قِطَعٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ
مُظۡلِمًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار لەخۆبایی بوونی ئادەمیزادانی بەدونیا روون کردەوەو لەم بارەوە نموونەی هێنایەوە، بەشوێن ئەوەدا ئادەمیزادانی هەڵنان بۆ

وەدەستهێنانی بەهەشتو هەروا باسی حاڵو چۆنیەتی خراپەکارانو چاکەکاران لەقیامەتداو فەرمووی: ﴿وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى دَارِ السَّلَامِ﴾ پەروەردگار بانگەوازی هەموو بەندەکانی دەکا بۆ ئیمان هێنانو ئەنجامدانی کردەوەی چاك: کە دەبنە هۆی چوونە بەهەشتو حەسانەوە لەناو خانووی ئاشتیو ئارامیدا!!

بەبەهەشت دەگوترێ: (دار السلام) چونکە (دار) کە مەبەست پێی بەهەشتە ئیضافە کراوە بۆ لای (السلام) لەم روەوە: کە هیچ ناخۆشیو کەمو کوڕیو تەمو لێڵی تێدا نیە. یان دەگوترێ: بانگەوازی پەروەردگار بۆ ئیمانهێنان گشتییەو هەموو کەس دەگرێتەوە. ﴿وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ کەسێکیش خودا مەیلی لێ بێ شارەزای رێگای راستی دەکا: کە بیگەیەنێتە بەهەشت، تۆفیقی دەدا بۆ بڕوا هێنانو پابەندبوون بەئەحکامو ئەخلاقی ئیسلامییەوە کەوایە: بانگەوازی بۆ ئیمان هێنان گشتیو یەکانگیرە، بەڵام هیدایەت پابەندە بەمەشیئەتەوەو تایبەتییە.

**لەلایەکی ترەوە ئاشکرایە هیدایەت دوو جۆرە:**

+ هیدایەت: بەمانای شارەزایی کردنو رێنمویی کردن، ئەمەیان گشتییەو بۆ هەموو ئادەمیزادەو بریتیە لەبانگەوازیکردنی ئادامیزادان بۆ ئیمانهێنان.

+ هیدایەت: بەمانا تۆفیقدانو یارمەتیدان بۆ گەیشتن بەمەبەست؛ ئەمەیان تایبەتە بەو کەسانەی کە خودا دەیەوێ بەمراز بگەن. واتە تایبەتە بەو کەسانە: کە تۆفیقی داونو ئامادەباشی پابەند بوون بەئایینی خودایان تێدایە!

﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ﴾ لەقیامەتدا هەیە بۆ ئەو کەسانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوەی باشیان ئەنجام داوە پاداشی چاكو زێدە پاداش تا دەچەندانەو زیاتریش بەڵکوو تا حەوتصەد هێندەو زیاتریش.

پاداشی زیادەو لەهەموو پاداشێك باشترو زیاتر بەهرەمەندبوونە بەدیتنی خودای پەروەردگار.

ئیمام ئەحمەدو موسلیمو کۆمەڵێك لەپێشەوایانی ئیسلام ریوایەت دەکەن لەصوهەیبەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ﴾ ئەمجار فەرمووی: (اذا دخل أهل الجنة الجنة، وأهل النار النار، نادي مناد: ياأهل الجنة، أن لكم عند الله موعداً يريد أن ينجزكموه، فيقولون: وما هو؟ ألم يثقل موازيننا؟ ألم يبيضّ وجوهنا ويدخلنا الجنة ويجرنا من النار؟ قال: فيكشف لهم الحجاب، فينظرون اليه، فو الله ما أعطاهم شيئاً احب اليهم من النظر اليه ولا أقر لا عينهم) کاتێ کە بەهەشتی چونە بەهەشتەوەو دۆزەخی چوونە دۆزەخەوە، بانگکەرێك بانگ دەکا ئەی بەهەشتییەکان! خودا وادەیەکی پێداون، دەیەوێ بۆتانی بێنێتە دی. دەڵێن: ئەو وادە چیە؟ چ ماوە بماندرێتێ؟ ئەوە نیە تەرازوی نامەی چاکەمان قورس کرا، روومان سپی بوونو خراینە ناو بەهەشتەوەو لەئاگر پارێزراین؟! دەفەرموێ: پەردە لا دەدرێ، هەموویان دەڕواننە پەروەردگار، سوێند بەخودا هیچ شتێکی بەهەشتیان بەئەندازەی ئەو سەیرکردنە لا خۆش نیە، هیچ شتێك ئەوەندەی ئەو دیتنە چاویان فێنك ناکاتەوە!

ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبو حاتەم لەئەبو موسای ئەشعەرییەوە ئەویش لەپێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرموێ: (ان الله يبعث يوم القيامة منادياً ينادي، ياأهل الجنة -بصوت يسمع أولهم و آخرهم- ان الله وعدكم الحسنى و زيادة، فالحسنى: الجنة، و الزيادة: النظر الى وجه الرحمن عز وجل).

﴿وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ﴾ هیچ شتێك لەتەپو تۆزی رەش دەمو چاویان داناپۆشێ لەکاتێکا کافرەکان دەمو چاویان تەپو تۆزاویو رەشی دایان دەپۆشێ، ئەوان دەمو چاویان روناکو نورانییە، سوکایەتییان پێ ناکرێ چاو بەرەژێرو زەلیلو ئیهانە پێکراو نین، بەئاشکراو بەنهێنی سەر بەرزو سەرفرازن، بەمراد گەیشتوو بەنازن!!

خودا لەم شەڕو شەرمەزارییە پاراستوونیو دەیانپارێزێ، وەكوو لەشوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾الإنسان/١١.

﴿أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ئەو بەندە راستالآنەی ئەوە صیفاتو نیشانەیانە هەر ئەوان بەهەشتینو خودا پێداون، ئەوان دەچنە ناو بەهەشتەوەو بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە، خۆشیو نیعمەتەكانی بڕانەوەیان نیەو كۆتاییيان نایە.

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار باسی حاڵو چۆنیەتیو سەرەنجامی موسوڵمانانی بەمرازگەیشتوو خۆشبەختی كرد، دێ باسی حاڵو چۆنیەتی سەرەنجامی كافرە بەدبەختەكان دەكا، ئەم شێوازە بەرامبەری كردنو بەیەكگرتنە، ئوسلووبێكە قورئان زۆرجار بەكاری دەهێنیو پەیڕەوی دەكاو شێوازێكی سەركەوتووشە لەبواری بانگەوازیو چەسپاندنی بیرو باوەڕدا، دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ كَسَبُوا السَّيِّئَاتِ جَزَاءُ سَيِّئَةٍ بِمِثْلِهَا﴾ ئەوانەی خراپەكارنو لەدونیادا تاوان ئەنجام دەدەن كافرو موشریكو ستەمكارن، سزای پڕاو پڕ وەردەگرنەوەو هیچ لەتاوانەكانیان زیاد ناكرێ، بەئەندازەی تاوانەكانیان سزایان لێ دەسێندرێ!

﴿وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ﴾ چاو بەرەو ژێریو ریسواییو زەلیلی دایان دەپۆشێ، ترسو خۆفو ریسوایی دەوریان دەداو لەعەیبەتانو لەترسان خەریكە زەندەقەیان بچێو واقیان وڕدەمێنێ، كە دەبینن نامەی كردەوەكانیان ئەو هەموو شیركو ستەمكاریو بوختانو تاوانانەی لەخۆگرتووە، پەنجەی پەشیمانی دەگەزنو هیوا بڕاو دەبن، ﴿مَا لَهُمْ مِنْ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ﴾ هیچ شتێك نیە بتوانێ لەعەزابی خودا بیانپارێزێ، هیچ كەس نیە فارو تۆڵەی خودایان لەكۆڵ بكاتەوە. وەكوو لەشوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْئاً وَالْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِلَّهِ﴾الأنفطار/١٩. یان دەفەرموێ: ﴿يَقُولُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ الْمَفَرُّ ؟ كَلَّا لَا وَزَرَ، إِلَى رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمُسْتَقَرُّ﴾القيامة/١٠-١٢.

ئـەو تاوانبارانــە لەترسـانو لەشـەرمان وا دەپەشـۆكێنو شـپرێو دەبـنو ڕەش دادەگیرسێن ﴿كَأَنَّمَا أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعاً مِنْ اللَّيْلِ مُظْلِماً﴾ هەر دەڵێی دەمو چاویان بەپارچەیەك لەتاریكی شەو داپۆشراوەو ڕەشو برش دەبنو هیچ ڕوناكایی لەشێوەو ڕوخساریاندا نامێنێ.

﴿أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُـمْ فِيهَـا خَالِـدُونَ﴾ ئەوانـەی حـاڵو چۆنیەتییان بـەم ئاكامــە دەگــاو بــەو شـێوە ڕیــسوا دەبــنو ئــاوا لەرەحمــەتو بــەزەیی خــودا دوور دەخرێنەوە هاوەڵانی ئاگرنو پێری دۆزەخینو بۆ هـەتا هەتایـە تێیـدا دەمێننـەوەو لێی دەرناچن!

## حەشركردنی هەموو بەندەكانی پەروەردگارو پاكانە كردنی شەریكو خودا درۆزنەكان لەموشریكەكان

﴿ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ مَكَانَكُمْ
أَنتُمْ وَشُرَكَآؤُكُمْ ۚ فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ ۖ وَقَالَ شُرَكَآؤُهُم مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا
تَعْبُدُونَ ﴿٢٨﴾ فَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ إِن كُنَّا عَنْ
عِبَادَتِكُمْ لَغَـٰفِلِينَ ﴿٢٩﴾ هُنَالِكَ تَبْلُوا۟ كُلُّ نَفْسٍ مَّآ أَسْلَفَتْ ۚ
وَرُدُّوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ ۖ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ

﴿٣٠﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار ئاکامی چاکەکاران‌و خراپەکارانی لەرۆژی قیامەتدا روون کردەوە، بەشوێن ئەوەدا باسی رۆژی قیامەت دەکا؛ ئەو رۆژەی: کە حەشری مەخلوقاتی تێدا دەکرێ، عیبادەتکەرو عیبادەت بۆ کراو بەرەورووی یەکتر دەکاتەوەو عیبادەت بۆ کراو یەخەی خۆی لەعیبادەتکەر دادەڕی‌و هەموو خودا درۆزنەکان؛ ئەوانەی گومڕاکان بەهاوەڵی خودایان دەزانین هەموویان عیبادەتکەرەکان بەدرۆ دەخەنەوە دەڵێن: ئەوانە هەرگیز عیبادەتیان بۆ ئێمە نەکردوە، بەڵکوو فەرمانی شەیتانیان جێ بەجێ کردوە. دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعاً﴾ ئەی پێغەمبەر! یادی ئەو رۆژە بکەرەوە: کە ئێمە هەموو مەخلووقات بەئادەمیزادو جندۆکەوە، بەچاکەکارو خراپەکاریانەوە زیندو دەکەینەوەو کۆیان دەکەینەوە بۆ لێپرسینەوەو لێکۆڵینەوەو سزاو پاداشدانەوە، هەموویان راپێچی سارای مەحشەر دەکەین. ﴿ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا مَكَانَكُمْ أَنتُمْ وَشُرَكَاؤُكُمْ﴾ پاشان رودەکەینە موشریکەکان‌و پێیان دەڵێین: لەشوێنی خۆتان بوەستن‌و جووڵە مەکەن ئێوەو ئەوانەی بەشەفاعەتکارو هاوەڵی خوداتان دەزانین راوەستن چاوەڕوان بن، ئاخۆ چیتان لەگەڵ دەکرێ‌و چ حوکم‌و بڕیارێکتان دەربارە دەردەچێ!!

ئەمەیە چیرۆکی شەفاعەتکاران‌و خودا درۆزنەکان، بەراستی دیمەنێکی سامناک‌و پڕمەترسییە، دیمەنێکە لەدیمەنەکانی رۆژی قیامەت دیمەنێکی زیندوو سەرنج راکێش‌و هەست بزوێنە، هەواڵێکی ئاسایی نیە!

ئەوانە: عابیدو مەعبوود، کافرەکان‌و بەخودا دانراوەکان هەموویان کۆدەکرێنەوە، موشریکەکان وایان دەزانی کە ئەو بت‌و صەنەم‌و خودا درۆزنانە هاوبەشی خودان، بەڵام قورئان ناڵێ (شرکاء الله) بەڵکو دەڵێ (شرکاؤهم) واتە: شەریکەکانیان، ئەمەش بۆ گاڵتە پێکردن‌و بەسووك زانینیان لەلایەکەوەو لەلایەکی ترەوە ئاماژەیە: بۆ ئەوە کە ئەمانە شەریکی خودا نین‌و ئەوان بەشەریکی خودایان زانیون!

ئەوانە هەموویان فـەرمانیان ئاراستە دەکرێ کـە لەشوێنی خۆیـان بوەسـتن، نـەجوولێن، هەڵبەتـە یەکسەر وەکـوو بزمـار دادەکـوترێنو جووڵـەیان لێ دەبـڕێ، فەرمانەو بۆ جێ بەجێ کردنە، مۆڵەتو خۆ لێ دزینەوە نیـە، راوەسـتن نـەجوولێن، قاچ هەڵنەهێننەوە، چاوەڕوان بن چ فەرمانێکتان پێ دەکرێ.

﴿فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ﴾ پاشـان عیبادەتکـەرەکانو عیبـادەت بـۆ کراوەکانمـان لێـك جیـا کردنەوە، لێکمان هەڵهاواردن، بەرامبەر بەیەك رامان گرتن.

ئالـەو کاتـەدا کافرەکـان قـسە ناکـەن، قـسەیان بـۆ نـاکرێ، نـاتوانن بـەرگری لەخۆیان بکەن، بەڵام بەخودا دانراوەکـان (شـرکاء) ئـەوان دەکەونـە قـسەو پاکانـەی خۆیـان لـەو تاوانـە رادەگەیـەنن، تـاوانی ئـەوە: کـە کافرەکـان لەتـەك خـودادا پەرستشیان بۆ کردون، ئیعلانی ئەوە دەکەن: کە ئەوان ئاگاداری ئـەوە نـەبوون ئـەو گومڕایانـە عیبادەتیـان بـۆ ئـەنجام داونو هەسـتیان پـێ نـەکردوە، کـەوابێ ئـەوان هاوبەش نین لەتاوانەکەدا، خودا دەکەن بەشایەدو دەڵێن: خـودا ئاگـادارە ئێمـە لـەو عیبادەتکردنەی ئێوە بۆ ئێمەتان ئەنجام داوە بێ ئاگاینو نـەمانزانیوە. دەفـەرموێ: ﴿وَقَالَ شُـرَكَاؤُهُمْ مَـا كُنـتُمْ إِيَّانَـا تَعْبُـدُونَ﴾ خـودا درۆزنـەکانیان پێیـان دەڵـێن: درۆ دەکەن، ئێوە بەتایبەتی ئێمـەتان نەپەرسـتووە، بـەڵکوو ئێـوە عیبـادەتی شـەیتانتان کـردوە، ئـەو فـەرمانی پـێ کـردون هـاوەڵ بـۆ خـودا دابنـێنو بیانپەرسـتن، ئێـوەش بـەگوێتان کـردووە، پەیکـەرتان بـۆ ئێمـە تاشـیوەو بەناحـەق ئێمـەتان بەشـەریكو هاوەڵی خودا زانیوە، گومڕابوونو سەرتان لێ تێکچووە. پەرستراوی حـەقو شـیاو بـۆ خودایەتی تەنها زاتی (اللـه)یە هەر ئەو خاوەنی دەسەڵاتەو سوودو زیـانی بەدەسـتە ﴿فَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيداً بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ﴾ بەسە بۆ راستی ئەم قسانەمان کە خودا شایەد بـێ لەنێوان ئێمەو ئێوەدا، ئەو ئاگادارە بەحاڵی ئێمەو حـاڵی ئێـوە، خـودا دەزانـێ ئێمـە بانگـەوازی ئێوەمـان نـەکردوە بمانپەرسـتن، فـەرمانمان پـێ نـەکردوون، رازیـش نەبووین بەوە عیبادەتمان بکەن!

﴿إِنْ كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَافِلِينَ﴾ بێگومان ئێمە تەواو بێ ئاگابوین: لەعیبادەتکردنی ئێوە، نەمانزانیوە کە ئێوە عیبادەتی ئێمە دەکەن، بشمان زانیایە پێی رازی نەدەبووین.

قورطوبی دەفەرموێ: واتە: ئێمە لەعیبادەتکردنتان بۆ ئێمە هەر بێ ئاگابووین نەدەمانبیست، نەدەمانبینی، نەهەستمان پێ دەکرد، چونکە ئێمە بێ گیان بووین، بەردو دارێکی تاشراوو رێکخراو بووین.. جا ئەگەر ئێوە عیبادەتی ئێمەتان کردبێ، ئەوە ئێمە لەراستیدا لێی بێ ئاگاینو هیچ زانیارییەکمان لەو بارەوە نیە. بەراستی ئەمە شەرمەزاریو ریسواکردنێکی گەورەیە بۆ ئەو موشریکانەی: کە لەگەڵ خودادا شتی تریان پەرستووە؛ شتێك نەدەبیسێ نەدەبینێ، نەسوودو قازانجی هەیە. نەفەرمانیان پێ کراوە بەپەرستن، نەپەرستراوەکان رازین بەو عیبادەتە، بەڵکوو لەتەنگانەترین کاتو شوێندا پاکانەیان لێ دەکەن!

سەیرە ئەوان وازیان هێناوە لەعیبادەتکردنی خودای زاناو بیناو شنەواو بەتواناو ئاگادار بەسەر هەموو شتێکدا، ئەو خودایەی پێغەمبەرانی ناردوون، نامەی ئاسمانی پێدا ناردوون بۆیان، فەرمانی پێ کردوون: کە هەر خودا بپەرستن، جڵەوگیری لێ کردوون لەعیبادەتکردن بۆ هەر شتێك جگە لەزاتی خۆی! دەی باشە هەڵوێستو هەڵسوکەوتی ئەوان جێگای سەرسوڕمانە، یان ئەوە: کە خودا پێغەمبەر لەئادەمیزاد بنێریو نیگایان بۆ بکا؟! کامەیان جێگای تەعەججوبە؟

﴿هُنَالِكَ تَبْلُو كُلُّ نَفْسٍ مَا أَسْلَفَتْ﴾ ئالەو مەوقیفە ترسناکەداو لەو کاتی لێکۆڵینەوەو حیساب لەگەڵ کردنەدا هەموو نەفسێك لەعابیدو مەعبوود، موسوڵمانو کافر، تێدەگاو دەزانێ: چی کردوەو چی نەکردوە، کردەوەی باشی ئەنجام داوە یان خراپ، شیاوی چوونە ناو بەهەشتە یان دۆزەخ!!

﴿وَرُدُّوا إِلَى اللَّهِ مَوْلَاهُمُ الْحَقِّ﴾ هەموو بەندەکان گێڕدرانەوە بۆ لای پەروەردگار، هەموو ئیشو کارێك گەڕێندرایەوە بۆ لای خودای حاکمو دادوەر،

خودای حه‌ق‌و هه‌بوو هه‌میشه زیندوو ئاگادار، ئه‌وانه‌ی شیاوی چوونه ناو به‌هه‌شتن خستنیه به‌هه‌شته‌وه، ئه‌وانه‌ی شیاوی چوونه ناو دۆزه‌خ بوون، تورِی‌دانه دۆزه‌خه‌وه، به‌راستی هه‌ر خودا په‌روه‌ردگارو خاوه‌ن‌و سه‌رپه‌رشتیاری به‌نده‌کانیه‌تی، نه‌ك ئه‌وانه‌ی به‌شه‌ریکی خودایان داناون‌و پێیان وا بوو هاوه‌ڵی خودان!

﴿وَضَلَّ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ گوم بوو له‌و کافرانه ئه‌و شه‌ریك‌و خودا درۆزنانه‌ی به‌خودایان دانابوون‌و پێیان وا بوو: هاوه‌ڵ‌و هاوبه‌شی خودان، هیچ یارمه‌تیده‌رو تکاکارێکیان نه‌ماو بۆیان ده‌رکه‌وت هه‌موو شتێك به‌ده‌ست خودایه، که‌سی تر هیچی به‌ده‌ست نیه.

## چه‌سپاندنی تاك‌و ته‌نهایی خودا له‌روانگه‌ی سه‌لماندنی ربوبییه‌ته‌وه لای خودی موشریکه‌کانیش

﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ
ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ
مِنَ ٱلْحَىِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ
﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ ۖ فَأَنَّىٰ
تُصْرَفُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ
فَسَقُوٓا۟ أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾

دوای ئـەوەی پـەروەردگار سـتەمو جینایـەتی موشـریکەکانی لەسـەر خـودی خۆیان روون کردەوە: لەم رووەوە کـە هاوەڵو شـەریکیان بـۆ خـودا دانـاون، ئـەمجار بەڵگە لەسـەر پوچـەڵی ڕێبازەکـەیان دێنێتـەوە: کـە بریتییـە لەبتپەرستی، جا کـە ڕێبازەکەیان پووچەڵ بێ، دیارە تاکو تەنهایی خودا دەچەسپێ، چونکە دان بـەوەدا دەنـێن کـە هـەر خـودا رزقو رۆزیـدەرەو هـەر ئـەو دەمرێنـیو زینـدو دەکاتـەوە، گیانبەخشو گیانستێنەوە هەر خۆیەتی.

دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ﴾ ئـەی موحەممـەد! بـەو کافرو موشریکانە بڵێ: کێ رزقو رۆزیی ئێوە دەدا؟ لـەئاسمان بـەهۆی ئـەو بارانـەی لەبەرزاییـیـەوە دەیبارێنێتـە خـوارێ، هـەروا لـەزەویدا بـەهۆی ئـەو گیـاو گـژو دارو درەختەی تێیدا دەڕوێنێ، خۆتانو ئاژەڵەکانتان لێیان دەخۆن؟

کێ دەتوانێ (جگە لەخودا) باران ببارێنێ، کە بەهۆی ئەو بارانە، کشتو کاڵ دەڕوێو وەبەر دێ؟ وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿أَمَّنْ هَذَا الَّذِي يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُ ؟﴾الملك/٢١.

ئاشکرایە هەر خودا سەرچاوەی رزقو رۆزیـدەری ئێوەیـە، لەئاسمانـەوە بـاران دەبارێنیو لەزەویدا کشتو کاڵی پێ دەڕوێنیو رزقو رۆزیی بۆ ئێوە بەرهەم دێنێ! نیعمەتو رەحمەتی لـەم بـارەوە هـەموو کـەس دەگرێتـەوە رزقو رۆزیـی هـەمووتان دەدا.

﴿أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ ؟﴾ ئـەی موحەممـەد! پێیـان بڵـێ: کـێ ئـامێری بیـستنو دیـتنو هەسـتەکانی تـر بـۆ ئێـوە دابـین کـردوە؟ کـێ بـەدی هێنـاون؟ کـێ لەئافات دەیانپارێزێ؟ کێ ئاوا بەو جۆرە هێزی بیـستنو دیـتنو لـەمسو بـۆنکردنو تـامکردنی پـێ بەخـشیون؟ خـۆ ئەگـەر بیـەوێ لێتـان دەسـتێنێتەوەو بـێ هەسـتو شعوورتان دەکا، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ الَّذِي أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ﴾الملك/٢٣.

بەهۆی ئـەم هەسـتانەوە ئـادەمیزاد دەتوانـێ زانیـاری بەدەسـت بێنـیو بزانـێ بەسەر هەندێ روداوی جیهاندا ئاگادار بێ.

بۆیەش بەتایبەتی باسی ئامێری بیستنو ئامێری دیتنی کرد، چونکە ئەمانـە گرنگترین هەستەکانو هۆکاری بەدەستهێنانی زانیاریو زانستن. ﴿وَمَنْ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِـنْ الْمَيِّـتِ وَيُخْـرِجُ الْمَيِّـتَ مِـنْ الْحَـيِّ ؟﴾ کـێ دەتوانـێ بـەتواناو دەسـەڵاتی لـەبن نەهاتووی کاروبـاری پەیوەنـد بـەمردنو ژیانـەوە ئـەنجام بـدا؟ دەمرێنـێو دەژێنـێ، زیندوو لەمردوو پەیدا دەکاو مردوو لەزیندوو دەردێنێ، وەکوو رسکانی دارخورمـا لەدەنکـە خورمـاو دروسـتکردنی پەلـەوەرو گیانلەبـەری تـر لەهێلکـەو دڵۆپـە ئـاو، بەپێچەوانەشەوە دەنکی مێوەو هێلکەو تۆماو لەدرەختو باڵنـدەو گیانلەبـەرانی تـر دەردێنێ.

هەڵبەتــە دەرهێنــانی دەنکــە تــۆم لــەرووەكو هێلکــە لەگیانلەبــەر، یــان بەپێچەوانەوە دەرهێنـانی رووەك لەدەنکە تـۆمو بێچوو لەهێلکە، خـۆی لـەخۆیدا سەرسوڕهێنەرە، تەنانـەت پـاش ئـەوەی زانیـاری پـێش کـەوت، زانـدرا کـە هێلکـەو دەنکە تۆمو وێنەکانیان بەمردو ناژمێردرێن، بەڵکوو جۆرە گیانێکیان تێدایە.

بێگومان نهێنیو شێردراوەی ژیـانو رەچەڵەكو شـێوەو روخـسار شـتێکە لـەو شـتە سەرسـوورهێنەرانەی کـە دەسـەڵاتی خـودا دروسـتیان دەکـاو عـەقڵو عیلمـی ئادەمیزاد لەئاستیاندا کۆڵو سەرسوڕماوو جۆش داماوە!

بێگومان هەڵوێستەیەك لەبەردەم دەنکە تۆمو دانەوێڵەیـەك کە گیایـەك یـان دارخورمایـەکی لێ دەرِسـکێ، هـەروا تێفکـرینو هەڵوێـستەیەك لەبـەردەم هێلکـە گەرایەکدا کە پەلەوەرو باڵندەو ئینسانی لێ دروست دەبـێ پێویـستە هـەموو ژیـانی زانایان بەدرێژایی تەمەنیان بۆ بیرلێکردنەوەی تەرخان بکرێ!

ئەگینا ئەگەر ئەمە سەرسوڕهێنەر نەبێو شوێنی لێ وردبوونەوەو تێفکرین نەبێ ئەدی چ سەرسوڕهێنەرە؟

ئەم دەنکە دانەوێڵە بەو وردیو بچوکییەی، چۆن ئەو هەموو روخسارو چۆنیەتیەی گوڵەگەنمو لاسکو توێکڵیو رەگەو پەلكو پرژو پاڵەی لەخۆگرتووە؟

دەنکە خورمایەکی رەقو تەق چۆن مواصەفاتی دارخورمای تێدا شاردرایەوە، چۆن ئەم قەدو توێکڵو پرژو عورجونو لاسکەی تێدا حەشار دراوە؟ باشە ئەم تامو بۆنو رەنگ بەرامەی لەکوێدا شارداوەتەوە؟

ئەی هێلکە، بێچوەکە لەکوێیدایە؟ ئەو گۆشتو ئێسقانو پەرو باڵەو رەنگو شێوەو دەنگو صەدایەی چۆن تێدا شاردراوەتەوە؟ ئەی لەهێلکەو تۆماوی ئادەمیزاددا ئەم ئادەمیزادە سەرسوڕهێنەرە چۆن پەیدا دەبێ؟ لەو هێلکە گەرایەدا چۆن ئەو هەموو صیفاتو رەوشتەی ئادەمیزاد شێردرایەوە؟ چۆن دیاردەی قەدو باڵاو گۆشتو ئێسقانو قاچو دەستو دەمو چاوو روخسارو شێوەو دەنگو صەداو هەستو شعوورو بیرو باوەڕەی تێدا شێردرایەوە؟ ئایا بەسە؛ کە بڵێین ئەم جیهانە سەرسوڕهێنەرە بەرفراوانەی باسمان کردن لەدەنکە تۆمو دانەوێڵەو هێلکەو هێلکەگەرادا حەشار دراون، بۆ ئەوەی سەرسوڕمانی سەرسووڕهێنەر لابچێ، سەرسووڕهێنەرێك، کە جگە لەگەڕاندنەوەی بۆ دەسەڵاتو توانای خوداو نەخشەکێشانی خودا هیچ تەفسیرو شی کردنەوەیەکی تری نیە.؟؟

بەردەوام ئادەمیزاد لەهەوڵو تێکۆشاندایە بۆ ئەوەی نهێنی ژیان بدۆزێتەوەو بزانێ نهێنی مردن چیە، دەرهێنانی مردو لەزیندو دەرهێنانی زیندو لەمردو، گۆڕانی ئەو عونصورانە لەقۆناغەکانیاندا جارێك دەبنە عونصوری ژیانو دەمێك دەبنە عونصوری مردن، رۆژ لەدوای رۆژ مەودای پرسیارەکان قوڵترو بەرفراوانتر دەکاتەوە، خواردەمەنیو خۆراك کە بەهۆی کوڵانو برژاندن بەئاگر دەمریو ژیانی تێدا نامێنێ، چۆن کە زیندو دەیخوا دەبێتەوە خوێنو گۆشتو ئێسقان؟؟ چۆن

بەشێکی دەبێتە پیسایی‌و فڕێی دەداتە دەرەوەو هەندێکیشی دەبێتە بەشێك لەو جەستە زیندوە؟

بەڵێ بەراستی ژیان شتێکی سەرسوڕهێنەرەو ئادەمیزاد ناتوانێ بگاتە بنجو بناوانی، ناچار دەبێ دان بەهەبوونی خودایەکدا بنێ: کە بەخشندەی ژیانە. خاوەنی ژیانە، خۆی دەیبەخشێ‌و خۆی وەری دەگرێتەوە!!

﴿وَمَنْ يُدَبِّرُ الأَمْرَ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: کێ کاروباری مەخلوقات هەڵدەسوڕێنێ، کێ سەروکاری ئەو هەموو یاساو تایبەتمەندییانەی بونەوەر دەکا؟

بێگومان لەوەڵامی ئەم پێنج پرسیارانەدا موشریکەکان هیچ وەڵامێکی گونجاویان بەدەستەوە نیە، ناچار ﴿فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ﴾ بەبێ منجەمنجو راوەستان دەڵێن: بکەری حەقیقی‌و بەدیهێنەری راستی خودای پەروەردگارە، هەر ئەو بوونەوەر هەڵدەسوڕێنێ‌و سەروکاری مەخلوقات دەکا. ناچارن هەردەبێ بڵێن: خودا چونکە هیچ وەڵامێکی تریان بەدەستەوە نیە.

ئەگەر پرسیاریان لەبارەی ئەم پێنج شتانەوە لێ بکرێ، یان ئەگەر پرسیاریان لێ بکرێ: کێ یاسای بوونەوەری داناوە؟ کێ جمو جوڵی ئەفلاك بەو شێوە رێكو پێکییەو وردەکارییە ئەنجام دەدا؟ کێ جمو جووڵی ئەم ژیانە پەرە پێ دەداو ئاوا بەو شێوە سەرسوڕهێنەرە لەگەڕدایە؟ کێ یاسا کۆمەڵایەتیەکان نەخشەکێش دەکاو جارێکیش هەڵە ناکا؟ ئەگەر دەیانو سەدان لەئەم جۆرە پرسیارانە ئاراستە بکرێن، وەڵامەکە هەر ئەوەیە: دەڵێن: خودا هەڵسوڕێنەرە...

دەی کەوایە: ﴿فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ؟﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: ئەدی بۆچی خۆتان لەسزای خودا ناپارێزن؟ بۆچی هاوەڵی بۆ دادەنێن‌و لەتەك زاتی پاکیدا خودا درۆزنەی تر دەپەرستن‌و خۆتان وا لێ دەکەن شیاوی سزای دۆزەخ بن!؟ بۆ ناترسن لەو خودایەی رزق‌و رۆژی ئێوەی بەهۆی باراندنی باران لەئاسمانەوەو

ئامادەباشی زەوی بۆ کشتو کاڵ دابین کردوە، هەستی بیستنو دیتنو هەستەکانی تری بۆ ئێوە فەراهەم هێناوە، زیندوو لەمردوو مردوو لەزیندو دەردێنێ، هەموو کاروبارێکی بوونەوەر هەڵدەسوڕێنێ، لەهەموو بوارێکدا کارامەیی‌و دەسترەنگینی‌و بەتوانایی ئاشکراو نمایانە.

﴿فَذَلِكُمْ اللَّهُ رَبُّكُمْ الْحَقُّ﴾ ئەو زاتەی کەوا ئەو تواناو دەسەڵاتە بێ سنورەو ئەو ویستو ئیرادە داهێنەرانەی هەیە، ئەوە (الله)یە، خوداو پەروەردگاری حەقو راستی ئێوەیە، بەدیهێنەری ئێوەیە، هەڵسوڕێنەری کاروباری ئێوەیە، هەر ئەو شیاوی پەرستنو عیبادەت بۆ کردنە، پەروەردگاری بەردەوامو هەمیشەیی ئێوەیە، ئەو ئێوەی لەنەبوو دروست کردوە ژیانی پێ بەخشیون، رزقو رۆزیی پێداون، کاروبارتان بۆ هەڵدەسوڕێنێ، هیچ خودا نین جگە لەئەو کەس شیاوی پەرستن نیە جگە لەزاتی پاکی!

جا ئەگەر (الله) خودای حەقو راستی ئێوە بێ حەقیش یەکەو نابێ بەدوو ﴿فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلاَّ الضَّلالُ؟ فَأَنَّا تُصْرَفُونَ ؟﴾ لەپاش حەق جگە لەگومڕایی چی تر هەیە؟ بۆچی لەحەق لادەدەن بۆ گومڕایی؟ ئاشکرایە دوای گوتەی حەقو کرداری حەق جگە لەگومڕایی‌و بەتاڵ هیچی تر نیە، شتێك نیە ناوەند بێ لەنێوان حەقو بەتاڵدا، هەرکەسێ لەحەق لایداو وازی لەپەرستنو عیبادەتکردن بۆ خودای حەق هێنا، دەکەوێتە چاڵی گومڕاییەوە، دەی ئێوە بۆچی لەخودا پەرستی لادەدەنو رودەکەنە بتپەرستی؟ چۆن لەحەق لادەدەن بۆ بەتاڵ، پشت لەهیدایەت دەکەنو رودەکەنە گومڕایی؟ بەراستی هەڵوێستو کرداری ئێوە شتێکە عەقڵو مەنطیق پەسەندی ناکا!!

﴿كَذَلِكَ حَقَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَ فَسَقُوا﴾ واتە: وەکوو چۆن بەحەق ربوبییەت هەر بۆ (الله)یە، ئولوهییەت هەر بۆ (الله)یە ئەمە شتێکی چەسپاوو سەلمێندراوە، هەر بەو جۆرە وشەی خوداو بڕیاری خوداو حوکمو هەڕەشەی خودا

چەسپا بەسەر ئەو کەسانەی فاسقنو رۆچون لەکوفرو بێدینیداو سوورن لەسەر مانەوە لەگومراییداو لەچوار چێوەی حەقو چاکەکاریو یەکتاپەرستی چوونە دەرەوە، چەسپا لەسەریان ﴿أنهم لا یؤمنون﴾ کە ئەوانە ئیمان ناهێنن، لەسەریان چەسپا کە ئەوانە بڕوایان نیە، خودا زانیویەتی: کە ئەوان ئیمانیان نیەو ئیمان ناهێنن، لەسەریان چەسپا: کە ئەوانە پێڕی ریسوا بووانو ئیمان ناهێنن!

دەتوانرێ بڵێین: مەبەست بە(الكلمة) لەئایەتەکەدا هەڕەشەو سزای دۆزەخە، ئەو کاتە ﴿أَنَّهُمْ لا يُؤْمِنُونَ﴾ دەبێتە عیللەتو بایس بۆ (حقت) واتە: هەڕەشە بەسزای دۆزەخیان لەسەر چەسپا چونکە ئەوان ئیمان ناهێنن! بەویستی خۆیان سوورن لەسەر ئیمان نەهێنان، نەك خودا مەنعیان بکا لەئیمان هێنان، ئەوەتا بەلگە بۆ ئیمانهێنان لەبوونەوەردا زۆرو زەبەندەن، ئەوە سەرەتاکانی ئیمان لەبیرو باوەڕیاندا چەسپاوە، بەڵام ئەوان بۆخۆیان بەویستی خۆیان لەو ڕێبازە لادەدەن کە دەیانگەیەنێ بەئیمانهێنان، ئینکاری ئەو بەلگە سەرەتاییانە دەکەن: کەوان لەبەردەستیاندا، روی خۆیان وەردەگێڕن لەو بەلگە ئاشکرایانە، عەقڵو هۆشی خۆیان لەو بارەوە لەکار دەخەن!

تێبینی ئەوە دەکرێ: کە ئایەتەکە تەصریحی کردوە بەنائومێدبوون لەئیمانی ئەو فاسقانەی: کە رۆچوون لەکوفرو بێدینیدا، سوورن لەسەر کافریی خۆیان، باسی کەسی تری نەکردوە، چونکە کەسێك سوور نەبێ لەسەر کوفر هیوای ئیمانی لێ دەکرێ، ئەگەر ئیمانی هێناو فەرمانبەرداری فەرمانی خودا بوو لەسزای دۆزەخیش رزگاری دەبێ.

هیچ لەمپەڕێکی حەقیقی لەبەردەم ئیمانهێنانی ئادەمیزادی کافردا نیە، هەرگیز خودا بەزەختو زۆرە ملێ کەس کافر ناکاو رێگای ئیمانهێنان لەکەس ناگرێ. ئەوەی دەبێتە مانیع ئەومیە: کابرا بەویستی خۆی مانیعە لەئیمانهێنانو

سووره لەسەر کوفر، وەکوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ الَّـذِينَ حَقَّـتْ عَلَـيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ، وَلَوْ جَاءتْهُمْ كُلُّ آيَةٍ حَتَّى يَرَوُاْ الْعَذَابَ الأَلِيمَ﴾یونس/٩٦-٩٧.

ئیمام مالیك لەرسـتەی ﴿فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلاَّ الضَّلاَلُ﴾ ئـەوەی وەرگرتـووە: کـە یاری شەترەنج حەرامەو فەرموویەتی: یاری شەترەنج جۆرێکە لەگومڕایی.

زانایانی ئیسلام راجیاییان هەیە: لەوەدا ئایا یاری شـەترەنجو یاریـەکانی تـر کە لەسەر شێوەی قومار نەبێ حەلاڵن یان حەرامن؟!

جـەماوەری زانایـان دەفـەرموون: کەسـێك شـەترەنج نەکاتـە قومـار، لـەماڵی خۆیدا لەگەڵ خێزانی خۆیدا مانگی جارێك یـان لەساڵدا جارێك ئـەو یاریـە بکا ئەوە عەفووی لێیەو حەرامو مەکروهـ نیە، هەر کەسێك زێدەڕەوی بکا لەشـەترەنج کردندا بەجۆرێك بەو یاریە ناوبـانگ دەرکاو زۆر لەخـەڵکی بـزانن: کـە ئـەو یاریـە ئــەنجام دەدا، کــارێکی خراپــەو ئابڕوبەرەیــەو عەدالــەتی نــامێنیو شــایەدی لێ وەرناگیرێ.

ئیمام شافیعی دەفەرموێ: شایەدی یاریکەری شەترەنج رەت ناکرێتەوە ئەگەر لەبواری تردا عادڵ بیو تاوانی گەورەی لێ رونەدرابێ، مەگەر بەشەترەنجەکە قومار بکا، ئەگەر قوماری کرد عەداڵەتی نامێنێ، چونکە ماڵی خەڵکی بەبۆش خواردوە!

ئـەبو حەنیفـە دەفـەرموێ: یـاری شـەترەنج مەکرووهـە، ئەگـەر یاریکـەری شەترەنج تاوانی گەورەی لێ رونەدرابوو، چاکەی زیـاتر بـوو لەخراپـەی، شـایەتی لێ وەردەگیرێ!

## چەسپاندنی هاتنی ڕۆژی قیامەتو زیندووبوونەوە

﴿قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣٤﴾ قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَهْدِى لِلْحَقِّ ۗ أَفَمَن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّىٓ إِلَّآ أَن يُهْدَىٰ ۖ فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٥﴾ وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ۚ إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾﴾

قورئان جارێکی تر دەگەڕێتەوە سەر ڕانواندنی دیاردەکانی دەسەڵاتی خودا، ئەوەبوو لەئایەتی پێشوودا بەڵگەی زۆری هێنانەوە لەسەر یەکتاپەرستیو چەسپاندنی تاکو تەنهایی خودا لە ئولوهییەتو ڕوبوبییەتدا، دوابەدوای ئەو چەسپاندنو سەلماندنە دێتە سەر باسی چەسپاندنی هاتنی ڕۆژی قیامەتو زیندووبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوە. ئەمەش بەشێوەی پرسیارو وەڵام. هەرچەندە ئەو شتانەی لەم کۆمەڵە ئایەتەدا بەشێوەی پرسیار ڕایاندەنوێنێ (وەکوو زیندوو بوونەوەو سەرلەنوێ دروستکردنەوەو هیدایەتدانی خەڵك بۆ ڕێبازی حەق) لای کافرەکان وەکوو ئەو شتانەی لەئایەتەکانی پێشوودا باسی کردن، ئاشکراو نمایان نینو لایان موسەلەم نین، وەلێ بەپشت ئەستووری سەلماندنو چەسپاندنی شتەکانی پێشوو لێرەشدا پرسیاریان تێدا ئاراستە دەکا، چونکە ئەمانەش بەشێکن لەو شتانەی: کە ئولوهییەتو ڕوبوبییەت داخوازیانن، لێرەدا

پرسیارەکان ئاراستە دەکاو بەسەر عاقڵ مەندەکاندا رایاندەنوێنیو داوای وەڵامیان لێ ناکا، چونکە هەر کاتێ (مقدمات)ەکانیان سەلماندن ئاکامەکان ئاشکرانو قبووڵن. ئاشکراشە رونکردنەوەو بەڵگە هێنانەوە بەشێوەی پرسیار کاریگەرترە لەدڵو دەروونێدا.

دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَلْ مِنْ شُرَكَائِكُمْ مَنْ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ؟﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو موشریکانە بڵێ: ئایا کێ لەو شەریکانەی ئێوە عیبادەتیان بۆ دەکەنو بەهاوەڵی خودایان دەزانن لەبتو صەنەمو ئەستێرەو جندۆکەو فریشتە...هتد. پێیان بڵێ: کێ وەکوو خودا لەنەبوەوە مەخلوقاتی بەدی هێناوە؟ کێ ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی تێیاندایە دروست کردوە؟ کێ دەتوانێ پاش لەناوچوون جارێکی تر سەرلەنوێ دروستیان بکاتەوە؟

جا کە ئەوان لەبەر سەررەقیو بڕوا نەکردنیان بەهاتنی قیامەتو زیندوبوونەوە وەڵامیان نەبوو، وەکوو لەوەڵامی پێنج پرسیارەکەی پێشوودا وەڵامیان دایەوە لێرە وەڵامیان نەدایەوە ئەوە تۆ خۆت وەڵام بدەرەوە: ﴿قُلِ اللَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ﴾ ئەی پێغەمبەر! بڵێ (اللە) دەتوانێ. هەر خودای من دەسەڵاتی ئەوەی هەیە سەرەتا مەخلوقات دروست بکاو دوایش سەرلەنوێ جارێکی تر دروستیان بکاتەوە، چونکە کەسێك بتوانێ سەرەتا لەنەبوەوە شتێك دروست بکا، جارێکی تر دروستکردنەوەی بەلاوە ئاسانترە. هەر خودا دەتوانێ ئەوە بکاو کەسی تر ئەو توانایەی نیە.

بێگومان ئەو موشریکانە دانیان بەوەدا دەنا: کە دروستکارو دروستکەرەوە لەجیهانی گژوگیاو روەكو دارو دروختدا خودای تاكو تەنهایە، چونکە بەچاوی خۆیان دەیان بینی: کە گژوگیاو دارو درەخت بەهۆی باران لەوەرزی زستانو بەهاردا زیندوو دەبوەوەو لەوەرزی هاویندا دەمردو دووبارە لەوەرزی زستانو بەهاری داهاتوودا جارێکی تر زیندوو دەبوەوە. بەڵام ئینکاری زیندو بوونەوەی

گیانلەبەرانیان دەکرد. ﴿فَأَنَّا تُؤْفَكُونَ ؟﴾ پێیان بڵێ: چۆن ئێوە لەرێگای حەق لادەدەن بۆ رێگای بەتاڵ؟ چۆن لەحەق‌و یەکتاپەرستی وازدێنن‌و رودەکەنە هاوەڵدانان بۆ خوداو بتپەرستی!

بەکورتی، فیطرەت‌و عەقڵ‌و هۆش‌و تێفکرین‌و سەرنجدانتان سەردەکێشێ بۆ ئەوە: کە خودا دوای مردن‌و وشکبوونەوە سەرلەنوێ گژوگیاو دارو دروخت زیندو دەکاتەوە، ئەدی بۆچی دان بەوەدا نانێن‌و ئیعتراف بەدەسەڵاتی خودا ناکەن: کە دەتوانێ پاش مردن سەرلەنوێ ئادەمیزاد زیندوو بکاتەوە؟ بێگومان ئەگەر ئیعتراف بەوە بکەن ئەوە سەردەکێشێ بۆ ئەوەی بڕوا بەزیندوو بوونەوەی قیامەت‌و پاداش‌و سزا وەرگرتنەوە بکەن.

ئەمجار بەڵگەیەکی تر دێنێتە گۆڕێ بۆبۆڕدان‌و ئیلزام دانیان، پرسیارێکی تریان ئاراستە دەکا دەربارەی لایەنێك لەلایەنەکانی پەیوەند بە ربوبییەتی پەروەردگار کە داخوازی ئەوەیە ئەو زاتە شیاوی ئولوهییەتیش بێ‌و بەتەنیا عیبادەت هەر بۆ ئەو بکرێ، دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَلْ مِنْ شُرَكَائِكُمْ مَنْ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو موشریکانە بڵێ: ئایا یەکێك هەیە لەو شتانەی بەهاوەڵی خودایان دەزانن، بتوانێ هیدایەتی گومڕاو سەرلێشێواو بدا؟ کێیان دەتوانێ بەسروشت‌و غەریزە یان بەهۆی هەست‌و عەقڵ‌و تێفکرینەوە، یان بەهۆی ناردنی کتێبی ئاسمانی‌و پێغەمبەرانەوە، گومڕاو سەرلێشێواوێك هیدایەت بدا؟ یان ئەوانەی ئێوە بەهاوەڵی خودایان دەزانن بێ دەسەڵات‌و دەستەوەسانن‌و هیچیان پێ ناکرێ.؟

بێگومان ئەوان هیچ وەڵامێکیان بەدەستەوە نیە، چونکە دەزانن: ئەوانەی کە ئەوان بەهاوەڵی خودایان دەزانن ناتوانن هیچ شتێك بەدی بهێنن، هیدایەتی بدەن، بەدیهێنان‌و هیدایەت (واتە: هیدایەتی تەشریعی) هەردوکیان بەدەست خودان. جا کەوابێ ﴿قُلِ اللَّهُ يَهْدِي لِلْحَقِّ﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: هەر خودا دەتوانێ

هیدایەتی بەندەکانی بدا بۆ ڕێبازی حەقو ڕاست. هەر ئەو دەتوانێ نامەی ئاسمانی بنێرێ، پێغەمبەران بنێرێ، یاسا دانێ، خەڵك ڕووەو خێر ڕەها بکا، نیشانەو ئایاتی خۆی لەبوونەوەرو خودی ئادەمیزاددا ڕانوێنێ، دڵەکان بەئاگا بێنێتەوە، هەستە لەکارکەوتووەکان وە جمو‌جوڵ بخاتەوە، ئەوەتا وەکوو دەبینن خودا پێغەمبەری ناردوە، هەموو بەڵگەو نیشانەی ڕاستی ڕابەرایەتی بەدەستەوەیەو بەمێوەی ڕاگەیاندوە بۆ ئەوەی هیدایەتتان بدا بۆ ڕێبازی حەقو خوداپەرستی. عەقڵو هەستی پێ بەخشیون کە کلیلی زانیاریو تێگەیشتنو ئیمان هێنانن. بۆ ئەوەی بەکاریان بێننو سوودیان لێ وەربگرن.

ئیتر لەم (قضیە)وە (قضیە)یەکی تر سەر هەڵدەداو پرسیارو وەڵامێکی تر دێتە ئاراوەو دەفەرموێ: ﴿أَفَمَنْ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ أَحَقُّ أَنْ يُتَّبَعَ أَمَّنْ لا يَهِدِّي إِلاَّ أَنْ يُهْدَى﴾ ئایا کەسێك هیدایەتی بەندەکانی بدا بۆ ڕێگای حەقو ڕاست، ئەو شیاوترە بەشوێنکەوتن، ئەو شیاوی ئەوەیە: کە بەندەکانی پەیڕەوی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بکەن؟ یان کەسێك توانای هیدایەتدانی خودی خۆی نیەو نازانێ هیدایەتی خۆی بدا، مەگەر غەیری خۆی: کە خودایە ئەو هیدایەتی بدا؟! وەڵامی پرسیارەکە ئاشکراو نمایانە، کەسێك هیدایەتی بەندەکانی بۆ ڕێبازی حەق بدا، ئەو شیاوە بۆ بەندایەتی کردنو پەرستن ئەو شیاوترە لەکەسێك کە بۆخۆی دەسەڵاتی هیدایەتدانی خۆی نیە، مەگەر غەیری خۆی هیدایەتی بدا، جا ئەو شەریکو بەخودا دانراوانە بتو صەنەم بن، یان فریشتەو مانگو خۆر بن یان ئادەمیزاد بن، تەنانەت حەزرەتی عیسا هەرچەندە پێغەمبەرەو نێردراوە بۆ ڕەهنومایی کردنی خەڵك بەڵام ئەو بۆ خۆی ئاتاجی هیدایەتی خودایەو بەبێ هیدایەتو تۆفیقی خودا هیچی پێ ناکرێ! جا کە ئەمە حاڵی عیسا بێ؟ دیارە شتەکانی تر باشتر ئەم ڕاستییەی بەسەردا دەچەسپێ! دەی کەوابێ ﴿فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ؟﴾ چی وای لەئێوە کردوەو پاڵی پێوە ناون بۆ ڕەچاو کردنی ڕێبازی ئاوا چەوت؟ چۆن

یەکسانیتان خستۆتە نێوان خوداوەندو بەندەکانیو حوکمتان کردوە بەوەی: کە ڕەوایە عیبادەتی غەیری خودا بکرێ؟ ئێوە چۆن مەزندەی شتەکان دەکەن، چۆن ئاوا لەحەقو ڕاستی دوور دەکەونەوە؟ ڕوو دەکەنە ڕێبازی بەتاڵو پووچ؟.

جا کە لەپرسیارو وەڵامەکان بوەوە، پرسیارەکانی ئاراستە کردنو وەڵامە خۆسەپێنەرەکانی هێنان، ئەمجار واقیعی حاڵی ئەو بەدبەختانە ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلاَّ ظَنّاً﴾ ئەوانەی لەو بیرو باوەڕدا، کە شەریك بۆ خودا بەرەوا دەزانن‌و عیبادەتی غەیری خودا دەکەن هیچ بەڵگەو دەلیلی ڕاستیان بەدەستەوە نیە، بەڵکوو هەموویان شوێن گومانی لاواز کەوتوون، لەوەهمو خەیاڵپلاو زیاتر هیچی تر نیە.

﴿إِنَّ الظَّنَّ لا يُغْنِي مِنْ الْحَقِّ شَيْئاً﴾ بێگومان ئەو گومان‌و خەیاڵپلاوانە دادی هیچیان نادا، چونکە گومانی بێ بناغە هیچ کاتێك‌و لەهیچ شتێکدا لەشوێنی بەقیندا دانانیشێ‌و بێ سوودو قازانجە!

﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ﴾ بێگومان خودا زاناو ئاگادارە بەو کارو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن، بەگوێرەی بیرو باوەڕو گوفتارو کرداریان سزایان دەداتەوە؛ لەسەر هەموو کردەوەیەکیان (بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەر، هەرچەندە بەڵگەو دەلیلی قەطعی‌و بەهێزی بەدەستەوەن.. شوێنکەوتنی باوك‌و باپیران بەشێوەیەکی کوێرانەو بێ بەڵگەو دەلیل) سزایان دەداو تۆڵەیان لێ دەستێنێ.

بەڕاستی ئەمە هەڕەشەیەکی توندو تیژە ئاڕاستەیان دەکرێ، چونکە پەروەردگار هەواڵی داوەو دەداو ڕایگەیاندوە کە بەتەواوی‌و پڕاو پڕ سزایان دەدا.

سەیرە ئەوانە وا گومان دەبەن خودا هاوەڵ‌و هاوبەشی هەن. کەچی ئەم گومانەیان شی دەکەنەوە، بەکردەوەو بەتێفکرینی عەقڵ‌و هۆش تاقی ناکەنەوە! وا گومان دەبەن: کە ئەم بت‌و صەنەمانە شیاوی پەرستنن بۆیە باوك‌و باپیرانیان

عیبادەتیان بۆ کردون، دەی ئایەن بیرێك لەم خەرافییاتە بکەنەوە، عەقڵو هۆشی خۆیان لەکۆتو زنجیری ئەو جۆرە لاسایی کردنەوە گوماناویە بێ بناغەیە رەها ناکەن!

ئەوان وا گومان دەبەن: کە خودا نیگا بۆ ئادەمیزادێکی وەکوو خۆیان نانێرێ، بیر ناکەنەوەو ناچنە بنجو بناوانو بزانن ئەمە بۆچی لەسەر خودا یاساغە؟! گومان دەبەن: قورئان دانراوی موحەممەدەو خۆی داینــاوە. بیر لەوە ناکەنەوە: کە موحەممەدیش وەکوو ئەوان ئادەمیزادە کە موحەممەد بتوانێ قورئان دابنێ، ئەدی ئەوان بۆچی ناتوانن کتێبی وەکوو قورئان دابنێن؟! تا بەم جۆرە لەناو کۆمەڵێك گێژاوی گوماندا ژیان بەسەر دەبەن، کە لەهیچ رویەکەوە سودیان لێ نابینن و هیچ حەقیقەتو راستییەکیان بۆ رون ناکەنەوە.

ئایەتی ﴿إِنَّ الظَّنَّ لا يُغْنِي مِنْ الْحَقِّ شَيْئاً﴾ ئەوەی لێ وەردەگیرێ: کە لەبیرو باوەڕدا گومان کاری پێ ناکرێ، بیرو باوەڕێك کە لەسەر گومان بنیات بنرێ بەبیروباوەڕ حسێب ناکرێو پەسەند نیە، بەڵکوو پێویستە بیرو باوەڕ لەسەر بناغەی زانستو یەقین بنیات بنرێ، بنەمای ئیمانو باوەڕ شتی سەرەکین، دەبێ لەسەر یەقین بنیات بنرێن، ئیختلافیش لەئوصوولی دیندا دروست نیەو نابێ موسوڵمانان لەبنەماکانی ئایندا راجیاییان هەبێ.

## قورئان نامەی خودایەو تەحەددای نەتەوەی عەرەبی پێکردوە

﴿ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ

ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ
مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ بَلۡ كَذَّبُواْ بِمَا
لَمۡ يُحِيطُواْ بِعِلۡمِهِۦ وَلَمَّا يَأۡتِهِمۡ تَأۡوِيلُهُۥۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن
قَبۡلِهِمۡۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٩﴾

لەوەپێش پەروەردگار باسی ئەوەی کرد: کە موشریکەکان داوایان لەپێغەمبەر کرد نیشانەو موعجیزەیەکی تر جگە لەقورئانیان لەخوداوە بۆ بێنێ، چونکە پێیان وابوو: قورئان موعجیزە نیەو موحەممەد بۆخۆی دایناوە، ئەمجار وەڵامی دانەوە: کە موحەممەدو غەیری موحەممەد ناتوانن بۆخۆیان وێنەی ئەم قورئانە بێنن، ئەمجار هاوەڵدانانیانی بۆ خودا بەچەند بەڵگەیەك پووچ کردەوە.

ئەمجار لێرەدا دێتەوە سەر چەسپاندنی حەقیقەتێکی بنەڕەتیو سەرەکی، ئەویش ئەوەیە: کە قورئان نیگای خودایەو لەخوداوە بەسرووش بۆ پێغەمبەر هاتووە، موحەممەد بۆخۆی دایناوە، دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ هَذَا الْقُرْآنُ أَنْ يُفْتَرَى مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ راست نیەو ناگونجێو عەقڵ نایگرێ: کە ئەم قورئانە لەسەر خودا هەڵبەسترێ، کەس رایەی ناکەوێو ناتوانێ بۆخۆی کتێبێکی ئاوا دا بێنێو پاڵ خودای بدا، چونکە قورئان بەو هەموو رەوانبێژیو فەصاحەتەی تێیدایە، ئەو هەموو کورتبڕیو شیرینکەلامییەی لەخۆی گرتووە، ئەو هەموو هەواڵو رووداوە غەیبیانەی باسیان دەکا، ئەو شەریعەتو یاسا رێکو پێکەی هێناویەتی، ئەو هەموو ئامۆژگاریو نەصیحەتە بەسوودانەی کە ئاڕاستەیان دەکا، گەواهی ئەوەن: کە ئەم کتێبە هەر دەبێ لەخوداوە هاتبێو کەسی تر توانای دانانو هێنانی کتێبی ئاوای نیە.

بەکورتی قورئان کەلامی خودایەو لەکەلامی ئادەمیزاد ناچێ، جگە لەخودا کەس ناتوانێ کتێبی ئاوا بخاتەڕو.

ئەوەش چەسپاوە: کە ئەبو جەهل وێڕای ئەو هەموو دژایەتیەی بۆ پێغەمبەر ﷺ، وتوویەتی: (موحەممەد تائێستا بەدەم کەسەوە درۆی نەکردوە، ئەدی چۆن بەدەم خوداوە درۆ هەڵدەبەستێ؟!!)

﴿وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ بەڵکوو ئەم قورئانە گەواهیدەری راستی ئەو کتێبە ئاسمانییانەیە: کە لەوەپێش بۆ پێغەمبەران نێردراون. بێگومان زانیاری قورئان لەگەڵ زانیاری کتێبە ئاسمانییەکانی تر: کە لەوە پێش بۆ پێغەمبەران نێردراون یەکدەگرنەوەو موافیقی ئەوانە لەبانگەوازیکردنیدا بۆ بنەمای ئایین لەیەکتاپەرستی دا، لەبڕوا بەخوداو بەرۆژی قیامەتو هەڵنان بۆ کاری چاكو رەوشتی بەرز، سەرباری ئەوەش چ گۆڕنکاری‌و دەست لێدانێکی تێیاندایە ئاشکرایان دەکاو دەیانخاتە ڕو وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ﴾المائدة/٤٨، بەهۆی قورئانەوە دەزاندرێ تەوراتو ئینجیل چەند گۆڕانکارییان تێدا کراوە.

﴿وَتَفْصِيلَ الْكِتَابِ﴾ قورئان روونکەرەوەی ئەحکامی شەریعەتە حەڵاڵو حەرام لێك جیا دەکاتەوە، پەندو ئامۆژگاری تێدایە، ئادابو ئەخلاقی کۆمەڵایەتی فێری ئادەمیزاد دەکا، دەرمانی هەموو دەردێکە، رێ پیشاندەرو چاورونکەرەوەیە.

﴿لا رَيْبَ فِيهِ﴾ هیچ شكو گومانی تێدانیە، ناگونجێ ئادەمیزادی عاقڵو هۆشمەند گومان لەقورئاندا پەیدا بکا، چونکە بەڵگەکانی ئاشکراو حەقو راستن ﴿مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ لەلایەن خوداوە بەنیگاو سروش نێردراوە بۆ پێغەمبەر ﷺ کەلامی پەروەردگارەو دانراوی ئادەمیزاد نیە، چونکە کتێبێکە لەهەموو عەیبو رەخنەیەك سەلامەتە، چەواشەیی‌و ئیختلافی تێدا نیە، ئەوەتا سەیری بکەنو

بیخوێننەوە ئاخۆ ڕەخنەیەکی تێدایە؟! وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفاً كَثِيراً﴾النساء/٨٢.

**پەروەردگار لەئایەتەکەدا پێنج صیفەتی بۆ قورئان هێناون:**

١- دەفەرموێ: ناگونجیو ڕاست نیە: کە ئەم قورئانە لەلایەن غەیری خوداوە هاتبێ؛ چونکە قورئان موعجیزەیەو لەتوانای ئادەمیزاددا نیە کەلامی وا دابنێ.

٢- پشتگیری کتێبە ئاسمانییەکانی پێش خۆی دەکاو گەواهی دەدا لەسەر ڕاستیو دروستییان، موعجیزەیە چونکە هەواڵی ڕوداوی ڕابوردوو داهاتوو دەدا؛ هەواڵی ئاکامی جەنگی فارسو ڕۆمی ڕاگەیاندو ڕاست دەرچوو. مژدەی ڕزگارکردنی شاری مەککەی دا بەپێغەمبەرو فەرمووی: ﴿لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ﴾الفتح/٢٧. مژدەی پەیدابوونی حکوومەتی ئیسلامی دا بەموسوڵمانانو فەرمووی: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ﴾النور/٥٥. هاتە دی. هەروا گەلێ هەواڵی غەیبی تری وەکوو ﴿سَنَسِمُهُ عَلَى الْخُرْطُومِ﴾ی ڕاگەیاندو هاتە دی.

٣- شیکەرەوەو توێژەرەوەیە بۆ هەموو حوکمو یاسایەکی پێویست بۆ ژیانی دونیاو قیامەتی ئادەمیزاد، هەرچی زانیاری شەرعیو زانیاری هەمە جۆری تری ئایینیو دونیایی هەیە ئاماژەی بۆ کردوەو لەخۆی گرتوون.

٤- هیچ شکو گومانی تێدا نیە.

لەلایەن خوداوە حەزرەتی جوبرائیل بەسروش هێناویەتیە سەر دڵی پێغەمبەر ﷺ ئەویش بەئەوپەڕی دڵسۆزیو لێهاتوویيو لێبوردەییەوە ڕایگەیاندوە.

ئەمجار دوا ئەوەی، ئەوەی ڕونکردەوە: کە قورئان زۆر لەوە بەرزترە ئادەمیزادو جندۆکەو فریشتە بتوانن کەلامی وا دابنێن، سیاقی باسەکە

دەگوێزێتـەوە بـۆ رانوانـدنی بـیرو بۆچـوونی ئـەو نەفامـە سـەررەقانەی دەیـانگوت: موحەممـەد بـۆ خـۆی ئـەم قورئانـە دادەنـیو دانـراوی خۆیـەتیو بـەدەم خـوداوە هەڵیبەسـتووە! بـیرو بۆچـوونەکەیان پـووچ دەکاتـەوەو سەرسـوورِمانو تەعـەجوب دەردەبڕێ لەهەڵسو کەوتیان، لـەکردارو گوفتاریـانو تەحـەددایان دەکا کە بتـوانن نموونەی ئەو قورئانە بخەنە ڕوو دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ﴾ واتـە: بـەڵکوو ئایـا ئەوان دەڵێن: موحەممەد بۆخۆی ئەم قورئانەی هەڵبەستووە؟! ﴿قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِثْلِهِ﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: منیش وەکوو ئێـوە ئـادەمیزادم، جا کە بەقسەی ئێوە من خۆم ئەم قورئانەم دانابێ، دە ئێوە بتوانن سوڕەتێکی ئـەم قورئانـە بخەنـە ڕو، تەنانەت ئەگەر کورتترین سورەتیش بـێ، ئـەوە عـەرزو ئـەوە گـەز!! هـەمووتان خەریك بن بتـوانن سـورەتێکی وەکـوو قورئـان لەشـێوازو دەسـتەواژەو خۆشـخوانیو ڕەوانبێژیو بەپێزیو سفتـو لووسیو پتەویدا بێـنن. چـەندێکی دەتـوانن بـۆ ئـەم کارە داوای یارمەتی لەئادەمیزادو جندۆکە بکـەن! ﴿وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ داوای کۆمەگی لەکێ دەکەن بیکەن، جگە لەخودا.

دەخۆتان بەتاقی بکەنەوە بزانن: ئـاخۆ دەتـوانن؟! بێگومـان نـاتوانن: چـونکە هەموو مەخلووقات لەئاستی ئەم کارەدا دەستەوەسانو دۆش داماونو نـەیانتوانیوەو ناتوانن.. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَـذَا الْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيراً﴾الأسراء/٨٨. ئەمە تەحەددایەکەو قورئان ئاراستەی ئەو موشریکانەی کردوەو هەمووی بۆڕداون. ماوەشی بۆ دانـەناون، تەحەددایەکە بـەردەوامو هەمەکاتـە، بـۆ چینێكو دوو چین نیە، بۆ هەتا هەتایەیە!!

﴿إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە راستگۆن لەئیدعاکەتاندا کە دەڵێن: قورئـان دانراوی موحەممـەدە، دە ئێوە بەهـەمووتان؛ بـەئادەمیزادو جندۆکەتانـەوە وێنـەی ئەم قورئانە دابێنن.

**بێگومان تەحەددا کردنی قورئان بۆ عەرەبەکان: کە بتوانن: وێنەی قورئان بخەنەڕو بەسێ قۆناغ ئەنجام دراوە:**

١- ئەو تەحەددایەی: کە لەم ئایەتەدا ئاراستە کراوە، دەفەرموێ: ﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ...الآية﴾

٢- ئەو تەحەددایەی: کە دادەبەزێ بۆ هێنانی دە سوورەت، داوا دەکا: کە بتوانن دە سوورەت وەکوو هی قورئان بخەنەڕو. وەکوو دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُواْ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُواْ مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾هود/١٣.

٣- قۆناغی سێیەم دادەبەزێ بۆ تەحەدداکردن بەیەك سوورەت وەکوو لەئایەتەکەی ئێرەداو لەئایەتێکی سورەتی (البقرة)دا: کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ﴾البقرة/٢٣.

ئەمجار قورئان هەڵوێستی موشریکەکان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿بَلْ كَذَّبُوا بِمَا لَمْ يُحِيطُوا بِعِلْمِهِ﴾ واتە: بەڵکوو ئەوانە بەخێرایی‌و بێ لێ وردبوونەوە قورئانیان بەدرۆ لەقەڵەمداو بەبێ ئەوەی لێی وردببنەوەو بزانن: چی تێدایەو بەڵگەو نیشانەکانی چین، پێش ئەوەی بزانن: کە قورئان لەو کتێبانە نیە بتوانرێ لەلایەن غەیری خوداوە وێنەی بهێنرێ بەدرۆیان خستەوە.

﴿وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ﴾ هێشتا ئەو هەواڵە غەیبیانەی قورئان هەواڵی پێ داون نەهاتوونو کاتی هاتنیان نەهاتووە، تا بۆیان روون ببێتەوە ئاخۆ راستن یان درۆن!

واتە: قورئان لەدوولاوە کتێبێکی موعجیزەیە، لەلایەکەوە ئوسلوبو شێوازی لێکدانو پێکهاتەی موعجیزەیە، لەلایەکی ترەوە، هەواڵدانی بەرودوای غەیبی موعجیزەیە. دەی ئەوان خێرا بەدرۆیان خستەوە، پێش ئەوەی لەئوسلوبو شێوازی وشەو رستەکانی وردببنەوەو، بزانن: ئاخۆ گەیشتۆتە پلەی ئیعجاز یان نا، هەروەها

پێش ئەوەی هەواڵە غەیبییەکانی بەتاقی بکەنەوە، بزانن: ئاخۆ راستن یان نا، هەر کە بەسەریاندا خوێندرایەوە بێ لێ وردبوونەوە یەکسەر بەدرۆیان خستەوە.

بەکارهێنانی وشەی (لَمّا) لێرەدا ئەوە دەگەیەنێ: کە ئەو موشریکانە دوای بەرزیو گرنگی قورئانیان بۆ روون بووەوەو زانییان کەلامێکی موعجیزەو سەرئاسایە، بەڵام هەر لەسەر سەررەقیو هەڵوێستی خۆیان بەردەوام بوونو بەئەنقەست دەیانگوت: ئەمە کەلامی خودا نیە.

بەکورتی ئەوان سەرەتاو پێش لێ وردبوونەوە قورئانیان بەدرۆ خستەوەو بەدرۆیان لەقەڵەم دا، چونکە تەقلیدی باوکو باپیرانیان کردو لاسایی کەرەوە بوون.

هەروەها پاش لێ ورد بوونەوەو دەرکەوتنی بەرزیو سەرئاسایی قورئانو دەستەوەسانی خۆیان لەبەرامبەریدا هەر بەدرۆیان خستەوە لەبەر سەررەقیو یاخی بوونیو حەسوودی!

﴿كَذَلِكَ﴾ وەکوو ئەم بەدرۆخستنەوەی قورەیش بۆ قورئان پێش لێوردبوونەوە بەهۆی لاسایی کردنەوەی پێشینانیانو دوا تێفکرینو دەرکەوتنی ئیعجازی لەهەموو روێکەوە بەهۆی سەررەقیو لاساییانەوە ﴿كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ گەلە پێشینەکانی پێش ئەوانیش پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستۆتەوە. ئەوانیش وەکوو ئەمان بەبێ لێ وردبوونەوەو تێفکرین، لاسایی باوکو باپیرانی خۆیان کردەوەو بەبێ ویژدانانە پەیامی نێردراوانی خودایان بەدرۆ خستەوە، رانەوەستان بزانن: پەیامەکەیان چییەو چی نیە، چاوەڕوانی ئاکامی وادەو بەڵێنەکانی پێغەمبەرانیان نەکرد، یان پاش وردبوونەوەو تێفکرینیش بەسەررەقیو ئینکەبەری پەیامەکەیان رەت کردنەوەو بەدرۆیان خستنەوە.

﴿فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر! سەیر بکەو بزانە: سەرەنجامی ستەمکاران چۆن بوو چییان بەسەرهات، چۆن لەتۆڵەی

بەدرۆخستنەوەیان بۆ پێغەمبەرەکانیانو دونیا ویستیانو وازهێنانیان لەئیش کردن بۆ قیامەت بەهیلاکمان بردنو لەناوچوون؛ ئێوەش ئەی گرۆهی موشریکو کافران! بەخۆتاندا بچنەوە، واز لەسەر رەقیو ستەمکاریو بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەری ئیسلام بێنن، بترسن لەوەی ئێوەش بەدەردی ئەوان بچن، هاکا سزای ناگەهانی ریشە کێش کردنمان بۆ ناردن...! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنبِهِ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِباً وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ الصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ الْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾العنكبوت/٤٠.

ئا بەم جۆرە پەروەردگار ئوممەتی حەزرەتی موحەممەد دەترسێنێ لەو عەزابو سزایانەی بەسەر نەتەوە پێشینەکان هاتو وریایان دەکاتەوەو داوایان لێ دەکا: کە بیر لەحاڵو سەرەنجامی خۆیان بکەنەوە. هەروەکوو چۆن دەیانترسێنێ لەسزای دۆزەخ!!

## موشریکەکان دوای بیستنی قورئان دەبنە دوو تاقم هەیە ئیمان دێنیو هەیە بەکافری دەمێنێتەوە

﴿وَمِنْهُم مَّن يُؤْمِنُ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن لَّا يُؤْمِنُ بِهِۦ ۚ وَرَبُّكَ
أَعْلَمُ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤٠﴾ وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّى عَمَلِى وَلَكُمْ
عَمَلُكُمْ ۖ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٤١﴾
وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا

يَعۡقِلُونَ ﴿٤٢﴾ وَمِنۡهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيۡكَۚ أَفَأَنتَ تَهۡدِي
ٱلۡعُمۡيَ وَلَوۡ كَانُواْ لَا يُبۡصِرُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ
ٱلنَّاسَ شَيۡـٔٗا وَلَٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿٤٤﴾

لەئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار ئەوەی رونکردەوە: کە کافرەکان تانەیان لەپێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدو سروش دەدا، ئەمجار هەڕەشەی ئەوەی لێ کردن: کە ئەگەر بەردەوام بن لەسەر ئەو هەڵوێستەیان، دوور نیە وەکوو گەلو نەتەوەکانی رابردوو سزایان بۆ بیو بەدەردی ئەوان بچن!

ئەمجار لێرەدا ئەوە روون دەکاتەوە: کە لەواقیعدا ئەو موشریکانە لەئاست قورئاندا دوو تاقمو گرۆهن؛ کۆمەڵێکیان بڕوا بەوە دەکەن: کە قورئان لەخوداوە بۆ هاتووە، بەڵام هەر ئینکەبەری دەکاو تەسلیم نابێ کۆمەڵێکیشیان بەهیچ جۆرێ بڕوا ناکەن قورئان کەلامی خودا بێ. سوورن لەسەر بەدرۆ خستنەوەیی‌و رەتکردنەوەی پەیامی پێغەمبەر ﷺ ئەمانە هیچ هومێدێك لەئیمانهێنانیاندا نیەو بەتەما هیدایەتو بڕوا کردنی ئەوان مەبن.

بەڵام کۆمەڵی یەکەم هیوای ئەوەیان لێ دەکرێ موسوڵمان بن، کەوابوو بەرژەوەندی لەوەدایە مۆڵەت بدرێن بۆ ماوەیەك نەك عەزابیان بۆ بێ‌و ریشە کێش بکرێن.

دەفەرموێ: ﴿وَمِنۡهُم مَّن يُؤۡمِنُ بِهِۦ﴾ ئەو کافرانە هی وایان هەیە لەناو دڵو دەروونی خۆیدا بڕوا دەکا: کە قورئان کەلامی خودایە، بەڵام بەئەنقەست بەدرۆی دەخاتەوەو سەر رەقی دەنوێنێ.

﴿وَمِنْهُمْ مَنْ لا يُؤْمِنُ بِهِ﴾ هی واشیان هەیە بەهیچ جۆرێ بڕوا ناکاو گومانی لەوە هەیە: کە قورئان کەلامی خودا بێو بەنیگا بۆ موحەممەد هاتبێ!

دەشگونجێ ماناکە بەم جۆرە بێ: ئەی موحەممەد! لەو ئادەمیزادانەی ئەتۆیان بۆ سەر ڕەوانە کراوە کەسانێك هەن ئیمان بەم قورئانە دەهێننو شوێن پەیامەکەت دەکەون، هی واشیان تێدایە ئیمان ناهێنیو بەکافری دەمرێو بەکافری زیندو دەکرێتەوە.

﴿وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِالْمُفْسِدِينَ﴾ خودای تۆ لەهەموو کەس زاناترە بەوانەی شیاوی هیدایەتو شارەزایی کردنن، بەئەوانەی شیاوی گومڕاییو سەرگەردان بونن، ئەمانەش سەرپێچیکارو یاخی بووەکانن.

خودای تۆ زانایە بەو کەسانەی ئاشووبو فەساد لەسەر زەوی بەرپا دەکەنو ستەمکارو ملهوڕو لەڕێ دەرچوونو هومێدی موسوڵمانبوونیان لێ ناکرێ.

دەشگونجێ مانای ئایەتەکە بەمجۆرە بێ: بڕێك لەو موشریکانە لەمەودوا بڕوا بەقورئان دەکەنو ئیمان دەهێنن، بڕێکیشیان سوور دەبن لەسەر کوفرو بێدینیو ئیمان ناهێنن، خودای تۆ زانایە بەو گرۆهانەی شیاوی گومڕابونن بەهۆی فەسادی خۆیان.

ئا بەو جۆرەو لەڕوانگەی مانای ئەو دوو ئایەتانەی پێشەوە زانیمان: کە هۆی شكو گومانو کوفری ئەوانە ستەمکاریێو فەسادو ئاشوبگێڕی خۆیانە لەسەر زەوی، جا کەسێك ستەمکار بێو کەسێك ئاژاوەچی بێ ئەوە دەکەوێتە شكو گومانەوە دەربارەی قورئانو بەدرۆی دەخاتەوە. ئەگینا قورئان بۆخۆی جێگای گومان نیەو شکی تێدا نیە، چونکە بەڵگەی بەهێزو حاشا هەڵنەگری تێدان، هەموویان گەواهی ئەوە دەدەن کە ئەو کەلامە لەخوداوە هاتووەو پەیامی پەروەردگارە بۆ ئادەمیزاد. لەفەرموودەیەکی ڕاستی پێغەمبەردا هاتووە: کە فەرموویەتی: (مامن نبي من

الأنبياء الا وقد أوتي من الآيات مآمن عليه البشر، وانما كان الذي أوتيته وحيا أوحاه الله الي، فأرجو أن أكون أكثرهم تابعا) پێغەمبەرەکانی پێشوو موعجیزەکانیان شایەد بوون لەسەر راستی پەیامەکەیان، بەلام پەیامی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ قورئان راڤەکەریەتی، خودی موعجیزەکە لەقورئاندایە؛ دەی کەوابێ چۆن شكو گومان تێیدا بەرپادەبن.

ئەمجار پاش رونکردنەوەی هەڵوێستی کافرەکان دەربارەی قورئان خیطاب ئاراستەی پێغەمبەر ﷺ دەکا، کە دلگران نەبێ بەهەڵوێستی موشریکەکانو بەدرۆخستنەوەکەیان، بەتەما ئیمانهێنانیان نەبێو دەستیان لێ بشواو یەخەی خۆی لەوان دابدڕێو پاکانە لەهەڵوێستو کردەومیان بکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كَذَّبُوكَ﴾ ئەگەر بەردەوام بوون لەسەر بەدرۆخستنەوەتو نائومێد بووی لەئیمانهێنانیانو بەهیچ کلۆجێ بڕوایان پێ نەکردی، ئەوە بەرائەتو دوورەپەرێزی خۆت لەخۆیانو کردەومیان رابگەیەنە.

﴿فَقُلْ لِي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ﴾ پێیان بلێ: کردەوەی خۆم بۆ خۆم، کردەوەی خۆتان بۆخۆتان، من راگەیاندنی پەیامی خودا بۆ ئێوەو ترساندنتان لەدۆزەخو مژدە پێدانتان بەبەهەشت بۆخۆمو خودا پاداشم دەداتەوە، ئێوەش ستەمکاریو شەریك دانانتانو ئاشووبگێڕیتان بۆ خۆتانو خودا سزاتان پڕاو پڕ دەداتەوە لەسەر کردەوەکانتان! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿هَلْ تُجْزَوْنَ إِلاَّ بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ﴾یونس/٥٢. بەلێ بەگوێرەی کردەوەکانتان سزا وەردەگرنەوە.

﴿أَنتُمْ بَرِيئُونَ مِمَّا أَعْمَلُ وَأَنَا بَرِيءٌ مِمَّا تَعْمَلُونَ﴾ ئێوە لەکردەوەی من بەرپرسیار نین، منیش بەرپرسیار نیم لەکردەوەی ئێوە، ئەمە جۆرە جولاندنو خوراندنێکە بۆ ویژدانیان، بەوە کە جیایان دەکاتەوە خۆیانو کردەومیان، وازیان لێ دێنێ خۆیانو سەرەنجامی رەشیان، مەبەستەکە ترساندنو گێڕانەوەمیانە لەو هەڵوێستو کردەوانەیان. لەهەمان کاتدا راگەیاندنی بەرپرسیارێتی هەموو

ئادەمیزادێکە بەرامبەر خودی خۆیو چەسپاندنی ئەو مەبدەئە ئیسلامییەیە: کە کەس لەسەر تاوانی یەکێکی تر سزا نادرێ. قورئانی پیرۆز چەند جار ئەم مەبدەئە پیرۆزەی دووبارە کردۆتەوە. دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ إِنِ افْتَرَيْتُهُ فَعَلَيَّ إِجْرَامِي وَأَنَاْ بَرِيءٌ مِّمَّا تُجْرَمُونَ﴾هود/٣٥. یان ﴿قُل لَّا تُسْأَلُونَ عَمَّا أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْأَلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾سبأ/٢٥. یان ﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾الأنعام/١٦٤. یان ﴿فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾الشعراء/٢١٦.

هەروا سیاقی ئایەتەکان بەردەوامن لەسەر رانواندنی هەڵوێستی بڕێ لەموشریکەکان بەرامبەر پەیامی پێغەمبەرو قورئان، بەڕواڵەت گوێ لەقورئان دەگرن بەڵام دڵیان داخراوە، بەچاو سەیر دەکەن وەلێ بیناییيان کوێرو کۆترەو بیستنو دیتنی رواڵەت بێ سوودە بۆیان. رێگای حەقو راست نادۆزنەوە.

کەوابێ ئەی پێغەمبەر! تۆ سەرت سووڕنەمێنێ لەهەڵوێستو کردەوەی موشریکە بەدرۆخەرەوەکان، چونکە لەراستیدا ئەوانە کوێرو کەڕن. ئەوەتا: ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ﴾ لەو موشریکو بەدبەختە نەفامانە، کەسانێك هەن گوێ دەگرن بۆ تۆ، کاتی قورئان دەخوێنیەوەو راڤەی دەکەیو بنەمای ئایین روون دەکەیەوە، ئەوانە گوێچکەیان بۆ کلۆر کردووی، بەڵام ئەو کاتەی گوێیان راگرتووە نابیسن چونکە گوێچکەی دڵیان داخراوە، ئەوانە بیری لێ ناکەنەوەو تێناگەن چییان لێ داوا دەکریو مەبەست چیە، بەڵکوو ئەوان: کە گوێ دەگرن گرنگی بەناوازەیی نەظمو جەرەسی موسیقای خوێندنەوەکەی دەدەن، وەکوو کەسێك گوێ لەخوێندنی بولبولێك بگرێ بۆ لەززەت وەرگرتن لەمۆسیقای خوێندنەکەی نەك بۆ ئەوەی تێی بگا.

بێگومان قورئان لەچەند شوێنێکی تردا حاڵو چۆنیەتی ئەم موشریکانەی روون کردۆتەوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا اسْتَمَعُوهُ

وَهُمْ يَلْعَبُونَ، لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ﴾الأنبياء/٢ – ٣. یان دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ وَجَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْراً﴾الأنعام/٢٥.

دەی جا: کە ئەمە حاڵو وەزعیان بێ ﴿أَفَأَنتَ تُسْمِعُ الصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا لا يَعْقِلُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! تۆ تەماعی ئەوەت هەیە: بتوانی بیستن بەکەڕ ئەنجام بدەی؟ تەنانەت ئەگەر وێڕای کەڕییەکەیان بێ عەقڵو هۆشیش بن؟

واتە: ئەتۆ ناتوانی بیستنی بەسوود بخەیە گوێچکەی کەسانێکەوە کە گوێچکەیان کەڕە لەئاست ئاخاوتنی تۆو نایانەوێ گوێیان لەتۆ بێ، وێڕای ئەوەش عەقڵیان بەو شتە ناشکێ کە دەیبیستنو تێی ناگەن تا سوودی لێ وەربگرن! چونکە بیستنی بەسوود بۆ بیسەر ئەوەیە: تێی بگاو بەپێی تێگەیشتنەکەی هەنگاو بنێ، ئەگینا وەکوو کەڕو کوندی راستی دەبێ!

ئێستاش دەبینین زۆر لەموسوڵمانان گوێ لەخوێندنی قورئان دەگرن، ئەگەر قورئانخوێنەکە دەنگو صەدای خۆش بێ بەمەبەستی لەززەت وەرگرتن لەمۆسیقای خوێندنەکەی نەك بۆ سوود وەرگرتن لەپەندو ئامۆژگارییەکانیو تێگەیشتن لەحوکمو یاساکانی!!

﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَنظُرُ إِلَيْكَ﴾ ئەی پێغەمبەر! کەسانێك هەن لەو کاتەدا تۆ قورئان دەخوێنی بەسەر سامییەوە سەیرت دەکەن، بەڵام نووری ئیمانو قورئانو هیدایەتی ئایینو ئەخلاقی جوان نابینن‌و فێر نابن، سەیری شێوەو روخسارت دەکەن، سەرنج دەدەن لەهێدیو هێمنیو بەڵگەی پێغەمبەرایەتیت، ئەوانە وەکوو باقی کەسانی تر سەیرت دەکەن، بەڵام لەو سەیرکردنە هیچ سوودیان پێ ناگا، موسوڵمانان بەچاوی ویقارو رێزەوە تەماشات دەکەن، ئەو کافرانە بەچاوی رقو کینەو ئیحتیقارەوە سەیرت دەکەن، کەوابێ چۆن ئیمانت پێ دەهێنن؟ چۆن سوود لەبینین‌و تەماشاکردنت دەبینن؟! خۆ ئەوان لەبەر کوێری چاوی دڵیان حەقیقەتی تۆ نابینن ﴿أَفَأَنتَ تَهْدِي الْعُمْيَ وَلَوْ كَانُوا لا يُبْصِرُونَ﴾ ئایا تۆ پێت وایە: کە دەتوانی هیدایەتی

کەسانێك بدەی کە چاوی دڵیان کوێرە؟ تەنانەت ئەگەر وێڕای کوێری چاویان چاوی دڵیشیان کوێر بێ؟ چونکە کەسێك چاوی سەری کوێر بێ هەستی دەرك کردنی هەیەو لەوانەیە لەزۆر شت حاڵی بێ. بەلاّم کوێری وێڕای ئەحمەقی ئەوە گەورەترین بەلاّو موصیبەتە.

بەکورتی: ئەتۆ ئەی موحەممەد! ناتوانی هیدایەتی ئەوانە بدەی، چونکە ئامادە باشییان تێدا نیە بۆ تێگەیشتن‌و هیدایەت، ئەوانە هەروەکوو کەسێك وان، کە هەستی بیستن‌و دیتنی فەوتابێ، چونکە گوێچکەو چاو بۆیە باشن کە سوودیان هەبێ، کاتێك سوودیان لێ نەبینرا وەکوو ئەوە وایە: کە هەر نەبووبن.

﴿إِنَّ اللَّهَ لا يَظْلِمُ النَّاسَ شَيْئاً﴾ بێگومان پەروەردگار هەرگیزاو هەرگیز ستەمی نەکردوەو ناکا، هەستو شعوور لەکەس ناستێنێتەوە، قەت ڕێگای هیدایەتو راست لەکەس ناگرێ، ﴿وَلَكِنَّ النَّاسَ أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ وەلێ ئادەمیزادان بۆ خۆیان ستەمکارن، بۆخۆیان خۆیان وا لێ دەکەن کە شیاوی سزاو عیقاب بن. بۆخۆیان نیعمەتی عەقڵو هۆش فەرامۆش دەکەن، دان بەگرنگی هیدایەتی ئاییندا نانێن، پەیڕەوی رەهنومایی‌و ئامۆژگارییەکان ناکەن!

## دونیا بێ بەقایەو زوو رادەبورێ

﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةً مِّنَ ٱلنَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ ۚ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار وەصفی کافرەکانی بەوە کرد: کە تێنافکرنو گوێ ناگرن، قورئان بەدرۆ دەخەنەوەو پێغەمبەر بەدرۆزن حسێب دەکەن، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا هەڕەشە لەکافران دەکا بەسزای قیامەت لەسەر کرداری دونیایانو دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَنْ لَمْ يَلْبَثُوا إِلاَّ سَاعَةً مِنْ النَّهَارِ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەوە بۆ ئادەمیزادان باس بکەو لەو ڕۆژەیان بترسێنە کە پەروەردگار دوای مردن هەموویان لەگۆڕەپانی مەحشەردا کۆدەکاتەوە بۆ حیسابو لێکۆڵینەوە، ئەو کاتە ئادەمیزادان هەموویان سەرنج دەدەنو بیر لەرابوردویان دەکەنەوە، وا دەزانن: لەدونیادا ماوەیەکی زۆر کورت ماونەوەو ژیانی دونیایان ماوەیەکی کەم بووەو تێپەڕیوە.

﴿يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ﴾ کە لەگۆڕەکانیان دێنە دەرەوە یەکتر دەناسنەوە پاشان لەترسانو لەعەیبەتان یەکتریان لەبیر دەچێتەوەو کەس وەسەر کەسی ناپرژیو کەس کەس ناناسێ!

مەزندەکردنی دونیا لەلای ئادەمیزادان لەو مەوقیفو نمایشگایانەدا بەکورتو کەمخایەن لەزۆر ئایەتی قورئاندا دووبارە بۆتەوە وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ﴾الأحقاف/٣٥. یان ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا﴾النازعات/٤٦. یان ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ﴾الروم/٥٥. یان ﴿قَالَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِي الْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ؟ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْماً أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَاسْأَلْ الْعَادِّينَ، قَالَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلاً لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾المؤمنون/١١٢/١١٣/١١٤.

ئەمجار پەروەردگار خەسارەتمەندیی گومڕایان رادەگەیەنێو دەفەرموێ: ﴿قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ﴾ بێگومان ئەو موشریکو کافرانە: کە بڕوایان بەزیندو بوونەوە نیە، هاتنی ڕۆژی قیامەتیان بەدرۆ دەزانی خەسارەتمەندبوونو پاداشی

گەورەی بەهەشتیان لەکیس خۆدا، بڕواو ئیمانیان بەکوفر گۆڕییەوە، زەرەریان کرد، ﴿وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ﴾ ئەوان ڕێگای فازانجو سوودی خۆیان نەزانی، ڕویان کردە ئەنجامدانی کردەوەی خراپ. ئای چەند خەسارەتمەندن؟ ئای چەند بەدبەختو ئاکام ڕەشن؟ ئەوانە ژیانی کەمخایەنی خەسیسیان بەژیانی نەبڕاوەی نەفس گۆڕیوەتەوە.

## هەڕشە کردن لەکافرەکان بەسزادانیان لەدونیاو قیامەتدا

﴿ وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ
ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ ﴿٤٦﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا
جَآءَ رَسُولُهُمْ قُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٤٧﴾
وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ قُل لَّآ أَمْلِكُ
لِنَفْسِى ضَرًّا وَلَا نَفْعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ إِذَا جَآءَ
أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ
أَتَىٰكُمْ عَذَابُهُۥ بَيَـٰتًا أَوْ نَهَارًا مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ ٱلْمُجْرِمُونَ
﴿٥٠﴾ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ ءَامَنتُم بِهِۦٓ ءَآلْـَٔـٰنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ

﴿٥١﴾ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ هَلْ تُجْزَوْنَ
إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ وَيَسْتَنۢبِـُٔونَكَ أَحَقٌّ هُوَ قُلْ
إِى وَرَبِّىٓ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥٣﴾ وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ
نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِى ٱلْأَرْضِ لَٱفْتَدَتْ بِهِۦ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا
رَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ
﴿٥٤﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَلَآ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ
وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٥﴾ هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ وَإِلَيْهِ
تُرْجَعُونَ ﴿٥٦﴾

**دوای ئەوەی پەروەردگار خەسارەتمەندیی موشریکەکانی روون کردەوە لەم روەوە کە بڕوایان بەزیندووبوونەوە نەبوو، رێگای هیدایەتو چاکەکارییان نەگرتەبەر، ئەوەشی راگەیاند: کە ئەوانە سزا دەدرێن، ئەمجار لەم ئایەتانەدا ئەوە روون دەکاتەوە: کە ئەو سزایە هەندێکی لەدونیادا دەبێو هەندێکی لەقیامەتدا دەبێ، لەرانواندنی ئەو دیمەنە سەرسوورهێنەرەی حەشرو ئەو چەند رۆژە کورتەی ژیانی دونیا: کە پێش زیندو بوونەوە بووە، دەگوێزرێتەوە بۆ ئاخاوتن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەربارەی هەڕەشە کردن لەموشریکو کافرەکانو بەجێهێنانی ئەو هەڕەشانە هەموویان یان هەندێکیان، ئەو هەڕەشە نادیارەی: کە نازانن کەیو چ**

کاتێ بەربینگیان پێ دەگرێ!؛ ئایا لەجیهاندا ئەو سزایە پەلاماریان دەدا، یان هەڵدەگیرێ بۆ رۆژی قیامەتو تا ئەو رۆژە هەرچاوەڕوان بن، بۆ ئەوەی وەکوو چەکوچی ئامادە هەموو کات بەسەر سەریانەوە بیو لێی بترسێن، بۆ ئەوەی موسوڵمان بنو لەخودا بترسنو رێگای هیدایەت بگرنە بەر!

ئەمجار سیاقی ئایەتەکان وردە وردە پێوە دەچن، هەتا ئەو باسو خواسەی بەهەڕەشە کردن لەکافرەکان دەستی پێ کردوەو دیمەنەکان یەك لەدوای یەك رادەنوێردرێن تا دەگاتە هاتنی رۆژی قیامەت کە لەو رۆژەدا فیدیەو بەرتیلو ئەم جۆرە شتانە هیچ کەڵکیان نیە، تەنانەت ئەگەر لەڧەرزی مەحاڵدا سامانی زەوی هەموو هی ئەو بێو بەفیدیە بیدا سوودی نیە، لەو رۆژەدا پەروەردگار بەعەداڵەت دادگایی دەکاو ستەم لەکەس ناکا! ئەمەش ئوسلووبێکی قورئانە لەپێکەوە گرێدانی دونیا بەقیامەتەوە، ئەوەتا بەچەند وشەو رستەیەك ئاوا لێکی داونو رایاندەنوێنێو دەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ﴾ ئەگەر ئێمە برێ لەو هەڕەشانەی لێمان کردوون بەدییان بهێنینو پیشانی تۆیان بدەین ئەوە سزایەکە شیاوی خۆیانە.

موشریکەکان بڕوایان بەپێغەمبەر نەدەکرد، هەر کاتێکیش پێغەمبەر ﷺ هەڕەشەی بەهاتنی عەزاب لێ بکردنایە بەدرۆیان دەخستەوە، بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕیو قەشمەری ئامێزەوە پێیان دەگوت: ئەگەر راست دەکەی دەبەزوویی ئەو عەزابەی هەڕەشەمان پێ لێ دەکەی بۆمان بێنە!

لەهەمان کاتدا تەمەنناى مردنی پێغەمبەریان دەکرد، بەو هیوایەی بەمردنی ئەو بانگەوازییەکەی لەناوبچێ، ئیتر پەروەردگار وەڵامی دانەوەو فەرمووی: ئەی پێغەمبەر! ئەگەر ئێمە لەماوەی ژیانی تۆدا تۆڵەیان لێ بستێنینو داخی دڵی تۆیان پێ بڕێژین، وەکوو ئەو حاڵەی بەسەریان هات لەرۆژی بەدردا ئەوە ئەوان شیاوی ئەو سزایەنو سوچ سوچی خۆیانە.

بێگومـان پـەروەردگار زۆر لـەو هەڕەشـانەی لێـی کـردن، پیـشانی پێغەمبـەری دان، برسـیایەتیو گرانـیو قـاتو قـڕیو تێـشکانو کـوژارنی زۆر لـەو موشـریکانەی نیشانی پێغەمبەری دا. ﴿أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ﴾ یـان تـۆ بمـرێنین پـێش ئـەوەی ئەو سزایەی بۆمان داناون ببینی، ئەوە لەهەردوو حاڵەکەدا سـەرنجام دەگەڕێنـەوە بـۆ لای ئێمـە، ئـەو کاتـە سـزای وادەپێـدراویان تـووش دێو بۆیـان دەردەکـەوێ: کـە هەڕەشەکانمان راستنو چییان پێ گوتراوە: دەق دێتە جێ. لەهەمان کاتدا سـزادانی ئەوان پیشانی تۆش دەدەینو دەبینی چۆن سزایان دەدەین.

﴿ثُمَّ اللّهُ شَهِيدٌ عَلَى مَـا يَفْعَلُـونَ﴾ پـاش مردنـی تـۆ خـودا ئاگاداره بـەکردەوەو گوفتاریانو بەپێی کرداریان سزایان دەداتـەوە، بـەگوێرەی زانیـاریو ئاگـاداری خـۆی بەحەقو دادپەروەری سزایان دەداتەوە وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَاصْـبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾الروم/ ٦٠. یان ﴿وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّـكَ فَإِنَّمَـا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ﴾الرعد/ ٤٠.

ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە پـەروەردگار جۆرەها ریـسواییو زەلیلـی کافرەکـان نیشانی پێغەمبەر دەدا، دوای لەدونیا دەرچوونیشی هەر لەو سزایەیان زیاد دەکا.

﴿وَلِكُـلِّ أُمَّـةٍ رَسُـولٌ﴾ پـەروەردگار لەروانگـەی لـوطـفو بـەزەیی خۆیـەوە، هـەروەها بـۆ نەهێـشتنی بەڵگەو بیـانوو بەدەسـت ئـادەمیزادەوە بـۆ هـەموو گـەلو نەتەوەیـەك لـەو گـەلو نەتەوانـەی پێـشوو لـەکاتی پێویـستدا پێغەمبـەرانی بـۆ ناردوون، بۆ ئەوەی رێبازی ئاینیان بۆ روون بکەنەوە، باسو خواسی قیامەتیان پێ رابگەیـەنن، هـەڵیان بنـێن بـۆ ئیمانهێنـانو ئەنجامـدانی کـردەوەی چـاك بـەجۆرێك خۆشبەختی دونیاو قیامەت بەدەست بێنن!

ئایەتەکە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوە: کـە پـەروەردگار بـۆ هـەموو گـەلو نەتـەوەو کۆمەڵگایـەك پێغەمبـەرێکی نـاردوە، هـیچ گـەلو نەتەوەیـەکی پاشـگوێ نەخـستوە،

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾فاطر/٢٤. یان ﴿...وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾الأسراء/١٥. کەوابێ: گەلی کوردیش وەکوو باقی گەلەکانی سەر زەوی پێغەمبەری تێدا رەوانە کراونو پێغەمبەری بۆ نێردراون، ئەمجار ئەم پێغەمبەرانە کێنو ناویان چیە؟ ئەوە گرنگ نیە، چونکە ئەگەر گرنگ بوایە قورئان ناوی دیاری دەکردنو وەکوو برێ لەپێغەمبەرانی بەنوئیسرائیل: کە ناوی تۆمار کردوون.

هەڵبەتە ئەو پێغەمبەرە کوردانە بەزوبانی کوردیش نێردراون وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ فَيُضِلُّ اللّهُ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ابراهيم/٤.

ئەمە راستییەکی مێژوویییەو قورئان بەئاشکراو نمایان چەسپاندویەتی، وێدەچێ ئەگەر لەکوردستاندا زەوی دۆزیو پشکنینو لێکۆڵینەوەی شوێنەوار ناسان بکەوێتە گەڕو ئەنجام بدرێ زانیاری کەم تا زۆر لەم بوارەدا بەدەست بکەوێ...!

﴿فَإِذَا جَاءَ رَسُولُهُمْ قُضِيَ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ وَهُمْ لا يُظْلَمُونَ﴾ جا هەر کاتێ پێغەمبەرێك دەهاتە سەرگەلو نەتەوەیەکو ئەوەی لەسەر شانی پێویست بوو پێی رادەگەیاندن، ئیتر عوزرو بیانوویان بۆ نەدەمایەوە، بەڵام ئەو گەلو نەتەوانە بەدرۆیان دەخستنەوە، پەیامەکەیانیان رەت دەکردنەوە. جا لەرۆژی قیامەتدا خودا دادگایییان دەکا، دادپەروەرانە حیسابو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ ئەنجام دەدا، تۆزقاڵێك ستەمیان لێ ناکرێ، چەند سزادان هەڵدەگرن ئەوەندە سزا دەدرێن.. ئەمە ئەگەر راناوی (بينهم) بگەرێتەوە بۆ گەلو نەتەوەکان.

ئەگەر راناوەکە بگەرێتەوە بۆ پێغەمبەرەکانو گەلەکان ئەو کاتە ئاوا مانا دەکرێ: (قضي الله بينهم) خودا بڕیارو دادگایی دەردەکا لەنێوان پێغەمبەرو گەلو نەتەوەکەیدا، واتە: دەدگایی لەنێوان هەموو پێغەمبەرێکو گەلەکەیدا دەکا،

پێغەمبەرو پەیڕەوکارانی رزگار دەکاو سەرپێچیکاران سزا دەدا، لەم دادگایی کردنەدا کەسیان ستەمی لێ ناکرێ، بەبێ تاوان کەس سزا نادرێ.

﴿وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْوَعْدُ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ واتە: کافرەکانی قورەیش لەروی بەدرۆ خستنەوەو گاڵتە پێکردنەوە بەپێغەمبەرو موسوڵمانان دەڵێن: ئەو هەڕەشانەی موحەممەد لێمان دەکا، ئەگەر راست دەکا: کەی دێتە دی؟ کەی خودا سزاو عیقاب بۆ ئێمە دەنێرێو تۆڵەمان لێ دەستێنیو موحەممەدو شوێنکەوتوانی بەسەر ئێمەدا زاڵ دەکا؟؟

ئەمجار پەروەردگار دەرزی پێغەمبەر دا دەدا کە وەڵامیان بداتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو موشریکانە بڵێ: کە پەلە لەهاتنی سزا دەکەن. ﴿لا أَمْلِكُ لِنَفْسِي ضَرّاً وَلا نَفْعاً إِلاَّ مَا شَاءَ اللَّهُ﴾ من ئادەمیزادێکمو نیگام بۆ کراوە، بەندەیەکی خودامو کراوم بەپێغەمبەر. بۆ خودی خۆم (چ جای بۆ کەسانی دیکە) توانای لابردنی سزاو هێنانی سوودم نیە، ناتوانم قازانجو زەرەر بەخۆمو غەیری خۆم بگەیەنم، بەڵام ئەوەی خودا ئارەزۆی بکا لەناردنی سزا بۆ سەر موشریکەکانو سەرخستنی موسوڵمانان، هەر کاتێ ئارەزۆی کرد دێتە دی ئەمن نازانم کەی دێ!

واتە: نازڵکردنی عیقاب بۆ سەر دوژمنانی ئایینو سەرخستنی خودا پەرستان بەسەر کافراندا، جگە لەخودا بەکەسی تر ناکرێ، ئەوە کاری من نیەو بەدەست من نیە. ئەرکی سەرشانی من ئەوەیە: ئەوەی خودا نیگای بۆ کردوم بەگوێرەی پێویست بەئێوەی رابگەیەنم.

﴿لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ إِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ فَلا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلا يَسْتَقْدِمُونَ﴾ هەموو گەلو نەتەوەیەك لەوانەی سوورن لەسەر بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەرەکەیان، ماوەیەکی دیاریکراو هەیە بۆ هاتنی عەزاب بۆ سەریان، ئەو عەزابە دێتە سەریانو گەلو نەتەوەیەکی تر ناگرێتەوە، جا کە ئەو عەزابە نازڵ بوو، ئیتر

نەپێغەمبەرەکەیانو نەغەیری پێغەمبەر، هیچیان توانای ئەوەی نیە ساتە وەختێك دوای بخەن یان پێشی بخەن!

خاوەنی تەفسیری مەراغی دەڵێ: خاوەنی (فتح البیان) لەفەتحولبەیاندا دەڵێ: (ئەم ئایەتە گەورەترین ئامۆژگاریکەرە بۆ ئەوانەی بۆ ئەنجامدانی هەموو کارێك هاوار دەکەنە پێغەمبەر ﷺ وا خویان پێوە گرتووە؛ لەکاتی نازڵبوونی بەڵاو موصیبەتدا لەپێغەمبەر ﷺ بپاڕێنەوە، یان داوا لەپێغەمبەر دەکەن کە سوودیان پێ بگەیەنێ، لەکاتێکدا ئەم شتانە هەر بەخودا ئەنجام دەدرێنو لەتوانای زاتی ئەودایەو بەس!)

ئەمە پلەو پایەی پەروەردگارەو تایبەتە بەخۆیەوە، ئەو خودایەی پێغەمبەرو پیاو چاکو هەموو بوونەوەری بەدیهێناوە، گیانی پێ بەخشیونو رزقو رۆزییان دەداو داوە. دەی چۆن دەگونجیو رەوایە: کە داوا لەپێغەمبەرێك لەپێغەمبەران، یان فریشتەیەك لەفریشتان، یان لەپیاو چاکێك لەپیاوچاکان بکرێ شتێك ئەنجام بدەن: کە لەتوانایاندا نیە، داوا لەخودای بەتواناو زانا نەکرێ داوا لەوانە بکرێ.

داوا لەخودای بەدیهێنەرو رزقو رۆزیدەر نەکرێ داوا لەو بەندانە بکرێ کە هیچ شتێکیان لەم بارەوە بەدەست نیە!!

بەراستی ئەم ئایەتە کیفایەتەو پەندو ئامۆژگاری تەواوە بۆ ئادەمیزاد.. ئەوەتا: گەورەی ئادەمیزاد سەردارو پێشەوای پێغەمبەران، خودا فەرمانی پێ دەکا: کە بەئادەمیزادان بڵێ: ﴿لاَّ أَمْلِكُ لِنَفْسِي ضَرّاً وَلاَ نَفْعاً﴾.

بەراستی جێگای سەرسووڕمانە کەسانێك هەبن لەسەر گۆڕی مردوان خۆکوشمەڵە بکەن، یان بەدەوریاندا بخولێنەوە، ئەوانە لەژێر گڵو خۆڵدا پۆڵکاونو ئەمان داوای جێ بەجێ کردنی شتێکیان لێ دەکەن کە ناتوانن ئەنجامی بدەن! چۆن

پەند ئامێز نابن‌و نازانن: کە ئەوە شیرکەو سەرپێچی مانای (لا الە الا اللە)یە. لەگەڵ مانای ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ یەك ناگرنەوە! [١٦]

ئەمجار پەروەردگار وەڵامێکی تریان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ﴿أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَتَاكُمْ عَذَابُهُ بَيَاتاً أَوْ نَهَاراً﴾ هەواڵم پێ بدەن‌و پێم بڵێن: حاڵ‌و وەزعتان چۆن دەبی‌و چی دەتوانن بکەن ئەگەر عەزابی خوداتان بۆ هات بەشەوو لەکاتی نوستندا، یان بەرۆژو لەکاتی ئیش کردنتاندا، لەو کاتانەدا: کە سەرگەرمی کارو کاسبی یان رابواردن‌و گاڵتەو سەیرانن!!

﴿مَاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ الْمُجْرِمُونَ ؟﴾ چ جۆرە سزاو عیقابێك داوا دەکەن‌و پەلەیان بۆ هاتنی کامەیانە؟ داوای سزای دونیا یان سزای قیامەت دەکەن؟ هەردوو سزاکە دێن‌و بەئازاریشن، هەرکامێکیان داوا بکەن‌و پەلەیان لەهاتنی بێ نیشانەی نەفامی‌و ئەحمەقییانە، چ سوودێکی لێ دەبینن؟

﴿أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ آمَنْتُمْ بِهِ ؟﴾ خۆ ئەگەر بڵێن: کاتی هاتنی عەزابەکە ئیمان دەهێنین، ئەوە بەهەڵەچوون، چونکە ئیمانهێنانی کاتی هاتنی عەزاب‌و ناهومێد بون لەژیان، بێ سوودە. سزای نزیك سزای دونیایە، بەدوا سزای دونیادا سزای قیامەت هەیە زۆر لەسزای دونیا بەشیدەت ترە.

واتە: ئایا ئێوە چاوەڕوانی هاتنی سزا دەکەن بۆ ئیمانهێنان، جا کە هات ئیمان دەهێنن لەکاتێکدا ئیمانهێنان سوودی نابێ. بەقەشمەری‌و لاقرتی‌و شێوەی گاڵتە ئامێزەوە پێتان دەگوترێ: ﴿آلْآنَ وَقَدْ كُنْتُمْ بِهِ تَسْتَعْجِلُونَ ؟﴾ ئەوە تازە ئیمان بەخوداو بەپێغەمبەر دەهێنن‌و بەناچاری‌و لەترسان‌و بەزۆر بڕوا دەکەن؟ لەکاتێکا ئێوە لەوەپێش بەشێوەی گاڵتەجاڕی‌و بەمەبەستی بەدرۆخستنەوەو خۆ بەزلزان پەلەی هاتنی سزاتان دەکرد، دەتانگوت کوانی‌و کەی ئەو سزاو عیقابە دێن؟!

---

(١٦) تەفسیری مەراغی ج١١/١١٧.

﴿ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا ذُوقُوا عَذَابَ الْخُلْدِ﴾ پاشان بەوانە دەگوترێ: کە ستەمیان لەخودی خۆیان کردوە بەکوفرو یاخی بوون، ستەمیان لەخۆیان کردوە لەم رووەوە: کە بڕوایان بەپێغەمبەرایەتی‌و وادەو هەڕەشەکانی پەروەردگار نەکردوە، پێیان دەڵێن: دەبچێژن سزای خودا بۆ هەتا هەتایە، سزایەك بچێژن کە برانەوەی نیەو کۆتایی نایە. ئەمجار ئەوە رون دەکاتەوە: کە ئەمە سزای کردەوەکانی جیهانیانەو دەفەرموێ: ﴿هَلْ تُجْزَوْنَ إِلاَّ بِمَا كُنْتُمْ تَكْسِبُونَ ؟﴾ ئایا سزا دەدرێنەوە ئیللا بەگوێرەی کردەوەکانتان؟ ئێوە بەویستی خۆتان کوفرو ستەمکردنتان هەڵبژاردوە، سوور بوون لەسەر بەردەوام بوون لەسەر کوفرو ستەمکاریی، کەوابێ ئەم عیقابو سزایە هیچ جۆرە ستەمکارییەکی تێدا نیە، بەڵکوو سزایەکی پڕاو پەڕە.

جا هەرچەندە لەوەپێش پەروەردگار وەڵامی پرسیاری کافرەکانی دایەوە: کە دەیانگوت: ﴿مَتَى هَـذَا الْوَعْدُ ؟﴾.

بەڵام پەروەردگار لێرەدا ئەوەمان بۆ شی دەکاتەوە: کە جارێکی تر کافرەکان پرسیارێکی تری لەم جۆرەیان ئاڕاستەی پێغەمبەر ﷺ کردۆتەوە دەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَنْبِئُونَكَ أَحَقٌّ هُوَ ؟﴾ ئەی پێغەمبەر ئەو موشریکانە داوای خەبەرو هەواڵت لێ دەکەن، داوات لێ دەکەن خەبەریان دەربارەی عەزابی دونیاو قیامەت پێ بدەی، ئایا حەقو راستە؟ دێتە دی؟ یان چاوو راوو هەڕەشەو ترساندنە؟

﴿قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: بەڵێ سوێندم بەخودا ئەو عەزابەی هەڕەشەتان پێی لێ کراوە حەقو راستەو پەیدا دەبێ، کە هات کەس نیە بیگێڕێتەوە، کەس ناتوانێ بەرگری بکاو نەهێڵێ نەیە ﴿وَمَا أَنْتُمْ بِمُعْجِزِينَ﴾ ئێوە ناتوانن خۆتان لەچنگ ئەم سزایە قوتار بکەن، ئێوە خودا دەستەوەستان ناکەن، بونتان بەگڵو خۆڵ نابێتە کۆسپو تەگەرە لەبەردەم خودادا کە نەتوانێ دروستتان بکاتەوە، بەڵکوو چۆن لەسەرەتادا لەنەبوونەوە ئێوەی هێناوەتە گۆڕەپانی ژیانەوە،

ئاواش دووای مردنتانو دوای بوونتان بەگڵو خۆڵ جارێکی تر زیندوتان دەکاتەوەو ئەو سزایەتان بەسەرا دەداو دەتانجەڕێنێ!! ئەمە بۆ خودا کارێکی ئاسانە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾يس/٨٢.

لەقورئاندا دوو ئایەتی تر بەم جۆرە هاتوون:

یەکێکیان ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَأْتِينَا السَّاعَةُ قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ﴾السبأ/٣. ئەویتریان ﴿زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾التغابن/٧.

جا لەکاتێکا ئێمە لەگەڵ ئەو موشریکانە سەرگەرمی پرسیارو وەڵامینو واین لەسەر زەویو هەوای ژیان هەڵدەمژین، لەپڕێکا لەگەڵ سیاقو ئوسلووبی قورئان ئێمە خۆمان لەگۆڕەپانی حەشرو نەشرو حیسابو لێکۆڵینەوەدا دەبینینەوە، زۆرجار قورئان ئوسلووبی ئاوا بەکار دەهێنێو لەپڕێکا لەسیاقو روداوێکەوە دەگوێزێتەوە بۆ سیاقو روداوێکی تر، بەجۆرێك هەستی ئادەمیزاد بهەژێنێو سەرنجی رابکێشیو دیمەنە جۆراو جۆرەکانی رابنوێنێ بەبێ ئەوەی هەست بەکۆسپو لەدەستدانی بەلاغەتو فەصاحەتو چەواشەیی لەئوسلووبەکەدا بکرێ!

ئەوەتا: لەو کاتەدا لەژیانی دونیادا دیمەنی پرسیار کردنی موشریکەکانو وەڵامی پێغەمبەر را دەنوێنێ لەپڕێکا گواستییەوە بۆ رۆژی حیسابو سزاو پاداشو بڕی تەنگو چەڵەمەی رۆژی قیامەت دەخاتە ڕوو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِي الْأَرْضِ لَافْتَدَتْ بِهِ﴾ ئەگەر لەفەرزی مەحاڵدا، بۆ هەر نەفسێك کەستەمی لەخۆی کردوەو ئیمانی نەهێناوەو بڕوای بەپەیامی پێغەمبەر نەکردوە، چی لەزەویدا هەیە لەماڵو سامانو تواناو دەسەڵات هەمووی هی ئەو بێ، بتوانێ بیکاتە فیدیەو قوربانی بۆ خۆیو رزگاربوونی لەسزای بەئێش، ئەوە بێگومان بەبێ

سی و دوو هەر هەمووی دەکردە فیدیەو هیچی لێ نەدەهیشتەوە، خۆشی بەسوودمەند دەزانی!

بەلام لەفەرزێکدا هەموو ئەو ملکو سامانەی هەبی و بیدا بەفیدیە لێی وەرناگیری!

﴿وَأَسَرُّوا النَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ﴾ جا ئەو کاتەی سزای بەئێش دەبینن پەشیمانی خۆیان دەشارنەوە، سەرگەردانو سەرسامو لالّو پالّ دەبن، دەتاسێنو کەڕو کاس هیچیان پێ ناگوترێ، نازانن بلێن چی، چاویان بەملۆق دەوەستی و رەنگیان رەش دادەگیرسێ!

جاری وایش دەبێ پەشیمانی خۆیان رادەگەیەنن وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا حَسْرَتَى عَلَى مَا فَرَّطتُ فِي جَنبِ اللَّهِ﴾الزمر/٥٦.

بەکورتی ئەوان کە ئاگری دۆزەخ دەبینن، بانگی پەشیمانی خۆیان هەلدەدەن پێیان وایە: ئەو هاوارو گریانو پەشیمان بوونەوە سوودی هەیە، کە دەزانن: بێ سوودە، پەشیمانیەکەیان دەشارنەوە، بۆ ئەوەی کەسانی دیکە پێیان خۆش نەبن.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە لەو رۆژەدا هیچ زۆرو ستەمێك نیەو بەندەکان بەگوێرەی کردەوەکانیان سزاو پاداش وەردەگرنەوە. دەفەرموێ: ﴿وَقُضِيَ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ وَهُمْ لا يُظْلَمُونَ﴾ پەروەردگار دادگایی نێوان ئادەمیزادان دادپەروەرانە ئەنجام دەدا، بڕیاری عادلانە دەردەکا، دادگایی نێوان پێغەمبەرانو گەلە ستەمکارو کافرەکانیان ئەنجام دەدا، دادگایی نێوان گومڕاکەرانو گومڕاکراوان دەکا، بەم دادگایی کردنەش تۆزێ سزای گومڕاکەران زیاد دەبێ و سزای گومڕاکراوانیش سووك دەکرێ!

ئەمجار بەلگە لەسەر ئەوە دێنێتەوە: کە حوکمی رەوایەو وادەو هەڕەشەی دێنەجێ‌و ستەمکاران لەدەستی قودرەتی رزگاریان نابێ‌و رێگای هەڵاتنیان نابێ. دەفەرموێ:

﴿أَلا إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ ئاگادار ببنەوە؛ بێگومان هەر بۆ خودایە چی لەئاسمانەکان‌و زەویدا هەیە، هەمووی ملکی خودایە، کەوابێ کافرەکان لەو رۆژەدا هیچیان دەست ناکەوێ بیکەنە فیدیەو قوربانی‌و خۆیانی پێ لەئاگری دۆزەخ رزگار بکەن! ئەگەر لەفەرزی مەحاڵدا دەستیشیان بکەوێ سوودی نیە!

بەڵکوو هەموو شتێك بۆ خودایەو، سزادان‌و تۆڵەستاندنەوە هەر بەدەست ئەوە، چۆنی بوێ ئاوا سزایان دەداو تۆڵەیان لێ دەستێنێ؛ هەموو ویستو بڕیارو فەرمانێکی عەدالەتکارییەو ستەمی تێدا نیە.. بەکورتی کەسێك لەیادی چووە بابیر بکاتەوە، بێ ئاگاو غافڵ با بەهۆش خۆ بێنەوە، با نەزان‌و نەفام فێر ببن‌و بزانن: کە ملکی دونیاو قیامەت هەر بۆ خودایەو بەس! عالەمی باڵاو عالەمی سەرزەمین‌و ناو زەوی هەمووی هی خۆیەتی. چۆنی بوێ ئاوا هەڵیاندەسوڕێنێ، کەس خاوەنی هیچ نیەو دارایی هیچ نیە. کە لەدونیادا بەڕواڵەت ئادەمیزاد خاوەنیەتیەکی مەجازی هەبێ ئەوە لەقیامەتدا هیچی نیەو هیچی دەست ناکەوێ بیکاتە فیدیەو قوربانی.

ئەمجار جەخت لەسەر مانای پێشوو دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَلا إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لا يَعْلَمُونَ﴾ ئاگادار ببنەوەو بزانن: کە بێگومان وادەو هەڕەشەی خودا حەق‌و راستن‌و دێنە جێ، وەلێ زوربەی ئەو ئادەمیزادانە، زوربەی ئەو موشریکانەی بڕوایان بەزیندوبوونەوە نیە، لەبەر بێ ئاگایی‌و نەفامی‌و کورتبینی‌و نەزانییان کاروباری قیامەت نازانن: نازانن روداوەکانی چۆنن!!

ئەمجار بەلگە لەسەر تواناو دەسەڵاتی رەهای خۆی دەهێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ هەر خودا خۆی ژیان دەبەخشی‌و دەمرێنی،

هەرچی بیەوێ زیندوی بکا یان مردنی بەسەردا بدا فەرمانی رەوایەو کەس نیە بەرگری بکاو ببێتە کۆسپو تەگەرە، پاش مردن زیندوتان دەکاتەوەو راپێچی دەشتی مەحشەرتان دەکا بۆ حیسابو لێکۆڵینەوەو سزادانو پاداش دانەوەتان لەسەر کردارو گوفتارتان!!

## مەبەستە سەرەکییەکانی قورئانی پیرۆز

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٧ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ٥٨﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوودا بەڵگەی لەسەر سێ بنەما سەرەکییەکانی ئایینی ئیسلام هێنایەوە: کە بریتی بوون لە (یەکتاپەرستی، پێغەمبەرایەتی، زیندوبوونەوە) ئەمجار پەروەردگار باسی تەشریعی عەمەلی: کە قورئانی پیرۆزە، دەکاو چوار مەبەستی سەرەکی ئەو نامە ئاسمانییە پیرۆزە شی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بەو خەڵکە رابگەیەنە، بڵێ: ئەی ئادەمیزادینە! دڵنیا بن نامەیەکی ئاسمانی گرنگتان بۆ هاتووە، هەموو ئامۆژگاریو راسپاردەی جوانی لەخۆ گرتوون، فێری رەوشتی بەرزو کرداری چاکو گفتاری باشتان دەکا، جڵەوگیریتان لێ دەکا لەخراپەکاری دەتانگێڕێتەوە، دەرمانی دەردی دڵو دەروون دەکا، شارەزاییتان دەکا بۆ رێبازی حەقو راست: کە دەتانگەیەنێتە بەختەوەری دونیا قیامەت!

ئەمەش ئەو چوار ڕەوشتە تایبە تمەندییە یان چوار مەبەستە سەرەکییەی قورئانن:

١- ﴿مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ﴾ قورئان ئامۆژگاریکەرێکی باشە لەخوداوە نێردراوە بۆ سەر ئادەمیزاد ترساندن لەسزاو بەتەماکردنی پاداشی لەخۆگرتووە، ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ ئەنجامدانی کاری باشو وازهێنان لەکاری خراپ.

٢- ﴿وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ﴾ دەرمانی دەردی دڵو دەروونە، شوبهەو گومانو دووڕوویی‌و کوفرو ئیلحاد لادەبا، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلاَ يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إَلاَّ خَسَاراً﴾الأسراء/٨٢.

٣- ﴿وَهُدًى﴾ شارەزایی دەکا بۆ ڕێبازی حەقو یەقین، ڕێبازی ژیانی خۆشبەختی‌و کامەرانی هەردوو جیهان دیاری دەکا. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاء﴾فصلت/٤٤.

٤- ﴿وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ بەخششو ڕەحمەتێکی تایبەتییە بۆ بڕواداران، لەتاریکایی گومڕایی ڕزگاریان دەکاو بەرەو نووری ئیمان ڕەهایان دەکا، ئاگری دۆزەخیان لێ دوور دەخاتەوەو پلەو پایەی بەهەشتی بەرینیان دەداتێ. بۆیەش ڕەحمەتەکەی تایبەت کرد بەبڕوادارانەوە چونکە هەر ئەوان سوود لەئیمان وەردەگرن.

ئەمجار فەرمان بەپێغەمبەر دەکا، کە بەموسوڵمانان رابگەیەنێ: کە ئەوان شیاوی ئەوەن بەبەخششو فەضلی خودا کەیفخۆش بنو دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ﴿بِفَضْلِ اللّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُوا﴾ با بەبەخششو فەضلو ڕەحمەتی خودا کەیف خۆش بن، واتە: ئەگەر شتێك هەبێ لەجیهاندا شیاوی دڵ پێ خۆش بوون بێ، ئەوە ڕەحمەتو فەضلو بەخششی خودایە!

ئیبنو مەردەوەیهیو ئەبو شەیخ: ئیبنو حەییانی ئەلئەنصاری لەئەنەسەوە بەمەرفوعی فەرموودەیەکی هێناوە دەفەرموێ: (فضل)ی خودا بریتییە لەقورئان رەحمەتەکەشی ئەوەیە: کە بەئێوەی رەوا دیوەو ئێوەی کردوە بەئەهلی رەحمەتەکە!

حەسەنی بەصریو ضەححاکو قەتادەو موجاهید دەفەرموون: فەضلی خودا: بریتییە لەئیمان، رەحمەتەکەشی قورئانە!

﴿هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ﴾ واتە: دڵ خۆش بوون بەفەضڵو رەحمەتی خودا باشترو بەسوودترە لەهەموو ئەو زێڕو زیوو ئاژەڵو ماڵو سامانە جۆراو جۆرەی کۆی دەکەنەوە، چونکە ماڵو سامان لەوانەیە ببنە هۆی خۆشبەختی دونیا بۆ ماوەیەکی کەمو کورت خایەن، بەڵام فەضڵو رەحمەتی خودا هۆی خۆشبەختی هەردوو جیهانەو بەختەوەری قیامەت بڕانەوەی نیە.

## موشریکەکان لەخۆیانەوە هەندێ شت حەڵاڵو هەندێکی تر حەرام دەکەن

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم
مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ
(٥٩) وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ

إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَشۡكُرُونَ



دوای ئەوەی پەروەردگار لەسەرەتای سورەتەکەدا باسی نیگاو سروشتی کرد، بەبەڵگەی حاشا هەڵنەگر چەسپاندی، ئەمجار لەرویەکی ترەوە راستی پێغەمبەرایەتی دەچەسپێنیو ئەوە رادەگەیەنێ کە تەحلیلو تەحریم بەدەست خودایەو بەس! کەسی تر مافی تەشریع دانانی نیە، هەروەها هەموو شتێك لەبنەمادا موباحو حەڵاڵە بەمەرجێك بەڵگە لەسەر حەرامبوونی نەهاتبێ، کەوابوو حەرامکردنی برێ شتو حەڵاڵکردنی هەندێکی تر: کە سوودو رەوشتو دیاردەیان وەکوو یەك وایە بەڵگەیە لەسەر دان پیانانتان بەراستی پێغەمبەرایەتیو سروش، چونکە بەڵگەیەکی عەقلی یان نەقڵیتان بەدەستەوە نیە لەسەر ئەو جوداوازییە، بەهەوانتە ئەمیان حەڵاڵ دەکەنو ئەویان بەحەرام لەقەڵەم دەدەن، ئەمەش پەیڕەوو پرۆگرامێکی بەتاڵو پوچو ناحەقە، رێبازی پێغەمبەران حەقو راستو پڕ سوودە!

ئەوەتا لەم ئایەتەدا پەروەردگار خیطاب ئاراستەی پێغەمبەر ﷺ دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ لَكُمْ مِنْ رِزْقٍ فَجَعَلْتُمْ مِنْهُ حَرَاماً وَحَلالاً﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو موشریكو بێ بڕوایانە بڵێ: بەو نەفامانە بڵێ: کە بڕوایان بەنیگاو پێغەمبەرایەتی نیە، پێیان بڵێ: ئێوە بیرو راتان دەربارەی ئەو رزقو رۆزییەی خۆدا بۆی ناردوونە خوارێ چۆنەو چیە؟ (ئاشکرایە هەموو رزقو رۆزییەك لەخوداوەیە) پێیان بڵێ: راتان چیە دەربارەی ئەو رزقو رۆزییەی؛ کە خودا پێی بەخشیون بۆ ئەوەی بەگوێرەی شەریعەتو یاسای ئەو هەڵسو کەوتی تێدا بکەن، کەچی ئێوە بەپێچەوانەوە لەخۆتانەوەو بەهەوانتە، بەبێ ئیزنو شەرعی خودا، هەندێکتان

حەرام کردووەو هەندێکتان بەحەڵاڵ داناوە، هەڵبەتە حەرامکردنو حەڵاڵکردن تەشریعو یاسا دانانە، تەشریعو یاسادانان فەرمانڕەواییو حاکمییەتە، حاکمییەتیش ربووبییەتەو تایبەتە بەخوداوە هیچ کەسی تر مافی ئەوەی نیە، دەی ئێوە بۆ خۆتان صەلاحییەتی ئەو تەشریع دانانو حاکمییەتەتان بەخۆتان داوە!!

ئەوەتا بەهەوانتەو بەبێ بەڵگە (بەحیرەو سائیبەو وصیلە)تان حەرام کردوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُواْ لِلّهِ مِمِّا ذَرَأَ مِنَ الْحَرْثِ وَالأَنْعَامِ نَصِيباً فَقَالُواْ هَـذَا لِلّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَـذَا لِشُرَكَآئِنَا﴾الأنعام/١٣٦. یان دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ هَـذِهِ أَنْعَامٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لاَّ يَطْعَمُهَا إِلاَّ مَن نّشَاء بِزَعْمِهِمْ﴾الأنعام/١٣٨. یان ﴿وَقَالُواْ مَا فِي بُطُونِ هَـذِهِ الأَنْعَامِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَى أَزْوَاجِنَا﴾الأنعام/١٣٩. یان ﴿ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ مِّنَ الضَّأْنِ اثْنَيْنِ وَمِنَ الْمَعْزِ اثْنَيْنِ قُلْ آلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ الأُنثَيَيْنِ أَمَّا اشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ الأُنثَيَيْنِ﴾الأنعام/١٤٤.

جا پەروەردگار رەددی بۆچوونو تەشریع دانانەکەی دانەوەو فەرمووی: ﴿مَا جَعَلَ اللّهُ مِن بَحِيرَةٍ وَلاَ سَآئِبَةٍ وَلاَ وَصِيلَةٍ وَلاَ حَامٍ وَلَـكِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ يَفْتَرُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ﴾المائدة/١٠٣.

﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: هەواڵم پێ بدەن دەربارەی ئەو رزقو رۆزییە حەڵاڵەی خودا بۆی ناردوونە خوارێ بۆ ئەوەی سوودی لێ ببینن، کەچی ئێوە بەشبەشتان کردووەو دەڵێن: ئەم بەشە حەڵاڵو ئەو بەشەی حەرامە، هەواڵم پێ بدەن: ﴿آللّهُ أَذِنَ لَكُمْ﴾ ئایا خودا ئیزنی داون کە هەندێك لەو رزقو رۆزیو ئازەڵانە حەرام بکەنو هەندێکی حەڵاڵ بکەن؟ ئێوە ئەو تەشریعو یاسایە بەئیزنو رەزامەندی خودا دادەنێن؟ ﴿أَمْ عَلَى اللّهِ تَفْتَرُونَ﴾ یان ئێوە درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستنو پێتان وایە: ئەوەی حەرامی دەکەن حەرامەو ئەوەی حەڵاڵی دەکەن حەڵاڵە؟؟

بەکورتی چارتان ناچارە دەبێ دان بەیەکێك لەم دوو لایەنەدا بنێن یان دەبێ بڵێن: خودا ئیزنی داوین بەتەحریم کردنو تەحلیل کردن، ئەوەش سەردەکێشێ بۆ ئەوە ئیعتیراف بەنیگاو سروش بکەن لەکاتێکدا ئێوە ئینکاری پێغەمبەرایەتیو سروش دەکەنو پێتان وایە: محاڵە خودا سروش بۆ ئادەمیزادێك بکا. جا ئەگەر ئینکاری ئەمە بکەن دەبێ دان بەوەدا بنێن کە درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن.

ئەمجار کە پەروەردگار تاوانی درۆهەڵبەستنی لەسەر تۆمار کردن، بەشوێن ئەوەدا هەڕەشەی توندیان ئاراستە دەکاو ئاماژە بۆ ئەوەش دەکا کە ئەوان ڕۆژی قیامەت سزایان توندو عیقابیان سامناکە! دەفەرموێ: ﴿وَمَا ظَنُّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ؟﴾ ئەوانە کە درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن دەبێ گومانیان چۆن بێ؟ دەبێ بەخەیاڵی خۆیان ڕۆژی قیامەت بەچ شێوەیەك هەڵسو کەوتیان لەگەڵ بکرێ؟ ئایا پێیان وایە: ئەوان ئاوا بەبێ سزاو عیقاب لەسەر تاوانی درۆهەڵبەستن لەسەر خودا ڕزگاریان دەبێ؟ ئایا وا دەزانن: خودا لەسەر ئەو تاوانە گەورەیە سزایان نادا؟!

بێگومان ئەمە هەڕەشەیەکی گەورەو سامناکە، چونکە ئاوا بەشێوەی پرسیارئامێز هەڕەشەکە ئاراستە دەکاو جۆری سزاکەش بەنادیاری رادەنوێنێ

دەبێ ئەو بوختانکەرانە ڕۆژی قیامەت حاڵیان چۆن بێو بەتەما چی بن، دەبێ بەخەیاڵی خۆیان چییان لەگەڵ بکرێ؟؟

یان دەبێ وا بزانن: کە تکاکاریان هەنو تکایان بۆ دەکەنو لەو سزا گەورەیە ڕزگاریان دەکەن؟!

وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاء شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ﴾الشورى/٢١.

ئەوانە بوختان دەکەنو درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن دەبێ پێیان وابێ خودا رۆژی قیامەت چییان لەگەڵ دەکا؟؟!

بەراستی هەڕەشەیەکە، کێوی قایمو قوڵو شاخی گەورەو سەخت دەتوێنێتەوە، هەڕەشەیەکە، جیهان وەلەرزە دێنێ زمان لاڵ دەکاو هەستو شعوورور دەتاسێنێ، بەڵام دڵی کافر لەبەرد رەق ترەو لەشاخ سەخت ترە!!

﴿إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ﴾ بێگومان خودا خاوەنی فەضلو بەخششی زۆرو زەبەندەیە بەسەر ئادەمیزاداندا؛ نیعمەتی عەقڵو ئاوەزی پێ بەخشیون، نیگای بۆ پێغەمبەر کردوە پێیان رابگەیەنێ، حەڵاڵو حەرامی بۆ دیاری کردون، یاسای ژیانی بۆ داناون، بەفەضلو رەحمەتی خۆی رزقو رۆژی بەسەردا رشتون، سوود لێ بینینی بۆ حەڵاڵ کردون، مافی حەڵاڵکردنو حەرام کردنی تایبەتە کردوە بەخۆیەوە، بۆ ئەوەی کەسانی هەلپەرست نەیقۆزنەوە، وەکوو مالەو قەشەکان: کە بەئارەزۆو هەوەسی خۆیان شتیان حەرامو حەڵاڵ دەکرد، خۆیان دەکردە هاوەڵی خودا!!

پەروەردگار لەو رزقو رۆژییەی پێی بەخشیونو بۆی باراندون زوربەی زۆری بۆ حەڵاڵ کردون، ئەوەی لێی قەدەغە کردون زیانی دونیاو قیامەتی تێدایە بۆیان بۆیە لێی حەرام کردون.

﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لا يَشْكُرُونَ﴾ وەلێ زوربەی زۆری ئەو خەڵکە سوپاسی ئەم نیعمەتانەی خودا ناکەن، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ﴾سبأ/١٣. شوێن پەیامی خودا ناکەون، بەڵکوو ئەو رزقو رۆژیو نیعمەتانەی خودا پێی بەخشیون لەخۆیانی حەرام دەکەن، رێبازی فراوان لەخۆیان تەسکو تەنگ دەکەنەوە، خودا بەفەضلو رەحمەتی خۆی رزقو رۆژی بەسەردا رشتوون کەچی ئەمان لەجیاتی سوپاس هاتوون هەندێکیان لەخۆیان حەرام کردوە، هەندێکیان بەحەڵاڵی هێشتۆتەوە؛

ئـەم حـەڵاڵکردنو حەرامکردنـە تـاوانێکی گـەلێك گەورەیـەو هاوەڵدانانـە بـۆ خـودا، موشـریکەکان بۆخۆیانیـان کـردوە بەشـەریعەتو یاسـا، خـاوەن نامـەکانیش خستویانەتە نـاو ئـایینی خۆیانـەوە بـەناوی ئایینـەوە بـەناو پـەیڕەوکارانی ئـایینـدا بلاویـان کـردەوە، بـڕێ جـار هەنـدێ موسـوڵمانیش کەوتوونـە ئـەم هەڵـە گـەورەوە، بـەناوی زوهـدو دونیـا نەویـستییەوە رزقو رۆزی پـاكو خاوێنیـان لـەخۆیان حـەرام کـردوە، یـان بەپێـچەوانەوە زێـدە رەوی دەکـەن لـەخواردنو خواردنـەوەو پۆشـینو رازاندنەوەدا، پێچەوانەی مەنهەجو پرۆگرامی ئایینی ئیسلام هەڵسو کەوت دەکەن، گوێ نادەنە میانەڕەوی ئیسلامیو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی نابن!!

ئایینی ئیسلام لەهەموو بوارێکی ژیاندا فەرمانی بەمیانەڕەوی کردوە لەهیچ شتێکدا زێدەڕەوی بەلاوە پەسەند نیە، وەکوو لەشوێنێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَلاَ تَجْعَـلْ يَـدَكَ مَغْلُولَـةً إِلَـى عُنُقِـكَ وَلاَ تَبْـسُطْهَا كُـلَّ الْبَـسْطِ فَتَقْعُـدَ مَلُومـاً مَّحْسُوراً﴾الأسراء/٢٩. یان دەفـەرموێ: ﴿لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا مَا آتَاهَا﴾الطلاق/٧.

ئیمامی ئەحمەد لەئەبولئەحوەصەوە ئەویش لەباوکییەوە، دەگێڕێتەوە دەڵێ: (هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پۆشاکەکەم شڕو پیسو پۆخـەڵ بـوو، پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: ئەرێ ئەتۆ ماڵو سامانت هەس؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: چ ماڵێکت هەیـە؟ عەرزم کرد لەهەموو ماڵو سامانێك هەمە؛ وشتر، کۆیلـە، ئەسـپو مـەڕو بـزنو گـاو مانگـا، ئـەمجار فـەرمووی: کـە خـودا مـاڵێکی پـێ بەخـشی پێـی خۆشـە ئـاثـاری نیعمەتەکانی بەسەرتەوە ببینرێن..).

ئیمامی بوخاریو طەبەرانی لەزهەیری کوڕی ئـەبو عەلقەمـەوە بەمـەرفوعی فەرموودەیەکیان ریوایەت کردوە دەفەرموێ: (هەرکاتێ خـودا مـاڵێکی پـێ بەخـشی، بـا نیـشانەی ئـەو سـامانداریيە بەسـەرتەوە ببینـرێ، چـونکە خـودا پێـی خۆشـە

نیعمەتەکانی بەسەر بەندەکانییەوە ببینرێن، شرو شۆڕیو شپرێویو روتیو رەجاڵی پێ ناخۆشە، خۆ بەشپرێو پیشاندانی پێ ناخۆشە.)

## زانستو زانیاری خودا هەموو کاروبارو هەڵسوکەوتی ئادەمیزادانی لەخۆگرتوە، ئاگای لەهەموو بوونەوەرە

﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُواْ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٦١﴾ ﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوودا باسی زۆری فەضلو رەحمەتی خۆی کرد بەسەر بەندەکانیدا، ئەوەی راگەیاند: کە پێویستە هەموویان بەلێبڕانو دڵسۆزییەوە سوپاسی خودا بکەن، بەردەوام بن لەسەر طاعەتکردنی پەروەردگارو وازهێنان لەسەرپێچی فەرمانەکانی، ئەوەشی راگەیاند: کە کەمێك لەبەندەکانی شوکری خودا ئەنجام دەدەن!

بەشوێن ئەوەدا وەبیری بەندەکانی دەهێنێتەوە: کە زانیاری خودا هەموو کارو کردەوەو هەڵسو کەوتێکی ئەوانی بەپچووکو گەورەوە بەنهێنیو ئاشکرایانەوە، لەخۆگرتووە، بەڵکوو ئاگاداری هەموو وردو درشتی بوونەوەرە لەئاسمانەکانو زەویدا، بۆ ئەوەی هەڵیان بنێ بۆ سوپاسکردنو بەندایەتی کردن بۆ خوداو وازهێنان لەسەرپێچیکردنی فەرمانەکانی، دەی با بۆ خۆیان دادگایی خۆیان بکەنو کردارو گوفتاری خۆیان هەڵبسەنگێننو رێبازی بەختەوەریی بگرنە بەر.





دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەوەی رودەدا لەکاروباری خۆت تایبەتی بێ یان گشتی بێ، پەیوەندی بەخودی خۆتەوە هەبێ، یان پەیوەندی بەبانگەوازیو بەرژەوەندی پەیڕەوانی ڕێبازی ئیسلامو کاروباری گشتییەوە هەبێ، موژدەو وادەپێدان بێ، یان ترساندنو هەڕەشە کردن بێ، کردار بێ یان گوفتار بێ!

﴿وَمَا تَتْلُوا مِنْهُ مِنْ قُرْآنٍ﴾ هەروەها ئەوەی دەیخوێنیەوە بۆ ئەنجامدانی ئەو شتە گرنگە لەو قورئانەی نێردراوەتە سەرت بۆ پەیڕەوی کردنو ڕاگەیاندنو بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی بەناو مەردومدا ئێمە ئاگامان لییەو پێی دەزانین.

کە پەروەردگار وشەی (شأن)ی لێرەدا بەکار هێناوە، ئاماژەیە بەوە: کە هەموو کاروبارێکی پێغەمبەر ﷺ هەموو هەڵسو کەوتێکی گرنگەو بایەخدارە، چونکە پێشەواو ڕابەرو مامۆستایە، هەموو شتێکی سەرمەشقە بۆ موسوڵمانان.

ئەمجار دوای خیطاب لەگەڵ پێغەمبەر دەگوێزێتەوە بۆ خیطاب لەگەڵ ئوممەتەکەی بەگشتیو دەفەرموێ: ﴿وَلا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلاَّ كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُوداً إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ﴾ ئێوە ئەی ئادەمیزادینە؛ ئەی ئوممەتی پێغەمبەر! هیچ کردەوەیەك ئەنجام نادەن گەورە بێ یان بچووك بێ، خێر بێ یان شەڕ، شوکرو سوپاس بێ یان سپڵەییو کوفرانی نیعمەت بێ، هەرچەندە بچووکو بێ بایەخیش بێ، ئیللا ئێمە چاودێریو شاهیدین بەسەرتانەوە ئاگامان لییەو چۆنی ئەنجام دەدەنو مەبەستتان لەئەنجامدانیدا چیە، لەسەرتانی دەنووسینو سزاو پاداشتانی لەسەر دەدەینەوە. ﴿وَمَا يَعْزُبُ عَنْ رَبِّكَ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلا فِي السَّمَاءِ﴾ هیچ شتێك لەژێر زانستی خودا دەرناچێ تەنانەت ئەگەر بەئەندازەی گەردیلەیەکیش بێ لەزەوییو ئاسماندا یان بچووکتر بێ، خودا پێی دەزانێو ئاگای لێیە. ﴿وَلا أَصْغَرَ مِنْ ذَلِكَ وَلا أَكْبَرَ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾ هیچ شتێك لەژێر تیشکی زانیاری خودا دەرناچێ، تەنانەت ئەگەر لەگەردیلە بچوکتر یان زلتر بێ، دیار بێ یان نادیار بێ، لەعالەمی باڵا بێ،

یــان لەعالــەمی ســوفلا بــێ، ببینــدرێ یــان نەبینــدرێ، ئــیلا لای پــەروەردگار سەرژمێرکراونو ئەندازەو چۆنیەتیو چەندایەتیان نمایانـەو لەدەفتـەری تایبـەتی خۆیدا تۆمار کراون؛ لە لەوحولمەحفوظدا چەسپێندراون!

مثقـالـە ذەرە: پـچوکترین قەبارەیـە : کـە نموونــەی پــێ دەهێنرێتــەوە بـۆ پچووکی، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا أَصْغَرَ مِنْ ذَٰلِكَ﴾ ئاماژەیە: بـۆ ئـەو بەشانەی کە گەردیلەیان لێ پێك دێ وەکوو (ئەلەکترۆن، پرۆتۆن، نـیترۆن). بەمـەش ئامـاژە دەکا بۆ بنەمای کەرتبوونی گەردیلەو هەبوونو دەرخستنی پارچەکانی!

کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا أَكْبَرَ﴾ ئاماژە دەکا: بۆ گەورەترین قەبارەی بوونەوەر کە عەرشی پەروەردگارە.

بەکورتی زانیاری خودا هەموو شتێك دەگرێتەوە، هەر لەذەرە تـاکو مەجـەرە، بـەڵکوو لەگەردیلـەش پـچوکترو بـێ نمـوود تـر: کـە ئەلـەکترۆن، یـان پرۆتـۆن، یـان نیوترۆنــە، هــەروەها لەمەجــەرەش زەبــەلاحترو گــەورەترین شــت عەرشــی پەروەردگارەو گەورەترین دروستکراوە، چۆنیەتیو چـەندایيەتیان لای خـودا رونو ئاشـکرایە. بەراسـتی ئـەم ئایاتـە بەڵگەیـەکی بـەهێزە لەسـەر سەرئاسـایی زانـستی قورئـان، ئـەوەتا پـێش چـوارده سـەدە زیـاترە ئامـاژەی بـۆ پـچوکترین شـتی هـەبوو لەبوونـەوەردا کـردوە، ئامـاژەی بـۆ شـتی پـچوکی وا کـردوە: کـە بەچـاوی عـادەتی نابیندرێ، بەڵکوو پێویستە بۆ ئەوەی چاو قـەبارەی ببینـێ دەبـێ سـەدان جـار، یـان هەزاران جار هێندەی خۆی گەورە بکرێو بەزەرەبینو ئـامێری گەورەکـەر ببینـرێ. بۆ نموونە پارچەی زەرەو ڤـایرۆس ئەگـەر سـەدانو هـەزاران جـار هێنـدەی خۆیـان گەورە نەکرێن چاو نایانبینێ.

هـەروەکوو چـۆن قـەبارەی گـەورە گـەورەی وا هـەن زۆر لـەزەویو ئاسمـان زەبەلاحترن، ئەستێرەی زەبەلاحی وا هەیە بەملیونەها جار لـەمانگـو خـۆرو زەوی گەورەترە. لەبەر دوورییان لەئێمە نایان بیـنین. عەرشـی پـەروەردگاریش لەهـەموو

دروستکراوان گەورەترە، دەی زانیاری پەروەردگار هەموو بوونەوەری لەخۆگرتووە لەپچووکترین شتەوە تا گەورەترین شت لەبەر تیشکی زانیاری ئەودا ئاشکراو عەیانە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾الأنعام/٥٩.

## خۆشەویستانی خوداو رەوشتو پاداشیان

﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار ئەوەی راگەیاند: کە زانیاری خۆی هەموو کارو کردەوەی بەندەکانیو هەموو بوونەوەری لەخۆ گرتووە، بۆ ئەوەی هەڵیان بنێ لەسەر بەندایەتیکرنو سوپاسگوزاریی، ئەمجار حاڵو وەزعی سوپاسگوزارانو لەخودا ترسان دیاری دەکاو پاداشی باشیان لەقیامەتدا رادەگەیەنیو دەفەرموێ: ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللّهِ لا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ ئاگادار ببنەوە: کە خۆشەویستانی خودا؛ ئەوانەی بەندایەتیکردنو تاعەت هەر بۆ خودا ئەنجام دەدەن، خوداش رێزو نرخیان دەداتێ، ئەوانەی بەدڵسۆزیی بەندایەتی بۆ خودا دەکەنو تەوەکوولیان هەر لەسەر خودایە، هاوەڵی بۆ دانانێن، پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی دەبن، بەهوو لەرێبازی خودا لانادەن! ئەوانە خۆشەویستو وەلی خودان، ئیمانی راستو تەقوایان

هەیە، ئەوانە لەجیهاندا جگە لەخودا لەهیچ شتێك ناترسن، باکیان لەهیچ ناخۆشیو تەنگو چەڵەمەیەك نیە، ترسیان لەقوتابیانی شەیتانو ملهوڕان نیە. هەر لەخودا دەترسن، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾آل‌عمران/١٧٥.

هەروەها لەقیامەتیشدا ترسیان لەسەر نیە، ئەوەی کافرو لەخودا یاخی بووەکان ترسیان لێیەتی ئەوان لێی ناترسێن، لەقۆناغو وێستگاکانی قیامەت باکیان نیە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَا يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الْأَكْبَرُ﴾الأنبياء/١٠٣.

﴿وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ هەروەها لەدونیادا خەمو خەفەتی لەکیس چوونی شتێکیان نیە بەهیوای بووبن، یان ناخۆشییەکیان پێ بگا، یان خۆشەویستێکیان لەدەسدا بێ، چونکە ئەوان بڕوایان بەقەزاو قەدەر هەیە، هەوڵی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا دەدەن، هەروەها لەقیامەتدا غەمو پەژارەیان نیە.

بۆ بترسن؟ بۆچی غەمو پەژارە دایانگرێ؟ ئەوان پەیوەندییان بەخوداوە هەیە، چونکە خۆشەویستی ئەون!

بۆ خەفەتیان هەبێ؟ لەچی بترسن؟ لەکاتێکدا ئەوان مزگێنیان پێدراوە لەدونیاو قیامەتدا خودا وادەی پێ داون، وادەی خوداش حەقو بەجێیەو گۆڕانکاری تێدا ناکرێ.

جا وەکوو پێناسە کردنێکی وەلیو ناساندنی فەمووی: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾ خۆشەویستانی خودا ئەو کەسانەن: کە بڕوایان هێناوەو تەقواکار بوون. بڕوایان بەتاکو تەنهایی خوداو پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرانو هاتنی ڕۆژی قیامەت هێناوە، خۆیان لەهەموو سەرپێچییەك پاراستووە، هەر شتێك خودا پێی ناخۆشبێ خۆیان لێ پاراستووە، ئیمانی ڕاستو تەقوای تەواویان تێدا کۆبۆتەوە، بەگوێرەی دابو نەریتی باوی خودا هەڵسو کەوت دەکەن، هەوڵ دەدەن هۆکارەکانی

تەندروستیو بەتوانایییو بەرگریو ئازادیو سەرکەوتن دەستەبەر بکەن، ئەرگی سەرشانی خۆیان ئەنجام دەدەن، فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپەیان لێ بۆتە خویەکی سروشتیو بەگوێرەی توانا ئەنجامی دەدەن! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەربارەی خۆشەویستانی خۆی دەفەرموێ: ﴿وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ، الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ﴾الحج/٤٠/٤١.

ئەوانە: کە ئەوە رەوشتو کرداریانە ﴿لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ﴾ لەدونیادا مزگێنی سەرکەوتنو ئاکام باشییان پێ دراوە لەهەموو کاروبارێکیاندا. خودا مزگێنی داونێ کە دەیانکاتە جێگری خۆیو خاوەنیەتیی زەوییان پێ دەبەخشێ بەمەرجێ پابەندی شەریعەتی خودا بنو بەگوێرەی سونەتو دابو نەرێتی خودا لەبوونەوەردا هەڵسو کەوت بکەن! یارمەتی ئایینی خودا بدەن، هەوڵ بدەن ئاڵای ئیسلام شەکاوەبێ. ئەی ئەوەنیە لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ﴾النور/٥٥. بەشێك لەمزگێنی دونیایان بینینی خەونی راستە، پێغەمبەر ﷺ: کە لێیان پرسی: ﴿لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ﴾ چیە؟ فەرمووی: (هي الرؤيا الصالحة، يراها المسلم أو ترى له) مزگێنییەکە: بریتییە لەخەونی راست، موسوڵمان دەیبینێ، یان پێیەوە دەبینرێ.

هەروەها بەشێك لەمزگێنی دونیایان مژدە پێدانیانە لەلایەن فریشتەکانەوە لەکاتی گیانکێشاندا. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَآئِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلَامٌ عَلَيْكُمُ﴾النحل/٣٢.

هەروەها مزگێنییان لەژیانی قیامەتدا بەوە پێ دەدرێ: کە ئاکام باشو پاداش چاکن، ئەوابو لەززەتو مانەوەی هەتا هەتاییان لەبەهەشتدا بۆ دەستەبەر

دەبێ؛ وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَانٍ وَجَنَّاتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ﴾التوبة/٢١.

فریشتە تووشیان دەبن‌و مژدەی بەهەشتیان دەدەنێ وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ، نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ، نُزُلاً مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ﴾فصلت/٣٠/٣١/٣٢.

پەروەردگار وادە راستو دروستە ﴿لا تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللّهِ﴾ گۆڕانو خیلاف وادەیی لەوادەو بەڵێنی خودادا نیە. کە موژدەی بەهەشتی بەموسوڵمانان داوە وادەی خۆی بەجێ دێنی‌و گۆڕان لەوادەو بەڵێنی‌دا نیە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ﴾ق/٢٩.

﴿ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ ئەوەی باس کرا لەموژدە پێدانو وادە پێدانی خۆشبەختی‌و کامەڕانی لەدونیاو قیامەتدا بەمرازگەییشتنێکی گەورەو فرە مەزنە، خۆشی لەوە گەورە تر نیە؟!.

**تێبینی :**

ئەم ئایەتە پیرۆزانە بەشێوەیەکی راستو رەوان پێناسەی وەلی‌و خۆشەویستانی خودایان بۆ کردین، تێیان گەیاندین کە (ئەولیاء)ەکانی خودا ئەوانەن بڕوای تەواویان هەیەو تەقواکارن؛ خۆیان لەسەرپێچی کردنی فەرمانەکانی ئایین دەپارێزن.

سەعیدی کوڕی جوبەیر دەفەرموێ:: پرسیار لەپێغەمبەر کرا وەلی‌و خۆشەویستانی خودا کێن‌و چ کەسن؟ پێغەمبەر ﷺ وەڵامدا فەرمووی: (الذین

یـذکرون الـلە بـرؤیتهم) خۆشەویـستانی خـودا ئەوانـەن کـە بەچـاوپێکەوتنیان خوداتان بیر بکەوێتەوە..

عومەری کوڕی خەتتاب دەفەرموێ: لەپێغەمبەری خودام ژنەوت دەیفەرموو: (ان من عباد الله ماهم بأنبیـاء ولا شهداء، تغـبطهم الأنبیـاء والـشهداء یـوم القیامـة لمکانهم مـن الـله تعـالی) لەناوبەنـدەکانی خـودادا کەسـانێك هـەن، نەپێغەمبـەرن‌و نەشەهیدن، کەچی لەبەر پلەو پایەیان لای خودا پێغەمبەران‌و شەهیدان خۆزگەیان پێ دەخوازن. عەرزی پێغەمبەریان کرد وتیان: ئەی رەوانەکراوی خودا! پێمان بڵێ: ئـەوان کـێن‌و کردەوەکانیـان چـیە بـەڵکوو خۆشمـان بـوێن‌و وەکـوو ئـەوان بکـەین؟ فەرمووی: (هم قوم تحابوا في الله علی غیر أرحام بینهم ولا أموال یتعـاطون بها فـو الـله، ان وجـوههم لنـور، وانهـم علـی منـابر مـن نـور، لایخافون اذا خـاف النـاس ولا یحزنون اذا حزن الناس، ثم قـرأ: ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِیَاء اللّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَیْهِمْ وَلاَ هُمْ یَحْزَنُونَ﴾ ئەوانە کەسانێکن لەبەرخاتری خودا یەکتریان خۆش دەوێ، نەك لەبەر خزمایەتی‌و بەرژەوەنـدی مـادی یـەکتریان خـۆش بـوێ، بـەڵکوو بـۆ رەزامەنـدی خـودا یـەکتریان خۆش دەوێ. سوێندم بەخودا ئەوانە دەمو چاویان لەنوورە، لەسەر مینبەرو کورسی نوورانی دادەنیشن، ئەو کاتەی خەڵك ترسیان هەیە ئەوان ناترسن، کە خەڵك غەم‌و پەژارەیان هەیە ئەوان بێ خەمن، ئەمجار ئایەتی ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِیَاء اللّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَـیْهِمْ وَلاَ هُمْ یَحْزَنُونَ﴾ی خوێندەوە.

## عیززەت‌و خاوەنیەتی راستی هەر بۆ خودایە، هەر خودا شەوو رۆژ بەدی دێنێ

﴿وَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡۘ إِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًاۚ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٦٥ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ

وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن
دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ هُمۡ
إِلَّا يَخۡرُصُونَ ﴿٦٦﴾ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ
لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ﴿٦٧﴾

**پاش ئەوەی پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوودا جۆرەها شوبهەی موشریکەکانی رانواندنو یەکە یەکە رەتی کردنەوە، ئەمجار لێرەدا باسی ئەوە دەکا: کە ئەو موشریکانە رێبازێکی تریان گرتووە؛ ئەویش رێبازی هەڕەشەو هاشو هوش کردنە، هەڕەشەی ئەوە دەکەن: کە ئەوان خاوەنی دەسەڵاتو داراییـنو دەتوانن زیانت پێ بگەیەنن!! ئیتر پەروەردگار وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَلا يَحْزُنْكَ قَوْلُهُمْ﴾ با قسەو هەڕەشەو هاشو هۆشی ئەوان تۆ غەمناك نەکا، گوێ مەدەرە ئەو قسەو قسەلۆکانەیان: کە دەڵێن: تۆ پێغەمبەر نی، بەدرۆت دەخەنەوە، هەڕەشەت لێ دەکەن بەوە کە ئەوان خاوەن ماڵو دارایىو دەسەڵاتن، هیچ باکت لێیان نەبێ، پشت بەخودا ببەستەو تەوەکولت لەسەر ئەوبێ، ﴿إِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعاً﴾ چونکە هەموو هێزو توانایەکی راستیو سەرکەوتنو دەسەڵات بۆ خودایەو بەس، کەسی تر دارایی هێزو توانا نیە، هەر خودا خاوەنی دەسەڵاتە، سەرکەوتن دەدا بەکەسانێك بیەوێ بیانداتێ، هەر بەویستی خۆیشی سەرکەوتنو ماڵو دارایی لەکەسێکی تر دەگرێتەوە، سەرکەوتنو زاڵبوون بەزۆری ژمارە نیە، بەڵکوو زۆر جار تاقمی کەم (بەڵام پشت بەستوو بەخودا) بەسەر تاقمو کۆمەڵی زۆری کافرو خوانەناساندا زاڵ**

دەکا، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّهِ﴾ البقرة/٢٤٩.

که لەئایەتێکی تردا عیززەتو دەسەڵات بۆ پێغەمبەرو موسوڵمانان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾المنافقون/٨. ئەوە لەراستیدا عیززەتو دەسەڵاتە کە هەر هی خودایە بەحەقیقی، بۆ پێغەمبەرو موسوڵمانان مەجازە!!

﴿هُوَ السَّمِيعُ﴾ پەروەردگار شنەوایە بۆ قسەو وتەی بەندەکانی، کە بەشێك لەو قسانەیان بەدرۆ خستنەوەی حەقو پێغەمبەرایەتییەو هاوەڵدانانە بۆ خودا، ﴿الْعَلِيمُ﴾ زاناو ئاگادارە بەحاڵو چۆنیەتی بەندەکانیو ئاگادارە بەو هەڵسو کەوتو کردەوانەی دەیکەن؛ لەئەزیەتدانو فرتو فێڵ کردن، سزاو تۆڵەیان لێدەستێنێ، هیچ گرنگی مەدە بەفرتو فێڵیان.. لەمەشدا دڵدانەوەی پێغەمبەری تێدایە لەسەر ئەو ئەزیەتو تەنگ پێ هەڵچنینەی لەنەتەوەکەیەوە تووشی دەهات. لەهەمان کاتدا مژدەی سەرکەوتنو زاڵبوونی پێغەمبەرو موسوڵمانانی تێدایە بەسەر کافرەکاندا.

ئەمجار پەروەردگار جەخت لەسەر خاوەنیەتیو دەسەڵاتداری خۆی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَلا إِنَّ لِلّهِ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الأَرْضِ﴾ ئاگاداربینەوە هەر بۆ خودایە چی لەئاسمانەکانو زەویدا هەیە، هەموویان بەندەو ملکی خودان، کەسی تر خاوەنیەتی راستەقینەی نیە، دەی کەوابێ چۆن ئەو بتو صەنەمانە بەخودا حسێب دەکرێن؟ لەکاتێکدا ئەوان بۆخۆیان ملکی عیبادەتکەرەکانن، هەر بتێك لەو بتانە ملکی یەکێکە!

﴿وَمَا يَتَّبِعُ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللّهِ شُرَكَاءَ﴾ ئەو موشریکانە لەحەقیقەتو راستیدا عیبادەت بۆ هاوەڵی خودا ناکەن، چونکە خودا شەریکی حەقیقی نیە، ئەو بتو صەنەمانەی: کە ئەو نەفامانە بەهاوەڵی خودایان دەزانن هیچیان پێ ناکری،

هیچ دەسەڵاتێکیان نیە، بەڵکوو ئەوانە ناتوانن زیان لەخۆیان دوور بخەنەوە، دارایی ئەومیان نیە سوود بەخودی خۆیان بگەیەنن.

﴿إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَخْرُصُونَ﴾ ئەو نەفامانە لەحەقیقەتدا جگە لەشکو گومان شوێن هیچی تر نەکەوتوون. هەر بەخەیاڵو گومان لافی ئەوە لێ دەدەن: کە ئەو بتانە خۆشەویستی خودانو تکاکارن بۆیان لای خودا، ئەوانە پێیان وایە: پەروەردگار (جل جلاله) وەکوو پاشا ملهوڕەکانی دونیا وەهایە، بەبێ واسیتەو ناوەندو تکاکارو وەزیرو دەستو پێوەند نەبێ، کەس نایگاتێ، ئەوان لەم بۆچوونەدا شوێن گومانی پووچو چەواشە کەوتوون، کەوتوونە هەڵەیەکی گەورەوە.

ئەوانە لەشوێنکەوتنی گومانەکەیاندا درۆزنو گۆترەکارن، لەخۆیانەوە، بەبێ بەڵگەی زانستی تەخمین دەکەنو لەخۆیانەوە دەیڵێنو شت هەڵدەبەستن.

پەروەردگار بەم ئایەتانە جەخت لەسەر ئەو حەقیقەتە دەکاتەوە. کە نەفریشتەو نەمەسیحو نەغەیری ئەوانیش، بەکەڵکی خودایەتی نایەنو رایەی ئەومیان ناکەوێ پلەو پایەی خودایەتییان بدرێتێ! تەنانەت بەکەڵکی ئەوە نایەن بکرێن بەواسیتەو ناوەندو تکاکارو کاریگەر لەئیشو کاری خودادا، چونکە خودا بێ باکو بێ ئاتاجە، پێویستی بەکەس نیە، وەکوو کاربەدەستو ملهوڕەکانی ئادەمیزاد نیە؛ دەستو پێوەندو وەزیرو پیاوانی دەرباریان کاریان تێبکەنو بەهۆی ئەوان نەبێ ئیشو کاریان بۆ هەڵنەسوڕێ. بەڵکوو هەرچی لەئاسمانەکانو زەویدا هەیە بەندەو ملکی خودان وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْداً﴾مریم/٩٣.

ئەمجار پەروەردگار بەڵگە لەسەر ئەوە دەهێنێتەوە کە هەموو عیززەتو شانو شکۆمەندییەك هەر بۆ خودایەو، هیچ کەسی تر هیچ رۆڵێکی نیە لەبارەی خەڵقو تەقدیرو بەڕێوە بردنو هەڵسوڕانو کارلێکردنو ئەو جۆرە شتانەی کە تایبەتی خودایەتین؛ دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ

مُبْصِراً﴾ ئەو خودایەکی وەهایە، بەبێ یارمەتیدەرو تکاکار، کاتی ئێوەی دابەش کردوە، بەشێك لەکاتی ئێوەی کردوە بەشەوو تاریکی داهێناوە؛ بۆ ئەوەی ئارامی تێدا بگرن، دوای ماندوبوونو هەوڵدان بۆ دەستەبەرکردنی پێویستیاتی ژیان تێیدا بحەسێنەوە، بەشێکیشی کردوە بەرۆژی روناکو شتی تێدا دەبینن، بۆ ئەوەی لەم کاتەدا بەناو زەویدا بلاو ببنەوە، کاروباری خۆتان ئەنجام بدەن، کارو کاسبی تێدا رەدام بێنن، شوکرو سوپاسی خودای پەروەردگاری تێدا بکەن!

وەکوو لەشوێنێکی تردا لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتاً، وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاساً، وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشاً﴾النبأ/٩- ١٠ – ١١. یان دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً لِتَبْتَغُواْ فَضْلاً مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُواْ عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ﴾الأسراء/١٢.

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾ بێگومان لەم گۆڕانی شەوو رۆژەدا: کە بەو شێوە ئاڵو گۆڕیان پێ دەکەینو، حاڵو چۆنیەتی زیندەوەران لەشەوو رۆژداو، دیاردەو هەڵسو کەوتیان لەو دوو کاتەدا، لەهەموو ئەمانەدا بەلگەو نیشانەی بەهێز هەن لەسەر هەبوونو بەتواناییو خاوەنیەتیو تاکو تەنهایی خودایەکی زاناو بالادەستو هەمیشە زیندو، گۆڕانی شەوو رۆژ بەلگەن لەسەر ئەوەی: کە پەرستراوی حەقو راست ئەو کەسەیە: شەوو رۆژی داهێناون جوداوازی خستۆتە نێوانیانەوە، گۆڕانی شەوو رۆژ بەلگەو نیشانەن بۆ کەسانێك ببیسنو پەندو عیبرەت وەربگرنو تێفکرن لەو بەلگەو نیشانانەی دەیانبیسن!

**نیسبەتدانی مندالْ بۆ خودا شیرکە، پەروەردگار دوروو بەرزو پیرۆزە لەوەی مندالّی هەبیّ**

﴿ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ هُوَ ٱلۡغَنِيُّۖ لَهُۥ
مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ إِنۡ عِندَكُم مِّن
سُلۡطَٰنِۭ بِهَٰذَآۚ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٦٨
قُلۡ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ
٦٩ مَتَٰعٞ فِي ٱلدُّنۡيَا ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ
ٱلۡعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ٧٠ ﴾

دوای ئەوەی خودای گەورەو مەزن لەئایەتەکانی پێشوودا هەندێ هەڵوێستو بیرو باوەڕی موشریکەکانی باس کرد، ئەوەی لێوە گێڕانەوە: کە بتو صەنەم دەکەنە تکاکارو هیوایان وایە: ئەو دارو بەردە تاشراوانە شەفاعەتیان بۆ بکەن! ئەمجار ڕەددی دانەوە بەرەددێکی موقنیعو دڵنیاکەر، ئیتر لێرەدا جۆرێکی تر لەبڕوا پووچەکانیان باس دەکا: ئەویش مندالْ ومپالْدانە بۆ خوداو دەڵێن: خودا مندالّی هەیە! ئەمەش هەموو ئەو موشریکانە دەگرێتەوە کە دەڵێن: فریشتە کچی خودانو ئەو جولەکانەی کە دەڵێن: عوزەیر کوڕی خودایەو ئەو مەسیحیانەی دەڵێن: عیسا کوڕی خودایە:

﴿قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَداً سُبْحَانَهُ﴾ موشریکەکان دەڵێنو وتوویانە فریشتەکان کچی خودان، جولەکەکان دەڵێنو وتوویانە: عوزەیر کوڕی خودایە، مەسیحیەکانیش پێیان وایە عیسا کوڕی خودایە!!

خودا پاکو بەرییە لەوەی وەپاڵی دەدەن، بۆچوونەکەیان سەیرو جێگای سەرسووڕمانە، چونکە وەپاڵدانی منداڵ بۆ لای کەسێك دەبێ بگونجێ منداڵی هەبێ، دەی خۆ پەروەردگار نەلەکەس بووەو نەکەسیشی لێ بووە، نەخۆی منداڵی کەسە نەمنداڵیشی بووە!!

﴿هُوَ الْغَنِيُّ﴾ خودا بۆ خۆی بێ ئاتاجە، بۆ خۆی پێویستی بەکەس نیەو هەموو کەسێكو هەموو شتێك پێویستی بەئەو هەیە، منداڵ بۆ کەسێکە پێویستی پێ بێ، دەی خودا پێویستی بەکەس نیە.

﴿لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ هەر بۆ خودایە، چی لەئاسمانەکانو زەویدا هەیە، هەموو شتێکی بوونەوەر مڵکو بەندەی خودایە، خودا بەدیهێنەرو دروستکاری ئاسمانەکانو زەوییە، چی تێیاندا هەیە، ئەو دروستی کردون، خودا لەکەس ناچێو هیچ مەخلووقێك لەئەو ناچێ، هیچ ئاتاجی بەکەس نیەو هەموو کەس ئاتاجی بەئەو هەیە، هەرچی لەئاسمانەکانو زەویدا هەیە، هی خودایەو ئەو بەدی هێناونو ئەو خاوەنیانەو بەڕێوەیان دەبا، کەس هاوکارو هاوبەشی خودا نیە تێیاندا. دەی چۆن دەگونجێ خوداوەندێك ئەوە دەسەڵاتو زاتو صیفاتی بێ، بەو جۆرە بەدیهێنەرو ژیانبەخش بێ، پێداویستی هەموو کەس جێ بەجێ بکا، چۆن دەگونجێ دروستکراوێکی خۆی بکاتە منداڵی خۆی!؟ چۆن دەگونجێ ئاتاجی بەندەیەکی خۆی بێ!

﴿إِنْ عِنْدَكُمْ مِنْ سُلْطَانٍ بِهَذَا﴾ هیچ بەڵگەیەکتان بەدەستەوە نیە لەسەر ئەو ئیدیعاو بۆچوونەتان، هیچتان بەدەستەوە نیە، قسەو بۆچوونەکانتان بچەسپێنێ، ئەوەی کە دەیڵێن: درۆو بوختانو هەڵبەستە.

﴿أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لا تَعْلَمُونَ﴾ ئایا ئێوە لەسەر خودا شتێك دەڵێن: كە نایزانن، شتێك بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن كە هیچ حەقیقەتێكی نیە، شتێك وەپاڵ خودا دەدەن كە عەقڵ نایسەلمێنیو وەری ناگرێ!

ئەم رستەیەی بەشێوەیەكی پرسیار ئامێز هێناوە، مەبەست لەم شێوەو ئوسلووبە سەرزەنشتو تانەو تەشەرە، دەربڕینی نارەزامەندیو هەڕەشە كردنە لەبوختانكەران. ئایەتەكە ئاماژە بۆ ئەوە دەكا: كە هەر وتەیەك هەر راو بیرو بۆچوونێك بەڵگەی لەپشتەوە نەبێ، نەفامیو نەزانییە عەقیدەو بیرو باوەڕ پێویستە بەڵگەی حاشا هەڵنەگرو بەهێز پشتگیری بكەن، لاسایی كردنەوەو شوێنكەوتنی كوێرانە كارێكی هەڵەیەو نادروستە!

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێكی ترە كە دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَداً، لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئاً إِدّاً، تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدّاً، أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَنِ وَلَداً، وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَداً، إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْداً، لَقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدّاً، وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْداً﴾مريم/٨٨-٩٥.

ئادەمیزاد لەخۆیەوە قسەیەك هەڵبەستێ نیشانەی نەفامیو نەزانییە، درۆ هەڵبەستن شیاوی ئادەمیزاد نیە، جا ئەگەر قسە هەڵبەستنەكە لەسەر خودا بێو بەبێ بەڵگە بێ، ئەوە تاوانێكە لەهەموو تاوانان گەورە ترە. چونكە یەكەم پێچەوانەی ئەو رێزو پیرۆزییەیە كە پێویستە بۆ خودا دابنرێ، وەصف كردنیەتی بەصیفاتی دەسەوەسانیو بێ توانایی‌و دەست كورتی. دەی خۆ خودا لەم رەوشتانە دوورو پاكو مونەزەهە. هەروەها رێ لێ تێكچوونو گومڕاییە لەدەست نیشانكردنی پەیوەندی نێوان خوداو بەندەكانی. هەر لەروانگەی ئەم رێ لێ تێكچوونەوە تەصەوور كردنی هەر پەیوەندییەكی تری ئادەمیزادان پەیوەندییەكی گومڕایانەو سەرلێ شێواوانە دەبێ.

بۆ نموونە هەر ڕێبازو یاسایەك كاهینو فالگرەوەكان بۆ خۆیان دایانهێنابێ، هەر دەسەڵاتو صەلاحییەتیەك كە كەنیسە بۆ خۆی بەرەوای زانیو بوو بەمایەی گومڕایی ئادەمیزاد، هەمووی لەو بیرو باوەڕە پووچو بێ بناغانەوە سەری هەڵدا كە وتیان: فریشتە كچی خودان، عوزەیر كوڕی خودایە، عیسا كوڕی خودایە! هەر لەم بیرو بۆچوونە دەست هەڵبەستانەوە مەوزوعی تاوانو مەوزوعی دان پیانان (الأعتراف)و (صكوك غفران) چەكی لێ خۆشبوونو پاكبوونەوە...هتد سەری هەڵدا، هەموو ئەم زنجیرە بیرو بۆچوونە هەڵانە لەنەزانینی راستی پەیوەندی نێوان خوداو بەندەوە سەری هەڵدا.

مەسەلەكە هەر مەسەلەی سەرلێ شێواوی نیە لەبیرو باوەڕدا، بەڵكوو مەسەلەی ژیانە بەهەموو بوارەكانیەوە، هەرچی ڕویدا لەنێوان كەنیسەو زاناكاندا، هەر دژایەتیو ناكۆكییەك پەیدا بوو لەنێوان پیاوانی كەنیسەو زاناو عاقڵمەندەكاندا، ئاكامەكەی بەوە تەواو بوو، كۆمەڵگا لەدەست دەسەڵاتی كەنیسە رزگاری بوو بەمەش لەچنگ دەسەڵاتی ئایینی گۆڕدراو رزگاریان بوو، بەشێواندنی ئایینو ئەمجار بەوەلانانیو دوور خستنەوەی لەژیاندا ئەو هەموو شەڕو نەگبەتییانە هاتنە كایەوە. ئەو هەموو بەدرەوشتیو روخانی دەروونیو چەواشەیی لەبیرو باوەڕدا پەیدا بوو: كە تا ئێستاش جیهان پێیانەوە دەناڵێنێ!!!

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشەی توند لەدرۆزنو بوختانكەرەكان دەكا، هەڕەشەیان لێ دەكا بەوە: كە ئەوانەی بەدەم خوداوە درۆ هەڵدەبەستنو شتێكی وای وەپاڵ دەدەن كە ناگونجیو ناشێ وەپاڵی بدرێ سەركەوتوو نابنو دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لا يُفْلِحُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: ئەوانەی بەدەم خوداوە شت هەڵدەبەستنو هاوەڵی بۆ دادەنێن، كوڕو كچی وەپاڵ دەدەن، درۆ بەدەم خوداوە دەكەن سەركەوتوو نابن، قەت بەمراز ناگەنو لەدونیاو قیامەتدا

ئۆخەی لەگیانی خۆیان ناکەن، سەرلێشێواوو مالۆێرانو ئاکام نەگبەتن. لەسزای قیامەت رزگاریان نابێ.

﴿مَتَاعٌ فِي الدُّنْيَا﴾ ئەوانە لەدونیادا مەتاعو خۆشییەکی کەمو بێ بایەخیان هەیە، لەژیانێکی کورتو تەمەنێکی کەمدا پێوەی رادەبوێرنو لەپڕێکا دەبڕێتەوەو بەرەو سزای سەخت کێش دەکرێن، ﴿ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ﴾ پاشان گەڕانەوەیان بۆلای ئێمەیە، لەقیامەتدا زیندویان دەکەینەوەو راپێچی دەشتی مەحشەریان دەکەین، حیسابو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ ئەنجام دەدەین ﴿ثُمَّ نُذِيقُهُمُ الْعَذَابَ الشَّدِيدَ بِمَا كَانُوا يَكْفُرُونَ﴾ پاشان سزای بەئێشی دۆزەخیان پێ دەچێژین، لەناو ئاگردا جۆرەها سزای سەختیان دەدەین، بەهۆی کافربوونیانو درۆ هەڵبەستن بەدەم خوداوە، ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزو ئاشکراو روونە لەسەر خەسارەتمەندی کافرەکان، چونکە ئەو شتەی کە بەخەیاڵ پێیان وایە: لەدونیادا دەبێتە مایەی سەرکەوتنو خۆشبەختی، لەئاستی ئەو بەختەوەرییەی قیامەتیان: کە لەکیسیان چووە، ئەو خێرو بێرو نازو نیعمەتەی لەدەستیان داوە چ نرخو بەهایەکی نیە. چونکە دونیا لای خودا نرخی باڵە مێشوولەیەکی نیە.

## چیرۆکی حەزرەتی نوح ﷺ لەگەڵ نەتەوەکەدا

﴿۞ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ
كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ
تَوَكَّلۡتُ فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ
عَلَيۡكُمۡ غُمَّةٗ ثُمَّ ٱقۡضُوٓاْ إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ ٧١ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ

فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ
أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴿٧٢﴾ فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيْنَاهُ وَمَن مَّعَهُ فِي
الْفُلْكِ وَجَعَلْنَاهُمْ خَلَائِفَ وَأَغْرَقْنَا الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ۖ
فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾

لەوەپێش لەم سورەتەدا ئاماژەی بۆ بەسەرهاتو چیرۆکی گەلو نەتەوە پێشینەکان کرد، ئاکامو سەرەنجامی سەرپێچیو بەدرۆ خستنەوەیانی رون کردەوە، هەروەها ئاماژەشی بۆ ئەوە کرد: کە بۆ هەموو گەلو نەوەتەوەیەك پێغەمبەر نێردراوە، کە پێغەمبەرەکە هاتووە بۆ سەریان خودا حوکمی نێوانیانی بەعەدالەتکاری ئەنجام داوە.

ئەمجار لێرەدا سیاقی ئایەتەکان جەولەیەکی دورو رێژ لەبارەی ئەو دوو ئاماژەپێکراوانە ئەنجام دەدا، لایەنێکی چیرۆکو بەسەرهاتی حەزرەتی موسا لەگەڵ فیرعەونو تاقمەکەیدا رادەنوێنێ. تێیاندا سەرەنجامی بەدرۆخەرەوەکان دەست نیشان دەکا، بڕیاری یەزدانیی دەبارەی ئاکامی گەلو نەتەوەکان پاش هاتنی پێغەمبەرەکانیان بۆ ناویان ئاشکرا دەکا.

لەلایەکی ترەوە لەوەپێش پەروەردگار بەڵگەی جۆراو جۆری هێنانەوە لەسەر تاکو تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتیو هاتنی رۆژی قیامەتو زیندوو بوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەو پاداشو سزا. شوبهەو گومانی موشریکەکانی رەت کردەوە، سەررەقی ئەو موشریکانەی خستەڕوو.

ئـەمجار لێـرەدا بـڕێ چـیرۆکی پێغەمبـەران بـاس دەکـا، بـۆ ئـەوەی پێغەمبـەر تەسەللای بێو چاو لەپێغەمبـەرانی پێشوو بکا، ئەزیـەتو نارەحـەتی لەسـەر شـان سووك بێ، باکی لەفرتـو فێڵی موشریکەکانی عەرەب نەبێ، لەهەمان کاتدا ئـەوەش وەبیر موشـریکەکان بێنێتـەوە: کـە ئەگـەر ئـەوانیش سـوور بـن لەسـەر هەڵوێـستی خۆیـانو واز لەبەدرۆخـستنەوە نـەهێنن ئـەوە هـەمان سـەرەنجامی گەلەپێشینەکان چاوەڕوانی ئەوان دەکا. دەفەرموێ:

﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ نُوحٍ﴾ ئەی پێغەمبـەری خۆشەویـست! چیرۆکو بەسـەرهاتی نوح لەگەڵ نەتەوەکەیدا بەسەر کافرەکانی مەککەو هەموو ئەوانەدا کە سەرپێچیت دەکـەن، بخوێنـەوە، بۆیـان شـی بکـەرەوە: چـۆن خـودا بـەهیلاکی بـردنو بـەتۆفان خنکاندنیو لـەبێخی دەرهێنـان، بـۆ ئـەوەی ئـەو موشـریكو خـودا نەناسانە بترسـن لـەئاکامی خۆیـان؛ بترسـن: کـە ئەگـەر ئـەوانیش واز لەسـەر رەقـی خۆیـان نـەهێنن بەدەردی ئەوان دەچن.

ئەوەیان بۆ باس بکە ﴿إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ إِنْ كَانَ كَبُرَ عَلَيْكُمْ مَقَامِي وَتَـذْكِيرِي بِآيَاتِ اللَّهِ فَعَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْتُ﴾ کە نـوح بەنەتەوەکەی وت: ئـەی نەتەوەکەم! ئەگـەر مانەوەم لەناو ئێوەدا، ئامۆژگاری کردنم بۆتان، بانگەوازیکردنتان لەلایەن منەوە بـۆ بڕواهێنانو موسوڵمانبوون لەسەر شان قورسەو بەلاتانەوە ناخۆشە: کـە مـن ئایـاتی خوداتـان بـۆ شـی بکەمـەوە، بەڵگـەو نیـشانەی تـاكو تـەنهایی خوداتـان بـۆ رون بکەمەوە، پێتان رابگەیەنم: کە پەرستنو بەندایـەتی کردنتـان بـۆ خـودا پێویـستەو فەرزە لەسەرتان، ئەگـەر ئـەم شـتانەتان پـێ ناخۆشـەو لەسەرشـانتان قورسـە، ئـەوە بـزانن: کـە مـن بـاکم نیـە، پـشتم بـەخودا بەسـتووەو ثیقـەم لەسـەر ئـەوەو واز لەبانگەوازی خۆم ناهێنمو پەیامی پـیرۆزی خـۆم دەیـەمو پێتـان خـۆش بـێ پێتـان ناخۆش بێ من ئەرکی سەرشانی خۆم ئەنجام دەدەم!

بێ منەت بن ﴿فَأَجْمِعُوا أَمْرَكُمْ وَشُرَكَاءَكُمْ﴾ خۆتـان ئامـادە بکـەنو عـەزمتان جەزم بێ لەسەر ئەنجام دانی ئەو کارەی دەتانەوێ بیکەن بەرامبەر بەمن، خۆتـان ئەو شتانەی بـەهاوەڵی خودایـان دەزانـنو بەندایـەتییان بـۆ دەکەن بەکدیگیر بـنو چیتان لەدەس دێ بەرامبەر من ئەنجامی بـدەن! ﴿ثُمَّ لا يَكُنْ أَمْـرُكُمْ عَلَـيْكُمْ غُمَّـةً﴾ پاشان ئەوەی دەتانەوێ دەرحەق بەمن ئەنجامی بدەن با ئاشکرا بێو مەیشێرنەوە، رەپو رەوان بێ پێچو پەنا چیتان دەوێ بیخەنە ڕوو، کاری خۆتان لەگەڵ من یەکالا بکەنەوە، بەوردی پیلانی خۆتان داڕێژنو بەرەو مەبەستی خۆتان هەنگاو هەڵێنن!

﴿ثُمَّ اقْضُوا إِلَيَّ وَلا تُنْظِرُونِ﴾ جا ئەگەر پێتان وایـە ئێـوە لەسـەر حـەقن، ئـەو کارەی عەزمتان لەسەر جەزم بووە ئەنجامی بـدەن، ساتە وەختێـك پاشـی مەخـەن، هیچ مۆڵەتم مەدەن، بێ منەت بن! چونکە من چ گرنگی بـەو هەڵوێستەتان نـادەمو باکم نیەو لێتان ناترسم، ئێوە لەسەر ڕێبازی ناحـەقو مـن لەسـەر شـەقامە ڕێبـازی حەقم، هەموو کاتێکیش هەر حەقو راستی سەرکەوتووە!

بەراستی ئەم هەڵوێستەی حـەرزەتی نـوح ﷺ کەوەنـدە بتمانـەی بەپـەیامی خۆی هەبوو، ئەوەندە دڵنیا بـوو لەسـەر سـەرکەوتنو یارمەتیـدانی خـودا بـۆی دەق دەشوبهێتە هەڵوێستی حەزرەتی هود: کە بەنەتەوەکەی خۆی فـەرموو: ﴿إِنِّي أُشْـهِدُ اللَّهِ وَاشْهَدُواْ أَنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ، مِن دُونِهِ فَكِيـدُونِي جَمِيعـاً ثُـمَّ لاَ تُنظِـرُونِ، إِنِّـي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم...ألآية﴾هود/٥٤-٥٦.

ئـا بـەو شـێوە، جـوداوازی نێـوان هەڵوێـستی موسـوڵمانی بـڕوا پـۆڵایینو هەڵوێستی کـافری خودانـەناسو بـڕوا لاوازو زەبوونمـان بـۆ دەردەکـەوێ. موسـوڵمان بڕواو پتەوو پشت بەستوو بەخوداو بەرچاو روناکو بتمانە بەهێزە، کافر هەمیـشە ڕاڕاو بڕوا لاوازو بێ بتمانەیە، پشت بەشتی خەیاڵیو بـێ بناغـەو پـووچ دەبەسـتێ. رەش بینو ورە روخاوە.

بەکورتی حەزرەتی نوح بەبڕوایەکی پتەوەوە بەرنگاری نەتەوەکەی بووەوە، دوای ئەو هەموو ماوە دورو درێژە، دوای ئەو هەموو ئاگادار کردنەوەو هەڕەشە لێ کردنە دورو درێژە، دوای ئەو هەموو بەدرۆ خستنەوەی کە لەلایەن نەتەوەکەیەوە ئاڕاستەی کرا، تەحەددای هەموو نەتەوەکەی دەکاو دەفەرموێ: ئەگەر بەبانگەوازی من تەنگەتاونو پێتان ناخۆشە من لەناوتاندا بەو ئامۆژگاریتان بکەن، دەچیتان لەدەس دێ دژی من ئەنجامی بدەن، من واز لەرێبازی خۆم ناهێنمو سوورەو سوور دەبم لەسەر هەڵوێستی خۆمو پشتیوانیشم هەر خودایەو بەس، پارمەتیدانی ئەوم بەسەو حەوێجەم بەکەسی تر نیە، دە بێمنەت بنو مەهێڵن دەست بەکاربم!!

بەراستی ئەمە تەحەددایەکی سەرنج راکێشەو کەسێك تەحەددای وا دەکا هەردو دەستی پڕبن لەهێزو توانا، هەموو متمانەیەکی بەهێزو توانای خۆی هەبێ، تەنانەت تەحەدای وەها ئاڕاستەی دوژمنانی دەکا هەڵیان بنێ بۆ ئەوەی پەلاماری بدەن! دەی حەزرەتی نوح چ هێزو توانایەکی لەپشت بوو؟ لەهێزو توانی سەرزەوی چی لەگەڵ دابوو؟

بێگومان بڕوای پتەوی هەبوو، ئیمانی لەگەڵدا بوو، هێزو توانایەکی لەپشت بوو هەموو هێزو تواناکان لەبەردەمیا بەچۆك دادێن، هێزو توانایەکی لەپشت بوو هەموو هێزو توانا راواڵەتیەکان لەئاستیا پوچو بێ وەجن. ئەو خودای لەپشت بوو: کە هەرگیز ناهێڵێ خۆشەویستانی بکەونە ژێر رکێفی تاقمو کۆمەڵی شەیتان. ئەوە هەڵوێستی پیاوی پشت بەخودا بەستووە، بڕوا بەخودایە ئادەمیزاد دەگەیەنێتە ئەو ئاستەو ئاوا پەیوەست دەبێ بەسەرچاوەی هێزو تواناوە.

ئەم تەحەدداکردنە غورورو لەخۆبایی بوون نیە، زێدە رەوی و تێکڕوخان نیە، بەخۆ فەوتاندنو ئینتیحار ناژمێردرێ، بەڵکوو ئەوە تەحەدداکردنی هێزو توانای حەقیقییە بەرامبەر هێزو توانای لەرزۆکو قرچۆك، رەوشتو باوەڕی بڕوادارانە بەخوداو هەڵوێستی پشت بەخودا بەستوانە.

ئەوانەی ئەرکی بانگەوازی‌و جیهاد لەپێناو ئایینی خودادا دەخەنە سەرشانی خۆیان پێویستە ئەو پێغەمبەرانە بکەنە سەرمەشقی خۆیان، پێویستە دڵ‌و دەروونیان بەمتمانە بەخودا ئەوەندە پڕبێ سەرڕێژ بکا، پێویستە تەنها تەوەکولیان لەسەر خودا بێ‌و بەس! بەو جۆرە بەرەنگاری ملهوڕان بکەن‌و ئاوا روبەڕویان ببنەوە.

ملهوڕان جگە لەئەزیەتدانیان چیدییان پێ ناکرێ، ئەویش تاقیکردنەوەو ئیمتیحانە لەخوداوە بۆ تێکۆشەرانی ڕێبازی حەق‌و راستی، هەرگیز خودا تێکۆشەرانی ڕێبازی حەق‌و راستی ناداتە دەست دوژمنانی، بەڵکوو بەتاقییان دەکاتەوە، بۆ ئەوەی ڕێڕەوانی ڕێبازی خودا ریزەکانی خۆیان یەك بخەن‌و پتەویان بکەن‌و دڵ‌و دەروونەکانیان مشتومال بکەن‌و پاڵفتەیان بکەنەوە، خەبات‌و تێکۆشانیان بخەنەوە گەڕ!

جا پەروەردگار بەردەوامە لەسەر گێڕانەوەی چیرۆکی بەندەی راستاڵی خۆی؛ نوح پێغەمبەرو شێوەی تەحەدداکردنی بۆ ملهوڕانی سەردەمی خۆی‌و با بزانین چۆن چیرۆکەکە بەکۆتا دێ!؟

﴿فَإِنْ تَوَلَّيْتُمْ فَمَا سَأَلْتُكُمْ مِنْ أَجْرٍ﴾ ئەگەر ئێوە پشتان هەڵکردوو روتان وەرگێڕا لەپەیامی من‌و بەدرۆتان خستمەوەو بەردەوام بوون لەسەر بەدرۆخستنەوەم‌و بڕواتان بەپێغەمبەرایەتی من نەکردو پابەندی ئامۆژگارییەکانم نەبوون‌و ئایینی حەق‌و راستان وەرنەگرت، ئەوە بزانن من لەپێناو بانگەوازییەکەمدا داوای کرێ‌و شوکرو سوپاستان لێ ناکەم، بەتەمای پاداش‌و چاکە دانەوەی ئێوە نیم. ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى اللَّهِ﴾ پاداش‌و کرێی من تەنها لای خودایەو ئەو پاداشم دەداتەوە، ئەو منی کردوە بەپێغەمبەرو رەوانەی کردوم بۆ سەر ئێوە، هەر ئەویش پاداش‌و جەزای کردەوەکانم دەداتەوە، ﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ هەروەها خودا فەرمانی پێ کردوم: کە من لەتاقم‌و پێڕی موسوڵمانان

بم، گەردنکەچو فەرمانبەرداربم بۆ هەر فەرمانێك كە پێم دەكرێ، هەر شتێك پەیوەندی بەبانگەوازییەكەمەوە هەبێ بەوپەڕی لێبڕانو لێبوردووییەوە ئەنجامی دەدەم. گەردنكەچو گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگارم.

ئیسلام ئایینی هەموو پێغەمبەران بووە هەر لەیەكەم پێغەمبەرەوە تا پێغەمبەری ئاخیر زەمان: كە حەزرەتی موحەممەدە ﷺ هەموویان لەسەر ڕێو ڕەسمی ئایینی ئیسلام بوون. هەموویان لەبنەما سەرەكییەكانی ئایینی ئیسلامدا هاوبەشن، هەرچەندە لەشەریعەتو یاسا تەفصیلیەكانیاندا جوداوازییان هەبوە. وەكوو لەشوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً﴾المائدة/٤٨. بنەمای ئایینەكانیان یەكەو سەرچاوەی ئایینەكانیان یەك سەرچاوەیە.

بوخاریو موسلیمو ئەحمەدو ئەبوداود فەرموودەیەكی پێغەمبەریان ڕیوایەت كردوە: فەرموویەتی: ﴿الأنبياء أولاد علاّت﴾ واتە: ئێمەی پێغەمبەران هەموومان وەچەی چەند دایكێكینو باوكمان یەكە. ئایینو بیرو باوەڕمان یەكە: كە بریتییە لەبەندایەتیكردن بۆ پەروەردگارو یەكتاپەرستی.[1] وێڕای ئەو هەموو بانگەوازیو

---

[1] ئەوەتا حەزرەتی نوح فەرمووی: {وأمرت ان أكون من المسلمين﴾.

لەبارەی ئیبراهیمیشەوە پەروەردگار دەفەرموێ: {قال له ربه اسلم، قال أسلمت لرب العالمين. ووصى بها ابراهيم بنيه ويعقوب، يابني ان الله اصطفى لكم الدين، فلا تموتن الا وأنتم مسلمون﴾البقرة/١٣٢.

حەزرەتی یوسفیش فەرمووی: {رب قد آتيتني من الملك وعلمتني من تأويل الأحاديث، فاطر السموات والأرض انت وليي في الدنيا والآخرة، توفني مسلما والحقني بالصالحين﴾يوسف/١٠.

حەزرەتی موساش دەفەرموێ: {ياقوم ان كنتم آمنتم بالله فعليه توكلوا ان كنتم مسلمين﴾يونس/٨٤.

سیحر بازەكانیش وتیان: {ربنا افرغ علينا صبراً وتوفنا مسلمين﴾الأعراف/١٢٦.

بەڵقیسیش وتی: {رب اني ظلمت نفسي، وأسلمت مع سليمان لله رب العالمين﴾النمل/٤٤.

هەوڵو تێکۆشانەی حەزرەتی نوح، لەجیاتی ئەوەی ئیمانی پێ بهێننو پابەندی ئامۆژگارییەکانی بن، کەچی ﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ هەر سوور بوون لەسەر بەدرۆ خستنەوەی حەزرەتی نوحو گوێ پێ نەدانی پەیامەکەی. ﴿فَنَجَّيْنَاهُ وَمَنْ مَعَهُ فِي الْفُلْكِ﴾ نوحو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، لەکەشتیدا رزگارمان کردن، فەرمانمان پێ کرد گەمێ دروست بکاو هەر کاتێ تۆفان هەڵسا خۆیو بڕواداارانو لەهەموو رەگەزێك نێرو مێیەك بخاتە ناو کەشتییەکەوە، ئەویش پابەندی فەرمانی ئێمە بوو: بەکەشتی خۆیو پەریڕەوکارانیمان رزگار کردن...

﴿وَجَعَلْنَاهُمْ خَلائِفَ وَأَغْرَقْنَا الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا﴾ ئەوانەی لەتەك نوحدا لەکەشتییەکەدا رزگارمان کردن، کردمانن بەجێنشینو جێگری ئەوانەی لەناومان بردن، کردمانن بەئاوەدانکەرەوەو سەروکاری کردنی زەویو لەشوێنی لەناوچووەکان جێنشینمان کردن، سەرپێچیکارانو بەدرۆ خەرەوەکانمان خنکاندن! ﴿فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُنْذَرِينَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست بەچاوی دڵ بڕوانە، بەعەقڵ تێبفکرەو سەرنج بدە سەرەنجامی ئەو نەتەوە چۆن بوو: کە پێغەمبەرەکەیان ترساندنیو هەڕەشەی بەهاتنی عەزاب لێ کردنو ئەوان پەند ئامێز نەبوونو سوور بوون لەسەر هەڵوێستی ناراستی خۆیانو وازیان لەبەدرۆخستنەوەی پێغەمبەر نەهێنا!

---

پەروەردگار باسی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەران دەکاو دەفەرموێ: {انا انزلنا التورات فيها هدى ونور يحكم به النبيون الذين أسلموا﴾المائدة/٤٤.

دەربارەی حەوارییەکانی عیساش دەفەرموێ: {واذ أوحيت الى الحواريين: أن آمنوا بي وبرسولي، قالوا آمنا واشهد بأننا مسلمون﴾المائدة/١١١.

پێغەمبەری خۆشەویستمان دەفەرموێ: {ان صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين، لاشريك له وبذلك امرت وأنا أول المسلمين﴾الأنعام/١٦٣.

سەرنجامی هەموو گەلو نەتەوەیەکی بەدرۆخەرەوە بەو جۆرە دەبێ، ئەو گرۆهانەی لەنەتەوەی تۆش ئەی پێغەمبەر! هەڵوێستی ئاوا بنوێنن بەدەردی ئەوان دەچن.

ئەمە دابو نەریتی پەروەردگارە لەسەر زەوی، ئەمە وادەو بەڵێنی خودایە بۆ بەندەکانی، بۆ خۆشەویستانی، جا ئەگەر جارێك لەجاران لەبەر بەرژەوەندییەك کە خودا بۆخۆی دەزانێ بەجێهێنانی وادەو بەڵێنەکان دواکەوتن، ئەوە نابێ خودا پەرستان نائومێد بن، بەڵکوو پێویستە ئەوە بزانن: کە ئەوە دابو نەرێتی خودایە، دەبێ دڵنیا بن کە لەئاکامو سەرنجامدا جێنشینی هەر بۆ موسوڵمانانە، نابێ پەلە لەبەجێهێنانی وادەو بەڵێنەکان بکەن، دەبێ ئەوە بزانن: کە خودا خۆشەویستانی خۆی هەڵناخەڵەتێنیو قەت دەستەوەستان نابێ لەوەی یارمەتی خۆشەویستانی خۆی بدا، هەرگیز پەروەردگار خۆشەویستانی ناسپێرێ بەدوژمنان، بەڵکوو وەغرانی هاتنی یارمەتی خودایی بۆ تاقیکردنەوەو راهێنانو فێرکردنە!

## دابو نەریتی گەلو نەتەوەکان لەبارەی بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەران

﴿ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ بِمَا كَذَّبُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ ۚ كَذَٰلِكَ نَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار بەسەرهاتی حەزرەتی نوحی لەگەڵ نەتەوەکەیدا رونکردەوە، سەرەنجامو ئاکامی خوداپەرستان: کە سەرکەوتنو رزگار بوونە، هەروا ئاکامی سەرپێچیکاران: کە فەوتانو لەناوچوونە، دەست نیشان کرد، باسی چیرۆكو

بەسەرهاتێکی تر دەخاتە ڕو.. باسی مێژووی نەتەوەی تر لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان دەکا، ئەو نەتەوانەی کە پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستنەوە خودا سزای دانو لەناوی بردن.

جا وەکوو خودا دڵی ئەو نەتەوانەی مۆر کردوەو ئیمانیان نەهێناو پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستنەوە، دڵی کەسانی دیکەش مۆر دەکا، بۆیە پێویستە دانیشتوانی شاری مەککە پەند لەئاکامو سەرەنجامی نەتەوە پێشینەکان وەربگرنو خۆیان بپارێزن لەهۆکاری ئەو لەناوچوونو بەفتارەچوونە.

بۆیە لێرەدا بەشێوەیەکی کورتو چڕو پڕ، سیاقی ئایەتەکان ئاماژە بۆ بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرانەی دوا حەزرەتی نوح رەوانە کراون دەکاو باسی بەڵگەو موعجیزەکانیان دەکاو، بەپیرەوە چوونی بەدرۆخەرەوەکانو گومڕاکان دیاری دەکا. دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ بَعَثْنَا مِنْ بَعْدِهِ رُسُلاً إِلَى قَوْمِهِمْ فَجَاءُوهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ﴾ لەدوای نوح چەند پێغەمبەرێکی ترمان ناردن بۆ سەر نەتەوەکانیان، لەوانە: هود، صالح، ئیبراهیم، لووط، شووعەیب سەلامی خودا لەسەر پێغەمبەری ئێمەو ئەوانیش بێ، ئەم پێغەمبەرە بەڕێزانە هاتنە سەر گەلەکانیان بەبەڵگەی ئاشکراو موعجیزەی گەورە گەورەو بەڵگەو بورهانی عەقڵیو حیسسی لەسەر راستی ئەو پەیامەی پێی نێردراون، ﴿فَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا بِمَا كَذَّبُوا بِهِ مِنْ قَبْلُ﴾ هیچ گەلو نەتەوەیەك لەو گەلو نەتەوانە ئیمانیان نەهێنا بەپەیامی پێغەمبەرەکانیان لەیەکەم رۆژی بانگەوازی کردنیان بۆ گەلەکانیان، واتە ئەو نەتەوانە وەکوو چۆن پێش هێنانی موعجیزەو بەڵگەو نیشانەکانیان بڕوایان بەپێغەمبەرەکانیان نەکردو بەدرۆیان خستنەوە، پاش هێنانی موعجیزەو بەڵگە ئاشکراکانیشیان هەر بڕوایان پێ نەکردن، بەکافریو سەرپێچیکار مانەوە! موعجیزەو ئایەتەکان ئەوانی لەسەرپێچیو یاخی بوون نەگێڕایەوە.

یان دەتوانین بەو جۆرە راڤەکە بکەین‌و بڵێین: هیچ کامێ لەوەچەو پاشینەی نەتەوەکان ئیمانیان نەهێنا بەو پەیامەی کە باوك‌و باپیرو پێشینەکانیان بڕوایان پێ نەکردو بەدرۆیان خستبووەوە، ئەو هۆکارەی ببوە هۆی ئیمان نەهێنانی پێشینەکانیان هەمان هۆکار بووە هۆی ئیمان نەهێنانی پاشینەکانیان، لەهەموو چەرخ‌و رۆژگارێکدا ملهوڕی‌و سەرڕەقی‌و چاولێکەری‌و لاسایی کردنەوە هۆکارێکی سەرەکی بووە بۆ بڕوانەکردن‌و بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران.

﴿كَذَلِكَ نَطْبَعُ عَلَى قُلُوبِ الْمُعْتَدِينَ﴾ هەر بەو جۆرەی کە دڵی ئەوانەمان مۆر کرد بەهۆی سەرڕەقی‌و بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرەکانیان، دڵی ئەو نەفامانەی گەلی تۆیش (ئەی پێغەمبەر!) مۆر دەکەین کە دەشوبهێتە ئەو نەفام‌و سەرڕەقانەی پێشوو، ئەمە هەڕەشەیەکی گەورەو سامناکە لەو کەسانەی پێغەمبەری ئیسلام بەدرۆ دەخەنەوەو بڕوا بەقورئان‌و پەیامەکەی ناکەن‌و پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی نابن، چونکە لەکاتێکدا پەروەردگار بەو جۆرە گەل‌و نەتەوە سەرڕەقەکانی پێشووی لەناو بردن لەسەر ئەو تاوانانەی ئەنجامیان دان، ئەی دەبێ کەسێك تاوانی گەورە تر بکاو پێغەمبەری گەورە تر بەدرۆ بخاتەوە دەبێ حاڵی چۆن بێ؟!

ئەمە دابو نەریتی خودایە لەمەخلووقاتی خۆیدا، هەر دڵ‌و دەروونێك خاوەنەکەی بۆ خۆی دای بخاو لەکاری بکا، لەسەر ئەو بارە بار دەگری‌و رەق دەبی‌و بەکەڵکی وەرگرتنی پەیامی پێغەمبەران نایەو هیدایەت وەرناگرێ، مانای ئەوە نیە: کە خودا دڵەکان دادەخاو لەسەرەتاوە ناهێڵێ ئیمانیان تێ بچێ!!

## چیرۆکی حەزرەتی موساو حەزرەتی هارون لەگەڵ فیرعەونو تاقمەکەی

ئەم چیرۆکە دووەم چیرۆکی سورەتی (یونس)ە ئەویش چیرۆکی حەزرەتی موساو حەزرەتی هارپوونە لەگەڵ فیرعەونو تاقمەکەیدا شایانی باسە: کە بەسەرهاتی حەزرەتی موساو هارپوون لەگەڵ فیرعەونو قەومەکەیدا چەند جارێك لەقورئاندا دوبارە بۆتەوە، بۆ ئەوەی بەڵگەبێ لەسەر ئەوەی: کە هێزی حەقو دەنگی پێغەمبەرایەتی هەمیشە سەرکەوتوون بەسەر ئەوانەی لافی پاشایەتیو دەسەڵاتو فرمانڕەوایی لێ دەدەن، هیچ کاتێ ملهوڕیو تەختو بەختی پاشایان خۆیان لەبەر تیشکی نووری حەقدا ناگرنو لەئاستی حەقدا نموودیان نیە.

**ئەم چیرۆکە لە پێنج بەش پێك دێ:**

(١) **بەشی یەکەم: حیوارو گفتوگۆی نێوان حەزرەتی مووساو فیرعەون:**

﴿ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ وَهَٰرُونَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ
وَمَلَإِيْهِۦ بِـَٔايَٰتِنَا فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا
جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوٓا۟ إِنَّ هَٰذَا لَسِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٦﴾
قَالَ مُوسَىٰٓ أَتَقُولُونَ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمْ ۖ أَسِحْرٌ هَٰذَا وَلَا
يُفْلِحُ ٱلسَّٰحِرُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ

ءَابَآءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلْكِبْرِيَآءُ فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ ﴿٧٨﴾

﴿ثُمَّ بَعَثْنَا مِنْ بَعْدِهِمْ مُوسَى وَهَارُونَ إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ بِآيَاتِنَا﴾ واتە: پاش ناردنی ئەو پێغەمبەرە ڕێزدارانە (موساو هارون)مان کردنە پێغەمبەرو بۆلای فیرعەونو دارو دەستەکەی ڕەوانەمان کردن، بەبەڵگەو نیشانەی ئاشکراو بەهێزەوە ناردمانن بۆ سەر فیرعەونو تاقمو کۆمەڵی، کە ئەو کاتە فیرعەون پاشای میصر بوو، دارو دەستەکەشی خۆیان بەئەشرافو پیاوماقوڵی نەتەوەی قیبطی دەزانی بۆیەش بەتایبەتی هەر ناوی ئەوانی هێناوە، چونکە باقی خەڵکەکەی تر شوێنکەوتوو پابەندی فەرمانی ئەوان بوون. ئەگەر فیرعەونو تاقمەکەی ئیمانیان بهێنایە، مەردومگەلەکەی یەکسەر ئیمانیان دەهێنا (موساو هارون)مان بەئایاتو نیشانەی ئاشکراو گەورە ڕەوانە کردن: وەکوو لەسوورەتی (الأعراف/١٣٣) لەشوێنی تریش ئاماژەیان بۆ کراوە.

کەچی فیرعەونو دارو دەستەکەی لەجیاتی ئەوەی بڕوا بکەنو ئیمان بهێنن ﴿فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْماً مُجْرِمِينَ﴾ لوتبەرزییان نواند، شوێن ڕێبازی حەق نەکەوتنو ملکەچی شەریعەتی خودا نەبوون، ئیمانیان بەپەیامی حەزرەتی موساو هارون نەهێنا، بەڕاستی ئەوانە گەلو نەتەوەیەکی تاوانکار بوونو تاوانکارییان لێ ببوە خویەکی سروشتیو باریان بەتاوانەوە گرتبوو، تاوانی گەورە گەورەو کەم وێنەیان ئەنجام دەدان، لەستەمکاریو تاوانکاریو ئاشوبنانەوەدا دەستێکی باڵایان هەبوو، لەهەموو تاوانێکیشیان گەورەتر بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرانی خوداو ڕەتکردنەوەی پەیامەکەیان بوو!!

﴿فَلَمَّا جَاءَهُمْ الْحَقُّ مِنْ عِنْدِنَا﴾ کاتێك موسا هاتە سەریان بەبەڵگەو نیشانەی ئاشکراوە، زۆر موعجیزەو نیشانەی وای نیشان دان کە راستی پێغەمبەرایەتی ئەوو تاکو تەنهایی خودایان دەچەسپاند، رەوانە کردنی موساو هارونو بەدیهێنانی موعجیزەکانیان لەلایەن ئێمەوە بوو، ئەو پەیامە حەقو راستە لەئێمەوە نێردرابوو؛ کەچی ئەوان لەجیاتی ئیمان هێنان ﴿قَالُوا إِنَّ هَذَا لَسِحْرٌ مُبِينٌ﴾ لەروی سەرڕەقیو خۆبەزلزانیو لوتبەرزیو هەوا پەرستییەوە وتیان: بەراستی ئەمە سیحرێکی ئاشکراو نمایانە، بەشێوەیەکی جەخت لەسەر کراوو دڵنیاییەوە موعجیزەکانی موسایان بەسیحر لەقەڵەم دان، لەکاتێکدا بۆخۆیان لەدڵی خۆیاندا لێیان روون بوو کە ئەوەی وتوویانە درۆو بوختانەو بێ ئەصڵو بناغەیە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْماً وَعُلُوّاً فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ﴾النمل/١٤.

ئاوا بەبێ شەرمانە، بەبێ بەڵگەو نیشانە موعجیزەی پێغەمبەران بەسیحر لەقەڵەم دەدەن، کافرەکانی قورەیشیش وەکوو لەسەرەتای سورەتەکەدا زانیمان هەمان بوختانیان بەقورئانو پەیامی پێغەمبەر ﷺ کردو ئەوانیش وتیان: ﴿إِنَّ هَذَا لَسِحْرٌ مُبِينٌ﴾ سوبحانەڵلا دەڵێی ئەم رستەیە، هەموو کافرو بەدرۆخەرەوەکان لەهەموو کاتو سەردەمێکدا لێکیان گێڕاوەتەوە، هەر گەلو نەتەوەیەك پێغەمبەری بۆسەرنێردرابێو موعجیزەیان نیشان درابێ لەباتی ئەوەی ئیمانیان هێنا بێ، ئەو بوختانەیان بەپێغەمبەرەکە کردوە!.

﴿قَالَ مُوسَى أَتَقُولُونَ لِلْحَقِّ لَمَّا جَاءَكُمْ أَسِحْرٌ هَذَا؟ وَلا يُفْلِحُ السَّاحِرُونَ﴾ حەزرەتی موسا بەشێوەیەکی نارەزایی دەربڕینو سەرزەنشت کردنی ئەو نەفامو لوتبەرزانە وتی: ئایا ئێوە بەحەقی ئاشکراو رونو دوور لەسیحری بەتاڵ، یەژن ئەمە سیحرو جادوە؟ بەراستی عەجایەبو سەرسوڕهێنەرە بۆ ئێوە چۆن بەم پەیامو موعجیزانە دەڵێن: سیحرا؟ ئایا ئەمە سیحرە؟! چۆن رێگا بەخۆتان دەدەن

بڵێن: ئەمە سیحرە؟ لەحاڵێکدا ئێوە بۆخۆتان دەزانن سیحر چاوبەستەکیو روکەش کردنە، ئەگەر ئەمە سیحر بوایە زو دەپوکایەوە، سیحری ساحیرەکانی بەتاڵ نەدەکردەوە!! هەرگیزاو هەرگیز ساحیرەکان لەگۆڕەپانی روبەڕو بوونەوەی حەقائیقدا سەرکەوتوو نابن، قەت بەسیحر ئایین ناچەسپێ بنەمای ژیان رێك ناخرێ، سەڵتەنەتو پاشایی پێ دەستەبەر نابێ، چونکە سیحرو جادوبازی بریتییە لەشەعوەزەو چاویەستەکیو دەست سووکی، هیچ شتێك لەحەقائیق ناگۆڕێ. دەی ئەوەی ئێوە بەچاوی خۆتان لەو موعجیزەو نیشانانەی: کە خودا بەمنی داوەو کردونی بەبەڵگە لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی من دەبینن‌و دڵتان بەلەرزە دەکەوێ! چۆن ئەوە بەسیحر دادەنرێ!؟

ئیتر دوا ئەوەی حەزرەتی موسا بەو جۆرە بۆڕی دان‌و بەڵگە کوتی کردن‌و هیچ رەدێکی وێچوویان بەدەستەوە نەبوو بەربەرەکانی موسای پێ بکەن، پەنایان بۆ بەڵگەیەکی زۆر لاوازو هیچو پووچ برد: ﴿قَالُوا أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا﴾ وتیان: ئەی موسا! ئایا تۆ بۆ ئەوە هاتووی ئێمە لەئایینی باوکو باپیرانمان لابدەی؟ دەتەوێ ئێمە واز لەئایینی باوکو باپیرانمان بێنین؟ ﴿وَتَكُونَ لَكُمَا الْكِبْرِيَاءُ فِي الأَرْضِ﴾ هەروەها دەتانەوێ ئەتۆو هارونی برات ببنە کاربەدەستو خاوەن دەسەڵات لەسەر زەوی؟ دەتانەوێ سەرۆکایەتی ئایینی دونیایی بۆخۆتان دەستەبەر بکەن؟ دەتانەوێ شان‌و شکۆو پلەو پایەو ملکو دەسەڵات بۆخۆتان پەیدا بکەن؟ ﴿وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ﴾ باش بزانن ئێمە هەرگیزاو هەرگیز بڕواتان پێ ناکەین‌و نایەینە سەر ئایینی ئێوە: کە جیاوازە لەئایینی باوکو باپیرو پێشینەکانمان.

ئێبینی ئەوە دەکرێ: کە لەسەرەتاوە خیطابەکانیان ئاڕاستەی حەزرەتی موسا کرد، چونکە ئەو بانگەوازی کردن بۆ ئیمانهێنان‌و یەکتاپەرستی‌و وازهێنان لەبتپەرستی، ئەمجار لەکۆتایی ئایەتەکەدا حەزرەتی هارونیشی رەگەڵ خست، لەم

ڕووەوە کە ئەویش لەبەرووبوومی بانگەوازییەکە بەهرەمەند دەبێ‌و پلەو پایەو شکۆمەندی دەست دەکەوێ!!

## (٢) بەشی دووەم: ئامادەکردنی سیحربازەکان لەلایەن فیرعەونەوە بۆ بەرەنگاریکردنی بانگەوازیی موسا

﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ٱئْتُونِي بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا جَآءَ
ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُواْ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٨٠﴾ فَلَمَّآ
أَلْقَوْاْ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ ٱلسِّحْرُ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبْطِلُهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ
لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨١﴾ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوْ
كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾

ئەمە بەشی دووەمی چیرۆکی حەزرەتی موسایە لەگەڵ فیرعەوندا، بێگومان فیرعەون ویستی پەنا بۆ سیحربازەکان بەرێ‌و لەڕێگەی ئەوانەوە بەربەرەکانی حەزرەتی موسا بکا، فەرمانی بەپیاوانی دەربارى خۆی کرد: کە سیحربازە کارامەکان کۆبکەنەوەو ئامادەیان بکەن بۆ فیستیڤاڵێکی جەماوەری، بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی دەربخا: کە ئەوەی موسا لافی پێوە لێ دەداو بەموعجیزەی داناوە جۆرێکە لەسیحرو، نەهێڵێ خەڵکەکە شوێنی بکەون.

فیرعەون دەیویست بەهەر نرخێك بێ جەماوەر وابێ بگەیەنێ: کە موسا ساحیرە، بۆیە فەرمانی دا کۆڕێکی جەماوەری بگێڕێ بۆ سیحربازەکان‌و

بەربەرەکانی موساو موعجیزەکانی بکەن، بۆ ئەوەی لەسەرنجامدا بەجەماوەرەکەی بسەلمێنێ: کە موسا سیحربازێکی کارامایەو بەس! کە ئەمەشی بۆ چەسپا ئیتر خەتەر لەسەر بیرو باوەڕی کەلەپوور ئاساو دەسەڵاتی خۆیو دارو دەستەکەی لەسەر زەوی نامێنێ.

هەر ئەوەش گرنگو مەبەستە. وا دیارە مەبەستی سەرەکی فیرعەون بۆ بەستنی ئەو کۆڕە بەربڵاوە بۆ سیحربازەکان، هەر ئەوە بووە: کە سیحربازیی وەپاڵ حەزرەتی موسا بداو بیکاتە ساحیرێکی کاراماو لێزان. ئەمەش کاتێك بوو: کە نەتەوەکەی هەستی خۆیان دەربڕیو فیرعەونیان لەخەتەری چاوەڕوانکراو ترساند بۆیە فیرعەون بۆ چارەسەر کردنی ئەو خەتەرە بڕیاری دا کە لەهەموو لایەکەوە سیحربازە کاراماو لێهاتوەکان کۆبکەنەوەو کۆڕێکی فراوانیان بۆ بگرێ: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ائْتُونِي بِكُلِّ سَاحِرٍ عَلِيمٍ﴾ فیرعەون بەدارو دەستەکەی دەباری خۆی گوت: هەوڵ بدەن لەهەموو لایەکەوە ساحیرە زاناو لێهاتوەکانم بۆ ئامادە بکەن.. فیرعەون کاتێك ئەمەی گوت: کە عەصاو دەستی نوورانی موسای بینیو پێی وابوو: کە موساو هارون دوو کەڵەساحیری لێهاتوو شارەزان لەبواری سیحربازیدا، چونکە فیرعەونو تاقمەکەی پێیان وابوو: چ جوداوازییەك نیە لەنێوان موعجیزەی خوداییو سیحردا، جا بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانی فیرعەون ساحیرە زۆرزانەکانیان هێنانو کۆیان کردنەوەو هێنایاننە لای فیرعەونو لەوێوە بۆ جێی مەبەستو شوێنی کۆڕو فیستیڤاڵ راپێچ کران.

﴿فَلَمَّا جَاءَ السَّحَرَةُ﴾ کاتێك ساحیرەکان هاتنە شوێنی کۆبوونەوەو لەگەڵ حەزرەتی موسادا ڕوبەڕو بوونەوە، موسا پاش ئەوەی ساحیرەکانی سەرپشك کردن لەنێوان ئەوەدا سەرەتا ئەو عەصای خۆی بهاوێژێ یان ئەوان گوریسی جیوە تێکراوی خۆیان بهاون ﴿قَالَ لَهُمْ مُوسَى أَلْقُوا مَا أَنْتُمْ مُلْقُونَ﴾ موسا پێیانی گوت:

ئێوە ئەوەی دەتانەوێ بیهاوێن بیهاوێن، چیتان لەدەس دێ ئەنجامی بدەن، ئێوە دەست پێشخەر بن.

هەڵبەتە حەزرەتی موسا ویستی دەست پێشخەری لەوانەوە بێ، تا خەڵکی بزانن: ئەو سیحربازانە چی دەکەن، هەروەها بۆ ئەوەی هەرچی هێزو توانایان هەیە بەکاری بێننو چ خیبرەو فرتو فێڵیان هەیە بیخەنە کار. ئەمجار موسا موعجیزەی خودایی حەقو ڕاست بخاتە گەڕو عەصای خۆی بهاوێ، سیحرو جادویان بەتاڵ بکاتەوە.

هەڵبەتە سیحری ساحیرەکان سەرنج ڕاکێشو ترسناك بوو: کە گوریسەکانیان هاویشتن خەڵکیان سەرسام کردو ترساندیانو سیحرو جادوێکی مەزنیان ئەنجام دا، تەنانەت حەزرەتی موساش ترسێکی کەوتە دڵەوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُّوسَى، قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ الْأَعْلَى، وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوا إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى﴾طه/٦٧-٦٨-٦٩.

جا ﴿فَلَمَّا أَلْقَوْا﴾ کاتێك ساحیرەکان دەست پێشخەریان کردو گوریسەکانیان هاویشت، موسا دڵنیا کرابوو ترسی لێ ڕەوێندرابووەوە، متمانەی تەواوی بەڕاستی پەیامی خۆیو یارمەتی خودایی هەبوو ﴿قَالَ مُوسَى مَا جِئْتُم بِهِ السِّحْرُ﴾ موسا پێی گوتن ئەوەی ئێوە دەیکەن سیحرو جادوبازییەو چاوبەستو فرتو فێڵە، نەك ئەوەی من هێناومە لەخوداوە. ئەوەی من موعجیزەیەو لەخوداوە هاتووە کەچی فێرعەون بەسیحری دادەنیو دەیباتە ریزی سیحری ئێوەوە. بەڵام دڵنیابن ئەمەی من موعجیزەیەو حەقەو ئەوەی ئێوە سیحرو جادوبازییە، ﴿إِنَّ اللَّهَ سَيُبْطِلُهُ﴾ بێگومان خودا ئەو سیحرەی ئێوە دەینوێنن بەتاڵی دەکاتەوەو بێ بناغەییو پووچی سیحرەکەتان بۆ خەڵکی دەردەخاو پێیان دەسەلمێنێ کە کارەکەتان چاوبەستەو فڕی بەسەر ڕاستییەوە نیە. چونکە ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يُصْلِحُ عَمَلَ الْمُفْسِدِينَ﴾

بێگومان خودا کارو کردەوەی ئاشوبگێڕان بەرقەرار ناکاو هێـزو پێزیـان نـاداتیو وا ناکا کارەکـەیان بەکـەڵکی مانـەوە بـێ، ﴿وَيُحِـقُّ اللَّـهُ الْحَـقَّ بِكَلِمَاتِـهِ﴾ ویـستی خـودا وەهایە: کە حـەقو راسـتی بـەردەوام بکـا، ئـەو حەقـە بچەسـپێنێ کـە بەرژەوەنـدی مەخلووقاتی تێدایـە، بـەهێزی بکـاو بەسـەر بـەتاڵدا زاڵـی بکـا، هـەر لـەم روانگـەوە یارمـەتی موسـا دەداو بەسـەر فیرعـەونـدا زاڵـی دەکـاو نەتەوەکەشـی لـەژێر چـنگی فیرعەون دەردێنیو لەژێر دەستەیی‌و کۆیلەیی ڕزگاریان دەکا.

﴿وَلَـوْ كَـرِهَ الْمُجْرِمُـونَ﴾ بـا تاوانبـارانی وەکـوو فیرعـەونو دارو دەسـتەکەی سەرخستنی حەقو راستییان بەسـەر بـەتاڵدا پـێ نـاخۆش بـێ. وەکـوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿فَوَقَـعَ الْحَـقُّ وَبَطَـلَ مَـا كَـانُواْ يَعْمَلُـونَ﴾الأعـراف/١١٨. یـان دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى﴾طه/٦٩.

بەڵێ ئەمە زۆرانبازی نێوان حەقو بەتاڵ بـوو، بەربـەرەکانی مـوعجیزە بـوو لەبەرامبەر سیحردا!!

موعجیزە نیشانەیەکی خوداییەو سەرئاسایەو لـەعادەت بـەدەرە، خـودا دەیـدا بەو کەسانە ئیدیعای پێغەمبەرایەتی دەکەن، بۆ ئەوەی خـەڵك بڕوایـان پـێ بکـەنو شـوێن بانگەوازییەکـەیان بکـەون، بـەڵام سـیحر چاوبەسـتەکیو روکـەش کـردنو شاردنەوەی حەقیقەتە، هەر شتێکیش ئاوابێ بـەرەنگاری مـوعجیزەی خـودایی پـێ ناگرێ.

(٣) **بەشی سێیەم: بڕوا کردنی کۆمەڵێك لەنەوەی ئیسرائیل بەپەیامی حەزرەتی موسا**

﴿ فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوْمِهِۦ عَلَىٰ خَوْفٍ مِّن
فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِمْ أَن يَفْتِنَهُمْ ۚ وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِى ٱلْأَرْضِ
وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٨٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَـٰقَوْمِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ
فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴿٨٤﴾ فَقَالُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا لَا
تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٨٥﴾ وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ
ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا
بِمِصْرَ بُيُوتًا وَٱجْعَلُوا۟ بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۗ
وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾

دوای ئەوی پەروەردگار هەڵوێستو کرداری فیرعەونی ڕون کردەوە دەربارەی بەرەنگاریکردنی پەیامی حەزرەتی موسا ﷺ بەشوێن ئەوەدا باسی ئیمانهێنانی کۆمەڵێك لەگەنجو لاوی بەنو ئیسرائیلی دەکا، ئەمەش وەکوو ڕێخۆشکردنێك وا بوو بۆ دەرچوونیان لەئاخی میصرو ڕزگار بوونیان لەچنگی فیرعەون. هەڵبەتە ئەمە دڵدانەوەی پێغەمبەری تێدایە، بۆ ئەوەی دڵتەنگ نەبێ، چونکە پێغەمبەر بەپشت هەڵکردنی قورەیشییەکان دڵتەنگو غەمبار دەبوو، پێی ناخۆش بوو سوور

بن لەسەر کوفر. دەفەرموێ: ﴿فَمَا آمَنَ لِمُوسَى إِلاَّ ذُرِّيَّةٌ مِنْ قَوْمِهِ عَلَى خَوْفٍ مِنْ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِمْ أَنْ يَفْتِنَهُمْ﴾ پەروەردگار ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە: کە لەسەرەتاوە تاقمێکی کەم نەبێ لەگەنجو لاوەکانی بەنو ئیسرائیلی کەسی تر ئیمانی بەموسا نەهێنا؛ هەرچەندە حەزرەتی موسا بەڵگەو نیشانەو موعجیزەی ئاشکراو گرنگی نیشانی بەنو ئیسرائلو فیرعەونو دارو دەستەکەی داو بانگەوازی کردن بۆ ئیمانهێنان، کۆمەڵێکی کەم نەبێ لەگەنجو تازە ڕەسیدەکانی نەتەوەی ئیسرائیل کەسیکە ئیمانی پێ نەهێنا، ئەوانیش کە ئیمانیان هێنا ترسو بیمی ئەوەیان هەبوو فیرعەون پێیان بزانیو بیانگێڕێتەوە بۆ سەر کوفرو بێدینی، چونکە سوور بوونی فیرعەون لەسەر کوفرو ملهوڕی بەتایبەتی دوای ئەوەی ساحیرەکان بۆڕیان خواردو فیرعەون لێیان نائومێد بوو، گەیشتبوە ئەوپەڕی یاخی بوونو سەرپێچیکاری، ئەوەبوو: بڕیاری دا حەزرەتی موسا لەناوبەرێو نەهێڵێ پەیامەکەی بلاوبێتەوە وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَى وَلْيَدْعُ رَبَّهُ إِنِّي أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي الْأَرْضِ الْفَسَادَ﴾غافر/٢٦.

ئا ئەم هەڵوێستانەی فیرعەون وای لەنەتەوەی ئیسرائیل کرد: کە بترسن لەوەی فیرعەون ئەگەر پێیان بزانێ تووشی نارەحەتییان بکاو ژیانیان بکاتەوە، بەتایبەتی کە ئەو ملهوڕە تا بڵێی سەرڕەقو یاخیو زێدەڕۆ بوو لەستەمکاریو ئاشوبگێڕاندا، تەنانەت ملهوڕیی گەیشتبووە ئاستێك لافی خودایەتی لێ دەداو نەوەو وەچەی پێغەمبەرانی کردبوون بەکۆیلەو دەیچەوساندنەوە؛ زەبرو زەنگێکی وای دژ بەژێردەستەکانی بەکار دەهێنا خەریك بوو زەندەقیان لێ بچێ لەترسانی حەجمینیان لێ بڕا بوو.

ڕاناو لە(قومە)ی دا دەگەڕێتەوە بۆ بەنوئیسرائیل (نەتەوەی موسا) چونکە ڕاناو دەگەڕێتە بۆ نزیکترین مەرجەع.

هەندێکیش دەڵێن: راناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ فیرعەون. مەبەستیش بە(ذریة) لەئایەتەکەدا کابرا موسوڵمانەکەی تاقمی فیرعەون (مؤمن آلفرعون)ە هەروەها ئاسیەی خێزانی فیرعەونو خەزنەدارەکەیی‌و خێزانی خەزنەدارو دەلاکەکەی فیرعەونن.

راناوی (مئلهم)یش دەگەڕێتەوە بۆ فیرعەونو بەمانا ئالی فیرعەونە.

ئەمجار قورئان پاساو بۆ ترس‌و بیمی ئەو کۆمەڵە گەنجە دەهێنێتەوە کە ئیمانیان بەموسا هێنابوو دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِي الأَرْضِ وَإِنَّهُ لَمِنْ الْمُسْرِفِينَ﴾ بێگومان فیرعەون لوتبەرزو خۆبەزلزانو ستەمکارو یاخی‌و سەرڕەق‌و سنووربەزێن بوو لەخۆبەزلزانیدا، بەجۆرێك خۆی بەخودا دادەناو پێی وابوو: کەس لەخۆی گەورەتر نیە، جگە لەخۆی کەس خاوەنی ملکی میصر نیە. بەراستی ناوبراو لەهەرە ملهوڕە تەجاوزکارەکان بوو، بەتەواوی سنووری بەزاندبوو لەخۆی بایی بوبوو.

﴿وَقَالَ مُوسَى يَا قَوْمِ إِنْ كُنتُمْ آمَنتُمْ بِاللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا إِنْ كُنتُمْ مُسْلِمِينَ﴾ موسا: کە بینی ئەو کۆمەڵەی ئیمانیان پێ هێناوە ترسی زۆریان لەوە هەیە فیرعەون تووشی کێشەو سزایان بکا، وتی: ئەی نەتەوەکەم! ئەگەر ئێوە ئیمانتان بەخودا هێناوەو بڕواتان بەئایاتی پەروەردگار پتەوە، ئەوە پشت بەخودا ببەستن‌و ئیعتمادتان لەسەر زاتی پاکی بێ، متمانەی پێ بکەن‌و دڵنیابن کە ئەو وادەو بەڵێنانەی پێی داوین بەجێیان دێنێ‌و سەرکەوتوومان دەکا. ئەگەر ئێوە گەردنکەچ و پابەندی فەرمانی خودان، ئەگەر خۆتان داوەتە دەس قەزاو قەدەری خوداو گەردنکەچ‌و دڵسۆزی ئەون ئەوە متمانەتان بەخودا هەبێ‌و ترس‌و بیمتان لەفیرعەون نەبێ.

پشت بەستن بەخودا، نیشانەی ئیمانی بەهێزە، پشت بەستن بەخودا داخوازییەکی بەهێزی ئیمانە، لایەنێکی هێزو توانایە دەبێتە رەصیدو ورە بەخش

بۆ کۆمەڵی زەعیفو بێ دەسەڵات لەبەرامبەر جەبەڕوتی ملهوڕاندا، بەجۆرێك: کە ئەو بێ دەسەڵاتو لاوازانە بەهۆی پشت بەستنیان بەخوداوە دەبنە هێزێکی پتەوو خۆڕاگرو تەنگ بەملهوڕان هەڵدەچنن.

حەزرەتی موسا باسی گرنگی ئیمانو ئیسلامی بۆ گەلەکەی کردو پشت بەستنی بەخودا کردە نیشانەی پتەوی ئیمانو ئیسلام.

بەکورتیو کوردی ئیمان بریتییە لەوەی دڵو دەروون بگەنە ئاستێك بزانێ: کە پەروەردگار هەبوونی، شتێکی حەتمیو پێویستە، بوونەوەر بێ خودایەکی بەدیهێنەر تەصەوور ناکرێ، خودا (واجب الوجود)ەو تاکو تەنهاو بێ هاوەڵە. جگە لەپەروەردگار هەموو شتەکانی تر بەدیهێنراوی خودانو هەموویان لەژێر رکێفی زاتی پاکیدان، چۆنی بوێ ئاوا هەڵیاندەسوڕێنێ. ئیسلام: بریتییە لەگەردنکەچیو پابەند بوون بۆ هەموو ئەرکو فەرمانێك کە لەو زاتەوە دەردەچێ.

﴿فَقَالُوا عَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْنَا﴾ دوای ئەم فەرمووودانەی حەزرەتی موسا بڕوادارەکان یەکسەر وتیان: ئێمە پشت بەخودا دەبەستینو بتمانەمان هەر بەئەوە، ئەمجار دەستیان کرد بەنزاو پاڕانەوە لەخوداو وتیان: ﴿رَبَّنَا لا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ پەروەردگارا! ئەی خودای ئێمە! مەمانکەرە فیتنە بۆ گەلو نەتەوەی ستەمکار، خودایە!، وا مەکە ستەمکاران بەسەرماندا زاڵ ببنو خەڵکی پێ لەخشتە بچێو وا گومان بەرن ئەوان لەسەر حەقن، بۆیە بەسەر ئێمەی موسوڵماندا زاڵ بوون، خودایە! وامەکە ئادەمیزادان بەهۆی ژێرکەوتنی ئێمەوە هەڵبخەڵەتێنو بڵێن: ئەگەر ئەمانە لەسەر حەق بوونایە، فیرعەونو تاقمەکەی بەسەریاندا زاڵ نەدەبوون!

یان خودایە! مەمانکەرە شوێنی فیتنە بۆ ستەمکاران، بەمجۆرە ئەوان ئێمە لەئایین بگێڕنەوەو تۆیش لەتۆڵەی ئەوەدا سزایان بدەی.

﴿وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ ئەی پەروەردگار! بەڕەحمەتو چاکەکاری خۆت بەلوتفو کەرەمی خۆت رزگارمان بکە لەبالاّ دەستی ئەوانەی کافرن، بڕوایان بەتاکو تەنهایی زاتی پاکت نیە، ستەمکارو ملهوڕن، بڕوایان بەحەقو راستی نیە، حەق پەردەپۆش دەکەنو گوێی پێ نادەن، ئێمە بڕوامان بەتاکو تەنهایی تۆ هەیە، پشتمان بەهێزو توانای تۆ بەستووە. ئەوان بەم شێوە نزاو پاڕانەوەیە لەخودا پاڕانەوە، چونکە تەوەکول لەسەر خودا کە گەورەترین نیشانەی ئیمانە بەبێ صەبرو خۆڕاگریی لەسەر ناخۆشی تەواو نابێ.

دوعاو پاڕانەوەش گیرا نابێ تا تاعەتو خوداپەرستی لەگەڵدا نەبێ، دەبێ کەسێك بەتەمای گیرابوونی دوعا بێ کە خودا پەرست بێو هۆکارە ڕواڵەتیەکانیشی جێبەجێ کردبن. ئیتر ئەو کاتە، تەوەکول لەسەر خودا ڕۆڵی کاریگەری خۆی هەیە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾الطلاق/٣.

زۆرجار لەقورئاندا خوداپەرستیو تاعەت خراونە پاڵ تەوەکولو پشت بەستن بەخودا، وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ﴾هود/١٢٣. یان دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ الرَّحْمَنُ آمَنَّا بِهِ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا﴾الملك/٢٩. یان دەفەرموێ: ﴿رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَاتَّخِذْهُ وَكِيلاً﴾المزمل/٩.

ئەمجار پەروەردگار هۆکاری ڕزگار کردنی بەنوئیسرائیل لەفیرعەونو دارو دەستەکەی بەیان دەکاو چۆنیەتی قوتار بوونیان شی دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى وَأَخِيهِ أَنْ تَبَوَّآ لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتاً﴾ نیگامان بۆ موساو هارونی برای کرد: کە لەمیصردا شوێنی حەوانەوەو خۆحەشاردان بنیات بنێن. یان لەمیصردا مزگەوتو شوێنی بەجێهێنانی نوێژو خوداپەرستی دروست بکەن!

واتە: پاش ئیمانهێنانی ئەو کۆمەڵە گەنجو نەورەسیدانەو جیابوونەوەیان لەکافرو ملهوڕەکان پەروەردگار نیگای بۆ موساو هارونی برای کرد: کە خانووی

تایبەتی بۆ بەنوئیسرائیلییەکان دیاری بکەن، بۆ ئەوەی جیایان بکەنەوەو ڕێکیان بخەنو ئامادەیان بکەن بۆ بەرەنگاربوونەوە، خۆئامادە بکەن بۆ رەوکردن لەمیصرو بەجێهێشتنی لەکاتی گونجاودا، داوای لێ کردن کە ماڵو ناوماڵی خۆیان پاك بکەنەوە دڵو دەروونی خۆیان مشتو ماڵ بکەنو چاوەڕوانی کۆمەگیو یارمەتی خودایی بن.

پەروەردگار فەرمانی بەموساو هاروون کرد: کە لەگەڵ نەتەوەکەیاندا خانوەکانیان بکەنە مزگەوتو شوێنی خودا پەرستی! دەفەرموێ: ﴿وَاجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً﴾ خانوەکانتان ڕوبکەنە قیبلەو لەماڵی خۆتاندا بەرەو ڕوگە نوێژ بکەن؛ چونکە دەترسان خوانەناسان زیانیان پێ بگەیەنن!

قەتادەو ضەحاكو سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێن: مانای ﴿وَاجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً﴾ واتە: ماڵەکانتان وا دروست بکەن ڕویان لەیەکتر بێ، وەلێ قورطوبی دەفەرموێ: مانای پێشوو وێچووترە. واتە: مزگەوتەکانتان ڕووەو قیبلە بنیات بنێنو ڕویان بکەنە (بەیتول مەقدیس) کە ئەمڕۆش ئەو (بەیتولەقدیسە) ڕۆگەی جولەکەیە.

﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾ لەو مزگەوتانەدا، لەماڵەکانتاندا نوێژەکانتان ئەنجام بدەنو هەمووتان ڕوبکەنە قودسو یەك ڕۆگەتان هەبێ، چونکە یەکیەتی لەقیبلەدا دەبێتە هۆی یەکیەتی دڵو دەروون.

بێگومان لەسەرەتاوە فەرمانیان پێ کرا: کە هەر کەسە لەماڵی خۆیدا نوێژەکانیان ئەنجام بدەن، بۆ ئەوەی دوژمن پێیان نەزانێو زیانیان پێ نەگەیەننو لەئایینەکەیان ژێوانیان نەکەنەوە.

﴿وَبَشِّرْ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەی موسا! مزگێنی بەخودا پەرستان بدە: بەوە: کە خودا دەیانپارێزێو بەسەر دوژمندا زاڵیان دەکاو لەقیامەتیشدا دەیانخاتە بەهەشتی بەرینەوە.

مەراغی دەفەرموێ: بۆیە ئیسنادی مژدەدانەکە پاڵ حەزرەتی موسا دراوە، چونکە مزگێنی دان وەظیفەی خاوەن شەریعەتە، بەڵام لەبارەی ڕێکخستنی مزگەوتو پەیوەندی نێوان خاوەن بڕواکان هارونیشی کردوە بەیارمەتیدەر، چونکە ئەوە ڕێکخستنو تەنظیمە، ئەگبیرو موشاوەرەیە، بەڕواڵەتیش بۆ ئەم جۆرە شتانە فەرماندەو وەزیرو یارمەتیدەرانی پێکەوە نەخشەی بۆ دەکێشن!

مامۆستا سەیید لەڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ئەم تەعبیئە گیانییە وێڕای تەعبیئەی نیظامی بەیەکەوە پێویستییەکی سەرەکین بۆ تاکو کۆمەڵ. بەتایبەتی پێش ڕوبەڕوبوونەوەو هەڵگیرسانی شەڕو هەرا، وێ دەچێ هەندێ کەس ئەم تەعبیئە گیانییە بەشتێکی گرنگ نەزانن، بەڵام تاقیکردنەوەکانو ڕوداوەکان تا ئێستاش ئاماژە بەئەوە دەکەن: کە عەقیدەو بیرو باوەڕ چەکی هەرە کاریگەرە بۆ جەنگو ڕوبەڕوبوونەوە، چونکە چەکو ئامێری جەنگ لەدەستی سەربازێکی بێ بیرو باوەڕدا لەکاتی تەنگانەو شەڕدا هیچ بایەخێکی نیە.

ئەم تەجروبەو تاقیکردنەوەیەی پەروەردگار ڕای دەنوێنێ بەسەر تاقمی خاوەن باوەڕدا، بۆ ئەوەی بیکەنە سەرمەشق بۆخۆیان تایبەت نیە بەنەتەوەی ئیسرائیلەوە، بەڵکوو ئەمە تاقیکردنەوەیەکی ئیمانی پوختە، هەموو گرۆهێکی خاوەن باوەڕ دەگرێتەوە.

وێدەچێ موسوڵمانانی ئەمڕۆ یان سبەی لەوڵاتێك یان لەزۆر وڵاتدا وایان لێ بێ ڕاوەدو بنرێنو بکەونە بارودۆخێکی واوە نەوێرن بەئاشکرا شەعائیری ئایینی خۆیان ئەنجام بدەن، وەکوو چۆن لەسەردەمی فیرعەوندا باو بووە. بۆیە پەروەردگار موسوڵمانان شارەزا دەکا بۆ چەند هەڵوێستو کردەوەیەك:

١- گۆشەگیریی لەکۆمەڵگای نەفامی بەهەموو پیسیو بۆگەنییەوە.

٢- موسـوڵمانان خۆیـان ڕێـك بخـەنو دڵو دەروونـی خۆیـان پـاك بکەنـەوەو خۆیان رابێننو چاوەڕوانی وادەو بەڵێنی خودا بن!

٣- خۆیان لەپەرستگای نەفامان بپارێزنو ماڵی موسـوڵمانان بکەنـە مزگـەوتو خوداپەرستی تێـدا بکەنو وێـرای ئـەم گۆشـەگیریو خـۆ جیاکردنـەوە لەگۆمـەڵگای نەفامیو جاهیلی، جۆرە تەنظیمو ڕێکخستنێکی ناوخۆیان ئەنجام بدەن!

**تێبینی:**

کە دەفەرموێ: ﴿وَاجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً وَأَقِيمُوا الصَّلاةَ﴾ ئاماژەی ئەوەی تێدایـە: کە پەروەردگار فەرمانی بەخاوەن باوەڕان کـردوە: کـە ماڵـەکانیان لـەبارو دۆخێکـی تایبەتیـدا بکەنە مزگـەوت، بـۆ ئـەوەی فیرعـەون زیـان بەنوێژکـەرەکان نەگەیـەنێ؛ چونکە بەنوئیسرائیلییەکان پـێش ئـەو کاتـە دەبوایـە لەمزگـەوتو کەنیـسەکانیاندا نوێژەکانیان ئەنجام بدەن، فیرعـەون پەرسـتگاکانی روخانـدنو لەبـەجێهێنانی نوێـژ مەنعی کردن، ئەمجار پەروەردگار نیگای بـۆ موسـاو هـارون کـرد: کـە چـەند ماڵێـك هەڵبـــژێرن لەمیـــصرداو بیکەنـــە شـــوێنی نوێـــژو خـــودا پەرســـتیو روبکەنـــە بەیتولەقـدیس. ئەمـە نیـشانەی ئەوەیـەو ئـەوە دەگەیـەنێ کـە ڕوکردنـە قیبلـە لەنوێژدا لەشەرعی موسادا هەبوە.

زانایانی ئیسلامو شەرعزانەکان لەم ئایەتـە ئـەوەیان دەرهێنـاوە: کـە دروسـتە موسوڵمان نوێژ لەماڵەوە بکا، کەسێك بیانووی هـەبوو بـەمجۆرە نـەخۆش بـوو، یـان ترسـی هـەبوو بەچـوونی بـۆ جەماعـەتو جومعـە نەخۆشـییەکەی زیـاد دەکـا، یـان ترسـی سـتەمی کاربەدەسـتانی هـەبوو، دەترسـا زیـانی مـاڵی یـان جەسـتەیی پـێ بگەیەندرێ، یان بارانو زریانو قوڕو چڵپاو یـان بـەفرو بەسـتەڵەك بـوو، یـان کـابرا نەخۆشێکی لابوو، خـەریکی گیانکێشان بـوو، کەسـی تـر نـەبوو ئاگـای لێ بـێ، ئالـەم

حاڵانەدا یان بەم جۆرە بیانوانەوە موسوڵمان دەتوانێ نەچێ بۆ مزگەوتو لەماڵەوە نوێژەکانی ئەنجام بدا.

هەر بەم بۆنەوە زانایانی شەرع راجیاییو خیلافێکی تریان خستۆتە ڕو دەربارەی نوێژی تەراوێح لەشەوانی رەمەزاندا ئایا لەماڵەوە بکرێن باشترە یان لەمزگەوتدا.؟؟

ئیمامی مالیکو ئەبو یوسوفو برێك لەشافیعیەکان پێیان وایە: نوێژی تەراوێح؛ تەنانەت بۆ ئەوانەی تواناشیان هەیە بچنە مزگەوتو بیانووی شەرعییان نیە، هەر لەماڵەوە بیکەن خێری زیاترە، بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیەیە کە بوخاری ریوایەتی کردوە: دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (فعليكم بالصلاة في بيوتكم، فإن خير الصلاة صلاة المرأ في بيته الا المكتوبة). بەڵام زوربەی زانایان فەرموویانە: ئەنجامدانی تەراوێح بەجەماعەت باشترو گەورەترە، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەمزگەوتدا بەجەماعەت ئەنجامی داون، پاشان فەرمووی دەترسم لەسەرتان فەرض بکرێو ئەنجامدانی تەراوێح بەجەماعەت ببێتە فەرزی عەین، ئیتر وازی لەئەنجامدانی تەراوێح بەجەماعەت هێناو فەرمووی: (فعليكم بالصلاة في بيوتكم).

لەلایەکی ترەوە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دوای لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ لەمزگەوتدا بەجیا جیا نوێژی تەڕاوێحیان دەکرد، ئەمجار حەرزەتی عومەر کۆی کردنەوە ئەنجامدانی تەڕاوێحی بەکۆمەڵ هێنایە کایەوە، ئیتر لەسەر ئەمە کار چەسپاو کۆڕا دامەزرا.

**(٤) به‌شی چواره‌م: دوعا كردنی موسا له‌فیرعه‌ون‌و تاقمه‌كه‌ی**

﴿وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَا إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِكَ ۖ رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٨٨﴾ قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَٱسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾﴾

دوای ئه‌وه‌ی حه‌زره‌تی موسا موعجیزه‌ی جۆراو جۆری نیشان دان‌و به‌ڵگه‌ی ڕاستی پێغه‌مبه‌رایه‌تی خۆی چه‌سپاند، كه‌چی هه‌ستی كرد: كه فیرعه‌ون‌و تاقمه‌كه‌ی سوورن له‌سه‌ر ئینكاری‌و ئیمان نه‌هێنان، ئیتر دوعای له‌فیرعه‌ون‌و دارو ده‌سته‌كه‌ی كردو وتی: خودایه! ئه‌وانه سوورن له‌سه‌ر مانه‌وه له‌سه‌ر كوفرو دونیایان خۆش ده‌وێ، نازو نیعمه‌تی زۆرت پێ داون‌و له‌خۆشی‌و ڕابواردندا ده‌تلێنه‌وه‌و غه‌رابوون‌و گوێ به‌بانگه‌وازی من ناده‌ن.

ئیبنو كه‌ثیر ده‌فه‌رموێ: ئه‌م دوعا كردنه‌ی موسا له‌فیرعه‌ون‌و تاقمه‌كه‌ی له‌به‌ر خاتری ئایین بوو، له‌به‌ر خاتری خودا ڕقی هه‌ڵساو دوعای لێ كردن، ئه‌مه‌ش پاش ئه‌وه‌ی بۆی ده‌ركه‌وت: كه خێر له‌ناوچاویان به‌دی ناكرێ‌و هیوای موسوڵمانبوونی پێ نه‌مان ئه‌و كاته دوعای لێكردن، وه‌كوو چۆن له‌وه‌پێش حه‌زره‌تی نووح كه له‌ئیمانهێنانی قه‌ومه‌كه‌ی نائومێد بوو، دوعای لێ كردن. وتی: ﴿رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً، إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا

فَاجِراً كَفَّاراً﴾نوح/٢٦-٢٧. ئیتر پەروەردگار دوعاکەی حەزرەتی موسای قبووڵ کردو نیگای بۆ موساو هارون کرد کە دوعاکەیان گیرا بووە.

دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَى رَبَّنَا إِنَّكَ آتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلأَهُ زِينَةً وَأَمْوَالاً فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ واتە: دوای ئەوەی فیرعەونو کۆمەڵەکەی بانگەوازی حەزرەتی موسایان رەت کردەوەو سوور بوون لەسەر کوفری خۆیان، موسا وتی: پەروەردگارا! ئەتۆ لەدونیادا ئەوەندەت نازو نیعمەت داوە بەفیرعەونو تاقمەکەی لەخۆیان بایی بوون، ئەوەندەت پۆشاکی جوانو خشڵو زێڕو زیوو ناومالو ماڵو سامانو خۆشی ژیانت پێ بەخشیون، کشتو کاڵو باغو بێستانو ئاژەڵت هێندە بۆ زۆر کردون، خۆیان لەخۆ گۆڕاوەو گوێ بەبانگەوازی ئیمە نادەن: ﴿رَبَّنَا لِيُضِلُّوا عَنْ سَبِيلِكَ﴾ خودایە! ئەو نازو نیعمەتەی پێت داون سەری بەوە کێشاوە: کە وێڕای گومڕایی خۆیان کەسانی دیکەش گومڕا بکەن! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كَلَّا إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَى، أَن رَّآهُ اسْتَغْنَى﴾العلق/٦-٧.

شایانی باسە زانستی شوێنەوار ناسیو لێکۆڵینەوەو پشکنینی گۆڕی فیرعەونەکانی میصر گەواهی ئەوە دەدەن؛ کە فیرعەون خاوەن زێڕو زیوو دارایی‌و دەسەڵاتێکی فراوان بوو، ئەو هەموو زێڕو زیوو خشڵو شتە عەنتیکانەی کە دۆزراونەوەو دەدۆزرێنەوە ئەو هەموو ئەهرامو باڵەخانەو گۆڕی سەرنج ڕاکێش‌و پەیکەرانە، نیشانەی ئەوەن کە شارستانیەتو حەضارەت لەو ڕۆژگارەدا زۆر پێشکەوتوو بووە. قورئان بەو دوو سێ وشەیە ئاماژە بۆ ئەو شارستانیەتو پێشکەوتوییە دەکا.

(لام)ی (لیضلوا) پێی دەگوترێ (لام) عاقیبەت یان (لام)ی صەیرورەت. وەکوو چۆن (لام)ی (لیکون) لەئایەتی ﴿فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوّاً وَحَزَناً﴾القصص/٨.دا (لام)ی عاقیبەتە. کەوابوو (لام)ی (لیضلوا) لەئایەتەکەی ئێرەدا (لام)ی عاقیبەتو سەرەنجامە، واتە: سەرەنجام گەلو نەتەوەی فیرعەون

گـومڕا بـوون، دەشـگونجێ بڵـێین: (لام)ەکـە (لام)ی تەعلیلـە (لام)ی بایيـسە. بـەڵام بەگوێرەی ظاهيرو رواڵەت نەك لەحەقیقەتو واقیعدا.

واتە: پەروەردگار کاتێك ئەو هـەموو خۆشـیو مـاڵو سـامانەی دا بەنەتـەوەی فیرعەون، ئەوماڵو سامانە بووە هۆکاری زێدە گومڕایی‌و کافر بوونیـان، ئـەم حـاڵو چۆنیەتەیان دەق دەشوبهێتە حـاڵو چۆنیەتی کەسێك مـاڵو سـامانی درابێتـی بـۆ ئەوەی گومڕا ببێ. کەوابێ ئەگەر (لام)ەکە بە(لام)ی تەعلیلو بایيس دابنێین دەبێ ئاوا مانای بکەین.

﴿رَبَّنَـا اطْمِـسْ عَلَـى أَمْـوَالِهِمْ﴾ خودایـە! مـاڵو سـامانیان مـەحوو کـەرەوە، شوێنەواری مـاڵو سامانیان بـەپێوە مەهێڵە، هەرچی هەیانـە لـەماڵو مڵکو بـاغو بێستانو ئاژەڵ لەناویان بەرەو بیفەوتێنـە! ﴿وَاشْدُدْ عَلَى قُلُـوبِهِمْ﴾ دڵیـان مۆربکـەو دایخەو قەساوەت دایگرێ ﴿فَلا يُؤْمِنُوا حَتَّى يَرَوْا الْعَذَابَ الأَلِيمَ﴾ ئیمان نـەهێنن هـەتا سزای بەئێشیان بۆ دێ، جا لەو کاتـەدا کـە حـەزرەتی موسا ئـەم دوعایانـەی دەکـرد حەزرەتی هارونیش ئامین ئامینی بۆ دەکرد، ئیتر پەروەردگار فەرمووی: ﴿قَـالَ قَـدْ أُجِيبَتْ دَعْوَتُكُمَا﴾ ئەوا دوعاکەتانمان قبووڵ کرد، چۆنتان داوا کردو حەزتان لێ بوو ئاوامان بڕیاردا، ئالی فیرعەون بەخۆیانو ماڵو سامانیانەوە لەبێخ دەریان دێنین.

﴿فَاسْـتَقِيمَا﴾ ئێـوەیش لەسـەر گەیانـدنی پـەیامی خۆتـان بـەردەوام بـنو کەمتەرخەمی مەکەن، بانگەوازیی بـۆ حـەقو خوداپەرسـتی بـەرێكو پێکـی ئـەنجام بدەن ﴿وَلا تَتَّبِعَانِ سَبِيلَ الَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ﴾ شوێن ڕێبازی ئەوانە مەکەون: کـە نـازانن دابـو نەرێتی خودا لەبوونەوەردا چۆنە، ئێوە شوێن ڕێبازی ئـەو نەفامانـە مەکـەون کە هەڵەشەکارو چەواشەکارن، بتمانـەیان بـەوادەی خـودا نیـە، پەلـە دەکـەنو پـێش وەخت داوای ئەنجامدانی کار دەکەن!

شایانی باسە دوعا گیرا بوون کاتی تایبەتی هەیە، پەروەردگار لەزانستی خۆیدا کاتێکی تایبەتی بۆ مەزندە کردوە، بەگوێرەی ئەو زانیاریو مەزندەکردنە نزاکە گیرا دەبێ، واتە: بەویستی خودا دوعا گیرا دەبێ نەك بەگوێرەی ویستی بەندە، پەلە کردن لەگیرابوونی دوعا نەفامیو نەزانیە، کەسێك پەلە بکا لەگیرا بوونی دوعا نیشانەی بێ ئەدەبیو نەفامییە دەرحەق بەخودا، لەهەمان کاتدا نیشانەی هەبوونی شكو گومانە بەوادەی خودا، بۆیە پەروەردگار بەحەزرەتی موساو هارونی فەرموو: ﴿قَالَ قَدْ أُجِيبَتْ دَعْوَتُكُمَا فَاسْتَقِيمَا وَلا تَتَّبِعَانِ سَبِيلَ الَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ﴾ واتە: ڕێگای کەسانێك مەگرن کە دەربارەی حەقیقەتی وادەو بەڵێنی خودا ئاگادار نین.. نازانن دابو نەرێتی خودا لەبوونەوەردا چۆنەو چۆن نیە.

## (٥) بەشی پێنجەم: خنکاندنی فیرعەونو تاقمەکەی، ڕزگارکردنی نەتەوەی ئیسرائیل

﴿ ۞ وَجَٰوَزْنَا بِبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ
وَجُنُودُهُۥ بَغْيًا وَعَدْوًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ
أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ
﴿٩٠﴾ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٩١﴾
فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ ءَايَةًۚ وَإِنَّ كَثِيرًا
مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾ وَلَقَدْ بَوَّأْنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ

مُبَوَّأَ صِدۡقٖ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ فَمَا ٱخۡتَلَفُواْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ
ٱلۡعِلۡمُۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقۡضِي بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ


ئەمە بەشی پێنجەمە لەچیرۆکی حەزرەتی موساو هاروون لەگەڵ فیرعەوندا وەکوو زانیمان سەرەتا چیرۆکەکە بەگفتو گۆو حیوار دەست پێ دەکا، ئەمجار بەچیرۆکی سیحربازەکانو پاشان ئیمانهێنانی هەندێ گەنجو لاوی بەنوئیسرائیلی ئەمجار بەدوعاو پاڕانەوەی حەرزەتی موساو داویی بەهیلاکبردنی فیرعەونو تاقمەکەی.

ئەمجار کۆتایی چیرۆکەکە بەوە دێنێ: کە خودا دوعای حەزرەتی موسای گیرا کردو، فەرمانی بە بەنوئیسرائیلییەکان کرد: کە لەکاتێکی دیاریکراودا لەمیصر بڕۆنە دەرێ، هۆکاری چوونەدەرەوەشی بۆ گونجاندن، فیرعەون ئاگاداری ئەم کەینو بەینە نەبوو، هەرچەندە موساو هارونو شوێنکەوتوانیان لاوازو بێ دەسەلات بوونو فیرعەونو تاقمەکەی دەسەلاتدارو بەهێزو توانا بوون، بەلام چونکە خودا یارمەتی موسای دا فیرعەونو دارودەستەکەی لەناوبردنو دەفەرموێ: ﴿وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَائِيلَ الْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُ بَغْياً وَعَدْواً﴾ واتە: بەنوئیسرائیلییەکانمان لەدەریا پەڕاندەوە، پەڕاندنەوەکەیان بەکۆمەکیو یارمەتی ئێمە بوو، دەریامان بۆ شەق کردن، پەڕینەوەکەیان بەو شێوە نائاساییە، موعجیزەیەکی تری موسا بوو، نیشانەیەکی تری راستی پێغەمبەرایەتی ئەو بوو، فیرعەونو یاساوڵەکانی شوێنیان کەوتن، دەیانەویست ستەمیان لێ بکەنو قەلاچۆیان بکەن.

وەكــوو دەڵــێن: بەنوئیــسرائیلییەكان كاتێــك لەخزمــەت حــەزرەتی موســادا لەمیصر چوونەدەر شەشصەد هەزار شەڕكەربون ئەمە جگە لەژنو منداڵو پیرو كەنەفت. جاوەكوو دەڵێن: بەنوئیسرائیلییەكان پێش ئەوەی میصر بەجێ بێڵن خشڵو زێڕو زیوێكی زۆریان لەقیبطییەكان وەرگرتبوو، جا كە ڕەویان كردو لەمیصر وەدەركەوتن لەگەڵ خۆیاندا ئەم خشڵو زێڕەشیان بردبوو، بەمەش فیرعەون بەتەواوی رقی هەڵساو هەراسانی لێ هەڵگیرا، ئیتر بەسوپایەكی زۆرو بێ شومارەوە شوێنیان كەوت، لەكاتی خۆرهەڵاتا لەكەنار دەریای سوور (دەریای سویس) پێیان گەیشت، ئیتر كە بەنوئیسرائیلییەكان ئەم سوپا زۆرەی فیرعەونیان بینی، ترسیان لێ نیشتو ئەژنۆیان شكا؛ چونكە پێشیان دەریابوو، پاشیان سوپای فیرعەون بوو، ئیتر پەروەردگار نیگای بۆ حەزرەتی موسا كرد: كە بەعەصاكەی لەدەریا بدا، ئەویش عەصاكەی لەدەریا داو دەریا شەق بوو رێباز رێباز بوو، دوانزە رێگای تێكەوت، تەباری نێوان رێگاكان بەئەندازەی كێوێكی گەورە دەینواند، بۆ ئەوەی هەرتایەفەیەكیان بەرێگای تایبەتی خۆی بپەڕێتەوە، كە دەریا شەق بوو رێگاكانی تێكەوتن، پەروەردگار بایەكی هەڵكرد رێگاكانی وشكو برینگ كردەوە. ئیتر بەنوئیسرائیلییەكان كەوتنەرێو لەدەریا پەڕینەوە، كاتێك دواكەسیان لەلێواری ئەوپەری دەریاوە پەڕینەوە، فیرعەونو تاقمەكەی لەم لاوە گەیشتنە لێواری دەریا، كە فیرعەون دیمەنی رێگاكانی بینی ترسی لێ نیشتو ویستی بگەڕێتەوە، پاشان بڕیاری دا شوێن بەنوئیسرائیلییەكان بكەوێ، بەخێزانەكەی خۆی گوت: بەنوئیسرائیل لەئێمە شیاوترنین بۆ رۆیشتن بەناو دەریادا، ئیتر تێكڕا هەموویان ملیان لەناو دەریا نا، كاتێك هەموویان كەوتنە ناوەڕاستی دەریاوە، پەروەردگار فەرمانی بەدەریا كرد: كە وێك بێتەوەو هەموانیان لەنێوخۆ بگرێ، ئەوەبوو دەریا وێك هاتەوەو كەسیان رزگاریان نەبوو، ئیتر شەپۆلەكانی دەریا جەستەكانیانی بەرزو نزم دەكردەوەو فیرعەون ژێر شەپۆلەكان كەوتو مەرگ یەخەی پێ گرت، ﴿حَتَّى إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ﴾ هەتا خنكان لێی نزیك بووەوو دڵنیا

بوو: تازە رزگاربوونی نیە ﴿قَالَ آمَنْتُ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ وَأَنَا مِنْ الْمُسْلِمِينَ﴾ وتی: بڕوام هێنا: کە هیچ خودایەك نیە جگە لەو خودایەی: کە نەتەوەی ئیسرائیل ئیمانیان پێ هێناوە، وە من لەپێڕی موسوڵمانانم. من یەکێکم لەوانەی گەردنکەچی فەرمانی پەروەردگارم، من کە لەوەپێش ئینکاری ئایەتەکانی خودام دەکردو بەربەرەکانی پێغەمبەرەکەیم دەکرد، ئێستا وا پەشیمان بوومەوەو ئیمانم هێناوە. سێ جار ئیمانهێنانی خۆی راگەیاند بەتەمای ئەوە بوو: ئیمانی لێ وەربگیرێو لەخنکان ڕزگاری ببێ، بەڵام تازە کار لەکار ترازاوەو ئەو سەردەمە تێپەڕی ئیمانهێنان قبوولّ بێ، ئیمانهێنانەکەی کاتی نائومێدیو دەس لەخۆبەردانو غەرغەرەی مردن بووەو لێی وەرناگیرێ. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا قَالُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ مُشْرِكِينَ، فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا سُنَّتَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْكَافِرُونَ﴾غافر/٨٤-٨٥.

بۆیە پەروەردگار لەوەڵامی فیرعەوندا دەفەرموێ: ﴿آلْآنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنْ الْمُفْسِدِينَ؟﴾ ئایا ئێستا ئیمان دەهێنی، تازە بڕوا بەدەسەڵاتو خودایەتی خوداو پەیامی موسا دەکەی؟ لەحاڵێکدا تۆ لەوەپێش لەخودا یاخی بووی‌و خەریکی ئاشوبگێڕانو فیتنە جۆیی بووی لەسەر زەوی، بۆ خۆت گومڕاو سەرلێ شێواو بووی، هەمیشە خەریکی گومڕاکردنی کەسانی دیکە بووی. ئێستا کە لەژیان نائومێد بوی‌و دەزانی کارلەکار ترازاوە ئەمجار ئیمان دێنی؟! بۆچی پێش ئەوەی دەرگای تۆبەو پەشیمانیت لەسەر دابخرێ ئیمانت نەهێنا؟!

﴿فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً﴾ ئەمڕۆ لاشەکەت بەبێ گیان بەرز دەکەینەوە بۆ سەر بەرزاییەك، ئەوانەی بڕوایان بەلەناوچوونی تۆ نیە بادڵنیا بن لەمردنی تۆ، بۆ ئەوەی ببیتە پەندو عیبرەت بۆ ئادەمیزادانی دوا خۆت، بەتێفکرین لەسەرەنجامو بەسەرهاتی تۆ تەمبێ ببن، واز لەسەرپێچی فەرمانی

خودا بێنن، واز لەکوفرو بێدینی بێنن، چیدی ئاشوبو فیتنە لەسەر زەوی بەرپا نەکەن. شەریك بۆ خودا دانەنێن‌و لافی خودایەتی لێ نەدەن. تەمبێ ببن‌و بزانن خودا وادەو بەڵێنی خۆی بەجێ دێنێ، ئەو وادەی کە داویەتی بەپێغەمبەران ئەنجامی دەدا، هەروا هەڕەشەی بۆ دوژمنانی ئەنجام دەدا!

دەی باملهوڕەکانی مەککەو هەموو ملهوڕانی تر بترسن لەقارو غەزەبی خودا، چونکە پەروەردگار کەمالی قودرەت‌و زانیاری تەواوی هەیەو بەویستو ئیرادەی خۆی چی بوێ دەیکاو چۆنی حەز لێ بێ ئاوا ئەنجامی دەدا.

فیرعەون نازناوە بۆ پاشاکانی میصر. ناوی خۆی منپیتاح بووە کوڕی رەمسیس بووە ساڵی ١٢٢٥ی پ.ز تۆپێندراوە.

پاش خنکانی لەناو دەریادا لاشەکەی رزگار کراوە، تا ئێستا ئەو جەستەیە لەمۆزەخانەی شوێنەواری میصریدا لەشاری قاهیرە هەڵگیراوە، زۆر کەس کە دەچێ بۆ سەیری ئەهرامەکان‌و شوێنەوارەکانی قاهیرە ئەولاشەیە بەچاوی خۆی دەبینێ. وەکوو دەڵێن: ئێستاش شوێنەواری سوێراوی ئاوی دەریای پێوەدیارە.

بەدەرخستنەوەی لاشەکەی فیرعەون پەندو ئامۆژگارییە بۆ هەموو ملهوڕێك، بۆ هەر کەسێك لافی خودایەتی لێ بداو بڕوای بەتاك‌و تەنهایی خودا نەبێ.

لاشەکەی فیرعەون ئەوەمان تێدەگەیەنێ کە ئەو زۆر لەوە کەمترە ببێتە خودا، چونکە خودا نابێ بمرێ، دەبێ هەمیشە زیندوو بەئاگابێ.

ڕاڤەکەرانی قورئان دەفەرمون: حیکمەت لەڕزگارکردنی لاشەی فیرعەون دوای خنکانی ئەوەیە: کەسانێك هەبوون پێیان وابوو: فیرعەون خودایەو نامرێ، ئیتر پەروەردگار ویستی خەڵکی بەچاوی خۆیان بەمردویی ببینن‌و بەو شێوە زەلیل‌و هیچ‌و پووچییە چاویان پێ بکەوێ‌و دڵنیابن کە گۆڕەهو بووە. بزانن ئەو کەسەی

دوێنێ لافی خودایەتی لێ دەداو ئەو هەموو پلەو پایەی بۆخۆی دانابوو ئەمڕۆ چەند زەلیلو بێ دەسەڵاتو هیچ لەبارانەبووە!

﴿وَإِنَّ كَثِيراً مِنْ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ﴾ واتە: زۆربەی زۆری ئادەمیزادان بێ ئاگان لەبەڵگەو دەلیلی جۆراو جۆری ئێمە دەربارەی ئەوەی کە عیبادەت تەنیا بۆ خودایەو کەسی تر شیاوی خودایەتی نیە، بەو نیشانەو بەڵگانە پەند ئامێز نابن، عیبرەت وەرناگرن، چونکە بیر لەهۆکارو ئاکامی رووداوەکان ناکەنەوە!

ئەمجار پەروەردگار پەردە بەسەر مەشهەدی کۆتایی دیاردە دڵتەزێنەکان دادەداتەوە، پەردە بەسەر مەشهەدی یاخی بوونو فەسادو رکەبەریو تەحەدداکردنی خوداو بەندایەتی بۆنەکردنیدا دادەداتەوەو بەچاوتروکانێك دیمەنێکی تر دێنێتە پێشەوەو، سەرەنجامی بەنوئیسرائیلییەکان لەدوا لەناوچوونی فیرعەونو ڕوداوی چەند سەردەمو چینو توێژێکیان دەخاتە سەرشاشەی تەلەفیزیۆنی خوداییو دەفەرموێ:

﴿وَلَقَدْ بَوَّأْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ مُبَوَّأَ صِدْقٍ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنْ الطَّيِّبَاتِ﴾ بێگومان دوای فەوتانو لەناچوونی فیرعەون، نەتەوەی ئیسرائیلمان لەشوێنێکی گونجاوو لەبار نیشتەجێ کردن، ڕزقو ڕۆزی زۆرو زەبەندەمان بەسەردا باراندن، لەوڵاتی شامو فەلەستیندا نیشتەجێمان کردن، لەوڵاتێکی ئاودارو سازگارو ئاوو هەوا گونجاودا ژیانیان بەسەر برد، خێرو بێری زۆرمان بەسەردا رشتن، میوەو دانەوێڵەو ئاژەڵو باخو بێستانو جۆرەها وەسائیلی بەختەوەریو زینەتمان بۆ دابین کردن؛!

بێگومان لەوەپێش پەروەردگار لەسەر زوبانی پێغەمبەرانی وەکوو حەزرەتی ئیبراهیمو ئیسحاقو یەعقووب وادەی بەبەنوئیسرائیلییەکان دابوو: کە خاکی فەلەستینیان بداتێ بەڵام: کە لەدواییدا بڕوایان بەپێغەمبەرانی نێردراو بۆ سەریان نەکرد، بەتایبەتی: کە بانگەوازی حەزرەتی عیساو حەزرەتی

موحەممەدیان ڕەتکردەوە، پەروەردگار ئەو خەلافەتەی لێ ستاندنەوە، ئیتر لەوەدوا هیچ مافێکی نیشتەجێ بوونیان لەخاکی فەلەستیندا نەماوە..

**زانایانی تەفسیر دەربارەی پێناسەی بەنوئیسرائیل لەم ئایەتە دوو ڕایان هەیە :**

١- هەندێکیان دەڵێن: مەبەست بەبەنی ئیسرائیل لێرەدا ئەو جولەکانەن: کە لەسەردەمی حەزرەتی موسادا بوون! جا بەگوێرەی ئەم ڕایە، مەبەست بە(مبوأ صدق) وڵاتی میصرو شامە. مەبەست بە(طیبات)یش خێرو بێری ئەو وڵاتانەیە.

٢- هەندێکی تریان دەڵێن: مەبەست بە(بني اسرائیل) ئەو جولەکانەی هاوچەرخی پێغەمبەری ئیسلامن ﷺ ئەمە ڕای زوربەی زۆری ڕاڤەکەرانی قورئانە. دەڵێن: مەبەست هۆزو خێڵە جووەکانی مەدینەو دەوروبەری مەدینەن، واتە: (بەنوقورەیظەو بەنونەضیرو بەنوقەینوقاع)ن. دەڵێن: مەبەست بە(مبوأ صدق) وڵاتی نێوان مەدینەیەو مەبەست بە(الطیبات) ئەو میوەو بەرو بوومەیە کە لەو وڵاتەدا هەیە. مەبەست بە(العلم) لەئایەتی دوایىدا قورئانی پیرۆزە، بەمەجاز بەقورئان دەگوترێ: عیلم، چونکە هۆی عیلمو زانیارییە.

﴿فَمَا اخْتَلَفُوا حَتَّى جَاءَهُمْ الْعِلْمُ﴾ واتە: بەنوئیسرائیلیەکان نەکەوتنە دوبەرەکیو ڕاجیاییەوە دەربارەی ئایینی خۆیان ئیللا پاش ئەوەی زانیارییان دەستگیر بوو، تەوڕاتیان خوێندەوە، حوکمەکانی فێر بوون، یان ئەوان نەکەوتنە ناو کێشەو دووبەرەکیو ئیختلافەوە دەربارەی حەزرەتی موحەممەد ﷺ ئیللا پاش ئەوەی ڕاستی ئەو زاتەیان بۆ دەرکەوت، ڕەوشتو نیشانەو موعجیزەکانیان بینین، چونکە ئەوان پێش هاتنی پێغەمبەری ئیسلام دانیان دەنا بەپێغەمبەرایەتی پێغەمبەرێك: کە ناوی موحەممەدە، کۆك بوون لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی، دەیانگوت هەر لەگەڵ ئەو پێغەمبەرە هات ئێمە نیشانەو ڕەوشتەکانی دەزانین خێرا پێش هەموو کەس ئیمانی پێ دەهێنین، چونکە ئەوان وەکوو کوڕی خۆیان

دەیانناسی، لەم بارەوە کە نیشانەکانی لەکتێبە ئاسمانیەکاندا ڕوون کرابووەوە، لەتەوراتو ئینجیلدا نووسرابوو ئەوان دەیانخوێندەوە. کەچی کە پێغەمبەر ڕەوانە کراو بانگەوازی خۆی بڵاو کردەوە، ئەو کەسەی: کە سەدەها ساڵ بوو لەکتێبەکانی خۆیاندا ناونیشانەکانیان دەزانیو لافی ئەوەشیان لێ دەدا هەر کە ڕەوانە کرا خێرا بڕوای پێ بکەن، کەچی کە هاتە سەریان بڕوایان پێ نەکرد، بڕێکیان لەبەر حەسوودیو پلەو پایە خۆشەویستیو دەسبڕینی خەڵکی نەفام ئیمانیان پێ نەهێناو بانگەوازییەکەیان ڕەتکردەوە، بڕێکی تریشیان ئیمانیان پێ هێنا.

بەکورتی ئەوان لەهیچ مەسەلەیەکدا لەبەر نەزانی نەکەوتنە دووبەرەکیو کێشەوە، بەڵکوو پاش ئەوەی زانیارییان دەستگیر بوو، ئەو کاتە ڕاجیاییو کێشەیان تێکەوت: کە دەبوایە دووبەرەکییان تێ نەکەوێ.

﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ واتە: بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد! ڕۆژی قیامەت ناوانیان دەکاو دەربارەی ئەو مەسەلانەی تێیاندا کەوتوونە کێشەوە حوکمو بڕیاری عادلانەی خۆی دەردەکا، حەقو بەتاڵ لێك جیا دەکاتەوە، ڕاستالان ڕزگار دەکاو دەیانخاتە بەهەشتەوە گومڕایانیش دەخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

## جەخت کردنەوە لەسەر ڕاستی قورئان دەربارەی ئەو وادەو بەڵێنانەو هەڕەشانەی تێیدا هاتوون

﴿ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا

تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ
بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ
كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴿٩٧﴾ ﴾.

دوای ئەوەی پەروەردگار هەواڵی لەچیرۆکی پێغەمبەرانی ڕابردوودا؛ باسی سەرگوروشتەی حەزرەتی (نوحو موساو هارون)ی بۆ کردین: کە چۆن یارمەتیدانو بەسەر ناحەزانیاندا زاڵی کردن؛ باسی دووبەرەکی نێوان بەنوئیسرائیلییەکانی کرد بەتایبەتی لەکاتێکدا زانیارییان پێگەیشتو حەقیقەتیان زانی، حەسوودیو خۆویستیو مادەپەرستیو کورسی خۆشەویستی وای لێ کردن کە بڕوا بەپێغەمبەری ئاخیرزەمان نەکەن، ئەمجار ئەو شتانە دەخاتە ڕو کە ڕاستی قورئان دەچەسپێنێ دەربارەی ئەو وادەو بەڵێنانەی تێیدا هاتوونو ئەو هەڕەشانەی لەخۆی گرتوونو ڕو دەکاتە پێغەمبەرو مەبەستی ئومەتەکەیەتیو دەفەرموێ:

﴿فَإِنْ كُنْتَ فِي شَكٍّ مِمَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! ئەگەر لە(فەرزی مەحاڵدا) شكو گومانت لا پەیدا بوو دەربارەی ڕاستی ئەو قورئانەی بەنیگا بۆت نێردراوەو چیرۆکی پێغەمبەرانی ڕابوردووی وەکوو حەزرەتی هوودو نوحو موساو هارونو هی تریشی لەخۆگرتووە، لەفەرزێکدا گومانت لەحەقیقەتو ڕاستیدا هەبوو، ئەوە ﴿فَاسْأَلِ الَّذِينَ يَقْرَءُونَ الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكَ﴾ تۆ پرسیار لەزاناکانی ئەهلی کیتاب بکە، لەماڵەکانی جولەکە بپرسە؛ لەئەوانە پرسیار بکە کە لەپێش تۆدا تەوراتیان خوێندۆتەوە، ئەوان زانیارییەکی تەواویان هەیە دەربارەی ڕاستی ئەو نیگایەی بۆ تۆ نێردراوە.

لەڕاستیدا هیچ کاتێ پێغەمبەر دەربارەی ڕاستی پەیامەکەی‌و نیگاو سروشێ: کە بۆی دەهات گومانی نەبوەو پرسیاریشی لەماڵەکانی جولەکە لەم بارەوە نەکردوە، وەکوو ریوایەت کراوە لەپێغەمبەرەوە ﷺ دەیفەرموو: (لا أشك ولا أسأل) دەی کەوابێ: ئەوە مانای چی؟ ئەگەر شكو كومانت هەبوو؟ هەڵبەتە مەبەست بە ﴿فَاسْأَلِ الَّذِينَ يَقْرَءُونَ الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكَ﴾ ئیحالە کردنیانە بەزانین‌و زانست نەك وەصفدارکردنی پێغەمبەربێ بەشكو گومان.

ئیبنو عەبباس فەرموویەتی: نە، سوێندم بەخودا هەرگیز پێغەمبەر ﷺ چاولێك نانێك گومانی نەبوە، لەهیچ ماڵێکی جولەکە پرسیاری نەکردوە، دەیفەرموو: (لا أشك ولا أسأل) بەڵکوو شایەدی دەدەم کە ئەو قورئانە حەقەو لەحەقەوە هاتووە.

ڕای پەسەند بۆ ڕاڤەکردنی ئەو ئایەتە ئەوەیە: کە بڵێین: خیطابەکە بۆ بیسەرە (جا هەر بیسەرێك بێ) یان خیطابەکە بۆ پێغەمبەرەو مەبەست ئومەتەکەیەتی. ئەمەش جۆرە تەعبیرێکی باوو بارپێوەگرتووە لەزمانی عەرەبیدا، هەروەها دانانی ئەگەر لەشتێکدا، بۆ نەفیی ئەگەری هەبوونی، جۆرە تەعبیرێکی ئولفەت پێوەگیراوە لەناو عەرەبدا. وەکوو ئەوە حەزرەتی عیسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ﴾المائدة/١١٦. لێرەدا حەزرەتی عیسا دەزانێ کە ئەو قسەیەی نەکردوە، وەلێ بەشێوەی ئەگەرو فەرزی مەحاڵ ئاڕاستەی دەکا بۆ ئەوەی بیکاتە بەڵگە: کە ئەو قسەیەی نەگوتووە. چونکە ئەگەر بیگوتایە، خودا دەیزانی ئاخۆ گوتویەتی یان نەیگوتووە.

وەلێ ئەم جۆرە ئاڕاستە کردنە تیلنیشانی ئەوە دەکا: کە ئەو کاتە پێغەمبەر ﷺ تووشی چەند ناڕەحەتی‌و ئەزمەی یەك لەدوایەك بووە، بەتایبەتی ئەو ئەزمەو ناڕەحەتیانەی دوای روداوی شەورەوی (الأسراء) تووشیان هات؛ ئەوەبوو: بڕێك لەوانەی موسوڵمان بوبوون پاشگەزبوونەوە، چونکە بڕوایان بەمیعراج

نەكرد.لەدوای مردنی خاتوخەدیجەی خێزانیو مردنی ئەبوطالیب، فشار خستنە سەر پێغەمبەرو هاوەڵانی لەلایەن كافرەكانی قورەیشەوە زیاتر پەرەی سەند، تا ئەندازەیەك بانگەوازی ئیسلامی جۆرە راوەستانو جمودێكی بەسەردا هات؛ هەموو ئەم دیاردانە كاریان لەدڵو دەروونی پێغەمبەر ﷺ كرد، ئیتر پەروەردگار بەم جۆرە جەخت لەسەركردنە ئەو كارداناوەیە لەدڵو دەروونی پێغەمبەر دەردەهاوێو زێدە یەقینی پێ دەبەخشێ!

دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ جَاءَكَ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ فَلا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ﴾ سوێند بێ پەیامی حەقو راستو ئاشكرات بۆ هاتووە، هیچ شكو گومانی تێدا نیە، ئەو هەواڵانەی لەقورئاندا بۆت هاتوون راستو حەقن، تۆ فروستادەو رەوانەكراوی پەروەردگاری، جولەكەو مەسیحییەكان ئەو راستییە دەزانن چونكە لەكتێبە ئاسمانییەكانی خۆیاندا نیشانەو وەصفی تۆیان خوێندۆتەوەو دەزانن، كەوابێ هیچ گومانت لەپێغەمبەرایەتی خۆتدا نەبێ، دڵنیابە ئەوەی بۆت نێردراوە ڕاستو حەقە.

ئەمەش دڵنیاكردنێكی ترە بۆ موسوڵمانانو پێ زاناندنیانە: كە ناونیشانو رەوشتی پێغەمبەرەكەیان لە كتێبە ئاسمانییەكانی پێشوودا تۆمار كراوەو لای خاوەن نامەكان عەیانو نومایانە.. وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوباً عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ﴾الأعراف/١٥٧.

﴿وَلا تَكُونَنَّ مِنَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر بەهیچ جۆرێك نەچی لەپێڕی ئەوانەبی: كە ئایاتی خودا بەدرۆدەخەنەوە، بەڵگەكانی تاكو تەنهایی خودا رەت دەكەنەوە، دەڵێن: خودا ناتوانێ ئادەمیزاد بكاتە پێغەمبەرو رەوانەی بكا بۆ سەر گەلو نەتەوەكان، ئەگەر وا بكەی دەچیە پێڕی ئەوانەی خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت بوون، خودی خۆیان بەخەسار داوە،

خۆیان لەئیمانهێنان بێبەش کردوە، کامەرانیو خۆش بەختی دونیاو قیامەتیان لەکیس خۆیان داوە.

ئەمجار ئەگەر ئەوەی بۆ پێغەمبەر هاتووە پەیامی حەقەو شكو گومانی تێدا نیە، ئەی هۆ چیە ئەو خەڵکە لەسەر سەرپێچی کردنو گوێ پێنەدان بەپەیامی حەق بەردەوامن؟!

هۆیەکە ئەوەیە: قەزاو قەدەری خودا، دابو نەرێتی پەروەردگار داخوازی ئەوەیە: هەر کەسێك ئەسبابی هیدایەت دەستەبەر نەکا هیدایەت نادرێ، کەسێك چاو نەکاتەوە روناکی نابینێ، کەسێك هەستەکانی خۆی لەکاربخا سوودیان لێ نابینێ، سەرەنجامی بۆ گومڕاییەو سەرێ لێ شێواوە، هەرچەندە بەڵگەو نیشانە هەبن ئەگەر هەستیارانە تێیان نەفکرێ، ئامادەباشی هیدایەتی تێدا نەبێ هیچ کەڵکێك لەو بەڵگانە نابینێ، چونکە ئەمە دابو نەرێتو باوی خودایەو وای بڕیار داوەو دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لا يُؤْمِنُونَ﴾ ئەوانەی بڕیاری خودایان بۆ دەرچووە بەوە: کە سزایان بدا، حوکمی خودایان بەسەردا چەسپاوە بەسزا بەگوێرەی سوننەتی پەروەردگار لەمەخلووقاتی خۆیدا لەم ڕووەوە: کە ئامادەباشی ئەوەیان تێدا نیە هیدایەت وەربگرن، ئەوانە هەرگیزاو هەرگیز ئیمان ناهێنن، چونکە لەکوفرو یاخیبووندا ڕۆچوون، لەتاواندا نقوم بوون، پشتیان لەنیشانەکانی خودا هەڵکردوە، ڕوو لەو بەڵگانە وەردەگێڕن کە خودا لەبوونەوەردا دایناون.

ئەمەش مانای وا نیە خودا ڕێگای ئیمانهێنانیان لێ دەگرێو ناهێڵێ موسوڵمان بن، بەڵکوو مانای وایە: ئەوان بۆخۆیان ڕێبازی کوفریان هەڵبژاردوەو کەسبی بێدینییان کردوە!

بەکورتی کەسێك بەگوێرەی زانیاری خودا کافربوو، یان موسوڵمان بوو، دەبێ ئەو کوفرە یان ئەو ئیمانەبێتەجێ، چونکە زانستی خودا هەڵە ناکا.

جا هەر کەسێك لەعیلمی خودادا بەکافر دانرابێ‌و بڕیاری خودا لەسەر کافر بوونی درابێ ئەوانە ئیمان ناهێنن. ﴿وَلَوْ جَاءَتْهُمْ كُلُّ آيَةٍ حَتَّى يَرَوُاْ الْعَذَابَ الأَلِيمَ﴾ تەنانەت ئەگەر هەموو ئایاتو نیشانە کەونییەکانیان بۆ بێ بەچاوی خۆیان بیانبینن، هەرچی نیشانەی زانستی‌و قورئانی هەیە بۆیان بێ ئەوانە ئیمان ناهێنن، چەند نیشانەو موعجیزەی موسا کە قوڕەیشییەکان داوات لێ دەکەن بۆیان بنوێنی، وەکوو هەڵقوڵانی جۆگەو جۆبار، بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان، دارایی باغو باغات، قورئان کە بۆخۆی نیشانەی ئەوەیە: کە لەخوداوە هاتووە، ئەگەر ئەم نیشانانەو دەیان بەڵگەی تری سەرناسا ببینن ئەوانە بڕوا ناکەن، هەتا سزای بەئێش‌و ئازارو کوشندەیان بۆ نەیێ، ئەو کاتەش ئیمانهێنان بێ سوودە، وەکوو چۆن ئیمانهێنانی فیرعەون سوودی نەبوو، چونکە ئیمانهێنانی سەرەمەرگ بوو، ئیمانی سەرەمەرگو کاتی غەرغەرە وەرناگیرێ. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَا إِلَيْهِمُ الْمَلآئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ الْمَوْتَى وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَيْءٍ قُبُلاً مَّا كَانُواْ لِيُؤْمِنُواْ إِلاَّ أَن يَشَاءَ اللّهُ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ﴾الأنعام/١١١.

## چیرۆکی حەزرەتی یونس ﷺ لەگەڵ نەتەوەکەیدا

﴿ فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ
لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْيِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا
وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٩٨﴾ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ
كُلُّهُمْ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ

﴿٩٩ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَجْعَلُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ١٠٠﴾

ئەمە چیرۆکی سێیەمە لەو چیرۆکانەی ئەم سوورەتە لەخۆی گرتوون، ئەم بەسەربردەیە: چیرۆکی حەزرەتی یونسە ﷺ!

ئەم سێ ئایەتانەی ئێرە تەواوکەری مانای ئایەتەکانی پێشوونو دابو نەرێتی پەروەردگار لەبوونەوەردا شی دەکەنەوە: کە چۆن هەڵسو کەوتی کردوە لەگەڵ ئەو نەتەوانەی پێغەمبەریان بۆسەر رەوانە کراون. هەروەها باسی ئەوەش دەکەن: کە پەروەردگار ئادەمیزادی وا دروست کردوە ئامادەباشی ئیمانهێنانو مانەوە لەسەر کوفرو کردنی کاری خێرو شەڕیان تێدابێ!

ئەوەتا پاش ئەوەی پەروەردگار لەئایەتی پێشوودا ئەوەی راگەیاند: کە ئەوانەی لەزانستو زانیاری خودادا بڕیاری کوفرو بێدینیان بۆ دراوە ئیمان ناهێننو هەر بەکافری دەمێننەوە، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا ئەم ئایەتانەی هێنان بۆ ئەوەی ببنە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە گەلی (یونس) پاش کوفرو بێدینی ئیمانیان هێناو ئیمانهێنانەکەشیان سوودبەخش بوو بۆیان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ: کە کافر دوو بەشن؛ بەشێکیان، خودا بڕیاری داوە بەکافریی بمێننەوەو لەسەر کوفر بمرن. بەشێکیشیان خودا دەربارەیان بڕیاری داوە کە ئیمان بێننو بەموسوڵمانی بمرن، هەر شتێکیش خودا بڕیاری لەسەر دابێ دێتەجێ.

پەندو عیبرەتیش لەهێنانی ئەم چیرۆکو بەسەربردانە (چیرۆکی حەزرەتی نوح، چیرۆکی حەزرەتی موسا، چیرۆکی حەزرەتی یونس) رەددانەوەی پڕوپاگەندەو چەواشەکاریی کافرەکان بوو، کە بەشێك لەو چەواشەکارییە ئەوەبوو: پێغەمبەر هەڕەشەی لەقوڕەیشییەکان کرد بەسزاو عەزابو عەزابەکەش نەهات. ئیتر

پەروەردگار ئەوە ڕون دەکاتەوە: کە دواکەوتنی هەڕەشەکان کار ناکاتـە سـەر ڕاسـتی هاتنیان، بەبەڵگەی ئەوە پەروەردگار عەزابی لەقەومی نوحو قەومی موساو قـەومی یونس دواخست، پاشان ئەو عەزابە هەڕەشەپێکراوەی بەسـەر گـەلی نـوحو نەتـەوەی موسادا داو بەو دەردەی بردن، وەڵێ عـەزابی قـەومی یونـسی نـەدا چونکە ئیمانیـان هێنا.

وەکوو ئاشکرایە حەزرەتی یونس، چوار جـار لـەقورئاندا بـەناوی خـۆی نـاوی هاتووە، لەسورەتی (النساء/١٦٣)و لەسورەتی (الأنعام/٨٦)و لەسورەتی (یونس/٩٨)و لەسـورەتی (الصافات/١٣٩)دا؛ بـەناوەڵناویش دوو جـار نـاوی هێنـراوە لەسـورەتی (الأنبیاء/٨٧)دا: دەفـەرموێ: ﴿وَذَا النُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَاضِباً﴾و لەسـورەتی (القلم/٤٨)دا کە دەفەرموێ: ﴿فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ الْحُوتِ إِذْ نَادَى وَهُوَ مَكْظُومٌ﴾ ئەم زاتە ناوی یونسە کوڕی (مەتا)یە هەندێك دەڵێن: یونسی کوڕی ئەمەتایە.

پـەروەردگار نیگـای کـردو کـردی بەفروسـتادەی خـۆیو نـاردی بـۆ سـەر دانیـشتوانی نەینـەوا (موصـل) ئـەوانیش بـەدرۆیان خـستەوەو پەیامەکـەیان ڕەتکردەوە، حـەزرەتی یـونس هەڕەشـەی لێ کـردن بـەوە کـە ئەگـەر ئیمـان نـەهێنن پاش ماوەیەك عەزابیان بۆ دێ، هەندێك دەڵێن: ماوەکە چل ڕۆژ بووە.

جا حەزرەتی یونس پـاش ئاڕاستەکردنی ئـەم هەڕەشـە بۆیـان بۆخـۆی بـەرق هەڵساوی ئەو وڵاتەی بەجێ هێشتو بەرەو وڵاتێکی تـر کەوتـە ڕێ. پـاش ماوەیـەك خەڵکەکە ترسانو کەوتنە گەڕان بەشوێنیا نەیاندۆزییەوە، کە وادەی هاتنی عـەزاب نزیك بووەوە، ئاسمان هەورو هەڵا دایگرت، بەری ئاسمـان بەهـەوری ڕەشـی ترسـناك گـیراو هـەورەکان لـەزەوی نزیـك بوونـەوە، بـەجۆرێك شـارەکەیان داپۆشـی، ئـیتر دانیـشتوانەکان بەتـەواوی تینیـان لێ پەیـدا بـوو، بـەدوا حـەزرەتی یـونسدا گـەڕانو نەیاندۆزییـەوە، ئـیتر دڵنیـابوون لەراسـتی هـاتنی عەزابەکـە، هـەموویان پۆشـاکی بزویـان پۆشـی، چوونە دەری شـارو بـەخۆیانو منـداڵو خێـزانو مـەڕو ماڵاتیانـەوە

بێچووەکانیان لەدایکەکان جیا کردەوە، بەم دابڕانە شینو شەپۆرو بارە بارو گارەگارو هۆرە هۆرو دەنگو صەدایەك پەیدا بوو وەکوو رۆژی حەشر، خەڵکەکە هەموویان بەدڵ پەشیمان بوونەوەو تۆبەیان کردو ئیمانهێنانی خۆیان ڕاگەیاندو لەخودا پاڕانەوە، پەروەردگار رەحمی پێ کردنو عەزابەکەی لێ دوور خستنەوە.

وەکوو دەڵێن: ئەو ڕۆژە ڕۆژی جومعە بوو ڕێکەوتی ڕۆژی عاشورا بوو.

ئیمامی طەبەری دەفەرموێ: لەناو هەموو نەتەوەکاندا گەلی یونس تایبەتمەندی ئەوەیان پێ درا کە دوای دەرکەوتنی عەزاب لێیان تۆبەیان لێ وەرگیرا.

زەجاج دەفەرموێ: نەخێر ئەوان عەزابیان نەهاتە سەر بەڵکوو نیشانەکانی عەزابیان بینی، چونکە ئەگەر خودی عەزابەکەیان ببینیایە ئەو کاتە ئیمان هێنانەکەیان سوودی نەدەبوو ئیمانهێنانەکەیان دەکەوتە حاڵەتی غەرغەرە.

لەلایەکی ترەوە حەزرەتی یونس، کە ئەوەندە بانگەوازی کردنو گوێیان پێ نەدا، ڕقی هەڵساو ئەو هەرێمەی جێ هێشتو بەبێ ئەوە ئیزن لەخودا وەربگرێ، بەرەو دەریا کەوتە رێو سواری کەشتییەکی پڕ لەخەڵك بوو، بەهیوای هەڵاتنو دووركەوتنەوە لەو وڵاتە ڕێگای هاتونەهاتی گرتەبەر!

کەسواری گەمێ بوو، گەمێکە کەوتە تەکانو لەشێوە ڕۆیشتنی ئاسایی خۆی کەوتو کەشتیوانەکان ترسان نقووم بێ، زانییان: کە دەبێ لەسەر کەشتییەکە کابرایەك هەبێ هەڵاتوو بێ، پاشان بڕیاریاندا یەکێك لەسەرنشینەکانی فڕێ دەنە ناو دەریاوە، هاتن قورعەیان لەنێوان سەرنشینەکاندا ئەنجام داو قورعە بەر حەزرەتی یونس کەوتو فڕێیان دایە ناو دەریاوە! ماسییەکی زەبەلاح قوتی دا، پەروەردگار یونسی لەهێزی هاضیمەی ماسییەکە پاراست، ماوەیەك لەناو سکی ماسییەکەدا مایەوە، هەمیشە ئەم دوعایەی دووبارە دەکردەوە ﴿لَا إِلَهَ إِلَّا أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾الأنبياء/۸۷.

پەروەردگار نزاکەی قبوڵ کردو پاش ماوەیەك ماسییەکە هاتە کەناری دەریاو فڕێی دایە دەرەوە، بەڵام حاڵی شەکەت بوو، تەندروستی تێك چووبوو جا خودا داری کولەکەی بۆ رواند سێبەرەکەی زۆر سوودمەندبوو بۆ لەش و لاری و پاش ماوەیەك تەندروستی هاتەوە سەرخۆو ئەمجار ناردی بۆ سەر نەتەوەیەك ژمارەکەیان سەد هەزار یان زیاتر بوون، هەموویان ئیمانیان پێ هێناو خودا ئیمانهێنانەکەی لێ قبوڵ کردن.

﴿فَلَوْلا كَانَتْ قَرْيَةٌ آمَنَتْ فَنَفَعَهَا إِيمَانُهَا إِلاَّ قَوْمَ يُونُسَ لَمَّا آمَنُوا كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَى حِينٍ﴾ واتە: دانیشتوانی هیچ شارو شارۆچکەیەك لەو نەتەوانەی پێشوو ئیمانیان بەپێغەمبەرەکەیان نەهێناوە جگە لەنەتەوەی یونس کە دانیشتووی شاری نەینەوا (موصل) بوون لەکوردستانی عێراق، ئەوان ئیمانهێنانەکەیان لەترسی هاتنی ئەو عەزابە بوو کە پێغەمبەرەکەیان هەڕەشەی پێ لێکردبوون، جا کە نیشانەی هاتنی سزاکەیان بینی و هۆکارەکانیان بەدی کردن، لەهەڵوێستی خۆیان پەشیمان بونەوەو هاواریان کردە خوداو لێی پاڕانەوەو ئیمانیان هێناو خودا رەحمی پێکردن و ئیمانی لێ قبوڵ کردن، عەزابی لابردو خستنیە حاڵەتی ئاساییەوەو خودا پەرستانە تەمەنی خۆیان بەسەر برد!!

هەڵبەتە قبوڵکردنی ئیمان لێیان بەپێچەوانەی ئیمانی فیرعەونەوە بوو، فیرعەون کاتێك ئیمانی هێنا کە مردن یەخەی گرتو کەوتە غەرغەرەی مردن و گیانەڵاوەوە. بەڵام قەومی یونس پێش هاتنی عەزابەکەو پێش ئەوەی بکەونە حاڵەتی گیانەڵاوەوە ئیمانیان هێنا، واتە: هێشتا لەحاڵەتو وەزعی ئیختیاریدا بوون: کە ئیمانیان هێنا، بەڵام فیرعەون کاتێك ئیمانی هێنا کە لەحاڵەتی ئیضطراری گیانەڵاودا بوو!!!

لەچیرۆکەکەدا جۆرە هەڕەشەیەك هەیە بۆ قوڕەیشییەکانو دانیشتوانی مەککەو هەڵنانی ئەوانی تێدایە؛ بۆ ئەوەی چاو لەنەتەوەی یونس بکەن پێش ئەوەی بگەنە حاڵەتی نائومێدی لەژیانو گیانەلاو، چونکە عەزاب هەموو کاتێك لەوانەیە بێتەدی، وەکوو چۆن بۆ نەتەوەی فیرعەون هاتەدی!!

﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لآمَنَ مَنْ فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعاً﴾ ئەگەر خودای تۆ ئەی موحەممەد! بیویستایە: کە ئیزن بدا بۆ هەموو دانیشتوانی سەرزەوی بڕوا بەپەیامەکەت بکەنو ئیمانیان تێدا برسکێنیو هیدایەتیان بدا، دەیکردو هەموویان ئیمانیان دەهێنا، وەلێ کە پەروەردگار وای نەکردووەو واناکا حیکمەتێکی تێدایەو بۆخۆی زاناو دانایەو دەزانێ بەرژەوەندی ئادەمیزادان لەچیدایەو چۆنەو چیە؟! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ، إِلاَّ مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَلِكَ خَلَقَهُمْ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لأَمْلأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾هود/١١٨-١١٩.

کەوابێ ئەی موحەممەد! ئەتۆ غەمبار مەبە لەسەر ئەوەی: کە قوڕەیشییەکان ئیمان ناهێنن، ئیمانهێنان دەبێ بەحەزو ئارەزۆ بێ، بەئیختیاریو ئازادیی بێ. ﴿أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ ؟﴾ ئایا تۆ ئەی موحەممەد! زۆرەملێ لەئادەمیزادان دەکەی تا ئیمان بێننو موسوڵمان ببن؟ تۆ ناتوانی زۆری لەکەس بکەی، نابێ بەزۆرەملێ ئادەمیزادان موسوڵمان بکەی، ئەوە کاری تۆ نیە، ئەرکی سەرشانی تۆ نیە. ئەوە عائید بەخودایەو ئەو ئەو کارە دەکا، ئیمان بەزۆرەملێ نابێو حسێب نیە، ئیمانی راستو قبووڵ ئەوەیە: کابرا بەویستو ئیرادەی خۆی هەڵیبژێرێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾البقرة/٢٥٦. یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ﴾ق/٤٥. بەڵکوو ئەرکی سەرشانی تۆ ئەی پێغەمبەر! راگەیاندنو ترساندنو موژدە دانە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا الْبَلَاغُ﴾الشورى/٤٨.

یان دەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ، لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾الغاشية/٢١-٢٢.
یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾القصص/٥٦.
هەموو ئەم ئایەتانەو هی تریش ئەوە دەگەیەنن: کە ئیمانهێنان بەزۆرەملێ ج کەڵکی نیە، ئیمان دەبێ بەویستو ئیرادەو لەناخەوە بێ، چونکە ئیمان ئەوەیە کە لەدڵا جێگیر بووبێو کردەوە گەواهی بۆ بداو نیشانەبێ لەسەری!

﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تُؤْمِنَ إِلاَّ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ ناگونجێ بۆ هیچ ئادەمیزادێك: کە ئیمان بهێنێ مەگەر بەئیرادەو مەشیئەتی خودا نەبێ، دەبێ ئادەمیزادەکە بۆ خۆی لەناخەوە بەرەو ئیمانهێنان بچێ، ئەمجار خودا هۆکارەکانی ئیمانهێنانی بۆ بڕەخسێنێ. بەڵام کەسێك بۆخۆی بەرەو ئیمانهێنان نەچێو هەستو شعووری خۆی بەرەو ئەو ئاستە ئاڕاستە نەکا، ئەوە شیاوی عەزابی خودایە، چونکە دابو نەریتی خودا وایە: کە ﴿وَيَجْعَلُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لا يَعْقِلُونَ﴾ عەزابو غەزەبی خۆی بخاتە سەر ئەو ئادامیزادانەی لەنیشانەو بەڵگەکان ورد نابنەوە، عەقڵو بیری خۆیان ناخەنەکار بۆ ئەوەی ڕێبازی حەقو خودا پەسەند بگرنەبەرو لەبەڵگە عەقڵیو قورئانییەکان وردببنەوە، کەوابێ ئەوان لەبەر ئەوەی عەقڵی خۆیان لەکارخستووە هەستەکانیان بەگوێرەی پێویست بەکار ناهێنن، شوێن هەواو ئارەزۆی خۆیان کەوتوون شیاوی عەزابی خودانو دەیانخاتە ناو دۆزەخەوە.

## تێفکرینو وردبوونەوە لەبوونەوەر واجبە

﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۚ وَمَا تُغْنِي ٱلْأٓيَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠١﴾ فَهَلْ يَنتَظِرُونَ

إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِهِمْ ۚ قُلْ فَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ نُنَجِّى رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ ﴾

دوا ئەوەی پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوودا ئەوەی ڕون کردەوە کە ئیمان پەیدا نابیو ناچێتە دڵانەوە مەگەر خودابەدی بێنیو مەشیئەتی لەسەر بێ، ئەمجار فەرمانی کرد بەتێفکرینو وردبوونەوە لەبوونەوەرو نیشانەکانی خودایەتی خوداو تاکو تەنهایی، بۆ ئەوەی وا گومان نەبرێ کە حەق زۆرەملێیەو خودا دەیەوێ بەزۆرو تۆپزی خەڵك موسوڵمان بێ، فەرمووی: ﴿قُلْ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ ئەرکی سەرشانی هەموو عاقڵو هۆشمەندێکە جوداوازی نێوان خێرو شەڕ بکا، ئەرکی سەرشانی پێغەمبەریش مـوژدەدانو ترساندنە، ئایین یارمەتیدەرە بۆ عەقڵ بۆ ئەوەی ڕێبازی باش هەڵبژێرێ.. جا با قوڕەیشییەکانو نەتەوەکانی تریش بترسن لەو جۆرە عەزابەی تووشی نەتەوەکانی رابوردو بوو بەهۆی سەرپێچیو بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرانیان، چونکە دابو نەریتی خودا ناگۆڕێ، لەهەموو رۆژگارو سەردەمێکدا پێغەمبەرانو خوداپەرستان سەرکەوتوو دەکا، بەدرۆخەرەوەو سەرپێچیکاران بەهیلاك دەباو پاشان توڕیان دەداتە نێو دۆزەخەوە. جا بۆ جەختکردنەوە لەسەر ئەو راستییەی: کە ئایین دەبێ بەئیختیارو قەناعەتەوە وەربگیرێو زۆرەملێی تێدا بەکار نەیە، پەروەردگار فەرمان بەبەندەکانی دەکا کە لەبوونەوەر وردببنەوە، دەفەرموێ: ﴿قُلْ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو سەرڕەقو یاخی بووانە بڵێ: سەیری ئاسمانەکانو زەوی بکەن، بیر لەدروستکردنیان بکەنەوە، بڕوانن چەند بەڵگەو نیشانەی جۆراو جۆرو گرنگ لەئاسمانەکانو زەویو ئەو شتانەی تێیاندایە، لەیاساو

نیظامی سازاوو گونجاویان وردببنەوە، سەیری مانگو خۆرو ئەستێرەکانی تر بکەن، بیر لەئەستێرەو کاکەشان بکەنەوە، لەگۆڕانی شەوو ڕۆژو درێژبوونو کورتییان بفکرن، سەیری بەرزی ئاسمانو ئەستێرەکان بکەن، لەجوانیو رازاوەییان وردببنەوە، تەماشای فراوانیو پانو پۆڕی بوونەوەر بکەن، بڕوانن چۆن پەروەردگار لەلای سەروتانەوە باران دەبارێنیو زەوی زیندوو دەکاتەوە گیاو گژو روەك دەڕوێنێ جۆرەها دانەوێڵەو گوڵو گوڵزارو دارو درەختو بەروبوومو میوەو خۆراکیان لێ وەبەردێنێ!

لەلایەکی ترەوە ئەو هەموو گیانلەبەرەی لەزەویدا خولقاندوە، جگە لەئادەمیزاد جۆرەها ئاژەڵی ماڵیو کێوی، باڵندەو خشۆکی تێدا بڵاوکردۆتەوە، ئەو هەموو دەریاو چۆمو جۆگەو کانیاوو کێوی بەرزو دەشتی کاکی بەکاکیو کوێستانی هەواسازو گەرمەسێری تێدا خولقاندوە، هەریەکێ لەم شتانەو غەیری ئەمانەش بۆخۆیان نیشانەی هەبوونی خودایەکی باڵادەستو بەتواناو زاناو داناو کارسازو هەمیشە زیندوون..

بەراستی تێفکرینو وردبوونەوە لەبوونەوەر ئادەمیزاد شارەزایی دەکا بۆ ئیمانهێنان بەهەبوونی خودایەکی بەدیهێنەرو خولقێنەر، بەراست زانینو بڕواکردن بەپێغەمبەران، ئیمانهێنان بەقورئانو نیگا کە شیکەرەوەی ئەو نیشانانەن.

﴿وَمَا تُغْنِي الآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لا يُؤْمِنُونَ﴾ بەڵام نیشانەو بەڵگە کەونییەکان، قورئانو پێغەمبەرو ترسێنەران چ سوودێك نابەخشێ بەگەلو نەتەوەیەك کە ئومێدی ئیمانیان لێ نەکریو نەفامو گەوج بنو لەبەڵگەو نیشانە جۆراو جۆرەکان وردنەبنەوە. (ئەمە ئەگەر (ما) نافیە بێ).

دەشگونجێ (ما) ئیستفهامیە بێ. ئەو کاتە ماناکە بەم جۆرە دەبێ: چ نیشانەو بەڵگەیەکی ئاسمانی یان هی سەر زەوی چ پێغەمبەرو رەهبەرێك بەموعجیزەو

پەیامەکەوە کەڵکی دەبێ بۆ گەلو نەتەوەیەك: کە بڕوایان بەخودا نیەو بڕوا بەپێغەمبەران ناکەنو عەقڵو هۆشو هەستەکانیان ناخەنە گەڕو وەکوو پێویست ئاڕاستەیان ناکەن!؟

دەبێ ئایاتو موعجیزە، نیشانەو بەڵگە چ ڕۆڵێکیان هەبێ؟ ئەگەر دڵەکان داخرابن، عەقڵەکان لەکارخرابن، ئامێری پێشوازیو وەرگرتن لەسروشتی ئادەمیزاددا پەکیان کەوتبێ؛ بەڵکوو ئادەمیزاد پەردەیەکی ئەستووری لەنێوان خۆیو بوونەوەردا دابێتەوەو چاوی سەرو دڵی نوقاندبنو گوێچکەی هاخنیبنو ذکرو تەسبیحی بونەوەر نەبیسێ!.

بێگومان بوونەوەر هەمووی خوداناسو موسوڵمانە، خاوەنی خۆی دەناسیو تەسبیحاتی تایبەتی خۆی دەکاو گەردنکەچو فەرمانبەردارە، هەموو شتێکی بوونەوەر خودا دەناسیو تەسبیحاتی دەکا، هەموو زیندوێکی ناو بوونەوەر (جگە لەبڕێ ئادەمیزاد) هەموویان خوداناسن هەموویان خەریکی ذیکرو تەسبیحاتی خودان، بەڵام ئێمە لەذیکرو تەسبیحاتەکەیان حاڵی نابین یان گوێمان لێ نیە.

سەیرە ئادەمیزاد لەم بوونەوەرەدا دەژیا: کە هەموو زرڕەو گەردیلەیەکی، هەموو دارو درەختو گژوگیاو ئاژەڵو باڵندەو خشۆکو چۆمو دەریاو کانیاوو دۆڵو شیوو کێوو دەشتی، هەموو ئاسمانەکانو شتی ناویان بەمانگو خۆرو ئەستێرەکانیانەوە ئاوازی ئیمانو ئیسلام بۆ یەکتر دەستێننەوە، لەجمو جۆڵو هاتوچۆی سروشتی خۆیاندا گەردنکەچی یاساو نیظامی پەروەردگارن، ئادەمیزادیش بۆخۆی بیەویو نەیەوێ هاوبەشی بوونەوەر دەکا لەوتنەوەی ئەو صەداو ئاوازەدا، لەجمو جۆڵی سروشتیدا بەو شێوەیەی خودا بۆی مەزندە کردوە!!

هەر کائینێکی بەشەری بەفیطرەتو سروشتی خۆی هەست بەم تەسبیحو ذیکرە نەکا، ئامێرە فیطریو هەستەکانی باوەش بۆ ئەو شەپۆلە ئیمانییە کەونیانە نەگرێتەوەو لەئامێزیان نەگرێ، کائینێکە ئامێری پێشوازیو بەپیرەوەهاتنی بۆ

شەپۆلە ئیمانییەکان تێیدا پەك کەوتوو لەکارکەوتوونو ستۆکن بەکێشەو جەدەل دەرگای دڵو عەقڵی ناکرێتەوە، بۆیە پێویستە رێگاچارەی تری بۆ بدۆزێتەوە، هەوڵ بدرێ ئامێری پێشوازیو بەپیرەوەچوونی بانگی سروشتی تێدا بەئاگا بهێندرێتەوە، شاراوە سروشتییەکانی ناوکییانو هەستیان وەجوڵە بخرێ بەڵکوو بکەوێتە کارو شەحن ببێتەوە. کەوابوو سەرنج راکێشانی هەستو دڵو عەقڵ بۆ ورد بوونەوە لەو حەشاماتەی لەئاسمانەکانو زەویدا هەن هۆکارێکن لەهۆکارەکانی مەنهەجی قورئان بۆ زیندوکردنەوەی دڵەکان، بەڵکوو بکەونەوە گەرو دەست بکەنەوە بەجمو جۆڵی سروشتی خۆیانو بەپیر بانگەوازی پەیامی خوداوە بێن.

بەڵام ئەو بەدرۆخەرەوە نەفامە عەرەبانەو هاووێنەکانیان لەبوونەوەر وردنابنەوە، بەپیر بانگەوازی پەروەردگارەوە نایەن، دەی ئەوانە چاوەڕوانی چی دەکەن؟!

بێگومان دابو نەریتی خودا ناگۆڕێ، سەرەنجامی یاخی بوانو بەدرۆخەرەوان ئاشکراو نمایانە، نابێ چاوەڕوانی ئەوەبن دابو نەریتی خودا گۆڕانکاری تێدا پەیدا بێ، وا دەبێ خودا ئەو نەفامانە مۆڵەت دەداو عەزابی ریشەکێشیان بۆ نانێرێ، بەڵام ئەوانەی سوورن لەسەر بەدرۆخستنەوەی فروستادەکانی خوداو ئایینی ئیسلام رەت دەکەنەوە هەردەبێ تۆڵەیان لێ بستێنێ.

﴿فَهَلْ يَنتَظِرُونَ إِلاَّ مِثْلَ أَيَّامِ الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلِهِمْ﴾ ئەی موحەممەد! ئایا ئەو موشریکانەی پەیامی تۆ بەدرۆ دەخەنەوە چاوەڕوانی چی دەکەن لەبەلاّو عەزاب جگە لەو جۆرە عەزابو ئافاتانەی تووشی نەتەوە بەدرۆخەرەوەکانی پێشو هات، ئەگەر ئەوان بەردەوام بن لەسەر هەڵوێستی ناشیرینی خۆیان با چاوەڕوانی هەمان عەزابو بەسەرهاتی گەلەپێشینەکانی پێش خۆیان بن، با بزانن ئەوەی بەسەر گەلی نوحو نەتەوەی عادو ئەموودو هی تریش هات، ئەو عەزابو روداوانەی ئەوانی

ریشەکێش کرد دوورنیە ئەمانیش بگرێتەوە، چونکە دابو نەریتی خودا ناگۆڕێ ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً﴾الأحزاب/٦٢.

﴿قُلْ﴾ ئەی موحەممەد! بەو موشریکانە بڵێ: هەڕەشەیان لێ بکە، بیانترسێنە، پێیان بڵێ: ﴿فَانْتَظِرُوا﴾ چاوەڕوانی عەزابی سەختی پەروەردگار بن ﴿إِنِّي مَعَكُمْ مِنَ الْمُنْتَظِرِينَ﴾ منیش لەگەڵتاندا چاوەڕوانی لەناوچونتانم بەعەزابی ریشەکێشکەری پەروەردگار.

یان: ئێوە چاوەڕوانی فەوتانی من بن، منیش لەگەڵتاندا چاوەڕوانی لەناوچوونی ئێوەم بەعەزابی سەختی بێ ئامان. یان چاوەڕوانی بەدی هاتنی بەڵێنی خودام، چاوەڕوانی ئەو وادەو بەڵێنانەم کە خودا بەمنی داوە دەربارەی لەناوچوونی ئەو کەسانەی سوورن لەسەر سەرپێچیو یاخی بوون.

﴿ثُمَّ نُنَجِّي رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا﴾ پاشان پێغەمبەرانمانو ئەوانەی ئیمانیان پێ هێناون ڕزگاریان دەکەین.

سوننەتو دابو نەریتمان دەربارەی پێغەمبەران لەگەڵ نەتەوەکانیان کە بانگەوازییان کردونو پەیامی خودایان پێ گەیاندونو ترساندویانن لەسەرەنجامی هەڵوێستی نالەباریان. جا هەندێ لەنەتەوەکان ئیمانیان پێ هێناونو شوێنییان کەوتوون، هەندێکیشیان سوور بوون لەسەر بەردەوام بوون لەسەر کوفر، دابو نەریتمان وابووە، کە بەدرۆخەرەوەکان لەناوبەرینو پێغەمبەرانمانو شوێنکەوتوانیان رزگار بکەین.

﴿كَذَلِكَ حَقّاً عَلَيْنَا نُنجِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ وەکوو ئەو ڕزگار کردنەی گەلە موسوڵمانە پێشینەکانمان پێ ڕزگار کردن، بەو شێوە موسوڵمانە شوێنکەوتووەکانی تۆش ئەی موحەممەد! ڕزگار دەکەین، ئەمە بەڵێنێکەو داومانەو لێی پاشگەز نابینەوە!

ئەمە بەڵێنو وادەی پەروەردگارە لەسەر خۆی پێویست کردوە، بڕیاری داوە ئەنجامی بدا، بڕیاری داوە: کە تۆوی ئیمانو موسوڵمانان بەردەوام بێو بڕوێو لەهەموو ناڕەحەتیو ناخۆشییەکدا بەسەر بەرزی رزگاری بێ، لەهەموو خەتەرو تەنگو چەڵەمەیەك بپەڕێتەوە، دوای هەموو بەدرۆخستنەوەو سزاو ئازارێك سەربەرزو ڤاڵبوو خۆی بنوێنێ!

ئایەتەکان بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنن: کە پێویستە بەچاوێکی ورد بینییەوە سەیری نیشانە ئاسمانییەکانو زەوی بکەین بۆ ئەوەی لەڕێگەی بەڵگەکانەوە بگەینە پلەی خوداناسیو ئیمانمان پتەوو دامەزراوبێ، چونکە هیچ ڕێگایەکی تر نیە بۆ ناسینی خودا جگە لەتێفکرین لەبەڵگەو نیشانەکان.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (تفکروا في الخلق، ولا تفکروا في الخالق، فانکم لاتقدرون قدره) بیر لەبوونەوەرو دروستکراوانی خودا بکەنەوە، هەرگیز بیر لەزاتی خودا مەکەنەوە، چونکە ئێوە ناتوانن زاتی خودا تەصەوور بکەن.

ئەو بەڵاو سزاو کارە ساتانەی خودا بەسەر گەلی نوحو عادو ثەموودو گەلەکانی تری هێنان پەندو عیبرەتن بۆ ئەوانەی پەیامی پێغەمبەران بەدرۆ دەخەنەوە.

دابو نەرێتی خودا وا جاری بووە کاتێك سزاو تۆڵەی گشتی دەنێرێ بۆ سەر گەلو نەتەوەیەك، پێغەمبەرانو موسوڵمانان ڕزگار دەکاو کافرو گومڕاکان ڕیشەکێش دەکا، ئەم پاکو پیس لێك هەڵاواردنە ڕەحمەتو عەداڵەتی خودایە بۆ بەندەکانی.

## بەندایەتیکردنی راستاڵانەو دڵسۆزانە بۆ خودا

﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ مِّن دِينِى فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ
تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَـٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُمْ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ
أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٤﴾ وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا وَلَا
تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٥﴾ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا
يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ۖ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾ وَإِن
يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ
بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ
ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ ﴾

بەم کۆمەڵە ئایەتە کۆتایی بەسورەتی یونس دەهێنێ، دوای ئەم هەموو جەولەو هاتووچۆیە لەئاسۆکانی بوونەوەرو لایەنە دەروونییەکانو جیهانی بیرو هەستو تێفکریندا، دوای ئەو هەموو رونکردنەوەو شیکردنەوانە دەربارەی بیروباوەڕو یەکتاپەرستیو فەرمانرەواییو حاکمییەت بۆ خودا، دوای ڕونکردنەوە دەربارەی چۆنیەتی دابو نەریتی خودا لەبوونەوەردا، فەرمان بەپێغەمبەر ﷺ دەکا: کە بەهەموو ئادەمیزادان رابگەیەنیو ئیعلانێکی گشتیو یەکلاکەرەوە ڕابگەیەنێو پێیان بڵێ: کە ئەو سوورە لەسەر هەڵوێستی خۆیو ئەو ڕێبازەی

گرتوویەتیە بەر بەموو لێی لانادا، بەردەوام دەبێ لەسەر بانگەوازیکردنو ڕاگەیاندنی پەیامەکەی!

دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ!﴾ ئەی موحەممەد! بەو خەڵکە ڕابگەیەنەو پێیان بڵێ: ئەی خەڵکینە! ﴿إِنْ كُنْتُمْ فِي شَكٍّ مِنْ دِينِي﴾ ئەگەر ئێوە گومانتان هەیە دەربارەی ڕاستی ئەو ئایینە پاکەی من بۆم هێناونو خودا بەنیگا بۆی ناردوم: ئەگەر ئێوە لەئایینەکەم حاڵی نابنو نازانن چۆنە، ئەوە گوێ بگرن بامن بۆتانی ڕون بکەمەوە. هەڵوێستی خۆمتان بۆ دیاری بکەم باش بزانن بچێتە دڵتانەوە ﴿فَلا أَعْبُدُ الَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ ئەمن بەندایەتیو پەرستش بۆ ئەو خودا درۆزنانە ناکەم کە ئێوە لەجیاتی خودا بەندایەتییان بۆ دەکەن. ئەو بەردو دارو بتو صەنەمانەی ئێوە بەخودایان دەزانن من نایان پەرستمو بەندایەتییان بۆ ناکەم، چونکە ناتوانن زیانو قازانجم پێ بگەیەنن ﴿وَلَكِنْ أَعْبُدُ اللَّهَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُمْ﴾ بەڵکوو من خودایەك دەپەرستم تاكو تەنیاو بەتواناو زاناو داناو بەدیهێنەرە خودایەك دەپەرستم تەمەنو ژیانو مردنتان بەدەست ئەوە، چۆن ژیانتان پێ دەبەخشێ ئاواش دەتانمرێنێ، پاشان هەمووتان دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو.

﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ فەرمانم پێ کراوە: کە لەپێڕی ئەو موسوڵمانانە بم کە بڕوایان پتەوو بەتەواوی خودا دەناسن.

ئەم ئایەتە ئاماژەی ئەوەشی تێدایە: کە ئایینی حەقو ڕاست جێگای گومان نیەو حەق وایە: کەس گومانی تێدا پەیدا نەکا، عەقڵی سەلیمو سروشتی پاك پەسەندی دەکەن. بەڵام بتپەرستی کارێکی گەوجانەیەو هەرکەسێك بەخۆیدا بچێتەوەو تۆزێك بیر بکاتەوە دەزانێ: کە بەتاڵو پووچە، چونکە ئەو بتو خودا درۆزنانە بێ هەستو شعوورن، نەدەتوانن زیان دووربخەنەوە، نەتوانای سوود بەخشینیان هەیە، دەی شتێك ئەوە حاڵو وەزعی بێ چۆن بەکاری خودایەتی دێ؟!

ئەمجار وێڕای ئەوەی: کە فەرمانم پێ کراوە لەپێری موسوڵمانان بم ﴿وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفاً﴾ فەرمانم پێ کراوە کە ڕو بکەمە ئایینی ڕاستو دروست، ئایینی حەقو خوداپەسند، پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بمو بەموو لێی لانەدەم، دڵسۆزانە بەندایەتی خودا بکەمو هیچ شتێکی تر جگە لەخودای مەزن بەشیاوی پەرستن نەزانم.

واتە: نیگام بۆ کراوەو پێم گوتراوە: کە پابەندی ئایینی ئیسلام بمو بەتەواوی ڕو لەئایین بکەمو ئاوێنەی بم!

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفاً وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾الأنعام/٧٩. ئەم ئایەتانە بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنن: کە پێویستە لەعیبادەتدا، لەدوعاو پاڕانەوەدا ڕووبکرێتە خوداو عیبادەت هەر بۆ زاتی پاکی بکرێو نزاو پاڕانەوە هەر ئاراستەی ئەو بکرێو لەکەسی تر نەپاڕێنەوەو عیبادەت بۆ کەسی تر نەکەین، کەسێك بەدڵ عیبادەت بۆ غەیری خودا بکاو لەدوعاو پاڕانەوەدا داوا لەیەکێکی تر بکا ئەوە عیبادەتکەری غەیری پەروەردگارەو بەموشریك دادەنرێ.

﴿وَلا تَكُونَنَّ مِنْ الْمُشْرِكِينَ﴾ ئەی موحەممەد! (ئەی بیسەر!) نەخەڵەتابی لەو پێڕو تاقمو کۆمەڵانە بی کە هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن، هەرگیز لەکۆمەڵی موشریکان مەبە. ڕاستەوخۆو بەبێ ناوەند عیبادەتی خودا بکە، ناوەندو واسیتەو تکاکار مەهێنە کایەوە، نەچی لەکاتی تەنگانەو بەڵاو موصیبەتدا هاوار بکەیە پێڕو موشایەخو داوایان لێ بکەی بەهاوارتەوەبێنو کارت بۆ جێبەجێ بکەن، ئەگەر وا بکەی بەهەتارە دەچیو دەفەوتێی ﴿وَلا تَدْعُ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لا يَنْفَعُكَ وَلا يَضُرُّكَ﴾ نەچی پەنابەریە بەر هەڵوێستی ناڵەبارو نەگونجاو، نەچی عیبادەت بۆ غەیری خودا بکەی، نەکەی دوعاو پاڕانەوەت ئاراستەی غەیری پەروەردگار بکەی! نەخەڵەتابی جگە لەخودا عیبادەت بۆ شتێك بکەی لەدونیاو قیامەتدا سودو

قازانجت پێ ناگەیەنێ، تەنانەت ئەگەر هاواریشیان بکەیتێ بەهاناتەوە نایەنو چ سودێکت پێ ناگەیەنن، خۆ ئەگەر وازیشیان لێ بێنیو عیبادەتیان بۆ نەکەی، ناتوانن هیچ زیانێکت پێ بگەیەنن!!

﴿فَإِنْ فَعَلْتَ﴾ ئەگەر خودانەخواستە وات کردو نزاو پاڕانەوەت ئاڕاستەی غەیری خودا کرد، ئەو کاتە ﴿فَإِنَّكَ إِذاً مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ ئەتۆ دەچیە پێڕی ستەمکارانەوە، ئەم جڵەوگیرییە کە لەپێغەمبەر کراوە جڵەوگیری کردنە لەئۆمەتەکەی. چونکە جڵەوگیری لەکەسێك هەرکاتێك نەگونجێو چاوەڕوان نەکرێ جڵەوگیریی لێ بکرێ، ئەوە نیشانەی موبالەغەو زێدەڕەوییە لەجاڵەوگیرییەکەدا.

لەقورئانی پیرۆزدا زۆر ئایەتی تر لەوێنەو مانای ئەم ئایەتەدا هاتوون، بۆ ئەوەی شیرکو هاوەڵدانان بۆ خودا لەدڵو دەروونی زوربەی خەڵك دەربهاوێ. جا ئەوانەی قورئانی پیرۆز کاری تێکردنو ئایینی خۆیان لەقورئانو فەرموودەی پێغەمبەرو شوێنکەوتنی سەلەفی صالح وەرگرت ئەو جۆرە بیرو باوەڕە شیرك ئامێزەیان لەدڵو دەروونیدا سڕدرایەوەو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی ئایین بوونو ئێوارەو بەیانیو شەوو ڕۆژ خەریکی خوداپەرستی بوون.

هەر لەقورئانی پیرۆزدا زۆر هەڕەشەو سەرزەنشتی ئەوانەی تێدایە: کە وازیان لەتێفکرینو وردبوونەوە لەئایەتەکانی قورئان هێناوە، دەیانەوێ ئایین لەدابو نەریتی کۆنو رزیوی باوکو باپیرانیانو لەزڕە شێخو کۆلکە خوێندەوارو جادوبازو دەسبڕو کادرەکانی ئیستعمارو موناقیقەکانی سەردەمو قوتابیانی شەیتان وەربگرن! خەریکی رازاندنەوەی گۆڕو ئارامگای ئەمو ئەون، بەنەقشو نیگار دەیانرازێننەوە، چراو مومیان لەسەر هەڵدەکەن، لەجیاتی خودا هانایان بۆ دەبەنو لێیان دەپاڕێنەوە، داوای بەمرازگەیشتنیان لێ دەکەن، کوشتیو قوربانیان بۆ سەردەبڕن بەهیوای ئەوەی زیانیان لێ دوور بخەنەوە، سوودو خێریان بۆ دەستەبەر بکەن، ئەو ئایەتو حەدیثانەی لەم بارەوە هاتوون وایان ئاراستە دەکەن کە تایبەت

بن بەبتپەرستیو نەزرو فۆتۆ بۆ بتەکان، سوبحانەڵڵا! پێیان وایە: هاوەڵدانان بۆ خودا دروستە؟!

ئەمجار پەروەردگار مانای ئایەتی پێشوو دووبارە دەکاتەوەو شوبهەو بیرو بۆچوونی ئەوانەی لەجیاتی خودا هاوار دەکەنە گۆڕو ئارامگای ئەم شێخو ئەو پیر رەت دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلا كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ﴾ ئەی بیسەر؛ ئەی ئادەمیزاد! هەر کاتێ جەستەت تووشی نەخۆشیو زیانێك بوو، ماڵو سامانت تووشی زەرەرو زیان بوو هەژار کەوتی، ئازارێکت تووش هات ئەوە باش بزانە هیچ کەس نیە بتوانێ ئەو زەرەرو زیانەت لەسەر لابەرێ جگە لەخودا!!

بێگومان پەروەردگار بۆ هەموو شتێك هۆکارێکی داناوە، ئادەمیزاد بەهۆی تەجروبەو ئەزموونەوە دەیانزانن‌و فێریان بوون، ئەوەتا بۆ هەموو دەردو ئازارێك دەرمانێکی داناوە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: پەروەردگار بۆ هەموو دەردێك دەرمانێکی داناوە جگە لەپیری، جا کەوابێ ئەرکی سەرشانمانە: کە بەگوێرەی سوننەتی خودا هەڵس‌و کەوت بکەین، ئەگەر نەخۆش کەتین هەوڵی چارەسەر بدەین‌و دەرمان بەکاربێنین‌و بڕواشمان وا بێ شیفادەر هەر خودایەو داوای شیفا لەو بکەین‌و خاڵصانە ڕو لەبارەگای ئەو بکەین.

﴿وَإِنْ يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلا رَادَّ لِفَضْلِهِ يُصِيبُ بِهِ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ﴾ ئەگەر خودا خێرو بێرێکت بەنسیب بکا، سەروەرییەکی ئایینی یان دونیاییت پێ بگەیەنێ، سەرکەوتنێك، لەشساغیو خۆشگوزەرانییەکت پێ ببەخشێ، ئەوە باش بزانەو دڵنیابە کەس نیە بتوانێ جگە لەخودا ئەو خێرو بەرەکەتو سەروەرییەت لێ بستێنێتەوە، چونکە کەس نیە بتوانێ بەرەنگاریی ویستی خودا بکا، کەس ناتوانێ بڕیاری خودا هەڵبوەشێنێتەوە، فەضل‌و رەحمەتی خودا بگێڕێتەوە، پەروەردگار باڵادەستو خاوەن دەسەڵاتی ڕەهایە بەسەر هەموو شتێکدا دەبەخشێو دەگرێتەوە،

چی بوی‌و چۆنی بوێ ئاوا دێتە کایەوە. ڕەحمەتو فەضلی خودا لەچوارچێوەی ڕەحمەتی گشتی‌و بەخششی فراوانی‌دا دەڕژێ بەسەر بوونەوەردا، بەپێچەوانەی دەرودو بەڵاو زیانو ناخۆشی؛ ئەوانە بەبێ هۆکار نایەنە دی، بەڵاو موصیبەت بەهۆی تاوانەوە دادەبارنو بەتۆبەو پەشیمانبونەوەو ئیستیغفار نەبێ لاناچن. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ﴾الشوری/٣٠.

بەڵێ: بەچاوی خۆمان دەبینینو مێژووش گەواهیدەرە نەخۆشی‌و تاعونو پەتا بەهۆی گوێ پێ نەدان بەهۆکارەکانی تەندروستی‌و کەمتەرخەمی لەدەستەبەرنەکردنیان دەکەونەوە، وڵات وێران دەبن، حکوومەتو فەرمانڕەوا دەڕوخێن بەهۆی ستەمکاری‌و وازهێنان لەعەدالەتکاری!

﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ پەروەردگار لێبوردو لێخۆشبووە بۆ ئەوانەی تاوانبارنو تۆبە دەکەنو لەتاوانەکانیان پەشیمان دەبنەوە، واز لەشیرکو گومرایی دەهێننو ڕودەکەنە خوداپەرستی‌و بەندایەتی بۆ خودا. بەڕەحمو بەزەییە بۆ ئەو کەسانەی ئیمانی پێ دەهێنن، خۆ ئەگەر ڕەحمەتو فەضلو بەخششی بەرفراوانی خودا نەبوایە هەموو ئادەمیزاد بەهۆی تاوانەکانیانەوە بەفتارە دەچوون. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِمَا كَسَبُوا مَا تَرَكَ عَلَى ظَهْرِهَا مِن دَابَّةٍ﴾فاطر/٤٥.

ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە هەر پەروەردگار زیانو ناخۆشی لادەبا، خێرو خۆشی بەدەست خۆیەتی‌و هەر ئەو فەضڵو خێر دەبەخشێ.

ئیبنو عەساکیر لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکاو دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اطلبوا الخیر دهرکم کله، وتعرضوا لنفحات ربکم، فان لله نفحات

مـن رحمتـه، يـصيب بهـا مـن يـشاء مـن عبـاده واسـألوا أن يـستر عـوراتكم ويـؤمن روعاتكم)

## ئایینی ئیسلام ئایینێكی حەقەو پێویستە ئادەمیزاد پابەندی بن

﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٨﴾ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَٱصْبِرْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿١٠٩﴾ ﴾

دوای ئـەوەی پـەروەردگار بەڵگـەی تـاكو تـەنهایی خـوّی‌و پێغەمبەرایـەتی‌و زیندوبوونـەوەی ڕانوانـدن‌و چەسـپاندنی، بـەم شـێوە جـوان‌و ڕەوانـە كۆتـایی بەسورەتەكە دەهێنـێ‌و پوختـەی نـاوەڕۆكی هـەموو سـورەتەكە لـەم دوو ئایەتـەدا ڕادەنـوێنی‌و ئاراسـتەی دەكـا، كـە بریتییـە لەتـەواو كردنـی شـەریعەتو ئـایین‌و پێویستبوونی پابەندبوون بەو شەریعەتو ئایینەوەو دەفەرموێ:

﴿قُـلْ يَـا أَيُّهَـا النَّـاسُ قَـدْ جَـاءَكُمْ الْحَـقُّ مِـنْ رَبِّكُـمْ﴾ ئـەی موحەممـەد! بەئادەمیزادەكان بڵێ: ئەی خەڵكینـە! ئـەوەتا لـەخوداوە نیگای حـەق‌و راسـتتان بـۆ هاتووە، ناوەڕۆكی ئایینتان بۆ شـی دەكاتـەوە، شـەریعەتتان بـۆ دیـاری دەكـا، لەسـەر زوبـانی پیـاوێكی هاوزمـانی خۆتـان‌و لـەهۆزی خۆتـان شـەریعەتو یاسـاتان بـۆ رون دەكاتەوە.

جا ﴿فَمَنْ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ﴾ کەسێك بەو پەیامو نیگایە هیدایەتی وەرگـرتو بـڕوای بـەقورئانو بەپێغەمبـەر کـردو شـوێنیان کـەوت، ئـەوە سـوودو قازانجی شوێنکەوتنەکەی بۆ خۆیەتیو بۆخۆی پیێ بەختەوەری دونیاو قیامەت دەبێ. ﴿وَمَنْ ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا﴾ کەسێکیش لەو ڕێبازە لابداو گوێ بەو پەیامە نـەداو ئـەو مەنهـەجو پرۆگرامـە پاشگوێ بخا ئـەوە بەدبەختییەکەی بۆخۆیەتیو خۆی تووشی نەگبەتی دونیاو قیامەت دەبێ، سزای بەئێشو ئازاری دۆزەخی تـووش دەبێ.

﴿وَمَا أَنَا عَلَيْكُمْ بِوَكِيلٍ﴾ ئەمن بەسەر ئێوەوە وەکیلو بەرپرسیار نیم، ناتوانم بەتۆپزیو زۆرەملێ موسوڵمانتان بکەم، ناتوانم بەزۆر ڕێگای کوفرو یـاخی بوونتـان لێ بگرم، نـاتوانم زیانتـان لێ دووربخەمـەوەو خێـرو خۆشیتان بـۆ دەستەبەر بکـەم، سوود پـێ گەیانـدنو زیـان لێ دوورخـستنەوە بەدەستی خودایـەو بـەس! مـن تـەنها ڕاگەیانـدنو ئامۆژگـاریم لەسـەرە، مـوژدەدەرم بەبەهەشـتو نیعمەتـەکانی بـۆ ئـەو کەسـانەی شـوێن پەیامەکـەم دەکـەون، ترسـێنەرم بەسـزای دۆزەخ بـۆ ئەوانـەی ڕو لـەقورئان وەردەگێـڕنو پەیامەکـەم بـەدرۆ دەخەنـەوە! کەسـێکیش ترسـێندرا ئـیتر بیانووی نامێنێ.

﴿وَاتَّبِعْ مَا يُوحَى إِلَيْكَ وَاصْبِرْ حَتَّى يَحْكُمَ اللَّهُ﴾ ئـەی موحەممـەد! شوێن ئـەو نیگایە بکەوە کـە بـۆت نێـردراوە، بەتـەواوی پابەنـدی بـەو لێـی لامـەدە، خۆگربـەو بەردەوامبـە لەسـەر بانگـەوازییو بڵاوکردنـەوەی پەیامەکـەت، خـۆڕاگرە لەسـەر ئەزیەتـدانو نارەحـەتکردنت لەلایـەن گەلەکەتـەوە، گـوێ بـەیاخی بـوونو سەرپێچیکردنیان مەدە، پەیامی خۆت ڕابگەیەنـەو بانگەوازی خـۆت بڵاوبکـەرەوە، هەتا خودا نێوان تۆو ئـەوان یـەکالا دەکاتـەوەو زاڵـت دەکا بەسـەریانداو یارمـەتیت دەدا، ﴿وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ﴾ چـاکترین حـاکمو دادوەرە، بەئەوپـەڕی عەدالەتـەوە کارەکانی ئەنجام دەدا، هەموو کـارێکی عەدالـەت ئـامێزەو پـڕە لەحیکمـەتو دانـایی.

بێگومان پەروەردگار وادەو بەڵێنی خۆی بەجێ هێناو پێغەمبەرو هاوەڵانی زاڵ کردن بەسەر کافرەکانداو فەرمانڕەوایی سەرزەوی پێ بەخشین.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی هود

ئەم سورەتە ناونراوە بەسوورەتی هود، چونکە چیرۆکی حەزرەتی هودی تێدایە، هەواڵ و سەرگوزشتەی هودو گەلەکەی لەخۆ گرتووە.

لەم سوورەتەدا پەروەردگار لەئایەتی (٥٠) تا ئایەتی (٦٠) بەسەرهاتی هودو نەتەوەکەیمان بۆ دەگێڕێتەوە؛!

ئەم چیرۆکەش وەکوو چیرۆکەکانی تری قورئان بەربەرەکانیو صیراعێکی دژواری نێوان هودو گەلەکەی تۆمار کردوە. حەزرەتی هود بانگەوازی گەلەکەی کرد بۆ خوداپەرستیو وازهێنان لەبتپەرستی، بەڵام گەلەکەی سوور بوون لەسەر کوفرو بێدینی خۆیانو بەدرۆخستنەوەی حەزرەتی هود. ئیتر پەروەردگار بەعەزابێکی کوشندە لەناوی بردن، رەشەباو زریانێکی بەتەوژمی لەسەر هەڵکردن، حەوت شەوو هەشت رۆژ بەردەوام بوو، وەکوو لەشوێنی خۆیداو لەم سورەتەدا خودا پشتیوان بێ باسی دەکەین.

ئەم سورەتە لەمەککە هاتۆتە خوارێ بەسورەتێکی مەککی دەناسرێ!

هەندێك دەڵێن: ئایەتی ﴿فَلَعَلَّكَ تَارِكٌ....(١٢)﴾و ئایەتی ﴿أَفَمَن كَانَ عَلَى بَيِّنَةٍ....(١٧)﴾و ئایەتی ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفاً....(١٤٤)﴾ لەمەدینە هاتوونە خوارێ.

بەڵام مامۆستا سەیید زۆر بەتوندی ئەو ڕایە ڕەت دەکاتەوەو دەفەرموێ: سورەتەکە تێکڕا مەککییە، ئەو مەزوعانەی باسیان لێوە دەکا لەباسە سەرەکییەکانی قورئانی مەککین، پەیوەندییان بەعەقیدەوە هەیە، هەڵوێستی قورەیشییەکان بەرامبەر ئایین رادەنوێنێ‌و کاریگەری ئەو هەڵوێستە لەدڵو دەروونی پێغەمبەرو هاوەڵانی‌داو چارەسەری قورئان بۆ ئەو کاریگەرە شی دەکەنەوە.

تێکڕای ئەم سورەتە لەدوای سورەتی (یونس) هاتۆتە خوارێ، سورەتی (یونس)یش دوای سورەتی (الاسراء) دابەزیوە، ئەمەش ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە سەردەمی هاتنە خوارەوەی سورەتی هود ناخۆشترین کات بوو ناسکترین‌و زەحمەترین رۆژگار بوو لەمێژووی بانگەوازی ئیسلام لەمەککەدا، ئەوەبوو پێش هاتنە خوارەوەی سورەتی (هود) ئەبوطالیب کە مامی پێغەمبەر بوو، خەدیجە کە خێزانی بوو هەردوکیان دوو پاڵپشتو یارمەتیدەری پێغەمبەر بوون کۆچی دواییان کرد، ڕێگا بۆ قورەیشییەکان ئاچوغ بوو کە هێرش بکەنە سەر پێغەمبەر (درووردی خودای لەسەر بێ)و لەوەپێش نەیاندەوێرا بەو شێوە ئەزیەتی پێغەمبەر بدەن، بەتایبەتی پاش روداوی ئیسراو میعراج: کە کافرەکان بەلایانەوە شتێکی سەیرو نەگونجاو بوو، دەستیان کرد بەگاڵتەپێکردن‌و بەدرۆخستنەوە، هەندێك لەوانەی لەوەپێش موسوڵمان بووبوون پاشگەز بوونەوە، سەرباری مردنی هاوسەری بەوەفای خاتو خەدیجەو مردنی ئەبوطالیبی مامی کە دوو پشتیوانی دڵسۆزی پێغەمبەر بوون، قورەیشییەکان پەرەیان بەدژایەتی کردنی بانگەوازیکردنی ئیسلام‌داو لەسنووریان تێپەڕاندو تەنگیان بەپێغەمبەرو هاوەڵانی هەڵچنی، بەجۆرێك جمو جۆڵی بانگەوازی ئیسلامی لەپەلو پۆ کەوتو تەجمید بوو، تەنانەت وای لێ هات لەمەککەو دەورو بەری دا بۆ ماوەیەکی زۆر کەس موسوڵمان نەدەبوو، تا خوا کردی پەیمانی عەقەبەی یەکەم‌و دووەم بەسترا‌و دەرویەکی بەرەحمەت لەبانگەوازی ئیسلامی کرایەوەو لەحاڵەتی خامۆشی یان بڵێین: لەحاڵەتی جمود ڕزگاری بوو.

سوورەتی (هود) کە لەدوای سوورەتی (یونس) هاتۆتە خوارێ، لەزۆر لایەنەوە ئەم دوو سورەتە لێك دەچن، مانایان لێك دەچن، باسەکانیان وەکوو یەك وان، هەردوکیان بە(الر) دەست پێ دەکەن، هەردوکیان بەوەصفی ئیسلام‌و باسی قورئان‌و پەسنی پێغەمبەر کۆتاییان پێ دێ، هەردوکیان بانگەوازیکردنی ئادەمیزاد بۆ بڕوا کردن بەپەیامی پێغەمبەرو شی کردنەوەی ئەو باسانەی لەسورەتی یونس‌دا بەکورتی هێنراون دەربارەی عەقیدەو یەکتاپەرستی‌و زیندوبوونەوەو پاداش‌و سزاو حیسابو لێکۆڵینەوەو سەرئاسایی قورئان‌و چەسپاندنی ئایەتەکانی‌و بەرپەرچدانەوەی موشریکەکان‌و تەحەدا لێ کردنیان بەقورئانی لەخۆگرتوو، هەروا باسی هەندێ سەرگوزشتەو بەسەرهاتی پێغەمبەرانی وەکوو نوح‌و ئیبراهیم‌و هودو صالح‌و شوعەیب (درودی خودایان لەسەر بێ) لەخۆ گرتووە.

ئەم سورەتە تایبەتمەندییەکی تێدایە لەبارەی هەڕەشەو ترساندن‌و سام بەرخستنەوە: کە لەچیرۆکی ئەو پێغەمبەرانەدا هەیە لەشوێنی تری قورئاندا ئاوا بەزەقی بەرچاو ناکەون.

بانگەوازی جەخت لەسەرکراوی تێدایە بۆ خۆگری‌و پابەند بوون بەئاییەنەوە.

تیرمیذی لەئیبنو عەبباسەوە فەرموودەیەك ڕیوایەت دەکا دەڵێ: حەزرەتی ئەبو بەکر عەرزی پێغەمبەری کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پیری لێی دیاری داوی! لەوەڵامدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: سورەتی (هود)و (الواقعة)و (المرسلات)و (عم یتساءلون)و (اذا الشمس کورت) پیریان کردم. لەریوایەتێکی تردا هاتووە دەڵێ: پرسیار لەپێغەمبەر کرا، چ شوێنێکی سورەتی هود پیری کردی؟ فەرمووی: ئایەتی ﴿فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ﴾.

**ئەو باسانەی لەم سورەتەدان:**

ئـەم سـورەتەش وەكـوو سـورەتی یـونس بنـەما سـەرەكییەكانی ئـایینی لەخۆگرتوون: كە بریتین لەیەكتاپەرستی‌و پێغەمبەرایەتی‌و زیندوبوونـەوەو سـزاو پاداش. وەكوو لەم خاڵانەدا ئاماژەیان پێ دەكەین:

١- چەسپاندنی ئەوە: كە قورئان لەخوداوە هاتووەو ئایەتەكانی هـەموو ڕێـكو پێكو ڕەوانو پتەوو تەواوو بێ كەمو كوڕین، چەسـپاندنی ئـەوە : كـە قورئـان پـڕە لەبەڵگەی یەكتاپەرستی‌و ڕاستی پێغەمبەرایەتی‌و حوكمو یاساو پەندو ئامۆژگاری‌و چـیرۆكو جـوداوازی خـستن لـەنێوان حـەقو بـەتاڵدا، لێـك هـەڵاواردنی ڕاسـتو ناڕاست..

چەسپاندنو سەلماندنی سەرئاسایی قورئانو تەحەدا كردن لەعەرەبو غەیری عەرەب كە بتوانن دە سورەتی وەكوو ئەم قورئانە بخەنە ڕو، وەكوو دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُواْ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُواْ مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾هود/١٣.

ئەمجار كە عەرەبەكان دەستەوەسان بوون: لەهێنانی نموونەی قورئان، یان دە سورەت، تەنانـەت یـەك سـورەت لـەكورترین سـورەتیش، جـا كـە ئیفلاسـی‌و بـێ دەسەڵاتییان دەركەوت، ئەوە بزانن‌و یەقینتان زیاد ببێ كە ئـەو قورئانـە لـەخوداوە هاتووە. وەكوو دەفەرموێ: ﴿فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّمَا أُنزِلِ بِعِلْمِ اللّهِ﴾ هود/١٤.

٢- یەكتاپەرستی خودا. ئەویش دوو جۆرە:

أ- تـاكو تـەنهایی لەخودایـەتی دا (الألوهیـة) ئـەمیش بریتییـە لەبەندایـەتی كردن بۆ خوداو بـەس! پەرسـتنی خـوداو طاعـەت بـۆ ئـەو كـردن، واتـە: كەسـی تـر نەپەرستی‌و بەندایەتی بۆ كەسی تر نەكا.

ب- تاکو تەنهایی لەربووبییەتدا. واتە: بیرو باوەڕت وابێ کە هەر خودا بەدیهێنەرو هەڵسوڕێنەری بوونەوەرە. هەر ئەو دەتوانێ بەویستی خۆی گۆڕانکاری تێدا ئەنجام بدا.

عەرەبەکان لەوەپێش بڕوایان وابوو: کە هەر خودا بەدیهێنەرە، بەڵام بڕوایان بەفرە خودایی هەبوو، دەیانگوت: خودا هاوەڵو شەریکی هەن. قورئان لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ...﴾العنكبوت/٦١.

بۆیە لەقورئاندا زۆر ئایەت هەن؛ تاکو تەنهایی خودا لەربووبییەتدا دەچەسپێنن؛ یەکێك لەو ئایەتانە ئایەتی ژمارە (٧)ی ئەم سورەتەیە: کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ...الآية﴾.

٣- چەسپاندنی زیندوبوونەوەو هەبوونی حیسابو لێکۆڵینەوەو پاداشو سزا. وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِلَى اللّهِ مَرْجِعُكُمْ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾هود/٤. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِن بَعْدِ الْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِنْ هَـذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾هود/٧.

٤- بەتاقیکردنەوەی ئادەمیزاد بۆ ئەوەی بزانن: کامەیان کردەوەی باشو بەسودی هەیە. وەکوو دەفەرموێ: ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً﴾هود/٧.

٥- بەرامبەریکردنو بەیەك گرتنی سروشتی موسوڵمانو کافر لەکاتی خۆشیو ناخۆشیدا. ئەوەتا خاوەن باوەڕو خوداپەرست لەکاتی تەنگانەدا خۆگرە، لەکاتی خۆشیو فەرەحیدا سوپاسگوزارە. کافر لەکاتی خۆشیدا تەرەدەماخ و لەخۆبایی دەبێ، لەکاتی تەنگانەدا بەرچاوتەنگو بێ وزەو کوفرکەرە. سەیری ئایەتی (٩-١١) بکە.

٦- ئادەمیزاد پەلە دەکا بۆ وەدەستهێنانی خێرو سودو هاتنی عەزابو سزا، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ أَخَّرْنَا عَنْهُمُ الْعَذَابَ إِلَى أُمَّةٍ مَّعْدُودَةٍ لَّيَقُولُنَّ مَا يَحْبِسُهُ...؟﴾هود/٨.

هەروەکوو لەسورەتی (یونس)یشدا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُعَجِّلُ اللّهُ لِلنَّاسِ الشَّرَّ اسْتِعْجَالَهُم بِالْخَيْرِ لَقُضِيَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ﴾یونس/١١.

٧- سروشتی ئادەمیزاد جوداوازو هەمە جۆرە تەنانەت لەوەرگرتنی (ئایین)یشدا مەگەر کەسێك خودا رەحمی پێ بکا. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ، إِلاَّ مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَلِكَ خَلَقَهُمْ﴾هود/١١٨-١١٩.

٨- هێنانی چیرۆکو سەرگوزەشتەی پێغەمبەران بەشێوەیەکی درێژئامێز، بەمەبەستی دڵدانەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەو ئەزیەتو ناڕەحەتیەی تووشی دەهات لەلایەن قورەیشییەکانەوەو ڕو وەرگێڕانو پشت هەڵکردنیان لەبانگەوازییەکەی! وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَكُلاًّ نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ﴾هود/١٢٠. هەڵبەتە لەهەموو چیرۆکو سەرگوزشتەیەکیشدا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ موسوڵمانان..

لەم سورەتەدا چیرۆکی حەزرەتی هود لە (دە) ئایەتدا باس دەکا (ئایەتی ٥٠-٦٠) پاشان چیرۆکی حەزرەتی صالح لەگەڵ قەومەکەی لەئایەتی (٦١-٦٨)دا شی دەکاتەوەو بەدوو ئایەت (٦٩-٧٠) ئاماژە بۆ چیرۆکی میوانەکانی حەزرەتی ئیبراهیم: کە فریشتە بوون دەکا.

ئەمجار چیرۆکی حەزرەتی لوط لەئایەتەکانی (٧٠-٨٣)دا دەگێڕێتەوە. لەئایەتەکانی (٨٤-٩٥)یشدا چیرۆکی حەزرەتی شوعەیب دەگێڕێتەوە.

ئەمجار چیرۆکی حەزرەتی موسا لەگەڵ فیرعەوندا لەئایەتەکانی (٩٦-٩٩) ڕادەنوێنێ.

٩- دوابەدوای چیرۆکەکان ڕاستەوخۆ پەندو عیبرەتی چیرۆکەکان دەخاتە ڕوو لەناوچونی ستەمکاران دەچەسپێنێو دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ مِنْ أَنبَاء الْقُرَى نَقُصُّهُ عَلَيْكَ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ، وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَـكِن ظَلَمُواْ أَنفُسَهُمْ فَمَا أَغْنَتْ عَنْهُمْ آلِهَتُهُمُ الَّتِي يَدْعُونَ مِن دُونِ اللّهِ مِن شَيْءٍ...الآية﴾ سەیری ئایەتەکانی (١٠٠-١٠١) بکە.

١٠- فەرمان بەئیستیقامەو بەردەوام بوون لەڕاگەیاندنو پابەند بوون بەفەرمانو جڵەوگیرییەکانی پەروەردگار، کە ئەمە قورسترین ئەرك بوو. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەمە پیری کردم. چونکە ئیستقامە بریتییە لەجیهاد لەگەڵ نەفسو خۆگرتن لەسەر ئەنجامدانی ئەرکەکانو پارێزگاریکردنی نەفس لەتێدا چوونو فەوتان.

١١- ئەو ڕاستییە رون دەکاتەوە کە لەخۆبایی بونو ملهوڕی هۆکاری وڵات وێرانبونو سەرتێداچوونەو سزاکەی ئاگری دۆزەخە. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَطْغَوْاْ إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ، وَلاَ تَرْكَنُواْ إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ﴾ هود/١١٢-١١٣.

١٢- فەرمان بەئەنجامدانی نوێژەکان لەکاتو سەردەمی خۆیاندا چونکە نوێژ تاوانی لەوەپێش دەشواتەوە.

١٣- دژایەتیکردنی ئاشووبو فەساد لەسەر زەوی بۆ ئەوەی پارێزگاری تاكو کۆمەڵ بکرێ لەفەوتانو لەناوچوون، وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَلَوْلاَ كَانَ مِنَ الْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُوْلُواْ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ الْفَسَادِ فِي الأَرْضِ﴾ هود/١١٦.

١٤- ئاماژەی ئەوەشی تێدایە: کە هەتا ئادەمیزاد بۆخۆیان ڕاستاڵو فەرمانبەرداربن خودا سزایان ناداو لەناویان نابا. (ئایەتی١١٧).

١٥- هەڕەشەکردن بەسزای سەخت لەو کەسانەی ڕوو لەبانگەوازی حەقو خودا پەسەند وەردەگێڕن. لەهەمان کاتدا ئاماژەی ئەوەشی تێدایە کە سەرەنجام بۆ خوداپەرستانەو ئەوان ڕزگار بوو بەمرازگەیشتوون.

١٦- كۆتایی سورەتەكەش بەفەرمانكردن بەخوداپەرستی‌و پشت بەستن بەخوداو ترسان لەسزاو عیقابی دەهێنێ‌و سەرەتاو كۆتایی سورەتەكە پێكەوە دەگونجێنێ.

## قورئان كتێبێكی بێ كەمو كوڕی‌و بێ عەیب‌و رەخنە لێ نەگیراوە بانگەوازی ئادەمیزاد دەكا بۆ بەندایەتیكردنی خوداو گەڕانەوە بۆ لای‌و بڕوا بەزیندوبوونەوە

﴿ الٓرۚ كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ
(١) أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۚ إِنَّنِي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ (٢) وَأَنِ
ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُمَتِّعۡكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى
وَيُؤۡتِ كُلَّ ذِي فَضۡلٖ فَضۡلَهُۥۖ وَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ
يَوۡمٖ كَبِيرٍ (٣) إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ (٤) ﴾

﴿الر=ألف، لام، را﴾ موبتەدایەو ﴿كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ...﴾ خەبەرەكەیەتی. واتە: ئەم كتێبەی كە پێك هاتوە لەو پیتانە ئەو كتێبەیە كە ئێوە بڕوای پێ ناكەن‌و پشتی لێ هەڵدەكەن‌و ڕوی لێ وەردەگێڕن، لەهەمان كاتیشدا ناتوانن لەو پیتانە نموونەی ئەم كتێبە، یان دە ئایەت تەنانەت كورترین سورەتیش بخەنە ڕوو.

دەشتوانین بڵێین ﴿كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ...﴾ خەبەرە بۆ موبتەدایەكی مەحذوف، واتە: ئەمە كتێبێكی بەرزو بەنرخە، ئایەتەكانی ڕێك‌وپێك‌و پتەوو بێ كەم‌و كوڕین، نەظم‌و مەعنای بێ عەیب‌و نەنگییە، لەهەموو ڕویەكەوە تەواوو

پڕمانایە، جوان دانراوە، ماناکانی وردو وشەکانی پتەوو رستەکانی مەبەستەکانیان پێکاوەو جوان ئاڕاستە کراون، هەموو وشەیەکی، هەموو رستەیەکی مەبەستێکی بەرزو مانایەکی قوڵو ورد دەگەیەنێ، هەموو مانایەکی، هەموو ئاماژەو وشەکانی پێکەوە گونجاوە، رستەکانی دەستەملانی یەکتربوونو چەمبەرەیان تێك وەرهێناوە، دژایەتیو ناکۆکی لەنێوان وشەو رستەکانیدا نابینـدرێو نیە، وشەو رستەکانی بەوپەڕی کاراماییو تەنظیمەوە رێکخراونو لێك دراون، ﴿ثُمَّ فُصِّلَتْ مِنْ لَدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾ پاشان شیکراوەتەوەو بەگوێرەی مەبەستەکانی دابەشکراوە، بەگوێرەی باسو مەواضیعەکانی سورەت سورەتو ئایەت ئایەت تەرتیب کراوە، هەر مەبەستو باسێك بەئەندازەی خۆی وشەو رستەی بۆ تەرخان کراوە!

ئەمجار کێ ئاوا ئەم کتێبە ناوازەی بەو شێوە سەرسوڕهێنەرە، ئاوا رەوانو فەصیحو بەو شێوە سەرنج راکێشە بەشبەشو سورەت سورەتو ئایەت ئایەت شی کردۆتەوە؟! بێگومان پەروەردگار، ئەمە شاکاری کەریمی کارسازە، تابلۆی رەنگینی دەستی قودرەتە، دانراوی پەروەردگارە، کەلامی نازڵبووی خودای داناو زانایە، لەلایەن خودای داناو زانا رێکخراوە، بەداناییو زانایی لەلایەن خۆیەوە ناردویەتی بۆ سەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەوەی بیگەیەنێو لەئادەمیزادانی بگەیەنێ، گۆڕانکاریو دەست لێدانی تێدا نەکراوەو ناکرێ.

دەی با بزانین ئەم کتێبە شاکارە ناوازەیە چی تێدایە؟ بێگومان بنەماسەرەکییەکانی عەقیدە رادەگەیەنێ. حەقیقەتەکانی بیرو باوەڕ رون دەکاتەوە، بیرو باوەڕە پووچەکانی کافران قەڵاچۆ دەکا، جوانترین رێبازی ژیانو شەریعەتی راست بۆ ئادەمیزاد شی دەکاتەوە، باشترین پەیڕەوو پرۆگرامو پەندو ئامۆژگاریو ئەخلاقو رەوشت فێری ئادەمیزاد دەکا.

بەڵێ ئەم کتێبە ئاوازە بێ وێنەیە فەرمان بەئێوەی ئادەمیزاد دەکا ﴿أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ اللَّهَ﴾ کە جگە لەخودای تاکو تەنیاو باڵا دەست کەسی تر نەپەرستن، هیچ شتێك نەکەن بەهاوەڵو هاوشانی.

یان دەڵێن: ئەم قورئانە موحکەمو شیکەرەوە، بۆیە هاتۆتە خوارێ: کە بەتەنیا بەندایەتی خودا بکرێ، طاعەتو پەرستش هەر بۆ زاتی ئەو ئەنجام بدرێ، یان دەڵێن: بۆیە ئەم قورئانە نێردراوە: کە جگە لەخودا کەسی تر نەپەرستن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾الأنبياء/٢٥. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ﴾النحل/٣٦.

ئەی موحەممەد! بەو خەڵکە بڵێ: ﴿إِنَّنِي لَكُمْ مِنْهُ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ﴾ من لەخوداوە کراوم بەپێغەمبەرو بۆ سەر ئێوە رەوانەکراوم، ئەگەر سەرپێچی پەیامەکەم بکەن، ئەوە لەسزاو عەزابێکی بەئێش دەتانترسێنم، ئەگەر پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی قورئان بن، ئەوە موژدەتان دەدەمێ بەبەهەشتو ژیانی کامەرانی. ئەمە ئەرکی سەرەکی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ): کە یاخی بووان بترسێنێ لەئاگری دۆزەخو مزگێنی بەهەشت بەو کەسانە بدا: کە شوێنی دەکەون.

لەحەدیثی صەحیحو راستدا هاتووە، دەڵێ: رۆژێك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووە سەر تەپۆلکەی صەفا، یەکە یەکە بنەماڵەکانی قورەیشی بانگ کردن، هەموو لێی کۆبوونەوە، ئەمجار فەرمووی: ئەی جەماوەری قورەیش! ئایا ئەگەر من هەواڵتان بدەمێ کە سبەینێ لەکاتی دەمەوبەیاندا لەشکرێك گەمارۆتان دەدا، ئایا ئێوە بروام پێ دەکەن؟ هەموو تێکرا وتیان: بەڵێ بروات پێ دەکەین چونکە لەوەپێش درۆمان لێ نەدیوی. ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (فاني نذير لكم بين يدي عذاب شديد) دەسا من ترسێنەرم بۆ ئێوە پێش هاتنی عەزابێکی توندو دژوار.

پێیان بڵێ: ﴿وَأَنْ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا﴾ من فەرمانتان پێ دەکەم بەوەی تۆبەو پەشیمانی لەتاوانەکانتان بکەن، داوای لێ خۆشبونو لێبوردن لەتاوانی شیرکو یاخی بوون رابگەیەنن. بگەڕێنەوە بۆ لای خوداو لەکرداری لەوەپێشتان پەشیمان ببنەوەو عەزمتان جەزم بێ کە جارێکی دی نەگەڕێنەوە بۆ سەر ئەو تاوانانە. ئەگەر وا بکەنو ئەوە هەڵوێستتان بێ ﴿إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُمْ مَتَاعاً حَسَناً إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ پەروەردگار ژیانی کامەرانیو خێرو خۆشیتان بۆ ماوەیەکی درێژ پێ دەبەخشێ، هەتا تەمەنتان تەواو دەبێو کاتی مردنتان دێ، بەخۆشیو سەرفرازیو کامەرانی دەیگوزەرێنن!

﴿وَيُؤْتِ كُلَّ ذِي فَضْلٍ فَضْلَهُ﴾ رۆژی قیامەتیش هەر کەسێك کردەوەیەکی باشی هەبێ پاداشەکەی وەردەگرێتەوەو ستەمی لێ ناکرێ.

خۆشگوزەرانی لەجیهانداو پاداشی باش لەقیامەتدا، کۆکردنەوەی دوو پاداشە، وەلێ پاداشی دونیا کورتو کەم خایەنە، پاداشی قیامەت بەردوامو نەبڕاوەیە بۆ هەتا هەتایە هەر درێژەی هەیە.

ئاماژەی ئەوەشی تێدایە کە پاداشی دونیا بۆ تێکڕای ئادەمیزادەو هەموویان تێکڕا سوود لەو پاداشە وەردەگرن. بەڵام پاداشی قیامەت تایبەتە بەخاوەن کردەوەکەوە، هەرکەسەو بەگوێرەی کردەوەی تایبەتی خۆی پاداشی دەدرێتەوە!!

ئاماژەی ئەوەشی تێدایە: کە هەموو خێرو خێراتی دونیاو قیامەت لەخوداوەیە، ئەو بەدییان دەهێنێو دەیانبەخشێ.

ئوسلووبو شێوازی قورئان وایە: کە باسی قیامەتی کرد باسی دونیاش بکا، کە پاداشی موسوڵمانانی دیاری کرد سزای کافرانیش دەست نیشان بکا، کە باسی شتێکی کرد سودەکەشی بەیان بکا بۆ هەڵنانو دنە دنەدانی ئادەمیزاد تا وەگری ببن، ئەمجار بەرامبەرەکەشی باس دەکا بۆ ئەوەی خۆی لێ بپارێزنو لێی

بتەکێنەوە. دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە رو وەرگێڕن لەبانگەوازی یەکەمو پشت هەڵبکەن لەیەکتاپەرستیو بەندایەتیکردن بۆ خودا، ئەوە من دەترسم ئێوە دوچاری سزایەکی کوشندە ببن، عەزابێکی گەورەو سامناك لەقیامەتدا توشتان ببێ، ئەو کاتە هیچ شتێك فریاتان ناکەوێو کار لەکار دەترازێ.

﴿إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ دڵنیابن گەڕانەوەتان بۆ لای خودایەو رۆژی قیامەت هەمووتان زیندو دەکرێنەوەو دەخرێنە بەرحیسابو لێکۆڵینەوەی خودای باڵا دەستو بەتوانا چی بوێ لەگەڵتان ئەنجامی دەدا، چۆن پاداشی باش بەچاکەکاران دەداتەوە تۆڵەش لەخراپەکاران دەسێنێ، هیچی لێ عاسێ نابێو کەس ناتوانێ بەربەرەکانی بکا، چونکە زاتی پاکی بەسەر هەموو شتێکدا بەتواناو دەسەڵاتە! جا هەرچەندە هەموو کاتو ساتێك لەدونیاو لەقیامەتدا گەڕانەوە هەر بۆ لای خودایەو هەموو کاتێ هەموو شتێك لەژێر دەسەڵاتی خودادایە بەڵام لەقورئاندا کە وشەی (مرجع)و ئەو جۆرە وشانە بەکاردێنێ کە لە(رجع) وەردەگیرێن مەبەست پێیان گەڕانەوەی دوا ژیانی دونیایە.

## ڕووە وەرگێرانی کافرەکان لەحەقو ڕاستی

﴿أَلَا إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا مِنْهُ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٥﴾﴾

دوابەدوای ڕاگەیاندنی خولاصەی ئەو نامە پیرۆزەی: کە ئایەتەکانی ڕێکو پێکو پڕماناو فەصیحو ڕەوانو بێ عەیبو نەنگینو لەلایەن خودای زاناو داناوە شی کراونەوەو ڕێکخراونو نێردراون، ئەمجار باسی حاڵەتی کافرەکانی کردو ئەوەی رون کردەوە: کە ئەگەر ڕو لەعیبادەتی خودا وەربگێڕنو بەندایەتی بۆ نەکەن دوچاری عەزابی ڕۆژێکی گەورەو سامناك دەبن. ئەوە ڕون دەکاتەوە: کە ڕو وەرگێڕانو پشت هەڵکردن لەبەندایەتی خودا بەنهێنیو پەنامەکی وەکوو ڕو وەرگێڕانی بەئاشکرا وایە، ئیتر سیاقی قورئان ئەوە رادەنوێنێ: کە چۆن تاقمێك لەو کافرانە پێشوازی لەئایەتەکانی قورئان دەکەن لەکاتێکدا پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) بۆیانی دەخوێنێتەوە. بەوردی وێنەی هەڵسو کەوتیان دەکێشێ، شێوەی خۆ باریك کردنەوەو سەرداخستنو خۆکۆم کردنەوەیان نەخشەکێش دەکا، بێهودەیی هەوڵدانەکەیان ڕادەگەیەنێو ئەوە ڕون دەکاتەوە: کە پەروەردگار لەهەموو هەڵسو کەوتێکیان ئاگادارەو هیچ شتێك لەژێر تیشکی زانیاری خودادا هوون نابێو ئەوان نەفامن: کە پێیان وایە دەتوانن خۆیان لەخودا بشارنەوە دەفەرموێ: ﴿أَلا إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا مِنْهُ﴾ ئاگادار ببەرەوەو بزانە: کە ئەو کافرانە کاتێ بانگەوازی دەبیسن بۆ خوداپەرستی پشتی لێ هەڵ دەکەنو خۆیان کۆم دەکەنەوەو سەری خۆیان شۆڕ دەکەنو خۆیان باریك دەکەنەوە بۆ ئەوەی پێغەمبەر نەیان بینێ، کەس چاوی پێیان نەکەوێ، واتە: هێندە کافرو سەررەقو بێ بڕوان: کە گوێیان لەئایەتی قورئانە خۆیان باریك دەکەنەوەو خۆیان دەشێرنەوە.

دەقە قورئانییەکە تەصویری حاڵەتێك دەکا: کە لەموشریکەکانەوە دیاری داوە: کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) قورئانی بۆ دەخوێندنەوە ئەوان سینگی خۆیان وێك دەهێنایەوەو سەریان دادەخستو بەخەیاڵی خۆیان خۆیان لەو خودایە دەشاردنەوە کە ئەم قورئانەی نازڵ کردوە!!

﴿أَلا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ ئاگادار ببەرەوەو بزانە ئەو خودایەی ئەم قورئانەی نازڵ کردوە هەمیشە لەگەڵیانەو چاوی لێیانە، ئەو کاتەی سەری خۆیان دادەپۆشن بەپۆشاکەکانیان بۆ ئەوەی پێغەمبەر نەبینن، ئەوەندەیان رق لێیە چاویان بەرایی نادا ببینن، یان بۆ ئەوەی خۆیان لەپێغەمبەر یان لەخودا بشارنەوە، پێیان وایە: خودا نایانبینێ، بەڵام با باش بزانن: خودا زاناو ئاگادارە بەو نهێنییانەی لەدڵیاندا حەشاریان داونو ئەوەی بەدەم دەیدرکێنن، ئاگادارە بەو شتە پەنامەکییانەی بەشەو بەنهێنی دەیکەنو بەو کارو کردەوانەی بەرۆژ بەئاشکرا ئەنجامیان دەدەن.

واتە: ئەوان لەو حاڵەتە پەنامەکییەی کەتێیدان؛ کاتێك دەچنە سەر جێگای نوستنیانو هەر خۆیانو بەس، شەو بەتاریکی خۆی دایپۆشیونو پێخەف دایپۆشیونو بەخەیاڵی خۆیان کەس نایانبینێ، ئا لەو کاتەدا خودا لەگەڵیانەو ئاگای لەهەموو پەنامەکیو ئاشکراییەکیانە! بەڵکوو خودا لەوەش پەنامەکی تر دەزانێو هیچ شتێك نیە لەخودا شاراوەبێ.

﴿إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ پەروەردگار زاناو ئاگادارە بەو نهێنیو پەنامەکییانەی لەناوسنگدا شاراوەن ئەو نهێنیو پەنامەکییانەی لەدڵاندا حەشاردراون خودا ئاگای لێیانەو پێیان دەزانێ. هەرچی لەبوونەوەردا هەیە، هەرچی شكو گومانی ناو دڵو دەروون هەیە، هەرچی خەتەرەو خەیاڵ، خیانەتی چاو هەیە خودا پێی دەزانێ، پاداشو سزای هەموو ئادەمیزادێك دەداتەوە.

## تێبینی :

ڕستەی ﴿يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ﴾ واتە: سینگیان دەپێچنەوە، سینگیان وێك دێننەوە پشتیان کۆم دەکەنەوەو خۆیان باریك دەکەنەوەو سەریان دادەخەن، وەکوو ئەوە هەوڵ بدەن سینگیان بپێچنەوە بەسەر ورگیاندا بۆ ئەوەی سەرسامیو ڕقو کینەی

ناو دڵیان کە لەسەر رویان دیارە بیشارنەوە. واتە: ئەم حاڵەتە پێچەوانەی سینگ دەرپەڕاندنو سەربەرز کردنەوەیە..

**بەیارمەتی خوای گەورە لێرەدا جزمی یانزە تەواو بوو**

## بەخششی پەروەردگارو زانستو دەسەڵاتی

﴿ ۞ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ
مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلٌّ فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي
خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ
عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۗ وَلَئِن
قُلۡتَ إِنَّكُم مَّبۡعُوثُونَ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡمَوۡتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٧﴾ ﴾

لەئایەتی پێشوودا ئەوەی ڕاگەیاند کە پەروەردگار ﴿يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ زانایە بەهەموو پەنامەکیو ئاشکرایەکی ئادەمیزاد، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا ئەوە رون دەکاتەوە: کە ئەو خودایە هەموو زانیارییەك دەزانێ، بەسەر هەموو شتێکدا بەتواناو دەسەڵاتە، هەر ئەو بەدیهێنەرو ڕزقو رۆزیدەرە، هەر ئەو زانایە بەحاڵو چۆنیەتی ئادەمیزاد. پاش مردن زیندویان دەکاتەوە، ڕۆژی قیامەت





دێو شـكو گومـانی تێـدا نیـە! ﴿لَيَقُـولَنَّ الَّـذِينَ كَفَـرُواْ إِنْ هَـذَا إِلاَّ سِـحْرٌ مُّـبِينٌ﴾ دەفەرموێ: ﴿وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الأَرْضِ إِلاَّ عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا﴾ واتە: هیچ پێـڕۆو خـشۆكو باڵنـدەو ئاژەڵێـك نیـە لەسـەر زەوی مەگـەر خـودا رزقو رۆژی دەداو بـژێوی لەسـەر پـەروەردگارە، ئەمـە وێنەیـەكی تـرە لەوێنـەكانی زانیـاری پـەروەردگار: كـە عـەقڵ تێـدا سەرسـامو هەسـتو شـعوور لەبەرامبـەریدا دامـاوە! ئـەم هـەموو پێـڕۆو زیندەوەرانە، هەرچی لەسەر زەوی گیانی تێدایەو دێو دەچێ؛ ئـادەمیزادە، ئاژەڵە، خشۆكە، پەلەوەرە، باڵندەیە، هەرچی لەم زیندەوەرانە كـە سـەرزەوییان پـڕ كـردوە، لەناو سكی دایە زەویدا خۆیان حەشارداوە، لەكونو كەلەبەریدا خۆیان شاردۆتەوە، ئەم هەموو زیندەوەرانەی: كە هەر خودا بۆخۆی ژمارەو جۆریـان دەزانـێو زانـستی ئێمە پەییان پێ نابا، لای پەروەردگار زانیاری تەواوو وردو ڕاست دەربارەیان هەیـە، ڕزقو ڕۆژیـشیان لەسـەر ئـەوەو ئـەو بـژێوییان دەدا، نـەك هـەر ئەوەنـدە بـەڵكوو ﴿وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُـسْتَوْدَعَهَا﴾ دەزانـێ لـەكوێ دەحەوێتـەوە لـەكوێوە هـاتوونو بـۆ كوێ دەچن، دەزانێ تا لەژیاندان جێگایـان كوێیـەو پـاش مردنیـان بـۆ كـوێ دەڕۆنو هەریـەكێ لـەم زینـدەوەرو گیانلەبەرانـە لـەنێو زانـستی رەهـاو بـێ سـنووری پەروەردگاردا تۆمار كراونو كۆنتڕۆڵ كراون، بەڵێ ئەمە وێنەیەكی موفەصصەلە بۆ زانیـاری خـودا لـەو كاتـەدا كـە پەیوەنـدی بەبونـەوەرەوە دەكـا، هەسـتی ئـادەمیزاد وەلـەرزە دێنـێو عـەقڵو هۆشـی سەرسـامو دامـاو دەكـا! هەرچـەندێك هـەوڵ بـدەین بەخەیاڵی ئادەمی خۆمان تەصەوری بكەین بێهودەیەو ناتوانین كۆنتڕۆڵی بكەین!

نەك هەر زانیاری تەواوی دەربارەیان هەیـەو بـەس! بـەڵكوو بـۆ هـەر یـەكێك لـەم هـەموو زیندەوەرانـە: كـە زانینـی ژمـارەو جۆریـان لـەوزەی ئـادەمیزاد دا نیـەو خەیاڵی ئێمە ناتوانێ كۆنتڕۆڵیان بكا، رزقو رۆژی مەزندەكراوی بۆ داناونو هیچیان بژێوی هیچیان ناخۆن!

بەڵێ پەروەردگار بەویستو ئیختیاری خۆی لەسەر خۆی پێویست کردوە: کە بژێوی ئەو هەموو زیندەوەرانەی سەر زەوی‌و ناوسکی زەوی‌و شوێنی تریش ئەگەر هەبن بدا.

زەوی وا گونجاوە کە بژێوی هەموو زیندەوەرێکی سەر زەوی تێدا دابین بکرێ، دەسەڵاتو زانیاری داوە بەزیندەوەرەکان هەریەکەیان بەپێی سروشتی خۆی بژێوی خۆی لەم دایکە زەمینە فەراهەم بێنێ، بۆ هەموو شتێك هۆکاری داناوە، فەرمانی کردوە هۆکارەکان بەکار بێندرێن بۆ ئەوەی ئاکامەکان بێنە دی. بەتایبەتی ئادەمیزاد کە خودا کردویەتی بەئاوەدانکەرەوەی زەوی‌و جێنشینی خودا تێیدا، هێزو توانای جەستەیی‌و عەقڵی پێ بەخشیوە بۆ ئەوەی سوود لەخێرو بەرەکەتی زەوی وەربگرێ، لێکدانەوەو تێکەو لێکە لەبەروبوومەکاندا ئەنجام بدا، کشتوکاڵ بکا، ئاژەڵ بەخێو بکا، پیشەسازی‌و بازرگانی بکا، گەشە بەشێوازی ژیان بدا، هەوڵو تەقەلا بدا بۆ وەدەست هێنانی بەروبومو بژێو: کە خودا لەناو زەوی رەخساندویەتی زانیاری پێ بەخشیونو عەقڵو هۆشی داونێ چۆن سوود لەگەنجینەکانی زەوی وەربگرن! چۆن سروشت وا بگونجێنن سوودی لێ وەربگرن! فەرمانی بەئادەمیزادان کردوە: کە هەوڵو کۆششی خۆیان بخەنە کار، هۆکارەکان پەیرەو بکەن!!

بێگومان بۆ هەموو زیندەوەرێك رزقو رۆزی تایبەتی هەیە، ئەمە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە، بەڵام ئەو ڕزقو ڕۆزییە لەم بوونەوەرەدا فەراهەم هێنراوە، لەلایەن پەروەردگارەوە مەزندە کراوە، دابو نەرێتی خودا وا هاتووە دەبێ ئەو زیندەوەرانە هەوڵ بدەن بۆ وەدەستهێنانی بژێوو پێداویستی خۆیان.

پێویستە هەر کەسە لەعاست خۆیەوە هەوڵی دابین کردنی رزقو رۆزی خۆی بدا، وەکوو گوتراوە: (ئاسمان زێڕو زیو نابارێنێ!) بەڵام ئاسمانو زەوی پڕن لەڕزقو ڕۆزی پێویست بۆ هەموو زیندەوەرێك، هەر کاتێك گیانلەبەران بەگوێرەی دابو

نــەرێتی پــەروەردگار لەبوونــەوەردا هــەوڵو تەقــەللای خۆیــان بخەنــەکار بــۆ دابینکردنی بژێوو پێداویستی خۆیان، ئـەوە بێگومـان نائومێـد نـابنو هەریەکـەیان رزقی خۆی دەست دەکەوێ.

﴿كُــلٌّ فِــي كِتَــابٍ مُّــبِينٍ﴾ هــەموو زینــدەوەرو گیانلەبــەرێك چــۆنیەتیو چەندییەتی، تەمەنو شێوازو ڕوخساری، ژیانو مردنی بەئەوپەڕی وردیو لێزانـیو ئاگالێبوونەوە لەلەوحولمەحفوظ دا چەسپێندراونو نوسراون!

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا مِن دَآبَّـةٍ فِـي الأَرْضِ وَلاَ طَـائِرٍ يَطِـيرُ بِجَنَاحَيْــهِ إِلاَّ أُمَــمٌ أَمْثَــالُكُم مَّــا فَرَّطْنَــا فِــي الكِتَــابِ مِــن شَــيْءٍ ثُــمَّ إِلَــى رَبِّهِــمْ يُحْشَرُونَ﴾الأنعام/٣٨. یان دەفەرموێ: ﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾الأنعام/٥٩.

ئەمجار سیاقی قورئانەکە بەردەوامە لەناساندنی پەروەردگار بەئادەمیزادانو نیشاندانی دیاردەی دەسەڵاتو توانای خودا لەبوونــەوەردا، حیکمـەتو دانـایی خـودا لەدروسـتکردنی ئاسمانـەکانو زەویـدا بـەنیظامو یاسـایەکی تایبـەتیو لـەو قۆنـاغو ئەطوارانـەی بەسـەر ئاسمانـەکانو زەویـدا تێپـەڕیوە چـەند بـوونو چۆن بـوونو بۆچی وابوون؟! ئەمیشیان حیکمەتێکی تایبەتی خوداییـە. لێرەدا سـیاقەکە باسـی زیندو بوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەو سزاو پاداش دێنێتە پێشەوەو ئاوێتەی باسـی دروسـتکردنی ئاسمانەکانو زەوی دەکاو دەفەرموێ:

﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ پـەروەردگار ئاسمانـەکانو زەوی دروسـتکردونو بـەدیهێناون لـەماوەی شـەش ڕۆژدا، نـەك وەك ڕۆژی ئاسـایی دونیا، بەڵکوو لـەڕۆژە تایبەتییـەکانی خـودا: کـە هـەر بۆخـۆی دەزانـێ ئـەو ڕۆژانـە چەندنو چۆنن! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿وَإِنَّ يَوْماً عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ

مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾الحج/٤٧. یان دەفەرموێ: ﴿تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾المعارج/٤.

زانایانی فەلەکو ئاسمان شوناسیی ئەوەیان سەلماندوە: کە ڕۆژانی ئەستێرەکانی تری کۆمەڵەی خۆریی جیاوازییان هەیە لەڕۆژانی سەر زەوی، جیاوازییەکەشیان بەگوێرەی قەبارەو خێرایی جەو جوڵو هەڵسوڕانو دووریانە! ڕۆژانی تەکوینو دروستکردن: کە پەروەردگار ئاسمانەکانو زەوی تێدا بەدیهێناون بەهەزاران هەزار ساڵی ئێمە مەزەندەدەکرێن!!

﴿وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ﴾ لەوەپێشو لەماوەی دروستکردنی ئاسمانەکانو زەویدا عەرشی پەروەردگار لەسەر ئاو بوو!

سەلەفی صالحو زانایانی عیلمی کەلامو تەفسیر دەفەرموون: عەرشی پەروەردگار بەشێکە لەعالەمی غەیبو ئێمەی ئادەمیزاد بەهەستو عەقڵی خۆمان دەرکی ناکەینو ناتوانین بەبیرو هۆشی ئادەمیزادیمان تەصویری بکەین، نازانین خودا چۆن لەسەر ئەو عەرشە ئیستیوای کردوەو چۆنی کۆنترۆڵی کردوە؛ نازانین پەروەردگار چۆن نەخشەو فەرمانی خۆی بۆ ئەو مەملەکەتە گەورەو فراوانە ئاراستە کردوەو دەکا!!؟

بۆیە لەئوممەسەلەو ئیمام مالیکو ڕەبیعەو ئیمام ئەحمەدو هی تریشەوە ریوایەت کراوەو فەرموویانە (الأستواء معلوم والكيف مجهول) کۆنترۆڵکردنو دەس بەسەراگرتنەکە ئاشکرایەو بڕوامان پێیەتی بەڵام چۆیەتیەتەکە نازانینو پەی پێ نابەین.!!

جا ئیتر ئەم ئاوە چۆن بوو، لەکوێ بووە، لەچ حاڵو چۆنیەتیەکدا بووە، عەرشی خودا چۆن لەسەر ئاو بووە؟ ئەمانە هەموو پرسیارنو دەقە قورئانییەکە لێیان بێ دەنگەو شی نەکردوونەوە، هەر ڕاڤەکەرێکیش خۆی بناسێ، ناتوانێ زیاد

لەمانای دەقە قورئانیەکە پل بهاویَ، ئێمە لەم غەیبەدا جگە لەم دەقە قورئانییە سەرچاوەی ترمان بەدەستەوە نیە!!

ناشگونجیَو حەقیشمان نیە بۆ ئەم جۆرە دەقە قورئانییانە تیۆری ناونراو بەتیۆری زانستی بێنینە پێشەوەو بەگوێرەی ئەو جۆرە تێۆرانە دەقە قورئانییەکە مانا بکەین، تەنانەت ئەگەر ظاهیری دەقەکە لەگەڵ تیۆرەکەدا یەکیش بگرنەوە هەر نابێ بەگوێرەی تیۆرەکە دەقەکە مانا بکەین، چونکە تیۆری زانستی بەردەوام ئەگەری گۆڕانی تێدایەو هەر رۆژەی تیۆرێك دەردەکەوێ سەد دەرسەد دژی تیۆری پێشووەو بۆچونی رابوردو هەڵدەوەشێنێتەوە، جا ئەگەر بێین مانای قورئان بەسەر تیۆرەکەدا ببڕینو بەو شێوەیە لێکی بدەینەوە، سبەینێ ئەگەر تیۆرەکە هەڵوەشایەوە دەبێ مانای ئایەتەکەش هەڵبوەشێنینەوە، ئەمەش شتێکی نەگونجاوو نەشیاوە، چونکە دەقە قورئانییەکە خۆی لەخۆیدا سەد دەرسەد راستەو شكو گومانی تێدا نیە، تیۆرە زانستییەکە لەوانەیە راست بێ لەوانەیە درۆ بێ! بۆیە نەقورئان دادەبڕێ بەسەر تیۆری زانستیدا، نەتیۆرەکە بەسەر قورئاندا دادەبڕێ تیۆری زانستی بۆخۆی ڕێبازێکی تایبەتیو مەجالێکی تری هەیە.

لەڕاستیدا هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ڕێبازی موافقەکردنی تیۆری زانستی لەگەڵ دەقەکانی قورئاندا، نەك ئیمان بەهێز ناکەنو بەس بەڵکوو دەبێتە هۆکارێك بۆ لەق کردنی ئیمان بەراستی قورئان، تێشکانی بیرو باوەڕە بەناوەرۆکی قورئانو لەخۆبایی بوونە بەزانستو زێدە ڕەوییە لەبڕوا کردن بەزانست زیاد لەسنووری سروشتی خۆی!

﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً﴾ لەپێش ئەم رستەدا چەند فەقەرەیەك مەزندە دەکرێنو بەزاراوەی زانستی (نەحوی عەرەبی) حەزف کراون ڕستە حەزف کراوەکان بەم جۆرە مەزندە دەکرێن:

واته‌: په‌روه‌ردگار ئه‌م بوونه‌وه‌ره‌ی له‌م ماوه‌دا به‌دیهێنا، بۆ ئه‌وه‌ی گونجاوو ئاماده‌باش بێ بۆ تێدا ژیانی ره‌گه‌زی ئاده‌میزاد، ئێوه‌ی ئاده‌میزادی دروستکردوه‌، زه‌وی بۆ ته‌رخان کردون، ئاسمانی بۆ گونجاندون سوود له‌مانگو خۆرو ئه‌ستێره‌و بارانی وه‌ربگرن.... په‌روه‌ردگار بالآده‌سته‌ به‌سه‌ر هه‌موو بوونه‌وه‌ردا بۆ؟ ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً﴾ بۆ ئه‌وه‌ی ئێوه‌ به‌تاقی بکاته‌وه‌، ده‌ربکه‌وێ کامه‌تان ڕو له‌خودا ده‌کاو خوداپه‌رستی چاك ده‌کاو کرداری باشو گوفتاری چاکی ده‌بێ.

هه‌ڵبه‌ته‌ ئه‌م به‌تاقیکردنه‌وه‌یه‌ بۆ ئه‌وه‌ نیه‌ شتێکی نه‌زانراوی پێ بزاندرێ، خودا بۆ خۆی زانایه‌و پێویستی به‌وه‌ نیه‌ به‌تاقیکردنه‌وه‌ شت بزانێ، به‌ڵکوو به‌تاقییان ده‌کاته‌وه‌ بۆ ئه‌وه‌ی کرداری شاردراوه‌یان ده‌ربکه‌وێ بۆ خۆیان نه‌ك بۆ خودا، پاداشو سزای له‌سه‌ر وه‌ربگرنه‌وه‌.

جا له‌گه‌ڵ هه‌بوونی ئه‌م ده‌سه‌ڵاتو توانا فراوانه‌ بۆ خودای بالآ ده‌ست، که‌چی ئه‌و کافرانه‌ عار نانێنو دان به‌زیندوبوونه‌وه‌و حیسابو لێکۆڵینه‌وه‌ی قیامه‌تدا نانێن ﴿وَلَئِنْ قُلْتَ إِنَّكُمْ مَبْعُوثُونَ مِنْ بَعْدِ الْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُبِينٌ﴾ ئه‌ی موحه‌ممه‌د! ئه‌گه‌ر تۆ به‌ڵگه‌ی زۆرو زه‌به‌نده‌ بهێنیه‌وه‌ بۆ ئه‌و کافرانه‌ له‌سه‌ر زیندو بوونه‌وه‌ی دوای مردنو پێیان بلێی به‌ته‌ئکید ئێوه‌ دوای مردن زیندو ده‌کرێنه‌وه‌و له‌گۆڕه‌کانتان ڕاست ده‌کرێنه‌وه‌ بۆ حیسابو لێکۆڵینه‌وه‌و وه‌رگرتنی سزاو پاداش، ئه‌و کافره‌ نه‌فامانه‌ له‌جیاتی ئه‌وه‌ی بڕوات پێ بکه‌نو به‌خۆیاندا بچنه‌وه‌ به‌ته‌ئکید ده‌ڵێن: ئه‌م زیندوبوونه‌وه‌ی تۆ باسی ده‌که‌ی، یان ئه‌و قورئانه‌ی باسی زیندوبوونه‌وه‌ی هاتنی ڕۆژی قیامه‌تی تێدایه‌ سیحره‌و فێڵو فرتێکی ئاشکرایه‌و بێ بناغه‌یه‌و شتی وا نابێ!

ئه‌مه‌ی که‌ تۆ ده‌یلێی بۆ شێواندنی دڵو ده‌روونو بیرو باوه‌ڕمانه‌، چاوبه‌سته‌کێیه‌ لێمان ده‌که‌یو ده‌ته‌وێ ژیانی ئاساییمان لێ تێك بده‌ی!

## هەڵوێستی موسوڵمانو کافر لەکاتی خۆشیو ناخۆشی دا

﴿ وَلَئِنْ أَخَّرْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِلَىٰٓ أُمَّةٍ مَّعْدُودَةٍ لَّيَقُولُنَّ
مَا يَحْبِسُهُۥٓ ۗ أَلَا يَوْمَ يَأْتِيهِمْ لَيْسَ مَصْرُوفًا عَنْهُمْ وَحَاقَ
بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا
رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَٰهَا مِنْهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٌ كَفُورٌ ﴿٩﴾
وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ نَعْمَآءَ بَعْدَ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ
ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّىٓ ۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٌ فَخُورٌ ﴿١٠﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَمِلُوا۟
ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١١﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی ڕون کردەوە: کە کافرەکان بڕوا بەپێغەمبەر ناکەنو ئەگەر پێیان بڵێ: قیامەت دێو ئێوە پاش مردن لەگۆڕەکانتان ڕاست دەکرێنەوە، یەکسەر دەڵێن: ئەوە سیحرو قسەی پوچو بێ بناغەیە. ئەمجار جۆرێکی تر لەسەرکەشیو بڕوای پوچو کەودەنییان دیاری دەکا؛ ئەویش ئەوەیە: هەر کاتێ ئەو عەزابەی پێغەمبەر هەڕەشەی پێ لێ کردوون، وەغراو دواکەوت ئەوان یەکسەر دەست دەکەن بەگاڵتە پێ کردنو دەڵێن: ئەوە چی ناهێڵێ ئەو عەزابەمان بۆ بێ؟!

ئەمجار باسی هەڵوێستی ئادەمیزادی کافر دەکا: کە سروشتی بەدەو کاتی خۆشیو فەرەحی لەخۆی بایی دەبێو کاتی بەڵاو ناخۆشیش لەرەحمەتی خودا نائومێد دەبێ! دەفەرموێ:

﴿وَلَئِنْ أَخَّرْنَا عَنْهُمُ الْعَذَابَ إِلَى أُمَّةٍ مَعْدُودَةٍ لَيَقُولُنَّ مَا يَحْبِسُهُ ؟﴾ وەڵڵاهی ئەگەر ئێمە ئەو عەزابەی پێغەمبەر هەڕەشەی پێ لێ کردوون بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دوای بخەین، بەگوێرەی دابو نەریتی خۆمانو لەبەر حیکمەتو پەرژەوەندییەك: هاتنی عەزابەکە هەڵبگرین بۆ ماوەی دیاریکراوی خۆی، بەگاڵتە پێکردنو لەشێوەی بەدرۆخستنەوەدا دەڵێن: ئەوەچی هاتنی عەزابەکەی بۆ ئێمە دواخست؟ بۆ نەهات؟ ئیتر زمان درێژ دەکەنو تیرو توانج لەپێغەمبەر دەدەنو لاقرتێی پێ دەکەن!

﴿أَلا يَوْمَ يَأْتِيهِمْ لَيْسَ مَصْرُوفاً عَنْهُمْ﴾ ئاگاداربەو بابزانن هاتنی ئەو عەزابە رۆژی دیاریکراوی هەیە، کە کاتی خۆی هات، ئەو کاتە هات کە خودا دایناوە بۆ نازڵبونی ئەو عەزابەی ئەوان گاڵتەی پێ دەکەن، هیچ شتێك نیە بتوانێ عەزابەکە بگێڕێتەوەو لێیانی لادا، ﴿وَحَاقَ بِهِمْ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ ئەو کاتە لەهەموو لایەکەوە عەزاب دەوریان دەداو تۆڵەی بەدرۆخستنەوەو گاڵتە پێ کردنیان لێ دەستێنێ، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَاقِعٌ، مَا لَهُ مِن دَافِعٍ﴾الطور/٧-٨.

بێگومان گەلە پێشینەکان، هەر کاتێ پێغەمبەریان بهاتایە سەرو موعجیزەو داواکارییان جێ بەجێ بکرایەو ئیمانیان نەهێنایە خودا بەعەزابی جۆراو جۆر ریشەکێشی کردونو لەناوی بردون، چونکە پەیامی ئەو پێغەمبەرانە پەیامێکی کاتی بووەو بۆ کۆمەڵێك ئادەمیزاد بووە، بۆ چینێك بووە لەگەڵو نەتەوەیەك، موعجیزەکەش هەر ئەو کۆمەڵو چینە چاویان پێ کەوتووە، بەردەوام نەبوە تا چینی داهاتوو ببینێنو ئەوانیش ئیمانی پێ بێنن.

بەڵام پەیامی پێغەمبەری ئیسلام سەرخەتمی پێغەمبەرایەتی هەموو پێغەمبەران بووە، بۆ هەموو گەلو نەتەوەکانی سەر زەوی‌و بۆ هەموو چینەکانی ئادەمیزاد بووە، مەعجیزەکەشی موعجیزەیەکی غەیرە مادییەو تا دونیا دونیا بێ

بەردەوامە، بەکەڵکی ئەوە دێ چین لەدوای چین ئادەمیزادان تێی بفکرنو چین لەپاش چین ئیمانی پێ بهێنن.

بۆیە حیکمەتو ویستی خودا وا داخواز بووە: کە ئوممەتی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵە پێشینەکان جوداواز بنو عەزابی گشتیو لەبێخ دەرهێنەریان بۆ نەنێرێو سەر لەبەر لەناویان نەبا، ئەگەر عەزابیشیان بدا، عەزابەکە بۆ هەندێکیان بێو هەموان نەگرێتەوە، هەر وەکوو چۆن لەوەپێشیش بۆ خاوەن نامەکان (جولەکەو مەسیحی) عەزابی گشتگیرو ریشەکێشی بۆ نەناردوون.

بەڵام موشریکەکان لەبەر نەزانیو نەفامی، لەبەر تێنەگەیشتن لەدابو نەرێتی پەروەردگار دەربارەی بەدیهێنانی ئادەمیزادو دەسەڵاتو ئیختیار پێدانی بەم شێوە؛ هەروەها دەربارەی دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی بەم شێوە سەرسوڕهێنەرو گونجاوە بۆ ژیانی ئادەمیزاد، هەروەها لەبەر نەزانیو نەفامییان دەربارەی دابو نەرێتی خودا لەناردنی پێغەمبەرانو دەرخستنی موعجیزە لەسەر دەستیانو ناردنی عەزابو سزا بەگوێرەی حیکمەتو دانایی پەروەردگار، ئەگەر عەزابی هەڕەشە پێ لێکراویان بۆ ماوەیەك لێ دوابخرێ، دەڵێن: ئەوەچی عەزابەکەی راگرت؟ ئەوان نەفامن، ئاگایان لەحیکمەتی خودا نیە، نازانن لەو ماوەدا کە خودا عەزابی لەسەر کافرەکانی قوریش دواخست چەند کەسیان موسوڵمان بوونو بوونە بانگەوازیکەرو موجاهید لەپێناو ئایینی ئیسلامدا، ئەو کافرانە چەند منداڵیان بوونو دوایی ئەو منداڵانە بوونە سەربازی ئیسلامو خزمەتی ئایینیان کرد!

هەر بەبۆنەی باسی پەلەکردنی کافرەکان بۆ هاتنی عەزاب، باسی هەندێ رەوشتی ناشیرینی ئادەمیزاد دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَا الإِنسَانَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَاهَا مِنْهُ إِنَّهُ لَيَئُوسٌ كَفُورٌ﴾ ئەگەر جۆرێك لەنیعمەتەکانمان ببەخشین

بەئادەمیزاد، لەشساغو تەندروست بێ، ماڵو سامانی بدەینێ، کوڕو کچی باشی بدەینێ، ئەمنو ئاسایشی بۆ فەراهەم بێنین، لەخۆی بایی دەبێ، جا ئەگەر پاشان ئەو نیعمەتانەی لێبستێنینەوە، نەخۆش بکەوێ، هەژار ببێ، خێزانو منداڵی بمرێ، توشی تەنگو چەڵەمەی ژیان ببێ، ئەوە لەرەحمەتی خودا نائومێد دەبێو زێدە ڕەوی دەکا لەرەشبینیو نائومێد بوون لەرەحمەتی یەزدان، کوفر دەکاو ڕابوردوی لەبیر دەچێتەوە، لەداهاتوو نائومێد دەبێو هەروەکوو قەت خێرو خۆشی نەبینیبێ!!

تەنانەت کوفرانی ئەو نیعمەتانەش دەکا: کە تێیاندایە، بەکورتی ئەو ئادەمیزادە ڕەوشتی خۆگری لەسەر بەڵاو سوپاسگوزاریی لەسەر نیعمەتی تێدا نیە..

﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ نَعْمَاءَ بَعْدَ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ السَّيِّئَاتُ عَنِّي إِنَّهُ لَفَرِحٌ فَخُورٌ﴾

ئەگەر ئێمە لەروانگەی ڕەحمەتی خۆمانەوە، دوای ئەو ناخۆشیو تەنگو چەڵەمانەی تووشیان بووە نیعمەتی خۆمانی بەسەردا برێژین، شیفای نەخۆشی بدەین، دوای لاواز بوونو بێ هێزیی بەهێزی بکەین، پاش هەژاریی ساماندارى بکەین، ئیتر ڕابوردووی لەبیردەچێتەوە، دەڵێ: بەڵاو موصیبەت یەخەی بەردامو جارێکی تر تووشیان نابمەوە، ئیتر سەرلەنوێ خۆی لەخۆ دەگۆڕێو کەیف خۆشو تەڕدەماخو خۆبەزلزان، کەس بەپیاو نازانێو ئاوڕ لەهەژارو بێ نەوایان ناداتەوە، لەپاساوی ئەو نیعمەتانەدا سوپاسی خودا ناکا، بەڵکوو خۆ بەسەر خەڵکدا بادەداو خۆهەڵدەنێتەوەو فەخرو شانازی بەسەر ئەمو ئەودا دەکا.

ئەم ئایەتە ئاماژە بۆ ئەوە دەکا: کە لەئادەمیزاددا ڕەوشتی ناشیرینو نەخۆشی سامناك هەن، ئەو ڕەوشتە ناشیرینو نەخۆشیانە ناهومێد بوونە لەرەحمەتی خودا، کوفرانی نیعمەتو فەخرو شانازیو خۆبەزلزانییە. چارەسەری ئەم نەخۆشییانە صەبرو خۆڕاگرییە، بڕوابوونو ڕازی بوونە بەقەزاو قەدەری خودا.

هەموو ئادەمیزاد ئەم رەوشتە ناشرینو نەخۆشییە سامناکانەیان تێدایە ﴿إِلاَّ الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُوْلَئِكَ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ مەگەر ئەو ئادەمیزادە موسوڵمانانەی کە لەکاتی تەنگانەو ناخۆشیدا خاوەن صەبرو بەئارامن، ئیمانیان پتەوەو کرداری باش دەکەن، پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی پەروەردگارن، لەکاتی ناخۆشیدا خۆڕاگرو بەئارامن، لەکاتی خۆشیو فەرەحیدا سوپاسگوزارن، ئەوانە لێخۆشبوون لەتاوانیان خەڵات دەکرێو پاداشی گەورەو مەزن لەسەر کرداری باشیان وەردەگرنەوە.

ئەوانەی خۆڕاگرن لەسەر جیهادو نەخۆشیو هەژاری، خاوەن ئارامن لەکاتی ناخۆشیو ماندوبووندا، لەکاتی خۆشیو فەرەحیدا وێڕای ئەنجامدانی ئەرکە پێویستەکانی سەرشانیان، سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی پەروەردگارن، کاری باش دەکەنو گوفتاری چاك دەبێژن، ئەوانە خودا لەتاوانەکانیان خۆش دەبێ، پاداشی کردارە باشەکانیشیان وەردەگرنەوە.

هەر لەمانای ئەم ئایەتەدایە: کە دەفەرموێ: ﴿وَالْعَصْرِ، إِنَّ الإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ، إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾العصر/١-٣.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەفەرموودەیەکیدا دەفەرموێ: (والذي نفسي بيده لا يصيب المؤمن هم ولا غم ولا نصب ولا وصب ولا حزن حتى الشوكة يشاكها الا كفر الله بها من خطاياها) واتە: سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، تووشی موسوڵمانان نابێ هیچ غەمو خەفەتو ماندوبوونو نەخۆشییەك تەنانەت هەتا چقڵو درکیش کە لەپێی رادەچێ، ئیللا پەروەردگار ئەو ناخۆشییانەی بۆ دەکاتە کەفارەتی گوناهەکانی.

لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: (والذي نفسي بيده لايقضى الله للمؤمن قضاء الا كان خيراً له: ان اصابته سراء فشكر، كان خيراً له، وان اصابته ضراء فصبر،

كان خيراً له وليس ذلك لأحد غير المؤمن) واتە: سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هەرچی خودا بەسەر موسوڵمانی دەهێنێ لەخۆشیو ناخۆشی، دەبێتە خێرو سەروەری بۆی: ئەگەر خێرو خۆشی توش بوو سوپاسی خودای لەسەر کرد دەبێتە مایەی خێر بۆی، ئەگەر ناخۆشیو زیانی تووش هات صەبری گرتو رازی بوو بەقەزاو قەدەری خودا، ئەوە دەبێتە مایەی خێرو خۆشی بۆی، ئەم بەهرەو سەروەرییە بۆ موسوڵمان نەبێ بۆ کەسی تر نیە.

بێگومان هەر ئیمانی پتەوو بەهێز: کە لەکردەوەی چاکدا ڕەنگ دەداتەوە دەتوانێ: دڵو دەروونی ئادەمیزاد لەو رەوشتە ناشیرینو نەخۆشییە سامناکانە پاڵفتە بکاتەوە، هەر ئیمانە دەتوانێ دڵی ئادەمیزاد وا لێ بکا لەکاتی خۆشیدا خۆی لەخۆ نەگۆڕێ، لەکاتی ناخۆشیدا نائومێد نەبێ؛ لەهەر دوو حاڵەکەدا وا لەئادەمیزاد بکا: کە دڵی پەیوەست بێ بەخوداوە، بەکوتکی بەلاّو موصیبەت نەپوکێتەوە، بەخۆشیو فەرەحی لەخۆی بایی نەبێ!

## موشریکەکانی مەککە داوایان لەپێغەمبەر ﷺ کرد: کە گەنجو خەزێنەی بۆ بێتە خوارێ، یان فریشتە لەگەڵ دابێ، دەشیانگوت: قورئان دەس هەڵبەستە

﴿ فَلَعَلَّكَ تَارِكُۢ بَعۡضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ وَضَآئِقُۢ بِهِۦ صَدۡرُكَ أَن يَقُولُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ جَآءَ مَعَهُۥ مَلَكٌۚ إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٞۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٌ ﴿١٢﴾ أَمۡ يَقُولُونَ

ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ وَٱدۡعُواْ مَنِ
ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾ فَإِلَّمۡ
يَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلۡمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ
فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٤﴾ ﴾

ئـەو عەرەبـە موشـریکە نەفامانـەی نەیانـدەزانی حیکمـەت لەبـەدیهێنانی بوونەوەردا چیە، شارەزای دابو نـەرێتی خودا نـەبوون، ئەوانـە بەشـێك بـوون لـەو جۆرە ئادەمیزادانەی کە بـێ ئاگاو غەفڵەت زەدەو ناهومێدو کوفرکەرو لـەخۆبایی تـەڕدەماغ بـوون، ئەوانـە نەیانـدەزانی: کـە حیکمـەتو بەرژەوەنـدی لـەناردنی پێغەمبەری ئادەمی چیەو چی نیە، بۆیە داوایان دەکردو دەیانگوت: دەبێ فریشتە ببێتـە پێغەمبـەر، یـان فریـشتە لەگـەڵ پێغەمبـەری ئـادەمـیدا بـێ، نرخـی پێغەمبەرایەتیان نـەدەزانی، دەیانگوت: دەبێ پێغەمبـەر گـەنجو خەزێنـەی هـەبێ، ئـەو درۆزنو بەدرۆخەرەوانـەی کـە سـوورن لەسـەر بەدرۆخـستنەوەی پـەیامی پێغەمبەرایەتیو سەرڕەقو یـاخی بـوون، دەبێ تـۆ ئـەی پێغەمبـەر! چییان لەگـەڵ بکەی؟

ئیبنو عەبباس ﵄ ریوایەت دەکاو دەفەرموێ: سەرانی قورەیش وتیـان: ئـەی موحەممەد! ئەگەر تۆ ڕاست دەکەی پێغەمبـەری، دە کێوەکانی مەککەمان بـۆ بکـە بـەزێڕ! هەنـدێکی تریـان وتیـان: دەبێ فریـشتەمان بـۆ بێنـی شـایەتی بـدا: کـە تـۆ پێغەمبەری، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی نـاتوانم ئـەوەتان بـۆ بکەم ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێو دەفـەرموێ: ﴿فَلَعَلَّكَ تَارِكٌ بَعْضَ مَا يُوحَى إِلَيْكَ وَضَائِقٌ بِهِ صَدْرُكَ﴾ ئـەی پێغەمبـەر! تـۆ هـەوڵو تەقـەللا مـەدە موشـریکەکان ڕازی

بکەی، چونکە ئەوان ئیمان ناهێنن، لەوانەیە ئەگەر هەوڵ بدەی ئەوان ڕازی بکەی هەندێك لەو نیگایەی بۆت دەنێردرێ‌و لەسەر شانی ئەوان گرانە تەرکی بکەی‌و نەیگەیەنی، برێك لەو شتانەی پێیان ناخۆشە بیبیسن وەکوو فەرمان بەیەکتاپەرستی‌و نەهی کردن لەبتپەرستی‌و هەڕەشە کردن لێیان‌و دەرخستنی نەفامی‌و گەوجییان پێ ڕانەگەیەنی‌و پێت ناخۆش بێ بۆیان بخوێنیتەوە، ئەوەکوو بەرپەرچدانەوەیان توندو تیژ بێ.

بەکورتی لەوانەیە تۆ برێ لەو نیگایەی بۆت نێردراوە، وازی لێ بێنی‌و پێت ناخۆش بێ هەندێ برگە لەقورئانیان بەسەردا بخوێنیتەوە ﴿أَنْ يَقُولُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ كَنزٌ أَوْ جَاءَ مَعَهُ مَلَكٌ﴾ لەترسی ئەوەی ئەوەکوو بڵێن: ئەرێ بۆچی گەنجو خەزێنەی ئاڵتونی بۆ نایەتە خوارێ بێ ئاتاجی بکا لەکاسبی‌و بازرگانی‌و بشبێتە نیشانەی ڕاستی پەیامەکەی!؟ یان بۆچی فریشتە لەتەکیا نایە؟ بۆ ئەوە پشتگیری ڕاستی پێغەمبەرایەتییەکەی بکا.

مەبەست بەو ئیستیفهامە ئینکارئامێزەی کە ﴿لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ﴾ دەیگەیەنێ لەئایەتەکەدا، نەفییە یان نەهییە..

واتە: ئەی موحەممەد! تۆ هیچ شتێ لەو نیگایەی بۆت کراوە وازی لێ مەهێنە، هەمووی بەموشریکەکانی مەککەو کافرو بێ بڕواکانی تر بگەیەنەو کۆڵە خوێندنەوەی ئەو نیگایە بەسەریاندا مەکەرەوە، چیت بۆ دێ لەنیگا پێیان ڕابگەیەنە بەدڵنیایی‌و بڕوای پتەوەوە ئەرکی سەرشانی خۆت ئەنجام بدە. ئەمە موبالەغەو جەخت کردنەوەیە لەسەر پێغەمبەر کە بەتەواوی پەیامی خۆی ڕابگەیەنێ، موبالات بەقسەو قسەلۆکی کافرەکان مەکە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەڵدەنێ کە بەتەواوی پەیامی خۆی بگەیەنێ ئەو خەڵکە پێیان خۆش بێ یان ناڕازی بن، گوێیان پێ نەدا، چونکە موجامەلەو ڕازیکردنیان بێ سوودە.

ئاشکراشە ئەمە ئەوە ناگەیەنێ: کە پێغەمبەر کەمتەرخەمی کردبێ لەئەنجامدانی ئەرکی سەرشانیو ویستبیەتی هەندێ لەقورئان پاشقول بداو نەیگەیەنێ، حاشا لەوەو قەت شتی وا نەبووە. چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) مەعصوومە لەوەی کەمتەرخەمی بکا یان خوانەخواستە خیانەت لەنیگادا بکا. بێگومان موسوڵمانان (ئیجماع) کۆڕایان لەسەر ئەومیە: کە ناگونجێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) خیانەت لەگەیاندنی نیگادا بکا، نابێو نەبوە هەندێ لەقورئان پاشقول بدا، چونکە هەبوونی شتێك لەم جۆرە کەمتەرخەمیو پاشقول دانە گومانو شك لەهەموو شەریعەتدا پەیدا دەکا، تانە لەپێغەمبەرایەتی دەدا. ئەم ئایەتە ئامۆژگاری پەروەردگارە بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە تەنگەتاو نەبێ بەگەیاندنی هەموو ئەو پەیامو نیگایەی بۆی دێ، هیچ شتێك نەتوانێ لەئەنجامدانی کارەکەی بیگێڕێتەوە، بەوپەڕی دڵنیاییو بڕوا بەخۆبوون پەرە بەبانگەوازییەکەی بداو بەشەوو بەرۆژ خەریکی گەیاندنی پەیامەکەی بێ! گوێ بەبانگەشەو بەشاتە شاتی کافرەکان نەدا، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ﴾الحجر/٩٧.

ئەی موحەممەد! گوێ بەگاڵتەکردنو رەتدانەوەی نابەجێیان مەدە، بەردەوامبە لەسەر رێبازی خۆت، ﴿إِنَّمَا أَنتَ نَذِيرٌ﴾ تۆ تەنها ئەوەندەت لەسەرە بیانترسێنی بەو قورئانەی بۆت نێردراوە، ئەوەی فەرمانت پێکراوە پێیان بگەیەنیو بیگەیەنی، ئیتر ئەوان هەڵوێستیان چۆن دەبێو چۆن نابێ کەیفی خۆیانە، ئەوە تۆ لێی بەرپرسیار نی، ﴿وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾ خودا بەسەر هەموو شتێکدا ئاگادارو چاودێرە، لەسەر کردەوەو گوفتاریان سزایان دەداتەوە، چۆنی بوێ ئاوا سزایان دەدا، تۆ پشتت بەخودا قایم بێو ئیشی خۆت بەئەو بسپێرە، بەدڵێکی فراوانو بڕوایەکی پتەوەوە ئەرکی سەرشانی خۆت ئەنجام بدە،

هیچ گرنگی بەسەر رەقیو یاخی بوونیان مەدە، بەگاڵتە پێکردنو رەتدانەوەی نابەجێیان تەنگەتاو مەبە!

ئاشکراشە لەچەند شوێنی تردا ئەم مانایە تابیلا بۆتەوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَـكِنَّ اللّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾البقرة/٢٧٢. یان دەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ، لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾الغاشية/٢١-٢٢. یان دەفەرموێ: ﴿نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ﴾ق/٤٥.

ئەمجار پەروەردگار ئیعجازو سەرناسایی قورئان بەیان دەکاو فەرمان بەپێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەدا: کە تەحەدای عەرەبەکان بکا، بەدەمیان داداتەوەو پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە پێتان وایە قورئان دەس هەڵبەستی منە، دە ئێوە ئازابن (دە) سوورەتی ئاوا بخەنە روو!

دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ﴾ واتە: بەڵکوو موشریکەکانی مەککە پێیان وایە: موحەممەد ئەم قورئانەی داناوە، دەڵێن: دەسهەڵبەستی خۆیەتیو بەدەم خوداوە هەڵی بەستووە، ﴿قُلْ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئەوەی ئێوە دەیڵێن: ئەگەر راست بێو ئادەمیزاد بتوانێ کەلامی ئاوا دابنێ؛ دە ئێوە ئازابن ﴿فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ﴾ دە سوورەتی ئاوا هەڵبەستراو بخەنە روو! هاوشانی ئەو قورئانەی من بکا لەفەصاحەتو بەلاغەتدا، لەرێکو پێکیو تۆکمەییو بەهێزیو یاسا دروستیو شەریعەت رەواییو لەخۆگرتنی زانیارییە جیا جیاکانی وەکوو رامیاریو کۆمەڵناسیو ئابوریو هەواڵدروستیو چیرۆکی رابوردوانو غەیب زانیدا، پێیان بڵێ: ئەمە ئەرزو ئەمە گەز، خۆ ئێوە شۆڕە سواری رەوانبێژیو گوزارەکاریو زمانرەوانیو وتار بێژین. ﴿وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ داوای یارمەتی لەکێ دەکەن بیکەن، کێ یارمەتیتان دەدا بابیدا، بانگی ئادەمیزادو جندۆکە بکەن، بانگی رەوانبێژو زمانپاراوو هەستیارو وێژەوانانتان بکەن، با

یارمەتیتان بدەن و کەلامێکی ئاوا بەئەندازەی (دە) سوورەتی دابێنـێن ئەگـەر ئێـوە ڕاست دەکەن ئەم قورئانە کەلامی ئادەمیزادە!!

بەڵام قورەیشییەکان بۆڕیان خواردو نەیانتوانی، چۆن دەتـوانن؟ کێ دەتوانێ نموونەی ئەم قورئانە بێنێتە ڕو؟ کەس ناتوانێ وێنـەی قورئـان بخاتـە ڕو تەنانـەت بەئەنـدازەی دەسـوورەتیش نـاتوانن بـەڵکوو نـاتوانن وێنـەی کـورترین سـوورەتی قورئانیش دابنـێن! چونکە کـەلامی خـودا جوداوازەو لـەئاخاوتنی ئادەمیزادناچێ، هەر وەکوو چۆن صیفەتەکانی لەصیفەتی مەخلووقات ناچن و زاتی پاکیشی لـەهیچ شتێك ناکاو هیچ شتێك لەوێنەی نیە!

جا ﴿فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ﴾ ئەگـەر بەدەنگتانـەوە نـەهاتن و نـەیانتوانی (دە) سوورەتی وەکوو هی قورئان دابێنن، ئـەوە ﴿فَاعْلَمُوا أَنَّمَا أُنزِلَ بِعِلْمِ اللَّهِ﴾ بـزانن: کـە ئـەوان عـاجزن لـەوەی بتـوانن وێنـەی (دە) سـوورەتی قورئـان بخەنـە ڕو، لەهـەمان کـاتدا ئـەوەش بـزانن: قورئـان لەلایـەن خـوداوە نـازڵ کـراوەو بەشـێوەو شـێوازێك نێردراوە جگە لەخودا کەسی تـر ناتوانـێ کـەلامی ئـاوا سەرئاسـاو مـوعجیز بنێـرێ، کەسـی تـر ناتوانـێ نامـەی ئـاوا پـڕ حیکمـەت و ئامۆژگـاری و هەواڵـدەر لـەنهێنی و پەنامەکییەکان دابنێ!

بەکورتی: خیطابەکە ئاڕاسـتەی پێغەمبـەرو موسـوڵمانان کـراوە، دەفـەرموێ: ئەگەر کافرەکانی مەککە نەیانتوانی دە سوورەت لەوێنەی قورئان بێنن و نەیانتوانی بەربـەرەکانی بکـەن، ئـەوە ئێـوە بـزانن ئـەم قورئانـە بەزانـست و حیکمـەتی خـودا نێردراوەو کەلامی ئەوەو دەستی ئادەمیزادی تێدا نیـە. هـەروەها بـزانن و دڵنیـابن ﴿وَأَن لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ﴾ کە هیچ خودایەك نیە حەق و ڕاست بـێ و خـاوەنی بوونـەوەرو شیاوی پەرستن بێ جگە لـە(الله) هـەر ئـەو خودایـە شـیاوی بەندایـەتی بـۆ کردنـەو توانای ناردنی قورئانی ئاوای هەیە!

﴿فَهَلْ أَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ؟﴾ ئایا ئێوه ئه‌ی گرۆهی كافرو موشریك! دوای راستكردنه‌وه‌ی ئه‌م هه‌موو به‌لگه‌و ده‌لیله به‌هێزانه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی: كه قورئان له‌لایه‌ن خوداوه هاتووه، موسولمان ده‌بن‌و بروا به‌خودایه‌تی خوداو راستی قورئان ده‌كه‌ن؟ گه‌ردنكه‌چ ده‌بن بۆ فه‌رمان‌و جله‌وگیرییه‌كانی خودا كه له‌قورئاندا ئاراسته‌ی كردوون؟ پابه‌ندی ئه‌و ئه‌حكام‌و شه‌ریعه‌ت‌و داب‌و یاسایانه ده‌بن كه له‌خۆی گرتوون؟؟

ئه‌گه‌ر خیطابه‌كه بۆ موسولمانه‌كان بێ، ئه‌و كاته مانای (مسلمون) به‌(مخلصون) لێك ده‌ده‌ینه‌وه.

بێگومان حه‌ق ئاشكرا بوو، كافره‌كان ده‌یانزانی: كه قورئان كه‌لامی خودایه‌و ده‌ست هه‌لبه‌ستی پێغه‌مبه‌ر خۆی نیه، به‌لام ترسی ئه‌وه‌یان هه‌بوو به‌رژه‌وه‌ندی‌و ده‌سه‌لاتیان له‌كیس بچێ، نه‌توانن هه‌ژارو بێنه‌وایان بچه‌وسێننه‌وه.. بۆیه په‌رده‌یان به‌به‌ربه‌ره‌كانی خۆیاندا، هه‌ندێكیان له‌و پیناوه‌دا تێداچوون!!

## كه‌سێك له‌ژیاندا هه‌ر هه‌ولی دونیای بێ، له‌نیعمه‌ت‌و خۆشی قیامه‌ت بێبه‌ش ده‌بێ!

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي ٱلْأَخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار ئەوەی چەسپاند: کە قورئان کەلامی خودایەو لەخوداوە نێردراوە بۆ پێغەمبەرو دەست هەڵبەستی موحەممەد نیە، ئەوە ڕوون دەکاتەوە: کە هۆکاری بەرهەڵستی کردنی موشریکەکان، بەدرۆخستنەوەیان بۆ پێغەمبەرو قورئان هەواو ئارەزۆو بەرژەوەند پەرستی بوو، ترسی لەدەستدانی دەسەڵاتو پلەو پایەی دونیایی بوو!

دەفەرموێ: ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لا يُبْخَسُونَ﴾ کەسێك هەوڵی ژیانی دونیا بدا، بیەوێ خۆشیو لەززەتی دونیای دەست بکەوێو جوانیو رازاوەیی دونیا بۆ خۆی دابین بکا، ئەوە بەروبوومی کردەوەکانیان بەتێرو تەسەلی دەدەمێنێو هیچی لێ کەم ناکەینەوە!؛

هەوڵو تێکۆشان لەم زەوییەدا بەروبوومی هەیە، هەر کەسێك هەوڵو تێکۆشانی هەبێ هەوڵو تێکۆشانەکەی بەفیڕۆ ناڕوا، ئاکامی دەبێ، جا کەسێك بۆ دونیا هەوڵ بداو کارو تێکۆشانی تەنها بۆ دونیا بێ ئەوە بێگومان ئاکامی تێکۆشانەکەی لەدونیادا چنگ دەکەوێو لەو ماوە کەمەو کورتەی کە تێیدا دەژیا لەززەتی لێ دەبینێ!

﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ إِلاَّ النَّارُ﴾ ئەوانەی کە لەژیانی دونیایاندا تەنها هەوڵی دونیا دەدەنو بەس! ئەوانە لەقیامەتدا جگە لەئاگری دۆزەخ لەبەرامبەر هەوڵو تێکۆشانەکەیاندا هیچی تریان پێ نادرێ، چونکە ئەوان لەدونیادا پاداشی کردەوە چاکەکانیان وەرگرتووە، ئەوەی ماوەتەوە بۆ قیامەتیان تەنها کردەوە خراپەکانیانە، چ کردەوەیەکی باشو پەسەندی بۆ قیامەت نەکردوە، هیچ حیسابێکی بۆ ژیانی پاش مردنی بەرچاو نەگرتووە. کەوابێ ﴿وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا فِيهَا﴾ بێ سوود بوو ئەو کردەوانەی لەدونیادا ئەنجامیان دابوون، هیچ کەڵکیان لێ وەرنەگرتن بۆ ژیانی قیامەتیان، چونکە مەبەستیان لەکردەوەکانیان بۆ قیامەت نەبوە.

﴿وَبَاطِلٌ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ بەتاڵو پووچ بوو پاداشی کردەوەکانیان لەقیامەتدا، چونکە ئەوان کە کردەوەکانیان ئەنجامداون مەبەستیان ڕەزامەندی خودا نەبوە، هەر کردەوەو تێکۆشانێك خۆشبەختی هەمیشەیی لێ نەکەوێتەوە پووچو بێ بایەخەو وەکوو نەبوو وایە، تەرازووی پاداشی قیامەت هەوڵدانە بۆ وەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوداو ئیخلاصو دڵسۆزییە بۆ پەروەردگار!

هەر کارو کردەوەیەك بۆ ڕەزامەندی خودا نەبێ بەپووچو بەتاڵ دەژمێردرێ.

ئەمە دابو نەریتی خودایە لەبوونەوەردا، هەر کەسێك کار بکا بەروبوومی دەبێ، کردەوە بێ پاداشو بەروبووم نابێ..

ئێمە لەم سەر زەوییەدا تاكو کۆمەڵ دەبینین: کە کاردەکەن بۆ دونیاو بەدەستهێنانی پێویستیە مادییەکانی ژیان، دەبینین بەروبوومی هەوڵو تێکۆشانی خۆیان هەڵدەگرنەوە بەجوانیو ڕازاوەیی دونیا گەییشتوونو خۆشیو نیعمەتەکانی جیهانیان دەستەبەر کردوە، خانوو باڵەخانەو باغو ڤێلاو ئامێری جۆراو جۆری ژیان خۆشکردنیان دەستکەوتووە! نابێ ئێمە لەوە سەرمان سووڕ بمێنێ، نابێ بڵێین ئەوە بۆچی وایە؟ چونکە ئەوە دابو نەریتی خودایە لەسەر زەوی: هەر کەسێك هەوڵو تەقەڵلا بدا بۆ ژیانی دونیاو خۆشگوزەرانی تێیدا پاداشی کردەوەکانیان لەدونیادا دەدەینەوەو نائومێدیان ناکەینو هیچیان لێ کەم ناکەینەوە.

بەڵام تەسلیم بوونمان بەم دابو نەریتو ئاکامانە نابێ ئەوەمان لەبیر بەرێتەوە، کە ئەو کەسانە دەتوانن هەمان کارو کردەوە ئەنجام بدەنو مەبەستیان ڕەزامەندی خودا بێو دڵسۆزانە بۆ خودا کاربکەن، ئەو کاتە وێڕای ئەوەی خۆشیو لەززەتی دونیایان دەس دەکەوێ، خۆشبەختی و کامەرانی قیامەتیشیان دەست دەکەوێ.

بێگومان هەوڵدان بۆ ژیانی قیامەت نابێتە کۆسپو تەگەرە لەبەردەم هەوڵدان بۆ ژیانی دونیا، بەڵکوو موراقەبە کردنی خودا لەکارو کردەوەدا دەبێتە

هۆی بەرەکەتو زیاد بوونی بەرهەمو پیرۆزی کارەکەو کاسبییەکە پاکو خاوێن دەکاو لەززەتو خۆشییەکە زیاد دەکاو خۆشبەختیو کامەرانی قیامەتیش مسۆگەر دەکا!

ئەی ئەوە نیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (اعمل لدنياك كأنك تعيش أبدا، واعمل لآخرتك كأنك تموت غدا) وا بۆ ژیانی دونیا تێبکۆشە وا بزانە هەتا هەتایە دەژیو قەت نامری، وا بۆ قیامەتیش هەوڵو تەقەلا بدە وا بزانە بەیانی دەمریو دونیا جێ دەهێڵی!

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاء لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُ جَهَنَّمَ يَصْلاهَا مَذْمُوماً مَّدْحُوراً، وَمَنْ أَرَادَ الآخِرَةَ وَسَعَى لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُوراً﴾الأسراء/١٨-١٩.

یان دەفەرموێ: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤتِهِ مِنْهَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ﴾الشورى/٢٠.

ئیمامی عومەریش فەرموودەیەکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: پێغەمبەر فەرمووی: (انما الأعمال بالنيات، وانما لكل امرئ مانوى، فمن كانت هجرته الى الله ورسوله فهجرته الى الله ورسوله ومن كانت هجرته الى الدنيا يصيبها أو امرأة ينكحها فهجرته الى ما هاجر اليه) هەموو کردەوەیەك بەگوێرەی نیەتو مەبەستە، هەموو ئادەمیزادێك نیازو مەبەستی چۆنە بەپێی نیازو مەبەستەکەی پاداشی دەدرێتەوە: چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە. کەوابوو هەر کەسێ نیازی لەکۆچکردنو هیجرەتەکەی لەمەککەوە بۆ مەدینە رەزای خوداو پێغەمبەر بێ ئەوە کۆچکردنەکەی قەبووڵەو بەپاداشی گەورە دەگا! هەر کەسێکیش کۆچکردنەکەی لەبەر کارێکی دونیایی بێ کە دەستی بکەوێ، یاخود لەبەرئافرەتێك بێ مارەی بکا، ئەوە کۆچکردنەکەی بەپێی نیازەکەیەتیو هیچ خێری ناگا لەسەری!

قەتادە دەفەرموێ: کەسێك دونیا نیازو مەبەستو داواکاری بێ، خودا پاداشی چاکەی بەدونیا دەداتەوە، پاشان کەدەچێ بۆ قیامەت هیچ چاکەیەکی نیە پاداشی لەسەر وەربگرێتەوە، بەڵام موسوڵمان کە کاری چاکە ئەنجام دەدا، لەدونیادا پاداشی کردەوەکەی وەردەگرێتەوە، لەقیامەتیشدا پاداشی هەیە، واتە: موسوڵمان لەسەر کردەوەی چاکی دوو پاداشی هەیە؛ پاداشی دونیاو پاداشی قیامەتیش، بەڵام کافر لەسەر کردەوەی باشی تەنها لەدونیادا پاداش وەردەگرێتەوە...

## کەسێك هەوڵی قیامەت بدا بەختەوەرە، کەسێك کافر بێ دۆزەخ جێگایەتی

﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ ۚ فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ ۚ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾



ئەم ئایەتە پەیوەندی بەئایەتی پێشوەوە ئاشکراو روونە، دوای ئەوەی پەروەردگار لەئایەتی پێشوودا باسی ئەو کەسانەی کرد: کە هەڵپەی ژیانی دونیایانەو هیچ گرنگی بەقیامەت نادەن، ئەمجار باسی ئەوانە دەکا: کە هەوڵو تێکۆشانیان بۆ قیامەتەو دەیانەوێ رەزامەندی خوداو ژیانی کامەرانی قیامەت

دەستەبەر بکەن‌و دەفەرموێ: ﴿أَفَمَنْ كَانَ عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّهِ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِنْهُ﴾ یان کەسێك لەژیانی دونیادا بەرێك‌و پێکی هەڵس‌و کەوت بکا، خودا هیدایەتی دابێ‌و رێگای حەق‌و راستی گرتبێتە بەرو هەوڵ‌و تێکۆشانی بۆ رەزامەندی خودا بێ، دڵسۆزانە لەپێناو حەق‌و راستی‌دا ژیانی خۆی بەسەر بەرێ، شاهیدێکی راستی (کە قورئانە) گەواهی بۆ بداو پشتگیری لێ بکا، ﴿وَمِنْ قَبْلِهِ كِتَابُ مُوسَى إِمَامًا وَرَحْمَةً﴾ شایەتێکی تریشی هەبێ لەوەپێش هاتبێ‌و شایەتی پێغەمبەرایەتی بۆ بداو موژدەی هاتنی دابێ. ئەویش کتێبی موسایە، نامەی تەوراتەو بەخەڵات بۆ موسا هاتووە، پەیڕەوو پرۆگرامێکی بەرزو پیرۆزو بەنرخە، شیاوی شوێنکەوتن بووەو نامەی هیدایەت‌و شەریعەت بووە، رەحمەت‌و بەرەکەت بووە بۆ ئەوانەی شوێنی کەوتوون‌و ئیمانیان پێ هێناوە..

ئایا کەسێك ئەوە حاڵ‌و شەئنی بێ، ئەوە هەڵس‌و کەوت‌و پەیڕەوو پرۆگرامی بێ؛ وەکوو کەسێك وایە: کە لەژیانی‌دا گومڕاو سەرلێ شێواوو بێ بەرنامە بێ، هەر هەوڵی لەززەت‌و خۆشی کاتی دونیای بێ؟ بێگومان وەك یەك نین.

﴿أُولَئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ﴾ ئەوانەی خودا هیدایەتی داون‌و بڕوایان بەناوەرۆکی تەورات هەیە: کە موژدەی هاتنی پێغەمبەرو ناوو نیشانەکانی تێدا تۆمار کراون، ئەوانە لەناخەوە بڕوایان بەپێغەمبەری ئیسلام‌و قورئان هەیە.

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: هەندێ لەراڤەکەرانی قورئان، لێرەدا ئیشکالیان هەڵستاندووەو دەڵێن: ئەگەر مەبەست بە ﴿أَفَمَنْ كَانَ عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّهِ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِنْهُ﴾ شەخصی پێغەمبەر بێ (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو کاتە چۆن دەگونجێ ﴿أُولَئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ﴾ کە بۆ کۆیەو کۆمەڵ دەگەیەنێ بگەڕێتەوە بۆ ﴿مَنْ﴾ لەرستەی ﴿أفمن كان...﴾دا.؟

بەڵام هیچ ئیشکالێك نایەتە گۆڕێ، چونکە راناو لە(یؤمنـون بـە) دەگەڕێتەوە بۆ (شاهد) کە قورئانە. هەروەها راناو لە(من قبلـه)یـشدا دەگەڕێتـەوە بـۆ (شـاهد). کەوابێ هیچ ئیشکالێك نیـە لـەوەدا بگوترێ: ﴿أُوْلَئِـكَ يُؤْمِنُـونَ بِـهِ﴾ ئەوانـە (واتـە: پێغەمبەرو موسوڵمانان) ئیمانیان بەم قورئانە هەیە. خۆ ئاشـکرایە پێغەمبـەریش بۆ خۆی یەکەم کەسـە کـە بـڕوای بـەقورئان هەیـە موسـوڵمانانیش لـەوەدا شـوێنی کەوتوونو ئەوانیش بڕوایان پێی هەیە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿آمَـنَ الرَّسُـولُ بِمَـا أُنـزِلَ إِلَيْـهِ مِـن رَّبِّـهِ وَالْمُؤْمِنُـونَ كُـلٌّ آمَـنَ بِاللّـهِ وَمَلآئِكَتِـهِ وَكُتُبِـهِ وَرُسُلِهِ..﴾البقرة/٢٨٥.

ئایەتی ﴿أفمن كان...﴾ لێرەدا ئاماژە بۆ خودی پێغەمبەر دەکا موسـوڵمانانی شوێنکەوتووشـی دەخرێنـە گـەڵ کـە بڕوایـان بەپەیامەکـەی کـردوە ئـەم جـۆرە تەعبیرانە لەقورئاندا زۆرو زەبەندەن.

بەکورتی کەسێك بەسروشتو بەعەقڵ موسوڵمان بێ، بڕوای بەنووری قورئان هەبێ، بڕوای بەو نیگایە بێ کە خودا بۆ پێغەمبەرانی وەکوو موساو عیساو ئـەوانی تری کردوە ئەوە لەسەر پەیڕەوو پرۆگرامێکی حەقو راستە.

﴿وَمَنْ يَكْفُرْ بِهِ مِنْ الأَحْزَابِ فَالنَّارُ مَوْعِدُهُ﴾ ئەو کەسـەی لەدانیـشتوانی مەککە بـڕوا بـەقورئان ناکـاو ئەوانـەی کۆمـەڵو پارتیـان پێـك هێنـاون دژی پێغەمبـەر لەسەرانی قـوڕەیشو جولەکەو مەسـیحیو بتپەرسـتەکان دەیانـەوێ قورئـان بـەدرۆ بخەنەوەو موسوڵمانان پاشگەز ببنەوە. هەوڵ دەدەن نەهێڵن خـەڵکی تـر موسـوڵمان ببن، ئەوانە دۆزەخ شـوێنی حەوانەوەیانـەو بەتەئکیـدی دەچـنە نـاوی‌و تۆڵـەی ئـەم بەدرۆخـستنەوەو دژایەتیکردنـەی ئایینیـان لێ دەسـتێندرێ! رۆژی قیامـەت ئـاگری دۆزەخ چاوەڕێیانە.

موقاتیــل دەفــەرموێ: مەبەســت بــە(الأحــزاب) خێڵــی بــەنو ئومەیــەو، بەنولوغەیرەی نەوەی عەبدوڵلای مەخزومیو خێڵی طەڵحەی کوڕی عەبدوڵلان.

ســەعیدی کــوڕی جوبــەیر دەڵــێ: مەبەســت بــە(الأحــزاب) هــەموو ئــەهلی ئایینەکانن.

ریوایــەتێکی تــر لــەموقاتیل ریوایــەت کــراوە دەڵــێ: مەبەســت بــە(الأحــزاب) ئاییندارى هەموو گەلو نەتەوەکانن.

لەصــەحیحی موســلیمدا لەئەبوموســای ئەلئەشــعەرییەوە فەرموودەیــەکی پێغەمبەر ریوایەت کراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویــەتی: (والذي نفسي بيده، لايسمع بي أحد من هذه الأمة يهودي أو نصراني، ثم لايؤمن بي الا دخل النـار) سـوێند بـەو کەسـەی گیـانی منـی بەدەسـتە، هەرکەسێك لـەم گـەلو نەتەوانـە هـەواڵی پـەیامی منـی پـێ بگـا، جوولەکـە بـێ، مەسـیحی بـێ، ئیمـانم پـێ نەهێنێ رۆژی قیامەت دەخرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

﴿فَلا تَكُنْ فِي مِرْيَةٍ مِنْهُ﴾ ئـەی موحەممـەد! یـان ئـەی بەرپرسـی بیسـەر! هـیچ شكو گومانـت نـەبێ دەربـارەی راسـتی ئـەم قورئانـە، ﴿إِنَّـهُ الْحَـقُّ مِـنْ رَبِّـكَ﴾ ئـەم قورئانـە کـەلامێکی حەقــەو لــەهیچ رویەکــەوە کــەمو کــورتی تێـدا نیــەو لــەهیچ لایەکەوە رەخنەی لێ ناگیرێ، لەلایەن خوداوە هاتووە، بەدیهێنـەری تـۆ ناردویـەتی، هەر کەسێ شوێنی بکەوێ خۆشبەختو کامەران دەبێ لەدونیاو قیامەتدا، ﴿وَلَكِـنَّ أَكْثَـرَ النَّـاسِ لا يُؤْمِنُــونَ﴾ وەلێ زوربــەی ئـادەمیزادان هــەواو ئارەزۆبـازیی گـومڕای کردونو رێگایان لێ تێك چووەو بڕوا بەقورئان ناکەن!

**کافرەکانو موسوڵمانەکانو پاداشتو سزای هەموو لایەکیان**

﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ
يُعْرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَـٰدُ هَـٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ
كَذَبُوا۟ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ٱلَّذِينَ
يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْـَٔاخِرَةِ هُمْ
كَـٰفِرُونَ ﴿١٩﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَمْ يَكُونُوا۟ مُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا
كَانَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ۘ يُضَـٰعَفُ لَهُمُ ٱلْعَذَابُ ۚ مَا
كَانُوا۟ يَسْتَطِيعُونَ ٱلسَّمْعَ وَمَا كَانُوا۟ يُبْصِرُونَ ﴿٢٠﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ
ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢١﴾
لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَأَخْبَتُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّهِمْ أُو۟لَـٰٓئِكَ
أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢٣﴾ ۞ مَثَلُ

ٱلۡفَرِيقَيۡنِ كَٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡأَصَمِّ وَٱلۡبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِۚ هَلۡ يَسۡتَوِيَانِ مَثَلًاۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾

پاش ئەوەی قورئان باسی هەردوو کۆمەڵی ئادەمیزادی کرد، ئەوانەی هەوڵو تەقەڵلایان بۆ دونیایەو ئەوانەی قیامەتیان دەوێو بۆ خۆشبەختیو کامەرانی ئەو جیهانە تێدەکۆشن. ئەمجار دێ ئاکامو سەرەنجامی هەردو تاقمو کۆمەڵ دیاری دەکا.

جاوەکوو باسمان کرد، مەبەست بە ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا...﴾ سەرزەنشتکردنی ئەوانەیە: کە هەڵپەی دونیایانەو قیامەتیان لەبیرچۆتەوە.

مەبەستیش بە ﴿أَفَمَن كَانَ عَلَى بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِ...﴾ ڕەتدانەوەی ئەوانەیە کە ئینکاری پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (درוودی خودای لەسەر بێ) دەکەنو تانە لەموعجیزەکانی دەدەن.

هەروەها مەبەست بە ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِباً﴾ لەم ئایەتەدا ڕەتدانەوەی موشریکەکانە: کە پێیان وایە: بتەکانیان لای خودا شەفاعەتیان بۆ دەکەن. دەفەرموێ:

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِباً؟﴾ کێ لەوە کەسە ستەمکارترە بۆ خۆیو غەیری خۆیشی؟ واتە: کەس ستەمکارتر نیەو ستەمی زۆر تر نیەو دوورکەوتو تر نیە لەحەقو ڕێبازی ڕاستو خوداپەسەند لەو کەسەی لەسەر خودا درۆ هەڵدەبەستێ، بەدەم خوداوە بەدرۆ شت هەڵدەبەستی لەکردارو گوفتارو صیفاتیدا، لەئەحکامو یاسایدا، یان پێیان وایە: بتەکانیان خودا درۆزنەکانیان لای خودا شەفاعەتیان بۆ دەکەنو خوداش شەفاعەتەکانیان قبووڵ دەکا! یان منداڵ پاڵ خودا دەدەنو پێیان وایە: خودا کوڕو کچی هەن! وەکوو هەندێ لەعەرەبەکان: کە

ده‌یانگوت: فریشته کچی خودان، جووله‌که ده‌یانگوت: عوزه‌یر کوڕی خودایه، مه‌سیحییه‌کان ده‌یانگوت: عیسا کوڕی خودایه!

﴿أُوْلَئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَى رَبِّهِمْ﴾ ئه‌وانه‌ی: كه ئاوا گومڕا بوونو ڕۆچوون له‌كوفرو شیركو درۆ هه‌ڵبه‌ستن له‌سه‌ر خودا، ڕۆژی قیامه‌ت ڕاده‌نوێندرێن به‌سه‌ر په‌روه‌ردگاردا واته: كرده‌وه‌و گوفتاریان به‌سه‌ر خودادا ڕاده‌نوێندرێ بۆ ئه‌وه‌ی حیسابو لێكۆڵینه‌وه‌یان له‌گه‌ڵ بكا.

﴿وَيَقُولُ الأَشْهَادُ هَؤُلاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى رَبِّهِمْ أَلا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾ شایه‌ده‌كان له‌فریشته‌و پێغه‌مبه‌رانو پیاوچاكانی موسوڵمان ڕاست ده‌بنه‌وه‌و ده‌ڵێن: ئا ئه‌وانه بوون به‌ده‌م خوداوه درۆو ده‌له‌سه‌یان هه‌ڵده‌به‌ستن، گه‌وره‌ترین تاوانو سته‌مییان ده‌رحه‌ق به‌په‌روه‌ردگار ئه‌نجام داوه، لێیان له‌هه‌را ده‌ده‌نو ڕیسوایان ده‌كه‌ن، ده‌ڵێن: ده‌ی نه‌فرینی خودا له‌سه‌ر سته‌مكاران بێ، ئه‌وانه‌ی هاوه‌ڵیان بۆ خودا قه‌رار ده‌داو، به‌ده‌م خودا درۆیان هه‌ڵده‌به‌ستن.

هه‌ڵبه‌ته ئه‌م ڕانواندنه ڕانواندنێكی تایبه‌تییه، ڕانواندنێكه به‌مه‌به‌ستی ڕیسواكردنو ئابڕوو بردنه، ئیتر له‌ناخۆشترین حاڵو وه‌زعدا ڕیسوایان ده‌كه‌نو شه‌رمه‌زاری ئه‌و ڕۆژه سامناكه‌یان ده‌كه‌ن!

نموونه‌ی ئه‌م ئایه‌ته ئایه‌تێكی تره: كه ده‌فه‌رموێ: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ، يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّالِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ﴾غافر/٥١-٥٢.

ئیمام ئه‌حمه‌دو هه‌ردوو پیری فه‌رمووده موسلیمو بوخاری فه‌رمووده‌یه‌ك له‌ئیبنو عومه‌ره‌وه ده‌گێڕنه‌وه ده‌فه‌رموێ: له‌پێغه‌مبه‌رم ژنه‌وت؛ ده‌یفه‌رموو: ڕۆژی قیامه‌ت: په‌روه‌ردگار موسوڵمان له‌خۆی نزیك ده‌كاته‌وه ده‌ستی قودره‌تی ده‌خاته سه‌رشانو له‌خه‌ڵكی تاق ده‌كاته‌وه‌و یه‌كه یه‌كه تاوانه‌كانی پێ ده‌دركێنێ، پێی

دەفەرموێ: فلأن تاوانو فیسار تاوانت دێتەوە یاد؟ لەبیرتە فلأن تاوانت ئەنجام دا؟ ئەویش دان بەتاوانەکانیدا دەنێو پێی وایە ئیتر بەفتارە چووە! ئەمجار پەروەردگار پێی دەفەرموێ: ئەمن لەدونیادا تاوانەکانتم بۆ پۆشیوی ئەمڕۆش لێت خۆش دەبم! ئەمجار نامەی کردەوە چاکەکانی دەداتێ.

بەلأم کافرو دووڕووەکان، شایەتەکان لێیان راست دەبنەوەو لێیان لەهەرا دەدەنو دەلێن: ﴿هَـؤُلاء الَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى رَبِّهِمْ أَلاَ لَعْنَةُ اللّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾ ئەمانە ئەوانەن کە درۆیان لەسەر خودا هەڵبەستووە، ستەمکار بوون، دەی نەفرینی خودا لەستەمکاران بێ!

﴿الَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجاً وَهُم بِالآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ﴾ ستەمکاران ئەو موشریکانەن کە ئادەمیزادان لەرێبازی خودا لا دەدەن، ئەوانەن کە بەدەم خوداوە درۆ هەڵدەبەستن بۆ ئەوەی خەڵك لەرێبازی حەق لابدەن، دەیانەوێ خەڵك شوێن حەقو راستی نەکەوێ، بڕوایان نەبێ، رێگایەك نەگرنە بەر: کە بیانگەیەنێ بەڕەزامەندی خودا، دەبنە کۆسپو تەگەرە لەنێوان ئەوانو بەهەشتدا، خەڵك لەرێگەی خودا لادەدەن بۆ رێبازی گوناهکاریو شیرك، دەیانەوێ رێبازی ئەو خەڵکە رێبازێکی خوارو خێچ بێ، توشی هەڵدێرو سەرگەردانی ببن! وەلحاڵ ئەوان بۆ خۆشیان بڕوایان بەرۆژی دوایی نیەو بەدرۆی دەزانن‌و هەوڵ دەدەن خەڵکی تریش وەکوو ئەوان وا بێ!

بێگومان بەندایەتیکردنی ئادەمیزاد بۆ غەیری خودا، پەستیو نزمیو زەلیلی لەدڵو دەروونیاندا دەخولقێنێ، لەکاتێکدا خودا دەیەوێ لەسەر کەرامەتو پیاوەتی پەروەردە ببنو بژین. پەرستنی غەیری خودا، لەژیاندا ستەمکاریو یاخی بوونو دڵرەقی پەیدا دەکا، پەروەردگار دەیەوێ عەداڵەتکارو میانەڕەو بن.

بەندایەتیکردن بۆ غەیری خودا هەوڵو کۆششی ئادەمیزادەکان ئاڕاستە دەکا بۆ بەخودا زانینی خودا درۆزنەکانو دەهۆڵو زورنا لێدان بۆیانو باتێکردنیان تا بەتەواوی جێگای خودای حەقیقی دەگرنەوە!

جا چونکە ئەم خودا درۆزنانە خۆیان لەخۆیاندا هیچو پووچو بێ وەجن، ناتوانن جێگای خودای حەقیقی بگرنەوە، ئەو بەندانەی دەیانپەرستن بەردەوام لەناخۆشیدا دەژین، شەوو رۆژ پێیاندا هەڵدەڵێنو تیشکیان دەخەنە سەرو وەسپو ئەنایان دەکەن، تەپڵو دەفیان بۆ لێ دەدەن سەڵاواتیان لەدیدار دەدەن، تا هەموو کۆششو هەوڵدانەکانی ئادەمیزاد بۆ بەرژەوەندی ئەوان تەرخان دەکرێو ژیانیان دەسوڕێ بۆ غەمو نارەحەتی ج بەرهەمێکی نابێ، ئەمەش ئەوپەڕی رێگا خوارو چەوتو چەوێڵییە.

﴿أُولَئِكَ لَمْ يَكُونُوا مُعْجِزِينَ فِي الأَرْضِ﴾ ئەو ستەمکارە لەڕێ لادەرانە، ئەو موشریكو كافرانە، هێزو توانایەكی ئەوتۆیان نیە بتوانن خودا دەستەوەستان بكەن لەوەی لەدونیادا بەسزا بیانگرێ، وڵاتیان بەسەردا وێران بكا، بەزەویدا بیانباتە خوارێ، بەردەبارانیان بكاو لەناویان بەرێ، وەكوو چۆن گەلەپێشینەكانی لەناوبردن! بەڵكوو ئەمانیش لەژێر دەسەڵاتو قەهرو غەزەبی خۆیدان هەر كاتێ بیەوێو چۆنی بوێ ئاوا سزایان دەدا، دەتوانێ لەدونیادا پێش هاتنی قیامەت سزایان بدا!

﴿وَمَا كَانَ لَهُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ﴾ ئەو ستەمكارو موشریكانە جگە لەخودا خۆی، هیچ یارمەتیدەرو پشتیوانێكیان نیە، كەس نیە بتوانێ عەزابی خودایان لێ دوور بخاتەوە...

﴿يُضَاعَفُ لَهُمُ الْعَذَابُ﴾ رۆژی قیامەت عەزابیان بۆ دوو چەندانەو چەند چەندانە دەكرێتەوە، بەهۆی ئەوەوە كە وێڕای گومڕابوونی خۆیان كەسانی

دیکەشیان گومڕا کردوون، هەروەها چونکە پێیان ناخۆشبوو گوێیان لەقورئان بێ، نەیاندەویست نیشانەکانی خودا لەبوونەوەردا ببینن.

ئەوانە ﴿مَا كَانُوا يَسْتَطِيعُونَ السَّمْعَ وَمَا كَانُوا يُبْصِرُونَ﴾ بەهیچ جۆرێك نەیاندەویست گوێیان لەقورئان بێ، خۆیان لەبیستنی حەقو راستی کەڕ کردبوو، نەیاندەویست شوێن حەق بکەونو خۆیان لەئاستیدا کوێرو کوتر کردبوو! هەروەکوو ئەوە بڵێی نەیاندەتوانی ببیستنو ببینن!

تەنانەت کە گوێشیان لەقورئان دەبوو دڵیان نەدەدایەو لێی ورد نەدەبوونەوە، هەوڵیان دەدا کەس لێی حاڵی نەبێ، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ﴾فصلت/٢٦. کە لەبونەوەریشیان دەڕوانی بەدڵ لێی ورد نەدەبوونەوە، بەسەربخەوە تەماشای ئایەتەکانی بوونەوەریان نەدەکرد!

﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ ئەوانەی خاوەنی ئەو رەوشتە نامەردانەن کە لەوەپێش باس کران ئەو ئادەمیزادانەن: کە خودی خۆیان بەفیڕۆ داوە، لەدونیادا خۆیان فەوتاندوە، پارێزگاری کەرامەتو رێزو نرخی خۆیان نەکردوە، بڕوایان بەهاتنی قیامەت نەبوو، بەدەم خوداوە درۆو دەلەسەیان هەڵبەستن، خۆیان بەفیڕۆ دا، چونکە ئەوان رۆژی قیامەت دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە، سات دوای سات گەرماییەکەی لەزیادبووندایە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيراً﴾الأسراء/٩٧. لەو سزایەدا دەتلێنەوە نەئەوەیە بمرنو لەکۆڵ ببنەوە، نەئەوەیە بەشێوەیەکی ئاسایی ژیان بەسەر بەرن!

﴿وَضَلَّ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ ئەو خودا درۆزنانەو شەفاعەتکارانەیان لێ گوم دەبن: کە لەدونیادا بەهاوەڵو هاوبەشی خودایان دەزانین، هیچ سودێکیان لێ

دەست ناکەون! بەڵکوو زیانیان پێ دەگەیەنن! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاءً وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ﴾الأحقاف/٦. یان دەفەرموێ: ﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِّيَكُونُوا لَهُمْ عِزًّا، كَلَّا سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا﴾مريم/٨١-٨٢.

﴿لا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِي الآخِرَةِ هُمُ الأَخْسَرُونَ﴾ هیچ گومان نیەو شتێکی حەقو راستە: کە ئەوانە لەقیامەتدا لەهەمووکەس زیاتر خەسارەتمەندن، چونکە خۆشیو لەززەتی بەهەشتیان گۆڕیومتەوە بەسزای دۆزەخ، خۆراکی خۆشی بەهەشتییان بەناوی کولاتووی دۆزەخ گۆڕیومتەوە، پیاڵە شەرابی خۆشو گوارایان بەسەمووەی گەرم گۆڕیومتەوە، لەجیاتی حۆرییە چاو جوانەکانی بەهەشت بنکڵی دۆزەخو لەباتی رەزامەندی پەروەردگارو چاوپێکەوتنی زاتی پاکی، غەزەبو قاری خوداو تۆڵەو سزای بەئێشی دۆزەخیان وەرگرتووە. دەی چ خەسارەتمەندییەك لەمە ماڵوێرانکەر ترە!؟!

ئەمجار پاش ئەوەی باسی حاڵو چۆنیەتیو بەسەرهاتو سەرەنجامی کافرەکانی کرد، بەشوێن ئەوەدا باسی حاڵو چۆنیەتی موسوڵمانە بەختەوەرەکان دەکاو دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَأَخْبَتُوا إِلَى رَبِّهِمْ أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ بێگومان ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، خوداو پێغەمبەریان بەراستی ناسیون، خودایان بەحەق ناسیوەو بەندایەتییان بۆ کردوە، پێغەمبەریان بەراست زانیوەو شوێنی کەوتوون، لەدونیادا کرداری چاکیان ئەنجام داوەو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی ئایین بوون، دڵیان بەئیمان ئاوەدان بووە، بەردەوام بوون لەسەر طاعەتکردنو دوورە پەرێزی لەتاوان، هەمیشە ترسی خودایان لەدڵدا بووە، ئەوانە هاوەڵانی بەهەشتن، بەهەشتی رازاوەو پڕ خێرو خۆشییان دەدرێتێ، نازو نیعمەتی وایان پێ دەبەخشرێ کە لەژمارە نایەنو بەچاو نەبیندراون بەگوێچکە نەبیستراون

بەخەیاڵیش بەسەر دڵی هیچ کەسدا رانەبردوون، ئەوان لەو بەهەشتە خۆش‌و رازاوەدا بۆ هەتا هەتایە دەمێننەوە، نەپیر دەبن، نەدەمرن، نەنەخۆش دەکەون، نەپیسایی‌و بۆنی ناخۆشییان لێوە دەردەچێ.

ئەمجار پەروەردگار لێکچون‌و موشابەهەیەك دێنێتە کایەوە، هەریەکە لەکافرو موسوڵمان دەشوبهێنێ بەشتێکی ترەوەو دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ الْفَرِيقَيْنِ كَالأَعْمَى وَالأَصَمِّ وَالْبَصِيرِ وَالسَّمِيعِ﴾ واتە: مەثەل‌و نموونەی ئەو دوو تاقم‌و کۆمەڵەی لەوەپێش باسکران، ئاکامیان دیاری کرا، کافرەکان بەبەد بەختی‌و موسوڵمانەکان بەکامەرانی، وەکوو نموونەی کوێرو کەڕو شنەواو بینەر وان، کافر وەکوو کوێر وایە، چونکە خۆی لەئاستی حەق‌و راستیدا کوێر دەکاو بەچاوی ورد تەماشای نیشانەکانی خودا ناکا لەبوونەوەردا، شارەزای رێبازی خێر نابێ‌و نایدۆزێتەوە، وەکوو کەڕ وایە، چونکە بەڵگەو دەلیلی راست نابیستێ، شتێك سوودی هەبێ بەدڵ گوێی لێ ناگرێ!

موسوڵمان وەکوو چاو ساغی گوێچکە کراوە وایە لەوەدا: کە سوود لەو قورئانە دەبینێ کە دەیبیسێ، نیشانەکانی تاك‌و تەنهایی خودا لەبوونەوەردا دەبینێ ئیمانی پتەو دەبێ، دڵ دامەزراوو بەرچاو روون دەبێ.

ئامێری دیتن‌و بیستن (چاوو گوێچکە) دوو هۆکاری زانست‌و هیدایەتن، لەروانگەی ئەمانەوە عەقڵ‌و هۆش کامڵ دەبن‌و رەهنومایی ئادەمیزاد دەکەن...

﴿هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلاً أَفَلا تَذَكَّرُونَ﴾ ئایا ئەو تاقم‌و کۆمەڵە لەرەوشت‌و حاڵ‌و سەرەنجامدا چۆن یەکن؟ ئەرێ بۆ بیر ناکەنەوە؟ بۆ پەند وەرناگرن؟

بێگومان ئەو دوو تاقمە وەکوو یەك نین، زۆر جوداوازن، دەی ئێوە بۆ وردنابنەوە؟ فەرقی نێوانی ئەم کۆمەڵ‌و ئەو کۆمەڵ بکەن؟ چۆن ئێوە ئەوەندە نەفامن جیاوازی نێوان رەوشت‌و حاڵ‌و چۆنیەتی‌و سەرەنجامی ئەم دوو تاقمە

ناکەن؟ کورە خۆ زانینی ئەوە شتێکی گران نیە دەتوانن فێری ببن، ئەوەتا پەروەردگار لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَا يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾الحشر/٢٠. یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَى وَالْبَصِيرُ، وَلَا الظُّلُمَاتُ وَلَا النُّورُ، وَلَا الظِّلُّ وَلَا الْحَرُورُ، وَمَا يَسْتَوِي الْأَحْيَاء وَلَا الْأَمْوَاتُ إِنَّ اللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَاءُ وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ﴾ فاطر/١٩-٢٢.

## چیرۆکی حەزرەتی نووح ﷺ

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ
(٢٥) أَن لَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ
أَلِيمٍ (٢٦) فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ
إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ
أَرَاذِلُنَا بَادِىَ ٱلرَّأْىِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍۭ بَلْ
نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ (٢٧) قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ
مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي رَحْمَةً مِّنْ عِندِهِۦ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوهَا
وَأَنتُمْ لَهَا كَٰرِهُونَ (٢٨) وَيَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مَالًا ۖ إِنْ

أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُوا۟
رَبِّهِمْ وَلَٰكِنِّىٓ أَرَىٰكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴿٢٩﴾ وَيَٰقَوْمِ مَن
يَنصُرُنِى مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمْ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣٠﴾ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ
عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّى مَلَكٌ وَلَآ
أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِىٓ أَعْيُنُكُمْ لَن يُؤْتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيْرًا ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا
فِىٓ أَنفُسِهِمْ ۖ إِنِّىٓ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣١﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوودا پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدی چەسپاند، ئەوەی تابیلا کردەوە: کە قورئانی پیرۆز نیگای خودایە، ئەمجار حاڵو چۆنیەتی تاقمی موسوڵمانو تاقمی کافری باس کردو سەرەنجامی هەردولایانی دیاری کرد، ئادەمیزادانی هەڵنان بۆ بیرکردنەوەو تێفکرینو پەندوەرگرتن، دوابەدوای ئەم باسو خواسانە، کۆمەڵێك چیرۆکی پێغەمبەران باس دەکا: بۆ پەندو ئامۆژگاریو بیرکردنەوە، هەروەها بۆ ئەوەی ئەوە بەیان بکا: کە پێغەمبەری ئیسلام لەگەڵ پێغەمبەرانی پێش خۆیدا هاوبەشە لەبنەمای بانگەوازیدا، هەموویان بانگەوازیان بۆ یەکتاپەرستیو بڕوا بەهاتنی ڕۆژی قیامەتو وەرگرتنەوەی پاداشو سزا کردوە،هەروەها هۆشیار کردنەوەی پێغەمبەرە: کە لەبەرامبەر ئەزیەتدانی کافرەکاندا خۆڕاگر بێ هەتا خودا چاریان دەکاو لەعۆدەیان دێ! یەکەم چیرۆکی ئەم سورەتە چیرۆکی حەزرەتی نووحە (علیه السلام). لەوەپێش پەروەردگار لەسوورەتی (یونس)دا ئەم چیرۆکەی گێڕایەوە،

لێرەشدا دووبارەی دەکاتەوە، چونکە پەندو ئامۆژگاری زۆری تێدان، گرنگتریان پێ زاناندنی کافرەکانە کە حەزرەتی موحەممەد وەکوو پێغەمبەرانی پێش خۆی، بۆیە رەوانە کراوە: کە بانگەوازی ئادەمیزادان بکا بۆ یەکتاپەرستیو چەسپاندنی زیندووبوونەوەو هاتنی رۆژی قیامەتو وەرگرتنەوەی پاداشو سزا. دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحاً إِلَى قَوْمِهِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ واتە: ئەی موحەممەد! وەکوو چۆن تۆمان کردوە بەپێغەمبەرو رەوانەمان کردوی بەترسێنەرو موژدەدەر، بێگومان (نوح)مان رەوانەکردوە بۆ سەر گەلەکەیو پێی گوتن: من رەوانەکراوی پەروەردگارم، ترسێنەرێکی ئاشکراو حەقو راستم بۆ ئێوە، دەتانترسێنم لەسزای بەئێشی خودا، رێبازی رزگاریتان بۆ روون دەکەمەوە، بڕوام پێ بکەنو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی خودابن!

من بۆ ئێوە ترسێنەرێکی ئاشکراو شارەزاکارم بەوەی: کە ﴿أَنْ لا تَعْبُدُوا إِلاَّ اللَّهَ﴾ جگە لەخودا بەندایەتی بۆ کەسی تر مەکەن. داواتان لێ دەکەم: کە یەکتاپەرستی بکەنو واز بێنن لەهاوەڵدانان بۆ پەروەردگار ﴿إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ﴾ چونکە ئەگەر بەقسەم نەکەنو یەکتاپەرستی نەکەنو واز لەهاوەڵدانان بۆ خودا نەهێنن، ئەوە من دەترسم سزای رۆژێکی بەشیدەت یەخەتان بگرێو رزگار بوونتان نەبێ.

بێگومان حەزرەتی نوح (علیه السلام) یەکەم پێغەمبەرو فروستادە بووە: کە رەوانەکراوە بۆ سەر دانشتوانی سەر زەوی لەموشریکو بتپەرستان!

**تێبینی:**

وشەی (ألیم) فەعیلی بەمانا مەفعوولە، دەی خۆ رۆژەکە ئازار ناچێژێ، ئەوەی ئازاری پێ دەگا خەڵکەکەیە نەك رۆژەکە. کەوابێ دەبێ بگوترێ: لێرەدا تەعبیرەکە بەم شێوە هەڵبژێراوە بۆ ئەوەی وا پیشان بدا کە رۆژەکە بۆ خۆی

خاوەن ئازارەو ئاوسە بەسزای بەئێش‌و بۆ خۆی ئازاری پێ دەگا! دەی حاڵی ئەوانەی لەو ڕۆژەدان دەبێ چۆن بێ؟!

﴿فَقَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ مَا نَرَاكَ إِلاَّ بَشَراً مِثْلَنَا﴾ ریش سپی‌و پیاو ماقووڵ‌و قسەڕۆیشتووەکانی گەلەکەی؛ ئەوانەی کافر بوون‌و بڕوایان بەنووح نەدەکرد، وتیان: تۆ ئادەمیزادێکی وەکوو ئێمەی‌و هیچت لەئێمە زیاد نیە، تۆ پاشاو مەلیك نی، ئادەمیزادێکی ئاسایی وەکوو ئێمەی‌و بەس! ئیتر بۆچی شوێنت بکەوین. بۆچی زێدە لەهەموو کەس نیگا بۆ تۆ هاتووە؟!

﴿وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلاَّ الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ﴾ ئێمە نابینین شوێنکەوتوانت ئیللا کەسانێکن: کە پلەی کۆمەلاَتییان نزمەو جوتیارو وەرزێرو خۆش باوەڕن، هیچ بیریان لەسەرەنجام‌و ئاکامی نەکردۆتەوە.. ئەگەر تۆ ڕاست دەکەی پێغەمبەری پیاو ماقوڵ‌و ئەشرافو عاقڵمەندان شوێنت دەکەوتن.

﴿وَمَا نَرَى لَكُمْ عَلَيْنَا مِنْ فَضْلٍ﴾ ئێمە نابینین بۆ ئێوە بەسەر خۆماندا هیچ ڕێزو نرخێك، هیچ شتێکتان لەئێمە زیاتر نیە؛ لەئێمە بەهێزو تواناتر نین، ساماندارتر نین، زانیاری‌و عەقڵ‌و فامتان لەئێمە زیاتر نیە، ئیتر چ شتێك وا لەئێمە دەکا: کە شوێنتان بکەوین.؟!

﴿بَلْ نَظُنُّكُمْ كَاذِبِينَ﴾ بەڵکوو ئێمە ئەوەمان بەلاوە ڕاستە کە ئێوە درۆزنن‌و ئەوەی دەیڵێن: گوایە ئێوە لەدونیاو قیامەتدا بەختەوەر دەبن لەڕاستییەوە دوورەو هیچی بەسەر هیچەوە نیە.!

**بەکورتی ئەو کۆمەڵە کە دەمڕاستو ریش سپی گەلی نووح بوون" چوار شوبهەیان ئاڕاستەی پەیامی حەزرەتی نووح کرد:**

١- نووح ئادەمیزادێکە وەکوو ئەوان‌و پلەو پایەیەکی وای نیە بگاتە پایەی سەرداری مەعنەوی‌و پێغەمبەرایەتی.

٢ ئەوانـەی شـوێنی کـەوتوون کۆمـەڵێکی لاتو بـێ دەسـەڵاتو هـیچ لەبارانەبوون، ئەمانە وەکوو تاقمێ وەهان لەبرسا موشاغەبە دروست بکەن! دەی ئێمە ناچینە ریزی ئەوانەوە.

٣- پلەو پایەو شانو شەوکەتی وا بەنووحو شوێنکەوتوانییەوە نابینن تەماعی ئەوەیان لێ پەیدا ببێ خۆیان بکەن بەئوممەتی نووح.

٤- وا ئەزانین: کە تۆ لەم داوای رەهبەری‌و پێغەمبەرایەتیەدا درۆ دەکەی، دەی ئێمە شوێن پیاوی درۆزن ناکەوین..!

ئـەمجار پـەروەردگار باسـی رەتدانەوەکـەی حـەزرەتی نـووح دەکاو شـوبهەو بیانووەکانیان بەرپەرچ دەداتەوەو دەفەرموێ:

﴿قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ﴾ نووح لەوەڵامیاندا وتی: ئەی نەتەوەکەم! پێم بڵێن: مـن چی بکەمو ئێوە چۆنی دەبینن؟؟ ﴿إِنْ كُنتُ عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّي﴾ ئەگـەر مـن بەڵگـەی بەهێزم بەدەستەوە بێ، یەقینم هەبێ کە مـن رەوانـەکراوی پـەروەردگارمو ئـەرکی پێغەمبەرایەتیم خراوەتە سەرشانو دەبێ ئەنجامی بدەم، دڵنیام من لەسـەر حـەقو راستیمو لـەخوداوە نێـردراوم ﴿وَآتَانِي رَحْمَةً مِنْ عِنْدِهِ﴾ پـەروەردگار رەحمـەتو بـەهرەی پێغەمبەرایـەتی لەلایـەن خۆیـەوە پـێ داوم: کـە گـەورەترین بـەهرەی پەروەردگارە، بەرزترین پلەو پایەیە؛ کە خودا دەیدا بەبەندەی خۆی! چ رەحمـەتو بەهرەیـەك لـەوە گـەورەترە کـە ئـادەمیزاد خـودا بناسـێتو رێبـازی یەکتاپەرسـتی بگرێتە بەرو ئەرکی فروستادەیی بخرێتە سەرشان؟!

من چی لەئێوە بکەم؟ مـن کـراوم بەپێغەمبـەرو لـەخوداوە نیگام بـۆ هـاتووە ﴿فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ﴾ ئـەم بەهرەیـە لـەئێوە شێردراوەتەوە، هەسـت بـەگرنگی ناکـەن، پـێی هیدایـەت نـادرێن، ئیمـانی پـێ نـاهێنن بـەڵکوو خێـرا بـەدرۆتان خـستمەوە، پەیامەکـەمتان رەتکـردەوە، ﴿أَنُلْزِمُكُمُوهَا﴾ ئایـا دەتـوانم بـەزۆر ئـەم پـەیامو

رەحمەتەتان پێ قبووڵ بکەمو بتانخەمە سەری؟! وەلحال ﴿وَأَنْتُمْ لَهَا كَارِهُونَ﴾ ئێوە پشتی لێ هەڵدەکەنو ناتانەوێ، دەی خۆ ناگونجێو عەقڵ پەسەندی ناکا ئایین بەزۆر بسەپێ!

بەراستی ئەمەیە بەڵگەی پێغەمبەرایەتیو خۆبەرزگرتن لەئاست هەڵوێستی نەفامانو بێ هۆشان.

﴿وَيَا قَوْمِ لا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مَالاً﴾ ئەی قەومەکەم! من لەجیاتی ئامۆژگاریو پەیام راگەیاندنەکەم داوای کرێو پارەو پولتان لێ ناکەم، ئەرکی سەرشانتان بەوە گران ناکەم داوای کرێتان لێ بکەم! ئەمن پەیامی خودا بەئێوە دەگەیەنمو پاداشیشم هەر لەخودا دەوێ، ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى اللَّهِ﴾ کرێو پاداشم هەر لای خودایەو هەر ئەو هیوای پاداشدانەوەی لێ دەکرێ!

بێگومان ئەمە هەڵوێستی هەموو پێغەمبەرانی دووا حەزرەتی نووح بوو؛ حەزرەتی هودو صالحو شوعەیبو حەزرەتی موحەممەدو هەموو پێغەمبەران هەر ئەم ئاخاوتنە بەنرخەیان ئاراستەی گەلەکانیان کردوە، هەموویان بەگەلەکانیان گوتووە: ئێمە ئەجرو پاداشمان لەئێوە ناوێ، خودا پاداشمان دەداتەوە!

﴿وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەوە ئیشی من نیەو لەشانی من ناوەشێتەوە کە بڕواداران لە کۆڕو مەجلیسی خۆم دوور بخەمەوە؛ ئەوانە دەرناکەم ﴿إِنَّهُمْ مُلاقُو رَبِّهِمْ﴾ ئەوانە لەرۆژی قیامەتدا بەخودای خۆیان دەگەنو حیسابیان لەگەڵ دەکا، ئەگەر دەریان بکەم شکاتم لێ دەکەنو تووشی سزا دەبم، ﴿وَلَكِنِّي أَرَاكُمْ قَوْماً تَجْهَلُونَ﴾ بەڵام من ئێوە دەبینم گەلو نەتەوەیەکی نەفامو نەزانن، حەقائیقی شت نازانن، لەناو زەلکاوی جەهلو گومڕاییدا دێنو دەچن؛ هەندێ لەنیشانەی بێ عەقڵیتان ئەوەیە: موسوڵمانەکان بەنەفام دەزانن، بەپڕوپوچو پلە نزم ناویان دەبەن، داوای ئەوەم لێ دەکەن لەکۆڕو کۆمەڵی خۆم دەریان بکەم، ئێوە نەفامن

نازانن: کە پلەو پایەی ئادەمیزاد بەکردەوەی چاکو رەوشتی جوانو بیرو باوەڕی راستە، نەك بەماڵو سامانو پلەو پایەی رواڵەتی دونیایی! یان نەزانییەکەتان لەوەدایە: کە بڕواتان بەزیندوبوونەوەو گەیشتنەوە بەخودا نیە، یان نازانن کە موسوڵمانەکان لەئێوە باشترن!

﴿وَيَا قَوْمِ مَنْ يَنصُرُنِي مِنْ اللَّهِ إِنْ طَرَدْتُهُمْ أَفَلا تَذَكَّرُونَ﴾ ئەی گەلو هۆزەکەم! ئەگەر من ئەوانەی شوێنم کەوتوونو بڕوایان پێ کردوم دەریان بکەمو نەهێڵم ئامادەی کۆڕو کۆمەڵم ببن؛ کێ پشتیوانو یارمەتیدەرم دەبێ لەبەرامبەر عەزابی خودادا، چونکە دەرکردنی ئەوانە ستەمو تاوانو سپڵەییە بەرامبەریان، ئەگەر من شتی وەها بکەم لەدەستەی ستەمکاران دەبم وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾الأنعام/٥٢.

پەروەردگار خودای دەوڵەمەندو هەژارە، خاوەنی زەبوونو بەهێزە، خودا تەرازوی عەدالەتی بەدەستەوەیە، بەپێی ئەو تەرازووە بەندەکانی هەڵدەسەنگێنێ، ئەو موسوڵمانانە لەژێر چاودێری خودادان، ئەو سەرپەرشتیاریانە، کێ من دەپارێزێ ئەگەر من تەرازوەکەی بشێوێنمو ستەم لەبەندە بڕوادارەکانی بکەم! ﴿أَفَلا تَذَكَّرُونَ ؟﴾ ئەوە بۆ بیر ناکەنەوە، بێگومان ملهوڕیو سەررەقی ئێستاتان تەرازوی سروشتی لەبیر بردونەوە، بیر بکەنەوە بابێنەوە تایمو بچنەوە سەر رێبازی راستەقینەی خۆتان!

ئەمجار کەسایەتیو پێغەمبەرایەتی خۆی دەخاتە بەردەمیان، واقعی حاڵی خۆی چۆنە ئاوا خۆی پێشکەش دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلا أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَائِنُ اللَّهِ﴾ من کە دەڵێم: پێغەمبەرمو نیگام بۆ دێ، مانای ئەوە نیە من خاوەنی خەزێنەی پەروەردگارمو دەتوانم گۆڕانکاری لەملکی خودادا بکەم! ئەمن هەرگیز پێتان ناڵێم خەزێنەی خودام لایە، من ئادەمیزادمو نیگام بۆ کراوەو لەخوداوە

بەموعجیزە پشتگیریم لێ دەکرێ، ئادەمیزادان بانگ دەکەم بۆ عیبادەت کردنی پەروەردگار.

﴿وَلا أَعْلَمُ الْغَيْبَ﴾ من غەیب زان نیم، مەگەر هەندێ شتی پەنامەکی نەبێ کە خودا بەفەضلی خۆی منی بەسەردا ئاگادار کردوەو دەکا!! ﴿وَلا أَقُولُ إِنِّي مَلَكٌ﴾ من نالێم فریشتەمو رەوشتو صیفەتێك بۆ خۆم داوا ناکەم کە نەمبێ، لافی شتێك لێ نادەم کە تێمدا نەبێو خۆم بەسەر ئێوەدا هەڵنانێمەوە. ﴿وَلا أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِي أَعْيُنُكُمْ لَنْ يُؤْتِيَهُمُ اللَّهُ خَيْراً﴾ ئەمن نالێم: بەئەو کەسانەی کە ئێوە بەهیچو پۆچیان دەزاننو لەپێش چاوتان بێ نموودو کەم بایەخن، نالێم خودا خێرو خۆشییان ناداتێ! من بریار نادەمو نالێم: ئەوانە خودا لەدونیاو قیامەتدا بەهرەمەندیان ناکا، ناچم بۆ رەزامەندی ئێوە ئەو بریارە هەڵەیە بدەم! ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِي أَنفُسِهِمْ﴾ خودا دەزانێ چی لەدەروونیاندایە، خودا دەزانێ ئاخۆ بیرو باوەریان راستو پەسەندە یان نا؟ من ظاهیر بینمو سەیری رواڵەتیان دەکەمو بەظاهیر رێزدارو خاوەن بەهرەنو هومێد وایە خودا خێرو خۆشییان بەنسیب بکا. ئەگەر دڵو دەروونیان وەکوو دەرەوەیان پاکو خاوێن بێ، ئەوە بەهرەمەندو خۆشنودن!

مەبەست بەئایەتەکە ئەوەیە: کە حەزرەتی نووح گەردنکەچیو بەندایەتی خۆی بۆ پەروەردگار پێ راگەیاندن، ئەمەش نیشانەی هێڵێکی جیاکەرەوەیە: لەنێوان پێغەمبەرانو لەنێوان پاشاو فرمانڕەوایانی جیهان، پێغەمبەران گرنگی دەدەن بەشارەزایی کردنی ئادەمیزادان بۆ رێبازێك: کە بەختەوەریی دونیاو قیامەتی تێدا بێ، بەبێ ئەوەی ماڵو سامانو بەرژەوەندی تایبەتی کاریان تێ بکا، پاشاو سەرۆکەکانی تر بۆ پەیداکردنی تاقمو پێرو شوێنکەوتوو پشت بەمادە دەبەستن، ماڵو سامان دەبەخشن بۆ وەدەستهێنانی لایەنگیریو دەنگ بۆدان!!

ئاماژەی ئەوەشی تێدایەکە پێغەمبەر ئادەمیزادەو فریشتە نیە غەیب زان نیەو چی خودا ئاگاداری نەکا پێی نازانێو پەی پێ نابا! وەکوو دەفەرموێ: ﴿قُل لاَّ

أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعاً وَلاَ ضَرّاً إِلاَّ مَا شَاء اللّهُ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لاَسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ﴾الأعراف/١٨٨.

ئەگەر من بڵێم: ئەو فەقیرو هەژارانە خاوەن پایە نین، ئیمانو باوەڕەکەیان نەنرخێنمو یەکتاپەرستییان تەقدیر نەکەم ﴿إِنِّي إِذاً لَمِنَ الظَّالِمِينَ﴾ من بەراستی لەتاوانبارو ستەمکارانم، چونکە پێغەمبەر دەبێ راستی نیشان بدا نەك حەقو راستی ون بکا، هەر کەسێك حەق ون بکا ئەوە ستەمی لەخۆی کردوە کە حەقیقەتو راستی لێ شاردونەوە!

ئا بەو جۆرە حەزرەتی نوح خۆی پێشکەش دەکا، بەشێوەیەکی واقیعیو لەسەر حەقیقەتی خۆی بەبێ زیادو کەم خۆی رادەنوێنێو ماستاو بۆ کەس ناکاو تۆزقاڵێك لەهەڵوێستی پێغەمبەرایەتی خۆی دانابەزێو ناچێ لەسەر حیسابی پەیامەکەی ملهوڕەکان رازی بکا، بەمەش وانەیەکی بانگەوازی بۆ هەموو چینە بانگەوازیکەرەکانی دوا خۆی دادا، بوو بەنموونەی بانگخوازانی ئایینی خودا، رێچکەی بۆ شکاندن چۆن موواجەهەی ملهوڕانو خاوەن دەسەڵاتان بکەنو حەقو راستییان بەگوێچکەدا بدەن بەبێ مەرایی کردن بۆیان!

ئیتر: کە کار گەیشتە ئەم ئەندازەو ریش سپیو پیاو ماقوڵانی نەتەوەی نووح هیچیان بەدەستەوە نەماو نەیانتوانی بەبەڵگە، بەڵگەکانی نووح بپووچێننەوە، ملیان لەملهوڕی خۆیانناو هەڵوێستی ئادەمیزادی دۆڕاویان نواندو پشتیان لەبەڵگە هێنانەوە هەڵکردو وازیان لەگەردنکەچ کردن بۆ بەڵگەی عەقڵیو فیطری هێناو دەستیان دایە بەربەرەکانی نەفامانەو سەررەقانەو تەحەددا کردنو رەتکردنەوەی حەقو گوێ پێ نەدانی راستی وەکوو لەئایەتەکانی داهاتوودا دەردەکەوێ.

## پەلەکردنی قەومی نوح بۆ هاتنی عەزابو نائومێد بوونی حەزرەتی نوح لەئیمانهێنانیان

﴿ قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدْ جَٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا
تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ
إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِىٓ إِنْ أَرَدتُّ
أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ ۚ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ
تُرْجَعُونَ ﴿٣٤﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَعَلَىَّ
إِجْرَامِى وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُجْرِمُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾

پاش ئەوەی حەزرەتی نوح (علیه السلام) وەڵامی شوبهەو گومانی گەلەکەی دایەوە، ئیتر هەڵوێستی نامەردانەیان نواندو دوو خاڵیان ئاڕاستە کرد، یەکەمیان پێیان گوت: ئەتۆ زۆرت دەمە دەمێ لەگەڵ کردینو لەسنوورت تێپەڕاند. دووەمیان ئەوەبوو داوایان لێ کرد کە ئەو سزایەی هەڕەشەی پێ لێ کردن بۆیان بێنێ!

دەفەرموێ: ﴿قَالُوا يَا نُوحُ قَدْ جَادَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَالَنَا﴾ قەومەکەی نوح پێیان گوت: ئەی نوح! بێگومان زۆرت لەگەڵ گوتینو جەدەلو موناقەشەی زۆرت لەگەڵ کردین، لەسنوورت تێپەڕاند! بەلگەیەك نەمایەوە نەیهێنی، شتێك نەما لامان پێت بڵێین، تاقەتمان چوو، کاس بووین، وەڕەز بووین لەبەلگە هێنانەوەو بەرپەرچدانەوە!!

﴿فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِنْ كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ ئەگەر ڕاست دەکەی دەڵێی بڕوام پێ نەکەن پێش سزای قیامەت لەدونیادا خودا سزاتان بۆ دەنێرێو بەوە هەڕەشەمان لێ دەکەی! دە ئەو عەزابەی هەڕەشەمان پێ لێ دەکەی بۆمان بێنەو منەتت نەبێ.

کە داوای هاتنی عەزابیان لەحەزرەتی نوح کرد: ﴿قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُمْ بِهِ اللَّهُ إِنْ شَاءَ وَمَا أَنْتُمْ بِمُعْجِزِينَ﴾ فەرمووی: هاتنی عەزاب بەدەست خودایە، ئەو هەر کاتێ ویستی عەزابتان بدا دەیدا، ئێوە ناتوانن لەچنگ عەزابی ئەو خۆتان قوتار بکەن، هەڵاتنتان بۆ ناکرێ، چونکە هەمووتان لەژێر چنگو دەسەڵاتی خودادانو لەملکی ئەودان.

﴿وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِي إِنْ أَرَدْتُ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِنْ كَانَ اللَّهُ يُرِيدُ أَنْ يُغْوِيَكُمْ﴾ ئەگەر خودا بیەوێ گومڕاتان بکا نەصیحەتو ئامۆژگاری من سوودتان پێ ناگەیەنێ، ئەگەر بمەوێ ئامۆژگاریتان بکەم. بەڵکوو سوود ببینن لەئامۆژگاری، پابەندە بەویستو مەشیئەتی خوداوە، دابو نەرێتی خوداش لەبوونەوەردا وا هاتووە: هەر کەسێك ئامادەباشی تێدا بێ ئامۆژگاری وەردەگرێو سوودی لێ دەبینێ: کەسێکیش گومڕاو فاسید بێ ڕەتی دەکاتەوە.

جا ئەگەر سوونەتی خودا داخوازی بەهیلاکچوونتان بێ بەهۆی گومڕایی خۆتانەوە، ئەوە من چەندێك ئامۆژگاریتان بکەم بێ سوودەو خودا سوننەتی خۆی دێنێتە جێ. نەك لەم ڕووەوە: کە خودا ناهێڵێ سوود لەئامۆژگارییەکانم وەربگرن چونکە هەڵسو کەوتی خۆتان وای کردوە سوننەتی خودا داخوازی گومڕاییتان بێو گومڕا ببن، خەتا لەخۆتانەوەیەو سوچ سوچی خۆتانە...

﴿هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ خودا بەخێوکاری ئێوەیەو هەموو شتێکی ئێوە بەدەست خۆیەتی، بەگوێرەی دابو نەرێتی خۆی لەبوونەوەردا کاروباری ئێوە هەڵدەسوڕێنێو کارەکان ئەنجام دەدا، هەموو شتێکیش لای پەروەردگار سنوورو ئەندازەی خۆی هەیەو مەزندەکراوە، لەقیامەتیشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە،

سزاو پاداشی کردەوەکانتان دەداتەوە، چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپەو تۆزقاڵێك ستەمتان لێ ناکرێ!

بەکورتی خودا بۆخۆی بەدیهێنەرو دروستکەرمومیە، هەر خۆی خاوەنی دونیاو قیامەتە چۆنی بوێ ئەنجامی دەداو دەیهێنێتە کایەوە.

ئا بەم جۆرە چیرۆکەکەرادەنوێنێو بەڵگە بەرامبەر بەڵگە دێنێو هەڵوێست لەئاست هەڵوێستدا دەخاتە ڕو، جا کە چیرۆکەکە گەییشتە ئەم ئاستە ئەم ئاستە حاسیمو یەکالاکەرەوە. ئایەتێکی ناواخنو موعتەرەضە دێنێ کە باس لەئوممەتی موحەممەد دەکاو پرسیارو وەڵامە لەنێوان پێغەمبەرو قورەیشییەکاندا.

هێنانی ئەم ئایەتە لەناوەندی چیرۆکەکەدا نیشانەی ئەوەیە: کە چیرۆکەکە بۆ مەبەستی تەوجیهو ئیرشادە، بۆ سەرنج راکێشانو تەمثیلە، بەجۆرێك گونجاو بێ لەگەڵ بانگەوازی تازە. دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ﴾ بەڵکوو ئایا ئەو کافرە سەرڕەقو نەفامە قورەیشییانە دەڵێن: موحەممەد بۆخۆی قورئان هەڵدەبەستێو ئەم چیرۆکەی (نووح)یش کە بۆمان دەگێڕێتەوە بۆ خۆی دایناوە!

پەروەردگار فەرمان دەکا بەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە ڕەدیان بداتەوە دەفەرموێ: ﴿قُلْ:﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ﴿إِنْ افْتَرَيْتُهُ فَعَلَيَّ إِجْرَامِي﴾ ئەمن ئەگەر ئەم قورئانەم هەڵبەستبێ وەکوو ئێوە دەڵێن، ئەوە ئێوە هیچتان لەسەر نیەو چ زیانێکتان پێ ناگا، بەڵکوو سزای تاوانی خۆم خۆم دەیچێژمو بۆخۆم بەرپرسیارم!

﴿وَأَنَا بَرِيءٌ مِمَّا تُجْرِمُونَ﴾ منیش بەرپرسیار نیم لەتاوانی ئێوە سزای تاوانی خۆتان لەسەر خۆتانە، حوکمی خودا وایەو بڕیاری وا داوە هەموو کەسێك بەگوێرەی کردەوەی خۆی پاداشو سزا وەربگرێتەوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا

دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَى، وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّى، أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ﴾النجم/٣٦-٣٨.

وێنەی ئەم ئایەتەی ئێرە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنتُمْ بَرِيئُونَ مِمَّا أَعْمَلُ وَأَنَاْ بَرِيءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾يونس/٤١.

هەندێ لەراڤەکەران دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ...﴾ گفتو گۆی حەزرەتی نووحە لەگەڵ گەلەکەی‌و رەستەی ناوەخن نیە، چونکە نەلەپێشەوە نەلەپاشەوە جگە لەباسی نووح‌و گەلەکەی باسی کەسی تر ناکرێ.

**تێبینی:**

ئایەتەکان بەئاشکرا ئەم حوکمانەیان لێ وەردەگیرێ:

١- موناقەشەو دانوسان لەئایین‌دا بۆ چەسپاندنی بەڵگەو لابردنی شوبهەو گومان کارێکی پیرۆزە.

٢- لاسایی کردنەوەو نەفامی‌و سوور بوون لەسەر بەتاڵ، پیشەی کافرو گومرایانە، کێشەو جەدەل بۆ زاڵبوونی بەتاڵ بەسەر حەق‌دا کارێکی ناپەسەندەو ئەو کەسەی خەریکی ئەوە بێ لەهەر دوو جیهان‌دا سەرزەنشت کراوە.

٣- رستەی ﴿كَانَ اللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ﴾ لەئایەتەکەدا رەددە لەسەر موعتەزیلەو قەدەرییەو شوێنکەوتوانیان؛ ئەوانەی پێیان وایە: خودا نایەوێ تاوانبار تاوان بکا، یان کافر کوفر بکا، پێیان وایە ئەوانە کە ئەمە دەکەن خودا ئیرادەی نەکردوە.

لەراستی‌دا خودا هیدایەتدەرو گومراکەرە، واتە: ئیرادەی خودا دەگونجێ تەعەلووق ببەستێ بەئیغواوە وەکوو چۆن تەعەللوق دەبەستێ بە(اهداو)ەوە. بەکورتی خودا رێگەی هیدایەت‌و رێبازی گومرایی بۆ ئادەمیزاد روون دەکاتەوە، ئادەمیزاد بۆ خۆی لایەک هەڵدەبژێرێ‌و هەڵبژاردنەکەش بەویستی خودایە!

فەرموودەکەی حەزرەتی نووح لەئایەتەکەدا، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە خودا گومڕای نەکردون بەڵکوو ئیختیاری پێ داونو ئەوان بەویستی خۆیان ڕێبازی گومڕاییان هەڵبژاردوە ئەمەش بەدوو بەڵگە:

أ- ئەگەر خودا بیویستایە گومڕایان بکاو ویستەکەی خۆی بێنێتە دی، ئیتر ئەو کاتە چ سوودێك لەئامۆژگاری کردنەکەیاندا نەدەمایەوە، هەروەها خودا فەرمانی نەدەکرد بەنووح کە بانگی کافرەکان بکاو ئامۆژگارییان بکا. موسوڵمانانیش کۆڕا (اجماع)یان هەیە: کە پێغەمبەری ئێمە وەکوو باقی پێغەمبەرانی تر فەرمانی پێ کراوە: کە بانگەوازی کافران بکاو ئامۆژگارییان بکا.

ب- ئەگەر بچەسبێ: کە خودا بڕیاری داوە کە ئەوانە گومڕا بکا، یان بەگومڕایی دروستیان بکا، ئەو کاتە ئیمان نەهێنانەکەیان عوزرەو بیانوویان بەدەستەوە دەبێ، هەروەها بانگەوازی نووح بێهودەو بێ مەبەست دەبوو.

بەکورتی مەذهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەت ئەوەیە: خودا جاری وا دەبێ ئیرادەی کوفر دەکا لەئادەمیزاد وەڵێ فەرمانی پێ ناکا، بەڵکوو فەرمانی پێ دەکا بەئیمان هێنانی.

هەر کاتێ خودا ویستی ئادەمیزاد کافر بێ هەرگیز ئیمانهێنانی لێ دەرناکەوێ!

## پەروەردگار جڵەوگیری لەنووح دەکا کە بەلەناوچوونی قەومەکەی غەم نەخواو، خەریکی دروستکردنی کەشتی بێ

﴿وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ

بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلَا تُخَاطِبْنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ
﴿٣٧﴾ وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ
سَخِرُواْ مِنْهُۚ قَالَ إِن تَسْخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا
تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ
وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ
قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن
سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ وَمَنْ ءَامَنَۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٤٠﴾ ۞
وَقَالَ ٱرْكَبُواْ فِيهَا بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْرٜىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ
رَّحِيمٌ ﴿٤١﴾ وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَٱلْجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ
ٱبْنَهُۥ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَٰبُنَيَّ ٱرْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ
ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ سَـَٔاوِيٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ ٱلْمَآءِۚ
قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا

ٱلْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ ﴿٤٣﴾ وَقِيلَ يَٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِى
مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقْلِعِى وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى
ٱلْجُودِىِّ ۖ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ
فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ
ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ ۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ
صَٰلِحٍ ۖ فَلَا تَسْـَٔلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۖ إِنِّىٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ
ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى
بِهِۦ عِلْمٌ ۖ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ
﴿٤٧﴾

ئه‌م ئایه‌تانه ته‌واوكه‌ری پێشه‌وه‌نو باسی خۆئاماده‌كردن بۆ له‌ناوبردنی گه‌لی نووح ده‌كاو ده‌فه‌رموێ: ﴿وَأُوحِيَ إِلَى نُوحٍ أَنَّهُ لَنْ يُؤْمِنَ مِنْ قَوْمِكَ إِلاَّ مَنْ قَدْ آمَنَ فَلا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا يَفْعَلُونَ﴾ واته: نیگا بۆ نووح كرا: كه جگه له‌وانه‌ی له‌گه‌له‌كه‌ت ئیمانیان پێ هێناوی كه‌سی تر بڕوات پێ ناكا، كه‌وابێ تۆ نارِه‌حه‌ت مه‌به به‌وه‌ی ئه‌نجامی ده‌ده‌نو به‌وه‌ی له‌ناكاما به‌سه‌ریان دێ. كاتی ترساندنو بانگه‌وازی به‌سه‌ر چوو، وه‌ختی ده‌مه ده‌مێو موناقه‌شه‌و جیدال نه‌ما، ئه‌و دڵو ده‌روونانه‌ی

ئامادەباشیان تێدا بوو: بۆ ئیمانهێنان ئیمانیان هێنا، ئەوانەی تا ئێستا بڕوایان پێ نەکردووی تازە ئیمانت پێ ناهێنن، چونکە ئامادەباشی ئیمانهێنانیان تێدا نیە.

ئا بەم جۆرە پەروەردگار نیگای بۆ پێغەمبەری خۆی؛ (نوح) کرد: ئەویش لەهەموو کەس باشتر حاڵو وەزعی بەندەکانی دەزانێ، دەزانێ چۆن دەبنو چی دەکەن، دەزانێ بەردەوام بوون لەسەر بانگەوازیی بێهودەیە، ئیتر هەڵوێستو کوفرو بەربەرەکانیو بەدرۆخستنەوەو گاڵتە کردنیان بەرامبەر پەیامەکەت عائید بەخۆیانەو خۆیان لێی بەرپرسیارنو خۆیان سزای ئەو کردەوانەیان دەچێژن!

دڵ ناخۆش مەبە بەوەی ئەنجامی دەدەن ئەو هەڵوێستو کردەوانەیان زیان بەتۆ ناگەیەنێ، خەفەتیان بۆ مەخۆ، چونکە ئەوان گەلێکی بێ خێرو پڕو پووچن، وازیان لێ بێنە!

حەزرەتی نووح کە لەئیمانهێنانیان ناهومێد بوو دوعای فەوتانو لەناوچوونی لێ کردن، فەرمووی: ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً﴾نوح/٢٦.

ئەوان حیسابیان بیتی بوو، بڕیاری لەناوچوونیان دراوەو بڕاوەتەوە. تۆ خەریکی چارەسەری رزگار کردنی خۆتو شوێنکەوتوانت بە ﴿وَاصْنَعْ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا﴾ کەشتی رزگار بوون دروست بکە، لەژێر چاودێری ئێمەو ریعایەتو پارێزگاری ئێمە بەگوێرەی نیگای ئێمە خەریکی دروستکردنی کەشتی ببە، چۆنت پێ دەڵێین: ئاوا دروستی بکە، ئاکامو سەرەنجامی ئەوان تەواو بوو، بڕیاری لەناوچونیان درا. ﴿وَلَا تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُوا إِنَّهُمْ مُغْرَقُونَ﴾ ئەی نووح! ئیتر دەربارەی ئەو ستەمکارانە نزاو پاڕانەوەم لێ نەکەی! نەچی بپاڕێیەوە بۆ ئەوەی عەزابیان لەسەر لابەرین، شەفاعەتیان بۆ نەکەی! ئەوان بڕیاری خنکانیان بەتۆفان دەرچووە، ئیتر شەفاعەت بۆ کردنیان یاساغە!

﴿وَيَصْنَعُ الْفُلْكَ﴾ ئیتر حەزرەتی نووح دەستی کرد بەدروستکردنی کەشتی ﴿وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِنْ قَوْمِهِ سَخِرُوا مِنْهُ﴾ هەر کاتێ کۆمەڵێك لەئەشرافی گەلەکەی بەلایدا تێپەڕبوونایە گاڵتەیان پێ دەهاتو پێی پێ دەکەنینو پێیان وابوو شێت بووە!! بەگاڵتەوە پێیان دەگوت: ئەوە دوای ئەوەی پێغەمبەر بووی ئەمجار بووی بەدارتاش؟!

هەڵبەتە ئەمە شتێکی ئاساییەو چاوەڕوانکراو بوو، چونکە هەر کەسێك کارێك بکا لەژوور عەقڵو هۆشی خەڵکەوە بێ، حەتمەن گاڵتەی پێ دەکەنو بەلایانەوە گاڵتەیە تا لەئاکامو سەرەنجامدا سەرکەوتن بەدەست دێنێ!

ئەوان گاڵتەیان پێ دەکردن، چونکە هەر زاهیری شتەکەیان دەزانی، ئاگایان لەناوەڕۆکو پەنامەکی کەشتی دروستکردنەکە نەبوو، ئاگایان لەوە نەبوو ئەوە فەرمانو نیگای خودایە، نەیاندەزانی چ حیکمەتو نەخشەو پیلانێك لەو کارەدا هەیە.

بەڵام حەزرەتی نووح بتمانەی بەپەیامی پەروەردگار هەبوو، لای ڕونو ئاشکرابوو، ئاکامو سەرەنجام چۆن دەبێ!

بەوپەڕی دڵنیاییەوە هەواڵی پێ دەدان: کە ڕۆژێك ئەمیش گاڵتە بەئەوان دەکا.

﴿قَالَ إِنْ تَسْخَرُوا مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنْكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ﴾ حەزرەتی نووح فەرمووی: ئەگەر ئێوە ئەمڕۆ گاڵتە بەئێمە بکەنو پێتان وا بێ کەشتی دروستکردنەکەمان کارێکی بێ سوودە، ئەوە ئێمەش گاڵتە بەئێوە دەکەین، ئەمڕۆ گاڵتەتان پێ دەکەینو پێکەنینمان بەعەقڵی ئێوە دێ چونکە نەفامنو نازانن حیکمەتو بەرژەوەندی ئەمە چییە، سەبەینێش کە سزاو عەزاب دێتە سەرتان گاڵتەتان پێ دەکەین وەکوو چۆن ئەمڕۆ ئێوە گاڵتە بەئێمە دەکەن! جا ئەگەر

ئەمڕۆ سوودی کارەکەمان نازانن ئەوە ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَنْ يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُقِيمٌ﴾ لەوە بەولاوە سوودی کارەکەمانو کەشتی دروستکردنەکەمان دەزانن‌و لەمەبەستەکە حالّی دەبن.

لەوە بەولاوە دەزانن: کێ عەزابی پڕ ئێش‌و ئازارو ڕیسواکەری بۆ دێ: کە سزای خنکان بەتۆفانە! دەزانن کێ عەزابی بەئێشی قیامەتی بۆ دێ‌و دەیچەرپێنێ بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێنێتەوەو ڕزگاری نابێ، ئێمە یان ئێوە!!

ئەمجار دیمەنێکی تر دەست پێ دەکا، دیمەنی ساعەی سیفرو کاتی دەست پێ کردنی تۆفان ڕادەنوێنێ‌و دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا جَاءَ أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ﴾ جا ئەو کاتەی کاتی فەرمان کردنمان بەهیلاکچوونیان هات ئاو لەتەندوور هەڵقوڵاو بەخوڕەژم بەرزبوەوەو بڵقی هاویشتن‌و فوارەی کرد! ئەمە نیشانە بوو بۆ حەزرەتی نووح، کە هەر کاتێ لەتەندوور ئاو هەڵقوڵا، ئەوە نیشانەی هەڵسانی تۆفانەکەیە.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: تەنوور: ڕوی زەوییە، واتە هەموو سەر ڕووی زەوی بوو بەسەرچاوەو ئاوی لێ هەڵدەقوڵا، تەنانەت لەتەندوورەکان کە شوێنی ئاگرن ئاو هەڵدەقوڵاو فوارەی دەکرد.

چیرۆک‌و سەرگوشتەی زۆرو جۆراو جۆر دەربارەی هەڵقوڵانی ئاو لەتەندوور هەن‌و هەندێکیان خەیاڵئامێزن‌و ئیسرائیلییاتیان تێکەڵاو بووەو نامەوێ ڕاگوێزی نێرەیان بکەم.

ئەوەی کە لێرەدا دەتوانین بیلێین: ئەوەیە: دەگونجێ هەڵقوڵانی ئاو لەتەندوور بەهۆی بورکانێکەوە بێ لەتەندوورەکەوە ئاو هەڵقوڵابێ یان کانیاوێك لەو شوێنەوە تەقی بێ ئاوی لێ دەرچووبێ، دەگونجێ ئەم هەڵقوڵانە نیشانەیەك بوو بێ بۆ حەزرەتی نووح‌و هاو کات بووبێ بۆ سەرەتای دەست پێکردنی تۆفانەکە!

جا كە تۆفانەكە دەستی پێ كـرد ﴿قُلْنَا احْمِلْ فِيهَا مِنْ كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ﴾ ئـەو كاتە بە(نووح)مان گوت: هەڵبگرە لەناو كەشتییەكەدا لەهەموو جۆرە گیانلەبـەرێك نێـرو مێیـەك، بـۆ ئـەوەی گـەرای ئـەو حەیوانانـە نەفـەوتێ دوایـی زاووزێ بكـەنو بێچوویان لێ بكەونەوە.

ئەمجار ژمارەی ئەم نێرو مێیانە چـەند بـوونو چـەند جۆربـوونو حـەزرەتی نووح چۆنی كۆكردنەوە، ئەمەش دووبارە گۆڕەپانێكی بەرفراوانە بۆ ئیسرائیلیاتو نامەوێ ئەو راو بۆچوونانە راگوێزی ئێرە بكـەم! دەقـە قورئانییەكـە هـەر ئەوەنـدە دەڵـێ: كـە فـەرمانمان بـەنووح كـرد لەهـەموو نێـرو مێیـەك جوتێـك بخاتـە نـاو كەشتییەكەوە.

﴿وَأَهْلَـكَ إِلاَّ مَـنْ سَـبَقَ عَلَيْـهِ الْقَـوْلُ﴾ واتـە: هـەڵبگرە لـەناو كەشـتییەكەدا لەخانـەوادەی خـۆت بـەنێرو مێیانـەوە، جگـە لەوانـەی بڕیـار دراوە كـە لـەپێڕی خنكاوان بن بەهۆی ستەمكارییانەوە ئەوانیش كەنعانی كوڕی نووحو دایكی كـەنعان بوون كە لەبیرو ڕادا لەگەڵ كافرەكاندا بوونو نووحیان بەشێت دەزانی!

﴿وَمَـنْ آمَـنَ﴾ هـەروەها هـەڵبگرە لەكەشـتییەكەدا هـەر كەسـێ ئیمـانی پێـت هێناوە لەكەسانی تر كە لەخانەوادەی خۆت نـین ﴿وَمَا آمَنَ مَعَـهُ إِلاَّ قَلِيـلٌ﴾ وەلحاڵ ژمارەیەكی كـەم ئیمانیـان پـێ هینـابوو، وێـڕای ئـەو مـاوە دورو درێـژەی: كـە نـووح تێیدا بانگەوازی كردن، ژمارەیەكی كەم نەبێ كەسی تر بڕوایان پێ نـەكرد، هەنـدێ لەراڤەكـەران دەفـەرموێ: شـەش پیـاو، یـان هەشـت پیـاو لەگـەڵ خێزانـەكانیاندا ئیمانیان هێناوە! واتە: (٩٥٠) نۆسەدو پەنجا ساڵ ئەم پێغەمبەرە بەرێزە بانگـەوازی كردن ئەو ژمارە كەمە بڕوایان پێ كـرد! ئیبنـو عـەبباس دەفـەرموێ: هەشـتا كـەس ئیمانیان پێ هێناوە!

پـەروەردگار بەپێویـستی نـەزانیوە ژمـارەی ئەوانـە بـەیان بكـا كـە ئیمانیـان هێناوە، هـەروەها جۆرەكـانی ئـەو گیانلەبەرانـەی كـە خـستونیە نـاو كەشـتییەكەوە

دیاری نەکردوونو چۆنیەتی هەڵگرتنەکە شیانی روون نەکردۆتەوە. (ئیتر بۆچی ئێمە رملی لیٚ راهاوین).

﴿وَقَالَ ارْكَبُوا فِيهَا بِاسْمِ اللَّـهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا﴾ واتە: نووح بڕوادارەکانو گیانلەبەرەکانی خستە ناو کەشتییەکەوەو وتی: سوار بن، بەناوی خودایە رۆیشتنی ئەم کەشتییە بەسەر ئاودا، بەناوی خودایە ئاگامی رۆیشتنەکەی‌و راوەستانی، هەمووی بەتەسخیرو رامکردنی پەروەردگارە، بەهۆی دەسەڵاتو توانای خودایە نەك بەهێزی ئێمە!

﴿إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ پەروەردگاری من لێخۆشبوونی زۆرە بۆ بەندە بڕوادارەکانی، بەرەحمو بەسۆزە بۆیان: کە بەهۆی تاوانەوە لەناوی نەبردن، بەڵکوو کافرە ستەمکارەکان لەناو دەبا. بەرەحمو بەسۆزە: کە ئەو کەشتییەی بۆ دابین کردنو لەو تۆفانو خنکانە رزگاری کردن.

طەبەرانی‌و هی تریش لەحەسەنی کوڕی عەلییەوە ریوایەت دەکەن: کە دەڵیٚ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (أمان لأمتي من الفرق اذ رکبوا الفلك أن يقولوا باسم الله الملك الرحمن الرحيم ﴿باسم الله مجريها ومرساها، ان ربي لغفور رحيم﴾).

ئەمجار دیمەنێکی سامناك دەست پیٚ دەکا، ئەویش دیمەنی تۆفانو هەڵبەزو دابەزی کەشتیەکەیە! دەفەرمویٚ: ﴿وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ﴾ واتە: کەشتییەکە دەرۆیشت بەناو شەپولی گەورەو سامناکدا، کە وەك کێو وەهابوون لەبەرزی‌و گەورەیی‌و درێژیدا، جا کەسێك ئاگای لیٚ بووبیٚو کەوتبێتە ناو شەپولی دەریای گەورە لەو کاتەدا کە بای بەهێزهەڵدەکاو شەپۆلی وەکوو کێو دەخولقێنیٚو دیمەنێکی سامناك نیشان دەدا، دەزانیٚ کە ئەم زێدە رەوی‌و موبالەغە لەم تەشبیهو لێك چواندنەدا شتێکی ئاساییە..

چونکە لەکاتی هەڵسانی شەپۆلی ئاوەهادا، تۆ کەشتییەکەت وا دێتە بەرچاو، وەکوو ئەوە بڵێی دادەبەزێتە قوڵاییەکی زۆر قووڵو لەهەردولاوە وەکوو کێو شەپۆلەکان دەوری کەشتییەکەیان داوەو خەریکە دایپۆشن، هەر پاش ماوەیەکی کورت دبینیٚ کەشتیەکەت بەرز بۆتەوە بۆ سەر تۆپەڵاکی شەپۆلەکەو دەیەویٚ لەو حەوایەڕا خۆبەربداتەوەو بکەوێتە خوارو کەشتییەوانان لەسەر پشتی کەشتییەکە بەحەبلو گوریسی ئەستوورو پتەو خۆیان بەستۆتەوە، نەوەکوو لەنکاوێك بکەونە بەر هەڵمەتی شەپۆلەکانو لولیان بدەن! ئالەم کاتە سامناكو ناسکەدا، حەزرەتی نووح کوڕێکی خۆی بینی لەوان تەرە بووەو سواری کەشتییەکە نەبووە، ئیتر سۆزی باوکایەتی پاڵی پێوە دەنیٚو بانگی کوڕی یاخی بووی دەکاو دەفەرمویٚ:

﴿وَنَادَى نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ﴾ حەزرەتی نوح بانگی کوڕەکەی خۆی کرد وەلحال لێیان تەرەبوبوو فەرمووی: ﴿يَا بُنَيَّ ارْكَبْ مَعَنَا وَلا تَكُنْ مَعَ الْكَافِرِينَ﴾ ئەی کوڕی خۆم! وەرە لەگەڵ ئێمە سواری کەشتییەکە ببەو لەتاقمو پێڕی کافرەکان مەبە؛ کە خودا بڕیاری داوە بەم تۆفانە لەناو بچن!

بەڵام کوڕی گەنجو سەرکەشو لەخۆبایی بوو، ئامۆژگاری باوکی بەگویٚدا نەچوو ﴿قَالَ سَآوِي إِلَى جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنْ الْمَاءِ﴾ وتی: خۆم دەگەیەنمە سەر لوتکەی کێوێك بۆ ئەوەی لەخنکان بمپارێزیٚ!

﴿قَالَ لا عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِلاَّ مَنْ رَحِمَ﴾ نووح وەڵامی کوڕەکەی دایەوەو وتی: لەم ڕۆژەدا هیچ شتێك نیە بتوانیٚ یەکێك لەخنکان بپارێزیٚ هیچ شتێك نیە ئەمڕۆ ببێتە لەمپەرو نەهێڵیٚ عەزابی خودا بگاتە ئەوانەی یاخی بوونو بڕیاری لەناچوونیان دراوە، مەوزوع مەوزوعی ئاو نیە بەئەسبابی ڕواڵەتی خۆی لیٚ ڕزگار بکەی! بەڵکوو مەوزوعی تۆڵەساندنی خودایە لەخراپەکارانی ئادەمیزاد؛ لەوانەی هاوەڵیان بۆ خودا داناوەو ستەمیان لەخۆیانو ئادەمیزادانی تریش کردوە، بەپێر

بانگەوازی پێغەمبەری خوداوە نەهاتوون، بەڵام ئەوانەی خوا رەحمی پێ کردونو ئیمانیان هێناوەو سواری کەشتی بوون ئەوانە رزگاریان دەبێ.

ئالەم سەروبەندەدا دیمەنی تۆفانەکە دەگۆڕێو ئاو زیاد دەکاو شەپۆلەکان بەهێز تر دەبن کار لەکار دەترازێو لەنکاوێك ﴿وَحَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ﴾ شەپۆلێك هاتو کوڕی یاخی بووی لوول داو گفتو گۆی باوکو کوڕی لێکدابڕیو لێکی جیاکردنەوە! ئەو کوڕە یاخی بووە سەرکەشە لەپێڕی خنکاوان بوو.

بەراستی دیمەنێکی سامناکە منداڵ پیر دەکا، ئاو لەئاسمان بەلێزمە دێتە خوارێ، زەوی هەمووی تەنانەت تەندووری ئاگریش ئاوی لێ هەڵدەقوڵێو دەریایەکی پانو پۆڕی پڕ شەپۆلی یەك لەدوا یەکی پێك هێناوە، دارو بەردو کێوو دۆڵو دەشتاییو بەرزایی داپۆشیوە، ئاسمان بەخۆیو ئەستێرەو مانگو خۆریەوە داپۆشراوە، کەشتی لەسەر ئاوە، وەکوو چۆن لەپێش دروستکردنی بوونەوەردا عەرشی پەروەردگار لەسەر ئاو بوو!

زریانو لێزمەو ڕەشەبا نەما، هێدیو هێمنایەتیەك بەسەر وڵاتدا هات؛ ﴿وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَاسَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْداً لِلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ بانگێك لەمەلەئی سەرووەوە هات، خیطابی ئاڕاستەی ئاسمانو زەوی کرد، گوترا زەمین ئاوت هەڵقوڕێنە، بەرزایی بەس ببارێنە، ئاو رۆچو بەناخی ئاخاو کار سەری گرت، کەشتی لەسەر کێوی جودی لەنگەری گرت، گوترا: تارن ئەوانەی ناحەقیکارن! دووری بۆ ئەوان لەژیان ئەوەتا ژیانی دونیایان لەکیس چوو، دووری بۆ ئەوان لەڕەحمەتی خودا ئەوەتا نەفرینیان لێ کراوە، دووری بۆ ئەوان لەرەحمەتی خودا ئەوەتا لەناوچوونو شیاوی ئەوە نین تەنانەت یادیشیان بکرێتەوە!

شایانی باسە ئەم چیرۆکە لەتەوراتدا لەسفری تەکویندا لەچوار فەصلدا هاتووە لەفەصلی چوارەمدا دەڵێ کەشتییەکە لەسەر کێوی ئارارات نیشتۆتەوە.

جا ئێستا کە تۆفان نیشتۆتەوە، ترسو سام نەماوە، کەشتی لەسەر کێوی جودی لەنگەری گرت، دووبارە سەر لەنوێ سۆزی باوکایەتی حەزرەتی نووح دەکەیێتەوە جۆشو خرۆش، ﴿وَنَادَى نُوحٌ رَبَّهُ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ابْنِي مِنْ أَهْلِي﴾ نووح بانگی ئاراستەی پەروەردگار کردو وتی: خودایە! بێگومان کوڕەکەم لەئەهلو کەسو کاری منە؛ کەوا دەت دامێ رزگاریان بکەی فەرمانت پێ کردم بیانخەمە ناو کەشتییەکەوە.

﴿وَإِنَّ وَعْدَكَ الْحَقُّ وَأَنْتَ أَحْكَمُ الْحَاكِمِينَ﴾ بێگومان وادەی تۆ بەجێیەو دێتە دی، دەی باشە ناکامی کوڕەکەم بەچی گەیی؟ وەلحال تۆ لەهەموو دادوەرێك کاروبارت موحکەم ترو لەجێی خۆیدایە، حوکمو بڕیاری تۆ لەئەوپەڕی زانستو داناییەوە دەردەچێ، ئەوپەڕی دادپەروەریو صەوابی تێدایە، هەرگیز هەڵەو ستەمو نابەجێیی تێدا نیەّ!

حەزرەتی نووح ئەم خیطابەی ئاراستەی پەروەردگار کرد، دەیەویست بزانێ خودا چۆن وادەی دەربارەی رزگار کردنی کەسو کارەکەی بەجێ دێنێ، دەیەویست بزانێ خودا حیکمەتی چۆنە لەوادە بەجێهێناندا، چی تەقدیر کردوە چی ئەنجام داوە، وەڵامێکی کورتو موختەصەری بۆ هات، کە لەوەپێش حەزرەتی نووح لێی بێ ئاگابوو، کەسو کار لای خوداو لەتەرازووی خودادا، لەنایینی خودادا خزمایەتیو خوێنو رەچەڵەك نیە، بەڵکوو خزمایەتی بیرو باوەڕە، ئەم کوڕەش کە بڕوای نەهێناوە نابێتە کوڕی حەقیقی تۆو بەکەسو کاری تۆ ناژمێردرێ.

وەڵامی بۆ هاتەوەوەڵامێکی بەهێزو جەخت لەسەر کراوو چەسپێنەرو بەشێوە توڕەییو هەڕەشە ئامێز، دەفەرموێ: ﴿قَالَ يَا نُوحُ إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ﴾ پەروەردگار فەرمووی: ئەی نووح! بێگومان ئەو کوڕە لەکەسو

کاری تۆ نیە، بێگومان ئەو کورەی تۆ خاوەنی کرداری بەدبوو، خۆی لەچاکەکاری دەپاراستو خەریکی فەسادو ئاشوبو کوفرو ستەمکاری بوو! ئەو لەتۆ دابڕابوو، تۆش لەئەو دابڕابووی، ئەگەر بەڕواڵەت لەپشتی تۆش بێ، پەیوەندی بەهێز کە ئایینە پچڕاوە، هیچ پەیوەندیبەتۆوە نەماوە!

جا چونکە نووح دوعاکەی وا ئاڕاستە کرد، وەکوو ئەوە بلێی وادەیەکی پێ دراوەو جێ بەجێ نەکراوە، بۆیە رەتدانەوەکە بۆنی سەرزەنشتو هەڕەشەی لێ دێ!

﴿فَلا تَسْأَلْنِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ﴾ پرسیارم لەشتێك لێ مەکە کە نازانی چۆنەو چۆن نیە، داوای شتێك مەکە: کە نازانی ئایا ڕاستو دروستە، یان هەڵەو ناقۆڵایە؟!.

﴿إِنِّي أَعِظُكَ أَنْ تَكُونَ مِنْ الْجَاهِلِينَ﴾ ئەمن جلەوگیریت لێ دەکەم، ئامۆژگاریت دەکەم لەوەی لەپێڕی نەزانان بی، ئامۆژگاریت دەکەم نەوەکوو نەزانی پەیوەندیو کەسایەتی راستی چیەو چی نیە، یان نەوەکووونەزانی پەیوەندی کەسایەتی راستی چیەو چی نیە، یان نەوەکوو لەوادەی خودا حاڵی نەبیونەزانی چۆن خودا وادەی خۆی بەجێ هێناوە، وادەی خودا هاتە دی کەسو کاری حەقیقی تۆ رزگاریان بوو! جارێکی تر پرسیاری ئاوا ناقۆلاو نابەجێ مەکەو دەتترسێنم کە لەنەزانو تاوانباران بی!

ئیتر حەزرەتی نووح لەرزەی پێ کەوتو ترسی لێ نیشت: کە دەربارەی پەروەردگاری خۆی هەڵەیەکی کردبێ، بۆیە خێرا هانا بۆ خودا دێنێو پەنا بەزاتی پاکی دەگرێو داوای لێ خۆشبونو رەحمەت دەکا دەفەرموێ: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْأَلَكَ مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ﴾ وتی: خودایە! من پەنا دەگرم بەزاتی پاکت: کە لەئێستا بەولاوە پرسیارێکت ئاڕاستە بکەم، نەزانم جێ بەجێ بوونەکەی لەگەڵ حیکمەتی تۆدا یەك دەگرێتەوە!

﴿وَإِلاَّ تَغْفِرْ لِي وَتَرْحَمْنِي أَكُنْ مِنْ الْخَاسِرِينَ﴾ پەروەردگارا! ئەگەر لەتاوانم خۆش نەبیو رەحمم پێ نەکەی ئەمن لەپێری خەسارەتمەندانم، هەوڵمدا قازانجم دەست بکەوێ، هەموو منداڵەکانم رزگاریان ببێو بکەونە خۆشیو کامەرانییەوە بەهۆی بەندایەتیو خودا پەرستییانەوە، کەچی بەو جۆرە بەسەرمدا شکایەوە، تۆ خۆت باشتر دەزانیو ئاگاداری هەموو شتێکی!

**تێبینی:**

هەندێ لەو پەندو ئامۆژگاریانەی لەم ئایەتانەوە وەردەگیرێ:

١- خۆبەزلزانیو سەررەقی ج سوودو بەرژەوەندییەکی تێدا نیە، ئەوەتا کوڕی نووح چونکە کافرو لەخۆباییو سەررەق بوو، نژادو کوڕایەتی بۆ پێغەمبەری خودا دادی نەدا. چووە پێری کافرانەوەو عەزابی طوفان تێکیەوە پێچا.

٢- حەزرەتی نووح کە داوای رزگار بوونی کوڕەکەی کرد، داواکردنەکەی لەوەوە سەری هەڵدا کە خودا وادەی پێدا بوو: کە خزەو کەسو کارەکانی رزگار بکا، بەبڕوای خۆشی کوڕەکەی ئیماندار بووە.

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: کوڕەکەی دووڕو بووە بەڕواڵەت موسوڵمانو لەدڵدا کافر بووە.

٣- داوا کردنی حەزرەتی نوح بۆ رزگار بوونی کوڕەکەی هەڵەیەکی ئیجتیهادی بووە بەمەبەستێکی پاك، بەڵام نەدەبوو ئەو ئیجتیهادی هەڵە بکا، نابێ پێغەمبەران هەڵەی ئاوا بکەن، چونکە وەکوو دەڵێن: (حسنات الابرار سیئا المقربین)ە.

٤- پەیوەندی ئایین لەپەیوەندی خوێنو رەچەڵەك بەهێزترە بۆیە خودا خاوەن باوەڕەکانی نەتەوەی نووحی رزگار کرد، بەڵام کوڕەکەیو خێزانەکەی چونکە کافر بوون لەناوی بردن!

٥- ئایەتەکە دڵدانەوەو تەسلییەیە بۆ ئەوانەی کوڕو کچیان باش‌و ڕەفتار جوان نابن.

٦- دادپەروەری خودا ڕەهاو موطلەقە، ماستاو کردنی تێدا نیە بۆ کەس، هەموو کەس، کوڕی کێ بێ‌و خزمی کێ بێ، بەگوێرەی کردەوەی خۆی پاداش‌و سزا وەردەگرێتەوە، کەسێك بەنەسەبو بنەماڵەو ڕەچەڵەك لەخۆی بایی ببێ‌و خەریکی خودا پەرستی‌و رازی کردنی خودا نەبێ ئەوە نەزان‌و نەفامە لەشەریعەتی خودا شارەزا نیە، هەر بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: ئەی کۆمەڵێ قورەیش! وا مەکەن خەڵکی بەکردەوەی باشەوە ڕۆژی قیامەت بێنە لاەو ئێوەش بەتەمای نەسەبو ڕەچەڵەك بێنە پێشەوە.

٧- تۆفانەکە گشتی‌و داگرندەی هەموو سەرزەوی بووە، رافەکەرانی قورئان‌و ئەهلی کیتاب پێیان وایە هەموو سەر زەوی گرتۆتەوە.

ئەوەی پێویستە بڕوامان پێی هەبێ ئەوەیە طوفانەکە گشتی بووە بۆ گەلی نووح: کە لەو ڕۆژگارەدا جگە لەئەوان کەسی تر نەبووە، تۆفانەکەش لەرۆژ هەلاتی ناوەڕاست بووە. بەڵام نازاندرێ ئاخۆ تۆفانەکە هەموو کورەی زەوی گرتۆتەوە یان نا.

## پەندو عیبرەت وەرگرتن لەچیرۆکی حەزرەتی نووح

﴿قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهْبِطْ بِسَلَٰمٍ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ ۚ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ

﴿٤٨ تِلْكَ مِنْ أَنبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ
وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا ۖ فَٱصْبِرْ ۖ إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ٤٩﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار هەواڵی لەنگەرگرتنی کەشتییەکەی ڕاگەیاندو رزگار بوونی موسوڵمانانو فەوتانی کافرانی باس کرد، پەروەردگار دوو شتی تر باس دەکا؛ کە وەکوو پەندو عیبرەتی چیرۆکەکە وەهان!

١- ڕێز گرتن لەنووح موسوڵمانانی شوێنکەوتووی، لەم ڕووەوە کەوادەی خوای بەجێ هێنا، کە بەسەلامەتی لەکەشتییەکە دابەزینو بەرەکەتی بەسەردا رشتنو لەشوێنێکی پیرۆز نیشتەجێی کردن، کە ئەویش خاکی کوردستانەو جێگای شانازی گەلی کوردە کە قورئانی پیرۆز وڵاتەکەی بەموبارەکو پیرۆز ناوبردوون.

هەروەها سەلامەتییان لەشتی مەکرووهو ناخۆش، چونکە ئەوان کە دابەزین لەوەزعی خۆیان دەترسان. بیریان لەوە دەکردەوە چۆن هەڵسو کەوت بکەن، چۆن پێداویستی ژیانی خۆیان دابین بکەن، بەتایبەتی دوای ئەوەی تۆفانەکە هەموو سەر زەوی ئاوەدانی ئەو ڕۆژگارەی گرتبووەوە، لێیان نومایان بوو کە لەسەر زەوی شتێکی ئەوتۆ نەماوە کەڵکی لێ وەربگیرێ. جا کە پەروەردگار وادەی بەنووحو هاوەڵانی دا بەسەلامەتی رزگاربوون لەهەموو ناخۆشییەك. وادەی بەرەکەتو هەرزانیو مانەوەو جێگیر بوونو بەمرازگەیشتنیشی پێ ڕاگەیاندن.

٢- دووەم شت کە لەچیرۆکەکە وەردەگیرێ؛ هەواڵدانە لەچەند کارێکی پەنامەکیو نادیار لەئادەمیزادان، کە وەکوو ئینذارو پەند وەرگرتن وایە، چەند نموونەیەکیش دەخاتە بەرچاو کە ئاکامی صەبرو خۆڕاگریی بەیان دەکا. ئەمجار پاش وەستانی ئاسمان لەباران بارانـدنو هەڵقوڕاندنی زەوی بۆ ئاوی خۆیو گیرسانەوەی تۆفان، دەفەرموێ: ﴿قِيلَ يَا نُوحُ اهْبِطْ بِسَلَامٍ مِّنَّا وَبَرَكَاتٍ عَلَيْكَ وَعَلَى

أُمَمٍ مِمَّنْ مَعَكَ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ واتە: بەزوبانی نیگاو سروش بەنووح گوترا: لەکەشتی رزگاریی دابەزە بۆ سەر زەوی، بەسەلامەتیو بێ وەیی، بەدڵنیاییو دڵخۆشی، دابەزە سەلامی خودات لەسەرو لەئەمانی خودادا دەبی. یان لەکێوی جودییەوە دابەزە بۆ پێدەشتو دەشتاییەکانی دەورو بەری، ئەوە زەوی ئاوی خۆی هەڵقوڕاندوەو ئاسمان لەباران باراندن وەستاوەتەوە، دونیا وشکو برینگە، دابەزەو نیشتەجێ ببە سەلاوی ئێمەت لەسەر بێ، لەژێر چاودێری رێزلێنانی ئێمەدا بی وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿سَلَامٌ عَلَى نُوحٍ فِي الْعَالَمِينَ﴾الصافات/٧٩.

دابەزە خێرو بەرەکەتی ئێمەت بەسەردا برژێ، رزقو رۆزی دەرژێ بەسەر خۆتو ئەوانەی لەگەڵت دانو هەروا نەوەو وەچەی داهاتوویان، هەروەها ئەو گەلو نەتەوانەی لەدوا ئێوەوە دێنە کۆڕی ژیانەوە، هەندێکیان بڕوایان بەخودا دەبێو گەردنکەچی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی ئێمە دەبن، هەندێکیان گەلو نەتەوەیەك دەبن، هەر هەوڵی بەدەستهێنانی لەززەتی ژیانی دونیایان دەبێو پێداویستییەکانی بەدەست دێننو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی خودا نابن. ئەوانەیان لەرۆژی قیامەتدا سزایەکی بەئێشیان تووش دێ.

کە دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ﴾ هەموو موسوڵمانانی سەر زەوی دەگرێتەوە هەر لەو رۆژەوە تا رۆژی قیامەت..

کە دەفەرموێ: ﴿وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ﴾ هەموو کافرانی سەر زەوی دەگرێتەوە هەر لەو رۆژەوە تا رۆژی قیامەت.

بەکورتی سەلامی ئێمەو رزقو رۆزیو خێرو بەرەکەتی ئێمە لەسەر تۆ بێ ئەی نووح! هەروەها لەسەر ئەو موسوڵمانانەش بێ کە لەگەڵ تۆ پەروەردە بوونو دەبن، جا لەوانەی لەگەڵ تۆدان گەلو نەتەوەیەك دێنە کۆڕی ژیانەوە، بێدینو

خوانـەناس دەبـن لـەززەتـو خۆشـی دونیـا بەدەسـت دەهێـنـنو پاشـان لەقیامـەتـدا دەخزێندرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

کەوابوو لەدووا حەزرەتی نـووح ئـادەمیزاد دەبنـە دوو تـاقمو کۆمـەڵ: تـاقمو کۆمەڵێکیان موسوڵمانو خوداپەرستو کامەڕانی دونیاو قیامەتیان دەست دەکەوێ، تاقمو کۆمەڵێکیشیان لەدونیادا لەلەززەتو خۆشیدا دەژینو لەقیامـەتدا دەخرێنـە ناو عەزابی بەئێشەوە.

ئـەمجار پـەروەردگار پەنـدو عیبرەتـی گـشتی لەچـیرۆکەکە بـەیان دەکـاو دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ﴾ ئەو هەواڵو سەرگورشـتانەی بۆمـان گێڕایەتەوە لەباسو چیرۆکی نووحو گەلەکەی هەموویان هەواڵی نهێنیو پەنامـەکین بـۆت دەگێڕینـەوە لەسـەر شـێوەی خـۆی، هـەر دەڵێـی بەچـاو دەی بینـیو لێـت ئاشکرایە. سروشو نیگایە لەئێمەوە بۆ تۆ، فێرت دەکەین..

﴿مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا﴾ پێش ناردنی نیگـاو سـروش بـۆ تۆ، نەخۆت دەتزانیو نەنەتەوەکەشت، کەسیان زانیارییەکیان لـەم بـارەوە نـەبوو، دەی چـۆن ئەوانـەی بـەدرۆت دەخەنـەوە دەڵـێن: تـۆ لەخـەڵکی تـرەوە فێـری ئـەم چیرۆکو سەرگورشـتانە بـووی؟ بـیرو بۆچـوونەکەیان هەڵەیـە، ئـەتۆ خـودا فێـری کردووی!

جا کەوابێ ئەی پێغەمبەر! ﴿فَاصْبِرْ﴾ تۆ خۆڕاگرە، بـەئارام بـە، صـەبر بگـرە لەسەر بەدرۆخـستنەوەی کافرەکـان بـۆ پەیامەکـەت، خـۆگرو پـشوو درێـژبـە لەسـەر ئەزیەتدانی ئەوان بۆ تۆ، بەردەوامبە لەسـەر گەیانـدنی پەیامەکـەتو باکـت لـەهیچ شتێك نەبێ، هەروەکوو چۆن نووح بەصەبرو پشوو درێـژبوو لەبەرامبـەر ئەزیـەتی کافرەکانی سەردەمی خۆی، ماوەی (٩٥٠) ساڵی رەبەق بانگـەوازی نەتەوەکـەی کـردو لەهەوڵدانو تێکۆشان مانـدو نـەبوو، تـۆش بەصـەبرو خۆگربـە چونکە ﴿إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ﴾ بێگومـان سـەرەنجامو سـەرکەوتنو بەمرازگەیـشتن بـۆ تەقواکارانـە، بـۆ

ئەوانەیە بەندایەتی پەروەردگار دەکەنو خۆیان لەتاوان دەپارێزن. ئێمە لەوە بەولاوە کۆمەگیت پێ دەکەینو چاودێرتینو سەرەنجام سەرکەوتنو بەمرازگەییشتن بۆ تۆو شوێنکەوتوانی پەیامەکەتە، لەدونیاو قیامەتدا، وەکوو چۆن لەوەپێش هەمان هەڵسوکەوتمان لەگەڵ پێغەمبەرانی تر کردوە. بەسەر دوژمنانیاندا زاڵمان کردن! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا﴾غافر/٥١. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ، إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنصُورُونَ﴾الصافات/١٧١-١٧٢.

**تێبینیەك دەربارەی چیرۆکی نووح:**

لەقورئانی پیرۆزدا دەقێکی یەکالاکەرەوە نیە ئەوە بگەیەنێ: کە تۆفانەکە هەموو دونیای گرتبێتەوە، یان ئەوە بگەیەنێ: کە پێغەمبەرایەتی نووح گشتی بووبێ، ئەو حەدیثانەی کە لەم بارەوە هاتوون، ئەگەر لەفەرزێکدا سەنەدەکانیشیان راست بن، حەدیثی ئاحادن جێگای متمانە نین، ئەوەی پێویستیشە بۆ چەسپاندنی ئەم راستیانە دڵنیا بوونە نەك گومان بردن!!

بەڵام مێژوو نووسانو زانستخوازان دەتوانن بەهۆی گومانو بۆچوونەوە بتمانە پەیدا بکەنو زانیاری پەیدابوو بۆیان بکەنە حەقیقەتی مێژوویی، هەرچەندە ناتواندرێ بکرێتە بەڵگەیەکی قەطعی لەسەر بیروباوەڕێکی ئایینی!

بۆیە بابەتی چۆنیەتی تۆفانەکە بووەتە جێگای سەرنجو کێشە لەنێوان خاوەن ئایینەکانو خاوەنی تیۆرە زانستییەکانی تایبەت بەتوێژەکانی زەویو کیشوەرناسەکانەوە، هەروا بوەتە جێگای خیلافو راجیایی نێوان مێژوو نووسانی کۆنو نوێ!

خاوەن نامەکانو زانایانی عالەمی ئیسلامی پێیان وایە: کە تۆفانەکە گشتی بووەو هەموو سەرزەوی گرتۆتەوە، زوربەی زۆری خاوەنانی تیورە زانستەکانیش

هەمان رایان هەیە. بەڵگەشیان لەسەر ئەوە دۆزینەوەی هەندێ صەدەفو لاشەماسی بەبەردبوو لەبڵندایی کێوەکان، کە بەرواڵەت ئەم جۆرە شتانە لەدەریادا نەبێ پەیدا نابن، دەرکەوتنو دۆزینەوەی ئەم جۆرە شتانە لەسەر لوتکەی کەژەکان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی: کە رۆژگارێك بووە ئاو ئەو لوتکانەی داپۆشیوە. ئەمەش ئەوەمان لەلا دەچەسپێنێ کە تۆفانەکە هەموو سەر زەوی گرتبێتەوە!

زۆربەی زۆری خاوەن تیۆرەکانی ئەم سەردەمانە پێیان وایە تۆفانەکە گشتی نەبوەو هەموو جیهانی نەگرتۆتەوە. لەم بارەوە بەڵگەی زۆرو جۆراو جۆریان هێنانەوەتەوە. (تەفسیری مەنارو المفصل في تاريخ العرب قبل الإسلامو کتێبەکانی د. سوسە) زۆریان لەم بارەوە نووسیوە.

بەڵام رەوانیە بۆ موسوڵمان هەر بەوەندە کە دەتوانرێ ئایەتەکانی قورئان لەم بارەوە تەئویل بکرێن، ئینکاری ئەوە بکا؛ کە تۆفانەکە گشتی بووبێ، بەڵکوو پێویستە هەر کەسێك بڕوای بەئایینی ئیسلام هەیە هەر شتێکی ظاهیری ئایەتی قورئانو فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەیاندیان بڕوایان پێ بکاو واز لەتەئویلو مانالێدانەوەی بەپێچو پەنابێنێ! مەگەر بەڵگەیەکی عەقڵی بەهێز هەبێ پێ لەسەر ئەوە داگرێ کە مانای ظاهیری دەقەکە مەبەست نیە.

بەکورتی ظاهیری ئایەتەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوە دەگەیەنن: کە تۆفانەکە گشتیو سەرتاسەری بووە بۆ نەتەوەی نووح: کە ئەو کاتە لەسەر روی زەوی جگە لەو گەلو نەتەوە کەسی تر نەبوە، بڕوا بەئەم راستییە واجبەو پێویستە بڕوامان پێی هەبێ. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ: کە تۆفانەکە هەموو کیشوەرەکانی زەوی گرتبێتەوە، چونکە بەڵگەیەك نیە لەسەر ئەوە: کە گەلی نووح هەموو سەر زەوییان پڕ کردبێتەوە.

هەروەها هەبوونی صەدەفو لاشەماسیو حەیواناتی دەریایی تر لەسەر لوتکەی کەژەکان ئەوە ناگەیەنێ: کە لەئاکامی ئەو تۆفانەوە بێ، چونکە گەییشتنی

ئاو بۆ سەر لوتکەی کێوەکان بۆ ماوەی چەند رۆژێك نابێتە هۆکاری پەیدابوونی ئەو دیاردانەی باسمان کردن!

## چیرۆکی حەزرەتی هود ﷺ

﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا
لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓۖ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ ﴿٥٠﴾ يَٰقَوْمِ
لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًاۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِى فَطَرَنِىٓۚ أَفَلَا
تَعْقِلُونَ ﴿٥١﴾ وَيَٰقَوْمِ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِ يُرْسِلِ
ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ وَلَا
تَتَوَلَّوْاْ مُجْرِمِينَ ﴿٥٢﴾ قَالُواْ يَٰهُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا
نَحْنُ بِتَارِكِىٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ
﴿٥٣﴾ إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعْتَرَىٰكَ بَعْضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٍۗ قَالَ إِنِّىٓ أُشْهِدُ
ٱللَّهَ وَٱشْهَدُوٓاْ أَنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦۖ فَكِيدُونِى
جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّى تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّى وَرَبِّكُمۚ مَّا

مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ
﴿٥٦﴾ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُم مَّآ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦٓ إِلَيۡكُمۡۚ وَيَسۡتَخۡلِفُ
رَبِّي قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ وَلَا تَضُرُّونَهُۥ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَفِيظٞ
﴿٥٧﴾ وَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا هُودٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ
مِّنَّا وَنَجَّيۡنَٰهُم مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٖ ﴿٥٨﴾ وَتِلۡكَ عَادٞۖ جَحَدُواْ بِـَٔايَٰتِ
رَبِّهِمۡ وَعَصَوۡاْ رُسُلَهُۥ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٖ ﴿٥٩﴾ وَأُتۡبِعُواْ
فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَآ إِنَّ عَادٗا كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ أَلَا
بُعۡدٗا لِّعَادٖ قَوۡمِ هُودٖ ﴿٦٠﴾

ئەمە چیرۆكو سەرگورشتەی پێغەمبەرێكی ترە لەو چیرۆكانەی پەروەردگار لەم سورەتەدا گێڕاونیەوە، بێگومان ئەم چیرۆكە بەشێوەو شێوازێكی تر لەسوورەتی (الأعراف)دا هێندراوە.

لەگێڕانەوەی ئەم چیرۆكە لێرەدا موشابەهەو لێكچونێك هەیە بەچیرۆكی حەزرەتی نووحەوە، ئەم چیرۆكەش بەهەمان شێوە ئەوەی تێدایە: كە هود بانگەوازیو دەعوەتنامەی خۆی بەنەتەوەكەی راگەیاندوەو ئەوانیش رەتیان كردۆتەوە، هەروەها كۆتایی ئەم چیرۆكەش بەرزگاربوونی موسوڵمانەكانو لەناوچونی كافرەكان دێ.

دەفەرموێ: ﴿وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُوداً﴾ ناردمان بۆ لای گەلی عادی یەکەم، برای خۆیان (هود) ﷺ لەڕەچەڵەکو هۆزایەتی دا نەك برای ئایینیان بێ چونکە هود یەکێك بوو لەهۆزی عاد، کەسێکیش لەهۆزێك بوو پێی دەگوترێ: برای فلان ئەوەتا: بەکابرا دەگوترێ (یاأخا العرب) مەبەستیش یەکێکە لەعەرەب. ئەم هۆزی عادە هۆزێکی عەرەب بوون لەلای یەمەنەوە لەشیمالی حەضرەمەوت لەناوچەیەك پێی دەگوترێ (الأحقاف) نیشتەجێ بوبوون، خاوەنی هێزو توانایەکی زۆرو کشتو کاڵی هەمەجۆرو مەڕو ماڵاتدار بوون!

سەرەتا: حەزرەتی هود بانگەوازی کردن بۆ یەکتاپەرستیو نەهی لێ کردن لەبتپەرستی ﴿قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَـهٍ غَيْـرُهُ﴾ وتی: ئەی نەتەوەکەم! تەنها خودا بپەرستنو کەسی تر بەخودا مەزانن، جگە لەخودا بتو صەنەم مەپەرستن، کەس مەکەن بەهاوەڵو هاوشانی پەروەردگار، ئێوە جگە لە ئەو خودای ترتان نیە. ﴿إِنْ أَنْـتُمْ إِلاَّ مُفْتَـرُونَ﴾ ئێوە کە پەرستش بۆ بتو صەنەم دەکەنو بەخودایان دەزانن، لەخۆتانەوە شت هەڵدەبەستنو درۆ بەدەم خودای تاکو تەنیاوە هەڵدەبەستن لەخۆتانەوەو بەبێ بەڵگە ئەو خودا درۆزنانەتان کردوون بەهاوەڵو تکاکار لای خودا؛ ئەو خودایەی ئێوەی بەدیهێناوەو بژێوی پێ داون، نیعمەتی زۆرو زەبەندەی بەسەردا رشتوون...

﴿يَا قَوْمِ لا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْراً﴾ ئەی نەتەوەکەم! ئەمن لەپاساوی بانگەوازی کردنم بۆتان داوای کرێو پاداشتان لێ ناکەم، لەبارتەقای ئامۆژگاریو نەسیحەتەکانمدا پارەو ماڵم مەبەست نیە، ﴿إِنْ أَجْـرِيَ إِلاَّ عَلَـى الَّـذِي فَطَرَنِـي أَفَـلا تَعْقِلُـونَ ؟﴾ کرێو پاداشی من لەسەر پەروەردگار؛ لەسەر ئەو خودایەیە: کە دروستی کردوم لەسەر فیطرەتی ساغو راست، فیطرەتی خوداپەرستیو یەکتاپەرستی! ئەوە بۆ تێناگەن، بۆ حاڵی نابن لەقسەی کەسێك: کە دڵسۆزتانە بانگتان دەکا بۆ رێبازێك بەرژەوەندی ئێوەی تێدایە لەدونیاو لەقیامەت، بەبێ

ئـەوەی داوای کـرێو پاداشـتان لا بکـا! ئـەوە بـۆ ڕێـزی ئـەوەی پێتـان دەگـوترێ لەنەسـیحەتو ئامۆژگـاری نـاگرن؟ ئـەوە بـۆ نـازانن کـە مـن دڵسۆزتانمو، کـە جڵەوگیریتان لێ دەکەم لەبتپەرستی، راستیم پێکاوە!!

﴿وَيَا قَوْمِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُـوا إِلَيْـهِ يُرْسِـلِ الـسَّمَاءَ عَلَـيْكُمْ مِـدْرَاراً﴾ ئـەی گەلەکـەم! ئێـوە داوای لێخۆشـبوون بکـەن لەسـەر بتپەرسـتیو کـوفرو بێـدینی رابووردوتان، تۆبەیـەکی راسـتالانە بکـەن، جـا ئەگـەر داوای لێخۆشـبوونتان لـەخودا کردو تۆبەیەکی ڕێکو پێکتان کردو کەوتنە سەر ڕێبازی خوداپەرستی، ئـەوە خـودا بارانی زۆرتان بۆ دەبارێنێ، زەویو زارتان تێر ئـاو دەبـێو کشـتو کاڵتـان بەرەکـەت ئامێز دەبێ، دیارە ئەو کاتە ئەوان زۆریـان پێویـستی بـەباران بـووە، چونکە وەکوو ئامازەمان بۆ کرد ئەوان خاوەنی ئاژەڵو کشتو کاڵێکی زۆر بوونو ساڵەکەیان وشکە سـاڵ بـووە، ﴿وَيَـزِدْكُمْ قُـوَّةً إِلَـى قُـوَّتِكُمْ﴾ ئەگـەر داوای لێخۆشـبوون بکـەنو لەتاوانەکانتان پەشیمان ببنەوە، سەرباری هێزو توانای ئێستاتان هێـزو توانـای تـرو ماڵو سامانی کەشتان دەداتێ! زیاتر بالادەستو سەرکەوتووتان دەکا.

بێگومان گەلی عاد بەهێزو تواناو شـانو شـەوکەوت بـوون، شـانازییان بـەهێزو توانـای خۆیـان دەکـرد، هەمیـشە هـەوڵی ئـەومیان بـوو بـالا دەسـتو زاڵ بـن بەسـەر خەڵکدا. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِي الْخَلْقِ بَسْطَةً فَاذْكُرُواْ آلاء اللّـهِ لَعَلَّكُـمْ تُفْلِحُـونَ﴾الأعـراف/٦٩. یـان دەفـەرموێ: ﴿أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ آيَـةً تَعْبَثُـونَ، وَتَتَّخِـذُونَ مَـصَانِعَ لَعَلَّكُـمْ تَخْلُـدُونَ، وَإِذَا بَطَشْتُمْ بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ، فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ، وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَـدَّكُمْ بِمَـا تَعْلَمُـونَ، أَمَـدَّكُمْ بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ﴾الشعراء/١٢٨-١٣٣. یان دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِـي الْـأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً﴾فـصلت/١٥. ئـەم ئایەتانـەو ئایـەتی تـریش ئـەوە دەگەیەنن: کە گەلی عاد بەدەسـتو بـازوو شـانو شـەوکەتو شـان پـانو تێـك سمـڕاو بوون.

﴿وَلاَ تَتَوَلَّوْا مُجْرِمِينَ﴾ ئێوە ئەی گەلەکەم! پشتم لێ هەڵمەکەن، بانگەوازییەکەم رەت مەکەنەوە، سوور مەبن لەسەر تاوانو جەریمە..

هەڵبەتە پەشیمان بوونەوە لەتاوانو داوای لێخۆشبوون لەگوناه سودێکی زۆری هەیە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەزۆر فەرموودەدا موسوڵمانانی هەڵناوە: کە پابەندی داوای لێخۆشبوون بن.

ئەبو داوودو ئیبنو ماجە لەئیبنو عەبباسەوە فەرموودەیەك ڕیوایەت دەکەن: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (من لزم الاستغفار، جعل الله له من كل هم فرجا، ومن كل ضيق مخرجا، ورزقه من حيث لا يحتسب) کەسێك بەردەوام بێ لەسەر داوای لێخۆشبوونو بەدڵ لەخودا بپارێتەوە بۆ لێبوردن، خودای پەروەردگار بۆ هەموو تەنگو چەڵەمەیەك دەروویەکی لێ دەکاتەوە، لەهەموو ناخۆشییەك دەرگای رزگار بوونی بۆ ئاوەڵا دەکا، لەلاوە رزقو رۆزی دەدا، بەجۆرێك کە خۆیشی نازانێ چۆنو لەکوێوە بۆی دێ.

جا کە حەزرەتی هود ئەو نەسیحەتو ئامۆژگاریانەی ئاراستە کردن ﴿قَالُوا يَا هُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ﴾ وتیان: ئەی هود! تۆ لەسەر داواو پەیامەکەت بەڵگەو نیشانەیەکی وات نیشان نەداین: کە پێت بڕوا بکەینو دڵنیا بین تۆ پێغەمبەریو لەخوداوە رەوانە کراوی! ﴿وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِي آلِهَتِنَا عَنْ قَوْلِكَ﴾ ئێمە واز لەخوداکانی خۆمان ناهێنین بەقسەی ڕوتی تۆ، بەتەما ئەوە مەبە ئێمە بەقسەکانی تۆ هەڵبخەڵەتێین، واز لەرەخنە گرتن لەخوداکانی ئێمە بێنە ﴿وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ﴾ ئێمە بڕوات پێ ناکەین. ﴿إِنْ نَقُولُ إِلاَّ اعْتَرَاكَ بَعْضُ آلِهَتِنَا بِسُوءٍ﴾ ئێمە لەبەرامبەر هەڵوێستی تۆدا هیچکە شك نابەین جگە لەوەی کە بڵێین هەندێ لەخوداکانمان دەستیان لێ وەشاندویو شێتیان کردووی، چونکە رەخنەت لێ گرتن، داوات لەئێمە کرد واز لەعیبادەت بۆ کردنیان بێنین، ئیتر ئاوایان لا کردووی ئەم قسە پڕوپووچانە دەکەی! شێتو وێت بووی نازانی دەڵێی چیو چی دەکەی!!

وەڵامی ئەو نەفانە چوار شتی تێدایە هەموویان ئەحمەقی و خۆبەزلزانییە:

أ- یەکەم داوای بەڵگەو نیشانەیان لێ کرد.

ب- دووەم سوور بوونی خۆیان راگەیاند لەسەر بتپەرستی.

ج- سێیەم بڕوانەکردن بەپەیامی هود.

د- چوارەم ئیدعای ئەوەیان کرد کە هود عەقڵو هۆشی تێك چووە، خوداکانیان دەستیان لێ وەشاندووەو شێت بووە.

حەزرەتی هود وەڵامی دانەوە ﴿قَالَ إِنِّي أُشْهِدُ اللَّهَ وَاشْهَدُوا أَنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُونَ﴾ وتی: من خودا دەکەم بەشایەت بەسەر خۆمەوە لەبابەت ئەوەی دەیڵێم: ئێوەش دەکەم بەشایەدو بزانن: کە من بەریەو دوورم لەنەخۆشی هاوەڵدانان بۆ خودا، من دوورە پەرێزم لەبتپەرستیو هەرگیز رێبازی ئاوام نەگرتووە پەیڕەوی ناکەم! ئێوە نەخۆشن من لەو نەخۆشییەی ئێوە دوورە پەرێزم! ئەمەش مانای وا نیە کە حەزرەتی هود ئەوانی بەشیاوی ئەوە زانیبێ بەکاری شایەتیدان هاتبن، نەخەیر بەشیاوی شایەتیدانی نەزانیون، بەڵام بۆ گاڵتە پێکردن بەوانو دڵنیا بوون لەراستی پەیامی خۆی ئەوانی کرد بەشایەد بۆ ئەوە بزانن: کە ئەوە بیرو باوەڕو هەڵوێستیەتیو ئەوان بەهیچ نازانێ.

بەڵێ من دوورم لەپەرستش بۆ ئەو خودا درۆزنانەی ئێوە بەخودایان دەزانن، ﴿مِنْ دُونِهِ﴾ جگە لەخوداو پێتان وایە ئەو بتو صەنەمانە هاوەڵی پەروەردگارن.

دڵنیا بن: کە من هیچ موبالات بەئێوەو خوداکانتان ناکەم، چ گرنگی یەك بەخوداکانتان نادەم: کە دەڵێن: گوایە دەستیان لێ وەشاندوم. دەبێ منەت بن ﴿فَكِيدُونِي جَمِيعاً ثُمَّ لا تُنْظِرُونِ﴾ هەمووتان خەریکی پیلانو نەخشەکێشان بن لەدژی من، ئێوەو خوداکانتان هاوکاری یەکتری بکەن، دژم بوەستنو هەوڵی زیان پێگەیاندنم بدەن، چاو لێکنانێك مۆڵەتم مەدەن، خوداکانتان: کە پێتان وایە:

دەستیان لێ وەشاندوەو عەقڵیان تێك داوم با ئەوانیش یارمەتیتان بدەنو دەسەوەسان رانەوەستن!

﴿إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمْ﴾ من پشتم بەخودای خۆم قایمەو تەوەككولم لەسەر پەروەردگارە، ئەو خاوەنی ئیشو كاری منو ئێوەشە، ئاگاداری هەڵوێستی منو هەڵوێستی ئێوەشە، ئەوم بەسە، پیلانی ئێوە دەپوچێنێتەوەو هیچ شتێك نیە بتوانێ نەهێڵێ خودا یارمەتیم بدا، خودا توانای بەسەر هەموو شتێكدا هەیە. ﴿مَا مِنْ دَابَّةٍ إِلاَّ هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا﴾ هیچ گیانلەبەرێك نیە لەسەر زەوی‌و شوێنی تریش ئیللا جڵەوی هەڵسوڕانو كاروباری بەدەست خودایەو ئەو خاوەنیەتی، چۆنی بوێ ئاوا رەدامیان دێنێ. هیچ شتێك نیە ئەو كۆڵەوار بكا لەپارێزگاری كردنی بۆ منو بەهیلاك بردنی ئێوە! ﴿إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ بێگومان كردەوەكانی خودای من بەگوێرەی حەقو دادپەروەری ئەنجام دەدرێن، ستەمو ستەمكاری تێدا نیە، دابو نەرێتی خودا وا هاتووە موسوڵمانانی راستاڵ یارمەتی دەداو كافرانی ئاشوبگێڕ لەناو دەبا.

بێگومان وەڵامدانەوەكەی حەزرەتی هود وەڵامێكی دەمكوتكەرو جەرگبڕو بوێرانە بوو، لەخۆڕادیوی پێوە دیارە، تەحەدای كردن، بەئاشكرا بەرائەتی خۆی لەهاوەڵدانانو بتپەرستی راگەیاند، خودای كرد بەشایەت لەسەر ئەوەو خۆشیانی كرد بەشایەت، داواشی لێ كردن چییان لەدەس دێ تەقصیری نەكەن، ئەوەی راگەیاند: كە هیچ موبالاتیان پێ ناكاو بەهیچیان دەزانێ، نە لەخۆیان دەترسێ نەمنەتی خودا درۆزنەكانیان دەزانێ!!

بێگومان ئەم هەڵوێستەی حەزرەتی هود دەق دەشوبهێتە هەڵوێستی حەزرەتی نوح كە لەوەپێش باسمان كردو قورئان ئاماژەی بۆ دەكا وەكوو دەفەرموێ: ﴿قُلِ ادْعُواْ شُرَكَاءكُمْ ثُمَّ كِيدُونِ فَلاَ تُنظِرُونِ﴾ الأعراف/١٩٥.

جا ﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ مَا أُرْسِلْتُ بِهِ إِلَيْكُمْ﴾ ئەی نەتەوەکەم! ئەگەر رو لەپەیامەکەم وەربگێرِنو گوێ بۆ ئامۆژگاریو نەسیحەتەکانم نەگرن، پشت هەڵبکەن لەو نیگاو سروشەی پێتان رادەگەیەنم، هەڵوێستتان نەگۆڕنو هەر بەدرۆم بخەنەوە، ئەوە من خەتا بارنابم، چونکە ئەو پەیامو سروشەی پێی نێردراوم گەیاندومەو پێم راگەیاندوون، کەمتەرخەمیم نەکردوە لەبەجێهێنانی ئەرکی سەرشانم، ئێوەش بۆخۆتان دانی پێدا دەنێن: کە من بانگەوازیم کردوونو داوام لێ کردوون تەنها خودا بپەرستنو هاوەڵی بۆ دامەنێن. ئەوا من پەیامی خۆم گەیاندو بوو بەبەڵگە لەسەر ئێوەو بیانووتان نەما، موستەحەقی سزاو عەزاب بوون. ﴿وَيَسْتَخْلِفُ رَبِّي قَوْماً غَيْرَكُمْ﴾ خودا بەهیلاکتان دەباو گەلو نەتەوەیەکی تر دێنێتە گۆڕێو دەبنە جێنشینی ئێوەو ماڵو نیشتمانتان بەمیراتی دەکەوێتە دەست ئەوان.

﴿وَلا تَضُرُّونَهُ شَيْئاً﴾ ئێوە بەپشت هەڵکردنتان لەپەیامی خودا، بەسوور بوونتان لەسەر کوفرو بتپەرستی هیچ زیانێك بەخودا ناگەیەنن، بەڵکوو زیانی ئەوە لەسەر خۆتانەو بۆخۆتان تووشی دەردی سەریو کێشمەکێشم دەبن. ﴿إِنَّ رَبِّي عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ﴾ بێگومان خودای من بەسەر هەموو شتێکدا ئاگادارو چاودێرە، هیچ شتێ لەکردەوەی ئێوەی لێ هون نابێو غافڵ نیە لەتۆڵە لێ ستاندنتان! ئەگەر ماوەیەکیش مۆڵەتتان بدا دڵنیابن پاشگوێتان ناخا.

ئەمجار پەروەردگار باسی عەزابی نێردراو بۆ سەر گەلی عاد دەکاو سەرەنجامی هودو گەلەکەی دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُوداً وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِنَّا وَنَجَّيْنَاهُمْ مِنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ کاتێك فەرمانی ئێمە هات بۆ بەهیلاك بردنی گەلی هود، خۆیو ئەوانەی لەگەڵیا ئیمانیان هێنابوو، رزگارمان کردن لەروانگەی رەحمەتی خۆمانەوە، رزگارمان کردن لەعەزابێکی سەختی

ریشەکێش کەر، گەلەکەیشمان لەناو بردن، هەرچی ئیمانی نەهێنابوو کەوتنە بەر شالاّوی عەزابی سامناکو ئاسەوارمان بڕینەوە.

﴿وَتِلْكَ عَادٌ جَحَدُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَعَصَوْا رُسُلَهُ وَاتَّبَعُوا أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ﴾ هۆی ئەو سزا سامناکەی هاتە سەریانو لەناوی بردن، ئەوە بوو: گەلی عاد نیشانەکانی خودایان ڕەتکردنەوەو ئینکاریان کردن، لەپێغەمبەرەکان یاخی بوون (پێغەمبەرەکانی بەکۆ هێنانو مەبەستیش یەك پێغەمبەرە کە هودە، بەلاّم چونکە کەسێك بڕوای بەپێغەمبەرێك نەبوو وەکوو ئەوە وایە بڕوای بەهیچیان نەبێ، بۆیە فەرمووی (رسله) نەیفەرموو: (رسوله).

ئەوان هاوچەرخی حەزرەتی هود بوونوپەیامی ئەویان ڕەتکردەوە، بەلاّم کافر بوونەکەیان بەپەیامی ئەو، وەکوو کافر بوون وایە بەپەیامی هەموو پێغەمبەران! ئەوان پەیامی حەزرەتی هودیان بەدرۆخستەوەو شوێن فەرمانی ملهوڕەکانیان کەوتن، شوێن ئەو سەر ڕەقە یاخی بووانەیان کەوتن کە پابەندی حەق نەبوونو ملیان نەدا بۆ ڕاستی!

﴿وَأُتْبِعُوا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ لەم دونیادا نەفرینی خودایان دوکەوتوو هەروا نەفرینی ئادەمیزادانیان بەرکەوت، هەر کەسێ بەحاڵو وەزعیان بزانێو مێژوو بەسەرهاتیان ئاگادار بێ، نەفرینیان لێ دەکا، هەر پێغەمبەرێك هاتبێ، هەواڵی ئەوانی گێڕابێتەوە نەفرینی لێ کردون، هەروەها ڕۆژی قیامەتیش ئەو کاتەی شایەتەکان شایەتی لەخەڵك دەدەن نەفرین لەستەمکاران دەکەن، نەفرینی خۆیان ئاڕاستەی گەلی هودیش دەکەن!

لەپێش چاوی مەخلووقاتی دەشتی مەحشەر بانگدەرێك بانگ هەڵدەداو دەڵێ: ﴿أَلا إِنَّ عَاداً كَفَرُوا رَبَّهُمْ أَلا بُعْداً لِعَادٍ قَوْمِ هُودٍ﴾ ئاگادار ببنەوەو بزانن: کە گەلی عاد بەنیعمەتەکانی خودا کافر بوون، ئینکاری ئایەتەکانی خودایان کرد، پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستنەوە، ئاگادار ببنەوە دوور کەوتنەوە لەڕەحمەتی خودا

بۆ گه‌لی عاد: كه قه‌ومی هود بوون! له‌عنه‌تی خودایان لێ بێ، به‌شیان فه‌وتانو تیَدا چوونو به‌دبه‌ختیو عه‌زابی به‌رده‌وام بێ!

## چیرۆكی صالح پێغه‌مبه‌ر عليه السلام

﴿ ۞ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ
مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا
فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِۚ إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴿٦١﴾ قَالُوا۟ يَٰصَٰلِحُ
قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآۖ أَتَنْهَىٰنَآ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا
وَإِنَّنَا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٦٢﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ
إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَءَاتَىٰنِى مِنْهُ رَحْمَةً فَمَن
يَنصُرُنِى مِنَ ٱللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُۥۖ فَمَا تَزِيدُونَنِى غَيْرَ تَخْسِيرٍ ﴿٦٣﴾
وَيَٰقَوْمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ
أَرْضِ ٱللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ قَرِيبٌ ﴿٦٤﴾
فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُوا۟ فِى دَارِكُمْ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍۖ ذَٰلِكَ

وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ ﴿٦٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا صَٰلِحًا
وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَمِنْ خِزْىِ يَوْمِئِذٍ ۗ إِنَّ
رَبَّكَ هُوَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْعَزِيزُ ﴿٦٦﴾ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلصَّيْحَةُ
فَأَصْبَحُوا۟ فِى دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٦٧﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَآ ۗ أَلَآ إِنَّ
ثَمُودَا۟ كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّثَمُودَ ﴿٦٨﴾

ئەمە چیرۆکی سێهەمە لەو چیرۆکانەی کە لەم سورەتەدا باس کراون؛ ئەویش چیرۆك و بەسەرهاتی حەزرەتی (صالح)ە لەگەڵ گەلی ثەموود. حەزرەتی صالح دووەم پێغەمبەرە لەنەتەوەی عەرەب رەوانە کرابێ. نیشتمانی گەلەکەشی (گەلی ثەموود)، وڵاتی (حیجرە) کە کەوتۆتە نێوان وڵاتی حیجازو وڵاتی شامەوە. شوێنەواری شارو وڵاتیان تا ئێستاش هەر ماوە.

شێوەی داڕشتنی ئەم چیرۆکەش وەکوو هی چیرۆکی حەزرەتی هود وەهایە، بەڵام ئەوەندە هەیە لەم چیرۆکەدا: حەزرەتی صالح فەرمانی پێ کردن بەتەوحیدو خوداپەرستی دوو بەڵگەی ئاراستە کردن، یەکەمیان ئەوەیە: دەفەرموێ: خودا ئێوەی لەزەوی دروست کردوە، دووەم وای لێ کردوون کە خۆتان ئەو زەوییە ئاوەدان بکەنەوە!

بێگومان چیرۆکی حەزرەتی صالح لەوەپێش لەسورەتی (الأعراف)دا باس کراوە لەمەدواش لەسورەتی (الشعراء)و (النمل)و (القمر)و (الحجر)و سورەتی تریشدا هاتووە، ناوەرۆکی چیرۆکەکەش ئەوەیە: کە حەزرەتی صالح بانگەوازی

خۆی گەیاندوەو موناقەشەو گفتو گۆی زۆری لەگەڵ قەومەکەی کردوە، هەڕەشەی لەناوچوونو فەوتانی لێ کردون، ئەوانیش پەیامەکەیان رەتکردەوە، پاشان پەروەردگار موعجیزەی وشترەکەی پێ بەخشی بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە لەسەر راستی پێغەمبەرایەتیەکەی. ئەمجار گەلەکەی وشترەکەیان کوشت، پەروەردگاریش بەگرمەو هەورە بروسکە لەناوی بردن!

دەفەرموێ: ﴿وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحاً﴾ واتە: بێگومان ناردمان بۆ سەر قەومی ثەمود پیاوێك لەهۆزو نەژادی خۆیان، پەیوەندی نژادو خزمایەتی لەگەڵدا هەبوون، ئەویش صالح بوو (علیە السلام) کە هاتە سەریان فەرمانی پێ کردن بەخودا پەرستی، ﴿قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ﴾ پێی گوتن: ئەی نەتەوەکەم! تەنها پەرستش بۆ خودا بکەن، هەر ئەو بەخودا بزانن، جگە لەزاتی پەروەردگار هیچ خودای ترتان نیە شیاوی بەندایەتی بۆ کردن بێ!

**ئەمجار دوو بەڵگەی لەسەر تاكو تەنهایی خودا هێنایەوە:**

أ- بەڵگەی یەکەم ئەوەیە: کە دەفەرموێ: ﴿هُوَ أَنشَأَكُمْ مِنْ الأَرْضِ﴾ واتە: سەرەتا ئێوەی لەخاك دروست کردوە، ئادەم کە باوکی ئێوەیە لەخاك دروست کراوە ئەویش باوە گەورەی ئادەمیزادە، خۆڵ یەکەم ماددەیە کە ئادەمی لێ دروستکراوە، ئەمجار ئێوەی ئادەمیزادی لە(سولالە)ی قوڕ بەچەند هۆکارێك بەدیهێناوە؛ ئێوەی لەدڵۆپە ئاوی (تۆماو) ئەمجار کردویەتی بە(عەلەقە) ئەمجار کردویەتی بەگۆشتپارە، پاشان کردی بەئێسقانو ئەمجار ئێسقانەکانی بەگۆشت داپۆشیوە.

بنەمای تۆماو لەخوێنەوەیە، خوێنیش لەخۆراکەوە پەیدا دەبێ، خۆراکیش یان لەدانەوێڵەو بەروبوومی دارو دروخت یان لەگۆشتو شیرو پەنیرو ئەم جۆرە شتانە پەیدا دەبێ کە ئەمانیش دەچنەوە سەر دانەوێڵەو بەروبووم.

ب- بەڵگەی دووەم ئەوەیە دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا﴾ ئێوەی کردوە بەئاوەدانکەرەوە ئیشی تێدا دەکەن، کشتو کاڵو پیشەسازی‌و بیناسازی تێدا ئەنجام دەدەن. جا کە زەوی بەکاری ئاوەدانکردنەوە بێو ئادەمیزادیش بتوانێ ئاوەدانی بکاتەوە، ئەوە بەڵگەیە لەسەر هەبوونی خودایەکی بەدیهێنەرو دانا، کە نەخشەی هەموو شتێکی کێشاوە، ئادەمیزادی شارەزا کردوە بۆ سوود وەرگرتن لەسروشت، عەقڵو هۆشی داوە بەئادەمیزاد: کە بوونەوەر بۆ سوودی خۆی بەکار بێنێ، توانای داوەتێ کە تەصەروفی تێدا بکا.

جا کە پەروەردگار هەر خۆی شیاوی پەرستن بێ ﴿فَاسْتَغْفِرُوهُ﴾ داوای لێخۆشبوونی لێ بکەن بۆ ئەوەی لەتاوانی لەوەپێشتان خۆش بێ، ﴿ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ﴾ ئەمجار بگەڕێنەوە بۆ لای خودا، پەشیمان ببنەوە لەتاوانەکانتانو روبکەنە بەندایەتی بۆ کردنو عەزمتان جەزم بێ لەسەر نەگەڕانەوە بۆ گوناه لەداهاتوودا، ﴿إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُجِيبٌ﴾ بێگومان خودای من لەدروستکراوانی نزیکە بەرەحمەتو فەضلی خۆی، شنەواو زانایە بەمەخلووقاتی خۆی، بەفەضلو رەحمەتی خۆی وەڵامی داوای ئاتاجان دەداتەوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾البقرة/١٨٦.

قەومەکەی بەشێوەیەکی نەفامانەو سەر رەقانە وەڵامی حەزرەتی (صالح)یان دایەوە: ﴿قَالُوا يَا صَالِحُ قَدْ كُنْتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَذَا﴾ وتیان: ئەی صالح! تۆ لەوەپێش لەناو ئێمەدا شوێنی هومێد بووی! لەناو دڵماندا رێزو تەقدیرمان بۆ دانابووی، هیوامان پێت بوو بەتەما بووین ببیە گەورەو تەگبیرکەرو ریش سپیمان، چونکە زیرەکی‌و بلیمەتی‌و عاقڵمەندی‌و بیرتیژی‌و لێهاتووییمان پێوە دەبینی، ئێستا تۆ ئێمەت ناهومێد کرد، هەموو ئاواتێکت بڕین، سەدمخابن ئێمە بەتەما بووین ببیە پاشاو گەورەمان بەڵام وا ئێستا هیوا بڕاوت کردین.

ئەمجار هۆکاری ناهومێد بوونەکەیانی لێی دیاری دەکەنو دەڵێن: ﴿أَتَنْهَانَا أَنْ نَعْبُدَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا ؟﴾ ئەوە جڵەوگیریمان لەوە لێ دەکەی: کە ئەوەی باوکو باپیرانمان پەرستویانە ئێمەش بیپەرستین؟ دەتەوێ واز لەپەرستنی ئەو بتانە بێنین کە باوکو باپیرانمان پەرستویانو لەسەری راهاتوون؟ ﴿وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ﴾ ئێمە گومانی زۆرمان هەیە دەربارەی بانگەوازییەکەت: کە بانگمان دەکەی بۆ یەکتاپەرستی، بەراستی ئەمە جێگای گومانەو دڵمان لێ پیس کردوی.

مەبەست لەم قسانە ئەوەیە: دەڵێن: ئێمە سوورین لەسەر پابەند بوون بەبیرو باوەڕی باوکو باپیرانمان هەرگیز وازی لێ ناهێنین. ئەمە دەق لەهەڵوێستی کافرەکانی مەککە دەچێ: کە پەیامی پێغەمبەریان رەت دەکردەوەو دەیانگوت: ﴿أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهاً وَاحِداً إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ﴾ص/٥.

حەزرەتی صالح وەڵامی دانەوە، وەڵامێکی هێدیو هێمنانەو لەسەرە خۆ، هەڵوێستی دامەزراوی رادەگەیەنێ، بەردەوامی خۆی لەسەر پەیڕەوو پرۆگرامی پێغەمبەرایەتی خۆی دوپات دەکاتەوە. ﴿قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كُنتُ عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّي﴾ حەزرەتی صالح وتی: ئەی نەتەوەکەم! من چۆن لەخودا یاخی دەبم؟ چۆن واز لەپەیامی پێغەمبەرایەتی خۆم دەهێنم؟ دەپێم بڵێن: من چی بکەمو ئێوە چیم بۆ بەباش دەزانن: ئەگەر من لەسەر رێبازێکی حەق بمو بەڵگەو نیشانەی راستو دروستم بەدەستەوە بێو، دڵنیابم: کە ئەو پەیامەی پێی نێردراومو بۆ ئێوەم هێناوە حەقەو راستە، ﴿وَآتَانِي مِنْهُ رَحْمَةً﴾ ئێوە تەقدیری ئەوە بکەن: کە من لەخوداوە هیدایەت دراومو لەسەر بەصیرەتو بەرچاو روونی هەنگاو هەڵدەنێم، پێغەمبەرم بەراستیو خودا بەفەضڵو گەورەیی خۆی پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی پێ بەخشیوم، سەیر بکەن ئەگەر من شوێنی ئێوە بکەومو لەخودا یاخی ببم ﴿فَمَنْ يَنصُرُنِي مِنْ اللَّهِ ؟﴾ کێ من لەعەزابی خودا دەپارێزێ؟ ﴿إِنْ عَصَيْتُهُ﴾ ئەگەر من

لەخودا یاخی ببمو شوێن ئێوە بکەومو واز لەبانگەوازییەکەم بهێنم، بانگی ئێوە نەکەم بۆ خوداپەرستی، جڵەو گیریتان لێ نەکەم لەبتپەرستی، دڵنیام سوودم پێ ناگەیەنن ﴿فَمَا تَزِيدُونَنِي غَيْرَ تَخْسِيرٍ﴾ جگە لەخەسارەتمەندی هیچی ترم بۆ زیاد ناکەن، خەسارەتمەندی لەگۆڕینەوەی ئەو پەیامەی لامە، بەو بڕوا پڕوپوچەی لای ئێوە، واز هێنان لەپەیامی پێغەمبەرایەتیمو شوێن کەوتنی ئێوە.

جا چونکە دابو نەریتی پێغەمبەران لەسەرەتاوە بانگەوازیکردنە بۆ خوداپەرستیو پاشان ئیدیعا کردنی پێغەمبەرایەتیو درکاندنی ئەوە: کە ئەو رەوانەکراوەو ئەرکی رابەری پێ سپێردراوە. حەزرەتی (صالح)یش (علیه السلام) پاش راگەیاندنی پێغەمبەرایەتیەکەی، داوای موعجیزەیان لێ کرد، داوایان لێ کرد، وتیان: ئەگەر راست دەکەی پێغەمبەری، دە وشترێك لەو بەردە دەر بێنە! حەزرەتی صالح لەخودا پاڕایەوە داوای بەدیهێنانی ئەو موعجیزەیەی لێ کرد، پەروەردگار موعجیزەی بۆ هێنایەدیو وشتر لەبەردی رەقو تەق هاتە دەرەوە، ئەمجار روی کردە گەلەکەیو وتی: ﴿وَيَا قَوْمِ هَـذِهِ نَاقَةُ اللّهِ لَكُمْ آيَةً﴾ ئەی گەلەکەم! ئەمە وشترێکە نیشانەی راستی پێغەمبەرایەتی منە، وشترێکە خودا بەموعجیزە دروستی کردوە، لەهەموو وشترێکی تر جیاوازە لەخواردنو خواردنەوەیدا لەزۆری شیریدا، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا مُرْسِلُو النَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَارْتَقِبْهُمْ وَاصْطَبِرْ، وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ الْمَاء قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ﴾القمر/٢٧-٢٨.

﴿فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِي أَرْضِ اللّهِ﴾ مەرەخەسی بکەن لێی بگەڕێن لەکوێ دەلەوەڕێ با بلەوەڕێ، شیرو ماستەکەی بۆ ئێوەو ئالفەکەی لەسەر ئێوە نەبێ.

﴿وَلاَ تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ﴾ بەهیچ شێوەیەك خراپەی لەگەڵ مەکەنو دەستدرێژی مەکەنە سەرو ئەزیەتی مەدەن، ئەگەر ئەزیەتی بدەنو دەستدرێژی بکەنە سەر ﴿فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ قَرِيبٌ﴾ ئەوە سزایەکی نزیك خێرا یەخەتان دەگرێو لەناوتان دەبا، سێ رۆژ زیاتر نابا عەزابی خودا دێتە سەرتانو ئیتر رزگار بوونتان نابێ!

بەڵام گەلەکەی ئامۆژگارییەکەیان نەبیستو بەدرۆیان خستەوە، ﴿فَعَقَرُوهَا﴾ بەرەزامەنـدی هـەموویان قیـداری کـوڕی سـالف هەڵـسا وشـترەکەی سـەربڕی، خۆبەزلزانیو لەخۆبایی بونو گاڵتە کردنیان بەئامۆژگاریو هەڕەشەکانی حەزرەتی صالح گەییشتە ئاستێك نەك هەر ئەزیەتدان، بەڵکوو وشترەکەشیان سەربڕی.

﴿فَقَالَ تَمَتَّعُوا فِي دَارِكُمْ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ ذَلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ﴾ حەزرەتی صالح پـێی گـوتن: سـێ رۆژی تـر بگـوزەرێننو لـەززەتو خۆشـی ژیـان وەربگـرن لـەجێو رێگای خۆتاندا، تا سێ رۆژی تر بژینو هەوا هەڵمژن، پاشان عـەزابی بەئێـشتان بـۆ دێ، عەزابی پەروەردگار لەبێختان دەردێنـێ، ئـەوە وادەیـەکی حـەقو راسـتەو درۆی تێدا نیە، هیچ گومانتان لەهاتنیدا نەبێ!

ئەمجار باسی هاتنی عەزابی هەڕەشە پێ لێکراو دەکاو دەفـەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا صَالِحاً وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِنَّا وَمِنْ خِزْيِ يَوْمِئِذٍ﴾ جا کـە کـاتی هـاتنی عەزابی ئێمە هاتو ئەوی هەڕەشەیان پێ لێکرابوو رووی‌دا، هەورە بروسکەو سـزای ریــشەکەنیان بەســەردا درا، صــاڵحو شــوێنکەوتوانی لەگــەڵی بــوون بەرەحمــەتو میهرەبانی خۆمان رزگارمان کردن، لەو عەزابە بەئێـشە قوتاریـان بـوو، لەرسوایی‌و ناڕەحەتی رۆژی فڕکردنی گەلی ثـەموود رزگارمـان کـردن، ئـەو نـەفرینو نـاوزڕانو سەرزەنشتەی گەلی ثەموودی گرتەوە ئەوان لێی رەها بوون!!

﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ﴾ خودای تۆ ئەی موحەممەد! ئـەو خودایـەی گـەلی ثەموودی بەو مەرەدە بـرد، خودایـەکی بـەتواناو بـاڵا دەسـتە، دەتوانـێ وێنـەی ئـەو عەزابـەو تونـد تـریش بەگـەلی تـۆ بگەیـەنێ، ئەگـەر ئـەوان بـەردەوام بـن لەسـەر ئینکاری‌و سەر رەقی!!

﴿وَأَخَذَ الَّذِينَ ظَلَمُوا الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دِيَارِهِمْ جَاثِمِينَ﴾ ئـەوە بـوو: دەنگـی فریشتە، یان گرمەو نالەی عەزاب، گەلی ثەموودی گرتو دارو بەردی وەلەرزە هێناو

رایه‌کاندن‌و له‌رزه‌ی خسته دڵ‌و ده‌روونیانه‌وه، چونکه ئه‌وانه سته‌میان له‌خۆیان کردو کافرو سه‌ر ره‌ق‌و ته‌جاوز کار بوون، له‌ئاکامی گرمه‌و ناڵه‌ی هه‌وره تریشقه‌و صاعیقه‌که‌دا هه‌موو ئه‌وانه‌ی بڕوایان به‌حه‌زره‌تی صالح نه‌کردبوو سلار بوونه‌وه‌و جوڵه‌یان لێ بڕا، بوون به‌لاکه تۆپیوی فڕێ دراو له‌سه‌ر زه‌وی.

﴿كَأَنْ لَمْ يَغْنَوْا فِيهَا﴾ ئه‌وان به‌هۆی خێرا له‌ناوچوونیان ده‌تگوت: هه‌ر له‌دونیادا نه‌بوون‌و له‌ماڵ‌و وڵاتی خۆیاندا ژیانیان به‌سه‌ر نه‌بردوه. ئیشیان ته‌واو بوو، له‌کۆڕی ژیان وه‌ده‌ر نران، له‌وڵاتدا نه‌مان، به‌جۆرێك هه‌ر وه‌كوو نه‌بووبن، حاڵ‌و وه‌زعیان هاتبوه زوبان به‌جۆرێك په‌ندیان لێ وه‌ربگیرێ‌و هه‌موو عاقڵمه‌ندێك پێیان ته‌مبێ ببێ!

﴿أَلا إِنَّ ثَمُودَ كَفَرُوا رَبَّهُمْ أَلا بُعْداً لِثَمُودَ﴾ بزانن: كه گه‌لی ثه‌موود به‌خودای خۆیان كافر بوون‌و پابه‌ندی فه‌رمان‌و جڵه‌وگیرییه‌كانی نه‌بوون، شوێن په‌یامی پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یان نه‌كه‌وتن، دووری له‌ره‌حمه‌تی خوداو نه‌فرینی خودا له‌گه‌ل ثه‌موود بێ!

**تێبینی:**

برێ له‌و شتانه‌ی له‌چیرۆكه‌كه وه‌رده‌گیرێ:

١- تۆبه‌و ئیستیغفار له‌تاوان‌و یاخی بوون هۆكارێكی خێرایه بۆ دوعا قبووڵ بوون، چونكه خودا هه‌میشه له‌به‌نده‌كانی نزیكه‌و ره‌حم‌و فه‌ضلی زۆره بۆیان، داواكاری ئاتاجان جێ به‌جێ ده‌كا.

٢- وشتره‌كه موعجیزه‌یه‌كی سه‌رسوڕهێنه‌ر بوو، چونكه له‌به‌ردێكی ره‌ق‌و ته‌ق دروستكرابوو، كه وه‌دی هات ئاوس بوو، دروستكرابوو له‌سه‌ر شێوه‌ی كاملی‌و زه‌لامی، یه‌كسه‌ر كه هاته دی وشترێكی ته‌واوو كامڵ بوو، رۆژێك هه‌موو ئاوی كانیاو

یان بیرەکەی دەخواردەوە، ڕۆژێکیش ئاوەکە بەشی گەلەکە بوو، شیری ئەوەندە زۆر بوو بەشی هەموو ئەو خەڵکەی دەکرد!!

٣- دادپەروەری خوداو ڕەحمەتو میهرەبانی وا داخواز بوو: کە صاڵحو شوێنکەوتوانی ڕزگار بکا، دەڵێن: ژمارەیان چوار هەزار کەس بوو. نەتەوەی ئەموودیشی لەناو برد.

٤- وادەو بەڵێنی پێغەمبەران ڕاستو بەجێیە، هەڕەشەکانیان دێنەدیو خیلافولوەعدەیان نابێ. بێگومان حەزرەتی صاڵح هەڕەشەی لێ کردبوون: کە پاش سێ ڕۆژی تر عەزابیان بۆ دێ، لەڕۆژی چوارەمدا ئەو عەزابە سامناکە یەخەی گرتن!

٥- عەزابەکەیان بەگرمەو ناڵەیەك، یان بەصاعیقەو بومەلەرزەیەك بوو هەموویان بوون بەلاشەی بێ گیانو لاڵو پاڵ کەوتوو. جا گرمەکە یان گرمەی جوبرائیل بوو، یان دەنگێکی ئاسمانی بەهێز بوو یەکسەر دڵیان تەقیو خپ بوون.

## چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم عليه السلام

﴿ وَلَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوا۟ سَلَـٰمًا
قَالَ سَلَـٰمٌ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا رَءَآ
أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا۟ لَا
تَخَفْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٠﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٌ فَضَحِكَتْ

فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾ قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ
ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ
﴿٧٢﴾ قَالُوٓا۟ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۖ رَحْمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ
أَهْلَ ٱلْبَيْتِ ۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴿٧٣﴾ فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَٰهِيمَ ٱلرَّوْعُ
وَجَآءَتْهُ ٱلْبُشْرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِى قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ
أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾ يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَآ ۖ إِنَّهُۥ قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ
وَإِنَّهُمْ ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴿٧٦﴾

ئەمە چیرۆکی چوارەمە لەو چیرۆکانەی: کە لەم سورەتەدا باسکراون، بێگومان چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم لەوەپێش لەسورەتی (البقرة)دا باس کراوە!

حەزرەتی ئیبراهیم لەقورئاندا زۆر جار باس کراوە، جاری وا هەیە: لەگەڵ باوکیو گەلەکەیدا باس کراوە، لێرەدا لەتەك چیرۆکی ئەو فریشتانە ناوی هێنراوە کە موژدەی (ئیسحاقو یەعقووب)یان پێدا، هەروا هەواڵی لەناوبردنی گەلی (لوط)یشیان پێ راگەیاند، لەشوێنێکی تردا لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕی باس کراوە.

ئەو شارو گوندانەی حەزرەتی (لوط)یان لێ بوو کەوتبوونە دەوروبەری شام، حەزرەتی (ئیبراهیم)یش بۆ خۆی لەخاکی فەلەستین بوو، جا کە پەروەردگار فریشتەی عەزابی ناردن بۆ سەر گەلی لوط بەسەر ئیبراهیمدا تێپەڕینو میوانی

ئەو بوون! وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى﴾ واتە: بێگومان فریشتەمان ناردن بۆ لای ئیبراهیم بەموژدەوە؛ مزگێنیمان دا بەئیبراهیمو خێزانی بەوەی: کە منداڵیان دەبێ!

عەطاو کۆمەڵێکی تر لەتابعین دەڵێن: ئەو فریشتانە: جوبرائیلو میکائیلو ئیسرافیل بوون. هەندێکی تر لەرافەکەرانی قورئان دەڵێن: لەگەڵ جوبرائیلدا حەوت فریشتەی تر هەبوون. هەرچەندە لەراستیدا زانینی ئەم جۆرە شتانە پێویستی بەوە هەیە بەنیگاو سروش بچەسپیٚو لەرێگەی خەبەری صادیقەوە بەئێمە بگا، نەشکەییشتوە!

بەهەر حاڵ قورئان ئاماژە بۆ ئەوە دەکا: کە فریشتە هاتوونو مزگێنیان بەئیراهیمو خێزانی داوە بەوە کە کوڕیان دەبێ، کوڕەکەش ئیسحاقە وەکوو لەئایەتی ژمارە (٧١)ی ئەم سورەتەدا هاتووەو دەفەرموێ: ﴿فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ...الآيَة﴾ لەشوێنێکی تریشدا دەفەرموێ: ﴿وَبَشَّرُوهُ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ﴾الذاريات/٢٨.

هەندێکیش دەڵێن: مزگێنییەکە بریتی بوو: لەفەوتاندنو لەناو بردنی گەلی لوطو رزگار کردنی حەزرەتی لوط!

جا کە فریشتەکان هاتن ﴿قَالُوا سَلاماً﴾ وتیان: ئەی ئیبراهیم! سڵاوت لێ بێ. ﴿قَالَ سَلامٌ﴾ (ئیبراهیم)یش وەڵامی دانەوەو وتی: هەمیشە سەلام لەسەر ئێوە بێ.

﴿فَمَا لَبِثَ أَنْ جَاءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ﴾ پەلەی کردو ئەوەندەی پێ نەچوو کە گوێرەکەیەکی قەڵەوی برژێندراوی هێناو خستیە بەر دەمیان بۆ ئەوەی لێی بخۆن! گۆشتی ئەم گوێرەکەیە لەسەر بەردی گەرم برژابوو. لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَرَاغَ إِلَى أَهْلِهِ فَجَاءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ، فَقَرَّبَهُ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ؟﴾الذاريات/٢٦ – ٢٧.

ئەمەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە ئەو گوێرەکە برژێندراوو ئامادە کراو بوو بۆ میوان، دەشگونجێ لەکاتی گەیشتنی فریشتەکان بەگورجیو خێرایی برژێندرابێ!

﴿فَلَمَّا رَأَى أَيْدِيَهُمْ لا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً﴾ جا کە بینی میوانەکان دەستیان بۆ خواردنەکە نابەن، وەکوو میوانی ئاسایی دەستیان بۆ خواردنەکە نەبرد، حەزرەتی ئیبراهیم لێیان بەگومان کەوتو پێی وانەبوو ئەوانە میوان بن! لەدڵدا لێیان ترساو بۆی ئاشکرا بوو ئەوانە ئادەمیزاد نینو وێ دەچێ فریشتەی عەزاب بن.

﴿قَالُوا لا تَخَفْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمِ لُوطٍ﴾ وتیان: ئەی ئیبراهیم! مەترسە ئێمە نامانەوێ زیان بە تۆ بگەیەنین، ئێمە نێردراوین بۆ لەناوبردنی گەلی لوط. وڵاتی گەلی لوط نزیك بوو لەو شوێنەی: کە حەزرەتی ئیبراهیمی لێ بوو.

﴿وَامْرَأَتُهُ قَائِمَةٌ فَضَحِكَتْ﴾ خێزانی ئیبراهیم لەپاش پەردەیەکەوە ڕاوەستابوو بەجۆرێك کە چاوی لەفریشتەکان بوو، یان هەر ڕاوەستابوو لەپێش میوانەکانو خزمەتی دەکردن، بەبیستنی قسەکانیانو دڵنیا کردنیان بۆ ئیبراهیم کەیف خۆش بوو پێکەنینی لێ برژا، یان بەبیستنی هەواڵی لەناوبردنی گەلی لوط کەیف خۆش بوو، چونکە دژی کردەوەکانیان بوو، کوفرو بێ دینیو سەر ڕەقییان ئاشکراو نومایان بوو. ﴿فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَقَ وَمِنْ وَرَاءِ إِسْحَقَ يَعْقُوبَ﴾ لەسەر زوبانی فریشتەکان موژدەمان بەخێزانی ئیبراهیم دا: کوڕی دەبێو ناوی دەنێن ئیسحاق، ئەم کوڕە دەژیاو تەمەن درێژ دەبێ دوایی کوڕێکی دەبێ ناوی لێ دەنێ یەعقووب! ئیتر خێزانی ئیبراهیم هاواری لێ هەستاو لەخۆشیانو قیژاندی ﴿قَالَتْ يَا وَيْلَتَا أَأَلِدُ وَأَنَا عَجُوزٌ﴾ وتی: ئای چەند سەیرە، ئای کە جێگای سەر سوڕمانە چۆن من منداڵم دەبێ، وەلحاڵ ئەمن پیرەژنم، پەکم کەوتووەو کەوتومە حاڵەتی نەزۆکییەوە ﴿وَهَذَا بَعْلِي شَيْخاً﴾ ئەوەش مێردەکەمە دەبینن پیرە مێردێکی بەساڵا چووە، بەرواڵەت

هاوتەمەنانی ئەو منداڵیان نابن ﴿إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ﴾ بەراستی ئەوەی بیستم شتێکی سەیرو سەمەرەیە، چونکە چۆن پیرەژنێکو پیرەمێردێکی بەساڵا چووی وەکوو منو مێردەکەم منداڵیان دەبێ؟! ﴿قَالُوا أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ﴾ فریشتەکان وەڵامیان دایەوەو وتیان چۆن تۆ لەقەزاو قەدەری خودا سەرت سوڕ دەمێنێ؟ چۆن ئەوەت بەلاوە سەیرە کە بەپیری منداڵتان ببێ؟ ئەوە کاری خودایەو ویستو ئیرادەی ئەوە: کە هیچی لێ عاصی نابێ، ﴿رَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ﴾ ئەوە رەحمەتی خودایەو بەرەکەتو خێری ئەوە بەسەر ئێوەوە ئەی خانەوادەی پێغەمبەرایەتی!! هیچ عەجایەب نیە: کە خودا شتێك بەئێوە ببەخشێ کە نایدا بەکەسانی تر!

بێگومان پێغەمبەرایەتی لەخانەوادەی حەزرەتی ئیبراهیمدا بەردەوام بوو، هەر لەنەوەو ذروێتی حەزرەتی ئیبراهیم تا رۆژی قیامەت پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی بەردەوام بوو! ﴿إِنَّهُ حَمِيدٌ مَجِيدٌ﴾ بێگومان پەروەردگار لەسەر هەموو کردەوەیەکی سوپاس کراوە، شیاوی هەموو حەمدو سوپاسێکە، زاتو صیفاتی پیرۆزو موبارەکە، خێرو ئیحسانی زۆرو فراوانە، ئەو زاتە سوپاسکراو بەرزو پیرۆزە. بەخشندەو خاوەن عەطایە.

﴿فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَاهِيمَ الرَّوْعُ وَجَاءَتْهُ الْبُشْرَى يُجَادِلُنَا فِي قَوْمِ لُوطٍ﴾ جا کاتێك ترسو خۆف لەئیبراهیم رەوییەوە، موژدەی خۆشی بیستو گوێی لەموژدەدانی فریشتەکان بوو کە موژدەی بونی کوڕیان پێدا، زانی: کە ئەوانە فریشتەی عەزابن بۆ گەلی لوط. دەستی کرد بەموناقەشە لەگەڵ فریشتەی ئێمە دەربارەی بەهیلاکبردنی گەلی لوط، وتی: چۆن ئێوە ئەو گەلو وڵاتە لەناو دەبەن؟ لوط لەناویان دایە، ئاخر ئەویش بەردەکەوێ.

﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّاهٌ مُنِيبٌ﴾ بێگومان ئیبراهیم پیاوێکی لەسەرەخۆو هێمن بوو، پەلەی نەدەکرد لەتۆڵەستاندنەوەی ئەو کەسانەی خراپەیان لەگەڵ دەکرد،

زۆر به‌زه‌یی به‌خه‌ڵكدا ده‌هاته‌وه، ئاخو ئۆفی زۆر بوو: كه‌ بیدیایه‌ خه‌ڵكانی دیكه‌ تووشی ناڕه‌حه‌تی بوون، هه‌موو شتێكیشی ده‌گه‌ڕانده‌وه‌ بۆ لای خودا، هه‌میشه‌ تۆبه‌و ئیستیغفاری ده‌كردو ده‌یه‌ویست ئه‌و كارانه‌ بكا كه‌ خودا پێی خۆشه‌، جا دڵنه‌رمی‌و خۆشه‌ویستی بۆ خه‌ڵك پاڵی پێوه‌ نا: كه‌ موجاده‌له‌ له‌گه‌ڵ فریشته‌كان بكا، به‌هیوای ئه‌وه‌: كه‌ خودا عه‌زاب له‌سه‌ر گه‌لی لوط هه‌ڵبگرێ‌و ئه‌وانیش تۆبه‌ بكه‌ن‌و ئیمان بهێنن!

فریشته‌كان وه‌لامیان دایه‌وه‌و وتیان: ﴿يَا إِبْرَاهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَذَا﴾ ئه‌ی ئیبراهیم! واز له‌و جیدال‌و موناقه‌شه‌یه‌ بێنه‌، چی دی ده‌رباره‌ی گه‌لی لوط داكۆكی مه‌كه‌ ﴿إِنَّهُ قَدْ جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ﴾ شه‌ئن‌و حاڵ وایه‌: بێگومان فه‌رمانی خودای تۆ هاتووه‌و بڕیار ده‌رچووه‌ به‌له‌ناوبردنی گه‌لی لوطو هاتنی عه‌زاب بۆ سه‌ریان، ﴿وَإِنَّهُمْ آتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ﴾ بێگومان گه‌لی لوط سزایان بۆ دێ‌و سزاكه‌ش گه‌ڕانه‌وه‌ی نیه‌، چه‌ندێك موناقه‌شه‌و جیدال بكه‌ی بێ سووده‌.

## چیرۆكی حه‌زره‌تی لوط له‌گه‌ڵ نه‌ته‌وه‌كه‌یدا

﴿ وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا
وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ ﴿٧٧﴾ وَجَآءَهُۥ قَوْمُهُۥ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِن
قَبْلُ كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِى هُنَّ
أَطْهَرُ لَكُمْ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ فِى ضَيْفِىٓ ۖ أَلَيْسَ مِنكُمْ

رَجُلٌ رَّشِيدٌ ﴿٧٨﴾ قَالُواْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ
وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ ﴿٧٩﴾ قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِيَ إِلَىٰ رُكْنٍ
شَدِيدٍ ﴿٨٠﴾ قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيْكَ
فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ
إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمْ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ ٱلصُّبْحُ
أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٍ ﴿٨١﴾ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَٰلِيَهَا
سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ
﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ
﴿٨٣﴾

ئەمە چیرۆکی پێنجەمە لەو چیرۆکانەی لەم سورەتەدا باس کراون، ئەویش چیرۆکی حەزرەتی لوطە لەگەڵ گەلەکەیدا.

گەلی لوط ئەهلی سەدوومی ئوردنن.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: فریشتەکان لەلای حەزرەتی ئیبراهیمەوە رۆیشتن بۆ لای لوط (کە برازای ئیبراهیم بوو) لەنێوان شوێنی ئیبراهیمو شوێنی لوطدا چوار فرسەخ بوو. کە چوونە لای لوط. لەشێوەی کوڕی تازە پێگەیشتووی بێ موو،

شێوەو روخساریان لەوپەڕی جوانیو شۆخو شەنگیدا بوو. حەزرەتی (لوط)یش نەیزانی: کە فریشتەن.

دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطاً سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعاً﴾ کە فریشتەکانی ئێمە لەشێوەی کوڕی تازە پێگەیشتودا هاتنە لای لوط، زۆری پێ ناخۆش بوو، خەمو پەژارە دایگرت، هەستی کرد: کە ناتوانێ میوانداریان بکا، چونکە ترسا لەوەی: کە گەلەکەی پێیان بزانن‌و پەلاماریان بدەن، دەستدرێژییان بکەنەسەر. ﴿وَقَالَ هَذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ﴾ وتی: ئەمە رۆژێکی سەختو دژوارە تێی کەوتووم، ئەمڕۆ تەنگانەیەو تووشی بەلایەکی گەورە بووم!

﴿وَجَاءَهُ قَوْمُهُ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ﴾ جا کە گەلی لوط زانییان: کە ماڵی لوط ئەم کوڕە تازە پێگەیشتوانەی تێدان‌و میوانی ماڵی (لوط)ن، بەهەڵەداوان‌و راکردن بەرەو ماڵی لوط راجمین، کەیفخۆش‌و تەڕدەماخ بوون بەو هەواڵەو دەیانەویست زوو بەر پەلانیان بکەون سواریان بن، ئەمەش شتێکی ئاسایی‌و عادەتی بوو لایان، چونکە ﴿وَمِنْ قَبْلُ كَانُوا يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ﴾ لەپێش هاتنی ئەم میوانانەدا دابو نەریتی هەتیوبازی لایان باو بوو، ئەو کردەوە ناشیرینەیان ئەنجام دەدا، ئەم عادەتەیان لێ ببوە خوو وازیان لێ نەدەهێنا، تەنانەت کاتێ غەزەبیان لێ گیرا لەسەر ئەو حاڵەتە ناشیرینە بوون‌و سەرگەرمی ئەو هەتیو بازییە بوون. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ السَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِي نَادِيكُمُ الْمُنكَرَ﴾العنكبوت/٢٩.

﴿قَالَ يَا قَوْمِ هَؤُلاءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ﴾ لوط روی تێکردن‌و وتی: ئەی گەل‌و هۆزەکەم! ئەوانە کچەکانمن، واتە: ئافرەتی گەلەکەی مەبەستە؛ چونکە پێغەمبەر بۆ نەتەوەکەی وەکوو باوک وایە، ئەوە کچەکانمن مارەیان بکەن‌و بچنە لایان ئەوانە بۆ ئێوە پاک‌و خاوێن ترو باشترن لەوەی خەریکی ئەو کارە ناشرینە بن، مارە کردن‌و خێزان پێکەوەنان سوودی زیاترە بۆ ئێوە لەدونیاو قیامەتدا، وەکوو

لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ، وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ﴾الشعراء/١٦٥-١٦٦.

موجاهیدو قەتادەو هی تریش وتوویانە: هیچ کامێ لەو ئافرەتانە کچی لوط نەبوون، بەڵکوو ئافرەتی گەلەکەی بوون، هەموو پێغەمبەرێکیش باوکی ئوممەتەکەیەتی.

ئیبنو جورەیج دەڵێ: فەرمانی پێ کردن: کە ئافرەت مارە بکەن، نەك ئافرەتی بۆ رانواندبن!

سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: مەبەستی ئەوەیە: کە ئافرەتی گەلەکەی هەموویان کچی ئەونو ئەو باوکیانە!

﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ لەخودا بترسنو خۆتان لەسزاو عەزابی بپارێزن، ﴿وَلا تُخْزُونِي فِي ضَيْفِي﴾ حەیاو ئابڕوم مەبەن، دەستدرێژی مەکەنە سەر میوانەکانم، خەجاڵەتو چاو بەرەو ژێرم مەکەن سوکایەتیکردن بەمیوانەکانم سوکایەتیکردنە بەخودی خۆم!

﴿أَلَيْسَ مِنْكُمْ رَجُلٌ رَشِيدٌ﴾ ئایا لەناو ئێوەدا پیاوێکی داناو عاقڵمەندی تێدا نیە، ئامۆژگارییەکانم وەربگرێو بەقسەم بکاو واز لەو شتانە بێنێ: کە جڵەو گیریتان لێ دەکەمو شارەزاتان بکا بۆ رێگای ڕاستو دروست.؟

﴿قَالُوا لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ﴾ هەموویان رویان کردە حەزرەتی لوطو وتیان: بێگومان تۆ لەوە پێش زانیوتە: کە ئێمە کارمان بەکچەکانت نیەو ئارەزۆمان لەئافرەت نیە، کەوابێ چ سوودێك نیە لەوەی کە دەیلێی: ئێمە تەنها کارمان بەنێرە، تۆ بۆخۆشت دەزانی ئێمە چیمان دەوێ، ئیتر چ سودێك هەیە لەدوبارە کردنەوەی ئەو جۆرە قسانە؟؟ واتە: ئێمە سوورین لەسەر هەتیوبازیو وازی لێ ناهێنین!

﴿قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ﴾ لوط بە گەلەکەی وت: ئەگەر من هێزو توانایەکی وەهام ببوایە بمتوانیایە بەرگری بکەم، یان هۆزێکی شەڕکەرم ببوایە پشتم بگرێو یارمەتیم بداو شەڕو ئاشووبی ئێوەی لێ دوور بخستمایەوە بەرەنگاریم دەکردنو نەم دەهێشتن بەئاواتی خۆتان بگەن.

دوای پەیدا بوونی ئەم ترسو لەرزەی کەوتبوە ناو دڵو دەروونی (لوط)ەوە دەربارەی میوانەکانی، دوای ئەوەی لوط تەنگەتاو بوو، فریشتەکان پەردەیان لەسەر خۆیان لاداو موژدەی رزگار بونیان پێ داو ﴿قَالُوا يَا لُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ﴾ وتیان: ئەی لوط! مەترسەو ئەو غەمو پەژارەیە لەدڵو دەروونی خۆت دەربهاوێ ئێمە فروستادەی خودای تۆین، ئێمە فریشتەینو ڕەوانە کراوین بۆ ئەوەی تۆ ڕزگار بکەین لەشەڕو خراپی ئەمانەو لەناویان بەرین.. هیچ مەترسەو خەمت نەبێ ﴿لَنْ يَصِلُوا إِلَيْكَ﴾ ئەوانە ناتوانن خراپەو شەڕو نەگبەتی خۆیان بەتۆ بگەیەنن، سوکایەتیت پێ بکەن، ئابرۆو ناموست بەرن، ئیتر لەو کاتەدا خودا چاوی ئەو هەتیوبازانەی کوێر کردو کەسیان نەدەبینی وەکو لەسورەی (القمر)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِ فَطَمَسْنَا أَعْيُنَهُمْ﴾.

﴿فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِنْ اللَّيْلِ وَلا يَلْتَفِتْ مِنْكُمْ أَحَدٌ إِلاَّ امْرَأَتَكَ﴾ ئەتۆ خۆتو ماڵو خێزانت کە شەو راشکاو زوربەی زۆری تێپەڕ بوو پێش بەرەبەیان خۆتان رزگار بکەنو لەشار دەرچنو هەڵێن: کەستان ئاوڕ نەداتەوە، نەوەکوو دیمەنی عەزابی سامناك ببینێو زەندەقی بچێ، هەمووتان شار بەجێ بێڵن، جگە لەژنەکەت: کە خیانەتی لێ کردی، ئەو لەگەڵ دەرچووەکان نەبێ ﴿إِنَّهُ مُصِيبُهَا مَا أَصَابَهُمْ﴾ بەتەئکید ئەو عەزابەی تووشی گەلە ستەمکارەکەت دەبێ، دەبێ ژنەکەشت بگرێتەوە، دەبێ ئەویش ئەو عەزابە بچێژێ! ئێوە بەشەو دەرچن چونکە ﴿إِنَّ مَوْعِدَهُمْ الصُّبْحُ﴾ بێگومان کاتی لەناو بردنی ئەوان بەیانییەو هەر کەسێ لەشاردا بمێنێتەوە لەناو دەچێ عەزابەکە دوا فەجر دەست پێ دەکا کاتی

خۆرهەڵاتن، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ مُشْرِقِينَ﴾الحجر/٧٣.

دەشگونجێ خیطابەکەی حەزرەتی لوط لەگەڵ میوانەکاندا بووبێ، واتە: ڕوی کردە ئەو کۆمەڵە گەنجە دەمو چاو جوانو شۆخو شەنگانە، کە لەدیدی حەزرەتی لوطدا ئەوانە خاوەن هێزو توانا بوونو ئاواتی خواست کە بیانتوانیایە یارمەتی بدەنو پشتی بگرنو بەهەموویان بەرگری لەو کارە ناشرینە بکەن. خەمو ناڕەحەتی لوط گەیشتبوە ئاستێك ئەوەی لەبیر چوبوەوە کە خودا پشتیوانیەتی، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (رحمة الله علی لوط لقد كان يأوى الى ركن شديد!)

هۆی هەڵبژاردنی ئەم کاتە بۆ هاتنی عەزاب بۆ سەریان، ئەوە بووە لەو کاتەدا هەموویان لەماڵو شوێنی خۆیاندا کۆبونەوە.

ریوایەت کراوە: کە بە(لوط)یان گوت: ﴿إِنَّ مَوْعِدَهُمُ الصُّبْحُ﴾ لوط وتی: دەمەوێ عەزابەکە زووتر بێ، پێم خۆشە پاش سەعاتێکی تر عەزابەکەیان بۆ بێ، فریشتەکان وتیان: ﴿أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ ؟﴾ راڤەکەرانی قورئان دەڵێن: حەزرەتی لوط کە ئەم قسانەی بیستن بەشەو لەگەڵ ماڵو منداڵیا دەرچوون! ﴿فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا﴾ جا کاتێ فەرمانی ئێمە بەسزادانیان هاتو وەختی نازڵبوونی عەزابەکە هات لەکاتی خۆرهەڵاتندا ویستو ئیرادەی ئێمە هاتە دی ﴿جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا﴾ شارەکەمان ژێرو زەبەر کرد لای سەروی کە دانیشتوانی لەسەری دەژیان خستمانە ژێرەوە؛ واتە: خاکەکەمان هەڵگێڕایەوەو بەزەویماندا بردنە خواری!

﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِنْ سِجِّيلٍ مَنْضُودٍ﴾ وێڕای ئەو هەڵەوگێڕییە بەردە بارانمان کردن، بەردی سواڵەتمان بەسەردا باراندن، بەردو گڵی جۆشخواردومان بەسەردا باراندن، هەندێ لەو بەردانە لکابوون بەهەندێکیانەوە، واتە: یەك بەدوای

یەکدا باراندمانن. واتە: ئەوەندەمان بەرد بەسەردا باراندن تا بەردەکان کەڵەکە بوون.

﴿مُسَوَّمَةً عِنْدَ رَبِّكَ﴾ ئەو بەردانە نیشانەدار کرابوون بۆ سزاو عەزاب، بەردەکان نیشانەیەکی تایبەتیان پێوە بوو لەلایەن خوداوە، بۆ ئەو شوێنە دیاری کرا بوون، لەبەردی سەرزەوی جودا بوون!

﴿وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ﴾ ئەو جۆرە عەزابو بەردەبارانە دوور نیە تووشی ستەمکارانی گەلی تۆش ببێ ئەی موحەممەد!

یان ئەو شارو گوندانەی ئاوا ژێرو زەبەر کرانو بەردە باران کران لەستەمکارانی گەلەکەتەوە دوور نیە، ئەو شوێنە لەشاری مەککەوە نزیکەو ئێوە لەگەشتو هاتو چۆتاندا بەشەوو بەرۆژ بەسەر ئەو شوێنەدا دێنو دەڕۆن وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ، وَبِاللَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ؟﴾الصافات/١٣٧-١٣٨.

بەکورتی لەسبەینێی ئەو رۆژەدا: کە بڕیار درابوو بۆ لەناوبردنی گەلی لوط، فریشتەی تایبەتی: (جوبرائیل) بەهێزو توانای خوا پێداوی ئەو وڵاتەی بەرز کردەوە بۆ حەواو کوتایەوە بەزەویداو ئاداری بەسەر پادارەوە نەهێشت!

ئەو شارو گوندانەی کە بەر ئەم عەزابە کەوتن پێنج گوند بوون؛ سدروم (شارە دێرینەکەیانبوو)، عامورا، دادوما، ضفوة، قەتەم.

**ئەم عەزابە دوو تایبەتمەندی تێدا بوون:**

**یەکەم**: خاکەکە ژێرو زەبەر کرا، بەم جۆرە زەوییەکەیان هەڵکەندراو تا نزیکی ئاسمان بەرزکرایەوەو ئەمجار کوترایەوە بەزەویدا.

**دووەم:** ئەم هەڵکەندنو بەردانەوە لەو خاکەدا رویدا: بەبێ ئەوەی گوندو شارەکانی جیرانیان تۆزێك جوڵەیان پێ بکەوێ.

ئەمجار زیان نەگەیشتن بەلوطو هاوەڵانی هەرچەندە لەو شوێنە نزیك بوون ئەمەش موعجیزەیەکی ترە.

که دەفەرموێ: ﴿وَمَا هِيَ مِنْ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ﴾ هەندێ لەرافەکەران پێیان وایە: مەبەست بە(الظالمين) گەلی لوطە واتە: ئەو عەزابە بەشێوەیەك بوو گەلی لوطی هەڵە نەکردو یەکسەر پێکای.

لەلایەکی ترەوە ئەو عەزابەو بەو شێوە، پەندو عیبرەتە بۆ هەموو ستەمکارێك لەدانیشتوانی مەککەو شوێنی تریش.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: (سيكون في آخر أمتي قوم يكتفى رجالهم بالرجال، ونساؤهم بالنساء، فاذا كان ذلك فارتقبوا عذاب لوط، أن يرسل الله عليهم حجارة من سجيل) ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەی خوێندەوە ﴿وَمَا هِيَ مِنْ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ﴾!!.

## چیرۆکی حەزرەتی شوعەیب عليه السلام

﴿ ۞ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ وَلَا تَنقُصُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ ۚ إِنِّىٓ أَرَىٰكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ

مُّحِيطٍ ﴿٨٤﴾ وَيَٰقَوۡمِ أَوۡفُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَ
بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي
ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُم
مُّؤۡمِنِينَۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ ﴿٨٦﴾ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ
أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ أَن نَّتۡرُكَ مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ
فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾ قَالَ
يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا
حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ
أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ
تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾ وَيَٰقَوۡمِ لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شِقَاقِيٓ أَن
يُصِيبَكُم مِّثۡلُ مَآ أَصَابَ قَوۡمَ نُوحٍ أَوۡ قَوۡمَ هُودٍ أَوۡ قَوۡمَ صَٰلِحٖۚ
وَمَا قَوۡمُ لُوطٖ مِّنكُم بِبَعِيدٖ ﴿٨٩﴾ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ

ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٞ وَدُودٞ ﴿٩٠﴾ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ مَا
نَفۡقَهُ كَثِيرٗا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفٗاۖ وَلَوۡلَا رَهۡطُكَ
لَرَجَمۡنَٰكَۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡنَا بِعَزِيزٖ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَهۡطِيٓ أَعَزُّ
عَلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَٱتَّخَذۡتُمُوهُ وَرَآءَكُمۡ ظِهۡرِيًّاۖ إِنَّ رَبِّي بِمَا
تَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿٩٢﴾ وَيَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي
عَٰمِلٞۖ سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ وَمَنۡ
هُوَ كَٰذِبٞۖ وَٱرۡتَقِبُوٓاْ إِنِّي مَعَكُمۡ رَقِيبٞ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا جَآءَ
أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا شُعَيۡبٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَأَخَذَتِ
ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٩٤﴾ كَأَن
لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّمَدۡيَنَ كَمَا بَعِدَتۡ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾

**ئەمە چیرۆکی شەشەمە لەو چیرۆکانەی لەم سورەتەدا باسکراون. ئەم چیرۆکە لەوە پێش لەسورەتی (الأعراف)دا بەشێوەیەکی تر باسکراوە، لەهەر دوو شوێنەکەدا ئەحکامو یاسای تایبەتی لەخۆ گرتوون؛ بەبێ ئەوەی دژایەتیو ئیختلافی لەناوەرۆکی چیرۆکەکەدا پەیدا کردبێ. چیرۆکەکە لێرەدا ئەوەی لەخۆ**

گرتووە: کە حەزرەتی شوعەیب پەیامی خۆی بەگەلەکەی گەیاندو موناقەشەی لەگەڵ کردنو رەدی دانەوە، پاشان هەڕەشەی بەهاتنی عەزاب بۆ سەریان لێ کردن، عەزابەکەش هاتو سەرپێچیکارانی لەناو بردو موسوڵمانەکانیش رزگاریان بوو.

مەدیەن: ناوی شارێکە کەوتۆتە نێوان وڵاتی حیجازو وڵاتی شام نزیك شاری (معان). دەڵێن: مەدیەنی کوڕی ئیبراهیم دروستی کردوە. دەفەرموێ: ﴿وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْباً﴾ ناردمان بۆ سەر دانیشتوانی شاری مەدیەن برای خۆیان لەنەسەبدا: شوعەیب. کە لەبەرێزترین بنەماڵەو خانەوادەی ئەو گەلەبوو. کردمان بەپێغەمبەرو رەوانەمان کرد بۆ سەریان تا پەیامی خودایان پێ بگەیەنێ.

کە هاتە سەریان بانگەوازی کردن: ﴿قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ﴾ وتی: ئەی گەلو هۆزەکەم! عیبادەتی خودا بکەن، بەس ئەو بپەرستن، هاوەڵی بۆ دامەنێن، جگە لەخودای پەروەردگار هیچ شتێکی تر نیە شیاوی خودایەتی بێ، هەر ئەو خودای ئێوەیەو خودای ترتان نیە.

ئەمە دابو نەرێتی پێغەمبەرانە سەرەتا بانگەوازی بۆ یەکتاپەرستی دەکەن، چونکە یەکتاپەرستی بنەمای سەرەکی ئیمانو باوەڕە، ئەمجار بەگوێرەی پێویستو گرنگی فەرمانو جڵەوگیرییان ئاراستە دەکەن، بۆیە حەزرەتی شوعەیب دوا بەدوا فەرمان بەیەکتاپەرستی، جڵەوگیری لێ کردن لەتەرازوبازیو دزیو فزی لەکێشانو پێواندا، چونکە دانیشتوانی شاری مەدیەن خوویان بەو دیاردە ناشرینەوە گرتبوو ﴿وَلَا تَنقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ﴾ کە دەپێونو دەکێشن بۆ خەڵك دزی تێدا مەکەن، بەتەواوی حەقی خۆیان بدەنێ، تەرازوبازیو فسناغ چووکی مەکەن، واز لەم دابو نەرێتە ناشرینەتان بێنن، چ بفرۆشن چ بکڕن ئامێری پێوانەو کێشانەتان تەواو بێو کەمو کوڕی تێدا مەکەن!

﴿إِنِّي أَرَاكُمْ بِخَيْرٍ﴾ ئەوە دەتان بینم خاوەن رزقو رۆزی زۆرو زەبەندەن۔ هیچ پێویستیتان بەم دزیو گزییە نیە، حەوێجەتان بەخواردنی ماڵی خەڵك نیە بەبەتاڵ!

﴿وَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُحِيطٍ﴾ ئەمن ترسی ئەوەم هەیە کە بەهۆی سەرپێچی کردنتان بۆ فەرمانی خودا ئەو نازو نیعمەتەتان لێ بسەندرێتەوە. هەروەها دەترسم عەزابێکی سەختو دژوار دەورەتان بداو تێکتانەوە پێچێو کەستان رزگاری نەبێ، یان عەزابی ریشەکێشتان دێتە سەرو دەورەتان دەدا، یان عەزابی دۆزەخ لەقیامەتدا.

﴿وَيَا قَوْمِ أَوْفُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ﴾ ئەی گەلو هۆزەکەم! پێوانەو کێشانەتان دادپەروەرانە بێ، زیادو کەمی تێدا مەکەن، بەتەواوی مافی خەڵکی بدەن، هەڵبەتە ئەگەر مافی خەڵك بدەی بەتەواوی پێویستە تۆزێ زیادیەکی بخەیە سەری، ئەمەیان فەیناکا بەڵکوو پێویستە.

ئەمجار جڵەوگیرییان لێ دەکا لەوەی کە کەمو کوڕی لەهیچ شتێکدا نەکەن. دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ﴾ واتە: خۆتان بپارێزن: کە ستەمو ناحەقی بکەن لەمافی خەڵکدا رەخنە لەکاڵای خەڵك مەگرن لەنرخی دامەشکێنن بۆ ئەوەی بەبەهای کەم لێیان بکڕن، ئەمەش دابو نەریتێکی ناشیرینو ناپەسەندە!

﴿وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ هەوڵ مەدەن بەئەنقەست بەرژەوەندی دینو دونیای ئادەمیزادان تێك بدەن، ئەخلاقو رەوشتی خەڵك فاسید مەکەن، چەتەییو رێگری مەکەن، واتە: کاروباری خەڵك پەك مەخەن بەمەبەستی ئیفسادو زیانگەیاندن بەئادەمیزاد. بەڵام بڕێ کارو کردەوە هەن بەرواڵەت بەئیفساد دادەنرێن وەلێ لەراستیدا بۆ ئیصلاحو بەرژەوەندی دەکرێن: وەکوو بڕینی دارستانو بەرەڵڵا کردنی بەنداوو سوتاندنی دارستانو جەنگەڵستان لەکاتی جەنگو شەڕو هەرادا ئەم جۆرە کارانە ناچنە خانەی ئیفسادەوە چونکە

بەئەنقەست بەمەبەستی پەکخستنو ئیفساد ئەنجام نادرێن بەڵکوو بۆ بەرژەوەندی گەلو وڵاتە، یان وادەبێ بەهەڵە کارێکی ئیفسادئامێز ئەنجام دەدرێ ئەمەش ناچێتە چوار چێوەی چڵەوگیری ئایەتەکەوە..

﴿بَقِيَّةُ اللَّهِ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ ئەوەی بۆتان دەمێنێتەوە لەقازانجو سوودی حەڵاڵ، دوای گۆڕینەوەو فرۆشتنی کاڵاکانتان بەپێوانەو کێشانەی تەواوو رێکو پێکو دادوەرانە ئەوە زۆر باشترە لەو ماڵە حەرامەی بەهۆی تەرازووبازیو گزیو فزی لەپێوانەو کێشانەدا یان کردنی فرتو فێڵی تر لەو ماڵەدا دەستتان دەکەوێ.

ئەو قازانجەی لەرێگەی حەڵاڵەوە دەستتان دەکەوێ زۆر پیرۆز ترە، بەمەرجێك ئێوە موسوڵمان بن. چونکە ئیمانو باوەڕ دڵو دەروون لەتەماعو رەزیلی پاك دەکاتەوە، رەوشتی سەخاوەتو هاریکاریو بەخشش لەدەروونەدا دەڕسکێنێ.

﴿وَمَا أَنَا عَلَيْكُمْ بِحَفِيظٍ﴾ من چاودێرو رەقیب نیم بەسەر کردەوەکانتانەوە، ناتوانم مەنعتان بکەم لەکردنی ئەو کارە ناشرینانەتان! بەڵکوو من ئامۆژگاریتان دەکەمو نەسیحەتکارێکی ئەمینم بۆتان، کاری خێر ئامێزو خودا پەسند بکەن، دڵسۆزانە بۆ خودا ئەنجامیان بدەن نەك بۆ ریابازیو رووپامایی!

ئەمن بەس راگەیاندنم لەسەرەو حیسابو لێکۆڵینەوە لەسەر کردارو گوفتارتان لای خودایە.

ئەمجار پەروەردگار باسی هەڵوێستو رەتدانەوەی دانیشتوانی مەدیەن بۆ شوعەیب دەکاو دەفەرموێ:

﴿قَالُوا يَا شُعَيْبُ أَصَلاتُكَ تَأْمُرُكَ أَنْ نَتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا ؟﴾ وتیان: ئەی شوعەیب! ئەوە نوێژەکەت فەرمانت پێ دەکا کە ئێمە واز لەشێوە عیبادەتکردنی باوکو باپیری خۆمان بێنینو چیدی بتپەرستی نەکەین؟

ئەم قسانەیان بەشێوەی گاڵتەپێکردنو لاقرتێ ئاڕاستەکردنو ئەوەشیان ڕاگەیاند: کە ئەوان سوورن لەسەر شێوە عیبادەتکردنی ڕابوردویانو واز لەعیبادەتی بتەکانیان ناهێنن!

وەکوو ڕایوایەت کراوە حەزرەتی شوعەیب زۆری نوێژ دەکرد تەنانەت ئەو گەلە ناپەسندەی هەر کە بیاندیایە نوێژ دەکا پێی پێدەکەنینو گاڵتەیان پێ دەکردو دەیانکردە فیشقیاتو قڕیوەو پێکەنین.

﴿أَوْ أَنْ نَفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاءُ ؟﴾ ئایا نوێژەکەت فەرمانت پێ دەکا: کە ئێمە بەئارەزۆی خۆمان لەماڵو سامانی خۆماندا نەتوانین ئەوەی دەمانەوێ بیکەین؟ ئەوە نوێژەکەت فەرمانت پێ دەکا: کە ئێمە بەئازادیو سەربەستی تەصەروف لەماڵو سامانی خۆماندا نەکەین. مەبەست ئەوەیە: دەڵێن: ئێمە سەربەستو ئازادین لەماڵو سامانی خۆماندا، چۆنی ڕەدام بێنین کەیفی خۆمانە، زەکات نادەین، تەرازوبازی دەکەین، ماڵی خۆمان لەرێگەی خێردا نابەخشین، بەهەر وەسیلەو هۆیەک بێ دەمانەوێ ماڵو سامانی خۆمان زۆر بکەین، ئەوەی کە تۆ فەرمانمان پێ دەکەی لەوازهێنان لەتەرازوبازیو فرتو فێڵ لەمامەڵەدا پێچەوانەی سیاسەتی ماڵ کۆکرنەوەو ماڵ زۆر کردنە، ئەوەی کە تۆ دەیڵێی: دەست بەستنی ئێمەیەو داگیرکردنی حوریەتو ئازادی هەڵسو کەوتمانە.

**بەکورتی ڕەددانەوەیان لەسەر شوعەیب دوو لایەنی سەرەکی لەخۆ گرتبوو:**

**یەکەم**: سوور بوونیان لەسەر پابەند بوون بەئایینی باوکو باپیرانیانەوەو بەردەوام بوونیان لەسەر بتپەرستی!

**دووەم**: تەماعو هەڵپەکردنیان بۆ کۆکردنەوەی ماڵو سامان بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەوە ئاخۆ لەرێگەی حەڵاڵو رەواوە بەدەستی دێنن یان لەرێگەی حەرامەوە!

ئەمجار جەختیان لەسەر گاڵتەپێکردنەکەیان کردەوەو وتیان: ﴿إِنَّكَ لأَنْتَ الْحَلِيمُ الرَّشِيدُ﴾ بەراستی ماشا ئەڵڵا تۆ لەم وڵاتەدا پیاوێکی خاوەن عەقڵو فامی! وا دیارە هەر تۆ خاوەنی ماریفەتو هیدایەتی! ماشا ئەڵڵا پیاوێکی زەریفو هۆشمەندی، دەتەوێ ئیصلاحی مەعنەویاتو مادیاتی ئێمە بکەی! مەبەستیان ئەوە بوو: وەصفی بکەن بەپێچەوانەی ئەو رەوشتانە. وەکوو چۆن بەتەوسەوە بەپیاوی بەخیل دەڵێی ماشا ئەڵڵا ئەگەر حاتەمی طائی تۆی ببینیایە چاوی لێ دەکردی‌و شوێنیت دەکەوت!!

ئەمجار حەزرەتی شوعەیب کەوتە گفتو گۆ لەگەڵیاندا، بەنەرمی مەوعیظەی حەسەنەی کردن ﴿قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كُنتُ عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّي﴾ وتی: ئەی گەلو هۆزەکەم! شتێکی ئاشکراو بەڵگە نەویستە: کە هەر کەسێ بیەوێ قسەی ببیسترێ دەبێ بەڵگەی راستی بەدەستەوە بێو مەبەستی پاك بێ، دەی وەرن پێم بڵێن: ئەگەر من لەم بانگەوازییەمدا لەخوداوە بەڵگەو دەلیلی راستم بەدەستەوە بێ، رێبازێکی مەعقوولو خودا پەسەندم گرتبێ، نیگاو سروشم لەخوداوە بۆ هاتبێ!

﴿وَرَزَقَنِي مِنْهُ رِزْقاً حَسَناً﴾ ئەو خودا گەورەو بەرەحمە بەفەضلی خۆی رزقێکی جوانی گیانی پێدابم، منی کردبێ بەپێغەمبەر، حیکمەتو زانیاری فێر کردبم، ئەوەندەشی رزقو رۆزی‌و بژێو پێ دابم: کە پێر کیشی تەرازوبازی نەکەمو ماڵی خەڵك بەتاڵان نەخۆمو داوای دارای لەکەس نەکەم، دەی پێم بڵێن: ئەگەر من لەسەر یەقین بم لەخوداوە، بەراستی پێغەمبەر بم!! ئایا رەوایە: کە فەرمانتان پێ نەکەم بەخودا پەرستی؟ ئایا دەگونجێ من جڵەوگیریتان لێ نەکەم لەبتپەرستی؟ ئایا نابێ مەنعتان بکەم لەتاوانو ستەمکاری‌و تەرازو بازی؟

ئایا پێغەمبەران بۆ گەیاندنی ئەم ئەرکانە رەوانە نەکراون؟ ئایا: کە من پێغەمبەر بم نابێ ئەو فەرمانو جڵەو گیرییانەی پەروەردگارتان پێ بگەیەنم؟! وەڵامی پرسیارەکان حەزف کراوە!! چونکە پرسیارەکان پرسیاری تەقریر ئامێزن!

﴿وَمَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَى مَا أَنْهَاكُمْ﴾ ئەمن نامەوێ جڵەوگیریتان لەشتێك لێ بکەمو بۆ خۆم پابەندی نەبم، بەڵکوو ئەوەی بەئێوەی دەڵێم: بۆ خۆم بەعەمەلی ئەنجامی دەدەم.

ئەمجار بەچەند وشەیەکی کورت جەخت لەسەر ئەو شتانە دەکاتەوە: کە ئەرکی سەرشانی خۆیەتی دەفەرموێ: ﴿عَنْهُ إِنْ أُرِيدُ إِلاَّ الإِصْلاحَ مَا اسْتَطَعْتُ﴾ ئەمن بەم نەسیحەتو ئامۆژگارییانەم، بەم فەرمان بەچاکەو جڵەوگیرییانەم لەخراپە، مەبەستم ئەوەیە ئێوە ئیصلاح بکەم، چەندێك بتوانم ئێوە بخەمە سەر رێبازی راستو دروست، بەمەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکا: کە عاقڵو لێزانو کاراماو داناو زانایە، ئەوان بەهەڵە لێی تێگەیشتوون!

﴿وَمَا تَوْفِيقِي إِلاَّ بِاللَّهِ﴾ تۆفیقو سەرکەوتنم لەئەنجامدانی ئەرکی سەرشانم بەیارمەتیدانی خودایەو ئەو هیدایەتدەرو پشتیوانم نەبێ هیچم بۆ ناکرێ، من لەهەموو کارێکمدا (کە برێکی راگەیاندنی پەیامەکەمە) پشتیوانم هەر بەخودایەو بەس. چونکە من ﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾ پشتیوانم هەر بەخودایەو بۆ ئەنجامدانی هەموو کارێکم بۆ گەیاندنی پەیامی ئاسمانیم، ئەگەر یارمەتیو کۆمەکی خودا نەبێ هیچم بۆ ناکرێ، هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێمەوە.

بەکورتی من نە بەتەمای ئەجرو پاداشی ئێوەم، نە ترسیشم لەوە هەیە زیانم پێ بگەیەنن. من لەسەر بیرو باوەڕو پەیامی خۆم بەردەوامو سورم، بەهیچ شێوەیەك دەست بەرداری نابم.

﴿وَيَا قَوْمِ لا يَجْرِمَنَّكُمْ شِقَاقِي أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَ قَوْمَ نُوحٍ أَوْ قَوْمَ هُـودٍ أَوْ قَوْمَ صَالِحٍ﴾ ئەی گەلو نەتەوەکەم! تکام لێتان ئەوەیە: کە ناکۆکیتان لەگەڵ منو ناحەزیتان بۆ من واتان لێ نەکا ئێوە لەسەر کافریی خۆتان سووربن، با دژایەتیکردنتان بۆ من هەڵتان نەنێ بۆ ئەوەی بەردەوام بن لەسەر سەرپێچی فەرمانی خوداو دزیو تەرازوبازیو ئەمجار بەسۆنگەی ئەو سور بوونەتان لەسەر کوفرو بێدینی، ئەو عەزابو بەڵایانەی بەسەر گەلی نووحو گەلی هودو گەلی صالح هات بەسەر ئێوەش بێ! ئێوەش ئاوا ریشەکێش بکرێن!!

﴿وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِنْكُمْ بِبَعِيدٍ﴾ خۆ ئەوەی بەسەر قەومی لوط هات لەئێوە دوور نیە؛ نەمێژووەکەی زۆر کۆن بووە، نەشوێنەکەشی لەنیشتمانی ئێوە دوورە، ئەگەر پەندو عیبرەت لەگەڵە لەناوچووە پێشینەکان وەرناگرن دە لەقەومی لوط پەند وەربگرنو تەمبێ بن!

دەشگونجێ مانای ئەم رستەیە بەم جۆرە بێ: خۆ ئێوە لەکوفرو بێدینی لەقەومی لوط دوور نین، کوفرو بێدینی ئێوەش گەیشتۆتە ئاستی کوفرو سەرپێچی ئەوان، کەوابێ بترسن کە هەمان شێوە عەزاب بۆ ئێوەش بێ.

﴿وَاسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ﴾ داوای لێخۆشبوون لەخودای خۆتان بکەن لەو تاوانانەی ئەنجامتان داوەو تا ئێستاش بەردەوامو سوورن لەسەری، ئەمجار تۆبەیەکی نەصووح بکەنو بگەڕێنەوە بۆ لای خوداو پابەندی فەرمانو نەهیەکانی بنو خۆتان بەنەو بسپێرن ﴿إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ﴾ بێگومان خودای من بەرەحمو میهرەبانە بۆ ئەوانەی تۆبە دەکەنو دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو، ئەو کەسانەی خۆش دەوێن کە تۆبەکارن، رەحمەتو بەخششی زۆرە بۆ تەوبەکاران.

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە تۆبەو ئیستیغفار گوناح هەڵدەوەرێنێو دەبنە هۆکار بۆ دەستەبەربوونی خێری دونیاو قیامەت...!

ئەمجار دوای ئەوەی کە ئامۆژگاری کەڵکی نەبوو موجادەلەو موفاوەضەو دانو سان هیچیان لێ شین نەبوو، خەڵکەکە دەستیان کرد: بەسوکایەتی کردن بەحەزرەتی شوعەیبو پەیامەکەی، هەڕەشەیان لێ کرد، بوختانو شتی ناشرینیان وەپاڵ دا، ﴿قَالُوا يَا شُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيراً مِمَّا تَقُولُ﴾ وتیان: ئەی شوعەیب! بەراستی ئێمە لەزۆر لەو شتانەی دەیانلێی حاڵی نابین، هەرچەند ورد دەبینەوە، لەمانای یەکتاپەرستیو وازهێنان لەپەرستنی بتەکانمان حاڵی نابین، ئەو ئایینەی تۆ بۆمان شی دەکەیەوە ناچێتە دڵمانەوە. هەروەها لەوەش حاڵی نابین کە ئێمە پایەمان لەئاستی پایەی خەڵك دابێ، هەرچی بۆ ئێمە ڕەوابێ بۆ کەسانی دیکەش ڕەوا بێ، بەڵکوو ئێمە گەلی هەڵبژاردەینو هەرچی پێویست بێ بۆخۆمان بەرەوای دەزانین! ئیتر تۆ ئەم قسە پڕوپوچانە چیە دەیانکەیو بۆچی وازمان لێ ناهێنی؟!

﴿وَإِنَّا لَنَرَاكَ فِينَا ضَعِيفاً﴾ ئێمە کە سەیری تۆ دەکەین، تۆ بەهاوشانی خۆمان نازانین، پلەو پایەت زۆر لەخوار هی ئێمەوەیە، دەی چۆن تەماعی ئەوەمان لێ دەکەی کە تۆ بەرەهبەرو پێشەوای خۆمان دابنێینو بەئارەزۆی تۆ ڕەفتار بکەین؟ ﴿وَلَوْلا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَاكَ﴾ ئەگەر لەبەر دڵڕاگرتنی خزمو کەسو کارو عەشیرەتەکەت نەبوایە: کە نامانەوێ دڵیان بشکێنین، شاربەدەرمان دەکردیو نەماندەهێشت لەم وڵاتەدا دانیشی! چونکە تۆ بۆ خۆت لای ئێمە هیچ ڕێزو نرخێکت نیە، ﴿وَمَا أَنْتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ﴾ تۆ هیچ دەسەڵاتو هێزێکت نیە لەئێمە یاخی ببی، کوشتنو ئەزیەتدانت زۆر ئاسانە!

ئاوا بەو جۆرە حەزرەتی شوعەیب بەڵگەی بۆ دەهێنانەوەو بەو شێوە نەرمیو دڵسۆزییە ئامۆژگاری دەکردن، کەچی ئەوان بەتوانجو بەهەڕەشەو قسەی نابەجێ وەڵامیان دایەوە!

بۆیە حەزرەتی شوعەیب سەرزەنشتی کردنو لۆمەو تەوبیخی ئاراستە کردن لەسەر ئەو هەموو بێ عەقڵیو نەفامییەیان، دەفەرموێ: ﴿قَالَ يَا قَوْمِ أَرَهْطِي أَعَزُّ

عَلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ ؟﴾ ئەی گەلو هۆزەکەم! ئەوە ئێوە بۆچی ئەوەندە نەفامو تێنەگەیشتوون؟ ئایا خزمو کەسو کارم لای ئێوە لەخودا عەزیز ترەو ئەوانتان لەلا لەخودا رێزدار ترە؟! کە زیانم پێ ناگەیەنن لەبەر خاتری خزمەکانمە، نەك لەبەر خاتری خودا؟! بەراستی جێگای سەرسوڕمانو پێکەنینە!

خودا شیاوی ئەوەیە: پابەندی فەرمانەکانی بن، رێزی بگرن بەندایەتی بکەن، هەوڵ بدەن رەزامەندی ئەو بەدەست بێنن، کەچی ئێوە ئەوەندە نەفامن چەند کەسێکی خزمو کەسو کارەکەمتان لەخودا بەلاوە عەزیزترەو ﴿وَاتَّخَذْتُمُوهُ وَرَاءَكُمْ ظِهْرِيًّا﴾ خودای پەروەردگارتان پاشگوێ خستووە، لایەنی خوداتان بەرداوە، خستوتانەتە پاش خۆتانەوە وەکوو شتێکی بێ نرخ، نەئیطاعەی دەکەن، نەرێزی دەگرن، نەلەعەزابو تۆڵەی دەترسن، نەسوپاسی نازو نیعمەتی دەکەن، تەنانەت ئەوەتا بەدەمی خۆتان دەڵێن: ئێمە کە بەردەبارانت ناکەین لەبەر خاتری خزمەکانتە نەك لەبەر خاتری خودا!.. ﴿إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ خودای من بەو هەڵوێستو کردەوانەتان ئاگادارە، دەزانێ چی دەکەنو چی دەڵێنو هەڵوێستتان چیەو هیچی لێ گووم نابێ، پڕاو پڕ عادڵانە سزاتان دەداتەوە.!!

جا کە شوعەیب نائومێد بوو لەئیمانهێنانیانو زانی بەهیچ جۆرێك بەپیر بانەوازییەکەیەوە نایەن، هەڵوێستێکی یەکلاکەرەوەی راگەیاندو خۆی لێ جیا کردنەوە، وتی: ﴿وَيَا قَوْمِ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ﴾ ئەی گەلو نەتەوەکەم! مادام کە باوەڕم پێ ناکەنو شوێنم ناکەون، دە ئێوە بەگوێرەی تواناو بیرو باوەڕی خۆتان کار بکەن، چیتان لەدەس دێ دەربارەی زیان پێ گەیاندنم، تەقصیری مەکەن! بۆ خۆتان سوور بن لەسەر کوفرو بێدینیو تەرازوو بازی خۆتانو باقی کارە ناشرینو نەشیاوەکانتان! ﴿إِنِّي عَامِلٌ﴾ ئەمنیش بەگوێرەی بیرو باوەڕی خۆمو بەگوێرەی تەئییدو پشتیوانی خودا بۆخۆم کار دەکەم.

بەکورتی: ئێوە لەسەر کوفرو گومڕایی خۆتان بەردەوام بن، منیش بەردەوام دەبم لەسەر بانگەوازی‌و بتمانە بوونم بەخودا، ﴿سَوْفَ تَعْلَمُونَ مَنْ يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَمَنْ هُوَ كَاذِبٌ﴾ لەوە بەولاوە بۆتان دەردەکەوێ‌و دەزانن: کێ سزای ریسواکەری بۆ دێ‌و یەخەی دەگرێ‌و زەلیل‌و داماوی دەکا لەدونیاو قیامەتدا؟ دەزانن: کێ درۆزنەو کێ راستە لەقسەو گوتاریدا، من یان ئێوە؟!

﴿وَارْتَقِبُوا إِنِّي مَعَكُمْ رَقِيبٌ﴾ چاوەڕوانی ئەوە بن: کە پێتان دەڵێم: دەربارەی هاتنی عەزاب، منیش لەگەڵتاندا چاوەڕوانی دەکەم!

ئیتر لێرەدا پەردە بەسەر نمایشەکەدا دادەتەوەو نیشانەی لێك دابڕان‌و جودا بوونەوەی حەق‌و بەتاڵ دەردەکەوێ، با چاوەڕوان بین بزانین چی رو دەدا؟! ئەوەتا: لەپڕێکا دوا بەدوای مەشهەدی پێشوو پەردە لەسەر نمایشێکی تر هەڵدەدرێتەوە. چی دەبینین؟ بەهیلاکچوونی گەلەکەی شوعەیب، هەموو ئەو خەڵکە لاڵ‌و پاڵ کەوتوون، بەهەمان شێوە عەزاب‌و صاعیقەی گەلی (صالح) پێغەمبەری لەناوبردن، ئەمانیشی خستە ناو توونی دۆزەخی عەزابی یەزدانییەوە، سەرەنجامی ئەمانیش وەکوو ئاکامی گەلی صالح وابوو، ولاتو شارو دێهاتیان لێ چۆڵ بوو، هەروەکوو نەبووبن، هەروەکوو لەوەپێش رۆژێك لەرۆژان ولاتیان ئاوەدان نەکردبێتەوە، دونیایان بەجێ هێشت بەباری لەعنەتو نەفرینەوە، لاپەڕەی ژیانیان پێچرایەوەو لەبیر چوونەوە.

دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْباً وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِنَّا﴾ کاتێك فەرمانی ئێمە بەسزادانی گەلی شوعەیب دەرچوو ئەمرەکەمان دەربارەیان تەنفیذ کرا، شوعەیب‌و موسوڵمانانی شوێنکەوتوویمان رزگار کردن، بەرەحمەتو میهرەبانی خۆمان پێغەمبەرو شوێنکەوتوانیمان لەو عەزاب‌و مەینەتییە قوتار کرد، ﴿وَأَخَذَتْ الَّذِينَ ظَلَمُوا الصَّيْحَةُ﴾ گرمەو صاعیقەی مەرگ ئاوەر یەخەی ئەوانەی گرت کە ستەمکار بوون‌و بەپیر بانگەوازییەکەی شوعەیبەوە نەچوون‌و ئامۆژگاری‌و

نەسیحەتەکانی بەگوێیاندا نەچوو، بەهۆی ستەمو کوفرو خراپەکارییانەوە دەنگێکی گەورەو سامناکو ریشەکێشکەر؛ کە دونیای لێ وەلەرزە هێنانو لەناوی بردن، لەماوەیەکی کەمدا هەموویانی خپ کردن ﴿فَأَصْبَحُوا فِي دِيَارِهِمْ جَاثِمِينَ﴾ هەر کەسە لەماڵو حاڵی خۆیدا، لەشوێنو نیشتمەنی خۆیان بەرەو دەم سەرمنگری بوونو جوڵەیان لێ برا!

ئوسلوبو شێوازی قورئان دەربارەی چۆنیەتی عەزابەکەیان جیاوازی هەیە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، لەهەر سورەتێکدا بەگوێرەی سەرپێچیو خراپەکارییان جۆری عەزابەکە دەستنیشان کراوە لەسوورەتی (الأعراف)دا گەلەکە هەڕەشەیان لەشوعەیب کرد بەوە: ئەگەر واز نەهێنێ خۆیو شوێنکەوتوانی لەشار وەدەرنێن، لەوێدا جۆری عەزابەکەی بە(الرجفة) دەست نیشان کردوە. لێرەدا گەلەکە بێ ئەدەبییان لەگەڵ شوعەیب کردو هەڕەشەی ناشیرینیان بەرامبەر نواندو هەڵوێستی نالەباریان نیشان دان، بۆیە لێرەدا جۆری عەزابەکەی بە(الصیحة) ناو هێناوە.

لەسورەتی (الشعراء)دا خەڵکەکە داوای بەربوونەوەی پارچەیەك لەئاسمانیان کرد: کە بکەوێ بەسەریاندا، بۆیە جۆری عەزابەکەی بە(عذاب یوم الظلة) ناو هێنا.

بەڵێ بەجۆرێك ئەو نەتەوە کرکەوتنو ئاسەواریان بڕایەوەو لەناوچوون ﴿كَأَنْ لَمْ يَغْنَوْا فِيهَا﴾ هەر دەڵێی لەنیشتمانی خۆیاندا رۆژێك لەرۆژان نەبوونو نەژیاونو بەخۆشی رایان نەبواردوە، لەوەپێش جمو جۆڵو هەڵپەی ژیانیان نەبوە!! ﴿أَلا بُعْداً لِمَدْيَنَ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ﴾ دەك بەفتارە بچن دووریی لەرەحمەتو میهرەبانی خودا بۆ دانیشتوانی مەدیەن بێ، وەکوو چۆن لەوەپێش گەلی ثەموود لەرەحمەتو میهرەبانی خودا دوور خرانەوەو بەهیلاك چوونو فەوتان!

گەلی مەدیەن دراوسێی گەلی ثەموود بوون، وەكوو ئەوان كافرو سەر رەقو بێدین بوون هەردوو نەتەوە بەرەچەڵەك عەرەب بوون ئێستا پێیان دەگوترێ: عەرەبی بائیدة، واتە: عەرەبە لەناو براوەكان!

شایانی باسە هەردوو گەل بەدەنگی گەورەی زەمینلەرزە لەناو چوون.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پەروەردگار هیچ كاتێ دوو گەلی بەیەك شێوە عەزاب لەناو نەبردوە جگە لەگەلی (صالح)و گەلی (شوعەیب)، گەلی صالح گرمەو صاعیقە لەژێریانەوە پەیدا بوو لەناوی بردن، گەلی شوعەیب لەسەرویانەوە بۆیان هاتو لەناوی بردن.

## چیرۆكی موسا لەگەڵ فیرعەونو پیاو ماقولانیدا

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٩٦﴾ إِلَىٰ
فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَٱتَّبَعُوٓاْ أَمْرَ فِرْعَوْنَ ۖ وَمَآ أَمْرُ فِرْعَوْنَ
بِرَشِيدٍ ﴿٩٧﴾ يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ ۖ
وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ ٱلْمَوْرُودُ ﴿٩٨﴾ وَأُتْبِعُواْ فِى هَٰذِهِۦ لَعْنَةً وَيَوْمَ
ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ بِئْسَ ٱلرِّفْدُ ٱلْمَرْفُودُ ﴿٩٩﴾ ﴾

ئەمە چیرۆكی حەوتەمە لەو چیرۆكانەی پەروەردگار لەم سورەتەدا گێڕاونیەوە، دوا چیرۆكی ئەم سورەتەشە!

بێگومان سەرگورشتەی حەزرەتی موسا (عليه السلام) لەگەڵ فيرعەونو دارو دەستەکەیدا لەزۆر شوێنی قورئاندا باس کراوە: لەسورەتی (الأعراف/١٠٤-١٠٥)و لەسورەتی (الشعراء/١٧-٢٨)و سورەتی (طه/٤٨-٥٥)و سورەتی (القصص/٣٨)و سورەتی (غافر/٣٦-٣٧) ئەم چیرۆکە بەشێوەی جیا جیا بەکورتی یان بەدرێژی هێندراوە.

مەبەست لەدووبارە بوونەوەو سێ بارە بوونەوەی ئەم چیرۆکە عیبرەت وەرگرتنو تەمێ خواردوییە لەسەرەنجامی ئەم چیرۆکە: کە رزگاربوونی حەزرەتی موساو شوێنکەوتوانیەتیو لەناوچونی فيرعەونو دارو دەستەکەیەتی، وێڕای لەناوچوون، نەفرینو دوور لەرەحمەتی خوداو عەزابی سەختی دۆزەخە، کە ئەوەش چارەنووسی هەموو کافرو ملهوڕو ستەمکارو خودا نەناسانی رۆژگارە؛ ئەوانەی پشتیان لەبانگەوازی پێغەمبەرانی خودا هەڵکردوە، بەپیر بانگەوازییەکەیانەوە نەچوون، شایانی باسە عەزابی نێردراو بۆ سەر فيرعەونو دارو دەستەکەی، خنکان بوو لەناو دەریاداو هەموو کەسی ئەو گەلەی نەگرتەوە.

دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُبِينٍ، إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ﴾ سوێند بێ ئێمە موسامان کردە پێغەمبەرو رەوانەمان کرد بەبەڵگەو نیشانەی ئاشکراوە بۆ سەر فيرعەونو دارو دەستەکەی، ئایەتەکان نۆ موعجیزەی ئاشکراو نومایان بوون، نیشانەی تاکو تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتی موسا بوون.

جا هەر چەندە موسا بۆ سەر هەموو گەلی فيرعەون (بەقیبطیء بەنو ئیسرائیلییەوە) نێردراوەو بانگەوازییەکەی بۆ هەموان بووە وەلێ چونکە فيرعەونو تاقمەکەی ئەهلی حیللو عەقد بوون، بۆیە لێرەدا بەتایبەتی ناوی ئەوان هێندراوەو رەوانە کردنەکە بۆ لای ئەوان دیاری کراوە، ﴿فَاتَّبَعُوا أَمْرَ فِرْعَوْنَ﴾ واتە: فيرعەون بۆ خۆی بڕوای پێ نەکردو پێی کافر بوو، فەرمانیشی بەدارو دەستەکەی کرد کە بڕوا بەموسا نەکەنو شوێن خۆی (واتە: فيرعەون) بکەون لەکوفرو سەرپێچی فەرمانی خودادا، ئەوانیش شوێن فەرمانی فيرعەون کەوتن، رێبازی

ئەویان پەیڕەو کرد لەگومڕایی‌و سەر لێ شێواویدا، لەستەم کردن لەنەتەوەی ئیسرائیل‌و لەناوبردنی زارۆکە نێرینەکانیان‌و هێشتنەوەی مێینەکانیاندا، لەچەوساندنەوەو ئەزیەتدانیاندا بەهەموو شێوەیەك.

﴿وَمَا أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ﴾ ئیش‌و کاری فیرعەون، پەیڕەوو ڕێبازی‌و هەڵس‌و کەوتو مەنهەجی ژیانی گونجاوو لەبار نەبوو، ڕێبازێکی عاقڵانەو هیدایەت ئامێز نەبوو، بەڵکوو گومڕایی‌و نەزانی‌و نەفامی‌و کوفرو سەرپێچی‌و ستەمو ئاشوب بوو!

جا کە ئەوان شوێنکەوتووی فیرعەون بوون‌و لەدوا ئەوەوە دەرۆیشتن شوێن فەرمان‌و مەنهەجی ئەو کەوتبوون، بەبێ لێ ورد بوونەوەو تێفکرین، بەبێ ئەوەی ڕایەکیان هەبێ کوێرانە دوای کەوتبوون، خۆیانی سووك کردبوو، ڕێزو نرخێك کە خودا پێی دابوون لەخۆیان داڕنیبوو، ئیرادەو عەقڵ‌و ئازادی خۆیان لەدەس دا بوو، کەوابێ سزایان لەقیامەتدا دۆزەخە، دەبێ تۆڵەیان لێ بسەندرێ، لەهەردوو لایان؛ لەفیرعەون‌و لەشوێنکەوتوانیشی ﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ فیرعەون ڕۆژی قیامەت پێش گەلەکەی دەکەوێ، فیرعەون پێشەواو ئەوانیش بەدوویدا، بۆ کوێ؟ ﴿فَأَوْرَدَهُمُ النَّارَ﴾ بەتەئکید دەیانباتە ناو ئاگرەوە، داخڵی دۆزەخ دەبن، ئازاری ئەو عەزابە دەچێژن ﴿وَبِئْسَ الْوِرْدُ الْمَوْرُودُ﴾ خراپ شوێنێکە کە ئەوان دەچنە ناوی، دەچن لەجیاتی ئاوی ساردو فێنك کردنەوەی ناو دەروونیان ئاوی کوڵاتووی بۆگەن دەخۆنەوە، لەجیاتی ئەوەی تێنویەتییان بشکێ بەو ئاوە کوڵاتوە ڕیخۆڵەکانیان پچڕ پچڕ دەبن. ﴿وَأُتْبِعُوا فِي هَذِهِ لَعْنَةً وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ سەرباری ئەو عەزابە سامناکەی دۆزەخ، لەدونیاشدا نەفرینیان لێ دەکرێ لەلایەن ئەو گەل‌و نەتەوانەی کە دوا ئەوان دێنە کۆڕی ژیانەوە، هەروەها ڕۆژی قیامەتیش لەلایەن خوداوە نەفرینیان لێ دەکرێ، لەلایەن فریشتەکانەوە، لەلایەن ئەهلی مەحشەرەوە نەفرینیان لێ دەکرێ، ئەوان واتە: فیرعەون‌و تاقمەکەی قێزلێ کراوو ڕەزا گران‌و ڕیسوا کراون، هەموو کەس نەفرینیان لێ دەکا، ﴿بِئْسَ الرِّفْدُ الْمَرْفُودُ﴾ بەڕاستی خراپ خەڵاتێکە ئەم

نەفرین لێکردنەی دونیاو قیامەت کە پێشکەش ئەوان دەکرێ، نەفرین لێکردنو دوور بوونیان لەرەحمەت ناونراوە (رفد) عەطاو بەخشش بۆ گاڵتەپێکردنو قەشمەریو سوکایەتی پێکردنیان!

## پەندو عیبرەت وەرگرتن لەچیرۆکی گەلە ستەمکارەکان

﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَآئِمٌ
وَحَصِيدٌ ﴿١٠٠﴾ وَمَا ظَلَمْنَـٰهُمْ وَلَـٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ
أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا
جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾ وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ
رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَـٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ
﴿١٠٢﴾ ﴾

پەیوەندی ئەم ئایەتانە بەهی پێشەوە ئاشکراو نومایانە، چونکە پاش ئەوەی پەروەردگار چیرۆکی پێغەمبەرانی پێشووی گێڕایەوە: کە حەوت چیرۆك بوون (چیرۆکی حەزرەتی نوح، هود، صالح، ئیبراهیم، لوط، شوعەیب، موسا (درودی خودا لەسەر هەموویان بێ)) ئەمجار ئاماژە بۆ پەندو ئامۆژگاری ئەو چیرۆکانە دەکا، دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ مِنْ أَنْبَاءِ الْقُرَى نَقُصُّهُ عَلَيْكَ مِنْهَا قَائِمٌ وَحَصِيدٌ﴾.

ئەگەر بەوردی لەو چیرۆکانە ورد بینەوە، فێری ئوسلووبی جەدەلو دانوسان دەبین، ئەم چیرۆکانە ئادەمیزاد فێری پوچانەوەی بەلگە بەبەلگە دەکەن، پشتگیری بەلگەی عەقڵی بەچیرۆکی واقیعی دەکا، خوێنەرو بیسەر ئامادە دەکا بۆ سوود وەرگرتن لەو پەندو عیبرەتانەی لەو چیرۆکانە وەردەگیرێن! بەئەم چیرۆکانە دڵی موسوڵمان نەرم دەبێ، نەفسی پاك دەبێتەوە، ئەندامەکانی ترسی خودایان لێ دەنیشێو رام دەبن بۆ یاد کردنەوەی خوداو بەندایەتی بۆ کردنی، ترسی سزای، گوناحباران وەلەرزە دێنێو دەزانرێ: کە موسوڵمان جیهان بەجێ دێڵێ مەدحو ثەنای دەکرێو رێزدارە، کافر: کە جیهان جێ دێڵێ دەکەوێتە بەر نەفرینی خەڵكو لەقیامەتیشدا نەفرینو عەزابی زۆرو بەئازاری تووش دێ، لەهەمان کاتدا ئەم چیرۆکانە بەلگەن لەسەر راستگۆیی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چونکە ئەگەر لەخوداوە نیگای بۆ نەیە چۆن پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار، پێغەمبەرێك بەدرێژایی ژیانی رابوردووی سەیری کتێبێکی نەکردوە، خوێندگاو قوتابخانەیەکی نەبینیوە، قوتابیەتیو فەقێیەتی کەسی نەکردوە، چۆن ئەو هەواڵانەی زانینو چۆن ئەو چیرۆكو سەرگوزەشتانەی گێرانەوە!

هەڵبەتە گێرانەوەی ئەم چیرۆکانە نیشانەی پێغەمبەرایەتی موحەممەدە (دروودی خودای لەسەر بێ) بەلگەی ئەوەیە: کە قورئان کەلامی خودایەو بەنیگاو سروش بۆ پێغەمبەری ناردوە وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ حَدِيثاً يُفْتَرَى وَلَـكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ...﴾یوسف/١١١.

دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْقُرَى نَقُصُّهُ عَلَيْكَ﴾ ئەم چیرۆکانەی بۆمان گێرایتەوە ئەی موحەممەد! ئەوە برێکن لەهەواڵو سەرگورشتەی ئەو گوندو شارانەی: کە زێرو زەبەرمان کردن، وێرانمان کردن، ئەمانە هەموویان هەواڵی پەنامەکینو بۆت دەگێرینەوە ﴿مِنْهَا قَائِمٌ وَحَصِيدٌ﴾ هەندێ لەو گوندو شارانەی تا ئێستاش ئاسەواریان ماوەو شوێنەواریان دەبیندرێ. هەندێکیشیان ئاسەواریان

نەماوە ئەوە مەیدانی لەناوبردنی گەلە ستەمکارەکانە رادەنوێندرێ، نەفس و خەیاڵ تەنگە تاو دەکا!! هەندێ لەو گەلو نەتەوانە لەنێو شەپۆلی تۆفاندا نوغرۆ بوون، هەندێکیان بەرەشەباو زریان خاکو ولاتیان ژێرو زەبەر کراوە، هەندێکیان بەگرمەو ناڵەی بێ ئامانی دەنگی فریشتەی هێزو توانا پێدراوی لەووزە بەدەر شارو گوندیان وێران کرانو خۆیان سەرەنگرێ کەوتنو خپ بوون. هەندێکیان بەخۆیانو ماڵو حاڵیانەوە بەزەویدا رۆچونو چوونە دەریای نەمانەوە، هەندێکیان لەدەریادا خنکانو هەمیشە نەفرینیان لێ دەکرێو فیرعەون پێشەوایان بوو بۆ دۆزەخ!

ئەمانە چیرۆکو سەربردەی دانیشتوی چەند گوندو شارێك بوون: کە لەسەر دەمی جیا جیادا بەهیلاکمان بردنو بۆتی دەگێرینەوە، لەوەپێش تۆ هیچ زانیارییەکت دەربارەیان نەبوو، ئێمە بەهۆی نیگاو سروشەوە ئەم غەیبە نەزاندراوەت فێر دەکەین، تۆش بۆ گەلەکەتی بخوێنەوە پێیان رابگەیەنە بۆ ئەوەی پەندو عیبرەتی لێ وەربگرن!

هەندێ لەو شارو گوندانەی وێرانمان کردنو دانیشتوانەکانمان لەناوبردوون تا ئێستاش شوێنەوارو کەلاوەکانیان ماون، شایەتی زیندون بۆ هێزو توانای ئەو گەلو نەتەوانەو ئاستی بیناسازییان، سەیری پاشماوەو کەلاوەکانی گەلی عاد لەوەڵاتی ئەحقافو شوێنەواری گەلی ثەموود لەوەڵاتی حیجردا بکەنو پەندی لێ وەربگرن!

هەندێکی تر لەو شارو گوندانە ئاسەواریان نەماوە، دەڵێی کشتو کاڵی دراواوەنو لەسەر زەوی هەڵکەندراونو روی زەوییان لێ پاك کراوەتەوە. وەکوو ئەوەی بەسەر گەلی نوحو گەلی لوط هات، وەڵاتو خانووبەرەیان ئاداری بەسەر پاداریيەوە نەماوەو خۆشیان لەبیر چوونەوە!

﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ﴾ ئێمە کە لەناومان بردنو وەڵاتمان وێران کردن ستەممان لێ نەکردن، بەبێ تاوان ئەوەمان بەسەر نەهێنان ﴿وَلَكِنْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ﴾ بەڵکوو

ئەوان بۆ خۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد.. کە سوور بوون لەسەر کوفرو ستەمکاری خۆیان، بەردەوام بوون لەسەر پەرستنی غەیری پەروەردگار، وازیان لەئاشوبو فیتنە جۆیی نەهێنا، ئامێری هەستی خۆیان لەکار خست، پشتیان لەهیدایەت هەڵکردو روویان لەبانگەوازی پێغەمبەران وەرگێڕا، پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستنەوە، گاڵتەیان بەهەڕەشەو ترساندنی خودا دەهات، بتمانەیان بەبتو خوداکانیان هەبوو کە لەزیانو نارەحەتی دەیانپارێزن! بۆیە ئەوەیان بەسەر هات: کە بەسەریان هات ﴿فَمَا أَغْنَتْ عَنْهُمْ آلِهَتُهُمْ فَمَا أَغْنَتْ عَنْهُمْ آلِهَتُهُمُ الَّتِي يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ لَمَّا جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ﴾ ئەو کاتەی فەرمانی خودای مەزن دەرچوو بەلەناو بردنیان خودا درۆزنەکانیان هیچ سودو نەفعێکیان بۆیان نەبوو، ئەو بتو صەنەمانەی کە لەجیاتی خودا بەندایەتیان بۆ دەکردن دادیان نەدانو عەزابی ریشەکێشکەریان لێ دوور نەخستنەوە، بەڵکوو زیانیان پێ گەیاندنو بوون بەمایەی لەناوبردنو بەفتارە چوون بۆیان ﴿وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ﴾ بەردەوامیو سوور بوونیان لەسەر بتپەرستیو بەندایەتی کردن بۆ غەیری خودا وێرانیو فەوتانی بۆ زیاد کردن، جگە لەخەسارەتمەندیو بەهیلاك بردنیان هیچ سوودێکی تریان بۆیان نەبوو، چونکە ئەوان پشتیان بەو بتو صەنەمانە بەستو رو وەرگێڕانو گاڵتە بەپێغەمبەرانیان زیاد کرد، پەروەردگاریش تۆڵەو عەزابو وێرانیو سەرگەردانی بۆ زیاد کردن! بەهۆی پەرستش بۆ ئەو بتانە خودا سزای توند تر کردنو بەسامناکترین شێوە لەناوی بردن.

﴿وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ﴾ وەکوو ئەو سزادانو غەزەب لێ گرتنە سامناکەی کە خودای تۆ ئەی موحەممەد! دانیشتوی ئەو شارو گوندانەی پێ گرتن، وەکوو ئەو وێرانیو لەناوبردنەی بەسەر گەلی نوحو قەومی عادو ثەموودو غەیری ئەوانیشمان هێنا کاتێ ستەمیان لەخۆیان کردو پەیامی پێغەمبەرانیان رەتکردەوە، هەمان عەزابو سزا دەهێنین بۆ سەر گەلو نەتەوەی تر

هەر کاتێ ستەمیان لەخۆیان کردو سەرپێچی فەرمانی خودایان کرد! چۆن گەلو نەتەوە پێشینەکانمان لەناو بردن ئاواش گەلو نەتەوەی تر لەناو دەبەین هەر کاتێ ڕەچاوی ئەوان بکەن. ﴿إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ بێگومان تۆڵەساندنو سزاو گرتنی خودا بۆ ستەمکاران سامناکو بەئازارو پڕ ئەندێشەیەو ڕزگار بوونی لێ ناکرێ!! ئیمام ئەحمەدو بوخاریو موسلیمو تیرمیذیو ئیبنو ماجە لەئەبو موسای ئەلئەشعەرییەوە خودایان لێ ڕازی بێ، ڕیوایەتیان کردوە، وتوویەتی: پێغەمبەر فەرموویەتی: (خودا مۆڵەتی ستەمکار دەدا تا ماوەیەك بەڵام کە گرتی ئیتر ڕزگار بوونی نیە، ئەمجار ئایەتی ﴿وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ی خوێندەوە.

دەی با ستەمکاران پەندو عیبرەت وەربگرنو لەخۆیان بایی نەبنو بگەڕێنەوە بۆ لای خوداو واز لەستەمکاری بێنن!!

## پەند وەرگرتن لەچیرۆکەکانی قورئان بەسزای قیامەت

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ ٱلْءَاخِرَةِ ذَٰلِكَ يَوْمٌ
مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ (١٠٣) وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا
لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ (١٠٤) يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ
فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ (١٠٥) فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُوا۟ فَفِى ٱلنَّارِ لَهُمْ فِيهَا
زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ (١٠٦) خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ

وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾ ۞
وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِي ٱلۡجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ
وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۖ عَطَآءً غَيۡرَ مَجۡذُوذٖ ﴿١٠٨﴾ فَلَا تَكُ فِي
مِرۡيَةٖ مِّمَّا يَعۡبُدُ هَٰٓؤُلَآءِۚ مَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُهُم مِّن
قَبۡلُۚ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمۡ نَصِيبَهُمۡ غَيۡرَ مَنقُوصٖ ﴿١٠٩﴾

ئه‌م كۆمه‌ڵه ئایه‌ته‌ش په‌یوه‌ندییان به‌ئایه‌ته‌كانی پێشه‌وه هه‌یه. بۆ په‌ند وه‌رگرتن له‌چیرۆكی گه‌له سته‌مكاره‌كان، جا دوای ئه‌وه‌ی په‌روه‌ردگار باسی په‌ند وه‌رگرتن له‌به‌هیلاكبردنی گه‌له سته‌مكاره‌كانی جیهانی كرد، دێته سه‌ر باسی په‌ند وه‌رگرتن به‌پاداش‌و سزای قیامه‌ت بۆ به‌خته‌وه‌ران‌و به‌دبه‌ختان!

ئه‌مه‌ش له‌ڕووی ڕانواندنی به‌ڵگه‌و ده‌لیل له‌سه‌ر ڕاستگۆیی پێغه‌مبه‌ران‌و ڕاستی واده‌ی په‌روه‌ردگار، هه‌روه‌ها ترساندن له‌سه‌رپێچی كردنی خوداو كافر بوون به‌واده‌و هه‌ڕه‌شه‌كانی. هه‌ڵنانی ئاده‌میزادان بۆ طاعه‌تكردنی په‌روه‌ردگار.

ئه‌و گرتنه گورچكبڕه كه له‌دونیادا په‌روه‌ردگار سته‌مكارانی پێ گرت‌و له‌ناوی بردن، نیشانه‌ی عه‌زابی قیامه‌ته، هه‌ر كه‌سێ له‌سزای قیامه‌ت بترسێ ده‌بێ ئه‌و جۆره سزایانه بخاته پێش چاوی خۆی‌و په‌ندو عیبره‌ت وه‌ربگرێ. واته: ئه‌وانه‌ی چاوی دڵیان ڕۆشن‌و بینایه، هه‌ست به‌وه ده‌كه‌ن: كه ئه‌و كه‌سه‌ی له‌م له جیهانه‌دا سته‌مكاران به‌و شێوه له‌ناو ده‌با، له‌قیامه‌تیش‌دا به‌دۆزه‌خ سزایان ده‌دا.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِمَنْ خَافَ عَذَابَ الآخِرَةِ﴾ بێگومان لەم چیرۆکانەی باسمان کردنو بەهیلاکچوونی ستەمکارانو رزگار بوونی بڕوادارانیان لەخۆ گرتبوو، بەڵگەی بەهێزو ئاشکرا هەن لەسەر راستی وادەو بەڵێنی خودا دەربارەی پاداشو سزای قیامەت؛ بۆ کەسانێك بڕوایان بەقیامەت هەیەو لەسزاو ئازاری سامناکی دەترسن! لەدونیادا خۆیان لەکوفرو ستەمکاریو سەرپێچی فەرمانی خودا دەپارێزن، چونکە دەزانن: ئەوەی پێغەمبەران هەواڵیان پێداوە لەزیندو بوونەوەو پاداشو سزا راستەو گومانی تێدا نیە، دەزانن: ئەو کەسەی لەدونیادا سزای ستەمکارانی داوەو لەناوی بردوون دەتوانێ لەقیامەتیشدا سزایان بدا، دەزانێ ئەو سزاو عەزابەی لەدونیادا یەخەی تاوانبارانی گرت نموونەیە کە بۆ عەزابی قیامەت..

زەمەخشەری لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ﴾ ئاماژەیە بۆ چیرۆكو سەرگورشتەی گەلە ستەمکارە لەناوبراوەکان کە خودا لەسەر تاوانو ستەمکارییان لەناوی بردن.

کە دەفەرموێ: (لآية) واتە: لەم چیرۆکانەدا پەندو عیبرەت هەیە بۆ کەسانێك کە لەعەزابی قیامەت دەترسن. چونکە ئەوانە دەڕواننە ئەو سزاو عەزابەی بەسەر ئەواندا درا لەدونیادا لێیان روونە ئەوە نموونەی عەزابی قیامەتە، جا کە عەزابو ناڕەحەتیو توندو تیژی ئەو سزایانەیان هێنایە پێش چاوی خۆیان، پەند ئامێز دەبن، ترسی خودایان لێ دەنیشێ...

﴿ذَلِكَ يَوْمٌ مَجْمُوعٌ لَهُ النَّاسُ﴾ ئەو رۆژە رۆژی عەزابی قیامەتە، هەموو ئادەمیزادی تێدا کۆدەکرێنەوە، لەیەك کەسەوە تا دواکەس لەو رۆژەدا گرد دەکرێنەوە، بۆ ئەوەی حیسابیان لەگەڵ بکرێو لەسەر کردەوەکانیان پاداشو سزا بدرێنەوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَحَشَرْنَاهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَداً﴾الكهف/٤٧. خەڵکەکە بەدەست خۆیان نیە، زیندوودەکرێنەوە، راپێچ

دەکرێن بۆ دەشتی مەحشەر بەبێ ئەوەی هیچ ویستو ئیرادەیەکیان هەبێ، هەموویان کۆدەکرێنەوە، هەموویان چاوەڕوانن چی دەبێو چی رو دەدا!!!

﴿وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ﴾ ئەو رۆژە رۆژێکی گەورەو سامناکە، رۆژێکی گەورەیە: فریشتە ئامادەی دەبن، پێغەمبەران تێیدا کۆدەبنەوە، خودا تێیدا حاکمەو پێغەمبەرانو شەهیدانو پیاوچاکان شایەتو گەواهیدەرن!!

ڕۆژێکی گەورەیە، چونکە مەخلوقات سەر لەبەر هەموویان تێیدا کۆدەبنەوە؛ ئادەمیزادو جنۆکەو باڵندەو درندەو ئاژەڵو خشۆکو هەموو گیانلەبەرێك بەبێ ئیستیثناو تێیدا کۆدەبنەوە، دادوەر خودای عادڵو زاناو دانایە، کەس بەئەندازەی تۆزقاڵێك ستەمی لێ ناکرێ!

هەڵسوڕانی کاروباری بوونەوەر لەدونیاو لەقیامەتدا هەر لەزەرەتامەجەرە بەهەموو روداوو لەناوبردنو عەزاب ناردنە سەرو عەزاب هەڵگرتنو باران بارینو هێنانو بردنی هەورو لێدانی بومەلەرزەو صاعیقەو تۆفانو رەشەباو زریان...هتد هەمووی بەدەست خودایەو بەویستی ئەو دێنە جێو نامێنن! سروشت (طبیعة) بۆ خۆی هیچ دەورێکی لەو روداوانەدا نیە، ئەویش مەخلووقێکی فەرمان پێکراوەو هیچی تر! ئەوەی مادديیەکان دەیڵێن: گوایە تۆفانو هەورە بروسکەو زەوی رۆچونو بومەلەرزە، کاروباری سروشتینو خودا ج دەخڵێکی تێیاندا نیە، بۆ خۆیان گوت: بەڵێ بۆ خۆیان گوت. ساکار ترین رەتدانەوەی ئەوانە ئەوەیە: کە ئەو عەزابو سزایانەی یەخەی ئەو گەلە ستەمکارانەی گرتووە پێش وەخت پێغەمبەرەکانیان ئینذاریان کردونو کاتی دیاریکراویان بۆ داناونو بەتەحدید کاتی هاتنی عەزابەکەیان دیاری کردوە، ئەی ئەوە نیە حەزرەتی صالح فەرمووی: ﴿تَمَتَّعُوا فِي دَارِكُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ﴾هود/٦٥. حەزرەتی (لوط)یش فەرموی: ﴿إِنَّ مَوْعِدَهُمُ الصُّبْحُ﴾هود/٨١.

ئـەمجار پـەروەردگار هـەواڵی دواخـستنی قیامـەتو هـاتنی عـەزابی خـۆی رادەگەیەنیو دەفەرموێ: ﴿وَمَا نُـؤَخِّرُهُ إِلاَّ لأَجَـلٍ مَعْـدُودٍ﴾ ئێمـە هەڵسانی قیامـەت دواناخەین مەگەر بۆ ماوەیەکی دیاریکراو کە خۆمان لەزانـستی خۆمـاندا دیاریمـان کردوە، هیچ زیادو کەمییـەکی تێدا نـاکرێو پاشو پـێش ناکا، هـەر کاتـێ تەمـەنی دونیا تەواو بـوو قیامـەت ڕادەبـێو کۆتـایی بـەژیان دێ! پـەروەردگار کەسـی بەسـەر زانیاری کاتی هاتنی رۆژی قیامەتدا ئاگادار نەکردوە، ئەو زانیارییە تایبەتە بەزاتی خۆیەوەو کەسی تر نایزانێ...

﴿يَـوْمَ يَـأْتِ لا تَكَلَّـمُ نَفْـسٌ إِلاَّ بِإِذْنِـهِ﴾ لـەو کاتـەی رۆژی قیامـەت دێ هـیچ زیندەوەرێکی خاوەن نوتقو قسە، ئاخاوتنی بـۆ نـاکرێ، مەگـەر خـودا رێگـەی بـدا، چونکە لەو رۆژەدا کەس ئیرادەو ئیختیاری نیە، بەبێ ئیـزن وەرگـرتن کـەس قسەو کردەوەی بۆ ناکرێ! هەر خودا خاوەنی فەرمانو جڵەوگیرییە، کەسی تر دارای هیچ نیە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلَائِكَةُ صَفّاً لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرحْمَنُ وَقَالَ صَوَاباً﴾النبأ/٣٨. یان دەفـەرموێ: ﴿يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ الدَّاعِيَ لَا عِوَجَ لَهُ وَخَشَعَت الْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْساً﴾طه/١٠٨.

بێدەنگییـەکی سامناك هـەموو مـەخلووقات دادەپۆشـێ، ترسـێکی گـشتی خـۆ بەسەر مەشهەدو ئامادەبوانی مەشهەدەکەدا باڵ دەکێشێ! کـەس زاتـی ناهێنـێ داوای قسە کردن، بکا، کەس ورتەی لەدەم نایەتە دەرێ، بەڵام جاری وادەبێ خودای مـەزن رێگە دەدا بەهەندێ کەس قسەیەك بکاو پەردەی بێدەنگی بدرێنێ!

﴿فَمِـنْهُمْ شَـقِيٌّ وَسَـعِيدٌ﴾ لـەو حەشـاماتەی کۆبۆتـەوە لـەو رۆژەدا هەیانـە بەدبەختو نەگبەتە بەهۆی کوفرو بێدینی لەژیانی دونیایدا، هەشیانە بەختەوەرو کامەرانە، تاقمەو کۆمەڵی بەهەشتی رازاوەیە؛ چونکە لەژیانی دونیادا بـڕوای راسـتی هەبووەو بـەردەوام بـووە لەسـەر خوداپەرسـتی وەکـوو لەشـوێنێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ﴾الشورى/٧.

جا هەر کەسێك ویسترابێ بەدبەخت بێ‌و کاری خراپەی کردبێ ئەوە ئەهلی شەقاوەتە، کەسێکیش ویسترابێ خێرو خۆشی پێ بگاو کاری خێری ئەنجام دابێ ئەوە لەئەهلی سەعادەتو بەختەوەرانە، هەر کەسەو رێڕەوی رێگای بۆ دیاریکراوی خۆیەتی، بۆ چ لایەك دروست کراوە ئەوە ئەنجام دەدا! تیرمیذی‌و ئەبو یەعلاو هی تریش لەعومەری کوڕی خەتتابەوە ریوایەت دەکەن، دەڵێن: عومەر (رەزای خودای لێ بێ) دەڵێ: کە ئایەتی ﴿فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ﴾ هاتە خوارێ پرسیارم لەپێغەمبەر کرد وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! لەسەر چی کار بکەین؟ لەسەر شتێك کە بڕاوەتەوە یان لەسەر شتێك کە نەبڕاوەتەوە؟ لەوەڵامدا فەرمووی: کار بکەن لەسەر شتێك کە بڕاوەتەوەو مۆر کراوەو قەڵەمی بەسەردا هاتووە، وەلێ هەموو کەس پەیڕەوی ئەو رێبازە دەکا کە بۆی دیاری کراوەو بۆی دروست کراوە ئەمجار ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: ﴿فَأَمَّا مَن أَعْطَى وَاتَّقَى، وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى، وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَى، وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى﴾الليل/٥-١٠.

مەبەست ئەوەیە: خودا بۆ خۆی غەیب زانەو ئاگاداری روداوی داهاتووە. دەزانێ چ دەبێ‌و چ رو دەدا، دەزانێ کێ چ دەکاو سەرەنجامی کارەکان چۆنە، هەموو کاروبارێکی لەکتێبی غەیبی خۆیدا تۆمار کردوە.. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەفەرمودەکەیدا ئەوەمان فێر دەکا: کە سزاو پاداش لەسەر کردەوە دەدرێنەوە، هەموو ئادەمیزادێك ئەو رێبازەی بۆ ئاسانکراوە کە بۆی دیاری کراوە، جا رێبازەکەی سەربکێشێ بۆ کامەرانی بەهەشت، یان بۆ بەدبەختی ناو دۆزەخ، ئەو ئامادەباشی‌و عەزیمەتەی پێی دراوە، رۆڵی خۆیان دەگێڕن لەبەخێو کردنی نەفس‌و رامکردنی بۆ ئەو رێبازەی پێی سپێردراوەو بەختەوەری لێ چنگ دەکەوێ.

ئەمجار پەروەردگار سزاو پاداشی هەردوو تاقمەکە دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ شَقُوا فَفِي النَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ﴾ جا ئەوانەی بەدبەختن لەژیانی دونیادا بەهۆی ئەو کردەوە ناشیرینانەی ئەنجامیان داوە، کە لەئاکامی بیرو باوەڕی

فاسیدو پوچی بەجێماو بۆیانو شوێنکەوتنی خراپەکاران لەکردارو گوفتاردا هەتا وایان لێ هات لەتاوانو خراپەکاریدا نوغرۆ بوونو روناکایی بیرو باوەڕی سروشتییان کوژایەوەو دڵیان تاریک بوو گومڕا بوون، موستەحەقی چوونە ناو دۆزەخ بوون، ئاگر بەشی ئەوانەو جێگای حەوانەوەو پشودانیانە. ئەوان لەناو ئەو دۆزەخەدا شینو شەپۆڕیان هەیەو هەناسە سوارنو نرکەو هانکە هانکیان لێ دێ، سینگیان تەنگ دەبێ لرخەو پرخەو لرفەو دادو فیغانیانو شاتە شاتیان جیهانێك پڕ دەکا!!

﴿خَالِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتْ السَّمَوَاتُ وَالأَرْضُ﴾ ئەوانە لەناو دۆزەخدا دەمێننەوە بۆ هەتا هەتایە، مانەوەکەیان لەوێدا بەردەوامو نەبڕاوەیە، تا ئەو ئاسمانەی لەسەریانەو ئەو زەوییەی لەسەرنی بمێننەوە ئەوانیش لەناو دۆزەخدا دەمێننەوە، مەبەست بەم تەعبیرە قورئانییە مانەوەیانە لەناو ئاگردا بۆ هەتا هەتایە. کۆتایی نەهاتنی سزاکەیانە.

مەبەست بە(السموات) لێرەدا ئاسمانی هەر یەکێ لەئەهلی دۆزەخو ئەهلی بەهەشتە، واتە: ئەو سەقفەی لەسەریانە، مەبەستیش بە(الأرض) لێرەدا ئەو زەوییە: کە ئەوان لەسەرنیو کەوتۆتە ژێریانەوە. چونکە لەقیامەتدا ئاسمانو زەوی ئێستا نامێننو دەگۆڕدرێن؛ وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ﴾ابراهيم/٤٨. یان دەفەرموێ: ﴿وَأَوْرَثَنَا الْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَاءُ﴾الزمر/٧٤.

هەروەها چونکە پێویستە بۆ ئەهلی قیامەت ئاسمانێك هەبێ دایانپۆشێو زەوییەك هەبێ هەڵیانگرێ! هەر شتێك لەسەرتەوە بێ بەئاسمان حیسابە بۆ تۆ.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: لەقیامەتدا بۆ هەموو کەس زەویو ئاسمان هەیە.

﴿إِلاَّ مَا شَاءَ رَبُّكَ﴾ واتـە: ئـەم مانـەوەیان لەدۆزەخـدا بـەردەوامو نەبڕاوەیـە: مەگەر خودای تۆ مەیلی بێنێ، ئەم یاسایە بگۆڕێ لەشێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تـر! مەبەست بەم تەعبیرە بەردەوامو مانەوەی نەبەدییـە، چونکە مانـەوەی موشـریکان لەناو دۆزەخداو مانەوەی بەهەشتییەکان لەبەهەشتدا چەسپاوو سەلێنراوە.

کەوابوو مەبەست ئەوەیە: مانەوە هەتا هەتاییەکە بەویستی خودایەو هیـچ شتێك لەدونیاو لەقیامەتدا بەبێ مەشیئەتی خودا نابێ، لەزمانی عەرەبیـدا ئەگـەر کەسێك بیەوێ تەعبیر لەبەردەوامی شتێك بداتەوە، دەڵێ: (هذا دائـم دوام الـسموات والأرض) زانایـانی تەفـسیر زۆر راوو بۆچـونیان لەسـەر ئـەم ئیـستثنایـە دەربڕیـوە، گرنگەکانیان ئەمانەن:

زەمەخـشەری دەڵـێ: ئیـستیثنائەکـە رو دەکاتـە وشـەی: (خالـدین)ی نـاو ئایەتەکـە، واتـە: ئـەهلی دۆزەخ بەبـەردەوامی لـەناو ئـاگردا نامێننـەوە، بـەڵکوو دەگوێزرێنـەوە بـۆ نـاو زەمهـەریر، هـەروەها جگـە لـەئاگر بەچـەند جۆری تـریش عـەزاب دەدرێـن، لەوانەیـە سـزاکەیان لەسـزای ئـاگر بـەئێش تـر بـێ، ئـەویش نارەزامەنـدی خودایـە لێیـان. هـەروەها ئـەهلی بەهەشـت جگـە لـەنازو نیعمـەتی بەهەشت خۆشی تریان تووش دێ، وەکوو رەزامەندی خودا لێیان، جگە لەبەهەشت پەروەردگار بەفەضلی خۆی نیعمەتی وایان پێ دەبەخشێ چۆنیەتەکەی نازانـدرێو وەصفی ناکرێ.

واتە: ئەهلی دۆزەخو ئەهلی بەهەشت بەبەردەوامی دەمێننەوە مەگـەر خـودا بیەوێ ئەو شێوە ژیانەیان بگۆڕێ، سزایان زیاد بکا یان کـەمی بکـا، نـازو نیعمـەتیان بۆ زیاد بکا یان کەمی بکاتەوە.

مەبەست ئەوەیە: هەموو شتێك لەژێر دەسەڵاتی خودا دایەو بەویـستی خـۆی زیادو کەمی دەکا.

ئەبو حەیان لەتەفسیری بەحری موحیطدا دەڵێ: وا پێدەچێ ﴿إِلاَّ مَا شَاءَ﴾ چەرتکردنەکە روبکاتە ئەو کاتو زەمانەی کە لە﴿خَالِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتْ السَّمَوَاتُ وَالأَرْضُ﴾ وەردەگیرێ. واتە: ئەوانە لەدۆزەخدان، مەگەر ئەو کاتو زەمانەی خودا دەیەوێ لەوێدا نەبن، یان ئەوانە لەبەهەشتدان مەگەر ئەو کاتە نەبێ کە خودا دەیەوێ لەوێدا نەبن، ئەمەش دەگونجێ ئەو کاتو زەمانە بێ کە خودا حیسابو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکا، کەوابێ زەمانە چەرتکراوەکە ئەو کاتە دەبێ کە خەڵکە لەدەشتی مەحشەردا دەمێننەوە.

ئەگەر ئیستیثنائەکە رو بکاتە (خالدین) ئەو کاتە بەنیسبەت ئەهلی دۆزەخەوە ماناکە ئاشکرایە، چونکە دەگونجێ زەمانە چەرتکراوەکە ئەو زەمانە بێ کە هەندێ لەئەهلی دۆزەخ: کە موسوڵمانی تاوانبارن، پاش پاکبوونەوەو سزادانیان بەئەندازەی تاوانەکانیان لەدۆزەخ دەردێنرێنو دەبرێنە بەهەشت. بەڵام ئەم جۆرە ماناکردنە بەنیسبەت ئەهلی بەهەشتەوە ناگونجێ، چونکە هەر کەسێ چووە ناو بەهەشت ئیتر لێی دەرناچێو دەرناکرێ..

﴿إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ﴾ بێگومان خودای تۆ هەرچی بوێ دەیکا: بەگوێرەی زانیاریو دانایی خۆی چی بوێ لەگەڵ ئەهلی دۆزەخی دەکا، هەروەکوو چۆن چی بوێ بیدا بەبەهەشتییەکان پێیان دەدا.

ئەمجار پەروەردگار پاداشی تاقمی دووەم تاقمی بەختەوەرەکان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ سُعِدُوا فَفِي الْجَنَّةِ خَالِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتْ السَّمَوَاتُ وَالأَرْضُ إِلاَّ مَا شَاءَ رَبُّكَ عَطَاءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾ واتە: ئەهلی سەعادەت: کە شوێنکەوتووی پێغەمبەرانن، ئەوانە شوێنو ماوایان بەهەشتەو بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەو، هەتا ئاسمانی بەهەشتیان بەسەرەوە بێو زەوی بەهەشتیان لەژێرەوە بێ بەویستو ئیرادەی خودا تێیدا دەمێننەوە، ئەو بەهەشتە بۆ ئەوان بەخششێکی نەبڕاوەو ناپاسغە، بۆ هەتا هەتایە!

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: مەعنای ئیستیثنائەکە لێرەدا ئەوەیە: کە مانەوەی ئەهلی بەهەشت لەناو ئەو نازو نیعمەتانەدا شتێك نیە لەبەر زاتی خۆی پێویست بێ (واجب لذاته) نیە بەڵکوو پابەندە بەویستو ئیرادەی خوداوە، بۆیە هەمیشە منەتو بەخشایندەیی خودا لەسەریانەو ئەوانیش تەسبیحو تەمجیدی خودا دەکەن لەپاساوی ئەو بەهرەو بەخششانەدا.

هەریەکێ لەپاداشی بەهەشتو سزای دۆزەخ بەویستو ئیرادەی خودا بەردەوامەو بەگوێرەی عەداڵەتکاریو دانایی خودا لەپاساوی کردەوەکانیاندا!

عەزابی ئەهلی دۆزەخ بەردەوامەو پابەندە بەویستو ئیرادەی خوداو سزای کردەوەکانیانە.

نیعمەتو لەززەتی بەهەشت بۆ بەهەشتییان ئەویش پابەندە بەمەشیئەتی خوداوەو پاداشی کردەوەکانیانە.

بەڵام ئەوەندە هەیە پەروەردگار لەکۆتایی باسی دۆزەخییە بەدبەختەکاندا فەرمووی: ﴿إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾ لەکۆتایی باسی ئەهلی بەهەشتدا فەرمووی: ﴿عَطَاءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾ ئەمەش بۆ دڵخۆشکردنی بڕواداران‌و ئاماژەشە بۆ ئەوە: کە پاداشی موسوڵمانان بەخششێکی خودایەو چاکەیەکی بەردەوامە لەگەڵیان دەکا.

موسلیم‌و بوخاریو نەسائی لەئەبو هورەیرەوە فەرموودەیەکی پێغەمبەریان (درووودی خودای لەسەر بێ) ریوایەت کردوە دەفەرموێ: (لن يدخل أحد منكم الجنة بعمله قالوا: ولا أنت يا رسول الله؟ قال: ولا أنا الا أن يتغمدني الله برحمته) واتە: هیچ کەس بەهۆی کردەوەی خۆیەوە ناچێتە ناو بەهەشتەوە، هاوەڵان وتیان: تەنانەت تۆیش ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: تەنانەت منیش، مەگەر خودا بەرەحمەتی خۆی دامپۆشێ!

ئـەمجار پـاش باسـکردنی حـاڵو چـۆنیەتی دۆزەخییـەکانو بەهەشـتییەکان، پـەروەردگار هەڕەشـەیەکی تونـد ئاڕاسـتەی دوژمنـانی پێغەمبـەر دەکـا (درودی خودای لەسەر بێ). هەڕەشەی عـەزابو لەناوچوونی وەکوو گەلە پێشینەکانیان لێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَلا تَكُنْ فِي مِرْيَةٍ مِمَّا يَعْبُدُ هَؤُلاءِ﴾ واتە: ئەی موحەممەد! ئەگەر ئەوەی باسکرا لەچیرۆکو سەرگوزەشتەی گەلە ستەمکارە موشریکەکان لەدونیاو قیامەت سەرەنجامی هەموو ستەمکارو موشریکێك بێ، ئـەوە تـۆ ئـەی موحەممـەد! هـیچ شـكو گومانـت نـەبێ لەسـەرەنجامی ئـەوەی: کـە ئـەو موشـریکانەی گەلەکـەت ئەوانـە بـت پەرسـتن، شـكو گومانـت لەفەسـادی بـیرو باوەڕیـان نـەبێ! هەرچـی دەیپەرستن بەتاڵو پـوچو نـەزانیو گومڕاییـە، عەزابەکـەیان مـسۆگەرەو بۆیـان دێ. ئەمـەش دڵدانەوەیـە بـۆ پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) هەڕەشـەیە لەگەلەکەی.

ئەمجار حاڵو چۆنیەتییان لەعیبادەت کردندا روون دەکاتەوەو پاداشەکەشیان دەست نیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿مَا يَعْبُدُونَ إِلاَّ كَمَا يَعْبُدُ آبَاؤُهُمْ مِنْ قَبْلُ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَـصِيبَهُمْ غَيْـرَ مَنقُـوصٍ﴾ ئـەوان عیبـادەت ناکـەن مەگـەر وەکـوو بـاوكو باپیرانیـان دەیکـەن! ئێمـەش پاداشـیان دەدەینـەوە بەتـەواوی. واتـە: ئـەوان وەکـوو بـاوكو باپیرانیـان بتپەرسـتی دەکـەن ئـەمانیش وەکـوو ئـەوان نـەفامو نـەزانن، کوێرانـە شـوێنیان کـەوتوون. پـەروەردگار رۆژی قیامـەت لەسـەر کردەوەکانیـان پڕاوپـڕ پاداشیان دەداتەوە، سزایەکی بەئێشیان دەداو تۆڵەی باشیان لێ دەستێنێ. بەنیسبەت کردەوە باشەکانی دونیاشیانەوە، وەکوو: بەجێهێنانی صیلەی رەحـمو چاکە لەگـەڵ باوكو دایكو یارمەتی کۆست کەوتووان، ئەوە پەروەردگار هـەر لـەدونیادا جـەزایان دەداتـەوە بـەرزقو رۆژی زۆرو لابردنـی بـەڵاو ناخۆشـی لەسـەریان، جەزایـەکی پڕاوپڕیان دەداتەوە، ئەو خۆشیو لەزەتە کاتییەی دەیاندرێتێ نیعمـەتو لـەزەتێکی کەمخایەنەو زوو بەسەر دەچێ، کـەوابێ باکـەس هەڵنەخەڵـەتێ بـەڕابواردنی کـافرو

بێدینان، کە هەندێ جار لەخۆشیو لەزەتی دونیادا دەتلێنەوە، چونکە ئەوان هەر دونیایان هەیەو بێ بەشن لەنیعمەتەکانی بەهەشت، لەقیامەتدا جگە لەسزای جۆراو جۆری دۆزەخ هیچی تریان نادرێتێ..!

## ئایەتەکان بەروونی ئەم حوکمانەیان لێ وەردەگیرێ:

١- هەرچی پێغەمبەران هەواڵیان پێ داوە لەرووداوی رابوردوو نهێنی داهاتوو لەدونیاو لەقیامەتدا سەد دەرسەد راستنو شکو گومانی تێدا نیە.

٢- زیندو بوونەوە حەقو راستەو گومان لەهاتنی قیامەت دا نیە، وەلێ حیکمەتی خودا واداخوازە کە تا کاتی خۆی نەیە هەڵی نەستێنێ.

٣- دەسەڵاتی موطلەقو رەها لەرۆژی قیامەتدا بۆ خودای مەزنە، کەس بەبێ ئیزنو رەزای ئەو ناتوانێ شەفاعەت بکا.

٤- ئادەمیزاد رۆژی قیامەت دوو تاقمن: نەگبەتو بەختەوەر، نەگبەتەکان لەدرۆزەڵاننو بەختەوەران لەبەهەشتدا. هەردوولایان تێیاندا دەمێننەوە بەویستو ئیرادەی خودا بۆ هەتا هەتایە.

٥- جەماوەری زانایان کۆکن لەسەر ئەوە کە سزای کافران لەدۆزەخدا بەردەوامو ئەبەدییەو برانەوەی نیە. هەروەها موسوڵمانانیش لەبەهەشتدا بۆ هەتا هەتایە دەمێننەوە.

٦- لەزەتی بەهەشت بەردەوامەو برانەوەی نیە.

٧- پەرستشی موشریکەکان بۆ بتەکانیان عیبادەتێکی پوچو بێ بناغەیەو عەقڵو مەنطیقوەری ناگرن. بەڵکوو ئەو عیبادەتو پەرستنە لەنەفامیو لاسایی کردنەوەوە سەری هەڵداوە.

٨- پەروەردگار دەرحەق بەکافرانیش عادڵو دادپەروەرە پاداشی کردەوە باشەکانیان لەدونیادا پێ دەداتەوە، بەڵام لەقیامەتدا پاداشیان نیە، چونکە

وەرگرتنی کرداری باشیان مەرجە، دەبێ لەبیرو باوەڕەوە سەری هەڵدابێ، کردەوە بێ بوونی ئیمان لەقیامەت سوودی نابێ.

مەبەستەکانی چیرۆکی قورئان:

وا دەبێ چیرۆکێك چەند جارێك بەشێوازی جیا جیا لەقورئاندا دوبارە دەبێتەوە هەر جارە بەبۆنەی شتێکەوە دەهێندرێو کاریگەری تایبەتی خۆی دەبێ. لەگێڕانەوەی چیرۆکی گەلەپێشینەکان لەم سوڕەتەو سورەتەکانی تریشدا چەند مەبەستێکی سەرەکی هەن، گرنگەکانیان ئەمانەن:

١- هەواڵدان لەسەردەمو مێژووی بڕێ گەلو نەتەوەی رابوردوو. تیشك خستنە سەر بڕێ روداوی گرنگ کە لەوەپێش پێغەمبەرو غەیری پێغەمبەر نەیانزانیوە. ئەمەش دەبێتە نیشانەیەکی بەهێز لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

٢- هەواڵدان بەهەموو ئادەمیزادان دەربارەی هەوڵو تێکۆشانی پێغەمبەران لەپێناو بڵاوکردنەوەی بانگەوازەیەکەیانو ململانێو بەربەرەکانی کردنیان لەگەڵ گەلەکانیان، بۆ ئەوەی حەقو راستی دەربکەونو بەتاڵ پوچ بکەنەوە. هەروا بۆ زانینی ئاستی بەپیرەوە هاتنو پشت لێ هەڵکردنی گەلەکانیان بۆ پەیامی پێغەمبەرەکانیان. لەهەمان کاتدا تەسەللاو دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەری ئیسلام: کە دڵی بەخۆ نەمێنێو ئەوەی تووشی ئەو بووە تووشی پێغەمبەرانی پێش ئەویش بووە. ئەو چیرۆکانە ئەوەشیان لەخۆ گرتووە: کە پێغەمبەران مامۆستای راستەقینەی بانگخوازانی ئیسلامنو پێویستە بانگەوازیکەران بیانکەنە نموونەو پێشەواو شوێنیان بکەون، جیهادو تێکۆشانو خۆڕاگری لەوانەوە فێر بن.

٣- ئەو چیرۆکانە ئەوەشیان لێ وەردەگیرێ: کە هەموو پێغەمبەران لەیەك سەرچاوەوە پەیامی خۆیان هەڵێنجاوە هەموویان لەبنەمای پێغەمبەرایەتیەکەیاندا دەبنە یەكو پەیامی ئەویان پشتگیری ئەمیان دەکا لەبواری یەکتاپەرستیو بڕوا

بەهاتنی رۆژی قیامەتو زیندوبوونەوەی هەموو گیانلەبەرانو پاداشو سزادانەوەی بڕوادارو بێ بڕوایان یەکنو جودا وازی لەپەیامەکەیاندا نیە!

٤- چیرۆك عونصورێکی کێشکەرو مەرغووبە، کاریگەری خۆی هەیە لەبواری بەخێوکردنو فێر کردنو چەسپاندنی شت بەبەڵگەی عەقڵیو بەرو داوی حیسسی. بۆ گەورەو پچوك بەسوودە، ژنو پیاوو کچو کوڕ چێژی خۆیانی لێ دەکەن، ئەمەش سەر دەکێشێبۆ چاندنو رسکانی تۆوی ئیمانو باوەڕ لەدڵاندا، هەڵنانی خەڵك بۆ طاعەتو خودا پەرستی، ترساندن لەگوناهو تاوان، بەجۆرێك دەتوانین بڵێین چیرۆك قوتابخانەیەکی خوداییە بۆ بڕواداران، بۆ دڵنەوایی پێغەمبەران، واقیعو رووداوەکانیان دەخەنە روو، قوتابخانەی فێر بوونی گەلو نەتەوەکانن، مێژووی چیرۆك کۆنو کەوناراپە. مەوضوعی چیرۆکەکان بەهیلاکبردنی ستەمکارانە مەبەستو ئامانجیش لەو چیرۆکانە پاڵفتە کردنی دڵو دەروونەو ئیصلاحی حاڵو وەزعیانە.

٥- یەکەم مەبەستی سەرەکی چیرۆك لەقورئاندا سەلماندنو چەسپاندنی یەکتاپەرستیو بوونی خودایەکی بالادەستو زاناو دانایە، چەسپاندنی پێغەمبەرایەتیو زیندو بوونەوەی رۆژی قیامەتە.

٦- چیرۆکەکانی قورئان ئەوەمان بۆ روون دەکەنەوە کە ئەرکی سەرەکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) راگەیاندنی نیگاو سرووشەو ترساندنو موژدە پێدانی ئادەمیزادە، هەرچەندە لێکردنیانە بەهاتنی عەزابی خودا زوو یان درەنگ، بەبێ ئەوەی پێغەمبەر بۆ خۆی چ دەسەڵاتێکی لەهاتنو نەهاتنی عەزابەکەیان زوو هاتنو درەنگ هاتنیدا هەبێ. هەروەها سوور بوونی ئەو پێغەمبەرانە لەسەر مەبدەئەکەیانو هەوڵو تێکۆشانی بێ وچانیان دەردەخەن!

٧- چیرۆکەکانی قورئان ئاستی ئامادەباشی ئادەمیزاد بۆ کافر بونو ئیمانهێنان دیاری دەکا.

٨- هەروەها دەسەڵاتو توانای خودا دەردەخەن، ئەو سزاو عەزابەی دەینێرێ نموونەیەکی عەزابی قیامەتە.

٩- هەر لەبواری چیرۆکەکانی قورئاندا، پشتگیری خودا بۆ پێغەمبەرەکانیو بەدیهێنانی موعجیزەو ئایەتەکانی خۆی لەسەر دەستی ئەوانو راستکردنەوەی بەڵگە لەسەر ئادەمیزادەکان بۆ ئەوەی هەڵیان بنێ بۆ ئیمانهێنانو قەناعەتکردن بەبانگەوازی پێغەمبەران! بەئاشکرا دەبیندرێ.

١٠- چیرۆکەکانی قورئان هەموویان پەندو عیبرەتن، دەرمانی دڵو دەروون دەکەن.

١١- لەسەروو هەموو ئەو مەبەستانەی باسکران مەبەستێکی گرنگی تر هەیە ئەویش ئەوەیە: هەواڵدانی پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار: بەبێ ئەوەی بزانێ بنووسێ یان بخوێنێتەوە، یان چیرۆك گێڕەوەو مێژوو زان بێ، کە ئەویش پێغەمبەری ئیسلامە (دروودی خودای لەسەر بێ) هەواڵدانی ئەو پێغەمبەرە بەئەو سەرگورشتانە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر پێغەمبەرایەتیو بەرزی پەیامەکەیو هەواڵدانی بۆ بڵاوکردنەوەی زانستو زانیاری، هەروەها بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە لەسەر ئەوەی: کە قورئان نامەی خودایەو دەستورو یاسایە بۆ ئادەمیزاد تا رۆژی قیامەت.

## سەرەنجامی ناکۆکی پەیدا کردن لەتەوراتدا

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ

مُرِيبٍ ﴿١١٠﴾ وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَٰلَهُمْ إِنَّهُۥ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١١﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار موشریکەکانی عەرەبی ئاگادار کردەوە بەسەرنجامی گەلو نەوە لەناو براوەکان! لێرەشدا ئەوەیان دەخاتەوە بیر: کە گەلی موسا ناکۆکییان لەتەوراتدا پەیدا کرد، هەیانبوو ئیمانی پێ هێناو هەبوو ئیمانی پێ نەهێنا! ئیتر خودا سزای دانو لەسەر کردەوە خراپەکانیان عەزابی بۆ ناردن. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە: کە کوفر یەك گەلو نەتەوەیەو مێژووی کافرانو هەڵوێستیان لەگەڵ پێغەمبەراندا یەك مێژوو یەك هەڵوێستە...

ئەوەتا: کافرەکانی قورەیش وێڕی ئینکاریکردنی تاكو تەنهایی خودا ئینکاری پێغەمبەرایەتی موحەممەدیش دەکەنو قورئانەکەی بەدرۆ دەخەنەوە، ئەمانیش وەکوو گەلو نەتەوە کافرەکانی پێشوو هەڵوێست دەنوێنن! دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ فَاخْتُلِفَ فِيهِ﴾ بێگومان ئێمە تەوراتمان دا بەموسا بۆ ئەوەی گەلەکەی بیکەنە بەرنامەو یاساو شەریعەتی خۆیانو بەگوێرەی ئەو کتێبە هەڵسو کەوت بکەن! بەڵام ئەوان لەڕاو بیرو بۆچونو ڕاڤەکردنیاندا کێشەیان تێکەوت هەر کەسە بەئارەزۆی خۆی مانای لەدەقەکانی دەدایەوە، بوونە تاقم تاقمو گرۆ گرۆ، پەرتەوازە بوونو هەر تاقمەیان دەیەویست بۆ مەرامی خۆی بیگونجێنێو بیکاتە داردەستی خۆی بۆ دونیا خواردنو چەوساندنەوەی کەسانی دیکە، هەندێکیان ئیمانیان پێ هێناو ئەوانی دیکە پێی کافر بوون! زوربەی زۆریان لەو حەقو ڕاستیەی تەورات بۆی هێنا بوون دوور کەوتنەوە، هەرچەندە نامەی ئاسمانی بۆیە نێردراوە یەکتاپەرستی بچەسپێنێ، ئادەمیزادان لەسەر یەك ڕێبازو پەیڕەوو پرۆگرام کۆبکاتەوە، بەڵام نەتەوەی موسا کێشەیان تێکەوتو جوداوازییان پەیڕەو

کـرد.. کـەوابێ تـۆش ئـەی موحەممـەد! موبـالات بەهەڵوێـستی گـەلو نەتەوەکـەت مەکە، کە دەربارەی قورئان کێشەیان تێ کەوتووە هەنـدێکیان باوەڕیـان پـێ کـردوە، زوربەشیان بەدرۆت دەخەنەوە! ئەوە دابو نەرێتی گەلو نەتـەوە پێشینەکان بـووە لەگەڵ پێغەمبـەرەکانیان، تـۆ ئـەرکی سەرشـانی خـۆت ئـەنجام بـدەو خەفـەت بـەوە مەخۆ کە بەدرۆت دەخەنەوەو پەیامەکەت ڕەت دەکەنەوە.

﴿وَلَوْلا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِنْ رَبِّكَ لَقُضِيَ بَيْـنَهُمْ﴾ ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبوایـە: کـە قـەزاو قـەدەری خـودای تـۆ، داخـوازی ئـەوە بـووە: کـە بـۆ ماوەیـەکی دیـاریکراو کـە هاتنی ڕۆژی قیامەتە عەزابیان بۆ نەنێرێ، ئـەوە هـەر لـەدونیادا ناوانمـان دەکـردن، هـەر لـەدونیادا عـەزابمان بـۆ دەنـاردن، سەرپێـچیکارانمان لـەناو دەبـردن، خـودا پەرسـتانمان ڕزگـار دەکـردن، وەکـوو چـۆن لـەوەپێش دەربـارەی گـەلو نەتـەوە پێشینەکان ئەنجاممان دا.

﴿وَإِنَّهُمْ﴾ بێگومان گەلو نەتەوەی موسا ﴿لَفِي شَـكٍّ مِنْـهُ مُرِيـبٍ﴾ دەربـارەی تـەورات لەشـكو گومـانێکی زۆر چەواشـەکاردان، چـونکە تـەورات زۆری لێ گـۆڕاوە، زۆری لێ فەوتاوە، مێـژوو نووسـان دەڵێن: کاتێـك بابلیـەکان پەیکـەری سـولەیمانیان سوتاند؛ تەوراتیش فەوتاو لەناو چوو، ماوەیەکی زۆری پێ چوو ئەمجار جولەکەکان سـەر لـەنوێ هـەوڵیاندا تـەوراتیان نووسـیەوە بـەڵام بەشـێواوی‌و دەسـت لێـدراوی، چونکە نوسخە ئەصلیەکەی نەمابوو!

﴿وَإِنَّ كُلاًّ لَمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَالَهُمْ﴾ هەر تاقمە لەموسوڵمانانو لەکافرەکان: کە کێشەیان هەیە دەربارەی نامەی خودا، هەموو ئەوانـەی: کـە جیاوازییـان هـەبوە لەکتێبی تەوراتو هەندێکیان بڕوایان پێ کردو زوربەشیان ڕەتیان کـردەوە، خـودای تۆ ئەی موحەممەد! پاداشو سـزای خۆیـان بەتـەواوی دەداتـەوە، ﴿إِنَّـهُ بِمَـا يَعْمَلُـونَ خَبِيرٌ﴾ بێگومان پەروەردگار ئاگادارو زانایە بەهەر شـتێکی ئەوانـە ئـەنجامی دەدەن. هیچی لێ هون نابێ!!

## پابەند بوونو بەردەوام بوون لەسەر فەرمانی خودا

﴿ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْاْ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٢﴾ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار هەڵوێستی جوداخوازانی دەربارەی یەکتاپەرستیو پێغەمبەرایەتی روونکردەوە، بەدورو درێژی هەڕەشەی جۆراو جۆرو توندی ئاڕاستە کردن، وادەو بەڵێنی بەخوداپەرستان دا، ئەمجار لێرەدا فەرمانی بەپێغەمبەری ئیسلام کرد کە پابەندی ئەو فەرمانو جڵەوگیرییانە بێ کە ئاڕاستەی دەکرێن، ئیستیقامەی هەبێ، بەردەوام بێ لەسەر پابەند بوون بەفەرمانی خودا، دەفەرموێ: ﴿فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَنْ تَابَ مَعَكَ﴾ ئەی موحەممەد! خۆتو ئەوانەی شوێنت کەوتوون، رێبازی ئیستیقامە بگرنەبەر، لەبواری عەقیدەو کردەوەو ئەخلاقدا بەردەوام بن لەسەر رێبازی ئیسلام؛ رێبازی مام ناوەندی پەیڕەو بکەن، بەبێ ئیفراطو تەفریط. لەرێگای راست لامەدەن، بەردەوام بن لەسەر رێبازی خودا پەسەند، کە بریتییە لەیەکتاپەرستی بڕوا بوون بەوەی: کە خودا تاکو تەنیایە لەزاتو لەصیفاتدا، بڕوا بوونە بەغەیبو شتە پەنامەکییەکان: کە بریتیین لە بەهەشتو دۆزەخو زیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەو فریشتەو عەرشو هەموو ئەو شتانەی ئایین ئاماژەی پێ کردون.

ئیستیقامە بریتییە: لەپابەند بوون بەهەموو ئەو شتانەی قورئان فەرمانی پێ کردوە لەچوار چێوەی عیبادەتو مامەڵەو بیرو باوەڕەوە، ئیستیقامە پلەیەکی بەرزو پیرۆزە، کەسێك زەحمەت لەنەفسی خۆی نەکاو هەواو هەوەسی نەخاتە ژێر پێوە ئەو بەهرەیەی گیر ناکەوێ!!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە فەرمان بەئیستیقامەی ئاڕاستە کرا، هەستی بەگرنگی ئەم ڕەوشتە کرد، زانی پابەند بوون بەم ڕەوشتە چەند کارێکی قورسو گرنگە! تەنانەت فەرموودەیەکی لێوە ڕیوایەت دەکرێ کە ئاماژەی بەئەم ئایەتەی ئێرە کردوە کە فەرمانی بەئیستیقامە کردوەو فەرموویەتی: (شیبتني هود وأخواتها...) چونکە ئیستیقامە یانی مام ناوەندیو میانەڕەویو ڕێگا گرتنەبەر بەبێ لادانو ئیفراطو تەفریط. ئیستیقامە پێویستی بەدڵ هۆشیاری بەردەوام هەیە، پێویستی بەهەوڵو تێکۆشان هەیە بۆ دۆزینەوەی ڕێگای ڕاستو ڕەوان. پێویستی بەتەنظیمو کۆنتڕۆڵکردنی ڕەوتی ئادەمیزاد هەیە بۆ ئەوەی ڕێبازی حەق بەرنەدا، کەوابێ ئیستیقامە چاودێری کردنی هەموو جمو جوڵێکی ژیانەو کێشانیەتی بەتەرازووی وردبینو وردخوێنی خودایی.

حەزرەتی موساو هارونیش فەرمانیان پێکراوە کە پابەندی پەیامی خودا بنو ئیستیقامەیان هەبێو بەردەوام بن لەسەر ڕێبازی خۆیان. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَاسْتَقِيمَا وَلاَ تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ﴾يونس/٨٩.

پەروەردگار لەئایەتێکی تردا پاداشی ئەوانە دیاری دەکا کە ئیستیقامەیان پەیڕەو کردوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾فصلت/٣٠. ئەوانەی دەڵێن: ئەڵڵا خودامانە، پاشان بەردەوام بوون لەسەر ئەم ڕەوشتە، فریشتە دادەبارنە

سەریانو پێیان دەڵێن: مەترسن خەفەت مەخۆن، موژدەتان لێ بێ بەو بەهەشتەی وادەتان پێدراوە.

کاتێك سوفیانی ثەقەفی لەپێغەمبەری پرسی ئەی پێغەمبەری خودا! شتێکم پێ بڵێ: لەئیسلامدا لەوەبەولاوە دوا تۆ لەکەس پرسیار نەکەم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (قل آمنت بالله ثم استقم) بڵێ بڕوام بەخودا هەیەو پاشان ئیستیقامەت هەبێو بەردەوام بە لەسەر ئەو بیرو باوەڕەت! هەڵبەتە فەرمانکردن بەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەئیستیقامە ئەوە ناگەیەنێ: کە پێغەمبەر ئەو ڕەوشتەی نەبوە، بەڵکوو بەپێچەوانەوە پێغەمبەر ئەوپەڕی ئیستقامەی هەبوە، کەوابوو مەبەست بەم فەرمانکردنە پێی بەئیستقامە بەردەوام بوونو پابەندبونە بەو ڕێبازو پەیامەی بۆ نێردراوە، پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەرو شوێنکەوتوانی دەکا: کە بەردوام بن لەسەر ئیستیقامە چونکە ئیستیقامە باشترینو کاریگەر ترین چەکە بۆ سەرکەوتنو زاڵبوون بەسەر دوژمناندا. لەهەمان کاتدا هەڵنانی تێدایە بۆ موسوڵمانان، چونکە لەکاتێکدا فەرمان بەپێغەمبەر بکرێ بە ئیستیقامە موسوڵمانان بە(طریق الاولی)وە دەبێ پابەند بن.

ئایەتەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکا: کە شوێنکەوتنی دەقە شەرعییەکان پێویستەو نابێ هیچ ئەملاو ئەولای تێدا بکرێ.

دەسەڵاتدان بەعەقڵ بۆ ئەوەی بچێتە ناو باسو خواسی تایبەت بەزاتی خوداو صیفاتەکانی، دەم تێوەردان لەعالەمی غەیبو چۆنیەتی فریشتەو بەهەشتو دۆزەخ...هتد. زێدە ڕەویکردنە لەدەسەڵاتی عەقڵدا، چونکە گەورترین عاقڵمەندو فەیلەسووف نازانن حەقیقەتی خۆیان چیەو چۆنە، بەڵکوو نازانن: حەقیقەتی گیانلەبەرانی تریش چۆنەو چۆن نیە، دەی چۆن پەی بەحەقیقەتی زاتی خوداو

صیفاتەکانی دەبەن؟ یان چۆن پەی بەحەقیقەتی فریشتەو شتە پەنامەکییەکانی تر دەبەن؟!

بەراستی لادان لەشوێنکەوتنی دەقەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو بوارانەدا گومڕابوونو سەر لێ شێوانە، لادانە لەشەقامەڕێی خودا پەسندو ڕێبازی سەلەفی صالحو شوێنکەوتوانیان! لاسایی کردنەوەی ئەوانەیە کە ئایینی خۆیان بەشبەش کردو کێشەیان تێدا پەیدا بوو! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعاً كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ﴾الروم/٣٢.

باشترین ڕێگاچارە بۆ بنبڕکردنی کێشەو نیزاع گەڕانەوەیە بۆ قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پابەند بوون بەو پەیامو زانیاریەی لەو سەرچاوە خاوێنانەوە دەستمان دەکەوێ وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ﴾النساء/٥٩.

هەڵبەتە ڕاجیایی‌و ئیختیلاف لەبواری عەقیدەو بنەما ئایینییەکاندا کارێکی خراپو ناپەسندە، دەم تێوەردانە لەشتە غەیبییەکانو هەوڵدان بۆ ناسینی خودا بەعەقڵی ڕوتو پشتگوێ خستنی دەقەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کارێکی بێهودەیەو نەهی لێ کراوە.

بەڵام ڕاجیایی لەغەیری ئەو شتانەدا وەکوو کارو باری دونیایی، بەڕێوەبردنی وڵاتو چۆنیەتی ئاژەڵداری‌و کشتو کاڵ کردنو باغو بێستان وەبەرهەم هێنانو ئاڵو وێر کردنو بینا سازی‌و پیشەسازی...هتد ئەمانە عەقڵ ڕۆڵێکی سەرەکی تێیاندا هەیەو ناگونجێ گرنگی عەقڵ لەم بوارانەدا پاشگوێ بخرێ.

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار فەرمانی بەئادەمیزادان کرد بەئیستیقامە، ئەمجار نەهی دەکا لەشتێك کە پێچەوانەی ئەو رەوشتە پەسندەیە، دەفەرموێ: ﴿وَلا تَطْغَوْا﴾ سنور بەزێنی مەکەن، گومڕاو یاخی مەبن، لەخۆتان بایی مەبن، لوتبەرزیی مەنوێنن ﴿إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بێگومان خودا بیناو زاناو شنەوایە بەو کردەوانەی ئەنجامیان دەدەن، هیچی لێ هون نابێ سزاو پاداشتان دەداتەوە لەسەر هەموو گوفتارو کردەوەیەکتان. کەوابێ خۆتان بپارێزن لەنافەرمانی خوداو شتێك ئەنجام مەدەن ئەو پێی ناخۆش بێ!

هەڵبەتە بانگەوازی کردن بۆ ئیستیقامەو پابەند بوون پێوەی مەبەستێکی سەرەکی قورئانەو چەند جارێکی تر فەرمان بەئیستیقامەی دووبارە کردۆتەوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلِذَلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ وَقُلْ آمَنتُ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِن كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ اللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ اللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾الشوری/١٥. واتە: هەر لەبەر تەبایی‌و یەکیەتی لەئاییندا، بۆ ئەوەی تەفرەقەو جوداوازی لەئاییندا پەیدا نەبێ، ئەی موحەممەد! ئادەمیزادان بانگ بکە بۆ پابەند بوون بەئایینەوە، ئەمجار بەردەوام بە لەسەر بانگەوازییەکەت بەو شێوەی خودا فەرمانی پێ کردووی، بەهیچ جۆرێ شوێن موشریکەکان مەکەوە، بڵێ: من بڕوام بەهەموو نامە ئاسمانییەکان هەیە کە بۆ پێغەمبەران نێردراون، فەرمانم پێ کراوە: عەداڵەت بەرپا بکەم. پێیان بڵێ: ئەڵڵا بەدیهێنەری ئێمەو ئێوەشە، کردەوەی خۆمان بۆ خۆمانو هی خۆتان بۆ خۆتان ئایینی ئێمە ئەوەندە ئاشکراو واضیحە پێویست بەبەڵگەو دەلیل هێنانەوە ناکا، خودا رۆژی قیامەت کۆمان دەکاتەوە، بۆ دادگایی کردن‌و وەرگرتنەوەی پاداش‌و سزا. گەڕانەوە هەر بۆ لای خودایە.

ئەمجار پەروەردگار هۆشیارمان دەکاتەوە: کە مەیلی ستەمکارو موشریکەکان نەکەین ﴿وَلا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ بەهیچ شێوەیەك کەمترین مەیل مەکەن بۆ

لای ستەمکاران، خۆشتان نەوێن، مەراییان مەکەن، داوای کۆمەگییان لێ مەکەن، پشتیان پێ مەبەستن، رێبازیان بەجوانو پەسند مەزانن ﴿فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ﴾ ئەگەر وا بکەن شیاوی ئەوە دەبن: کە بەهۆی ئەو مەیلو رەغبەتەتان بۆ لای کافران سزای دۆزەخ سزا بدرێن، پەروەردگار لەسەر ئەو مەیلو رەغبەتەتان بۆ لای کافران سزای دۆزەختان دەدا ﴿وَمَا لَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ﴾ نیە بۆ ئێوە جگە لەخودا کەسێکی تر یارمەتیتان بدا، کەس نیە سوودتان پێ بگەیەنێ، عەزابتان لێ دوور بخاتەوە ﴿ثُمَّ لا تُنصَرُونَ﴾ پاشان ئێوە یارمەتیتان نادرێ، خودا پشتیوانیتان ناکا، چونکە پەروەردگار کۆمەکی بەستەمکاران ناکا، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾البقرة/٢٧٠، یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾الحج/٧١، فاطر/٣٧.

جا کە ئەمە حاڵی ئەوانە بێ کە مەیل دەدەنە ستەمکاران، هاوکاریکردنو خۆشەویستی ستەمکاران ببێتە هۆکاری چوونە ناو دۆزەخ، ئەی دەبێ حاڵی ستەمکارەکان خۆیان چۆن بێ؟!

کەسێك تێوەگلاو ئیشو کاری تێکەڵ بەستەمکاران بوو، بوو بەکار بەدەست لەژێر دەستیان، با بۆخۆی وردبێتەوە، گوفتارو کرداریان بەتەرازوی شەرع بکێشێ، ئەگەر ئەوان لەرێبازی شەریعەت لایاندا، ئەوە ستەمیان لەخۆیان کردوە، بەگوێکردنو پەیرەو کردنی فەرمانو نەهیەکانیان واجبە بەمەرجێ کارەکە بێ شەرعی نەبێ، سەرپێچی فەرمانی خودای تێدا نەبێ، ئەگەر فەرمانیان پێ کرد: کە وەزیفەیەك وەربگرێ، قازییەتیان وتارخوێنی جومعە یان وانە بێژی یان هەر وەزیفەیەکی لەم جۆرانەی پێ درا با وەری بگرێ بەمەرجێ بتمانەی بەخۆی هەبێ کە دەتوانێ ئەرکەکەی بەرێکو پێکی ئەنجام دەدا، بەڵام لەهەمان کاتدا پێویستە بەگشتی دەستی ستەمکاران بگرێ وەندێکی بۆی دەکرێ بەرەنگاری مونکەر ببێتەوەو هەوڵی گۆڕینی مونکەر بدا بەدەستو بەکردەوە، ئەگەر نەیتوانی بەزمان ئەگینا بەدڵ، ئەمەش نیشانەی بیرو باوەڕی لاوازە.

ئیمام ئەحمەدو خاوەنانی سونەنەکان ریوایەت دەکەن لەئەبو بەکرەوە کە هەستاو سوپاسی خودای کردو پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکینە! ئێوە ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾ دەخوێننەوە، ئاگادار ببنەوە: ئادەمیزادان هەر کاتێ ستەمکاریان بینیو دەستیان نەگرت، لەوانەیە خودا بەڵایەکی گشتیو هەمە جۆریان بۆ بنێری. ئاگادار ببنەوە: من لەخودی پێغەمبەرم ژنەوتووە دیفەرموو: ﴿ان الناس اذا رأوا المنكر بينهم، فلم ينكروه، يوشك ان يعمهم الله بعقابه﴾ بێگومان ئادەمیزادان ئەگەر کاری نابەجێیان بینی لەناویان بڵاوبۆتەوەو نارەزامەندی خۆیان دەر نەبڕی، نزیکە خودا عەزابی ئیقلیم گیریان بۆ بنێرێ.

## فەرمان بەنوێژ کردنو بەخۆڕاگری

﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ وَٱصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١١٥﴾ ﴾

دەربارەی نازڵبوونی ئەم ئایەتانە، هەردوو پیری فەرموودەو ئیبنو جەریر لەئیبنو مەسعوودەوە ریوایەت دەکەن، دەڵێ: پیاوێك ئافرەتێکی ماچ کردبوو، هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەی بۆ گێڕایەوە، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَأَقِمْ الصَّلاةَ طَرَفِي النَّهَارِ وَزُلَفاً مِنْ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ﴾ ناردە خوارێ پیاوەکە وتی: ئەمە هەر بۆ منە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: نەخێر بەڵکوو بۆ هەموو ئوممەتمە.

تیرمیذی لەئیبنو مەسعوودەوە بەم شێوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتی: من لەوپەڕی شاری مەدینە ئافرەتێکم تیمار دەکرد، وەمن تەنیا لەگەڵیا جوت نەبووم ئەگینا شتی ترم لەگەڵ کرد، ئەوەتام، فەرموو دەربارەی منو کارەکەم بڕیار دەرکە، چۆنت دەوێ ئاوا حوکم بدە، حەزرەتی عومەر وتی: خودا تاوانەکەی پۆشیوی، ئەگەر بۆ خۆت بێدەنگ بویتایە! پێغەمبەر هیچ وەلامی نەدایەوە، پیاوەکە ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بەدودا ناردو بانگی کردەوە، کە هاتەوە ئایەتی ﴿وَأَقِمْ الصَّلاةَ طَرَفِي النَّهَارِ وَزُلَفاً مِنْ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ﴾ی بەسەردا خوێندەوە. پیاوێك لەئامادەبوان وتی: ئەمە تایبەتە بەئەم کابرایەوە؟ فەرمووی نا ئەمە بۆ هەموو کەسە.

پەیوەندی ئەم ئایەتە بەهی پێشەوە ئەوەیە: پاش ئەوەی پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبەرو موسوڵمانان کرد کە ئیستیقامەیان هەبێو سنوور بەزێنی نەکەن لەئاییندا، ڕوونەکەنە ستەمکارانو مەیلو خۆشەویستیان بۆ تەرخان نەکەن. بەشوێن ئەوەدا فەرمانی بە نوێژ کردنو صەبرو خۆڕاگری ئاراستە کردن، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە: کە دوا ئیمان بەخودا نوێژ لەهەموو روکنێکی تری ئیسلامی گەورەترە. ئەمجار پلەی صەبرو خۆڕاگری دێتە پێشەوە، چونکە صەبر نیوەی ئیمانە. نوێژ بناغەی خودا پەرستییەو کۆڵەکەی ئایینە.

دەفەرموێ: ﴿وَأَقِمْ الصَّلاةَ طَرَفِي النَّهَارِ وَزُلَفاً مِنْ اللَّيْلِ﴾ ئەی پێغەمبەر! نوێژ بەتەواوی‌و ڕێكو پێکی ئەنجام بدە لەهەردوو سەری ڕۆژدا، هەموو ڕۆژێك نوێژەکانت ئەنجام بدە لەدوو تەرەفی ڕۆژدا: کە نوێژی بەیانی‌و نیوەڕۆو عەصر دەگرێتەوە، بەم ڕەنگە لەنیوەی ئەوەڵدا نوێژی بەیانی دەکرێ، لەنیوەی دووەمدا نوێژی نیوەڕۆو نوێژی عەصر دەکرێ، لەبەر ئەوە ئەم دوو نوێژە کەوتوونەتە یەك، چونکە لەکاتی جەمعدا یان نیوەڕۆ دەبرێتە لای عەصر، یان عەصر

دەهێندرێتە لای نیوەڕۆ، لەغەیری جەمعیش‌دا وەکوو دروستە نوێژی نیوەڕۆو پاش زەوال بکرێ، دروستیشە لەئاخرو ئۆخری وەختا بکرێ، واتە: کاتی کردنەکەی دەکەوێتە نزیك کاتی نوێژی عەصر.

بەکورتی پاش زەوال کاتی نوێژی نیوەڕۆو عەصرە، جا لەم ڕووەوە کە پاش زەوال کاتی ئیوارەیە، ئەم دوو نوێژە دەکەونە لایەکی ڕۆژەوە، نوێژی بەیانیش دەکەوێتە لایەکیەوە.

ئەو کاتانەیش کە نزیکی شەونو بە(زلفاً من اللیل) ئاماژەیان بۆ کراوە بریتیتن لەکاتی پاش ڕۆژ ئاوا بوون کە وەختی مەغریبەو ونبوونی ڕوناکی کەناری ئاسمانە کە وەختی نوێژی عیشایە، کەوابێ ئایەتەکە ئاماژەی بۆ هەر پێنج نوێژەکان تێدایە. وەکوو چۆن لەئایەتی تریش‌دا ئاماژەیان بۆ کراوە کە دەفەرموێ:

١- ﴿أَقِمِ الصَّلاَةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَى غَسَقِ اللَّيْلِ وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُوداً﴾الأسراء/٧٨.

٢- ﴿فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ، وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِيّاً وَحِينَ تُظْهِرُونَ﴾الروم/١٧ - ١٨.

٣- ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا وَمِنْ آنَاء اللَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ النَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَى﴾طه/١٣٠.

ئەمجار پەروەردگار لەئایەتەکەی ئێرەدا سوودو قازانجی نوێژ بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾ بێگومان کرداری چاکەو چاکەکاری (کە نوێژ بەشێکە لەچاکە) تاوانی پێشوو ڕەش دەکاتەوە، واتە: تاوانی بچوك، چونکە تاوانی گەورە کەفارەتو تۆڵەو حەدی خۆیان هەیە!! پێویستیان بە تۆبەی نەصووحو شتی تر هەیە!

ئیمام ئەحمەدو هی تریش لەئیمام عەلییەوە فەرموودەیەکیان ریوایەت کردوە دەفەرموێ: ئەبوبەکر بۆی گێڕامەوە دەفەرموێ: لەپێغەمبەرم ژنەوت، دەیفەرموو: (مامن مسلم یذنب ذنبا فیتوضأ، ویصلی رکعتین الا غفرله) هەر موسوڵمانێك تاوانێك بکا، ئەمجار دەستنوێژ بشواو دوو رکات نوێژ بکا ئیللا خودا لێی خۆش دەبێ.

لەصەحیحەیندا ریوایەت دەکا: کە عوسمانی کوڕی عەففان دەستنوێژێکی وەکوو دەستنوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ششت، ئەمجار فەرمووی: پێغەمبەری خودا ئاوا دەستنوێژی دەشۆردو دەیفەرموو: (من توضأ وضوئي هذا، ثم صلی رکعتين، لایحدث فیها نفسه، غفر له ما تقدم من ذنبه) هەر کەسێك وەکوو ئەم دەستنوێژ شتنەی من دەستنوێژ بشوا، پاشان دوو رکات نوێژ بکا، بەدڵ مەبەستی رەزامەندی خودا بێ، لێخۆشبون لەتاوانەکانی پێشووی دەستگیر دەبێ.

(الحسنات) کۆی (حسنة)یە، هەموو کردارێکی چاك دەگرێتەوە، (السیئات)یش کۆی (سیئە)یە لێرەدا بەمانا تاوانی پچوکە، چونکە تاوانی گەورە بەتۆبە نەبێ لەکۆڵ ناکەوێ، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلاً كَرِيماً﴾النساء/٣١.

هەر ئیمامی موسلیم فەرموودەیەکی ریوایەت کردوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (الصلوات الخمس کفارة لما بینهن، اذا اجتنبت الکبائر) پێنج نوێژە فەرزەکان دەبنە کەفارەتو تاوانشۆرەوەی نێوان خۆیان بۆ موسوڵمان بەمەرجێ ئەو موسوڵمانە تاوانی گەورەی نەکردبێ. نوێژ قەڵای موسوڵمانە، کۆبوونەوەیە لەگەڵ پەروەردگارو چپە کردنە لەخزمەت خودادا، لەکاتی بەڵاو موصیبەتدا پەنا بۆ نوێژ دەبرێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەر کاتێ تەنگو چەڵەمەو ناخۆشییەکی توش دەهات پەنای بۆ نوێژ کردن دەبرد.

**تۆبەی نەصوح چوار مەرجی هەن:**

١- وازهێنان لەتاوانو پەشیمان بوونەوە لێیان.

٢- بڕیاردانو سوور بوون لەسەر نەگەڕانەوە بۆیان لەداهاتوودا.

٣- ئەنجامـدانی کـردەوەی چـاك کـە ببێتـە هۆکـاری ڕەشـکردنەوەی تـاوان هەروەها گێڕانەوەی مافی خەڵك بۆیان.

٤- داوای لێبوردن لەوانەی بەدەستو زمانی ئەم تووشی زیان بوون.

﴿ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّاكِرِينَ﴾ ئـەو ئامۆژگارییانـەی پێـشوو کـە بریتـی بـوون: لەئیـستیقامەو کردنـی کـردەوەی بـاشو پەسـندو پابەنـد بـوون بەفـەرمانو جڵەوگیرییـەکانی پـەروەردگارو سـنوور نەبەزانـدنو مـەیل نـەدان بەسـتەمکاران، پەندو عیبرەتن بۆ ئەو کەسانەی پەند وەرگرنو شت دەبیسنو تێی دەگەنو هەست بەگرنگی دەکەن، خۆیان لەخەتەری خراپەکاری دەپارێزنو ترسـی خودایـان هەیـەو داوای لێبوردن لەتاوانەکانیان دەکەن.

﴿وَاصْبِرْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ صـەبر بریتییـە لەپابەنـدبوون لەسەر کردنی کاری چاكو نارەحـەتی بـەجێهێنانی، هـەروا خـۆگری لەسـەر کردنـی تاوانو داخوازییەکانی، خۆ بەدووربگرە لەهەموو شتێکی خراپو ناپەسندو حـەرام، لەکاتی بەڵاو ناخۆشیدا بەصەبرو ئـارام بـە، خـۆگرو ورە بـەرز بـە، بێگومـان خـودا نازو نیعمەتی بەهەشتتان بەنسیب دەکا.

## هۆکاری بەهیلاکچوونی گەل‌و نەتەوەکانی پێشوو

﴿ فَلَوْلَا كَانَ مِنَ ٱلْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُو۟لُوا۟ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ
عَنِ ٱلْفَسَادِ فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ ۗ وَٱتَّبَعَ
ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَآ أُتْرِفُوا۟ فِيهِ وَكَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿١١٦﴾ وَمَا
كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ
﴿١١٧﴾ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ
مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ۗ وَتَمَّتْ
كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوودا باسی ئەو عەزابو سزایانەی کرد: کە تووشی ئەو گەل‌و نەتەوانەی پێشوو بووە، ئەمجار لێرەدا باسی هۆکاری هاتنی ئەو عەزابە دەکا بۆ سەریان ئەویش دوو شتی سەرەکییە:

١- هەر کاتێ کەسانێك نەبوو جڵەوگیری لەبڵاوبوونەوەی فەساد بکا.

٢- ستەمکارو ملهوڕەکانیان شوێن شەهەوەتو ئارەزۆبازی خۆیان کەوتبوونو هەوڵو تێکۆشانیان بۆ پلەو پایە بوو، وازیان لەفەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە هێنابوو.

دەفەرموێ: ﴿فَلَوْلَا كَانَ مِنَ الْقُرُونِ مِنْ قَبْلِكُمْ أُولُوا بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ الْفَسَادِ فِي الْأَرْضِ﴾ ئەوە بۆچی لەناو ئەو گەلو نەتەوانەی کە لەچەرخەکانی پێش ئێوەدا بەهۆی ستەمکاری خۆیان لەناومان بردن، کەسانێك نەبوون خاوەن عەقڵو فامو ئایین، یان خاوەن قەدرو قیمەتو قسە بیستراوو ئەهلی خەیر، جڵەوگیرییان بکردایە لەو ستەمکارو ئاشوبگێڕو فیتنە جۆیانەی فەسادیان لەسەر زەوی بڵاوکردەوە، ئەوە بۆ کۆمەڵێك نەبوون خاوەن فەضڵو ئایینو هۆشمەند مەنعی جەمارەریان بکردایە لەفەسادو بەد رەوشتی، لەستەمکاریو ئاشووبگێڕی لەوڵاتدا، وڵاتو گەلیان لەو عەزابە رزگار بکردایەو بیانپاراستنایە!! ئەوە نەبوو، ئەوانە دەست نەکەوتن ﴿إِلَّا قَلِيلًا مِمَّنْ أَنْجَيْنَا مِنْهُمْ﴾ مەگەر کەمێ لەوانە کە رزگارمان کردن لەقارو غەزەبی خۆمان.

واتە: ئەوەی پێویست بوو بێ نەبوو، بەڵکوو ئەوەی رویدا ئەوە بوو: کە کەمێك لەموسوڵمانان کەم نمودو قسە نەبیستراو بێ ئەوەی کاریگەریان هەبێو شوێندەستیان دیار بێ، کەس بەگوێی نەکردن، خودا لەگەڵ پێغەمبەرەکانیاندا رزگاری کردن، لەکاتێکدا ستەمکارو ئاشوبگێڕەکان سوور بوون لەسەر هەڵوێستی خۆیانو وازیان لەژیانی تەرەفو فەساد نەهێنا، بەڵکوو ﴿وَاتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَا أُتْرِفُوا فِيهِ﴾ ئەو ستەمکارانە: کە زۆرینەی گەلو نەتەوەکان بوون، شوێن هەواو ئارەزۆی خۆیان کەوتن هەر خەریکی دەستەبەر کردنی نازو نیعمەتو پلەو پایەی دونیایی بوون، مەشغووڵی رابواردنو تاوانکاریو فەساد بوون، ئەگەر موصلێحێك ئامۆژگاری بکردنایە گوێیان بۆ نەدەگرت، خۆش رابواردنی دونیایان بەسەر بەختەوەری قیامەتدا هەڵبژاردبوو، ﴿وَكَانُوا مُجْرِمِينَ﴾ ئەوان لەهەڵبژاردنی ئەم جۆرە ژیانە بۆ خۆیانو سووربونیان لەسەر فەسادو ئاشوبگێڕان، لەناو تاوانو گومراییدا نوغرۆ بوبوون، خودا لەناوی بردن بەگوێرەی ئەو دابو نەریتو یاسایەی خۆی کە لەبوونەوەردا دایناوە. کە هەر کاتێ تەرەفو خۆش رابواردن لەناو گەلو نەتەوەدا

بڵاو بووەوە، سەردەکێشێ بۆ زێدە ڕەوی و ئیسراف، ئەویش سەر دەکێشێ بۆ فیسق و تاوان و ستەم و لادان لەڕێبازی ڕاستو پەسند. بەمەش شیاوی لەناو بردن و قەڵاچۆ کردن دەبن. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيراً﴾الأسراء/١٦.

پەروەردگار هەرگیز نەتەوەیەکی لەناو نەبردوە شارو گوندێکی وێران نەکردوە ئیللا ستەمکار بوون و شیاوی ئەو عەزابو لەناوبردنە بوون، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَـكِن ظَلَمُواْ أَنفُسَهُمْ﴾هود/١٠١. یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ﴾فصلت/٤٦.

ئەمجار پەروەردگار دادو نەرێتو هەڵوێستو عەدالەتکاری خۆی بەرامبەر موصلیحەکان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَى بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ﴾ واتە: ئەوە دادو نەرێتی خودا نیە، عەدالەتکاری ئەو نیە: کە ستەم لەگەڵو نەتەوەیەك بکا، بەناڕەوا لەناویان بەرێ، لەکاتێکدا ئەهلو دانیشتوانی ئەو شارو گوندانە حەقخوازو حەق پەرست بن، پابەندی ئەخلاقو ڕەوشتی بەرزو پەسەند بن، خەریکی ڕێکخستنی کارو باری خۆیان بن بەگوێرەی شەریعەتو یاسای خودا. چونکە پەروەردگار ستەمکار نیەو ستەم ناکا.

هەندێك لەراڤەکارانی قورئان مانای (ظلم)یان بەشیرك لێ داوەتەوە، ئەو کاتە مانای ئایەتەکە بەم جۆرە دەبێ:

پەروەردگاری تۆ ئەی موحەممەد! هیچ شارو گوندێك وێران ناکا بەهۆی ئەوەی: کە دانیشتوانەکانیان موشریکن و هاوەڵ بۆ خودا بەرەوا دەزانن لەحاڵێکدا ئەوان لەمامەڵەو هەڵوێستو کرداریان لەگەڵ یەکتردا ڕێکو پێك بن، لەناو خۆیاندا بۆ یەکتر باش بن و کارو باری کۆمەڵایەتی خۆیان بەرێکو پێکی هەڵسوڕێنن، واتە: وێرای شەریك دانانەکەیان ئاشوبگێڕو فیتنە جۆو فەساد کار نەبن، واتە: خودا عەزابی ڕیشەکێش نانێرێتە سەر گەڵو نەتەوەیەك تەنها لەبەر ئەوەی کە

موشریکن، بەڵکوو کاتێك عەزابی لەناوچوونیان بۆ دەنێرێ: کە وێڕای شەریك دانانەکەیان، لەناوخۆشیاندا مامەڵەیان باش نەبێ، هەوڵ بدەن یەکتر ئەزیەت بدەن، ماڵی یەکتری بەناحەق بخۆن، یەکتر بچەوسێننەوە، دەستدرێژی نامووس بکەنە سەر یەکتر! ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە: کە گەلو نەتەوە هەرچەند شەریك بۆ خودا دابنێن ریشەکێش ناکرێن. بەڵام هەر گەلو نەتەوەیەك ستەم بکا سنوور بەزێنی بکا لەناو دەچێو بەر قەرار نابێ.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە خۆی دەتوانێ هەموو ئادەمیزاد بکا بەیەك گەلو نەتەوە، یان هەموویان ئیماندار بن، یان هەموویان کافر بن، دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ﴾ ئەی موحەممەد! ئەگەر خودای تۆ بیویستایە هەموو ئادەمیزادەکانی لەسەر یەك ئایین کۆدەکردەوە، وای لێ دەکردن بەسروشت هەموویان خودا پەرست بوونایە وەکوو فریشتە، ئەو کاتە ئەم عالەمە عالەمێکی تر دەبوو! بەڵام ویستی خودا وا نەبوە کە هەموویان لەسەر یەك ئایین کۆ بکاتەوە، بەڵکوو وازی لێ هێناون بۆ خۆیان بەئیختیاری خۆیان رێبازی ژیانیان هەڵبژێرن، ئەوەتا جوداوازییان لەهەموو شتێکدا هەیە، تەنانەت لەبنەمای عەقیدەو بیرو باوەڕیشدا راجیاییان هەیە، تەنانەت لەو شتانەشدا کە نەدەبوو ئیختیلافیان تێدا ببێ وەکوو بڕوا بەرۆژی قیامەت: بیرو رایان جوداوازە، هەر کەسە بەگوێرەی مەیلو ئارەزۆو بیرو بۆچوونی خۆی رایەکی تایبەتی هەیە، هەر تاقمەو پشتگیری عەقیدەو مەذهەبێك دەکاو داکۆکی لێ دەکا.

ئەهلی سوننەو جەماعە پێیان وایە: ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر فراوانی دەسەڵاتی خودا، لەوەدا ئەگەر بیویستایە هەموو ئادەمیزادی لەسەر یەك ئایین کۆ دەکردنەوە، وای دروست دەکردن، قبووڵی یەك مەنهەجو پرۆگرام بکەن، بەڵام خودا ئەو ویستەی نەبوە وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِي

الأَرْضِ كُلُّهُـمْ جَمِيعـاً﴾ يـونس/٩٩. بـەڵێ: خـودا ئـەو ويـستەی نـەبوو وای نـەكرد؛ چونكە خودا ئادەميزادو جندۆكەی بـۆ بەنـدەگیو خـودا پەرسـتی دروسـت كـردون، بەندەییو خودا پەرستی كاتێك نرخی هەیە كە بەئیختیاری بـێو زۆرە ملێـی تێـدا نەبێ، بۆیە پەروەردگار هێزی ئامادەباشی بۆ چاكەو خراپـەی تێـدا دروسـت كـردن، عەقڵو هۆشو ويستـو ئیرادەو توانای پێ بەخشين، كە هـەر كەسـە بەويـستی خـۆی چـی دەكا بيكـا، ئـەمجار وێـڕای ئەمـەش رێگـەی چاكـو خراپـی بـۆ رون كردنـەوە، نامەی ئاسمـانی بـۆ نـاردوون، پێغەمبـەری بـۆ سـەر رەوانـە كـردوون، رێگـای چاكـو خراپيـان بـۆ روون كردوونـەوە، جـا هـەر كەسـەو بەويـستی خـۆی چ رێبازێـك هەڵدەبژێرێ با هەڵیبژێرێ..

ئـا بـەو جـۆرە ئـادەميزاد جـودا وازييـان تێـدا پەيـدا بـوو لـەئايينـدا لـەبيرو بـاوەڕدا، لـەڕاو بـۆ چـونـدا ﴿إِلاَّ مَـنْ رَحِـمَ رَبُّـكَ﴾ مەگـەر كەسـانێك كـە خـودا بەميهرەبانی خۆی هيدايەتی دابن بۆ هەڵبژاردنی رێگەی خودا پەسندو بەختياری، ئەوانە شوێن پێغەمبـەران كەوتنو پابەنـدی فـەرمانو جڵـەو گيرييـەكانيان بـوون، لەسەر ئەو رێبازەيـان بـەردەوام بـوون تـا دوا پێغەمبـەر: كە پێغەمبـەری ئيـسلامە هاتە سـەريانو شـوێنی كـەوتن، ئەوانـە كۆمـەڵی رزگـار بـووی ئـادەميزادن، فيرقـەی ناجييە ئەوانو بەس!

﴿وَلِذَلِكَ خَلَقَهُمْ﴾ واتە: هەر لەبەر ئەوەی بۆ خۆيان توانايان هەبێ بەويستی خۆيان رێبازی چاك يان خراپ هەڵبژێرن، بۆ ئەوەی ئەو ئيختيارميـەيان هـەبێ كە سەر دەكێشێ بۆ ئەو ئيختيلافە، پەروەردگار ئـادەميزادی دروسـتكردون، بـۆ ئـەوەی پاداشی باش بداتەوە بەئەوانەی رێبازی حەق هەڵدەبژێرنو پەيڕەوی دەكەن، سزای ئەوانە بدا كە رێگای خراپ هەڵدەبژێرنو پەيڕەوی دەكەن! [١٧]

(١٧) هەڵبەتـە ئەمـە ڕای موعتەزيلەكانـەو زومەخـشەری پەسـندی كـردوە. سـەيری تەفـسيری (كشاف) ج٢/١٣٠ بكە.

ئیمام مالیك دەفەرموێ: مانای ﴿وَلِذَلِكَ خَلَقَهُمْ﴾ بەم جۆرەیە: پەروەردگار ئەو ئادەمیزادانەی دروست کردون بۆ ئەو ڕێبازەی لەزانیاری خۆیدا دەیزانێ: کە هەڵیدەبژێرن لەئیختیلافو ئیتفاق. بۆ غەیری ئەو کارەی کە خۆی دەیزانێ هەڵیدەبژێرن دروستی نەکردوون! [٨]

ئەمە لەگەڵ رای زوربەی ڕاڤەکەراندا یەك دەگرێتەوە: کە دەفەرموون: (لا)ی (لذلك) لامی تەعلیلو باییس نیە، بەڵکوو لامی عاقیبەتو صەیرورەتە. واتە: ئیختیلافو ئیتفاق عیلەتی دروستکرنەکە نین وەکوو موعتەزیلەکان دەڵێن.

بەڵکوو خودا ئادەمیزادی دروست کردوون ویستو ئیختیاری پێ داون بۆ ئەوەی لەسەرنجامدا کارەکەیان سەربکێشێ بۆ ئیختیلاف هەروەکوو چۆن (لام)ی (لیکون) لەئایەتی ﴿فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوّاً وَحَزَناً﴾القصص/٨. لامی تەعلیل نیەو لامی عاقیبەتو صەیروڕەتو سەرەنجامە.. چونکە ئاشکرایە فیرعەون ئەگەر بیزانیایە منداڵە دۆزراوەکە (حەزرەتی موسا) لە ئاکامدا دەبێتە دوژمنو مایەی لەناو بردن بۆیان هەڵیان نەدەگرتەوە، یان یەکسەر ئەویشیان وەکوو نێرینەکانی تر دەکوشت.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: (لذلك) ئاماژەیە بۆ ئیختیلافو ڕەحمەت بەیەکەوە.

موجاهیدو قەتادە دەفەرموون: (ذلك) ئاماژەیە بۆ ڕەحمەت: کە لەرستەی ﴿إِلاَّ مَنْ رَحِمَ رَبُّكَ﴾ وەردەگیرێ، ئاوەڵناو لە(خلقهم)دا دەگەڕێتەوە بۆ ڕوحم پێکراوەکان!!

﴿وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ﴾ بڕیاری خودای تۆ ئەی موحەممەد! دەرچوو قەزاو قەدەری وا ئاڕاستە کرا، دانایی‌و زانایی خودا وا داخواز بوو: کە بەشێك

---

[٨] (الأساس في التفسير - سعید حوی) ج٥/٢٦٠٩.

لـەئادەمیزادو جنۆکـەی دروسـتیان دەکـا شـیاوی چـوونە نـاو بەهەشـت بـن، بەشێکیـشیان شـیاوی چوونە نـاو دۆزەخ بـن، بۆیـە لەئـەزەلدا ئـەم بڕیـارەی داوەو بڕاوەتەوە ئەویش بریتییە لەئەوە کە دەفەرموێ: ﴿لأَمْلأَنَّ جَهَنَّمَ مِنْ الْجِنَّـةِ وَالنَّـاسِ أَجْمَعِـينَ﴾ وەڵڵاهـی دەبـێ دۆزەخ پـڕ بکـەم لەجنـۆکـەو ئـادەمیزاد، دەبـێ لەگـەراو جینسی ئادەمیزادو جنۆکە دۆزەخ بهاخنم، لەوانـەی شوێن پێغەمبـەران ناکـەونو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانم نابن پەیامی پێغەمبەرەکان بەدرۆ دەخەنەوە..

## سوودی چیرۆكو سەرگوزشتەی پێغەمبەرانو فەرمان بەعیبادەتو پشت بەستن بەخودا

﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ
فُؤَادَكَ ۚ وَجَآءَكَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ
(١٢٠) وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَٰمِلُونَ
(١٢١) وَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ (١٢٢) وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ۚ وَمَا رَبُّكَ
بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ (١٢٣) ﴾

دوای ئـەوەی پـەروەردگار چیرۆکی پێغەمبـەرانی پێشووی بـۆ پێغەمبـەر ﷺ گێڕایەوە، ئـەمجار سـوودی ئـەو چیرۆکانە بـەیان دەکـا: کـە جۆرێکیـان پتـەوکردنو

دامەزرانــدنی دڵــی پێغەمبــەرە لەســەر بــەجێهێنانی پەیامەکــەی‌و خــۆڕاگری‌و تەحـەممولکردنی نارەحـەتی. جۆرەکـەی تریـان رونکردنـەوەی شـتێکە: کـە حـەق‌و راستەو پەندو ئامۆژگارییە بـۆ موسـوڵمانان. ئـەمجار کۆتـایی بەسـورەتەکە دەهێنـێ بەفەرمانکردن بـەعیبادەتـو خوداپەرستی‌و پشت بەستن بـەخوداو گرنگـی نـەدان بەدژایـەتی موشـریکەکان‌و دەفـەرموێ: ﴿وَكُـلاًّ نَقُـصُّ عَلَيْـكَ مِـنْ أَنْبَـاءِ الرُّسُـلِ﴾ دەخوێنینەوە بەسەر تـۆدا ئـەی پێغەمبـەر! هـەموو جـۆرە هـەواڵێکی پێغەمبـەرانی پێشوو لەگەڵ گەلەکانیان بۆ دوو مەبەستو قازانجی سەرەکی:

١- ﴿مَا نُثَبِّـتُ بِـهِ فُـؤَادَكَ﴾ یەکـەم بـۆ ئـەوەی دڵـت دابمـەزرێ‌و پتـەو ببـێ بـۆ بەجێهێنانی پەیامەکەتـو صەبرو ئارامت بـۆ پەیـدا ببـێ‌و لەبەرامبـەر ئەزیەتـدانی موشــریکەکان خــۆگرو پــشوو درێــژ بــی؛ چــونکە پێغەمبــەرانی پێــشوو لــەپێناو گەیاندنی پەیامەکەیاندا زۆریان ئەزیەت کێشاوە، گەلەکانیان بەدرۆیان خستنەوەو گاڵتەیان پێ کردن، ئەوان صەبریان گرتـو سوورتر بوون لەسەر هەڵوێستی خۆیان‌و گەیاندنی بانگـەوازی حـەق بـۆ نەتـەوەکانیان، لەسـەرەنجامدا خـودا سـەری خـستن‌و بەسەر دوژمنانیاندا زاڵـی کـردن، دوژمنـە کافرەکانیـانی ریـسوا کـرد! ئـەتۆش ئـەی موحەممەد! چاو لەهاوەڵە پێغەمبەرەکانت بکە، ئەوان بۆ تۆ قودوەو پێشەنگن.

٢- ﴿وَجَاءَكَ فِي هَذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: سـوودی دووەم بـۆ تۆ ئەوەیە: کـە لـەم سـورەتانەی چیرۆکی پێغەمبـەرانی تێدایـە، یـان لـەو چیرۆکـو نیشانانەدا کە بۆت رون دەکەینەوە: شتێکت بۆ هاتووە کـە حـەق‌و راسـتو یەقینـە: ئــەویش بریتییــە لــەتاکـو تــەنهایی خــوداو عیبــادەت بــۆ کردنــی بەخالــصی‌و چەسپاندنی زینـدوو بوونـەوەو تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خودا واز هێنـان لەفاحیـشەو کـاری خـراپ، لـەو هەواڵانـەدا پەنـدو ئامۆژگـاری هەیـە بـۆ کـافران‌و یادخـستنەوەو بیرەوەری هەیە بـۆ موسـوڵمانان، سـوودی لێ وەردەگـرن‌و ئیمانیـان پـێ زیـاد دەکـا، ئەوانەش: کە ئامادەباشییان تێدایە بۆ ئیمانهێنان پەلە لەموسوڵمانبوون دەکەن.

ئـەمجار دوای ئـەم هەڕەشـەو تـەرهیبو تەرغیبـە پـەروەردگار فـەرمان بەپێغەمبـەر دەکاو دەفـەرموێ: ﴿وَقُـلْ لِّلَّـذِينَ لا يُؤْمِنُـونَ﴾ ئـەی موحەممـەد! بـەو ئادەمیزادانـە بڵـێ: کـە سـوورن لەسـەر کـوفرو بێـدینیو بـەهیچ جۆرێـك بـڕوا بەپەیامەکەت ناکەن بەشێوەی هەڕەشە پێیان بڵێ: ﴿اعْمَلُـوا عَلَـى مَكَـانَتِكُمْ إِنَّـا عَامِلُونَ﴾ ئێوە لەسەر ڕێبازی خۆتـانو بـەگوێرەی مەنهەجو پرۆگرامـی خۆتـان کـار بکەن، چتان لەدەست دێ دژی مـن ئـەنجامی بـدەنو بـێ منـەت بـن، هەرچـی هێـزو تواناتان هەیە بیخەنـە کـار دژی ئیـسلامو بـۆ زیانگەیانـدن بەموسـوڵمانان، ئێمـەش بەگوێرەی شەریعەتو ڕێبازی خۆمـان کـاری خۆمـان ئـەنجام دەدەیـن، چـی بتـوانین لەبانگەوازی بۆ خێرو چاکە درێغی ناکەینو بەردەوامو سوورین لەسەر بیرو باوەڕی خۆمانو بەموو لێی لا نادەین!

﴿وَانتَظِرُوا﴾ ئێوە چاوەڕوان بن ئاخۆ ئێمە دەمـرین چیمان بەسـەردێ، ﴿إِنَّـا مُنتَظِرُونَ﴾ ئێمـەش چاوەڕوانی سـەرەنجامو ئاکامی ئێـوەین، بـزانین چـیتان بەسـەر دێ، چۆن بەهیلاك دەچنو بەچ شێوە عەزابێك تـەمبێ دەکـرێن. ئێمـە خـودا وادەو بـەڵێنی پـێ داویـن بەسـەرکەوتن بەسـەر ناحـەزانماندا، بەتـەما هاتنـە دی وادەو بەڵێنەکانی پەروەردگارین.

وێنەی ئەم هەڕەشەیە لەقورئاندا زۆرە وەکوو دەفـەرموێ: ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُـونَ مَن تَكُونُ لَهُ عَاقِبَةُ الدَّارِ إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾ الأنعام/١٣٥.

ئـەمجار پـەروەردگار کۆتـایی سـوڕەتەکە بەئایـەتێك دەهێنـێ: کـە هـەموو داخوازییەکی خێرو بەهرەمەندی لەخۆ گرتووە. دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ هـەر بـۆ خودایـە زانیـاری نهێنـی ئاسمانـەکانو زەوی. واتـە: پـەروەردگار زاناو ئاگادارە بەهەموو نهێنییەکی نـاو ئاسمانـەکانو زەوی لـەرابوردو حـاڵی حازرو داهـاتوودا، زانیارییەکـەی هـەموو کوللیـاتو جوزئیـات مەعـدومو مـەوجودێك دەگرێتەوە، دیاریو نادیاری لەلا وەکوو یەك وایە.

﴿وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ الأَمْرُ كُلُّهُ﴾ ئیشەکان هەموویان هەر بۆلای خودا دەگەڕێنەوە، چونکە ئەو کانو سەرچاوەی هەموو شتێکە، ئەو خودایە بەتواناو بەدەسەلاتە فەرمانی ڕەوایەو ویستی جێ بەجێ کراوە، هەموو بوونەوەر، هەموو بەندەکان لەژێر دەسەلاتیدا بێ وەچو زەبوونن، ڕۆژی قیامەت لەهەموو کەس دەپرسێتەوە، سزاو پاداشی هەموو کەس دەداتەوە، هەموو کردەوەیەك گەورەو پچووك حیساب دەکا.

دەی کە مادام خودا ئەوە زاتو صیفاتی بێ، هەموو شتێك بەدەست ئەو بێو بۆ لای ئەو بگەڕێتەوە، ﴿فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ﴾ بەخالصانەو دڵسۆزی عیبادەت هەر بۆ خودا بکە، با هەموو موسوڵمانان لەگەڵتدا هەر خودا بناسنو ئەو بپەرستن، لەهەموو کارو کردەوەیەکتدا پشتت بەخودا ببەستە، کەسێك تەوەککولی بەخودا بێو پشت بەئەو ببەستێ، خودای بەسەو حەوێجەی بەکەسی تر نیە.

﴿وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ خودای تۆ لەکردەوەی ئەو خەڵکە بێ ئاگا نیە، هەرچی دەیڵێنو دەیکەن لەخودا نهێنی نیە، لەدواییدا بەتەواوی پاداشو سزایان دەداتەوە، خۆتو شوێنکەوتوانت سەر دەخاو موشریكو بێدینەکان ڕیسوا دەکا.

ئیمام ئەحمەدو تیرمیذیو ئیبنو ماجە ریوایەتیان کردوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (الكيس من دان نفسه، وعمل لما بعد الموت، والعاجز: من اتبع نفسه هواها وتمنى على الله الأماني) عاقڵ کەسێکە خۆی دادگایی خۆی بکاو ئیش بۆ دوا مردنی بکا، عاجیزو بێ عەقڵ کەسێکە نەفسی شوێن هەواو ئارەزۆی خۆی خستووە، کرداری نیەو بەتەمای خودایە.

بەیارمەتی خودا لێرەدا سورەتی هود تەواو بوو خودا پشتیوانمان بێ بۆ تەواو کردنی سورەتەکانی تر...

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# سووره‌تی یوسف

ئـه‌م سـوره‌ته نـاونراوه سـوره‌تی یوسـف چونکه چـیرۆکی حـه‌زره‌تی یوسفی تێدایه..

ریوایـه‌ت کـراوه: کـه جوله‌کـه‌کان پرسـیاریان لـه پێغه‌مبـه‌ر (دروودی خـودای له‌سه‌ر بـێ) کـرد ده‌ربـاره‌ی چیرۆکی یوسـف ئـیتر ئـه‌م سوره‌ته نـازڵ بـوو، سـه‌عدی کوڕی ئه‌بو وه‌ققاص ده‌فه‌رموێ: قورئان بۆ پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سـه‌ر بـێ) هـات ماوه‌یـه‌کی زۆر بـۆی خوێندنـه‌وه، کافره‌کـان وتیـان: بریـا چـیرۆکت بـۆ بگێڕاینایه‌ته‌وه! ئیتر ئه‌مه نازڵ بوو ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ﴾یوسـف/٣، الکهـف/١٣. ماوه‌یه‌ك ئه‌مه‌ی بۆ خوێندنه‌وه، ئه‌مجار وتیان: ده‌کوا بۆمـان بگێـڕه‌وه! ئـیتر ئه‌مـه نازڵ بوو ﴿اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ﴾الزمر/٢٣.

بێگومـان سـوره‌تی (یوسـف) پـاش ئـه‌وه نـازڵ بـوو کـه به‌تـه‌واوی پێغه‌مبـه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) له‌لایه‌ن کافره‌کانی مه‌ککه‌وه ته‌نگه‌تاو کـرا، دوای ئـه‌و ساڵه خه‌مناکییـه هاتـه خـوارێ: کـه پێغه‌مبـه‌ر (دروودی خـودای له‌سـه‌ر بـێ) دوو پـشتیوانو یارمه‌تیـده‌ری رواڵـه‌تی دڵـسۆزی لـه‌کیس چـوو، خه‌دیجـه‌ی خێزانـیو ئه‌بوطالیبی مامی کۆچی دووایییان کرد، له‌دونیا ده‌رچوونی ئـه‌م دوو یارمه‌تیـده‌ره ئه‌وه‌نده له‌سه‌ر شانی پێغه‌مبه‌ر (دروودی خـودای له‌سـه‌ر بـێ) گـران بـوو ساڵه‌که‌ی ناونا ساڵی غه‌م (عام الحزن).

جـا هه‌رچـه‌نده ئـه‌م سـوره‌ته له‌مه‌ککـه هاتۆتـه خـوارێو مه‌ککه‌ییـه، ئوسلووبه‌که‌ی له‌سه‌ره‌خۆو ده‌مارشێله، ئارامیو سۆزی تێدایه، نه‌رمو نیانیو سفتو

سۆڵی لەخۆ گرتووە، واتە: هەرچەندە سورەتەکە مەککەییەو سورەتی مەککیش توندو تیژییان تێدایە کەچی ئەم سورەتە هەڕەشەو توندو تیژی تێدا بەدی ناکرێ.

ئیمام عەطاو دەفەرموێ: هەر غەمبارێك گوێی لەسورەتی یوسف بێ دڵی دادەمرکێ.

بەیهەقی لە(الدلائل)دا لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: کۆمەڵێك جوولەکە کاتێك گوێیان لێ بوو پێغەمبەر ئەم سورەتەی دەخوێند ئیمانیان هێنا، چونکە لەگەڵ زانیاری لای خۆیان یەکیان دەگرتەوە.

سورەتی یوسف دوای سورەتی هود نازڵ بووە، پەیوەندیشیان بەیەکترەوە هەیە، چونکە هەردوکیان چیرۆکی پێغەمبەرانیان تێدان، هەردووکیان ئەوە دەچەسپێنن: کە نیگای ئاسمانی بۆ پێغەمبەر هاتووە، بێگومان چیرۆکی هەموو پێغەمبەرێك زیاد لەجارێك لەسورەتەکانی قورئاندا دووبارە بۆتەوە، هەر جارە بەئوسلوبو شێوازێکی جیاو بۆ مەبەستێکی تایبەتو پەندو ئامۆژگارییەکی تر، ئیللا چیرۆکی یوسف ﷺ نەبێ. کە چیرۆکی ئەم جگە لەم سورەتە لەسورەتی تردا نەهاتووە، هەموو فەصلو رووداوەکانی چیرۆکی حەزرەتی یوسف لەم سورەتەدا بەزنجیرەو یەك لەدوا یەك رانوێنراون، ئەمەش ئاماژەیە: بۆ ئەوە: کە قورئان هەمووی ئیعجازەو سەرئاسایە چیرۆکەکە هەمووی بێ، یا بەشێکی بێ، بەکورتی بێگێڕێتەوە یان بەدرێژی لەهەموو رویەکەوە ئیعجازەکەی خۆی لەدەست نادا.

زانایانی بەلاغەو تەفسیر فەرموویانە پەروەردگار چیرۆکی پێغەمبەرانی لەقورئاندا گێڕاوەنەوە، هەندێکیانی بەئوسلووبی جیا جیا چەند جارێك دووبارە کردونەوە، وشەو رستەکانیان گۆڕانکاری تێدا کراوە، ئاستی بەلاغەو خۆشخوانی چیرۆکەکان لەروی رەوانیو سفتو لووسییەوە جوداوازییان هەیە، چیرۆکی حەزرەتی یوسف دووبارە نەکراوەتەوەو یەك جار هاتووە، هەمووشیان لەرووی

ئیعجازەوە سەرئاساو لەژوور پلەی ئاساییین. چیرۆکەکە دووبارە کرابێتەوە یان یەکجار هاتبێ لەپلەی ئیعجاز دانەبەزیوەو کەس نەیتوانیوە بەربەرەکانی بکا.

ئەم سورەتە هەموو چیرۆکی حەزرەتی یوسفی لەخۆ گرتووە، هەموو باس‌و رووداوە سەرنج راکێشەکان بەخۆش‌و ناخۆشەوە بەدڵخۆشکەرو خەمناکەکانیەوە کۆ کردۆتەوە.

سەرەتا باسی پلەو پایەی حەزرەتی یوسف دەکا لەلای یەعقووبی باوکی‌و ئاستی خۆشەویستی یوسف لەدڵی‌دا دەست نیشان دەکات، ئەمجار پەیوەندی یوسف بەبراکانیەوە، پیلان‌و نەخشەکێشانیان بۆ لەناو بردنی‌و سەرەنجام خستنە ناو بیرەوە، ئەمجار دەرهێنانی لەناو بیرەکەو پاشان بردنی بۆ ناو بازاڕی میصرو فرۆشتنی بەعەزیزی میصر وەکوو کۆیلەو دەستاو دەست پێ کردنی دوور لەنازی باوك‌و دایك، دوور لەخزم‌و کەس‌و کارو دڵسۆزانی. ئەمجار پیلان‌و فێڵی ژنی عەزیزی میصرو ژنە هاوەڵەکانی، پێش ئەوەش تاقیکردنەوەو بەربەرەکانی لەگەڵ ژنی عەزیزو دان بەخۆدا گرتن‌و بەرەنگار بوونەوەی نەفس‌و ئارەزۆی گەنجایەتی‌و شەهوەت‌و ئیغرائات، ئەمجار راپێچ کردنی بۆ بەندینخانەو میحنەتی ناو ئەو کوونە رەشەو هەڵس‌و کەوت کردن لەگەڵ کۆمەڵێك بەندکراوی جیا جیاو نامۆ بۆ ئەو، ئەمەش پاش ئەو ژیانە خۆشەی کە ماوەیەك لەماڵی عەزیزدا بەسەری برد. ئەمجار رزگار بوونی لەبەندینخانەو بوونی بەخاوەن دەسەڵات‌و ئەمینداری کۆکردنەوەو عەمبار کردنی بژێوی میللەتێك، بۆ ماوەیەکی دوور درێژ، چەند ساڵێك لەو لێپرسراویە گرنگەدا مایەوە لەو فەرمانگە گرنگەدا کەسی یەکەم بوو: کە بژێوی ئەو وڵاتەو وڵاتانی دەورو بەریشی لەئەستۆدا بوو، ئەمجار هاتنی براکانی‌و چاوپێکەوتن‌و راسپاردنیان بۆ ئەوەی برا پچووکەکەی تریشیان بێنن‌و هەریەکەیان بارێك بژێو (قووت) ببەنەوە.

ئـەم روداوو تاقیکردنەوانـە هـەموویان ئەزمونگـەو بۆتـە بـوون بـۆ یوسـفو تێیاندا قاڵ بوو، لەبەرامبەر ئەم هەموو روداوو بەسەرهاتانەدا ئـەو خـۆی راگـرتو پشتی بـەخودا بەسـتو بانگـەوازی بـۆ خـودا پەرسـتی دەكـردو، هـەوڵی دەدا خـودا بەخەڵكی بناسێنێ، لەهیچ كاتێكدا خودای لەبیر نەكرد، هەموو روداوەكانی بەسـەر بـەرزیو راسـتاڵی بەدەسـتپاكیو داوێنپـاكی بـەبڕوای پـۆڵایینو ورەی بـەرزەوە پێچانەوە، دوا سـەروەریو دوا ئـاواتی لـەو كاتـەدا كـە بـاوكیو دایكی هاتنـە لایـیو بەكـەسو كـاری شـاد بـووەوە خەونەكـەی هاتـە دی، لـەو كاتـەدا كـە وێـڕای موڵـك سەڵتەنەتو زانیاری پلەی پێغەمبەرایەتیشی درابوویە، شوكرو سوپاسی خودا دەكاو لێی دەپاڕێتەوە كە بەموسوڵمانی بمرێو بخرێتە ریزی صاڵحانەوە.

لەكۆتایی چیرۆكەكەدا چەند عیبرەتو پەندێكی رانواندوە، هەرە گرنگەكەیان چەسپاندنی پێغەمبەرایەتی حـەزرەتی موحەممـەدو دڵدانـەوەیو مزگێنـی پێـدانی بـەهاتنی خۆشـی دوای تەنگانـە، ئیسـتراحەتكردن دوا ماندوبوونـە چـونكە ئـەوەتا حـەزرەتی یوسف لەبەندینخانـەوە گواسـترایەوە بـۆ قەصـری پاشـا، كـرا بەعـەزیزی میصرو ئەمینداری قوتو بژێوی خەڵك، هەر كەسێك صەبر لەسـەر بـەڵاو تەنگانـە بگـرێ حەتمـەن رۆژێـك لـەرۆژان دەرووی لێ دەكرێتـەوەو دەكەوێتـە خۆشـییەوە، هـەروەكوو چـۆن هەڕەشـە لەموشـریكەكان دەكـا بـەهاتنی عـەزاب ئەگـەر واز لەهەڵوێستی خۆیان نەهێنن.

حەزرەتی یوسف كوڕی حەزرەتی یەعقووبە كە بـە(ئیـسرائیل الله) مەشهورە، ئەویش كوڕی حـەزرەتی ئیسحاقە ئـەویش كـوڕی حـەزرەتی ئیبراهیمـە! حـەزرەتی یوسـف زۆر جـوانو روح سـوكو خـوێن شـیرین بـوو، بـاوكی زۆری خـۆش دەویـست، ئەمـەش وایكـرد براكـانی رقیـان لێـی بـێو پیلانـی لـەناوبردنو سـەرنگونكردنی دابڕێژن.

هێشتا تەمەنی حەڤدە هەژدە ساڵ بوو: کە لەخەودا بینی یازدە ئەستێرەو خۆرو مانگ سوژدەیان بۆ دەبرد، کە ئەم خەونەی بۆ باوکی گێڕایەوە موژدەی پێغەمبەرایەتی‌و پلەو پایەی پێدا. پاش ماوەیەك براکانی ویستیان نەخشەو پیلانەکەیان تەنفیذ بکەن، داوایان لەباوکیان کرد: کە بەمەبەستی گەشتو گوزارو یاریکردنو سەیران یوسفیان لەگەڵدا بنێرێ بۆ دەشتو سارا، بردیانو خستیانە ناو بیرێکەوەو ئێوارە بەگریانەوە هاتنەوە بۆ لای باوکیان بەدرۆ وتیان: ئێمە لەیوسف بێ ئاگا بوینو گورگ خواردی، باوکیان بڕوای پێ نەکردنو قسەکەیانی بەدرۆو هەڵبەست زانی، پاشان کاروانێك هاتو دوڵچەیان داهێشتە ناو بیرەکە بۆ ئاوو یوسف خۆی پێوە هەڵواسی‌و هاتە دەرەوە، بردیان لەبازاڕی میصر بەبەهایەکی کەم فرۆشتیان ئەو کەسەی یوسفی کڕی عەزیزی میصر بوو، ناوی (فوطیفار) یان (ئەطغیر) بوو خۆشی ویستو چووە دڵیەوە، دەسەڵاتی دارایی‌و ئیداری لەماڵی خۆیدا پێدا، کردی بەلێپرسراوی خزمەتچی‌و پیاوەکانی، بەزولەیخای خێزانیشی گوت: ڕێزی بگرەو دەست بەر دەستی مەهێنە..

جوانی‌و شۆخی یوسف وای لەخێزانی عەزیزی میصر کرد کە حەزی لێ بکاو داوای لێ بکا شرواڵ پیسی لەگەڵدا بکا، نەك هەر داواکردن بەڵکوو فەرمانی پێ کردو زەختی بەکار هێنا. لەبەرامبەر ئەم هەموو ئیغرائاتو زەخت لێکردنو هەوڵدانەی زولەیخا حەزرەتی یوسف خۆی گرتو بەیدەست نەبوو، بڕوای پتەوی بەخوداو پابەند بوون بەفەرمانو جڵەوگیرییەکانی، وایان لەحەزرەتی یوسف کرد خۆ لەو خیانەتە بپارێزێ، هەروەها پیاوەتی عەزیزی میصری لەبەرچاو بوو، هەرچەند بیری دەکردەوە: نابێ پاساوی ئەو پیاوەتیە بەو خیانەتە بداتەوە، لەهەمان کاتدا دابو نەرێتی باوکو باپیرانی ڕێگەی پێ نادەن کارێکی ئاوا ناپیاوانە ئەنجام بدا. هەرچەندە زولەیخا هەوڵی داو زەختی لێ کردو هەڕەشەی لێ کرد، یوسف نەهاتە ژێر فەرمانی، ئەمجار شەهوەتو ئارەزۆ ئەوەندەی تین بۆ زولەیخا

هێنا: كه‌ په‌لاماری بداو له‌ئامێزی بگرێ، سابه‌ڵكوو یوسف له‌شه‌رمان یان له‌ترسان یان ئه‌ویش ئارەزۆی بجووڵێو به‌مه‌ستی خۆی بگا، هه‌رچه‌ند زوله‌یخا پڕی دادەیه‌و دەیه‌ویست له‌ئامێزی بگرێ حه‌زره‌تی یوسف پاڵی پێوه‌ دەناو داكۆكی له‌خۆی دەكرد، تا كار گه‌یشته‌ ئه‌وه‌ یوسف هه‌ڕه‌شه‌ی كوشتنیشی كرد ئه‌گه‌ر وازی لێ نه‌هێنێ ئا له‌و كاته‌دا یوسف چاوی لێ بوو مه‌وكیبی عه‌زیز (مێردی زوله‌یخا)به‌ره‌و ماڵ دێته‌وه‌، ئیتر به‌ره‌و دەرگای حه‌وشه‌ رای كردو زوله‌یخا به‌دویدا، پێش ئه‌وه‌ بگاته‌ نزیك دەرگا زوله‌یخا له‌دوواوه‌ پڕی دایه‌و یه‌خه‌ی كراسه‌كه‌ی دڕاندو له‌ناو دەرگادا به‌و حاڵه‌ شپرپوی‌و سه‌یره‌، تووشی عه‌زیزی میصر بوون! كه‌ زوله‌یخا له‌و حاڵه‌دا مێردەكه‌ی خۆی بینی له‌به‌ردەرگاو دەیه‌وێ وەژوور بكه‌وێ، خێرا بوختانێكی بۆ یوسف هه‌ڵبه‌ستو وتی: ئه‌وەتا: ئه‌مه‌ دەیه‌وێ دەستدرێژی بكاته‌ سه‌رم! حه‌زره‌تی یوسف خێرا به‌درۆی خسته‌وەو وتی: نه‌خه‌یر ئه‌و دەیه‌ویست ئه‌و كاره‌ بقه‌ومێ‌و من بێ تاوانم، عه‌زیزی میصر ویستی به‌به‌ڵگه‌ بۆی دەربكه‌وێ خه‌تا له‌كامیانه‌و كێیان تاوانبارن. شایه‌دێك هاته‌ پێشه‌وه‌ وتی: بڕوانن ئه‌گه‌ر كراسه‌كه‌ی له‌پێشه‌وه‌ دادڕاوه‌ ئه‌وه‌ زوله‌یخا راست دەكاو یوسف درۆ دەكا، ئه‌گه‌ر له‌دوواوه‌ دادڕاوه‌ ئه‌وه‌ یوسف راست دەكاو زوله‌یخا درۆ دەكا. كه‌ سه‌یریان كرد كراس به‌شێوه‌یه‌ك دادڕاوه‌ كه‌ راستی یوسف دەگه‌یه‌نێ‌و زوله‌یخا به‌درۆ دەخاته‌وه‌. تاوانه‌كه‌ به‌زوله‌یخاوه‌ لكاو یوسف به‌پاكی رزگاری بوو. ئیتر عه‌زیزی میصر فه‌رمانی به‌یوسف كرد: كه‌ هه‌واڵه‌كه‌ دابپۆشرێ‌و بڵاو نه‌بێته‌وه‌، فه‌رمانیشی به‌زوله‌یخا كرد كه‌ داوای لێخۆشبوون بكاو تۆبه‌ بكاو جارێكی تر ئه‌م تاوانه‌ دووباره‌ نه‌بێته‌وه‌.

به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وەشدا هه‌واڵی حه‌زلێكردنی خێزانی عه‌زیز به‌ناو شاردا بڵاوبووه‌وه‌، هه‌موو كه‌س بیستیان: كه‌ زوله‌یخا حه‌ز له‌به‌نده‌ی خۆی دەكاو باسی دڵداری ئاغه‌ژن له‌گه‌ڵ به‌نده‌كه‌ی بوو به‌بنێشته‌ خۆشكه‌ی بن ددان.

ئافرەتانی شار سەرزەنشتیان کرد، وتیان فلان حەز لەبەندەکەی خۆی دەکا. ئەویش بانگی کردن بۆ وەتاغو خواردەمەنییەکی بۆ دانان کە پێویستی بەکێردو چەقوە بیو هەریەکەی کێردێکی دایە دەستیانو فەرمانی بەیوسف کرد کە بێتە ناویانو ببیینن، کاتێ چاویان پێی کەوت جوانیو شۆخو شەنگی تاساندنی هەریەکەیان لەجیاتی ئەوە خواردەمەنییەکە بەکێردەکە قاش بکەن دەستی خۆیان بڕیو سەرسام بونو وتیان: ئەمە ئادەمیزاد نیە، ئەمە فریشتەیە، هەر کەسێ ئەمە ببینێ حەزێ لێ دەکاو زولەیخا لۆمەی ناکرێ کەوا عاشقی بووە..

ئەمجار زولەیخا داشی سواربوو وتی: ئاخر ئەوەیە: من عاشقی بومو ئێوە سەرزەنشتم دەکەن، ئەگەر ئەوەی پێی دەڵێم: بەگوێم نەکا دەیخەمە بەندینخانەوە، سزای دەدەم. ئیتر هەواڵی خۆشویستنی زولەیخا بۆ حەزرەتی یوسف لەناو خەڵکا بەتەواوی بڵاو بووەوە عەزیزی میصر وای بەباش زانی بۆ ئەوەی سومعەی خێزانەکەی نەشکێ، یوسف بخاتە بەندینخانەوە، یوسف نێردرایە بەندینخانەو بەرێکەوت دوو کوڕی گەنجی تر لەتەکیا نێردرانە بەندینخانە، یەکێکیان سەرکاری ئاشپەزەکانی ماڵی پاشا بوو یەکێکیشیان لێپرسراوی ئاو گێڕو مەیگێڕەکانی ماڵی پاشا بوو.

مەیگێڕەکەیان لەخەودا بینی: کە لەپیاڵەی پاشادا شەراب دەگوشێ، ئەوی تریشیان وای بینی لەخەویدا کە سینییەك خواردەمەنی بەسەر سەریەوەیەتی باڵندەو ئادەمیزاد لێیان دەخوارد. جا داوایان لەیوسف کرد مانای خەونەکانیان بۆ لێك بداتەوە: حەزرەتی یوسف بەتوانایی خۆی لەمانای خەوندا دەرخستو ئامادەباشی خۆی دەربڕی بۆ مانا لێدانەوەکە، وەلێ پێش ئەوەی دەست بکا بەمانا لێدانەوەی خەونەکان بانگەوازی ئەوانو بەندییەکانی تریشی کرد بۆ خودا پەرستیو یەکتاپەرستی! ئەمجار بەمەیگێڕەکەیانی گوت: تۆ رزگارت دەبیو

دەچیەوە لای پاشاو دەبیەوە مەیگێڕ. بەئەوی تریشیانی گوت: ئەتۆ ئیعدام دەکرێییو هەڵدەهاوەسرێیو باڵندە گۆشتەکەت دەخۆن.

ئەمجار بەئەوەیانی گوت: کە پێی وا بوو رزگاری دەبێ، لای پاشا باسی من بکە، پێی بڵێ: پیاوێکی ئاوا بێ تاوان وا لەبەندینخانەدایەو دەزانێ مانای خەونیش لێ بداتەوە. بەلام شەیتان لەبیری بردەوەو کە چووەوە لای پاشا ئەو راسپاردەیەی هەر لەبیر نەهاتەوە، نزیکەی حەوت ساڵێکی تریش لەبەندینخانەدا مایەوە..

پاشان پاشا بۆ خۆی خەونێکی دی، خەونەکەی زۆر لەسەر دڵی کاریگەر بوو: لەخەویدا بینی: حەوت گای قەڵەو حەوت گای کزو لاواز دەیانخواردن حەوت گوڵە گەنمی سەوزی جوان یەك لاسکیان هەبوو حەوت گوڵە گەنمی وشکەوە بوو دەیانخواردن!! پاشا فەرمانی دەرکرد ساحیرو خەون لێدەرەوەیان ئامادە کردن داوای مانای خەونەکەیان لێ کرا هەموو وتیان ئەمە خەونێکی بێ سەرو بەرەو ئێمە مانای خەونی ئاوا پڕو پووچ نازانین.

کابرای مەیگێڕی کۆنە هەواڵی یوسف لەبەندینخانەدا یوسفی بیر کەوتەوە، پێشنیاری کرد بینێرن بۆ بەندینخانەو یوسف لەگەڵ خۆیدا بهێنێ بۆ خزمەت پاشاو مانای خەونەکەی لێك دایەوەو مانای خەونەکەی بۆ پاشا بردەوە، پاشا فەرمانی دەرکرد: هەر ئێستا بڕۆن ئەم کابرا زاناو ژیرەم بۆ بێنن دەیکەمە راوێژکاری خۆم. حەزرەتی یوسف رازی نەبوو هەروا بەئاسانی لەبەندینخانە بێتە دەرێ، ویستی لێکۆڵینەوەو توێژینەوە لەبارەی پیلانی ژنەکانو خێزانی عەزیزی میصرو چۆنیەتی بەندکردنەکەی ئەنجام بدرێو بەرائەتی خۆی لەو تاوانە وەپاڵدراوەی لەسەری بەند کراوە ڕابگەیەندرێ.

پاشا فەرمانی دەرکرد ئافرەتەکانی کۆکردەوە پرسیارو لێکۆڵینەوەی لەگەڵ ئەنجام دان، هەموو وتیان حاشا لەئێمە هیچ خراپەیەکمان لەم پیاوە نەبینیوە، ژنی

عەزیزی میصر (زولەیخا) هاتە قسەو بێ تاوانی یوسفی راگەیاندو وتی: من حەزم لێ کردوە ویستومە بەیدەستم ببێو ئەو کەمەندێکیش نەبوەو خۆی نەداوە بەدەستەوە، ئەم پیاوە پیاوێکی راستو داوێنپاکو بێ تاوانە. ئەمجار حەزرەتی یوسف هاتە قسەو وتی: من ئەم توێژینەوەم بۆیە مەبەست بوو بۆ خاتری عەزیز (مێردی زولەیخا) بزانێ من پاشەملە خیانەتم لێ نەکردوە، بزاندرێ کە خودا فێڵو فەجەری خیانەتکاران سەرناخا، وەمن نەفسی خۆم لەم بوختانە بەری ناکەم چونکە نەفسو ئارەزۆ هەردەم فەرمان بەخراپەکاری دەکەن، مەگەر کەسێك خودا رەحمی پێ بکا.

حەزرەتی یوسف لەزیندان بەبێ تاوانو بەریی رزگاری بوو هاتە دەر، پاشا داوای لێ کرد بیکاتە کاربەدەستی خۆیو ویستی بزانێ بۆ خۆی چ کارێکی پێ خۆشە؟ حەزرەتی یوسف، وتی: بمکەنە ئەمینداری گەنجو خەزێنەی میصرو دەسەلاتو تواناى پێویستم پێ بدەن بەم شێوە حەزرەتی یوسف بوو بەوەزیری دارایيو بازرگانیو لێپرسراوی یەکەم لەو فەرمانگە گرنگەدا..

حەوت ساڵ هەرزانی تێپەڕینو سالانی گرانی سەرەتایان پەیدا بوو، حەزرەتی یوسف فەرمانی کرد: کە دەست بکرێ بەفرۆشتنی ئەو گەنمو خەلەیەی لەسالانی هەرزانیو هاتدا کۆکراوەتەوە، بەپێی پێویستیو بەشێوەیەکی رێکو پێك بەپێی نەخشەو ئامارێکی برپار لەسەر دراو بفرۆشێتەوە بەدانیشتوانی میصر.

ئەمجار دانیشتوانی ولاتانی دەورەو بەر برسیایەتی تینی بۆ هێنانو رویان کردە میصر بۆ کرینی خواردەمەنی، دانیشتوانی فەلەستین کاروانیان نارد بۆ میصرو حەزرەتی یەعقوب کوڕەکانی خۆی بەچەند وشترو ولاغی ترەوە نارد بۆ میصر بۆ هێنانی گەنمو جۆ، کاتێك کوڕەکان هاتن، حەزرەتی یوسف ناسینیەوە، بەلام ئەوان نەیانناسیەوە، چونکە ئەو کاتە تەمەنی چوبوە چل ساڵیو شێوەو روخساری گۆڕا بوو، پاشان داوای لێ کردن: کە برایەکی باوکی پچوکیان هەیە

بهێـنن، خواردەمەنییەکەشـی بـەخۆڕایی پـێ دانو جـەختی لێ کـردن دەبـێ کـە هاتنەوە برا بچوکەکەیان لەگـەڵ خۆیـاندا بهێـنن، پـارەو پـولی کـە هێنـا بوویـان بـۆ خۆراك کڕین بۆیان خستنەوە ناو جەواڵو هۆڕەکانیانەوە.

ڕۆژان تێپـەڕ بـوونو برسـیایەتیو گرانـی تـەنگی بەدانیـشتوانی فەلەسـتین هەڵچنی، حـەزرەتی یـەعقووب ڕێگای دا؛ کە کـوڕە پـچوکەکەی (بونیـامین) لەگـەڵ براکانیـدا بچن بۆ میصر بۆ هێنانی خۆراك، جا کە حەزرەتی یوسف هەواڵی هاتنی براکانی زانی پێشوازی لێ کردنو دەعوەتی خـوادنو سـفرەو خـوانی بـۆ ڕازاندنـەوە، وەلێ بۆ خۆی لەگەڵی نەخواردن، چونکە دابـو نەرێتی میصرییەکان وەهـا بـوو کـە لەگەڵ عیبرانیەکانـدا نان نەخۆن.

پاشـان حـەزرەتی یوسـف فـەرمانی کـرد بارەکانیـان بـۆ داگـرن، ئـەمجار فەرمانیشی کرد: کە هەر یەکەیان پارەو زیوەکەی هێناویە بیخەنە ناو بارەکەیـەوە، ڕبەی پاشاش بخەنە ناو باری بونیامینەوە، جا کاتێ قافڵەیان بارکردو وەڕێ کـەوتن بانگ ڕاهێشترا؛ کە ڕبەی پاشا دزراوە، هەر کەسێ دزیبیەتی خۆی دەکرێتە بارمتەو دەگیرێ، کاتێـك بارەکانیـان پـشکنین ڕبەکـەیان لـەباری بونیـامینـدا دۆزییـەوە، ئـیتر براکـانی یوسـف تینیـان بـۆ هـاتو پـەنایان بـردە بـەر پاشـا بـۆ ئـەوەی یـەکێکیان لەشوێنی بونیامین گل بدەنەوە، چونکە باوکێکی پیری کەنەفتی هەیەو ئەم هەواڵە ببیـسێ خـۆی بـۆ نـاگیرێ. بـەڵام پێـشنیارەکەیان وەرنـەگیرا، ئـەمجارە تـوڕە بـوونو وتیان: ئەمە ئەمڕۆ کە ئەم دزییەی کردوە لەوەپێش برایـەکی هـەبوو ئـەویش ئـاوا دزی لێ ڕودرا. حەزرەتی یوسف ئەمەی زۆر پێ نـاخۆش بـوو بـەڵام دانـی بـەخۆیـدا گـرتو لـەدڵی خۆیـدا وتـی: بـەڵکوو ئێـوە زۆر تاوانبـارترن لـەم کـوڕەی: کـە ئێـستا ڕبەکەی پاشا لەبارەکەیـدا دۆزراوەتەوە.

بەهـەر حـاڵ بنیـامین گـل درایـەوەو بـرا گەورەکەشـیان لەگـەڵیـدا مایـەوە، براکانی تر بەغەمناکی هاتنـەوە بـۆ لای باوکیـانو ڕوداوەکـەیان بـۆ گێڕایـەوە، ئـیتر

حەزرەتی یەعقووب غەمو ناڕەحەتی زیاد بوو، چاوی پێ سپی بونو برینی یوسفیشی کولانەوەو هاواری لێ هەڵساو وتی: ئای سەد داڵاو مخابن بۆ یوسف!

ئەمجار بۆ جاری سێهەم براکانی یوسف هاتنەوە بۆ میصرو داوایان لەحەزرەتی یوسف کرد: کە خواردەمەنی تریان بداتیو پارە کەمەکەیان لێ قبووڵ بکاو برا گیراوەکەیان بۆ بەرەڵڵا بکا.

ئەمجار حەزرەتی یوسف ئاواتی لەوەپێشیانی دەرحەق بەخۆی وەبیر هێنانەوەو وتی: دەزانن ئێوە کاتی خۆی چیتان دەرحەق بەیوسف کرد؟ ئەو کاتە ئێوە نەفام بوون لەبیرتانە چ تاوانێکتان دەرحەق بەبرای خۆتان ئەنجام دا؟

ئیتر براکان زانییان: کە ئەوە یوسفەو ناسییانەوەو وتیان: بۆ تۆ یوسفی؟ حەزرەتی یوسف فەرموی: بەڵێ من یوسفمو ئەمەش برامە.

ئەمجار هەندێکیان ناردنەوەو کراسی خۆی پێدان بۆ ئەوەی بیهێنن بەسەر دەمو چاوی باوکیاندا چاوەکانی چاك ببنەوەو روناکایی بکەوێتەوە ناویانو هەموویان بەخاوو خێزانەوە فەلەستین بەجێ بهێڵنو بگوێزنەوە بۆ میصر.

حەزرەتی یەعقووبو خێزانو کوڕەکانی کە گەیشتنە لای یوسف سوجدەی رێزو ئیحتیرامیان بۆ ئەنجامدا بەیەکتر شادبوونەوە، حەزرەتی یوسف فەرمووی: باوکە! ئەمە تەعبیری خەونەکەمە کاتی خۆی کە بۆم گێڕایەوە..

ئەمە بەکورتی رووداوەکانی چیرۆکی یوسف بوو کردمانە بەرکۆڵ بۆ ئەوەی بەچاوێکی رونترەوە بچینە ناو راڤەی ئایەتەکانەوە.

**قورئان بەزمانی عەرەبی نێردراوە، پلەو پایەی چیرۆکەکانی قورئان**

﴿الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا
عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٢﴾ نَحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ أَحۡسَنَ
ٱلۡقَصَصِ بِمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ وَإِن كُنتَ مِن
قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴿٣﴾﴾

ئیبنو جەریر لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا: دەفەرموێ: بەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوترا برِیا چیرۆکت بۆ بگێڕاینەوە! ئیتر ئایەتی ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ﴾ نازڵ بوو..

وەکوو ئاشکرایە سەرەتای سورەتی یوسف دەشوبهێتە سەرەتای سورەتی یونس، بەڵام لێرەدا قورئان بە(المبين) وەصف کراوە لەوێ بە(الحكيم) هۆیەکەشی دەگونجێ ئەوە بێ: کە سورەتی یوسف باسی روداوی گەورە گەورە دەکا: کە بەسەر پێغەمبەرێکی رێزدار هاتووەو خۆی لەبەرامبەر ئەو هەموو ناخۆشییانەدا راگرتووە، لەکاتی تەنگانەدا صەبرو لەکاتی خۆشیدا شوکر رەوشتی بووە. کەوابوو وەصف کردنی سورەتێك کە ئەو روداوانەی لەخۆ گرتبێ بە(مبين) گونجاوە، سورەتی (یونس) کە باسەکانی چەسپاندنی بنەماکانی ئایینو یەکتاپەرستیو راستی پێغەمبەرایەتیو هاتنی رۆژی قیامەتە ئەمەش وەصف کردنی بە(الحكيم) گونجاوە.

دەفەرموێ: ﴿الر﴾ ئەم وشە دەبێ بە(الف، لام، را) بخوێندرێتەوە، دەربارەی ماناکەشی هەمان راو بۆچون هەیە کە لەسەرەتای سورەتی (البقرة)داو سەرەتای

سورەتی (ال عمران)و شوێنی تریشدا باس کراوە هەرە گرنگیان ئەوەیە: کە دەفەرموێ: قورئان لەم پیتانە پێك هاتووە، ئێوەش زوبانەکەتان لەم پیتانە پێك هاتووە، دە ئێوە بتوانن لەو پیتانە کەلامێکی ئاوا بخەنە ڕوو!

﴿تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ﴾ ئەو ئایەتانەی لەم سورەتەدا بۆ تۆ هاتووە ئەی موحەممەد! کە لەو جۆرە پیتانە پێك هاتووە ئایەتی سورەتێکی ئاشکراو نمایانە لەوەدا: کە عەرەبەکانو غەیری ئەوانیش دەستەوەسان دەکا. یان ئایەتی قورئانێکە کە ئاشکراو نمایانە هیچ گومانی تێدا نیە، سەرئاسایەو عەرەبەکان دەستەوەسان دەکاو بۆڕیان دەدا..

یان ئایەتی قورئانێکە حەلاڵو حەرامو حوکمە شەرعییەکانو ئەندازەی تۆڵەو حەدو ئەوەی پێویستە لەسەر ئادەمیزاد دەربارەی ئایین دیاری دەکاو ئاماژەی پێ دەکاو هیدایەتدەرە بۆ پەی بردن بەبەرژەوەندی دونیاو قیامەت، ڕێبازی کامەرانی دونیاو قیامەت نیشانی ئادەمیزاد دەدا، جا وشەی (الكتاب) بەمانا سورەت بێ، یان بەمانا قورئان بێ چ خراپیەکی تێدا نیە، چونکە (الكتاب) ئیسمی جینسە بۆ هەموو جینسەکەو بۆ هەندێ لەئەفرادی جینسەکەش بەکار دەهێندرێ، لەهەردو حاڵەکەدا مەبەست بە(المبين) چەسپاندنی صیفەتی قورئانە، چونکە صیفاتی قورئان لەسورەتێکەوە بۆ سورەتێکی تر جوداوازی تێ ناکەوێ. قورئان هەمووی واضیحو ئاشکرایە، شتی نەزاندراو شی دەکاتەوە، ئایەتەکانی کاری نهێنیو شتی عامض ئاشکرا دەکەن، حوکمی شەریعەتو یاساو قانونی ژیان شی دەکەنەوە. ئادەمیزاد شارەزای ڕێبازێکی پڕ خێرو خۆشی دونیاو قیامەت دەکا..

قورطوبیو ئیبنو کەثیرو ئەبو حەییان وشەی (الكتاب)یان بەقورئان مانا کردوە، زومەخشەری دەڵێ: مەبەست بە(الكتاب) لێرەدا سورەتی یوسفە.

﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً﴾ ئێمە قورئانێکمان بەزوبانی عەرەبی ناردووە بۆ سەر پێغەمبەری خۆمان کە موحەممەدە، ئەو قورئانە دەخوێندرێتەوەو لەبەر دەکرێ، بۆیەشمان بەزوبانی عەرەبی ناردووە ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بەڵکوو بەهۆی ئەم قورئانەوە عەقڵو هۆش پەیدا بکەن، چیرۆکو سەرگورشتەی رابوردوان بزانن، فێری ئادابو ئەخلاقی جوانو ئەحکامو شەریعەت ببن، رێبازی ژیانتان بەگوێرەی بەرنامەی قورئان دیاری بکەن، بۆ ئەوەی قورئان بکەنە مەنهەجی ژیانتان لەرووی رامیاریو ئابوریو کۆمەڵایەتیو کاروباری دەوڵەتەوە، بۆ ئەوەی لەماناو مەبەستەکانی تێبگەن، تاکو کۆمەڵ لەسەر مەنهەجی ئەو قورئانە پەروەردە بکەن!

مامۆستا سەعید حەووا دەفەرموێ: قورئان کە رێزدارترین کتێبە بەرێزدارترین زوبان لەرێزدارترین نێرەرەوە بەرێزدارترین فریشتەدا: کە جوبرائیلە نێردراوە بۆ رێزدارترین پێغەمبەر: کە حەزرەتی موحەممەدە ﷺ[19]

منیش دەڵێم: دەبوایە بیشی گوتایە کراوە بەمەنهەجو رێبازی رێزدارترین گەل: کە گەلی موسوڵمانە، چونکە بەگوێرەی دەقی قورئان گەلی موسوڵمان باشترین گەلو نەتەوەن ئەگەر فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە بکەن! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾.

﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَذَا الْقُرْآنَ﴾ ئێمە جوانترین چیرۆکو سەرگورشتەت بەسەردا دەخوێنینەوە بەهۆی ئەوەوە: کە ئەم قورئانەمان بەنیگا بۆ ناردووی، قورئانێک کە تەواوو بێ عەیبو شیکەرەوەی هەموو شتێکە، چیرۆکی حەزرەتی (یوسف)یش چیرۆکێکی تەواوو سەرنج راکێشە، مەبەستو ئەهدافی بەرزی لەخۆ گرتووە ﴿وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ﴾

---

(19) الأساس في التفسير ج٥/٢٦٢٨.

هەرچەندە تۆ ئەی موحەممەد! پێش ئەوەی ئەم قورئانەت بەنیگا بۆ بنێرین لەپێڕی بێ ئاگایان بووی! تۆش وەکوو گەلەکەت لەو باسانەی لەقورئاندان بێ ئاگابووی، چ زانیاریەکت دەربارەی هەواڵو سەرگورشتەی پێغەمبەرانی پێشوو نەبوو، گەلو نەتەوەکەت هیچیان دەربارەی شەریعەتی یەعقووبو کوڕەکانی نەدەزانی، هەروا ئاگاداریان بەسەر باری کۆمەڵایەتی دانیشتوانی میسرو ژیارو شارستانییاندا نەبوو، تۆش لەو تاقمو کۆمەڵە بووی، لەوان شارەزاتر نەبووی.

**ئایەتەکان بەرونی ئەم حوکمانەیان لێ وەردەگیرێن:**

١- قورئان کتێبێکی رونکەرەوەیە: حەڵاڵو حەرامی لێک جیا کردوونەوە، ئەحکامو شەریعەتو ئادابو ئەخلاقی پەسەندی لەخۆ گرتووە.

٢- قورئان بەزوبانی عەرەبی نازڵ بووەو بەزوبانی عەرەبی دەخوێندرێتەوە، کەوابێ عەرەبەکان لەهەموو کەس شیاو ترن: کە ئیمانی پێ بهێنن و تێی بگەنو بەخەڵکی تری رابگەیەنن.

٣- قورئان جوانترین چیرۆکو ڕاسترین شوێنەوارو مێژووی گەلانی رابوردووی تێدایە.

٤- چیرۆکو سەرگورشتەی حەزرەتی یوسف جوانترین چیرۆکو سەرنج راکێشترین سەرگورشتەیە. چونکە پڕە لەپەندو حیکمەتو باسی یەکتاپەرستیو فیقهو مانای خەونو رامیاریو چۆنیەتی هەڵسو کەوت کردن لەناو خێزاندا، لەگەڵ کۆمەڵدا. گەلێ ئامۆژگاری سوود بەخشی تێدان کە بۆ دینو دونیا پێویستن باسی پێغەمبەرانو صاڵحانو فریشتەو شەیاتینیو جندۆکەو ئادەمیزادو ئاژەڵو پەلەوەرو پاشاو بازرگانو زانایانو نەزانانو پیاوو ئافرەتو پیلانەکانیان دەکا.

چیرۆکێکی گشتیو هەمە جۆرە. باسی ژیانی کۆمەڵایەتیو ئابوریو رامیاریو ئەدەبی دەکا. پڕە لەپەندو ئامۆژگاری کە هەرە گرنگەکەیان صەبرو خۆڕاگرییە لەسەر ئەزیەتو لێبوردنە لەکاتی دەسەڵاتدا.

## باسی یەکەم لەچیرۆکی یوسف

### خەون بینینی یوسفو ماناکردنی خەونەکەیە لەلایەن حەزرەتی یەعقووبەوە

﴿ إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا
وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَٰجِدِينَ ﴿٤﴾ قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا
تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيْدًاۖ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ
لِلْإِنسَٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ
مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ
كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ
حَكِيمٌ ﴿٦﴾ ﴾

ئەمە سەرەتای دەست پێکردنی چیرۆکە ڕازاوەکەی حەزرەتی یوسفە. بڕوانە: ئەم سەرەتا کورتە سەرنج ڕاکێشە لەنێو باسەکانی چیرۆکی حەزرەتی یوسفدا. سەیرکە: چۆن سەرنجی خوێنەرو گوێگر بۆ لای خۆی رادەکێشێو وایان لێ دەکا

هەوڵ بدەن چاوەڕوان بن: سەرەنجام چی رو دەدا، چۆن ئەو گرێ کوێرکە دەکرێتەوە، ئەو لەغەزەی خەون بینینی یوسفو گێڕانەوەی ئەو خەونە بۆ باوکیو وەڵامی باوکی بۆ کوڕی بچکۆلەی نەورسیدە: کە فەرمانی پێ دەکا خەونەکەی بۆ براکانی نەگێڕێتەوە نەوەکوو حەسوودی پێ بەرنو نەخشەی لەناوبردنی بۆ دابڕێژن!

ئەم جۆرە ئوسلوبو شێوازە ئوسلوبێکی باوە لای چیرۆك نووسان، سەرتا چیرۆکەکە بەگرێ کویرکەیەك بەلەغەزێك بەهەواڵێکی سەرەنج راکێش دەست پێ دەکەنو ئەمجار وردە وردە پێوە دەچن ئەو گرێ کوێرکەیە دەکەنەوەو لەغەزەکە حەل دەکەن. بێگومان چیرۆکی حەزرەتی یوسف وەکوو لەم سورەتەدا هاتووە، نموونەی تەواوی مەنهەجی ئیسلامییە لەبواری چیرۆکدا!

هەرچەندە مەنهەجی قورئان لەناوەرۆکو شێوازدا یەکێکەو جوداوازی تێدا نیە. وەلێ چیرۆکو سەرگورشتەی حەزرەتی یوسف دەلێی نمایشگایەکی تایبەتییە لەرانواندنی ئەم مەنهەجە لەبواری فەننی ئەدا کردندا.

بەلێ چیرۆکەکەی حەزرەتی یوسف (کە خۆی کەسایەتی سەرەکی چیرۆکەکەیە) بەسەرهاتی ئەو زاتە رادەنوێنێ بەشێوەیەکی فراوانو لەهەموو تێوەگلانو تێکەڵاوبوونی ئەو کەسایەتیە بەرووداوەکانی ژیانی پڕ سەیرو سەمەرەیەوە!

لەم چیرۆکەدا جۆرەها ئەزمونو تاقیکردنەوە رادەنوێندرێن کە ئەو زاتە تووشیان بووە. تاقیکردنەوەکان جۆراو جۆرن، سروشتو شێوەیان جیا جیایە. ئەزموونی ناخۆشیو تاقیکرنەوەی خۆشی، جارێك روبەڕوی فیتنەی شەهوەتو ئارەزۆبازی دەبێتەوە، دەمێك گیرۆدەی تاقیکردنەوەی فەرمانڕەواو پاشایەتی دەبێ بەرەو روی جۆرەها ئینفیعالاتو هەستی ئادەمیزادانە بوەتەوە لەجۆرەها وێزگەو لەگەڵ جۆرەها کەسایەتی تردا هەڵسو کەوتی کردوە، لەهەموو بوارەکاندا سەری

دەرکردوە، هەموو ئەزموونگەو تاقیگەکانی سەربەرزانە بڕینو بەوپەڕی بەرائەتو داوێن پاکیو دەست پاکییەوە ڕەها بوو، نموونەی خوداپەرستیو یەکتاپەرستییە، ڕابەری زانایانی دەروونناسو خەون لێدەرەوانە. نموونەی هەرە بەرزی گەنجی شۆخو شەنگی داوێن پاکو خاوەن وەفاو ئەمەکە، پرۆفسێۆری وەزیرانو فەرمانڕەواو کاربەدەستانی گەلو وڵاتە...

دەی بابزانین قورئانی پیرۆز چۆن ئەم چیرۆکە ڕازاوە جوانو سەرنج ڕاکێشە ڕادەنوێنێ!؟

﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ لأَبِيهِ﴾ ئەی موحەممەد! چیرۆکی یوسف بۆ گەلو نەتەوەکەت بگێڕەوە. ئەوە بۆ گەلەکەت باس بکە: کە یوسف بەباوکی (یەعقووب) گوت: ﴿يَا أَبَتِ﴾ ئەی باوکی خۆشەویستم! ﴿إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَباً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ﴾ من لەخەوەدا: یازدە ئەستێرەو خۆرو مانگم دیتن سوژدەیان بۆ بردم، واتە: سوژدەی ڕێزو تەقدیرو فەرمانبەرداری، نەك سوژدەی عیبادەتو پەرستن..

بێگومان ئەو دەمەی حەزرەتی یوسف ئەم خەونەی بینی منداڵ بوو ئەم جۆرە خەونەش بەڕواڵەت لەخەونی منداڵ ناچێ، چونکە منداڵو ساوا ئەگەر خەونی ئاوەها ببینێ، بینینەکەیان بەو جۆرە دەبێ مانگو خۆرو ئەستێرە بکەونە باوەشیەوە، لەبەردەمیدا بن، یارییان پێ بکا، کەچی حەزرەتی یوسف لەخەودا ئەم شتانەی بینی لەشێوەی عاقڵمەنداندا سوژدەیان بۆ برد، بینی خۆرو مانگو ئەستێرە وەکوو ئادەمیزادو لەشێوەی ئەواندا سەریان بۆ دانەواندو ڕێزیان لێ گرت. بۆیە لەئایەتەکەدا وەصفی کرداری بکەری ناعاقڵ بەوەصفی عاقڵ مەند کراوە کە سوژدە بردنە، تا ئامازەبێ: کە ئەو خەونە خەونی ئیلهامو نیمچە نیگا بووە نەك خەونی پڕو پوچو بێ بناغەو خەیاڵپلاو! ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: خەونی پێغەمبەران نیگایە. خەونی صاڵحو ڕاست بەشێکە لەپێغەمبەرایەتی، بەشێکە

لەهەواڵی پەنامەکیو نهێنی بەمەرجێ صاڵحو دیندار ببیبنێو زاناو صاڵح مانای لێ بداتەوە.

خەون بریتییە لەوێنە گرتنی روداوەکان لەسەر روبەری ئاوێنەی گیانێکی پاك. زوربەی جار خەون لەگەڵ گفتو گۆی نەفسدا یەکدی دەگرنەوە! بێگومان حەزرەتی یەعقووب کە یوسف خەونەکەی بۆ گێڕایەوە، تێگەیشت: کە ئەمە خەونێکی راستو نیمچە نیگایەو یوسف پاشەڕۆژێکی گەڵ مەزنی دەبێ، پلەو پایەیەکی وای دەست دەکەوێ داخوازی ئەوە دەبێ کە هەموو براکانیو باوکو دایکیشی رێزی لێ بگرنو سوژدەی رێزو تەقدیری بۆ بەرن، لەوە ترسا براکانی ئەم خەونە ببیسنەوەو وەکوو ئەو لێی تێبگەنو حەسوودی پێ بەرنو پیلانی لەناو بردنی نەخشە بکێشن! بۆیە جڵەوگیری لێ کرد: کە بەهیچ جۆرێك خەونەکە بۆ براکانی نەگێڕێتەوە. ئامۆژگاری کردو ﴿قَالَ يَا بُنَيَّ!﴾ وتی: ئەی کوڕی پچکۆلەو خۆشەویستم! ﴿لا تَقْصُصْ رُؤْيَاكَ عَلَى إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُوا لَكَ كَيْداً﴾ خەونەکەت بۆ براکانت مەگێڕەوە، نەوەکوو حەسوودیت پێ بەرنو پیلانی وات بۆ دابرێژن تووشی ناخۆشیو چەرمەسەریت بکەن، چونکە ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لِلإِنسَانِ عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾ بێگومان شەیتان دوژمنی سەرسەختی ئادەمیزادە، بەئاشکرا دوژمنایەتی خۆی لەگەڵ بەرەی ئادەمیزاددا راگەیاندوە، نەکەی باسی خەونەکەت لای براکانت بدرکێنی، بترسە لەوەی شەیتان بچێتە بن کلێشەی براکانتەوەو هەڵیان خەڵەتێنێو دەنە دەنەیان بدا بۆ ئەوەی زیانت پێ بگەیەنن، دابو نەرێتی شەیتان ئەوەیە: کە ناکۆکیو دژایەتی بخاتە نێوان ئادەمیزادانەوە، زۆر جار لەرێگای حەسوودییەوە زەفەریان پێ دەبا. وەکوو حەزرەتی یوسف دوایی بۆ خۆی ئاماژە بەحەسوودی براکانی دەکا، دەفەرموێ: ﴿مِن بَعْدِ أَن نَّزَغَ الشَّيْطَانُ بَيْنِي وَبَيْنَ إِخْوَتِي﴾يوسف/١٠٠.

لەفەرموودەی پێغەمبەردا (درووودی خودای لەسەر بێ) هاتووە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (اذا رآى أحدكم ما يحب فليحدث به، واذا

رأى مايكره فليتحول الى جنبه الآخر، وليتفل عن يساره ثلاثا، وليستعذ بالله من شرها، ولا يحدث بها أحدا فإنها لن تضره).

ئەگەر یەکێ لەئێوە لەخەودا شتێکی دڵخۆشکەرەی بینی با بیگێڕێتەوە، ئەگەر شتێکی بینی پێی ناخۆش بوو با خۆ وەرسوڕێنێ بۆ بارێکی دیکەو سێ جار تف بکاتە لای چەپی خۆی، پەنا بگرێ بەخوداو لەشەڕی شەیتانو خەونەکەی بۆ کەس نەگێڕێتەوە، چونکە ئەگەر وا بکا خەونەکە نایەتە جێو زیانی پێ ناگا..

ئیمام ئەحمەدو هەندێ کەسی تر فەرموودەیەك ریوایەت دەکەن لەموعاوییەی کوڕی حەیەدەی ئەلقوشەری دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (الرؤيا على رجل طائر مالم تعبر، فاذا عبرت وقعت) خەون لەسەر قاچی باڵندەیە هەتا مانای لێ نەدەیەوە، هەر کاتێ مانای لی دارایەوە دەچەسپێ.

﴿وَكَذَلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ﴾ ئەی کوڕی خۆشەویستم! وەکوو چۆن پەروەردگار لەخەودا ئاوا ئەستێرەو خۆرو مانگی نیشان داوی سوژدەیان بۆ بردوی، خودای خۆت هەڵت دەبژێرێو دەست نیشانت دەکا بۆ پێغەمبەرایەتیو پلەو پایەی رێزو ئیحترامت بەسەردا دەڕێژێو جۆرەها بەهرەو سەروەریت پێ دەبەخشێ!

﴿وَيُعَلِّمُكَ مِنْ تَأْوِيلِ الأَحَادِيثِ﴾ لەلایەن خۆیەوە زانیاری خەون لێدانەوەت فێر دەکا، واتە: زانیاری تایبەتی خۆیت فێر دەکا، دەتوانێ مانای خەون لێ بدەیەوەو بزانی چۆن دێتە جێو ئاکام چی دەبێ.

فێرکردنی مانای خەون لەلایەن خوداوە بۆ یوسف، ئەوە بووە خودا ئیلهامو کەشفێکی وای داوەتێ: کە بزانێ مانای ئەو خەونە چۆنەو نیشانەی چی دەبێ. یان زەکاو فیراسەتێکی پێش وەخت بڕێ شت بزانێ وەکوو یوسف بۆ خۆی ئاماژە بۆ ئەمە دەکاو بەدوو هاوەڵەکەی بەندینخانەی دەڵێ: ﴿لاَ يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِ إِلاَّ نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِ قَبْلَ أَن يَأْتِيكُمَا ذَلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّي﴾یوسف/٣٧.

﴿وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَعَلَى آلِ يَعْقُوبَ﴾ هەروەها پەروەردگار نیعمەتی خۆی لەسەر تۆ تەواو دەکا، بەو جۆرە دەتکاتە پێغەمبەرو رەوانەت دەکا بۆ بانگەوازیکردن، هەروەها نیعمەتی خۆی بەسەر یەعقووبو بنەماڵەکەشیدا تەواو دەکا، بەم جۆرە هەلیان بۆ دەڕەخسێنێ کە لەلادێوە بێنە ناو شاری میسرو جێگەو ڕێگەی باشیان بداتێو پاشان زنجیرەی پێغەمبەران لەم بنەماڵەیەدا بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام بێ.

﴿كَمَا أَتَمَّهَا عَلَى أَبَوَيْكَ مِنْ قَبْلُ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَقَ﴾ هەروەکوو چۆن لەوەپێش نیعمەتی خۆی رژاند بەسەر باپیرتو باوکی باپیرتدا. کە ئیسحاقو ئیبراهیم بوون.. لەئایەتەکەدا ئیبراهیمی پێش خست چونکە پلەو پایەی ئەو بەرز ترەو بەباوکی پێغەمبەرانو (خليل الله) ناسراوە.

﴿إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ بێگومان خودای تۆ زاناو دانایە بەو کەسانەی هەڵیان دەبژێرێ بۆ پێغەمبەرایەتیو دەزانێ کێ شیاوی فەضلو نیعمەتو رێزلێنانە، هۆکاری بۆ دەڕەخسێنێ بۆ ئەوەی بگاتە ئامانجی خۆیو ئاواتەکانی بەدی بێن. هەرچی دەیکا لەزانیاریو داناییەوەیە، ئیشی نابەجێ ناکاو کاری خراپی لێ ناوەشێتەوە.

## باسی دووەم لەچیرۆکی یوسف:

## یوسفو براکانی

﴿ ۞ لَّقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ ﴿٧﴾
إِذْ قَالُوا۟ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ

أَبَانَا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨﴾ ٱقْتُلُوا۟ يُوسُفَ أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ
لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا۟ مِنۢ بَعْدِهِۦ قَوْمًا صَٰلِحِينَ ﴿٩﴾ قَالَ
قَآئِلٌ مِّنْهُمْ لَا تَقْتُلُوا۟ يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ
بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿١٠﴾

**ئەمە سەرەتای چیرۆکەکەیە: لەوەپێش پەروەردگار دوو پێشەکی بۆ ئەم چیرۆکە دیاری کرد:**

**یەکەم:** وەصف کردنی قورئان بەوە کە کەلامێکی خوداییەو بەزوبانی عەرەبی نازڵ کراوە، بەڵگەیە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێت).

**دووەم:** بینینی ئەو خەونە سەرنج ڕاکێشە لەلایەن یوسفەوە، کاریگەری خەونەکە لەسەر یەعقووب. ئیتر دوا بەدوای ئەو دوو پێشەکییە دەست دەکا بەگێڕانەوەی چیرۆکەکەو دەفەرموێ:

﴿لَقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِ آيَاتٌ لِلسَّائِلِينَ﴾ سوێند بێ بەخودا لەچیرۆکی یوسفو براکانیدا[٢٠] پەندو ئامۆژگاری هەن بۆ پرسایان، زۆر عیبرەتو نیشانە هەن

(٢٠) براکانی یوسف وەکوو لەتەوراتی ئێستا تۆمار کراوە ئەمانەن:

١- رأوبین کوڕی لیئە: کە براگەورەیان بوو.

٢- شەمعون کوڕی لیئە: دووەم کوڕی یەعقووب بوو.

٣- لاوی کوڕی لیئە: سێیەم کوڕی یەعقووب بوو.

٤- یەهوذا کوڕی لیئە: چوارەم کوڕی یەعقووب بوو.

لەسەر قودرەتو دەسەڵاتی رەهای پەروەردگارو زانایی‌و دانایی‌و لوطفو کەرەمی بۆ بەندە هەڵبژاردەکانی‌و پەروەردەکردنیان بەپەروەردەیەکی خودایی، بۆ هەر کەسێك پرسیار بکا لەرووداوی چیرۆکەکەو بیەوێ بەراستی چۆنیەتی رووداوەکانی ئەم چیرۆکە بزانێ‌و پەندیان لێ وەربگرێ!

سەیر بکەو تێبفکرە! ئەگەر براکانی یوسف حەسوودیان پێ نەبردایە نەیاندەخستە ناو بیرەکەوە، ئەگەر نەیانخستایە ناو بیرەکەوە نەدەگەیشتە دەستی عەزیزی میصر، ئەگەر عەزیز بەئەمین‌و دەستپاکی نەزانیایە نەیدەکردە ئەمینداری خەرجی ناو ماڵی، ئەگەر ژنی عەزیز حەزی لێ نەکردایە داوێنپاکی‌و نەزاهەتی دیار نەدەکەوت، ئەگەر (زولەیخا) لەپیلانەکەیدا تێ نەشکایە یوسف نەدەخرایە ناو بەندینخانەوە، ئەگەر نەخرایە بەندینخانەوە مەیگێڕو پیاوی مەلیك نەیاندەناسی‌و نەیاندەزانی کە زانایە بەمانای خەون! هەروا پاشا نەیدەناسی‌و ئیمانی پێ نەدەهێناو نەیدەکردە ئەمینداری گەنج‌و گەنجینەی وڵات، ئەگەر ئەم پلەو پایەی دەست نەکەوتایە. نەیدەتوانی باوكو براکانی‌و خزم‌و کەس‌و کاری لەلادێوە بێنێ بۆ شارو لەبرسیایەتی رزگاریان بکا، بەڵکوو ئەم بەسەر

٥- دان کوڕی بەلهەی کچی راصیل، پێنجەم کوڕ بوو.

٦- نەفتالی کوڕی بەلهە: شەشەم کوڕ بوو.

٧- جاد کوڕی زلفەی کچی لیئە: حەوتەم کوڕ بوو.

٨- ئەشیر کوڕی زلفە: هەشتەم کوڕ بوو.

٩- یەسساکیر کوڕی لیئە: نۆیەم کوڕ بوو.

١٠- زوبولون کوڕی لیئە: دەیەم کوڕ بوو.

١١- یوسف کوڕی راحیل: یازدەهەم کوڕ بوو.

١٢- بونامین کوڕی راحیل برا بچکۆلەیان بوو.

بەگوێرەی ریوایەتی ریوایەت لەکاتی هاتنە دونیای بونیامین دایکی یوسفو بونیامین کە ناوی راحیل بووە لەدونیا دەرچووە.

هاتانەی یوسف بوون بەهۆی ئەوە: کە گەلو نەتەوەیەك لەبرسیاسەتی رزگار بکا. کەوابوو هەر بەلاّو ناخۆشییەکی بەسەری هات هەرچەند بەروالّەت شەڕو نەگبەتی بوو بەلاّم ئاکامو سەرەنجامی خێرو بەهرەو سەروەری بوو..

بەلّێ لەچیرۆکی یوسفدا ئایاتو نیشانە هەن بۆ کەسانێك کە بیانەوێ پرسیار لەرووداوەکانی ناو ئەم چیرۆکە بکەن، چ روداوی حیسسیو ظاهری بن، یان زانیاری نهێنیو پەنامەکی بن وەکوو زانستی یەعقووب بەسەرەنجامی خەونی یوسف، یان بەدرۆ زانینی داوای براکانی یوسف کە وتیان: یوسف گورك خواردویەتی، یان بەرەنگ کردنی کراسەکەی یوسف، یان بەوە کە هەر لەگەلّ کاروانەکە لەخاکی میصر بەرێکەوت ئەو لەکەنعانەوە بۆنی کراسی یوسفی کرد، یان زانیاری یوسف: کە بەگەیشتنی کراسەکە بۆ لای باوکیو بەسەر دەمو چاوی خۆیدا بهێنێ چاوی چاك دەبنەوە. بەراستی ئامۆژگاری زۆرو زەبەندە هەن:

﴿إِذْ قَالُوا لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَى أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ﴾ کاتێك براکانی یوسف وتیان: وەللاّهی یوسفو براکەی بونیامین لای باوکمان لەئێمە خۆشەویست ترن، ئەوان هەرچەندە لەئێمە پچوکترنو کارو کاسبییان پێ ناکرێ کەچی ئەوانی لەئێمە خۆشتر دەوێ، ئێمە هەموومان پیاوی بەهێزو تاقەتو کارو کاسبی کار، چی پێویست بێ بۆ دابینکردنی باری ژیانو خەرجی ناو مالّ ئێمە دابینی دەکەین کەچی زیاتر گرنگی بەئەوان دەدا!

﴿إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ بێگومان باوکمان لەو هەلّوێستەیدا کە ئەوانی لەئێمە خۆشتر دەوێ رێگای عەدالّەتکاری لێ هون بووەو بەهەلّە چووەو بەهەلّەچوونەکەی ئاشکرایەو هەموو کەس دەیزانێ، دەنا چۆن دوو مندالّی بێکارەو هیچ لەبارا نەبوو پاساو دەداتەوە بەسەر کۆمەلّێك کوڕی گەنجی بەدەستو بازۆو کاسبکەرو خزمەتگوزارو پارێزەر!!

بەلاَم لەراستیدا ئەوان هەڵە بوون نەك حەزرەتی یەعقووب، چونكە یوسفو بونیامینی برای هەردوكیان پچكۆلە بوونو دایكیان كۆچی دوایی كردبوو، پێویستیان بەزێدە نازكێشانو چاودێری پتر بوو، حەزرەتی یەعقووب بەم زێدە گرنگی دانە پێیان دەیەویست كەلێنی بێ دایكییان بۆ پڕ بكاتەوە، هەروەها لەحەزرەتی یوسفدا پاشە ڕۆژی پڕشكۆو پیرۆزی دەبینی، عەقڵو دانایی زیادی تێدا بەدی دەكرد، بەتایبەتی لەخەونەكەی یەسفدا گەلێ بەهرەو شكۆمەندی بۆ حەزرەتی یوسف چاوەڕوان بوو دەیزانی ئەم زاتە دوارۆژێكی پرشنگداری دەبێ...

ئایەتەكە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: كە پێویستە باوكو دایك گرنگی بدەن بەبەخێوكردنی منداڵەكانیانو یەكسانی بخەنە نێوانیانەوە لەخۆشەویستیو مامەڵە لەگەڵ كردندا تەنانەت لەماچ كردنیشیاندا، تا بۆیان دەكرێ خۆیان بپارێزن لەفەرقو جودایی كردن لەنێوانیاندا. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەفەرموودەیەكیدا: كە بوخاریو موسلیمو هی تریش ریوایەتیان كردوە لەنوعمانی كوڕی بەشیرەوە دەفەرموێ: (اتقوا الله واعدلوا بين أولادكم في النحل كما تحبون ان يعدلوا بينكم في البر واللطف) خۆتان بپارێزن لەسزای خودا، عەداڵەتكاریی بكەن لەنێو منداڵەكانتاندا لەبارەی خۆشەیستیو سۆزەوە، وەكوو چۆن پێتان خۆشە ئەوان هەموویان وەكوو یەك چاكەتان لەگەڵ بكەن..

ئەمجار پەروەردگار نەخشەو پیلانەكەیان دیاری دەكا دەفەرموێ: براكانی یوسف تەگبیریان كرد لەناوخۆیانداو وتیان: ﴿اقْتُلُوا يُوسُفَ أَوْ اطْرَحُوهُ أَرْضاً﴾ با یوسف بكوژینو لەناوی بەرین بۆ ئەوەی باوكمان بڕوی بنێو هیچ هیوایەكی پێك گەیشتنەوەی ئەوی نەمێنێ، یان فڕێی بدەنە ولاَتێك دوور بێ لەئاوەدانی، تەنانەت ئەگەر نەش مرێ ڕێگای هاتنەوە نەزانێ بێتەوە بۆ لای باوكمان. ﴿يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا مِنْ بَعْدِهِ قَوْماً صَالِحِينَ﴾ ئیتر بەرچاوی باوكتان چۆڵ دەبێو دڵو دەروونی بۆ ئێمە خالی دەبێ، هەموو گرنگییەك بەئێمە دەداو عەطفو سۆزی

خۆی دەدا بەئێمە ئەمجار ئێوە تۆبە بکەن‌و ببنە بەندەی صالْح‌و راستاڵ، کردەوەی باش ئەنجام دەدەین‌و جارێکی تر تاوانی وا ناکەین، بەمەش خودا لەخۆمان رازی دەکەین‌و باوکیشمان لێمان رازی دەبێ.

بێگومان بەدارِشتنی ئەم پیلانەیان تاوانێکی گەورەیان ئەنجام دا، خۆیان بۆ کارێکی سامناك‌و لەخودا رەنجان‌و ئامادە کرد؛ پچرانی صیلەی رەحم، ئەزیەتدانی باوك، بەزەیی نەهاتنەوە بەپیرێکی کەنەفتی کۆنە ساڵ کە بەهیچ شێوەیەك ئەزیەتدانی دروست نیە، دڵ شکاندنی تاوانی گەورەیە، پێشێل کردنی مافی باوکە لەسەر کوڕ، ئەوان هاتن باوکی پیرو کەنەفتیان لەمنداڵی ساواو خۆشەویستی خۆی دابڕی، باوکی دڵ پڕ سۆزو عاطیفییان لەمنداڵی بێ دەسەڵات‌و خۆشەویست جودا کردەوە.! خودا لێیان خۆش بێ!

﴿قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ لا تَقْتُلُوا يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِي غَيَابَةِ الْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ السَّيَّارَةِ إِنْ كُنتُمْ فَاعِلِينَ﴾ یەکێك لەبراکان: کە ناوی بەهوذاو برا گەورەیان بوو، هەندێکیش دەڵێن: روبیل بوو، وتی: یوسف مەکوژن، بڕکێشی کوشتنی مەکەن؛ چونکە برای خۆتانەو کوشتن تاوانێکی گەورەیە، بەڵکوو فڕێیدەنە ناو بیرێکەوە، کاروانێك (کە هاموشۆی بازرگانی دەکەن) بۆ خۆیان هەڵیدەگرنەوە، لەکۆڵ ئێوە دەبێتەوە، بەمە مەبەستەکەتان دێتە جێ‌و لەباوکی دوور دەکەوێتەوەو لێی دیدار ئاخیرەت دەبێ، ئیتر پێویست بەکوشتنی ناکا، ئەگەر ئێوە دەتانەوێ شتێك بکەن عەقڵ پەسندی بکا ئەوە رێگای لەبارو گونجاوە.!!

لەراستیدا ئەم کردارو هەڵوێستەی براکانی یوسف نیشانەی ئەوەیە: کە پێغەمبەر نەبوون، چونکە پێغەمبەران نابێ پیلانی موسوڵمان کوشتن دارِێژن. بەڵکوو ئەوان موسوڵمان بوون‌و تاوانیان ئەنجام داوەو دوایی تۆبەو ئیستیغفاریان کردوە. هەندێکیش پێیان وایە: ئەو کاتەی ئەم پیلانەیان دارِشت پێغەمبەر نەبوون، دوای تۆبەیان کردوەو کراون بەپێغەمبەر!.

## براكانی یوسف پیلانەكەیان جێبەجێ دەكەن‌و باوكیان هەڵدەخەڵەتێنن

﴿ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأۡمَ۬نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ
لَنَٰصِحُونَ ﴿١١﴾ أَرۡسِلۡهُ مَعَنَا غَدٗا يَرۡتَعۡ وَيَلۡعَبۡ وَإِنَّا لَهُۥ
لَحَٰفِظُونَ ﴿١٢﴾ قَالَ إِنِّي لَيَحۡزُنُنِيٓ أَن تَذۡهَبُواْ بِهِۦ وَأَخَافُ أَن
يَأۡكُلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَأَنتُمۡ عَنۡهُ غَٰفِلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُواْ لَئِنۡ
أَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ إِنَّآ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ ﴿١٤﴾ فَلَمَّا
ذَهَبُواْ بِهِۦ وَأَجۡمَعُوٓاْ أَن يَجۡعَلُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ
لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمۡرِهِمۡ هَٰذَا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿١٥﴾ وَجَآءُوٓ أَبَاهُمۡ
عِشَآءٗ يَبۡكُونَ ﴿١٦﴾ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبۡنَا نَسۡتَبِقُ وَتَرَكۡنَا
يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُۖ وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا
وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٖ كَذِبٖۚ قَالَ

بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾

ئایەتەکان پەیوەندییان بەئایەتەکانی پێشەوەوە هەیە، چۆنیەتی جێ بەجێ کردنی نەخشەو پیلانەکەی براکانی یوسف دیاری دەکا، ئەوە دەردەخا: کە ئەوان بەزوبانی لووسو فرتو فێڵ یوسفیان لەباوکی وەرگرتو بردیان. دەفەرموێ: ﴿قَالُوا يَا أَبَانَا مَا لَكَ لا تَأْمَنَّا عَلَى يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُ لَنَاصِحُونَ﴾ وتیان: ئەی باوکی بەڕێزمان! ئەوە تۆ چیتە لەئێمە دڵنیانی دەربارەی یوسف؟ دەترسی لێمان تووشی ئەزیەتی بکەین؟ ئێمە خۆشمان دەوێ، دڵسۆزین بۆی، دەمانەوێ لەخێرو خۆشیدا بێ، بەدڵو بەگیان نەصیحەتو ئامۆژگاری دەکەین، وەکوو چاوی خۆمان دەیپارێزین!.

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە براکان هەستیان بەوە کردبوو: کە باوکیان دڵی لێیان خراپ بووە. دەشیانزانی باوکیان چەند یوسفی خۆش دەوێ، بەتایبەتی دوای بینینی خەونەکە حەزرەتی یەعقووب زێد گرنگییەکی تایبەتی پێ دا بوو، چونکە پاشەرۆژێکی پرشنگداری بۆ دەبینی.

ئەمجار وتیان: ﴿أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَداً يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ جا وا ئێمە وەکوو دابو نەرێتی خۆمان بەیانی دەچین بۆ سەیران. بۆ یاریو رابواردن، جەنابیشت بەدڵنیاییەوە یوسفمان لەگەڵ بنێرە، با بۆخۆی بەئارەزۆی خۆی لەو دەشتو سارایە، لەو کێوو کەژە بەروبوم بخوا، لەگەڵ ئێمەشدا یاری بکاو پێشبڕکێو تۆپێنو سێ بازێن ئەنجام بدا، ئێمە پارێزگاری دەکەین ناهێڵین تووشی هیچ ناخۆشییەك ببێ، هەر لەبەر خاتری تۆ وەکوو چاوی خۆمان دەیپارێزین!.

حەزرەتی یەعقووب وەڵامی دانــەوە: ﴿قَالَ إِنِّي لَيَحْزُنُنِي أَنْ تَـذْهَبُوا بِـهِ﴾ وتـی: هەست دەکەم بەغەمو نارەحەتیو دڵتەنگ دەبم ئەگەر یوسف لێم دوور کەوێتـەوە، ئەگەر ئێوە لەگەڵ خۆتان بیبەن بۆ دەشتو دەر من بێ ئەو هەڵناکەم، ﴿وَأَخَافُ أَنْ يَأْكُلَهُ الذِّئْبُ وَأَنْتُمْ عَنْهُ غَافِلُونَ﴾ دەترسم رێگا بدەم لەگەڵ خۆتـانی بـەرنو لـەبیابان لێی کەمتەرخەم ببنو گورگ بیخوا، دەترسم ئێوە سەرگەرمی یـاری کردنـی خۆتـان بنو ئاگاتان لەیوسف نەمێنێو گورگ پەلاماری بداو بیخوا!

وا پێ دەچێ ئەگەر یەعقووب باسی گورکی بۆ ئەوان نەکردایە، ئەو درۆیەیان بۆ هەڵنەبەستایەو عەقڵیان بـەم عـوزرە درۆ ئـامێزە نەشـکایە! بـەڵام دوور بینـیو حەزەرو ئیحتیاط کردن لەپارێزگاری یوسف پـاڵی پێـوە نـا ئـەم شـتانەیان بـۆ بـاس بکا!

﴿قَالُوا لَئِنْ أَكَلَهُ الذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّا إِذاً لَخَاسِرُونَ﴾ وەڵامی باوکیان دایەوەو وتیان: وەڵلاهی، ئەگەر ئێمە ئەوەندە دەستەوەسان بـین گـورك بتوانـێ یوسـفمان لێ بفرێنـێو بیخـوا، ئەگـەر ئێمـە بەهـەموانمان نـەتوانین یوسـف بپـارێزن (لـەکاتێکدا ئێمە دەستەیەکی خاوەن هێزو تواناو دەسـتو بازووینو کوڕی تەنگانەو پیـاوی رۆژی هەڵمـەتو قوربـانین) ئەگـەر ئـەوەمان بـۆ نـەکرێ، نیشانەی ئەوەیـە: ئێمـە هـیچو پووچـین چـمان لەدەسـت نایـە، جێگـای متمانـە نـینو هـیچ کارێکمـان پـێ ئـەنجام نادرێو چ خێرو بێرێکمان تێدا نیە!

ئیتر پیرەمێردی باوکیان کە ئەم هەموو سوێندو بەڵێنـەی لێ بیـستن ئیحـراج بوو بەنابەدڵیو ناچاری یوسفی دانە دەست.. بۆ ئەوەی قـەزاو قـەدەری خـودا بێتـە دیو بەگوێرەی ویستی خودا چیرۆکەکە تەواو ببێ.

ئێـستا وا یوسـفیان لـەباوکی وەرگـرتو بـەرەو دەشـتو سـارا کەوتنـە رێو وا خەریکی ئەنجامدانی پیلانە چەپەڵەکەیانن!

﴿فَلَمَّا ذَهَبُوا بِهِ وَأَجْمَعُوا أَنْ يَجْعَلُوهُ فِي غَيَابَةِ الْجُبِّ﴾ کاتێك بەڕێ کەوتنو یوسفیان لەباوکی دوور خستەوە، هەموو رایان هاتە سەر ئەوە کە بیهاوێژنە قوڵایی بیری کەنعانەوەو ئەوەی بڕیاریان لەسەر دا بوو ئەنجامی بدەن. جا لەم حاڵە تەنگو چەڵەمەیەدا، لەم کاتە ناسكو ترسناکەدا کە مردن لێی نزیك بۆتەوەو هیچ فریارەس نیەو کەس نیە فریای بکەوێو دادو فوغان دادی ناداو ئەم منداڵو بێ دەسەڵاتو ئەوان دە کەسی زەلامو زەبەللاحو بێ ویژدان، ئا لەم ساتە ناسکەدا: کە یوسف لەژیانی خۆی نائومێد بووە، پەروەردگار نیگای بۆ دەنێرێو دڵنیای دەکا: کە ئەمە تاقیکردنەوەیە، تەنگانەیەو فەرەحی لەدوایە. دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُمْ بِأَمْرِهِمْ هَذَا وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ﴾ نیگامان بۆ کرد، دڵنیامان کرد لەوەی: کە لەم تەنگانە رزگارت دەبێ نامرێ تا ئەم کارە ناپیاوانەیان بەچاودا دەدەیەوە، تەریقیان دەکەیەوە، ئەوان لەسەرەتادا نازانن ئەوەی ئەم تانوتەیان لێ دەدا ئەو یوسفە منداڵەیە کە خستوویانەتە ناو بیرەوەو بەخەیاڵی خۆیان لەکۆڵیان بۆتەوە!

با ئێستا یوسف لەتەنگانەی ناو بیرەکەدا جێ بێڵین، بێگومان ئیلهامی خودا دڵنیای کردوەو چاوەڕوانی رزگار بوونە، با یوسف جێ بێلین بزانین براکانی دوای ئەنجامدانی تاوانەکەیان چی دەکەنو چی دەڵێن: ﴿وَجَاءُوا أَبَاهُمْ عِشَاءً يَبْكُونَ﴾ ئێوارە درەنگانێك کاتی عیشاء هاتنەوە بۆ لای باوکیان، خۆیان بەغەمبارو دڵتەنگ نیشان دەداو شینو رۆرۆیان دەکردو دادو فیغانو برا رۆیان بوو!

﴿قَالُوا يَا أَبَانَا﴾ وتیان: ئەی باوکی بەرێزمان! چیت لێ وەشێرین ﴿إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ﴾ ئێمە چووین بۆ یاریو پێشبرکێو بازبازێن ﴿وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِنْدَ مَتَاعِنَا﴾ یوسفمان لای کەلو پەلەکانمان دانابوو ﴿فَأَكَلَهُ الذِّئْبُ﴾ گورك خواردی، ئێمە لێی دوور بووینو سەرگەرمی یاریو رەمبازی خۆمان بووین، ﴿وَمَا أَنْتَ بِمُؤْمِنٍ لَنَا وَلَوْ كُنَّا صَادِقِينَ﴾ ئێمە دەزانین: ئەتۆ بڕوامان پێ ناکەی با ئێمە راستگۆو جێگای بتمانەی جەنابت بین! چۆن تۆ گومانی خراپ بەئێمە دەبەیو پێت وایە ئێمە راست

ناکەین؟ بەهەر حاڵ لەمەدا جەنابت بیانووت هەیە چونکە روداوەکە هێندە غەریبە ناچێتە عەقڵەوە شتی وا روبدا؟! ئەتۆ دوێنێ لەم کارەساتە ترساندتینو ئێمە رەدمان دایەوە، بەڵام وا کارەسات روی‌داو شتەکە قەوماوە!!

بەکورتی ئێمە هەرچەندە راست بکەینو راستگۆبین ئەتۆ بڕوامان پێ ناکەی‌و تۆمەتی فەوتانی یوسف دەخەیە سەر شانی ئێمە، چونکە تۆ یوسفت زۆر خۆش دەویستو گومانیشت وایە ئێمە درۆ دەکەین!

ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوە: کە ئەوان بۆ خۆیان قەناعەتیان بەوتەکانی خۆیان نەبوو ناڕاستەوخۆ دانیان بەدرۆزنی خۆیاندا دەنا!

﴿وَجَاءُوا عَلَى قَمِيصِهِ بِدَمٍ كَذِبٍ﴾ هەر بۆ چەواشەکاری‌و چەسپاندنی فێڵەکەی خۆیان، ئاسکێکیان سەربڕی‌و بەدرۆ خوێنی ئاسکەکەیان لەکراسی یوسف هەڵسوو بەنارێکو پێکی کراسەکەیان خوێناوی کردو وایان نیشان دا: کە ئەم کراسە ئەوەیە: کە گورگەکە یوسفی تێدا خواردووە، بەڵام ویستی خودا وابوو: کە دەبێ شوێندەستی تاوانەکەیان دەربکەوێ، فێڵەکەیان ئاشکرا ببێ، ئەوەیان لەبیر چوو کە هەندێك کراسەکە بشێوێنن، بیدڕێنن، بیهەنجنن، چونکە ئەگەر گورك بیخواردایە دەبوایە کراسەکە بدڕایەو ونجڕ ونجڕ ببوایە: بەڵام مەیدانی درۆ کورتەو زۆر ناخایەنێ.

حەزرەتی یەعقووب بڕوای پێ نەکردن، روی لێ وەرگێڕانو گوێی بۆ قسەکانیان شل نەکردو شتەکەی بەدرۆ زانی‌و فەرمووی: ﴿قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا﴾ بەڵکوو ئەوە دڵو دەروونی ناپاکتان ئەمەی پێ کردونو کارێکی وا ناپەسندی پێ ئەنجام داون، ئەوەی دەیڵێن لەراستییەوە دوورەو عەقڵ وەری ناگرێ!

﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾ صەبر دەگرم، صەبری جوانو پەسند بۆمان باشەو ئەوە چەکی خاوەن باوەڕانەو ئارام دەگرم، پشت بەخودا دەبەستم، چاوەڕوانی دەرووی

رەحمەتم، ﴿وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ﴾ خودا یارمەتیدەرمە لەسەر ئەوەی باسی دەکەن‌و بۆمی دەگێڕنەوە لەم هەواڵە دڵتەزێنە. بەڵێ: ئەوەندە لەیوسف پڕ بوون ڤینیان لێ بوو بۆیە ئاوا بەپەلەو بێ لێ ورد بوونەوە ئەم درۆ شاخدارەیان هەڵبەست. ئەگەر لەسەرەخۆو عاقڵ‌و ئەعصاب سارد بوونایە نەدەبوو وا خێرا بەپەلە ئەو تاوانەیان ئەنجام بدایە. ئەوە یەکەمجارە یەعقوب رێگا دەدا یوسف بەرن بۆ دەشت‌و سارا، دەبوایە ئەو رۆژە بەسەلامەتی بیانهێنایەوەو قسەی خۆیان ببردایە سەرو خۆیان بەدرۆ نەخستایەوە! بەڵام وا دیارە ئەوان زۆر داخ لەدڵ بوون پەلەیان لەناو بردنی بوەو، ترساون جارێکی تر هەلی وایان بۆ هەڵنەکەوێ!!

هەروەها نەفامییەکەیان لەوەدا بووە کە گورگیان هێنایە ناو پیلانەکەیان، ئەمەش نیشانەی هەڵەشەیی‌و سەر لێ شێوانیان بوو، چونکە دوێنێ باوکیان ئەوەی بەگوێچکەدا دان: کە ترسی ئەوەی هەیە یوسف گورگ بیخوا، ئەوان داکۆکییان لەوە دەکردو دەیانگوت: چۆن شتی وا دەبێ؟ دەی کەی ئەوە عەقڵ‌و فامە بەیانی دەربچن‌و یوسف بۆ گورك دابنێن؟ کە رۆژی پێشوو باوکیان ئاگاداری کردنەوەو وتی: ترسی ئەوەم هەیە ئێوە لەیوسف بێ ئاگا بن‌و گورك بیخوا؟!

هەر بەم شێوە هەڵەشەییەیان هاتن کراسەکەی یوسفیان خوێناوی کردو بۆشایەدی لەگەڵ خۆیان ئێوارە خستیانە بەردەمی باوکیان، وەلێ بەئاشکرا ئەم کراسە خوێناوییە، بوو بەنیشانەی درۆزنی‌و بێ بناغەیی داواکەیان!

حەزرەتی یەعقووب بەتێفکرین لەرووداوەکەو بەڵگە رواڵەتیەکان‌و هیتافی ناو دەروونی خۆی هەستی بەوە کرد: کە یوسف گورك نەیخواردووە، وە پێی وا بوو براکانی پیلانێکیان بۆ داڕشتووە، هەستی کرد کە ئەم رووداوەی ئەوان دەیگێڕنەوە شتێکی هەڵبەستراوو بێ بناغەیە. ئەوەی ئەوان دەیڵێن هەرگیز روی نەداوە! تەنانەت ریوایەت کراوە حەزرەتی یەعقووب بەشێوەیەکی گاڵتەئامێز فەرمووی:

ئای کە گورگێکی لەسەرەخۆو هێدیو هێمن بووی، کوڕەکەم دەخۆی کراسەکەی نادڕێنی!!

**تێبینی :**

پێشبڕکێ لەتفەنگچییەتیدا، لەغاردان بەسواری وڵاغ یان بەپێ دروستە.مەبەست لەپێشبڕکێ بەشێوەی راکردن راهێنانی ئادەمیزادە لەسەر شاڵاو بردنو عەمبازبوونو پەلامار دان: کە رامبوون لەسەر راکردن سوودی هەیە بۆ کاتی شەڕکردن لەگەڵ دوژمنو گەلێ کارو باری تری ژیان.

ئیبنولعەرەبی دەفەرموێ: پێشبڕکێ رێبازێکە لەشەریعەتو رەوشتێکی جوانو بەسوودە، یارمەتیدەرە بۆ کاتی جەنگ.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڕاکردنی ئاساییو بەسواری وشترو بەسواری ئەسپ پێشبڕکێی کردوە.

ڕیوایەت کراوە لەگەڵ عائیشەی خێزانیدا پێشبڕکێی کرد پێش عائیشە کەوت دوایی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەوتە ساڵەوە جارێکی تر پێشبڕکێیان کرد عائیشە پێشی کەوت! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: ئەمجارە لەجیاتی ئەو جارە.

هەروا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشبڕکێی لەگەڵ ئەبوبەکرو عومەردا کردوە پێشیان کەوتووە.

کاتێک موسوڵمانان لە (ذي قرد) گەڕانەوە بۆ مەدینە سەلەمەی کوڕی ئەکوەع پێشبڕکێی لەگەڵ پیاوێکدا کرد سەلەمە پێشی کەوت.

ئیمامی مالیک لەئیبنو عومەرەوە ریوایەت دەکا: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشبڕکێی لەنێوان دوو ئەسپدا ئەنجامدا یەکیان تەضمیر کرابوو، واتە: ئالیکو جۆی درابوویە تا قەڵەو بوبوو پاشان ئالیکو جۆی لێ کەم

کرابوەوە تا قەدی باریك بوبوو، ئەویتریان تەضمیر نەکرابوو. عەبدوڵڵای کوڕی عومەر یەکێك بوو لەوانەی ئەم پێشبڕکێیەی بەم جۆرە ئەسپە ئەنجامدا.

هەروەها پێشبڕکێ دروستە لەوشتر سواریدا لەتیر ئەندازیو تفەنگچییەتیدا.

نەسائی لەئەبو هوڕەیرەوە ریوایەت دەکا، دڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لاسبق الا في نصل أو خف أو حافر)ئیمامی بوخاری لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وشترێکی هەبوو ناوی (العضباء) بوو هیچ وشترێك نەیدەتوانی پێشی بکەوێ لەراکردندا کابرایەکی عەرەب هات وشترێکی (قعودی) پێ بوو پێشبڕکێی لەگەڵ پێغەمبەردا کردو پێش وشتری (العضباء) کەوت، موسوڵمانان زۆریان پێ ناخۆش بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە بەمەی زانی فەرمووی: (حق على الله الا يرفع شيئ في الدنيا الا وضعه) خودا لەسەر خۆی پێویست کردوە هەر شتێك لەجیهاندا بەرز بێتەوە ئیللا نزمی دەکاتەوە. زانایانی ئیسلام کۆڕایان هەیە: کە جائیزەوەرگرتن لەسەر شێوەی گرەوو پێشبڕکێ دروست نیە جگە لەسێ جۆر: کە پێشبڕکێ کردنە بەوشترو وڵاغی سواریو بەتیرئەندازییی!!

ئیمامی شافیعی دەفەرموێ: جگە لەم سێ شتانە پێشبڕکێ کردن قومارە.

پێشبڕکێ کردن بەوشترو ئەسپ کاتێ دروستە کە شوێنی دیاریکراوو کاتی دیاریکراو بۆ پێشبڕکێیەکە هەبن، واتە: دەبێ ماوەی پێشبڕکێیەکەو مەسافەی دیاریکراوبن. هەروەها لەتیرئەندازیشدا دەبێ مەسافەکەو تیرەکانو چۆنیەتی هەنگاوتنەکە دیاریکراو بێ!

## جائیزە وەرگرتن لەسەر پێشبڕکێ لەدوو حاڵدا دروستە:

١- یەکەم فرمانڕەوای وەخت لەماڵی خۆی بڕێك ماڵ تەرخان بکا بۆ ئەو کەسەی دەیباتەوە.

٢- یەکێ لەپێشبڕکێ کارەکان ئەندازەیەك لەماڵی خۆی دیاری بکا ئەگەر هاوەڵەکەی پێشی کەوت بیداتێ، ئەگەر خۆیشی پێشکەوت بۆ خۆی بێ.

خەڵات وەرگرتنی نادروست ئەوەیە: هەر دوولا لەپێشبڕکێ کارەکان ئەندازەیەك ماڵی خۆیان دیاری بکەن، هەرچییان پێشکەوت بەشەکەی خۆیشیو هاوەڵەکەی بۆ خۆی بەرێ. ئەم حاڵە کاتێك دروست دەبێ کە کەسێکی سێیەم بێتە ناو یارییەکەوەو ئەوەشی لێ بوەشێتەوە کە پێشیان بکەوێ. جا ئەگەر لەپێشبڕکێیەکەدا ئەم کەسی سێیەمە بردیەوە ئەوە هەردو بەشەکان بۆ خۆی دەبا ئەگەر ئەوانی تر هەرچییان پێشکەوتن خەڵاتەکە دەباو هیچ نادرێ بەکەسی سێیەم.

## باسی سێهەم لەچیرۆکی یوسف:

## ڕزگار بوونیو حەوانەوەی لەماڵی عەزیزی میصردا

### ١- هێنانە دەرەوەی یوسفو ڕۆیشتنی لەگەڵ کاروانەکەدا

﴿ وَجَآءَتۡ سَيَّارَةٞ فَأَرۡسَلُواْ وَارِدَهُمۡ فَأَدۡلَىٰ دَلۡوَهُۥۖ قَالَ يَٰبُشۡرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٞۚ وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ١٩ وَشَرَوۡهُ بِثَمَنِۭ بَخۡسٖ دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٖ وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ٢٠ ﴾

لەئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار ئەوەی ڕوونکردەوە: کە براکانی یوسف چ کارێکی نامەردانەیان لەگەڵدا کرد، چۆن بەبێ تاوانو بەشێوەیەکی بێ ویژدانی

خستیانە ناو قوڵایی بیرەکەوە، ئەمجار لێرەدا چۆنیەتی رزگار بوونی لەو تەنگانەیە بەهۆی کاروانە بازرگانییەکەوەو بردنی بۆ میصرو فرۆشتنی لەبازاڕدا دیاری دەکاو دەفەرموێ:

﴿وَجَاءَتْ سَيَّارَةٌ فَأَرْسَلُوا وَارِدَهُمْ فَأَدْلَى دَلْوَهُ﴾ کاروانێکی بازرگانی بەپەلە لەوڵاتی مەدیەنەوە بەرەو میصر دەڕۆیشتو بەلای بیرەکەدا تێپەڕین، یەکێکیان نارد هەوڵ بدا ئاویان بۆ پەیدا بکا، کابرا هاتە سەر بیرەکەو دۆڵچەی داهێشت بۆ ناو بیرەکە بۆ ئەوەی پڕ بێ لەئاوو هەڵیکێشێتەوە. ئەو کاتە سێ ڕۆژ بوو یوسف لەو بیرەدا بوو، یەکێك لەبراکانی: کە ناوی یەهوذا بوو خواردنی بۆ دەخستە ناو بیرەکە.

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: براکان پاش ئەوەی یوسفیان خستە ناو بیرەکەوە هەندێکیان لەنزیك بیرەکەوە خۆیان حەشاردابوو، چاوەڕوان بوون جاخۆ کێ دەیبا.

جا کە کابرای کاروانی دۆڵچەکەی داهێشت حەزرەتی یوسف خۆی پێوە هەڵواسی، کابراکە دۆڵچەکەی هەڵکێشایەوە کوڕێکی جوانکیلەی زۆر ڕوح سووكو خنجیلانەی بینی خۆی بەدۆڵچەکەوە هەڵواسیبوو، کابرا هاواری لێ هەڵساو مۆزدەی بەهەڤاڵانی دا ﴿قَالَ يَا بُشْرَى﴾ وتی: ئای لەم خێرو بەرەکەتە! ئای لەم دەستکەوتە بەنرخە! مزگێنی لەخۆمان ﴿هَذَا غُلَامٌ﴾ ئەمە کوڕێکی جوانو شۆخو شەنگە، وەرن سەیر بکەن! بزانن چ دەستکەوتێکمان دەست کەوت!! ﴿وَأَسَرُّوهُ بِضَاعَةً﴾ لەخەڵکی تریان شاردەوەو کردیانە کاڵایەکی نهێنیو لەناو شتو مەکەکانی خۆیاندا شاردیانەوە، بۆ ئەوەی بیبەنەوە بۆ بازاڕی میصر بیفرۆشن، ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾ خودا زانا بوو بەو کردەوانەی دەیانکرد، ئاگادار بوو بەکردەوەی براکانی یوسفو کڕیارو فرۆشیارەکانی ﴿وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ دَرَاهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا فِيهِ مِنَ الزَّاهِدِينَ﴾ بردیانە میصرو بەپارەیەکی کەم فرۆشتیان، ئەو پارەی لەجیاتی یوسف وەریان گرت چەند دیرهەمێکی کەم بوو، بەژمارە وەرگیران نەك بەکێشانە، چونکە

دابـو نـەرێتیان وا بـوو پـارەی کـەمیان بـەژمارە حیـساب دەکـردو پـارەی زۆریـان بەکێشانەو تـەرازو حیـساب دەکـرد. هـەر پارەیـەك لەچل دیرهـەم کـەمتر بوایـە دەیانهەژمارد، ئەگەر لەچل دیرهەم زیاتر بوایە دەیانکێشا، ئەوان یوسفیان بەبیست دیرهەم یـان بیـستو دوو دیرهـەم فرۆشـت ﴿وَكَانُوا فِيهِ مِنَ الزَّاهِدِينَ﴾ ئەوانـەی فرۆشتیان خواخوایان بـوو لـەکۆڵیان بێتـەوە، زۆر لێـی وەڕز بـوونو لایـان بـێ نـرخ بوو، چونکە دەیانەویست لەبەکۆیلە کـردنو فرۆشـتنی رزگاریـان ببـێ.[٢١] بەمـەش کۆتایی بەتەنگانەی یەکەمی حەزرەتی یوسف هات!!

## ٢- لەماڵی عەزیزی میصردا

﴿وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِى
مَثْوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا ۚ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا
لِيُوسُفَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ وَٱللَّهُ
غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢١﴾
وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ
﴿٢٢﴾﴾



[٢١] هەنـدێ لەموفەسـسیرەکان رانـاوی (وشـروە) دەگێڕنـەوە بـۆ براکـانی یوسـف واتـە: ئـەوان فرۆشتیان بەپارەکی کەمو لێی وەڕز بوون، بەڵام مانای سەرەوە ویچووترە.

ئەم ئایەتانە زنجیرەیەکی ترە لەزنجیرەکانی چیرۆکەکە، وەکوو زانیمان یوسف بردرایە بازاڕی میصرو وەکوو کۆیلە فرۆشرا، بەڵام ئەو کەسەی کڕی لەناو چاوانیدا خێرو بەرەکەتی بینیو پێش بینی دوارۆژێکی پرشنگداری بۆ کرد!

وەلێ وەکوو دەبینین تەنگانەیەکی تر لەجۆرێکی تر چاوەڕوانی یوسف دەکا، ئەو کاتەی لەماڵی عەزیزدا رەسیدە دەبێو پێدەگا، خودا زانیاریو دانایی پێ دەبەخشێ، بۆ ئەوەی ڕووبەڕوی ئەو تەنگانانە ببێتەوە کە دێنە ڕێگای.

ئەم تەنگانانەی لەماڵی عەزیزدا تووشی حەزرەتی یوسف بوون تاقیکردنەوەیەکی گرنگ بوون، کەسێك خودا پشتیوانی نەبێ لێیان دەرباز نابێ، ئەویش تەنگانەی دڵداریو حەز لێ کردنی زولەیخا بوو: کە دەیەویست یوسف دەستی لەگەڵ تێکەڵاو بکا، تەنگانەی فیسقو بەرەڵڵایی ناو باڵە خانەو وتاغی چینی دەوڵەمەندەکان بوو، یوسف سەربەرزانەو داوێنپاکانە لێیان رزگار بوو، بەڵام زەریبەی داوێنپاکی داو تووشی زۆر دەردی سەری بوو!

دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِي اشْتَرَاهُ مِنْ مِصْرَ لامْرَأَتِهِ أَكْرِمِي مَثْوَاهُ﴾ ئەو کەسەی لەمیصر حەزرەتی یوسفی کڕی: کە بردیەوە بۆ ماڵەوە بەخێزانەکەی خۆی وت: ڕێزی پلەو مەقامی بگرە!

قورئان باسی ئەم کابرایە ناکا چ کارە بووە ناوی چی بوو پلەو پایەی لەو حکومەتو فرمانڕەوایەی ئەو رۆژەدا چی بووە؟ بەڵام وەکوو لەمە دوا ئاماژەی پێ دەکرێ کابرا عەزیزی میصر بووە.

هێندێك پێیان وایە: سەرەك وەزیران بووە، حەزرەتی یوسفیش دوایی کە کرا بەکاربەدەست لەقەبی عەزیزی میصری پێ بەخشرا.

هەندێك دەڵێن: كابرا لێپرسراوی پۆلیسو سەرۆكی پارێزەرانی پاشا بوو بەندینخانەكانی ئەو وڵاتەی لەژێر دەست دا بوو، ناوی (فوطیفار) یان (قطفیر) یان (أطفیر) بوو!

هەندێكی تر پێیان وایە: كە ئەو كەسەی یوسفی كڕی ئەو فیرعەونە بوو كە حەزرەتی موساو هارونی بۆ سەر رەوانە كراو چوار سەد ساڵ تەمەنی بوو. ئاماژە بەو بەڵگەیە كە قورئان ئاماژەی پێ دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَاءكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِالْبَيِّنَاتِ﴾غافر/٣٤.

بەهەرحاڵ ئێمە هەر لەیەكەم رۆژی گەیشتنی یوسف بۆ میصرو كڕینی لەلایەن عەزیزی میصرەوە دەزانین: كە یوسف گەیشتۆتە جێگاو مەكانێكی ئەمینو لەحیاتی ژیانی پڕ مەینەتی ناو بیرو مەترسی ژیان لەدەستدان، ئێستا وا لەباڵەخانەی پیاوێكی دەست رۆیشتووی مەزنە پیاودا دەحەوێتەوەو بەئارەزۆی خۆی دێو دەچێو كەس دەستی وەبەر دەست ناهێنێ!

عەزیزی میصر كە بەخێزانەكەی دەڵێ رێزی لێ بگرەو دڵنەوایی بكە، هیواو ئاواتی دوارۆژی بەئەم كوڕە بۆ خێزانی دەدركێنێو پێی دەڵێ: ﴿عَسَى أَنْ يَنفَعَنَا﴾ رێزی لێ بگرە بەڵكوو سوودی لێ وەربگرین، یارمەتیمان بدا بۆ ئیشو پێویستی ژیان، ماڵو سامانی خۆمانی پێ بخەینە كارو بەرژەوەندی گشتی خۆمانی پێ بپارێزین ﴿أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَداً﴾ یان بیكەین بەكوڕی خۆمانو ببێتە فینكایی چاومانو بۆ كاتی پیریمان فریامان بكەوێو دوایی میراتو كەلەپورمان لێ بگرێ! وا دیارە عەزیزو خێزانەكەی منداڵیان نەبوون، بۆیە عەزیز تەماعی ئەوەی لێ كرد: كە بیكا بەكوڕی خۆیان!

لەهەمان كاتدا فیراسەتو پێش بینی ڕاست دەرچوو.

ئه‌مجاره په‌روه‌ردگار فه‌ضلو به‌خششی خۆی به‌یان ده‌کا، که به‌سه‌ر یوسفی‌دا رشتن ده‌فه‌رموێ: ﴿وَكَذَلِكَ﴾ واته: وه‌کوو چۆن نیعمه‌تی خۆمانمان پێ به‌خشی به‌سه‌لامه‌تی له‌بیری قوڵو تاریك ده‌رمان هێنا، له‌ده‌ستی براکانی رزگارمان کرد شوێنی حه‌وانه‌وه‌ی باشمان بۆ دابین کرد، دڵی عه‌زیزی میصرمان بۆ نه‌رم کردو سۆزێکی تایبه‌تی هه‌بوو بۆی، هه‌ر به‌و شێوه ﴿مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الأَرْضِ﴾ له‌خاکی میصردا جێگیربوونمان بۆ یوسف دابین کرد، پله‌و پایه‌و شانو شکۆمه‌ندیمان پێ دا، بوو به‌فه‌رمانڕه‌واو کاربه‌ده‌ستێکی گه‌وره‌و لێهاتوو، کاروباری گه‌نجینه‌و ماڵو سامانی وڵاتێکی فراوانی که‌وته ژێر ده‌ستو زۆر به‌لێهاتوویی به‌ڕێوه‌ی بردو بوو به‌مامۆستاو پێشه‌نگی ئه‌وانه‌ی که ده‌بنه کارگێڕی ماڵو سامانی گه‌لو وڵات. به‌ئه‌وپه‌ڕی عه‌داڵه‌تکاری‌و شاره‌زایی‌و ده‌ست پاکییه‌وه ئه‌رکی سه‌رشانی خۆی ئه‌نجام دا، ته‌نانه‌ت پاشا که چاوی پێکه‌وتو قسه‌ی له‌گه‌ڵدا کرد چووه دڵیه‌وه‌و به‌پیاوێکی ده‌ست پاکو لێزانی هاته به‌رچاو بۆیه پێی گوت: ﴿إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مِكِينٌ أَمِينٌ ﴿يوسف : ٥٤﴾﴾یوسف/٥٤. حه‌زره‌تی یوسفیش پێی گوت: ﴿قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَآئِنِ الأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ﴾یوسف/٥٥.

﴿وَلِنُعَلِّمَهُ مِنْ تَأْوِيلِ الأَحَادِيثِ﴾ واته: ده‌سه‌ڵاتو توانای فه‌رمانڕه‌وایی‌و به‌ڕیوه‌بردنمان پێ به‌خشی بۆ ئه‌وه‌ی بیکه‌ینه حوکمدارو فێری مانا لێدانه‌وه‌ی خه‌ونی بکه‌ین، له‌روانگه‌ی ته‌فسیری خه‌ونه‌وه بزانێ چ رو ده‌داو داهاتوو چۆن ده‌بێ؛ پێش وه‌خت خۆ بۆ رووداوه‌کان ئاماده بکا، بتوانێ له‌تێفکرین له‌هه‌ندێ مه‌خلووقات به‌ڵگه له‌سه‌ر ده‌سه‌ڵاتی خودا بدۆزێته‌وه، بزانێ خودا چه‌ند به‌تواناو داناو به‌ده‌سه‌ڵاته.

﴿وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ﴾ خودا به‌تواناو ده‌سه‌ڵاته بۆ ته‌نفیذ کردنی هه‌ر کارێك بیه‌وێ ئه‌نجامی بدا؛ هه‌رچی ده‌رباره‌ی یوسف رویدا هه‌ر له‌دژایه‌تی براکانیه‌وه‌و دۆزینه‌وه‌ی له‌لایه‌ن کاروانه‌که‌وه‌و به‌کۆیله کردنو فرۆشتنی له‌بازاڕی

میصردا، ئه‌مجار ئامۆژگاری عه‌زیزی میصر بۆ خێزانه‌که‌ی که ڕێزی بگرێو دوایی حه‌زلێکردنی زوله‌یخا لێی ئه‌مجار روداوه‌کانی ناو به‌ندینخانه هه‌موویان هۆکار بوونو خودا سازاندبوونی بۆ ئه‌وه‌ی یوسف له‌خاکی میصردا ببێته ئه‌و فه‌رمانڕه‌وایه‌و به‌و پله‌و پایه‌یه بگا ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ به‌لام زوربه‌ی خه‌ڵك نهێنی روداوه‌كان نازانن، ئاگاداری حیكمه‌تو پیلانی خودا نین، ته‌ماشای ظاهیری روداوه‌كان ده‌كه‌نو به‌و پێیه هه‌ڵسو كه‌وت ده‌كه‌ن. ئه‌وه‌تا براكانی یوسف پێیان وا بوو: ئه‌گه‌ر یوسف له‌باوكیان دوور بخه‌نه‌وه ئیتر باوكیان روویان ده‌داتێو گرنگییان پێ ده‌داو ئه‌مجار تۆبه ده‌كه‌نو ده‌بنه تاقمێكی صالحو راستاڵو كاره‌كه به‌ئه‌وه‌نده كۆتایی دێ، نه‌یانده‌زانی كه دوور خستنه‌وه‌ی یوسف له‌باوكی ده‌بێته ئه‌زمونگه‌و تاقیگایه‌كی وا یوسف له‌بۆته ده‌داو ئه‌و پیاوه گه‌وره‌یه‌ی لێ ده‌رده‌چێ كه ده‌بێته هۆی رزگار بوونی گه‌لو ولاتێكو سه‌رباری پله‌و پایه‌ی دونیایی روتبه‌ی پێغه‌مبه‌رایه‌تیشی پێ ده‌درێو بۆ هه‌تا هه‌تایه ده‌بێته نموونه‌ی گه‌نجی داوێنپاكو ده‌ست پاكو خۆڕاگرو خودا په‌رستو زاناو داناو فه‌رمانڕه‌وای دادپه‌روه‌رو لێهاتوو!!

﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ آتَيْنَاهُ حُكْماً وَعِلْماً﴾ كاتێك گه‌ییشته ته‌مه‌نی ژیریو هێزو توانای جه‌سته‌ییو عه‌قڵی ته‌واو بوو، زانیاری حوكمو بڕیاردانی راستو دروستو زانینی به‌ئاكام گه‌ییشتنو سه‌ره‌نجامی روداوه‌كانو مانای خه‌ونمان پێ به‌خشی، زانیاریمان فێر كرد: چۆن ژیان به‌سه‌ر به‌رێو چۆن هه‌ڵسو كه‌وت بكا، چۆن رێگای راستو دروست په‌یڕه‌و بكاو خۆ له‌رێبازی چه‌وت بپارێزێ.

پاش ئه‌وه‌ی په‌روه‌ردگار ئه‌وه‌ی روون كردەوه: كه براكانی یوسف خراپه‌یان له‌گه‌ڵ كردو ئه‌و خۆی راگرتو به‌صه‌برو پشودرێژ بوو هه‌تا خودا ده‌رووی ره‌حمه‌تی لێ كرده‌وه‌و له‌خاكی میصردا جێگیری كرد.

ته‌مه‌نی ژیریو ره‌سیده بوونو خۆداڕشتنو ته‌واو بوونی هێزو توانا له‌نێوان ته‌مه‌نی سی ساڵیو چل ساڵیدا په‌یدا ده‌بێ، هه‌ندێك ده‌ڵێن: له‌ته‌مه‌نی سیو سێ

ساڵیدا یان شتێك زیاتر ئادەمیزاد كامڵ دەبێو ئەم رەوشتانەی تێدا تەواوو كامڵ دەبن. هەندێك پێیان وایە: لەچل ساڵیدا ئەمە دەستەبەر دەبێ..

﴿وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ بەو شێوە پاداشو ئەمەكدانەوە پاداشی چاكەكاران دەدەینەوە. هەر كەسێك رەوشتی ئاوا جوانو جوانمێرانەی تێدا بن، دڵو دەروونی خۆیان بەخراپەكاریو تاوان پیس نەكردبێ، لەلایەن خۆمانەوە بەهرەی حوكم كردن بەعەدالەتو حەقخوازییان پێ دەبەخشین، زانیاری بەسوودیان فێر دەكەین بتوانن حەقو بەتاڵ لێك جودا بكەنەوە، چونكە چاكەكاری كاریگەری خۆی هەیە لەمشتو مالكردنی عەقڵو گیاندا، وا لەئادەمیزاد دەكا تێگەیشتووبێ، حەقیقەتی شتەكان بزانێ، جگە لەو شتانەی بەهۆی هەوڵدانو توێژینەوە فێریان دەبێ.

## باسی چوارەم لەچیرۆكی یوسف

## یوسفو ژنی عەزیز

﴿ وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ
ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ
مَثۡوَايَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ وَهَمَّ
بِهَا لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦۚ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ
وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٢٤﴾ وَٱسۡتَبَقَا

ٱلۡبَابَ وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلۡبَابِۚ
قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ
أَلِيمٞ ﴿٢٥﴾ قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ
أَهۡلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٖ فَصَدَقَتۡ وَهُوَ مِنَ
ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٢٦﴾ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ فَكَذَبَتۡ وَهُوَ
مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٧﴾ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ قَالَ إِنَّهُۥ
مِن كَيۡدِكُنَّۖ إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ ﴿٢٨﴾ يُوسُفُ أَعۡرِضۡ عَنۡ
هَٰذَاۚ وَٱسۡتَغۡفِرِي لِذَنۢبِكِۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلۡخَاطِـِٔينَ
﴿٢٩﴾

ئەمەش تاقیکردنەوەیەکی ترە حەزرەتی یوسف تێی دەکەوێ‌و بەداوێنپاکی‌و دەستپاکی لێی دەردەچێ، هەڵبەتە ئەو ژینگەو دەورو بەرەی یوسف تێیدا دەژیا رێگای بەدکاری‌و داوێنپیسی‌و رابواردنی وا ناشیرینی دەدا، چونکە بیئەکە بیئەیەکی نازدارو خۆویستانە بوو. کۆمەڵگایەکی ئەرستوقراطی‌و تەرەف ئامێز بوو. یوسف لەو کۆمەڵگایەدا کۆیلە بوو، لەتەمەنێکی زۆر حەساس‌و فیتنە ئامێزدا بوو، ئەم تاقیگایەی یوسف پێیدا تێپەڕی ماوەیەکی زۆری خایاندو

جەوێکی وا بوو: هەڵخلیسکان تێیدا بەشتێکی ئاسایی دەژمێردرا، بەڵام حەزرەتی یوسف سەربەرزانە لێی دەرچوو، هۆکارو کاریگەری ئەو کەش‌و هەوایە نەیانتوانی تۆزقاڵێك ئەم زاتە لەخشتە بەرن‌و سومعەی لەکەدار بکەن!

تەمەنی یوسف‌و تەمەنی خانمی عەزیز هەردوکیان لەپلەو قۆناغێکدا بوون داخوازی ئەوە بوون: یوسف هەڵخەڵەتێ‌و بکەوێتە داوی زولەیخاوە، بەتایبەتی کە حەزلێکردن‌و داخوازییەکەی زولەیخا بۆ یوسف شتێکی کوتو پڕی نەبوو، بەڵکوو زۆر لەمێژ بوو زولەیخا نەخشەی بۆ داڕشت بوو بەئاشکرا حەزو ئارەزۆی خۆی درکاند بوو، ئاخۆ چەند جار لەوەپێش بەدرکەو کینایە ئەم حەزەی خۆی نیشان داوە.

دەفەرموێ: ﴿وَرَاوَدَتْهُ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَنْ نَفْسِهِ﴾ داوای دەست تێکەڵکردنی لەیوسف کرد ئەو خانمەی کە یوسف لەماڵەکەیدا ژیانی بەسەردەبرد، بەڵێ زولەیخا (ژنی عەزیز) کە ئاغا ژن‌و گەورەی یوسف بوو داوای لەیوسف کرد کە دەستی لەگەڵ تێکەڵاو بکا.

شۆخ‌و شەنگی‌و جوانچاکی‌و قۆزی حەزرەتی یوسف گەییشتبوە ئاستێك زولەیخای ئاغاژن داوا لەیوسف بکا لەگەڵی رابوێرێ، دەستی لەگەڵ تێکەڵاو بکا، تەنانەت کار گەییشتە ئاستێك زولەیخا هەموو شتێك بۆ ئەو حەزو ئارەزۆیەی دابین بکا، هەموو خۆڕازاندنەوەو جێگا سازکردن‌و قایمکارییەکی ئەنجام دا. ﴿وَغَلَّقَتْ الأَبْوَابَ﴾ حەوت دەرگای باڵەخانەی داخستن، فەرمانی دابوو کەنیزەك‌و کارەکەرو خزمەتچی لەو ماڵەدا نەمێنن، بەکردەوە هەموو شتێکی مادی ئامادە کردو حەزو ئارەزۆی گەییشتە ئاستێك پەردەی حەیا بدڕێ‌و بەشێوەی فەرمان روبکاتە حەزرەتی یوسف، بەئاشکرا داوای لێ بکا ئارەزۆی جینسی دابمرکێنێتەوە ﴿وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ﴾ پێی گوت: دەی خۆت ئامادە بکەو وەرە پێشەوەو دەس بەکاربەو دوامەکەوەو خێرابە!

ئەم بانگەوازییە حەیاتکاوییە بێ شەرمییەی زولەیخا بانگەوازی سەرەتایی حەز لێ کردنەکەی نەبوو، بەڵکوو بانگەوازی کۆتاییی و دوا پلەی فشار هێنانی داخوازی جینسی بوو: کە تەنگی بەزولەیخا هەڵچنیو باری دەروونی وا لێ کرد: کە ئاوا بێ شەرمانە ئەو داوایە لەیوسف بکا، بێگومان ئەم داوایە بەو جۆرە ئاراستە ناکرێ ئەگەر ئەو ئافرەتە نەگاتە تینیو چاری ناچار نەبێو لەوەپێش رێخۆشکەرەو بەرکۆڵی جۆراو جۆری بۆ ئەنجام نەدابن!

ئەوەتا یوسف بەو شۆخو شەنگیو لاوچاکییە لەو باڵەخانەدا لەگەڵی دەژیا، رۆژ بەرۆژ گەنجایەتی کامڵ دەبێو لاویەتی تێدا بەرجەستە دەبێ، لەلایەکی ترەوە لایەنی مێیینەی زولەیخاش وێڕای جوانخاسیو پێگەییشتوویی یوسف رۆژ بەرۆژو سات دوای سات پێ دەگاو گەشە دەکا، کەوابوو دەبێ لەوەپێشو لەرۆژانی رابوردودا جۆرەها ئیغرائاتو تێفکرینو تەماشا کردنو چاو داگرتنو پێکەنینو قسەی خۆش لەگەڵ کردنی رویدا بێو ریخۆشکەرە بووبن بۆ تەقینەوەی ئەو فشارە جینسییەی کە تینی بۆ زولەیخا هێناو بەو شێوە داوای لەیوسف کرد!!

بەڵام ئایا حەزرەتی یوسف لەبەرامبەر ئەم ئیغرائاتو داخوازییەی زولەیخا چ هەڵوێستێکی نواندو چی کرد؟!

﴿قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ﴾ حەزرەتی یوسف فەرمووی: پەنا دەگرم بەخودا هانای بۆ دەبەم لەوەی: کە من شتی ئاوا بکەم! هەر خودا دەم پارێزێ لەوەی: کە من بچمە پێڕی نەفامانەوە، من هەرگیز ئەوەی تۆ داوام لێ دەکەیو دەتەوێ ئەنجامی بدەم توخنی ناکەوم، ئەوە خیانەتەو بێ وەفاییەو ناکەس بەچەییە من داوێنپیسی لەگەڵ تۆدا بکەم، چونکە تۆ خێزانی گەورەکەمی، بێگومان تۆ خێزانی عەزیزی میصری ﴿إِنَّهُ رَبِّي﴾ ئەویش خاوەنی منەو گەورەمەو ئەمن بەمڵکایەتی هی ئەوم ﴿أَحْسَنَ مَثْوَايَ﴾ مامەڵەی لەگەڵمدا زۆر پیاوانە بووە رێزی لێ گرتووم، وەکوو کوڕی خۆی حسێب کردووم، تەنانەت ئامۆژگاری تۆشی کرد: کە رێزم بگری! چۆن

من پاداشی ئەو چاکەیەی بەوە بدەمەوە خییانەتی نامووسی لێ بکەم؟! چۆن دەبێ پاساوی پیاوەتی جوانمێری عەزیز بەوەبدەمەوە داوێنپیسی لەگەڵ خێزانەکەیدا بکەم؟! ﴿إِنَّـهُ لا يُفْلِـحُ الظَّـالِمُونَ﴾ بێگومان ستەمکاران سەرکەوتوو نابن، خودا ستەمکاران سەرناخا: ئەوانەی ستەم لەخۆیان دەکەن‌و ستەم لەخەڵکی تر دەکەن خییانەتیان لێ دەکەن، دەستدرێژی دەکەنە سەر نامووسیان، نەلەدونیا سەرکەوتوو دەبن‌و دەگەنە مەرامی خۆیان نەلەقیامەتدا رەزامەندی خودایان دەست دەکەوێ‌و دەچنە بەهەشتەوە!!

﴿وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ﴾ بێگومان زولەیخا قەصدی یوسفی کرد بەوە پەلاماری بداو تۆڵەی مل نەدانی بۆ فەرمانەکەی لێ بستێنێ، ئەو ئاغا ژن‌و گەورەو خاوەنیەتی‌و داوای کارێکی وای لێ دەکاو بەقسەی ناکا، دەیەوێ تەمبێی بکاو سزای ئەم سەرپێچیکردنەی لێ بستێنێ!

یان زولەیخا شالاوی بۆ یوسف هێناو پەلاماری داو باوەشی پێدا کرد بۆ ئەوەی لەگەڵی تێکەڵاو بێ!

﴿وَهَمَّ بِهَا لَوْلا أَنْ رَأَى بُرْهَانَ رَبِّهِ﴾ حەزرەتی یوسفیش بەگوێرەی سروشتی ئادەمیزادو حاڵەتی گەنجی‌و بارودۆخی رووداوەکە لەدڵداو بەشێوە ختوکەدانی نەفس‌و خەتەرەی ناو دەروون مەیلی کرد، خۆ ئەگەر نیشانەی خودای خۆی نەبینیایە دەکەوتە ژێر کاریگەری زولەیخاوەو تاوان روی دەدا، بەڵام خودا پاراستی‌و خستیە دڵیەوە کە باشترین چارە بۆ ئەو هەڵاتنەو هەوڵ بدا خۆی لەدەست زولەیخا رزگار بکا.

**بەکورتی جوداوازی نێوان قەصدی زولەیخاو قەصدی یوسف بەم جۆرە بوو:**

زولەیخا ویستی کوڵی دڵی خۆی پێ برێژێ تۆڵەی ملنەدان‌و سەرپێچیکردنی لێ بستێنێ، چونکە ئاواتەکەی نەهاتە دی‌و ئەوەی دەیەویست نەهاتە جێ، بەڵکوو

وایدەزانی کە سوکایەتی پێ کراوەو فەرمانی کردوەو فەرمانی جێ بەجێ نەکراوە، هەستی بەتێشکاوی خۆی دەکرد، بۆیە ویستی رقی دڵی پێ برێژێو تەمبێی بکا. حەزرەتی یوسفیش خۆی ئامادە کرد بۆ بەرگریکردن لەخۆیو کاتێك نیشانەی ئەوەی بینی کە شازادە دەیەوێ هەڵمەتی بۆ بێنێ بڕیاری بەرگریکردن لەنەفسی خۆیدا. بەڵام لەو کاتەدا کە زولەیخا دەیەوێ پەلاماری بداو یوسف دەیەوێ بەرگری لەخۆی بکا یوسف نیشانەیەکی خودایی بینی: کە زولەیخا نەیبینی، ئەوە بوو خودا ئەوەی خستە دڵی یوسفەوە کە رێگای هەڵاتن بدۆزێتەوە، چونکە هەڵاتن لەم موقیفە دەبێتە خێر بۆیو بەرەو رێبازی سەرکەوتنو رزگار بوون دەیبا، لەتاوانی زینا یان کوشتنو برین رزگاری دەکا. بۆیە بەرەو دەرگا رایکردو زولەیخا بەدویەوە.(٢٢)

هەندێك لەراڤەکەران پێیان وایە وەکوو لەوەپێش ئاماژەمان پێ کرد هەمو قەصدی زولەیخا بۆ ئەنجامدانی داوێنپیسیو زینا کردن هیچ لەمپەڕو مانیعێکی نەبوەو بەعەزمو جەزمەوە ویستی یوسف دەستی لەگەڵ تێکەڵاو بکا، یوسفیش لەدڵدا مەیلی کردو غەریزەی جینسی ختوکەیدا، ئەگەر نیشانەو بەڵگەی خودایی نەبینینایە ویستی زولەیخای دەهێنایە دیو ئەو تاوانەی ئەنجام دەدا.

هەندێکی تر لەموفەسسرین پێیان وایە: یوسف بەدڵیش مەیلی نەبوە، نەقەصدی بەرگریکردنی کردوە نەلەدڵیشدا مەیلی زینای کردوە. چونکە وشەی (لولا) مانای پەیدا نەبوونی شتێك دەگەیەنێ لەبەر هەبوونی شتێك بەعەرەبی دەڵێن: (لولا حرف امتناع لوجود) وەلامەکەشی حەزف کراوە. کەوابێ مانای ﴿وَهَمَّ بِهَا لَوْلا أَنْ رَأَى بُرْهَانَ رَبِّهِ﴾ بەم جۆرەیە: حەزرەتی یوسف بەگوێرەی غەریزەی ئادەمیزادی مەیلی کرد، ئەگەر بورهانو بەڵگەی خودای نەبینینایە بەتەواوی ملی

---

(٢٢) ئەمە پوختەی رای تەفسیری طەبەریو تەفسیری کەبیرو رای پەسندی قازی ئەبو بەکری باقلانییە. تەفسیری (المنار)یش هەر رایەکی لەم جۆرەی هەیە.

دەداو دەستی لەگەڵ تێکەڵاو دەکرد لەزمانی عەرەبیشدا ئەم جۆرە رستەو دەقانە زۆرو زەبەندەمن دەگوترێ: (قصدت قتله لولا اني خفت الله) واتە: (لولا أني خفت الله لقتلته) کەوابوو لەئایەتەکەدا تەقدیمو تەئخیر هەیە، رستەکە پاشو پێشی پێ کراوە، واتە: (لولا أن رأى برهان ربه لهمّ بها)

بەکورتی یوسف هیچ تاوانێکی ئەنجام نەدا، ئەگەر پارێزگاریو چاودێری خودا نەبوایە مەیلی بۆ دەکردو دەستی لەگەڵ تێکەڵاو دەکرد. بەڵام خودا پاراستیو نەیهێشت هیچ تاوانێك بکا.

ئەمجار ئایا مەبەست بە(همّ) چیە؟ دەڵێن: مەبەست بە(همّ) ئاخاوتنی نەفسە، مەیلو ئارەزۆی دەست تێکەڵاو کردنە، ئەمەش سروشتی ئادەمیزادییە، لەشەرعدا لۆمەی لەسەر نیە، کەوابێ ناگوترێ: چۆن دەگونجێ پێغەمبەرێکی خودا مەیلو ئارەزۆی گوناه بکا؟!

بەلگە لەسەر ئەوە کە مەیلو ئارەزوی نەفس پرسینەوەی لەسەر نیە، چونکە پلەی لەخوار عەزمو جەزمەوەیە، ئیمامی بەغەوی لەفەرموودەیەکدا: کە عەبدورڕەزاق ریوایەتی کردوەو لەصەحیحی (بوخاریو موسلیم)یشدا هاتووە، ئەبو هورەیرە دەیگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (اذا همّ عبدي بحسنة، فاكتبوها له حسنة، فان عملها فاكتبوها بعشر أمثالها، وان همّ بسيئة فلم يعملها فاكتبوها حسنة، فانما تركها من أجراي، فان عملها فاكتبوها بمثلها).

ئەمجا ئەو بورهانەی کە حەزرەتی یوسف بینی، دەبێ چی بووبێ؟! هەندێك دەڵێن: ئەوەیە: کە خودا لەسەر موکەللەفاکانی پێویست کردوە کە خۆیان لەتاوان بپارێزن. یان بەلگەو دەلیلی خودایە لەسەر ئەوە: کە زینا حەرامە، یان زانینی ئەوە: کە زیناکەر عیقاب دەدرێ یان پاککردنەوەی دڵو دەروونی پێغەمبەرانە لەرەوشتی ناشیرینو ناپەسند، یان ئەو روتبەو نیشانە پێغەمبەرایەتیەیە: کە

ده‌بێته له‌مپه‌ڕ له‌به‌رده‌م تاوانو ره‌وشتی ناشریندا، ده‌گونجێ هه‌موو ئه‌م مانایانه به‌رچاو بگرین..

ده‌توانین بڵێین: مه‌به‌ست به‌(رب) له‌رسته‌ی ﴿لَوْلا أَنْ رَأَى بُرْهَانَ رَبِّهِ﴾دا عه‌زیزی میصره نه‌ك خودای مه‌زن. چونکه له‌زاراوه‌ی عه‌ره‌بیدا (رب) به‌مانا به‌خێوکه‌رو مالیك هاتووه. ئه‌و کاته مه‌به‌ست به‌(بورهان) ئه‌و ده‌بده‌به‌و سازو سه‌متورو ته‌پڵو ده‌فه‌یه که له‌گه‌ڵ عه‌زیزدا دوا ده‌وام ده‌گه‌ڕانه‌وه، چونکه عاده‌ته‌ن پاشاو کاربه‌ده‌ستی گه‌وره ده‌ستو پێوه‌ندو حه‌ره‌سو هه‌یتو هوتیان له‌خزمه‌تدایه. جا به‌م پێیه ده‌بێ له‌و کاته‌دا؛ که زوله‌یخا پێکێشی له‌یوسف کردوه‌و قه‌صدی ئه‌وه‌ی کردوه که تۆڵه له‌یوسف بستێنێو یوسف ویستویه‌تی به‌رگری له‌خۆی بکاو ته‌نانه‌ت هه‌موو هێزو توانای خۆی بخاته کار بۆ دیفاعکردن له‌نه‌فسی خۆی، ئا له‌و کاته‌دا که‌ژاوه‌ی عه‌زیزی بینیوه به‌ره‌و ماڵ هاتۆته‌وه، ئیتر له‌جیاتی ئه‌وه‌ی دیفاع بکا به‌ره‌و ده‌رگا قاچاندویه‌تیو ویستوویه‌تی خۆی رزگار بکا.

ئه‌مه به‌کورتی ئه‌و راڤه‌و ته‌فسیرانه بوون که بۆ ئه‌م ئایه‌ته به‌پێویستم زانی بیانخه‌مه به‌رده‌ستو به‌وێچوو گونجاوم زانین.

شایانی باسه هه‌ندێ ته‌فسیری تر هه‌ن: که کاریگه‌ری ئیسرائیلیاتیان پێوه دیاره پێویسته زۆر به‌حه‌زه‌ره‌وه شتیان لێ وه‌ربگرین چونکه چیرۆکو ئه‌فسانه‌ی وه‌نده سه‌یرو سه‌مه‌ره‌یان هێناون که پیاو سه‌ری له‌گێلیو سافیلکه‌یی ئه‌و موفه‌سیرانه سوڕ ده‌مێنێ، بۆ نموونه یوسف واراده‌نوێنن: که شه‌هوه‌تو ئاره‌زۆی تینی بۆ هێنابێو له‌زوله‌یخا زیاتر به‌کۆڵ بووبێ، وای نیشان ده‌ده‌ن که خودا ده‌یه‌وێ به‌به‌ڵگه له‌و تاوانه‌ی وه‌گێڕێ، به‌ڵام ناگه‌ڕێته‌وه. وێنه‌ی باوکی له‌سه‌قفی هوده‌که چاو پێ ده‌که‌وێو قامکی خۆی له‌داخان ده‌گه‌زێو ده‌ڵێ: کوڕه نه‌که‌ی! هه‌روا چه‌ند له‌وحه‌یه‌کی بۆ کێشراون: که ئایه‌تی قورئانیان له‌سه‌ر نووسراوه (به‌ڵێ ئایه‌تی قورئان) نه‌هی لا ده‌که‌ن که ئه‌و کاره ناشرینه نه‌کا. به‌ڵام به‌مانه‌ش

دانەپەتاو ئارەزۆی دانەمرکایەوە!! هەتا خودا جوبرائیلی نارد مستەکۆڵەیەکی لەسنگی یوسف داو پاشەو پاش گێڕایەوە دواوە!!! ئەمجار وازی هێنا!![٢٣]

دەی تو خوا ئەگەر ئەمە وابێ ئازایەتی یوسف لەکوێدایەو خوڕاگرییەکەی چیە!؟

﴿كَذَلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ﴾ ئاوا بەو جۆرە یوسف بەگوێی مەیلی دڵی نەکردو پڕکێشی تاوانو خیانەتی نەکردو بەداوێنپاکی مایەوە، بەم جۆرە یوسفمان لەسەر پاکو خاوێنیو داوێنپاکی پەروەردە کردو رامان کرد لەسەر بەردەوام بوون لەسەر ئەو رەوشتە بەرزانە، بۆ ئەوەی خراپەی خیانەتو تاوانی زینا کردنی لێ دوور بخەینەوە، بۆ ئەوەی لەپیڕی چاکەکاراندا بمێنێتەوەو نەچێتە ناو تاقمی ستەمکارانەوە.

﴿إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ﴾ بێگومان یوسف یەکێك بوو لەبەندە راستاڵەکانی ئێمە، دڵسۆز بوو بۆ ئایینی خودا، هەڵبژاردەبوو شەیتان نەیتوانی لەخشتەی بەرێ!

جا وەکوو لەپێشەوە ئاماژەمان پێ کرد زولەیخا کە زانی یوسف مل نادا بۆ داواکەی ویستی پەلاماری بداو تۆڵەی سەرپێچی لێ بستێنێ، (یوسف)یش ویستی بەرگری لەخۆی بکا بەڵام کە بورهانو بەڵگەی خودایی بینین، یان مەوکیبو کەژاوەی عەزیزی میصری بینی بەرەو ماڵ دەهاتەوە بڕیاریدا هەڵێو خۆی دەرباز بکا، ئیتر ﴿وَاسْتَبَقَا الْبَابَ﴾ هەرا دوکیان بەرەو دەرگای دەرەوە رایان کرد؛ یوسف لەپێشەوەو زولەیخا بەدواوە، یوسف دەیەویست بگاتە دەرگای حەوشەو دەرچێ، زولەیخا بەدوایدا رادەیکرد دەیەویست نەهێڵێ لەدەرگا دەرچێ، لەکاتی یەکتر راونانەکەدا زولەیخا لەدواوە لەیوسف نزیک کەوتەوە ﴿وَقَدَّتْ قَمِيصَهُ مِنْ دُبُرٍ﴾ کراسی یوسفی گرتو دڕاندی، ویستی لەدواوە یەخەی کراسەکەی بگرێو بۆ دواوە

---

(٢٣) سەیری (الأساس) ج٥/٢٦٥١ بکە.

بیگێڕێتـەوەو نـەهێڵێ دەربـارز ببـێ، یەخـەی کـراس دڕاو لـەو کاتـە ناسکەداو بـەو حاڵەتە سەرنج ڕاکێشە موفاجەئەیەکی سەیر قـەوما چونکە ﴿وَأَلْفَيَـا سَـيِّدَهَا لَـدَى الْبَابِ﴾ هەردوکیان؛ یوسفـو زولەیخا لوتیان بەلوتی عەزیزەوە هەڵتەقییەوەو لەناو دەرگاکەدا بەرەوڕوی بوونەوە!

ئیتر زولەیخا هەوڵی دا بەمەکرو حیلە خۆ لەتاوانەکە دەرباز بکاو تۆمەتەکە وەپـاڵ یوسـف بـدا، وەڵامێکـی ئامـادەکراوی بـۆ پرسـیارێك کـە شـێوە گوماناوییەکـە هەڵیساندبوو خێـرا دایـەوە، ویـستی تۆمەتەکـە بخاتـە ئەسـتۆی حـەزرەتی یوسـف ﴿قَالَتْ مَا جَزَاءُ مَـنْ أَرَادَ بِأَهْلِـكَ سُـوءاً ؟﴾ وتـی: ئـەوە سـزای ئـەو کەسـە چیـە: کـە بیەوێ دەستدرێژی بکاتـە سـەر خێزانـی تـۆ؟ بـەڵام لـەم کاتـەشدا چـونکە زولـەیخا ئەوینی یوسفی هـەبوو، ترسـی ئـەوەی هـەبوو عـەزیز، یـان کەسـانی دیکـە، بڕیـاری سزایەکی بۆ بدەن: کە یوسف لەناو بچێ، بۆیـە خێـرا جـۆری سـزاکەی دیـاری کـردو وتی: ﴿إِلاَّ أَنْ يُسْجَنَ أَوْ عَـذَابٌ أَلِـيمٌ﴾ مەگـەر بەنـد بکـرێ، یـان دارکارییـەکی بـاش بکرێو سزایەکی بەئێش بدرێ.

**ئیمامی رازی لێرەدا چەند بەڵگەیەك دەهێنێتەوە هەموویان نیشانەی ئەوەن کە یوسف ڕاست دەکاو زولە یخا درۆزنە :**

١- یوسـف بەڕواڵـەت لـەماڵی زولـەیخادا کویلـە بـوو، کۆیلـەش هـەرگیز ئـەو دەسەڵاتەی بەسەر خاوەنی خۆیدا نابێ.

٢- بەچـاو بینـدرا یوسـف رایـدەکرد بـۆ ئـەوەی دەربـچێو رزگـاری ببـێ. دەی کەسێك بیەوێ لەگەڵ ئافرەتێکدا رابوێرێ ئاوا لەبەری ڕاناکا.

٣- زولەیخا خۆی ئارایش دابـوو، بـەجوانترین شـێوە خـۆی رازانـدبووەوە، بـەڵام یوسف وانەبوو.

٤- لەوەپێش‌و لەو ماوە دوورو درێژەدا یوسف بەداوێنپیس مەشهوور نەبوەو حاڵەتێکی لێ نەبیندراوە کە لەگەڵ ئەو کردەوە بگونجێ.

٥- زولەیخا بەصەراحەت نیسبەتی فاحیشەکەی وەپاڵ یوسف نەدا بەڵکوو بەموجمەلی قسەکەی درکاند.

ئەمجار یوسف دەیەوێ تۆمەتەکە لەخۆی دوور بخاتەوە، راستی دەدرکێنێ‌و تۆمەتی پووچ‌و بێ بناغە رەت دەکاتەوە ﴿قَالَ هِيَ رَاوَدَتْنِي عَنْ نَفْسِي﴾ فەرمووی: نەخێر وا نیەو من هیچ دەستدرێژییەکەم نەکردۆتە سەر ئەم ئافرەتە بەڵکوو ئەو هەوڵی دا بەمەکرو حیلەبازی لەخشتەم بەرێ، هەڵم خەڵەتێنێ ئەو ویستی من کەمەندکێش بکاو من بەقسەم نەکرد، کێشەیان تێکەوتو هەریەکەیان ئەوی تری تاوانبار دەکردو بەڵگەی لەسەر بێ تاوانی خۆی دەهێنایەوە، هەتا کار گەیشتە ئەوە ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِنْ أَهْلِهَا:﴾ یەکێك لەخزمەکانی زولەیخا شایەتی دا وتی: سەیر بکەن‌و بزانن ﴿إِنْ كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِنْ قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنْ الْكَاذِبِينَ﴾ ئەگەر کراسەکەی یوسف لەپێشەوە دادڕاوە، ئەوە زولەیخا راست دەکاو یوسف لەپێڕی درۆزنانە.

﴿وَإِنْ كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِنْ دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنْ الصَّادِقِينَ﴾ ئەگەر کراسەکەی لەدواوە دادڕاوە ئەوە زولەیخا درۆ دەکاو یوسف لەراستگۆیانە.

ئەمجار ماوەتەوە بزانین ئەم شاهیدە کێ بوو؟ لەکوێ‌و چۆن ئەم شایەتیەی دا؟ ئایا ئەم شایەتە لەگەڵ عەزیزی میصردا بوو؟ لەگەڵ مەوکیبی ئەو دادەهاتەوەو حازری روداوەکە بوو؟ یان عەزیز بەتایبەتی لەدووی ناردو روداوەکەی بۆ گێڕایەوەو داوای ئەوەی لێ کرد لەم بارەوە بڕیارێك بدا، وەکوو چۆن باوە: کە لەو حاڵەتانەدا پیاوماقوڵێك لەبنەماڵەی ئافرەتەکە بانگ بکرێ‌و بەسەر روداوەکەدا ئاگادار بکرێ‌و رای وەربگیرێ، بەتایبەتی لەناو چین‌و توێژێکی خوێن ساردو فاسیدی وەکوو کۆمەڵگای ئەو سەردەمەدا.

**ئەمجار زانایانی تەفسیر دەربارەی ئەم شایەتە دوو ڕایان هەیە:**

ئایا منداڵ بووە یان گەورە بووە؟؟ ئایا ئادەمیزاد بووە یان کراسەکە بوو؟!
کەوابوو بۆ دیاریکردنی ئەو شایەتە سێ را دێنە پێشەوە:

١- ئەو کابرایە کوڕی مامی زولەیخا بوو، پیاوێکی داناو عاقڵ مەند بوو، کە سەیری روداوەکەی کرد وتی: ئەگەر کراسەکەی لەپێشەوە دادڕاوە ئەوە زولەیخا راست دەکاو یوسف درۆزنە، ئەگەر دڕانی کراسەکە لەدواوەیە، ئەوە یوسف راست دەکاو زولەیخا درۆزنە.. جا کەسەیری کراسەکەسان کرد لەدواوە دڕابوو، ئیتر ئامۆزاکەی زولەیخا بەزولەیخای گوت: ﴿إِنَّهُ مِنْ كَيْدِكُنَّ﴾ واتە: ئەمە ئیشی تۆیە، ئەمجار بە(یوسف)یشی گوت: داوای لێ خۆشبوون بکەو عوزر بێنەوە.

٢- ئەو شاهیدە وەکوو ئیبنو عەبباسو کۆمەڵێك دەڵێن: منداڵێکی ساوا بوو خودا زمانی کردەوەو دەستی کرد بەئاخاوتن.

ئیبنو جەریری طەبەری لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: پێغەمبەر فەرموویەتی: (تكلم أربع وهم صغار: ابن شطة بنت فرعون، وشاهد يوسف، وصاحب جريج، وعيسى بن مريم) چوار کەس بەمنداڵی زمانیان پژاوەو کەوتوونە ئاخاوتن: کچی فیرعەونو شایەدی یوسفو هاوەڵی جورەیجو عیسای کوڕی مەریەم..

٣- شایەتەکە کراسە دڕاوەکە بوو، ئیمامی رازی دەفەرموێ: ئەم رایە زۆر لاوازە، چونکە کراس بە(أهلها) وەصفدار ناکرێ.

جا ﴿فَلَمَّا رَأَى قَمِيصَهُ قُدَّ مِنْ دُبُرٍ﴾ کە عەزیزی میصر یان شایەتەکە تەماشای کرد، بینی: کراسەکەی لەدواوە دڕاوە، بەم پێیە دەرکەوت: کە راستگۆ یوسفەو حەق بەلای ئەووەیە، کە لەمە دڵنیا بوو: ﴿قَالَ إِنَّهُ مِنْ كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ﴾ وتی: ئەوە لەمەکرو حیلەی تۆیە ئەی زولەیخا! ئەمە بەشێکە لەفێڵەکانت، بەراستی

حیلەو فێڵی ئێوەی ئافرەت کاریگەرن لەسەر دڵو دەروون، زۆر سەرسووڕهێنەرنو پیاوان کەم وا هەیە زوو پەییان پێ بەرن، هەرگیز پیاوان فێڵی وا نازانن! بێگومان ئەم جۆرە قسانە بۆ ئافرەت بەسەرزەنشتکردن نازمێردێن، چونکە وەپاڵدانی مەکربازیی بۆ لای ئافرەت، ئاماژە کردنە بۆ ئەوە: کە ژنیەتی تەواوەو توانای مێیینەیەتی زۆر بەهێزە!!

﴿يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَذَا﴾ ئەی یوسف! ئەو شتە پاشگوێ بخەو گرنگی پێ مەدەو باسی مەکەو پەردەپۆشی بکە!

ئەمجار ئامۆژگاری خانم دەکا: کە حەزی لەکۆیلەی خۆی کردوە، لەدواوە کراسی کۆیلەی خۆی دڕاندوەو بەم تاوانەوە گیراوە! دەڵێ: ﴿وَاسْتَغْفِرِي لِذَنْبِكِ إِنَّكِ كُنتِ مِنْ الْخَاطِئِينَ﴾ ئەی زولەیخا! تۆ تاوانباری داوای لێ بوردن لەتاوانەکەت بکە، بێگومان تۆ لەپێڕی تاوانبارانی!.

## باسی پێنجەم لەچیرۆکی یوسف:

## بڵاوبوونەوەی هەواڵی حەزلێکردنی زولەیخا لەیوسف بەناو ئافرەتانی شارداو پیلانی زولەیخا

﴿ ۞ وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي ٱلْمَدِينَةِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا
عَن نَّفْسِهِۦ ۖ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا ۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾
فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَـًٔا وَءَاتَتْ كُلَّ
وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ ۖ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ

وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ
كَرِيمٌ ﴿٣١﴾ قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمْتُنَّنِى فِيهِ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن
نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ
ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَىَّ مِمَّا يَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ
وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّى كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾
فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ
﴿٣٤﴾ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا رَأَوُا۟ ٱلْءَايَٰتِ لَيَسْجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٍ
﴿٣٥﴾



پاش ئەم رووداوەش عەزیز نەهات زولەیخاو یوسف لێك دابڕێ، نەزولەیخای دەرکرد، نەیوسفی گواستەوە بۆ شوێنێکی دوور، بەڵکوو هەروەندەی پێ کرا داوای لەیوسف کرد رووداوەکە پاشگوێ بخاو پەردەپۆشی بکاو ئامۆژگاری زولەیخاشی کرد کە خۆی بەهەڵەکار بزانێو داوای لێبوردن بکا!!

رۆژان هاتو رۆیشتنو یوسف لەماڵی عەزیزدا مایەوەو زولەیخا شاژنو خانمی ماڵە. کاروباری قەصری عەزیز وەکوو خۆی دەڕۆیشت. بەڵام قەصری لێپرسراوان دیواری تایبەتی خۆی هەیە رەنجەرو کارەکەری تێدان، کارێکی ئاوا لەناو حەرەمی عەزیزدا روبدا داناپۆشرێ، کوردی وتەنی: (قسە کەوتە زارێ دەکەوێتە شارێ)

چونکە بیئەکە بیئەیەکی ئەرستوقراطییەو ئافرەتانی ناو ئەو کۆمەڵگاو بیئەیە ئیش‌و کاریان نیە جگە لەگێڕانەوەی باس‌و خواسی ئەو روداوانەی کە لەو دەورو بەرمیاندا رودەدا، بۆیە ئەم هەواڵە بەناو ئافرەتان‌و خانمانی شاردا بلاوبووەوە، هەر یەکە بەجۆرێك لێی دەدواو هەر کەسە لەلایەن خۆیەوە سەرزەنشتی زولەیخایان دەکرد، کە چۆن عاشقی کۆیلەو بەندەی خۆی بووە!؟

دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ امْرَأَةُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَنْ نَفْسِهِ﴾ کۆمەڵێك ژنی هاوەڵ‌و هاوشانی زولەیخا لەناو شاردا کەوتنە (تەحاو ئەیەڕۆ ئەیەڕۆ) وتیان: ژنەکەی عەزیز خەریکی دڵداری بووە لەگەڵ غولامەکەی، هەمیشە خەریکی لەخشتە بردنیەتی‌و دەیەوێ رامی بکاو دەستی لەگەڵ تێکەڵاو بکا، بەردەوامە لەسەر هەوڵ‌و تەقەللا بۆ رامکردنی!

﴿قَدْ شَغَفَهَا حُبّاً﴾ بەراستی ئەوین‌و خۆشەویستی ئەو غولامە چووەتە ناو پەرەی دڵی زولەیخاوە ﴿إِنَّا لَنَرَاهَا فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ بێگومان ئێمە لەم بارەوە زولەیخا بەگومڕاو سەرلێ شێواو دەزانین، چونکە چۆن دەبێ شاژنێکی وەکوو زولەیخا حەز لەخزمەتکاری خۆی بکا؟ کەی کۆیلەو بەندە شیاوی ئەوەیە: ژنی عەزیز دڵداری لەگەڵ بکا؟؟!

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەفەرموێ: ژنەکان هەواڵی جوانی‌و شۆخ‌و شەنگی یوسفیان پێ گەیشتبوو حەزیان دەکرد چاویان پێ بکەوێ، بەم قسەو باسانەی بلاویان کردەوە مەبەستیان ئەوە بوو زولەیخا وا لێ بکەن یوسفیان نیشان بداو قەناعەت بکەن ئایا حەقیقەتی هەیە یان نا؟! مەبەستیان نەصیحەت‌و ئامۆژگاری نەبوو، بەڵکوو مەکربازی‌و فێڵ بوو بۆ ئەوەی یوسف ببینن..

﴿فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ﴾ کاتێك زولەیخا قسەو باسی ژنەکانی بیستەوە، بەئاشکرا ئەو قسانەیان بلاو دەکردەوە بۆ ئەوە زولەیخا بیان بیسێتەوە رقی هەڵستێ‌و بانگیان بکاو یوسفیان نیشان بدا، پیلانەکەیان سەری گرت‌و ویستەکەیان

هاتەدی: ئەوەبوو: ﴿أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَأً وَآتَتْ كُلَّ وَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ سِكِّيناً﴾ زولەیخاش فێڵی خۆی لێ کردنەوە، بانگی کردن بۆ خوانێك لەماڵی خۆیدا، کورسیو سەرینی بۆ ئامادەکردن خواردنێکی بۆ ئامادەکردن کە پێویستی بەوەبێ بەکێردو چەقوە لەتی بکەن. کە هاتنو کۆبوونەوە خواردنەکەی لەبەردەم دانانو هەریەکەیان کێردێکی پێ دان، جا کە ژنەکان خەریکی قاش کردنی خواردنەکە بوون، ﴿وَقَالَتْ اخْرُجْ عَلَيْهِنَّ﴾ فەرمانی بەیوسف کرد وتی: وەرە بۆ ناو ئەم ژنانەو خۆتیان نیشان بدە! وا دیارە یوسف لەژورێك دابووە نزیك ئەو دیوەخانەی ژنەکانی لێ کۆببوونەوە، لەژنەکان نادیارو لەزولەیخا دیار بووە، بەئەنقەستو بۆ ئەوەی فیڵەکەی سەربگرێ کاتێك یوسفی بانگ کرد بێتە ناویان: کە ئەوان سەرگەرمی قاشکردنی خواردەمەنییەکە بن، دەیزانی: کە هاتنە ژورەوەی یوسف بۆ ناویان بەناگەهانو کتوپڕ کاریگەر دەبێو ڕۆڵی خۆی دەبینێ..

بۆیە ﴿فَلَمَّا رَأَيْنَهُ أَكْبَرْنَهُ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ﴾ کە یوسف هاتە ناویانو چاویان پێکەوت، زۆر بەشکۆمەندی جوانو شۆخ هاتە بەرچاویانو سەریان لەجوانیو پیاوەتی یوسف سوورماو چاویان تێ بڕیو بەهۆی تەماشا کردنیان بۆ ئەو هۆشیان لای خۆیان نەماو لەجیاتی ئەوە کێردەکە لەخواردەمەنییەکە بنێنو پێی قاشقاش بکەن دەستی خۆیان بڕی، دەستو پەنجەی خۆیانیان بریندار کردو بەخۆیان نەزانیو هەستیان بەئازاری برینەکەیان نەکرد. ﴿وَقُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ مَا هَذَا بَشَراً إِنْ هَذَا إِلاَّ مَلَكٌ كَرِيمٌ﴾ هەموو وتیان: پاکو بێ عەیبی بۆ خودا، خودا هەموو تواناو دەسەڵاتێکی هەیە، بەراستی ئەمە جێگای سەرسووڕمانە، خودا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو دەتوانێ ئادەمیزادی ئاوا شۆخو شەنگ دروست بکا، ئەمە ئادەمیزاد نیەو فریشتەیەکی ڕێزدارو خاوەن قەدرە لەشێوەی ئادەمیزاددا خۆی دەنوێنێ!! دڵنیابە ئێمە لەمەودوا سەرزەنشتت ناکەینو هەرچی دەکەی حەقی خۆتە، کێ دەتوانێ لەبەرامبەر ئەم کوڕە لاوە شۆخو شەنگەدا خۆ ڕاگرێ؟!

پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: شەوی (ئیسرا) لەئاسمانی سێیەم بەلای یوسفدا تێپەڕیم بینیم نیوەی جوانی درابوویە.

ئیمامی ڕازی دەفەرموێ: ژنەکان کە چاویان بەیوسف کەوت نیشانەو شکۆمەندی پێغەمبەرایەتیو داوێنپاکیو بێ تاوانیانییان بەسەرەوە بینی، بۆیە خێرا دیاردەی شەهوەتی بەشەریو ڕەوشتی ئادەمیزادییان لێ دارنیو ڕەوشتی فریشتەیان بۆ چەسپاند.! جا زولەیخا کە گوێی لەشایەدی ژنەکان بوو هەڵسو کەوتیانی بینی وای زانی: سەرکەوتووەو داشی سوارە! هەستی کرد: کە ژنەکان لەجوانی یوسف سەریان سووڕماوەو گیرۆدەی جوانیو شۆخی بوونو کەس لەئاستی جوانیو شکۆمەندی ئەودا خۆی ناگرێ، بێ شاردنەوەو بەدەنگی بەرز ﴿قَالَتْ فَذَلِكُنَّ الَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِ﴾ وتی: ئاخر ئا ئەم جوانو دڵڕفێنەیە: کە خۆتان بەچاوی خۆتان دیتانو لەجوانی سەرسام بوونو گیرۆدەی ئەوینی بوون، ئەو غولامەیە: کە ئێوە سەرزەنشتی منی لەسەر دەکەنو ڕەخنەم لێ دەگرن، دەبڕوانن خۆتان چیتان بەسەر هاتو چۆن بەبینینی شاگەشکەو سەرسام بوونو دەستی خۆتان بریندار کردو هەستان بەئازاری برینداریەکەتان نەکرد.

سەرنج بدەن هەرچەندە یوسف لەزولەیخا نزیك بووەو دەبوایە بەوشەی (هذا) کە بۆ موشاروئیلەیهی نزیك بەکار دێ ئیشارەی بۆ بکردایە، کەچی بەوشەی (ذلك) کە بۆ موشاروئیلەیهی دوور بەکار دەهێندرێ ئیشارەی بۆ کرد، تا ئاماژەبێ بۆ بەرزی پلەو پایەو شکۆمەندیو جوانیو شۆخو شەنگی وەکوو ئەوە بڵێ: ئا ئەوەیە: ئەو گەنجە دڵڕفێنە شۆخو شەنگەیە کە من گیرۆدەی ئەوینی بوومو دڵی لێ ستاندوومو حەجمینی لێ بڕیوەو مەستو مەدهۆشی کردوم، ئەمن عوزرم هەیەو چارم ناچارە، کەس خۆی لەبەرامبەر جوانی ئەودا ناگرێ، ئیتر من چۆن خۆم پێ بگیرێ!!؟ جا: کە ئەوە حاڵو وەزعی ئێوە بێ لەم ماوە کەمەدا، ئەدی من چیبکەم و چۆن هەڵکەم: کە ئەو هەموو کاتێ لەماڵەوە لەگەڵمەو چاوم لێیەتی. بۆیە لێتانی

ناشارمەوە دانی پیا دەنێم: ﴿وَلَقَدْ رَاوَدتُّهُ عَنْ نَفْسِهِ فَاسْتَعْصَمَ﴾ بێگومان چۆن ئێوەی سەرسام کرد، منیشی ئاوا سەرسام کردوە، بەراستی من زۆرم پێکیشی لێ کردوە، هەوڵم داوە بۆ رامکردنیو کەوی بوونی بۆم، بەڵام ئەو خۆی بەدەستەوە نەداوەو خۆی گرتووە.

ئەمجار زولەیخا باڵادەستی خۆی رادەگەیەنیو هەڕەشەی توندو تیژی ئاراستە دەکا، جارێکی تر حەزلێکردنو ئەوینی خۆی بەئاشکراو بێ پەردە لەناو ژنەکاندا رادەگەیەنیو دەڵێ: ﴿وَلَئِنْ لَمْ يَفْعَلْ مَا آمُرُهُ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُوناً مِنَ الصَّاغِرِينَ﴾ سوێند دەخۆمو عەهدو پەیمان بێ، ئەگەر ئەوەی من لەوم دەوێ ئەنجامی نەدا، ئەوەی فەرمانی پێ دەکەم پابەندی نەبێ، بەتەئکید دەخرێتە بەندینخانەوەو دەچێتە ریزی پێرو تاقمی زەلیلو چەوساوەکانو داماو دەکرێ، چونکە مێردەکەم هەرچی پێ بڵێم بەگوێم دەکاو سەرپێچی فەرمانم ناکا. چۆنم بوێ ئاوا سزای دەدا، دەیخاتە کوونە رەشی بەندینخانەوەو زەلیلو داماوی دەکا!

حەزرەتی یوسف بۆ خۆی گوێی لەم هەڕەشانەیەو دەزانێ کە سزای بۆ توند دەکرێ، لەوەپێش هەڕەشەی لێ کرد بەڵام وا توندو تیژ نەبوو، هەڕەشەی بەندکردنی لێ کرد بەبەندکردنێکی سادەو بێ ئازار لەوانە بوو بەبەندکردنی لەهۆدەیەکی باڵەخانەکەدا کیفایەت بکرێ!

بەڵام ئەمجارە هەڕەشەکانی توندنو کاریگەرن، بەتایبەتی کە باسی سوکایەتی پێکردنو زەلیل کردنو داماو کردنی تێدا بوو، نەفسی بەرزو ناسک ئەم جۆرە هەڕەشانەی لەسەر شان گرانە، بەتایبەتی نەفسی یوسف کە تا بڵێی ناسکو بەرزو حەساس بووە. ناخۆشترین ئازارو ناخۆشی لای ئەو جۆرە نەفسانە سوکایەتی پێکردنو داماو کردنە.

جا وەکوو لەسیاقی ئایەتەکەی دوایی دەردەکەوێ، هەموو ژنەکان دانیان بەوەدا نا: کە ئیختیاریان لەدەس داوەو بەرامبەر بەجوانی یوسف سەرسامو ماتو

حەیران بوون، ئیتر ژنەکان دەستیان کرد بەئامۆژگاریکردنی حەزرەتی یوسفو هەوڵیان دا: کەوای لێ بکەن لەوە دوا سەرپێچی فەرمانی زولەیخا نەکا، بۆ ئەوەی گیرۆدەی زیندانو سوکایەتی پێکردن نەبێ!

ئەڵڵا ئەڵڵا بەڕاستی ئەمە مەوقیفێکە کێو بەلەرزە دێنێو هەستو شعور دەهەژێنێ، بەهێزترین کەس ناتوانێ خۆی بۆ رابگرێ، ئەوەتا ئافرەتێکی مەکربازی ناز لێ گیراو پەردەی حەیای خۆی دڕاندوەو لەبەردەم کۆمەڵێك لەژنانی خێزانە ئەشرافەکانی شاری مصردا نهێنی ناو دڵی خۆی ئاشکرا دەکا، پەردە لەسەر روداوەکانی ناو باڵەخانەی عەزیزی میصر لادەدا. حەزرەتی یوسف لەبەرامبەر ئەم هەڕەشەو ترساندنەدا پەنا بۆ بارەگای پەروەردگار دەباو لەخودا دەپاڕێتەوە پشتی بگرێو بیپارێزێ ﴿قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ﴾ وتی: خودایە! بەندینخانە لەلای من زۆر خۆشترە لەو کارە ناشیرینەی: کە ئەو ژنانە داوام لێ دەکەن ئەنجامی بدەم!

﴿وَإِلاَّ﴾ ئەگینا خودایە! ئەگەر تۆ پشتیوانم لێ نەکەیو فرتو فێڵی ئەو ژنانەم لێ لانەدەی ﴿تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُنْ مِنَ الْجَاهِلِينَ﴾ لەوایەنە بکەومە داوایانەوەو مەیلیان بدەمێ، دەست بکەم بەرابواردن لەگەڵیاندا، ئەو کاتە دەچمە پێڕی ئارەزۆبازانو نەفامو گومڕایانەوە!!

ئەمە نموونەی نزاو پاڕانەوەی ئادەمیزادی خودا ناسو خۆناسە: کە هەرگیز بەبێ تاوانیو خۆڕاگری خۆی لەخۆی بایی نابێ، دەپاڕێتەوە خودا زیاتر پشتیوانی بکاو یارمەتی بدا بۆ رزگار بوون لەفرتو فێڵی هەڵخەڵەتێنەران. واتە: دەڵێ: خودایە! ئەگەر تۆ پشتگیریم نەکەیو هەر بەتەما خۆم بم، ئەوە من هێزی بەرەنگاری کردنی ئەو ژنانەم نیە، بۆیە من هانا بۆ قاپی بارەگای تۆ دێنم، پەنا بەهێزو توانای تۆ دەبەم، هەر ئەتۆی پشتیوانو پەنام، خودایە بێ پشتیوانی خۆتم مەکە!

﴿فَاسْتَجَابَ لَهُ رَبُّهُ﴾ په‌روه‌ردگار وه‌ڵامی دوعاو پاڕانه‌وه‌كه‌ی دایه‌وه نزاو لالانه‌وه‌كه‌ی وه‌رگرت ﴿فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ شه‌ڕو نه‌گبه‌تیو فرتو فێڵی ژنه‌كانی لێ لادا، پاراستی له‌وه‌ی بكه‌وێته نێو داوی هه‌وه‌سبازیو شه‌هوه‌ته‌وه، وه‌زعێكی وای ره‌خساند كه دڵی عه‌زیز هاته سه‌ر ئه‌وه یوسف له‌و باڵه‌خانه دوور بخه‌نه‌وه، بێگومان خودا شنه‌وایه به‌دوعاو پاڕانه‌وه‌ی ئه‌وانه‌ی په‌نای بۆ ده‌به‌ن، زانایه به‌راستی بیرو باوه‌ڕیانو ده‌زانێ حاڵو وه‌زعیان چۆنه‌و چییان بۆ باشه‌و به‌رژه‌وه‌ندییان له‌چی‌دایه‌!!

خودا پارێزگاری كرد، په‌روه‌رده‌ی كرد به‌شێوه‌یه‌ك كه شیاوی په‌روه‌رده كردنی پێغه‌مبه‌ران بێ!

ئه‌وه‌بوو له‌و ته‌مه‌نه گه‌نجییه داو وێڕای ئه‌و بارو دۆخه‌ی بۆ ئه‌و ره‌خسابوو خۆی دوور گرت له‌وه‌ی ده‌ست له‌گه‌ڵ ژنی عه‌زیزی میصر تێكه‌ڵ بكا، كه ئه‌ویش له‌ئه‌وپه‌ڕی جوانیو نازكی‌دا بوو، وێڕای جوانی سروشتی خۆیشی ئارایش دابوو وه‌نده‌ی تر خۆی به‌جوان ده‌نواند!

له‌ترسی خوداو به‌ته‌مای پاداشی قیامه‌ت، چوونه ناو به‌ندینخانه‌ی هه‌ڵبژاردو مه‌به‌ستی زوله‌یخای ره‌ت كرده‌وه... هه‌تا دونیا دونیایه یوسف نموونه‌ی گه‌نجی داوێنپاكی خۆڕاگرو له‌خودا ترسه‌و پێشه‌وای گه‌نجانی داوێنپاكو ده‌ستپاكه. به‌كورتی پێغه‌مبه‌ره‌و هه‌ڵبژارده‌ی خودایه‌و هه‌ر ئه‌و جۆره هه‌ڵوێسته‌ی لێ چاوه‌ڕوان ده‌كرێ!!

له‌صه‌حیحه‌ین‌دا هاتووه: پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی (سبعة يظلهم الله في ظله، يوم لاظل الا ظله: امام عادل، وشاب نشأ في عبادة الله، ورجل قلبه معلق بالمساجد، اذا خرج منه حتى يعود اليه، ورجلان تحابا في الله، اجتمعا عليه وتفرقا عليه، ورجل تصدق بصدقة فأخفاها، حتى لاتعلم شماله ما أنفقت يمينه، ورجل دعته امرأة ذات منصب وجمال، فقال اني أخاف الله، ورجل ذكر الله خاليا ففاضت

عيناه..) واتە: حەوت كەس هەن خودا رۆژى قيامەت دەيانخاتە ژێر سێبەرى عەرشى خۆيەوە، لەرۆژێكدا جگە لەسێبەرى عەرشى خودا چ سێبەرى تر نين: پاشايەكى دادپەروەر، گەنجێك كە بەخوداپەرستى پەروەردە بووبێ، پياوێك دلّى پەيوەست بێ بەمزگەوتەكانەوە، كە هاتە دەرەوە لەمزگەوتێك حەزى لێ بێ بچێتەوە ناوى، دوو پياو لەبەر خاترى خودا يەكتريان خۆش بوێ، لەسەر خۆشەويستى خودا كۆببنەوە، لەسەر خۆشەويستى خوداش لێك جيا ببنەوە، پياوێك مالّى خۆى ببەخشێ بەنهێنى، بەجۆرێك لاى چەپى نەزانێ دەستى راستى چى بەخشيوە. پياوێك ئافرەتێكى خاوەن پلەو پايەو شۆخ و شەنگ بانگى بكا بۆ داوێنپيسى، لەوەلاّمدا بلّێ: من لەخودا دەترسم، پياوێك بەتەنياو لەشوێنێكى چۆلّدا خوداى بير بكەوێتەوەو لەترسى خودا بگرياو چاوى ئاو برێژن.

﴿ثُمَّ بَدَا لَهُمْ مِنْ بَعْدِ مَا رَأَوْا الآيَاتِ لَيَسْجُنُنَّهُ حَتَّى حِينٍ﴾ جا پاش ماوەيەكى كەم لەكپكردنەوەى باسى ئەم رووداوە، دواى ئەوەى نيشانەى ڕاستى و داوێنپاكى يوسفيان بۆ دەركەوت، عەزيزو زولەيخاو پەيوەنداران وايان بەباش زانى: كە تا ماوەيەك يوسف بخەنە بەندينخانەوە، بۆ ئەوەى واى نيشان بدەن: كە يوسف ويستويەتى دلّى زولەيخا بۆ لاى خۆى رابكێشێ و هەولّى كارى نادروستى داوە، هەر لەسەر ئەم تاوانە مەوهوومە بێ بناغەيەو لەسەر داخوازى خێزانى عەزيز كە واديارە بەسەر مێردەكەيدا دەست رۆيشتوو بووەو عەزيز لەحاندايدا هيچ دەسەلاّتێكى نەبوە، بۆيە ويستى رەزامەندى ژنەكەى بەدەست بێنێ و بەهەر نرخێك بێ رازى بكا.

وا پێ دەچێ زولەيخاش لەبەروبوومى هەولّەكانى نائومێد بووەو زانيويەتى هيچى دەست ناكەوێ؛ هەروەها لەوانەيە هەوالّەكە زياتر تەشەنەى كردبێ و بەناو خەلّكدا بلاّوەى كردبێ، ئەمجار بۆ گێڕانەوەى سومعەو ئيعتيبار بۆ بنەمالّەى عەزيز، هاتن بڕيارى بەند كردنى يوسفى بێ تاوانيان دا.

**باسی شەشەم لەچیرۆکی یوسف:**

**یوسف لەبەندینخانەدایەو بانگەوازیی بۆ ئایینی حەق دەکا**

﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ
أَعْصِرُ خَمْرًاۖ وَقَالَ ٱلْءَاخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِي خُبْزًا
تَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِنْهُۖ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ
(٣٦) قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ
أَن يَأْتِيَكُمَاۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓۚ إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا
يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ (٣٧) وَٱتَّبَعْتُ مِلَّةَ
ءَابَآءِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشْرِكَ
بِٱللَّهِ مِن شَيْءٍۚ ذَٰلِكَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ
أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ (٣٨) يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجْنِ ءَأَرْبَابٌ
مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ (٣٩) مَا تَعْبُدُونَ مِن
دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ

ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ



دوای ئـەوەی عـەزیزو راوێـژكاران بڕیاریـان دا حـەزرەتی یوسـف بخەنـە بەندینخانـەوە هەرچـەندە دڵنیـا بـوون لـەپاكیو بـێ تـاوانیو داوێنپـاكی! ئـەمجار لێرەدا پەروەردگار باسی جێ بـەجێ كردنـی بڕیارەكـەی عـەزیزو دارو دەستـەكەی دەكا: كە بریتییە لەبەند كردنی یوسف. جا كە یوسفیان خستە بەندینخانەوە، دوو خزمـەتكاری پاشاشـیان لەگـەڵ دا نـاردە بەندینخانـەوە. دەفـەرموێ: ﴿وَدَخَـلَ مَعَـهُ السِّجْنَ فَتَيَانِ﴾ واتە: كاتێ ویستیان یوسف بەند بكەنو بەندیان كرد، وێڕای حەبس كردنـی یوسـف دوو خزمـەتكاری پاشاشـیان بەنـد كـردن. ئەمـەش ڕێكـەوت نـەبوو بەڵكوو تەقدیری خودا وا بوو. ئەم دوو خزمەتچییانە بەتاوانی ئەوە زیندانی كران گوایە: ویستوویانە پاشا دەرمانخواردوو بكەن!

جـا بـەهۆی دەنگدانـەوەی دەنگوباسـی روداوی نـاو مـاڵی عـەزیزی میـصرەوە، دەركردنی بڕیار بەزیندانكردنی یوسف بڵاوبۆوە، خەڵك زۆریان دڵنیا بوون لـەوەی: كە یوسف كوڕێكی بەحورمەتو دڵو داوێنپاكو خاوەن نەفسێكی بـەرزو پاكە، لـەم رووەوە دوو خزمەتكارەكانی پاشا باوەڕیان پـێی پتەو بوو، وەگـری بـوونو زانییـان: كـە یوسـف شـیاوی ئەوەیـە: تـەگبیرو راوێـژی پـێ بكـرێو داوای مانـا لێدانـەوەی خەونیشی لێ بكرێ.

سیاقی ئایەتەكان باسەكە زۆر بەكورتی ڕادەنوێنـێو هـەڵسو كـەوتی یوسف لەزینداندا كورت دەكاتـەوە باسـی ئـەوە ناكـا: كـە دەسـپاكیو داوێنپـاكیو صـاڵحیو

زانایی‌و دانایی یوسف بەناو زیندانەکاندا بڵاوەی کردو، بووە جێگای متمانەی خەڵکانی ناو بەندینخانەکە، کە ژمارەیان زۆر بوو، زۆری لەوانە تێدا بوو: کە بەختی ڕەشیان ڕۆژگارێك خستبونیە ناو قەصرو باڵەخانەکانی پاشاو دارو دەستەکانی‌و توشی هەڵەیەك بوونو لەزیندانیان پەستاوتبوون.

سیاقەکە ئەم زانیارانە هەموو کورت دەکاتەوە، بۆ ئەوەی نمایشێك ڕانوێنێ، نمایشی یوسف لەبەندینخانەداو لەتەنیشتی‌دا دوو گەنج وەگری بوونو هاتوونە لای تەعبیری خەونیان بۆ لێك بداتەوە، خەونیان بینیوەو بۆ یوسفی دەگێڕنەوەو داوای تەعبیری ڕاستو دروست بۆ خەونەکانیانی لێ دەکەن. چونکە نیشانەی پاکی‌و چاکی‌و خودا پەرستی‌و ئەخلاق جوانییان تێدا بەدی دەکرد.. هاتن بەنۆرە خەونەکانیان بۆ گێڕایەوە: ﴿قَالَ أَحَدُهُمَا إِنِّي أَرَانِي أَعْصِرُ خَمْراً﴾ یەکێکیان وتی: لەخەوما دیم ترێم دەگوشی‌و دەمکردە شەراب بۆ پاشا ﴿وَقَالَ الآخَرُ إِنِّي أَرَانِي أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِي خُبْزاً تَأْكُلُ الطَّيْرُ مِنْهُ﴾ ئەویتریان وتی: لەخەوما دیم نانم لەسەر سەرم داناوەو باڵندە دائەبارین بەسەرماو لەو نانەیان دەخوارد! ﴿نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِ﴾ وتیان: دەمانەوێ مەعنای ئەم خەونانەمان پێ بفەرمووی: بزانین چی دەگەیەنن ﴿إِنَّا نَرَاكَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾ بێگومان ئێمە وا دەزانین جەنابت مرۆڤێکی لیزانو لەپێڕی پیاوچاکانی‌و لەتەعبیری خەوندا زۆر شارەزاو کارامەی. پیاوێکی مرۆڤ دۆستی‌و خێرو چاکەی ئادەمیزادانت دەوێ.

حەزرەتی یوسف کە زانی ئەم دوو خزمەتکارە ئەوەندە بتمانەیان پێیەتی‌و خودای مەزنیش ئاگاداری کردبوو لەوە: کە مەیگوشەکەیان ڕزگاری دەبێ‌و دەچێتە لای پاشاو ڕێزی لێ دەگیرێ، ویستی ئەم هەلە بقۆزێتەوەو خۆی دەربخاو بیرو باوەڕی صەحیحی خۆی بڵاو بکاتەوەو بانگەوازی بکا بۆ خوداپەرستی‌و ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام بدا، ئیتر لێ بڕا بۆ بانگەوازیکردنی دوو خزمەتکارەکەو بەندییەکانی تریش بۆ یەکتاپەرستی‌و وازهێنان لەبتپەرستی!

بەرکوڵو ڕێخۆشکەرەیەکی بۆ قسەکانی دامەزراند ﴿قَالَ لا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِ إِلاَّ نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِ قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَكُمَا﴾ پێی فەرموون: من نەك هەر بۆ تەعبیری خەون پرسم پێ دەکرێ، بەڵکوو خودا زانیارییەکی وای پێ بەخشیوم؛ هەر خواردەمەنییەك لەلایەن کاربەدەستو ناشپەزی زیندانەوە بۆ ئێوە ڕەوانە دەکرێ بۆ خواردن، پێش ئەوەی خواردەمەنییەکە بگاتە لاتان، دەزانم چ خواردنێکەو دەتوانم هەواڵتان بدەمێ چ جۆرە خواردەمەنییەکەو خواردنی سودی هەیە بۆتان یان زیان! ﴿ذَلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّي﴾ ئەم زانیارییانە لەو زانیارییانەیە کە خودای خۆم فێری کردوم. وەمن بەهەوانتە فێری ئەم زانستانە نەبووم، نهێنی ئەم بەهرەو سەروەرییانە ئەوەیە: کە ﴿إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَهُمْ بِالآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ﴾ من دەست بەرداری ئایینی گەلو نەتەوەیەك بووم: کە بڕوایان بەخودای تاكو تەنیا نیەو پێیان وا نیە ڕۆژی قیامەت هەبێو بڕوا ناکەن زیندوو بوونەوە هەبێو پاداشو سزا لەسەر چاکەو خراپە بدرێتەوە.

مەبەستی بەم گەلو نەتەوەیە: بنەماڵەی عەزیزی میصرو دارو دەستەی پاشاو ئەو خەڵکەیە کە وا بەستەی ئەوان بوون.

هەڵبەتە دوو خزمەتکارەکەش لەسەر ئایینی دارو دەستەی پاشاو عەزیزی میصر بوون، بەڵام حەزرەتی یوسف ڕاستەو خۆ کوفرو بێدینییەکە ئاڕاستەی خودی ئەوان ناکا، بەڵکوو بەشێوەیەکی گشتی وەپاڵی گەلەکەیانی دەدا بۆ ئەوەی ئەوان ئیحراج نەکا.

دەشگونجێ مەبەستی بەگەلو نەتەوە کافرو بێدینەکە کەنعانییەکانو خەڵکانی تری دانیشتووی فەلەستینو ئەو میصرییانە بێ کە خودا درۆزنەی جۆراو جۆریان دەپەرستن، هەیانبوو خۆریان دەپەرست، هەبوو گوێرەکە پەرست بوو، هەبوو فیرعەون پەرست بوو، ئەوانە هیچیان بڕوایان وا نەبوو کە ڕۆژی قیامەت هەبێو پاداشو سزای تێدا وەربگیرێتەوە!

﴿وَاتَّبَعْتُ مِلَّةَ آبَائِي إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ﴾ مـن شـوێنی ئـایینی بـاوكـو باپیرەكـانی خـۆم كـەوتووم: كـە یـەعقوبو ئیـسحاقو ئیـبراهیمن، هـەموویان پێغەمبەری رەوانەكراو بوون، بانگەوازییان بۆ یەكتاپەرستی كردوە..

كە دەفەرموێ: (آبائي) ئاماژەیە بەئەوە: كە باپیریش حوكمی باوكی هەیە، هەروەها خانەوادەی ئەو خانەوادەی پێغەمبەرایەتییە، لەبنەماڵەی پێغەمبەرانە، ئەمەشی بۆ ئەوە راگەیاند: كە سەرنجیان رابكێشێو هەڵیان نێ بۆ ئەوەی گوێی لێ بگرنو شوێن قسەكانی بكەون!

ئـەمجار پـەیڕەوو پرۆگرامـی پێغەمبـەران بەشـێوەیەكی گشتی دیـاری دەكـاو دەفـەرموێ: ﴿مَا كَانَ لَنَا أَنْ نُشْرِكَ بِاللَّهِ مِنْ شَيْءٍ﴾ ناگونجێو بـۆ ئێمـە رەوا نیـەو نابێ: كە شەریكو هاوەڵ بۆ خودا دابنێین، هەرگیزاو هـەرگیز هیـچ شـتێك ناكـەین بەشەریك بۆ خودا.

﴿ذَلِكَ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى النَّاسِ﴾ ئـەم رێبـازو پـەیڕەوو پرۆگرامـە پیرۆزەیە فەضلو بەخششی خودایە بەسەر ئێمـەوەو بەسـەر ئـەو كەسانەشـەوە كـە ئێمـە پێغەمبـەریانین ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَشْكُرُونَ﴾ وەلێ زوربـەی ئـادەمیزاد نازانن كە ئـەم بەهرەیـە چـەند بـەرزو پیرۆزو پاكـە، شـوكرو سوپاسی پـەروەردگار ناكـەن، كـە ئـەم ئایینـەی بـۆ نـاردون لـەجیاتی شـوكر شـەریكی بـۆ دادەنـێن، بـیر لـەداهاتووی خۆیـان ناكەنـەوە. هەسـت بـەو نیعمەتـە مەزنـە ناكـەن كـە نـاردنی پێغەمبەرانە بۆ سەریان!

ئەمجار دوا ئەوەی: كە حەزرەتی یوسف بتپەرستی پوچ كردەوەو بتپەرستانی بەگومڕاو نەفام دانان، پێغەمبەرایەتی چەسپاندو بانگەوازی كرد بـۆ یەكتاپەرسـتی خالیصو بێ خەوشو دانـنان بەهەبوونی خودایـەكی تـاكو تـەنیا دەفەرموێ: ﴿يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ!! أَأَرْبَابٌ مُتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ؟﴾ ئـەی دوو هاوڕێكـانم

لەم بەندینخانەیەدا! ئەی هاوەڵانی زیندانم! ئایا پەرستنی چەند خودایەکی جیا جیای لێرەو لەوێ، پەرستنی چەند خودایەکی دژ بەیەکی جوداواز لەزاتو صیفاتدا: کە ئەم جوداوازییەیان سەردەکێشێ بۆ کێشەو بەرەنگاریکردنی یەکتریو تێکچوونی بوونەوەر لەئاکامدا، ئایا ئەوە باشترە بۆ ئێوەو غەیری ئێوەش لەبارەی هێنانی سودو گێڕانەوەی زیانو ئاگاداریکردنو چاودێری کردن! یان خودایەکی تاکو تەنیاو خاوەن دەسەڵاتو بێ ئاتاج لەهەموو شتێ، کە هیچ شتێك نیە بتوانێ بەرامبەری بوەستێو ئیشی لێ تێك بدا، خودایەکی باڵادەستو زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا؛ ئایا ئەم خودایە باشترە یان ئەو خودا درۆزنانەی ئێوە کە هیچیان پێ ناکرێ؟؟

ئەمجار حەقیقەتی خودا درۆزنەکان دەردەخاو دەفەرموێ: ﴿مَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِهِ إِلاَّ أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ﴾ ئێوە کە عیبادەت بۆ ئەو خودا درۆزنانە دەکەنو لەجیاتی خودای مەزن دەیانپەرستن، لەراستیدا عیبادەت بۆ چەند شتێك دەکەن کە شیاوی عیبادەت بۆ کردن نین چونکە خودا نین، بۆ خۆتان ناوتان لێ ناون، ئێوەو باوکو باپیرانتان بەناڕەوا بەخوداتان داناون ﴿مَا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ﴾ خودای مەزن هیچ بەڵگەو نیشانەیەکی لەسەر بەخودا دانانیان نازڵ نەکردوە تا بیکەنە بیانووی عیبادەت بۆ کردنیان، ئەوانە بۆ خۆتان ناوتان ناون خودا، هیچ بەڵگەو دەلیل لەسەر خودایەتی ئەوانە نیە.

﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ﴾ حوکمو فەرمانو خاوەنیەتی هەمووی هەر هی خودای تاقو تەنیایە..

﴿أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ﴾ ئەو خودایەی من دەیپەرستم فەرمانی بەبەندەکانی کردوە: کە جگە لە ئەو عیبادەت بۆ کەسی تر نەکەن، ئەوەی من بانگەوازیتان دەکەم بۆ پەرستنیو دڵسۆزی بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی، ئەوە خودای

حەقەو ئایینی پەسندو راستو بەجێیە، ئەو ئایینەیە خودا فەرمانی پێ کردوین پەیرەوی بکەینو بەڵگەو دەلیلی لەسەر راستیو پەسندی نازڵ کردون!

﴿ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زوربەی زۆری ئادەمیزاد نازانن: کە ئەوە ئایینی حەقو خودا پەسندەو رێبازێکی شەقامە رێیەو هیچ خوارو خێچیەکی تێدا نیە!

ئا بەو جۆرە بەم چەند وشە کورتو پڕ مانایانە حەزرەتی یوسف هەموو نیشانەیەکی ئایینی خودا پەسندی رەنگرێژ کرد، هەموو بنەماو پێکهاتەی عەقیدەی راستو رەوانی شی کردەوە، هەموو پایگاو سەنگەرەکانی شیرکو بتپەرستیو ملهوڕانی وەلەرزە هێنا.

بێگومان طاغووتو ملهوڕەکان هەر کە لەشوێنێك جێ پێی خۆیان کردەوە، یەکسەر داوای تایبەترین دەسەڵاتی خودای مەزنو تاکو تەنیا دەکەن، داوای ربوبییەت دەکەن؛ داوا دەکەن خەڵك گەردنکەچی فەرمانو یاسایان بن، پابەندی قانونو نیظامیان بن.

ئاشکراشە دەرەبەگو ملهوڕ کاتێ سەرهەڵدەدەنو پەیدا دەبن: کە ئایینی حەقو راست لەگۆڕێ نەبێ، کاتێك طاغوت پەیدا دەبن: کە ئایینی حەقو خودا پەسند لەدڵی ئادەمیزادەکاندا رەگی دانەکوتابێ، هەرکاتێ دڵو دەروونی ئادەمیزادەکان بەئیمانی ساغو پتەو ئاوەندان بێ، ملهوڕان جێگایان نابێتەوە، بەڵکوو ناتوانن سەر دەربێنن!

**بەشی حەوتەم لەچیرۆکی یوسف:**

## مانا لێدانەوەی یوسف بۆ خەونی هاوەڵانی بەندیخانە

﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴿٤١﴾ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾

پاش ئەوەی: حەزرەتی یوسف باسی یەکتاپەرستیو پێغەمبەریەتی بۆ هاوەڵانی کرد، ئەمجار هاتە سەر تەعبیری خەونەکانیانو فەرمووی: ﴿يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَمَّا أَحَدُكُمَا فَيَسْقِي رَبَّهُ خَمْراً﴾ ئەی دوو هاوڕێی زیندانم! یەکێکتان، واتە: ئەوەتان: کە لەخەویدا بینیویەتی ترێی دەگوشیو دەیکردە شەراب بۆ پاشاکەی! ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەر کاری پێشووی وەکوو جاران مەی پێشکەش پاشا دەکا.

﴿وَأَمَّا الآخَرُ فَيُصْلَبُ فَتَأْكُلُ الطَّيْرُ مِنْ رَأْسِهِ﴾ بەڵام ئەویترتان ئەوە تاوانبار دەکرێو حوکمی ئیعدامی بەسەردا دەدرێو تەنفیذ دەکرێو هەڵدەهاوسرێ بەسەر سێدارەوەو بۆ چاو ترساندنی خەڵك بەسێدارەوە دەمێنێتەوە، باڵندەو پەلەوەری گۆشت خۆر لەگۆشتی سەری دەخۆن!

دەگێڕنەوە دەڵێن: حەزرەتی یوسف بەئەمیانی گوت: خەونێکی خراپت بینیوە، دوای سێ ڕۆژی تر پاشا هەڵت دەهاوسێو باڵندە لەگۆشتی سەرت دەخۆن،

ئەمە ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـا: کـە ئـەم ئاشـپەزە تاوانبـار کـراوە بـەژەهراویکردنی خواردەمەنی پاشا.

هـەروەها ریوایـەت کـراوە: کـە یوسـف مـەعنای خەونـەکانی بـۆ لێـك دانـەوە، وتیان: درۆمان کردو خەونمان نەبینیوە. ئیتر حەزرەتی یوسـف فـەرمووی: ﴿قُـضِيَ الأَمْرُ الَّذِي فِيهِ تَـسْتَفْتِيَانِ﴾ لەسـەری مـەرۆن کـار لـەکار تـرازاوەو ئـەوەی پرسـیارتان دەربارەی هـەبوو هاتـە جێو براپـەوە، واتـە: ئاکـامی زینـدانی کردنتـان لەروانگـەی تەعبیری خەونەکانتانەوە ئەمەیە: کە من بۆم شی کردنەوە..

ئەمە راست دەرچـوو، یوسـف بەهاوەڵـەکانی راگەیانـد: کـە ئەمـە دێتـە جـێو بەچـاوی خۆتـان دەیبیـنن، چـونکە خـەون لەسـەر قـاچـی باڵندەیـە تـا مانـای لێ نەدەیەوە نایەتە جێ، هەر کاتێ مەعنات لێ دایەوە دێتە دی.

ئیمـام ئەحمـەد لەمعاویـیـەی کـوڕی (حَیـدة)وە ریوایـەت دەکـا کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (الرؤيا على رجل طـائر مـالم تعـبر، فـاذا عبرت وقعت)

ئاشکراشە حەزرەتی یوسـف بەهەوانتـە وەڵامـی نەدانـەوە، مانـا لێدانەوەکـەی لەشـكو گومانـەوە سەرچـاوەی نـەگرتووە، بـەڵكوو لەسـروشو نیگـای خوداییـەوە هـەڵقوڵاوەو پـشتی بـەو سەرچـاوە روونـە بەسـتووە، سـروشو نیگـاش یـەقینو دڵنیاییيان لێ پەیدا دەبێ.

حەزرەتی یوسف کابرای مەیگوشی بەند کـراوی بـێ تـاوانی خـۆش دەویـستو لێـی روون بـوو کـە ئـەویش بەهەوانتـە خراوەتـە کونـە رەشـی زیندانـەوەو بـەبێ لێکۆڵینەوەو تێفکرین پاشا دوچاری ئـەم سزایەی کـردوە، دەیزانـی ئـەمیش وەکـوو خۆی تاوانیان بۆ هەڵبەستووەو دەستە چەوری خۆیـان بەئـەو سـڕیوە، بۆیـە یوسـف

پـێی خـۆش بـوو کـە بـەهۆی ئەمـەوە سـکاڵای خـۆی بگەیەنێتـە پاشا بـۆ ئـەوەی لەقەزیەکەی بکۆڵێتەوەو چی دی بێ تاوان لەزینداندا نەمێنێتەوە.

﴿وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُ نَاجٍ مِنْهُمَا اذْكُرْنِي عِنْدَ رَبِّكَ﴾ بەدزییـەوە بـەویانی گـوت: کە پێی وا بوو لەزیندان رزگاری دەبێ، واتە: کابرای مـەیگێڕ، پـێی فـەرموو: کاتـێ چـویتە دەرێو گەڕایـەوە بـۆ سـەر وەزیفـەی خـۆت، لای پاشـا باسـی مـن بکـە، بڵـێ: یوسـف بـەنارەواو سـتەم لەزینـدانـدا هێڵراوەتـەوە، تـاوانی نـەکردوەو بـەتاوانبار لەقەڵەم دراوە، بـەڵکوو پـاش لێکۆڵینـەوەو دەرکـەوتنی بـێ تـاوانیم بـەزەیی پـێمدا بێتەوەو لەم کونە ڕەشە رزگارم بکا، بەڵام کابرا: کە رزگاری بوو، گەڕایەوە بـۆ سـەر کـاری پێـشووی تێکـەڵ بـەکۆڕو مەجلیـسی پاشـا بـووەوە، راسـپاردەکەی یوسـفی فەرامۆش کرد، چونکە ﴿فَأَنسَاهُ الشَّيْطَانُ ذِكْرَ رَبِّهِ﴾ شـەیتان بـاسو خواسـی یوسـفی لەلای پاشا لەبیر کابرای رزگـار بـووی مـەیگێڕ بـردەوە، هـەر بەخـەیاڵیا نەهاتـەوەو بیری نەکەوتەوە!! ویستی خودا وابوو: دەبوایە یوسـف ماوەیـەك لـەو بەندینخانـەدا بمێنێتەوە، بانگەوازی بکا بۆ یەکتاپەرستی، بۆ عیبادەتکردن بۆ خودای تاكو تەنیا، بەرەنگاری بتپەرستیو بتپەرستان بکا، ﴿فَلَبِثَ فِي السِّجْنِ بِضْعَ سِنِينَ﴾ ئـیتر یوسـف لەبەندینخانەدا نزیکەی حەوت ساڵێکی تر مایەوە، بـەبێ ئـەوەی کـەس باسـی بکـاو بەخەیاڵی کەسدا گوزەربکا. هەر لەبیرچوەوە..

زوربەی زۆری راڤەکەرانی سەلەف پێیان وایـە: حـەزرەتی یوسـف دوای رزگـار بونی کابرا حەوت ساڵی تەواو لەبەندینخانەدا ماوەتەوە.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: دوازدە ساڵ ماوەتەوە.

(الضحاك) دەفەرموێ: چواردە ساڵ ماتەوە. بەڵام رای صەحیح رای یەکەمە.

شتێکی ئاشکراو باسکراوە لەشـەریعەتی ئیسلامدا: کـە داوای کۆمـەکی کـردن لـەئادەمیزادان بـۆ نەهێـشتنی سـتەم، کـارێکی رەواو دروستە. وەڵێ وەکـوو گـوتراوە:

﴿حسنات الأبرار سيئات المقربين﴾ هەندێ شت بۆ پێغەمبەرانو نزیکانی بارەگای خودا باش نیەو لەسەریان دەکەوێ، پێویستە ئەو خۆشەویستانەی خودا پەنا بۆ هیچ کەس نەبەن جگە لەخودا، بۆیە خودا ویستی زیاتر حەزرەتی یوسف لەبۆتە بدا، ویستی تێی بگەیەنێ: کە واز لەهەموو هۆکارەکان بێنێو خۆی بداتە دەست خاوەنی بوونەوەرو پشت هەر بەئەو ببەستێ، داوای رزگار بوون لەتەنگو چەڵەمە هەر لەخودا بکا.

ئیمامی قورطبی دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ڕیوایەت کراوە: حەزرەتی جوبرائیل هاتووە بۆ لای حەزرەتی یوسف لەبەندینخانەدا، سەرزەنشتی کرد لەسەر پەنا بردن بۆ ئادەمیزادو پێی گوت: ئەی یوسف! کێ تۆی لەمردن بەدەستی براکانت رزگار کرد، حەزرەتی یوسف فەرمووی: خودا رزگاری کردم، ئەمجار پێی فەرموو: کێ تۆی لەبیر هێنایە دەرێ!؟ وتی: خودای مەزن، ئەمجار وتی: کێ تۆی لەفرتو فێڵی ژنەکان رزگار کرد؟ وتی: خودای مەزن.

ئەمجار پێی فەرموو: ئەدی چۆن خودات لەبیر کردو داوای رزگار بوون لەبەندینخانەت ئاڕاستەی خودا نەکردو بتمانەت بەپیاوی پاشاو داروودەستەکەی پاشا کرد بۆ رزگار بونت لەبەندینخانە؟؟

ئەمجار حەزرەتی یوسف دەستی نزاو پاڕانەوەی بەرز کردەوە وتی: خودایە! قسەیەك لەدەمم دەرچوو! ئەی خودای ئیبراهیمو خودای یەعقووبی پیرو کەنەفت! داوات لێ دەکەم بەزەییت پێمدا بێتەوە جوبرائیل پێی فەرموو: سزای تۆ ئەوەیە: چەند ساڵێکی تر لەبەندینخانەدا بمێنیتەوە.[1]

بێگومان بەندەراستاڵەکانی خودا پێویستە ئیخلاصی تەواویان بۆ خودا هەبێ، هەموو پاڕانەوەو عیبادەتێکیان لەخودا بێو بۆ ئەو بێ، هەر کاتێکیش

(١) تەفسیری قورطبی بەرگی:٩/١٩٥-١٩٦.

بەهۆی لاوازی ئادەمیزادییانـەوە پـەنا بـۆ هۆکـارێکی مـادی بـەرنو بـەموو لەخـەت لابـدەن، خـودا لـەدونیادا سـزایان دەداو دەیانخاتـە بۆتـەی پاڵفتـە کردنـەوەوە، تـا بەتەواوی خۆی پێ بسپێرنو بەئەوپەڕی ڕەزامەندییەوە بەندایەتی بکەنو بـەموو لەڕێبازی پەروەردگار لانەدەن!!

## خەون بینینی پاشاو پەیوەندیکردن بەیوسفەوە بۆ مانا لێکدانەوە

﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ

سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ إِن كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ ﴿٤٣﴾

قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٖۖ وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾

وَقَالَ ٱلَّذِي نَجَا مِنۡهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأۡوِيلِهِۦ

فَأَرۡسِلُونِ ﴿٤٥﴾ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفۡتِنَا فِي سَبۡعِ بَقَرَٰتٖ

سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ

وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖ لَّعَلِّيٓ أَرۡجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالَ

تَزۡرَعُونَ سَبۡعَ سِنِينَ دَأَبٗا فَمَا حَصَدتُّمۡ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا

قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾

ئێستا ئێمە وا لەکۆڕو مەجلیسی پاشادایین، پاشا لەخەو هەستاوە، پەشۆکاوە، خەونێکی سەرنج ڕاکێشی بینیوە، دەیەوێ بزانێ: مانای چیەو چی دەگەیەنێ، داوا لەکاهینو کەشیشەکانی دەرباری دەکا تەعبیری خەونەکەی بۆ بکەن، هەرچەندە بیریان لێ کردەوەو سەری خۆیان هێناو برد، نەیانتوانی مانایەکی ڕاست بۆ خەونی پاشا بدۆزنەوە، ناچار وتیان: ئەمە لەخەونە پڕوپووچو بێ بناغەکانەو چ مەعنایەك نابەخشێ! جا وەکوو زانیمان لەئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار باسی مانا لێدانەوەی حەزرەتی یوسفی کرد بۆ خەونی دوو هاوەڵە زیندانییەکانی، ئەمجار لێرەدا باسی خەو بینینی پاشای میصر دەکا: کە یەکێك بووە لەپاشاکانی عەرەبو ناوی (هەکسوس) بووەو دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الْمَلِكُ إِنِّي أَرَى سَبْعَ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ﴾ پاشای میصر وتی: من لەخەومدا شتێکم دی سەر سوڕهێنەر، خەونێکم بینیوە سەرسامی کردوم؛ لەخەومدا دیتم حەوت مانگای قەڵەو لەچەمێکی وشك هاتنە دەرەوە، حەوت مانگای لەڕو لاواز خواردیانن، ﴿وَسَبْعَ سُنْبُلاتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ﴾ هەروەها حەوت گوڵە گەنمی وشکەوەبوو حەوت گوڵە گەنمی تری سەوز، گوڵە گەمە وشکەوەبووەکان بەسەریاندا زاڵ بوونو بەسەریاندا کەوتنو دایانپۆشین، لەم خەوەم سەرم سوڕ ماوەو نازانم چیمان دێتە ڕێو ولاتمان توشی چی دەبێ؟

کاهین‌و کەشیشی وڵاتی کۆکردنەوە، گەورە پیاوانی حکوومەتی ئامادە کردن‌و خەونەکەی بۆ گێڕانەوە، ئەمجار وتی: ﴿يَا أَيُّهَا الْمَلأُ أَفْتُونِي فِي رُؤْيَايَ إِنْ كُنتُمْ لِلرُّؤْيَا تَعْبُرُونَ﴾ ئەی خەڵکینە! ئەی زاناو فامیدەی وڵات! ئەی پیاو ماقوڵ‌و کاربەدەستانی حکوومەت! مانای ئەم خەونەم بۆ لێك بدەنەوە، ئەگەر ئێوە لەو کەسانەن کە شارەزای مەعنای خەونن. پێم بڵێن: ئاماژە بەچی دەکاو چی لا وەردەگیرێ؟!

﴿قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلامٍ﴾ هەموویان وتیان: ئەمە جۆرێکە لەخەون‌و خەیاڵی تێکەڵ‌و پێکەڵ‌و بێ سەرو بەرو پڕو پووچ، نوستوو لەلاشعووری خۆیدا دەیانبینێ‌و مانا نادەن بەدەستەوە، لەئاکامی ناڕێکی هەزمکردن‌و تێکچوونی مەعیدەو ماندووبوونی گیان پەیدا دەبێ. ﴿وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ الأَحْلامِ بِعَالِمِينَ﴾ ئێمە مانای خەونی ئاوەها بێ بناغەو پڕوپووچ نازانین چونکە حەقیقەتی نیە!

وێ دەچێ ماناکەیان زانیبێ، بەڵام هەستیان کردبێ: کە ئاماژە بۆ شتێکی ناخۆش دەکا، نەیانویستبێ بیدرکێنن‌و دڵی پاشا ناخۆش بکەن، چونکە دابو نەریتی دەستو پێوەندی پاشاو خەڵکانی دەرباری وا هاتووە هەموو کاتێ خۆ دەدزنەوە لەو شتانەی کە دڵی پاشا ناخۆش دەکاو هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەن شتێك بخەنە رو: کە دڵی پاشا خۆش بکا!

تا ئێستا سێ خەون بینران‌و هەوڵی مانا لێدانەوەیان درا؛ خەونی حەزرەتی یوسف، خەونی دوو هاوەڵە زیندانییەکانی، خەونی پاشا، گرنگی دان بەخەون‌و مانا لێدانەوەی وێنەیەکی ئەو رۆژگارەمان بۆ دەکێشێ، تارماییەکی بارو دۆخی میصرو دەورو بەریمان نیشان دەدا، ئەمجار ئایا ئەو زانستە خوداییەی کە بەیوسف دراوەو لەو رۆژگارەدا گرنگی پێ دراوە بەموعجیزەی حەزرەتی یوسف حسێب دەکرێ؟ ئەمە باسێکەو دوورو درێژە زەحمەتە بەئاسانی یەکالا بکرێتەوە!!!

جا کە خەونی پاشا بەمانا لێ نەدراوەیی مایەوەو بووە موشکیلەی ناو قەصرو پاشا پێی تەنگەتاو بوو، دەستو پێوەند کەوتنە هەوڵ‌و تەقەڵلای تەعبیری

خەونەکە ﴿وَقَالَ الَّذِي نَجَا مِنْهُمَا﴾ ئەو کاتە کابرای کە لەزینداندا هاوەڵی یوسف بوو بوو خەونی بینیبوو یوسف مانای خەونەکەی بۆ لێ دابوەوەو رزگاری بوبوو شەیتان راسپاردەکەی یوسفی لەبیر بردبوەوە، ﴿وَادَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ﴾ پاش تێپەڕبوونی چەند ساڵێك ئەو کابرا مەیگێڕەی پاشا، یوسفی کەوتەوە بیرو یادی ئەوەی کردەوە کە خۆی خەونی بینیوە یوسف مانای بۆ لێ دایەوەو راست دەرچوو، راسپاردەکەی (یوسف)یشی هاتەوە بیرو وتی: ﴿أَنَا أُنَبِّئُكُمْ بِتَأْوِيلِهِ فَأَرْسِلُونِ﴾ من خەبەرتان دەدەمێ بەمانای ئەم خەونەو فەرمان بفەرموون بم نێرن بۆ لای یوسفی هاوەڵم، کە ئێستا لەزیندانادایە! (وا دیارە لەو رۆژگارەدا کەس نەیتوانیوە بێ فەرمانی پاشا بچێتە ناو زیندانەوەو بەند کراوان ببینێ).

پاشا خێرا فەرمانی داو کابرایان نارد بۆ زیندان بۆ لای یوسفو گەیشتە لایو پێی گوت: ﴿يُوسُفُ أَيُّهَا الصِّدِّيقُ!﴾ ئەی یوسف! ئەی هاوەڵی دێرینم! ئەی ئادەمیزادی خودا پێداوی قسە راستو کار دروست! ئەی راستگۆی زۆر راستگۆ! لەگوفتارو رەفتاردا ﴿أَفْتِنَا فِي سَبْعِ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنْبُلَاتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ﴾ تەعبیری ئەم خەونەمان بۆ لێك بدەرەوە، خەونێکی گرنگەو پاشا دیویەتی بەڵکوو مانا لێدانەوەکە بۆ تۆ ببێتە هۆی رزگار بونت لەبەندینخانە. خەبەرمان بدەرێ دەربارەی خەونی پاشا: کە لەخەودا دیویەتی: حەوت گای لەڕو لاواز حەوت گای قەڵەویان خوارد، حەوت گوڵە گەنمی وشکی پووکاوە بەسەر حەوت گوڵەگەنمی سەوزی دانەوێڵە لەخەم رەخسیوو پێگەیشتوودا کەوتنو دایانپۆشین، مانای ئەم خەونەم بۆ شی بکەرەوە ﴿لَعَلِّي أَرْجِعُ إِلَى النَّاسِ﴾ بەڵکوو من بگەڕێمەوە بۆ لای پاشاو دەستو پێوەندەکانیو باسەکەیان بۆ بگێڕمەوەو تەعبیرەکەی تۆیان پێ رابگەیەنم ﴿لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ بەڵکوو ئەوانیش لەمانای خەونەکە حاڵی ببنو بزانن: ئاکامی چی دەبێو ئاماژە بۆ چی دەکا، لەهەمان کاتدا زانینو فەضلو هونەری تۆش بناسنو فەرمانی رزگار بوونت دەربکەن!

﴿قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَباً﴾ حەزرەتی یوسف فەرمووی: مانای ئەو خەونە ئەومیە: ئێوە حەوت ساڵ کشتو کاڵ دەکەن، بەبێ پسانەوە ئێوە سەرگەرمی چاندنو دروێنە دەبن، ﴿فَمَا حَصَدْتُمْ فَذَرُوهُ فِي سُنْبُلِهِ إِلاَّ قَلِيلاً مِمَّا تَأْكُلُونَ﴾ هەرچی دەیدروونەوە لەناو گوڵەکەیدا بیهێڵنەوەو بەگوڵەکەیەوە عەمباری بکەن، مەگەر کەمێ نەبێ لەوەی: کە پێویستان دەبێ بۆ خواردن لەم ساڵە هاتانەدا. تا دەتوانن پەیڕەوی ئیقتیصاد بکەنو بەپێو دان دانەوێڵە بۆ خواردن وەلا بنێنو بەئەندازەی پێویست لێی خەرج بکەن!

﴿ثُمَّ يَأْتِي مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلاَّ قَلِيلاً مِمَّا تُحْصِنُونَ﴾ پاش ئەو حەوت ساڵە پڕ پیتو بەرەکەتە حەوت ساڵی گرانی دێن، حەوت ساڵ قاتوقڕی دەبێ، هەرچی ئەو رزقو رۆزییەی لەساڵە هاتەکاندا عەمبارتان کردووەو هەڵتان گرتووە بۆ ساڵە گرانییەکان دەیخۆن، مەگەر کەمێ نەبێ لەوەی کە هەڵی دەگرن بۆ تۆو چاندن لەساڵی داهاتوودا واتە: ساڵی دوا ساڵە قاتوقڕیەکان.

﴿ثُمَّ يَأْتِي مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ النَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ﴾ پاش تێپەڕبوونی ساڵە گرانییەکان، ساڵێکی هاتو باراناوی دێ لەو ساڵەدا دانیشتوانی وڵات کشتو کاڵیان تێراو دەبێو بەرو بوومو دانەوێڵەیان زۆر دەبێ، لەو ساڵەدا خەڵك ترێو زەیتونو هەر میوەیەك کە بگوشرێ دەیگوشنو شەربەتو پێخۆر بۆ خواردن دروست دەکەن!

ئەم هەواڵدانە بەنهێنییەکانی داهاتوو لەنیگاو سروشی خوداییەوە سەرچاوەی بۆ هەڵگێراوە، هەر تەعبیری خەون نینو بەس! ئەمە مزگێنیە کە دوا ساڵە گرانییەکان ساڵێکی پڕ پیتو بەرەکەت پەیدا دەبێ!

شایانی باسە لەخەونەکەدا هیچ ئاماژە کردنێکو ڕەمزێك نیە بۆ ساڵی پاش گرانی، کەوابێ حەزرەتی یوسف بەنیگاو سروش ئەمەی زانیوەو بۆ مزگێنی موژدەی بەکابرای مەیگێڕو هاوەڵی زیندانی داوە، بۆ ئەوەی ئەویش لەلایەن

خۆیەوە مـوژدە بەخـەڵکی بـداو رایبگەیـەنێ کـە پـاش حـەوت سـاڵ گرانـی سـاڵێکی هەرزانیو هات پەیدا دەبێ.

ئایەتەکان بەئاشکرا ئەوەیان لێ وەردەگیرێ کە خەون دوو جۆرە، خەونی پڕو پووچو بێ بناغە هەیە، خەونی راستو حەق هەیە.

ئەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوە کە ئەو قسە مەشهوورو باوەی: کە دەڵێن: گوایە خەون یەکەم جار چۆن مانای لێ درایەوە بەو شێوە دێتە جێ ناڕاستە. ئەوەتا خەونی پاشا خەڵکەکە هەموو وتیان: ﴿أَضْغَاثُ أَحْلَامٍ﴾ە کەچی بـەو شـێوە نەهاتـە دی. بەو شێوە هاتە دی: کە یوسف مانای لێ دایەوە.

کـەوابێ ئـەو فـەرموودەی کـە ئەبویـەعلا لەئەنەسـەوە بەمـەرفووعی دەیگێڕێتەوە گوایە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (الرؤیا لأول عابر) وا دیارە زەبوونو لاوازە!!

سەعید حەووا دەفەرموێ: کاتێ وایە: کە مانا لێدەرەوەکە زاناو لێزان بێ لەبواری تەعبیردا لەروانگەی زانستو عیلمەوە تەفسیری بکا.

هەروەها بەڵگەیە لەسەر بێ بناغەیی ئەو فەرموودەیەی کە لەوەپێش باسمان کرد: کە دەڵێ: (الرؤیا علی رجل طائر فاذا عبرت وقعت) بـەگوێرەی ئـەم ئایەتـە حەدیثەکە راست نیە.

ئیمامی قورطبی لەتەفسیری ئایەتی: ﴿تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ﴾دا دەفەرموێ: ئـەم ئایەتـە بنەمایەکـە لـەبواری بەرژەوەنـدی شـەرعیدا، یەکێکـە لـەو دەقانـەی کـە مەصالیحی شەرعی دەچەسپێنێ کە بریتین لەپاراستنی ئایینو گیانو عەقڵو نژادو ماڵو سامان. هەر شتێك پارێزگاری یەکێ لەم پێنج شتە یان هەموانیان بکا ئـەو مەصلەحەتەو پەسـندە، هـەر شـتێك یـەکێ لـەم پێـنج شـتانە بفـەوتێنێ ئـەو مەفسەدەیەو بـەرەنگاریکردنو رەتکردنـەوەی بەرژەوەندییـەو پێویسـتە. هـەموو

زانایـانیش کۆڕایـان هەیـە لەسـەر ئـەوە کـە مەبەسـتی هـەموو شـەریعەتە ئاسمانییـەکان شـارەزا کردنـی ئـادەمیزادە بـۆ وەدەسـتهێنانی بەرژەوەندییـە دونیاییەکان تـا بـەهۆی ئـەو بەرژەوەندییانـەوە بتـوانن، خـودا بناسـن‌و بەندایـەتی‌و عیبـادەتی بـۆ ئـەنجام بـدەن، کـە ئەمـەش سەردەکێشێ بـۆ بەختـەوەری دەونیـاو قیامەت.

## بەشی پێنجەم لەچیرۆکی یوسف:

## پاشا داوا دەکا یوسف ببینی‌و لەبەندینخانە ڕزگاری بکەن، یوسف داوای لێکۆڵینەوە دەکا

﴿ وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِى بِهِۦ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرْجِعْ إِلَىٰ
رَبِّكَ فَسْـَٔلْهُ مَا بَالُ ٱلنِّسْوَةِ ٱلَّـٰتِى قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ ۚ إِنَّ رَبِّى
بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ ﴿٥٠﴾ قَالَ مَا خَطْبُكُنَّ إِذْ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن
نَّفْسِهِۦ ۚ قُلْنَ حَـٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوٓءٍ ۚ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ
ٱلْعَزِيزِ ٱلْـَٔـٰنَ حَصْحَصَ ٱلْحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ
ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٥١﴾ ذَٰلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّى لَمْ أَخُنْهُ بِٱلْغَيْبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا
يَهْدِى كَيْدَ ٱلْخَآئِنِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾

دوای ئـەوەی کـابرای مـەیگێڕ گەڕایـەوە بـۆ لای پاشـاو تـەعبیر لێدانـەوەی خەونەکەی لەلایەن یوسفەوە پێ ڕاگەیاند، مانا لێدانەوەکەی بەلاوە پەسند بوو، دەست بەجێ داوای ئامادە کردنی یوسفی کرد، بۆ ئەوەی خودی خۆی ببینێو زیاتر مانای خەونەکەی بۆ شی بکاتەوەو بیرو بۆچوونی لەم بارەوە بزانێ، دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الْمَلِكُ ائْتُونِي بِهِ﴾ پاشا فەرمانی دەرکردو داوای کرد: کە یوسفی لائامادە بکەن، دەست بەجێ پیاوێکیان نارد بۆ بەندینخانە بۆ لای یوسف، ﴿فَلَمَّا جَاءَهُ الرَّسُولُ﴾ جا کە کابرای فرستادە هاتە لای حەزرەتی یوسفو پەیامی ڕزگار بوونی پێ ڕاگەیاندو ویستی پاشای بۆ روون کردەوە، حەزرەتی یوسف هیچ خۆی تێك نەداو هەواڵی رزگار بوونو مۆزدەی بڕیاری بەڕەڵلا کردنی لەبەندینخانە شاگەشکەی نەکرد، بەڵکوو چوونە دەرەوەشی لەبەندینخانە ڕەت کردەوە.

ئەوەتا ئێمە دەبینین: یوسف کە ئەو ماوە درێژەی لەبەندینخانەدا بەسەر بردوە پەلە لەچوونە دەرەوە ناکا تا قەزیەکەی لێکۆڵینەوەی تێدا نەکرێو بەرائەتی ڕانەگەیەنرێ مان لەچوونە دەرەوە دەگرێ. مانەوە لەبەندینخانەدا بۆ یوسف بووە بۆتەی پاڵفتە کردنو قاڵ کردن، خودا پەروەردەی کردو جوانی پێگەیاند، ئەم پەروەردە کردنە پەروەردە کردنەو قاڵکردنە بتمانەو ئارامی خستە نێو دڵی یوسفەوە، پەلە پەلی سەرەتای چوونە ناو بەندینخانەی پێوە دیار نەماوە!!

بێگومان کاریگەری ئەم پەروەردە یەزدانییە بەسەر یوسفەوە ئاشکراو نمایانە، جوداوازی نێوان مەوقیفی سەرەتای چوونە ناو بەندینخانەی کە بەهاوەڵەکەی دەڵێ: ﴿اذكرني عند ربك...﴾ لەگەڵ مەوقیفی دوا ئەو ماوە درێژەی: کە لەبەندینخانەدا ماوەتەوە زۆر ئاشکراو دیارە. ئەوەتا: حەزرەتی یوسف داوای چوونە لای پاشا ڕەت دەکاتەوە، لەباتی ئەوەی خێرا هەستێو خۆوەپێچێو بەرەو قەصری پاشا بکەوێتە ڕێو بەندینخانە جێ بێڵێ: ﴿قَالَ ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ﴾ بەفروستادەکەی فەرموو: بگەڕێرەوە بۆ لای پاشاکەتو داوای لێ بکە با لێکۆڵینەوە

لەو تۆمەتە بکا کە وەپاڵ من دراوە ﴿فَاسْأَلْهُ مَا بَالُ النِّسْوَةِ اللاَّتِي قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ﴾ بڕۆ عەرزی پاشا بکە! فەرمان بدا ئەو ژنانەی دەستی خۆیان بڕی لەگەڵ ژنی عەزیزی میصردا کۆیان بکاتەوەو پرسیاریان لێ بکا: حاڵی ئەوان چۆن بووەو حاڵی من چۆن بووە؟ لێیان بپرسێ لەسەر چی ئەو ژنانە داوایان لەمن کرد فەرمانی شاژن جێ بەجێ بکەم؟ ئەمن لەبەندینخانە نایەمە دەرەوە تا ئەو لێکۆڵینەوە ئەنجام نەدرێ، چونکە پێم ناخۆشە من بێمە لای پاشاو ئەو تۆمەتەم بەدووەوە بێ. ﴿إِنَّ رَبِّي بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ﴾ بێگومان خودای مەزن ئاگاداری فێڵو حیلە بازی ئەو ژنانەیەو بێ تاوانی من ئاشکرایە، داواکارم پاشا ئەو ژنانە کۆبکاتەوە بەڵکوو دان بەناپاکی خۆیانو پاکی من دابنێن!

پاشا ئەو ژنانەی دەستی خۆیان بڕیبوو لەگەڵ ژنی عەزیزدا کۆی کردنەوەو رووی تێ کردنو ﴿قَالَ مَا خَطْبُكُنَّ إِذْ رَاوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفْسِهِ﴾ وتی: مەبەستتان چی بوو ئەو رۆژەی: کە دەوری یوسفتان دابوو لەماڵی عەزیزی میصرو دەتانەویست یوسف لەخشتە بەرنو رامی بکەن بۆ ژنی عەزیز، ئایا یوسف هاتە سەر مەبەستی ئێوەو بەڵێنی دا داخوازییەکەتان جێ بەجێ بکا!!

﴿قُلْنَ حَاشَ لِلّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوءٍ﴾ ئەوانیش هەموو وتیان: نەوەڵڵا حاشا ئێمە هیچ رەفتارو هەڵسو کەوتێکی ناپەسەندمان لەیوسف نەدیوە، نە لەسەرەتاوە نەلەکۆتاییدا هیچ خراپەیەکمان لێ نەدیوە!!

ئیتر نەزعەی خێر لەدڵی زولەیخادا سەری هەڵدا دانی بەراستی دانا؛ وەکوو دەفەرموێ: ﴿قَالَتِ امْرَأَةُ الْعَزِيزِ﴾ ژنی عەزیز کەوتە قسەو وتی: ﴿الآنَ حَصْحَصَ الْحَقُّ﴾ ئێستا حەق دەردەکەوێو خۆی دەنوێنێ، چیتان لێ بشێرمەوە ﴿أَنَاْ رَاوَدتُّهُ عَن نَّفْسِهِ﴾ ئەم ژنانە پەیوەندییان بەقەزیەی یوسفەوە نیە، من هەوڵم لەگەڵ داوەو ویستوومە بۆ خۆمی رام بکەم، زۆرم ئەملاو ئەولا لەگەڵدا کردو هەوڵو تەقەللامدا بۆ ئەوەی سازی بکەمو بۆخۆمی بگونجێنم، بەڵام ئەو ملی نەداو بەقسەی

نـەکردەو نەهاتـە سـەرخەت. بەراستی یوسـف داوێنپاکەو ﴿وَإِنَّـهُ لَمِـنْ الـصَّادِقِينَ﴾ بێگومان ئەو لەگوفتارو هەڵوێستدا راسـتو راسـتخوازە، ئـەو کاتـەش کـە لەبـەردەم عەزیزدا رەدی دامەوە راستگۆ بوو. ئەم داننانەی زولەیخا شایەدییەکی رەپو رەوانە لەسـەر ئـەوە: کـە یوسـف داوێنپـاکو نیـاز پـاکو سروشـت پاکـە، هـیچ تـاوانو خیانەتکارییەکی ئەنجام نەداوە!!

﴿ذَلِـكَ﴾ ئـەم دان پیانانـەم ئـاوا بەئاشـکراو بـێ منجـە مـنجو شـایەتیدانم بەراستگۆیی‌و بێ تاوانی یوسف بۆ ئەوەیە: ﴿لِيَعْلَمَ أَنِّي لَمْ أَخُنْهُ بِالْغَيْـبِ﴾ کـە یوسـف بزانێ من لەو کاتانەدا کە ئـەو لەبەندینخانـەدا بـوەو خیانـەتم لێ نـەکردوە، تانـەو تەشەرم لەشەرەفو داوێنپاکی‌و نەفس بەرزی ئەو نەداوە، تەنانـەت کـە ژنەکانیـشم بـانگ کـردن بـۆ مـاڵی خـۆمو خواردەمـەنی‌و کێـردم دانـە دەسـتو یوسـفم هێنایـە سەریانو لەعەیبەتاو لەتاوا دەستی خۆیان بڕی، بـەئاگاداری ئـەوان دانم بـەوە دانـا: کە من هەوڵم داوە لەخـشتەی بـەرەو بۆخـۆمی کـەوی کـەمو کوڵی دڵی خـۆمی پـێ دامرکێنم! بەڵام یوسف بەیدەست نەبوو، خۆی گرتو بۆم رام نەبوو.

زومەخشەری دەفەرموێ: رستەی ﴿لِـيَعْلَمَ أَنِّـي لَـمْ أَخُنْـهُ بِالْغَيْـبِ﴾ وێ دەچـێ لەئاخاوتنی حەزرەتی یوسف بێو پەیوەست بـێ بەوتەکـەی پێـشووی کـە فـەرمووی ﴿إِنَّ رَبِّي بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ﴾.

ئەو کاتە مانای رستەی ﴿لِيَعْلَمَ أَنِّي لَمْ أَخُنْهُ بِالْغَيْبِ﴾ بەم جۆرە دەبێ: مـن کـە داوای ئەم لێکۆڵینەوەم کردو ویـستم پاشـا ئـەنجامی بـدا بـۆ ئـەوە بـوو: کـە عـەزیز (مێردی زولەیخا) بزانێو دڵنیا بێ من خیانەتم لێ نـەکردوە، لـەماڵ نـەبوونی ئـەوم بەهەل نەزانیوە دەست لەگەڵ خێزانەکەیدا تێکەڵاو بکەم![٢٥]

---

([٢٥]) تەفسیری کەششاف ج٢/١٤٢.

ئـەبو حـەییان رەخنـەی لـەم تەفسیر کردنـەی زومەخـشەری گرتـووەو دەڵـێ: ئەوانەی پێیان وایە رستـەی ﴿ذلك ليعلم...﴾ لـەئاخاوتنی یوسفە، خۆیـان تووشـی گـیرو گرفتـی نـەگونجانی پێکـەوە گرێـدانی ئـەم رسـتەیە لەگـەڵ رسـتەی پێـشوودا کردوە، هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نیە: کە ئەوە قسەی یوسف بێ.

هەڵبەتـە زومەخـشەری وەڵامـی ئـەبو حـەییانی داوەتـەوەو دەڵـێ: گونجـانی مەعنا باشترین بەڵگەیە؛ کە ئەوە لەکەلامی یوسفە..

﴿وَأَنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي كَيْدَ الْخَائِنِينَ﴾ با هەموو کەس بزانێو دڵنیا بـێ کـە خـودا فـرتو فێڵـی خائینـان جـێ بـەجێ ناکـاو سـەرکەوتوویان ناکـا بـەڵکوو بـەتاڵیان دەکاتەوە.

**ئەوەی لەئایەتەکان وەردەگیرێ ئەمەیە:**

١- هانـا بردنـی پاشـا بـۆ یوسـف نیـشانەی ئەوەیـە: کـە زانیـاری زۆر بـەنرخو پیرۆزە.

٢- زانیاریو کرداری چاك بەیەکەوە هۆکاری رزگار بونن لەتەنگـو چەڵەمەی دونیاو قیامەت.

٣- دروستە هەر کاتێ ئینسان هەلی بۆ هەڵکەوت حەقو راستی بچەسپێنێ.

٤- خۆڕازاندنــەوە بەرەوشــتی صــەبرو هێــدیو هێمنــیو نــەفس بــەرزیو کەرامەت پاراستن بنەمای ئەخلاقی پێغەمبەرانن.

٥- بەگوێرەی شەریعەت پێویستە ئینسانی موسوڵمان پەلـە لەلەکەدار کردنـی ناموسـی خـەڵك نـەکا، ئـەوەتا حـەزرەتی یوسـف خـۆی پاراسـت لـەوەی کـە تۆمـەتی خراپـە ئاڕاسـتەی ژنـەکان بکـا، بـەڵکوو داوای کـرد پاشـا بـۆ خـۆی لـەو بـارەوە لێکۆڵینەوە ئەنجام بدا. تەنانەت باسی زولەیخاشی بەخراپە نەکرد.

٦- راگەیانــدنی حەقیقــەتو درکانــدنی قــسەی حــەقو ئازایــەتی نوانــدن لەدەرخستی راستییەکانداو ویـژدان بەخەرجدان بەرامبـەر بـێ تاوانـانو تەصدیق کردنی خودا پەرستانو خۆپارێزان بەشێکن لەرەوشتی بەرزو جوانو پەسند.

بەیارمەتی خودا لەپاکنووسای جزمی دوانزەهەم بوومەوە بەمەش بەرگی چوارەمی تەفسیری رەوان تەواو دەبێ خودا یارمەتیمان بدا بۆ تەواو کردنی جزمەکانی تر ...

١٩٩٩/٣/١٥

ملا محمود أحمد